# پێشەکی چاپی دووەم

## بەناوی خوای بەخشندەومیهرەبان

ئەم کتێبەی بەردەستتان کۆکراوەی شەش کتێبە کە لەوەڵامی کتێبێکدا نووسراوە بەناوی (ئایا قورئان پارێزراوە)؟کە کتێبێکە دژ بەقورئان نووسراوە، پرۆژەی تیشک بەشەش کتێب وەڵامی داوەتەوە و بەزنجیرە بڵاویانکردۆتەوە، ئێمەش (گرووپی راگەیاندن) لەتۆڕی ئایە، بەباشمان زانی کە ئەو کتێبە پێکەوە بڵاوبکەینەوە، بۆیە کاتێك کە برایانی پرۆژەی تیشک پرۆژە مەعریفییەکەی خۆیانیان راگرت، داوامانلێکردن کە مۆڵەتی چاپکردنەوەی ئەو شەش کتێبەمان بدەنێ ، ئەوانیش بەسوپاسەوە مۆڵەتی لەچاپدانەوەی ئەو کتێبانەیان پێداین، لەسەر قسەی برامان مامۆستا ئیکرام کەریم کە مۆڵەتی لەهەر شەش نووسەرە بەرێزەکەی ئەو کتێبانە وەرگرت بۆمان و ئەوەشی پێراگەیاندین کە ئەو نووسەرە بەرێزانە فەرموویانە ئێمە بۆ خوا ئەو نووسینانەمان نووسیوەو بۆخواش پێشکەشی تۆڕی ئایەی ئەکەین و هەندێکیان پێشنیاریان وابوو کە کتێبەکان وەك خۆیان و بێدەستکاری چاپبکرێنەوەو خەتەکانیان وردنەکرێنەوە..

ئێمە بڕوامانوایە کە نە عەقڵ نە تەکنەلۆژیاو نە زانست و فەلسەفە ناتوانن جێگەی دین بگرنەوەو بێمنەت بن لێی، بەڵام بەدڵنیاییەوە هەم عەقڵ و هەم زانست ئەتوانن بەهەموو هێزیانەوە ببنە پاڵپشت بۆ راستیەکانی ئیسلام و زەروورەتی ئەو راستیانە بسەلمێنن بۆ ئەم مرۆڤە وەك تاك و وەك کۆمەڵگەش، وەك فیکرو وەك سیاسەتیش..

ئێمە دەرگای توێژینەوە لەتۆڕی ئایەدا بەم کتێبە ئەکەینەوەو ئومێدەوارین کە وەك پرۆژە پیرۆزەکەی تیشك ژمارەی توێژینەوەکانمان تا سەد نەوەستێت..

وما ذلك علي الله بعزيز..

گرووپی راگەیاندنی تۆڕی ئایە

## پێشەکی پرۆژەی تیشك

کتێبێکی قەبارە گەورە بەناوی(ئایا قورئان پارێزراوە) کە قەشەیەك بەناوی عەبدوڵا عەبدولفادیەوە نووسیویەتی و وەرگێڕێکی بێ ناوونیشان و بزرکاوی کوردیش وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، ماوەیەکە لەناو بازاڕدا دەست بە دەست ئەکات و بووەتە داری دەستی ئەوانەی کە خەڵکی بەدبینئەکەن بەرانبەر بە ئیسلام و چێژ لەوەئەبەن کە خەڵکی رێز لە ئیسلام نەگرێت و ئەوەی ئیسلام ئەیلێت ئەوان بیدەنە دواوە با راستەقینەیەکی حاشا هەڵنەگریش بێت، ئەیانەوێ ئەو قسەیەی کە یەکێکی وەك قەشە جۆن تاکلی مژدەدەر لە کتێبی"التبشیر والاستعمار"دا ئەڵێت، لە خەڵکی کوردی بکەنە راستەقینەی حاشاهەڵنەگر، قەشە جۆن تاکلی ئەڵێ: " يجب أن نستخدم القرآن، وهو أمضى سلاح في الإسلام، ضد الإسلام نفسه، حتى نقضي عليه تماماً. يجب أن نبين للمسلمين أن الصحيح في القرآن ليس جديداُ، وأن الجديد فيه ليس صحيحاً"یانی پێویستە قورئان –کە بڕندەترین چەکە لە ئیسلامدا–بەکاربهێنین دژ بە ئیسلام خۆی، تا بە تەواوەتی تێکیئەشکێنین، پێویستە ئەوە رۆشنبکەینەوە بۆ موسڵمانان کە ئەوەی لە قورئاندا هاتووەو راستە تازە نییەو، ئەوەی تازەیەو قورئان وتوویەتی راست نییە!

ئەم کتێبە لە راستیدا کلێسا نووسیویەتی و ئەو عەبدوڵا عەبدولفادیە ناوێکی خوازراوەو پێوەی دیارە کە لیژنەیەکی پسپۆڕ لە کلێسادا نووسیویەتی و ئیمکاناتی تەواوی بۆ تەرخانکراوە تا ئەو کارە ئەنجامبدات..

کتێبەکە بریتییە لەیانزە بەش کە شەشسەد لاپەڕەی خەتووردی داگیرکردووە، لە ساڵی٢٠٠٨دا چاپی یەکەمی کراوە هەرچەندە–نەفامانە– لەبەرگەکەشیدا نووسراوە٢٠٠٩!، کتێبەکە بە حسابی خۆی٢٤٣ رەخنەی لە قورئان گرتووەو بەو شێوەیە قەناعەتی بەخۆی کردووە کە قورئان پارێزراو نییە!و چاوەڕوانی ئەوەش ئەکات هەرکەس ئەو کتێبە بخوێنێتەوە قەناعەت بکات

کە قورئان کتێبێکی ئاسمانی نییەو ئەوەی لە قورئاندا هاتووەو راستە تـازە نییـە، و ئەوەی تازەیەو قورئان وتوویەتی راست نییە !

ئێمە لـە پـرۆژەی تیشـکدا –پـاش ئـەوەی بینیمـان ئـەم کتێبـە لـە هەنـدێ لـە راگەیاندنەکانەوە کراوەتە تەوەرەی باس و خواس و لە میانەی ئەو گومانانەوە کە لـەو کتێبــەدا هـاتوون خــەڵکی بەدبینئــەکرێت بەرانبــەر ئیسـلام–بڕیارمـان دا کـە وەڵامێکی زانستی ئەو کتێبـە بدەینـەوەو ئـەرکی وەڵامدانـەوەی ئـەو کتێبـەش بـە چەند براو خوشکێکی توێژەر لە بواری ئیسلامناسیدا بسـپێرین، بـەو هیوایـەی کـە ئـەم ئایەتـە پڕاوپـڕ پرۆژەکـەمان بگرێتـەوەو پەیمانـە خواییەکـەش بێتـەدی کـە ئەفەرموێ: (وَالَّذِينَ كَفَرُوا بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْـضٍ إِلَّـا تَفْعَلُـوهُ تَكُـنْ فِتْنَـةٌ فِـي الْآرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ (٧٣)ئەوانەی کە کافرن هەنـدێکیان پشـتیوانن بـۆ هەنـدێکیان ئەگـەر ئێــوەش وانەکــەن ئــەوە فیتنەیــەك و گەندەڵییــەکی گــەورە لەســەر زەویــدا بەرپائەبێت !

کەواتە ئەگەر وەك ئەوان بکەین و پشیوانی یەکتری بین نـە فیتنـەو نەگەنـدەڵی گەورە لە زەویدا روونادات،بۆیە ئێمـەش وەك ئـەوانمانکردو بـە لیژنەیـەکی پسـپۆڕ وەڵامــەکانمان دایــەوەو دووەم کتێبیــان بــوو بــە نســیبی هــەردوو بــرای توێــژەر: ئەنـدازیار عوسمـان و مامۆسـتا ئیکـرام کەریم،نووسـینەکەی ئەنـدازیار عوسمـان وەڵامی بەشـی هەشـتەمی ئـەو کتێبەیـەو نووسـینەکەی مامۆسـتا ئیکـرامیش وەك پێشدەسـتییەکە بـۆ وەڵامــی ناونیشــانی کتێبەکــەی عەبــدوڵا عەبــدولفادی کــە ئەپرسێ:(ئایا قورئان پارێزراوە ؟)چونکە ئەو پرسیارە ئەوەندەی روو لـە مێـژووی نووسینەوەی قورئان ئەکات ئەوەندە روو لە تێکستەکەی قورئان ناکات.

ئێمەی ئەهلی ئیسـلام ئەگـەر توانیمـان بیسـەلمێنین کـە لـە رووی مێژوویـیـەوە قورئان زۆر دەستپاکانە نووسراوەتەوەو هیچـی لێنەفـەوتاوە–نـە سـورەتێك و نـە ئایەتێك و نە تەنانەت پیتێکـیش– و وەك خـۆی لـە دەمـی پـیرۆزی پێغەمبـەرەوە وەرگـیراوەو نووسـراوەتەوەو دەسـت بـە دەسـت بـە ئەمانەتـەوە نـەوە بـە نـەوە

گوازراوەتەوە، ئیتر پاساو و بیانوو نامێنێ بۆ هیچ کەسێك بپرسێت:ئایا قورئان پارێزراوە؟!، بەڵکو ئەوەی جێگەی باسە ئەوەیە: ئایا ئەم قورئانە کە بە پارێزراوی گەیشتووەتە دەست خەڵکی هیچی بەکەڵکی تێدایە بۆ ئەم مرۆڤە؟ئایا قورئان سەردەمی بەسەرنەچووە؟ئایا قورئان کەڵکی ئەوەی پێوەنەماوە کە ئەمڕۆ ئەرکی ئاراستەکردنی تاك و کۆمەڵگە بدەیتە دەستی؟ یان نەخێر قورئان سەردەمی بەسەرچووەو کتێبێکی بێ سوودەو زانست و فەلسەفەو تەکنەلۆژیا جێگەی پێ لێژکردووە! لەبەر ئەمەبوو ئێمەش لە پرۆژەی تیشکدا ئەو دوو نووسینەمان کرد بە یەك و بەرگی دووەمی ئەم زنجیرە کتێبەمان تایبەت کرد بە نووسینی ئەو دوو توێژەرە بەڕێزەوە،و موژدەی ئەوەش بە خوێنەرانی بەڕێزی کتێبەکانی پرۆژەی تیشك ئەدەین کە ئەم زنجیرەیە بەردەوام ئەبێت تا هەموو بەشەکانی ئەو کتێبە نازانستیە وەڵامئەدەینەوە، خوای گەورە ئەو براو خوشکە توێژەرانە سەرکەوتوو بکات و پاداشتی بەخێریان بداتەوەو بەرەکەت بخاتە خامە بەخزمەتەکانیان و ئەم کارەش لە ئێمە قەبووڵبکات و بەرەکەتی تێبخات،چونکە هەر خۆی سەرچاوەی بەرەکەتە..

سلێمانی

٢٠١٢/٥/٢١

# وەڵامی پێشەکی کتێبەکە و سەرنجەکانی وەرگێڕ

## بەشی یەکەم

نووسینی : ئامینە صدیق

# پێشەکی نوسەر

لەکاتێکدا کە خەریکی نوسینی کتێبی خوێندنەوەیەکی نویٚ بۆ تەفسیری سورەتی (ئالی عیمران) بووم، کتێبی (ئایا قورئان پارێزراوە)م بینی، کە هەندێکم لێخوێندەوە ویستی ئەوەم بۆ دروستبوو ئەگەر خوا فرسەتبدات وەڵامێکی ئەو کتێبە بدەمەوە، ئەوەبوو ناوی خوام لێهێناو دەستمدایە نوسینی وەڵامەکەو تا خاڵی سێیەمی سەرەتای کتێبەکە رۆیشتم، بیستم کە پرۆژەی بەرێزو بەسەنگی"تیشك" بڕیاریان وایە بە دەستەجەمعی وەڵامی ئەو کتێبە بدەنەوەو ئەرکی ئەو وەڵامانەش بخەنەسەرشانی چەند نوسەرێك و ـ زۆر سوپاسیشیان ئەکەم ـ منیشیان لە ڕیزی ئەوانەدا دانابوو کە بەشێك لەو وەڵامانەی پێبسپێرن، هەر چەندە من داوامکرد وەڵامدانەوەی هەموو بابەتەکانی وەرگێڕی پەڕاوەکە بە من بسپێرن، بەڵام ئەوان وایان پێباش بوو کە زۆرترین نووسەر لەو بەرگریکردنەدا لە قورئان بەشداربن،بۆیە من تەنها ئەرکی وەڵامدانەوەی پێشەکی کتێبەکەو ئەو چەند بڕگەیەم لە بابەتەکانی وەرگێڕ پێدرا کە لە دووتوێی ئەم کتێبەدایە..

کتێبی"ئایا قورئان پارێزراوە" تابلێی کتێبێکی بیٚ ماناو نازانستیەو سیخنانە نووسراوەو ئەوەی ئەیخوێنێتەوە بۆی دەرئەکەوێت کە چ نووسەرەکەی– کە بریتییە لە قەشەیەك بەناوی"عەبدوڵا فادی"–و چ وەرگێڕەکەشی بۆ سەر زمانی کوردی– کە نادیارەو بێناو و نیشانە– زۆر بە رقەوە لەسەر قورئان نووسیویانەو خۆیان فریوداوە و بەتەمای تەفرەدان و چەواشەکردنی خوێنەرەکانیشیانن..

زۆر سەیرە– قورئان و ئیسلام بە ئایینێکی زیانبەخش ئەزانن و داوائەکەن نەهێڵرێت قورئان دیراسە بکرێت و ئازادببێت بۆ ئاراستەکردنی تاك و کۆمەڵ! ! ئەم وەرگێڕە ئەڵێ:(ئەگەر محمدو قورئانەکەی نەبووایە ئەوا عەرەب نەدەبوونە شەڕەنگێزترین میللەتی ئەم سەرزەوییە).. گاڵتە بەو قسەیە ئەکات کە موسڵمانان ئەڵێن: ئیسلام بە سوودە بۆ هەردوو دونیا.

وەرگێڕە بیٚ ناو نیشانەکە ئەڵێ:(ئایینمەندان ئەڵێن: گوایە ئیسلام هەردوو دونیای بەیەکەوە گرێداوەو وەکو یەك گرنگیان پێئەدات! !...)، یان کە باسی بەجێمانی دونیای موسڵمان ئەکات لە وڵاتانی تر ئەوە ئەکات بە خەتای ئیسلام و ئەڵێ: (هۆی دواکەوتنی گەلانی ئیسلامی ئەوەیە کە ئایینی ئیسلام

ئاییینێکی(سکونی)یەو ئاییینێکی بزواو و بزوێنەر(دینامیکی) نییە مەگەر بە ئاراستەی بوغزانـدن و جـەنگ و تـاپۆکردنی ئازادیەکانـدا نەبێت).( ! )ئەمەنـدە بێویـژدان و نامەنتیقییـە ئـاییني پڕخورافـەی وەك یـانیزمی– پێقەبووڵـە کـە ئـاییینێکی کـۆنی هیندستانیە، کەچی ئاییني ئیسلامی پێقـەبوولْ نییـە ! ! ئـەوەتا ئـەڵێ:(.... کەچـی ئاییینێکی هندی وەکو (یانیزم) ئافـەرۆزەو نـەهی لـە ئـازاردانی هـەموو گیانـەوەران و مرۆڤ دەکات...).

لە راستیدا ئەم کەسە خانەگومانانە مرۆڤ نازانێ چۆن قسـەیان لەگەڵدا بکـات، هەرچی بۆ باسبکەیت چەندە جوان و مەنتیقی و زانستی و بەرژەوەندی ئامێز بێـت بـەو مەرجـەی پەیوەنـدی بـە ئیسـلام و قورئانــەوە ببێـت لای ئـەو ناشـیرینەو نامەنتیقیـەو نازانسـتی و زیانبەخشـە ! ئەگـەر ئەمـە وا نیـە، ئـەی یـانی چـی ئـەو نووسـەرە بێناونیشـانەی لای خۆمـان ئـەڵێ: (ئەوانـەی سـەر بـە پـەڕاوێکی وەکـو قورئــانن و بــە هیــوان دەســەڵات بگرنــە دەســت کــە هێشــتا نەیانگرتووەتــە دەست،نایانەوێت رووناکبیر سەر بە هیچ رەوتێکی دیاریکراو بێت..)، ئاخر خۆ ئەم قسەیە ئەگەر وایدانێین قسەو بڕیاری ئەوانە بیت سەر بەپەڕاوی قورئـانن خـۆ ئـەم قسەیە مەنتیقیەو هەم زانستیەو هەم بەرژەوەندیئامێزە و هەم قسەیەکی جوانیشە ئـیتر بـۆ ئـەبێ ئـەو وەرگێـڕە ئاوەهـا قسـەکە گێـڕ بکـات؟و هەرایـەکی لەسـەر دروستبکات؟!

بە هەر حاڵ من لەو بەشە وەڵامەی خۆمدا ئەوەی زۆر بە قسەی نـاقۆڵا و بێتـامم زانیبێت لەسـەری وەسـتاوم و وەڵامـم داوەتـەوەو لـەوەش دڵنیـام کـە ئـەم وەڵامانـە کەموکورتیان تێدایـە، چـونکە ئـەوە تـەنها پەڕاوەکـەی خوایە پـارێزراوە لـە هەڵـەو کەموکورتی و موعجیزەی بەردەوامی ئەم ژیانەیە، لـەخوای پـەروەردگاریش داواکـارم بەفەزڵی خۆی ئەم نووسینەم لێقەبوڵ بکات و ئێوەی خوێنـەری بـەڕێزیش لوتفبکـەن دوعایەکی خێر بۆ منـیش و بـۆ پـرۆژە بەڕێزەکـەی تیشـکیش بکـەن کـە بەمشـێوەیە دەستمان ئـەکات بـەخێرداو ئـەرکی وەڵامدانـەوەی گومـان و چەواشـەکاریەکانی لـەم هەرێمەداو لەم رۆژگارە سەختەدا ناوەتە سەر شانی.

**ئامینە صدیق - ١٨ی رەمەزانی ١٤٣٣**

# ئایا قورئان پارێزراوە

ئەمە ناوی کوردی ئەو پەڕاوە عەرەبییەیە کە قەشەیەك بەناوی عەبدوڵلا عەبدولفادی نوسیویەتی و وەرگێڕێکی کوردی بێپێناس کردویەتی بەکوردی، بەڵام لەگەڵ وەرگێڕانەکەدا هاتووە نوسینەکانی نوسەری پەڕاوەکەی دیسان داڕشتۆتەوە بە چەندەها شێوازیتر و جگە لەوەش گومانیتری بۆزیادکردووە، دوبارەبونەوەی زۆریشی کردوە بۆ گومانەکان و هەرجارەی لەژێر ناونیشانێکی جیاوازدا، ئیتر ئەگەر مەبەستی لەم کارەی گەورەکردنی قەبارەی پەڕاوەکەبێت یان مەبەستی ئەوەیە بەو دوبارەکردنەوانە بەشێوازی جۆراوجۆر سەر لەخوێنەرانی بشێوێنی و دەستوپێیان لێوونکات، هەرکامێکیانی مەبەست بوبێت ئەوا بەدەستی بەتاڵ لێی دەردەچێت ! چونکە هەوڵەکانی بۆ خامۆشکردن و کوژانەوەی ڕوناکییەکە کە خوا خاوەنییەتی و بڕیاری پاراستنی داوە، ئەوەندەش هیزی پێداوە هەر کەسێك بیەوێت خزمەتی بکات ئەوا بەکەمترین ماندوبون ئەتوانێت تیشکەکانی بگوازێتەوە بۆ ناو تاریکییەکان، ئێمە ووتمان بەدەستی بەتاڵ لێی دەردەچێت " واتە دەست بەتاڵ لە بەدیهێنانی مەبەستەکانی بەڵام ئەوە قسەی لەسەر نییە کە کۆڵبەباری قورسی تاوان ئەبێت و توشی بێڕێزی ئەبێت لای هەموان چونکە هەرکەس خوا ڕسوایکرد کەسێك نابێت ڕێزی بگرێت (وَمَنْ يُهِنِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ مُكْرِمٍ) واتە: هەرکەس خوا ڕیسوای بکات لای کەس ڕێزی نامێنیٚ.

ئەمەش بەڵێنی خوایە ! ! بۆیە نابینی ئەوانەی وا لەمێژودا ڕەنجیانکێشاوە بۆ دژایەتی قورئان و ئاینی ئیسلام بەڕێزەوە باسبکرێن، لەوانەیە لەسەردەمی خۆیاندا پاداشتێکی ماددی وەرگرن بەڵام هەرچیان بۆبکرێت ڕێزو مەکانەی کۆمەڵایەتی لەگەڵ نابێت و بەچاوی ڕێزەوە سەیرناکرێن. ئەمەش تۆڵەیەکی خوایە بۆ ئەوکەسانە و پێم وایە سزایەکی سەختە چونکە مرۆڤ لەم دونیا هەرچی ئەکات بۆ پەیداکردنی مەکانەو ڕێزە و لەناخیدا بەدوای ئەوەدا وێڵە.

دیارە تادونیا مابێت و فرسەتی تەمەنیش هەبێت دەرگای فراوانی گەڕانەوەش بۆ لای خوای بەبەزەیش والآیەو داناخرێت، خۆشحاڵی دونیاو قیامەتن ئەوانەی ئەگەڕێنەوە بۆ لای خوای خاوەن ڕێز و گەورەیی کە ڕێزی لە مرۆڤ گرتوە (وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ).

ئێستەش فەرمون لەگەڵ وەڵامی هەندێك لەو گومانانەی کە وەرگێر دروستیکردووە: ـ سەرەتا وەرگێر لە پێنج خاڵدا پێشەکییەك ئەنوسێ بۆ پەڕاوەکەو زۆرترین گومانی تێدا دائەنێت، بەویستی خوا هەرخاڵێك چەند گومانی لەخۆگرتبێت بەجیا لەژێر خاڵی ژمارەیی خۆیدا وەڵامەکەی ئەنوسمەوە.

١ـ وەرگێڕ ئەم ئایەتە (انا نحن نزلنا الذكر وانا له لحافظون) دەکاتە دەستپێك و دەیەوێت بڵێت: کەخاوەنی قورئان بەڵێنی پاراستنی قورئانیداوەکەچی جیاوازی وناکۆکی تێدایە و و پارێزراو نییە!! بۆ سەلماندندنی ئەم مەبەستەی ئەم چەند ئایەتەی تری قورئان دەکاتە بەڵگە: (هُوَ الَّذِي أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلَّا اللَّهُ وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الْأَلْبَابِ (٧)سورةتی ئال عیمران و(أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِنْدِ غَيْرِ اللَّهِ لَوَجَدُوا فِيهِ اخْتِلَافًا كَثِيرًا (٨٢)سورةتی النساء

وەرگێر تەفسیری ئایەتەکان دەکات و پاشان بەئارەزو حەزی خۆی دەڵێت: (ئەو چەند ئایەتە ئاماژە دەکەن بۆ هەبونی ناکۆکی و جیاوازی لەقورئاندا، هەروەکو لە سورەتی (النساء٨٢) دا دیارەو باس لەوە دەکات کە ئەگەر قورئان لە خواوە نەبوایە ئەوا ناکۆکی و جیاوازییەکی زۆریان لە نێوان ئایەتەکانیدا دەدۆزیەوە، کەواتە هەر وەکو ئایەتەکە دەڵێ: ئەگەر جیاوازی و ناکۆکی زۆر ـ ( اختلافا كثيرا) یشی تێدا نەبێت ئەوا جیاوازی کەم لەنێوان ئایەتەکاندا هەیە) پاشان بۆ سەلماندنی ئەم بۆچونە هەڵەیەی نمونەی خوێندکارێك دەهێنێتەوە کە

دەڵێت من کۆششم نەکردوە واتای ئـەوە نییـە کـەهیچ کۆششـی نـەکردووە بـەڵکو واتای ئەوەیە کەکۆششی کردوە بەڵام کۆششێکی کەمی کردوە واتە ئەگەر قورئان ئایەتی لەگەڵیەك ناکۆکی زۆری تێدانەبێت ئەوا هەندێکی تێدایە و ئـەوەش دەکاتـە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە قورئان لای خوداوە نییە و دەڵێت هـەمان بەڵگـەش ئـەوە دەسەلمێت کە قوئان (معصوم ـ پارێزراو) نییە لەهەڵە.

وەرگێڕ زۆر بەخێرایی و بەهەڵەشەییی لە خـاڵی ژمـارە یـەکی پێشـەکیەکەی دا کەلاپەرەونیوێکە دەیەوێت بڵێت: کەسەلماندمان قورئان پارێزراو نییـەو دژەوانـە و هەڵەیشی تێدایە.

ئەوەی بەدێژایی مێژووی پـر لـە ململانێـی نێـوان قورئـان و نـەیارەکانی کـەس نەیتوانیوە ئەو بوختانە بسـەلمێنێ و هـەمووی چـۆکی داداوە لەبـەردەم ئیعجـازی یـەك پارچـەیی و تۆکمـەیی و تـەواوکاری نێـوان ئایەتـەکانی قورئانـدا، کەچـی وەرگێڕێـك بـۆ پـەڕاوێکی شکسـت خـواردوی قەشـەیەك زۆر بـە سـانایی لـە پێشـەکیەکەیدا ئـەو ئیدعایـە دەکـات و وادەزانێـت هـەنگی لـە کرۆڵـی داردا دۆزیوەتەوە. من وای بۆ دەچم وەرگێـر هـەر لەبـەر ئـەوە نـاوی خـۆی نەنوسـیوە چونکە هەموو دەرەنجام و تەعلیقەکانی وەرگێر لەسـەر بابەتەشـێواوەکانی قەشـە (عەبدوڵلا فادی) بەم شێوەیەیە و شایەنی شانازی پێوەکردن نییە تانـاوی خـۆیی لەسـەر بنوسـێت هـەروەك چـۆن قەشـەکەش بـە نـاوی خـوازراوەوە نوسـیویەتی: ئـــەوەی لای خـــەڵك زانـــراوە و سروشـــتیە شـــانازیکردن و دڵخـــۆش بوونـــە بـــە لێکۆڵینـەوەی زانسـتیانە ودەرەنجـامی دروسـت بـا جێگـەی قبـوڵی خـەلکیش نـە بوبێت، دیارە نە وەرگێڕو نەنوسەر متمانەیان بـە نوسـینەکانی خۆیـان نییـە بۆیـە نـــاوی خۆیانیـــان لەســـەر نەنوســـیوە و لـــە کـــاتی شـــەرمەزاربونیان لەبـــەردەم خوینەرانیاندا خۆیان حەشارداوە.

با بێینە سەر وەڵامی ڕستە و هاوکێشە بێبنەماکانی وەرگێڕ:

# قورئان ناكۆكی تێدا نیە

١ـ ولو كان من عند غير الله لوجدوا فية اختلافا كثيرا، واتە: ئەگەر ئـەم قورئانـە لای جگە لە خواوە بوایە ئەوا بێگومان جیاوازی زۆری تێدا دەبـوو. وەرگێـر دەڵێـت: ئەمە بەڵگەیە بـۆ ئـەوەی كـە ئەگـەر قورئـان جیـاوازی زۆریشـی تێـدا نـەبێت ئـەوا جیاوازی كەمی تێدایە.

لەوەڵامدا دەڵێم: ـ باسی بونی دژەوانەی كەم یان زۆر پەیوەندی بە قورئانەوە نیە و باسی بونی دژەوانە لـەناو نوسـینەكانی مرۆڤدایـە، خوێنـەری بـەڕێز كـەمێك بەوردی سەیری ئایەتەكە بكە خوای تەعالا ئەفەرموێت:

(ولوكان من عند غير الله لوجدوا فيه اختلافا كثيرا) واتـە: ئەگـەر ئـەم قورئانـە لای جگە لە خواوە بووایە ئەوا دژەوانەی زۆریان تێدا ئەدۆزرایەوە. كەواتە دژەوانە لەقورئاندا بوونی نیە و ئەوەی دژەوانەی تێدا ئەبێت ئەو پەراوەیە كەلای مرۆڤەوە ئەنوسرێت ئەویش مەرج نییە هەموو نوسراوێكی بەشەر دژەوانەی تێبكەوێت بەڵكو ئەگـەر بیانـەوێت پـەڕاوێكی بنوسـن لایـەنی ڕۆحـی و پـاكیزەكردنی مرۆڤـەكان لەئەستۆ بگرێت و هـەر ئـەو پـەڕاوە پەیوەنـدی نێـوان مرۆڤـەكان لەسـەر بنـەمای پێكەوە ژیان و خۆشەویسـتی بنیـات بنێـت و هـەمان پـەڕاویش هـەموو بنـەماكانی حوكمڕانی داد پەروەرانەی تێدا بێت و لەگەڵ ئەمانەشدا دەرگاو كلیلەكانی زانستی بونەوەری تێدابێت، هەواڵی نادیارەكان و هەواڵی ئەو دیـوی مـاددەش بـدات ئـەوە ناتوانن و دەستەوسان ئەبن و كارێكی لەوشێوە تەنها لە خوا دەوەشێتەوە و جگە لە خوا كەس ناتوانێت هەموو ئەوانە لە پەڕاوێكدا كۆكاتەوە، پەڕاوەكـەش گـۆڕانی شوێن و كات كاری تێنەكات و هەمیشە وەڵامی پرسیارەكانی پێبێت.

كارێكی بەم شێوە ئەگەر جگە لە خوا بیەوێت بیكات ئەوا پـڕ دەبێـت لـە كـارو حوكمی دژەوانە، بۆیە نەیفەرموە دژەوانەی كەم چـونكە كـاریّ بـەو گەورەییـە بـە مرۆڤ ناكرێت و پڕدەبێت لە دژەوانە هەروەك چۆن لە دەستورو یاسـاكانی دانـراوی دەستی خەڵكی دا دەردەكەوێت و هەر ماوەی جارێك پێویست بە هـەموار كـردن و

گۆڕانکاری دەکات ئەمە جگە لەوەی کە گشتگیر نابن ناتوانن وەڵامی هەموو داخوازییەکانی لایەنە ڕۆحی و کۆمەڵایەتی........هتا) بدەنەوە. کەواتە کاتێك خوا ی گەورە دەفەرموێ جیاوازی زۆری تێدا دەبوو مەبەستی لە دانراوەکانی دەستی خەڵکییە و حەقیشی فەرمووە.

ئایەتەکانی جێتوند وکشاو دانایی خواو موعجیزەبوونی قورئان ئەسەلمێنی

١. ئایەتی (هُوَ الَّذِي أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلَّا اللَّهُ وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الْأَلْبَابِ (٧) واتە: هەر ئەو خوایە یە کە دایبەزاندوەتە سەر تۆ پەڕاوەکە کە تیایدا ئایەتی جێتوند هەیە و ئەوانی تریش ئایەتی چونیەکن لە شێوازدا (مەبەستی جیاواز لە خۆ دەگرن) ئەو کەسانەی لە دڵیاندا لادان هەیە شوێن ئەو ئایەتانە دەکەون کە (موتەشابیهن) بەمەبەستی ئاژاوە نانەوە ودەرهێنانی مەبەست مەبەستی دروستی ئایەتەکان تەنها خوا دەیزانێت و ئەوانەی لە زانستەکەدا ڕۆچوون دەڵێن: باوەڕمان پێهێناوە هەمووی لای خواوە هاتووە و تەنها کەسانی خاوەن عەقڵی بێخەوش ئەمە بەیاد دەگرن.

وەرگێر ئەم ئایەتە دەکاتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە گوایە قورئان دژەوانەی یەکتری تێدایە و دەڵێت: ووشەی (العلم) یش لە ئایەتەکەدا مەبەست پێی قورئانە نەك زانستی سەردەمەکانی پێش قورئان و زانستی ئەمێستای نوێی دەرەوەی قورئان .

وەڵام: بونی ئایاتی موتەشابیە لە قورئاندا حیکمەتی زۆری تێدایە یەکێك لە حیکمەتەکانی نیشانەیەکە بۆ جیاکردنەوەی کەسانی ئاژاوەگێرو خاوەن مەرامە تایبەتەکان (ابتغاء الفتنة وابتغاء تاویلە) و زیاتر بە هەڵە بردنی کەسانێکە کە لارەڕی هەڵدەبژێرن و مامەڵە خراپەکە دەکەن (إِنَّ اللَّهَ لَا يَسْتَحْيِي أَنْ يَضْرِبَ مَثَلًا مَا بَعُوضَةً فَمَا فَوْقَهَا فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا فَيَعْلَمُونَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِنْ رَبِّهِمْ وَأَمَّا الَّذِينَ كَفَرُوا

فَيَقُولُونَ مَاذَا أَرَادَ اللَّهُ بِهَذَا مَثَلًا يُضِلُّ بِهِ كَثِيرًا وَيَهْدِي بِهِ كَثِيرًا وَمَا يُضِلُّ بِهِ إِلَّا الْفَاسِقِينَ (٢٦)البقرة

واته:ـ (الله) پێی شەرم نیە کە هەروێنەیەك بێنێتەوە مێشولە بێت یان لەو سەروتر، ئەوانەی باوەڕیان هێناوە یەکسەر حاڵی دەبن ئەوە حەقێکە لای پەروەردگاریانەوە هاتووە و ئەوانەش کە بێباوەڕبوون یەکسەر دەڵێن خوا بە ئەمە چ مەبەستێکی هەیە؟زۆرێك پێی هیدایەت وەردەگرن و زۆرێکیش پێی لاڕێ دەبن و تەنها کەسانێکیش لێیان دەشێوێ کە لاڕێکارن.

کەواتە بونی ئەو جۆرە ئایەتانە هەروەك چۆن هۆکاری زیاد بوونی باوەڕی باوەڕدارانە ئاواش هۆکاری زیاترسەرلێشێوانی ئەوانەیە کە بێباوەڕی هەڵدەبژێرن.

ئایا هەر ئەمە بۆ خۆی جۆرێکی تر نیە لە ئیعجازی قورئانی کە بەدەم کەسەکانەوە بچێت بە پێی مەرام و مەبەستی شاراوەی خودی ئەو کەسانە؟ ئەمیان باوەڕی دەوێت بۆی زیاد دەبێت ئەویشیان گومڕایی دەوێت و دەستی دەکەوێت (سبحان الله).

ئایەتەکانی (محکمات) و (متشابهات) لەقورئاندا مایەی مانەوەی ڕۆڵی کارای قورئانە لەژیاندا، هۆکارە بۆ ئەوەی قورئان کات و شوێن ببەزێنێت و ئایەتەکانی هەمیشە نوێ بێت. نەك بەو شێوەیەی کە وەرگێڕدەڵێت:ــ باسی ئەو ئایەتانەی کەکەس لێیان تێناگات باسێکی نەشیاوە چەنکە خواوەند لە سورەتی موحەمەددا دەڵێت: (أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ أَمْ عَلَى قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا(٢٤) ئایا ڕامانیان لەقورئاندا نەکردووە یان دڵەکان قفڵیان لێدراوە. یەکێك لەدژەوانەکانی وەرگێڕ لەم لاپەڕەیەدا ئەوەیە لەم دێڕەدا دەڵێ: باسی ئەو ئایەتانەی کەکەس لێیان تێناگات، لەپاشانیشدا کە ناچار دەبێت تەفسیری هەموو ئایەتەکە بکات دەڵێت: تەنها خوداوەند و ئەوانەش کە بنجیان لە زانستدا داکوتاوە واتای ئەو ئایەتانە دەزانن.

ئەگەر وەرگێر خۆی یان هەرکەسێکی تر بەڕامانەوە سەیرێکی لاپەڕە ٧ ی وەرگێر بکات بۆی دەردەکەوێت کە جگە لە لاوازی بەڵگەکەی، پەرچ کردنەوەیشی تێدایە و بەزیان بەسەرخۆیدا دەشکێتەوە : چونکە تێگەیشتن لە قورئان نیازی پاك و

زانست و دەبر کردن و ڕامـانی دەوێت و کەسـێك ئەمانـەی نـەبێت ئـەوا توشـی سـەر گەردانی دەبێت و سەری لەبەر دەرناكات و لـە خۆیشـی وایـە باشـی كـردوە (قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُمْ بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمَالًا (١٠٣) الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا (١٠٤) أُولَئِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ وَلِقَائِهِ فَحَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْنًا (١٠٥) واتـە: ئایا هـەواڵتان پێبـدەم كێن ئەوانـەی لـە هەموو كەس زیاتر كردەپەشیمان دەبن؟ ئەوانەن كە ڕەنج بەبادەن لەژیاتی دونیـاداو واش حیسـاب دەكـەن كـە خۆیـان پیشـەوەرێكی باشـن. ئەوانـە كەسـانێكن كـە بەئایەتەكان وگەیشتن بە پەروەردەكاریان بێباوەڕن. كاری ئەوان هەڵوەشـاوەیەو لـە ڕۆژی هەستانەوەشدا هیچ بەهاو قورساییەكیان بۆ دانانێن.

بۆ بەرچاو ڕونییەكی خوێنەری بـەڕێز و وەرگێـڕی نەناسـراویش، بـەپێی پێویسـت بەویستی خوا دەربارەی ئەو ئایەتانە دەنوسم كە (متشابهات) ن و پێوەرن بـۆ نیـازو مەرامی خەڵكی و زانستێكی ڕیشە داكوتراویان دەوێـت بـۆ لێتێگەیشـتنیان هـەروەها مـوعجیزەن بـۆ بەزانـدنی نـەیارەكانی قورئـان ، داوای لێبـوردنیش لـە خـوا دەكـەم لەهەموو كەمی و ناتەواوییەك" ئایەتەكانی قورئان بە پێی ئەسڵ و فـەرع دەكـرێن بـە دوو بەشەوە: ئایەتەكان كە ئەسڵی قورئانن و خواش بە دایك بۆ كتێب ناویان دەبـات ئەوانە (محكمات) ن، ئەو ئایەتانەش كە كێشدارن و وەچەن بەسەیر كردنی بێڕامان و دیراسەكردن نازانرێت بەرهەمی كام ئایەتی دایكە ئەوانـە ئایەتـەكانی (متشـابهات)ن، بەگەڕانەوەی ئەو وەچانە بۆ لای ئەسڵەكانیان و تەفسیر كردنیان لەسایەی دایكیانـدا ئـەوانیش دەبنـەوە بـە ئەسـڵو بەرهـەمی دروسـتی خۆیـان دەدەن، مـوعجیزەی ئـەم ئایەتە موتەشـابیهانە لەوەدایـە هەمیشـە بـە پێـی زەمـەن تـازە دەبنـەوە و چـەندێك خەریك بیت پێیانەوە هەر وەك هەڵگۆزینی ئاوە لە دەریا و لێـی كـەم ناكـات. سـەیر لەوەشدایە بارسـتایی قورئـان و ژمـارەی لاپەڕەكانیشـی هـەر وەك هـەموو پـەڕاوێكی سروشتیە بەڵام نەك وەك ئـەوان كـۆن بێـت و زانیارییـەكانی بەسـەر بچێـت یـان وەك ئەوان ناكۆكی و دژەوانەیی تێدابێت. بەڵكو هەمیشە بـەهارە و دیـوانی پڕبـەرەكـەتی

گەرمە و شوێنکەوتەکانی چالاك ونەیارەکانیشی دەستەوسان و کۆڵبەبارن، (سبحان الله).

## سەلماندنێك

لەقورئاندا دەربارەی، عیسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) چەند ئایەتێك هەیە کە موتەشابیهن و پێویست بەوە دەکات موحکەم بکرێن وەك ئایەتەکانی:
وَرَسُولًا إِلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنِّي قَدْ جِئْتُكُمْ بِآيَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ أَنِّي أَخْلُقُ لَكُمْ مِنَ الطِّينِ كَهَيْئَةِ الطَّيْرِ فَأَنْفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيْرًا بِإِذْنِ اللَّهِ وَأُبْرِئُ الْأَكْمَهَ وَالْأَبْرَصَ وَأُحْيِي الْمَوْتَى بِإِذْنِ اللَّهِ وَأُنَبِّئُكُمْ بِمَا تَأْكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِي بُيُوتِكُمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ (٤٩) وَمُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَلِأُحِلَّ لَكُمْ بَعْضَ الَّذِي حُرِّمَ عَلَيْكُمْ وَجِئْتُكُمْ بِآيَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ (٥٠)

واتە: ڕەوانەکراوێکیش بۆ لای نەوەکانی یەعقوب کەووتی من لای پەروەدگاری ئێوەوە بەڵگەم هێناوە بۆ ئێوە، من لە قوڕ باڵندە دروست دەکەم ، فوی پێدادەکەم بەویستی خودا دەبێتە باڵندە و کوێری زکماك و نەخۆشی بەڵەکیش چاك دەکەمەوە پێتان دەڵێم چی دەخۆن و چیش پاشەکەوت دەکەن، ئەمانە نیشانەن گەر ئێوە بڕوادارن، ئەوەی پێش منیش هاتووە لە تەورات بەڕاستی و دەگێڕم، هەندێ لەوەی لێتان حەرام کرابوو بۆتانی حەڵاڵ دەکەم و بەڵگەم لای پەروەردەکاری ئێوەوە هێناوە، زوو لەخوا خۆتان بپارێزن و پابەندی فەرمانەکانی منیش ببن.

١ـ خەلق کردنی گیانلەبەران ٢ـ شیفای نەخۆشی زکماك ٣ـ زانینی نهێنی ماڵەکان ٤ـ حەڵاڵ و حەرام کردن لە ئاییندا

ئەمانە بەدەرن لەتواناکانی خەڵکی، هەمووی کاری خوایە. پاشان خوا هەر کارێکی ئەنجام دابێت یان هەر فەرمانێکیشی کردبێت صیغەی بکەرەکەی بە (کۆ)

هێناوە وەك صیغەكانی (خلقنا السماوات و الارض، امرنا مترفیها ، جعلنا اليل والنهار ایتین،....)

بەسەیر كردنی ئەم ئایەتانە و گوێگرتن بۆ گاورەكان، گومانێك دروست دەبێت دەربارەی مرۆڤ بوونی عیسا پێغەمبەر، كەسی خاوەن مەرامی تایبەت بواری بۆ خۆش دەبێت بلێت: كە عیسا ناكرێت مرۆڤ بێت. گەر وابوایە موسڵمانیش زۆر ئامادە دەبوو بكەوێتە ناو ئەو هەڵە و سەرگەردانییەی كە گاورەكانی تێكەوتووە كە عیسای بەندەو نێردراوی خوایی بە خوا یان بەكوڕی خوا بزانێت (پەنا بەخوا) و (سبحان الله عما یشركون) ، ئایەتە موحكەمەكان عەقیدەی شوێنكەوتەكانی موحەمەدیان پاراستووە لە پیلانی خاوەن مەرامە تایبەتەكان و ئاژاوەگێڕان.

ئایەتە موحكەمەكان وەك: إِنَّ مَثَلَ عِيسَى عِنْدَ اللَّهِ كَمَثَلِ آدَمَ خَلَقَهُ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ (٥٩) الْحَقُّ مِنْ رَبِّكَ فَلَا تَكُنْ مِنَ الْمُمْتَرِينَ (٦٠) فَمَنْ حَاجَّكَ فِيهِ مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ فَقُلْ تَعَالَوْا نَدْعُ أَبْنَاءَنَا وَأَبْنَاءَكُمْ وَنِسَاءَنَاوَنِسَاءَكُمْ وَأَنْفُسَنَا وَأَنْفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَلْ لَعْنَتَ اللَّهِ عَلَى الْكَاذِبِينَ (٦١)

واتە بێگومان وێنەی عیسا لای خوا وەك وێنەی ئادەمە دروستی كرد لە گڵ و پاشان پێی فەرموو: دەی دروستبە دەبێت، هەموو ڕاستییەكان تەنها لای خوایە كەواتە تۆ نەبیتە یەكێك لە گومانكاران، دوای ئەم زانیارییە كەبۆت هات هەركەسێك دەربارەی ئەم ڕاستییە چەلەحانێی لەگەڵ كردی یەكسەر بڵێ وەرن ئێمە خۆمان و منداڵەكانمان و ژنەكانمان ئێوەش خۆتان و منداڵەكانتان و ژنەكانتان كۆبینەوە و بەكوڵ دوعای بە نەفرین بوون بكەین لە درۆزنەكان.

سەیركە چۆن خوای گەورە دڵی ئیماندار دادەمەزرێنێت بەوەی نەترسانە گرەوی مان و نەمان بكات لەسەر مرۆڤ بوون و بنیادەم بوونی عیسا پێغەمبەر. كەواتە " سەلامی خوای لێبێت لەو ڕۆژەی كەوەك منالآنی تر تیایدا لە دایك بووە و لەو ڕۆژەش تیایدا وەك هەموو مرۆڤێك دەمرێت و لەو ڕۆژەش وەك هەموومان زیندوو دەكرێتەوە (قَالَ إِنِّي عَبْدُ اللَّهِ آتَانِيَ الْكِتَابَ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا (٣٠) وَجَعَلَنِي

مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنْتُ وَأَوْصَانِي بِالصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ مَا دُمْتُ حَيًّا (٣١) وَبَرًّا بِوَالِدَتِي وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّارًا شَقِيًّا (٣٢) وَالسَّلَامُ عَلَيَّ يَوْمَ وُلِدْتُ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا (٣٣) ذَلِكَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ قَوْلَ الْحَقِّ الَّذِي فِيهِ يَمْتَرُونَ (٣٤) مَا كَانَ لِلَّهِ أَنْ يَتَّخِذَ مِنْ وَلَدٍ سُبْحَانَهُ إِذَا قَضَى أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ

واتە: عیسا ووتی: من بەندەی (الله) م پەڕاوی پێیام و کردمی بە هەواڵپێدراو، پیرۆزی کردم لەهەر کوێیەك هەبم ئاموژگاریکردم تا لە ژیاندابم نوێژ بکەم و زەکات بدەم، چاك بم لەگەڵ دایکم و خوا منی بە زۆردار و نەگبەت دانەناوە، من بەهەموو شێوەیەك سەلامەت دەبم ڕۆژی لەدایك بونم و ڕۆژێك کەدەمرم ڕۆژێکیش کە زیندوو دەکرێمەوە ، ئەوە عیسای کوری مەریەمە ئەو فەرمایشتە ڕاستەی کە ئێوە دەربارەی بەگومانن، شایستەی خوا نییە کە کوڕ بۆ خۆی دابنێ ئەو زۆر بێگەردە و هەر برِیارێکیدا ئەوەندە بەسە بفەرموویّت ببە ئیتر دەبێت.

کەواتە ئەو کارانەی عیسا بێغەمبەر سەلامی خوای لێبێت کردوونی موعجیزەو بەلگە بوون بۆ پێغەمبەرێتی عیساو ڕاستبوونی بانگەوازەکەی، بەهۆی ئەو پیرۆز بوونەوە بووە کە لای خواوە بەخشرابوو بە عیسا پێغەمبەر. عیسا پێغەمبەر پیرۆزبوونەکەی تەنها لە خۆیدا بووە و بەویستی خوا توانیویەتی ئەو کارە گەورانە بکات بەڵام موحەمەدی سەرداری پێغەمبەران پیرۆزییەکەی لە خۆیدا هەبوو بەلاّم موعجیزەو پیرۆزییەکەی بە (قورئان) ەو تا ئەبەد هەر بەردەوامە و ڕاستکەرەوەی هەموو بۆچونێکی هەڵەشی لە خۆ گرتووە.

بە تێڕامانەوە سەیری سورەتی (ال عمران) بکە دەبینی لە سەرەتاکانی سورەتەکەدا باسی (موحکەم و موتەشابیە) دەکات هەر لەو سورەتەشدا چەندەها ئایەتی موتەشابیە موحکەم دەکاتەوە و بۆچونە چەوتەکان ڕاستدەکاتەوە، وەك:ـ سەلماندنی مرۆڤ بوون و بەرز کردنەوی عیسا و بەسەلامەت دەرچوونی لەدەستی ناحەزەکانی ووشەی (والسلام علی) لەڕێزمانی عەرەبیدا ئەو (ال)ی بە ووشەکەوە هەیە بۆ (الاستغراق) ە وواتای هەموو جۆرێکی سەلامەتی دەدات و

دەیسەلمێنێ کە عیسا پێغەمبەر نەکوژراوە و ئایەتەکانی (وَمَكَرُوا وَمَكَرَ اللَّهُ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ (٥٤) إِذْ قَالَ اللَّهُ يَا عِيسَى إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا وَجَاعِلُ الَّذِينَ اتَّبَعُوكَ فَوْقَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأَحْكُمُ بَيْنَكُمْ فِيمَا كُنْتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ (٥٥) فَأَمَّا الَّذِينَ كَفَرُوا فَأُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَمَا لَهُمْ مِنْ نَاصِرِينَ )

واتە: ئەوان پیلانیان دانا و خواش داینا و خوا باشترینی ئەوانەیە کە پلان دادەڕێژن، ئەوکاتەی خوا فەرمووی ئەی عیسا من تۆ دەنوێنم و تۆ بەرز دەکەمەوە بۆ لای خۆم و تۆخاوێن ڕادەگرم لەوانەی کافر بوون و ئەوانەی شوێن تۆ کەوتن سەردەخەین بەسەر کافرەکاندا تا ڕۆژی دوایی وپاشان گەڕانەوەی هەمووتان بۆ لای خۆمەو حوکمی نێوانتان دەکەم لە ئەوەی ئێوە ڕاتان لەسەری جیاوازە.بەڵام ئەوانەی کەکافر بوون بەسزای سەخت سزایان دەدەم لە دونیاو ئاخیرەتدا و کەسیش بە هانایان نایەت.

ئەم ئایەتە پیرۆزانەش کە هەر لەسورەتی (ال عمران) دایە و باس باسی موحکەم و موتەشابیهە ولێرەشدا ئەم ئایەتە بواری تێدایە ووشەی (متوفیك) بکرێتە داردەست و بوترێت کە عیسا پێغەمبەر وەفاتی کردووە و ناگەڕێتەوە سەر زەوی چونکە ووشەکە دوو واتا هەڵدەگرێت:. (مردن یان خەوتن).

ئەم ئایەتە موتەشابیهە کۆمەڵێك خەڵکیتر بە خراپ کەڵکیان لێوەرگرتووە و سەریان لە خۆیان شێواندوەو دەڵێن عیسا ناگەڕێتەوە سەر زەوی و هاتون هەرچی دەقی فەرموودە هەیە لە بارەی هاتنەوەی عیسا پێغەمبەر بە جۆرێکیتر تەئویلی دەکەن یەکێك لەوانە خۆی لە خەڵکی دەکاتە مەسیحی چاوەڕوانکراوو خەڵکی بەوە لە خشتە دەبات و ئاژاوەی فیکری ساز دەکات.

ئەم جۆرە ڕووداوانە بەدرێژایی مێژوو لەشوێنە جیا جیاکاندا درێژەی هەیە و پاشان دەبنە کەفی دەریاو دەڕۆن ، ئەوەی دەمێنێتەوە ئەوانەن کە لەزانستدا بنجیان داکوتاوە و ئەوانەش شوێن زانا پلەدارەکان دەکەون و داوای بەرچاو

ڕوونیـان لێدەکـەن، بۆیـان ڕوون دەبێتـەوە کـە ووشـەی (متوفیـك) لەئایەتەکـەدا بـەواتای خەوانـدن دێـت ولەگـەڵ سـیاقی ئایەتـەکان و فـەرموودە سـەحیحەکاندا یەکدەگرنـەوەو موحکـەم دەبنەوە.پاشـان کـاتی هاتنـەوەی عیسـا پێغەمبـەریش وسەرکردایەتی کردنی موسڵمانان بۆ بەرپاکردنی دادوەری لەسەر زەویدا ئـەو کـات هەمووی شایەتی ڕاستێتی عەقیدەی موسڵمانان دەبن.

بوونی ئایەتە موتەشـابیهەکان لـە قورئانـدا پـڕە لـە کـارزانی خـوایی نـەك بـەو شێوەیەی کەوەرگێر دەڵێت: باسی ئەو ئایەتانەی کەکەس لێیان تێناگات باسـێکی نەشیاوە.

ئەوەمان ڕوون کردەوە کەئەو باسانە خەڵکانێکی خوا هەن لێیـان تێدەگـەن و ڕۆژگاریش ڕاستیان دەسەلمێنێت. بۆ ئەوەی وەرگێڕیش کەمێك لەحیکمەتی بوونی ئایەتەکانی موحکەم و موتوشابیھ شارەزا بێت دەڵێین:

١/ قورئان کەلامی خوایە و مـوعجیزە یـە پـڕە لـە باسـەکانی (ناسـاندنی خـوا، ناسـاندنی بوونـەوەر، میـژووی مرۆڤایـەتی، یاسـاکانی ژیـان لەسـەر زەوی، باسـی ویستی مرۆڤ و ویستی خاوەنی بونەوەر، مردن وهەواڵی پاش مـردن، زیندوبونـەوە و پاش زیندوبونەوەش، ڕێگەی ڕاست و هاوتەریب وگونجاو لەگەڵ هەموو بونـەوەر و ڕێگەی چەوت و دژەوانە لەگەڵ باقی دروستکراوەکان..)

کۆباسـی هـەر یـەکێك لـەو بابەتانـە پارچـە پارچـە کـراوە بەسـەر هـەموو سورەتەکانی قورئانداو هەر سورەتێك بەجیا لە سـورەتێکی تـر باسـێکی تۆکمـەی نەبچراوە و بەدەبر کردنی ئایەتەکانی ناو سورەتەکە جگـە لەسـەر سـام بـوون بـە دەربڕینە بێهاوتاکەی دەبینی ئەم قورئانە هەموو مرۆڤەکانی دەستەو سان کردووە لەوەی بتوانن وێنەی سورەتێکی قورئان دروست بکەن.

هـەر لـەناو ئـەم سـورەتانەدا ئایەتـەکانی (المحکمـات هـن ام الکتـاب و اخـر متشابهات) جـوانتر لـە مـرواری بێگـەرد لـەپاڵ یەکدا و بەویسـتی خـوا دانـراون و

باسەکە تەواو دەکەن، کەچی لە هەمان کاتدا هەر یەك لەو ئایەتانە بەجیا لە یەکتر بەجۆرێك لە پەیوەندی بەستراون بە ئایەتەکانی ناو سورەتەکانی ترەوە.

ئەوەی کەشایستەی ووزەی تێگەیشتنی تەواوە ئەو کەسەیە کە مەرامی دڵی چاك بێت و عەقڵی پاك بێت لەزانراوەی نادروست، بەڵام ئەوانەی بەمەرامی پیس و بە بڕیاری پێشوەختەوە دەستی بۆ دەبەن شایستەی ئەو بەهرەو خۆشیە نین و سەرەنجامیش هەر قورئان خۆی ئەو خاوەن دڵ و عەقڵە ژەنگاویانە بە هەڵەدا دەبات.

کەواتە: بوونی ئەو دوجۆرە لەئایەت بۆ دابەزینی پاداشت و سزای دونیاییە بۆ هەر دوو جۆرەکە لە خەڵکی و(الجزاء من جنس العمل) ئەمیان قورئانی ویست بۆ هیدایەت دەستی کەوت و ئەویشیان قورئانی ویست بۆ لادانی خەڵکی و ئاژاوەنانەوە کەچی خۆی ڕێی وونکرد و بەهەڵەدا چوو.(سوپاس و ستایش شایستەی خوای گەورەیە)

٢/ قورئان لەگەڵ ئەوەی خوێندنەوەکەی بۆ عیبادەتە هەروەهاش بۆ دیراسەکردن و دەرهێنانی یاساکانی ژیانە لەو ئایەتانەی کە بنەماو دەستورن، بوونی ئایەتەکانی(ايات المحكمات هن ام الكتاب واخر متشابهات) ئەو مەبەستەی پێکاوە کە قورئان وەڵامی بەرەو پێشچونەکان و گۆڕانکارییەکانی سەردەمە جیاجیاکان بداتەوە و ئایەتە موتەشابیهەکان کیشدارن و یاسای جۆراو جۆری جیاوازیان لێدەردەهێنرێت و لەبنەماو دەستورەکانیش لانادەن کە ئایاتی موحکەماتن. ئەم کارەش بە کەسانی خاوەن ژیری ساغ و خاوەن زانیاری بنجداکوتراوی دەوێت هەر وەك چۆن خوای گەورە لە ئایەتەکەدا ئاماژەی پێکردوە: هُوَ الَّذِي أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلَّا اللَّهُ وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الْأَلْبَابِ (٧)

٣/ کۆششکردن وبەکارهێنانی عەقڵ بۆ دەرخستنی ڕاستیەکان ونهێنیەکان " لە پێویستیەکانی ژیانی سەرزەوییە، تام و چێژی تایبەتی خۆی هەیە لای کەسانی ڕۆشنفکر وداهێنەرەکانی ناو بەشەرییەت، جگە لەمانەش کۆششکردن بۆمەبەستی خێری ژیانی سەرزەمین هۆکارو کلیلە بۆ گەیشتن بە ڕاستە ڕیگاکانی ڕەزامەندی خوای خاوەن بونەوەر. وەك خۆی دەفەرموویێت: (وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا وَإِنَّ اللَّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ (٦٩)

واتە: ئەو کەسانەش کە لەپێناو ئێمەدا خۆیانیانماندو کردووە بێگومان ڕێنوینیان دەکەین بۆ ڕاستە ڕێگاکانی خۆمان و خواش هەروا لەگەڵ چاکەکاراندایە.

ئەم خۆماندوکردن وکۆششە، ئەم بەکارخستنی ژیرییە، ئەم ئازادکردنەی مرۆڤ و دەستکردنەوەی بۆلێکۆلینەوەی زانستیانەی ئایەتەموتەشابیهەکان لەژێر سایەی ئایەتە موحکەمەکاندا " نیشانەی ئەوڕێزەیە کەخوا بەو گەورەییەی خۆی لە مرۆڤی گرتووە و بەڕاستگێڕانی فەرمودەی خوایە کە فەرموویەتی: - (ولقد کرمنا بنی ادم ).

کەواتە: بوونی ئایەتەکانی موتەشابیە " لەم گۆشە نیگایەشەوە" ڕێزگرتنە لە ژیری مرۆڤ و نرخاندنی کۆششی زانایانە.

ئەمانە و سەلماندنەکەی پێشوو هەندێك لە حیکمەتەکانی بوونی (واخر متشابهات) دەردەخات " ڕێز، ئازادی، نرخاندنی کۆششی زانایان، نوێبوونەوە، لەسایەی پڕبەرەکەتی ئایەتەکانی خوادا دەستدەکەوێت،(خوا خاوەنی فەزڵی زۆرە و زۆریش بەخشندەیە).

## قورئان دەمی کەسی نەبەستوە

وەرگێڕلە خاڵی دووەمی پێشەکییەکەیدا باس لەوە دەکات (کە هەر یەکێك لە ئێمە هەر لە منالیەوە بەر لەوەی بچێتە خوێندنگاو دوای چونە خوێندنگەش و لە

ژینگــەی کۆمەڵایــەتی و دەوروبــەرەوەو لــە ئــەنجامی بەرکــەوتن بەشــێوازە جیاوازەکانی بەریەککەوتن لەگەڵکۆمەڵگادا گوێی لە چەندین (بکەو مەکەو دەبــێ و نابێ) بووە، پاشان گـوێی لـە چـەندین قسـە و باسـی بەساڵاچـووەکان بـووە کـە هەندێ پرسیاری لەلا دروستکردووە) پاشان باس لەوە دەکات کە ئەم پرسـیارانە بەهۆی وەسیلەکانی ڕاگەیانـدن و پـەروەردەو فێرکردنـەوە زیـاتر ئـەو پرسـیارانە دەوروژێن و پاش ئەمانە گلەیی لەوە دەکات کە لەبەر هەندێ هـۆ نـەتوانراوە ئـەو پرسیارانە ئاراستە بکرێت و ئەو گلەییەیشی هەیە کەئەو پرسیارانە ئەگەر تـاکێکی کورد بیکات بەهەند وەرناگیررێت وەك پارەی قەڵبەو ناچێت.

کاتێك وەرگێڕ باس لە پرسیارەکان دەکات تەنها یەك نمونەش لـەو پرسـیارانە ناخاتە پێشچاوی خوێنەر تابڵێین وایـە یـان وانییـە، چـونکە ئێمـەش وەك وەرگێـڕ مناڵی ئـەم کوردسـتانە بـوین ووەك ئـەو گـەڕاوین و تێکـەڵی خـەڵکیمان کـردووە و هەموو جۆرە پرسیارێکمان لەلا دوست بووە و کردوومانە، ئیتر یـان وەڵامـی دڵنیـا کەرەوەمان دەست کەوتووە یان خۆمان بەدوای ولامدا گەڕاوین یان زەمەن و ژیان گەیاندوینی بە وەڵامی ڕاست.

نەبووە پێمان وترا بێت پرسیاری ئاوا قەدەغەیە، تەنانەت ئەگەر پرسیارەکەش دەربـارەی خـودی خـاوەنی ئاسمانـەکان و زەویـش بوبێـت، قورئـانی پیرۆزیـش چەندەها نمونـەی پرسـیاری تێدایـە، و بـەڵکو بـۆ سـەلماندی بیرۆکـەکان شـێوازی پرسیار کردن بەکاردەهێنی تا ژیری خەڵکی ببزوێنێ و بەئامانجیان بگەیەنێت، بـۆ نمونە لە سورەتی(واقعە) دا دەفەرموێت:

أَفَرَأَيْتُمْ مَا تُمْنُونَ (٥٨) أَأَنْتُمْ تَخْلُقُونَهُ أَمْ نَحْنُ الْخَالِقُونَ (٥٩) نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ الْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ (٦٠) عَلَى أَنْ نُبَدِّلَ أَمْثَالَكُمْ وَنُنْشِئَكُمْ فِي مَا لَا تَعْلَمُونَ (٦١) وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ النَّشْأَةَ الْأُولَى فَلَوْلَا تَذَكَّرُونَ (٦٢) أَفَرَأَيْتُمْ مَا تَحْرُثُونَ (٦٣) أَأَنْتُمْ تَزْرَعُونَهُ أَمْ نَحْنُ الزَّارِعُونَ (٦٤) لَوْ نَشَاءُ لَجَعَلْنَاهُ حُطَامًا فَظَلْتُمْ تَفَكَّهُونَ (٦٥) إِنَّا لَمُغْرَمُونَ (٦٦) بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ (٦٧) أَفَرَأَيْتُمُ الْمَاءَ الَّذِي تَشْرَبُونَ (٦٨) أَأَنْتُمْ

أَنْزَلْتُمُوهُ مِنَ الْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ الْمُنْزِلُونَ (٦٩) لَوْ نَشَاءُ جَعَلْنَاهُ أُجَاجًا فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ (٧٠) أَفَرَأَيْتُمُ النَّارَ الَّتِي تُورُونَ (٧١) أَأَنْتُمْ أَنْشَأْتُمْ شَجَرَتَهَا أَمْ نَحْنُ الْمُنْشِئُونَ(٧٢)

**واتە:** ـ ئایا بینیوتانە ئەو ئاوەی لە ئێوە دێت (مەبەست پێی مەنی یە، ئەو ئاوەی کەمناڵی لێدروست دەبێت) * ئایا ئێوە مەنی خەلق دەکەن یان خوا * ئێمە لە نێوان ئێوەدا مردنمان دارشتوە و کەس پێش لەبڕیارمان ناگرێت * لەوەی ئەگەر وێنەتان بگۆڕین و لەوەی کە نایزانن دروستتان کەینەوە * ئێوە زانیتان دروست کردنی یەکەمجار چۆن بوو ئەگەر بەیادی بگرنەوە * ئایا بینیتان ئەوەی دەیچێنن * ئایا ئێوە بەرهەرم داری دەکەن یان ئێمە * ئەگەر بمانەوێت بە پوش وپەلاشمان دەکرد وئێوەش واقتان ووڕدەما * دەتان ووت ئێمە زیانمەن بووین * بەڵکو رەنج بەبادە بووین *ئایا ئەو ئاوەتان بینیوە کە دەیخۆنەوە ئایا ئێوە لە هەورەکان داتانبەزاندوە یان ئێمە باراندومانە* ئەگەر بمانەوێت دەمانکردە تاڵوتفت دەیسا بۆ سوپاسگوزارنابن * ئایا بینیتان ئەو ئاگرەی ئێوە دایدەگیرسێنن * ئایا ئێوە درەختەکەیتان دروست کردووە یان ئێمە دروستمان کردووە*

ئەم ئایەتانە بەچەند پرسیارێك " کۆمەڵێك پرسیاری تر و دەریایەك لە ئەندیشەو وەڵام و دەرئەنجام لای خەڵکی دروست دەکات" (خەلقی مرۆڤێکی خاوەن ئیرادەو زانست وبەتوانای جیاوازەوە لە تنۆکە ئاوێك (مەنی) کە هیچ بەهایەکی نیە تاخوا لە ناو رەحەمی دایکدا جێگیری نەکات وپلە بەپلە گەشەی پێنەدات و هۆکارەکانی گەشەکردنی بۆ فەراهەم نەهێنێ و نەیهێنێتەبوون، ئەمانە گرنگن بەڵام ئەوەی زیاتر لەمەش گرنگە خەلقی تنۆکە ئاوەکانە کە هەموو مواسەفاتەکانی ئەو مرۆڤە سەیرەی هەڵگرتووە کەبەڕاستی خەلقی مرۆڤ و بەدیهێنانی بۆخۆی موعجیزەیەکی گەورەیە. کێ توانای خەلق کردنی تۆوی مرۆڤی (مەنی) هەیە؟ وەڵامەکەی تەنها (الله)یە.

ڕزگار نەبوونی هیچ کەسێك لە مەرگ کەخوا بڕیاری داوە نیشانەی چیە؟ ئایا دوای دروست بوون و مردن، گەڕانەوە و زیندو بوونەوە بۆ نابێت؟ ئەو (الله)یەی تونای دروستکردنی یەکەمی هەبێت وکەسیش نەتوانێت لەبڕیاری مەرگ ڕزگاری بێت ئایا زیندو کردنەوە وسزا وپاداشتیش لەوە ئاسانترنیە؟

تۆوێك کەمرۆڤ دەیچێنێت ئیترئەو تۆوە چۆن دروست بوو یان چۆن لە زەوی و ئاوو خۆر خۆراکی وەرگرت و گەشەی کرد هەمووی کێ کردی؟ تەنها الله

خوا ئەگەر ویستی وابێت هەرچی ئەچێنرێت ببێتە پوش و پەڵاش و مرۆڤ نەتوانێت سودی لێوەرگرێت چی دەبێت؟، ئەوکات مرۆڤ جگە لە حەسرەت و هات و هاوار چی بۆ دەکرێت؟

ئاوی خواردنەوە کە ڕۆژانە مرۆڤ دەیخواتەوە و ژیانی دونیای لەسەر بەندە کێ لە هەورەکان باراندی؟ تەنها (الله)

ئەگەر خوا بیەوێت بیگۆڕێت بەسوێرو تاڵ ژیان چی بەسەردێت؟ بۆ بەو نازو نیعمەتە بە ئەمەکنین وسوپاسی خوا ناکەن؟

ئاگر کەئەویش سەرچاوەی هەموو ژیارەکانی سەرزەوییە و هەموو داهێنانەکانی مرۆڤ بە شێوەیەك لە شێوەکان پشت بە گەرماو ئاگر دەبەستێت. کێ درەخت و سوتەمەنیەکانی دروست کرد؟ تەنها (الله)

خوای گەورە لە ڕێگەی پرسیار کردنەوە عەقڵی مرۆڤ دەدوێنێ کە ئایا دروست کردنی مەنی، ئاوی ساز بارین بەسەر ووشکانیدا، سەوزایی و ڕوەك بۆ بژێوی، ئاگر بۆ گەرمی و داهێنانەکان، ئەمانە خۆیان خۆیانیان دروستکرد بۆ سوودی ژیانی مرۆڤ لەسەر زەوی یان دەستی بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی ئەمانە دەکات و مەبەستیان لەپشتەوەیە، هەروا لە بەتاڵ نیە، بونی مەرگی مسەوگەریش بۆ هەر یەکێك، بەڵگەیە لەسەر گەڕانەوە بۆ لای ئەو خاوەنەی کە ئەگەر ویستی نە باران دەبارێت، نەڕووەك و سەوزایش دەبێت، نەسوتەمەنیش دەمێنێت، نە تۆوی مرۆڤیش (مەنی) خەلق دەبێت، ئەو ڕۆژەش کە بڕیاری

گەڕانەوەی گشتی دەدات هەموو ئەمانە لە ژیانی دونیادا کۆتایی پێدەهێنێ و ژیانێکی تر بڕیار دەدات کە بەرهەمی ئەم ژیانە کاتییەی تێدا وەردەگیرێت. ڕاستی ئەمانەش لە بەڕاستگێڕانی هەموو ئایەتەکانی قورئانە لە لایەن کتێبە بینراوو کراوەکەوەیە (بونەوەر).

ئەمانەو چەندەها پرسیاریتر کە لە قورئاندا هاتوە و لە سوننەتی پێغەمبەیشدا (صلی الله علیه واله وسلم) ئەتوانم بڵێم زۆربەی گەیاندنی تەعالیمی دینی لە ڕێگەی وەڵامی پرسیارەکانی پێغەمبەرەوە بووە و نەبووە پێغەمبەر (صلی الله علیه واله وسلم) بەرگری کردبێت لەوەڵامدانەوەی پرسیارێك هەرچەندە ئەو پرسیارەش لەڕووی ئایینیەوە سەیر بوبێت. بەڵام ئەگەر وەرگێر لەگەڵ خەڵکانێکدا ژیابێت تواناى پرسیار کردنی نەبوبێت و ڕێگەی نەدرابێت ئەوا تا منالْ بووە ئۆباڵی بەسەر ئەوانەبوە کە بواری فێربونیان لە دینەکەی بۆنەڕەخساندووە و ئێستەش کە پێگەیشتوە خۆی بەرپرسە لە فیکری خۆی و باش نیە بڕیاری پێشوەخت و بەپێی ئەو باکگراوندە نەسازە بدات بەسەر دیندا وچاولێکاری و هاوەڵی نادڵسۆزیش کاریگەری نەرێنیان لەم بارەدا دەبێت.

**٣ـ.................**

لە خاڵی سێیەمی پێشەکییەکەیدا وەرگێر سێ و چوار باس تێکەڵ دەکات، لەسەرەتادا گلەیی لە ئاینگەراکان دەکات کە گوتاری دژەوانەی پرسیارەکان لای ئەوان ئەوەیە کە خەڵکی دەرەوەی کایەی ئاین نابێت قسە لەسەر ئاین بکات، ئیجا دەڵێت: ـ پیاو سالارانی ئاین لە ڕێی تاوانبارکردنی پرسیارکەر بە گاڵتەکردن بە قورئان و لەڕێی تاوانبارکردنی پرسیارکەر بەنەزانی دەرگا بە ڕوی ڕەخنەو شیکردنەوەدا دادەخەن و ڕەخنە سەرکوت دەکەن و دەیانەوێت لێکدانەوەو شیکردنەوە تەنها لەکایەی پیاوسالارانی ئایندا بسوڕێتەوە.لێرەدا ئایەتێك و فەرموودەیەك دەکاتە بەڵگەی دروستی گلەییەکەی.

پاش ئەمەش دەست دەکاتە خستنە ڕوی ڕەخنەکانی و لەدوای واتاکردنی ئایەتی (والذین اتیناهم الکتاب یفرحون بماانزل الیك..) دەڵێت: ئایا چۆن یەهودییەکان دڵخۆش بوون بە پەراوێك کە ئەو هەموو هەڕەشەیەی تیادابێت و باس لەکوشت و بڕی ئەوانە بکات کەباوەڕ بە ئاینەکەی موحەمەد ناهێنن یان ئایا ئەگەر یەهود باوەڕیان بەهەندێك لەتەورات نەکردبێ ئیتر چۆن بە دابەزاندنی قورئان بۆ موحەمەد دڵخۆش بوون؟

دەڵێت: ئەگەر پرسیار بکەیت و بڵێیت ئایا لەبەرچی هێندە ناوی محمد بە ناوی خواوە لکێنراوە کە لە وشەیەکی لێکدراو دەچێت..یان ئەگەر کەسێك بڵێت هەندێکی زۆر لەوەی لە قورئاندا هەیە ناکرێت بڕوا بەڕاستیان بکرێت، ئەوسا ئاینمەندان لە سۆنگەی گوتاری قورئانیەوە دەڵێن: (ئەوانەی بێباوەڕن بەخواو نێردراوەکەی دەیانەوێت خواو نێردراوەکەی لەیەك جیابکەنەوە، دەڵێن بڕوا بەهەندێکی دەکەین و بە هەندێکی تریشی بێباوەڕین ئەوانە دەیانەوێت لەو نێوانەدا ڕێگایەك بدۆزنەوە (ان الذین یکفرون باللّٰە ورسلە ویریدون ان یُفرقوا بین اللّٰە و رسلە..)

ڕەخنەی کۆتایی ئەم خاڵەی ئەوەیە کەبۆچی خوا خۆی قورئانی دابەشکردووە بۆ دوبەش موحکەم و موتوشابیە کەچی هەڕەشە ولێپرسینەوە دەکات لەکەسانێ کەقورئانیان دابەشکردووە بۆ دووبەش و باوەڕبە بەشێکی ناکەن.

ئەوەی زیاتریش شایەنی باسە لە سۆنگەی پەیڤینی لەوەو بەری خۆیەوە گوزارشت لەوە دەکات کە یەکێك لە سیفەتەکانی قورئان کشان و هاتنەوە یەك وحەددی نەبوونی شرۆڤە و مانای ووشەو زاراوەکانێتی یان حەددی بونە لەهەمانکاتدا، ڕەخنەی وەرگێڕ لێرەدا ئەوەیە کە لەو شوێنانەدا ئەو پێویستی پێیەتی حەددی بێت قورئان حەددی نییە و لەو مەسەلانەشدا کە چاکوایە نا حەدی بن کەچی ئایەتەکان حەددی دەبن.

## پسپۆڕ و تایبەتمەند، فەهمی قورئان ئەکات

وەڵام: پرسیار ئەگەر بۆ گەیشتن بە وەڵام و زیـادکردنی تێگەیشـتن بێـت هـیچ خاوەن ژیرییەك نكولی لێناكات، لەهەمانكاتدا قسەكردن و دەمكوتین لە بابەتێك كە پسپۆڕو شارەزا نەبیت تیایدا نامەعقولە، بۆ نمونە بچیتە لای پزیشـك و دەربـارەی نەخۆشـــینەكان و نیشـــانەكانی و خۆپاراســـتن و چارەســـەر هەرچـــی بپرســـیت بۆسەلامەتی خۆت و دەوروبەرت كـەس ناڵێت خراپـت كـردووە، مەگـەر خراپـەكار وابلێ، بەڵام بەبێ بڕوانامەی پزیشكی و بەبێ ئەزموون و زانیاری چڕوپڕی پزیشكی بێیت و ڕەخنە بگریت لـە تـاڵیی دەرمـان و پـارێزی قـورس و وەرزشـی ماندوكـەر، بەڕاستی ئەمە جگە لە خراپەكاری و خۆكوژی هیچیتر نییە.

كاتێك خوا دەفەرمووێت (وَإِذَا عَلِمَ مِنْ آيَاتِنَا شَيْئًا اتَّخَذَهَا هُزُوًا أُولَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُهِينٌ (٩) مِنْ وَرَائِهِمْ جَهَنَّمُ وَلَا يُغْنِي عَنْهُمْ مَا كَسَبُوا شَيْئًا وَلَا مَا اتَّخَذُوا مِنْ دُونِ اللَّهِ أَوْلِيَاءَ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ (١٠)الجاثية

واتە: كاتێك ئەو كەمێك لە ئایەتەكانمان دەزانێت دەیكاتە گاڵتـە ئەوانـە سـزای ڕیسواكەریان بۆ هەیـە، دوایشـیان جەهەنەمـە و ئـەوەی بەدەسـتیان هێنـاوە هـیچ بەهانایان نایەت هەروەها ئەوەیش كە بێجگە لەخوا دەیپەرستن، وبۆ ئەوان سـزای گەورە هەیە.

ئەوانەی كەكەمێك تروسكایی دەربارەی ئاین دەكەوێتـە بیریـان ئـیتر بیانـەوێت وەك پسـپۆڕێكی زانسـتە ئیسـلامیەكان دەربـارەی ئسـلام قسـەبكەن، دەی دیـارە كەهەرچی بڵێن هەڵەیـە، بەتایبـەت ئەگـەر ئـەو تـۆزە زانینەیشـی بـەنیازی لادانـی خـەڵك وەریگرتبێـت، حـاڵی پڕاوپـڕوەك حـاڵی نەخوێنـدەوارێك وایـە بـە دەرزی و تەداوی و دەرمانی تاڵ و پارێزكردن گاڵتە بكات و پێیشی ناخۆش بێت پێی بڵێیت كاكە گیان ئەوەكاری تۆ نییە و تۆ لـە بـواری كارامـەیی خۆتـدا خـۆت بنوێنـە یـان وەرە لە سەرچاوەی سازگاری پڕلە زانستی ئیسلامدا پسپۆڕی پەیدا بكـە ئـەوكات بەهەڵەدا ناچیت و سزای ڕیسواكەر و جەهەنەمیش نابێتە بەشت و ڕەنج بـەبادەش نابیت.

فـەرموودەی (من كان يؤمن بالله واليوم الاخر فليقل خيرا او ليصمت) یـش کـە لەگەڵ ئایەتەکەی پێشودا وەرگێڕ کردبویە بەڵگە لـە سـەر قسـەکانی، بـەڵام ئـەم فەرمودەیە خاڵێك و قۆناغێکە بـۆ پـەروەردەی تاکـەکانی نـاو دائـیرە ئیسـلامیەکە نەك بۆ کەسانی دەرەرەوەی ئیسلام و نەك بۆ ئەوانەی بێڵ و پاچـیان هـەڵگرتووە و دەمیان پڕله فوو کردوە بۆ داڕوخان و کوژاندنەوەی سەرچاوەی نوری خواییی.

فەرمانەکە بـۆ ئیمانداارانـە، بـۆ کەسـانێکە کـە لـەناو دائـیرەی ئیسـلامدا چـەند پلەیەکی پەروەردەیی بڕیوە، لە پاککردنەوەی عەقڵ و دڵ و پاککردنەوەی لەش و پۆشـاك و پاککردنـەوەی دەسـت و زمـانیش بەچـەندەها ئایـەتی وەك ئایەتـەکانی سورەتی (الحجـرات) (إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ (١٠) يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِنْ قَوْمٍ عَسَى أَنْ يَكُونُوا خَيْرًا مِنْهُمْ وَلَا نِسَاءٌ مِنْ نِسَاءٍ عَسَى أَنْ يَكُنَّ خَيْرًا مِنْهُنَّ وَلَا تَلْمِزُوا أَنْفُسَكُمْ وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ بِئْسَ الِاسْمُ الْفُسُوقُ بَعْدَ الْإِيمَانِ وَمَنْ لَمْ يَتُبْ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ (١١)

واتە: بەڕاستی هەموو ئیمانـداران بـرای یـەکترن نێـوان برایـەتیتان سـازو چـاك بکەن و لەخوا بترسن بـەڵکو بـەر بـەزەیی خوابکـەون * ئـەی کەسـانێك باوەڕتـان هێناوە هەندێکتان گاڵتە بەهەندێکتان مەکەن لەوانەیە چاکتربن لـەوان ژنـانیش بـە ژنانی تر لەوانەیەگاڵتە پێکراوەکان چاکتربن ڕوشکێنی بەکتر مەکـەن وناونـاتۆرەی ناشیرین لەیەك مەنێن خراپترین ناو لادانـە لـەدوای ئیمـان و هەرکەسـێك پەشـیمان نەبێت لەو کارانە ئەوانە خۆیان ستەمکارن.

کەواتە ئەوە ئیمانداره کە ئەبێت زمانی پاك بێت " یان خێر بڵێت بۆ مەبەسـتی چاکسازی کردن و بڵاوکردنەوەی خۆشەویستی یان بێدەنگ بێـت. بـەڵام ئەوانـەی لەدەرەوەی کایەی ئیسلامن ئارەزوی خۆیانە چی ئەڵێن و چـۆن ئـەڵێن و تەنانـەت ئەگەر ئارەزویشیانە باکافریشبن (وَقُلِ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكُمْ فَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُرْ إِنَّا أَعْتَدْنَا لِلظَّالِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا وَإِنْ يَسْتَغِيثُوا يُغَاثُوا بِمَاءٍ كَالْمُهْلِ يَشْوِي الْوُجُوهَ بِئْسَ الشَّرَابُ وَسَاءَتْ مُرْتَفَقًا)٢٩

واتە: پێیشیان بلێ هەموو هەقێك لای خاوەنی ئێوەوەیە هەرکەسێك ئەیەوێت با ئیمان بێنێت و هەرکەسیش دەیەوێت باکافر بێت، ئێمە ئامادەمان کردوە بۆ کافرەکان ئاگرێك کە چواردەوری داون ئەگەر هاواری ئاویش بکەن ئاوێکیان بۆ دێت وەك زەیتی قرچاو دەموچاو دەبرژێنێت پیسترین خواردنەوەیە و خراپترین هەوارگەیە.

## خاوەن کتێبەکان بە قورئان دڵخۆشن

ڕەخنەی یەکەمی وەرگێڕ لەدوای گللەییەکانی ئەوەیە کەچۆن یەهود دڵخۆشدەبێت بەدابەزاندنی قورئان کەقورئان ئەو هەموو هەڕەشەیەی تێدایە بۆ ئەوان و باس لە کوشت و بڕی ئەوان دەکات ڕەخنەکیشی لە ئایەتی ٣٦ ی سورەتی (الرعد) وە رگرتووە.

نازانم وەرگێر هیچ تەفسیرێکی دەربارەی ئەم ئایەتە پیرۆزە خوێندۆتەوە یان ئایا گوێی بۆ هیچ ماموستایەکی شارەزا گرتوە کە ئەو ئایەتەی بۆ تەفسیر بکات، چونکە لەکاتی کولبوونی بیر بۆ تێگەیشتن لە قورئان، پێویست بە دەبرکردن و پەیداکردنی زانستی فراوان هەیە یان پێویست بە پرسیارکردن لەزاناکان دەکات تا ئیشکالەکەت بۆ حەل دەبێت (فاسئلوا اهل الذکر ان کنتم لاتعلمون).

ئەم ئایەتە کەلای وەرگێڕ بوەتە پرسیار ئەوەیە " ناچێتە عەقڵیەوە کە قورئان بۆ محمد دابەزیوە و هەڕەشەی تێدایە بۆ یەهود چۆن دەبێت یەهودییەکان دڵیان پێیخۆش بێت؟.

وەڵام: وَالَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَفْرَحُونَ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمِنَ الْأَحْزَابِ مَنْ يُنْكِرُ بَعْضَهُ قُلْ إِنَّمَا أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ اللَّهَ وَلَا أُشْرِكَ بِهِ إِلَيْهِ أَدْعُو وَإِلَيْهِ مَآبِ (٣٦) واتە: ئەو کەسانەی ئێمە کتێبمان پێداون، بەوەی کە بۆتۆ دابەزیوە دڵخۆشن هەندێکیان هەن کە باوەڕ بە بازێکی ناکەن، بڵێ فەرمانم پێدراوە کە تەنها الله بپەرستم کەس نەکەم بە شەریکی، تەنها لەو ئەپاڕێمەوە و بۆلای ئەویش دەگەڕێمەوە. ئەم ئایەتە پیرۆزەی سورەتی (الرعد) هەر لەناو قورئاندا لە چەند شوێنی تردا بە ئایەتیتر ڕاڤە کراوە و

مەبەستی وشەی (یفرحون) ی ڕوونکردۆتەوە، وەك ئەم دوو ئایەتەی کە لە سورەتی (البقره) وسورەتی (الاسراء) دا هاتووە: (الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَتْلُونَهُ حَقَّ تِلاوَتِهِ أُولَئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِ وَمَنْ يَكْفُرْ بِهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ) [البقرة: ١٢١] وقال تعالى: ( قُلْ آمِنُوا بِهِ أَوْ لا تُؤْمِنُوا إِنَّ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ مِنْ قَبْلِهِ إِذَا يُتْلَى عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلأَذْقَانِ سُجَّدًا وَيَقُولُونَ سُبْحَانَ رَبِّنَا إِنْ كَانَ وَعْدُ رَبِّنَا لَمَفْعُولا) الإسراء: ١٠٧، ١٠٨

ئایەتەکەی سورەتی بەقەرە دەفەرموێت: ئەوانەی کە کتێبەکەمان پێدان بە هەق دەیخوێننەوە ئەوانەن کە باوەڕی پێدەهێنن هەرکەسێکیش پێی کافر بێت ئەوە خۆیان زەرەر دەکەن . ئایەتەکەی سورەتی ئیسرائیش دەفەرموێت: بڵێ باوەڕ بێنن یان نەیهێنن ئەوانەی کە پێش ئەم عیلمیان پێدراوە کاتێك ئایەتی خوایان بۆ بخوێنرێت بۆ کڕنوشبردن بەڕوا دەکەون و دەڵێن بەڵێنی خاوەنەکەمان هەر دەبێت بەدیبێت.

کەواتە: ئایەتەکەی سورەتی ڕەعد کەباس لە خۆشحاڵی خاوەنی کتێبەکەی پێش ئیسلام دەکات باس لەوانەیان دەکات کە بەهەق و بەعیلمەوە کتێبەکەی خۆیانیان خوێندوە بۆیە بە دابەزینی قورئانیش دڵخۆشن و دەزانن دابەزینی قورئان و هاتنی موحەمەدیش بە دیهێنانی ئەو بە ڵێنەیە کە خوا لە تەوراتدا دابوی، بۆیە باوەڕی پێدەهێنن وپێی دڵخۆشدەبن. بەڵام ئەوانەی ڕێچکەکانی تریان گرتبو واتە کاتێکیش لە سەر تەورات بوون بەهەق پێڕەویان لێنەکردووە، ئەوانە قورئانیشیان بەشدەکرد و دانیان بە هەندێکیدا دەنا و هەندێکیشیان ڕەد دەکردەوە.

هەڕەشەی قورئانیش لە یەهودییەکان لە یەهودی بونیان نییە،بەڵکو لە گێرەشێوێنی و پیلانگێڕی وبەڵێنشکێنی بەردەوامی یەهودییەکانە، وسەیری هەموو قورئانیش بکە بزانە وایە یان نا؟

.

## بۆ ئەوەندە ناوی موحەمەد لەگەڵ ناوی خوا هاتوە؟

ڕەخنەو پرسیارێکی تری وەرگێڕ ئەوەیە بۆ ئەوەندە ناوی محمد لەگەڵ ناوی خوادا باسکراوە کەهەندێجار لە ناوی لێکدراو دەچێت؟

یان دەڵێت هەندێکی زۆر لە قورئان ناکرێت بڕوا بە ڕاستیان بکرێت. دەڵێت ئەگەر ئەم پرسیارانە بکرێت وەڵامەکەیمان بە ئایەتی ١٥٠ ی سورەتی نساء دەدەنەوە (إِنَّ الَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ وَيُرِيدُونَ أَنْ يُفَرِّقُوا بَيْنَ اللَّهِ وَرُسُلِهِ وَيَقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَنْ يَتَّخِذُوا بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلًا)

وەڵام: سەبارەت بەوەی بۆچی ناوی محمد پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) ئەوەندە لەگەڵ ناوی خوادا هاتووە؟ دەڵێین: خوای گەورە خۆی فەرمویەتی (وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ) ئەی موحەمەد ناوبانگی تۆمان بەرزکردەوە. ئەم ئایەتەش بڕیاری خوایە بۆ ئەوانەی کە ئەیانەوێت باوەڕ پارچە پارچەکەن و بەئارەزوی خۆیان لەنێوان باوەڕبون بەخواو باوەڕبوون بەراستیتی پەیامهێنەرەکانیدا جیاوازی بکەن، باوەڕ بەتەنهایی خوا ئەکەن لەبەر ئەوەی کەناچارن و خوا واجبی وجودە بەڵام گومان دروستئەکەن لەسەر نێردراوەکانی و ئەو پەیامەی کەهێناویانە، خوای گەورە دەریچەو ڕێگای دینداری بۆ ئەوانە دانانێت و ئەو باوەڕیان لێقبوڵ ناکات، هاتنە ناو بازنەی ئاینی ئیسلام بۆ کەسانی خاوەن بڕوانامەی (لااله الا الله و محمد رسول الله) یە.

دەبی هەربەو شێوەیەش بێت چونکە لەوانەیە مرۆڤ بە سروشت و ژیری و تێڕامان بگاتە ناسینی خوا بەهەندێ لە ناوو سیفاتەکانی بەڵام ئەمەی کە ئەو خوایە بەچ جۆر لەکردەوەیەك ڕازییە و بەچی ڕازی نییە، چی بۆ مرۆڤ داناوە دوای لەدونیا دەرچون، تۆڵەو پاداشتی چۆنە، چۆن و بۆچی مرۆڤی بەدیهێنا؟ مرۆڤ و دروستکراوەکانیتری نەبینراو بینراو سنوری کارو دەسەڵاتیان چەندە؟. ئەمانە و چەندەها زانیاری پێویست لەڕێگەی نێردراوەکانی خواوە نەبێت مرۆڤ بەدروستی پێیانناگات. کەواتە هاتنی پێغەمبەران و باوەڕکردن بەراستی پەیامەکەیان لە

ڕوکنــی بــاوەڕی ڕاســتەقینەیە و هەرکــەس بیــەوێت باوەڕداربێــت و بــاوەڕی بــە پێغەمبەر گومانی تێدابێت ئەوا ناتوانیت باوەڕیشی بەخوا ڕاست بێت " بۆیـە نـاوو یادی پێغەمبەر دوای یادو ناوی خوای گەورە دێت . بەڵام موحەمەد پێغەمبەر وەك مرۆڤێك ئەوا حسابێکی تری هەیە کە خوا و پێغەمبەر ئەوەیشیان ڕوونکردۆتەوە " وەك دەفەرموویێت: قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَمَنْ كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا (١١٠) واتــە: ئـەی محمد بڵێ من بەشەرێکم وەك ئێوە وەحـی خـواییم بـۆ دێت کـە خواوەنـدی ئێـوە تەنهایەو هەرکەسێك دەیەوێت بە لیقای شاد بێت با کارێك بکـات چـاککاری بێـت و بە پەرستنی خوا شەریك پەیدا نەکات.

وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِنْ مَاتَ أَوْ قُتِلَ انْقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ وَمَنْ يَنْقَلِبْ عَلَى عَقِبَيْهِ فَلَنْ يَضُرَّ اللَّهَ شَيْئًا وَسَيَجْزِي اللَّهُ الشَّاكِرِينَ

موحەمەد تەنها نێردراوێکە پێش ئەویش پێغەمبەرانی زۆر هـەبوون ئایـا ئەگـەر بمرێ یان بکوژرێ پاشگەز دەبنەوە؟ هەرکەس وابکات ئـەوا هـیچ زیانێـك بـە خـوا ناگەیەنێت و خوا پاداشتی شوکرانەکاران دەداتەوە.

پێغەمبەران بەندەی گوێڕایەڵ و پاکیزە وگەیەنەری فەرمانەکانی خـواین، خـوا وەك مامۆستا و فێرکارو پێشەنگ دانـاون و ڕێـزی ئـەوانی لەسـەر بەنـدەکانی تـر فەرزکردووە. جگـە لەمـە نێـوان ئـەوان و خـوا نێـوانی دروسـتکراوو دروسـتکارە و نێوان پەرستراوو بەندەیە و نێوان خاوەن فەزڵ و فەزڵ پێدراوە.

بێینە سەر ئەوەی لە قورئاندا هاتووە کە وەرگێڕ بـە زۆری دەزانێـت بـاوەڕ بـە هەمووی بکرێت، دەڵێم: واقیع وا ناڵێت چەندەها شتی تر هەیە کەلای خواوەش نە هــاتووە زۆر شتیشــی باوەڕکــەردەنی نییــە کەچــی کاتێــك بــە ئــەزموون بۆمــان ڕوونبویەوە کە هەرچی لەو زانستە تائێستە پێمان ووتـراوە هـەمووی ڕاسـت بـووە ئیتر بۆ باقی زانستەکە خۆمان تەسلیم دەکەین و چەن و چوونی تێدا ناکەین.

وەك: ئەو پێشكەوتنە پزیشكی و پێشكەوتنی تەكنەلۆژی و.......كەڕوویانداوە و بەهەمیشەیی و بەخێراییەكی بێوێنە بەرەو پێشدەچێت " هۆكارەكانی پەیوەندی كردن هەر لە سیمدار و هۆكاری ساكارەوە تا دەگاتە ئەم تۆڕی جاڵجاڵۆكەیییە هیچ دورنیە زۆر لەوە زیاتریش ئالییەتی پەیوەندی كردن و ئاسانكاریەكان دروست بن. ئەی ئەگەر پێش ئەم هەموو هۆكارەش باسبكرایە كە خەڵكی دەتوانێت لەیەك كاتدا پەیوەندی بكات بە چەند وڵاتێكەوەو بە دەنگ و ڕەنگ لەیەكبگەن چی دەووترا؟ كەچی ئێمە ئێستە چونكە ئەم زانستە پێشكەوتوەمان دیوەو بەكاریدەهێنین هیچ بەلامانەوە سەیر نیە ئەگەر هەواڵی دروست بوونی هەر شتێكی ترمان پێبدرێ.

قورئانیش دەبێت لەو شتانەی كەسەلماوە باوەڕیەوەی تری بكرێت كە لە سەروی ژیری هەندێك لەمرۆڤەكانەو هەندێك ناتوانن تەصەوری بكەن.

وەرگێڕ لێرەدا نەیووتوە ئەوانە چین كە ناتوانێت باوەڕی پێبكات تا ئێمەش لەوێوە وەڵامی بدەینەوە.

بە هەر حاڵ وەڵامی زۆرێك لە پرسیارەكان و لە وەڵامدانەوەمان بۆ پرسیارەكانی وەرگێڕ و نوسەری كتێبەكە دا دێت و بە ویستی خوا سودی بۆ هەموو دەبێت و ونبوی وەرگێڕیش دەدۆزرێتەوە ئەگەر بەڕاست وونبوی هەبێت و تەنها نكولیكردنی بێبنەما نەبێت.

## دابەشكردنی قورئان بەهەق و بەناهەق

كۆتا ڕەخنەی وەرگێر لەم خاڵەدا ئەوەیە كەخوا خۆی قورئانی دابەشكردووە بۆ دوو بەش كەچی هەرەشە دەكات لەوانەی قورئان دابەش دەكەن بۆ دوو بەش و بەڵگەكانی ئەم دوو ئایەتەیە (الذين جعلوا القران عضين فوربك لنسئلنهم اجمعين عما كانوا يعملون) سورةتی (الحجر) ئایەتی ٩٠ـ٩٣.

وەڵام: بــەڵێ خــوا خــۆی ئایەتــەکانی قورئــانی لــەروی ئەســڵ و فەرعــەوە دابەشکردوە بۆ ئایەتە موحکەمەکان و ئایەتە موتەشابیهەکان و لە پێشەوە باسی ئـەوەمانکرد و هەنـدێ لەحیکمـەتی بـوونی ئـەو دوجـۆرە لـە ئایـەتمان باسـکرد. ئێستەش ڕونیدەکەینەوە کە وەرگێڕ لەکوێدا بەهەڵەدا چووە، وەرگێڕ یـان ئەمـەی بیستوە و نقلیکردوە بێئەوەی سەیرێکی ئەو دوو جۆرە دابەشکردنە بکات، چونکە بەکەمترین پلەی زانستی دەرك بـەو هەڵـە ناقۆڵایـە ئـەکرێت کـە ئـەم کـاکی بێنـاو نیشـانە تێیکـەوتوە، یـان هـەرموعجیزەی خوایـە و ئـەبێ ناپـاك لـەکاتی دەست بردنیان بۆ قورئان توشی ئەو مەتاهەیە ببن!

تێکەڵکردنی دووبابەتی زۆر جیاواز لەیەك کـە جیـاوازی نێوانیـان بـە ئەنـدازەی ئاسمان و ڕێسمانە ، ئەم چەند ئایەتەی سـورەتی (الحجـر) لای زانایـان چـەندەها واتای بۆکراوە و هەمویشی گونجاوە و ئەبنە نمونە لە خەرواری واتای ئایەتـەکان ، ئەمەش چەند نمونەیەکی هەڵبژاردەی ووتەی زانایانـە و پاشـانیش بەسـەر خـودی وەرگێڕ و قەشە فادی باوانیـدا ئەچەسـپێ، لەتەفسـیری(ئیبن کـپیر)دا هـاتوە کـە ووشەی (المقتسمین) واتە هاوپەیمانی لە پێناو دەرچون لە فەرمانی پێغەمبـەران و بـەدرۆ زانینیـان و ئازاردانیـان وەك خـوای گـەورە دەربـارەی گەلەکـەی پێغەمبـەر (صالح) فەرموی: (قَالُوا تَقَاسَمُوا بِاللَّهِ لَنُبَيِّتَنَّهُ وَأَهْلَهُ )النمل٤٦. واتە: بە شەو خـۆی و شوێنکەوتەکانی ئەکوژین، موجاهد ئەڵێت: تقاسموا واتە: هاوپەیمانبوون .

( وَأَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ لا يَبْعَثُ اللَّهُ مَنْ يَمُوتُ) النحل: ٣٨. (أَوَلَمْ تَكُونُوا أَقْسَمْتُمْ مِنْ قَبْلُ مَا لَكُمْ مِنْ زَوَالٍ) إبراهيم:٤٤. (أَهَؤُلاءِ الَّذِينَ أَقْسَمْتُمْ لا يَنَالُهُمُ اللَّهُ بِرَحْمَةٍ) الأعراف: ٤٩ . ئەوانە بیانـەوێت هەرچـی ڕەت بکەنـەوە هاوپـەیمانیان بـۆ ئەکرد و سوێندخواری یەکتر ئەبون بۆیە ناونران (مقتسمین)

لە تەفسیری (الظلال) یشدا هاتوە: العضة: پارچـە لـە(عضـى الشـاة) هـاتوە واتە: مەڕەکەی پارچە پارچەکرد و ئەندامـەکانی جیـاکردەوە لەیـەکتری، ئەوانـەن کـە پـەڕاوە پێشـوەکان وقورئـانیش بەتونـدی ئاگاداریـان ئەکاتـەوە، قورئـان و

پێغەمبەریش داهێنانێکی تازە و بێ پێشینە نەبوو کە ئەوان بەلایانەوە نامۆ بێت، وێنەی قورئان کتێبێتر لە پێشدا دابەزیبوو ئەبوو قورئانیان قبوڵکردایە و تەسلیمی بونایە.

لە تەفسیری (الماوردی)دا دەربارەی (الذین جعلوا القرآن عضین) چوار ڕاڤە هەیە

**یەکەم:** کردن بە چەند بەشێك هەندێکی شیعر و هەندێکی سیحر و هەندێکی ئەفسانە و ئەوانیتر فالگرتنەوە، وەك چۆن قەساب گۆشت لەت لەت ئەکات. ئیبن عەبباس و زەححاك ئەمەیان ووتوە.

**دووەم:** ووشەی (العضین) کۆی ووشەی (عضە) و بەواتای بوختان دێت و ئەوان بوختانیان بۆ قورئان دروستکردوە شاعیریکیش بەم واتا هێناویەتی و ئەڵێت:

إن العضیهة لیستْ فعل أحرار.. بوختان دروستکردن کاری کەسە ئازادەکان نییە.

**سێیەم:** وشەی (العضین) واتە ئەوانەی گاڵتەجاڕن چونکە کاتێك لە قورئاندا باسی مێشولە و مێش و مێرولەو جاڵجاڵۆکە کرا ئەیانکردە گاڵتەجاڕو یەکێکیان ئەیوت من خاوەنی مێشولەم و یەکێك ئەیوت من خاوەنی مێشم و بەم شێوەیە هەریەك ناوێکی ئەوت، گاڵتەیان بە قورئان ئەکرد، شەعبی و سوددی بەم شێوە ڕاڤەیانکرد.

موحەمەد موتەوەلی شەعراویش ئەڵێت:ـ کلمە (عضین) بەواتای کەرتکردن دێت بە قەساب ئەوترێ کاتێك گۆشتەکەی پارچە پارچە ئەکات، واتە پەلەکانی لەیەك جیا ئەکاتەوە دوای ئەوەی ئەندامی یەك گیاندار بوون.

بەم شێوەیەش قورئان بەیەك کیان دابەزیوە و بێباوەڕان ئەیانەوێت پارچە پارچەی بکەن، ئەو بێباوەڕانەش کۆمەڵێك لە جولەکەو گاوربوون کە لەسەردەمی پێغەمبەردا بوو ئەیانویست قورئانیش بەدەردی پەراوەکانی پێشوو بەرن.

ئەم ئایەتانە گشتییەو ئەو تەفسیرانەش نمونەن بۆ واتای ئایەتە پیرۆزەکان هەروەك چۆن موشریکە کۆنەکان وجولەکەو گاور هاو هەڵوێستبون بەرانبەر بەقورئان و پارچەپارچەیانکردوە هەرجارەی بەجۆرێك و تەنها مەبەستیشیان سەرلێشێواندنی کەسانی تازەپێگەیشتوەی ئیسلامی یان ترساندنی کەسانی دور لەدینە تا لێی نزیك نەبنەوە ئەمەیشە ئەو فوو هاش و هوشەی دەمی بێباوەڕەکان بۆ کۆژاندنەوەی نوری خوا کە(قورئانە)، بەڵام رەنج بەبادە بۆ خۆیان فوی دەمی لاوازی ئەوان چۆن نووری بێسنوری خوا کز ئەکات و بەڵگەیشمان ڕەنجی بەزایەچوی هەمو ئەوانەیە لەکاتی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیە والە وسلم) فووئەکەن و بوهتان بۆ قورئان ئەکەن و تا ئیستەش هەر ئەڵێن و قسەی یەکتر ئەجوونەوە کەچی نووری قورئان زیاتر تەنگ بە ئەوان هەڵئەچنێ و بوغزی دڵیان زیاتر ئەبێت، ئەم ئایەتە پیرۆزانە لەوەشدا موجیزەی خۆی دەرئەخات ئەوەتا قەشەیەك و چەندەها کەسانی تووتی ئاسا دەست تێکەڵئەکەن بۆ لێدانی قورئان وبەش بەشی ئەکەن و هەر لەم پەڕاوەی کە وەڵامی ئەدەینەوە بەچەند جۆرێك بەشی ئەکەن جارێك ئەڵێن ئەم قورئانە لەفلانە حەکیم یان فیسارە شاعیر یان ئەوی کاهین وەرگیراوە جاریکیتر ئەڵێن ئەم پارچەیەی دژەوانەی ئەو پارچەیە، دیارە لە شوینی خۆیدا و دوای وەڵامدانەوەی پێشەکییەکەی وەرگێڕ یەکسەر وەڵامی ئەو ئاژاوەگێڕییەیشی ئەدەینەوە بە ویستی خوا.

وەرگێڕ ئەڵێت: لەسۆنگەی پەیڤینی لەوەو بەرمەوە دەمەوێت گوزارشت لەمەڕێەوەوە بکەم، کە یەکێك لە سیفەتەکانی قورئان کشان و هاتنەوە یەك و حەددی نەبوونی شرۆڤەو مانای ووشەو زاراوەکانێتی یان حەددی بوونە لەهەممانکاتدا بەڵام لەو مەسەلانەدا کە پێویستمان بە حەددی بوون نەبێت حەددییە و لەو مەسەلانەشدا کە چاکوایە ئایەتەکان نا حەددی بن کەچی ئایەتەکان حەددی دەبن)

وەڵام: ئەمە ڕاستە کە کشان و هاتنەوە یەکی شرۆڤەو واتاکانی ئایەتەکانی قورئان و حەددی و حەددی نەبوونی لە سیفەتەکانی قورئانە و ئەو سیفەتەیەتی وایکردوە تێپەر بوونی زەمەن و گۆڕانی زەمان و شوێن کاری تێنەکات و بەشی هەمووی بکات، کەسی زۆر زاناو بنجداکوتاونەبێت لە زانستی قورئاندا ناتوانێت دەرئەنجامی تەواو و ڕاست لە کۆباسی ئایەتەکان دەربهێنێت، کەسی زاناش نیازی بێپەڵەو پاڕانەوەی بەردەوامی پێویستە تا بتوانێت ئایەتە کشاوو ناحەدییەکان ببەستێتەوە بە ئایەتە چەسپییوو حەدییەکانەوە

(هُوَ الَّذِي أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلَّا اللَّهُ وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الْأَلْبَابِ (٧) رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ (٨) )

بەڵێ کەسی واش هەیە لەشرۆڤەی ئایەتەکاندا بەهەڵەدا ئەچێ و پڕاوپڕ مەبەست ناپێکێت و لەوانەیە ئیجتیهادێکی هەڵە بکات و لەوانەیشە زۆربەچاکی شرۆڤەیبکات و پراو پڕ مەبەست بپێکێت، تا قیامەتیش کۆششی زانایان بەردەوامە و شرۆڤەکان نوێئەبنەوە و لەسنوری ئایەتەکانیش دەرناچن ئەمەش عەینی ڕێزگرتنی خوایە لە خودی مرۆڤ و ژیرییەکەی کە خوا کەلامی خۆیی بۆناردوە تا صیاغەی یاساو تەعالیمەکانی لێبکرێت، بەدرێژایی مێژووش کەسی خاوەن مەرامی تایبەت هەبون ویستویانە بۆ مەرامی تایبەتی خۆیان دەقەکانی قورئان بەکار بهێنن! بەڵام ئەوانیش هەڵەو مەرامیان ئاشکرا بووە، بۆیە ڕاست نییەو ناکرێت کەسی ناتایبەتمەند لەزانستی قورئاندا بە ئارەزوی خۆی دەربارەی ئایەتەکانی قورئان هیچ بڵێت " ئیستە وەرگێڕی نەزان بەقورئان چۆن ئەزانێت لەکوێدا قورئان پێویستە حەددی بێت و لەکوێدا پێویستە کشاو بێت، لەکاتێکدا باوەڕی بە دانایی

و زانایی وتوانایی خوا نییە ئەگین متمانەی بەقورئانەکەی دەبوو دەیزانی هەمووی لەجێیەو تەواو دروستە.

## جیهانێکی سەوز یان شمشێر

وەرگێڕ لە خاڵی چوارەمی پێشەکییەکەیدا چەند پشێوی و لێتێکەڵبونیتر دەخاتە سەرئەوانیتر و ئەڵێت: هەڵبەتە هەموان دەزانن کەموسوڵمانان دەڵێن ڕۆژی دوایی گرنگە و خواوەند فەرمانمان پێدەدات کە بۆ ئەو ڕۆژە کاربکەین چونکە لە قورئاندا دەڵێ: (انما حیاة الدنیا هشیما تذروه الریاح ـ ژیانی دونیا پوشێکە و با دەیبات) ، کەچی موحەمەد دەڵێت: ئەگەر لەو کاتەدا کە ڕۆژی دوایین دێت. واتە لەو کاتەداکە پێی دەوترێت سەروەختی ئاخر زەمان، نەمامێکتان بەدەستەوەبوو ویستتان بیڕوێنن ئەوا بیڕوێنن، واتە تاوەکو کۆتایی هاتنی دونیا کاربکەن.

واتە لێرەدا ووتەکەی محەمەد دژەوانەی قورئانەکەیەتی کەواتە بۆ ئەوەی ئەمی موسڵمان بچێتە بەهەشت دەبێت پشتبکاتە ژیانی دونیاو هەرچی باوەڕ بەمحەمەد نەکات بە شمشێر بکوژرێت.

وەڵام: وەرگێڕ تەنانەت نەیتوانیوە لە نوسینی ئایەتەکەشدا ڕاست بکات و ئەوەی ئەو نوسیویەتی لە قورئاندا بوونی نیە و بەڵام لەوە ئەچێ بەپێی واتاکەیدا مەبەستی لەم ئایەتەی سورەتی (الکهف) بێت کە ئەفەرموویێت: وَاضْرِبْ لَهُمْ مَثَلَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا كَمَاءٍ أَنْزَلْنَاهُ مِنَ السَّمَاءِ فَاخْتَلَطَ بِهِ نَبَاتُ الْأَرْضِ فَأَصْبَحَ هَشِيمًا تَذْرُوهُ الرِّيَاحُ وَكَانَ اللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ مُقْتَدِرًا (٤٥)

واتە: ژیانی دونیایان بۆ وێنا بکە وەك ئاوێك کە لە ئاسمانەوە دامانبەزاندبێت و تێکەڵ بە ڕوەك و سەوزایی زەوی بوبێت و پاشان وەك پووش و پەڵاشی بەر بای لێهاتبێت و خوا بەسەر هەموو شتێکدا بە توانا بووە.

ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر چەند شتێك " لەوانە: كورتی بەشە ژیانی هەر تاكیك با هەزارساڵیش ژیابێت لەسەر ئەم زەوییە وەك كورتە بەهارێكە و ئەبێت چۆن هاتوە ئاواش بگەڕێتەوە، ئەمە حەقیقەتێكی دیارو بەرچاوییە كە چۆن باران دەبارێتە سەر زەوی مردوو زیندوی ئەكاتەوە و سەوزایی و كشت و كاڵ وەبەردێنیٚ و و پاشان وورده ووشك ئەبێتەوە و دەبێتەوە پوش و پەلاش و با پرشوبلاوی ئەكاتەوە، ئاواش ژیانی كەسێك لە باوك و دایكێكەوە وەبەردێت، لە لاوازییەوە بۆ هێزو بەخشین و پاشانیش بۆ لاوازی و بۆ نەمان.

ئەم ئایەتە یەكێكە لەو چەندەها نمونە و وێناكردنانەی كە قورئانی حەكیم لە بیری ئیماندارادا ئەیچەسپێنیٚ تا لەبیریاندا هەمیشە ئامادەبێت و بزانن هاتونەتە دونیا بۆ مەبەستی دەركردن و بەكارهێنانی هەموو خێری زەوی و خێری ئاسمان و بەخشینی بە خەڵكی سەر زەوی هەروەك نمونەكەی كە خوا هێناوییەتەوە.

ئەم فەرمودەیەش كە وەرگێڕی بێناونیشان بە دژەوانەی ئەم ئایەتەی ئەزانێت رێك ڕونكەرەوەی ئایەتەكەیەو نمونەیەكی بەدیهێنان و بەجێگەیاندنی ئایەتە پیرۆزەكەیە، سەیركەن:

حدثنا هشام بن زيد قال: سمعت أنس بن مالك قال رسول الله صلى الله عليه وسلم : إذا قامت الساعة وبيد احدكم فسيلة فإن استطاع أن لا يقوم حتى يغرسها فليفعل.

هیشامی كوڕی زەید ئەڵێت لە ئەنەسی كوڕی مالیكم بیست ووتی پێغەمبەری خوا فەرموویەتی كاتیٚ دوونیا ئاخیر هاتو لەدەستی یەكێك لە ئێوەدا فەسیلەیەك هەبوو ئەگەر توانی هەڵنەستی تا ئەیڕوێنێت با بیڕوێنێت.

فەسیلە جۆرێكە لە نەمامی دارخورما كە ماوەیەكی زۆری ئەوێت تا بەرهەم بدات. ئەم فەرمودەیە ئەوپەری هەستی خزمەتكردن بە خەڵك و بەژینگە و ئاوەدانی لە مرۆڤدا دروست ئەكات و دەبێت ئەم هەست و كارە بەردەوام بێت تەنانەت لەكاتێكیشدا كە ماڵئاوایی لەدونیابكات.

کەواتە ژیانی دونیا لای ئیماندار کورتەو ئەبێت تەواوی ئەوکاتە بەفرسەتبگرێت بۆ ئەوەی ئاوەدانی بەرپابکات و خزمەتبکات و فەلسەفەی بونی بسەلمێنێ و بۆ ئەم مەبەستەش پەیوەندی بەخوای خاوەن دەستور و کەتەلۆکی ژیان نەبچرێنێت بۆ ئەوەی کاتی گەڕانەوەی کارەکانی وەرگیراو بێت و کرێکەی بەزیادەوە وەرگرێت.

ئەمەیە حالو مەسەلەی ژیان و ئەگەر وەرگێر ئەمەی بەبەرجەستەکراوی نەبینیوە لای موسوڵمانان ئەوە بزانێت کە ئەو موسڵمانانە کەمتەرخەمن و نمونەیەکی جوان و دروستی ئایینەکەیان نین و ئیسلام لەو کەم و کورتیانە بەدوورە.

ئەو دەرەنجامەی کەوەرگێر لەسەر سەرەتاکە دروستیکرد بە دارمانی سەرەتاکە ئەویش هەرەس دێنێت و ئەوەیش کە ووتی (هەرچی باوەڕبە محەمەد نەکات بەشمشێر بکوژرێت) ئەوە هەرچەندە بێپاساو تێهەڵکێشی کردوە لەگەڵ ئەوەشدا زۆر لەراستییەوە دورە و ئایەتی (لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى لَا انْفِصَامَ لَهَا وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ). واتە: لەم دینەدا هیچ داسەپاندنێك نییە، شارەزایی لە گومڕایی جیابووەتەوە هەرکەسی باوەڕ بەخوا بهێنێ بەتاغوتیش بێباوەڕبێت ئەوە دەستی لەڕاستی گیر بوە لێی بەرنابێت خوا بیسەری زانایە.

ئەم ئایەتە وەڵامە بۆ ئەم بوختانەی وەرگێڕ، جۆری نەفیکردنی داسەپاندن لە ئیسلامدا بە ئاداتی (لا نافیە للجنس) هاتوە کە بەهێزترین جۆری نەفیکردنە و هەموو جۆرێکی زۆرو داسەپاندن لە ئیسلامدا نەفی ئەکات و هەر لە ئایەتەکەشدا هۆکارەکەیشی دیاریئەکات ئەویش ئەوەیە کە ڕاستەڕێ و لارەڕێ ڕونکراوەتەوە و مرۆڤیش ئازادە لە هەڵبژاردنی ڕێگاکان و لە چەندەها ئایەتیتردا خوا باسی ئەو ئازادییەی فەرموە وەك لە (الكهف) دا ئەفەرموێت:

(وَقُلِ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكُمْ فَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُرْ). بەڵام ئازادی لە هەڵبژاردنی ئاینی ئیسلام یان هەردینێکیتردا دیارە واتای ئەوە نییە مرۆڤ ئازاد بێت لە تێکدانی ئاسایشی خەڵکی یان ئازادی بۆ بڵاوکردنەوەی دەردەکۆمەڵایەتییەکان و ئەمەش لەدونیادا دەستوری بۆدانراوە و پاراستنی بەرژەوەندییە گشتییەکان و مافی تاکەکان و نەبەزاندنی سنوری یەکتری لە پێویستییەکانی ژیانی مەدەنیین لە ئاینی ئیسلامیشدا بە ڕێکترین شێوە ئەوە داڕێژراوە و کەسیش لەسەر هەڵبژاردنەکانی نەکوژراوە وبوونی ئەوهەموە (جوولەکە و گاورو بوزی صابئە و...) لە ژێر دەسەلاتی خیلافەتی ئیسلامیدا ئەیسەلمێنێ کە کەس لەبەر باوەڕنەبوونی بە موحەمەد نەکوژراوە و بەڵکۆ زۆربەی ئەو ناموسڵمانانە پلەی بەرزی ئیداری و ئابوریان بەدەست بووە و لەبازاڕدا ڕۆڵی دیاروبەرچاویان هەبووە و لە پلە بەندی و تایبەتمەندی دونیایدا لە سەردەمی دەسەڵاتی ئیسلامیدا تەنها ڕەچاوی لێهاتوویی و تایبەتمەندی زانستیانەکراوە و لابەلای دین و ڕەنگ و زماندا نەکراوەتەوە ".

بوونی دەوڵەتی مەمالیك و دەسەڵاتی ئەیوبییەکان و زانایانی بوخاراو سەمەرقەند وئەندەلوسییەکان وبازاری زێرگەری و پزیشکە مەسیحییەکان و.... شاهیدن لەسەر بوختانەکانی کاکی بێناونیشان و سەردەمی دەسەڵاتی ئیسلامی باشترین نمونەی دادپەروەری کۆمەڵایەتی بوە و مێژوو سەردەمی بەو شێوەیەی بەخۆە نەبینیوە. ئەگەر ئەیەوێت سەردەمی ئەم دەوڵەتە بەناو ئیسلامیانە کە هەریەکەیان بە هەوای شوێنێك شەن ئەکەن بەسەر ئیسلامدا ساغکاتەوە ئەوا دیسان ستەمکارەو سەرکردەکانی دەوڵەتە ئیسلامییەکان لەزۆر کۆنەوە بە دەوڵەتەکانیان نەشازن و وەك شاعیر ئەڵێت:

سادات کل اناس من نفوسهم      وسادات المسلمين اعبد قزم

## قورئان هەردوو ژیانی دونیاودوارۆژی پێکەوە گرێداوە

بێناونیشان ئەڵێت: گوتارەکان لەنێوان ژیانی دونیایی و ژیانی ئاسمانیدا دووفاقن بەڵام ئاینمەندان دەڵێن گوایە ئیسلام هەردوو دونیا بەیەکەوە گریداوەو وەکو یەك گرنگیان پێدەدات کەچی ناڕاستی ئەم ووتەیەش لەوێوە دەردەکەوێت کەهەموو وولاتانی دونیا جگە لە وولاتە ئیسلامییەکان لەدوای جەنگی جیهانی یەکەمەوە لە ماوەی ٥٠ ساڵدا گەورەترین شارستانیان دروستکرد. هەڵبەتە وولاتێکی(١,٣)ملیاری وەکوچین ئەگەر کەلتورێکی ئاییني سەرکوتکەرو شەڕەنگێزی هەبووایە هەلومەرجی هەموو ڕەهەندەکانی ژیانیان وەکو وولاتە ئیسلامییەکان دەبوو کەواتە گوتاری قورئانی هەموو بۆشاییەکان پڕناکاتەوە و کەلێنی تێدایە.

وەڵام: خوێنەری هۆشیار سەیرکە چەندە سەیرو ساویلکانە هەر چەنددێرێك ئەداتە دەم یەك یەکسەر بێموناسەبە ئەڵێت: کەواتە، ئیتر بێئەوەی هیچی سەلماندبێت دەرەنجامێك لە خەیاڵدانی دەردەهێنێت نازانم خوێنەر بەچی ئەزانێت !! تۆ بڵێی وابزانێت کەسێکی خوێنەوار هەیە باوەڕ بەو هاوکێشە و دەرەنجامە بێبنەما یانە بکات؟

بابێینە سەر وەڵامەکە، بەڵێ خوای گەورە لە ئاینی ئیسلامدا دین و دونیای پێکەوە گرێداوە هەروەك چۆن لەشی مادە و رۆحی نادیاری لە مرۆڤدا گرێداوە و تا لەژیاندا بن ئەبێت تەوازونی هەردوکیان بپارێزن هەرکات لەیەك جیابونەوە ژیانیش کۆتایی پێدێت و موسوڵمانیش ئەگەر بوویەوە بە تەنها دونیایی یان تەنها ئاخیرەتی ئەوا ژیانێکی نادروست و بەدەری دەبێت لە ڕێنماییەکانی خوا، ئاینی ئیسلام بۆ ئەوە هاتووە دونیای مرۆڤەکان ڕێکبخات، خوای گەورە پاداشتیشی لەسەر بەجێهێنانی ئەو ڕکخستنە داناوە و بە ئەندازەی هەوڵی مرۆڤەکان بۆ بەدیهێنانی فەلسەفەی بونیان کە ئاوەدانکردنەوە و ژێربارخستنی بونەوەرە و دەرهێنانی نهێنییەکانی زەوی و ئاسمانە، پاداشت و یارمەتی خوایان بۆ دێت وەك

خـوا ئەفـەرموێت: (وَهُوَ الَّذِي سَخَّرَ الْبَحْرَ لِتَأْكُلُوا مِنْهُ لَحْمًا طَرِيًّا وَتَسْتَخْرِجُوا مِنْهُ حِلْيَـةً تَلْبَسُـونَهَا وَتَـرَى الْفُلْـكَ مَـوَاخِرَ فِيـهِ وَلِتَبْتَغُـوا مِـنْ فَضْـلِهِ وَلَعَلَّكُـمْ تَشْـكُرُونَ. (النحل.١٤)

هەر ئەو خوایە زەریای خستۆتە بەردەستی ئێوە تا گۆشـتی تـازەی لێبخـۆن و خشـڵی لێـدەرهێنن و بەخۆتانـەوە هەڵیواسـن، ئـەبینی کەشـتیش لـەزەریادا گەشتئەکەن تا چاکەی ئەوتان دەستکەوێ بەڵکو شوکرانە بێژبن.

أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَـةً وَمِنَ النَّـاسِ مَنْ يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُـدًى وَلَا كِتَـابٍ مُنِيـرٍ (لقمان ٢٠) ئـاخۆ ئێـوە نەتانـدیوە کـە هەرچـی لـەئاسمان و زەویـدا هەیـە خـوا ژێردەستی ئێوەی خستوە و بەهرەی ئاشـکراو نهێنـی بەسـەرتانا ڕشـتووە، لـەناو خەڵکیـدا هـەن دەربـارەی خـوا بێئـەوەی بیـزانن دەمـەدەمێ ئەکـەن و بێئـەوەی شارەزاییان هەبێ یان کتێبێك بۆی ڕۆشن کردبێتنەوە.

اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَأَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقًا لَكُمْ وَسَخَّرَ لَكُمُ الْفُلْكَ لِتَجْرِيَ فِي الْبَحْرِ بِأَمْرِهِ وَسَخَّرَ لَكُمُ الْأَنْهَارَ (٣٢) وَسَخَّرَ لَكُمُ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ دَائِبَيْنِ وَسَخَّرَ لَكُمُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ (٣٣. ابراهيم))

ئەو خودایە ئاسمانەکان و زەوی بەدیهێناوە و لە ئاسمانەوە بارانی باراندوە کە بەروبومو ڕۆزی ئێوەی پێئەڕوێنێ و کەشتیگەلی بـۆ ژێربـارکردون کـە بـە فـەرمانی خـوا لـە زەریـادا دێـن و دەچـن و هـەموو ئـەو ڕوبارانەشـی بـۆ ڕامکـردوون، خـۆر ومانگیشی بۆئێوە خستۆتە بەرکار و شەوو ڕۆژیش هەر بۆ ئێوە ژێربارە.

(وَسَـخَّرَ لَكُـمْ مَـا فِي السَّـمَاوَاتِ وَمَـا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًـا مِنْـهُ إِنَّ فِي ذَلِـكَ لَآيَـاتٍ لِقَـوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ (الجاثية. ١٣) ئـەوەی لـە ئاسمانـەکان و زەویـدا هەیـە هـەمووی بـۆ ئێـوە ڕامکراوە ئالەمەدا بۆ ئەو کەسانەی ڕائەمێنن نیشانەهەن.

(وَإِلَى ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ هُوَ أَنْشَأَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَاسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ إِنَّ رَبِّي قَرِيبٌ مُجِيبٌ (٦١. هود)

بۆ گەلی سەمود صالحی برایان خۆیانمان نارد ووتی ئەی گەل تەنها خـوا بپەرسـتن تـەنها ئـەو خـودای ئێوەیـە لـە زەوی ئێـوەی دروسـتکردوە و داوای ئاوەدانیتـان لێئەکات داوای لێخۆشبونی لێبکەن و پاشان بۆلای ئەو بگەڕێنـەوە، پـەروەردگاری من بەڕاستی زۆر نزیکە و زۆر بەهاناپشەوە دێت.

کەواتە ئاینی ئیسلام ئـاینێکی سـکونی نیـە و هەمیشـە بـزواوە و بـەڵکو پلـەی ئاینمەنـدی بەسـتوەتەوە بــە رادەی توانــای مــرۆڤ بــۆ خوێندنــەوەی ئایەتــە بینراوەکانی خوا (بونەوەر) و بەراستگێڕانی ئایەتە خوێنراوەکانی لەو ڕێگەیـەوە و دەستەواژە قورئانییـەکانی (قل سيروا، الم يروا، الم تر، ان في ذلك لايـات، ان فـي خلق السماوات، فانظروا،...) ئاماژەن بۆ خەڵك داوایان لێئەکات کە دەستبەکاربن و ئاسمـان و زەوی و ئـەوەی لەزەویـدا هەیـە بـۆ ئەوانـە چـۆنی بـەکار ئـەهێنن دەستکراوەن بەمەرجێك لەبەرژەوەندی خەڵکی سەرزەویدا بەکاریبهێنن گەندەڵکار نەبن و خوا گەندەڵکارانی خۆشـناوێت (وَابْتَغِ فِيمَا آتَاكَ اللَّهُ الدَّارَ الْآخِرَةَ وَلَا تَنْسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا وَأَحْسِنْ كَمَا أَحْسَنَ اللَّهُ إِلَيْكَ وَلَا تَبْغِ الْفَسَادَ فِي الْأَرْضِ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُفْسِدِينَ (٧٧)

واتـە: لـەوەی کـەخوا پێـی بەخشـیویت ئـاخیرەت داوابکـە و بەشـی دونیاشـت لەبیرنەچێت چاککاربە وەك چاکەی خوا بەرانبـەر تـۆ، لەزەویـدا مەبەسـتی خراپـە وکـاری تێکدەرانـە مەکـە بەراسـتی خـوا هـەرگیز کەسـانی تێکـدەرو گەنـدەڵی خۆشناوێت.

ماوەی ئەو پەنجا ساڵەش کە وەرگێڕ باسی ئەکات و سەرکەوتن و پێشـکەوتنی چین ئەبەستێتەوە بەوەی کە خاوەنی ئاینێکی وەك ئاینی ئیسلام نین و دواکـەوتن و پاشکەوتنی ئەم پەنجا ساڵەی جیهانی ئیسلامیش ئەبەستێتەوە بـە ئیسـلامەوە، لەوەڵامی ئەم بێئینصافییەشـدا ئـەڵێین: سـەرکەوتن و بەرزبوونـەوەی ئـەو وولاتـە نائیسلامیانەش ڕاستی و دروستی قورئان دەردەخات چونکە خوا خـۆی بەڵێنیـداوە کەسان و میللەتانی خاوەن زانست بەرزبکاتەوە و ئەفەرمووێ:

(يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ (١١)

واتە: الله چەندەها پلە بەرزیئەکاتەوە ئەوانەتان کە باوەڕیان هێناوە و ئەوانەش کە زانستیان وەرگرتووە خوا ئاگادارە بەوەی ئێوە ئەنجامی ئەدەن.

ئەوان کە ئاینی ئیسلامیش پیادەناکەن و لە جیهانی ئیسلامیش پێشکەوتوترن لە بوارەکانی ماددیدا ئەوە لەبەر ئەوەیە ئەوان رویانکردۆتە زانستەکان و خواش هەر لەدروستکردنی ئادەم پێغەمبەرو لە میهرەجانە گەورەکەی بونەوەردا بڕیاری داوە سەرداری زەوی بە زانست ئەکرێت و هۆکاری کردنی مرۆڤیش بەسەرداری زەوی ئامادەییە زانستییەکەی بوو وەك لە سوورەتی البقرەدا ئەفەرمووێت (وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الْأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُوا أَتَجْعَلُ فِيهَا مَنْ يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ (٣٠) وَعَلَّمَ آدَمَ الْأَسْمَاءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلَائِكَةِ فَقَالَ أَنْبِئُونِي بِأَسْمَاءِ هَؤُلَاءِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ (٣١) قَالُوا سُبْحَانَكَ لَا عِلْمَ لَنَا إِلَّا مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنْتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ (٣٢) قَالَ يَا آدَمُ أَنْبِئْهُمْ بِأَسْمَائِهِمْ فَلَمَّا أَنْبَأَهُمْ بِأَسْمَائِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُلْ لَكُمْ إِنِّي أَعْلَمُ غَيْبَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنْتُمْ تَكْتُمُونَ (٣٣)

ئەی موحەمەد کاتێك خاوەنەکەی تۆ بە فریشتەکانی ووت من لەسەر زەویدا جێنشین دائەنێم، ووتیان ئایاڵەویێ کەسانێك دائەنێیت کە خراپەکاری بکەن و خوێنرێژی بکەن و ئێمە تەسبیحاتی تۆ ئەکەین لەپێناوی پاکڕاگرتنی تۆداین فەرمووی من ئەزانم ئەوەی ئێوە نایزانن، ئادەمی فێری هەموو ناوەکان کرد و پاشان ئەو شتانەی خستە پێشچاوی فریشتەکان و فەرمووی ناوی ئەوانەم پێبڵێن ئەگەر ڕاست ئەکەن لەوەڵامدا ووتیان، پاك و بێگەردی بۆتۆ ئێمە هەرئەوەندە ئەزانین کە فێرت کردوین و هەرتۆ زۆرزانای زۆر دانای فەرمووی ئەی ئادەم هەواڵی ئەو ناوانەیان بدەرێ کاتێك ئادەم هەواڵی ئەو شتانەیدا بەفریشتەکان خوا

فەرمووی من بە ئێوەم نەووت کە نهێنییەکانی ئاسمان و زەوی ئەزانم ئەوەی ئێوە پەنهانی ئەکەن و ئاشکرای ئەکەن هەمووی ئەزانم.

بەڵێ خوای بالادەست توانای زانینی هەموو نهێنییەکانی دونیای بە ئادەم و نەوەکانی بەخشیوە و لە نەوەکانی ئادەمیش کێ توانی ئەو ئامادەییەی ژیری پەرە پێبدات و بەکاری بهێنێت ئەوە شایستەیە سەردار بێت و ئەوانەش کەمتەرخەمن ئەبێت باجی کەمتەرخەمییەکەیان بدەن، دونیاش دونیای ململانێ و تاقیکارییە و هۆکارو ڕێگای هەرچی بگریتەبەر دەستت ئەکەوێت و براوە ئەبیت.

## دەستاودەستکردنی دەسەلات سوننەتێکی کەونییە

ئێمەی موسوڵمان ئەم سالانەی کەوەرگێر باسی لێوەئەکات و کەیفی پێدێت، ئەوا بابزانێ ئێمە ئیمانمان پێی زیاد ئەکات ئەزانین هەڵەی بەرەیەکی ئەم دینە بوو کە لاوازبوون یارمەتیدەربوون بۆ لاوازی دەسەلاتی ئیسلامی، لەگەڵ ئەوەشدا نائومێد نابین چونکە خوا خۆی دڵنەواییمان ئەکات و ئەفەرموویێت: (أَوَلَمَّا أَصَابَتْكُمْ مُصِيبَةٌ قَدْ أَصَبْتُمْ مِثْلَيْهَا قُلْتُمْ أَنَّى هَذَا قُلْ هُوَ مِنْ عِنْدِ أَنْفُسِكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (١٦٥)

ئایا کاتێك توشی موسیبەتێك هاتن کە ئێوە دووئەوەندە ئەوانتان تووشکرد بەسەرسامییەوە ووتتان ئەمە چۆن ڕوویدا ئەی موحەمەد بڵێ ئەمە لای خۆتانەوە هات و بەراستی خوا بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە.

کەواتە ئەوەی بەسەر جیهانی ئیسلامیدا هات پشتوێنکردنەوە و کەمتەرخەمیبوو لەلایەن بەرەیەکی لاوازی موسوڵمانانەوە، بەلام ئەوەش بزانن سەردەمانێکیش هەبوو چەندجارەی ئەو پەنجاساڵەی تۆ ژماردووتە باس هەر باسی پێشکەوتنی جیهانی ئیسلامیبوو لەهەموو زانستەکانی پزیشکی و خزمەتگوزاری و ئابووری و بیناسازی و زەخرەفە و داهێنانە جۆراوجۆرەکان و ئەمانە بە ئیزافەی ئەو ئارامییە دەروونییەی کەتاکی موسوڵمان هەیبووە.

راستییەکیتریش هەیە کەخوا وەك سوننەتێکی دونیا دایناوە ئەویش دەستاودەستکردنی دەسەڵاتە لەناو چینەکانی خەڵکدا ئەم دەفع و دەستاو دەستکردنەش بەجێنایەت تا گۆران لای ژێردەستەو ستەمیش لای دەسەڵاتداربەدی نەیەت و حیکمەتی ئەم سوننەتەش بۆ ئەوەیە ئیماندارانی راستەقینە لە کەسانی تر جیابکرێتەوە (إِنْ يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ فَقَدْ مَسَّ الْقَوْمَ قَرْحٌ مِثْلُهُ وَتِلْكَ الْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ النَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَيَتَّخِذَ مِنْكُمْ شُهَدَاءَ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ الظَّالِمِينَ (١٤٠)

واتە: ئەگەر ئێوە توشی پێکران بێن ئەوا ئەوانیش توش هاتوون ئەوانەش رۆژانێکن لەنێوان خەڵکیدا دەستاودەستی پێئەکەین تا خوا ئەوانی ئیمانداربوون بناسیێنێت و لەناو ئێوەشدا شایەت حاڵ وەرگرێت و خواش ستەمکارانی خۆشناوێت.

کەواتە یەکێك لەهۆکارەکانی پشتبەردانی خوا بۆ دەسەڵاتی هەردەستەیەك ستەمکردنی ئەو دەستەیەو دروستبوونی دەستەیەکیشە کە گۆرانکاری بکەن و بەوستەمە رازی نەبن (ان الله لايغير ما بقوم حتى يغيروا ما بأنفسهم) ئەوەی بەسەر هەر گەلێکدا هاتوە خوا نایگۆرێت تا ئەوەی لەناخیاندا هەیە نەیگۆرن. ئێستە دەرکەوت ئەوەی ئێستە گەلانی ئیسلامی تێکەوتوە لەهەڵە و لاوازی موسوڵمانان و پیلانی سەخت و وەرگرتنی هۆکاری سەرکەوتنە لەلایەن غەیرە موسوڵمانانەوەیە، بەلام بێگومان هەرئاوا بەردەوام نابێت نۆرەی موسوڵمانانیش دێت، سەرەتاکانیشی دەرکەوتوە (ان شاءالله) .

وەرگێری بێناونیشان هەر لە لاپەرە پانزەدا بەزۆر ئەیەوێت هەندێ کوێرە رێگا لەگەڵ شارێگاکەی ئیسلامدا بەراوردپێبکات و ئەڵێت: وەهابییەکان لەساڵی (١٨٠٣)دا بیستو سێ هەزار لەژن و منداڵیان لە کەربەلا کوشت کەچی ئاینێکی هیندی وەك یانیزم ئافەرۆزەو نەهی لە ئازاردانی هەموو گیانەوەران و مرۆڤ دەکات و داوادەکات مرۆڤەکان بەرەو یەکتر هەنگاو بنێن یان کریشنا کەلەخواروی هیندستاندا شوانی مانگاکانەو بەلام لەسەری هیندستاندا خواوەندێکی دایکانەیەو لەخواروی هیندستاندا خواوەندی دایکانە ئەوەنزەجگە لە کریشنا، تەعالیمەکانی شەسترای ئەوەنزی کە تەعالیمێکی رەوشتیە داوا لەدایکان دەکات و رایاندەسپێرێت کە چەند

منداڵێك بۆ پیاو بخەنەوە و پەروەردەیەكی مرۆڤدۆستانەیان بكەن بەلاَم لە مێژوی ئیسلامدا كەسێكی وەك خالیدی كوڕی وەلید هەیە كە لە شەڕی هەڵگەڕاوەكاندا دوای تەسلیم بوونی هەڵگەڕاوەكان هەموویانی سەربڕی تەنها ژن و كچۆڵكانی هێشتەوە.

## ئازاردانی مێروو لەنێوان قورئان و یانیزمدا

وەلاَم: خوێنەری بەڕێز ئەگەر به ووردی سەیری دارشتنەكەی بكەیت ئەزانیت چۆن هەوڵێ وێڵكردنی خوێنەرەكانی ئەدا، سەیركە باسی ڕوداوێكی ساڵی (١٨٠٣) دەكات كەئیسلام و دەقەكانی ئیسلام لێی بەرپرس نییە و جگە لەمەش ڕووداوەكەی بەبێ سەرچاوە هێناوە كە ئەمەش بەدەرە لەهەر نوسینێكی ئەكادیمی وەرناگیرێت و سەرەو ساحێبە. دوایی ئەم نمونە سەقەتە بەراورد ئەكات بەچەند دەق و تەعالیمێك كە لە كریشنای خواروی هیندستان و كریشنای سەروی هیندستان و یانیزم ، ئەوەی لەبەرچاوی خوێنەر لاداوە كە فەرمان و تەعالیمە بێهاوتاكانی ئیسلام چیانهێناوە بۆ بەرژەوەندی مرۆڤەكانی سەرزەوی لێرەدا تەنها دەربارەی ئەو نمونانەی ئەم لەناو ئەو ئاینەدانراوانەی كەپڕن لەخورافەو گزی بازی توانیویەتی بیدۆزێتەوە منیش هەندێك لە كانیاوی سازگاری ئیسلام هەڵئەگۆزم و تینوێتی تینوەكانی زانستی بەسودی پێئەشكێنم بەویستی خوا:

ئەگەر یانیزم نەهی لە ئازاردانی گیانەوەران و مرۆڤ ئەكات و داوائەكات بەرەو یەكتر هەنگاوبنێن، كەپاش كەمێكیتر سەرچاوەی هاتنی ئەو تەعالیمەیشیان بە ڕوداویك دەخەینەڕوو، ئەوا ئاینی ئیسلام هەموو گیانەوەران و باڵندەكان وەك میللەت ئەناسێنێ وله سورەتی(الانعام)ئایەتی ٣٨ دا ئەفەرموێت: (وَمَا مِنْ دَابَّةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّا أُمَمٌ أَمْثَالُكُمْ مَا فَرَّطْنَا فِي الْكِتَابِ مِنْ شَيْءٍ ثُمَّ إِلَى رَبِّهِمْ يُحْشَرُونَ (٣٨) واتە: هیچ گیانلەبەرێك نییە لەسەر زەویدا و هیچ باڵندەیەكی باڵەفڕیش نییە ئیللا وەك ئێوە میللەتن. كەواتە نەك تەنها نابێت ئازار بدرێن بەڵكو دەبێت مافەكانی خۆراك و حەوانەوە شوێنیان پارێزراو بێت و نابێت تەعاروفیش لەگەڵ ئەوانیشدا بەدوور بزانرێت.

لەسورەتی(النور)یشــدا پــۆلینی ئــەوانیش لەگــەڵ خــودی مرۆڤــدا لــەڕوی دروســتکردنەوە ئــەکات و ئەفــەرمووێت: (وَاللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَابَّةٍ مِنْ مَاءٍ فَمِنْهُمْ مَنْ يَمْشِي عَلَى بَطْنِهِ وَمِنْهُمْ مَنْ يَمْشِي عَلَى رِجْلَيْنِ وَمِنْهُمْ مَنْ يَمْشِي عَلَى أَرْبَعٍ يَخْلُقُ اللَّهُ مَا يَشَاءُ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (٤٥)

واتە: خـوا هـەموو گیانـەوەرێکی دروسـت کـردووە لـە ئاو،هەیانـە لەسـەر سك ئەڕوات و هەیانە بەدووقاچ ئەڕوات و هەشیانە بەسەر چوارەوە ئەڕوات،خوا بیـەوێ هەرچی ویست دروستی ئەکات، بەدڵنیاییەوە خـوا توانـای بەسـەر هـەموو شـتێکدا ئەکشێت.

هەروەها داوا دەکات تێبینی لە ژیان و پێکهاتەیان بکرێت و لە سورەتی الانعام دا ئەفەرمووێت: (وان لكم فی الانعام لعبرة نسقیكم مما فی بطونه من بین فرث ودم لبنا خالصا سائغا للشاربین) واتە: بێگومان لە گیانلەبەرانـدا بـۆ ئێـوە پەنـد هەیـە لەوەی لە ناو سکی ئەواندا هەیە لە نێوان خـوێن و پاشـەڕۆدا شـیرێکی خـاوێن بـۆ خواردنەوەی ئێوە بەرهەمدێنین نۆشی بخۆرەکانێتی.

الله لە گەورەیی ئەم ئیسلامە داوامان لێئەکات بەچاوی دیراسەو لێکۆڵینەوە لـە گیانلەبـەران بـڕوانین و باسـێکی زانسـتی ووردیـش ئامـاژە پێئـەکات کـە زانسـتی سەردەم ڕاستییەکەی سەلماندوە ئەویش کارگەی دروستکردنی شیرە لەناو گوانی گیانلەبەراندا و ئەو دەزگایە شیری پر لە خێرو سوود لە نێـوان خـوێن و پاشـەڕۆدا دەردەهێنێت پە پارێزراوی لە گوانەکاندا دایئەنێت بۆ بەرژەوەندی مرۆڤەکان

هــەروەها ڕازی نییــە بەســتەم، کوشــتنی کەســیك بــە ناهــەق وەك کوشــتنی مرۆڤایەتییــە، ســزای ســەختی دانــاوە بــۆ بکــوژ و ڕێگاکــانی کوشــتنی ناهــەقی کوێرکردۆتەوە و شەڕیشناکات لە پێناو بەدیهێنانی ئاشتیدا نەبێت ئەمانە هەمووی بەبەڵگەوە لەدێژەی ئـەم وەڵامانـەدا ئەسـەلمێنرێت بـۆ نوسـەریش و عەوداڵـەکانی ڕاستیش (ان شاء الله).

با ئێستە ڕوداوی کەسێ بگێڕینەوە لەسەر زمانی خۆیەوە کە زیاد لە من و ئێوەش ئەم ئایینانەی ناسیوە کە کاکی بێناونیشان پیایاندا هەڵدەدا نەك لەبەر باشی ئەوان بەڵکو لەبەر بوغزی بۆ ئیسلام.

کابرایەك بەناوی ڕەحمەت بۆنرو کەوەك خۆی دەریبڕیوە لە عەودالبوونی بەدوای دۆزینەوە و ئەزمونکردنی دینەکاندا زۆر شوێنگەڕاوە و بەچاوی خۆی زۆر شتی دیوە و هۆکاری دەستبەرداربوونی لەهەر یەکێك لەو دینانە باس ئەکات و ئەوەی جێگەی مەبەستی ئێمەیە لە چیرۆکەکەیدا لێرەوە دەست پێئەکات و ئەڵێت: ـ ماوەیەکی کورت ئایینی بوزیشم تاقیکردەوە و تێگەیشتم ئەو ڕاستیەی من وێڵی بووم لە ئاینی بوزیدا بوونی نیە و پاشان پەیوەندیمکرد بە ئاینی هیندۆسییەوە کە لەهیندستاندا دروستبوبو لە دوورگەکانی ئەندەنوسیادا پەرەی سەندبوو منیش لەنێوان ئەو دورگانەدا گەشتم ئەکرد کە پڕبوو لە چالاکییەکانی شوێنکەوتەی ئەو ئایینە و ماوەیەك لەناویاندا مامەوە تا فێری زۆربەی تەعالیمەکانیان بووم  و سەرکەوتنم بەدەستهێنا توانیم زۆر کاری سەرسوڕهێنەر بکەم وەك ڕۆیشتن بەسەرئاگر و بزماری تیژدا لەش ئاژنینن بەسیخ  بەڵام ئەمەش ئارەزوی منی تێرنەکرد و تینوێتی منی نەشکاند ، تا ڕۆژێك لە سەرۆکی پەرستگای هیندۆسەکانم پرسی چی ئەپەرستن؟

وتی:ـ (بەرهماو ویشنۆ و شیوا)  بەرهما خوای دروستکراوەکانە و ویشنۆ خوای چاکەیە و شیواش خوای خراپەیە ئەو سێ خوایە لەلەشی مرۆڤێکا بەرجەستە بووە بەناوی کریشنا کە بەڕزگارکاری جیهان ناوزەدکراوە لای هیندۆسەکان، ڕەحمەت بورنومو ئەڵێت لەدڵی خۆمدا وتم: کەواتە خوا پەرستی لای ئەمان و لای گاورەکان جیاوازییەکی نییە مەگەر لە ناوەکاندا نەبێت ئەوانیش سێ لە یەکیکدا بانگ ئەکەن، بە کاهینە هیندۆسییەکەم وت: باسی گەشەی کریشنا م بۆ بکە. وتی: ـ دوو هەزارساڵ پێش زایین لە هیند پاشایەکی ستەمکار هەبوو بەزەی بەکەسدا نەدەهات تەنانەت منداڵ نێرینەکانی خۆی ئەکوشت نەك سبەی

کورسییەکەی لێداگیرکەن، لە شەوێکی تاریکدا ئەم پاشایە لەبەردەم کۆشکەکەیدا دانیشتبوو بینی ئەستێرەیەکی درەوشاوە لەڕاسەریدا بەخێرایی ئەڕۆیشت پاشان وەستا و روناکییەکەی خۆی ناردە ناو گەوری مانگاکان کاتێك ئەم پاشایە پرسو ڕای زانایانی خۆیانی بیست ووتیان ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی خوا لە مرۆڤێکدا بەرجەستە ئەبێت کەناوی نهینی ئەو کەسە کریشنایە، منیش لەدڵی خۆمدا ووتم: ئەمە هەر هەمان چیرۆکی ئاینی مەسیحییە لەگەڵ گۆڕینی کاراکتەرەکانی و خۆیشم کاتێك قەشەیەکی مەسیحیبوم هەر ئاوام ئەوت بە خەڵکی و لادێکەی ئەمان لای ئێمە بەیت لەحم بوو مرۆڤەکەش مەسیحی ئێمەبوو کەواتە هەمان چیرۆکە و هەمان بنەمای عەقیدەییان هەیە و فریاد ڕەسە جیهانییەکەش هەمان پرۆسەیە، لەسەر گفتوگۆکردنم لەگەڵ ڕاهیبە هیندۆسییەکە بەردەوامبووم پێم وت: گەورەم ئەگەر من لەسەر دینی ئێوە بمرم بۆ کوێ ئەچم. وتی: نازانم بەڵام ئەبێت خۆت لە کوشتنی مێروەکانی وەك مێروولە و مێشولەو ئەوانیتر بپارێزیت، وتیشی: لەوانەیە لەناو ئەو مێروانەدا باوباپیرانی مردوی تۆ هەبێت.

ڕەحمەت ئەڵێت: بڕیارمدا وازلەهەموو ئایینەکان بهێنم و تەنها ئسیلام مابوو دیراسەی بکەم بەڵام لەبەر ئەو هەموو بوغزەی لەمندا چێنرابوو هەر لە منداڵیمەوەحەزم نەئەکرد لێی نزیك بمەوە و تەنها گومانەکانم دەربارەی ئیسلام ئەزانی، ئاواتم دۆزینەوەی ئەو ڕاستیە نادیارەبوو کە ئارامگری و کۆششی بەردەوامی ئەویست، ڕۆژێك بەژنەکەمم ووت: لەم شەوەوە نامەوێت کەس بێزارمکات، ئەمەوێت بەتەنها لەخوا بپاڕێمەوە، بەم شێوەیە دەرگام لەسەرخۆ پێوەدا و هاوارمکرد: ئەی خوایە ئەگەر بەڕاستی تۆ هەیت ئەوا دەستمبگرە بۆ رووناکی و ڕینمونیم بکە بۆ ئەو ئایینەی کەڕاستە و تۆ پێی ڕازیت بۆ خەڵکی دین بێت.

ئەم بەڕێزە "رەحمەت بۆنۆمۆ" دێژە بەباسەکەی ئەداو ئەڵێت: بانگکردنی خوا وەك هیچ بانگکردنێکیتر نییەو منیش ئەو پاڕانەوەیەم بۆ ماوەیەکی کورت نەبوو بەڵکوو نزیکەی هەشت مانگ بەردەوام پاڕامەوە لە شەوی سی و یەکی مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٧١ کە بەرانبەر دەی ڕەمەزانبوو وەك جاران پاڕامەوە و خەوتم

لەو خەوەدا نووری هیدایەتی خواییم بۆهات، بینیم دوونیا لەچواردەورم زۆرتاریکە و هیچم بەدی نەئەکردو یەکسەر کەسێك لەبەردەممدا دەرکەوت لێی وورد بومەوە ئەبینم لەڕوویەوە روناکی دێت و دەورم روناك ئەکاتەوە و ئەو پیاوە پیرۆزە زیاتر لەمن نزیککەوتەوە بینیم بەرگێکی سپی و میزەرێکی سپی لەسەرەو ڕیشێکی لول و روویەکی گەشی هەیەو لەتەمەنمدا وەك ئەو جوانم نەدیبوو بە دەنگێکی پڕلەمیهر ووتی شایەتومان بهێنە وتم شایەتومان؟ چونکە تا ئەوکاتە هیچم دەربارەی شایەتومان نەبیستبوو، فەرمووی: بڵێ: اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمدا رسول الله، منیش سێجار ووتمەوە، ئیتر پیاوەکە دیار نەما. کاتێك لەخەو هەستام ئەبینم هەموو لەشم لە ئارەقدا خوساوە، ئیتر هەرکە یەکەم موسوڵمانم بینی پرسیارم لێکرد شایەتومان چییەو لای ئێوە چی ئەگەیەنێت؟ ووتی یەکەم ڕوکنی ئاینی ئیسلامە هەرکەس بیڵێت ئەبێتە موسڵمان، داوامکرد واتاکەیم پێبڵێ ئەویش بۆیڕاڤەکردم ئیتر کەوتمە خولیای ئەوەی ئەبێت ئەو پیاوە پیرۆزە کێ بوبێت کەمن بینیم لەخەومدا کاتێك وەسفەکەیم بۆ هاوەڵە موسڵمانەکەمکرد، هیتافی کێشاو ووتی ئەوە موحەمەد پێغەمبەرت دیوە،.(رجال ونساء اسلموـ لعبد الرحمان محمود ص ١٣٠ ج ١ )

ئەوە راستی ئەو ئایینانەی هیندۆسەکانە کە ئەم لێرەوە بانگەشەی بۆ ئەکات و پیایدا هەڵئەدات، کریشنا بۆچی داوائەکات کە زیان بەگیانداران نەگەیەنن؟ ئایا وەرگێڕ ئەوەی زانیوە؟ ئایا ئەزانن بۆ باسی نەکردوە؟چونکە ئەو دۆستایەتیەیان بۆ مێرو لە خورافەیەکەوە سەرچاوەیگرتوە " ئەوان بڕوایان وایە و وائەزانن گیانی باوباپیرانی مردوو دەچیتە جەستەی ئەو مێرو ئاژەڵانەوە نەك لەبەر پاراستنی مافی گیانداران و ناساندنیان وەك میللەتێك وەك ئەوەی لەئاینی ڕاستی ئیسلامدا هاتوە، ئەوەش لەخوا کانی ئەو ئایینەی کە ئەم بەشانیدا ئەڵێ کەهەمووی خورافەو چنراوی خەیاڵدانەو هیچ بنەمایەکی زانستی و عەقڵی پشتگیری ناکات.

## قورئان وشەڕەنگێزی

کاکی وەرگێڕ بە کۆتاییەکانی خاڵی چوارەمیدا دەریخستوە بۆچی بەباڵای ئایینە دانراوەکانی دەستی مرۆڤ و خواستی دونیا ویستاندا هەڵئەدات و گللەیی لە ئیسلام ئەکات چونکە ئیسلام بە بۆچوونی ئەو خالید و جەزیرەو عەلیی کیمیایی دروستکردوە و سێگۆشەی مەرگ ئەخولقێنێ و پێی وایە قورئان و موحەمەد عەرەبیان کردۆتە شەڕەنگێزترین میللەتی ئەم سەر زەوییە !

ئەم بوهتان و وەهمە لە هەموو لایەکەوە ناراست و بێویژدانییە " قورئان و تەعالیمەکانی قورئان بۆ ژیانەوە و خۆشگوزەرانی خەڵکییە، پێغەمبەر موحەمەد بە ڕەحمەت نێرراوە بۆ خەڵکی و خۆیشی نیانترین و بەبەزەیی ترینی مرۆڤەکانە بەشایەتی دۆست و دوژمنی خاوەن ئینصافیش، واقیعی موسوڵمانانیش ئەوەی سەلماندوە کە چەندە پابەندی ئیسلام بوبن ئەوەندە لەخزمەتی خەڵکیدا ژیاون و ئەوەندە خەڵکی ئەمین بوە لەدەست و زمانیان.

بەڵام ئیسلام دوورە لەخراپەی هەموو خراپەکارێك کە بیەوێت لە ژێر پەردەو پۆشاکی ئیسلامدا مەرام و حەزی شەڕەنگێزی و ئاژاوەگێری خۆی پیادەبکات و

و موسڵمانیش هەرگیز بۆ جیاکردنەوەی باش لە خراپ بەهەڵەدا ناچێت چونکە پێوەرە قورئانی و فەرموودەییەکان لەبەردەستایە بۆ کەسێ بیەوێت بیری ڕووناکبێت، ئێمەی موسوڵمان ئیسلام فێری کردوین کە مرۆڤەکان جگە لە پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێت هەموویان هەڵە ئەکەن و شایستەی هەڵەکردنن بۆیە نابێت لە وەسف و بەگەورە دانانی کەسایەتییەکاندا ڕۆبچین و نابێت ببینە کەس پەرست، ئەمەش لەو شانازیانەیەی ئیسلامە کە ئازادی مرۆڤەکانی پێپاراستوە لە حەزی پاوانخوازی و بەکۆیلەکردنی خەڵك.

هەرچەندە تیشکی خۆر ئاماژە بۆکردنی ناوێت لەگەڵ ئەوەشدا بۆ ئەو کەسانەی کە خۆیان بە نابینا پیشان ئەدەن بیر خستنەوەی لەوانەیە سوودی هەبێت بەڵکو چاویان بکەنەوە یان ئەوەی چاویان پێبەستوە بیکەنەوە فڕێیدەن .

هەندی لە تەعالیمی قورئانی بۆ فەراهەمهینانی ئاشتی و خۆشگوزەرانی: ـ

سەرکردە و کاربەدەستەکانمان ئەبێت ئاوابن: ـ

فَبِمَا رَحْمَةٍ مِنَ اللَّهِ لِنْتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنْتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانْفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الْآمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ (١٥٩)

ئەی موحەمەد بەبەزەیەك لەخواوە تۆ ئاوا نەرمبووی بۆیان ئەگەر تۆ گرژو توند و دڵڕەق بووایەی ئەوا لە دەوری تۆ هەڵئەتەکین، کەواتە چاوپۆشیانلێبکە و داوای لێخۆشبونیان بۆبکە لەخوا و لە کاروباری گرنگدا ڕایان وەرگرە و کاتێك کردتە بڕیار پشت بەخوابە خوا ئەوانەی خۆشئەوێت کە بەپشتیوانی ئەو کارئەکەن.

سەرکردەیەکی نەرمونیان لەگەڵ عامی خەڵك، زمان شیرینی دڵنەوا، دڵسۆز و لێبوردە، خاکی و گوێگر بۆ ڕاوبۆچونی چین و توێژەکان.

إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تُؤَدُّوا الْآمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُمْ بَيْنَ النَّاسِ أَنْ تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ إِنَّ اللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُمْ بِهِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا (٥٨) النساء

واتە: خوا فەرمانتان پێئەکات سپاردەکان بدەنەوە دەست شیاوو خاوەنەکانیان و هەرکات لەنیوان خەلکدا دادوەریتانکرد ئەبێت فەرمانتان بەداد بێت و خوا بەباشترین ئامۆژگاریتان ئەکات و خوا بیسەری بینەرە.

کەسی شیاو بۆشوێنی شیاو و پاراستنی هەموو جۆرە سپاردەیەك کەهەموو شتێکی هاولاتی لای کاربەدەستان سپاردەیە، بەرپاکردنی داد و حیساب نەکردن بۆ کەس جگە لە بیسەری و بینەری خوا . ئەمە لە کوێدا هەیە جگە لەقورئان.

کۆمەڵگەی ئیسلامیش بەگشتی لەسەر ئەم تەعالیمە ناوازانە پەروەردە ئەکرێن:

وَسَارِعُوا إِلَى مَغْفِرَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالْآرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ (١٣٣) الَّذِينَ يُنْفِقُونَ فِي السَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ

يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ (١٣٤) وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِهِمْ وَمَنْ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا اللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا عَلَى مَا فَعَلُوا وَهُمْ يَعْلَمُونَ (١٣٥) أُولَئِكَ جَزَاؤُهُمْ مَغْفِرَةٌ مِنْ رَبِّهِمْ وَجَنَّاتٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَنِعْمَ أَجْرُ الْعَامِلِينَ (١٣٦)

واتە: ـ پێشـبرکێ بکـەن بـۆ لێبورنێك لای خاوەنەكـەتان و بـۆ بەهەشـتێك كـە پانتاییەكەی پانتایی ئاسمانەكان و زەوییە ئامادەكراوە بـۆ پارێزكـاران " ئەوانـەی لە خۆشی و ناخۆشیدا ئەبەخشن و جامی ڕقیـان ئەخۆنـەوە و لەخـەڵك خۆشـئەبن خوا چاككارانی خۆشئەوێت * ئەوانەش ئەگەر كارێكی ناشیاویانكرد یان سـتەمیان لەخۆكرد یەكسەر خوابەیاد ئەكەن و داوای لێخۆشبوونی تاوانەكانیان ئەكەن و كـێ وەك خـوا لەتاوانـەكان خۆشـئەبێت و سـوورنابن لەسـەر كردەوەكانیـان لەكاتێكـدا ئـەزانن * ئەوانـە پاداشـتیان لێبوردنـە لای خاوەنەكەیانـەوە و باخـاتێكیش كـە جۆگەكانی پێدا ئەڕوات و هەمیشەییە بۆ ئەوان و باشترین پاداشتی ڕەنجدەرانە *

قُلْ تَعَالَوْا أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ أَلَّا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا وَلَا تَقْتُلُوا أَوْلَادَكُمْ مِنْ إِمْلَاقٍ نَحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ وَلَا تَقْرَبُوا الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَلَا تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ ذَلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ (١٥١) الانعام

واتـە: ـ بڵـێ:وەرن بائـەوەی خـوا لـە ئێـوەی قاغـەكردوە بۆتـانی بخوێنمـەوە: هاوەڵ بۆ خـوا دامـەنێن، لەگـەڵ دایكـو باوكـدا چـاكەبكەن، منداڵـەكانتان مـەكوژن لەترسی بژێوی ئێمە ئەوانیش و ئێوەش ڕۆزی ئەدەین، نزیك خراپەی دیـارو نادیـار مەكـەون، بەناهـەق كـەس مـەكوژن، ئەمانـە بـوون وەسـییەتەكان بـەڵكو ئێـوە وابەستەی بن.

وَاعْبُدُوا اللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا وَبِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَالْجَارِ ذِي الْقُرْبَى وَالْجَارِ الْجُنُبِ وَالصَّاحِبِ بِالْجَنْبِ وَابْنِ السَّبِيلِ وَمَا

مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ مَنْ كَانَ مُخْتَالًا فَخُورًا (٣٦) الَّذِينَ يَبْخَلُونَ وَيَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبُخْلِ وَيَكْتُمُونَ مَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ عَذَابًا مُهِينًا (٣٧)

واتــە: ـ خـواش بپەرسـتن و هـیچ هاوبەشـی بـۆ دامـەنێن بـەدایكو باوكتـان چاكەبكەن بە خزم و هەتیوو هەژار و هاوسێی نزیك و تەنیشت و هاوسەرو ڕێبوار و كارمەندەكانتان چاكەكارین خوای گەورە كەسی لوتبەرزو خۆبـەزلزانی خۆشـناوێت * ئەوانەی چرووكن و فەرمان ئەكەن خەڵكیش چروكبێت و ئەوەی خـوا بـە فـەزڵی خۆی پێیداون ئەیشارنەوە بۆ كافرەكان سزای ڕیسواكارمان ئامادەكردوە.

وَمَا لَكُمْ لَا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا وَاجْعَلْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ وَلِيًّا وَاجْعَلْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ نَصِيرًا (٧٥)النساء

واتە: ـ ئەوە بۆ لەپێناوی خوا و ژن و پیاو و لاوە چەوساوەكاندا ناجەنگن، ئەو چەوسـاوانەی ئـەڵێن ئـەی خاوەنكـەمان لـە ئـەم شـوێنەی كـە كاربەدەسـتەكانی ستەمكارن دەربازمانكە و لای خۆتەوە پشتیوان و فریادڕەسێكمان بۆ بنێرە.

ڕازی نەبوون بەستەمی كاربەدەستان و ڕزگاركردنی چینی چەوسـاوە لـە كـارە بنەڕەتییەكانی موسڵمانانە و لەپێناوی خوادایە.

مَنْ يَشْفَعْ شَفَاعَةً حَسَنَةً يَكُنْ لَهُ نَصِيبٌ مِنْهَا وَمَنْ يَشْفَعْ شَفَاعَةً سَيِّئَةً يَكُنْ لَهُ كِفْلٌ مِنْهَا وَكَانَ اللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ مُقِيتًا (٨٥) وَإِذَا حُيِّيتُمْ بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ حَسِيبًا (٨٦) النساء

واتــە: ـ هەركــەس شــەفاعەتێكی باشـبكات ئــەوا بەشــی ئـەبێت تیایـدا و هەركەسـیش بـەخراپ شـەفاعەتبكات ئـەوا بەریئەكـەوێت خـوا بـۆ ئ هەمووشـتێك كاتێكی داناوە * ئەگەر بەسڵاوێك سڵاوتان لێكرا بە باشتر لە ئەو سڵاوە یـان وەك ئەو بیدەنەوە خوا هەموو شتێك هەژمارئەكات.

نوێنەرایەتی و بریكاریكردن بەچاكە بـۆ كەسـانی نـەتوان لـەكارە خێرەكانـە و پاداشتی لەسەرە و پێچەوانەكەیشی پێچـەوانەیە و سـڵاو بڵاوكردنـەوە و پاداشـتی

چـاکەی خـەڵکی بەچـاکتر و وەرگرتنــی بەهەشـت لەسـەر خزمـەتکردنی خـەڵکی لەکامە تەعالیمدا هەیە جگە لەئیسلام.

ئەمانـەو چـەندەها بـەهرەو بەخششـی خـوایی لـە قورئانەکـەی خـوادا هەیـە و پێغەمبەری خۆشەویستیش بـە فـەرموودە شـیرین و کـرداره گـەورەکانی ئەوانـەی ڕوونکردۆتەوە.

لە ساباتی دڵڕفێن و ئـارامی ئیسـلامەوە بێینـەوە بـۆ دەرهێنـان و دیـاریکردنی دڕك و داڵی نوسینەکانی وەرگێڕو قەشە ی نوسەر:

خالید و جەزیرە و عەلی کیمیاوی بەبەرهەمی ئیسـلام ئـەزانێت. ئێمـەش ئـەڵێن بەڵێ خالید کە مەبەسـتی خالیـدی کـوڕی وەلیـدە بەرهـەمی ئیسـلامە بـەڵام عـەلی کیمیاوی کە مەبەستی ئەو سـتەمکارە بەعسـییەیە کـە حیزبـی بەعسـی ئیشـتراکی بەرهەمی هێنا و ئەویش وەك وەرگێڕ لەوانەیە لەدایك و باوکێکی بەڕگـەز موسـڵمان بوبێت بەڵام پێشئەوەی لـەکانیاوی سـازگاری ئیسـلام بخواتـەوە و بـەو سەرچـاوە گەشەبکات لایدابێت و ئیسلام لەلاری ئەوان بەرییە.

کـەناڵی (الجزیـرة) ش ئێمـە نـازانین کێـی لەپشـتە و بـۆکێ کارئـەکات، هـیچ بەرگرییەکی لێناکەین و تفەنگیش بە تاریکییـەوە نـانێین، بـەڵام لەوانەیـە وەرگێـڕ بۆیە پێی قەڵسە چونکە بوێرانە پەردە لەسەر زۆربەی نهێنییـەکان هەڵئەداتـەوە و لەوانەشە بترسی لەوەی سەرە بێتە سەر شتانێك بۆ ئەو باشنەبێت، ئەگین بـۆ لـەو هەموو کەناڵەی تر کە ئیسلامییەو کـاری خێرخـوازی پـەروەردەیی لەئەسـتۆگرتوە باسی (الجزیرة) ئەکات کە نەخۆی و نەکەسیش نەیووتوە کەناڵێکی ئیسلامییە.

خالیدی کوڕی وەلیـد خـوا لێـی ڕازی بێـت شـۆڕە سـوارو نەبـەزی بـەرەکانی جەنگ و ڕوبەڕو بونەوەبوو، شمشێری تیژی خوا بوو بۆ لەناوبردنی هەموو ئەوانەی لەبەردەم ئازادی خەڵکیدا ئەوەسـتان و ئـازادی ئایینیـان قەدەغەئـەکرد، دەسـتی زاڵمەکانی ئەگرت تا چەوسـاوەکان ڕزگاربکـات، ئـەو فەرمانانـەی خـوای جێبـەجێ ئـەکرد کـە لەسـەرەوە باسمـانکرد واتـە لـە پێنـاو پیـاوو ژن و منـاڵێ چەوساوەدا

ئەجەنگا تا رزگاریانکات، هەتا لەدونیا دەرچوو لە ڕەنجی بێوچاندا بوو " تەپوتۆز، برینداری، نەخشەکێشان، بێداریشەوان، شاخ بەشاخ و غەریبی وولآتـان بەشـیبوو ئەگەر لەپالٌئەمانەشدا جارێك لەبۆچونەکانیدا بەپێکابێت ئەوە سروشتییەو ئەویش مرۆڤ بووە، دادپەروەری نییـە کەسـێکی بێناونیشـان بێرێـزی بەرانبـەر بکـات ! !، وەرگێرلەم پەڕاوەیدا چەندەها جار ناویئەهێنی بێئـەوەی بەلگەیـەکی ڕوون بـدات بەدەسـتەوە، هـەموو ئازایـەتی و خۆنەویسـتی و فیداکارییـەکانی خالیـد لـە پێنـاو چەوساوەکاندا بە خوێنرێژی وەسف ئەکات و فرمێسکیش ئەرێـژێ بـۆ نـەیارەکانی ئیتر هەرکەس وکۆمەڵێك بن.

شەڕو ململانێ لەسەر زەویدا هەربووە و هەر ئەشبێ ئەمـە ڕاسـتییەکی حاشـا هەڵنەگرە بەلآم پالٌنەری ئـەو ململانـێ و جەنگانـە جیـاوازن هەیـە تـەنها لـە پێنـاو مانەوەی خـۆیی و حـەزی دەسـەلآتداریدا ئەجـەنگێ و هەیشـە بـۆ دورخسـتنەوەی ستەم لەخۆی و میللەتەکەی ئەجەنگێ وجەنگی پێغەمبەر صـلی الله علیـە وسـلم و یارانی بەرێزیشی تەنها لەگەڵ ئەوانەدا بوو کە ئەبوونە ڕێگر لە ئـازادی بانگەشـەی بیری ئیسـلامی و ئەوانـەی خـەڵکیان بەکۆیلـەی خۆیـان ئـەزانی، عومـەر ئاسـا کـە ئەیفەرموو (متی استعبدتم النـاس وقـد ولـدتهم امهـاتهم احـرارا) ئـەوە لەکەیـەوە خەڵکیتان کردۆتـە کۆیلـە کـە ئـەوان بـەئازادی لـەدایك بـوون) بـەڵێ ئەجـەنگا بـۆ ئەوەی کەس نەکرێتە بەندەی کەس و هەمووی بەندەی خوای بەدیهێنـەری تاقانـە بێت و هەمووی یەکسان بن وەك دانـەکانی شـانە، ئەجـەنگا بـۆ ئـەوەی لـە مـاڵی خرپـوەوەی لای دەوڵەمەنـدان بەشـی هـەژاران دەرکـات بـۆ ئـەوەی چـیتر خـەڵك نەخوێنـدەوار نـەبێت و هـەموی بخوێنێتـەوە فـەرمانی خـوایی (اقـرأ)، بەخـەڵکی بگەیـەنێت، ئـەم فەرمانـە خواییانـە ناحـەز و ڕێگـری زۆرە و دژەوانـەی خواسـت و بەرژەوەندی ستەمکارانە بۆیە ئەو جەنگانەی خالید و یارانی پێغەمبەر توشـیانبوە لەو پێناوەدا بووە، ئەوان شایستەی ڕێزلێنان و پیاهەڵدانن، ئەوان وەلآمی خوایـان داوەتــەوە کــە ئەفــەرموێت: وَمَا لَكُمْ لَا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ

الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا وَاجْعَلْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ وَلِيًّا وَاجْعَلْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ نَصِيرًا (٧٥) واتە: ئەوە ئێوە چیتانە وا ناچنە غەزا لەرێی خودا و لە پێناو ئەوانەی ئەچەوسێنرێنەوە لە پیاوان و ژن و منالأن ئەوانەی ئەلالێنەوە ! ئەی پەروەردگارمان لەم شارەی کە دەسەلاتدارەکانی ستەمکارن ڕزگارمانکە و لەلای خۆتەوە یارو یاوەرێکمان بۆ دابنێ.

خالید و هاوەلانی ئەو یارو یاوەرانەبوون کە چەوساوەکانی جیهان چاویان لە ڕێبوو بۆیان، ئەوەی ئەوان کردیان بۆ خزمەتی خەڵکی لەکەسیتر ناوەشێتەوە چونکە بەخشینی هەمووتەمەن بوو بێئەوەی چاوەڕێی پاداشتەکەی لەکەس بکەن.

## پێنجەم

لەم خاڵەشدا ئەلێت: ئەوانەی سەر بەپەراوێکی وەك قورئانن و بەهیوان دەسەلات بگرنە دەست، کە هێشتا نەیانگرتۆتە دەست نایانەوێت ڕوناکبیر سەر بەهیچ ڕەوتێکی دیاریکراو بێت بەلام ڕوناکبیری ئاینی کە بۆخۆی سەربەئایدۆلۆجیاو حیزبێکی ئیسلامییە کە حەتمەن بەستایلی جیاوازو لە ڕێبازو فەرهەنگی قورئانەوە سەرچاوە دەبەستێت داوا لەڕوناکبیران دەکات کەحیزبی نەبن و سەر بەهیچ ڕێبازێکی فکری و سیاسی و فەلسەفی و کۆمەلایەتی نەبن، بۆئەوەی حیزب خودابیەکان واتە گروپە حیزبیە ئیسلامییەکان ئەو ڕۆشنبیرانە بەڕۆشنبیر وەسفکەن واتە بۆناوزەدکردنی کەسێك بەڕوناکبیر لەلایەن کەسایەتی ئیسلامگەراوە چەند پێودانگ و مەرجێك دانراوە:...هتد.)

وەلام: خوێنەری هۆشیار ئەمە پێشدەستیەکە بۆ هۆنینەوەی مەرجەکانی لە ئەلیفەوە بۆ واو و ئیتر بەئارەزی خۆی و لەوەهمی خۆیەوە دلو نیازەکانی دلی موسولمانان ئەخوێنێتەوە چۆن خۆی بەخەیاڵ دونیایەك شتی لەخۆی زلکردوە ئەیەوێت خەڵکیش باوەڕبکەن نازانێت ڕوناکبیری ڕاستەقینە داوای بەلگەئەکات لەسەرقسەکان، کەچی لێرەدا نوسەر نادیارە و سەرچاوەی نقل نادیارە. بۆنمونە

ئەڵێت: ڕوناكبیری ئاینی ئـەو مەرجانـەی دانـاوە !! ناڵێـت ئـەو مەرجانـە لـە كـام سەرچاوەدا هاتووە و كێداییناوە و ئەگەر ئیسلامییەكان وەكو خۆی ئـەڵێت هێشـتا دەسەڵاتیان نەگرتۆتە دەست ئیتر چۆن و بەكام دەسـەڵات ئـەتوانن مـەرج لەسـەر نوسەری عیلمانی دابنێن كە كول فی كول خۆیانن و خاوەن دەسەڵاتن ئـەوە جگـە لە وەهم یان بوختان هیچیتر نییە.

مەرجەكانیش بێگومان دانەری نییە جگە لە نوسـەری بێناونیشـان، بـەڵام هـەر پێویست ئەكات لەسەر هەندێكیان هەڵوێستە بكەین لەبـەر نوسـەر خۆیشـی بـەڵكو بۆی بەسوود بێت.

## خوا بۆ باوەڕهێنان زۆر لە كەس ناكات

ڕوناكبیر دەبێـت بـاوەڕی بـە هـەبوونی (نـابونێكی وشـەیی) هـەبێت (دەبێـت ناوزەدی ئـەو نابونـەش (ئـەڵڵاه) بێـت بـەو مواسـەفات و قیاسـاتەش بێـت كـە لـە بیروێنا (خەیاڵدان) ی عەرەبی قورئاناوی بووەوە سەرچاوەی بەستبێت.

وەڵام: كەسی موسڵمان هـەمووی بـاوەڕی وایـە كـە خـوا خـۆی بـۆ هیدایەتـدان زۆری لەكەس نەكردوە و هەڵبژاردنی داوەتە دەست خەڵكی وەك ئەفـەرموێت: وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَآمَنَ مَنْ فِي الْآرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا أَفَأَنْتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ (٩٩) يونس

ئەی موحەمەد ئەگەر خاوەنەكەی تـۆ ویسـتی لەسـەر بوایـە هـەموو سـەرزەوی باوەڕیانئەهێنا ئایا تۆ زەبر لەخەڵكی ئەكەیت تا باوەڕدارین..

وَقُلِ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكُمْ فَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُرْ إِنَّا أَعْتَدْنَا لِلظَّالِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا وَإِنْ يَسْتَغِيثُوا يُغَاثُوا بِمَاءٍ كَالْمُهْلِ يَشْوِي الْوُجُوهَ بِئْسَ الشَّرَابُ وَسَاءَتْ مُرْتَفَقًا (٢٩) إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ مَنْ أَحْسَنَ عَمَلًا (٣٠) الكهف

بلّێ ئـەوەی ڕاسـتییە لای خاوەنەكەتانەوەیـە كەواتـە هەركەسـێك وویسـتی بـا بـاوەڕبهێنێ و هەركەسـیش ویسـتی بـا كـافر بێـت ئێمـە ئامادەمـانكردوە بـۆ بێباوەڕەكان ئاگرێك وەك چادر چوادەوریان ئـەگرێت كـاتێكیش هـاوار ئەكـەن بـە ئاوێكی وەك كانزای تواوە بەهانایانەوە دێـن دەمووچـاوەكان ئـەبرژێنێ خـراپترین خواردنەوە و هاودەم * ئەوانەش كەباوەڕئەهێنن و كاری چاكە ئەكەن ئێمە كەسێ كارەكانی چاك بێت بەفیرۆی نادەین.

هَلْ أَتَى عَلَى الْإِنْسَانِ حِينٌ مِنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُنْ شَيْئًا مَذْكُورًا (١) إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنْ نُطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا بَصِيرًا (٢) إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا (٣) إِنَّا أَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ سَلَاسِلَ وَأَغْلَالًا وَسَعِيرًا (٤)

ئایا بەسەر مرۆڤەكاندا كاتێك هاتووە كە ئەو شایستەی باسـكردن نـەبووبێت * ئێمە مرۆڤمان خولقاند لە ئاوێكی ئاوێتە پاڵفتەی ئەكەین و كردمانە بیسەری بینەر * ئێمـە ڕێنمامـانكرد بـۆ ڕێگاكـان ئـیتر یـان ئەبێتـە پێـزان و سوپاسـگوزار یـان زۆربێبـاوەڕ ئـەبێت * ئێمـە بـۆ بێباوەڕەكـان ئامادەمـانكردوە زنجـیرو كـۆت و كوڵێنەر.

فَذَكِّرْ إِنَّمَا أَنْتَ مُذَكِّرٌ (٢١) لَسْتَ عَلَيْهِمْ بِمُصَيْطِرٍ (٢٢) إِلَّا مَنْ تَوَلَّى وَكَفَرَ (٢٣) فَيُعَذِّبُهُ اللَّهُ الْعَذَابَ الْأَكْبَرَ (٢٤) إِنَّ إِلَيْنَا إِيَابَهُمْ (٢٥) ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُمْ

بەیاد بهێنە تۆ تەنها بەیادكاریت * تۆ بەسەردڵی ئەواندا زاڵ نیـت * ئەوانـەش كە بێباوەڕن * الله سزا گەورەكەیان ئەدات * گەڕانەوەیان بۆلای ئێمەیە و لەسـەر ئێمەشە حیسابكردنیان.

ئەم ئایەتانەو چەندەها ئایەت وفەرمودەی تر ئیمەی موسوڵمانی فێركردوە كـە باوەڕهێنـان بـەزۆر نییـە خـەڵكی ئـارەزوی خۆیـەتی چـی هەڵئەبـژێری تـەنها ئەوەندەمان لەسەرە كە ئەوەی ئەیزانین ئـەبێت بـەگوێی خەڵكیـدا بـدەین ئـەویش لەبەرئەوەی خواو پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) لەسەرمان واجبـی كـردوە

کەدڵسۆز بین و خەڵکی بانگ بکەین بۆ ڕێگاکەی خوا بە حیکمەت و ئامۆژکاری چاك و موناقەشەکردن لەگەڵیان) .

ئەمانە هەموو بەڵگەن لەسەر ئەو ئازادییەی خوا بەخشیویەتی بەبەندەکانی و موسڵمانیش پیادەی فەرمانی خاوەنەکەی ئەکات.

## کەسێ ڕوناکبیربێت ئەزانێت قورئان زادەی ئەقڵی مرۆڤ نیە

لە خاڵی (ب) دا وەرگێرئیدیعای ئەوە ئەکات کە ڕوناکبیری ئاینی بەمەرجی داناوە: نابێ روناکبیر بڵێت قورئانیش هەروەکو هەرپەڕاوێکی تر زادەو دەرچوی ئەقڵی مرۆڤە و لەسەر ئەرزشێکی پێشینەو زەمینەیەکی کۆمەڵایەتی و ئابووری و فەرهەنگی سەردەمەکەی خۆی و بەر لەخۆی بنیاتنراوە دەشێت لە هەڵەی فیکری و مەعریفی بەدەر نەبێت.

وەڵام: ئەمەی کەتۆ ئەتەوێت بیڵێیت زۆر کۆنەو ئەگەر نازانی ئەوا با پێت بڵێم ئەم قسانەی قەشە فادی کەوەرتگرتووە و ئەیڵێیتەوە لە سەردەمی دابەزینی وەحی خوایشدا ئەوترا و خوا بۆ ئێمەی باسکردوە و وەڵامیشی داوەتەوە وەك ئەم چەند ئایەتە پیرۆزە :

وَمَا كَانَ هَذَا الْقُرْآنُ أَنْ يُفْتَرَى مِنْ دُونِ اللَّهِ وَلَكِنْ تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ الْكِتَابِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِنْ رَبِّ الْعَالَمِينَ (٣٧) أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِثْلِهِ وَادْعُوا مَنِ اسْتَطَعْتُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ (٣٨) بَلْ كَذَّبُوا بِمَا لَمْ يُحِيطُوا بِعِلْمِهِ وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُ كَذَلِكَ كَذَّبَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ فَانْظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الظَّالِمِينَ (٣٩) وَمِنْهُمْ مَنْ يُؤْمِنُ بِهِ وَمِنْهُمْ مَنْ لَا يُؤْمِنُ بِهِ وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِالْمُفْسِدِينَ (٤٠) وَإِنْ كَذَّبُوكَ فَقُلْ لِي عَمَلِي وَلَكُمْ عَمَلُكُمْ أَنْتُمْ بَرِيئُونَ مِمَّا أَعْمَلُ وَأَنَا بَرِيءٌ مِمَّا تَعْمَلُونَ (٤١) وَمِنْهُمْ مَنْ يَسْتَمِعُونَ إِلَيْكَ أَفَأَنْتَ تُسْمِعُ الصُّمَّ وَلَوْ كَانُوا لَا يَعْقِلُونَ (٤٢)

واتە: ئەم قورئانە نابێت هەڵبەستراو بێت و نابێت لای بێجگە لەخواوە هاتبێت بەڵكو ئەم قورئانە ڕاستگێڕی پەڕاوەكانی پێشخۆیەتی و درێژەی ئەم كتێبەش هیچ گومانێكی تێدا نییە و لای خاوەنی جیهانیانەوەیە * یان ئەڵێن موحەمەد خۆی دایڕشتوە و چنیویەتی بڵێ دەی ئێوەش سورەتێكی وەك ئەو بهێنن و ئەتوانن بانگی هەركەسێ بكەن جگە لەخوا بانگیان بكەن ئەگەر ئێوە ڕاست ئەكەن * بەڵكو ئەوانە ئەوە بەدرۆ ئەزانن كە نەیانتوانیوە بەتەواوی لە زانستەكانی شارەزابن و هێشتا تەئویلی قورئانیان بۆ نەهاتوە، هەر بەم شێوەیەش ئەوانەی پێشوو باوەڕیان نەكرد دەسەیر بكە سەرەنجامی ستەمكارانی پێشوو چۆنبووە * هەیە باوەڕی بەقورئان هێناوە و هەیشە باوەری پێی نییە خوا بەكەسانی گەندەڵكار زاناترینە * ئەگەر ئەوانە هەرباوەڕیاننەهێنا ئەوا بڵێ كارەكانی خۆم بۆ خۆمەو كاری خۆشتان بۆ خۆتان، ئێوە لەكردەوەكانی من بەرین و منیش لەكارەكانی ئێوە بەریم * لەناویاندا هەیە گوێ لەتۆ ئەگرێت ئایا تۆ ئەتوانیت كەڕ بیسەر بكەیت هەرچەندە ئەوانە عاقل نابن.

وَإِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا قَالُوا قَدْ سَمِعْنَا لَوْ نَشَاءُ لَقُلْنَا مِثْلَ هَذَا إِنْ هَذَا إِلَّا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ (٣١)الانفال

واتە: كاتێك ئایەتەكانی ئێمەیان بۆ ئەخوێنرێتەوە ئەیانووت بیستمان و ئەگەر ئێمەش بمانەوێت وەك ئەمە ئەڵێین، ئەمە هیچ نییە ئەفسانە كۆنەكان نەبێت.

وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ هَذَا إِلَّا إِفْكٌ افْتَرَاهُ وَأَعَانَهُ عَلَيْهِ قَوْمٌ آخَرُونَ فَقَدْ جَاءُوا ظُلْمًا وَزُورًا (٤) وَقَالُوا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ اكْتَتَبَهَا فَهِيَ تُمْلَى عَلَيْهِ بُكْرَةً وَأَصِيلًا (٥) قُلْ أَنْزَلَهُ الَّذِي يَعْلَمُ السِّرَّ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِنَّهُ كَانَ غَفُورًا رَحِيمًا (٦) وَقَالُوا مَالِ هَذَا الرَّسُولِ يَأْكُلُ الطَّعَامَ وَيَمْشِي فِي الْأَسْوَاقِ لَوْلَا أُنْزِلَ إِلَيْهِ مَلَكٌ فَيَكُونَ مَعَهُ نَذِيرًا (٧) الفرقان

واتە: ئەوانەی كە باوەڕیان نەهێنا وتیان ئەمە تەنها هەڵبەستراوێكە و خۆی دایرشتوە و چەندێكیتریش یارمەتیاندا، بەڕاستی ئەوەی هێنایان ستەم و درۆبوو

* وتیشیان ئەفسانە کۆنەکانە و کردویەتی بەنوسراو بەیانیان و ئێواران بۆی ئەخوێننەوە * بڵێ ئەوە دایبەزاندوە کە هەموو نهێنییەك لە ئاسمانەکان و زەوی ئەزانێت بەڕاستی ئەو زۆر لێبوردەی بەبەزەیە * ووتیان ئەمە چۆن نێرراوێکە خۆراك ئەخوات و بەزەویدا ئەڕوات با فریشتەیەك دابەزیبایە لەگەڵ ئەودا کاری ئاگادارکردنەوەی بکردایە.

کەواتە: ئەم قەوانانە زۆر کۆنن و لەگەڵ هاتنی قورئاندا ناحەزەکانی هەر ئەوەیان لەعەقڵ هەڵهاتوە ئەوانە بڵێن و قورئانیش زۆر بێباکانە لەپێشڕەفتی خۆی بەردەوامبووە باشترین وەڵامیش بۆ ئەو کەسانەی ئەڵێن قورئان وەك هەر پەڕاوێکیتر زادە و دەرچووی ئەقڵی مرۆڤەو لەسەر ئەرزشێکی پێشینەو زەمینەیەکی کۆمەڵایەتی و ئابووری و فەرهەنگی سەردەمەکەی خۆی..... و لەم جۆرە قسانە ئەوەیە بڵێین: ئەم قورئانە خوا ناردوویەتی کە هەموو نهێنییەکانی ئاسمانەکان و زەوی ئەزانێت و ئەم قورئانە ناوەڕۆکی پەراوەکۆنەکانیش لەخۆ ئەگرێت و بەڕاستیان ئەگێڕێت و پەڕاوێکە ئایەتەکانی جێتوند و کشاویشە ، نەگومان نەهەڵەی تێدانییە، ئەگەر بەکەمی ئەزانن ئادەی بتوانن وێنەی ئەو بهێنن، هۆی ئەوەی کە ئێوە باوەڕی پێناهێنن ئەوەیە شارەزاییتان بە زانستەکانی نییە و ڕاڤەو دەرەنجامەکانی نازانن.

لەگەڵ ئەمانەشدا هەموو کەس ئازادە لە باوەڕپێکردنی یان بەدرۆخستنەوەی چونکە خوا بۆ ئەوانەی بەدرۆی ئەزانن سزای قیامەتی ئامادەکردوە و لەدونیادا هەرکەس چۆن ئەیەوێت با بەوشێوە کاربکات.

## پیرۆزی بۆ قورئانە نەك وشەی عەرەبی

ج ـ لەم خاڵەشدا ئیدعای ئەوە ئەكات گوایە ئیسلامییەكان مەرجیانداناوە كە: نابێت ڕوناكبیر هەرگیز باس لە لاپەڕە ڕەش و پرلە تاوانەكانی مێژوی ئیسلام بكات دەبێت ووشەی عەرەبی پیرۆزە شكۆمەند ڕابگرێت.

وەڵام: ئەوەتا تۆ زۆر بێشەرمانە و بێبەڵگەو بوختان ئەكەیت و هەموو ناهەقییەك ئەڵێیت و چەندەهای وەك تۆش بەهەموو زمانێك تەییاركراون بۆ ئەو كارە و نەك هەر ئەوەندەش بەڵكو ئاسانكاریكراوە بۆ ئەو مژدەدەرانە لە ناو جەرگە و زێدی موسوڵماناندا بە پارەو موچەی چاكەوە لەناو چینی میردمناڵاندا ((ئەو چینەی جاریٚ بواری شارەزایی تەواوی نەبووە لە دینەكەی بگات)) بوختان بەدەم پێغەمبەری ئیسلام و ئیسلامەوە بكەن و تۆوی دوژمنایەتی ئسلامیان تێدا بچێنن و قوتابخانەی میدیای نمونەیی و جێرمایەی موژدەدەریش* نمونەیەكە لە خەرواری ئەو پیلان دژایەتییە زۆرەی بەرانبەر قورئان و پێغەمبەرەكەی ئەكرێت. چی ماوە نەتانووتبێت و نەتانكردبێت بەڵام كەئیسلام جوانەو پەڵە لەخۆناگرێت و لاپەڕەكانی مێژوی ئیسلامیش بەسەنەدەوە پارێزراوە و پڕە لەسەروەری و ڕەحمەت بۆ مرۆڤایەتی و هەموو درۆو بوختانێكیش كە بەرانبەری ئەكرێت شكست ئەهێنێ ئیتر ئەوە كەی واتای ئەوەیە لەبەر ئەوەی موسڵمانان ڕازی نین كەس ناتوانیت لەگوڵێ كاڵتر بەئیسلام بڵێت و بۆیە سەرناگرێت.

ئەوەش كە ئەڵێت دەبێت ووشەی عەرەبی پیرۆزو شكۆمەند ڕابگیرێت ئەوەش هەردرۆیە چونكە كەس بەو شێوەی نەووتوە و موسوڵمانان تەنها قورئان لەناو نوسینەكاندا بەپیرۆز و شكۆمەند ئەزانن و ئیتر هەموو نوسین و ووشەیەكیتر قابیلی هەڵە و ڕاستییە و خۆ ئەم پەڕاوەی تۆ وەرتگێراوە ووشەكانی عەرەبی بوون و بەناوی (هل القران معصوم) دوە بووە و پڕیشە لە ساختەكاری و درۆ چۆن ئێمە ئەبێت بچوكترین ڕێزو بەها دابنێین بۆ درۆ و بوختان و چەواشەكاری !! نا، كاكە "ئێمەی موسڵمان خوا فێری كردوین عەرەب و كورد و تورك و ئینگلیز لای

خوا یەکسانن و لە پێشترینیان ئەوانەن کەزیاتر چاککارن وەك خۆی ئەفەرموێت (ان اکرمکم عند الله اتقاکم) بەڕێزترینتان لای خوا ئەوانەن کە پارێز ئەکەن لە خراپە.، لەشکری ئیسلامی بەرفراوانیش باش لەمە حاڵی بوون بۆیە ئەبینین سوپاسالارەکانی مێژووی ئیسلامی تێکەڵ بوون لە کورد و عەرەب و هیندی و فارسی و... و بەهەمانشێوە لەشکرەکانیشیان، تەنها ئیسلامبوو کویلەی هیندی و قبتی تورکی هێنایە شوێنی بڕیار و بوونە خاوەن دەوڵەت و حوکمی هاونشتمانی عەرەبیشیان ئەکرد، ئیسلام خزمەتی مرۆڤایەتیکرد نەك خزمەتی تاکە زمانێك و تاکە میللەتێك و بوونی زمانەکان و خێڵ و میللەتەکانیش بەهۆکار ئەزانێت بۆ یەکترناسن و پێشکەوتن وەك خوا فێری کردوین (يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ (١٣)

واتە: ئەی خەڵکینە ئێمە ئێوەمان لەژن وپیاوێك خولقاندوە و ئێوەمان کردوە بە گەلی جیاواز و خێڵی جیاواز بۆ ئەوەی تەعاروف بکەن، بەڕاستی بەڕێزترینتان ئەوانەن کە پارێز لە خراپە ئەکەن.

## هاوسانی ئینسانەکان چۆن دێتەبوون؟

لە خاڵی (د)دا بەدەم ئیسلامییەکانەوە ئەڵێت: ڕوناکبیر نابێت باس لە وەکیەکی و هاوسانی ئینسانەکان بکات بە تایبەت وەکیەکی لە ڕوی دارایی بژێوەوە) چونکە پەنجەکانی دەست وەك یەك نین.

لە خاڵی پێشودا بۆ وەکیەکی و هاوسانی ئینسانەکان وەڵام هەیە بەڵام ئەوەی سەیرە پەندێکی کودی وەك لێچون ئەهێنێ بۆ قسەکانی و ئەیکاتە بەڵگە بۆ ئەوەی کەنابێت باس لە وەکیەکی بژێوی و دارایی بکرێت چونکە پەنجەکانی دەست وەك یەك نین ئێمەی موسوڵمان بەڵگەمان بۆ مەفاهیمە ئیسلامییەکان یان

دەقی قورئانە یان فەرموودەی صەحیحە بەڵام ئەکرێت هەر بەنمونەکەی خۆی وەڵامی بدەینەوە بەڵێ هەروەك چۆن پەنجەکانی دەست وەك یەکنین و ئەگەر وەك یەکبونایە لەکار ئەکەوتن نەئەبوونە هاوکار بۆ تەواوکردنی کارە زۆرو جۆربەجۆرەکان، مرۆڤەکانیش بەهەمانشێوە وەك یەك نین و حەزو ئارەزو لێوەشاوەییان جیاوازە " هەیە ئارەزوی سەروساماندارییە و هەیە ئارەزوی نوسینە بابژێوییەکەی مەژی و مەمرەشبێت و هەیشە لەحەیواندارى و باخداریدا خۆی ئەبینێ و هەیشە ئارەزوی ژیانێکی پڕلەمیهرە با لەژێر خێمەشدا بەسەری بەرێت !! ئیتر بۆخۆیشت ئارەزووەکانیتر بژمێرە.

ئاینی ئیسلام لەبەر ئەوەی ئاینێکی زۆر واقعییەو لەگەڵ تەواوی مرۆڤەکاندا گونجاوە و هەموی بەختەوەر ئەکات، بۆیە ئازادی کارو بەدەستهێنانی بژێوی تاکەکان زەوت ناکات تەنها ئەوە نەبێت نابێت فێری مشەخۆری بکرێن، بەڵام بازاڕیشی بێڕێکخستن بەجێنەهێڵاوە و دەوڵەمەندو سەرمایەدارانیشی فێری بەخشین و زەکاتدان کردوە و ئەوانەیشیان کە نابەخشن بەزۆر زەکاتەکەیان لێوەرئەگرێت بۆ هەژارەکان و خاوەن پێداویستییە تایبەتییەکان و بۆیە ئەمەش ئەکات تا سامان و پارە و بازاڕ نەبێتە تاپۆی دەوڵەمەندەکان.

خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِمْ بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلَاتَكَ سَكَنٌ لَهُمْ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ (١٠٣) أَلَمْ يَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ هُوَ يَقْبَلُ التَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِ وَيَأْخُذُ الصَّدَقَاتِ وَأَنَّ اللَّهَ هُوَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ (١٠٤)التوبة

کەواتە نە سەرمایەداری ڕۆژئاوا کە چینێکی زەبەلاحی سەرمایەدار بخولقێنی کە بوونەتە خاوەنی بازارو بەزەبری سامان تەوجیهی دەوڵەتیش ئەکەن، هەرچیان بوێت بەپارەو سامانە بێشومارەکەیان ئەیکەن ! نە ئیشتراکی ڕۆژهەڵاتیش کە توانایەکی زۆری دارایی و بەرهەمهێنان بەفیڕۆ ئەچێت ! لەو ناوەندەدا کەسانی ئارەزومەندو لێزانی بازار و ئابوری باڵەکاردا بن بەڵام هەژاران و نەداران لەبیرنەکەن ئەوانەش کە لەبازاردا لیاقەیان نییە و کەسی ئەو مەیدانە نین با بە

داهێنان و کاریترەوە خەریك بن پێکەوە وەك پەنجەکانی دەست هاوکاربن بۆیە کاری کەسیان کەم نییە و کۆمەڵگا لەکاری کەسیان بێنیاز نییە، ستەمیش لەسەر هیچ لایەك دروست نابێت، چونکە هەریەکێك کاری شایستە بەخۆی ئەکات و هەمویشی بەجۆرێك سوود لە کاری ئارەزومەندانەی بازار ئەبینێ و ئەوانیش شادومانن چونکە لەلایەك تواناکانیان لەگەڕدایە لەلایەکیتریش هەست ئەکەن کەسانێکی پێویست و خێردارن هەژاران و نەدارانیش بێ هیچ مننەت و چاوخوارییەك لە سامانی سامانداراندا بەشیان هەیە و خوا بۆیداناون و دەسەڵاتی ئیسلامی لەسەرشانییەتی تا ئەوکاتەی کاری شیاو بۆ بێکاران دابین ئەکات سەربەرزانە بیانژێنێت.

ڕێزو دادپەروەریی حەقیقی لەگەڵ ژیانی خەیاڵی (وەکیەکی دارایی و بژێوی) نێوانیان ئاسمان و ڕێسمانە. لە ئیسلامدا سروشتی جیاوازی تاکەکان و لێوەشاوەییان بەهەند وەرئەگیرێت و یاساکان دانراوە بۆ تەواوکاری و هەماهەنگی نێوانەکان بەڵام ئەوە لای هیچ یاساو دەستورێکیتر بونیان نییە .

## ئیسلام خۆی بەهەموو مەوداکانی ژیانی کێدائەکات؟

لە خاڵی(ه) دا گلەیی لەوە ئەکات بۆنابێت ئەوان حیکایەتە ئەفسانەییەکان ڕەتبکەنەوە و بۆ ئەگەر کردیان تاوانبار ئەکرین و بۆ ئاییینگەراکان ئەوە بەهەند وەرناگرن کە ئەم کارە بۆ نەهێشتنی ستەمی چینایەتی و نابەرابەری کۆمەڵایەتی و نەزانییە و..

یان بۆ ئیسلام بۆی هەیە کەخۆی بەهەموو مەوداکانی ژیاندا بکات و هەموو وردەکارییەکانی ژیانی ڕۆژانە بتەنێت بەڵام هیچ ئایدیاو دید و بۆچوون و سستمێکی سیاسی و فەلسەفی و.. لەدەرەوەی ئیسلامەوە ڕێگەی پێنادرێت گەشە بکات.

وەڵام: ڕەتکردنەوەی حیکایەت و ئەفسانەکان و وەرگرتنیان چ پەیوەندییـەکی بـە ڕوونـاکبیرە ئیسـلامییەکانەوە هەیـە و ئەگـەر مەبەستیشـی نمونـە و ڕووداوو چیرۆکەکانی ناو قورئانە ئەوا بەڵێ ئێمە باوەڕمان وایە هەمووی هەقەو لای خـواوە هاتووە و باشـترین جـۆری چـیرۆکن و زۆر نـاوازەن بـۆ سەلماندنیشـیان بەڵگـەمان هەیە لەبەر ئەوەی ئەو باسە شوێنی تایبەتی خۆی ئەبێت لەوەڵامی ئـەم پـەڕاوەدا ئەوا لێـرەدا پێویسـت بـە باسـکردن ناکـات و هەرکەسـیش بـاوەری بـەو چـیرۆك و ڕوداوانە نییە و ڕەتیدەکاتەوە ئـەوا هـەموو قورئـانیش ڕەتئەکاتـەوە، ئـەم جـۆرە ئایەتانەش لە ئایەتەکانیتری قورئان جیاناکرێتەوە و هەرکەسیش ئەوە بکـات ئـەوا یان لەنەزانین و نەناسینییەتی بۆ قورئان یان لەوانەیە وەك سەرچـاوەیەکی بـژێوی سـەیری بکـات یـان هـەر حـەزێکی لاسـاییکردنەوە بێـت و بەرهـەمێکی مەعنـەوی لێچاوەڕێ بکات.

دەربـارەی ئـەوەش بـۆ ئیسـلام بـۆی هەیـە خـۆی بەهـەموو مـەوداکانی ژیـانی ئینسـاندا بکـات، ئـەڵێین ئـەوە بڕیـاری خوایـە و هێـز و شمولییـەتی ئیسـلام و پەیامەکـەی دەرئـەخات ! کـاتێکیش خـۆی بەهـەموو مـەوداکانی ژیـانی ڕۆژانـەی خەڵکدا ئەکات و هەژموونی بەسەر هەموو ڕەهەندەکانی ژیاندا هەیە: ئەوە تایبەتە بەو کەسانەی پێڕەوی ئەکەن و ڕازی ئەبن ئیسلام ئایینیان بێت، ئەگین کەسـانیتر باتائەتوانن بێبـاوەڕبن و لـەهیچ ژیانیانـدا کارییپێنەکـەن و سـورەتی (الکـافرون) و ئایەتەکانی پێشوش لە نێوانمادا بێت. ئایا ئەمـە ئیرەیـی بـردن نییـە بـە ئیسـلام؟ کەبەبێ دەسەڵات ئەتوانێت حوکمی ژیانی پێڕەوکارانی بکات و جگە لە ئیسلامیش ئەو کارەی پێناکرێت با هەموو هێزی دونیا پشتگیری لێبکات.

# شایەتی لە دوژمن وەرناگیری

لە خاڵی (و)یشدا تێکەڵی و پێکەڵییەك دروست ئەکات ئەیەوێت تۆمەتی زۆر خراپ بداتە پاڵ زیاتر لە چواردە سەدەی پڕلەسەروەری و داهێنانی حوکمی ئیسلامیدا و بەبەربەرییەت و هەمەجییەت تاوانباری بکات کەچی بۆ سەلماندنی قسەکانی ئەچێت شایەتی و نوسینی کەسێکیتری ناحەز بە ئیسلام و بوختانچی دێنێت ئەویش سوپاسالار و سەرفەرماندەیەکی پروسیاییە (فیلد مارشال هولمس فۆنی مولتەکە) کە ئەڵمانییە.

ئیسلام هەموو موسڵمانبوەکان و ناحەزانی بەویژدانیش شایەتی ناوازەیی و خێرداری بۆ ئەدەن بۆ لەو پیاهەڵدان و شایەتیدانە بێشمارە وەرگێر هاتووە بوختانی فەرماندەیەکی پروسیایی ناحەزو دوژمنێکی سەرسەختی ئیسلام و موسڵمانان ئەهێنی کە بەگەشەی ئیسلام تروسکایی دین و عەرشی لەرزۆکی ئەوان وەلانرا، ئەوەی کە قسەی لەسەر ناکرێ ئەوەیە شایەتی لە ناحەز وەرناگیررێت، وەرگێڕ کاتێك ئەیەوێت بیسەلمێنی کە کورد لە مێژوی ئیسلامدا ستەمی لێکراوە ئەوە زۆر هەڵەیە چونکە کوردستان لەو شوێنانە بووە کە خۆیان باوەشیان بۆ ئیسلام کردۆتەوە و ئیسلامیان هەڵبژاردوە، و پاشانیش هەر شەڕێك بوبێت لەناو خودی کوردەکاندا ئەوە ئیسلام لێی بەر پرسیار نییە و ڕاستییەکەی ئەوەیە کە مەسعود عبدالخالق لە لاپەرە (٤٢) ی پەڕاوی (ڕۆڵی عەلمانیەت لە دروست بوونی مەینەتی کورد) دا ئەڵێت: بەدرێژایی تەمەنی خیلافەت کوردەکان سەربەخۆ بوینە جگە لەهەندێ دۆخی تایبەتی و هێرشەکانی دەرەکی نەبێت) ئەویش لە پەڕاوی (تاریخ الاکراد ١٩١ ـ١٩٢) وەریگرتوە و لە پەڕاوی (الملل والنحل والاعراق) یش وەرگرتوە (زۆربەی خەلیفەکانی هەردوو دەوڵەتی عەبباسی و ئەمەوی تەنها بەنامەیەکی موالات لەکوردەکان دڵنیا ئەبوون وڕاستەو خۆ فەرمانڕەرایی کوردیان نەئەکرد) ، هەر لەوێشدا نوسەری (ڕۆلی عەلمانییەت..) نەقڵی ئەمەش ئەکات و ئەڵێت: کوردەکان خاوەنی دەسەڵاتی خۆیان بوون، شێخی

ئیسلامی عوسمانلی (خواجە سەعدەدین) لە (تاج التـواریخ) دا دەڵـێ: کـورد هـەر سەربەخۆ بوینە ئەگەر ئەو کێشە ناو خۆییەیان نەبوایە ئەوا فارس و هەموو جیهان لێیـان دەترسـا)، لەسـەردەمی عوسمانیشـدا حـاڵی کـورد چـاکتر بووینـە، لـە نوسینەکانی محمد امین زکی بەگ هاتووە:

(حکومەتی عوسمانی بەواسیتەی دامەزراندنی بەعزێ حکومەتی محـەلی قـەومی کوردی بەتەواوی لە خۆی ڕازی کردبوو. لە لاپەڕە ٩٩دا بە بەڵگەوە باسی سـنوری کوردستانی سەربەخۆ ئەکات لەسایەی سەردەمی خیلافەتی ئیسـلامیدا کە کـورد نە پێشتر و نە ئێستەش بەخۆیەوە نەبینیوە کەسێك ئەیەوێت درێژەی ئەو باسـانە بزانێت با سەیری ئـەو پـەڕاوە ناوازەیـە بکـات، و بـۆ شـارەزا بـوونیش بـە مێـژوی پڕلەسـەروەری و داهێنـان و ئاشـتیخوازی و بـەزەیی سـەیری پـەڕاوی (مێـژوومان بوختانی بەدەمەوە ئەکرێت) بکات کە لە نوسینی دکتـۆر یوسـف القرزاوییـە و لـە وەرگێڕانی ئیکرام کەریمە، ئەو دوپەڕاوەی باسمانکرد زۆر بەزیادەوە وەڵامـی ئـەم خاڵی (ه)ی وەرگێریان تێدایە و نوسینەکانیشیان پشت ئەستورە بەبەڵگە و لێرەدا پێویسـت بـە دوبـارە بونـەوە ناکـات و ئەوەیشـی جێگـەی سـەرنجە لەنوسـینی نوسەرانی دژە ئیسلامدا تۆمـەتی دووبـارە بـووەوە یـە هـەرجارەی بـە ئاوازێك و شـێوازێکەوە و ئەوەیشـی جێگـەی دڵخۆشـییە ئەوەیـە ئەگـەر کەسـی ڕۆشـنبیر و خوێنەر تۆمەتێکی بیست حەز ئەکات قسەو بـەرگری بەرانبـەریش ببیسـێ ئـەوکات دیارە قسەی بەڵگەدار و دەنگـی دلێـر چـەندە جیـاوازە لـە ژاوەژاو دروسـتکردن و چەواشەکاری خوێنەرو ڕۆشنبیریش با حوکمی خۆی بدات.

.

.

# ئایا لەقورئاندا ئایەتی دژەوانە هەیە؟

وەرگێڕ لە لاپەڕە (٤٥١) بۆ(٤٥٣)دا هەندێك ئایەتی پیرۆز ئەهێنێ وبەرانبەر بەیەك دایانئەنێ لەژێرشەش ناونیشاندا وئەیەوێت بڵێت قورئان ئایەتی دژەوانە وناكۆكی تێدایە، ئێمەش بەویستی خوا پاش ڕاڤەكردنی ڕونیدەكەینەوە ئەم ئایەتانە چۆن تەواوكارو یان ڕاڤەكاری یەكترن نەك دژەوانە و ناكۆك.

ئێستە فەرموون با پێكەوە ڕامانێكی وورد لە فەرمایشتە پیرۆزەكانی خوا بكەین: ـ ماڵ ومناڵ جوانی دونیان....... دوژمنن

١ـ ئایەتی ٤٦ ی سورەتی الكهف (الْمَالُ وَالْبَنُونَ زِينَةُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَالْبَاقِيَاتُ الصَّالِحَاتُ خَيْرٌ عِنْدَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ أَمَلًا (٤٦).

لەگەڵ ئایەتی (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ وَأَوْلَادِكُمْ عَدُوًّا لَكُمْ فَاحْذَرُوهُمْ وَإِنْ تَعْفُوا وَتَصْفَحُوا وَتَغْفِرُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ (١٤) إِنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُمْ فِتْنَةٌ وَاللَّهُ عِنْدَهُ أَجْرٌ عَظِيمٌ (١٥) التغابن

ئەهێنێ و بۆ یەكەمیان سەرباسی (مناڵەكانتان جوانی ژیانی دونیان) و بۆ دوەمیان سەرباسی (هەندێك لە مناڵەكانتان و ژنەكانتان دوژمنتانن) دائەنێ ئەیەوێت وا لە خوێنەر بگەیەنێت كە ئەم دو ئایەتە پیرۆزە دژ بەیەكن.

بەڕێزەكەم !سەیری بەهەڵەتێگەیشتن یان هەوڵی بەهەلابردن بكە بزانە چۆن وەرگێڕ ئەیەوێت خوێنەرانی بخاتە تاریكیەوە !!

وەڵام: ئایەتی یەكەم ئایەتی ژمارە چل و شەشی سورەتی (الكهف) ە كە ئەمە تەفسیرەكەیەتی: دارایی و كوڕداری زینەتی(جوانكاری) ژیانی دونیایە و ئەو چاكانەی ئەمێننەوە لای پەروەردگاری تۆ باشتر پاداشتیان هەیە و باشتر چاوەڕێیان لێئەكرێت.

ئەم ئایەتە پیرۆزە لە پاشكۆی ڕوداویكدا هاتوە كە خوای بالادەست بەم شێوەیە بۆمان ئەگێڕێتەوە :

ئەی موحەمەد نمونەی ئەو دوو پیاوەیان بۆ بهێنەوە کە بە یەکێکیان دو باخمان پێدابوو لە ترێ و چواردەور درابوو بە خورما و لە نیوانیاندا بێستانمان دانابوو، هەردوو باخەکە بەروبومی پێگەیشتبوو لەهیچی کەمنەبوو لە نێوان باخەکانیشدا کانیاو جۆگەی هەڵخستبوو، لەکاتی بەروبومدا بەهاوەڵەکەی ووت: (لە توێی قسەکانیدا کە بەیەکەوە ئەیانکرد) من لەتۆ زیاتر سامانم هەیە و لەتۆش زیاتر دەورم پڕە، کە چویە ناو باخەکەیشەوە ستەمی لەخۆیکرد و ووتی: وانازانم ئائەمە بەهیچ کۆتایی بێت و واشنازانم قیامەت هەڵسێ و ئەگەر بگەڕێمەوە بۆلای خاوەنەکەیشم ئەبێت لەمە زیاترم بۆبگەڕێتەوە.

هاوڕێکەی لە دوتوێی ئەو گفتوگۆیەی ئەیکرد لەگەڵیدا پێی ووت: ئایا بێباوەڕبویت بەوەی لە گڵ دروستیکردیت و پاشان لە تنۆکە و پاشان تۆیکردە پیاوێك بەڵام من تەنها ئەو الله یە خاوەنمە و کەس ناکەمەهاوبەشی، ئەگەر تۆ من وائەبینی لەتۆ سامان و کوڕم کەمترە لەوانەیە خاوەنەکەم لە باخەکەی تۆ باشترم پێبدا و بەڵایەکیش لە ئاسمانەوە ببارێنێ بەسەر باخەکەدا بیکاتە خاکەسار، بەروبومەکە هەمووی لەناوبراو کابرای خاوەن باخیش دەستی بەدەستا ئەهێنا لە ئاهی ئەو هەموو خەرجییەی کە بۆ ئەو باخەی خەرجکردبوو وا ئێستەش دارو پەردوی بەسەریەکا کەوتن و ئەیووت ئای خۆزگە هاوبەشم بۆ خوا دانەئەنا، دەستەو تاقمێکی نەبوو پشتی بگرن و خۆیشی نەیتوانی هیچ بکات، ئالەوێدا پشتیوانی وپشتگیری خوایی دیارە، تەنها ئەو تۆڵەو پاداشتی باشترینە. نمونەی ژیانی دونیاشیان بۆ بهێنە وەك بارانێك کە لە ئاسمانەوە دامانبەزاندوە و تێکەڵی زەوی دەبێت و سەوازیی دروستئەکات و پاشان ئەبێتە پوش و پەڵاشی دەمبا خوا بەسەر هەمووشت بەتوانایە، ماڵ و سامان و کوڕ جوانی ژیانی دونیان بەڵام ئەوچاکانەی ئەمێننەوە لای خاوەنەکەت پاداشتیان باشترە و باشتریشە هیوایان پێوە ببەسترێ.

کەواتە بەپێی سیاقی ئایەتە پیرۆزەکاندا دەرئەکەوێت:

١ـ دەسـەڵات و دارایـی و کـوڕداری بـە پێـوەری کەسـانی دونیاپەرسـت مایـەی شـانازییە و لای خـوا تـەنها وەك ئارایشـی ژیـانی دونیایـە و وەك سـەوزایی بـەهار تەمەنێتی و بەئەندازەی باخی خاوەن باخەکەش جێگەی هیوایە.

٢ـ هەر وەك چۆن زینە (خشـڵ و ئـارایش، هەرشـتێك مایـەی ڕازاندنـەوە بێـت) مرۆڤی پێ ئەخڵەتێ و ئاوا ئەو جوانیانەی دونیا هەندێکی پێئەخڵەتێ وەك کـابرای خاوەن باخ و هەندێکیش وەك هـاوەڵی خـاوەن باخەکـە ئـەبن ((ئەسـڵی دونیایـان بینیوە بەبێ زینەتەکە)) و پێی ناخڵەتێن و ئـەزانن ئـەوەی جێگـەی هیوایـە کـارە چاکو چاکسازەکانە (الباقيات الصالحات) .

٣ـ لە ئایەتی (٢٨) یشدا واتە (٣) ئایەت پێش ئەم باسـانە خـوای گـەورە داوا لـە پێغەمبەر(صـلى الله عليـە والـە وسـلم) ئـەکات کـە ئارامبگرێـت و هـاوەڵی ئەوانــەبکات کەخواویســتن تــەنها بۆخــوا کارئەکــەن، داوای لێئــەکات چــاویان لێوەرنەگێڕی بۆلای کەسانی تر کـە خـاوەن زینـەتن (سـاماندار، کەسـدار) بـەڵام غافڵن لەیادی خوا و شوێن ئارەزوەکانیان کەوتون، بەویستی ئەوان نەکات چـونکە ڕەنج و کاری ئەوان خەسارو هەڵوەشاوەیە.

٤ـ لە ئایەتی (١٤ بـۆ ١٨) ی سـورەتی ئـالی عیمرانیشـدا خـوای گـەورە باسـی ئەوە ئەفەرموێت کە ئارایشکردن و ڕازاندنەوەی ئـەو شـتانەی مـرۆڤ خۆشەویسـتی بۆی هەیە کاری شەیتانە و بۆ لەخشتە بردنی مرۆڤەو بۆ ئەوەیە مرۆڤ هەموو ژیانی پێیانەوە خەریك بێت و لەکاری چاکە غافڵ بێت ، خوای گەورە ڕووی ڕاستەقینەی ئەوشتانە بۆ مرۆڤ دەرئەخات و باشتر و جوانتر لەوەیان پیشـان ئـەدات کـە کـاری چاکەکردنەو بەرزبونەوەیە بۆ پلـە باڵاکـان و بـۆ شـاهیدبوونی ڕاسـتییەکان لەگـەڵ خواو فریشتەکانیدا و ئاگاداریش ئەدات ئەو پلەیـە لـەناو مرۆڤەکانـدا زاناکـان پێـی ئەگـەن کەواتــە بابەزانســتەوە خــەریکبن نــەك بــە شــانازیکردن بــە شــتانێکی کەمتەمەنی بەسەرچوو.

٥ـ ئەم ئایەتە پیرۆزانەی لەم باسەدا هاتون پڕە لەڕێز و دڵنەوایی بۆ کەسانی هەژارو بێزینە و هیوای ئەوەیان پێئەدات ئەتوانن بگەنە پلە بالاْکان، خەڵکی موسوڵمانیش فێر ئەکات هاوڕێی هەژاران بەمایەی دڵخۆشی بزانن و شانازی بەشتانێکەوە نەکەن کە ماوەکورتن و ئەوەش نەکەنە پێوەر بۆ کەسانیتر بەڵکو کرداری چاك و زانست بکەنە ئامانج، ئەو کەسانەی بەشیان لەو زینانەش زۆرە با ئاگاداربن بۆ چاکەکاری بەکاریبهێنن و نەیکەنە پەرستراوی خۆیان.

کەواتە بەڵێ خوا ڕاستی فەرمووە کە دارایی و منداڵ جوانی ژیانی دونیایە و ئەوەیشی ئەمێنێتەوە کاری چاکەیە و کوردیش موسوڵمانانە ووتویان دەوران دەوڵەتت لەدەست دەردێنێ بەڵام ناوی چاك تا سەر ئەمێنێ.

ئایەتەکەی کە وەرگێڕی نەشارەزا بە ئایەتەکان هێناویەتی بۆ بەرانبەری ئەم ئایەتە ئایەتی (١٤)ی سورەتی (التغابن)ە.

فەرموو ئێوە و حەکیمی ئەم ئایەتە پیرۆزە و چۆنێتی تەواوکاری ئەو باسەی پێشەوە: يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ وَأَوْلَادِكُمْ عَدُوًّا لَكُمْ فَاحْذَرُوهُمْ وَإِنْ تَعْفُوا وَتَصْفَحُوا وَتَغْفِرُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ (١٤) إِنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُمْ فِتْنَةٌ وَاللَّهُ عِنْدَهُ أَجْرٌ عَظِيمٌ (١٥)

واتە: ئەی کەسانێك کە باوەڕتان هێناوە هەندێ لە هاوسەرو منداڵە کانتان دوژمنتانن ئاگاداریان بن و ئەگەر لێبوردەو چاوپۆشی و لێخۆشبونتان هەبێت ئەوا خوای گەورەش لێبوردەی بەبەزەییە، ماڵ و منداڵەکانتان تەنها بۆ تاقیکردنەوەتانە و (اللە) پاداشتی گەورەی لایە.

لێرەشدا با ئەوە بیری وەرگێڕو خوێنەرانیش بهێنینەوە کە وەرگێڕ ئایەتەکانی قورئان پارچە پارچە ئەکات نەك هەر لەباس و سیاقی ئایەتەکان بەڵکو لەتەنها ئایەتێکیشدا نیوەی ئەهێنێ کە ئەمەو وێنەی ئەمانەیە هەرەشەی لەسەرە کە لەپێشەوە لێی تێنەگەیشتبوو ئەیووت خوا خۆی قورئانی بەشکردوە بۆ موحکەم و موتەشابیە کەچی هەرەشە ئەکات لە کەسانێك قورئان بەش بەش ئەکەن، لە

پێشەوە وەڵامی ئەوەیمان داوەتەوە و لێرەشدا ئـەڵێین ئـەم جـۆرە دابەشـکردن و پارچە پارچە کردنەش لەو جۆرانەن کـە بـەر هەرەشـەی خـوا ئەکـەون چـونکە لـە واتـاو مەبەسـتی خـوا لائـەدرێت، ئایەتـەکان یـەکتر ڕاڤەئەکـەن و باسـەکان تـەواو ئەکەن نەك ئەوەی خوانەخواستە دژ بـە یـەك بـن و لەوەڵامدانـەوەی ئـەم بەشـەی نوسراوەکەیدا زیاتریش وەڵامی گومانەکانی پێشـوی پشتڕاسـت ئەکاتـەوە چـونکە ئەبن بە نمونە بۆی.

ئـەم دووئایەتـەی سـورەتی (التغـابن) یـش درێژەپێـدەرو تـەواوکاری یەکەمـە چونکە لەیەکەم باسدا ئەوە زانرا دارایی و منداڵ زینـەی ژیـانی دونیـان و تەمـەنیان کەمە و ئەوەی ئەمێنێتـەوە کـردەوەی چاکە. لێـرەدا ئیمانـداران ئاگـادار ئـەکات لەناو ئەو زینەتانەی دونیا هەیە دوژمن ئەبێت بۆیان و فێریان ئەکات چۆن مامەڵـە بکەن ئەگەر توشی بوون.

هاوسەرەکان لە دونیادا هەیانە زۆر گونجاون بەیەکـەوە و ڕاو بۆچـونیان نزیکـە لەیەکەوە و هەیشیانە ئاراستەی بـیرو بۆچـونیان جیـاوازو دژەوانەیـە و ئـەم ئـەڵێ سیرو ئەو ئەڵێ پیاز، هەیـە لەگـەڵ هاوسـەریدا گونجـاوە بـەڵام لەگـەڵ هەنـدێ لـە منداڵەکانیدا ئاراستەی پێچـەوانەیە هـیچ خێزانێـك خـاڵی نییـە لـەبوونی جۆرێـك لـە دژایەتی. خوا ئیماندار فێرئەکات و ئامادەی ئەکات کە نابێت ڕاوبۆچونی دژ بـە ڕاو بۆچـونی خـۆی وەرنـەگرێت، نابێـت دیکتـاتۆر و خۆسـەپێن بێـت، بـەڵکو لـەو بارودۆخەدا ئەبێت دانایانە لەنگەری خانەوادەکەی ڕاگرێ و بە ئاگابێت و خـۆی لـە تەقینەوەی ئاگری جیاوازی بپارێزێـت، ووشـەی (فَاحْذَرُوهُمْ) بـەکار ئـەهێنێ کـە بـەواتای (خۆتانیـان لێبپـارێزن) و ڕێنماییـان ئـەکات بـۆ (تَعْفُوا وَتَصْفَحُوا وَتَغْفِرُوا) (چاوپۆشین و سینەسافی و بەخشین) تا بتوانن پێکەوە بژین و خاڵە هاوبەشەکان برەو پێبدەن، هەمیشە بەرانبەر بە ئەوانەی هەڵگری سروشت و ئاراستەی جیاوازن لە خێزانەکەدا لێبوردەو بەخشندەبن و بزانن منداڵ و دارایی مایەی تاقیکارییـە بـۆ دەرچون و دەر نەچونی خـەڵکی لـە پێشـهاتەکانی ژیـان، بـۆ پێوانـەکردنی ڕادەی

ئارامگری و ئیرادەی بەندەکانە، دیارە بۆ کەسانی سەرکەوتوو بەپێی پلەکانیان لای خوا پاداشتی گەورە هەیە.

ئادەی با وەرگێڕو ئەوەی هەیە بتوانێت یاسایەکی لەئەمە جوانتر بهێنی بۆ پاراستنی ئاراستە جیاوازەکان لەناو یەك خێزاندا و کێ ئەوتوانێت جگە لە خوا ئاوا ئارامی لەدڵی شوێنکەوتەکانیدا دروستبکات و سەرکردەی خێزانەکان بکاتە خزمەتکارێکی داناى بەخشندە و ئەڵێی شاعیر لەم ئایەتەوە ئیلهامی بۆ هاتوە کە ئەڵێ:

ئەبێ بەخشندە ملکەچ کا لە ئاستی موچەخۆری خۆی

سوراحی سەر فرۆدێنێ لە بۆ پیاڵە کەتێکا بۆی

خوێنەری بەڕێز جارێکیتر ئەو باسە بخوێنەوە و جەند جاریتریش بەچەندەها لە ڕاڤەی جیاوازی اڤەکاران ئەو ئایەتانە بزانە چەندە پڕن لە دانایی !چەندە مرۆڤەکان پێویستیان پێیانە ! بۆ ئەوەی ژیانیان ئارام و پڕلە بەرهەم بێت.

## قسەی نەرم ـ قسەی ڕەق

٢ـ لە لاپەرە (٤٥١)دا دوو سەرباس بەرانبەر بەیەك دا ئەنێ و لە ژێر یەکەمیان ئایەتی (٢٨) ی سورەتی (الاسراء) و سورەتی (طه) ئایەتی (٤٤) و سورەتی (لقمان) ئایەتی (٢٣) لە ژێر دوەمیان ئایەتی (٦٣) ی سورەتی (النساء) دائەنێ و سەرباسی یەکەمیان: قسەی چاك و نەرمونیانیان بۆ بکە و دوەمیشیان قسەی توندیان پێبڵێ.

با پێش هەموو شت ڕاڤەی بەڵگەکانی باسی یەکەم بکەین بزانین تا چ ئەندازەیەك حاڵی نەبووە یان چۆن ویستویەتی گەنجانی نەشارەزا و لاواز لەخشتەبەرێت، فەرموون:

لێرەشدا نەك هەر وازی لە سیاق و ئەسڵی باسەکە هێناوە بەڵکو تەنها سێیەکی یەك ئایەتەکەی هێناوە (فقل هم قولا ميسورا) قسەی چاك و نەرمونیانیان بۆ بکە، ئاخر ئەو قسەیە بۆ کێ بکات و بۆچی؟

خوای گەورە ئەفەرمووێت: وَآتِ ذَا الْقُرْبَى حَقَّهُ وَالْمِسْكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا (٢٦) إِنَّ الْمُبَذِّرِينَ كَانُوا إِخْوَانَ الشَّيَاطِينِ وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِرَبِّهِ كَفُورًا (٢٧) وَإِمَّا تُعْرِضَنَّ عَنْهُمُ ابْتِغَاءَ رَحْمَةٍ مِنْ رَبِّكَ تَرْجُوهَا فَقُلْ لَهُمْ قَوْلًا مَيْسُورًا (٢٨) وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَى عُنُقِكَ وَلَا تَبْسُطْهَا كُلَّ الْبَسْطِ فَتَقْعُدَ مَلُومًا مَحْسُورًا (٢٩)

خزمان و هەژارو ڕێبوار هەریەکەیان مافی خۆیانیان پێبدە و بەزیادەش ماڵ بەفیڕۆمەدە، بەڕاستی کەسانی سامان زایەکەر برای شەیتانن و شەیتان بۆ خاوەنەکەی زۆر بێئەمەك بوو، ئەگەر خۆت لەوانە لادا لەبەر ئەوەی چاوەڕێی بەزەیەکی خوا بویت ئەوا قسەی نەرمونیانیان بۆ بکە، دەستت مەکەرە گەردنت و بەتەواویش والای مەکە نەك ئیتر کەفتەکار بیت.

ئەوەندەی لە زانیاری کەمی ئێمەوە بە قورئانی پیرۆزو حەکیم هەمانە ئەم چەند ئایەتە پیرۆزە ئەم چەند حیکمەتە گەورەیەی تێدا بەدی ئەکەین :

١- خزم و هەژار و ڕێبوار مافیان هەیە لە سامانی ساماندارانداا بە فەرمانی خوایی ئەو مافانە دیاریکراوە دەبێت بێ منندەت و شاباشیکردن پێیان بدرێت.

٢- تەوازن ڕاگرتن لە بنەما سەرەکییەکانی ئیسلامە لە هەموو شتێکدا و ئەو تەوازونە سامان و بەخشینیشی گرتۆتەوە، نە بەفیڕۆ دان و نەچروکیش، نەدەست بەگەردنەوە نوسان و نەوالاکردنیشی بەشێوەیەك بێکاربکەوی

٣- لەکاتی نەداریشدا کاتێك لە داوای خزم و هەژارو ڕێبوار خۆت لائەدەیت چونکە نیتە و ناتەوێت نەبونییەکەت بزانرێت تا خوا لە بەزەیی خۆیەوە دەرگایەکی ڕۆزیت لێئەکاتەوە ئەوا بە قسەی خۆش و نەرم دڵی داواکار نارەنجێنێ و ڕازیان ئەکات.

بۆ بەڵگەی دووەمی یەکەمیان کە ئایەتی (٤٤)ی سورەتی (طه) یە فەرموون:

اذْهَبَا إِلَى فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَى (٤٣) فَقُولَا لَهُ قَوْلًا لَيِّنًا لَعَلَّهُ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَى (٤٤) قَالَا رَبَّنَا إِنَّنَا نَخَافُ أَنْ يَفْرُطَ عَلَيْنَا أَوْ أَنْ يَطْغَى (٤٥) قَالَ لَا تَخَافَا إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَى (٤٦) فَأْتِيَاهُ فَقُولَا إِنَّا رَسُولَا رَبِّكَ فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلَا تُعَذِّبْهُمْ قَدْ جِئْنَاكَ بِآيَةٍ مِنْ رَبِّكَ وَالسَّلَامُ عَلَى مَنِ اتَّبَعَ الْهُدَى (٤٧) إِنَّا قَدْ أُوحِيَ إِلَيْنَا أَنَّ الْعَذَابَ عَلَى مَنْ كَذَّبَ وَتَوَلَّى (٤٨) قَالَ فَمَنْ رَبُّكُمَا يَا مُوسَى (٤٩) قَالَ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى (٥٠) قَالَ فَمَا بَالُ الْقُرُونِ الْأُولَى (٥١) قَالَ عِلْمُهَا عِنْدَ رَبِّي فِي كِتَابٍ لَا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنْسَى (٥٢) الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ مَهْدًا وَسَلَكَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا وَأَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ أَزْوَاجًا مِنْ نَبَاتٍ شَتَّى (٥٣) كُلُوا وَارْعَوْا أَنْعَامَكُمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِأُولِي النُّهَى (٥٤) مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَى (٥٥)

لێرەدا ئێمە بۆ وەڵامی ئەمە دیسان ئایەتەکە ئەخەینەوە ناو سیاقەکە تا زیاتر ڕوون بێتەوە کە گوتە نەرمەکە کامەیە و بۆ کێیە؟

واتە: ئەی موساو هارون بڕۆن بۆ لای فیرعەون چونکە ملهوربووە، قسەیەکی نەرمی پێبڵێن بەڵکو بەیادی بێتەوە یان لەخوا بترسێ، ووتیان خوایە ئێمە ترسی ئەوەمان هەیە زیادەڕوی بکات، خوا فەرموی مەترسن من لەگەڵ ئێوەم ئەبیسم و ئەبینم، وەرن بۆ لای پێی بڵێن ئێمە لای خاوەنی تۆوە هاتوین بۆ ئەوەی بەنی ئیسرائیل لەگەڵ ئێمە بنێریت و سزایان نەدەیت بەڵگەی ڕاستێتی قسەکانیشمان پێیە و هەرکەسیش شوێنی ڕێنماکان بکەوێت پارێزراو ئەبێت، ئێمە وەحیمان بۆ هاتوە سزا تەنها لەسەر کەسانێکە کە درۆزنن و پشتیان هەڵکردوە، فیرعەون ووتی دەی کەواتە خاوەنی ئێوە کێیە ئەی موسا؟، وتی: پەروەردگاری ئێمە ئەوەیە هەموو شتێکی دروستکرد و پاشان ڕێگای ژیانیشی فێرکرد، فیرعەون ووتی: ئەی دەنگ و باسی سەردەمەکانی پێشوو چییە؟

وتی: ئەوە هەمووی لای خوا نوسراوە و خوا هیچی لێوون نابێت و هیچیشی لەیاد ناچێت، ئەو خوایەی زەوی بۆ کردونە لانکەو ڕێگاکانیشی بۆ کێشاون و لە

ئاسمانیشەوە بارانی بۆ باراندون بەو بارانە لە نێرو مێی هەموو ڕوەکێکی بۆ دەرهێناون، بخۆن و گیانلەبەرەکانیشتان بلەوەڕێنن ئەمانە بەڵگەن بۆ خاوەن ژیرییەکان، لەو دروستمانکردن و لەوێوە ئەتانگەڕێنینەوە و لەناو ئەویشەوە دیسان دەرتان ئەهێنینەوە.

**کورتەی ئەم چەند ئایەتە پیرۆزەش ئەمانەیە:**

١ـ پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێت خوای گەورە بۆ بەرژەوەندی خەڵکی چەوساوە ناردوونی (فارسل معنا بنی اسرائیل ولا تعذبهم....)

٢ـ زمانی گفت و گۆو دواندنی ژیری و بەڵگە هێنانەوە بنەمای ئایینە ئاسمانیەکانە خوا خەڵکی فێرکردوە لە ڕێگەی نێرراوە بەڕێزەکانییەوە.

٣ ـ گوتەی نەرم ئەگەر بۆ فیرعەون داواکرابێت لەلای خواوە ـ کە فیرعەون ئەو پەری نمونەی لەخوا یاخیبونە ـ ئەوا ئەبێت مرۆڤ لێرەوە هەست بەو بەزەییە زۆرەی خوا بکات و بزانێت هەر پەنای ئەو باشە وهەقە پێشبڕکێی بۆ بکات.

٤ـ دروستکردنی هەموو شتێك و کارکردنیان بەپێی لێوەشاوەییان و لانەدان لێی، ڕاخستنی زەوی و شیاوی بۆ ژیان، باران بارین و ژیانەوەی زەوی، نێرو مێی هەموو دروستکراوەکان و هەموو ئەمانەش لەبەرژەوەندی ئادەمیدا بێت ئەمانە نیشانەن بۆ ئەوانەی خاوەن ژیری بیّ خەوشن (ان فی ذلك لایات لاولی النهی).

٥ـ ئەو قسە نەرم و گفت وگۆیانە بۆ ئەوەیە ستەمکاران ژیریان بخەنەکارو واز لە چەوساندنەوەی خەڵکی بێدەسەڵات بهێنن و ئامۆژگارییەکان لەبیر نەکەن ئەوکات ئەوانیش پارێزراو ئەبن (والسلام علی من اتبع الهدی) ئەگەرنا ئەوا با بترسن لە سەرەنجامی ملهوڕی و زۆرداریيەکانیان چونکە خوایەکی باڵادەست لە سەرەوە ئاگاداریانە و کە گەڕانەوە ناو گڵ و لەوێشەوە زیندوکرانەوە ئەوا حیساب و تومارەکانیان ئەبیننەوە و ئیتر هیچیش بە دادیان ناڕەسی ئەمە جگە لەوەی وەك فیرعەونیش ئەبێت دونیا بەجێبهێڵن (ان العذاب علی من کذب وتولی) .

بەڵگەی سێیەمی سەر باسی یەکەمی: ئەم نیوە ئایەتەی هێناوە (وجادلهم بالتي هي احسن) و واتاکەی نوسیویەتی: بەو شێوەیەی کە چاکترینە گفت و گۆیان لەگەڵ بکەن.

بەڵێ ئیمانداران دەبێت بەو شێوەیەی کە چاکترینە گفت و گۆ بکەن و جگە لە موراعاتکردنی ئەوپەڕی ئادابی گفتوگۆ دەبێت دڵسۆزیش بن بۆ ئەوکەسانەی گفتوگۆیان لەگەڵ ئەکەن و بەهیوای ڕزگارکردنیان بن لەو ئاگرەی بەرەوڕوی ئەڕۆن، تەنانەت ئەگەر خراپەیان بەرانبەرکرا ئەوا باشتر بۆیان لای خوا ئەوەیە کە ئارامبگرن هەرچەندە هەقیشیان بێت تۆڵە بکەنەوە ئەو ئارامگرتنەیان بۆ خوایە و خوا هەمیشە یاوەری ئەوانەن گوێڕایەلیئەکەن و چاککارن.

ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ (١٢٥) وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُمْ بِهِ وَلَئِنْ صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِلصَّابِرِينَ (١٢٦) وَاصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلَّا بِاللَّهِ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلَا تَكُ فِي ضَيْقٍ مِمَّا يَمْكُرُونَ (١٢٧) إِنَّ اللَّهَ مَعَ الَّذِينَ اتَّقَوْا وَالَّذِينَ هُمْ مُحْسِنُونَ (١٢٨)

واتە: بانگکە بۆلای ڕاستەڕێگەی خوا بە حیکمەت و گفتی چاك و بەوشێوەی کە باشترینە گفتو گۆیان لەگەڵ بکە خوا زاناترە بەوانەی لایانداوە و زاناتریشە بەوانەی لەسەر ڕێگاکەن، ئەگەر ویستان تۆڵەی خراپەش بکەنەوە ئەوا وەك ئەوەی بەرانبەرتانکراوە بیکەن و ئەگەریش ئارامبگرن ئەوە بۆ ئارامگران باشترە، ئارامگرەو ئەو ئارامگریەشت تەنها بەخوایە و پەژیوار مەبە بۆیان و تەنگەتاویش مەبە لەو پیلانانەی ئەیگێڕن، بەڕاستی خوا لەگەڵ ئەوانەدایە تەقوایان هەیە و لەگەڵ چاکەکاراندایە.

**ئەم ئایەتە پیرۆزانە ئەم خاڵانە لەخۆ ئەگرێت:**

١ـ دانـایی لـە هەڵسـوکەوت ودڵسـۆزی لـە ئامـۆژگاری وباشـترین جـۆری گفتوگـۆ (الحكمة، الموعظة الحسنة، المجادلة بالتی هی احسن) لـە سـیما هـەرە بـەرزەکانی شارستانییەتی ئیسلامە، پێش ئیسلام ئەمانە نـەزانرابون مەگـەر لای پێغەمبـەرانی هاوکارو هاو پیشەی پێغەمبەری ئیسلام نـەبێت کـە هـەمویان لەیـەك سەرچـاوەوە ڕێنماییان وەرگرتوە.

٢ـ ئارامگرتن و پشوودرێژی بانگخوازانی ڕێگای خوا بە فیڕۆ ناچێت وپاداشـتی لەسەر وەرئەگرن و مایـەی ئەوەیشـە خـەڵکی یـاخی لەوانەنـەوە هەسـت بـە زۆری بەزەیی خوا و ئەندازەی ڕێزداری مرۆڤ بکەن لای خوا.

٣ـ ئەوانەش هەست و ژیریان ناجوڵێن ئەوا بەزۆر نییە و ئەبێت بانگخواز پەست و نەنگ نەبێت و پشت بەخوای خۆی ببەستێت چـونکە خـوا لەگـەڵ خواویسـتان و چاکسازاندایە.

بەڵگەی چوارەمی سەرباسی یەکەمی ئەم ئایەتەی سورەتی لوقمانە: وَمَنْ كَفَرَ فَلَا يَحْزُنْكَ كُفْرُهُ إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ فَنُنَبِّئُهُمْ بِمَا عَمِلُوا) هـەرکێ بێبـاوەڕی دەربـڕی بـە بێباوەڕی کردنەکەی پەژیوار مەبە چـونکە ئـەوان بـۆلای ئێمـە دەگەڕێنـەوە ئێمـە هەواڵی ئەو کارانەیان پێدەدەین کە دەیانکرد..

ئەم ئایەتە وەك ڕاڤەو ڕونکەرەوەی (ولاتحزن علیهم) ی ئایەتەکەی پێشـووە و ئەم ئایەتانەش کە نمونەیەکە لە جۆری باشترین گفت و گۆ کـە خـوا لـە سـورەتی (النحل) دا داوایکردبوو، فەرموون ئێوە و ئەم ئایەتە پڕ لە حیکمەتانە:

أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَابٍ مُنِيرٍ (٢٠) وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنْزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا أَوَلَوْ كَانَ الشَّيْطَانُ يَدْعُوهُمْ إِلَى عَذَابِ السَّعِيرِ (٢١) وَمَنْ يُسْلِمْ وَجْهَهُ إِلَى اللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى وَإِلَى اللَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ (٢٢) وَمَنْ كَفَرَ فَلَا يَحْزُنْكَ كُفْرُهُ إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ فَنُنَبِّئُهُمْ بِمَا عَمِلُوا إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ (٢٣) نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلًا ثُمَّ

نَضْطَرُّهُمْ إِلَى عَذَابٍ غَلِيظٍ (٢٤) وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ (٢٥) لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ (٢٦) وَلَوْ أَنَّمَا فِي الْأَرْضِ مِنْ شَجَرَةٍ أَقْلَامٌ وَالْبَحْرُ يَمُدُّهُ مِنْ بَعْدِهِ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَا نَفِدَتْ كَلِمَاتُ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ (٢٧) مَا خَلْقُكُمْ وَلَا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَاحِدَةٍ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ(٢٨)

واتە: ئایا نابینن کە خوا هەموو ئەوەی لە ئاسمان و زەمیندا هەیە بۆ ئێوەی ساناکردوە و بەهرەکانی دیارو نادیاری خۆیی بەسەرا ڕشتون لەناو خەڵکیشدا هەیە بەبێ زانیاری و بێ ڕێبەری و پەڕاوێکی ڕۆشنگەر خەریکی گفتوگۆکردنە دەربارەی خوا، کاتێکیش پێیان ئەوترێ شوێن ئەوە بکەون لای خواوە دابەزیوە ئەڵێن بەڵکو شوێن ئەوە ئەکەوین کە باپیرانمان لەسەری بوون، یان هەر ئەوەیە کە شەیتان بانگیان ئەکات بۆلای سزای سوتێنەر، هەرکەسێك خۆی تەسلیم بکات بەخوا و لەچاکەکارانیش بێت ئەوە بەڕاستی دەستی گیرکردوە لەوەی پسانی بۆ نییە و سەرەنجامی هەموو کارەکانیش لای خوایە، هەرکەسیش بێباوەڕبوو بێباوەڕییەکەی دلگرانت نەکا بۆلای ئێمە ئەگەڕێنەوە و هەواڵی کردەوەکانیان ئەدرێتەوە خوا بە نهێنی سینەکان ئاگادارە، کەمێك نازپەروەریان ئەکەین و پاشان پەلکێشیان ئەکەین بۆلای سزای بێبەزەییانە،ئەگەن پرسیاریان لێبکەیت کێ ئاسمانەکان و زەوی دروستکردوە بێگومان ئەڵێن (الله) بڵێ سوپاس بۆ خوا بەڵکو زۆربەیان نازانن، ئەوەی لەئاسمانەکان و زەویدایە هەمووی موڵکی خوایە و هەر ئەو خوایە بێئاتاج و زۆر سوپاسکراوە، ئەگەر هەموو ئەو درەختانەی لەزەویدا هەیە قەڵەم بێت و دەریاش مرەکەبی و حەوت دەریای تریش بێنی ووشەکانی خوا تەواو نابێت خوا زاڵ و کاردروستە، دروستبوون و زیندو بونەوەتان تەنها وەك نەفسێکە خوا بیسەری بینەرە.

**ئەوەی لەم ئایەتانە وەرئەگیرێت:**

١ـ ئەم سێ شتە (زانست یان ڕێبەری یان بەڵگەنامە) ئەکرێن بەسەرچاوە و دادوەر، لەکاتی گفتوگۆکردندا بێ یەکێك لەوانە گفتوگۆ تەنها چەلەحانێیە و سەرەنجامی نابێت، لەناو خەڵکیشدا هەن لەخۆیانەوە دەربارەی خواو دینی خوا گفتوگۆ ئەکەن و قسەکانیان بنەمایەکی زانستی نییە، بێ یاساو ڕێبەری و بەڵگەی پێویست دەم لەو باسەگرنگانە ئەکوتن، وەك قەشە فادی و وەرگێڕە نەناسراوەکەی.

٢ـ بۆ ئەوەی بگەینە دەرەنجامێك لەکاتی گفتوگۆ لەگەڵ کەسانی بێسەرچاوە و مەرجەعدا ئەوا ئەبێت نیشانە کەونییەکان ((کەبۆ هەموو کەسێکی کاڵفامیش دیارە)) بکەینە دەروازە بۆ چوونە ناو ئەو شتانەی ووردن و ژیری بەکاری ئەوێت وەك ئەوەی خوا لەم ئایەتانەدا ئاماژەی پێکردوە "(ئەو دەسەڵاتەی بەمرۆڤ دراوە بەسەر بوونەوەدا بۆ چییە؟ ئەو هەمووە بەهرە دیارو شاراوەی مرۆڤ ئەنازێ پێیانەوە کێ بۆی ڕشتوون؟ بۆ ئەبێت وەڵامی دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی لای ژیرەکان هەر (الله) ئەبێت؟ و لەم جۆرە بەڵگانەی بوونەوەر و بینراوەکان زۆرن بۆ ئەوەی لێیانەوە بگەینە پلەی سوپاسگوزاری بۆ خوای تاقانە بەڵام دیارە زۆرێك لە خەڵکی ناگەنە ئەو پلەیە چونکە بواری ڕامانیان بۆخۆیان دانەناوە یان بەمادە هۆشبەرەکان بێهۆشن لەو بابەتانە.

٣ـ ئەو کەسانەی نەبەڵگەی زانستی و ژیری و نەبەڵگەی پەڕاوی ئاسمانی وەرناگرن ئەوا نابێت بە بێباوەڕییەکانیان دلگران بین، حیسابی ئەوانە لای خوایە، خۆی هەواڵی سەرەنجامی کارەکانیان ئەداتێ پاشئەوەی لە نازی دونیا ئەیانـژێنێ بێگومان خوا خۆی ئاگادارە بەوەی لە سینەکاندایە.

ئەم ئایەتانەی کە وەرگێڕ هێناویەتی و پارێزی لەوە کردووە هەموو ئایەتەکان بەتەواوی بهێنێ لەبەرئەوەی نەك هێزو موجیزەی گەورەیی ئایەتەکان دڵی خوێنەران کێش بکات و ڕێسەکەی بێتەوە بەخوری و هەر ئایەتەکان خۆیان تەمومژی گومانەکان بڕەوێننەوە. ئێمە ئەڵێین قورئان زۆر زیاتر لەوانە باسی

نەرمونیانی و بەزەیی ئـەکات و پێغەمبەرەکەیشـی بەنـەرم و نیـان و زمـان شـیرین ئەدەبـداوە و پێغەمبـەریش (صـلی الله علیـه والـه وسـلم) ئیمانـدارانی فێرکـردوە لەهەموو کاروبارێکـدا نـەرمی بـەکاربهێنن، نیـانی جـوانی ئـەدات بـەکارەکان (عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّهَا كَانَتْ عَلَى جَمَلٍ فَجَعَلَتْ تَضْرِبُهُ فَقَالَ النَّبِيُّ –صلى الله عليه وسلم–:« يَا عَائِشَةُ عَلَيْكِ بِالرِّفْقِ فَإِنَّهُ لَمْ يَكُنْ فِى شَىْءٍ إِلاَّ زَانَهُ وَلَمْ يُنْزَعْ مِنْ شَىْءٍ إِلاَّ شَانَهُ ». أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ فِي الصَّحِيحِ

دایکمـان عائشـه ئـەڵێت: کـە بەسـواری پشـتی حوشـترێکەوە بـوە و لـە حوشترەکەیداوە پێغەمبەر پێی فەرمووە: ئەی عائشه نەرمو نیانبه چونکه نـەرمی لەهەرچیدا هەبوو جوانی ئەکات و لەهەرچییەکیش دەرتهێنا ناشیرینی ئەکات.

ئەگەر کـاکی وەرگێـر سـەرنج بـدات نـەرمونیانی و بـەزەیی ئیسـلام گەیشـتۆتە گیاندارانیش، لەهەموو قورئانیشدا دژەوانەیەك بۆ ئـەم چـەمکە نادۆزیتـەوە و ئـەم ئایەتـەش کـە تـۆ وا ئـەزانی لەگـەڵ ئەمـەدا پێـك نایـەت و (قـولا بلیغـا) بـە زۆر تەفسیری ئەکەیت بە قسەی ڕەق و ووشك ئەوە زۆر بەهەڵەدا چویت و ئـیتر هـەقت نیە زویر بیت لەوەی کە ئەگەر کەسێك پێت بڵێت لێگـەڕی بـا کەسـانی تایبەتمەنـد قسە لەسەر ڕاڤەی قورئان بکەن چونکە تۆ نایزانی.

خوێنەرانی بەڕێز فەرموون ئێوە و ئەو ئایەتە پـیرۆزە بـا پێکـەوە بـزانین چـۆن ئەو ئایەتە بەشێکە لە کۆبەندی ئادابەکانی گفتوگۆکردنی ئیسلامی:ـ

أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَنْ يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا (٦٠) وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا إِلَى مَا أَنْزَلَ اللَّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ رَأَيْتَ الْمُنَافِقِينَ يَصُدُّونَ عَنْكَ صُدُودًا (٦١) فَكَيْفَ إِذَا أَصَابَتْهُمْ مُصِيبَةٌ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ثُمَّ جَاءُوكَ يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ إِنْ أَرَدْنَا إِلَّا إِحْسَانًا وَتَوْفِيقًا (٦٢) أُولَئِكَ الَّذِينَ يَعْلَمُ اللَّهُ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَعِظْهُمْ وَقُلْ لَهُمْ فِي أَنْفُسِهِمْ قَوْلًا بَلِيغًا (٦٣) وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ رَسُولٍ إِلَّا

لِيُطَاعَ بِإِذْنِ اللَّهِ وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ جَاءُوكَ فَاسْتَغْفَرُوا اللَّهَ وَاسْتَغْفَرَ لَهُمُ الرَّسُولُ لَوَجَدُوا اللَّهَ تَوَّابًا رَحِيمًا (٦٤)

واتە: ئایا نابینی ئەوانەی لافی باوەڕداری بە قورئان و پەراوەکانی پێش تۆ لێئەدەن ئەیانەوێ گوێ لەمستی زاڵمەکانبن و فەرمانیان پێکرابوو بەو تاغوتانە کافربن و شەیتان ئەیەوێت زۆر وێڵیانکات، ئەگەر پێیان بووترێ وەرن بۆلای ئەوەی خوا دایبەزاندوە و بۆلای پێغەمبەر ئەبینی کەسانی دووڕو خۆیان لەتۆ لائەدەن، ئەی حاڵیان چۆن ئەبێت کاتێك توشی گرفتێك ئەبن بەوەی خۆیان بەخۆیانیانکردوە پاشان دێن و سوێند بەخوا ئەخۆن کە بەوکارەیان وویستویانە چاکسازی و گونجانێك دروستکەن، ئەوانە خوا ئەزانێ چی لە دڵیاندا هەیە.

کەواتە"پشتیان تێبکە وئامۆژگاریان بکە وقسەیەکیان بۆبکە بگاتەدڵیان، هیچ پەیامبەرێکمان نەناردوە بۆ ئەوە نەبێت بە ئیزنی خوا گوێڕایەڵی بکرێت، ئەوان ئەگەر ستەمیان لەخۆیانکرد بهاتنایە بۆلات وداوای لێبودنیان بکردایە لەخوا و پێغەمبەر داوای لێخۆشبونی بۆ بکردنایە ئەیانبینی خوا زۆر لێبوردەی بەبەزەییە.

**ئەوەی لەم ئایەتانەش وەرئەگیرێت:**

١ـ ئەم گفتوگۆیە لەگەڵ بێباوەڕەکاندا نییە بەڵکو لەگەڵ کەسانی دووڕوو ناپاکدایە کە بەحیساب لەناو موسوڵماندان و بەدڵیش لەگەڵ بێباوەڕاندان. حەزئەکەن بۆ یەکلاکردنەوەی داواکانیان پەنا بۆ حوکمی تاغوت ببەن، بەلام کاتێك لەوکارەیان زەرەرێ بکەن دێنەوە و سوێند کەڵکە ئەکەن کە نیازیان بەو کارە باش بووە.

٢ـ موسوڵمان داوای لێکراوە لەگەڵ کەسانی دووڕوشدا باش و دڵسۆز بێت چونکە نیفاق لەدڵدایە و حیسابی دڵیش لای خوایە،کاروکردەوەی دووڕوەکانیش تێکەڵە و نیشانەکانی جۆراو جۆرن، مرۆڤ بەهەڵەدا ئەبەن بۆ جیاکردنەوەیان لە کەسانی باوەڕداری لاواز بۆیە ئەبێت چاوپۆشیان لێبکرێت بەلام لە ئامۆژگاری فەرامۆش نەکرێن و قەسەیەکیان بۆبکرێت ڕاچڵەکینەربێت ئەو قسەیەی ئەگاتە

ناخیـــان، یـــان قســـەی پـــەنهانیان بۆبکرێـــت، واتـــە دڵســـۆزەکەیان دوو بـــەدوو هەڵەکانیانیان ڕووبەڕوو بکاتەوە.

٣ــ کەسـی دووڕوو بـۆ پاراسـتنی جەماوەرەکـەی ئـەو بارودۆخـەی بـۆ خـۆی هەڵبژاردوە و حـەز ئـەکات وەك ئـەڵێن (لەهـەموو دیوانێـك چـەکمەیەکی هـەبێت)، خوای گەورەو نهێنیزانیش زانایە بەوەی لەدەرونی ئەوانـەدا هەیـە بۆیـە بەوشـێوە حەکیمانە چارەیان ئەکات.

یەکەم گرنگـی نـەدان بـەکارەکانیان.دووەم: ئامۆژگاریکردنیان.سـێیەم: لـە دڵ وناخیان بدەیت بەوەی ئەگەر بەردەوام بن ئابڕویان ئەچێ و بێکەس ئەبن یان هەر قسەیەکیتر کەهیوای ڕوخاویان وێنابکات.

٤ــ ئەوانـەش کـە ماوەیـەك لـە ژیانیـان لەسـەر چـەند پـەت گەمـەیانکردووە و وویستی خڵەتاندن و ناپاکیانکردوە ئەگەر بگەڕێنەوە لای خواو داوای لێخۆشـبوون بکـەن ئـەبینن کـەخوا نائومێـدیان ناکـات چـونکە خـوا زۆر لێبـوردەی بەبەزەییـە (سوپاس بۆ خوا بەبەزەیی) .

سەیرکە خوێنەری بەڕێز ! بەمشـێوەیە دەرکـەوت ئـەم ئایەتانـەش تـەواوکاری ئایەتەکانی پێش خۆی بوو ئەوان ئادابـەکانی گفـت و گـۆ بـوو لەتـەك بێبـاوەڕان و ئەمانیش بۆ گفتوگۆ بوو لەتەك دووڕووەکان، هەروەها ئەم قسە توندو گەیەنەرەش هەر بەزەییە و بۆ ئەوەیە ئەوانەش کە بواریان بـە شـەیتان داوە وێڵیانکـات بـەڵکو بگەڕێنەوە سەر ڕاستە ڕێگاکە بۆ لای خوای خاوەن سـۆز و بـەزەیی پاشـانیش بـۆ بەهەشتی پان و بەرین.

## ڕوخۆشی ـ گرژومۆنی

بۆ یەکەمیان فەرمودەی (کثرة الضحك تميت القلب) دەهێنێ و واتای ئـەکات و ئەڵێت بە دیوێکدا ئەم ووتەیـە ڕاسـتە !! تـەنها ئـەم دوو ووشـەش لـە ئایـەتێکیتر ئەهێنێ (تضحكون ولا تبكون) بە ( ئایا ئێوە پێدەکەنن و ناگرین) واتـای ئـەکات

و دیسان پارچەیەك لـە ئایـەتێكیتر ئەكاتـەوە و دایئـەنێت(خروا سـجدا وبكيـا) لـە پەڕوكەوتن بە كرنوش بردن و گریانەوە.

بۆ دووەمیشیان ئەڵێت: لە قورئاندا بە ڕۆژی قیامەت ئەوترێت ڕۆژێكی گرژومۆن و توند لەگرژومۆنیدا (يوما عبوسا قمطريرا) و دوای ئەم فەرموودەی (ان الله يحب الطلق البسم) بە (خواوەند مرۆڤی ڕوخۆشی دەم بـە زەردەخەنـەی خۆشـدەوێت)، واتای ئەكات و دوای ئەمیش فەرمودەی (اطلب الخير عند حسان الوجوه) دێنـێ و بە (هیوای چاكە لە ڕووە خۆشەكان بكەن) واتای ئەكات.

خوێنەری بەڕێز: بێگومانم تۆش هەر بەسەیركردنی ئەمانە ناهـەقی بیانوەكـانی وەرگێـڕت بـۆ دەركـەوتوە چـونكە هـیچ دژەوانەیـەك بـەدی ناكرێـت و بابەتـەكان سـەربەخۆن، بـەڵام لەبـەر خۆشـی بابەتەكـە (پێكـەنین و گریـان) ، (زەردەخەنـەو گرژومۆنی) و گرنگیان بـۆ ژیـانی مـرۆڤ هـەروەها ئیعجـازی خـوا لـە چاندنیان لـە ئەسڵی دروستكردنی مرۆڤدا كەمێك لەسەریان هەڵوێستە ئەكەین ئەوكات بـۆ خـۆی نەزانی وەرگێڕیش زیاتر دەرئەكەوێت.

لە قورئاندا دە جار باسی پێكەنین كراوە لە هەشت سورەتی جیاوازدا (الـنجم /٦٠، ٤٣، عـبس /٣٩، هـود /٧١، التوبەـ ٨١، الزخرفـ ٤٧، المطففينـ ٢٩، ٣٤ ، النمل ١٩، المؤمنون ٤٣).

لە سورەتی (النجم) دا لە دوو شوێندا باسی پێكەنین هـاتوە یـەكێكیان ئەوەیـە كە وەرگێڕ هێناویەتی و بە هەڵە نوسیویەتی و بەهەڵەش ڕاڤەی كـردوە لەخۆیـەوە هەمزەی ئیستفهامی لە پێشەوە داناوە و فایشی بە ئامرازی نەفییەكـەوە لكانـدوە نازانێ چۆن مامەڵە لەگەڵ قورئاندا ئەكرێت یان نەیزانیوە قورئـان سـاناترین هەڵـە لە نوسینەوەیشیدا وەرناگرێت و پێی ئەزانرێت، با بێینە سەر كۆباسی پێكە نـین لە قورئاندا بزانین ئـەو خوایـەی كـە گریـان و پێكـەنینی تیـا خـەلق كـردوین چـی دەبارەی ئەفەرموێت:

دوو ئایەتەکەی سورەتی (النجم) بەم شێوەیە: وَأَنَّهُ هُوَ أَضْحَكَ وَأَبْكَى (٤٣) ئـەو خوایـە خـۆی پێکـەنین و گریـانی دانـا.وَتَضْحَكُونَ وَلَا تَبْكُونَ (٦٠) ئێـوە پێدەکەنن و ناگرین.

ئایەتـەکـەی سـورەتی عـبس ئەفـەرمووێت : وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ مُسْفِرَةٌ (٣٨) ضَاحِكَةٌ مُسْتَبْشِرَةٌ (٣٩) کۆمەڵـە روویـەك لـەو رۆژەدا گەشـن پێئەکـەنن و مژدەبەخشـن، سـورەتی هـود ئەفـەرمووێت: وَامْرَأَتُهُ قَائِمَةٌ فَضَحِكَتْ فَبَشَّرْنَاهَا بِإِسْحَاقَ وَمِنْ وَرَاءِ إِسْحَاقَ يَعْقُوبَ (٧١) خێزانەکەی ئیبراهیمیش وەستابوو پێکەنی ئێمـەش مـژدەی بـوونی نەوەیـەکمان پێدا بـەناوی ئیسـحاق و لـە ئیسـحاقیش یـەعقوب. سـورەتی (التوبـە) ش ئەفـەرمووێت: فَلْيَضْحَكُوا قَلِيلًا وَلْيَبْكُوا كَثِيرًا جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ (٨٢)

لە باسی ناپاك و دووڕووەکاندایە کـە گاڵتـەیان بـە ئیمانـدارەکان ئـەکرد خـوای گەورەش دەربـارەی ئـەو جۆرانـە ئەفـەرمووێت: باکـەم پێبکـەنن و زۆر بگـرین لـە تۆڵەی ئەوەی بەدەستیانهێناوە.

لە (الزخرف) دا ئەفەرمووێت: فَلَمَّا جَاءَهُمْ بِآيَاتِنَا إِذَا هُمْ مِنْهَا يَضْحَكُونَ (٤٧) کاتێك موسا ئایەتەکانی خوای بۆ هێنان ئەوان بە ئایەتەکان پێدەکەنین

لـە سـورەتی (النمـل) یشـدا : فَتَبَسَّمَ ضَاحِكًا مِنْ قَوْلِهَا وَقَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَى وَالِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحًا تَرْضَاهُ وَأَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ فِي عِبَادِكَ الصَّالِحِينَ

سولەیمان پێغەمبـەر سـەلامی خـوای لێبێـت بـە خەنـدەوە پێکـەنی بـە قسـەی مێرولەکە و ووتی ئەی خاوەنەکەم دەرفـەتم بـدەری کـە سوپاسـی ئـەو بەهرەیـەت بکەم کە بە من و دایك و باوکمت بەخشیوە و ئەو کردەوە چاکانەش بکـەم کـە تـۆ پێی ڕازیت و بە بەزەیی خۆت لەناو بەندە چاکسازەکاندا دامبنێ.

لە سورەتی (المؤمنون) دا ئەفەرمووێت:

إِنَّهُ كَانَ فَرِيقٌ مِنْ عِبَادِي يَقُولُونَ رَبَّنَا آمَنَّا فَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا وَأَنْتَ خَيْرُ الرَّاحِمِينَ (١٠٩) فَاتَّخَذْتُمُوهُمْ سِخْرِيًّا حَتَّى أَنْسَوْكُمْ ذِكْرِي وَكُنْتُمْ مِنْهُمْ تَضْحَكُونَ (١١٠)

واتە: خوا ئەفەرمووێت کەرتێك هەبوون لە بەندەکانی من ئەیانووت خوای خاوەنی ئێمە باوەڕمان هێناوە لێمانخۆشبە و ڕەحممان پێبکە، تۆ باشترینی بەبەزەییەکانی، ئێوە ئەوانتان کردە گاڵتەجاری خۆتان و بەو هۆیەوە منتان لەیادکرد و ئێوە بەئەوان پێدەکەنین

لە سورەتی (المطففين) دا ئەفەرمووێت: إِنَّ الَّذِينَ أَجْرَمُوا كَانُوا مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا يَضْحَكُونَ (٢٩) وَإِذَا مَرُّوا بِهِمْ يَتَغَامَزُونَ (٣٠) وَإِذَا انْقَلَبُوا إِلَى أَهْلِهِمُ انْقَلَبُوا فَكِهِينَ (٣١) وَإِذَا رَأَوْهُمْ قَالُوا إِنَّ هَؤُلَاءِ لَضَالُّونَ (٣٢) وَمَا أُرْسِلُوا عَلَيْهِمْ حَافِظِينَ (٣٣) فَالْيَوْمَ الَّذِينَ آمَنُوا مِنَ الْكُفَّارِ يَضْحَكُونَ (٣٤) عَلَى الْآرَائِكِ يَنْظُرُونَ (٣٥) هَلْ ثُوِّبَ الْكُفَّارُ مَا كَانُوا يَفْعَلُونَ (٣٦)

واتە: ئەوانەی کە تاوانباربوون لە دونیا بە ئیمانداران پێدەکەنین و کاتێك بەلایاندا تێئەپەڕین سوکایەتیان پێئەکردن و ئەگەڕانەوە بۆ ناو ماڵ و منداڵیان بە دەمبازی و کاتێك ئیماندارانیان ئەبینی ئەیانووت بەڕاستی ئەوانە سەرلێشێواون، خۆ ئەوان نەکرابوون بە پارێزەری ئەوان، ئەوا ئەمرۆ ئیمانداران لەسەر تەختن و سەیری تاوانباران ئەکەن و پێیان پێدەکەنن، ئایا ئاوا بێباوەڕەکان پاداشتیان وەرگرتەوە.

ئەم دە ئایەتە پیرۆزەی کە باسی پێکەنینی تێدایە ئەم خاڵانە لەخۆ ئەگرێت:

١ـ پێکەنین و گریان دوو غەریزەن و خوا وویستی کردووە لە مرۆڤدا هەبێت (انه هو اضحك وابكى) هەردووکیان لەیەکاتدا بۆ خەم و خۆشی دروست ئەبن هەرچەندە پێکەنین زۆرتر لەکاتی بوونی کاریگەرییەکانی شادی و هەستی بڵندیدا دروست ئەبێت کەچی جاری وا هەیە کەخەم ئەگاتە ئاستێك هەر پێکەنین ڕووئەدات وەك عەرەبیش ئەڵێت (شر البلية ما يضحك) .

گریانیش کاتێك ڕوو ئەدات هۆکارەکانی خەم و پەژارەو لەناخدا دروست بێت ئەوکات ڕەنگ و ڕووئەگۆڕێت و چاوەکانیش فرمێسك ئەڕێژن، گریانی شادیش هەیە ئەویش کاتێکە شادی بگاتە ئاستە بەرزەکانی. کاریگەرییەکانی پێکەنین و گریان لەکەسێکەوە بۆکەسێکیتر ئەگۆڕێ و جاری وا هەیە پێچەوانەش ئەبێتەوە واتە ئەوەی تۆ بۆی ئەگریت خەڵك پێی پێئەکەنێت، وەك ئەوەی ئیمانداران ئەپاڕێنەوە و فرمێسك ئەڕێژن کاتێك داوای بەزەیی و لێخۆشبوونی خوا ئەکەن کەچی بێباوەڕان بەو دیمەنە پێدەکەنن.

٢- ئەوانەی لەدونیا باوەڕیان هێناوە و لایان بەلای گاڵتەو تەشەری دەمبازاندا نەدابێتەوە ئەوا لە قیامەتدا زۆر شاد و دەم بەخەندە ئەبن و خواش تۆڵەیان بۆ ئەکاتەوە بەخستنە ئاگری ئەوانەی باوەڕدارانیان بە سەر لێشێواو ئەزانی (فاليوم الذين امنوا من الكفار يضحكون هل ثوب الكفار ماكانوا يفعلون).

٣- خوای گەورە لە یەك ئایەتی ئەو دە ئایەتەدا ئەفەرمووێ: باکەم پێبکەنن و زۆر بگرین. ئەویش بە ناپاك و دوو ڕووەکانی فەرمووە، نازانم چۆن وەرگێر ئەمەیانی نەکردۆتە بەڵگە؟؟ ئایا لەبەر ئەوە بووە نەیزانیوە ئایەتی ئاوا هەیە؟!! یان ئەگەر لەبەر هەرهۆیەکیتر نەیهێنابێت! ئەوا پێش و پاشی ئەو پارچە ئایەتە باسی کەسە ناپاکەکان و سیفەتەکانیان ئەکات کە گاڵتە بە باوەڕدارەکان ئەکەن هۆکاری گاڵتەکردنیشیان ئەوەیە باوەڕداران لەکەم کەم و لەزۆر زۆر ئەبەخشن، بەگیان و بەماڵ درێغی ناکەن، کەچی دووڕووەکان، سوێندی درۆ، پەیمان شکاندن، لەخۆبایی وچروکی لە سیفاتە بنەڕتییەکانیانە. ئایا ئەمانە هەقیان نییە زۆر بگرین و کەم پێبکەنن چونکە سزای ئەو کردەوە خراپانەیان چاوەڕێیانە؟ ئەم ئایەتە بڕیاری خوایە و لامی ئەمر لکاوە بە کرداری پێکەنین و گریانەکەوە (فليضحكوا قليلا و ليبكوا كثيرا) کەواتە ئەوان هەرچەندە پێبکەنن و گاڵتە بکەن لە دونیا هەر کەمە لەچاو ئەو گریانە درێژەی قیامەتیان کە دڵنەوایيکاريشيان نابێت (پەنا بە خوا) .

٤ـ پێکەنینەکەی سولەیمان پێغەمبەریش سەلامی خوای لێبێت بۆ بینینی نیشانەی خوا بوو کە چۆن مێرووەکانیش وەك ئێمە ئەژین و زمانی تایبەت بەخۆیشیان هەیە و هەروەها لە باسەکانی هەست و نەستی مرۆڤ ئەزانن، هەروەها پێکەنینی سارە خاتونی خێزانی ئیبراهیم پێغەمبەریش سەلامی خوای لێبێت لەبەر ئەوە بوو هەواڵی لەناوبردنی زۆرداران و ڕزگاربوونی لوت پێغەمبەرو باوەڕدارانی بیست بەو هەواڵە شاد بوولەو شادییەشدا هەواڵ و مژدەی بارداری بەئیسحاقەوە بیست.

٥- ڕوخۆشی و دەمبەخەندەییش لە ئیسلامدا بەچاکە دائەنرێت و موسوڵمان لەسەری پاداشتی بۆ دائەنرێت، لە نێوان محرەمەکان و هاوڕێیاندا دەرگای خۆشەویستی ئەکاتەوە کە بڕوانامەی گەیشتنە بە ئیمان و کلیلی چوونە بەهەشتە، پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) ئەفەرمووێت: ـ لن تدخلوا الجنة حتى تؤمنوا و لن تؤمنوا حتى تحابوا ألا أدلكم على شيء إذا فعلتموه تحاببتم،قالوا: ما هو يا رسول الله؟ قال: أفشوا السلام بينكم.

واتە: هەرگیز ناچنە بەهەشت تا باوەڕنەهێنن، باوەڕیش ناهێنن تا یەکترتان خۆشنەوێت ئایا شتێکتان پێبڵێم ئەگەر کردتان یەکترتان خۆشئەوێت؟ ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو شتە چییە؟ فەرمووی: زۆر سڵاو لەیەکتر بکەن.

عَنْ أَبِى ذر أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– قَالَ:« يَا أَبَا ذر لاَ تَحْقِرَنَّ مِنَ الْمَعْرُوفِ شَيْئًا وَلَوْ أَنْ تَلْقَى أَخَاكَ بِوَجْهٍ مُنْبَسِطٍ، وَلَوْ أَنْ تُفْرِغَ مِنْ دَلْوِكَ فِى إِنَاءِ الْمُسْتَسْقِى، وَإِذَا طَبَخْتَ قِدْرًا فَأَكْثِرْ مَرَقَتَهَا وَاغْرِفْ لِجِيرَانِكَ مِنْهَا ». رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

واتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) بەئەبوزەری فەرموو: ئەی ئەبوزەڕ هیچ کارێکی چاك بەکەم مەزانە با ئەو چاکەیەش ڕوخۆشیت بێت کاتێك ئەگەیت بە برادەرەکەت یان بە بەتاڵکردنەوەی دۆڵچە ئاوەکەت لە دەفری ئاوخوازدا ، ئەگەر خواردنت لێنا شلەکەی زیادکە و لەو خواردنە بۆ دراوسێکانیش بنێرە.

ئەمانەو پێشەوایەتی پێغەمبەریشمان (صلى الله عليه واله وسلم) لە ڕەوشت جوانی و ڕوخۆشی و نەرمونیانی بۆمان دەرئەخات کە سڵاوو خۆشەویستی و خەندە و دڵاوایی لە سیمای باوەڕدارە و لە ئیسلامیشدا وەك باسمانکرد دەقەکان بەیەکەوە باسەکان تەواو ئەکەن و ڕاڤەی یەکتر ئەکەن ! ماوەتەوە بڵێین یەکێك لە سیفەتەکانی قیامەت (عبوسا قمطريرا) یە وەك لەم ئایەتەی سورەتی ( الانسان )دا هاتوە (يُوفُونَ بِالنَّذْرِ وَيَخَافُونَ يَوْماً كَانَ شَرُّهُ مُسْتَطِيراً (٧) وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَى حُبِّهِ مِسْكِيناً وَيَتِيماً وَأَسِيراً (٨) إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللَّهِ لا نُرِيدُ مِنْكُمْ جَزَاءً وَلا شُكُوراً (٩) إِنَّا نَخَافُ مِنْ رَبِّنَا يَوْماً عَبُوساً قَمْطَرِيراً (١٠) فَوَقَاهُمُ اللَّهُ شَرَّ ذَلِكَ الْيَوْمِ وَلَقَّاهُمْ نَضْرَةً وَسُرُوراً (١١) وَجَزَاهُمْ بِمَا صَبَرُوا جَنَّةً وَحَرِيراً (١٢)

واتە: ئەوان بەجێهێنەری نەزرەکانن و ترسیان لە ڕۆژێك هەیە مەترسی و خراپەی لێئەبارێ، لەبەر خۆشەویستی خوایە نانبدەن بەهەژاران و هەتیوان و دیلەکان، ئەڵێن تەنها بۆخوا ئێمە ئێوە تێرئەکەین و سوپاس و پاداشتمتان لە ئێوە ناوێت، ئێمە ترسمان لە خوای خۆمان هەیە لە ڕۆژێکی گرژی توند لە گرژی مۆنیدا، خوا لە خراپەی ئەو ڕۆژە ئەوانی پاراست و شادی و گەشی بەبالآبرین.

خوێنەری هۆشیار سەیرکە چۆن وەرگێڕ لێی تێکەڵ بووە، لێرەدا (عبوسا قمطريرا) یەکێکە لە سیفەت و ڕووەکانی ڕۆژی زیندوبونەوە و تەنها لەڕوی خراپەکاراندا توند و گررژە و لە هەموو لایەکەوە بەلآیان بۆ ئەبارێ بەلآم ئەوانەی لە دونیا سفرەو خوانداربوون بۆ هەژاران و بێسەرپەرشتان و دیلەکان ئەوانە قیامەت لەڕویاندا گەشەو چاکەکاران تیایدا ڕوگەش و شادمانن.

ئیتر ئەم سیفەتەی ڕۆژی دوایی لەکوێ و ئەم باسە لەکوێ؟ مەگەر لەوێدا بەیەك بگەنەوە لەو ڕۆژەدا کەئەوە سیفەتەکەیەتی هەیە دڵخۆشەو پێئەکەنێت و چاکەکانی بۆتە قەڵغان بۆی و هەیشە واوەیلاو ڕۆڕۆیەتی چونکە چاکەیەکی نەکردوە دادی بدات و ڕزگاری بکات.

کەواتــە: ئێســتە ڕوونبویــەوە پێکــەنین و گریــان دوودانــراوی خــوایین وهۆکــاری ڕوودانیان جۆراوجۆرن، ئیسلام بـاس لەدانـەرو ڕاسـتی بـوون و سروشـتی ئـەو دوو غەریزەیە ئەکات لە مرۆڤدا.

وەك بینیمان نەك هـەر باسـی دژەوانـەیی لـە ئـارادا نییـە بـەڵكو هـەردووكیان پێویستن بۆ ژیانی مرۆڤ وبونیان هیچ دەستی مرۆڤی تیدا نییە و نیشانەن بۆجوانی دروستکراوەکانی خوا (پاك و بێگەردی بۆ ئـەو خوایـەی هـەموو شـتێکی خـەلقكرد وپاشان ڕێنمایكرد).

## مرۆڤ ڕێزی لێگیراوە، مرۆڤ لاوازە ـ ستەمکارە ـ نەفامە

٤ـ وەرگێڕ لێرەدا ئایـەتی (ولقـد کرمنـا بنـی ادم) و (ولقـد خلقنـا الانسـان فـی احسن تقویم) لەلایەك دائەنێ و لە بەرانبەریدائایەتی (وجعلناهم قـرده وخنـازیر..) و (وخلق الانسان ضعیفا) و چەند ووشەیەکی وەك (ظلوما، جهولا، کفورا) ئەهێنی کە ئاماژەن بۆ چەند ئایەتێکیتر.

لەم باسەشدا هـەروەك ئـەوانی پێشـوو بەکـەمێك ڕامـان لـە ئایەتـە پیرۆزەکـان دەرئەکەوێت کە ئەبن بەبەڵگە لەسەر وەرگێر نـەك ئـەوەی بەڵگـەبن بـۆی "ئـەوەی دیارە ئەوەیە خوایەکی بەخشندەی خاوەن ڕێز وبەدەسەڵات مرۆڤێکی خەلقکردوە وڕێـزی لێنـاوە، جـوانترین شـێوەی بۆدانـاوە، لەگـەڵ ئـەوەی ئـەم مرۆڤـە لەچـاو بوونەوەرو زۆربەی دروستکراوەکانیتردا لاوازە !کەچی خـوا بـە شـێوەیەك ژیـری و توانـای زانسـتی پێـداوە هـەموو بونـەوەری بـۆ دەسـتەمۆکردوە وخسـتویەتییە ئیختیاری، لەگەڵ ئەمانـەدا هەنـدێك لـەو مرۆڤانـە لـەجیاتی سـوپاس و پێـزانین و ملکەچـی بـۆ خـاوەن بـەهرەکان لـەڕێنماکان لائـەدەن و سـتەمکارو گێرەشـێوێن ئـەبن!، ڕێگـرو بەربەسـت ئـەبن لـە چـاکەکردندا ! ئەمانـە لـەو ڕێـز و بەهرانـە دائەماڵرێن، ئایا هەقیان نییە؟؟ یان لە مێژوودا هـەیانبوە لەوانـەش خـراپتر بـوون بۆیە مافی مرۆڤ بونیشیان لێ سەنراوەتەوە و خوا کردونی مەیمون و بەراز.

کەواتــە: خــوا ڕێــزی لــە مــرۆڤــاوە و بەرزیکردۆتــەوە بەســەر هــەموو دروستکراوەکانیتریدا و ئەم ڕێزە هەر بەردەوامە تا ئەوکاتەی ئەم مرۆڤە بێئەمەکی و شەرەنگێزی دەست پێئەکات و بەخالقی بێمنەت ئـەبێت و ئیعلانـی شـەر ئـەکات لەگەڵی، (پەنا بەخوا) ئیتر لەو ڕێزو بەهرانـە دائـەماڵرێ، مەگـەر هـەر خـوا خـۆی بزانێت لە دوای مۆڵەتی دیاریکراویشی لە قیامەت چی بەسەر ئەوانە ئەهێنێ.

## تۆڵەسەندن لەسەرتـان نوسراوە، لێبوردەبن

٥ــــ لـــەژێر ســـەر باســـەکانی (تۆڵەســـەندنەوەتان لەسەرنوســـراوە) و (تۆڵەمەسەنەوەو لێبوردەبن) دا وەرگێر دیسان دێت و ئایەتـەکان پارچـە ئـەکات نیـوەی لێـرەو نیوەکـەیتری لـەولا ئەنوسـێ و بەوەیشـەوە ناوەسـتێت بـەڵکو ڕستەیەکی عـەرەبی لـەدوو پاچـە ئایـەت دروسـت ئـەکات و ئەیـەوێت لەخوێنـەری بکاتە ئایەت ! نازانێ ئـاوازی ئایەتـەکان مـوجیزەن و هـەرگۆرا خوێنـەری قورئـان هەستی پێئەکات، ئایا کام خوێنەری قورئان هەیە نەزانێ ئەمە ئایەت نییـە (کتب علیکم القصاص کما کتب علی الذین من قبلکم) ئەمـە ئەگـەر (القصـاص) ەکـە بکەین بە (الصیام) ئـەوا لـە ئایـەتی ١٨٣ ی سـورەتی (البقرة) یـەو ئەگـەر (کتـب علیکم القصاص) بیت ئەوا ئەم ئایەتەی خوارەوەیە کە هـەر لـە سـورەتی (البقرة) دایە ئایەتی(١٧٨) و دیارە وەرگێر مەبەستی ئەمەیانە بەڵام لەبەر چەواشـەکاری و زۆرکردنی بەڵگەکانی ئەوەی دروستکردوە، هەروەها ئەو ووشانەی لـە ئایەتەکانـدا وەڵامەکانی خۆیی تێدایە و خوێنەر سەرسام ئەکات لایداوە چونکە ئەزانیت ئەگـەر وەك خۆی ئایەتەکانی بهێنایە و ڕاڤەی بکردایـە ئـەوا خزمـەتی بـەقورئان ئـەکرد و پارێزراوی قورئانی ئەسەلمان، بەڵام بەو شـێوەیەی کـردوە کـەباسمانکرد ئەمـەش ناپاکییەکی ڕوونە و کەسی بەو شـێوە ناکرێـت بەئەنـدازەی گەردیلەیـەك متمانـەی

پێبکرێـت، چـونکە دەرکـەوت هەڵـەکان و هـەوڵی بەهەڵەبردنـەکانی مەبەسـتی لەپشتەوەیە نەك نەزانین.

بـا بچـینە سـەر باسـی قورئـان و باسـەکانی تۆڵـە سـەندنەوە و لێبـوردن و دەرخستنی حەکیمی خوای تەعالا لە ناردنی ئەو فەرمانانەدا:

لە قورئاندا باسی تۆڵەکردنەوە (القصاص) لەم دووئایەتەی سورەتی (البقرة) دا هاتوە و ئەفەرموویێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالْأُنْثَى بِالْأُنْثَى فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ وَأَدَاءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَانٍ ذَلِكَ تَخْفِيفٌ مِنْ رَبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ فَمَنِ اعْتَدَى بَعْدَ ذَلِكَ فَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ (١٧٨) وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ (١٧٩)

واتە: ئەی بڕوامەندان تۆڵە سەندنەوەتان لەکوشتندا لەسەر نوسـراوە ئـازاد بـە ئازاد و کۆیلە بەکۆیلە و ژن بەژن بۆ هەرکەسـێك لـەخوێنی براکـەی خۆشـبوو ئـەوا بەچـاکە هـەڵس و کـەوت بکرێـت و هـەقی خوێنەکـەش بەباشـی بـدرێت ئەمـەیان بارسوکیی و بەزەیی پەروەردگارتانـە، هەرکـەس دوای ئەمـە دەسـتدرێژیکرد ئـەوا سزای بە ئازاری بۆ هەیە * بۆ ئێوە لە تۆلە سەندنەوەدا ژیـان هەیـە ئـەی خـاوەن ژیرییەکان بەڵکو ئێوە تەقوای خواتان هەبێت.

الشَّهْرُ الْحَرَامُ بِالشَّهْرِ الْحَرَامِ وَالْحُرُمَاتُ قِصَاصٌ فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ (١٩٤) البقرة

واتە: مـانگی شـەڕبەس بەرانبـەر بـەمانگی شەڕبەس،شـکاندنی هـەر ڕێـزێکیش تۆڵەی هەیە. ساهەرکەسێ دەستدرێژی کردە سەر ئێوە ئێوەش هـەر بەئەنـدازەی ئەو دەستدرێژی بکەنەوە و لەخوا بترسن خوا لەگەڵ خۆپارێزەراندایە.

وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَا أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْسِ وَالْعَيْنَ بِالْعَيْنِ وَالْأَنْفَ بِالْأَنْفِ وَالْأُذُنَ بِالْأُذُنِ وَالسِّنَّ بِالسِّنِّ وَالْجُرُوحَ قِصَاصٌ فَمَنْ تَصَدَّقَ بِهِ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَهُ وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ (٤٥)(المائدة)

واتە:لە تەوراتدا بۆ ئەوان بڕیارمانداوە کە گیانێک بە گیانێک، چاو بەچاوو لوتیش بە لوت، گوێ بەگوێ و دانیش بەدان، برینەکانیش تۆڵەیان هەیە، کێ بەخودی خۆی دەست لەتۆڵەکەی هەڵگرێت ئەبێتە کەفارەتی تاوانی، هەرکەسێ بەفەرمانی دابەزیوی خوا حوکم نەکات ئەوانە لە پێڕی ستەمکارانن.

**کەواتە:**

١ـ ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئاینێکی واقیعییە ولەگەڵ سروشتی مرۆڤەکاندا گونجاوە ئەو هەستەی لەدڵی کەس ودۆستی کوژراوەکەدا دروست ئەبێت فەرامۆشی ناکات و لەهەمان کاتیشدا دەستی لێبەرنادات بتەقێتەوە و تەڕ و ووشك پێکەوە بسوتێنێ، بەڵکو لەو نێوەندەدا ڕایدەگرێت.

٢ـ ئەو سنورەی کە ئیسلام بۆ کوشت و بڕ دایناوە نەفسەکان تیایدا یەکسانن و خوێنی کەس لەکەس زیاتر نییە بکوژ بەکوژراوەکە ئەکوژرێتەوە و زیادە ڕۆیشی تێدا ناکرێت.

٣ـ ئەگەر خاوەنی کوژراوەکە بە خوێنبایی ڕازیبوون ئەوا ئەبێت بەجوانی و چاکی خوێنباییەکەیان پێشکەش بکرێت و هەڵس و کەوت ئاسایی بکرێتەوە. ئیتر دوای ئەوە هەرکەس دەستدرێژی کرد ئەوا سزای سەختی بۆ هەیە چونکە پەیمانی شکاندوە و خیانەتیکردوە و دوای ئارامی پشێوی دروستکردوە .

٤ـ هەڵبژاردن لەنێوان خوێنبایی وەرگرتن و کوشتنەوەی بکوژەکە لەدەستی کەس و دۆستی کوژراوەکەدایە و کەس بۆی نییە شتێك بەسەریاندا فەرز بکات کەئەوان نەیانەوێت.

٥ـ ئەم تۆڵەسەندنەوە بۆ بەردەوامی ژیانە، ژیانی پڕ لەئاشتی ودڵسافی و دادوەری،ژیانێك تیایدا تەنها تاوانبار بەتاوانەکەی گیرۆدە ببێت نەك ژیانێك هەرکەسێك بیەوێت ئاگری ئاژاوە هەڵگیرسێنێ و گەل ومیلەتێك گیرۆدە بکات کەچی خویشی وەك باسکی بانان بۆی دەرچێ ! ئەبێت کەسانی ناپاك بەتارمایی مەرگ

بترسێنرێن پێش ئەوەی بیانەوێت فەرمانی مەرگی کەس دەرکەن، بەڵێ ژیان بۆ چاکخوازان و بەهرەداران ئاوا فەراهەم ئەهێنرێت. کۆمەڵگایەك ئیسلام بینای بکات ژیانی دانیشتوانەکەی ئەپارێزێت، ئاشتی و پێکەوە ژیانیان دەستەبەر ئەکات.

ئەمانە دەربارەی کوشتنی عەمدی بەڵام ناکۆکییەکانیتر کە لەنێوان ئەندامانی کۆمەڵگادا ڕوو ئەدات بەهۆی بەریەککەوتەی سروشتیەوە ئەوا باشترین هەڵوێستی ئیسلامی لێبوردنە و چاکەکردنە بەرانبەر هەڵەکار (وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ (١٣٤) هەرچەندە بەئەندازەی خۆی ئەتوانیت هەق بکاتەوە (فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ). ئەویش لەڕێگەی دادگاوە نەك هەروا بێسەروبەری.

لەو کاتانەدا هەروەك لە ئایەتە پیرۆزەکاندا دیارە خوا داوای تەقوا ئەکات ئەویش هەستی چاودێری خوا لەو کەسانەدا دروست ئەکات کە هەقەکەیان بەدەستە دەبێت لەخوا بترسن، زیادە ڕۆیی نەکەن، بێتاوان بەدووربگرن، دوای چەسپانی تاوانەکە بەسەر تاوانباردا و نەمانی گومان هەقەکەیان بەتەنها لەتاوانبار وەرگرنەوە، بەمشێوەیە کەس بە ئاگری تاوانی کەس ناسوتێ وپێکەوەژیان و هەماهەنگی خێڵ و کۆمەڵەکانیش نابێتە کینەوناکۆکی درێژخایەن.

کەواتە، ئەوەی وەرگێڕ پارچە پارچەیکردبوو ئەمە وێنە ڕاستەقینەکەیبوو ئەوەش کە تێکەڵیکردبو ئاوا ئەخرێنەوە شوێنی خۆیان.

ئەوەی ماوە (تۆڵەی خوایە) واتە:ـ ئەو هەقانەی خوا کە ئەکەوێتە گەردنی نکولیکاران. وەرگێڕ هاتوە دوان لەو ئایەتانەیشی بەم باسە تێکەڵکردوە ئەوانیش ئایەتی هەشتی سورەتی (الزلزله) یە لەگەڵ ئایەتی ٤٨ ی سورەتی (النساء):

يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ النَّاسُ أَشْتَاتًا لِيُرَوْا أَعْمَالَهُمْ (٦) فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ (٧) وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ (٨)

واتە: لەو ڕۆژەدا خەڵكی پەرتەوازە دێنەدەر بۆ ئەوەی كارەكانیان نیشانبدەن، هەركەسێك بەئەندازەی گەردیلەیەك چاكەبكات ئەیبینێتەوە و هەركەسیش بەئەندازەی گەردیلەیەك خراپە بكات دەیبینێتەوە.

كاكی وەرگێڕ ! !ئەو ڕۆژە كام ڕۆژەیە، سەیركە چۆن ئەبێت باسەكە نەبچڕێنیت، ئەو ڕۆژە لە ئایەتەكانی پێشوی سورەتەكەدا باسكراوە كە ئەمانەیە و ئەفەرموێت: كاتێك زەمین لەرزەكەی خۆی كرد، زەوی هەموو بارەكەی خۆی هەڵڕشت، و مرۆڤیش ووتی ئەوە زەوی چییەتی، ئەو ڕۆژە هەواڵی خۆی پەخش ئەكات، كە خوا فەرمانی پێكردوە.

إِذَا زُلْزِلَتِ الْأَرْضُ زِلْزَالَهَا (١) وَأَخْرَجَتِ الْأَرْضُ أَثْقَالَهَا (٢) وَقَالَ الْإِنْسَانُ مَا لَهَا (٣) يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا (٤) بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَى لَهَا (٥)

ئەوە ئەو ڕۆژەیە كە تۆماری كردەوە و گفتارەكان هیچی لێون نەبووە و هەمووی ئەبینرێتەوە، تاوانباران سەرسام ئەبن و هاوار ئەكەن (وَوُضِعَ الْكِتَابُ فَتَرَى الْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَا وَيْلَتَنَا مَالِ هَذَا الْكِتَابِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّا أَحْصَاهَا وَوَجَدُوا مَا عَمِلُوا حَاضِرًا وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا (٤٩)(الكهف) پەراوەكە دائەنرێت و تاوانباران لەوەی تیانوسراوە ترسیان لێئەنیشێ و ئەڵێن: وای بۆ ئێمە ئەم پەڕاوە چییە بچوك و گەورەی نوسیوە و ئەوەی لەدونیا كردبویان ئامادەیە و خواش ستەم لەكەس ناكات.

بەڵام خوای گەورە لە فەزڵ و بەزەیی خۆی هەمیشە هیوا بەبەندەكانی ئەدات بەم ئایەتەیتر كە وەرگێر لەكۆتایی ئەم بەشەیدا نوسیویەتی و تێكەڵی بەو باسانەیتر كردووە:

إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدِ افْتَرَى إِثْمًا عَظِيمًا (٤٨) واتە: خوا نابورێت كە هاوبەشی بۆ دابنرێت و دەبورێت لەوەی لەمەكەمترە بۆ ئەوەی كە بیەوێت، هەركەسێك هاوبەش بۆ خوا دابنێ ئەوە تاوانێكی گەورەی چنیوە.

ئەم ئایەتەش سۆزو بەزەیی خوا دەرئەخات بۆ ئەو بەندانەی کە تاوانیـان زۆرە بەمەرجێك پلەی خوایەتیان بەکەسیتر نەدابێت جگە لە(الله).

ئەم ئایەتە پیرۆزە بەدوای ئایەتێکیتردا هاتوە کـە خـوا لـەو ئایەتـەدا داوای لـە ئەهلی کتێب کردوە باوەڕ بەم قورئانە بهێنن پێش ئەوەی خوا لێیان تـوڕە بێـت و لەبـەزەیی خـۆی بـەرییان بکـات یـان پـێش ئـەوەی وەك ئەوانـەیان لێبکـات کـە ڕاوەماسـییان لەشـەممەدا کـرد دوای ئـەوەی خـوا لـەوانی قەدەغـەکردبوو، وەك ئەفەرمووێت: يَا أَيُّهَا الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ آمِنُوا بِمَا نَزَّلْنَا مُصَدِّقًا لِمَا مَعَكُمْ مِنْ قَبْلِ أَنْ نَطْمِسَ وُجُوهًا فَنَرُدَّهَا عَلَى أَدْبَارِهَا أَوْ نَلْعَنَهُمْ كَمَا لَعَنَّا أَصْحَابَ السَّبْتِ وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ مَفْعُولًا (٤٧) إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدِ افْتَرَى إِثْمًا عَظِيمًا (٤٨).(النساء)

کەواتە: ئەوانەی باوەڕ بەقورئان ناکەن کـەلای خـواوە دابـەزیوە ئەوانـە "خـوا لێیان توڕەیەو با چاوەڕێی سزا بکەن و بزانن ئەگەر لەو کارە پەشیمان نەبنـەوە و بێگومان لە قیامەتیشـدا خـوا لێیـان خۆشـنابێت، بـەڵام ئەوانـەی پلـەی خوایـەتی (ئەمر و نەهی) تەنها بە (الله) ئەدەن و ئەویش لە ڕێگەی قورئانەوە پێمان ئەگات ئەوا هەرچـیتریان هـەبێت لـە کـەموکورتی نێـوان خۆیـان و خـوا ئـەوا ئەگـەر خـوا بیەوێت لێیان خۆش ئەبێت.

ئەم دوو ئایەتە ئاماژەی ئەوەیشی تێدایە ئەوانەی بـاوەڕ بـەقورئان ناکـەن کـە خـوا دایبەزانـدوە ، هاوبەشـی بـۆ دائـەنێن، هـیچ بەڵگـەیان پێنییـە چـونکە ئەفـەرمووێت (فَقَدِ افْتَرَى إِثْمًا عَظِيمًا) ئیفـتیرا: بوختـان و قسـەی بێبنەمایـە و ووشەی (قد) یش کە چووەتە سەر کرداری ڕابـردوو واتـای بێگومـانی ئەگەیـەنێت، ئەوانە بێگومان بوختانچی و خاوەن تاوانی گـەورەن بۆیـە خـوا لـە بـەزەیی خـۆی دووریان ئەخاتەوە و فەرمانی خواش گەڕانەوەی بۆ نییە.

کەواتە: تا فرسـەتی ژیـان لەبەردەسـتایەو تـا دەرگـای پەشـیمانی و گەڕانـەوە نەبەسـتراوە بـا ئەوانـەی بەرانبـەر بـەقورئان هەڵـەیانکردوە پەشـیمان ببنـەوە و بگەڕێنەوە ئەگین ئارەزوی خۆیانە و دوای ئەوە کەس بەهانایان نایەت.

ئەمانـەو چـەندەها یاسـای تـری قورئـانی دەربـارەی لێبـوردن و تۆڵـە هـەن و هەریەکـەیان هەلومـەرجی تایبـەتی خـۆیی هەیـە وکاتێـك کۆباسـێکیان لێدروسـت ئەکەیت ئەزانیت تۆکمەیی حەکیمی دەقەکان تەنها لەخوای حەکیم و زانـاو بـەتوانا ئەوەشێتەوە و تێئەگەیت ئەم قورئانە پارێزراوە و خوا خاوەنییەتی.

## بێ حیساب ڕۆزی ئەدات، وەك یەك ڕزق بەهەموان ئەدات

٦ــ لـەژێر باسـی (بـەبێ حسـاب ڕزق دەدات) و (وەك یـەك ڕزق بەهـەموان دەدات) بۆ ئەم بابەتەیشـی هـەر چـەند پارچـەیەك لەئایـەتی هێنـاوە و تێکـەڵی و گاڵەگاڵێکی دروستکردوە. لـەژێر باسـی یەکەمـدا تەنهائـەو پارچـانەی کـە هێڵمـان بەژێردا هێناوە دایناوە:

فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ وَأَنْبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا الْمِحْرَابَ وَجَدَ عِنْدَهَا رِزْقًا قَالَ يَا مَرْيَمُ أَنَّى لَكِ هَذَا قَالَتْ هُوَ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يَرْزُقُ مَنْ يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ (٣٧)ال عمران

وَاللَّهُ فَضَّلَ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ فِي الرِّزْقِ فَمَا الَّذِينَ فُضِّلُوا بِرَادِّي رِزْقِهِمْ عَلَى مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَهُمْ فِيهِ سَوَاءٌ أَفَبِنِعْمَةِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ (٧١) النحل

وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِنْ شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ وَلَئِنْ كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ (٧)الرعد

بۆ باسی بەرانبەریشی کە بەحیسابی خۆی دژەوانەی باسی یەکەمە ئـەم چـەند پارچیتر کە هێڵیان بەژێردا هاتوە دائەنێت:

قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُ أَنْدَادًا ذَلِكَ رَبُّ الْعَالَمِينَ (٩) وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِنْ فَوْقِهَا وَبَارَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَاءً لِلسَّائِلِينَ (١٠) ( فصلت )

أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى (٣٨) وَأَنْ لَيْسَ لِلْإِنْسَانِ إِلَّا مَا سَعَى (٣٩) وَأَنَّ سَعْيَهُ سَوْفَ يُرَى (٤٠) ثُمَّ يُجْزَاهُ الْجَزَاءَ الْأَوْفَى (٤١).(النجم)

**وەڵام: ڕاڤەو تەفسیری ئایەتەکانی بەشی یەکەم بەمشێوەیە:**

ئایەتی یەکەمیان باسی مەریەمی کچی عمرانە سەلامی خوای لێبێت کەخوای گەورە دەربارەی ئەفەرمووێت:خوا وەریگرت بەشێوەیەکی چاك وپەروەردەیەکی چاکی کرد سەرپەرشتیکردنی خستە ئەستۆی زەکەریا هەرکات زەکەریا ئەچوویە پەرستگاکەیەوە ئەیبینی ڕۆزی لایە ووتی ئەی مەریەم ئەمەت لەکوێبوو ئەویش ووتی: ئەوەلای خوایە،خوا بۆ هەرکەس بیەوێت بەبێ حیساب ڕۆزی ئەداتێ.

ئایەتی دووەمیان باس لە جیاوازی ئەندازەی ڕۆزی خوا بۆ بەندەکانی ئەکات و ئەفەرمووێت: خوا فەزڵی هەندێکتانی داوە بەسەر هەندێکیترتاندا لە ڕۆزیدا و ئەوانەش کە زیادەیان پێدراوە زیادەکەی پەخش ناکەن بەسەر داروودەستەکەیاندا لەوەدا وەك یەکن ئایا بەبەهرەکانی خوا نکوڵی ئەکەن.

ئایەتی سێیەمیش باسی بڕیارێکی خوا ئەکات کە ئەوانەی سوپاسگوزارن بۆ بەهرەکانی خوا ئەوا بۆیان زیاد ئەکات و ئەوانەش کە بێئەمەکن هەرەشەی سزای توندیان بۆ هەیە.

ئەم ئایەتە پیرۆزانە هەموویان موحکەمن، ئیرادەی خوای گەورەش لە ڕۆزی بەخشیندا بەپێی ئایەتەکان بەم شێوەیەیە:

١ـ کەسانێکی خواناسی پاك ودڵپڕ لەخێر ئەوانە شایستەن و لەهەموو کەس زیاتر بەهرەی خوایان پێدراوە وەك پێغەمبەران "ئەوانە ڕۆزی زانست و ژیری و ڕێز وتوانای تێگەیشتن و بەڕێوەبردن... لەهەموو جۆرە ڕۆزییەکیان پێدراوە، خوا

ئەوانەی قبوڵکردوە بۆیە بەبێ حساب ڕۆزی پێـداون و لەئایـەتی یەکەمیشـدا ئـەوە دیارە.

٢ـ لەناو خـەڵکی ئاساییشـدا ڕۆزییـەکان دابـەش بـوون و هەرکـەس و کۆمـەڵێك زیادەی لەجۆرێکی ڕۆزیدا هەیـە بەسـەر ئـەویتردا و کارەکـەش کـاری خوایـە و بـۆ ئەوەیە خەڵکی پێویستیان بەیەکتر هەبێت و هیچ توێـژو کۆمـەڵێك زیـادەو بێئـیش نەبن، خاوەن زانست پێویستی بە سامانی ساماندار ببێت و ساماندار پێویستی بـە زانـا و ژیرەکـان هەیـە بـۆ کردنـەوەی بـواری بازرگـانی و خسـتنەکاری زیـاتری سەرمایەکان.

سامانداری هیوای هەموو کەسێکە و ئەبوو کەسە ژیرەکان لەهەمووکـەس زیـاتر دەوڵەمەند بوونایە کەچی بەو شێوەیە نییە و ئەبینی کەسی نەخوێندەواری نـەزان لەماوەیەکی کەمدا ئەبێتە دەوڵەمەندترین و کەسـی زۆر دانـاش هەیـە بـەزۆر نـانی شەوی دەست ئەکەوێت.

کەواتە: هەرکەسێك لەجۆرێکی ڕۆزیـدا بەشـی زۆرەو هەیشـە لەچـەند جۆرێکدا بەشی باشـی وەرگرتـوە، ئـەم جیاوازییـەش بـۆ یـەکگرتن و گونجاندنـەو بـەزەیی خوایە، ئەگەر ئەم جیاوازییە نەبوایە نە دونیا بەردەوام ئـەبوو نـە بـەرەو پێشـیش ئەچوو.

٣ـ ئەمەی کـەخوا دابەشـیکردوە و بەخشـیویەتی " مـرۆڤ ئـەتوانێت بەشـەکەی زیاد بکات یان بیبڕێت ئەویش لە ئایەتی سێیەمدایە: سوپاسکردنی خوا لەسەر هەر جۆرێکی ڕۆزی، زیادبوون و مانەوەی ئەو ڕۆزییەی لەدوایە ئیتر ڕۆزییەکە پارە بێت یـان منـاڵ یـان دەسـەڵات یـان سـەلامەتی یان....هەرچـییەکیتر بێـت و ناشـوکری وبەکەم زانینی بەهرەکانی خواش پەنابەخوا بڕین و نەگبەتی بەدوا دێت.

ئەمە دیارە بۆ کەسانێکە هاتونەتە ناو دائیرەی ئیسلامەوە و بە ئیسلام ڕازین و ئەو سزایەش بۆ پاککردنەوەیانە و هەقێکە لە دونیا وەریئەگرن. بەڵام ئەوانەی کـە

خوا ناناسن ئەوە حاڵیان جیاوازە و خوا بەجۆرێکیتر مامەڵەیان لەگەڵ ئەکات وەك لەم ئایەتانەی سورەتی (الزخرف) دا دیارە:

وَلَوْلَا أَنْ يَكُونَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً لَجَعَلْنَا لِمَنْ يَكْفُرُ بِالرَّحْمَنِ لِبُيُوتِهِمْ سُقُفًا مِنْ فِضَّةٍ وَمَعَارِجَ عَلَيْهَا يَظْهَرُونَ (٣٣)وَلِبُيُوتِهِمْ أَبْوَابًا وَسُرُرًا عَلَيْهَا يَتَّكِئُونَ (٣٤) وَزُخْرُفًا وَإِنْ كُلُّ ذَلِكَ لَمَّا مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةُ عِنْدَ رَبِّكَ لِلْمُتَّقِينَ (٣٥)

واتە: ئەگەر لەبەر ئەوەنەبێت کە خەڵك ئەبنە یەك میللەت ئەوا بۆ ئەوانەی بەخوای بەزەیی بێباوەڕن سەقفی ماڵەکانیانمان ئەکردە زیووئەوپلیکانانەش کە پێیدا سەرئەکەون هەمو دەرگای ماڵەکانیشیان لەزیو ئەبووئەو تەختانەش کە لەسەریان پاڵ ئەدەنەوە، شتی تری هەمە ڕەنگەش،ئەوانە هەمووی خۆشی ژیانی دونیان و ژیانی قیامەتیش لای خوا باشترە بۆ ئەوانەی تەقوای خوایان هەیە.

کەواتە: خوای بەبەزەیی بۆ ئەوانەی باوەڕیان بەخواو زیندوبونەوە نییە لە خۆشییەکانی دونیا زۆر بەشیان ئەدات و ئەگەر لەبەر ئەوەش نەبوایە کە ئەبێتە فیتنەیەکی گەورە بۆ ئیمانداران ئەوا حاڵی هەموو بێباوەڕان بەو شێوە ئەبوو کە لەئایەتەکاندا باسی فەرمووە.

بابێینە سەر ئەو ئایەتانەی کە وەرگێڕ لە بەرانبەری ئەم ئایەتانەدا داینـاوە و بە حیسابی خۆی دژەوانەی ئەمانەیە:

قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُ أَنْدَادًا ذَلِكَ رَبُّ الْعَالَمِينَ (٩) وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِنْ فَوْقِهَا وَبَارَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَاءً لِلسَّائِلِينَ (١٠) فصلت

أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى (٣٨) وَأَنْ لَيْسَ لِلْإِنْسَانِ إِلَّا مَا سَعَى (٣٩) وَأَنَّ سَعْيَهُ سَوْفَ يُرَى (٤٠) ثُمَّ يُجْزَاهُ الْجَزَاءَ الْأَوْفَى (٤١)

ئایەتی یەکەمیان: ئەی موحەمەد بڵێ ئایا ئێوە سورن لەسەر ئەوەی بێباوەڕبن بەوەی کە زەوی لەماوەی دوو ڕۆژدا دروستکردو هاوبەشیشی بۆ دائەنێن ئەو

خـاوەنی جیهانیانـە، لـەناو زەویـدا کێوەکـانی بەبـەرزی دانـا و فـەڕی تێخسـت و بژێویشی تێدا دانا لە چوار ڕۆژی یەکساندا بۆ ئەوانەی ئەپرسن.

لە ئایەتی دوەمیشدا کە ئایەتێکی گشتییەو باسی هەموو جۆرە هەوڵێك ئـەکات کە مرۆڤ پێی هەڵئەسێ و ئەفەرموێت: تاوانی کەسـێك مەخەنـە سـەر کەسـێکیتر و مرۆڤ هیچی لەسەر نییە ئـەوە نـەبێت کەکردوویـەتی و کۆششەکەیشـی لـە دواییـدا هەڵئەسەنگێنرێت و تەواوترین  پاداشتی ئەدرێتەوە.

کەواتــە: ئەمــە داوای خوایــە بــۆ دادگــای ئیســلامی کــە هەرکــەس بەرانبــەر کردەوەکانی خۆی بەرپرسـە و کەسـیش لەسـەر تـاوانی کەسـیتر نابێـت پرسـیاری لێبکرێت، و لە لای خواش هەر بـەو شـێوەیەیە هەرکـەس کـاری خـۆی بـۆ هـەژمار ئەکرێت و پاداشت و سزای تەواوی لەسەر وەرئەگرێت.

خوێنەری بەڕێز:  ئایا لـەم ئایەتانـەو ئەوانـەی پێشـوودا چ دژەوانەیـەك بـەدی ئەکرێت؟!! بێگومان هیچ، بەڵام ئـەوەی وەرگێـڕ لێـی حـاڵی نـەبووە ئەوەیـە کـە وشەی (سَوَاءً لِلسَّائِلِينَ) ی هێناوە و ڕاڤەی کردوە و ئەڵێت: خواوەند بژێو و قـوتی هەموانی وەکیەك بۆ پرسیارکەران تەقدیرو پێوانە کردوە.

ئـەم ڕاڤەیــە هەڵەیــە.دەبو کــەخۆی نازانێــت لــە تەفســیری زانایەکــەوە نقڵــی بکردایەو بەهەرسێجۆرە خوێندنەوەکەی ووشەی (سواء)  بە (نەصب و بەجەڕ و بە ڕەفع) ئەو واتایان تێدا نییە! بەڵکو یـان ئەبێتـە سـیفەتی چـوار ڕۆژەکـە کـە چـوار ڕۆژی یەکسان بوون یـان حاڵـە لـە بـژێوی و پێوانەکـە کـە لـە دابەشـبونیان لـەناو زەویدا یەکسانە یان مەصدەرە و بەشی گوزارەیە بۆ نیهادێکی نادیار.

ئەم ووردەکـاری دروسـتکردنی زەوی و بژێوییـە بـۆ ئـەو کەسـانەیە لـە مـاوەی دروستکردنی زەوی و ئەوەی لەزەویدا هەیە پرسیار ئەکەن، ئەم ئایەتانە ئامـاژەن بۆ چەندەها ڕاستی زانستی کـە پرسـیارکەران پێویسـتە بەدوایـدا بگـەڕێن، لەوانـە تەمەنی زەوی و ماوەی دروستبونی یان دابەش بوونی جۆری قووت بە نـاو زەویـدا و یەکسانبونی.

لەوانەیە وەك ئەوەبێت كە لەناو مرۆڤەكاندا هەیە جۆرەكانیان جیاوازە و بـونی ئەو جیاوازییەش هەماهەنگی و پێكەوە ژیانیانی سـازكردووە،هەروەها ڕۆزیش لـە ناو زەویدا دابەشكراوە بەجیاوازی جـۆرو پێویسـتی بـڕ، پارچـەیەك زەوی كشـت و كاڵییە، پارچەیەكیتر كانزا دارە و هەیە نـەوت و هەیشـە دارسـتانی چـڕ و.... بـەم شـێوەیە ئـەم پێوانـە و دابەشـكردنە بـۆ ئەوەیـە ئـاڵوگۆڕی بازرگـانی و پێویسـتی میللەتان بەیەكتر هەر بەردەوام بێـت و بـۆ هەركـەس و میللـەتێكیش بـەدوای ئـەو ڕۆزی و بەهرانەدا بگەڕێ بێگومان نائومێد نابێت و دەستی ئەكەوێت.

## وَوَجَدَكَ ضَالًّا فَهَدَى ـ وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ

٧ــ دو باسـی جیـاوازی بـێ سـەرباس هێنـاوە یەكـەمیان دەربـارەی كەسـێتی پێغەمبەرەو دوەمیان دەربارەی حەددی زیناكارە.

بۆ یەكەمیان ئایەتی ٧ی سورەتی (**الضحى**) ی هێنـاوە (وَوَجَدَكَ ضَالًّا فَهَدَى) و لەبەرانبەریدا ئایەتی (وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ (٤) سورەتی (القلم) ی داناوە.

بـۆ باسـی دووەمیـان ئایـەتی ٢ی سـورەتی (النـور) ی هێنـاوە (الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ وَلَا تَأْخُذْكُمْ بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ (٢) و لەبەرانبەریـدا **فـەرموودەی** (مـن سـتر مسـلما فـی الدنیاسـترە الله یـوم القیامـة) ی دانـاوە و لەپەراوێزیشدا ئەڵێت ئەمە پێچەوانەی بەئاشكرای جەڵد لێدانە.

لە وەڵامی ئاماژەی یەكەمیدا بەویستی خوا ئەڵێین: ئـەم ئایەتـە (وَوَجَدَكَ ضَالًّا فَهَدَى) لە سورەتی (الضحى) دایە كە سەراپای سورەتەكە لە وەسـفی جـەمال و كەماڵی پێغەمبەرە وەك شاعیر ئەڵێ:

وەزوحا وەسفی جەماڵی تۆیە ئەی خەیرەلبەشەر
نێرگزی چاوت دەلیلە یەعنی ما زاغ البصر

ئەم ئایەتەش کە وەرگێڕ لەو سورەتە هێناویەتی و بەدژەوانەی ئایەتی (وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ) داینـاوە گـەورەترین هەڵەیـە چونکە ڕاستی وگـەورەیی واتـای ئایەتی دووەمیان بوویە بنـەما بـۆ یەکـەمیان و هـەردوو ئایەتەکە لازم و مـەلزومی یەکن، خوا خۆی ئەزانێت لەکوێدا و بەکێدا نامەی خۆی ڕەوانەی بەندەکانی ئەکات ( وَإِذَا جَاءَتْهُمْ آيَةٌ قَالُوا لَنْ نُؤْمِنَ حَتَّى نُؤْتَى مِثْلَ مَا أُوتِيَ رُسُلُ اللَّهِ اللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُ سَيُصِيبُ الَّذِينَ أَجْرَمُوا صَغَارٌ عِنْدَ اللَّهِ وَعَذَابٌ شَدِيدٌ بِمَا كَانُوا يَمْكُرُونَ (١٢٤)

بـەڵێ موحەمـەد پێغەمبـەر درودی خـوای لەسـەر بێـت خـاوەنی گـەورەترین ڕەوشت بووە، هەر لەمناڵییەوە تا ئەوکاتـەی دونیـای بەجێهێشـت، خـوای گـەورە شایەتی ئەوەی بۆ داوە بەو ئایەتەو چەند ئایەتێکیتر لـە سـورەتی ئـالی عیمـران و سورەتی ئەحزاب و نەیاران و موشـریکەکانی مەککـەش هـەمان شـایەتیان بـۆداوە بەوەی نازناوی ڕاستگۆی ئەمانەتپارێزیان پێدابوو پێش ئەوەی ببێت بە پێغەمبەر، دوای بـوو بـە پێغەمبـەریش هەرشـایەتی گـەورەییان بـۆ ئـەدا هەرچـەندە نـەیارو دوژمنیشی بوون، بۆ نمونە لەکاتی میوانـداریان لای هیرقـل پاشـای ڕۆم بەناچـاری نەك بـەدرۆ بخرێنـەوە شـایەتی خانـەدانی و ڕەوشـت بـەرزیان بۆیـدا ئەمـەش ئـەو بەشەی ڕووداوەکەیە کە پەیوەندی بەباسەکەی ئێمەوە هەیە: عن ابن شـهاب، عـن عبيد الله بن عبد الله: أن عبد الله بن عباس رضي الله عنهما أخبره قال أخبرني أبـو سفيان: أن هرقل قال له: سألتك ماذا يأمركم. فزعمت أنه أمركم بالصـلاة والصـدق والعفاف والوفاء بالعهد وأداء الأمانة. قال: وهذه صفة نبي.

واتە: لە ئیبن شەهابەوە لە عوبەیدوڵلای کوڕی عەبدوڵلاوە کە عەبدوڵلای کوڕی عەبباس خوا لەخۆی و باوکی ڕازی بێت هەواڵی پێداوە و ووتویەتی: ئەبو سـوفیان هەواڵی پێدام: کە هیرقل پێی ووتوە: پرسیارم لێکردی موحەمەد فـەرمانی چیتان پێئـەکات و تـۆش ووتـت بەنوێـژ و بـە ڕاسـتگۆیی و پـاکیزەیی و وەفـاکردن بـە پەیمانەکان و ئەمانەتپارێزی. هیرقل ووتی:دەی ئەمەیە سیفەتی پێغەمبەران.

کەسێك خواو ودۆست و دوژمنەکانی بەو شێوەیە پێناسەی بکەن شایستەی ئەوەبووە کە هەڵگری ئەمانەتەگەورەکەبێت  ئەویش گواستنەوەی پەیامی خوایە بۆ خەڵکی خوا، بۆیە خوا ئەفەرموێت: خوا خۆی زاناترینە بەوەی پەیامەکەی لەکوێدا دائەنێت.

پێغەمبەری خوا پێش پێغەمبەرایەتی بەماوەیەك، لەبیرکردنەوە و گەڕاندا بوو بەدوای وونبویەکیدا و پێش سێ ساڵیش لەبوون بەپێغەمبەری بۆ ئەومەبەستە خەڵوەتی ئەگرت لە ئەشکەوتی حەڕا، ئەو عەودالبوون و گەڕانەی بەدوای ڕێگەی ڕاستی ژیاندا و هاتنی وەحی خوایی و دۆزینەوەی ڕێگە ڕاستەکە تەفسیری ئایەتی (وَوَجَدَكَ ضَالًّا فَهَدَى) یە، وەك ئەم ئایەتەی تریشە کە ئەفەرمووێت: وَكَذَلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِنْ أَمْرِنَا مَا كُنْتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلا الإيمَانُ وَلَكِنْ جَعَلْنَاهُ نُورًا نَهْدِي بِهِ مَنْ نَشَاءُ مِنْ عِبَادِنَا وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ) الشورى: ٥٢

واتە: بەمشێوەیە ژێنەرێکمان وەحی کرد بۆتۆ بەفەرمانی خۆمان تۆ قورئان و ئیمانت نەئەزانی بەڵام ئێمە قورئانمان کردۆتە ڕووناکییەك ڕێگەی ئەو بەندانەی پێڕوناك ئەکەینەوە کە ئەمانەوێت و بەڕاستی تۆ بێگومان خەڵکی بۆ ڕاستەڕێ بانگ ئەکەیت.

کەواتە: موحەمەدێکی ڕەوشت بەرزی دڵسۆز و خەمخۆری خەڵك وێڵبوو بەدوای هیدایەتدا، وەڵامدانەوەی خوا بۆی و کردنی بەسەرمەشقی هەموو جیهان و ناردنی قورئان بۆی وەك ڕێگەی ژیان، ئەمانە هەمووی لەلایەك تۆکمەیی و حەکیمی ئایەتەکانی خوامان فێر ئەکات لەلایەکیتر نەگۆڕی فەرمان و سوننەتی خوا لەکەوندا دەرئەخات، بێگومان ئایەتەکانی قورئان لە ژیاندا قسەی خۆیان ئەکەن، ژیان لەگەڵ ئایەتەکانی سورەتی (الضحى) دا هەموو ئەوانەمان فێر ئەکات.

باسی دووەمی دانانی ئایەتی دووەمی سورەتی (النور) و لە بەرانبەریدا فەرموودەی (من ستر مسلما ....) و ئیدعا کردنی ئەوەی گوایە دژەوانەی یەکن.

لەوەڵامدا ئەڵێین: ئاینی ئیسلام هاتوە بۆ پاراستنی نەفس و سامان و ناموس و دین و عەقڵ و بۆ ئەم مەبەستەش کۆمەڵێك ڕێوشوێنی دیاریکردوە و ئایەتەکەی سورەتی نور یەکێکە لە ڕێگاکانی پاراستنی نەفس و فەرموودەکەش بۆ پاراستنی ناموسە.

زیناکردن، پەیوەندی ناشەرعی نێرومێ لەم سەدەمەدا بەرهەمەکەی کە نەخۆشی ئایدزە بەئاشکرا دیارەو دروێنەی ژیانی خەڵك ئەکات لەلایەك بە لەکارخستنی ئەوەی توشی ئەبێت ، لەلایەك بەوەی کە نەخۆشییەکە بۆتە مۆتەکەیەك بۆ ئەوانەی لە گواستنەوەی ئەترسن لەڕێگەیەك لە ڕێگەکانی گواستنەوەی و متمانەیشی لە نێوان ئەندامانی کۆمەڵدا کەمکردۆتەوە، ئەو هەموو هەوڵ و سامانەبێشمارەش با بوەستی کە لە پێناوی توشبوان و گەڕان بەدوای دەرماندا خەرج ئەکرێت، ساڵەهایە لایەنە پەیوەندیدارەکان خەریکن بە بڵاوکردنەوەی ڕۆشبیری سێکسی و هۆشیاریدان و بۆماوەیەك بەندکردنی لەشفرۆشان کەچی نەخۆشییەکە لەزیادبوندایە و باندەکانی بازرگانی بە مرۆڤ وبازرگانی بەلەش هەر لەزیاد بووندایە، بەڵام ئەگەر ئەو چارەسەرە ئیسلامییە ئەزمونکراوانە بەکاربهێنرانایە بێگومان ئەو بەڵایە قەڵاچۆ ئەبوو.

ڕێوشوێنەکانی ئیسلام بۆ پاراستنی نەفس لە نەخۆشی ئایدز و نەخۆشییەکۆمەڵایەتییەکانیتر کە بەهۆی ئەو پەیوەندییە ناشەرعییەوە دروست ئەبێت ئەمانەن:

١ـ چاوداخستنی هەردوو ڕەگەز لە ئاستنی نامحرەمەکانیان.

٢ـ مۆڵەت وەرگرتن و چاوەڕێی مۆڵەتدان بۆ چوونە ماڵی یەکتر.

٣ـ ئەندامانی خێزانێکیش بۆ چوونە ژوری تایبەتی یەکتر ئەبێت تەقە لەدەرگا بدەن و مۆڵەت وەرگرن.

٤ـ پاراستنی هەردوو ڕەگەز بۆ عەورەتیان و داپۆشینی. ژنیش تەنها دەست و دەموچاویان عەورەت نییە.

٥ـ تەنیا نەبوونەوە لەگەڵ نامەحرەمدا.

٦ـ باسنەكردنی ئەوبابەتانەی وورووژێنەرن لای نامەحرەمدا.

٧ـ دواندنی عەقڵ و عاتیفەی ئەو کەسانەی حەزیان بەکاری بەدڕەوشتی هەیەبۆئەوەی بەقەناعەتەوە وازبهێنن وەك ئەوەی کە پێغەمبەر (صلی الله علیە والە وسلم) کردی لەگەڵ ئەو کەسەی کە هات و داوای مۆڵەتی شەرعی ئەکرد بۆکردنی ئەو تاوانە.

٨ـ ئەگەر تاوانی زینا بەسەر هەر دوانێکدا چەسپا ئەویش کاتێك ئەچەسپێ کە خۆیان دان بەتاوانەکەدا بنێن یان ئەبێت چوارکەس بەیەکەوە ئەو تاوانەیان بینیبێت ئەوکات هەریەکەیان سەد جەڵدیان لێئەدرێت و ئەم حوکمە بەزەیی تێدا نییەو ئەبێت کۆمەڵێك لە باوەڕدارانیش جێبەجێکردنی ئەم حەددە ببینن.

دیارە لەکۆمەڵگایەکدا کە ئیسلام دروستی بکات زۆر بەکەمی زینا ڕوو ئەدات تیایدا لەبەر ئەو هەموو مەودایەی کە دایناوە لەنێوان مرۆڤ ئەو تاوانە خراپەدا، ئەگەر کەسێك ئەوهەموو بەربەستەی شکاند و گەیشتە ئەو تاوانە کاولکارە و بەشێوەیە بینرا یان خۆی دانپیانانیکرد ئەوا ئەبێت نەفسییەت و جەستەی سزا بدرێت (نەفسی بەکۆبونەوەی پاکیزەکان و بینینی سزاکەی و جەستەیشی بە سەد جەڵەکە) چونکە ئەوکارەی بۆ وەڵامدانەوەی داوای ئەودوانەکردوە. ئەگەر ئەو دووانە سزا وەگرن بۆجارێکیتر تەمێ ئەبن ئەزانن ئەو باجەی ئەیدەن زیاترە لە خۆشی چەند ساتێکی زۆر کەم، هەروەها بوونی سزایەکی لەو جۆرە بۆ ئەو تاوانە ونەبوونی بەزەیی و چاوپۆشی لە جێبەجێکردنی سزاکە دیارە دوای چەسپاندنی بەو دوو ڕێگەیەی کەباسمانکرد ئەوە کاریگەری زۆری ئەبێت لەسەر هەموو خەڵك و بەمشێوەیەش پرۆسەی زەواج گەشە ئەکات چونکە تەنها ڕێگا ئەبێت بۆ تێرکردنی ئارەزوەکان و متمانە لەناو خێزانەکاندا بتەو ئەبێت و کۆمەڵگا بەدوور ئەبێت لەو هەموو نەخۆشییەش و چەندەها خێرو بێریتر کە بونی کۆمەڵگای بەڕەوشت ئەیهێنێ.

کەواتە، ئەو جەڵد و سزایە عەینی بەزەیی و حیکمەتە بۆ ژیانی پڕلە ئاشتی و ئاسایشی گەلان ئەگەر بزانن.

ماوە بلێین : ئایا کە ئەم سزاو تۆڵەیە هەیە هەروا زمانی خەڵکیش کراوەیەو لەکاردایە بەرانبەر بەخەڵکی و هەرکەس ڕقی لەهەرکەس هەستا بە ئاسانی ئەتوانێت لەکەداری بکات و بەر سزای بدات؟؟

نەخێر هەروەك چۆن بۆ چەسپاندنی ئەو سزایە دوو مەرج دانراوە و ئەوەی پەیوەندی بەخەڵکەوەیە زۆر قورسە و بۆ قسەکردن لەسەر بابەتێکی وا هەستیار ئەبێت چوارکەس بەیەکەوە ئەو تاوانە ببینن ئەگین نابێت هەر باسیشی بکەن و ئەگەر باسیانکرد ئەوا جەڵدیان لێئەدرێت، ناموس و ناوبانگی خەڵکی نابێت لەکەداربکرێت و لەکاتی بینینی هەر عەیبوعارێکی خەڵکیدا ئەبێت باسنەکرێت و پەردەپۆش بکرێت. عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ، رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم حَتَّى أَسْمَعَ الْعَوَاتِقَ فِي بُيُوتِهَا، أَوْ قَالَ فِي خُدُورِهَا، فَقَالَ: يَا مَعْشَرَ مَنْ آمَنَ بِلِسَانِهِ وَلَمْ يَدْخُلِ الإِيمَانُ قَلْبَهُ، لاَ تَغْتَابُوا الْمُسْلِمِينَ، وَلاَ تَتَّبِعُوا عَوْرَاتِهِمْ فَإِنَّ مَنْ تَتَبَّعَ عَوْرَةَ أَخِيهِ تَتَبَّعَ اللهُ عَوْرَتَهُ، وَمَنْ تَتَبَّعَ اللهُ عَوْرَتَهُ يَفْضَحْهُ فِي جَوْفِ بَيْتِهِ.

رَوَاهُ أَبُو يَعْلَى الْمَوْصِلِيُّ: وَرَوَاهُ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ، وَالْحَاكِمُ، وَالْبَيْهَقِيُّ فِي الْكُبْرَى.

واتە: بەڕائی کوڕی عازب ووتی: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ووتاری بۆ داین و ئەوەندە دەنگی بەرزکردەوە تائەوانەی ناو ماڵەکانیش گوێیان لێبوو فەرمووی ئەی ئەوانەی بەزمان باوەڕتان هێناوەو هێشتا باوەڕ نەچووەتە ناودڵێ لە پاشەملە باسی موسوڵمانان مەکەن و بەدوای عەیبیاندا مەگەڕێن چونکە هەرکەس بەدوای عەیبی براکەیدا بگەڕێ ئەوا خوا بەدوای عەیبەکانیەوە ئەبێت و هەرکەسیش خوا بەدوا عەیبەکانییەوە بێت ئاشکرای ئەکات با لەناوجەرگەی ماڵەکەی خۆیشیدا بێت.

عن أبي هريرة رضي الله عنه عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: (من نفس عن مؤمن كربة من كرب الدنيا نفس الله عنه كربة من كرب يوم القيامة، ومن يسر على معسر يسر الله عليه في الدنيا والآخرة، ومن ستر مسلماً ستره الله في الدنيا والآخرة، والله في عون العبد ما كان العبد في عون أخيه، ومن سلك طريقاً يلتمس فيه علماً سهل الله له به طريقاً إلى الجنة، وما اجتمع قوم في بيت من بيوت الله يتلون كتاب الله، ويتدارسونه بينهم إلا نزلت عليهم السكينة، وغشيتهم الرحمة، وحفتهم الملائكة، وذكرهم الله فيمن عنده، ومن بطأ به عمله لم يسرع به نسبه) رواه مسلم

واتە: ئەبی هورەیرە ئەڵێت: پێغەمبەر فەرموویەتی: هەرکەس گرفتێك لە گرفتەکانی دونیا لەسەر ئیمانداریك لابدات خوای گەورە گرفتێك لە گرفتەکانی قیامەتی لەسەر لائەدات، هەرکەس کارئاسانیکرد بۆ نەتوانێك خوای گەورە لەدونیاو قیامەتیشدا کارئاسانی بۆ ئەکات،و هەرکەسێکیش کەسێکی پۆشی خوا لەدونیاو قیامەتدا ئەیپۆشیێ، خوا لە یارمەتیدانی بەندەکەیدایە مادامێك ئەو بەندەیە لە یارمەتی برادەرەکەیدا بێت، هەرکەسیش رێگەی وەرگرتنی زانست بگرێتەبەر خوا رێگەی بەهەشتی بۆ ئاسان ئەکات، کۆمەڵێکیش نابێت لە ماڵێك لە ماڵەکانی خوادا کۆببنەوە و قورئان بخوێنن و دیراسەی بکەن ئیللا ئارامی دایانئەگرێت بەزەیی خوا دایانئەپۆشێت و فریشتەکان دەوریان ئەدەن وخوا باسیان بەباشە ئەکات لای ئەوانەی لای خۆی، هەرکەسیش بەکردەوەکانی دواکەوێت نەسەبی پێشی ناخات.

خوێنەری بەرێز: غەیبەت نەکردن و چاوپۆشیکردن و یارمەتیدانی یەکتر و بەرەو زانست رۆیشتن و دیراسەکردنی قورئان لە سیفاتەکانی هەرکۆمەڵگەیەك بێت و پێوەریش لەناویاندا کردەوە بێت نەك نەسەب، ئەبێ ژیان لەو کۆمەڵگەیەدا چەند خۆش و پرلە ئاسایش بێت، ئێمە ئێستە چەندە پێویستیمان بەو رەوشت و بەها بڵندانەیە؟

ئەو باسانە یەکەمیان تاوانێکـە چەسـپاوەلە دادگـای ئیسـلامیدا و بێـدەنگ بوون لێـی و چارەسـەر نـەکردنی مـەرگ و پەکخسـتنی کۆمـەڵگای بەدواوەیـە وەك باسمانکرد، دووەمیشیان ئەو جۆرە تاوانانەن یان ئەو کەموکوڕییانـەن کـە هـەموو کـەس بـۆی هەیـە توشـی بێـت تـاوانی ئاسـایین وزیانەکەیشـی لەکەسـی تاوانبـار تێناپەڕێت یان هەقی کەسیتری تێدا پێشێل ناکرێت، ئەوا نابێـت بەدوایـدا بـڕۆی و ئەگەر ئاشکراش بوو چاوپۆشی لێبکەی باشە، ئایا ئەمە پڕ نییە لە دانایی؟؟ ئایا هەمووی لە بەرژەوەندی کۆمەڵانی خەڵکیدا نییە؟؟ ئایا ئەم قورئانە لای خوایـەکی حەکیم وزاناوە نەهاتووە بۆ پێغەمبەرێکی ڕەوشت بەرزی ئەمین؟.

## هەڵەکانی وەرگێڕ دەربارەی حەجی ماڵی خوا

یەکەم: تێناگەن ئەگـەر سـتەم و تـاوان لـەناو مـاڵی خـوادا قەدەغـەو یاسـاغەو خوابەشوێنێکی ئارام ناوی ئەبات بۆچی لە مێژوودا لەناو مەککەدا چەندەها شـەڕو کوشتار ڕویداوە؟ یان بۆچی لـەناو هـەموو ماڵـەکانی خـوادا (مزگەوتـەکان) تـەنها کەعبەدا پارێزراوە؟ وەرگێڕ ئەڵێت: لەوانەیە مرۆڤ لە ئەندێشەیشیدا بێت بڵێت ئایـا خوا لەوێیە یان نا؟

وەڵام: پرسیاری سەرەتای ئەم کۆمەڵە پرسیارە وەك ئەم پرسیارەیە: ئایا کە مەشروب(مادەی هۆشبەر) خواردنی حەرامە ئەی بۆ خەڵکی مەشروب ئەخۆن؟ یان مزگەوتەکان خوا دایناوە بـۆ یـادی خـواو کاروبـاری ئیسـلام ئـەی بـۆ جارجـار ڕوو ئەدات بۆ جگە لەو مەبەستانەش بەکار ئەهێنرێت؟

وەڵام: بەڵێ کەعبەی ماڵی خوا لەو کاتەوەی دروستکراوە بۆ تەواف و سـوجدە و ڕکوع بردن و ئیعتکافکردن دانراوە. بۆ بەئەنجام گەیاندنی ئەمانە کەشێکی ئارام و داراییەکی بەردەوام پێویستە.

ئەمـەی کەبەدرێـژایی مێـژوودیارە، ئەوانـەی کاروبـاری حـەجی مـاڵی خـوا بەڕێدەکەن لە ڕێگەی بازرگانی هاوینەو زستانەوە تا دەگاتە بەرهەمی نەوتی و ئەو

هەمووه پارەیەش کە حاجییەکان ئەیبەن و لەوێ خەرجی ئەکەن بۆ دیاری و شوێنی مانەوە وایکردوە خەڵکی مەککە لە دەوڵەمەندترینی خەڵکانی سەرزەوی بوون و ئەمەش وەك خوا خۆی ئەفەرموێت:

لِإِيلَافِ قُرَيْشٍ (١) إِيلَافِهِمْ رِحْلَةَ الشِّتَاءِ وَالصَّيْفِ (٢) فَلْيَعْبُدُوا رَبَّ هَذَا الْبَيْتِ (٣) الَّذِي أَطْعَمَهُمْ مِنْ جُوعٍ وَآمَنَهُمْ مِنْ خَوْفٍ (٤)

خو نەریتی گەشتی زستانە و هاوینەی قورەیشیەکان ، کەواتە با خاوەنی ئەم ماڵە بپەرستن کە تێری کردن لەکاتی برسێتیداو ئاسایشی پێدان لە کاتی ترسدا.

لێرەدا قەشە فادی و وەرگێر قسەیان دەربارەی ئەو بوژانەوە زۆرەی ئابوری نییە کە ماڵی خوا بەدرێژایی مێژوو هەیبوە و لە شوێنیتردا بەشێوەیەکیتر دەربڕین لە ئیرەیی ناخیان ئەکەن دەربارەی ئەم خاڵە و دێینە سەر ئەوەش بەویستی خوا.

ئەو ئاسایش و ئارامییەی کە خوا بۆ ماڵی خۆی داناوە بەو فەرمانانە بووە کە خوا لەڕێگەی پێغەمبەرانەوە داوایکردوە فەراهەم بهێنرێت بۆ حاجیانی ماڵی خوا:

(وَإِذْ جَعَلْنَا الْبَيْتَ مَثَابَةً لِلنَّاسِ وَأَمْنًا وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى وَعَهِدْنَا إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ أَنْ طَهِّرَا بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْعَاكِفِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ (١٢٥) وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ اجْعَلْ هَذَا بَلَدًا آمِنًا وَارْزُقْ أَهْلَهُ مِنَ الثَّمَرَاتِ مَنْ آمَنَ مِنْهُمْ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ قَالَ وَمَنْ كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُ قَلِيلًا ثُمَّ أَضْطَرُّهُ إِلَى عَذَابِ النَّارِ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ (١٢٦).البقرة

إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِلْعَالَمِينَ (٩٦) فِيهِ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ مَقَامُ إِبْرَاهِيمَ وَمَنْ دَخَلَهُ كَانَ آمِنًا وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا وَمَنْ كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ (٩٧) قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَكْفُرُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَاللَّهُ شَهِيدٌ عَلَى مَا تَعْمَلُونَ (٩٨) قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ مَنْ آمَنَ تَبْغُونَهَا عِوَجًا وَأَنْتُمْ شُهَدَاءُ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ (٩٩) يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ تُطِيعُوا فَرِيقًا مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ يَرُدُّوكُمْ بَعْدَ إِيمَانِكُمْ كَافِرِينَ (١٠٠) ال عمران

### ئاماژەكانی ئەم ئایەتە پیرۆزانە:

١. (وَإِذْ جَعَلْنَا الْبَيْتَ مَثَابَةً لِلنَّاسِ وَأَمْنًا) ئێمە ماڵەكەمان داناوە ڕووگاو ئارامگا بێت بۆ خەڵكی ئەم (جعل) ە هەمان جەعلی ئەم ئایەتەیە كە ئەفەرموێت: وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ٢١) لە ئایەتەكانی خوایە بۆئێوە لە خۆتان هاوسەری دروستكردوون بۆ ئەوەی لایان ئارامبگرن و لە نێوان ئێوەشدا خۆشەویستی و بەزەیی داناوە.

هەرچۆن خوای گەورە زەواجی داناوە بۆ ئارامبونەوە و هۆكاری ئاوەدانی و درێژە پێدانی ژیان و لەو نێوەندەشدا خۆشەویستی و بەزەیی داناوە، ئەم خۆشەویستی و بەزەییە ئەگاتە پلە باڵاكان لەكاتی گونجان و لەیەكگەیشتن و نەبوونی كێشە ،بەڵام لەكاتی نەگونجاندا كزو خامۆشیش ئەبێت،خوای گەورە هەروەك چۆن هاوسەرگیری داناوە بۆ ئارامبونەوە و سۆزو خۆشەویشتی هەر ئاواش حەجی ماڵی خوای داناوە بۆ ئەوەی قیبلە بێت و مایەی ئارامی و ئاسایش بێت،ئیتر كاتێك مرۆڤەكان بەكاری تێكدەرانە ئەوە ئەشێوێنن ئەوە لادانە لەسروشت وداوای خوا و خەڵكەكانیش بەپێی ئەو لادانانە مامەڵەی خواییان لەگەڵ ئەكرێت، لە ئایەتەكانی خوای گەورەیە كە ماڵی خوا هەركەس بەنیازی پاكەوە بۆی بڕوات ئەوا ئەمین ئەبێت لە سزاو بەدەرونێكی ئارام و سافەوە ئەگەڕێتەوە ئەم ئارامی و بارسوكییە هەموو حاجیان هەستی پێئەكەن و هەركەس بە پێی مەبەستەكەی. ئەمە لەلایەك لە لایەكیتر خوای گەورە داوا ئەكات لەو دوو ڕستە هەواڵییەدا ئارامی ماڵی خوا بپارێزرێت. كە ئەمەیان ئەركی كاربەدەستان و گشت موسوڵمانانە. پەڕاوە فیقهییەكان پڕن لە یاسا بۆ جێبەجێكردنی ئەم داواو ئاماژەیەی خوای گەورە، دیارە نە قەشە فادی خاوەن ئیرە و نە وەرگێریش "هەروەك چۆن تەفسیری ئایەتەكانیان لە زانایان وەرنەگرتوە هەر ئاواش ڕاو بۆچوونی زانایانی فیقهیان لەو بارەوە نەزانیوە.

٢- ئیبراهیم پێغەمبەرو ئیسماعیل پێغەمبەری کوڕی سەلامی خوایان لێبێت کاریان دوبارە دروستکردنەوەی ماڵی خوابوە، بەپێی ئایەتەکان ئەمان لەسەر بناغەکۆنەکەوە دیواریان هەڵچنیوەتەوە (وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَاهِيمُ الْقَوَاعِدَ مِنَ الْبَيْتِ وَإِسْمَاعِيلُ) کاتێک ئیبراهیم لەسەر بناغەکە دیواری دائەنا، و لە سورەتی (الحج) یشدا ئەفەرموویێت: (وَإِذْ بَوَّأْنَا لِإِبْرَاهِيمَ مَكَانَ الْبَيْتِ) کاتێك شوێنی مالی خوامان پیشانی ئیبراهیمدا، چیرۆکی جۆری پیشاندانەکەو کارەکانی ئەودوو پێغەمبەرە بەرێزە لە پەڕاوەکانی فەرموودەو مێژوودا زۆرن.

٣- کەعبەی ماڵی خوا یەکەم ماڵ بووە بۆ خواپەرستی دروستکرابێت"واتە هەر لەکاتی ئادەمەوە هەبوە ( إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِلْعَالَمِينَ) بەڕاستی یەکەم ماڵێك بۆ خەڵکی دانرابێت مەککە بوە پیرۆزەو ڕێنما یە بۆ جیهانیان، بەپێی ئەم ئایەتەو ئایەتی فِيهِ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ مَقَامُ إِبْرَاهِيمَ وَمَنْ دَخَلَهُ كَانَ آمِنًا) یش دەرئەکەوێت نەك تەنها موسوڵمانان بەڵکو بۆ هەموو خەڵك و جیهانیش ماڵی خوا مایەی پیرۆزی و ڕێدەرکردن وبەرژەوەندییە، ئایا چۆن؟ ئەوە نازانم ئایا پەی بەهەموی براوە یان نا؟ و بەڵام بێگومانم ڕۆژێك دێت کە بزانرێت چونکە خوا بەڵێنی داوە هەموو ئایەتە خوێنراوەکان لە لە بونەوەردا ببینرێت و ئەفەرموێت: (وَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَتَعْرِفُونَهَا). بلێ سوپاس بۆ خوا لەمەودوا ئایەتەکانتان پیشان ئەدا و ئەوجا ئەیناسنەوە، و ئەشفەرموێت (سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ).ئایەتەکانی خۆمانیان پیشان ئەدەین لە ئاسۆکان و ناو نەفسی خۆیشیان تا بۆیان ڕوونبێتەوە کە قورئان زۆر هەقە.ئەم تەفسیرەی بونەوەرو نەفس بۆ ئایەتەکانی خوا درێژ ئەبێتەوە و بەردەوام ئەبێت !بەدرێژایی و بەردەوامی خەڵکی لە سەر دیراسەکردن و گەڕان بەدوای نهێنییەکانی بونەوەرو نهێنیەکانی ئەم مرۆڤە مەزنە، بوونی پیتی (س) لەسەر فیعلی هەردوو ئایەتەکە(سیریکم، سنریهم) بۆ داهاتووە و ئەو ڕاستیە ئەسەلمێنێ.

بۆ نمونە: سوڕانەوەی خەڵکی بەدەوری ماڵی خوا واتە تەوافکردن ئەبێت بە پێچەوانەی میلی کاتژمێرەوە بێت،ئەمە هەر لەسەرەتای عیبادەتی حەجکردنەوە بەوشێوە فەرزکراوە و نەزانراوە بۆچی ئەبێت بەو شێوەیەبێت؟!! کەچی لە سەردەمی پێشکەوتنی زانستدا دەرکەوتوە ئەو سوڕانەوەیە هاوئاهەنگە لەگەڵ سروشتی هەموو سورانەوەکانیتردا، سوڕانەوەی ئیلیکترۆن بەدەوری ناوك و سورانەوەی ئەستێرەکان بەدەوری خۆرو سورانەوەی مەجەڕەکان بەدەوری کونە ڕەشەکان و.. (کەناڵی ـ الرسالەـ تاریق سوەیدان لەبەرنامەی نهێنییەکانی حەج بە بەڵگەی زانستی باسی هەموو ئەو سوڕانەوانەیکرد لەبەنەوەردا کەوەك تەوافکردنن)

ئایا ئەمە هاوئاوازبونی ڕاستەقینە نییە لەگەڵ بونەوەردا کە زۆرێك لە چاکسازانی بواری ووزەو دەرونی بەدوایدا وێڵن؟!ئایا ئەمە بەشێك نییە لەو ڕێنمایەی کەخوا فەرمویەتی لەحەجدا هەیە؟ هەروەك ئەمە لەوانەیە چەندەها نیشانەیتر بدۆزرێتەوە لەحەجدا کە ببنە بەڵگە لەسەر پارێزراوی قورئان و ڕاستگۆیی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم).

٤ـ وشەی (بكە) وەك لەو ئایەتەی پێشودا هاتوە ناوێکە بۆ مەکە و قەشە فادیش چاك ئەو ووشەیە ئەناسێ چونکە لە تەواتدا هاتوە زانای یەمەنی عەبدولمەجید زەنەدانی لە پەڕاوی (الايمان بالرسول صلى الله عليه وسلم) دا ئەڵێت: لە تەوراتدا هاتوە کە داوود سەلامی خوای لێبێت بەماڵی خوادا هەڵیداوە و هیوای خواستوە لەوێ بێت هۆکاری هیوا خواستنەکەیشی چەندانەی پاداشتی عیبادەتە لەوێ ، تەورات لە داوودەوە بۆمان نقلێ ئەکات کە ووتویەتی: چەند خۆشحاڵن ئەوانەی لەتۆوە هێز وەرئەگرن، ئەوانەی شەیدای حەجکردنن بۆ ئەو کۆمەڵگە دینییەی تایبەتکراوە بۆ پەرستنی الله ئەوان لە دۆڵی بەککەی ووشکەڵانەوە ئەڕۆن و ئەبێتە شوێنی کانیاو. ئەمەش دەققەکەیەتی وجاء في التوراة أن داود عليه السلام يترنم ببيت الله ويتمنى أن يكون فيه، ويعلل ذلك بمضاعفة

الأجر هناك(٤٥) وتقول التوراة نقلاً عنه(٤٦): " ما أسعد أولئك الذين يتلقون قوتهم منك، الذين يتوقون لأداء الحج إلى جبل المجتمع الديني الذي خَلُصَ لعبـادة الله(٤٧) وهم يمرون عبر وادي بكه الجاف فيصبح مكاناً للينابيع"(٤٨).(ق).

هـەر چـەندە لـە وولاتـە عەرەبییـەکان و لـە هەنـدێ نوسـخەدا قەشـەکان لـە تەرجمەکردنی دەقەکەدا ووشـەی (بکـە) یـانکردووە بـە (بکـاء) بـۆ ئـەوەی لـەو واتایە بەدوری بخەنەوە بەڵام نوسخە ئینگلیزییەکان ناوەکە هـەر بەشـێوەی خـۆی نوسـراوەتەوە (Baca) و ئـەوەش ڕاسـتە چـونکە نـاو لەتەرجمەکردنـدا نابێـت واتاکەی بنوسرێت لەجیاتی خۆی.

٥ـ ئایەتی ٩٨ و ٩٩ فـەرموودەی خوایـە بۆ قەشـە فـادی و هـاو وێنـەکانی لـە ئەهلی کیتاب دەربارەی حـەجکردن و ئەفـەرمووێت : بڵـێ ئـەی ئەوانـەی خـاوەنی پەڕاوی ئاسمانن بۆ ئێوە بە ئایەتەکانی خوا کافرن و ئەشزانن خوا شایەتە بەسـەر ئەوەی ئەیکەن، ئەی ئەهلی کتێب بۆ ئێوە ئەوانەی باوەڕیانهێناوە لایان ئەدەن لە ڕێگەی خـوایی هـەر بـە لاری ئەتانـەوێت و ئێـوەش شـایەتن و خـواش غافـڵ نییـە بەکردەوەکانتان.

گەورەیی و پاکی بۆخوا سەیرکەن چۆن قەشە فادی و هەموو مـژدە دەرەکـانی هاو شێوەیان بوونەتە پۆشەر بۆ ئەو ئایەتانەی کە لەتەوراتدا هـاتوە وبەڵگـەن بـۆ ڕاستی قورئان و پێغەمبەری ئیسلام و چۆن لە هەوڵی لەڕێ لادانی ئیمانداراندان بە گومـان دروسـتکردن و خۆیشـیان ئـەزانن ئـەوەی ئەیکـەن بـۆ لەخشـتەبردنی موسوڵمانانە.

٦ــ ئایـەتی دوای ئـەو دوو ئایەتـەی پێشـوو واتـە ئایـەتی سـەد بـۆ وەرگێـڕ و کەسانی لەخشتەبراوی وەك ئەوەو ئەفەرموێت: ئەی کەسانێك کـە بڕوامەنـد بـوون ئەگەر گوێ لە مستی کۆمەڵێك لە ئـەهلی کتێـب بـبن ئـەوا دوای ئـەوەی باوەڕتـان هێناوە بێباوەڕتان ئەکەنەوە.

ئەم هەواڵە قورئانیانەو چەسپاندنی وەك مۆر بەسەر ژیان و باسی هەرشتێك كە هەواڵی لێداوە ئایا بەڵگە نییە لەسەر ڕاستی و پارێزراوی قورئان؟؟

پرسیاریکیتر کەئەیکات ئەمەیە: بۆچی لەناو هەموو ماڵەکانی خوادا (مزگەوتەکان) تەنها کەعبەدا پارێزراوە؟وەڵامی ئەم پرسیارە لەوەڵامی پرسیاری پێشوودا هەبو وماڵەکانیتری خوا واتە مزگەوتەکانیش خوا هەرداوای لەبەندەکانی کردوە بیپارێزن لەوەی بۆ جگە لە کاروباری ئیسلام بەکاربهێنرێت و پاکو خاوێنی ڕابگرن و با ئاوەدان بێت، ئەمانە وبەرپاکردنی حەجی ماڵی خوا و ئارام ڕاگرتنی لە ئەرکەکانی بەندایەتی موسوڵمانانە، بەڵام کاتێك كار ئەگاتە ئەوەی خوانەخواستە سوکایەتی بەخودی کەعبەبکرێت وبەرگری کردنیش لە توانای موسوڵمانان بەدەر بێت ئەوە سورەتی (الفیل) شایەتە ناحەزان و هێرش بەران چیان بەسەر دێت، ئەم هەوڵەش لەئایندە دووبارە ئەبێتەوەو دوژمنانی ماڵی خوا نغرۆی زەوی ئەبن، دایکمان عائشە لە پێغەمبەرەوە ئەگێڕێتەوە: عن أُمِّ المؤمنينَ أمِّ عبدِ اللهِ عائشةَ رضي الله عنها، قالت: قالَ رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم: (يغْزُو جَيْشٌ الْكَعْبَةَ فإِذَا كَانُوا بِبَيْدَاءَ مِنَ الآرضِ يُخْسَفُ بِأَوَّلِهِمْ وآخِرِهِمْ ). قَالَتْ: قلتُ: يَا رَسُولَ اللهِ،كَيْفَ يُخْسَفُ بأوَّلِهِمْ وَآخِرِهِمْ وَفِيهِمْ أسْوَاقُهُمْ(٢) وَمَنْ لَيْسَ مِنْهُمْ؟! قَالَ: (يُخْسَفُ بِأَوَّلِهِمْ وَآخِرِهِمْ ثُمَّ يُبْعَثُونَ عَلَى نِيّاتِهِمْ ) مُتَّفَقٌ عَلَيهِ. هذَا لَفْظُ الْبُخَارِيِّ

کاتێك پرسیار ئەکات و ئەڵێت: لەوانەیە مرۆڤ لە ئەندێشەیشیدا بێت بڵێت ئایا خوا لەوێیە یان نا؟ ئێمەش ئەڵێن خوای گەورە ئەو ماڵەی خۆی و مزگەوتەکانی بۆ بەرژەوەندی خەڵك داناوە ئەگینا خوای گەورە خۆی لە ئاسمانەو لەسەر عەرشە وەك ئەفەرموێت: الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى (٥)

. بیسەر و بینەرو زانا و ئاگادارە و هیچی لێون نابێت (سوپاس بۆ خوا) .

دووەم: هەر لە باسی حەجدا ئەڵێت: هەموو كۆچ و سەفەرێك بۆ مەبەستێکە بۆچی تەنها چوون بۆ کەعبە ناونراوە مەبەست (الحج)؟ ئایەتی (٢٧) ی

سـورەتی(الحج) لەگـەڵ هۆكارەكـانی گواسـتنەوەی ئێسـتادا نـاگونجێ و پارانەوەكەی ئایەتی ١٢ ی سورەتی الزخرف یش بۆ ئیستا نابێت.

هەرەشـەكەی ئایـەتی ٣٣ی سـورەتی (الشـوری) دەریـدەخات لـە بیروێنـای پێغەمبەرو الله كەیدا نەبووە كە فرۆكـە و شـەمەندەفەرو ئوتومبیـل دێتـە كایـەوە؟ ئاشكرایە بەر لە موحەمەد بیرۆكەی چـون بـۆ حـەج هـەر بـووە و ئەڵبەتـە كـرداری حـەجكردن وەكـو مەراسـیم و سـروتێكی ئـاینی كاراكتـەری سیاسـی و ئـابوری لـە پشتەوە بووە.

(فليعبدوا رب هذا البيت الذى اطعمهم من جوع وامنهم من خوف) ئەڵێت ئەوە بەنی هاشم بوون نانیان بەخەڵكی ئەدا نەك ژوورە ووشكە كەڵەكەكە.

وەڵام : زۆر سەیرە ڕاستە وشەی حەج لـە زمانزانیـدا بـە واتـای مەبەسـتكردنی یەك لەدوای یەك دێت و لە زاراوەشدا بەواتای نیازكردنی ماڵی خوا دێـت لـەكاتێكی دیاریكراودا و بەشێوەیەكی دیاریكراو كە شەرعی خـوا ڕوونیكردۆتـەوە، عـومرەش لە زمانـدا سـەردانیكردن و ئاوەدانكردنەوەیـە و بـەو سـەردانیكردنە دەوترێـت كـە بەمەستی ئاوەدانكردنەوەی ماڵی خوا بێت.

ئایا هەموو ناونانـەكان هـەر بـەو شـێوەیە نـەهاتوە؟ بـۆ زیـاتر ڕوونكردنـەوەی گونجاوی ناوی (حەج) لەم فـەرزە ئیسـلامییە ئـەڵێین: بـە جێهێنـانی ئـەو فـەرزە ئیسـلامییە مەبەسـتی هـەموو باوەڕمەندێكـە و كـاتێكیش بۆیـان ڕێكدەكـەوێت بەمەبەسـتی پاكبوونـەوە و نزیكبونـەوەی زیـاتر لـەخوا و مەبەسـتی پاڕانـەوە وخۆئەگەر لەگەڵ ئەم مەبەستانەشـدا مەبەسـتی گەشـت و بازرگـانیش بكـەن هـەر دروستە و جارانیش كە ئیسلام حاكمبوو بەمەبەستی چارەسەری گرفتە سیاسـی و كۆمەڵایەتی و ئابورییەكانیش ئەچوون. كەواتە سەراپای مەبەسـتەو جگـە لـەوەش هـەر لەگـەڵ تـەواو بونیشـیدا جاجیـان مەبەسـتی گەڕانـەوەی ئەكـەن لـە سـاڵانی داهاتودا و هیواخوازن ئەوە كۆتا جار نەبێت.ئێستە زانیت بەجێهێنانی ئـەم فـەرزە

خۆی مەبەستە و ناوەکە پڕبە پێستییەتی و کالآ لەقەد بالآیە وئەم قورئانە لەتەنها یەك ووشەی وەك (حەج) یشدا گومان هەڵناگرێت.

پاشان لە باسی ئەو هۆکارانەی کە بۆ حەجکردن بەکار هاتوە (حوشتر و ئەسپ و حوشتری لات و..) لەتەك هۆکارەکانی ئێستەدا ئەڵێت ئەو پاڕانەوەی لە سورەتی (الزخرف) دا هاتوە لەگەڵ هۆکارەکانی گواستنەوەی ئێستادا ناگونجێ و بۆ ئێستا ناشێت.

لە تێکەڵییەکەیدا لەلایەك باسی بەکارهێنانی گیانەوەر ئەکات وەك هۆکاری گواستنەوە و باسی ئامێرە خێراڕەوەکانیش ئەکات هەر لە ئوتومبیل و فڕۆکە تا ژێراوڕۆی ئەتۆمی و ئەڵێت هەرگیز لە بیرۆنای پێغەمبەر یان خوداوەند (الله) کەیدا نەبوە کە فڕۆکەو شەمەندەفەرو ئوتۆمبیل دێتە کایەوە.

وەڵام: ئاینی ئیسلام هیچ دژایەتیکردنێکی نییە لەگەڵ پێشکەوتنەکاندا و بەڵکو هەموو ئەو پێشکەوتن و ئاوەدانیانەش بە بەرهەمی ئاسایی و دروستی جێنشین بونی مرۆڤ ئەزانێ و موسوڵمانانیش ئاوا سەیری هەموو پێشکەوتنێکی زانستی ئەکەن بۆیە وەك نوسەریش ئەڵێت لەمڕۆدا لەگەڵ لێدانی سلفی سەیارەدا گوێمان لە ئایەتی (سبحان الذی سخر لنا هذا...) ئەبێت. بەڕاستی ئەو ئایەتە پیرۆزە ئەوەندە ووشەکانی گونجاوەو لەگەڵ هەموو هۆکارەکانی گواستنەوەدا ئەگونجێ، خوێنەری بەڕێز سەیرکە موعجیزەی دەربڕینی ئەم ئایەتە پیرۆزە چۆن ئەیسەلمێنێ کەلای خوایەکی زاناوە هاتوە و ئاگاداری هەموو گۆرانکارییەکانە " ئایەتەکە بەم شێوەیە و ئەفەرموێت:

وَالَّذِي خَلَقَ الْأَزْوَاجَ كُلَّهَا وَجَعَلَ لَكُمْ مِنَ الْفُلْكِ وَالْأَنْعَامِ مَا تَرْكَبُونَ (١٢) لِتَسْتَوُوا عَلَى ظُهُورِهِ ثُمَّ تَذْكُرُوا نِعْمَةَ رَبِّكُمْ إِذَا اسْتَوَيْتُمْ عَلَيْهِ وَتَقُولُوا سُبْحَانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ (١٣) وَإِنَّا إِلَى رَبِّنَا لَمُنْقَلِبُونَ (١٤).الزخرف

ئەوەی کەهەموو جوتەکانی دروستکرد و بۆ ئێوەش لە کەشتی و ئاژەڵ دایناوە ئەوەی سوواری ئەبن، بۆ ئەوەی لەسەری ئارامبگرن و یادی بەهرەیخوابکەن

کاتێك ئارامتانگرت لەسەری و بلێن پاکی و دورلەهەڵەیی بۆ ئەو خوایەی ئەمەی بۆ ڕامکـــردوین و پـــێش ئەمـــە ئێمـــە نـــەمانبوو، ئێمـــەش بـــۆ لای خاوەنەکـــەمان ئەگەڕێینەوە.

١ـ وشەی (الفلك، الانعام) دوو ووشەی کۆن و هـەر زەمیرێـك کـە ئـەبێت بۆیـان بگەڕێتـەوە ئـەبێت زەمـیری مـێ بێـت کەچـی زەمـیری (ظُهُـورِهِ، عَلَيْـهِ، هَـذَا، لَـهُ) هەموویان بۆ ووشەیەکی نێر ئەگەڕێنەوە و لە ئایەتەکەشدا (ما) کەبەواتای (الـژی) دێت هەموو ئەو زەمیرانەی بۆ ئەگەڕێتەوە، ووشەی (جعل) ش لە زمانی عەرەبیـدا ووشەیەکی تێپەرە بـۆ زیـاتر لەبـەرکارێك، بـەرکاری یەکـەمیان (لکـم) وبـەرکاری دوەمیشـیان (ما)یـە و وشـەی (الفلـك، الانعـام) لەوێـدا نمونـەن بـۆ وەسـیلەی گواستنەوەیەکێکیان نمونەی داهێنانی مرۆڤـە کـەخوا پێشـی خسـتوە و دوەمیـان نمونەی هۆکاری سەرەتایی و سروشتییە، ئەگین بنەمای ڕستەکە لە (فعـل و فاعـل و هەردوو مفعولەکە) بەبێ ئەو دوانەیە و هـەموو جـۆرێکی هۆکـاری گواسـتنەوەی لەژێردا جێدەبێتەوە.

٢ـ خوای گەورە ئاماژەی بەکەشتی ئاسمـانیش کـردوەو پـێش وەخـت مۆڵـەتی داوە (يَامَعْشَرَ الْجِنِّ وَالإِنسِ إِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَن تَنفُذُواْ مِنْ أَقْطَارِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ فَانفُذُواْ لاَ تَنفُذُونَ إِلاَّ بِسُلْطَانٍ) الرحمان:واتە: ئـەی کۆمـەڵی جنۆکـەو مـرۆڤ ئەگـەر توانیتـان ناوچـەکانی ئاسمانـەکان و زەوی تەیکـەن بیکـەن نـاتوانن بـە سـوڵتان نەبێت.

ئێمە لێرەدا باوەڕمان بەوە هەیە کە جیهانی پەریش (جن) جیهانێکی تایبەتەو تا پێش هاتنی پێغەمبەر خۆبەخۆ توانای گەڕانیان هەبوە بەناو ئاسمانەکاندا بەڵام بە هاتنی پێغەمبەرمان (صلی الله علیه واله وسلم) ئەوەیان لێ قەدەغەکراوە. بەڵام ئێستە ئەوانیش و ئێمەش ئەگەر بمانەوێت ئەوە بکەین ناتوانین بە سـوڵتان نـەبێت و ووشەی سوڵتانیش لەزمانی عەرەبیدا چەند واتایەکی هەیە لەوانە بەدەسـتهێنانی توانای تەواوە بۆهەرکارێك.

پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێت هەریەکەیان بە شەریعەو بەرنامەیەکەوە هاتون و بەهەموویانەوە بینای ئایینەکانی سەر زەویان تەواوکردوە، کۆتا ئاین کە ئیسلامە تەواوکارو لەخۆگری هەموو خاڵەگرنگەکانی ئایینەکانی پێش خۆیەتی، ئەوەی جێگەی باسە لێرەدا ئەوەیە قورئان ئاماژەی بە دەسەڵاتی (ذو القرنين) کردوە لە سورەتی پیرۆزی (الكهف) دا و باس لەوە ئەکات کە فەرمانڕەوایەتی هەموو سەر زەوی کردوە و هۆکاری هەموو کارێکی لە بەردەستدا بووە،یەکێك لەهۆکارەکان خێراڕەوی گواستنەوەی بوە لە ڕۆژهەڵات بۆ ڕۆژئاواو و لەوێوە بۆلای گەلە ستەمدیدەکان بۆڕزگارکردنیان، لەئەمانەش زیاتر ئاماژەی خێراتر لەوەیشی تێدایە ئەویش توانای گواستنەوەی یەك عەرش لە یەمەن بۆ شام لەیەك چاوتروکاندندا و بەپێی ئاماژە قورئانییەکە ئەو کەسەی ئەکارەی کردوە بە هۆی بونی زانستەوە کردوویەتی: قَالَ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ أَيُّكُمْ يَأْتِينِي بِعَرْشِهَا قَبْلَ أَنْ يَأْتُونِي مُسْلِمِينَ (٣٨) قَالَ عِفْرِيتٌ مِنَ الْجِنِّ أَنَا آتِيكَ بِهِ قَبْلَ أَنْ تَقُومَ مِنْ مَقَامِكَ وَإِنِّي عَلَيْهِ لَقَوِيٌّ أَمِينٌ (٣٩) قَالَ الَّذِي عِنْدَهُ عِلْمٌ مِنَ الْكِتَابِ أَنَا آتِيكَ بِهِ قَبْلَ أَنْ يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ فَلَمَّا رَآهُ مُسْتَقِرًّا عِنْدَهُ قَالَ هَذَا مِنْ فَضْلِ رَبِّي لِيَبْلُوَنِي أَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ وَمَنْ شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ وَمَنْ كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّي غَنِيٌّ كَرِيمٌ (٤٠)

واتە: سولەیمان فەرمووی ئەی کاربەدەستەکان کێ لە ئێوە عەرشەکەی شاژنە(بەڵقیس) م بۆ دێنێ پێش ئەوەی بە موسوڵمانی بێن بۆلام، دێوێك لە ناو جنۆکەکان ووتی: من بۆت ئەهێنم پێش ئەوەی لە دانیشتنەکەت تەواو بیت و من بۆ ئەوکارە بەتواناو ئەمینم، ئەوکەسەی کە زانستی کتێبەکەی پێبوو ووتی: من بۆتی ئەهێنم پێشئەوەی چاوبتروکێنی و کاتێك عەرشەکەی بینی لەلایدا جێگیربوە ووتی: ئەمە بەفەزڵی خاوەنەکەمەوەیە و تاقیمئەکاتەوە ئایا سوپاسگوزار ئەبم یان بێئەمەك و پێنەزان و هەرکەس سوپاسگوزاربوو ئەوا بۆخۆیەتی و هەرکەسیش بێباوەڕبێت ئەوا پەروەردەکارم بێباك و بەخشندەیە.

ئەو هۆکاری گواستنەوەیە کە لە دەوڵەتی ئاینی زیلقەرنەیندا هەبوو لەوانەیە ئێستە هەبێت بەڵام هێشتا ئەو خێراڕەوەی لە دەوڵتی ئاینی سولەیماندا هەبووە تا ئێستەش بوونی نییە و هەموو هۆکارەکانیش پارانەوەکەی پێشو کە وەرگێڕ پێی پەستە (سبحان الذی سخر لنا هذا وما کنا لە مقرنین) پڕاوپڕیانە! بەمشێوەیە چڕەدوکەڵ یان تەمومژەکەی قەشەفادی و وەرگێڕ ڕەوییەوە و دەرکەوت هەموو هەق لای خوایەو قورئانەکەی بەهەق ناردووە.

کاتێکیش ئەڵێت: ئاشکرایە بەر لە موحەمەد بیرۆکەی چون بۆ حەج هەر بووە و ئەڵبەتە کرداری حەجکردن وەکو مەراسیم و سروتێکی ئاینی کاراکتەری سیاسی و ئابوری لە پشتەوە بووە.

لە وەڵامدا ئەڵێین: بەڵێ حەجکردن پێش موحەمەد پێغەمبەر (صلى الله علیه واله وسلم) هەربوە و ئەوە گەر تۆش نەیڵێیت هەروا بووە و گومانیش وەرناگرێت، چونکە خوا ئەو ڕاستییەی بۆ باسکردوین و تەنانەت چۆنێتی بنیاتنانەوەی و جوگرافیای شوێنەکە پێش ئاوەدانی و دوای ئاوەدان بونەوەی و هەروەهاچۆنێتی دروستبونی لادانەکان لە مەراسمی حەجدا و پاشان بە ناردنی پێغەمبەری خۆمان چۆن مەراسیمەکان ڕێکخرانەوە هەموو ئەوانە لە ئایەتەکانی پەیوەند بەو مەراسیمەدا باسکراون. ئەمەی کە مەراسیمێکی دینی بێت و کاراکتەری سیاسی و ئابوری لە پشتەوە بێت ئەوەش هەر وایە چونکە ئیسلام ئاینێکی گشتگیرە و قەشە فادی بۆیە ئەوەی بەلاوەسەیرە چونکە واڕاهاتوە کەدین تەنها پەیوەندی نێوان خواو بەندە بێت و دەست لەژیانی ئابوری و سیاسەت وەرنەدات، کاتێك ئەم مەراسمە ئیسلامییە ئەبینیێ کە لە ماڵە پیرۆزەکەی خوادا پەیوەندی بەندەکان بەخواوە بتەو ئەبێت و لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئەم حەجە ئەبێتە کونگرەیەکی هەمەلایەنە بۆ هەموو ڕەنگ و زمانەکانی جیهان و لەوێدا هەمووی بەیەکسانی ئەندامن !یەکتر ناسین و هەستی ئەندامبونیان لەم ئایینە جیهانییەدا زیاتر گەشەئەکات و بەهەمان حەجیش ڕێگەیان پێدراوە بازرگانیش بکەن.

ئـەم ڕەخنـەو گلەییـەی قەشـەفادی تـەنها ئیرەییـە و هیچـیتر چـونکە لـەهیچ ئاینێکیتردا نەیدیوە ئاوا دین و دونیا پێکەوە ببەسترێتەوە !

هەر لەمیانەی ئەم بەهەڵە بردنی خەڵکیدا کۆتایی سورەتی قورەیش ئـەهێنێ و واتای ئەکات و پاش هەندێ هێنـان و بردنـی باسـەکە ئـەڵێت: ئـەوە بـەنی هاشـم بوون تریتیان بەخەڵکی دەدا نەك ژورە وشکە کەڵەکەکە.

وەڵام: خوێنـەری بـەڕێز: ئەمـە ئایەتـە پیرۆزەکەیـە: فَلْيَعْبُدُوا رَبَّ هَذَا الْبَيْتِ (٣) الَّذِي أَطْعَمَهُمْ مِنْ جُوعٍ وَآمَنَهُمْ مِنْ خَوْفٍ (٤)

واتە: با پەروەردگاری ئەم ماڵە بپەرستن کە لە برسێتیدا خۆراکی پێداون و لـە مەترسیش دڵنیای کردنەوە.

لەکوێی ئەو ئایەتانەدا هەیە ئاماژەبێت بۆ ئەوەی کە ئەو وشکە کەڵەکە خـۆراك بەخـەڵك ئـەدات، هەرکەسـێك بـاوەڕی بەوشـێوەبێت ئـەوە لـە بازنـەی ئیسـلامدا وەرناگیرێت، ئایەتەکە داوا ئەکات خاوەنی ئەو ماڵە بپەرستین چـونکە ئەوخـەڵکی تێر ئەکات و لەمەترسی دڵنیایان ئەکات.

سێیەم: ئەڵێت: ئایا خواوەند جێگەو شوێنی تری لەسەرزەوی نـەبوە لەهـەموو ڕویەکەوە شیاوتر بێت تاکو مرۆڤ بەدەستی خۆی ماڵێك بۆ خواوەند بنیات بنێـت و بیکاتە مەبەستگە؟ و پاشان دێتـە سەرباسـی کرنوشـگەو مەبەسـتگەی گـەلانیتر و لەگەڵیـدا چـەند مەراسـیمێکی کـاتی نـەفامی بـۆ حـەجکردن بـاس ئـەکات وڕێگـە خۆشئەکات بۆ ئـەوەی بڵێـت: پـەیامهێن: خـاوەن نامـە) ویسـتویەتی هەرچـییەك کەنـەخوازراوەو پەیوەنـدی بـە پـێش ئیسـلامەوە هەیـە بیسـڕێتەوە و شـوێنکاری نەهێڵێت بەڵام هەرچییەك بـۆ یەکخسـتن و کۆکردنـەوەی عـەرەب سـود مەنـد بێـت بهێڵێتەوە ئەگەرچـی بـۆ سـەردەمی پـێش ئیسـلامیش بگەڕێتـەوە. کەواتـە محمـد لــەکرداری حەجکردنەکــەیان نــاڕازی نــەبوە بــەڵکو لــە فیکــە فیــك و چــەپڵەو خۆڕوتکردنەوەکەیان ناڕازی بووە هەرچەندە بە(صلاە ـ نوێژو پاڕانەوە) ناو زەدی کردوە. ل ٥٣٦.

وەڵام: وەك لە پێشەوە باسمانكرد ئەوماڵە بۆ بەرژەوەندی هەموو خەڵكی سەرزەوی دروستكراوە. هەموو سەرزەوی و ئاسمانەكان موڵكی خوایە، بۆچی ئەو شوێنەی هەڵبژاردوە بۆ مەبەستەگەو قیبلە و ئایا شوێنی شیاوتر هەیە یان نییە؟

ئەوەی لای هەموو ژیرێكەوە دیارە ئەوەیە كە خاوەن موڵك بەویستی خۆی شوێنەكانی موڵكەكەی دیاریئەكات و خۆی زانایە كە ئەو شوێنە شیاوە بۆ ئەوە یان نا، هەر ئەوەندەی ئەو شوێنە هەرگیز دەوری چۆڵ نییە و بەردەوام خەڵكی شەیدای دیداری ئەكەن، ئەمە لە خۆیدا نیشانەی گونجانی شوێنەكەیە، خوای گەورە ئاماژەی بەوە داوەی نیشانەگەلێكی تێدایە و وەك لە پێشەوە ووتمان تەنها دوان لەو نیشانانە لەقورئاندا باسكراوە و ئەوانیتری ئەبێت مرۆڤ بە عەقڵ و زانست بیدۆزێتەوە كە ئەمەش نیشانەی ڕێزی خوایە لە عەقڵ و زانستی مرۆڤ كە ئەوانەش مەناتی ئەرك بەرداری و بەرزبونەوەی مرۆڤە بەسەر دروستكراوەكانیتردا. ئێمە لە ئەوانەی وەك قەشە فادی لە پیلانگێڕیدان ئەپرسین ئایا لە ئایینەكەی خۆتاندا وەسفی ئەو شوێنە نەكراوە كە حەجی لێئەكرێت؟ بە شیاوترین شوێن دانەنراوە؟ بەڵێ بیگومان باسكراوە و ئەشعیا پەیامبەر دەربارەی كەعبەی ماڵی خوا ئەڵێت: فقومي واشرقي فإنه قد ورى زندك ووقار الله عليك انظري بنيك حولك فإنهم مجتمعون يأتيك بنوك وبناتك على الأيدي فحينئذ تنظرين وتزهرين ويخفق قلبك ويتسع وكل غنم قيدار تجتمع إليك وسادت نبايوت يخدمونك وتفتح أبوابك الليل والنهار فلا تغلق ويتخذونك قبلة وتدعين بعد ذلك مدينة الرب

وقال أشعيا باسم الكعبة وحجها وتعظيمها: "إنه سيرد عليك أبناؤك من بلد بعيد. ومعهم فضتهم وذهبهم من أجل اسم الرّبّ إلهك قدوس إسرائيل الذي أحمدك. وتبنى أبناء الغرباء سورك. وتخدمك ملكوهم. وتفتح أبوابك آناءه الليل والنهار فلا تغلق. وتدخل إليك أرسال الأمم. وتقاد إليك ملوكهم أذلة. وكلّ أمة لا تخضع لك تتبدد تبديداً. والشعوب التي لا تخدمك/(٢/١١٥/ب) تصطلم اصطلاماً. الكتاب: تخجيل من حرف التوراة والإنجيل

المصدر: موقع شبكة مشكاة الإسلامية

http://www.almeshkat.net

ئەی بۆ ئەو ڕەخنەیە لە تەورات ناگرن؟! کاتێکیش وەرگێڕێکی کوردزوبان کە نازانین کێیەو دینی چییە ئەوە دوبارە ئەکاتەوە ئەوا ئێمە ئەپرسین ئایا بۆ تۆ لەگەڵ پرسیارکردنەکەتدا پێشنیاری شوێنێکیترت نەکرد کە بەلای ژێری تۆوە گونجاوتر بێت لە مەککە؟!یان هەر بەدوای بیانودا وێڵن و بەدگومانن، باوەڕ بەڕاستبونی ئایەتەکانی خوا ناکەن تاسزاکەی خوا نەبینن؟ وەك خۆی ئەفەرموێت: وَلِيَعْلَمَ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ أَنَّهُ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكَ فَيُؤْمِنُوا بِهِ فَتُخْبِتَ لَهُ قُلُوبُهُمْ وَإِنَّ اللَّهَ لَهَادِ الَّذِينَ آمَنُوا إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ (٥٤) وَلَا يَزَالُ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي مِرْيَةٍ مِنْهُ حَتَّى تَأْتِيَهُمُ السَّاعَةُ بَغْتَةً أَوْ يَأْتِيَهُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَقِيمٍ (٥٥).

ئەمەش کە ئەڵێت پەیامهێن: ویستویەتی هەرچییەك کەنەخوازراوەو پەیوەندی بە پێش ئیسلامەوە هەیە بیسڕێتەوە و شوێنکاری نەهێڵێت بەڵام هەرچییەك بۆ یەکخستن و کۆکردنەوەی عەرەب سود مەند بێت بهێڵێتەوە ئەگەرچی بۆ سەردەمی پێش ئیسلامیش بگەڕێتەوە.

وەڵام: ئەوەی کە کراوە لە سڕینەوەی ئایینەکانی پێشوو یان هێشتنەوەی هەندێ سروت و بنەما یان زیادکردن تەنها خوا خۆی کردوویەتەتی بەڵگەیشمان ئەم خاڵانەیە:

١ـ ئەوەی کەسڕاوەتەوە عەقڵی بێخەوش و زانست و سروشتی پاکیش بە چاکیان نازانێت بۆنمونە (بتەکان، خوێن سڕین بە دارودیواری کەعبەدا، فیکەفیك و چەپڵەڕێزان لەجیاتی نوێژ) ئایا لابردنی هەموو ئەوانە پڕنییە لە حیکمەت و دەریناخات کە (الحكيم) ئەوەیکردبێت.

٢ـ گونجانی باسەکانی حەج وەك سروتێکی خوایی لە قورئاندا لەگەڵ هەواڵەکانی تەورات و هێشتنەوەی ئەو عیبادەتەو پاککردنەوەی لە هەموو ئەو خورافاتانەی پێوەی لکێنراوە.

٣ـ ئەوەی کەئێستە ئەکرێت لە حەجدا هـەمووی بـۆ یەکخسـتن و کۆکردنـەوەی هـەموو ئینسـانییەتە(نەك عـەرەب) بـەدەنگ و ڕەنـگ و ئاسـتی جیـاوازەوە، بـۆ دەسـتەبەرکردنی پێویسـتییە ڕۆحـی و ئـابوری و سیاسـەتی و لاشـەیی مرۆڤـە لەیەککاردا، سەیرێکی بێلایەنانەی مەراسـیمی حـەج بکـە ئایا ئـەوە نابینی؟؟ئایا ئەمـە لەخۆیـدا مـوعجیزە نییـە؟ ئایـا چ مرۆڤێـك توانیویـەتی لـە لـە نەخشـاندنی مەراسیمێکدا ئاوا سەرکەوتوو بێت؟ ئەی پێغەمبەرێکی نەخوێنـەوار چـۆن ئـەتوانی ئەوەبکات؟ کەواتە تەنها خوای ئاگادار بەهەمووشتێك ئەوەیکردوە.

٤ـ حەجکردن لەیەککاتدا و بەبێجیاوازی بـۆ هـەموو زمانێـك و هـەموو ڕەنگێـك، جوانترین و دیارترینی نیشانەکانی جیهانگیری ئیسلامیە و تەفسـیری ئایـەتی (وما ارسلناك الا رحمە للعالمین) ە.

کەواتە حەجکردن بۆ بەرژەوەندی هەموو مرۆڤـەکانی سـەرزەوییە و کـۆنگرەی سـاڵانەی هـەموو موسـوڵمانانە و یەکسـانبوونی هـەموو مرۆڤـەکان ئەسـەلمێنێ و لەوێدا نـەڕنگ و نـە زمـان و نـە جیـاوازی چینایەتی بونیـان نییـە و ئـەوەی هەیـە مرۆڤبوونە، خۆشەویستی و ئاسـودەییە نزیکبونەوەیـە لـە پـاکێتی و بەرزبونـەوە، هەموو بەهایەکی بڵندە کە شایستەی ئیرەیی پێبردنە لەلایەن ئەوانەوە کە بێبەشن لەو بەهرانە.

چوارەم: لە لاپـەرە ٥٣٧ و لاپـەرە ٥٣٨دا ئـەم چـەند تێکـەڵی و تەمومـژەیتر لەسـەر حـەج دروسـت ئەکاتـەوە و ئـەڵێ: سـەربڕینی ئـاژەڵ لـە کەعبـەدا پـێش ئیسلامیش هەبووە ئەوانەی ڕویان دەکردە کەعبە ئاژەڵیان لەگەڵ خۆیان دەبـرد و بۆ سەربڕین پێشکەشـیان دەکـرد چـونکە سـەربڕینی ئـاژەڵ لـە کعبـەدا نیشـانەی پەرستیاری بووە هەروەکو لە گوتاری قورئانیدا هاتوە (لله نسکی ومحیای وممـاتی ـ بـۆ (لاھ)ە سەربڕین(النسـك: العبـادە: پەرسـتن) و پەرسـتیاریم) بـەڵام لەوەوبـەر ئاماژەمـان بـەوەدا کەنسـك بـەمانای سـەربڕین دێـت کـە مەبەسـت لـەخۆنزیك کردنەوە...

وەڵام: پێش هەموو شت ئەبێت بڵێم گوتاری بەو شێوە لەهەمو قورئاندا نییە و ئەم دەستەواژە لەهەرشوێنێکت هیناوە ئەوا بەو شێوەیەش واتا ناکرێت، ئەم وشەی (لاھ)ەت لە کوێوە هێنا؟ ئەگەر لەقورئاندا (لله) هەیە ئەوە پێکهاتوە لە لامی جەڕو وشەی پیرۆزی (الله)یە کە بەپێی یاساکانی خوێندنەوەی قورئان بەو شێوە ئەخوێنرێتەوە و واتاکەی واتە بۆ الله نەك بۆ لاھ.نازانم چ خاوەن ویژدانێك ئەوە ئاستی بێت ئەتوانێت ڕێگە بەخۆی بدات دەربارەی قورئان قسەبکات کە زاناو داناکانی سەرسام و دەستەوەستانکردوە؟

ئاژەڵ سەربڕین لەمەککەدا لە پاشماوەی ئاینی یەکخواپەرستی ئیبراهیم پێغەمبەرە و ئیسلام بەفەرمانی خوای ئیبراهیم و موحەمەد خستیەوە سەر شێوە ڕاستەکەی پاش لە گیژنە دەرچوونی دوای هێنانەکایەی بتپەرستی.

هەردەربارەی ئەو بابەتەدا دیسان دووشەی عەرەبی ئەداتە پاڵ قورئان (انە یطعم ولا یطعم) و ئەڵێت: (هەروەکو لە گوتاری قورئانیدا هاتوە (انە یطعم ولا یطعم) واتە ئەوە کە دەرخوارد دەدات و ناخوات کەچی سەربڕینەکان لەبەر ئەوو بۆ ئەو دەکرێت ! خواوەند میراتگری ئاسمانەکان و زەوییە و میراتگری هەموو ئەوەشە کە لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە و هەموی بۆ ئەو دەگەڕێتەوە کەچی مرۆڤ لەهەندێ جۆری تایبەت لە ئاژەڵەکانی خودی خواوەندسەربڕین بۆ خواوەند دەکات ! کە لەو خواوەندە نزیك بیتەوە کەچی خواوەند لە سورەتی (البقرە ١٨٦ بە پێغەمبەر دەڵێت (اذا سالك عبادی عنی انی سمیع قریب استجیب دعوة الداع اذا دعان) واتە خواوەند نزیکە، یان لەخەلکی خاوەن باوەڕ نزیکە، کەواتە هیچ پێویست ناکات خەڵکی ئاژەڵ سەربڕێت بۆ ئەوەی خواوەند لێوەی نزیك بێتەوە..).

وەڵام: زۆر بەلامەوە سەیرە بۆ ناتوانێ ئایەتێ بەڕاستی نقلٚ بکات؟!! ئەوەی یەکەمیان( وَهُوَ يُطْعِمُ وَلَا يُطْعَمُ)ە ئەوەی دوەمیش ئەمە ئایەتەکەیە و خوا

ئەفــەرموێت: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ (١٨٦)

بەڵێ" ئاسمانەکان و زەویی و ئەوەی لە نێوانیشیاندا هەیە موڵکی خوایە و لەژێر فەرمان و ویستی خوا دەرناچێت خوای گەورە بە ئیرادەو ویستی خۆی مرۆڤی خستە سەرزەوی و ئاسمان و زەویشی بۆ دەستەمۆکرد، هەروەها ژیری و زانست کە ئالەتی بەڕیوەبردن وئاوەدانکردنەوەیە پێی بەخشی پاشان ڕێنمایی و نوێنەرەکانیشی یەك لەدوای یەك بۆ نارد و کامڵی ئازادی هەڵبژاردنیشی پێداوە.

ئەم مرۆڤە هەرچی ئەکات لەچاك لەخراپ بەرهەمەکەی بۆ خۆیەتی، خوای گەورە بە گەورەیی خۆی ڕێزی لە مرۆڤ گرتوە کاتێك لەم موڵکەی خۆیدا مرۆڤی نیشتەجێ کرد دەستکراوەیشی کرد کە چیئەکات بیکات بەڵام ئەگەر بە قسەی نوێنەرو ڕێنماییەکانی خوایکرد ئەوا ئەبیتە خۆشەویستی خوا و پاداشتش وەرئەگرێت و بە پێچەوانەشەوە پێچەوانەکەیەتی.

ئاژەڵیش لەو دروستکراوانەیە کە خوا بۆ بەرژەوەندی مرۆڤ دروستیکردوە و لە ڕێنماییەکانی خوای گەورەیە ئەگەر مرۆڤ توانای هەبوو لەو ماڵەی بەدەستیهێناوە قوربانی بکات و هەژارانی پێ تێر بکات، بە گوێکردنی ئەم فەرمانە لەبەرخوایە ئەگین وەك خوا خۆی ئەفەرموێت: ﴿لَنْ يَنَالَ اللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَاؤُهَا وَلَكِنْ يَنَالُهُ التَّقْوَى مِنْكُمْ كَذَلِكَ سَخَّرَهَا لَكُمْ لِتُكَبِّرُوا اللَّهَ عَلَى مَا هَدَاكُمْ وَبَشِّرِ الْمُحْسِنِينَ (٣٧)

گۆشت و خوێنی ئەو ئاژەڵە ناگات بەخوا ئەوەی ئەگات دروستبونی تەقوایە لە ئێوەوە بەمشێوە ئەو ئاژەڵانەی بۆ دەستەمۆکردن بۆ ئەوەی خوا بەگەورە بزانن لەسەر ئەو ڕێنماییەی بۆتان و مژدەش بە چاککاران بدە.

بەخشینەوەی گۆشت لەپاڵ خێرەکانیتردا و پشتگوێ نەخستنی ئەم خێرە بۆ ئەوەیە زۆرجار هەزار کاتێك پارەو سامانی پێئەدرێت زۆرتر بیر لەکرینی پێداویستیتر ئەکاتەوە و لەوانەیە حەزو پێویستی لاشەیی مناڵەکانی لەبیربکات کە چەندە پێویستی بە خۆراکی چاکە تا تەندروستانە گەشەبکەن بەڵام خوا

بەزەییەکەی لە بەزەیی باوك بۆ منداڵەکانی زیاترە بۆیە کاتێك سەیری قورئان و ڕێنماییەکانی پێغەمبەر ئەکەین پڕە لە داوای خێری لەو جۆرە: (وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَى حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا) واتە: لەخۆشەویستیان بۆخوا خۆراك ئەدەن بە هەژارو هەتیوو دیل.

فِي الصَّحِيحِ عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ عُمَرَ: (سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَيُّ الْإِسْلَامِ خَيْرٌ؟ قَالَ: تُطْعِمُ الطَّعَامَ، وَتُقْرِئُ السَّلَامَ عَلَى مَنْ عَرَفْتَ وَمَنْ لَمْ تَعْرِفْ) لە پێغەمبەریان پرسی کام نیشانەی ئیسلامەتییە باشترینە؟ فەرموی: خۆراك بەخشین (نانبدەیی) و سڵاوکردن لەناسیاوونەناسیاو.

في الصحيح عن أبي موسى الأشعري عن النبي (قال: أطعموا الجائع، وعودوا المريض، وفُكّوا العاني) برسی تێربکەن و سەردانی نەخۆش بکەن و کۆیلە ئازاد بکەن.

وفي صحيح مسلم عن أبي ذر عن النبي قال لە: (يا أبا ذر! إذا طبخت مرقة فأكثر ماءها، وتعهد جيرانك) ئەی ئەبو زەڕ ئەگەر گۆشتاوت لێنا ئەوا ئاوی زۆرتری تێکەو دراوسێکانت بیر نەچێت.

ئەمکارە باشانە بۆ بەرژەوەندی و خۆشگوزەرانی و پێکەوە ژیانی خەڵکی سەرزەوییە و لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤ لەخوا نزیك ئەخاتەوە چونکە گوێڕایەڵییە لە ڕێنماییکانی خواو پێغەمبەرەکەی، ئەم نزیکبونەوەیە بەرزبونەوەی مرۆڤە بەپلەکانی چاکەدا هەرکەس بەپێی هەوڵی خۆی و هەیە ئەگاتە پلەی (الاحسان) ئیتر خۆی ئەبێتە پەکپارچە لە چاکە، ئەوکەسانەی کە گەیشتونەتە پلە باڵاکانی چاککاری ئەوانە هەر بە لەدونیا دەرچونیان ئیتر لە نازو بەهرەکانی خوادا ئارامئەگرن و خوا لەوان ڕازییەو لە نزیکەکانن.

بەڵام ئەوەی کە نوسەر لێی حاڵی نەبوە ئەم ئایەتی ١٨٦ی سورەتی البقره یە کە ئەفەرموێت: (وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ (١٨٦)

واتە: ئەگەر بەندەكانم پرسیاری منیان لێكردی ئەوەمن نـزیكم و وەڵامـی داوای داواكارەكان ئەدەمەوە كاتێك بانگم ئەكەن با ئەوانیش وەڵامـم بدەنـەوە و بـاوەڕم پێبهێنن بەڵكو پێبیگەن.

ئەم ئایەتە حەكیمە هەڵەی چـەند بیروبـاوەڕێكی بـاوی نـاو ئاینـەكانیتر(دانراوو گـۆڕراو) بەرانبـەر بـەخوا دەرئـەخات، هەلپەرسـتان لەهـەموو ئایینـەكانیتردا بـۆ بەرژەوەندی كۆمەڵێك لە نێوان مرۆڤ و خوادا پەیوەندكار دائەنێن ئیتر ئایا بت بێت یان مەزارگابیت یان ئەو مرۆڤانەی وەك دەرگاوان خۆیانیان ناسـاندوە، ئەمانـە بـە كێشانەوەی سامانێكی زۆر خەڵكی خۆیان بە واسیتەو وەسیلە داناوە بـۆ گەیشـتن بەخوا.

بەڵام قورئانی پارێزراوو مەزن بەم ئایەتە هەموو پەردەو واسـیتەكان لائـەدات و حەقیقـەتی نێـوان خـواو مرۆڤمـان بـۆ دەرئـەخات كـە خـوا نزیكـەو بیسـەری بەنـدەكانێتی، ئەگـەر بـانگی بكـەن وەڵامیـان ئەداتـەوە، تەنانـەت لـەو سـاتە وەختانەی كە موشریكیش پێئەگیرێت و داوا لـەخوای تـەنها ئـەكات خـوا بـەهانای ئەبێت، وەك ئەفەرموێت: وَإِذَا أَذَقْنَا النَّاسَ رَحْمَةً مِنْ بَعْدِ ضَرَّاءَ مَسَّتْهُمْ إِذَا لَهُمْ مَكْرٌ فِي آيَاتِنَا قُلِ اللَّهُ أَسْرَعُ مَكْرًا إِنَّ رُسُلَنَا يَكْتُبُونَ مَا تَمْكُرُونَ (٢١) هُوَ الَّذِي يُسَيِّرُكُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ حَتَّى إِذَا كُنْتُمْ فِي الْفُلْكِ وَجَرَيْنَ بِهِمْ بِرِيحٍ طَيِّبَةٍ وَفَرِحُوا بِهَا جَاءَتْهَا رِيحٌ عَاصِفٌ وَجَاءَهُمُ الْمَوْجُ مِنْ كُلِّ مَكَانٍ وَظَنُّوا أَنَّهُمْ أُحِيطَ بِهِمْ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ لَئِنْ أَنْجَيْتَنَا مِنْ هَذِهِ لَنَكُونَنَّ مِنَ الشَّاكِرِينَ (٢٢) فَلَمَّا أَنْجَاهُمْ إِذَا هُمْ يَبْغُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّمَا بَغْيُكُمْ عَلَى أَنْفُسِكُمْ مَتَاعَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ثُمَّ إِلَيْنَا مَرْجِعُكُمْ فَنُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ (٢٣)

واتە: كاتێك دوای ناخۆشی خۆشی ئەهێنین بۆ هەندێ كەس ئەبینی دەربـارەی ئایەتـەكانمان پـیلان ئـەگێرن بڵـێ خـوا لـە پیلانـی پەلـەترە و نێرراوەكانیشـمان پیلانەكانیان ئەنوسن، تەنها ئەوە لە وشكانی و ئاودا ئیوە دێنێ و دەبا كاتێـك لـە ناو دەریادا شنەبا ئەبینن پێی شاد ئەبن بەڵام كە ئەبیتە ڕەشەباو تۆفان بیگومـان

ئـەبن لـە تیاچـوون لەوکاتـەدا بەتـەنها خـوا بـانگ ئەکـەن و بـەڵێن ئـەدەن ئەگـەر ئەمجارە رزگاریان بێت ئەوا زۆر سوپاسگوزار ئـەبن، کاتێـك خـوا رزگاریـان ئـەکات بەناهەق لەزەویدا ستەمکاریئەکەن، ئەی خەڵکینە ستەمکاریتان لەزیانی خۆتانـە و دونیـا کەمێکـەو پاشـان بـۆلای ئێمـە ئەگەڕێنـەوەو ئەوکاتـە پێتـان ئـەڵێین چیتانکردوە.

بەڕاستی هەر ئەم نەرمدوانە دیارە کە ئەم قورئانە لای خوایەکی زۆر بەبـەزەیی و بەخشندەوە دابەزیوە و پارێزراوە چونکە ئەو تەحەموله لەتوانای هیچ مرۆڤێکدا نیە، ئەم نمونەیەی ئێستەی وەرگێری بێناو نیشان و قەشە فادی موزەوەر کە خوا خۆی ئەیانناسیٚ بەم شێوەیە بەرانبەر بە ئایەتـەکانی خـوا پـیلان ئـەگێڕن کەچـی خوا مۆڵەتیان ئـەدات لـە دونیـاو بێگومـان توشـی حاڵـەتی پێگیرانیـان ئـەکات بـە نەخۆشی بێت یان لەناو هەر مەترسـییەکیتردا بێـت بـۆ ئـەوەی لەگـەڵ سروشـت و ناخیاندا تەنها ببنەوە و خوای تـەنها یـان بـۆ دەرکەوێتـەوە ئـەو خوایـەی بـەهۆی ڕۆچـونیان بـە خراپەکانـدا لێیـان بـزر بـوە بیدۆزنـەوە کـە ئەمـەش بـەزەیی و بانککردنەوەیانە و دیسان ژێریان ئەدوێنیٚ کە هەموو دەرچونێك لـە فـەرمانی خـوا خراپەکەی بۆ مۆڤ خۆیەتی (بەلێکۆڵینەوە لـە تاوانـەکان ئـەزانرێت) و مانـەوە لـە دونیا بۆ کەس نییە و دیارە بۆلای خوا ئەگەڕێنەوە (إِنَّمَا بَغْيُكُمْ عَلَى أَنْفُسِكُمْ مَتَاعَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ثُمَّ إِلَيْنَا مَرْجِعُكُمْ فَنُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ (٢٣) .

کەواتـە: خـوای گـەورە نزیکـەو بیسـەرو بینـەری بەنـدەکانێتی و وەڵامـی داواکانیان ئەداتەوە و پێویست بە نێوەنـد واسـیتەناکات و قوربـانیکردن و هـەموو چاکەکان نێوەند نین بەڵکو وەسیلەن بۆ گەیشـتن بـە ڕەزامەنـدی خـوا نـەك ئـەوە بێت کە نوسەر لێی تێکەڵ بووە و بە بتەکانی سـەردەمی نـەفامی ئەیچوێنیٚ. ئایا ئەوەژیرییە، نانـدان، ئازادکردنی کۆیلە، بەخشـین، گـەڕان بـەدوای زانسـت، گـەڕان بەناو بونەوەرو ڕامان و لێکۆڵینەوە لێی و..) کە لەکارەچـاکەکانن و وەسـیلەن بـۆ

نزیککەوتنەوەو گەیشتن بەرەزامەندی خوا بیچوێنی بە تاشینی بەردو داروپەرستنی بۆ ئەوەی بەخەیاڵ نزیکتکاتەوە لەخوا؟

هەرکەسێك ئەوە بڵێ دیارە لەچ ئاستێکی ژێریدایە.

پاشان ئەڵێت: دوای ئەوەی پێغەمبەر بەنسبەت عەرەبەکانی دورگەوە خواوەندی لەزەوییەوە هەڵکێشایەوە بۆ ئاسمان وخواوەندی بەتەواوەتی لەسەر زەوی دابڕی دەبێت بۆ نزیکبونەوە بەمحمد و قورئان و مەککەدا تێپەڕین لەهەمانکاتدا خاوەنی قورئان دەبو ئەوەش بڵێت کە خواوەند بەتەنها لە ئاسمانەکاندا نیە بەڵکو لەسەرزەویشە هەروەکو لە (الزخرف ٨٤ دا دەڵێت: هو اله فی الارض وهو اله فی السماء).

خوێنەری بەڕێز: سەیری ئەو سەر لێشێواویە بەڕاستی خۆیشی نەیزانیوە چی ئەڵێ! یانی چی دەبوو خاوەنی قورئان ئەوەش بڵێت... هەروەکو لە الزخرفدا دەڵێت (... ؟ پاشان وەك ئەوەی هیچ جاریك موەفەق نەبوە بۆ نوسینی ئایەتێك بەڕاستی ئەمجارەش هەر بەهەڵە نقلێکردوە و ئەمە ئایەتە پیرۆزەکەیە (وَهُوَ الَّذِي فِي السَّمَاءِ إِلَهٌ وَفِي الْأَرْضِ إِلَهٌ وَهُوَ الْحَكِيمُ الْعَلِيمُ (٨٤) .

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه واله وسلم) خوای بە خەڵکی ناساند و هەرکەس بیەوێت بەدروستی بیپەرستێ ئەبێت لە خواوە تەعالیم وەرگرێت چونکە ئەوکارانە بەدەرە لە ئاستی ژێرترینەکانی خەڵکی کەواتە ئەبێت خوا خۆی نێردراوی هەبێت و ئەو نێردراوەش بەڵگەی نوێنەرایەتی پیشانی خەڵکی بدات، دەی هەر ئەمەیە لە موحەمەد پێغەمبەر هاتۆتەدی و نیشانەی نوێنەرایەتییەکەیشی ئەم قورئانە پارێزراوەیە کە بەپێی نیازی خراپی ئەم وەرگێڕو قەشە فادی بۆیان چوە و سەری لێشێواندون و خۆیشیان نازانن چۆن لێیان تێکەڵبوە ئەوهەموو هەڵە زەق و ناقۆڵایانکردوە.

دیسان هەر لەو لاپەرەیەدا ئەڵێت: کەواتە وەکو لەمەوبەر وتمان لەکاتێکدا کوردەواری وادەزانن کرداری حەج کردارێکی عەرەبیە بەتەنها، هەربەو شێوەیە

تێگەیەنراون کەکرداری حەج بەتەنها کردارێکی عەرەبی و ئیسلامیە و تەنها بەوان تایبەتمەندە کەچی هەمو ئاینەکان حەجی خۆیان هەبوە و کەعبەو شوێنی پیرۆزو سەربرِینگەی خۆیان هەبوە ...تادەگاتەئەوەی ئەڵێت ڕوکردنە مەککە بۆ پێش ئیسلام ئەگەڕێتەوە و مەبەستێکی ئابوری و ڕامیاری لە پشتەوە بوە و عەرەب پێش ئیسلامیش کەعبەیان هەربە پیرۆز ڕاگرتوە.

سەیرکەن چۆن بەدەم کوردەوارییەوە قسە ئەکات؟ لەکوێ کوردەواری بڕوایان وایە؟ ئەگەر کوردەکان باوەڕیان وایە بۆ سەرەی بۆ ئەگرن؟ بۆ ئەو هەمو کۆمپانیای حەج و عەمرە لە کوردستاندا کار ئەکەن و بەردەوام کاریشیان هەیە؟ ئەوەی کە ئەڵێت: هەموو ئاینێك حەج و سەربرِینگەی خۆیان هەبوە! ئەوە ئەگەر ئاینەکان لای خواوە هاتبن ئەوە وایەو لەیەك سەرچاوەوە دابەزیون و وەك لە پێشیشەوە باسمانکرد بەڵێ ئەم حەجکردنەی خوا ڕازی بوە حەجی شوێنکەوتەکانی موحەمەد پێغەمبەر بێت لەسەر هەمان ئەساسی حەجی ئیبراهیم و ئیسماعیل پێغەمبەریش بوە و وەك باسیشمانکرد ئەوە لە گەورەیی ئیسلامە کە بەرژەوەندییە ئابوری و ڕامیاری ڕۆحییەکان پێکەوە ئەسازێنێ و ئەوەی گرنگە جیهانگیرە و تایبەتیش نییە بە هیچ زمان و ڕەنگێکەوە.

چەند پرسیارێکیتر ئەکات و ئەڵێت: هەروەکو خاوەنی قورئان دەڵێت: خواوەند میراتگری ئاسمانەکان و زەوییە(لله میراث السماوات والارض) بەلأم ئەوەی لەبەرچاوە ئەوەیە کەهەمو شوێنێکی ئەم سەرزەویە بەدەست کەمینەیەکەوەیە، هەروەها دەکرێت ئەو پرسیارەش بکەین ئایا خواوەند چاوەڕوانی لەناوچونی گشت مرۆڤ دەکات تاکو ببێتە میراتگری ئاسمانەکان و زەوی؟ یان ئایا ساتە وەختی ئێستا مرۆڤ زەوی لەخواوەند داگیرکردوە و خواوەندیش خوازیارە لەمرۆڤی بسەنێتەوە؟ ئایا خواوەند بەو مەزنییە خەیاڵییەی کە لە بیرۆنای مرۆڤدا هەیە لەلایەن عەرەبەوە تەنها ئەو ژورە وشکە کەڵەکەی بە موڵك بۆ دیاریکراوە لەکاتێکدا هەر خاوەنی قورئان خۆی دەڵێت هەموو گەردون موڵکی ئەوە؟

وەڵام: ئەمە نمونەی ئەو بزربوونەیە کە بێباوەڕان ئازار ئەدات، وێنای ئـەوەیان بۆ ناکرێت مرۆڤێك ئـەو هـەموو ڕێـزەی لێبگیرێـت، ئاسمـان و زەوی بـۆ دەسـتەمۆ بکرێت! لای کێشەوە لای ئەو خوا مەزنەی کە خـاوەنی هـەمو بونـەوەرە! نـازانیّ ئەو چوار دیوارە ئەگەر بۆ خوایە خوا بۆ چییەتی کـە خـاوەنی هـەموو بونـەوەرە؟ مرۆڤ ئەم هەموو نالەبارییە ئەکات بۆ سـزا نانێرێـت؟ ئەمانـەو چـەندەها پرسـیاری تریش ئەگەر بەهۆی قورئانی پاریزراوی خوا نەبوایە موسوڵمانانیش ئەکەوتنـە ئـەو گێژاوە فیکرییەوە و پێم وابێت ئەوە واتای کولەمەرگی و نەزانییە.

کاکـە، خـوای مـەزن بـۆ هـەمو شـتێك کـاتێکی دیـاریکردوە، کـاتی مانـەوەی مرۆڤایەتی لەسـەر زەوی کۆتـایی دێـت هـەر وەك چـۆن سـەرەتای هـەبوو تـا ئـەو کاتەش بڕیاری خوا وایە مرۆڤ خاوەنی هەڵبژاردن بێت و بەویستی خۆی کاربکات و هەموو پێداویستییەکی ژیانیشی خستۆتە ئیختیاری جا هەرکات کـاتی دیـاریکراوی تـەواوکرد ئـیتر هـیچ مۆڵـەتی نـادات و سـپاردەکانی لێوەئەگرێتـەوە، ئاسمانـەکان ئەپێچـێتەوە و زەویـش فەرمانـەکانی خـوای خـۆی بـەجیّ ئـەهێنیّ و ئـەوە واتـای میراتگری ئەگێن لە سەرەتا تا کۆتایی هەرخوا خاوەنی خەلق و ئەمرە.

بۆ مەبەستی ماڵەکەی خوا لەسەر زەویدا لە پێشـەوە وەڵامـی تـەوای ئـەوەمان داوەتەوە.

لە لاپەرە ٥٣٩ و لاپەرە ٥٤٠ باسی هێرشەکەی ئەبرەهە ئەکات بۆ سەر کەعبـە چاو پۆشی لە هێرشـی کاولکـاری وڕاوڕوتـی لەشـکرەکەی ئەبرەهەئـەکات و باسـی پاڵنـەری هێرشـەکە ناکـات کـە تـەنها ئیرەیـی ئەبرەهـە بـوو بەرانبـەر بـە کەعبـەو خەڵکی مەککە، ئەمانە واز لێئەهێنیّ و باسی ئەوە ئەکات کە ئەبرەهە کلیسـایەکی جوان و ڕێك و پێکـی دروسـتکردوە بـۆ ئـەوەی حـەجی بـۆ بکرێـت و گلـەیی ئـەوە ئەکات کە بۆچـی عـەرەب ئـەوەیان پێقبوڵنـەکراوە و بۆچـی بـت پـەرستی خۆیـان پێباشتر بوە لە ئاینێکی ئاسمانیتر وەك مەسیحییەتەکەی ئەبرەهـەو حـەجی مـاڵی ئەبرەهـە؟ قسـەکانی نێـوان ئەبرەهـەو بـاپیری پێغەمبـەر نقـلّ ئـەکات و ئـەڵێت

عەبدولموتەلیب وەك كڕینەوەی هەڵوێستی خۆی ووتویەتی: كەعبە پەروەردگاری خۆی هەیە دەیپارێزێت. و واتایەك لە قسەكەی دەردەهێنێ و دەڵێت واتە من هیچ هەقم بەسەر كەعبەوە نیە بەڵكو وشترەكانی خۆمم پێبدەنەوە. و لەم باسەش ئیستنتاجی ئەوە ئەكات كە عەرەبەكان لەگەڵ بوونی ئەو ٣٦٠ بتەی ناو مەككەدا باوەڕیان بەخوای تاك هەبوە، دەركەوتنی موحەمەد مەودایەكی ئاینی هەبوە بەلام سیمایەكی سیاسی و ئابوری و نەتەوایەتیشی هەبوە، بۆچی خوا پێش هاتنی موحەمەد هەبونی بتەكانی لە كەعبەدا یاساغ نەكردووە؟چۆن بەخودی خۆی ئەو بتانەی لەناو نەبردوە و ئەو كارەی بەمرۆڤ سپاردوە؟

**وەڵام**: ئەوەی كە عەرەب لەو كاتەدا لە ئەبرەهەی قبوڵ نەكرد هیچ نەتەوە و كۆمەڵێكی ئازاد ناتوانن قبوڵی بكەن، كاكی نەناسراو ئەتوانیت لەم باسەی خۆتەوە جیاوازی بكەیت لە نێوان دانانی سروت و مەزارگەیەك كە پاڵنەری ئابوری و سیاسەتی لە پشتەوە بێت (كلیسكەی ئەبرەهە) و سروت و قیبلەیەك كە خوا داینابێت و دڵی خەڵكی پێوە بەستبێت !! ماڵێكی جوان و ڕێكوپێكی دروستكراوی ئەبرەهەو پشت ئەستور بە لەشكری بەتوانای خاوەن زەبر و خاوەن فیلی زەبەلاح بەرانبەر ماڵێكی (خۆت ووتەنی ووشكە كەڵەك) لە شوێنێكی ووشكەلانی بێ سەوزایی لەبن دەستی كۆمەڵێكی نەخوێندەواری پەرتەوازە كەچی وەك عەبدولموتەلیب ئەیزانی ئەو ماڵە خوایەكی هەیە ئەیپاریزێت و پاراستیشی و ئەو لەشكرە خاوەن فیل و دەسەلاتەی كردە كای جووراو و ئەو فیلەش كەتۆ ئەڵیی لەوانەیە شەكەتی ڕێگا بوبێت بۆیە نەیتوانیوە بیڕوخێنێ! ئەی بۆ كە ڕویان لە كەعبە وەرئەگێڕرا بەچالاكانە ئەڕۆشت؟ یان ئایا فیلەوانەكان وەك تۆ نەیانئەزانی ئەو فیلە شەكەتەو باپشووبدات ئەوكاتە ئەوكارەی پێبكەن!!، ئەی ئەو لەشكرە زەبەلاحە چ دەردیانبوو ئاوا داڕزان و بوونە سەرگوزشتەی زمانی خەڵك ومێژونوسان؟

کەواتــە: ئــەو خەڵکــە بتپەرســتەی ئەوکاتــە هێشــتا هەنــدێك لــە قســەو باســی پێغەمبــەرانیان لامــابوو بەتایبــەت ئەوانــەی هێشــتا لەســەر دینــی ئیــبراهیم بــون وپەراوە پێشوەکان (تەورات و ئینجیل) بەدەستکاریەوە لـەناو جـەزیرەدا هـەبوو بۆیە ئەیانزانی کە کەسێك بیەوێت قیبلـەو حـەج بگۆڕێـت ئـەبێت پێغەمبـەر بێـت و پێغەمبەریش ئەبێت بەڵگەی ڕاستبوونی خۆی پیشانی خەڵك بـدات ئـەوکات خـەڵك ئـەتوانن متمانـەی پێبکـەن، ئـەو خەڵکـەی بەرانبـەر کەنیسـەی جـوان و لەشـکری کاولکـار ملیـان نـەدا بـەهاتنی پێغەمبـەر (صـلی الله علیـە والـە وسـلم) و متمانـە پێکردنی ڕازی بوون ئەو بتانەی ساڵەها بوو کڕنوشیان بـۆ ئـەبرد تێکیانشـکاندن و لەنوێژێکـدا فـەرمانی قیبلـە گـۆڕین بـە پێغەمبـەرکرا بێچەنوچـون لەنوێژەکـەدا قیبلـەیان گـۆڕی لـە قودسـەوە هـەربۆ لای ئەوکەعبەیـەی دڵـەکان کـێش ئـەکات بێئەوەی جوانییەکی دونیایی تێدا بێت ئایا ئەمە موعجیزە نییە؟ بۆکەس ناتوانێت شوێنێکیتری لەوشێوە ئاوا شیرین بکات؟.

نوسەر ئەڵێت: بۆ پـێش هـاتنی موحەمـەد خـوا هـەبونی بتـەکانی لـە کەعبـەدا یاسـاغ نەکردووە؟چـۆن بـەخودی خـۆی ئـەو بتانـەی لـەناو نـەبردوە و ئـەوکارەی بەمرۆڤ سپاردوە؟

ئەوەتـەی دونیـا دونیایـە خـوای گـەورە هـەموو جـۆرە پەرسـتنێکی جگـە لـە پەرستنی خوای تاقانە یاساغکردوە و ئەم فەرمانەیشی بە هـەموو پێغەمبەرانـداوە بیگەیەنن بەخەڵکی. بەڵام خەڵکیشی سەرپشککردوە لە هەڵبژاردنی ڕێڕەوی ژیان، هەیە لە جیاتی خوای تاقانەو بێهاوتا دێت و بەدەستی خۆی خوایەکی تر بۆ خـۆی ئەتاشێ و ئەیکاتە شەریکی خوای تـەنها و هەیـە مانگـا یـان جـرج یـان مردوویـەك بەدەسەڵاتدارو شەریکی خوا دائەنێ و هەیە(پەنا بەخوا) کوڕبۆ خوای بێنیاز قەرار ئەداو لەگەڵ خوا ئەیکاتە پەرستراو ئـیتر بـژمێرە.... لـە نـاو ئەمانەشـدا هەیـە لـە فەرموودەی خوا خۆیەوە خواو مرۆڤیشی ناسیوە و ئـەزانێ خـوا ڕێـزی لێگرتـوە و بیسەرو بینەریەتی و پێویستی بە واسیتە نییە.

(الله) بـەدرۆ خسـتنەوەی ئـەو خوادرۆیانـەی لەئەسـتۆی پێغەمبـەران و مرۆڤـە باوەڕمەندەکان داناوە، بوونی هەر بەرەیەك لەوانـە کراوەتـە مایـەی تاقیکـاری بـۆ ئەوانیترو نمرەی لەسەرە. ئەی نازانی ژیان و پاشان مردن هەر بـۆ ئـەو مەبەسـتی تاقیکاریە دانـراوە خـوا خـۆی ئەفـەرموێت (تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (١) الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ (٢) واتـە: پـیرۆزە ئـەو خوایـەی مـوڵکی بەدەسـتە و بەسـەر هـەموو شـت بەتوانایە، ئـەو خوایـەی مـردن و ژیـانی خـەلق کـرد بـۆ ئـەوەی تاقیتـان بکاتـەوە کامتان باشترین کار ئەکەن و ئەو خوایە زۆر زاڵ و لێبوردەیە.

بەڵێ خوا خۆی بەتوانایـە هـەمووکات خراپـەکاران وەك لەشـکرەکەی ئەبرەهـە بەیەکێك لە لەشـکرەکانی لەناوبـەرێت بـەڵام ئـەوکارەی بـە بـاوەڕداران سـپاردوەو لەسەر کۆششیان لەو کارەدا بەهەشـتیان ئـەداتیٚ، خـوا حەکیمـە وزانایەچـۆن و چ کاتێك یارمەتی ئەنێرێ یان چ کاتێك ئەو کارە خۆی ئـەیکات" کۆمـەڵێك ماوەیـەکی زۆرە بت پەرستن و هێشتا نەگەڕاونەتـەوە بـۆ بەرسـتنی تـەنها(الله) نـەهێزی ئـەو بەرەنگاربونەوەیان هەیە نەخوای گەورەش ئـەو شـەرەفەیان ئەکاتـە نسـیب بۆیـە خوای گەورە خۆی لەشکرەکەی ئەبرەهەی لەناوبرد (والله اعلم) .

هەرچەندە نوسەرو وەرگێڕ لە رستەی (والله اعلـم) زۆر قەڵسـن بـەڵام بائەمـەش بزانن " کاتێك ئێمە ئەمە ئـەڵێن کـە دەربـارەی عللـەت یـان حیکمـەتی کارێـك یـان فەرمودەیەکی خوا قسەو بۆ چـونی خۆمـان ئـەڵێین چونکە ئـەزانین ئـەوەی ئێمـە ووتومانە هەمووی نییەو دیارەبەهەموو عیللەت و حیکمەتەکانی خوا زاناترە.

لە لاپەڕە ٥٤١ یشدا هەمان قسەکانی پێشوو دوبارە ئەکاتەوە و ئەمجار ئەڵێت: ئەمە لەگەڵ (ان الله غنی عـن العـالمین ـ خواوەنـد لەهـەردوو جیهانیـان بێنیـازە)دا ناگونجێت.

**وەڵام**: ئەم پارچە ئایەتە کۆتـایی ئایـەتی (٩٧) ی سـورەتی (ال عمـران)ە کـە باسی حەجی ماڵی خوا ئەکات (فِيهِ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ مَقَامُ إِبْرَاهِيمَ وَمَنْ دَخَلَهُ كَانَ آمِنًا

وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا وَمَنْ كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ (٩٧) لە حەجدا نیشانانی ڕونی تێدایە ' شـوێنی ئیـبراهیم و هەرکەسـیش چووە ئەوێ دڵنیا ئەبوو، بۆ خوا لەسەر خەڵکی توانادار حـەجی ماڵەکـە دانـراوە و هەرکەسیش کافر بێت ئەوە خوا لە جیهانیان بێنیازە.

ئەمە وەڵامە بۆ وەرگێڕو قەشە فادی و هەموو ئەوانەی وەك ئەوان بیرئەکەنەوە دەربارەی حەج خوا بێنیـازە لەوانـە، خـوای گـەورە بێنیـازی سوپاسـکراوە بـەڵام بێنیـازێکی خـاوەن بەزەییـە و ئەفـەرموێت:(وَرَبُّكَ الْغَنِيُّ ذُو الرَّحْمَةِ ....) واتـە: خاوەنەکەی تۆ بێنیازی خاوەن بەزەییە..) کەواتە ئەم ڕوونکردنەوە و شیکردنەوە و لێبوردەیی و بانگکردنەوەی یەك لـەدوای یـەکی بـۆ بەنـدە لاڕێکـانی لـە بـەزەیی زۆری خواوەیە نەك ئەوەی نیازی بەکردەوەی بەنـدەکانیبێ، پێغەمبـەر (صـلى الله عليه واله وسلم) لە فەرمودەیەکی قودسیدا ئەفـەرموێت: خـوا فەرمویـەتی: ئـەی بەندەکانم ئەگەر لەیەکەم کەسەوە تاکۆتاییتان ئینس و جینتان وەك بەتـەقواترین کەستانبن هیچ لە موڵکی من زیاد ناکات، ئەی بەندەکانم ئەگەر یەکەم تاکۆتایتـان بە ئینس و جننەوە وەك خراپترین کەستان بن هیچ لە موڵکی من کەم ناکات، ئەی بەنـدەکانم تـەنها ئەوەندەیـە کردەوەکانتـان هـەژمار ئەکـەم بۆتـان و پاشـان پاداشتەکەیتان ئەدەمەوە هەرکەس توشی خێر بوو ئەوا باسوپاسـی خـوا بکـات و هەرکەسـیش جگـە لـەوەی بینـی ئـەوا بـا تـەنها لۆمـەی خـۆی بکات.ئەمـەش دەقەکەیەتی: (في صحيح مسلم: "يقول الله تعالى: يا عبادي لـو أن أولكـم وآخـركم، وإنسكم وجنكم كانوا على أتقى قلـب رجـل مـنكم، مـا زاد ذلـك في ملكـي شـيئًا. يـا عبادي، لو أن أولكم وآخركم، وإنسكم وجنكم، كانوا على أفجر قلب رجل مـنكم، مـا نقص ذلك من ملكي شيئًا. يا عبادي، إنما هي أعمـالكم أحصـيها لكـم (ثـم أوفـيكم إياها) (٢) فمن وجد خيرا فليحمد الله، ومن وجد غير ذلك فلا يلومن إلا نفسه"

کەواتـە: خـوای گـەورە بێبـاك و بێنیـازە لـە بەنـدەکانی بـەڵام بەبەزەییـە بەرانبەریان و کارئاسانیان بۆ ئەکات (يريد الله بكم اليسر ولايريـد بكـم العسـر) و

ڕێگـەی لێخۆشـبونیان بـۆ واڵا ئـەکات، کـاری ئاسـان و کـەمیان بـە زۆر دائـەنێ و ئەوەیشی هیچی لەدەستانەبێ ئەتوانێ بە نیازی دڵـی وەك بەخشـندەکان پاداشـت وەرگرێت، ئەوەی خوا بناسێ ئەزانێت بەهەموو جۆرێك خـوای گـەورە ڕێـزو سـۆزو بـەزەیی بـەمرۆڤ و لـە مـرۆڤ گرتـوە. کـێ جگـە لـەو خوایـە شایسـتەی سـتایش وپەرستنە؟

لەلاپەڕە ٥٤٢و ٥٤٤دا باسی ڕۆخاندنی دیواری ئەریحا ئەکات لەلایەن(یوشع) ی کوڕی نون و ئەڵێت ناوی خۆی (هۆشیایە) بەڵام لە قورئاندا بە یوشع نـاوی هـاتوە و ئیتر دێتەوە سەر باسی بازارەکانی مەککە و نـاوی مەککـە و دیسـان ئایـەتێکیتر بەهەڵە نقلێ ئەکات و باسی سێڵاوەکە ئەکات کـە پـێش هـاتنی پێغەمبـەر کەعبـەی ڕووخـان و چـۆن مەککـە شـوێنێکی بازرگـانیبوە وەسـفی بازرگـانی مـەی و پـارە بەسودانی یەهودییەکانی مەککە ئەکات و ئـەڵێ بەچـڕی لەوێـدا بـوون، دێتـە سـەر باسی کوردەکان و فارس و مەسیحییەکان و بەشێوەیەکی نەشازو ڕەکیك باسەکان تێهەڵکێش ئەکات و لەکۆتاییدا ئـەڵێت: لەکـەش و هەوایـەکی ئـاینی ئارامـدا هـەمو قۆنـاغ و شـێوازەکانی پەرسـتن بەیەکـەوە لەدورگـەدا هـەبوو هـەر لـە ئاییـنـەکانی حەنفایی و صابئی و مەسیحی هەتا دەیان و سەدان ئاینیتر بەڕادەیەك لە کەعبـەدا بە ژمـارەی ڕۆژەکـانی سـاڵ پەیکـەری جیـا جیایـانکردبوە هێمـای خواوەنـد واتـە ژمارەیـەکی زۆر لـە عەرەبـەکانی دورگـە بوبونـە حـەنفایی و یـەهودی و صـابئی و مەسیحی.

وەڵام: من نازانم ئەم دوو لاپەڕەیـە بـۆ ئەوەنـدە حاڵیـان شـرە لەگـەڵ ئـەوەی هەمووی درۆیە ڕێکخستنی درۆکانیش هەر زۆر نالەبارە، ئاخۆ بۆچی وایە؟!

خوێنەری بـەڕێز سـەیرکە لـە هـەموو قورئانـدا ناوی(یوشـع) نییـە، ئـیتر چـۆن ئەڵێت لە قورئاندا بە یوشع ناوی هاتوە، ئایەتی (رَبَّنَا إِنِّي أَسْكَنْتُ مِنْ ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ عِنْدَ بَيْتِكَ الْمُحَرَّمِ ) بەهەڵە ئەنوسێت (ونحن بـواد غـير ذی زرع) و ئەیکاتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە باکشتوکاڵیش نەبوە بەڵام بازرگانیبوە و بازرگانی

مەی و شەرابیانکردوە و یەهودییەکان بەچری لەمەککەبوون. ئاخر ئەمە کەس واناڵێت!! یەهودی لەمەککە نەبوون، بازرگانی شاری مەککەش لەدوای ئاوەدانبونەوەی مەککە دەستیپێکرد و ئەوان عادەتی گەشتی هاوینەو زستانەیان دانا.

وەرگێڕ زۆر شین بۆ مەیفرۆشتن و ژمارەی زۆری بتەکان و زەردەشتی و بەسودانی پارە..ئەکات! بۆ؟ خۆ ئەوەی خۆی باسی کردوە ئەوە باشترینەکانی سەردەمی پێش پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر بوە:

ئایا لە جیاتی مەستی و مردنی سست، هۆشیاری و ساغی بەردەوام باشتر نییە؟.

لە جیاتی بتی زۆری کەڕو کوێر و بێخێر (الله) ی تاقانە و بیسەرو بینەرو بەتوانا دانای بەبەزەیی باشتر نییە؟.

لە جیاتی سووخۆری و بەدیل گرتنی قەرزار بەخشندەیی و قەرزی بێسوو باشتر نییە؟.

وەڵامی ئەوانە ئاشکرایە، دەی پێغەمبەری خوا ئەوانەی چەسپاند ئایا عەقڵ ناڵێت کە پێغەمبەر لای خواوە نێرراوە و کتێبەکەیشی باشترین کتێبە؟.

پاشان خوێنەری بەڕێز ئەگەر کەمێك لە کۆتایی باسەکەی ڕابمێنی ئەبینی لە بابەتەکەی کلۆڵترە. خۆی لەوەو پێش باسی ڕاوڕووتو شەڕو بەکۆیلەگرتن و ململانێی زلهێزەکانی کردوە کەچی لێرەدا ئەڵێت (لەکەش و هەوایەکی ئارامدا...)؟

پاشان ئەڵێت: هەتا دەیان و سەدان ئاینی تر بەرادەیەك لە کەعبەدا بەژمارەی ڕۆژەکانی ساڵ پەیکەری جیاجیایانکردبووە هێمای خواوەند. واتە ژمارەیەکی زۆر لەدورگە بوبونە حەنفایی و یەهودی و صابئی ومەسیحی.) ئاخر بوونی ئەوەندە پەیکەر کەی ئەوە واتاکەیەتی؟!! هەر ئەو کەش و هەوا نالەبار و پەرتەوازەیی و نەفامی وسەرگەردانییە هۆکار بوون بۆ پێویست بوونی هاتنی پەیامهێنەرێك لای

خواوە بۆ ڕزگاربوون و بەڵگەیشن لەسەر دانایی خوا کە قورئـان و پێغەمبەرەکـەی نارد تا ئەو کۆمەڵگە ڕزگاربکەن لە کۆیلایەتی و ژێردەستەیی.

لەلاپەڕە ٥٤٥ و ٥٤٦دا باسێکیتری مێژوویی ئەهێنیّ و لـە باسـەکانیتری باشـتر نییـە، باسـی سـەلمانی فارسـی ئـەکات کـە بـەرەو دورگـە هـەڵهاتبوو، کـەخۆی هێربودانی ئاتەشگە بوە و دژی کۆیلایەتی و موڵکداری بوە. ئەڵێت: مەزدەکی بوە و ئایەتی (لسان الذی يُلحدون اليه...) مەبەستی لـە سـەلمانی فارسـییە، سـەلمان لەگـەڵ ئـەوەی دژایـەتی زەردەشـتی کـردوە بـەڵام باسـی ئـەو ئاینـەی بـۆ محمد کردوە..سـەلمان بـەر لـە خـۆ بـە پێغەمبـەرکردنی محمـەد و پـێش موسـڵمانبوونی خۆیـدا ئـەو لەلایـەن پێغەمبـەرەوە کڕابـوو، لەیەکچـون لـە نێـوان زەردەشـتی و ئیسلام و ئاینی ئیبراهیم دا هەیە لەوانە شێوە و ژمارەی نوێژەکان و سەر هەڵدانی هۆشیدەر.. لە ئاینی زەردەشتیدا (شۆسـیانت) واتـە (مهـدی المنتظـر) لـە نزیـك بیری زەمزەم سەر هەڵدەدات و باسکردنی بـەرزەخ فریشـتەکان فریشـتەی مـردن، لەیەکچوی پاکی بنەماڵەی هەردولا، لەوانەیـە کارتێکـەری سـەلمان لەسـەر کەسـی محمد وای کردبێت کە پێغەمبەریش دژایەتی ئەو ئایینە بکات.

وەڵام: ئەو ئایەتـە لـە تەفسـیرەکاندا ڕاڤـەی جـۆراو جـۆری هەیـە و یـەکیك لـە ڕاڤـەکانی ئـەڵێت موشـریکێکی مەککـە ووتویـەتی موحەمـەد ئـەم قسـانەی لـە عەجمێکـەوە وەرگرتـوە و ئـەو عەجەمـەش هـەرجارەی کەسـێك ئـەڵێن (عـداس، سـەلمان، دوو غـولامی ڕۆمـی لەمەککـەبوون بـەزمانی خۆیـان کتێبێکیـان هـەبوو ئەیانخوێندەوە) و ئیبن کەسیر ئەڵێت: زەحـحاك وتویـەتی: ئـەو کەسـە سـەلمانی فارسیە، ئەم قسەیە لاوازە، چونکە ئەم ئایەتە لە مەککەدا دابەزیوە و سـەلمان لـە مەدینە بەخزمەت پێغەمبەر گەیشتوە و موسوڵمان بوە، عەبدوڵڵای کوڕی موسـلیم ئەڵیّ دوو غـولامی ڕۆ میمـان هـەبوو کتێبێکیـان بـە زمـانی خۆیـان ئەخوێنـدەوە و پێغەمبەر (صلی الله علیە والە وسـلم) جارجـار گـوێی بـۆ ئـەگرتن و موشـریکەکان

ووتیـان لەوانـەوە فێـر ئـەبێت و خـوای گـەورەش ئایـەتی (لسان الذی یلحدون..) دابەزاند.

ناحەزانی قورئان لەکۆن و تازەدا وەك یەك پیلان ئـەگێڕن! یان ئەوانـەی تـازە هیچیان پێنییە جگە لە جوینەوەی قسەو بوختانی ناحەزانی کۆن!.

بۆچی لەناو ئەوانەی کە ئیحتمالی هۆی دابەزینی ئایەتە پیرۆزەکە ئەیانگرێتەوە چوە سەلمانی فارسی هەڵبژاردوە! !کـە بۆچـونێکی ناراسـت و لاوازە؟ ئایـا لەبـەر ئەوە بوە باسی ئاینی مەزدەکی و زەردەشتی بێنێتە کایـەوە؟ یـان ئەمـەش هـەر موعجیزەی ئایەتەکەیە کە لە دوای باسی بوهتانەکەدا فەرمویـەتی خـوا هیدایـەتی ئەوانە نادات کە باوەڕیان بە ئایەتـەکانی خـوا نیـە بۆیـە لـەناو ئەوانـەدا ئەمـەیانی هەڵبژادوە کە هیچ ڕێی تێناچێت و لاوازە؟، ئەوانەی کە بـەدەم خـواوە درۆئەکـەن ئەوانەن کەدرۆزنن و ڕاستیان نییە، سـەیریکەن چـی ئەفـەرموێت: ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُ بَشَرٌ لِسَانُ الَّذِي يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِيٌّ وَهَذَا لِسَانٌ عَرَبِيٌّ مُبِينٌ (١٠٣) إِنَّ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ لَا يَهْدِيهِمُ اللَّهُ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ (١٠٤) إِنَّمَا يَفْتَرِي الْكَذِبَ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَأُولَئِكَ هُمُ الْكَاذِبُونَ (١٠٥)﴾

واتـە: ئێمـە ئـەوە بـاش ئـەزانین ئـەوان ئـەڵێن ئادەمییـەك فێـری ئـەکات، ئـەو کەسەی نیازیانە لـە عەرەبیـدا کۆڵـە و ئـەم قورئانـەش عەرەبییـەکی ڕەوانـە، ئـەو کەسانەی باوەر بە ئایەتەکانی خوا ناهێنن خوا ڕێنمایان ناکات و سزای بە ئازاریان بۆ هەیە، تەنها ئەوانە درۆ بەدەم خواوە ئەکەن کە باوەڕ بە ئایەتەکانی خوا ناکەن و ئەوانە خۆیان درۆزنن. خوا ڕاستی فەرمووە(سبحان الله).

تەبەرانی لە سەلمانی فارسیەوە ئەگێڕێتەوە ووتویەتی: بەدوای دیندا ئەگەڕام کەوتمـە نـاو کۆمـەڵێك لـە پاشمـاوەی خواناسـەکانی ئـەهلی کیتـاب وەك خـوا ئەفەرموێت: ئەوان موحەمەد وەك کوڕی خۆیان ئەناسن ئەیانووت ئەمە سـەردەمی پێغەمبەریکە لە زەمینی عەرەبەکاندا لەدایك ئەبێت چەند نیشـانەیەکی هەیـە پێـی ئەناسرێتەوە" لەوانە لەناوشانیدا مۆری پێغەمبەرایەتی پێوەیە.

کەواتــە وەك خــۆی ئــەڵێت بــەدوای دینــدا وێڵــی شــاران بــوەو زێــدی خــۆی بەجێهێشتوە بەپێی نیشانەی ئەو شوێنەی کە کۆتـا پێغەمبـەر تێیـدا دەردەکـەێت لە دورگەدا گیرساوەتەوە بەڵام ئەو لـە مەدینـە بـوە کـە پاشمـاوەی ئـاینی گـاورو جولەکەی لێبوە و بەپێی لێکۆڵینەوەکانی خەڵکی خـاوەن کتێبـی ئـەو سـەردەمەو لوتبەرزی و هاشوهوشی جولەکەی ئەوکاتە وای بۆ ئەچون لە مەدینـە دەرکـەوێت، بەڵام خوا خۆی ئەزانێت لە کوێدا و بەکێدا پـەیامی خـۆی ئـەنێرێت و هـەمان ئـەو نیشانە خەلقی و خولەقیانەی تێدا بوو کە لە کتێبەکانی ئەواندا هەبوو.

بەڵێ سەلمانی فارسی یەکێك بوە لە ڕۆشنبیرە چاوکراوەکان کە بەهەق نـەبێت دڵاوا نەبێت بۆیـە بـەردەوامبوو نەبـە زەردەشـتی و نەبـە مـەزدەکی و نەبـە گـاورو نەبەجولەکە ڕازی نەبوو لە وڵاتێکـی پێشـکەوتوی سـەردەمی خۆیـەوە هـاتبوو لـە شوێنی خۆیشیدا خاوەن پلە بووە کەسـی بـەو شـێوە دیـارە تـا بەڵگـەی ڕاسـت و ڕوون نەبینێ بەئاسان پابەند نابێت، کەسی بـەو شـێوە ئەگـەر خـۆی ئـەو توانـای هەبوایـە دەربـەدەری و دیلـی بەسـەرخۆیدا نەئـەهێنا بـەڵکو ئەبویـە سـەرداروو دەمڕاست و خێری بۆ ئاگرپەرستەکانی لای خۆی ئەدایەوە، کەسێك نیە لەم دونیـا خێرێکی لابێت کە مایەی ڕێزو گەورەیی ورزگاری بێت خـۆی ڕاینەگەیـەنێت بیداتـە کەسێکی نەخوێندەوار بڵێ تۆ بیگەیەنە ! ، ئەوە پلەیەکە ئیرەیـی پێئـەبرێت چـۆن سەلمان یان غـولامی ڕۆمـی یـان هەرکەسـێکیتر ئەیبەخشـێت بـەباوکی خۆیشـی چ جای ئەوەی بیدەنە کەسێکی نەخوێندەواری غەیرە؟ جگە لەوە قورئـانێکی ڕەوان و ساز چۆن کەسـێکی کلۆڵ لـەزمانی عەرەبیـدا ئـەتوانێت بیهێنـێ؟ ئـەم قورئانـە ڕەوانبێژەکانی بەخۆیەوە سەرسامکردوە و دوای هاتنی قورئان زانستی دەربڕین و ڕەوانبێژی عەرەبی نوسرانەوە و نمونەکانیشیان ئایەتەکانی  قورئان بوو.

ئەو سەلمانەی کە نوسەر بـە سەرچـاوەی قورئـانی ئەداتـە قەڵـەم، ئەگێڕنـەوە کاتێك گوێی لە ئایەتی:(ان جهنم لموعدهم اجمعـین) بـوو لەکاریگـەری ئـەو ئایەتـە سێ ڕۆژ خۆی شاردەوە، پاشان هێنایانە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم)

لێی پرسی؟ ئـەویش ووتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا بـەو خوایـەی تـۆی بەهەقـەوە ناردوە ئەو ئایەتە جەرگمی بڕی، ئینجا خوای گەورە ئایەتی (ان المتقين فى جنات وعيون...) دابەزاند.

کاتێك کە ئەڵێت سەلمان بەر لەخۆ بەپێغەمبەرکردنی محمد و لەپێش موسڵمان بونی خۆیدا لەلایەن پێغەمبەرەوە کرڕابویەوە، ئەمەیشـیان هـەر درۆی نـاو چـاوی خۆیــەتی چــونکە وەك باسمــانکرد ئــەو لــە مەدینــە بــوەو وەك خــۆی بۆمــان ئەگێڕێتەوە، عەبدوڵڵای کـوڕی عـەبباس ئـەڵێت سـەلمانی فارسـی دەنـگ و باسـی خۆی بۆ گێڕامەوە و ووتی: من فارسیم و لە خەڵکی گوندی جەیونم و لەوێ ئـەژیام بـاوکم کوێخـای دێ کـەبوو ئەوەنـدەی خۆشئەویسـتم منـی لـەجێی هەموکەسـی دانابوو، لە ئـاگر پەرسـتیدا ئەوەنـدە چالاك بـووم تـا گەیشـتمە پلـەی هێربـودانی ئاتەشگە، بـاوکم موڵـك و باخـاتێکی گـەورەی هـەبوو ڕۆژێـك بـەهۆی خـەریکبوونی بەکارێکیترەوە منـی لـەجێی خـۆی نـارد بـۆ سەرپەرشـتی باخاتەکـەی لـە ڕێگـەدا گەیشتم بە کەنیسەیەك و گوێم لە دەنگی نوێژەکەیانبوو لێیانزیك بومەوە تـا بـزانم چی ئەڵێن تا ئەو کاتـە لەبـەر ئـەوەی بـاوکم دەسـتی لێبـەر نـەدابووم بچـمە هـیچ شوێنێك هیچم دەربارەی خـەڵکی نەئـەزانی، کاتێـك ئـەوانم بینـی نوێژکردنەکـەیان سەرنجی منی ڕاکێشا و وتم بەخوا ئەمە لەدینەکەی ئێمـە باشـترە ئـیتر لای ئـەوان مامــەوە تــا خۆرئــاوابون و کارەکــەی بــاوکم لــەیادکرد و پرســیارم لێکــردن ووتم سەرچاوەی ئەم دینە لەکوێیە ووتیان لە شامە، ئیتر گەرامەوە بۆ لای باوکم ئـەزانم ناردویـەتی بەدوامـدا لەبـەر مـن کارەکـەی خۆیشـی تـەواو نـەکردبوو، ووتـی ئـەوە ڕۆڵەگیان لەکوێ بویت ئەمە لە ڕەفتاری تۆ ناچێت؟ وتم بـەخوا لای خواناسـەکانی کەنیسە بووم نوێژکردنەکەیان سەرنجی منی ڕاکێشا.

بەم شێوەیە سەلمان پەیوەندی لەگەڵ ئەواندا زیاد ئەکات و پەیوەنـدی لەگـەڵ باوکیـدا لاواز ئـەبێت تـا ئەگاتـە ئـەو ڕادەیـەی داوا لـە سەرپەرشـتیارانی کەنیسـە ئەکات بیگەیەننـە شـام بـۆ ئـەوەی خـۆی لـە سەرچـاوەکەوە ئـەو دینـەوەرگرێت،

ئـەوانیش ئـەوکارەی بـۆ ئەکـەن بـەڵام کـە ئەچـێتە ئـەوێ لـە ڕەوشـت و دوڕویـی قەشـەکان تـوڕە ئـەبێت و بـیر لـەوە ئەکاتـەوە دوای ئـەو هەواڵانـە بکـەوێت کـە لەتەوراتدا بیستویەتی دەربارەی کۆتـا ڕزگارکـەر بـۆ ئـەو مەبەسـتە ڕێگـەی ئـاوی ئەگرێتەبـەر لـەوێ چـەند چـەتەیەکی جولەکـە ئـەیگرن و وەك کویلەیـەکی خۆیـان ئەیناسێنن ولە مەدینە ئەیفرۆشن و وەك بۆخاری لەفەرمودەیەکدا ئـەڵێ: چـەندەها جار کرین و فرۆشتنی پێکراوە تـا ئـەو کاتـەی ئەبیسـێ لـە مەککـە فریادڕەسـەکە دەرکەوتوە بەڵام لەبەر ئەوەی کۆیلەبوە نەیتوانیوە بچێتە خزمەتی تا ئـەو کاتـەی پێغەمبەر(صلی الله علیه واله وسلم) کۆچ ئەکات بۆ مەدینە. سەلمان ئەڵێت: دوای کارەکانم ئێوارە هەنێ شتم هەبوو بردم و چومە خزمەتی پێغەمبەر لە قوبابوو وتم: بیستومە تۆ پیاوچاکی و هەندێ هاوەڵت لەگەڵدایە لێـرە غـەریبن و منـیش شـتێکم لایە بۆ خێر دانراوە ئەبینم زیاتر بە ئێوە ئەشێ.

پێغەمبەر (د.خ) دایە هاوەڵەکانی خۆی هیچی لێنەخوارد که ئەوەم بینـی ووتم ئەمە یەکەم نیشانە ڕاست دەرچوو، ئیتر چـوم و هەنـدێ شـتیترم کـۆکردەوە و تـا هێنام پێغەمبەر گەشتبوە مەدینە، بوم برد وتم تۆم بینـی لـە خێرەکـەت نـەخوارد بۆیە ئەمەیان دیارییە بۆتۆم هێناوە ئەبینم لێی خوارد و هاوەڵەکانیشی بـانگ کـرد لێیانخوارد، لەدڵی خۆمـدا وتم ئـەوە دوەم نیشـانەش وابـو، جـارێکیتر لـە بـەقیعی غەرقەد بوو بۆ بەشداریکردن لە ئەسپەردەکردنی تـەرمی یـەکێك لـە هاوەڵـە کـانی لەگەڵ هاوەڵەکانیدا لەوێ دانیشتبون، سڵاوم لێکردو هەوڵم ئەدا سـەیری ناوشـانی بکــەم دو پارچــەی لەبــەردابوو ئەمویســت ئــەو نیشــانە ببیــنم کــە بۆیــان باسکردبوم،کاتێك پێغەمبەر هەستیکرد لەهـەوڵی ئـەوەدام خـۆی پارچـەکەی سـەر شانی لادا یەکسەر مۆرەکەم بینـی خـۆم پێنـەگیرا کـەوتم بەسـەر دەسـتوپێی دا و ئـەگریام، پێغەمبەر(صـلی الله علیـه والـه وسـلم) داوای لێکـردم هەسـتم و منـیش چیرۆکی خۆمم بۆ گێڕایەوەو پێغەمبەر(صلی الله علیه والـه وسـلم) پـێی خۆشـبوو هاوەڵەکانیشــی ئــەو بەســەرهاتە ببیســتن، لەبــەر کۆیلایــەتی لــە شــەرەفی

بەشداریکردنی بەدرو ئوحد بێبەش بووم، پێغەمبەر فەرموی سەلمان خۆت بکڕەوە منـیش داوای خۆکڕینـەوەمکرد وئـەوەی منـی کڕیبـوو بـە ژیانـەوەی سێسـەد دارخورمـاو چـل هۆقـە ڕازیبـو، پێغەمبـەر بـە موسـوڵمانانی فـەرموو: یارمـەتی هاوەڵەکەتان بدەن، ئیتر هـاوەڵان بـە بیسـت و بەسیو بـە پـانزەو بـەدە نـەمام یارمەتیان ئەدام واتە هەرکـەس بـە پێـی توانـای خـۆی تـا هـەمویم تـەواوکردو لـە ڕیوایەکانیتردا هاتوە کەپێغەمبەریش(صلی الله علیه والـه وسـلم) خـۆی بەدەسـتی پیرۆزی خۆی ناشتونی.

ڕیوایەت زۆرن دەربارەی سەلمانی فارسی خوا لێی رازی بێت.

ئەوەی گرنگە ئێستە ئەوەیە لە هەمو ڕیوایەتەکاندا هیچی وەك ئـەوە نییـە کـە ئەم (وەرگێڕی بێناونیشانە ئەیڵێت و کاتێکیش ئەڵێت لە نێوان زەردەشتی و دینی ئیبراهیم و ئیسلامدا لەیەکچون هەیەو نمونەی نوێژو پـاکی بنەماڵـەی نێرراوەکانـدا ئەهێنێتە ئێمەش ئەڵێن لەوەزیاتریش هەیە ڕۆژوو تۆڵەی کوشتن و بانگخوازیان بـۆ لای خوای تەنها. ئـاخر ئەمانـە بەڵگەیـە لـە یـەك سەرچـاوە بونیـان و ئایەتـەکانی قورئان ئەسەلمێنیٚ و خوا خۆیشی ئەفەرموێت:

إِنَّا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ كَمَا أَوْحَيْنَا إِلَى نُوحٍ وَالنَّبِيِّينَ مِنْ بَعْدِهِ وَأَوْحَيْنَا إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ وَعِيسَى وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَارُونَ وَسُلَيْمَانَ وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُورًا (١٦٣) وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَاهُمْ عَلَيْكَ مِنْ قَبْلُ وَرُسُلًا لَمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تَكْلِيمًا (١٦٤) رُسُلًا مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا (١٦٥) لَكِنِ اللَّهُ يَشْهَدُ بِمَا أَنْزَلَ إِلَيْكَ أَنْزَلَهُ بِعِلْمِهِ وَالْمَلَائِكَةُ يَشْهَدُونَ وَكَفَى بِاللَّهِ شَهِيدًا (١٦٦) إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا وَصَدُّوا عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ قَدْ ضَلُّوا ضَلَالًا بَعِيدًا (١٦٧)

واتە: ئێمە فەرمانی خۆمانمان خستە دڵـت هـەروەك نـوح و پێغەمبـەرانی دوای ئەویشمان وا تێگەیاند خستیشمانە دڵی ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و نـەوەکان و عیسـاو ئـەییوب و یـونس و هـارون و سـولەیمان زەبوریشـمان دا

بەداوود، پێغەمبەرانیتریش کە بۆتۆمـان باسـکردون و ئەوانـەش باسماننـەکردون و خودا خۆیشی موسای دواندوە، هەموویان ترسێنەرو مژدەدەر بوون بۆ ئەوەی ئەو خەڵکە هیچ بەڵگەیەکیان لەلا نەبێ بۆلای خوا، خـودا خـاوەن دەسـەڵاتی کاربزانـە، خودا خۆی ئاگادارەو فریشتەکانیش هـەمویان ئاگـادارن کـە خـوا بەزانسـتی خـۆی ئەمەی بۆ ناردویتە خوار و ئاگاداربونی خوا بەسە، ئەوانەی لەرێگەی خـوا لایانـداو ناهەقییانکرد بێگومان وێل و زۆر سەرگەردانن.

کەواتە" ئەوەی کە کەسـانێکی وەك ئـەم نوسـەرە ئەیانـەوێت بیکەنـە تانـە بـۆ ئیسـلام ئـەوە نیشـانەی ڕاسـتبونی ئیسـلام و پێغەمبەرەکەیـەتی و جگـە لـەوەش ئیسلام ڕۆڵی پاککەرەوە و لادەری خەوش و خاڵی سەر دینەکانی پێشخۆی بینـی، واتە ئەوەی کە کەسانی پشتی پەردە ئەڵێن موحەمەد سودی لەخاڵـە ئیجابیـەکان وەرگرت و وازی لەخاڵە سلبیەکانی ئاینەکانیتر هێنـا، ئـەوە لـە توانـای سـنورداری مرۆڤ بەدەرەو تەنها خوا پێیکردو کەسێکی وەك نەجاشی پاشا لـە قورئانـدا ئـەوە ئەبینێ بۆیە باوەڕ ئەهێنی، ئەم قورئانـە نـاوەڕۆکی پـەڕاوە کۆنەکانیشـی لـە خـۆ گرتوە وە و هەمویان بەڕاس ئەگێڕێ.

لە بنەماکانی باوەڕی ئێمە ئەوەیە باوەڕ بە پەڕاوە پێشوەکان و پەیام هێنەرە پێشوەکان بهێنین و جیاوازی لە نێوانیاندا نەکەین.

کەواتە" هەرچیتان بینی چاك و بەسود بوو لە ئاینەکانیتردا ئـەوە شـوێنەواری پەیامە پێشوەکانە چـونکە وەك خـوا خـۆی فەرمویـەتی: هـیچ شـوێن و میللـەتێك نەبوە بێ هۆشـیدەر بوبێـت (وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ فَمِنْهُمْ مَنْ هَدَى اللَّهُ وَمِنْهُمْ مَنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ الضَّلَالَةُ فَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانْظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ (٣٦)

واتە:لـەناو هـەموو گەلێکـدا پێغەمبـەرێکمان نـاردوە کـە خـوا بپەرسـتن و لـە پەرستنی جگەلەو بەدوربن هەبون ڕێنماییـەکانی خوایـان وەرگـرت و لەناویشـیاندا

هەبوو هەقی وێڵکردن بوو بەسەر زەویدا بگەڕێن بزانن سەرەنجامی ئەوانەچۆن بووە کە پێغەمبەرانیان بەدرۆ زانیوە.

وەرگێڕ لەکۆتایی باسی حەجیشدا دیسان دەرەنجامێکی نەشاز بەباسەکەی ئەهێنێ و ئەڵێت: کەواتە سەرهەڵدانی مەککە وەکو سەنتەری بازرگانی و شارەزابونی عەرەب لە کلتوری گەلانیتر شتێك نەبوە جێگەی سەر سوڕمان بێت ئەوەش بەهۆی هەڵکەوتنی دورگەی عەرەبەوە بوەو شاری مەککەش ڕۆڵی خۆی لەدورگەی عەرەبدا هەبوە، کەواتە حەجکردن بەتەنها سروتێکی عەرەبی و ئاینی نەبووە چونکە ڕواڵەت و خەسڵەتی بازرگانی و هی تریشی لەخۆگرتوە.

وەڵام: ئەو بەڵگانەی کە نوسەر هێنای سەلمانی فارسی و ئاینی مەسیحی ئەوە هیچیان بۆ مەککە نەبوون و ئەبوو بەو پێوەرەی ئەو دەسەڵاتی ئیسلام لە مەککە گەشەی بکردایە، یان بەدرێژایی مێژوو چەندەها شوێن بونەتە سەنتەری بازرگانی و شوێنی گەشتیاری بۆچی لە وشوێنانەشدا هاوشێوەی قورئان و موحەمەد پێغەمبەر(صلى الله عليه واله وسلم) دوبارە نەبوەتەوە؟!پاشان ئەو( هی تریش) ە مەبەستت هەرچی بێت ئەوە بۆ خۆت، چونکە دەرکەوت حەج سروتێکی ئیسلامی و جیهانییەو بۆ بەرژەوەندی مرۆڤایەتیە، ئاماژەی یەکسانی مرۆڤەکانە، پێکەوە ژیان، ئالوگۆڕی ڕۆشنبیری و زانستی، گەورەیی خوا، بەندایەتی بۆ الله بۆ بەدەستهێنانی خێرو خۆشی و ئازادی لە بەکۆیلەبونی کەسیتر، ئەمانەو لەمانە زیاتریش لە سروتی حەجدا بەرجەستە ئەبێت.

## وەرگێڕو ژیانی بەرزەخ

نوسەر بەدوو لاپەڕەو نیو لە ٥٤٧ و ٥٤٨ تا ٥٤٩ ش باس لە بابەتی بەرزەخ ئەکات و ئەم ئەم تێکەڵی و هەڵانەی لای خوارەوە ئەکات:

١ـــ ئـەڵێت: ووشــەی بــەرزەخ بــەرگرە لــەنێوان زیندوبونــەوە و مردنــداو دەقەکانیش باس لە زیندوبونەوەی ناو گۆڕ ئەکەن و ووشەکە دژی ماناکەیەتی!

وەڵام: بەڵێ ووشەی بەرزەخ بە واتای بەرگر دێت بـەڵام لەچی بـەرگرە؟ بـەڵێ مــرۆڤ دوای مردنــی زینــدو ئەکرێتــەوە و باوەهێنــان بــەو زیندوبونــەوە لــە پێویستیەکانی باوەڕی باوەڕمەندەو بابزانین خوای گەورە خۆی دەربارەی بەرزەخ چی ئەفەرموێت لە قورئانـە پارێزراوەکەیـدا: لـە سـورەتی پـیرۆزی (المؤمنـون) دا هاتوە:

حَتَّى إِذَا جَاءَ أَحَدَهُمُ الْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ارْجِعُونِ (٩٩) لَعَلِّي أَعْمَلُ صَالِحًا فِيمَا تَرَكْتُ كَلَّا إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَائِلُهَا وَمِنْ وَرَائِهِمْ بَرْزَخٌ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ (١٠٠) فَإِذَا نُفِخَ فِي الصُّورِ فَلَا أَنْسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَاءَلُونَ (١٠١) فَمَنْ ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ (١٠٢) وَمَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ فَأُولَئِكَ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنْفُسَهُمْ فِي جَهَنَّمَ خَالِدُونَ (١٠٣) تَلْفَحُ وُجُوهَهُمُ النَّارُ وَهُمْ فِيهَا كَالِحُونَ (١٠٤)

واتە: کاتێك کە مردن دێتە سەر یەکێکیان ئەڵێت ئەی خاوەنەکـەم بمگەڕێنـەوە بەڵکو لەوکردەوە چاکانە بکەم کە نەمکردبوو، نەخێر ئەوە تەنها قسەیەکە بۆخۆی ئەیکا و لەمپەر (ڕێگر) لەدوایانـەوە هەیـە تـا ڕۆژی قیامـەت، کاتێـك فـوو بەکەڵڵـە شـاخداکرا ئـیتر نەخزمایـەتی لـە نێوانیانـدا ئـەمێنێ و نەلەیـەك ئەپرسـن، هەرکـە کێشانەکەی سەری هێنا ئەوانـە لـە ڕزگاربوەکـانن و هەرکـەس کێشـانەکەی کـەمی هێنـا ئەوانـە خۆیانیـان دۆڕانـدوە و لـە دۆزەخـدا دەمێننــەوە ئاگردەموچـاویان ئەپروزێنێو لچ و لێویان ئەقرچێنێ.

خوێنەری بەرێز، نوسەری بێئاگا بزانـە" ئـەو لەمپـەرو ڕێگـرە لـە نیـوان مـردوو هاتنەوەی بۆ ژیانی دونیا دانراوە نەك لە نێوان ئەوو زیندوبونەوە چونکە مـرۆڤ بـە مردنی قۆناغی دوەمی ژیانی دەست پێئەکات و ئەو قۆناغەش نێوبڕی نێوان دونیاو قیامەتە، بەگەیشتنی مرۆڤ بەو قۆناغە ئیتر ویست و توانای هەڵبژاردن و کارکردنی لێئەسەنرێ، ئیتر ئەبێت چاوەڕێی بەرهەمی کارەکانی دونیای بکـات و گەڕانـەوەی

بۆ ژیانی دونیـا محاڵـە، لەوێـدا هـەموو کەسـێ بـە یـەقین ئـەگات و بـەهای هـەموو کـاروکردارێکی بـۆ دەرئەکـەوێت، ئـەوەی کـە زۆر حەسـرەتی بـۆ ئـەخوازێ ئـەو کارەچاکانەیە کە ئەم بەشی خۆی لێنەبچراندوە بەمەرجێکیش زۆر ئاسانبوون.

ژیانی بەرزەخ " ژیانێکە بە لێکۆڵینەوە و ئەزمون و زانسـت نازانرێـت و هـەموی لە کارە نادیارەکانەو تەنها ڕێگەی زانینی ئەبێت لـە مـالیکی نادیارەکانـەوە فێـری ببین و بەڵگەی ڕاستی و بونیشی بەستراوە بە سابتبونی ڕاستی و هەقبونی ئەوەی هەواڵەکانی هێناوە، ئەوە موحەمەد پێغەمبـەر (صـلى الله عليـه والـه وسـلم) وەك خۆی لەسەردەمی خۆیدا بە ڕاستگۆی ئەمیندار ناسراوە و لەسـەردەمی ئیستاشـدا دۆست و دوژنی بە ئینسافیش ئەو شایەتییەی بۆ ئەدەن، قورئانیش خۆی شایەتی بۆ ڕاستی خۆی ئەدا و تا ئێستەش لە هەموو بوارەکاندا موعجیزەیـە، ئـەوەتا لـەم وەڵامدانەوانـەدا دەرئەکـەوێت چـۆن بـەپارێزراوی ماوەتـەوە لەگـەڵ ئـەو هـەموو هێزەکۆکراوەدا کە لەدژی بەرپاکراوە.

کەواتە، ووشەی بەرزەخ واتە لەمپەرو ڕێگر لە گەڕانـەوەیان بـۆ دونیـا و ووشـە قورئانییەکەش پڕ بەواتاکەیەتی و ئیتر وەرگێڕو نوسەر یان حاڵی نەبوون یان باڵـە کوتەیانکردوە بۆ دروستکردنی تەپەتۆز لەسەر زانراوەکە ئەگین بگەڕێن بـزانن کـێ دوای دەستپێکردنی ژیانی بەرزەخ گەڕاوەتەوە بۆ ژیانی دونیا مەگەر بەموعجیزەی عیسا پێغەمبەر(سەلامی خوا لە خۆی و دایکی بێت)  ئەویش بە ئیزنی خـوا بـوە و تەنها بۆ ئەوەندەبوە کە پێغەمبەرێتی عیسا بسەلمێنی.

تەنانەت ئەوانەش کەبوە کەسیان ئەوەنـدە نـەژیاون تـا بتـوانن کـارێکی چـاکە بکـەن و بـەرزەخ هـەر لەمپـەر بـوە لـە گەڕانـەوەیان بـۆ ژیـان و کـارکردن و هـیچ دژایەتییەك لە نێوان ووشەو واتاکەیدا نییە و سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە پەڕاوێکی ناردوە هیچ لارییەکی تێدا نییە.

٢ـ ئـەڵێت: هەڵبەتـە ئـەوەی زمـانی عـەرەبی نـەزانێت یـان هـەر ئـاینێکیتری هەبێت سزا ئەدرێت بەڵام ئەگەر موسڵمان بێت و عەرەبی چاك بزانێـت و بەتـەواوی

وەڵامی پرسیارەکان بداتەوە ئەوا گۆڕەکەی بۆ فـراوان ئـەبێت و بەهەشـتی لێـوە ئـەبینێت کەچـی لـەگوتارە ئایینیەکانـدا بەهەشـت لـە ئاسمانەکانـەو بەتـەنها پانتاییەکـەی هێنـدەی پانـایی ئاسمانـەکان و زەوییـە، چـۆن مردویـەکی ئیمانـدار لەگۆڕدا لە ئەفغانستان و مردویەکی تر لەگۆڕدا لە سودان و یان لە مۆریتانیـا و لـە کوردسـتان یـەکێکیتریش لـە هـەر وڵاتێکـیتردا و لـە هەمانکاتـدا یـان لـە چـەند زەمـەنێکی جیـاوازدا دەبیـنین، لـە کاتێکـدا هـەموو دەزانـین کەسـێك دوای مـردن جەستەی چی بەسەر دێت؟!

وەڵام: لێـرەدا کـە ئـەڵێت هەڵبەتـە ئـەوەی کـە زمـانی عـەرەبی نـەزانێت سـزا ئەدرێت ئەوە هەڵەو درۆیەکی زۆر ڕوونە و بۆخۆی ووتویەتی چونکە خـوای گـەورە خوای هەموو نەتەوە و زمانەکانەو ئیسـلامیش ئـاینی هـەموو نەتـەوە و زمانەکانـە (وما ارسلناك الا رحمة للعالمين) و بەرپرسیارێتی و لێپرسینەوەش بـە یەکسـانی بـۆ هەمووانە و هەموو ئایینەکانیتریش هەریەکەیان تاخوا ڕازیبوە بمێنـێ ولـەکاردابێت شوێنکەوتوانیشی لە ڕەزامەندی خوا ئەبن و هەرکاتیش گۆڕی بە ئاینی تـر ئـەبێت شوێنکەوتەی دینی پێشو بەوە ڕازی بێـت و تازەکـە وەرگرێ.ئەگـەر ئـەوە نـەکات ئەوە لە فەرمانی خوا دەرچوە و هەقی سزای هەیە، ئـەم کـارە بـەردەوام بـوە تـا خوا خـۆی بڕیاریـدا کـە ئیسـلام کۆتـا ئایینـە و موحومـەدیش کۆتـا پەیامهێنـەرەو ئەبێت هەموو ئاینمەنـدانیتر پێـڕەوی ئـەم فەرمانـەبن، کەواتـە بـەهاتنی قورئـان و موحەمەد ئیتر شەرعییەتی ئایینە ئاسمانییەکانیتر وەك پێڕەو سڕرانەوە وەك ڕێزو یادو بەشێك لە باوەڕ ئەمێننەوە.

ئەم گۆڕانکارییانەش بەپێی پێویستی و بەرژەوەندی گەل و نەتەوەکان هـاتوە و قورئانیش پێڕەوێکی درێژخایەنە، بەتێپەڕبونی زەمـەن کـۆن نابێـت و لەتوانایـدا هەیە وەڵامی پێویستیەکانی هەمو زەمەنێك بداتەوە، بۆیە پێویست بەهاتنی دین و پەیامهێنەری ترنییە و ئەمەش بەشێکە لە موعجیزەبوونی ئەم قورئانـە، پێڕەوانـی ئایینــەکانیتریش دوای هــاتنی قورئــان و موحەمــەد پێغەمبــەر ئــارەزوی خۆیانــە

هەرچۆنێك لەدین پێڕەو ئەكەن بەڵام خوا لێیان وەرناگرێت چونكە بەپێی بڕیاری ئەو نەكراوەو دینیش بۆ خوایە ئەبێ بەپێی ڕێنمایی ئەو بكرێت.

بەشی دوەمی قسەكانی لەم خاڵەدا زۆرسەیرە گومان لەوە ئەكات كە مردوی شوێنە جیا جیاكان لەیەككاتدا بتوانن بەهەشت ببینن!

ئەڵێی لەم سەردەمەدا ناژی! ؟ یان لەوانەیە ئەمە گومانی ناحەزانی كۆنی قورئان بێت و لەسوچی نوسراوێكی كۆندا ئەمەی بینیبێ و بێبیرلێكردنەوە نقڵی كردبێت! ؟ ئەگین ئەوەی ئالەتە تەكنەلۆژییەكانی ئەم سەردەمە ببینێ زۆر ئەو هەواڵانەی قورئان و فەرمودەی لا ئاسایی ئەبێت، ئەگەر مرۆڤ بتوانێت ئامێرێك دروستبكات دیمەنێكی ئەوپەڕی زەوی بۆ هەموو زەوی بگوێزێتەوە یان دیمەنێكی كەشكەشانی فەلەك بگوێزێتەوە و لەتوانادا هەبێت هەموو سەرزەوی لە شاشەیەكەوە بیبینن بۆ خوای دروستكەری ئەو مرۆڤە ناتوانێت لەوە بەهێزتر دروست بكات؟بینینی بەهەشت بۆ مردوەكان و لەیەككاتدا یان بینینی دۆزەخ لەیەككاتدا بۆ مردوە خراپەكان زۆر ئاساییە و بەتایبەتیش ئەو كاتەی ڕۆح لە قەفەسی لەش ئازاد بوە وبۆی هەیە لێی دەرچێت، بەڕاستی ئەم ئەم گومانەی كەویستی لەسەر ئەو هەواڵە نادیارانەی ئیسلام دروستی بكات كاتەكەی زۆر بەسەرچوو بوو.

٣ـ ئەڵێت: دوای ئەوەی هەموو مرۆڤ (حشر _ كۆ دەكرێنەوە)و بەسەرپردی (ڕێگە _ صراط)دا تێ دەپەڕن و بەرەو ئاوی ڕوباری(كوثر)دەبرێن، كە ئاوەكەی لە (عەبیر) بۆنخۆشترەو لە شیر سپیترە ئەگەر كەسێك هەزار ساڵ لە دۆزەخدا بوبێت و بۆ یەكجار لەو ئاوە بخواتەوە هەرگیز تینووی نابێت؟!كەواتە كەسی دۆزەخی دەچێتە بەهەشت و تەنها بۆ یەكجار ئاو خواردنەوەی لە بەهەشتدا بەسە بۆ ئەوەی هەرگیز تینوی نەبێت كەواتە ئیتر چ پێویست ئەكات ئەو هەموو ڕوبارە لە بەهەشتدا هەبێت؟.

**وەڵام**: بەڵێ هەموو خەڵك كۆدەكرێنەوە بەڵام هەموویان ئەو ڕێگەیە(صراط) نابڕن، بەڵێ ئاوی كەوسەر لەوەش زیاترە كەباستكردوە بەڵام هەمووی لێی ناخۆن و دوای پردەكەش نییە بەڵكو جۆگەی لێهێنراوەتە سەر گۆڕپانی كۆكردنەوەكە، ئەوەی لێی بخوات تینو برسی نابێت تا ئەچێتە بەهەشتەوەو ئەمەش ڕاستی ئەو هەواڵەیە كەنوسەر لێی شێواوە.

خوای گەورە لەكورتترین سورەتی قورئاندا ئەفەرموویێت (إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ (١) فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ (٢) إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الأَبْتَرُ (٣)

واتە: ئێمە كەوسەرمان بەتۆدا كەواتە نوێژ بۆ خاوەنەكەت بكە و قوبانی بكە ئەوەی ناتۆرەت لێئەدات خۆی دوابڕاوە.

كەوسەر بەواتای خێری زۆر دێت و ناویشە بۆ ئاوی بەهەشت كە خوای گەورە جۆگەیەكی لێهێناوەتە گۆڕەپانی كۆبونەوەكە و بەدەست موحەمەد پێغەمبەرە(صلی الله علیه واله وسلم) .

ئاوی كەوسەر بەپێی فەرمودەكان سارد و شیرین و سپییە بەسەر یاقوت و مرواریدا ڕێئەكات و ڕۆخەكانی لە ئاڵتون و زیوە ئەو ئاوە هەكەسێك لێی بخوات تا ئەچێتە بەهەشت تینوی نابێت، ئەمەش فەزڵێكە خوا بەخشیویەتی بە ئیماندارانی ئوممەتی موحەمەد درودی خوای لەسەر بێت، ئەو ئاوە خەڵكی دۆزەخ بۆیان نییە بینۆشن وەك ئەوەی گومانكار لافی لێئەدات و ئەوە بۆ شوێنكەوتەكانی پێغەمبەرە(صلی الله علیه واله وسلم).

ماوەی كۆكردنەوەی خەڵكی و وەرگرتنەوەی تۆماری كردەوەكان و كێشانەی كردەوەكان و لێپرسینەوە و لێپێچینەوە هەمووی ماندوكەرو دژوارەو لەگەڵ ئەمانەشدا خۆر نزیككرابێتەوەو سێبەرێكیش نەبێت، ئەمانە خوای گەورە ئاسانی ئەكات لەسەر ئیمانداران بەهۆی ئاوی كەوسەرو سێبەری عەرشی خوا و مژدەی ناوبەناوی فریشتە ڕوگەشەكان پێیان.

کەواتە" ئەو ئاوە بۆ ئەو ماوەیە و بۆ ئەو کەسانەشـە، ئـیتر ئـەوەی خـوا بـۆی ئامادەکردون لە بەهەشتدا هەر نابڕێتەوە، بە نیسبەت دۆزەخییەکانەوە پەنابەخوا تینوێتی و برسێتی و گەرما و ڕیسواییان بۆ هەیە، لەدونیاشدا وەك لـە ئایەتـەکانی سـورەتی کەوسـەردا هـاتوە ناحـەزان و ناتۆرەلێـدەرانی پێغەمبـەر دوابـڕاو وبێنـاز ئەبن، دەسەیرێکی مێژوو ناوبانگی ناحـەزانی پێغەمبـەر بکـە و سـەیری نـازداری و شۆرەتی پێغەمبەر بکە و پاشان بلّێ خوا ڕاسـتی فـەرموە و ئـەم قورئانـە کـەلامی خوایە بۆیە ئەوەی ئەیفەرموێ وەك خۆی دەرئەچێت.

٤/ ئەلێت: سودی (وانە پێگـوتن: تلقـین) یـان پەنـد دادانـی مـردوو چـییە لـە کاتێکدا دۆزەخیی دۆزەخییـەو بەهەشـتییش بەهەشـتییە؟ یـان ئایـا مـردوو گـوێی پەند دادان و وانە پێگوتنەوەیە دەبێت، یـان لـەو وانـە پێگوتنـەوەوە فێـری ئـەوە دەبێت تاکو بە شێوەیەکی چاك وەڵامی ئـەو دوو فریشـتەیە بداتـەوە، کـە لـە نـاو گۆڕدا پرسیاری لێدەکەن؟!

وەڵام: تەڵقینی مردوو لە کارە داهێنراوەکانە ئەگین پێغەمبـەر (صـلى الله علیـە والە وسلم) خۆی نەیکردوە و ئەو خەڵکەش لەسـەر چـەند حەدیسـێکی لاوازو ئـەم فـەرمودە سـەحیحە ئـەو کارەیـان داهێنـاوە لـە فەرمودەیـەکی سـەحیحدا هـاتوە پێغەمبــەر فەرمویــەتی: (لقنـوا موتـاکم لا إلـه إلا الله) رواه مسـلم والأربعـة.واتــە تــەلقینی مردوەکانتــان بــە لاالــە الا الله بکــەن. مــردوو لێــرەدا ئــەکرێت وەك واتــا حەقیقیەکــەی وەریگــری و ئەشــکرێت وەك واتــای مــەجازی وەریگریــت. بــەواتا حەقیقیەکەی ئەم تەلقینە داهێنراوەیە و بەواتا مەجازییەکەی کاتێکە کـە خـاوەنی کەسەکە لە کاتی سەرەمەرگدا بەتەنگی کۆتا تۆماری کەسەکەیانەوە بن و لەهەوڵی ئەوەدا بن کۆتا وشەی بەبەهاترین وشە بێت.

پێغەمبەریش فەرمویـەتی هەرکەسـێ کۆتـا ووشـەی لاالـە الا الله بێـت ئەچـێتە بەهەشـتەوە، بـەپێی ئـەوەی کـە پێغەمبـەر (صـلى الله علیـە والـە وسـلم) دوای ئەسپەردەکردنی مردوو تەلقینی کەسی نەکردوە وئەوەش سابتە دوای مردن مـرۆڤ

کارکردنی بۆ نییە، نوسەر لەوەدا ڕاستەکات بەمردن بەهەشتی بەهەشتییەو دۆزەخیش دۆزەخییە و هەرکەس کاروکردەوەی خۆی، مەگەر لەو ڕێگا دیاریکراوانەوە نەبێت کە لێی بەجێماوە، کەواتە ئەبێت مردن لەو فەرمودەیەدا سەرە مەرگ بێت نەك مردوی ئەسپەردەکراو، بەپێی ئەزمونەکانیش دەرکەوتوە ئەوەی لەژیانیدا چاکەکار نەبوبێت لەسەرەمەرگیشدا نەیتوانیوە ئەو ووشە پیرۆزە بڵێت بەڵام چاکەکاران و کەسە بەسۆزو بەزەییەکان ئەوانەی لەدونیادا بەپێی ئەو ووشە کاریانکردبێت زۆر بەئاسانی لەسەرە مەرگیشدا کاتێك بەو وشەیە تەلقینکراوە یەکسەر ووتویەتی و پاش شکانی زمانیشی بە پەنجەی شایەتمانی ئەو شایەتییەی داوە و ئەمەش پەند بوە بۆ کەسانی زیندوو یارمەتی و بەزەییە بۆ کەسانێ کە لە ماڵئاوایی دونیادان و بەرەو ژیانێکی نوێ هەنگاو ئەنێن کە ئەو وشە پیرۆزە لە سەروی هەمو ئەو کردەوانەن کە جێگەی قبوڵی ملیکی ئەو ڕۆژانەیە.

٥/ ئەڵێت: لە (النمل:٨٠)دا دەڵێت: (انـك لا تُسـمع المـوتى ولا تُسـمع الصـمَ الدعاء) واتە تۆ ناتوانیت (کەڕ)و مردوو گوێبیستی داواو بانگێشی باوەڕ بکەیت — واتە مردوو، کە مەبەستی لە بێباوەڕە گوێی لە قسە کردن نابێت، هەرچەندە لێرەدا مەبەستی لە کەڕو مردوو مەبەستی لە بێباوەڕە بەڵام ئایەتەکان ئەوەش دەگەیەنن، کە مردوو گوێی لە داواو قسە کردن نابێت کەچی لە ناو گۆڕدا لە دوای ناشتنی مردووەکە قسەی بۆ دەکرێت و پەندی دادەدرێت و گوایە فریشتە دێن قسەی لەگەڵ دەکەن.

وەڵام: لە وەڵامی پێشودا وەڵامی ئەمەیشی تێدایە و بۆیە هێناومە لەبەر ئەوەی ئەو حەقیقەتەش باس بکەم کە قورئان دەریخستوە مردو لەتەك کەڕ گوێبیستی قسە نابن هەروەك چۆن کەسی بێباوەڕ کاتێك تەوەلا ئەبێت و ڕوو لە هەق وەرئەگێڕێ ئەویش وەك ئەو مردو یان وەك ئەو کەڕەی لێدێت و نابیسێت، ئەم چواندنە بۆ ئەوەیە کەسی باوەڕمەند بێهیوا نەبێت کاتێك ئەبینێ ئەو هەموو ئایەتە گەردونییەی کە ئایەتەکانی قورئان ئەسەلمێنێ کەچی هەیە وەك کەڕو

مردوو هیچ نابیسێ و بەهیچ داناچڵەکێ، بابزانێت ئەوانە خۆیان بڕیاریانداوە لە ئاستی قورئان کەڕو بێهەست بن و نەگەڕێنەوە بۆلای.

ئێمەش کاتێك ئەم وەڵامانە ئەدەینەوە ئەزانین لەوانەیە نوسەرو وەرگێڕ لە ئاستیدا وەك مردووبن چونکە پێش وەخت خۆیان زانیویانە قورئان هەقە و کەلامی خوایە و تەنها بۆ خڵەتاندنی هەندێك ئەو نوسینەیان چنیبێت بەڵام بە ئەرکی خۆمانی ئەزانین ڕوی راستی سەراب و تروسکەی کزولاوازو خوڵ لەچاوکردنی ئەو بێهەستانە بۆ خەڵکی خێردار دەربخەین تا شەڕیان لەسەر خۆیان کۆتا بێت، خۆئەگەر لەوانەشبن هێشتا هیوای زیندوبونەوەیان لێئەکرێت ئەوە زۆر خۆشحاڵ ئەبین ئەگەر لە ڕزگاربوانبن.

کەواتە، بەرەی باوەڕمەند بە قورئان هەرگیز بە ژمارەو هەوڵی بێباوەڕان بێهیوا نابن چونکە خوا خۆی بون و هەوڵی ئەوانی بۆ باسکردون و بەرچاویان ڕوناکە.

٦ـ ئەڵێت: هەلبەتە کەلتوری ئایینی داوادەکات کە مرۆڤ هەردەم دەبێت خۆی بە تاوانبار بزانێت و پیرۆزی و بەرزی تەنها بەکەسایەتییە ئایینیەکان بدات و لەبەرانبەر ئەواندا مرۆڤ خۆی بەکەم و نزم و ناپیرۆز بزانێت..

**وەڵام**: لەوانەیە ئەم قسەیە لای قەشە فادی بیروباوەڕەکەی بەو شێوەیە بێت بەڵام لای ئێمەی موسوڵمان باوەڕمان وایە هەوو مرۆڤێك بەشی خۆی هەڵەو تاوان ئەکات و تەنها پەیامبەران لە تاوان پارێزراون و کەس بۆینییە لافی پیرۆزی و بێتاوانی لێبدات، مرۆڤەکان یەکسانن و پلەی دینداری و تەقوا خوا ئەیپێوێ و ئەوەی لە ئێمەوە دیارە کردەوەکانە، داوامان لێکراوە بە دینداری کەسدا هەڵنەدەین و کەسیش بە پیرۆز نەزانین، هەرچەندە سوپاسگوزاری و پێزانین و ئەمەکداری بەرانبەر بەچاکەی خەڵکیش لە ڕەوشتە بەرزەکانی ئاینی ئیسلامن و زیادە ڕۆیشی تێدا ناکەین، ئەوانەی ئەکەونە زیادەڕۆیی لائەدەن وەك ئەوانەی دەربارەی عیسا پەیامبەرو دایکی کەوتنە هەڵەی گەورەوە، نکولی لەوەش ناکەین لە ناو موسوڵمانانیشدا هەندێ کۆمەڵ بەو دەردە چوون.

# ڕێژەیی بوونی حەڵاڵ و حەرام و دیاریکردنی لە لایەن کەسی موحەمەدەوە

لـەژێر ئـەم بابەتـەدا ئەیـەوێت گومـان لەسـەر حـەرامبونی خواردنـەوەی مـەی دروست بکات بە دوو ڕێگە یەکەمیان ئەڵێت: بازرگانیکردن بە مەیەوە کاری گـاورو جولەکەکان بوە و موحەمـەد ویستویسـەتی لـەو ڕێگـەوە ژێرخـانی ئـابوری ئـەوان هەرەس پێبێنێت. بۆ دوەمیشیان ئەڵێت گوایە تاکاتی خیلافـەتی عومـەریش مـەی خوراوەتەوە و عومەر حەرامی کردوە، و ئەڵێت: مەسەلەی حەرامکردنی مـەی بـەو جۆرە نەبوە وەکو باسی دەکەن کە گوایـە هـەمو خـەڵکی لەیەککاتـدا بـە بیسـتنی فـەرمانی قەدەغـەکردنی مـەی یەکسـەر هەرچـی شـەراب و مـەی یـەك هـەیانبوە ڕشتویانەتە کۆڵانەکانی شاری مەککەوە.

لـە پێشیشـەوە ووتویـەتی: شـێوەی خـواردن و هەڵبـژاردنی خـواردن و ئـەو کەسانەی کە لەگەڵیاندا خواردن دەخورێـت پەیوەنـدی بـەخودی کەسـێك خۆیـەوە هەیە و چاکوایە ئاین خۆی نەخاتە ئەو باس و مەسەلانەوە.

بـە شـێوازێکی گاڵتـە پێکردنـەوە لەپـەراوێزدا ئـەڵێت: سـەیرە لـە یـەکێك لـە خوتبەکانی المتولی الشعراویدا باسی ئـەوەی دەکـرد کـە ئـەو گوێدرێـژەی کەسـێك پێی دەچێت بۆ مەی خواردنەوە گوێدرێژەکە پێی ناخۆشە تۆ بۆ ئەو کارە بەکاری دەهێنی !! ئەی ئەگەر ئەو کەسە بە ئامێرێك چو بۆ خواردنەوەی مەی؟.

وەڵام: سەیرە ئەم بێناو نیشانانە زەردەشتی و مـەزدەکی و قەشـەفادی و..لـە هەموو پەڕاوەکانیاندا باسی مەی دەهێننە بەرکار !! ئایا لەبەر ئەوەیە کە دیـاری دەسـتی بێباوەڕەکانـە و ئـەوەیان هەیـە بازرگـانی پێـوە بکـەن !؟؟کەچـی لای موسوڵمانان بێبەهاو یاساغە؟ یان ئەیانەوێت عەقڵی میللەتانی ئیسلامی پێ دۆگما بکـەن و وەك خۆیـان ئـالودەی مـاددە هۆشـبەرەکان بـن؟ یـان هـەر خـوی شەیتانیانگرتوە وئەیانەوێت لەگەڵ خۆیاندا بەنی ئادەمی هەموی ڕاپێچی نـەفرینی

خوایی بکەن و ئەزانن بەزاندنی سنوری قاغەی خوا (حەرامکراوەکان) مرۆڤەکان بەدەردی شەیتان ئەبات لەلایەن خواوە؟.

ئەوەی کە خواردنەوەی ماددە هۆشبەرەکانی یاساغکردووە الله یە نەك پەیامبەر (صلى الله عليه واله وسلم) و خوای گەورەش بە چەند هەنگاوێك مرۆڤەکانی لەو ئالودە بونە ڕزگارکرد وەك لە پەڕاوی (ئاشتینامە وەڵامێك بۆ خوێننامەی زەردەشتی) دا پلەکانمان باسکردوە، هەر ئەو پلەبەندی و داناییە لە حەرامکردنی (مەی) ئەیسەلمێنێ کە قورئان لای خوایەکی داناوە هاتوە بۆ بەرژەوەندی هەموو مرۆڤەکان ئەگین موحەمەدێکی نەخوێندەوار لەکوێ ئەزانێ و چۆن ئەتوانێت بەگژ ئەو هێزە دەرونی و دەرەکیانەدا (ئالودەبوون، بەرژەوەندی گاورو جولەکە، شەیدا بونی ئەو مادە لەلایەن شاعیران و نوسەرانی ئەو سەردەمە) بێەوەو لە ماوەیەکی کورتدا بیکاتە خەبەری کانە بێئەوەی خەرجی بێشمارو دەزگای ڕاگەیاندن و بەندیخانەش بخاتە خزمەتی ئەو کارە وەك ئەوەی سەردەمانێکە دەوڵەتە عیلمانییەکان لەهەستکردنیان بە مەترسی ئەو ماددانە ئەیکەن و نەك هەر بێهودەیە بەڵکو زیادیش ئەکات.

کاتێکیش ئەڵێت: شێوەی خواردن و هەڵبژاردنی خواردن و ئەو کەسانەی کە لەگەڵیاندا خواردن دەخورێت پەیوەندی بەخودی کەسێك خۆیەوە هەیەو چاکوایە ئایین خۆی نەخاتە ئەو باس و مەسەلانەوە.

ئەوە دیارە هیچ ئاگادارنییە لە گرنگی و کاریگەری خۆراك لە بونیاتنانی کەسێتی و تەندروستی مرۆڤ، ئاینی ئیسلام وەك ئاییینەکانیتر نییە و دەخالەت ئەکاتە سەرجۆری خواردن " خواردنی چاك و پاك و بەسود حەڵاڵ ئەکات و خواردنی پیس و خراپ زیانبەخش یاساغ ئەکات، گۆشتی مردارەوەبوو، مەی، ریبا، گۆشتی بەراز، خواردنی خوێنی ڕەوان) لەوانەن کە حەرامکراون و زانستی تازەش ئەوەی سەلماندوە هەریەك لەوانە زیانی گەورەیان هەیە لەسەر کەسێتی و تەندروستی مرۆڤ بۆ نمونە " گۆشتی مردارەوەبوو واتە گۆشتی ئەو گیاندارەی

بـەبیٚ سـەر بڕینێکـی شـەرعی گیـانی لەدەسـت دابێـت خـواردنی لەلایـەن خـواوە حـەرامکراوە و توێژینـەوە زانسـتییەکانیش ئـەڵێن: خـوێن لـەبارترین ناوەنـدە بـۆ گەشەسەندنی میکرۆبی زیانبەخش و کاتێك گیانـدار گیـان لەدەسـت ئـەدات بـەبیٚ سەربڕینێکی شەرعی خوێنەکەی لەلەشیدا ئەمێنێتـەوەو هەندێکیشـی ئەگەڕێتـەوە بۆ سییەکانی لە سییەکانیدا ئەمێنێتەوە و بەماوەیەکی کەم گۆشتەکەش پڕئـەکات لە ماددەی زیانبەخش و لەوێشەوە ئەگوێزرێتەوە بۆ لەشی بخۆرەکەی.

یان سووخۆری (ڕیبا)کە سەرچاوە و بنیاتنەری جیـاوازی چینایەتیە، مـژەری خۆێنی هەژارانە، لەکارخەری زۆرێك لەخەڵکیە.

یان خواردنی ماڵی هەتیوان؟ یان قۆرخکردنی بازار بـۆ بەرژەوەنـدی دەسـتەو تاقمێك؟.

ئەمانەن خوا حـەرامی کـردون و بـوار نـادات خـەڵك ئـارەزوی تێـدا بـەکاربهێنیٚ چونکە هەموئەوانە لە کۆتاییدا بەرژەوەندی دەسـتەیەك لـە خوێنمـژان دەسـتەبەر ئەکات و هەموو خەڵکی و کۆمەڵگەش پێیەوە ئـەناڵێنیٚ ئـیتر چـۆن خـوای خـەڵکی دەخالەت نەکات؟؟

لەوەشدا دەخالەت ئەکات کە باشترین خـوان ئـەو خوانەیـە هـەژارو دەوڵەمەنـد پێکەوە کۆئەکاتەوە، لەگەڵبێباوەڕانیشدا ئەکرێت بخۆین بەمەرجێك خواردنەکە لـە حەرامکراوەکان نەبێت، ئەگـەر ئـەم دەخالەتانـە نەبوایـە دەوڵەمەنـدەکان سـفرەو خوان و دانیشـتنیان لـە هـەژاران جیـا ئـەکردەوە و ئـەوکات کەمئەنـدامان لـەکۆڕو کۆمەڵـدا پەراوێزئـەخران چـونکە ئەوانـەی بـاڵا دەسـت و خـاوەن دارایـین نـاتوانن هەست بە هەست و خواستی کەسانیتر بکەن مەگەر خوای ئـەو کەسـانە هەسـتیان بپارێزێت و خواستیان بهێنێتەدی. ئیتر بۆ خوا دەخالەت نەکات؟؟

وەرگێڕ لـەکۆتایی ئـەم بابەتەشـدا دیسـان باسـی مـەی خواردنـەوە ئەکاتـەوەو خـۆی وەك موجتەهیـدیك لێئـەکات و ئەیـەوێت مـەی خـواردن ئاسـایی بکاتـەوە و ئـەڵێت: مـەی لەبەرئـەوە حـەرامکراوە چـونکە ڕق و دوژمنایـەتی دەخاتـە نـاو

موسوڵمانانەوەو لەیادکردنەوەی خواو نوێژکردن دوریان دەخاتـەوە کەواتـە ئەگـەر خواردنەوەی مەی نەبێتە مایەی دورکەوتنەوە لە نوێژکردن و نەبێتە مایەی ئـاژاوە لەنێوان موسوڵماناندا ئەوکاتە حەرام نابێت.

لەم بابەتەشدا جارێك درۆبـەدەم عومـەری کـوڕی خەتتابـەوە دەکـات و جارێـك نیـوەی فەرمودەیـەکی عومـەر بـە بوختـان ئـەلکێنێ بـە بەبابـەتێکی جیـاوازەوەو جـارێکیش بـە مەبەسـت وشـەی نـەبیز ئـەگۆڕێ بـۆ ووشـەی خـەمر کـە ئـەویش هەردەربارەی ئیمامی عومەرە.

**وەڵام**: حـەرامی مـەی و جۆرەکـانی مـەی هـیچ گومـان هـەڵناگرێت و بـەدەقی ئایەتی قورئانی ئەو حوکمەی بەسەردادراوەو خوا ئەفەرموێت:(يا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنْصَابُ وَالأَزْلامُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ (٩٠) إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ وَعَنِ الصَّلاةِ فَهَلْ أَنْتُمْ مُنْتَهُونَ (٩١) وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَاحْذَرُوا فَإِنْ تَوَلَّيْتُمْ فَاعْلَمُوا أَنَّمَا عَلَى رَسُولِنَا الْبَلاغُ الْمُبِينُ (٩٢)

خـوای گـەورە بـە(رجس) واتـە بـە پـیس و قیـزەون نـاویبردوەو بەفـەرمانی (فـاجتبوه) واتـە دوری لێبگـرن پاشـان هەنـدێ لـە زیانـەکانی ئەخاتـە پێشچـاوی باوەڕداران تادڵنیابن و دوای ئـەوەش ئاگاداریـان ئەکاتـەوە لەسەرپێچـی فـەرمانی خواو پێغەمبەرو هۆشـیاریش ئـەدات کـە پێغەمبـەر تـەنها گەیانـدتی فەرمانـەکانی لەسەرە.

لەهەندێ لە ڕیوایەتەکاندا هاتوە کە ئیمامی عومەر پرسیاری حـوکمێکی شـافی مەی خواردنی لە پێغەمبـەرکردوە و ووتویـەتی: مـەی عـەقڵ و سـامان لـە خـەڵکی زەوت ئەکات. کەواتە ئیمامی عومەر بەسروشتی پاك و بەژیری تیژی خۆی دەرکـی بـەوەکردوە کـە خواردنەوەیـەك بێتـە مایـەی نـەمانی ژیـری و بـەفیرۆدانی سـامان ئەبێت خوا دەربارەی ئایەت بنێرێت و حوکمی یەکلاکەرەوە بدات دەربارەی.

عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێت لە ژیانی پڕپیرۆزییدا ئەوەندە ڕاوەستاوبوە بۆ جێبەجێکردنی ئایەتەکان و لەو بارەدا هیچ نەرمییەکی نەنواندوە بۆیە دوژمنان هەرکات بیانەوێت شەرعییەت بەکارێك بدەن پەنا بۆ ختانکردن ئەبەن بەدەم هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) بەتایبەت ئیمامی عومەر بەڵام لەبەر بونی زانایانی فەرموودەناسی هەموجار هەوڵەکانیان شکستی هێناوە، ئەم کابرایەش کاتێك فەرمودەکان ئەهێنێ بە ئارەزوی خۆی مەقەستکارییان تێدا ئەکات یان ووشەکانی ئەگۆڕێت لەخۆی وایە کەس پێینازانێت و باشیکردوە نازانێت پەتی درۆ هەمیشەکورتەو خەجاڵەتی لەدوایە.

ئەوەی ئیمامی عومەر لەدوای موسوڵمانبونی خواردویەتی سرکەی خورمابوەو کاتێکیش ئاوی تێکردوە دیارە لەبەر تەرکردنەوەی بوەو لەفەرمودەکەشدا پاڵنەری خواردنی بۆ ئەو سرکەیە باسئەکات کە یارمەتیدانییەتی بۆ هەرسکردن، ئەگینا مەی بەئاو تێکردنی نەپاك ئەبێتەوە نەحەلاڵ ئەبێت (خورما و تریێ و جۆ چەندەها بەرهەم و لێدروستکراویان هەیە وەك دۆشاوو سرکە و مەی و و بەوشککراوەیش)

ئەوەی لە بەرهەمی ئەوانە حەرامکراوە ئەوەیە کە هۆشئەبات وەك ئیمامی عومەر دوپاتی کردۆتەوە و باقی بەرهەمەکانیان حەلاڵە.

پاشان لەم درۆیەگەورەتر ئەکات و ئەڵێت: عومەر لەدوای مردنی پێغەمبەر ووتی (كأننا على عهد رسول الله وانا احرمها) عومەر وتی هەروەکو ئەوە وەهایە کە لەسەردەمی پێغەمبەردابین من خواردنەوەی مەی حەرامدەکەم) .

وەڵام: خوێنەری هۆشیار سەیری ڕادەی ناپاکی ئەم بێناونیشانە:

یەکەم: ووشەی (متعتان) ی لە لەسەرەتاوە مقەست لێداوە.

دووەم: ووشەی (كانتا) ی گۆڕیوە بە (كأننا) .

سێیەم: ووشەی (انهى عنهما) ی گۆڕیوە بە(احرمها) لەمەیاندا پێڕەوی مامۆستایەکی خۆیکردوەو درێژەی ووتەکەش ئەمەیە: قال: "متعتان كانتا على

عهد رسول الله صلى الله عليه وسلم أنا أنهى عنهما وأعاقب عليهما: متعة النساء ومتعة الحج" .ئەم سەرە پارچەی کە لە بابەتێکی تەواو جیاواز بە بابەتی مەی خواردنەوە هێناویەتی و واتایەکی تەواو نادروستی لێدەرهێناوە واتای چی ئەگەیەنێت؟؟ کەسێك بتوانێت لەیەك ڕستەدا ئەوەندە گزی بکات چۆن ئەکرێت ئاوا بەبێ هیچ فلتەرێك نوسینەکانی بڵاوبکرێتەوە؟ یان چۆن دەبێت بیری خەڵکی بخرێتە ژێر ڕەحمەتی وەها کەسانێکەوە؟

## وەرگێرو باوەڕ بەقەزاوقەدەر

لەژێر ناونیشانی(ڕایەندەبوون و لێتێگەیشتن ـــ التسير والتفقه) باسی قەدەری خوا لە یازدە خاڵدا ئەکاتە پرسیارو کاتێك خۆی وەڵامی پرسیارەکان نازانێت ئیتر دەست دەکات بە (کەواتە) کانی و بەئارەزوی خۆی دەرەنجام لەو ئاسۆتەمومژاوییە دەردەهێنێت و دیسان دەست دەکاتەوە بەپرسیار ئەمجارە بەبێ خاڵ دیاریکردن، کورتەی باسەکە ئەوەیە تێناگات ئایا مرۆڤ ڕایەندەکراوە لای خواوە یان نا؟و بۆ ئەو مەبەستە واتای هەندێ ئایەت بە ناتەواوی ئەهێنێ . فەرمون ئێوە و چۆنێتی دەرچون لەو گێژاوە (بەویستی خوا) .

١ـ لەنێوان (سبيل الله) و(سنة الله) تێکەڵی ئەکات و لەلایەك ئەڵێت: چۆن دەبێت ڕێگەی خواوەند، یاساو دەستورو سونەتێك بن و لەهەمانکاتیشدا حەزەکانی خواوەند بن و لەنێوان خواوەند و مرۆڤدا هاوبەش و ناکۆك بن لە کاتێکدا هیچ کەسێك یان هیچ شتێك وەکو ئەو نیە ـ ليس كمثله شيء ـ لە خالی دوای ئەو ئەڵێت: ئەگەر ئەو ڕێگەیە بەسەر خودی خواوەنددا سەلمابێت و پیادەکرابێت ئەوا چۆن بۆ مرۆڤ ئەلوێت وەك خواوەند یان پەیغام هاوردەکان بێت لەکاتێکدا بەپێی شرۆڤەکانی دەق مرۆڤ لە توانایدا نیە وەکو فریشتەکان و خواوەند بێت.

وەڵام: سبيل الله و سنة الله جياوازن یەکەمیان ئەو ڕێگەیە کە خوا دیاریکردوە بۆ پێغەمبەرو شوێنکەوتەکانیان، واتە ئەو ڕێڕەوەیە کە خوا پێی ڕازییە بەندەکانی پیادەی بکەن و ڕێگەی گەیشتنە بە ڕەزامەندی خوا، نەك وەك ئەوەی نوسەر بیری لێکردبێتەوە کە گوایە ئەو ڕێگەیە بەسەر خوادا پیادەکرابێت و سەلما بێت پاکو گەورەیی بۆ خوا خۆی خاوەنی هەموو دروستکراوێکە، با لە خوای گەورەی ببیستین بزانین مەبەست بە سبيل الله چییە: وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيلِهِ ذَلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ (١٥٣)

واتە: ئا ئەمەیە ڕیگەگەی من ڕاستە ڕێیە شوێنی بکەون و شوێن ڕێگاکانیتر مەکەون کە پەرتەوازەتان ئەکات لەدوری ڕێگەی خوا ئەمەیە کە ئامۆژگاری ئێوەی پێئەکات بەڵکو خۆپارێزبن.

وَالَّذِينَ آمَنُوا وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ آوَوْا وَنَصَرُوا أُولَئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا لَهُمْ مَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ).

واتە: ئەوانەشی باوەڕیان بەخوا هێناوە و کۆچیانکردوە و لە پێناویخوادا کۆششیانکردوە و ئەوانەش لانەدارو پشتیوانیانکرد ئەوانەن باوەڕداری هەقیقین لێبوردن و ڕۆزی نەبڕاوەیان بۆ هەیە.

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ كَثِيرًا مِنْ الآحْبَارِ وَالرُّهْبَانِ لَيَأْكُلُونَ أَمْوَالَ النَّاسِ بِالْبَاطِلِ وَيَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلَا يُنْفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَبَشِّرْهُمْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ).

واتە: ئەی کەسانێك کە باوەڕدابوون بەڕاستی زۆرێك لە گەورە پیاوانی جولەکە و گاور بخۆری ماڵی خەڵکن بە ناهەق و خەڵکی لە ڕێگەی خوا لائەدەن و ئەوانەش کە ئاڵتون و زیو لە خەزێنە ئەنێن و لەڕێی خوا نایبەخشن مژدەی سزای بەئازاریان بدەرێ

إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِنْ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ).

واتە: خێرو خاکە بۆ هەژاران و نەداران و ئەوانەیەکە کارمەندن لەو بوارەدا و بۆ ئەوانەش دلگیر ئەکرێن و بۆ رزگارکردنی کۆیلە وقەرزارو رێبوارو لە پێناوخوا فەرزێکی خوایە و خوا زۆر زانایە زۆردانایە.

( وَلَا يَأْتَلِ أُولُوا الْفَضْلِ مِنْكُمْ وَالسَّعَةِ أَنْ يُؤْتُوا أُولِي الْقُرْبَى وَالْمَسَاكِينَ وَالْمُهَاجِرِينَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا أَلَا تُحِبُّونَ أَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ)

واتە: با ئەوانەی خاوەن فەزڵن سوێند نەخۆن کە ئیتر بەخزم و نەدارو کۆچەرانی لە پێناو خوا نەبەخشن ئایا حەز ناکەن خوا لێبوردە بێت بۆتان و خوا لێبوردەی بەبەزەییە.

کەواتە: سبیل الله بریتیە لە رێگای راستی خوا ئەو رێگەیەی مرۆ ئەگەیەنێت بە رەزامەندی خوا (کارکردن بە فەرمانەکان و وازهێنان لە بەرگری لێکراوەکان)، کاتێکیش سبیل الله لەگەڵ چاکەکانیتردا باسئەکرێت ئەم تایبەت ئەبێت بە واتای (کۆشش کردن لە پێناو بەرز راگرتنی دینی خوا) .

بەڵام (سنة الله) ئەمەیان هەموو ئەو بنەما جێتوندانە ئەگرێتەوە کە خوا لە بونەوەردا چەسپاندویەتی و بونەوەر لەسەر ئەوە رێئەکات، لێی لانادات، واتە قەدەرە بڕاوەکان کە نوسراون و گۆران و لادان لێیان محاڵە.

بابزانین خوا دەربارەی ئەمەیان چی ئەفەرموێت:

( فَلَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا قالوا آمَنَّا بالله وَحْدَهُ وَكَفَرْنَا بِمَا كُنَّا بِهِ مُشْرِكِينَ فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَانُهُمْ لَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا سُنَّةَ الله التي قَدْ خَلَتْ فِي عِبَادِهِ وَخَسِرَ هُنَالِكَ الكافرون) غافر: ٨٥.٨٤

واتە: کاتێك بەڵای ئێمەیان بینی کە بۆیان دێت ووتیان باوەڕمان بەخوای تەنها هێناو حاشا لەوانە بێت کە ئەمانکرد بە هاوبەشیخوا، پاش بینینی بەڵای ئێمە ناکرێت باوەڕهێنان سودی بۆ ئەوان هەبێت، رێوشوێنی خوا بەو شێوەیە بووە بۆ بەندەکانی و لەوێدا بێباوەران زەرەرمەند بوون.

قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِكُمْ سُنَنٌ فَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانْظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ(١٣٧)

واتە: پێش ئێوە ڕێوشوێن گیراوەتەبەر دەی بەزەویدا بگەڕێن سەیرکەن سەرەنجامی ئەوانە چۆن بووە کە پەیامبەرانیان بەدرۆ زانیوە.

مَا كَانَ عَلَى النَّبِيِّ مِنْ حَرَجٍ فِيمَا فَرَضَ اللَّهُ لَهُ سُنَّةَ اللَّهِ فِي الَّذِينَ خَلَوْا مِنْ قَبْلُ وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ قَدَرًا مَقْدُورًا (٣٨).

واتە: پێغەمبەر هیچ ئیحراج ناکرێت لەسەر ئەوەی کەخوا بۆی فەرزکردوە ئەمەش هەمان ئەو ڕێو شوێنەبوە کە خوا بۆ ئەوانەی پێش ئێوەی داناوە فەرمانی خوا قەدەرێکی بەجێهێنراوە.

وَإِنْ كَادُوا لَيَسْتَفِزُّونَكَ مِنَ الْأَرْضِ لِيُخْرِجُوكَ مِنْهَا وَإِذًا لَا يَلْبَثُونَ خِلَافَكَ إِلَّا قَلِيلًا (٧٦) سُنَّةَ مَنْ قَدْ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِنْ رُسُلِنَا وَلَا تَجِدُ لِسُنَّتِنَا تَحْوِيلًا (٧٧) الاسراءْ

واتە: خەریکبوو لەو سەرزەمینە گێچەڵت پێبگێڕن بۆ ئەوەی لەوێ دەرتکەن گەر وابوایە ئەوانیش هەرکەمێك لەدوای تۆ تیایدا ئەمانەوە، ئەمە پێودانێکە بۆ پێغەمبەرانی پێش تۆش هەروا بوە و نابینی یاسای ئێمە گۆڕانی بەسەردا بێت.

بەو شێوەیە خوای بالاّ دەست ئەم ژیانەی لەسەر چەند یاسایەك ڕێکخستوە ئەو یاسایانە براوەن، خۆلادان لێی محالّە، لە قورئاندا ئاماژەی بەو یاسایانە کردوە کە مرۆڤ ئەتوانێت لە ژیانیدا سودی لێببینێت وەك:( ئەوانەی بەگژ پێغەمبەراندا چونەتەوە توشی سزای بە ئازارو شکستی هاتون، سەرەنجامی کەسی پێنەزان و بێڕیز سوکی و ریسواییە، بەبەخشین ماڵ زیاد ئەکات و بە سوخۆریش ماڵ کەم ئەکات، ئەوەی لەتاوان خۆی بپارێزێت لەگرفت زوو ڕزگاری ئەبێت، ئەوەی چاك بچێنێ چاك ئەدورێتەوە، مردن ئەبێت هەمووی بیچەژێت، یادی خوا ئارامی بەدڵ ئەدات، و..) هەموو ئەمانە و چەندەها یاسای نەگۆڕاوی خوایی لەم بونەوەرەدا هەیە و مرۆڤ پێویستی بە بیرکردنەوە و ڕامان هەیە تا لە سوننەتەکانی خوا بگات، ئەمەش بێگومان سودی هەیە بۆ ئەوەی بزانیت چۆن ئەوەی لەدەستی تۆدایە

بکەیتـە هۆکـار بـۆ هێنـانی خێـرو خۆشـی و خـۆلادان لـەو بـەڵاو ناخۆشـیانەی کـە نوسراون.

کەواتە " لێرەیشەوە لە باوەڕ بون بە قەدەری خێرو شەڕ باشتر حـاڵی ئـەبین و ئەزانین مرۆڤ ئیختیاری سەرەنجامی هەموو کارەکانی ئەکات بەکردنی ئەو کارانـەی ئەبنـە هۆکـار بـۆ دابـەزینی قەدەرەکـە ئـیتر هۆکـارە باشـەکە باشـی لەدوایـەتو خراپەکەش خراپ.

## ئەوەیە جیاوازی نێوان سوننەی خواو سەبیلی خوا

٢/ نازانێت سودی پاڕانەوە و نوێژ و زیکرەکان و تاقیکردنەوە چیە ئەگەر خوا لە ئەزەلەوە بڕیاریداوە و چارەنوسی داواکارانی ڕایەندەکردبێت! !، پرسیار ئەکات ئایا خوا دەیەوێت لە پێناو دەستورو یاساکانی ئـەودا بـژین؟ یـان ڕێگـەی ژیانمـان دەدات ئەگەر چی لەسەر حیسابی تەعالیمەکانیشی بێـت؟، ئایـا بەنسـبەت خـواوە کامیان گرنگترە مرۆڤ یـان ئـاین و تەعالیمـەکانی خـوا؟ کۆتـایی ئـەم پرسـیارانەی دەربارەی قەدەر بە دوو پرسـیاریتر ئـەهێنێ و ئـەڵێ ئایـا ئایینـەکانن کـە نـاتوانن مرۆڤ تێبگەیەنن یان یاساکانی خواوەند ناتوانرێت بزانرێت؟ ئایا مرۆڤ نەزانە و یاسا ئایینییەکانیش بارێکی گرانن بەسەر مرۆڤەوە یان ئێمەی مرۆڤ ناتوانین بـە سـنوری دیاریکراو جێگیر لە یاسا ئایینییەکان تێبگەین؟

**وەڵام**: ئەوەی کە گومان هـەڵناگرێت ئەوەیـە کـە خـوا داوای شـتی بێهـودە لـە کـەس ناکـات و خۆیشـی هـیچ شـتێکی بیهـودە دروسـت نـەکردوە، پاڕانـەوە بـۆ بەدەستهێنانی خواستەکان، نوێژ بۆ ئارامبونەوە و بەهێزبونە لەبەردەم تاوانەکان، زیکرەکانیش بۆ پاکبونـەوە و دەرکردنـی شـەیتان و سـافبونی دەرونـە، هەموئـەو کارە چاکانەش بەجۆرێك بێبەش نین لە بەرهەمی یەکتری، تاقیکردنـەوەکانیش بـۆ دەرخستنی ڕاستگۆیی و دروستی ئەوانەی پێشوە .

خوای گەورە دەستورو یاسای بۆ بەڕێوەبردنی بونەوەر چەسپاندوەو ئەمەیان نەگۆڕە، دەستوری ژیانیشی بۆ مرۆڤەکان ناردوە کە بەپێی سەردەمە جیاوازەکان بۆی گۆڕیون تا گەیشتۆتە سەردەمی کۆتا پەیامبەرو کە دەستورێکی درێژخایەنی تۆکمەی ناردوە و وەلامی هەموو داوا جۆربەجۆرەکان ئەداتەوە و مرۆڤیشی دەستکراوە کردوە بۆ دەرهێنانی یاساکان لەو بنەما دەستوریانەی قورئان لەمەشدا پەیامبەرەکەی کردۆتە سەرمەشقیان.

مرۆڤەکان بەگشتی لەبەردەم وەرگرتن یان وەرنەگرتنی ئەو ڕێڕەوو بەرنامەیەدا ئازادن وەك خوا ئەفەرموێ: إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنْ نُطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا بَصِيرًا (٢) إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ..(الانسان)

واتە: ئێمە مرۆڤمان خەلقکرد لە تنۆکەئاوێکی تێکەڵ و کردیشمان بەبیسەرێکی بینەر، ڕێنمامانکرد بۆ ڕێگە ڕاستەکە یان سوپاسگوزار ئەبێت یان نکولیکار.

وَقُلِ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكُمْ فَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُرْ إِنَّا أَعْتَدْنَا لِلظَّالِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا وَإِنْ يَسْتَغِيثُوا يُغَاثُوا بِمَاءٍ كَالْمُهْلِ يَشْوِي الْوُجُوهَ بِئْسَ الشَّرَابُ وَسَاءَتْ مُرْتَفَقًا (٢٩) إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ مَنْ أَحْسَنَ عَمَلًا (٣٠)الكهف

واتە: بلێ هەموو ڕاستیەکان لای خوایەوەیە هەرکەس ئەیەوێت با باوەڕی پێبهێنێو هەرکەسیش ویستی با کافر بێت، ئێمە ئامادەمانکردوە بۆ ستەمکاران ئاگرێك کە گەمارۆیان ئەدات کاتێکیش هانا ئەبەن ئاوێك بەهانا دێنن وەك ڕۆنی قرچاوە و ڕووەکان ئەبرژێنێ خراپترین خواردنەوە و خراپترین ژینگەیە، ئەوانەش باوەڕدارن و کاری چاکە ئەکەن ئێمە هەرکەسێ چاکە بکات کاری بەزایەناکەین.

کەواتە: خوا ڕێگەی ژیانی ئازادانەی بەمرۆڤەکان داوە و بەرنامەو تەعالیمەکانیشی بۆ بەرژەوەندی ئەوان ناردوە بەلام لە سوننەتە کەونییەکەشدا هەیە:کە ڕازیبون و پیادەکردنی ئەو تەعالیمانە خۆشی و شادی بەدواوەیەو ڕەدکردنەوەیشی پەشیمانی ناخۆشی بەرهەم دێنێ.

بــە پێــی ئایەتــەكان خــوای گــەورە كەســی ڕایەندەنــەكردوەو چارەنوســی هەركەسیشی خستۆتە ئیختیاری كەسەكەخۆی.

ئەوەی كە ڕایەندەكراوەو گۆڕانی نییـە ڕێوشـوێنەكانی بـەڕێوەبردنی بونـەوەرو سـەرەنجامی هەركارێكەكـە مرۆڤـەكان ئەیكـەن، هەرچـەندە لەمـەی دوەمـدا بـە پاڕانەوەو گەڕانەوە گۆڕانكاری بەسەردادێت ئەویش بەویستی خوا.

بۆ نمونە: كەسێك لەگەڵ دایك و باوكی خراپەكارە ئەم كەسـە بـەپێی سـوننەتە كەونییەكە لە منداڵەكانی خۆی چاكە نـابینێ و لـە قیامـەتیش زیـان لـەو كـردەوەی وەرئەگرێت بەڵام ئەگەر پەشیمانی دەربڕی و لەخواپاڕایەوە كە لێی خۆشبێت ئەوا خـوا وەڵامـدەرەوەی داواكانـەو ئاگـادارە بـە قـەرەبوی زیانـەكان، یـان كەسـێك ریوشوێنێكی خراپی لە خواردن گرتۆتەبـەر و ئـەبێت بـەپێی سـوننەتە كەونییەكـە توشی نەخۆشی بێت و كاتێك توشدێت پاڕانەوە و چارەسەر ڕۆڵی خۆی ئـەبێت بـۆ ڕزگـاربون لـەوەی خـۆت بـەخۆتت كـردوە و هێنـانی نـاوی خـوا لەسـەرەتای خۆراكەكانیشـدا لـەزیانی خـۆراك ڕزگـارت ئـەكات، ئـیتر بـەم شـێوەیە... تەنانـەت مردنیش كە شتێكی حەتمییـە ئـەكرێت مـرۆڤ خـۆی ئاسـانی و گرانییەكـەی دیـاری بكـات، زیـادكردنی بەشـەڕۆزی دیـاریكراویش شـتێكی ڕوونـە كـە بەدوركەوتنـەوە لەسـوخۆری و دەركردنـی زەكـات لێـی و دەسـتگیرۆیی هـەژاران زیـاد ئـەكات، پێچەوانەكەیشی پێچەوانەیە.

كەواتە: وەك خوای گەورە ئەفەرموێت: وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَى (١) وَالنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّى (٢) وَمَا خَلَقَ الذَّكَرَ وَالْأُنْثَى (٣) إِنَّ سَعْيَكُمْ لَشَتَّى (٤) فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى (٥) وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى (٦) فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى (٧) وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَى (٨) وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَى (٩) فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَى (١٠)

واتە: سوێند بەو شەوەی كاتێك هەمو شت دادەپۆشێ، بەو ڕۆژەش كە كاتێـك دەردەكەوێت، بەوەش كـە نێـرو مێـی خـەلقكرد، هەوڵـدانتان جیـاوازە، ئەوانـەتان بەخشیان و خۆیانپاراست، بەپاداشتـی هەرەباشـیش بـڕوای هـەبوو، ئـەوا بـۆجێی

حەسانەوە ڕێی بۆ ئاسانئەکەین، بەڵام ئەوەش کە چروکبو و خۆیشی بێنیاز لەقەڵەمدا، پاداشتی هەرەباشی پێدرۆ بوو، ئەوە ڕێگە هەرەدژوارەکەی دەخەینەبەر.

تەعالیمەکانی خوا هەموی ڕونەو تێگەیشتن لێیان ئاسانە بۆ کەسانێك بە نیازی تێگەیشتن ئەیخوێنن، بۆ کەسانێکیش نیازپاك نین و مەرامی چەپەڵیان هەیە ئەکەونە گێژاوێکەوە دەرچون لێی زۆر ئەستەمە، ئەمەش ڕاستی تەعالیمەکانی خوا دەرئەخات کە ئاوێنەی نیازەکانە و نیازی خوێنەرانی ئەخوێنێتەوە !، بۆ وەرگرتنی وەڵامی شیفا بەخشیش پێویست بەڕۆچون و زانستی تەواو هەیە لەهەر باسێکی تایبەتدا.

کەواتە " تەعالیمەکانی ئیسلام بارێکی گران نییە، نەخستنەگەڕی تواناکان و کەمئەزمونی وائەکات هەڵە لە بیروڕاکاندا دروستبێت، یان لە دەروندا نائارامی هەبێت بەرانبەر بە هەر تەعالیمێکی خوایی، ئەوەش بەڵگە نەویستە کەخوا توانای ژیری زۆری بەمرۆڤ بەخشیوە و توانای فێربونی هەموو شتێکی پێداوەو مەودای بیرو ژیری زۆرفراوانە.

لە تەعالیمەکانی خوایە کەمرۆڤ هەمیشە بیریارو پەندگیرو زانا بێت و بەهەق جێنیشتەی سەرزەمین بێت، جێنیشتەیەك لە جوانییەکانی سروشتی دروستکراوەکان سود وەرگرێت بۆ چاککاری و ئاوەدانی ئەمەیە کە خوا ئەفەرموێت: (إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى الْآرْضِ زِينَةً لَهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا)الكهف واتە: ئێمە ئەوەی لەسەر زەوی کردومانە بۆ ڕازاندنەوەو جوانی زەوییە تا تاقیانکەینەوە کامیان چاکترین کارئەکەن.

يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَتْكُمْ مَوْعِظَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ وَشِفَاءٌ لِمَا فِي الصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ (٥٧) قُلْ بِفَضْلِ اللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَلِكَ فَلْيَفْرَحُوا هُوَ خَيْرٌ مِمَّا يَجْمَعُونَ (٥٨)يونس

واتە: ئەی خەڵکینە بێگومان لای پەروەردەکارتانەوە ئامۆژگاریتان بۆ هـاتووەو شـیفا بەخشـە بـۆ ئـەوەی لـە سـینەدایەو مەشـخەڵی ڕێیـە و پڕلـە میهـرە بـۆ باوەڕمەندەکانی، بڵێ با بەفەزڵ و بەزەییەکەی دڵخۆشبن ئـەوە پڕخێرتـرە لـەوەی هەر کۆیئەکەنەوە.

دەرچون لە گێژاوی فیکری و نەمانی گومان و تێگەیشتن لە نادیارەکان فەزڵ و بەزەیی خوایە بۆ بـاوەڕداران، خۆشـترین ژیانـە کـە بڕوامەنـدی ڕاسـتەقینە نـەبێت کەس نەیچەشتوە جگە لەوان هەرخەریکی کۆکردنەوەیە و دەرونی ئـاڵۆزو سـینەی پڕلەدەغەڵ و بیری پڕلە گێـژاوە، خـوا بـەو حاڵەتـەی ڕازی نییـە بـەڵام خـۆی بـە ڕتکردنەوەی تەعالیمەکانی خوا بەسەرخۆیدا هێناوە.

ئـەوە کورتــە وەڵامــی گوشــراوی قســەو پرســیارەکانی نوســەربوو دەربــارەی ڕایەندەبوون و لێتێگەیشتن هیواخوازم سودبەخش بێت بۆ هەموان چـونکە ئەوانـە ئایەتە موحکەمەکان بون دەربـارەی ئـەو باسـە وئـەکرێت هـەموو ئایەتـەکانیتر لـە ژێرڕۆشــنایی ئــەم ئایەتــە موحکەمانــەدا بناســرێتەوە و ڕاڤــەی دروســتی خــۆی وەرگرێت، هەرکەس جگە لەوانە بڵێـت ئـەوا شـوێن موتەشـابیە ئەکـەوێت و ئـەوان ئەکات بە ئەسڵ بۆ باسەکە بۆیە سەر لەبەری دەرناکات و ئەکەوێتە مەتاهەوە.

## ئەقڵی مرۆڤ زادگەی زانین و زانیارییە

١ـ سەرەتا بـەوە دەسـتپێئەکات کـە نازانێـت ئایـا مـرۆڤ بـەڕێزە یـان بیهێـزو بێنرخە ئەڵێ کەسایەتی ئاینگەرا ئەمە ئەڵێن و ئایەتەکانی (وخُلق الانسان ضـعیفا) و (ثم رددناه اسفل سافلین) ئەکاتـە بەڵگـە و دیسـان ئـەڵێت: کەچـی ئاینگـەراکان ئـەڵێن: خواوەنـد ئاسمـان و زەوی و ئەسـتێرەکان و مـانگ و خـۆری لەبـەر مـرۆڤ خولقاندوە. دوای ئەمـەش ئـەڵێت: لـەخودی دەقـی قورئـانی و ڕاڤەکانیـدا بـاس و خواستە ئایینیەکان لەسەر ڕێچکەی پـەیڕەو پرۆگـرام نـین و ئەزمونـەکان بەهەنـد

وەرناگرن، بەڵکو شێوازی (دابینکردن ـ الاقناع) ی بو زۆرەملێ دەگرنەبەرو بە شێوازی فشاری جیاجیاو بە پێی بارودۆخ، گوشاری ڕۆحی و ئەقڵی و دەروونی بەکاردەهێنن و مراوەغەو پێچکردنەوە بە دەوری باسەکاندا مەبەستیانەو وشەکاریش بە مەبەستی پەردەپۆشکردنی ستەمی فیکری و کۆمەڵایەتی بەکاردەهێنن.

پاشان دێت و ڕخنە لە فەرمودەیەك ئەگرێت وئەبێتە بریکارێکی یەهودی و بەرگرییەکی نەزانانە ئەکات لێیان.

**وەلام**: کام ئاینگەرا وتویەتی مرۆڤ بێڕێزە؟! لەگەڵ ئەوەدا ئەگەر ئەو کەسە قورئان خوێنبێت ئەزانێت کە خوا چەندەها جار لە قورئاندا ڕێزلێنانی بۆ مرۆڤ دوپاتکردۆتەوە و فەزڵی ئەمی مرۆڤی داوە بەسەر هەمو دروستکراوەکانیتردا، خوا خۆی فەرمویەتی ئەوەی لەئاسمانەکان و زەویدا هەیە بۆ ئەمی مرۆڤی دەستەمۆو ژێربارکردوە، (وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا (٧٠) الاسراء

واتە: بێگومان ڕێزمان لە بیادەمی گرتوە و لە وشکانی و زەریادا هەڵمانگرتن، ڕۆزی پاکژمان پێداون لەچاو دروستکراوەکانیترماندا زیاتر فەزڵمان پێداون بە قەدری زیاتر.

أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَابٍ مُنِيرٍ (٢٠) لقمان

واتە: ئایا نابینن کەخوا ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەویدایە بۆئێوەی دەستەمۆکردوە و دەرەوە و ناوەوەی بەهرەکانی خۆمان بەسەرتاندا ڕشتوە هەیە لەناو خەڵکیدا دەربارەی خوا بەبێ زانیاری و بەرچاوڕونی وبەبێ پەڕاوێکی ڕۆشنگەرا دەمەدەمێ و موناقەشە ئەکات.

ئایا تەنها ئەو دوو ئایەتە هەموو وەڵامەکان ناداتەوە؟ ئایا ئەوەندە بەس نییە بۆئەوەی مرۆڤەکان بەدەم ژیانی پڕلەڕێزەوە بێپەروایانە بڕۆن؟ ئایا ناکرێت بۆ ئەو ڕێزو فەزڵە پێزان و بەئەمەك بن؟ ئایا ئایەتی دووەم مرۆڤی دەستکراوە نەکردوە هەمو ئاسمانەکان تەی کات و بەناخی زەویدا ڕۆ بچێت؟ ئایا ئەوانەی ئەڵێن وانییە لەوانە نین کە بێزانست و بێبەڵگە دەربارەی خوا قسە ئەکەن؟.

منیش ئەڵێم ئەوانەی کە قسەی کەسانی دور لەدینی ئیسلامیان زاڵکردوەو وایکردوە ئەوان ئاسمانەکان و زەوی تەیکەن و جێنیشتەیی خۆیان بسەلمێنن، ئەوە ئێمەین گەلانی موسوڵمان کە ناتەواوین، نەك قورئان، نازانم بۆ لە هەموو کارێکدا لەم سەردەمەدا ڕۆحی ئاینی ئیسلام لای وولاتە پێشکەوتوەکانە؟ ئایا ئەوان خوێنەری چاکن بۆ هەموو پەڕاوێك و لەئێمە باشتر سودیان لە ئاماژەکانی قورئان وەرگرتوە؟ یان هەر سودیان لە ژیری و پەراوە بینراوەکە (بونەوەر) ی خوا وەرگرتوەو گەیشتون بە بەڕاستگێڕانی پەڕاوە خوێنراوەکە (قورئان)؟ لەوانەیە ئەمەی کۆتایش بێت بەهەرحاڵ مرۆڤ کاتێك خوا دروستیکرد ئامادەیی زۆری پێدا و کائنێکی بەڕێزە لای خوا، ئەم کائنە بەڕێزە بەهێزی ژیری ئەتوانێت بەسەر هەموو بەهێزەکاندا زاڵ بێت لەگەڵ ئەوەشدا وەك لەش و لار لە زۆربەی دروستکراوەکانی خوا لاوازترە.

بەڵێ خوا فەرموویەتی (وخُلِق الانسان ضعيفا) سەرەتا کەخوا خەلقی ئەکات زۆر لاوازو بێدەسەڵاتە خوا گەشەی پێئەکات و پەروەردەی ئەکات تا ئەو مرۆڤە کامڵەی لێدروست ئەبێت، پاشان کەم کەم هەر لە هێزی بڕیەوە تا بازوی و تا ئەژنۆکانی بەرەو لاوازی ئەڕۆنەوە، ئایا ئەمە هەقیقەتی مرۆڤ نییە؟ لەڕیزگرتنی خوایە بۆ مرۆڤ لەکاتی بێهێزی مرۆڤیشدا دڵی دایك و باوکی بۆ پڕ ئەکات لە خۆشەویستی بۆ ئەوەی بەرگەی چاودێریکردن و بەخێوکردنی بگرن و لەبێهێزی دوەمیشدا یان خاوەن بەزەییەکانی کۆمەڵگە یان نەوەکانیان ڕۆڵی

چـاودێریکردنیان لـە ئەسـتۆ ئـەگرن. کـێ هەیـە لەئێمـە لـەکاتی گەنجێتیشـدا لەڕوبەڕوبونەوەی ئازارێکی توندا هەستی بە بێهێزی خۆی نەکردبێت؟

کەواتــە: ئــەوەی خــاڵی بــەهێزە لەمرۆڤــدا ژیــری و ئــیرادەی پــۆڵایی و لەبننەهاتویەتی  نەك لاشەی، ئەو دوو باسەش واتە باسی ڕێز و فـەزڵ و سـەرداری لەگەڵ ئەوەی لاواز بێت لەهەندێ ڕووەوە هیچ دژایەتی و ناکۆکییەك نییە.

کاتێك وەرگێر ئەڵێت: لەخودی دەقـی قورئـانی و ڕاڤەکانیـدا بـاس و خواسـتە ئایینیەکان لەسەر ڕێچکەی پەیڕەو پرۆگرام نین و ئەزمونەکان بەهەنـد وەرنـاگرن، بەڵکو شێوازی (دابینکردن ـ الاقناع) ی بورژۆرەملێ دەگرنەبەرو بەشـێوازی فشـاری جیاجیـاو بـەپێی بـارودۆخ، گوشـاری ڕۆحـی و ئـەقڵی و دەرونـی بـەکاردەهێنن و مراوەغەو پێچکردنەوەبەدەوری باسەکاندا مەبەستیانەو ووشـەکاریش بەمەبەسـتی پەردەپۆشکردنی ستەمی فیکری و کۆمەڵایەتی بەکاردەهێنن.

لەوەڵامیدا ئەڵێین خۆزگـە ئـەم قسـەیە هەرکـەس بیکردایـە وەرگێـر نەیکردایـە چونکە باس و خواستەکانی وەرگێر سەراپای بوختان و درۆو هەڵەیە، ئـەی ئێسـتە ئــەم تۆمەتــە گەورانــە ئەداتــە پــاڵ دەقــەکانی قورئــان بــۆ تــەنها نمونەیــەکی نەهێناوە؟!

لە باسەکانی پێشودا باسی نمونەیەك لە دواندنی قورئانمانکرد بـۆ ژیـری مـرۆڤ لەسورەتی (الواقعة) دا، ئێستەش ئەڵێین ئەوەی ئەو بەگوشاری ڕۆحـی و ئـەقڵی و دەرونی ناوی ئەبات ئەوە گوشار نیە بەڵکونیشانەی ئەوەیە ئەم قورئانە خـاوەن و کردگـاری ئـەقڵ و ڕۆح و دەرون ناردویـەتی بۆیـە توانیویـەتی هەرسـێ لایەنەکـە بدوێنێ، گەردنەکان کـەچ ئـەکات بێئـەوەی سـوپا بخاتـەکار، تـەنها ووشـەیە و لـە پیتــەکانی ســەر زاری خــەڵکیش پێکهــاتوە کەچــی وەك قســەو یاســای خــاوەن ســوپاکانیش نییــە و لەهــەموویان بــەهێزترە، کامــە ســتەمی کۆمەڵایــەتی و کامــە ستەمی فیکری؟ بۆ ناڵێیت ئـەوە؟ تـا وەڵامەکـەی وەرگریـت. خـەڵکی سـتەمدیدە لەژێر زەبرو زەنگدا هەمیشە لەهەوڵی ڕزگاریدان و بەهەر نرخێکیش بوە بەدەسـتی

ئەهێنن ئەی چۆن تەنها ووشە بەبێ لەشکر و دەسەڵات ئەتوانێت ستەم بکات؟ بۆ ئەو خەڵکانە شەیدای بوون و بەرەو ڕوی ئەچن؟ ئایا لەبەر ئەوە نییە کە هەست بە ئازادی ئەکەن لەهەموو جۆرێکی کۆیلایەتی و تەنها خوای خالقیان بەخاوەنی خۆیان ئەناسن؟ ئایا لەبەر ئەوە نییە کە ئاسودەیی کۆمەڵایەتیان لەوێدا دەستەبەر ئەکەن؟ بەڵێ لەبەر هەموئەوانە و لەوانە زیاتریشە.

کاتێکیش وەرگێڕ دێت و ڕخنە لەم فەرمودەیە ئەگرێت (علماء أمتي كأنبياء بني إسرائيل) ئەبێتە بەرگریکارێکی یەهودی و بەرگرییەکی نەزانانە ئەکات لێیان و ئەڵێت: هەروەها گوتەکەی موحەمەد ئەوە دەگەیەنێت کە زانایانی ئاینی (امة) ی موحەمەد لە ئاستی پەیامبەرانی گەلی ئیسرائیلیدان، لەدەرەوەی ئەم باسە قسەکردنی پێغەمبەر بەو ڕیتمە لایەنی نەتەوایەتی تێدایەو عەرەبی بە (امة) گەل و نەتەوە ناوزەدکردوە بەڵام یەهودییەکانی بە (امة) ناوزەد نەکردوە هەرچەندە امە مەبەست لە نەتەوەیەکی ئایینیە بەڵام ناونەهێنانی گەلانیتر بە (امة) لە بەرزگەرایی و نەژادپەرستی بەدەر نییە ئەگەرچی ئەو نەژاد پەرستییە لەدیدێکی ئاینیشەوە بێت ئەوا هەر نەژاد پەرستیە.

ئەمە جگە لەوەی کە زانای ئاینی عەرەبی لە ئاستی پێغەمبەرانی گەلی ئیسرائیلیدا داناوە ئەوەش بۆ خۆی لەگەڵ مەنتیقی ئاینیدا ناگونجێت ت. وەرگێر

وەڵام: ئەوە حەدیس نییە و تەنها قسەیەکە لەسەر زاری خەڵکی، حافیزی عێراقی ئەڵێت: ئەسڵ و سەنەدی نییە، واتە فەرمودەی لاوازە، ئەوەی لەم بارەیەوە هاتبێت و صحیح بێت ئەوەیە (العلماء ورثة الأنبياء) زاناکان میراتگری پێغەمبەرانن، لەگەڵ ئەوەشدا ڕەخنەکانی وەرگێر لەو دەستەواژەیە لەجێی خۆی نییە، چونکە ئوممەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) هەموو ڕەنگ و نەژادەکان لەخۆ ئەگرێت و تەنها عەرەب ناگرێتەوە پاشان بەنی ئیسرائیل بونەتە ئوممەت بۆ زۆرێك لە پێغەمبەران و هەرگیز بە ئوممەتی بەنی ئیسرائیل

ناونەبراون! بەڵکو هەر لە بەنی ئیسرائیل بوون بوونە ئوممەتی موسا پێغەمبەر و هەر لەوان بوو ئوممەتی عیسا پێغەمبەر و بەو شێوەیە.

کەواتە وەرگێڕ جگە لەوەی ویستویەتی لە فەرمودەیەکی کارپێنەکراو و بێئەسڵ و سەنەد ڕێگە خۆشکات بۆ ڕەخنەگرتن لە پێغەمبەری داناو زانا کەچی ڕەخنەکانیشی لە بەڵگەکەی لاوازتربوو، پێغەمبەری ئیسلام پێغەمبەرانی پێش خۆی بە برا کانی خۆی ناوزەد ئەکات و خواش باوەڕ بەهەموو پەیامبەران و جیاوازی نەکردن لە نێوانیان لە بنەماکانی باوەردائەنێ، مەنتیقی ئایینی خواو پێغەمبەر دیاریئەگەن و ئەزانن چی ئەگونجێ و چی ناگونجێ لەگەڵ ئەو مەنتیقەدا نەك کەسێکی وەك وەرگێر کە ناحەزە بەئیسلام و هەموو هەوڵە نەزۆکەکانی خستۆتەگەڕ بۆ شاردنەوەی ڕاستییەکان.

٢ـ لەلاپەڕە (٥٥٥) و دوای ئەوەشدا هەر لەم بابەتەدا ئەم چەند قسانە ئەبڕزکێنێ و ئەڵێت: سروشت بەخودی خۆی کراوە و ئاسان نییە لەبەردەم مرۆڤدا بەڵکو (قاسی ـ دژوارە) بەڵام مرۆڤ لەڕێی دۆزینەوەی پەیوەندیە لەیاساچوەکانی نێوان بونە جیاوازەکانی سروشتی دەوروبەردا ڕۆڵی کارای بینیوە تاکو بۆ خزمەتکردنی خۆی ڕامیان بکات، گەرنا سروشت و سیستم و پەیوەندیە لە یاساچوەکانی سروشت لە پێناو خزمەتی مرۆڤدا ئافەریدە نەکراون، ئاینەکان نەخۆشیەکان بەدەستلێدانی شەیتان یان بە ڕق و تۆڵەی خواوەند وەسفدەکەن، یان هەندێ جاریش بە پێچەوانەیەکی سەر سوڕهێنەرەوە ئاینگەراکان نەخۆشی بە میهرەبانی و یادکردنەوەی خواوەند بۆ بەندەکانی خۆی ڕاڤە دەکەن.

ئەڵێت: لەگوتراوی پێغەمبەردا هاتوە دەڵێت (تداووا فان الله لم یضع داء الا ووضع له دواء) ئاشکرایە دەرمانی ئیسلامیش (بەرزکردنەوە: الرقی) بووە واتە بەرزکردنەوە لەئاست بەچاوەوە بون و برنوتی کردنە لوت و پژماندن و خوێن لێدەرهێنان بەزەرو لەوجۆرە چارەسەرانە. هەروەها دەڵێت (اذا سمعتم بالطاعون بارض فلا تدخلوها، وهذا وقع بارض وانتم فیها فلا تخرجوا منها ـ واتە ئەگەر

بیستان تاعون لەزەویەکدا بڵاوبۆتەوە مەچنە ناویەوە ئەگەر لە زەویەکیشدا بون و تاعەنی لێکەوتەوە لێی دەرمەچن) کاتێك کەوتویەتیلەو زەویە دەرمەچن بەو مەبەستە نەبوە کە نەخۆشیەکە لە ناوچەکانیتردا بڵاو نەبێتەوە بەڵکۆ بەو مەبەستە بوە کەکەسی ڕاکردوە باوەڕی بەقەدەرو مەشسئەتی ئیلاهی نیە.

ئەگەر ئاینگەراکان باس لە تەواوێتی لەخولقاندندا بکەن یان بیانەوێت ناتەواویەکان وەکو بەڵگە لەسەر کارامەیی ئەقڵی ئەزەلی پیشانبدەن ئەوا ئەوکاتە ئێمەش باس لەو پێودانگانە دەکەین کەپێودانگی مرۆیین و ناتەواوی دیاردەو ڕوداومەسەلەکانیان پێڕاڤەدەکەین هەزاران کەموکورتی لەخەلق و دروستبوندا دەخەینەڕوو، کارمەندی مرۆڤ لەوەدایە کەلەڕێی ئەندازەی ڕەچەڵەکی و چاککردنی جینەکانەوە بەچاککردنی توخم و حۆرو بەهەڵبژاردنی نەژادی چاك و چاککردنی سیفاتە بۆماوەییەکان هەڵدەستێت.. وەرگێڕ

**وەڵام**: سروشتێك بەم هەموو یاسا و ڕکوپێکی و گەورەییە بە کۆمەڵەکانی خۆرەکان لە بونەوەردا و ڕێکردنیان لەسەر خولگەی خۆیان بەیاسای تایبەت بەخۆیان، بە بونی وەرگێڕ لە سەر شیاوترین پارچەی بونەوەردا بۆ ژیان، بەکارە وردو هەستیارەکانی ناو میشك و دڵ و شانەکان و خانەکانی لەشی مرۆڤ، بە هاتنە دونیاو لێدەرچونی، شەوو ڕۆژ، نێرومێی هەموو دروستکراوەکان.. ئەمانەو هەربژمێرە بێبڕانەوە.. کێ ئەڵێ بێ خاوەنە؟ کێ ئەڵێ خۆکردە؟ بۆ ئەگەر ئەم سروشتە خۆکردە تەنها یەکجار لەکاردا بوو ئیتر کەس لەپڕ کارێکیتری لەو شێوەی سروشتی نەبینی؟ ئەو قسە ئەوەندە نازانستانەیە تەنها کەسانی زۆر سەرەتایی نەبێت کەس ئەوە ناڵێت چونکە پاش ناسینی گەردون زانینی وردەکاری دروستکراوەکان زانراوە ئەبێت دروستکارێکی داهێنەری بەتوانا ئەم کارانەی بەدیهێنابێت نەك سروشت کە بەکەڕوکوێر ناسراوە.

ئەمەش کە سروشتی ژیان لەبەردەم مرۆڤدا دژوارە ئەوەڕاستە و بەویستی خوایەو ئەگە وانەبوایە ئیتر ئازایەتی مرۆڤ و توانا شاراوەکانی ئەم دروستکراوە

سەرسورهێنەرە چۆن ئەکەوتنە گەڕ؟ خوای گەورە بەئادەمی فەرموو: فَقُلْنَا يَا آدَمُ إِنَّ هَذَا عَدُوٌّ لَكَ وَلِزَوْجِكَ فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ الْجَنَّةِ فَتَشْقَى (١١٧)(طه) واتە بەئادەممان ووت: ئەی ئادەم ئەم شەیتانە دوژمنی خۆت و ژنەکەتە ئاگاداربین لەبەهەشت وەدەرتان نەنێت ئەوکات گرفتار ئەبیت.

هەروەها ئەفەرموێت: (لَقَدْ خَلَقْنَا الإِنْسَانَ فِي كَبَدٍ) مرۆڤمان دروستکرد لە ناو قورسیکاندا، کەواتە: خوا مرۆڤی دروستکردو لەسەر زەوی جێنشینیکرد و ئاسمانەکان و زەوی بۆ دەستەمۆو ژێربارکردوە وەك ماددەی خام، ژیری و ئامادەیی زانستی بەمرۆڤ بەخشیوە ئیتر مرۆڤەکان هەمویان وەك تاك و کۆ ئەوەتان لەژێر چاودێری و تاقیکردنەوەدا و ئازادن چۆن کاری تێدائەکەن، ڕینمایی و نەخشەی کارکردنیشی بۆ ناردون، هەرکەس بەپێی جۆری کارو دروستی کارەکەیشی لەپاشانیش (واتە دوای تەواوبونی دونیایان) نامەی کارەکانیان ئەدرێتەوە دەستیان.

کاتێك وەرگێڕ قسە لەسەر دوو فەرمودەی پێغەمبەر (د.خ) ئەکات و نیازی دڵی پێغەمبەر ئەخوێنێتەوە و شتێك ئەڵێت دەربارەیان کەکەس نەیووتوە و زۆر ناڕاستیشە، ئایا لێرەدا وەرگێڕ خۆی بەچی هاتوەتە پێشچاوو؟.

سەیرکە فەرمودەی (تداوو عباد الله فان الله لم يضع داء الا ووضع له دواء) ئەی بەندەکانی خوا دەرمان بەکاربهێنن چونکە خوا هەر نەخۆشیەکی دانابێ دەرمانیشی بۆ ناردوە.

ئەم فەرمودەیە جگە لەوەی کە ئاماژەیە بۆ ئەوەی پەرە بدرێت بە زانستی دەرمانسازی و ئاماژەیشە بۆ ئەوەی نەخۆشی بێچارەسەر نییە چیتری تێدایە؟ کاتێکیش نەخۆشییەك ئەبێتە کوشندە ئەوە واتای ئەوەیە کەهێشتا چارەسەرەکەی نەدۆزراوەتەوە نەك ئەوەی کە چارەسەری نەبێت.

ئایا ئەم فەرمودە بەڵگە نییە بۆ ئەوەی کە موحەمەد پێغەمبەرە؟ چونکە هەواڵی بەهەقیقەتێکی زانستیداوەو دەرگای زانستی پزیشکی والآ کردوە و ئەو

سەرەکەیشی بینیوە ! . یان ئەو فەرمودەیتر کە دیسان وەرگێڕی بیویژدان ئەیەوێت بەناهەق ڕوە ئیعجازییەکەی داپۆشێت (اذا سمعتم بالطاعون بارض فلا تدخلوها، واذا وقع بارض وانتم فيها فلا تخرجوا منها ـ واتە ئەگەر بیستان تاعون لە زەویەکدا بڵاوبۆتەوە مەچنە ناویەوە ئەگەر لە زەویەکیشدا بون و تاعونی لێکەوتەوە لێی دەرمەچن) ئەمە بۆ زاڵ بوون و کۆنترۆڵکردنی نەخۆشییە درمەکانە و باشترین ڕیوشوێنە کەزانستی تازەش پشتگیری لێئەکات لە پێناو سەلامەتی دانیشتواندا.

پاڕانەوە بۆ چارەسەر دوای بەکارهێنانی دەرمانەو پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه واله وسلم) خۆی موسڵمانانی فێری ئەوانەکردوە، کاتێك نەخۆش دەرمان ئەخوات و ئەشزانێت کە خوایەکی باڵادەست و بەتوانای هەیە، داوای لێئەکات ئەو دەرمانە بەزایە نەچێت و ڕۆڵی خۆی هەبێت، چونکە چەندەها کەس هەن بەخواردنی دەرمانەکانیش چاك نابنەوە، ئێمەی موسڵمان باوەڕمان وایە هەرچیمان بەسەر دێت لە نەخۆشی یان هەرچییەکیتر لە هەڵەی خۆمانە ئایا هەڵەی لە خۆراکی بێت یان لە هەڵسوکەوتێکی دژەوانە لەگەڵ ئەو سروشتەی خوا دایناوە توشبوبین لەوکاتانەدا پەنا بۆخوا ئەبەینەوە پاش گرتنەوەبەری ڕیوشوێنە دروستەکان، بڕواشمان وایە خوا پەشیمانیمان ئەبیستی و پەشیمانیش وەرئەگرێ، یارمەتیدەریشمانە هەرکات داوای یارمەتیمان لێکردو هۆکارەکانیشمان گرتەبەر.

ئەو دەرمانە سەرەتاییانەش کەوەرگێر باسیان ئەکات و چاودائەخات لەو سامانە پزیشکییە زۆرانەی ئاماژەکانی پێغەمبەرو زانایانی پەروەردەکراوی پزیشکایەتی ئیسلامی پێشکەشیانکردوە "ئەوەش دوانیان کە باسمانکرد" کێ ئەیەوێت لەو باسانە شتێك بزانێت باسەیری پەڕاوی (الطب النبوي)ی ئیبنو قەیمی جەوزیە و مێژوی پزیشکایەتی ئیسلامی بکات لە پەراوە مێژوییەکاندا ئەوکات ئەزانێ ئەوەی ئەوانکردویان لەمبارەیەوە هەوڵی بێوچان بووە بۆ بەرەو پێشبردنی

زانستی پزیشکایەتی نەك ئەوەی خەریکی نوشتەو خورافات بووبن وەك وەرگێڕ ئەیەوێت بەزۆر بیگەیەنێ.

بەشی یەکەمی پرسیاری کۆتایی لەبەشی سەرەوەی ئەم وەڵامانەدا هەبوو بەڵام بەشی کۆتاییەکەی کەباس لە کارامەیی مرۆڤ ئەکات ئەوا ئەڵێین: بەڵێ مرۆڤ کارامەیە بەڵام هێشتا نەگەیشتۆتە ئاستی هەموو ئەو ئامادەییانەی کە خوا تیایدا دایناوە ئیتر ئایا دور لەدین بێت یان دیندار هەر ئەو دروستکراوەیە کە خوا پڕی کردوە لە بەهرەی جۆراو جۆر و هەرکات ویستی بەهرەکانی بخاتەکار ئەتوانێ و ئامادەیەو خوا بەڵێنیشی داوە خاوەن زانیارییەکان لەدونیا پلەدارکات ئیتر مەرجی دینداریشی بۆ دانەناوە هەرچەند دینداران خۆیان خاوەن پلەی تایبەتن لای خوا خوا ئەفەرموێت: (يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ)(١١) المجادلة

واتە: الله ئەوانە بەرزئەکاتەوە کە لەناو ئێوەدا باوەڕدارن، ئەوانەش کە خاوەن زانیارین خوا بەوکارانەی ئەیکەن ئاگادارە.

کەواتە: ئەوەی کە وەرگێڕ پێی سەرسامە لە تواناکانی مرۆڤ هێشتاکەمە لە ئاست ئەوەی خوا بە مرۆڤی بەخشیوە لەتواناو ئامادەیی، بەرزبونەوەی زانایانی وولاتە بێدینەکانیش هەر ڕاستی قورئان دەرئەخات کە بەڵێ ئەوە بەڵێنێکی خوایە هاتۆتەدی ئەوان بە عیلم بەسەر موسوڵماناندا پلەدار بوون و ئەگەر موسڵمانان ڕوو بکەنەوە عیلم و پەی بردن بەنهێنییەکانی بونەوەر ئەوکات موسڵمانان پلەداری باوەڕو پلەداری زانستی بەدەست ئەهێننەوەو ئەبێتە نور علی نور (ان شاء الله).

حەز ئەکەم لێرەدا ئاماژەیەکی قورئانی بخەمە پێشچاوی وەرگێڕ و خوێنەران کە هێشتا تەفسیری عەمەلی نەهاتۆتەدی وەواڵە لە نادیارێك ڕۆژێك ئەبێت خەڵکی ئەوە ببینن، خوا لە سورەتی (الشورى)دا ئەفەرموێت: (وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِنْ دَابَّةٍ وَهُوَ عَلَى جَمْعِهِمْ إِذَا يَشَاءُ قَدِيرٌ (٢٩).

واتــە: دروســتکردنی ئاسمانــەکان و زەوی و ئــەوەی لــە هەردوکیانــدا هەیــە لەگیاندار لەنیشـانەکانی خـوان و ئەوخوایـە گـەر بیـەوێت توانـای کۆکردنـەوەیانی هەیە.

کەواتە" بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە لە ئاسمانەکانیشدا گیانداران هـەن و ئـەژین، یەکتر بینین و ئاشنابوون بەیەکتر لەنێوان گیاندارانی سـەرڕوی زەوی و گیانـدارانی ئاسمان محاڵ نییەو ڕێی تێئەچێت، ئەکرێت کاری بۆ بکرێت و هەر کۆمەڵێك دیندار یان بێـدین گـەر کـار بـۆ ئەوەبکـەن لەوانەیـە بەدەسـتی بهێـنن و لەهەمانکاتیشـدا ئەبێتەوە بـە شـایەتییەکیتر لـەو هـەزارەها شـایەتییە لەسـەر پـارێزراوی و ڕاسـتی قورئان و پێغەمبەرێتی موحەمەدی نەخوێندەوار(صلى الله عليه واله وسلم) .

## ئایا خواوەند نیازی بەمرۆڤ هەیە، یان بێنیازە لە مرۆڤ

وەرگێڕ لەم باسەدا تێکەڵیی کردووە لە نێوان ئەوەی ئایاخوا بێنیازە لەخەڵکی وەك خۆی ئەفەرموێت (ان الله غني عن العالمين) و ئەڵێت: کەچی کاتێك سـەرەنج لەدەقـەکانی ووتـاری قورئـانی دەدەیـن دەبیـنین پێچـەوانەی ئـەو گوتارەمـان بـۆ دەردەکەوێت واتـە ئـەوەمان بـۆ دەردەکـەوێت کـە خواوەنـد نیـازی بـەمرۆڤ هەیـە هەرهیچ نەبێت لەبەر ئەوەی هەست بەبونی بکەن.وەرگێر

پاش ئەمە دێتە سەرئەو سەرنجانەی کەنەیداوە چونکە ئەگەر سەرەنجی بدایـە خۆی وەڵامی دەست ئەکەوت، ئەمـەش پاسـاوەکانێتی بـۆ سـەلماندنی قسـەکانی: دانانی سزا لەسەر تاوانەکان، دروستکردنی جن و ئینس بۆ پەرستن، نوێژکردن بـۆ یادکردن، ڕۆژوگـرتن کـە تـەنها بـۆ خـودی خواوەنـدە، وەرگێـڕ دەربـارەی ڕۆژوش حـوکمێکی تـازە ئـەدات کـە گوایـە مەندوبـەو فـەرز نییـەو ئەمـەش دیـارە وەك حوکمەکانی پێشو هەر لە گیرفانی خۆیی و بێ بنەما ئەیلێت، کۆتاییەکەیشـی بـەم گووتە دانراوە کەبەدەم پێغەمبەرەوە (د.خ) دروستکراوە (كنت كنزا مخفيا فـاردت ان اعرف فخلقت الدنيا) ئـەهێنێ و لەمانـەوە ئەگاتـە کەواتەکـەی و ئـەڵێ: کەواتـە

خواوەند بێنیازنییە لەمرۆڤ و پێویستی بەمرۆڤ هەیە تاکو هەست بەخوایەتی ئەو بکەن.

وەڵام: بۆ ڕەواندنەوەی ئەم تاریکییە پێویستە بزانین خوا خۆی چۆن باسی بێنیازی خۆی ئەفەرموێت و وەرگێڕ لە کوێدا لێی تێکچوە:

یەکێك لە ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورە (الغنی)ە و ئەو ناوە واتە: زۆر بێنیاز، لە چەند ئایەتێکی قورئاندا ئەم ناوە هاتوە"بۆ نمونە لەم دو ئایەتەی سورەتەکانی(لقمان و فاطر) و لە لقماندا ئەفەرموێت: (لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ.٢٦) واتە: ئەوەی لەئاسمانەکان و زەویدا هەیە موڵکی خوایە بەڕاستی خوا خۆی بێنیازی ستایشکراوە. ولە سورەتی(الفاطر) یشدا ئەفەرموێت:( يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَنْتُمُ الْفُقَرَاءُ إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ . ١٥) واتە: ئەی خەڵکینە ئێوە نیازتان بەخوا هەیەو خوا خۆی بێنیازو ستایشکراوە.

بەڵێ (الله)کەخاوەنی ئاسمانەکان و زەوی بێت و هەموو مەخلوقەکانیش کاروباریان لای ئەو بێت دیارە بێنیازە لەوەی کە هەمویان لەناوبەرێت یان بیانگۆرێت، هەچی بوێت ئەیکات و کەس ناتوانێت بەرگیری لە فەرمانەکانی بکات. بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر دادپەروەری زۆر خاوەن بەزەییە ڕاستەڕێ بەبەندەکانی ئاشنا ئەکات و ڕێگای چونە بەهەشت و خۆشی تاهەتاییان بۆ ئاسانئەکات بەم شێوەیە: قَوْلٌ مَعْرُوفٌ وَمَغْفِرَةٌ خَيْرٌ مِنْ صَدَقَةٍ يَتْبَعُهَا أَذًى وَاللَّهُ غَنِيٌّ حَلِيمٌ (٢٦٣) زمان شیرینی و لێبوردەییەك لای خوا باشترە لە بەخشینێك ئازاردانی بەدوابێت (مننەتکردن) .

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَنْفِقُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّا أَخْرَجْنَا لَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ وَلَا تَيَمَّمُوا الْخَبِيثَ مِنْهُ تُنْفِقُونَ وَلَسْتُمْ بِآخِذِيهِ إِلَّا أَنْ تُغْمِضُوا فِيهِ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ ٢٦٧ البقرة) ئەی کەسانێك کە باوەڕتان هێناوە لەوماڵە حەڵاڵەی بەدەستتان هێناوە ببەخشن و لەوەش کە لەزەوی بۆ ئێوەمان دەرچاندوە و

نیازمەکەن لە بێبەهاکانی ببەخشن بەشێوەیەك ئەگەر بەخۆتان بدرێت وەریناگرن مەگەر چاوپۆشی بکەن و بزانن کە بەراستی خوا بێنیازو ستایشکراوە.

قَالَ الَّذِي عِنْدَهُ عِلْمٌ مِنَ الْكِتَابِ أَنَا آتِيكَ بِهِ قَبْلَ أَنْ يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ فَلَمَّا رَآهُ مُسْتَقِرًّا عِنْدَهُ قَالَ هَذَا مِنْ فَضْلِ رَبِّي لِيَبْلُوَنِي أَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ وَمَنْ شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ وَمَنْ كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّي غَنِيٌّ كَرِيمٌ (٤٠) النمل. واتە: ئەوەی کە زانیاری لە کتێبەکە هەبوو وتی: من بەچاوتروکانێك عەرشەکەی بەڵقیست بۆ دێنم، کاتێك سولەیمان عەرشەکی بینی لای خۆیەوە دانرابوو ووتی: ئەمە فەزڵی خوایە تا من تاقیکاتەوە ئایا پێزان و سوپاسگوزار ئەبم یان بێئەمەك، هەرکەسێك سوپاسگوزار بێت ئەوا بۆخۆی باشە و هەرکەسێکیش بێئەمەك بێت ئەوا خوا بێنیازو بەخشندەیە.

وَلَقَدْ آتَيْنَا لُقْمَانَ الْحِكْمَةَ أَنِ اشْكُرْ لِلَّهِ وَمَنْ يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ وَمَنْ كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ (١٢) لقمان _ واتە: داناییمان بە لوقمان بەخشیبو سوپاسگوزاری خوابە هەرکەس پێزان بێت ئەوا بۆ خۆیەتی و هەرکەسیش بێئەمەك (کافر) بێت ئەوا بیگومان خوا بێنیاز و ستایشکراوە.

إِنْ تَكْفُرُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنْكُمْ وَلَا يَرْضَى لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ وَإِنْ تَشْكُرُوا يَرْضَهُ لَكُمْ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى ثُمَّ إِلَى رَبِّكُمْ مَرْجِعُكُمْ فَيُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ(٧) الزمر _ئەگەر ئێوە کافربن ئەوە خوا بێنیازە لە ئێوە و بەکوفر ڕازی نییە بۆ بەندەکانی و ئەگەر سوپاسگوزاربن ئەوە خوا پێی ڕازی ئەبێت بۆتان تاوانی کەس بەسەر کەسیتردا مەدەن پاشان ئەگەڕێنەوە بۆلای خاوەنەکەتان و هەواڵی کارەکانتان ئەداتێ و زانایە بەوەی لەناوسییەکاندا ئەگوزەرێ.

أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَأُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ قَبْلُ فَذَاقُوا وَبَالَ أَمْرِهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ (٥) ذَلِكَ بِأَنَّهُ كَانَتْ تَأْتِيهِمْ رُسُلُهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ فَقَالُوا أَبَشَرٌ يَهْدُونَنَا فَكَفَرُوا وَتَوَلَّوْا وَاسْتَغْنَى اللَّهُ وَاللَّهُ غَنِيٌّ حَمِيدٌ (٦)

واتــە: ئایــا هــەواڵی بێباوەڕەكــانی پــێش خۆتــان پێنەگەیشــتوە كــەئۆباڵی كارەكانیــان چەشــت و ســزای بەئازاریشــیان بــۆ هەیــە، چــونكە ئەوانــە كاتێــك نێردراوەكانی خوا پشتئەستور بە بەڵگە ئەهات بۆ لایان بێباوەڕ و تــەوەلا ئــەبوون و خواش لەئەوان بێنیازبوو، خوا زۆر بێنیازی سوپاسگوزارە.

بەم ئایەتە پیرۆزانەدا دەرئەكەوێت خوای گەورە نیــازی بــەهیچ دروســتكراوێكی نییــە، كارەكــانی بەخشــین، بــاوەڕداری، چەســپاندنی ســنورەكان ، پیــزانین و بەئەمەكبون، ئەمانەو هەركارێكی تر كەخوا دایانابێت هەموی لە بەرژەوەندنی مرۆڤ خۆیدایە و پاداشتی دونیایی و قیامــەتی لەســەر وەرئــەگرێت و ئەگــەر هــەر هــەموو خەڵكیش تەوەلا بن و كافرو بێئەمەك بن بە بەخشینە نەبڕاوەكانی خوا ئــەوا تــەنها خۆیان زەرەرمەند ئەبن ئەگین هیچ لەموڵكی خوا كەمناكات.

ئەمەی كەخوای گەورە مرۆڤ و جنۆكەی بۆ پەرستش خەلق كردوە، پەرستشێك كەخۆی لە هەڵگرتنی ئەمانەتی خوا خۆی ئەبینێتەوە. كاتێكیش فریشــتەكان حــەز ئەكەن هۆكاری دوستكردنی ئەم مەخلوقە بۆكارێكی ئاواگەورە بزانن، خوای گەورە ئەفەرمووێت (انی اعلم مالا تعلمون) واتە: ئەوەی ئێوە نایزانن من ئەبزانم .

كەواتە دروستیكردن بــۆ ئــەو كــارە گــەورە، ناشــزانرێ بــۆ ئــەو ئەركــە گــەورە (هەڵگرتنی سپاردەی خوا و كارپێكردنی) بۆ ئەم مەخلوقە گونجا؟؟!، ئەم مرۆڤە سەركەشــە شایســتەی ئــەو بەرپرســیاریەتەیە!!، خــوا لــە كارەكانیــدا پرســیاری لێناكرێت، ئەو نهێنیانەی كە مرۆڤ پێویستی تێناكەوێت بۆ كارەكانی لەسەر زەویدا هەر بەشاراوەیی ماوەو ئەمێنێ مەگەر ڕۆژی گەیشتن بەخوا ئەوانە بزانرێت.

گرنگ ئەوەیە بزانین مــاوەی مانــەوەمان لەســەر زەویــدا دیــاریكراوە، هــەروەك چــۆن ئــەم بونــەوەرەش بۆكــاتێكی دیــاریكراو دانــراوە، ئــەوەی لێــرە ئەیكــەین لەدونیایەكی تــەواو جیــاواز لێــرە وەریئەگرینــەوە، ئــەوەی ئــەم هەواڵــەی پێــداوین هەرچی فەرمووە ڕاست دەرچوە بێگومان ئەم هەواڵەیشی ڕاست دەرئەچێت.

وەرگێر هەروا بەیاسای (دەمە چیت لێ کەمە) ئەڵێ: ڕۆژوو مەندوبە نەك فەرز ئەڵێ ئەمە لەشرۆڤەکاندا هاتووەو ئاماژە بە شرۆڤەی کەسیش ناکات، کەچی خوای گەورە بە دەقی ئایەت ڕۆژوی مانگی ڕەمەزانی فەرزکردووەو هەواڵیشمان ئەداتێ کە ڕۆژوگرتن لە سەر هەموو میللەتانی پێش ئێمەش فەرزکراوە و ئەفەرموێت: يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ (١٨٣) أَيَّامًا مَعْدُودَاتٍ فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ فَمَنْ تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَهُ وَأَنْ تَصُومُوا خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ (١٨٤) شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنْزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ فَمَنْ شَهِدَ مِنْكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ وَمَنْ كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ وَلِتُكْمِلُوا الْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا اللَّهَ عَلَى مَا هَدَاكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ (١٨٥)

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ڕۆژوگرتن لەسەرئێوە نوسراوە هەروەك چۆن لەسەر ئەوانەی پێش ئێوەش نوسرا بوو بەڵکو ئێوە تەقواتان هەبێت، چەند ڕۆژێکی دیاریکراوە هەرکەس نەخۆش بوو یان لەسەفەردا بوو ئەوا لەڕۆژانیتردا بەجێی بهێنێ و ئەوانەش نەتوانن باربۆ خواردنی هەژارێکبدەن هەرکەسیش زیادە خێربکات بۆخۆی باشە گەر ڕۆژوبگرن بۆ ئێوە چاکترە ئەر بزانن، مانگی ڕەمەزان ئەو مانگەیە کە قوئانی تێدا دابەزیوە کە لەقورئاندا ڕێنمونی خەڵکی تێدایە و بەڵگەی هێدایەت و جیاکەرەوەی تێدایە هەرکەس لەئێوە گەیشتە ڕەمەزان با بەڕۆژو بێت و هەرکەسیش نەخۆش بوو یان لەسەفەر بوو ئەوا لە ڕۆژانی داهاتودا بە جێی بگەیەنێ خوا کارئاسانی بۆ ئێوە ئەوێت و نایەوێت بارگرانتانکات، ژمارەی ڕۆژوەکان تەواو بکەن و خوا بەگەورەبگرن لەسەر ئەوەی کەڕێنمونیکردن و بەڵکو سوپاسگوزاربن.

ئەمە حوکمی ڕۆژوگرتنی مانگی ڕەمەزانە و پڕە لە بەرژەوەندی بۆ خودی ڕۆژوگران و لەقیامەتیشدا ئەوەندە پاداشتەکەی زۆرە دیارینەکراوە.

کەواتــە: (اللە) خــاوەنی دروســتکراوەکانەو کاروبــاری هــەموو دروســتکراوەکانیش بەدەستی خۆیەتی، دەستکراوەو بێنیازە، ئەگەر هـەموو مرۆڤایـەتی بچـنە بەهەشـت هیچ لە موڵکی خوا کەمناکات و ئەگەر هەمویشـیان بچـنە دۆزەخ هـیچ لـەموڵکی خـوا زیادناکات، لەگەڵ ئەوەدا زۆر بە بەزەیی و بەخشـندەو میهرەبانـە بـەنرخێکی ئاسـان بەهەشتێکی نەبڕاوەو پڕلە خۆشی و شادییان ئەداتێ، لە تاوانـەکانیان خـۆش ئـەبێت هــەرکات داوای لێخۆشـبونیانکرد، هــەر ئـەرکێکی لەسـەر دانـابن بەرژەوەنـدی ژیـانی دونیای تێدایە کەچی پاداشتی گەورەیشی لەسەر داناوە، زۆر مامەڵەیەکی سـەیرو پـڕ لـە گرنگـی پێـدان و ڕێـزو بەزەییـە، ئەمانـە هـەموی بـۆ؟؟، خـوا ئـەیزانێ و ئێمـەو فریشتەکانیش نایزانین (انی اعلم مالا تعلمون) بـەڵام سـوپاس و پێزانینـی بێشـماری لایەقە.

ئــەوەی لەســەر ئێمەیــە خــوا لــەخۆمان ڕازی بکــەین بــەوەی ئــاوەدانی زەوی بپارێزین، خێری ئاسمانەکان و زەوی لـە بەرژەوەنـدی خـەڵکانی زەوی بـەکاربێنین و لەهەمو ئەوانەشـدا پەیوەنـدی بـەردەواممان بـەخواوە هـەبێت و ڕێنمـایی لـە پـەڕاوە موعجیزەو پارێزراوەکەی وەرگرین، دیارە هیچ کەسێك تا زانسـتی تـەواوو نیازیپـاکی نەبێت نازانێت و ناتوانێت دروستانە لەوپەراوە پاریزراوەتێبگات سوپاس و ستایشـی خوا ئەوەندەی لایەق بەگەورەیی بێسنوریەتی.

١٩ی رەمەزانی ١٤٣٣ /٦ ی ئابی ٢٠١٢

ئامینە صدیق عەزیز

## پێشەکی ئیکرام کەریم

سوپاس بۆ خوای گەورەو میهرەبان،سەلات و سەلامیش لەسەر پێغەمبەری سەروەر، دروودو رەحمەتیش بۆسەر صەحابە بەڕێزەکانی کە بە ئەوپەڕی پاکییەوە قورئانی پیرۆزو فەرموودە شیرینەکانی پێغەمبەریان گواستەوە بۆ دوای خۆیان.

برایانی بەڕێزم لە پرۆژەی تیشك،فەرموویان ئەو دەروازەیەمان بۆ بنێری کە بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە نووسیبووم لەسەر بەرگی کتێبی"ئایا قورئان پارێزراوە"، تا لەگەڵ نووسینێکی بەڕێز ئەندازیار عوسماندا پێکەوە بکرێنە کتێبی دووەم لە زنجیرە وەڵامی کتێبی ئایا قورئان پارێزراوە،منیش پاش ئەوەی کە دەستکارییەکی پێویستم کرد تا بگونجێ لەگەڵ ئەو داوایەداو بۆم ناردن،من وەك خۆم شانازی ئەکەم بەوەی نووسینێکم بکرێتە هاوڕێی نووسینێکی برای بەڕێزو بانگخوازی ناسراو ئەندازیار عوسمان، هیوادارم کە ئەوە کارێکی باش بوو بێت،بۆ زانیاری خوێنەرانی بەڕێزیش برایانی تیشك ئەرکی وەڵامدانەوەی بەشێکی ئەو کتێبەشیان خستووەتە سەرشانی من و ئومێدم وایە خوای زاناو دانا فەربخاتە کاتەکانمان و وەك خۆی ئەیەوێ ئەو کارە ئەنجام بدەین.

ئەم پێشەکییەم بۆ ئەو بەشە نووسیبوو کە بە من سپێردرابوو،بەڵام وا بوو بە نسیبی ئێرەو نۆرەبڕی پێکراو بەدڵنیاییشەوە ئەو کارە باشە کە خوا بڕیاری لەسەرئەدات و رێکیئەخات..

وان الله لهاد الذين امنوا الى صراط مستقيم

٢٠١٢/٤/١٥

# وردەكاری پرۆسەی كۆكردنەوەو نووسینەوەی قورئان بەڵگەیە لەسەر پارێزراوی قورئان

ئەوەی جێگەی یەقین و قەناعەتی هەموو موسڵمانێكە ئەوەیە كە ئەم قورئانە تەنانەت پیتێك چییە لێی نەفەوتاوەو هەمووی وەك چۆن لە ئاسمانەوە دابەزیووەتە سەر پێغەمبەر(صلی الله علیه واله وسلم) ئا بەو شێوەیە هەمووی هەر لە ژیانی خۆیدا نووسراوەتەوەو لە لای صەحابەكان پارێزراوەو بەو پارێزراویە نەوە بەنەوە تا ئەمڕۆ هاتووە، بە دوو بەڵگەی حاشاهەڵنەگر:

## یەكەم: بەڵێنی خوا بۆ پاراستنی قورئان

خوای گەورە كە قورئانی ناردووە بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه و اله وسلم) هەر خۆشی ئەفەرموێت: (إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ) (الحجر: ٩). واتە: بە دڵنیاییەوە ئێمە قورئانمان ناردووەتە خوارەوە و بە دڵنیایشەوە هەر خۆمان پارێزگاری ئەبین، دە كە خوای گەورە وەها وەعدێك بدات بەبێگومان هەلومەرج و هەموو كەرەسەیەكیش بۆ پاراستنی ئەرەخسێنێ وەك:

- عەشقو خۆشەویستی ئەخاتە دڵی خەڵك كە لە هەموو لایەكەوە بكۆشن بۆ ئەوەی لەبەری بكەن و لە سنگیاندا بیپارێزن و نەوە دوای نەوە بە دڵ و بە گیان بیپارێزن.

- هەیبەتو سامی ئەخاتە دڵان كە بێ دەست نوێژ دەستی بۆ نەبەن، سوێندی ناهەقی پێ نەخۆنو بەوپەڕی رێزەوە ناوی بەرن.

- گیانێكی كەمەندكێشی وا ئەدات بەم قورئانە كە هەژموون بەسەر دەروونەكاندا پەیدا بكات و زۆر سادە جیاوازی بكرێت لەگەڵ كتێبی تردا.

- بكۆشن بۆ ئەوەی هەرچی ئاوازی جوان هەیە بیخەنە خزمەتی قورئان تا هەمیشە لەسەر زمانی خەڵكی بێت، ئەوەتا عێراقییەكان بە ئاوازێكو

میصرییەکان بە ئاوازێكو سعودییەکان بە ئاوازێكو ولآتانی رۆژئاوای عەرەبی بە ئاوازێك و هەتا دونیا دونیایە قورئان بەردەوام لە دڵو مێشكو سنگەکاندا حزوری هەیەو مایەی شانازیو پشووی دەرونیشەو لە چاپخانەو بەردەستی نووسەرانیشدا بە هەمان شێوە حزوری هەیەو خزمەتی دێرو لاپەڕەو رازاندنەوەی پەڕەکانی ئەکرێت، کە ئەوانە هەموو تەنیا عیشق و هیدایەتێکی خواییەو هیچی تر.

ـ وایان لێدەکات هەریەکەو لە گۆشەیەکەوە بکەونە دەرهێنانی نهێنییەکانی ئەم قورئانە، ئەم ئیعجازی لێدەربهێنێت و ئەو سیستەمەکانی ژیان و ئەو سیستمی حوکم و ئەویتر خەمی چاپی جوان و پوخت و ئەوانی تر لە خولیای قیرائات و ئەحکام و بنەماکانی زانست و پەروەردەو....لێدەربهێنێت و ئەو کارانەش بە جیهادو تێکۆشان لە قەڵەم بدات و ماندووبوون لەو پێناوەدا نەزانێت...

بەڵێ خوای گەورە پاراستنی کتێبەکانی تری پێغەمبەرانی پێشووی سپارد بە خەڵکەکە خۆی بە تایبەتی زاناکانیان، ئەوەبوو ئەوان نەیانتوانی بیپارێزنو خەڵکی لەبەر (کەمدینی) یان یان لەبەر (نەفامی)یان پڕیان کرد لە ئەفسانەو قسەی نارەواو لادان، وەك ئەفەرموێ:

﴿ مِنَ الَّذِينَ هِادُواْ سَمَّاعُونَ لِلْكَذِبِ سَمَّاعُونَ لِقَوْمٍ آخَرِينَ لَمْ يَأْتُوكَ يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ مِن بَعْدِ مَوَاضِعِهِ يَقُولُونَ إِنْ أُوتِيتُمْ هَـذَا فَخُذُوهُ وَإِن لَّمْ تُؤْتَوْهُ فَاحْذَرُواْ وَمَن يُرِدِ اللّهُ فِتْنَتَهُ فَلَن تَمْلِكَ لَهُ مِنَ اللّهِ شَيْئاً أُوْلَـئِكَ الَّذِينَ لَمْ يُرِدِ اللّهُ أَن يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمْ لَهُمْ فِي الدُّنْيَا خِزْيٌ وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ * سَمَّاعُونَ لِلْكَذِبِ أَكَّالُونَ لِلسُّحْتِ فَإِن جَآؤُوكَ فَاحْكُم بَيْنَهُم أَوْ أَعْرِضْ عَنْهُمْ وَإِن تُعْرِضْ عَنْهُمْ فَلَن يَضُرُّوكَ شَيْئاً وَإِنْ حَكَمْتَ فَاحْكُم بَيْنَهُمْ بِالْقِسْطِ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾ (المائدة : ٤١ـ ٤٢).

پاش یەك دوو ئایەتی تر ئەفەرموێت: ﴿لِلَّذِينَ هَادُواْ وَالرَّبَّانِيُّونَ وَالأَحْبَارُ بِمَا اسْتُحْفِظُواْ مِن كِتَابِ اللّهِ وَكَانُواْ عَلَيْهِ شُهَدَاء﴾ (المائدة: ٤٤). واتە: ئەی پێغەمبەری خوا بەوە دڵگران مەبە کە لەناو جولەکەکانیشدا هەن هەمیشە گوێ بۆ درۆو دەلەسە ئەگرنو بەردەوام گوێیان شلکردووە بۆ خەڵکانێکی تر کە هێشتا

نەهاتوونەتە لاتو خەریکی لادانو گۆڕینی قسەنو لە مەبەستی خۆی لای ئـەدەن، ئەڵێن: (ئەگەر چوونە لای موحەممەدو ئاوەهاو ئاوەهـا بڕیـاری بـۆ دان ئـەوە لێـی وەربگرنو ئەگەر واشی پێنەوتن ئەوە خۆتانی لێ بپارێزن،[١] جا ئەگەر خـوا بیـەوێ سەر لەیەکێ بشێوێنێ ئـەوە تـۆ نـاتوانی هـیچ شـتێکی بـۆ پەیـدا بکـەی لـە رووی خوادا، ئەوانە ئەو کەسانەن کە خوا نایەوێ دڵیـان پاڵفتـە ببێـت، لـە دونیـا هـەر سەرشۆڕییان بۆ ئەمێنێتەوەو لە ئاخیرەتیشدا سزایەکی گـەورەیان بـۆ هەیـە، زۆر زۆر گوێ ئەگرن بۆ درۆو دەلەسەو بەردەوام خـەریکی مـاڵی حـەرام خـواردنن (کـە بـەرتیلو سـووخواردن خـووی هەمیشـەییانە)... پـاش ئـەوە ئەفـەرموێ: "ئـەو جولەکانەو پیاوە خواناسەکانیان و زاناکانیان ئەرکی سەرشـانیان بـوو کـە کتـێبی خوا بپارێزنو لەسەر ئەوەش شایەت بوون... "

بەهەر حاڵ شوێنی مەبەستمان لە ئایەتەکەدا وشەی (اسْتُحْفِظُواْ)ە[٢]، کـە مانـای ئەوەیە داوایان لێ کراوە خۆیان کتێبەکـەیان بپـارێزن، کەچـی ئـەوان نـەیانتوانی بیپـارێزنو پڕبـوو لـە (لادان)و (قسـەی خولقـاو)... بـەڵام خـوای گـەورە ئـەرکی پاراسـتنی (قورئـان)ی نەخسـتۆتە سەرشـانی پێغەمبەر(صـلی الله علیـه والـه وسلم)یان(صەحابە)(رەزای خوایان لێبێت)، یان جگە لـەوان، بـەڵکو ئەفـەرموێ: (ئێمە خۆمان ئـەیپارێزین)، کـە خـوای گـەورەش وادەی وابـدات ئـیتر سروشـتییە هەرچی کەرەسە هەیە بـۆی فەراهـەم بهێنـێ.. بـۆ نمونـە وەك زانایـان بـە کـورتی

[١] زانایان ئەڵێن:"ئەوە گەمەیەکە لە گەمەکانی جولەکە بە تەورات، ئەگەر دەوڵەمەندێك لەناویاندا خراپەیەکی بکردایە و حوکمەکەی لە تەوراتدا قورس بوایە، ئەحبارەکانیان بەرتیلێکی باشیان وەرئەگرتو ئەیانوت: برۆ بۆ لای موحەممەد جا ئەگەر حوکمێکی بەم شێوەیە (شتێکیان ئەوت) سوکی پێ وتی ئەوە لێی وەربگرەو شوێنی بکەوەو ئەگەر واشی نەکرد ئەوە لێی دووربکەوەرەوەو ئاگاداربە لێی". (ص١١٤، المفردات، محمد الحمصی). تەفسیری ئەو ئایەتەی سەرەوە.

[٢] لە زمانی عەرەبیدا هەر وشەیەك (ئەلفو سینو تائی) بچێتە سەر مانای (طلب)ی تێدا دروست ئەبێ، وەك (أستغفر الله)، یان (استودع الله)، یان (استعمرکم فیها) سەیری (المنجد، المقدمە)، بابەتی (استفعل) بکە.

ریزبەندی ئەو کەرەستانە ئەکەن کە خوای گەورە ئەم قورئانەی پێپاراستووە، ئەفەرموون:

یەکەم:خوای گەورە سنگی پێغەمبەری (صلى الله عليه واله وسلم) سازو ئامادەکرد کە ئەم قورئانەی تێدا نەخش ببێت وەك نەخش لەسەر بەردێکی موبارەك بەرادەیەك کە هەرگیز لەبیرینەچێت وەك ئەفەرموێ:(سنقرئك فلا تنسى)ئێمە پێتی ئەخوێنینەوەو نایەڵین لەبیریشت بچێتەوە.[٣]

دووهەم:خوای گەورە بەردەوام جوبەرئیلی ئەنارد بۆ ئەوەی (مودارەسە)ی قورئان بکات لەگەڵ پێغەمبەردا .

سێیەم: پێغەمبەریش (صلى الله عليه واله وسلم) بەسەر ئەصحابەکانیدا ئەیخوێندەوەو پێی لەبەر ئەکردنو بەدواداچوونی ئەکردو زۆر هانی ئەدان کە زۆر زۆر ئەم قورئانە بخوێنن، جوان بیخوێننەوە، بە خەڵکی بڵێنەوە، کاری پێ بکەن، زۆری لەبەر بکەن...ئەوەتا دەیان و بگرە لە سەدان فەرمودەدا عەشقی ئەم قورئانە لە دڵاندا ئەچێنێ.. بۆ نموونە ئەفەرموێ:

خوا فەرموویەتی: "من شغله القرآن وذكرى عن مسألتي أعطيته أفضل ما اعطي السائلين". واتە: هەرکەس قورئان و یادی من سەرقاڵی بکاتو نەیپەرژێ داوای شتم لێ بکات لەوانە شتی چاکتری ئەدەمێ کە داوام لێدەکەن.

- پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) ئەفەرموێ: "إن الله يرفع بهذا الكتاب أقواما ويضع به آخرين" رواه مسلم. واتە: خوای گەورە بە هۆی ئەم قورئانەوە چەندان میللەت هەیە بەرزو بە حورمەتیان ئەکاتو هەر بە هۆی ئەم قورئانەشەوە چەندان میللەت سوکو بێ حورمەت ئەکات.

---

[٣] هەندێ کە عەرەبی نازانن ئەڵێن(لا تنسى)یانی: لەبیرت نەچێ! واتە:"لا"یەکە بە"لا"ی ناهییە مانا ئەکەن! لەکاتێکدا کە ئەو"لا"یە"لا"ی نافییەیە نەك "لا"ی ناهییە..ئەگەر بە "مەبنی للمعلوم" بیخوێنیتەوە ئەوە یانی: لەبیری تۆ ناچێتەوە،ئەگەر بە "مەبنی للمجهول" بخوێنرێتەوە ئەوە یانی: ئەم قورئانە هەرگیز لەبیرناچێتەوە..

ـ پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) ئەفەرموێ: "خيركم من تعلم للقرآن وعلمه". رواه البخاري.

ـ پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) ئەفەرموێ: "الذي يقرأ القرآن وهو ماهر به مع السفرة الكرام البررة، والذي يقرأ القرآن ويتتعتع فيه وهو عليه شاق له أجران" متفق عليه.

ـ پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) ئەفەرموێ: "من قرأ حرفا من كتاب الله فله حسنة، والحسنة بعشر أمثالها لا أقول (الم) حرف، ولكن (الف) حرف، و(لام) حرف و(ميم) حرف". رواه الترميذي.

ـ پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) ئەفەرموێ: "إن الذي ليس في جوفه شيء من القرآن كالبيت الخرب" الترمذي.

ـ پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) ئەفەرموێ: "من قرأ القرآن وعمل بما فيه، البس الله والديه تاجا يوم القيامة ضوءه أحسن من ضوء الشمس في بيوت الدنيا فما ظنكم بالذي عمل بهذا"[٤]. رواه أبوداود.

ـ پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) ئەفەرموێ: " ما أَذِنَ اللّهُ لشيءٍ ماأذن لنبي حسن الصوت يتغنى بالقرآن يجهر به" متفق عليه.

ـ مەدحی ئەبوموسای ئەشعەری دەکات کە بە دەنگێکی خۆش قورئان ئەخوێنیو ئەفەرموێ: "لقد أوتيت مزمارا من مزامير آل داود" متفق عليه.[٥]

بەڵێ، ئەو فەرمودانە وای کرد صەحابە بەدڵو بە گیان بکەونە قورئان لەبەرکردنو قورئان نووسینەوەو خۆیەکلاکردنەوە بۆ دیراسەکردنی و خۆبەختکردن لە پێناویدا.

---

[٤] التبيان، النووی، پەراوێزی تفسير الجلالين. ص٥٠٤.

[٥] هەموو ئەو فەرمودانەی رابوورد لە کتێبی (رياض الصالحين)ی ئیمامی نەوەوی وەرگیراونو هەموو فەرموودەی "صحيح"، یان "حسن"ن. جگە فەرمودەی یەکەمیان نەبێت کە لە کتێبی (المدخل الى فقه القرآن، فرج توفيق) وەرگیراوەو ئەو دەڵێ: تیرمیزی ریوایەتی کردووە و "زەهەبی" دەڵێ: (حسن)ە، بەڵام (قسطلاني)٥ ئەفەرموێ ریوایەتەکە ئەفەرموێ: (من شغله القرآن عن ذكري وعن مسألتي..).

چوارەم: ئەم کتێبە پیرۆزەی خوا تەنیا بە نووسین نەپارێزراوە بەڵکو بە دەنگ و بە رەنگیش، یانی هەمووی بە دەنگەوە وەرگیراوەو پاشان نووسراوەتەوە، کە ئەمە بۆ هیچ کتێبێکی تر نەرەخساوە، نە کتێبە ئاسمانیەکان و نە کتێبە زەمینییەکانیش، بۆیە ئەوەی کە هیچ گومانی تێدا نییە ئەوەیە کە رێگەی وەرگرتنی ئەم قورئانە بەبەردەوام بریتی بووە لە وەرگرتنی بە گوێ پاشان نوویسینەوەی بەدەست، وەك زانایان سەلماندوویانەو ئەڵێن: ئەم قورئانە بە دەنگەکانیەوە وەرگیراوەو نووسراوەتەوە:

– بەدەنگەوە پێغەمبەر(صلی الله علیه و اله وسلم)لە جوبرەئیلی وەرگرتووە.

– نووسەرانی نیگا سەرەتاو هەموو موسڵمانی تریش لە پاشاندا بەدەنگەوە لە پێغەمبەری خوایان وەرگرتووە(صلی الله علیه و اله وسلم).

– هەموو موسڵمانانی تر بەدەنگەوە لە نووسەرانی نیگاوە وەریانگرتووە.

– ئێستاش ئەم قورئانە هەر بە دەنگەکەیەوە لە مامۆستایانی شارەزاو پسپۆڕ وەردەگیرێت لە لایەن هەموو تاکێکی موسڵمانەوە.

ئەمە بناغەو بنەمایە لە گواستنەوەی قورئاندا نەوە بە نەوە، لەو کاتەی کە قورئان هاتووەتە خوارەوە تا ئەم ساتەو تا قیامەتیش دێت، هەردەبێت ئەوەی قورئان وەردەگرێت و ئەوەی قورئان ئەگەیەنێت،.

بناغە لە گواستنەوەی قورئاندا بریتی نەبووە لە نووسینەوەی و نووسینەوەش نابێتە بناغە بۆ گواستنەوەی قورئان، چونکە قورئان پێویستە بە دەنگەوە وەربگیرێت و هۆشی بدرێتێ پێش ئەوەی کە لە قورئانەکەدا بخوێنرێتەوە،تاهەتایەش قورئانخوێن پێویستی زۆری بەوە ئەبێت کە لای مامۆستای شارەزاو قورئانخوێن قورئان بەدەنگەکەیەوە وەربگرێت،چونکە لە قورئاندا وشەو دەربڕینی وا هەیە کە ئەستەمە کەس بتوانێ خۆی بەتەنیا لە قورئاندا بەراستی و دروستی بیخوێنێتەوە، با ئەو کەسە چەندین رۆژو چەندین مانگیش خۆی پێوە خەریك بکات...)!!٦.

---

[٦] المفصل في الرد على شبهات أعداء الإسلام جمع وإعداد الباحث في القرآن والسنة، علي بن نايف الشحود،(٧٣/٥).

بەڵگەش لەسەر ئەم راستییە ئەو فەرموودانەیە کە باس لە وردەکارییەکانی نووسینەوەو گواستنەوەی قورئان ئەکەن،وەك فەرموودەکەی زەیدی کوڕی سابیت کە ئەفەرموێ:(كنت اكتب الوحي عند رسول الله (صلى الله عليه واله وسلم) وهو يملي علي، فاذا فرغت، قال: اقرأه، فاقرأه، فان كان فيه سقط أقامه)٧.من لە خزمەتی پێغەمبەردا(صلى الله عليه واله وسلم)نیگام ئەنووسییەوە و ئەو بۆی ئەخوێندمەوە،کە لێئەبوومەوە،ئەیفەرموو:بیخوێنەرەوە!منیش ئەمخوێندەوە،جا ئەگەر هەڵەیەکی تیابوایە راستی ئەکردەوە...یان ئەو فەرموودەیەی کە موصعەبی کوڕی سەعد ریوایەتی ئەکات کە عوسمان لە درێژەی راوێژەکانیدا (پرسی: کێ لە هەموو کەس نووسەرترە، وتیان: زەیدی کوڕی سابیت - نووسەرەکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) -، پرسی کێ زۆر عەرەبیزانە؟ وتیان: سەعدی کوڕی عاص، عوسمان فەرمووی: دەی با سەعد (قورئانەکە) بخوێنیتەوەو زەیدیش بینووسێت)!٨

پێنجەم:لە سەردەمی پێغەمبەردا هەموو قورئان لەبەرکراو هەمووشی نووسرایەوە یانی قورئان هەم خوێندنەوەو دەنگەکەی لە پێغەمبەر وەرگیرا هەم نووسین و رەسمەکەشی، بەڵام بەپەرشو بڵاوی‌و هەریەکەی ئەوەندەی بۆی لوا بوو لەلای هەبوو.

شەشەم:عەرەب بەوە بەناوبانگ بوون کە ئەهلی ئەدەبو رەوانبێژی‌و شت لەبەرکردن بوون‌و قەسیدەی هەزار بەیتییان لەبەرکردووە، بۆیە ئاسانبووە هەموو قورئان لەبەر بکەن وەك ئێستا ئاسانە، ئەوەش وەعدەی خوایەو ئەفەرموێ: (وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ) (القمر: ١٧) ئێمە بە دڵنیاییەوە ئەم قورئانەمان ئاسانکردووە بۆ ئەوەی یادبگیرێ، ئایا هەیە بە یادی خۆی بخاتەوە.

بەڵگەی دووهەم: وردەکاری پرۆسەی نووسینەوەی قورئان

---

[٧] علوم القرآن، محسن عبدالحميدو رشدي عليان و غانم قدوري: ص٤٣.

[٨] إرشاد الساري، ٤٤٩/٧.،(فضائل القران)، ابن كثير(٣٩/١).

ئـەوەی جێگـەی گومـان نییـەو مێژوونووسـان لەسـەری ڕێکـەوتوون ئەوەیـە کـە کۆکردنەوەو نووسینەوەی قورئان بە چوار قۆناغدا تێپەڕیووە:

١ـ قۆناغی سەردەمی پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم).

٢ـ قۆناغی سەردەمی ئەبوبەکر (خوای لێ ڕازی بێت).

٣ـ قۆناغی سەرەدەمی عوسمان (خوای لێ ڕازی بێت).

٤ـ قۆناغی سەردەمەکانی دوای عوسمان (خوای لێ ڕازی بێت).

## ١ـ قۆناغی سەردەمی پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم):

شتێکی بەڵگەنەویستو سەلماوە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه والـه وسـلم) هـەر لە ژیانی خۆیدا نزیکەی (٦٠) کەسی دانابوو بۆ نووسینەوەی قورئان، هەر جارێـك (وحی) بهاتایە سەری، ئەینارد بەشوێن یەکێك یان زیاتر لەو شەست کەسەداو ئەو ئایەتانەی بۆ ئەخوێندەوە کە بۆی هاتبوون، پێشی ئەفەرموو، لـە فلانـە شـوێنو لە لای فلانە ئایەتو سوورەتدا بینووسە. پاشان کە ئەینووسی پێی ئەخوێنـدەوەو ئەگەر هەڵەیەکی کردبایە بۆی ڕاستە ئەکردەوە.[٩]

ئیمامی بوخاری لە (صحيح)ەکەیدا ئەفەرموێ: بەڕائی کوڕی عـازب ئـەڵێت: کـە ئەم ئایەتە دابەزی: (لَّا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فَضَّلَ اللّهُ الْمُجَاهِدِينَ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ عَلَى الْقَاعِدِينَ دَرَجَةً وَكُلاًّ وَعَدَ اللّهُ الْحُسْنَى وَفَضَّلَ اللّهُ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ أَجْراً عَظِيماً) (النساء : ٩٥ ). پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) فـەرمووی: "ادع لـي زيدا، وليجيء باللوح، والدواة، والكتف او الكتف والـدواة". واتـە: بـڕۆ زەیـدم بـۆ

---

[٩] زەیدی کوڕی پابت لە ریوایەتێکدا ئەڵێ: (كنت اكتب الوحي عند رسول الله (صلى الله عليه وآله وسلم) وهو يملي علي، فاذا فرغت، قال: اقرأه، فاقرأه، فان كان فيه سقط أقامه). علوم القرآن، محسـن عبدالحميـدو رشـدي عليان و غانم قدوري: ص٤٣.

بانگ بکەو پێشی بڵێ لەگەڵ خۆیدا لەوحو مەرەکەب و ئێسقانێکی دەفەی شان بهێنێ، یان دەفەیەکی شانو مەرەکەب بهێنێ.

"ابن کثیر" گەورە مێژوونووسی موسڵمان لە کتێبی "البدایة والنهایة"دا ناوی یەکە بە یەکەی نووسەرانی (وحی) کە لەبەردەستی پێغەمبەردا (صلی الله علیة والة وسلم) (وحی)یان نووسیوەتەوە ئەهێنێتو لە ژێر ناونیشانی (فصل، أما کتاب الوحي وغیره بین یدیه صلوات الله وسلامه علیه و رضي الله عنهم أجمعین) یەك یەك ناوو ژیاننامەیان باس ئەکات و بۆ نموونە ئەفەرموێ:

"فمنهم الخلفاء الأربعة: أبوبکر وعمر وعثمان وعلي، .. ومنهم أبان بن سعد بن العاص بن أمیة.. منهم أبي بن کعب.. ومنهم أرقم بن أبي الأرقم .. ومنهم ثابت بن قیس بن شماس الأنصاري .. ومنهم، حنظلة بن ربیع .. ومنهم خالد بن سعد بن العاص .. ومنهم خالد بن الولید .. ومنهم الزبیر بن العوام .. ومنهم زید بن ثابت بن الضحاك .. ومنهم عبدالله بن أبي سرح .. ومنهم عامر بن فهیرة .. ومنهم معاویة بن أبي سفیان .. ومنهم مغیرة بن شعبة الثقفي ..).[١٠]

(ابن کثیر) نزیکەی (٣٠) کەس لەوێدا باس ئەکات کە لە خزمەتی پێغەمبەر دا (صلی الله علیه واله وسلم) کاریان ئەوە بووە کە (وحی) بنووسنەوەو لەسەر ئەو پێستو تەنکە بەردو پەلی خورمایانەی کە لەو سەردەمانەدا هەبووە، هەندێ لە زانایان وەك تەحقیقیان کردووە ژمارەی نووسەرانی وەحی شەست کەس بوون).[١١]

لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلی الله علیه واله وسلم) بەسێ شێوە قورئان ئەپارێزرا:

١ ـ بە لەبەرکردن.

٢ـ بە نووسینەوەی لەلایەن نووسەرانی (وحی)یەوە.

---

[١٠] البدایة والنهایة، إبن کثیر، (٥/ ٣٦٤).

[١١] التفسیر المنیر، وهبة الزحیلي، (٢٢/١).

٣ـ بە نووسینەوەی لەلایەن خەڵکی ترەوە، جگە لە نووسەرانی (وحی).(دیارە لە مەککەدا و لە مەدینەشدا).

پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) خۆی کە قورئانی بۆ ئەهات وەك نەخشی سەر بەرد لە سنگیدا نەخش ئەبوو، ئەیخوێندەوە بۆ ئەصحاب و ئەوانیش هەریەکەو بەپێی توانای خۆی لێی لەبەرئەکرد یان ئەینووسییەوە بۆ خۆی، (أبوعبيدة) کە زانایەکی ئیسلامییە١٢ لە زانستی (قراءات)داو لە کتێبەکەیدا بە هەمان ناوەوە، هەندێ لەو صەحابانە ئەژمێرێ کە هەموو قورئانیان لەبەرکردوەو لەوانە: "چوار خەلیفەکانی راشدینو تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵلاو سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصو عەبدوڵلای کوڕی مەسعودو حوزەیفەی کوڕی یەمانو سالمی کوڕی مەعقەلو ئەبوهورەیرەو عەبدوڵلای کوڕی سائیبو هەر چوار عەبدوڵلا ناوەکە (ئیبن عومەر، ئیبن عەباس، ئیبن عەمرو ئیبن زوبەیر) و عائیشەو حەفصەو ئوم سەلەمە (ئەمانە لە کۆچکەران).

لە پشتیوانانیش ئەمانە ئەژمێرێ: "عوبادەی کوڕی صامت، و موعاز و موجەممەعی کوڕی جاریەو فەچالەی کوڕی عوبەیدو مەسلەمەی کوڕی موخەللەد.

باسی گرنگترین حافزانی قورئان ئەکات کە بریتین لە: عوسمانو عەلیو ئوبەی کوڕی کەعبو ئەبودەرداو موعازی کوڕی جەبەلو زەیدی کوڕی سابتو ئیبن مەسعودو ئەبوموسای ئەشعەری".١٣

پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) هەموو ساڵێكو لە رەمەزاندا لەگەڵ جوبرەئیلی مامۆستایدا جارێك دەوری قورئانی ئەکردەوەو ئەم قورئانەکەی بۆ ئەخوێندو جوبرەئیلیش (عليه السلام) گوێی بۆ ئەگرت.١٤

[12] ناوی قاسمی کوڕی سەلامی ئەزدی خوزاعییە، یەکێکە لە گەورە پیاوانی (حەدیس)و (زمانی عەرەبی) خاوەنی کتێبی بەناوبانگی (الأموال)ە ساڵی ٢٢٤ی کۆچی مردووە.

[13] التفسير المنير، وهبه الزحيلي ٢٣/١.

ئەو ساڵە کە پێغەمبەر (صلی الله علیە والە وسلم) وەفاتی کرد دوو جار لە رەمەزاندا دەوری قورئانی کردەوە لەگەڵیدا، ١٥ بەو شێوەیە پێغەمبەر (صلی الله علیە والە وسلم) قورئانیشی بەسەر ئەصحابدا ئەخوێندەوەو ئەوانیش لەبەریئەوەی هەر بەوە بەناوبانگ بوون کە هێزی لەبەرکردنیان زۆر بووە١٦ و قورئانەکەیان لەبەرئەکردو بە خەڵكو ماڵو مناڵیشیان لەبەرئەکرد، ئیبنولجەزەری خاوەنی کتێبی (النشر في القراءات العشر) ئەفەرموێ: "پشتبەستن بە لەبەرکردنی دڵو سنگ (نەك بە نووسینو کتێب) لە گواستنەوەی قورئاندا نەوە بە نەوە یەکێکە لە گەورەترین رێزو پلەو پایەیەك کە خوا داویەتی بەم ئومەتی ئیسلامە".١٧

شێوەی دووهەمیش: ئەو ژمارە زۆرەی نووسەرانی (وحی) کە هەریەکەیان لای خۆیەوە ئەوەی بۆی رێکەوتبێت لە قورئان لەسەر ئەو شتانە نووسیویەتییەوە کە پێغەمبەر (صلی الله علیە والە وسلم) بۆی خوێندووەتەوە، کە هەندێکیان توانییان هەموو قورئان بنووسنەوەو لە پارچە پارچەی شتدا لای خۆیان هەڵیبگرن، بوویانە ئەوەی لەبەری بووە بۆ پێغەمبەری (صلی الله علیە والە وسلم) خوێندوەتەوەو زانایان ئەڵێن (زەیدی کوڕی ثابت) ئەوەی لەلای بووە لە قورئان بۆ کۆتا جار لەو ساڵەدا کە پێغەمبەر (صلی الله علیە والە وسلم) کۆچی دوایی کرد ـ صوحوفەکانی ـ خۆی نیشانی پێغەمبەر (صلی الله علیە والە وسلم) داوەو پێغەمبەریش نزای سەرکەوتنی بۆ کردووە.١٨ جگە لە زەید هەریەکە لە عەلی

---

[١٤] لەفزی فەرمودەکە ئەفەرموێ: "یعارضني القرآن" کە صیغەی موشارەکەیەو ماناکەی ئەوەیە یەك بۆ یەکیان خوێندەوە، جارێ ئەم و جارێ ئەو.

[١٥] هەمان سەرچاوە، (٢٢/١)، هەروەها مختصر صحیح البخاري، ص١٠، رقم الحدیث (٦).

[١٦] عەرەبی جاهیلی و سەردەمی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وئاله وسلم) بەناوبانگ بوون بۆ لەبەرکردنی قەسیدەی دووردرێژو (معلقاتی سبع)و ... هتد. هەموو ئەو قەسیدەو شیعرانەیان دەم بە دەم گەیاندووەتە شوێنە دوورەکان.

[١٧] مباحث في علوم القرآن: مناع القطان (ص١١٨).

[١٨] علوم القرآن: أحمد عادل کمال، ص٤٩.

کوڕی ئەبی تالیبو عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودو ئوبەیی کوڕی کەعب ـ صوحوف[١٩] ـ زۆریان لە قورئان هەبووە.

شێوەی سێیەمیش: خەڵکانێکی تری ناو صەحابەش هەبوون کە بۆ خۆیان قورئانیان نووسیوەتەوەو ماڵو منداڵو خەڵکی تریان فێری قورئان کردووە، چ لە مەککەدا پێش کۆچکردن بۆ مەدینەو چ لە مەدینەدا، ئەوەتا لە چیرۆکی موسڵمانبوونی حەزرەتی عومەردا باسی ئەوە ئەکرێت کە عومەر پارچەیەك قورئانی بە دەستی خوشکەکەیەوە بینی کە سورەتی (طە)ی تێدا نووسرابوو، کە خوێندییەوە کاری تێکردو چوو بۆ خزمەتی پێغەمبەر (صلی الله علیە والە وسلم) بۆ ئەوەی موسڵمانێتی خۆی رابگەیەنێت.[٢٠]

بەڵێ لە ژیانی پێغەمبەردا (صلی الله علیە والە وسلم) قورئان لە یەك (مصحف)دا بە کۆیی نەنووسرایەوە (هەرچەندە هەمووی بە نووسراوی و پەرشو بڵاوی هەبوو لای صحابە)[٢١]، چونکە بەردەوام قورئان ئەهاتە خوارەوەو هەر جارەی لە شوێنێکەوەو بە جیا لەسەر تەختە بەردێك، یان پارچە پێستێك ئەنووسرایەوە، ئەگەر وانەبوایە ئەبوو بە بەردەوام خەریکی سڕینەوەو گۆڕینی لاپەڕەو ئایەتەکانی بوونایە، بەڵام ئەو کاتەش لەلایەك پشت بە بوونی پێغەمبەر (صلی الله علیە والە وسلم) خۆی ئەبەستراو لەلایەکیش پشت بە لەبەرکردنی ئەو هەمووە صەحابەیە ئەبەستراو لەلایەکی تریشەوە پشت بە ئەو صوحوفانە

---

[١٩] ـ صوحوف ـ کۆی ـ صحیفە ـ یەو بە مانای چەند لاپەڕەو پارچەیەك لە قورئان دێت، وشەی (مصحف) بە بوونی (بۆر) و (سەر)و (ژێر) بۆ میمەکە ئەخوێنرێتەوە، (مٌصحف) یش بە شوێنی ئەو صوحوفانە ئەوتریۆ پاشان بە قورئان وترا (المصحف الشریف)، ئەڵێن ئەبوبەکری صدیق (رەزای خوای لەسەربێت) پاش نووسینەوەی قورئان راوێژی بە صەحابە کردووە ناوی بنێین چی؟ رایان وابووە ناو بنرێ (مصحف)و ئەویش ئەو ناوەی لێناوە. (التفسیر المنیر: وهبە الزحیلی، ١٦/١).

[٢٠] عثمان بن عفان شخصیتە وعصرە، الصلابي، ص٢٤٥.

[٢١] عثمان بن عفان شخصیتە وعصرە، الصلابي، ص٢٤٥.

ئەبەسترا کە بەردەوام ئەنووسرایەوە، بۆیە پێویستی بەبوونی یەك ـ مصحف ـ نەبوو.

ماوەی هاتنەخوارەوەی قورئان بیست و سێ ساڵی خایاند وەك زانایان باسی دەکەن، بەڵگەشیان ئەوەیە کە پێغەمبەر(صلی الله علیه واله وسلم)لە تەمەنی چل ساڵیدا بووەتە پێغەمبەرو لە تەمەنی ٦٣ساڵیشدا وەفاتی کردووە.٢٢

## ٢ـ قۆناغی سەردەمی حەزرەتی ئەبوبەکر ( خوای لێ رازی بێت )

پاش ئەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیه واله وسلم) کۆچی دوایی کرد و زۆرێك لە "ئەعرابەکان" لە دین پاشگەزبوونەوەو حەزرەتی ئەبوبەکریش جیهادی راگەیاند دژی هەموو ئەوانەی کە:

١ـ وازیان لە ئیسلام بەتەواوەتی هێنابوو.

٢ـ ئەوانەش کە وازیان لە هەندێکی دین هێنابوو "وەك زەکاتدان بۆ نموونە".

٣ـ ئەوانەش دەستیان دایە راگەیاندنی دینی تازەو پێغەمبەرایەتی درۆییانە..

ئەوەبوو شەڕێکی گەورە لەگەڵ ئەهلی یەمامەدا (سوپای موسیلەمەی درۆزن) روویداو لەو شەڕانەدا، کە هەندێ لە زانایان ئەفەرموون: "لەو شەڕانەدا نزیکەی هەزارو دوو سەد صەحابەی تێدا شەهید بوون، ٢٣ کە (٣٩) کەسیان و لە ریوایەتێکی تردا ئەفەرموێ: (٧٠) کەسیان لەوانەبوون کە هەموو قورئانیان لەبەربوو. ئەمە وای کرد کە یەکێکی وەکو حەزرەتی عومەر دابچڵەکێو بچێتە خزمەت حەزرەتی ئەبوبەکرو پێشنیاری ئەوە بکات کە با قورئان لەیەك ـ مصحف ـ دا بنوسرێتەوەو لیژنەی شارەزای بۆ دابنرێت نەوەك ئەم جیهادە هەموو

---

[٢٢] فضائل القران،ابن کثیر،ص(١٥).

[٢٣] ریوایەتێ ئەفەرموێ حەوتسەد کەس کوژراون (إشارد الساری ٧/٤٤١).

حافزەکانی قورئان لەناوبەرێتو بەشێك لەقورئان نەمێنێ.. ئیمامی بوخاری ئەفەرموێت: زەیدی کوڕی پابت ئەفەرموێ:

"أرسل الي أبوبكر مقتل أهل اليمامة فاذا عمر ابن الخطاب عنده، قال أبوبكر (رضي الله عنه) ان عمرا أتاني فقال: ان القتل قد استحرّ يوم اليمامة بقراء القرآن وإني أخشى أن يستحرّ القتل بالقراء بالمواطن فيذهب كثير من القرآن وإني أرى أن تأمر بجمع القرآن، قلت لعمر: كيف تفعل شيئاً لم يفعله رسول الله، قال عمر: هذا والله خير، فلم يزل عمر يراجعني حتى شرح الله صدري لذلك، ورأيت في ذلك الذي رأى عمر، قال زيد: قال أبوبكر: إنك رجل شاب عاقل لانتهمك وقد كنت تكتب الوحي لرسول الله (صلى الله علية والة وسلم) فتتبع القرآن فأجمعه، فوالله لو كلّفوني نقل جبل من الجبال ماكان اثقل عليّ مما أمرني به من جمع القرآن، قلت: كيف تفعلون شيئاً لم يفعله رسول الله قال: هو والله خير. فلم يزل أبوبكر يراجعني حتى شرح الله صدري للذي شرح له صدر أبي بكر وعمر (رضي اله عنهما)، فتتبعت القرآن أجمعه من العسب واللحاف وصدور الرجال، حتى وجدت آخر سورة التوبة مع أبي خزيمة الأنصاري لم أجدها مع أحد غيره، لقد جاءكم رسول الله من أنفسكم عزيز عليه ماعنتم.. حتى خاتمة براءة، فكانت الصحف عند أبي بكر حتى توفاه الله ثم عند عمر حياته ثم عند حفصة بنت عمر (رضي الله عنها)".[٢٤]

واتە: ئەبوبەکر دوای کوشتارەکەی خەڵکی یەمامە ناردی بە شوێنمدا، کە ڕۆیشتم عومەری کوڕی خەتتابیش لای ئەو بوو، ئەبوبەکر (خوای لێ ڕازی بێت) فەرمووی: عومەر هاتە لامو پێی وتم: کوشتن لە ڕۆژی یەمامەدا زۆرێك لە قورئان خوێنەکانی تیابردووەو منیش زۆر لەوە ئەترسم کوشتن لەمەودوا و لەشەڕەکانی تردا هەروا بکات لە قورئان خوێنەکانو زۆرێك لە قورئانمان لەدەست بچێت، بۆیە رام وایە کە فەرمان بدەی قورئان کۆبکرێتەوە (لەیەك "مصحف"دا) منیش بە عومەرم وت: چۆن شتێك ئەکەی کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه والە وسلم)

---

[٢٤] إرشاد الساري: القسطلاني، (٧/٤٤٧و٤٤٨).

نەیکردووە، عومەر ئەیوت: ئەو کارە سوێند بە خوا خێرێکی گەورەیە و عومەر بەردەوام هاتوچۆی ئەکردم (بۆ ئەو کارە)، تا خوای گەورەش سنگی منیشی گوشاد کرد بۆ کارەکەو هەمان ئەو رایەم بۆ دروست بوو کە بۆ عومەر دروست بوو، "زەید" ئەفەرموێ: ئەبوبەکر فەرمووی: تۆ پیاوێکی گەنجو ژیری، ئێمەش هیچ تۆمەتێکمان لەسەرت نییە، [25] لە خزمەت پێغەمبەریشدا تۆ هەر (وحی)ت بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه واله وسلم) ئەنووسییەوە، کەواتە دەست بکە بە گەران بە شوێن هەموو قورئانداو کۆی بکەرەوە، سوێند بە خوا ئەگەر ئەرکی گواستنەوەی شاخێك لە شاخەکانیان بسپاردایە پێم لەوە گرانتر نەئەبوو کە ئەرکی کۆرکردنەوەی قورئانیان پێ سپاردم، وتم: (باشە) چۆن شتێك ئەکەن کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه واله وسلم) نەیکردووە؟

ئەبوبەکر فەرمووی: وەڵلاهی ئەمە خێرێکی گەورەیە، ئەبوبەکر بەردەوام باسەکەی لەگەڵمدا ئەکردەوە، تا خوای گەورە سنگی منیشی گوشاد کرد بۆ ئەو کارە وەك چۆن سنگی ئەبوبەکرو عومەری بۆ گوشاد کرد (رەزای خوایان لێ بێت) دوای ئەوە ئیتر دەستم دایە قورئان کۆکردنەوە لە هەموو ئەو شتانەدا کە تێیدا نووسرابوویەوە وەك (پەلی پانی دارخورما) و (تەنکە بەرد)و (سنگو دڵی پیاوان).. تا ئەوەی کۆتایی سورەتی (تەوبە)م لای (ئەبی خوزەیمە)ی ئەنصاری دەست کەوت کە لای کەسی تر دەستم نەکەوت کە ئەفەرموێ: (لَقَدْ جَاءكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ * فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُلْ حَسْبِيَ اللّهُ لا إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ) (التوبة: ١٢٨-١٢٩). ئیتر دوای ئەوە هەموو ئەو صوحوفانە (پارچە قورئانانە) لای ئەبوبەکر هەڵگیران تا کۆچی دوایی کردو پاشان لای عومەرو تا لە ژیاندا بوو، پاش ئەویش خرایە لای ـ حفصەی کچی عومەر ـ رەزای خوای لێ بێ ـ )..

---

[25] قسطلاني ئەڵێ: "لانتهمك: أشار الى عدم كذبه به وأنه صدوق". واتە: ئاماژە بۆ ئەوە ئەکات کە درۆی لێ نەبیستراوەو پیاوێکی زۆر راستگۆیە". هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

لەم ریوایەتەوە هەندێ شتی ورد هەیە جێگەی خۆیەتی ئاماژەیان پێ بدەین:

١ـ بڕیاری کۆکردنەوەی قورئان لە ئەنجامی ئەوەوە هات کە قورئان خوێن‌و حافزەکانی قورئان بە زۆری بەشداریی شەرەکانیان ئەکردو لە ریزی یەکەمی شەڕەکاندا بوون مەترسی ئەوە دروست بوو بە نەمانی ئەوان هەندێ لە قورئان لەناوبچێ، ئەوەش وانەیەکە بۆ زانایان و رۆشنبیرە موسڵمانەکان کە بەرزکردنەوەی ئاڵای ئەم دینە کاری هەموو لایەکەو نابێ ئەوان خۆیانی لێ بدزنەوە.

٢ـ کۆکردنەوەی قورئان با کارێکە پێغەمبەر (صلی الله علیه واله وسلم) نەشی کردووە، بەڵام مادامێك بەرژەوەندییەکی گەورەی تێدایە ئەو صحابە گەورانە پێی هەستان‌و ئەوەبوو دوایش هەموو موسڵمانان بەشدارییان کرد لەو کارە خێرەداو تا دونیا دونیایە خەڵك وەك سەروەرییەك باسی دەکەن بۆ عومەر وەك پێشنیارو بۆ ئەو ئەبوبەکر وەك بڕیاردەرو بۆ زەید وەك هەڵسوڕێنەرو بۆ صحابەی پێغەمبەر (صلی الله علیه واله وسلم) وەك خەڵکێکی بەشدار لەو کارە گەورەدا.

٣ـ ئەو ریوایەتە ئەوە دەردەخات کە ئەصحابی پێغەمبەر (صلی الله علیه واله وسلم) بەرەیەکی ناوازەو هەستیار بوون، لەلایەکەوە زۆر بە ترسەوە بڕیار لە کۆکردنەوەی قورئان ئەدەن‌و لە لایەکەوە خەمی فەوتانی قورئانیان هەیە کە سەرچاوەی وەرگرتنی بیروڕاو رەوشت‌و هەموو پرنسیپەکانی ژیانە لەلایەکی تریشەوە ئەوکارە ئەوەندە گەورەیە لایان گواستنەوەی کێوێك ئاسانترە لەو کارە، کەچی ناوی خوای لێدێنن‌و بڕیاری لەسەر ئەدەن.

٤ـ لە ریوایەتەکەوە کەش‌و هەوای خۆشەویستی و برایەتی‌و موسڵمانێتی بە ئاشکرا دەردەکەوێت کە کەس رای خۆی ناسەپێنێ بەسەرکەسداو لە رێگەی حیوارو گفتوگۆوە بڕیار لە مەسەلە چارەنووسەکاندا ئەدەن و کەراشیان دێتە سەر کارەکە هەموو بەدڵ‌و بە گیان کاری بۆ دەکەن وەك ئەوەی هەر لە سەرەتاوە رایان لەسەری بووبێت!

٥ـ لەو ریوایەتەوە دەردەکەوێت هەڵبژاردنی (زەید) بۆ ئەو کارە لەبەر زۆر هـۆی گرنگ بووە، لەوانە:

أ ـ پیاوێکی گەنجو بە تاقەت بووەو لە ترۆپکی وزەو ورەدا بـووە، چـونکە ئـەو کاتە تەمەنی (٢١) ساڵان بووە، وەك هەندێ لە زانایان ئەڵێن.٢٦

ب ـ کەسێکی شیاو بووە بۆ ئەو کارە، چونکە خاوەنی (عەقڵێکی چاك) بـووەو توانای لەبەرکردنو بەدواداچـوونی زۆر بـووە، تەنانـەت کـە پێغەمبـەر (صـلى الله عليه واله وسلم) ئەچێتە (مەدینە) داوای لـێ ئـەکات خـۆی فێـری زمـانی یـەهودی بکات (واتە: زمانی عیبری)، زەید لە (پازدە رۆژ)دا فێری زمانەکـە ئـەبێت، زەیـد خۆی ئەفەرموێ: کە پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) هاتە مەدینە بردمیان بۆ خزمەتی، زۆر سەری لێم سوڕما، عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبـەری خـوا (صـلى الله عليه واله وسلم) ئەمە یەکێکە لە کوڕانی (بەنی نەججار)و نزیکەی نۆزدە سـورەتی لە قورئان لەبەرکردووە تا ئێستا، پێغەمبـەر ئـەوە سـەرنجی راکێشـاو فـەرمووی: "يا زيد تعلم لي كتاب يهود فأني والله ما آمن يهود على كتابي". (زەید خۆت فێـری نووسینی جولەکە بکە بۆم، چونکە سوێند بە خوا جولەکە بەدەست پاك نازانم بۆ نامـەکانم)، زەیـد ئـەڵێ: پـازدە شـەو تێنەپـەڕی زۆر بـە چـاکی فێـری نووسـینی زمانەکەیان بووم، هەر نامەیەکی ئەوان بهاتایە ئەم خوێندەوە بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) و هەر نامەیەکیشی ببوایە بۆ ئەوان بۆم ئەنووسی.٢٧

---

[٢٦] عثمان بن عفان، شخصيته وعصره، الصلابي، ص٢٤٨. ابن كثير لە (البدايـة والنهايـة: ٥/٣٧٠)دا ئـەڵێ: کە پێغەمبەر (صلى الله عليه والە وسلم) تەشریفی چووە مەدینە، "زەید" یازدە ساڵان بوو، بۆیـە کـە شـەڕی (بدر) روویدا لەبەر منداڵی نەیانبرد بۆ شەڕو هەروەها بۆ ئوحودیش، یەکەم شەڕێك بەشـداری تێـدا کـرد شـەڕی (خەندەق) بوو، پاش ئەوە بەشداری هەمو شەڕەکانی کردووە.

[٢٧] البدايةو النهاية، (٥/٣٧٠). "ابن كثير" ئەفەرموێ: ئیمامی ئەحمەد ریوایەتی کردووە. ئیمامی بوخـاریش لە (كتاب الأحكام، باب ترجمة الحكام)دا ئەم فەرمودەیە ئەهێنێت . (إرشاد الساري: ١٠/٢٥٨).

ج ـ پیاوێـك بـوو جێگـەی متمانــە بــووەو كــەس قســەی لەســەر نــەبووە و پەسەندیدەی پێغەمبەر (صلی الله علیه واله وسلم) بووە، بۆ كاری واش هـەر ئـەو جۆرە پیاوانە ئەبێت تەرخان بكرێ بۆ دڵنیایی زیاتری خەڵك.

د- خاوەن ئەزموونێكیش بووە لـەو مەیدانـەداو یـەكێك بـووە لـە نووسـەرەكانی (وحی)، نەك هەر ئەوە، بەڵكو زەید بە (كاتب الوحي) یان (كاتب الرسول (صلی الله علیه واله وسلم)[٢٨] ئەناسرا لەناو صەحابەو لەسەردەمی پێغەمبەردا (صلی الله علیه واله وسلم).

هـ ـ لە سەروو ئەمانەشەوە (زەید) لەلایەكـەوە هـەموو قورئـانی لەبـەر بـوو، [٢٩] لەلایەكیشەوە ـ مصحف ـ ێكـی خـۆی هـەبوو، كـە زانایـان ئـەڵێن: بـۆ كۆتـا جـار پیشانی پێغەمبەری (صلی الله علیه واله وسلم) داوە لەو ساڵەدا كـە كۆچـی دوایـی كردووە.[٣٠]

جا حەزرەتی ئەبوبەكر (رەزای خوای لێ بێت) هەستا لیژنەیـەكی لـە حـەزرەتی عومەرو زەید دروست كرد بۆ ئەو كـارەو بەرنامەیـەكی وردی بـۆ دانـان دەربـارەی چۆنێتی كارەكەیان، پێی وتن: لەبەردەم دەرگـای مزگەوتـدا دابنیشـن و هەركـەس هەر قورئانێكی لابوو بە دوو مەرج لێی وەربگرن.

یەكەم: بە نووسین هەبێت لای یەكێك.

دووەم: یەكێك لەبەری بێت.

ئـەبوداودی حەدیسـزان ئەفـەرموێ: عومـەر (خـوای لـێ رازی بێـت) رایگەیانـد هەركەسێك شتێكی لە قورئان لا هەیە و لە پێغەمبـەری خـوا (صـلی الله علیـە والـە وسـلم) ی وەرگرتـووە بابیهێنـێ بۆمـان".[٣١]و ژمارەیـەك صـەحابە دانـران بـۆ

---

[٢٨] ارشاد الساری، (٧/٤٤٩).

[٢٩] سير أعلام النبلاء، الذهبي، (٢/٤٣١).

[٣٠] علوم القرآن،أحمد عادل كمال، ص٤٨، ٤٩.

[٣١] أرشاد الساري، (٧/٤٤٧).

نووسینەوەی ئەو قورئانانە و ئوبەی کوڕی کەعب بۆی ئەخوێندنەوەو ئەوانیش ئەیانووسی.[٣٢]

هەر ئەبوداود ئەفەرموێ: "وكان لا يقبل من أحد شيئا حتى يشهد شاهدان".[٣٣] هیچیان لەکەس وەرنەدەگرت ئەگەر دوو شایەتی پێنەبوایە.

ئیبن حەجەر (رحمه الله) ئەفەرموێ: "المراد بالشاهدين: الحفظ والكتابة".[٣٤] مەبەست بەدوو شایەت ئەوەیە: هەبێت لەبەری بێتو هەبێت بە نووسراوی لای هەبێتو تەنیا یەکێکیان بەس نییە. ئەوەتا زەیدی کوڕی سابیت ئەفەرموێ: کۆتا ئایەتی سورەتی (التوبە)م تەنیا لای ئەبی خوزەیمە دەست کەوت (واتە بە نووسراوی)[٣٥]، ئەگەرنا خۆ زەید خۆیو عومەرو ئەبوبەکرو زۆربەی صەحابەش ئایەتەکەیان لەبەربوو[٣٦] ئەم لیژنەیە نزیکەی دوو ساڵ[٣٧] خەریکی کۆکردنەوەی هەموو ئەو صوحوفانە بوون کە لای خەڵکی هەبوونو گشتیان لەیەك (مصحف)دا کۆکردەوە بەو شێوەیەی کە لە سەردەمی پێغەمبەردا وەرگیرابوو.

جیاوازی ئەم نووسینەوەو کۆکردنەوەی قورئانە لەگەڵ سەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله عليه واله وسلم) چەند شتێکە:

---

[٣٢] ارشاد الساري، (٧/٤٤٩).

[٣٣] ارشاد الساری، (٧/١٦٤).

[٣٤] مباحث في علوم القرآن، مناع القطان، ص١٢٢.

[٣٥] إرشاد الساری، (٧/٤٤٧)، قسطلانی لە (إرشاد الساري)، ٧/١٦٣دا ئەڵێ: (فالمراد بالنفي نفي وجودهما مكتوبين لا نفي كونهما محفوظين)..مەبەست لەوەی کە ئەڵێ: لای کەس نەبوو، یانی بە نووسراوی لای کەس نەبوو،نەك کەس لەبەری نەبووە!.

[٣٦] مباحث في علوم القرآن القطان ص١٢٢.

[٣٧] هەندێ لە زانایان ئەفەرموون: (دوو ساڵ، یان سێ ساڵ)ی خایاند. علوم القرآن، أحمد عادل كمال، ص٤٨. بەڵام دروست ئەوەیە کە لە ساڵی یازدەی کۆچییەوە دەستی پێکراو پێش مردنی خەلیفە ئەبوبەکر لە ساڵی سیازدەی کۆچیدا بە کۆکراوەیی لە ماڵی حەزرەتی ئەبوبەکردا دانرا، (تأريخ القرآن، محمد طاهر الكوردي، ص٢٨).

ـ لەسەردەمی پێغەمبەردا هەر پارچەی لای یەکێك بووەو لە یەك (مصحف)دا کۆنەکراوەتەوە.

ـ لە سەردەمی ئەبوبەکردا هەمووی لەیەك (مصحف)دا کۆکراوەتەوە.

ـ لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله علیه واله وسلم) قورئان بە بەش بەشو پرشو بڵاوی هەبوو، واتە هەبووە لە سورەتێك چەند ئایەتێکی لابووە، یان لە قورئان چەند سورەتێکی لابووە کە ریزبەندی تێدانەبووە.

ـ لەسەردەمی ئەبوبەکردا (رەزای خوای لێ بێت) هەمووی ریزبەندی کراوەو بەو شێوەیەی کە لە خزمەتی پێغەمبەردا (صلى الله علیه واله وسلم) وەریانگرتووە نووسیویانەوە، چونکە نووسینەوەو دانانی سورەتەکان و ئایەتەکان کارێکی تایبەتە بە پێغەمبەری خواوە و ئەویش بەوشێوەیە گەیاندوویەتیو دایناوە کە خوای گەورە فەرموویەتی.[٣٨]

ـ جگە لەمانەش ئەم کۆکردنەوەیە تەنیا قورئانی تێدا نووسراوەتەوەو هیچ جۆرە تەفسیرێك، یان شەرحێکی لەگەڵ نەبووە، کە لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله علیه واله وسلم) هەبووە لەگەڵ قورئانەکەدا، تەفسیریان شەرحیشی نووسیوە بۆ زیادە تێگەیشتنی خۆی.

ـ ئەم کۆکردنەوەیە ئەوپەڕی وردەکاری و مەرج و ئیحتیاتی تێدا کراوەو بەشێوەیەکی زانستی نووسراوەتەوە، بەڵام ئەم حاڵەتە لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله علیه واله وسلم) بەو وردییە نەبووە.

ـ ئەم نووسینەوە تەنیا ئەو ئایەتو سورەتانەی تێدا نوسوراوەتەوە کە (نەسخ) نەکراون، کە لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله علیه واله وسلم) ئەمەش رەچاونەکراوە.

---

[٣٨] عثمان بن عفان، الصلابي، ص٢٤٩.

ـ ئـەم كۆكردنـەوە (ئیجمـاعی ئوممـەتی ئیسـلامیی) لەسـەر دروست بـوو، بـە پێچەوانەی ئەوانەی سەردەمی پێغەمبـەر (صـلی الله علیـە والـە وسـلم) كـە زۆرتـر كاری شەخصی بوون.

بـەو شـێوەیە قورئــان لــە ســورەتی (الفاتحــە)ەوە تــا ســورەتی (النــاس) كۆكرایەوەوە هەمووی خرایە نێوان دوو بەرگەوەو تەسلیم بـە حـەزرەتی ئەبوبـەكر كراو لای ئەو مایەوە تا كۆچی دوایی كردو پاشان لای عومەر مایەوەوە تا ئـەویش كۆچی دوایی كردو پاشان خرایە لای حەفصـەی كچـی عومـەرو دایكـی موسـڵمانان (رەزای خوا لە هەموویان بێت) و ئـەو خەلیفـە بەرێزانـە لـە دڵەخورپـەی فـەوتانی قورئان كەوتنو صحابەش كە هەستیان ئەكرد قورئان بە گشتی و بە نووسـراوی و تەواوی هەیە بەو شێوەیەی پێغەمبەر (صلی الله علیە والە وسـلم) لـە خـواوە بـۆی هاتووە، بێخەم بوونو لە ئاسوودەییدا ئەژیان.

## ٣ـ قۆناغی سەردەمی عوسمانی كوڕی عەففان ( رەزای خوای لێ بێت )

قورئـان هـیچ ترسـێكی لەسـەر نـەمابوو بـە كۆكردنـەوەی لـە لایـەن حـەزرەتی ئەبوبەكرەوە، حەزرەتی عومەریش یاسایەكی دەرهێنابوو كـە كورتەكـەی ئەمەیـە "رێگە بـە هـیچ گـەورە صـەحابییەكی كۆچـكەر نـادرێ مەدینـە جێبهێڵـێو بچێتە ولاتێكی تر بە پرس نەبێتو بۆ كاتێكی دیـاری كـراویش نـەبێ"[٣٩]. كـە حـەزرەتی عومەر كۆچی دوایی كرد و فتوحاتی ئیسلامی تا دەهات زیـادی ئـەكرد، پێویست بوو كە گەورە صـەحابیەكانیش بچـن بـە وڵاتانـدا بـۆ فێركـردنو پـەروەردەكردنی خەڵك، ئەوەبوو هـەر صـەحابەی كەوتنـە ولاتێـك و خـەڵكی ئـەو ولاتانـە بـە پێـی شـێوازی ئــەو صــەحابەیە قورئانیــان ئەخوێنــدو خوێندنــەوەكانیش لــە هەنــدێ (شوێندا) جیاوازیان هەبوو، دیمەشقییەكان بە پێی خوێندنەوەی (میقدادی كـوڕی

[٣٩] علوم القرآن، أحمد عادل كمال، ص٤٩.

ئەسوەد) و خـەڵکی کوفـە بـە پێـی خوێندنـەوەی (عەبـدوڵڵای کـوڕی مەسـعود) و خەڵکی بەسرە بە پێی خوێندنەوەی (ئەبو موسای ئەشعەری) و زۆرێك لـە خـەڵکی شـــامیش بـــە پێـــی خوێندنـــەوەی (ئوبـــەیی کـــوڕی کـــەعب)، قورئانـــەکانیان ئەخوێنــدەوەو لەبەرئــەوەی قورئــانیش بــە حــەوت جــۆر خوێندنــەوە ئــەتوانرا بخوێنرێتەوە جیاوازییەکی زۆر کەوتە ناو موسڵمانان و بوویە کێشـەیەکی گـەورە.. بۆ نموونە:

ـ بـە پێـی ئیعـراب وشـەیەك جـارێ بـە "مرفـوع"و جارێـك بـە "منصـوب"ی ئەخوێنرایــەوە وەك: (فَتَلَقَّى آدَمُ مِن رَّبِّهِ كَلِمَاتٍ)، وشــەی (آدَمُ) لــە یەکەمــدا (فاعله)و لە دووەمدا (مفعول به)یە.

ـ بەپێی پێشو پاش خستنی هەندێ وشە وەك (فيقتلون ويقتلون) بە دوو شێوە ئەخوێنرایــەوەو ئــەمیان پــێش ئــەویان ئــەخراو ئــەویان پــێش ئــەمیان ئــەخراو بەوشێوەیەش دوو مانای بۆ دروست ئەبوو، "وَيُقْتَلُون فَيَقْتُلُون" یانی: کە خۆیـان ئەکوژرێنو راستەوخۆ ئەبنە هۆی کوشتنی خەڵکی تر، ماناکـەی تریـان "فَيَقْتُلُون وَيُقْتَلون" خەڵك ئەکوژنو خۆشیان ئەکوژرێن.

ـ بە پێی صیغەکانی (تاك)و (جووت)و (کۆ) ئەخوێنرێتەوە وەك (أمانتهم) کە بە (أماناتهم)یش ئەخوێنرێتەوە.

بەهەرحاڵ ئەم خوێندنەوە جیاوازانە لە هەندێ شوێندا بوویە مایەی موناقەشەو رەخنە لـە یـەکتری گـرتنو ئـەم ئـەیوت خویێدنەوەکـەی مـن راسـتەو ئـەو ئـەیوت خوێندنەوەکەی من لە هی تۆ چاکترەو ئەمەش وای ئەخواست کە چارەسەرێکی بۆ بکرێ.

بە پێی ریوایەتە مێژووییەکان دوو رووداو زیاتر فشاری خستە سـەر موسـڵمانان کە چارەسەرێك بۆ کێشەکە بدۆزنەوە.

رووداوی یەکەم: (طبری) ئـەڵێت: "لـە کـاتی خیلافـەتی عوسمانـدا مامۆسـتایەك بەپێی خوێندنەوەی یـەکێك قوتابییـەکانی فێـر دەکـردو مامۆسـتایەکی تـر بـەپێی

خوێندنەوەیەکی تر، کە ئەم قوتابییانە ئەگەیشتنە یەکتری ئەبوویە موناقەشەیان و ئەم موناقەشەیەش بەرز ئەبوویەوە بۆ مامۆستاکان.[٤٠] ئەمە گەیشتە عوسمان و ئەویش چوویە سەردوانگەو وتارێکی دا بۆ موسڵمانان و فەرمووی: "ئێوە لەم نزیکانەی مندا وا جیاوازن و هەریەکەی بەشێوەیەك ئەیخوێنن، ئەی ئەبێ ئەو خەڵکە دوورە دەستە چەندێك جیاوازییان زۆرو توند بێت، ئەی هاوەڵەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) تکایە کۆببنەوەو با (پێشەوا)یەك بۆ هەموو خەڵکی بنووسین".[٤١]

ریوایەتی دووهەم: ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خوای لێ بێت) ئەڵێت: (حوزەیفەی کوڕی یەمان) کە بەشداریی فەتحی (ئەرمینیا)ی کرد کە هەردو وسوپای عێراق و شام تێیدا بەشداربوون، (حوزەیفە) خوێندنەوەی هەردوولا ترساندی و خۆی گەیاندە عوسمان و عەرزی کرد، ئەی ئەمیری ئیمانداران! فریای ئەم ئوممەتە بکەوە تا وەك "یهودو نصاری" جیاوازییان لە پەیامەکەی خوادا بۆ دروست نەبووە، عوسمانیش خێرا ناردی بۆ لای (حەفصە)و داوای کرد ئەو (مصحف)ەی کە لایەتی بۆمی بنێرێ با چەند (مصحف)ێکی تری لەبەر بگرینەوەو پاشان ئەینێرینەوە بۆی، حەفصەش ناردی بۆیان و عوسمانیش فەرمانی کردە کە (زیدی کوڕی سابیت) و (عەبدوڵڵای کوڕی زوبێر)و (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص)و (عەبدورەحمانی کوڕی حارسی کوڕی هیشام) دەست بە نووسینەوە بکەن و پێی فەرموون: لەهەر ئایەتێکدا جیاوازی کەوتە نێوانتان لەسەر چۆنیەتی نووسینەکە

---

[٤٠] "ئەیوب" کە یەکێکە لە (راوی)یەکانی ئەم ریوایەتە ئەڵێ: وام بیستووە کە هەندێکیان نکوڵییان لە خوێندنەوەی ئەوی تر ئەکرد.. هەندێ کەسی نیاز خراپ هەیە.. ئەڵێن: "هەندێ ئەوی تریان بەکافر ئەزانی" ریوایەتەکە واناڵێ، بەڵکو ئەڵێ: "حتى كفر بعضهم بقراءة البعض". واتە نکوڵی کردن لە خوێندنەوەی ئەو و حساب نەکردن بۆی". ئیتر کوا بڵێ: (كفر بعضهم بعضا) بۆ نموونە.

[٤١] مباحث في علوم القرآن، مناع القطان، ص١٢٥. لە تەفسیری (طبري) جوزئی یەك، ص٦١و ٦٢، وەری گرتووە.

ئەوە بڕیار بدەن بە زمانی قوڕەیش بینووسنەوە، چونکە ئەم قورئانە بە زمانی ئەوان دابەزیوە، ئەوانیش وایان کرد.."[٤٢].

بە پێی ریوایەتە مێژوویەکان کە درێژەی ئەو باسو خواستانەیان هێناوە حەزرەتی عوسمان (رەزای خوای لێ بێت) دوای ئەم دوو رووداوە راوێژ بە هاوەڵە بەرێزەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) ئەکات لە هەموو توێژەکانیان چ موهاجیری‌و چ ئەنصاری (کۆمەڵێك لە گەورە پیاوانی صەحابە و گەورە پێشەوایان‌و زانایانی ناو صەحابە کە لە سەرووی هەموویانەوە حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب بوو، عوسمان (خوای لێ رازی بێت) ئەم کێشەیە ئەخاتە بەردەم نوخبەی ئەم ئوممەتە ئیسلامییەو ئەوانیش و ئەمیش لێکۆڵینەوەی باش ئەکەن لەسەری‌و هەریەکەی رای خۆی دەرئەبڕێت‌و ئەم رای ئەوان‌و ئەوان رای ئەمیان بۆ دەرئەکەوێت‌و عوسمان (را)ی ئەوە ئەدات کە (ــ مصحف ــ یێکی پێشەنگ) بۆ خەڵکی بنووسرێ‌و پاش ئەم راوێژە ئەوان رازیبوونی خۆیان بۆ رایەکە دەرئەبڕن‌و ئەڵێن: "نِعم ما رأيت"! بەراستی ئەمە باشترین رایە"[٤٣].

دوای ئەوە عوسمان لیژنەیەکی (دوازدە کەسی)[٤٤] دانا بۆ ئەم ئیشە کە چوار قورئانخوێنە ناودارەکەی تێدابوو "زەیدی کوڕی سابیت، عەبدوڵڵای کوڕی زوبێر، سەعدی کوڕی عاص‌و عەبدوڕەحمانی کوڕی حارسی کوڕی هیشام".

ریوایەتەکە ئەڵێ: "ئوبەیی کوڕی کەعب‌و موصعەبی کوڕی سەعدو مالیکی کوڕی ئەبی عامیرو کەسیری کوڕی موفلیح‌و ئەنەسی کوڕی مالیك‌و عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسیش لەو لیژنەیدا هەبوون، وەك لە "إرشاد الساري، ٤٤٩/٧)دا هاتووە.

---

[٤٢] هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

[٤٣] عثمان بن عفان الصلابي، ٢٥١ء ٢٥٢.

[٤٤] عثمان بن عفان، صادق عرجون، ص١٧١، ریوایەتەکە هی ئەبوداودی حەدیسزانە (إرشاد الساری، ٤٤٩/٧).

لە ریوایەتێکی تردا هاتووە کە عوسمان لە درێژەی راوێژەکانیدا (پرسی: کێ لـە هەموو کەس نووسەرترە، وتیان: زەیدی کوڕی سابیت ـ نووسـەرەکەی پێغەمبـەر (صلى الله عليه واله وسلم) ـ پرسی کـێ زۆر عەرەبیزانـە؟ وتیـان: سـەعدی کـوڕی عاص، عوسمـان فـەرمووی: دەی بـا سـەعد (قورئانەکـە) بخوێنێتـەوەو زەیـدیش بینووسێت)٤٥.

ئەبو سەعید ـ هانئی دیمەشقی کە مەولای عوسمانی کوڕی عەففان بوو ـ ئەڵێت: "كنت عند عثمان وهم يعرضون المصاحف، فأرسلني بكتف شاة الى أُبي ابن كعـب فيها (لم يتسنّ) و (فأمهـل الكـافرين) و (لا تبـديل للحلـق) قـال: فـدعا بـدواة فمحا احدى اللامين وكتب (لا تبديل لخلق الله) ومحا (فأمهـل) وكتـب (فمهـل الكـافرين) و كتـب (لم يتسـنه)، ألحـق فيهـا الهـاء)٤٦. بـە پێـی ئـەم ریوایەتـە بێـت حـەزرەتی عوسمـان ئـەم ئەبوسـەعیدەی بـۆ ئـەوە دانـاوە لـە نێـوان خـۆیو لیژنەکـەدا تـا رێنووسی قوڕەیش لە نووسینەوەی قورئاندا رەچاو بکەن بۆ هەر وشەیەك کە یـەك را نین لە نووسینەکەیدا.

ریوایەتەکـەی ئیمـامی بوخـاری ئەفـەرموێت: (حتــى اذا نســخوا الصــحف في المصاحف ردّ عثمان الصحف الى حفصة وأرسل الى كل افق بمصحف مما نسـخوا و امـر بما سـواه مـن القـرآن في كـل صـحيفة أو مصـحف أن يحـرق)٤٧. واتـە: کـە صـوحوفەکانیان هـەموو لـە چـەند ـــ مصـحف ـــ ێکـدا نووسـیەوە، عوسمـان (صوحوفەکانی) ناردەوەو بۆ لای حەفصەو هەر ـ مصحف ـ ێکی لەو ـ مصحفانە

[٤٥] إرشاد الساری، ٧/٤٤٩.

[٤٦] جامع البيان، الطبري، (٣/٣٨).

[٤٧] هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

ـ نارد بە وڵاتێکداو فەرمانی دا کە جگە لەو ـ قورئان ـ ە هەرکەس صوحوف تر یان ـ مصحف ـ ی تری لا هەیە با بیستووتێنێت).٤٨

## ژمارەی ئەو ـ مصحف ـ انەی کە حەزرەتی عوسمان-رەزای خوای لێبێت- لەبەر ـ مصحف ـ ەکەی حەزرەتی ئەبوبەکر نووسیەوە..

زانایان بۆ ژمارەی ئەو قورئانانەی عوسمان لەبەر قورئانەکەی لای خاتوو حەفصە گرتییەوە چەند رایەکیان هەیە، هەندێ ئەفەرموون: چوار قورئانی لەبەر گرتەوە ـ کە ئەمەیان رای زۆربەی زانایانی لەسەرە، هەندێ ئەفەرموون: پێنج قورئانو هەندی ئەفەرموون شەشو هەندێ حەوتو هەندێ هەشت.. بۆ چوارەکە ئەفەرموون: دانەیەکیان لە مەدینە گل دایەوەو دانەیەکیان نارد بۆ شامو دانەیەك بۆ کوفەو دانەیەك بۆ بەصرە، بۆ پێنجەکە ئەو چوارەی پێشوو، دانەیەکیش بۆ ـ مەککە ـو بۆ شەشەکەش ئەو پێنجەی پێشوو لەگەڵ شەشەمێك کە هەندێ ئەفەرموون بۆ بەحرەین نێردراوەو هەندێك ئەفەرموون دانەیەکی تایبەت بە حەزرەتی عوسمان خۆی بووەو بۆ حەوتەمیش ئەو شەشەو دانەیەکی (یەمەن)یش و بۆ هەشتەمین ئەڵێن: ئەو حەوتەی پێشووی وڵاتانو دانەیەکی تایبەتیش کە عوسمان خۆی تێیدا ئەیخوێندو هەر بەسەر ئەو قورئانەشەوە شەهیدا کرا.٤٩

حەزرەتی عوسمان هەر قورئانێکی ئەنارد بۆ ئەو وڵاتە کەسێکی شارەزاشی لەگەڵدا ئەنارد بۆ ئەوەی خەڵکی فێری چۆنێتی خوێندنەوەکەی بکاتو بۆیان روون

---

[٤٨] ئیبن حەجەر لە (فتح الباری: ١٨/٩)دا لە راڤەی ئەم فەرمودەیەدا و لە ماناکردنی (أن يحرق)ەدا ئەفەرمویێت: لە زۆربەی ریوایەتەکاندا ئەفەرموێ: (أن يخرق) واتە پیتی (ح)ەکە نوختەی هەیە، و ئەوەشیان چەسپاوترەو (خەرقی) کتێب یان جلو بەرگ بریتییە لە درانەنو لەتوکوت کردنی.. واتە: فەرمانی دا کە هەموو ئەو ـ صحف ـو ـ مصحف ـ انەی تر بدڕێننو لەتوکوت بکرێن، دیارە لەتوکوت کراوە و پاشان سووتێنراوە.

[٤٩] أضواء البيان في تأريخ القرآن، صابر أبو سليمان، ص٧٧.

بکاتەوە چەند گریمان هەڵدەگرێ بۆ خوێندنەوە.. بۆ نموونە عەبدوڵڵای کوڕی سائیبی لەگەڵ قورئانەکەی مەککەدا ناردو موغیرەی کوڕی شهابی لەگەڵ قورئانەکەی شامدا ناردو ئەبوعەبدوڕەحمانی سولەمی لەگەڵ قورئانەکەی کوفەدا ناردو عامری کوڕی قەیسی لەگەڵ قورئانەکەی بەسرەدا ناردو فەرمانی بە (زەیدی کوڕی پابت) یش کرد کە لە رووی قورئانەکەی مەدینەوە قورئان بەخەڵك بڵێتەوە.[٥٠]

هەندێ شت لێرەدا هەیە خەڵکی ناحەز وەك برینێك سەیری دەکەن و بەسەریەوە ئەنیشنەوە:

١ـ ئەڵێن عوسمان قورئان سوتێنەو کارێکی خراپی کردووە !.

٢ـ ئەڵێن عەلی و عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ـ مصحف ـ ی تایبەتی خۆیان هەبووەو دانیان بە ـ مصحف ـ ەکەی عوسماندا نەناوە !.

٣ـ ئەڵێن کاتی خۆشی ئەبوبەکرو عومەر بە ئارەزووی خۆیان ئایەتو سورەتیان زیاد کردووە بۆ قورئان !.

لە وەڵامدا ئەڵێین:

١ـ کە خوا پەیمانبدات قورئان ئەپارێزێت ئیتر ئەیپارێزێت و کەس ناتوانێ دەستی بۆ بەرێت، ئەوەبوو خوای گەورە صەحابەی بەکارهێنا تا وادەکەی خۆی پێیان بێنێتە دی کە ئەفەرموێ: "وإنا له لحافظون".

٢ـ ئەبوبەکریش و عومەریش و عوسمانیش ئەو کارەیان بە نهێنی نەکردووەو بەراوێژو لە رووی مەنهەجێکی زانستی زۆر ووردەوە ئەنجامیان داوە:

ـ موناقەشەیەکی وردی کراوە لە لایەن ئەبوبەکرو عومەرەوەو چەندجار موراجەعەو دووبارە کراوەتەوەو لەوە ترساون ئەوە (بیدعە) بێت بۆیە ئەبوبەکر ئەفەرموێ: "کیف تفعل شیئا لم یفعله رسول الله"، عومەریش هەر ئەوەندەی ئەزانی ئەیفەرموو: "هذا والله خیر"، لە ریوایەتێکی تردا ئەفەرموێ: "أنه والله خیر

---

[٥٠] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

ومصلحة للمسلمين"..٥١ جا ئیتر ئەم زیادە ـ صحیح ـ بێت یان نا، خۆ وشەی (خیر)ەکە ئەو ماناشی تێدایە..

ـ لیژنەیەکی پسپۆڕ لەناو صەحابەکاندا ئەو کارە دەکەن و مەرجی وەرگرتنیشیان ئەوەیە کە دووشایەت هەبێت بۆ هەر صەحیفەیەك کە دێتە بەردەستی لیژنەکە:

١ـ ئەبێ یەکێك هەبێت لەبەری بێت"دەنگەکەی".

٢ـ ئەبێ یەکێك بە نووسراوی لای هەبێت"ڕەسمەکەی".

ـ هەبووە پارچەیەکی لابووە، بەڵام یەکێك لە وشەکانی قورئان نەبووە، بەڵکو یان شەرحی خۆی بووە لەسەری یان جۆرێك خوێندنەوە بووە، یان مانایەك بووە بۆ وشەیەك وەك: لە مصحفەکەی ئیبن مەسعوددا لە جیاتی بڵێ (کالعهن المنفوش) ئەیخوێندنەوە (کالصوف المنفوش)٥٢، بەڵام ئەوە خوێندنەوەی مانابوو نەك لەفز بۆیە وەرنەگیرا وەك چۆن خوێندنەوە (شاذ)ەکانی تریش وەرنەگیران بۆ نموونە خوێندنەوەکەی ئیبن عباس بۆ ئایەتی (٧٩) سورەتی (الکهف) کە ئەیوت: ئەم ئایەتە (وَكَانَ وَرَاءهُم مَّلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْباً) (الکهف: **٧٩**). ئاوەهایە (وکان أمامهم ملك یاخذ کل سفینة صالحة غصبا"، کەچی جمهوری صەحابە وایان نەئەخوێندەوەو ئەویش هاتە سەر ڕایەکەی ئەوان.

ـ هەندێ ڕیوایات ئەڵێت بۆ بوونی (واو)ێك دەستیان لە نووسینەوەی ئایەتی (١٠٠) لە سورەتی (التوبە) هەڵگرت٥٣ تا لە کاتی (حج)دا لە هەموو موسڵمانان

---

٥١ عثمان بن عفان، الصلابي، ص٢٤٧.

٥٢ مباحث في علوم القرآن، القطان، ص١٥٢.

٥٣ هەندێ لە زانایان ئەڵێن: "جاری وابوو لە نووسینی ئایەتێکدا یەك ڕانەبوون، ئەیانوت: پێغەمبەر (صلی الله علیه وئاله وسلم) ئەم ئایەتەی بە فلانی کوڕی فلان لەبەرکردووە ئەیاننارد بە شوێنیدا و جاری واهەبوو ئەو کەسە سێ شەو لە مەدینەوە دوور بوو، کە ئەهات (لیژنەکە) پێیانئەوت: پێغەمبەر (صلی الله علیه وئاله وسلم) فلانە ئایەت و فلانە ئایەتی پێ وتووی؟ ئیتر لیژنەکە بەوشێوەیە ئەیاننووسی کە ئەو ئەیخوێندەوە. أحمد عادل کمال، علوم القرئن، ص٥٥.

بپرسن بزانن ئایا خەڵکی ئەو ئایەتەیان چۆن لەبەرکردووە بە (واو)ەکەوە یان بەبێ (واو)ەکە.. ئایەتەکەش ئەفەرموێ: (وَالسَّابِقُونَ الآوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالآنصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ رَّضِيَ اللّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُ ..) (التوبه: ١٠٠). کە مانای ئایەتەکە لەگەڵ (واو)ەکەدا شتێکەو بێ ئەو (واو)ە شتێکە، مەبەستمان (واو)ی پێش (الذين اتبعوهم)ە. بەبێ (واو)ەکە مانای ئایەتەکە بەم شێوەیە ئەبێت: کە خوای گەورە باسی ڕێزی هەندێ لە خەڵکەکەی لادێنشین ئەکات، دێتە سەرباسی کەسانێکی تر کە ئەوان باشترو بەڕێزترن و ئەفەرموێ)[٥٤]: هەروەها ئەو کەسانەش کە لە ریزی پێشکەوتووە یەکەمینەکاندان چ لە موهاجیران و چ لە ئەنصارەکان ئەوانەی کە بەرێکوپێکی بە شوێن ئەواندا ڕۆیشتن خوا لە ئەوان رازی بووەو ئەوانیش لە خوا رازیبوون..) بەڵام ئەگەر (واو)ەکەی هەبێت واتە (والذين اتبعوهم) بێت ماناکەی وای لێدێت: (.. هەروەها ئەو کەسانەش کە لە ریزی پێشکەوتووە یەکەمینەکاندان چ لە موهاجیرین و چ لە ئەنصارەکان بن و چ لەوانەش بن کە بە رێکوپێکی بەشوێن ئەواندا ڕۆیشتوون، خوا لە ئەوان رازییەو ئەوانیش لە خوا رازین..). بەو شێوەیە یەکەمجار (الذين اتبعوهم) بەبێ (واو) ئەبێتە (صفە)، یان (عطف بیان)، بەڵام لە دووەمجاردا ئەبێتە کۆمەڵێکی سێیەم و (عطف) ئەبێت لەسەر دوو کۆمەڵەکەی تر کە (مهاجرین)و (ئەنصار)ن.

- ئەوەبوو ئەوانەی هاتبوون بۆ (حج) ئەوەیان دووپات کردەوە کە ئەو (واو)ە هەیەو ئەوان بە (واو)ەکەوە لە خزمەت پێغەمبەردا لەبەریانکردووە، ئەوەش بوویە پاڵپشتێك بۆ ئەوانەی کە لە لای لیژنەکە ئەیانوت بە (واو)ەوە لەبەرمان کردووە و وەك بویە پاڵپشت بۆ ئەندامانی لیژنەکە.

- ئەم پرۆسەی نووسینەوەی قورئانە کە بە بڕیاری (جەماعی)و بە لیژنەو بە وردەکاریو ئیحتیاتکردنەوە و بەو شێنەییە کە دووساڵ زیاتری خایاند وەك

[٥٤] ئەو زیادەیە کورتەی ئایەتەکانی پێشووە، وەك دکتۆر وەهبەت زوحەیلی ئەیڵێت. (التفسير المنير، ٦/٢١).

ریوایەتەکەی پێشوومان هێناو پاشان ئەبوبەکر راوێژی بە صەحابە کرد کامە ناو گونجاوە لەم قورئانە بنێرێت هەموو وتیان: (مصحف).

ـ عوسمانیش لە رووی ئەم موصحەفەوە نوسخەکانی قورئانی زۆرکردو بەناو هەرێمەکاندا بلاویکردنەوە..

ـ کارێکی ئاوەها جگە لە خەڵکی خراپو دوو دڵ و ناحەز بە دین و دینداری، کێ هەیە گومانی بۆ ئەوە بچێت کە صەحابە یان فلانو فیسار لە صەحابە بە ئارەزووی خۆی ئایەتو سورەتی دانابێت، صەحابەیەك کە پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) بفەرموێ: "من كذب علي متعمدا فليتبوأ مقعده من النار".[55] هەرکەسێك درۆیەك بەدەم منەوە بکات با شوێن بۆ خۆی لە ئاگردا چاك بکات، ئەی ئەبێ دەربارەی کەسێك پەنا بە خوا بە ناوی خواوە درۆیەك بکات چی بفەرموێ؟! پاشان با دووشتی تریش هەر بلێین:

١ـ باشە هەر ئەو صەحابانە نەبوون کە بە دڵو بە گیان خۆیان فیدای ئەم قورئانە کرد، باشە هەموویان بەشدار نەبوون لەم کارە پڕ شانازییەدا، هەموو کەسێك لای خۆیەوە ئەم خەمەی هەڵنەگرتو پێکەوە پرۆسەکەیان نەگەیاندە ئەنجام.

٢ـ باشە خۆ هەر وشەو رستەو هۆنینەوەکانی ئەم قورئانە خۆی شایەتن کە کەس دەستی نەبردووە بۆ ئەم قورئانەو ئەم کتێبە هەر ئەو کتێبەیە کە خوای گەورە (تحدی)ی هەموو مرۆڤەکانی پێ ئەکات و تەنانەت یەك"پیت"یش چییە لەم قورئانە نەفەوتاوەو یەك پیت چییە بۆی زیاد نەکراوە، باشە خۆ هەر ئەم قورئانەی کە ئێستا هەیەو لەبەردەستی موسڵماناندایە، ئەگەر قسەی خەڵکە بۆ کەس ناتوانێ وەك ئەو بڵێ؟ بۆ هەموو دونیا لەبەردەمیدا سەری رێز دائەنەوێنێو هەریەکەی لە گۆشەیەکەوە سەرسوڕمانی خۆی بۆی دەرئەبڕێتو بە شانازییەوە

[55] رواه البخاري.

باسی ئەکاتو ئەیسەلمێنێ کە ئەم سورەتەیان کورتەیەکە بۆ ئەوەی دوای خۆی و ئەمیان پێکەوە بەستراوەتەوە بە ئەویانەوە!.

سەبارەت بە خاڵی یەکەمو دووەمی ئەو گومانانەش کە ئەڵێ: "علی" یان "عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود" رەخنەیان بووەو بەو کارە رازی نەبوون و خاوەنی ـ مصحف ـــ ی خۆیان بوون، ئەوە درۆیەکی شاخدارەو بوختانی ناحەزانەی (رۆژهەڵاتناسانە)و خەڵکی نادانا ئەیگوازنەوە، ئەگینا راستییەکەی ئەمەیە:

ـ راستە زۆرێك لە صەحابەی پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) ـ مصحف ـ ی تایبەتی خۆی هەبووەو چەندێك بۆی رێکەوتبێ قورئانی نووسیوەتەوەو هەبووە زۆری نوسیوەتەوە وەك (زەیدی کوڕی سابیت)و (ئوبەیی کوڕی کەعب)و (عەلی کوڕی ئەبی تالیب)و (عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود)..و جگە لەوانیش هەبووە کەمو کەمترو بەوشێوەیە، چونکە پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) ئەیفەرموو: "لا تكتبوا عني شيئاً سوى القرآن.."[٥٦].

ـ ئەو قورئانانە شتی شەخصی بوون، ناسیخو مەنسوخیان تێدابووە، شەرحی تێدابووە، مانای هەندێ وشەی تێدابووە، خوێندنەوەیەکی (آحاد)ی تێدا بووەو هەروەها.

ـ لەبەرئەوەش کە قورئان بە حەوت خوێندنەوە خوێنراوەتەوە و کارێکی رێگەپێدراو بووە، کەس نکوڵی لەوە نەکردووە کابرا چەند پارچە قورئانی خۆی هەبێتو بە یەکێکیش لەو خوێندنەوانە بیخوێنێتەوە، بەڵام کە بڕیاری ـ صەحابە ـ هاتە سەر ئەوە کە هەموو قورئانەکان لە یەك ـ مصحف ـ دا کۆبکرێتەوە، چ عەبدوڵڵاو چ عەلیو چ غەیری ئەوانیش دایانە پاڵ کارەکەو پرۆسەکەیان سەرخست.

ـ "عەلی"یش دەربارەی کارەکەی ئەبوبەکرو دەربارەی کارەکەی عوسمانیش لە قسەی جوان بەولاوە هیچی تری بە ریوایەتی راستەقینەی مێژوو

---

[٥٦] علوم القرآن، د. محسن هاورێکانی، ص٤٤.

لێنەگوازراوەتـەوە، بـەڵکو ئەفـەرموێ: "ياأيهـا النـاس! لا تغلـوا في عثمـان، ولا تقولوا له الا خيراً، فوالله مافعـل الـذي فعـل ـ أي في المصـاحف ـ إلا عـن مـلأ منـا، جميعا (أي: الصحابة).. والله لو وليت، لفعلت مثل الذي فعل).[57] واتە: خەڵكینە! ڕۆمەچن لە مەسەلەی عوسماندا و لەخێر بەولاوە شتێكی تر مەڵێن، سوێند بە خـوا ئەوەی ئەو كردی ـ یانی دەربارەی مەصحەفەكان ـ بە دیـار چـاوی ئێمـەوە كـردی (واتە صەحابەكانەوە).. سوێند بە خوا ئەگەر منیش كاربەدەست بوومایە هـەمان كاری ئـەوم ئـەكرد.. "نـەك ئەمـە، بـەڵكو دەربـارەی ئەبوبـەكریش ئـەڵێ: "أعظم الناس أجرا في المصاحف أبوبكر، رحمه الله على أبى بكر، هو أول من جمع كلام الله".[58] واتـە: گـەورەترین پاداشـت دەسـتی ئەبوبـەكر كـەوتووە سـەبارەت بـە مەصحەفەكان، ڕەحمـەتی خـوا لـە ئەبوبـەكر یەكـەم كەسـێك بـوو قسـەی خـوای كۆكردەوە.

ـ بۆ مەسەلەی عەبدوڵڵای كـوڕی مەسـعودیش كـە گوایـە نـاڕەزایی دەربڕیـوە لـە كارەكەی عوسمان و ڕیزبەندی سورەتەكانی ئەو مەصحەفە وتوویـەتی (معـوذتین) قورئان نییە. ئەوە زانایان وەڵامـی زۆریـان داوتـەوەو بەشـێوازێكی زانسـتی ڕەدی ئەو گومانەیان داوەتەوەو ئێمە كورتەیەكی لێرەدا ئەنووسین.

١ـ ئیمـامی نـەوەوی ئەفـەرموێ: "أجمـع المسـلمون علـى أن المعـوذتين والفاتحـة مـن القـرآن، و ان مـن جحـد شـيئا منهـا كفـر، ومـا نقـل عـن ابـن مسـعود باطـل لـيس بصحيح".[59] نەك هەر ئەمە بەڵكو "ئیبن حەزم" ئەڵێ: "هذا كذب على ابن مسعود وموضوع".[60] واتە: هەموو موسڵمانان لەسەر ئەوە یەكدەنگن كە (معوذتین) و(فاتحة) بەشێكن لە قورئان و ئەوەشی نكوڵی لە شـتێكی بكـات كـافر ئـەبێتو ئـەوەش لـە

[57] فتح الباري، العسقلانى، ٩/١٨.

[58] مباحث في علوم القرآن، القطان، ص١٣٢.

[59] هەمان سەرچاوە، ص١٣١.

[60] هەمان سەرچاوە، ص١٣١.

ئیبن مەسعودەوە ئەگێڕنەوە پووچو ناراستە.. قسەکەی ئیبن حەزمیش یانی: ئەوە درۆیە بە دەم ئیبن مەسعودەوە ئەکرێتو بوختانە بۆی هەڵدەبەستن.

٢ ـ ئیبن کەسیر لە (البدایە والنهایە، ٧/٢١٦)دا ئەڵێ: ئیبن مەسعود کە مەصحەفەکەی خۆیان لێسەندو سوتاندیان گلەیی لێکردنو پێی ناخۆش بوو، عوسمانیش (ڕەزای خوای لێ بێ) نامەیەکی نووسی و تێیدا بانگی ئەکات بۆ ئەوەی بەشوێن صەحابەدا بڕوات کە هەموو یەکدەنگن لەسەر ئەو کارە کە بەرژەوەندییان تێدا بینیوە داوا ئەکات ئەویش یەك قسە بێتو جیاوازی دروست نەکات ئەویش یەکسەرە تۆبە ئەکاتو بڕیار ئەدات وەك ئەصحاب بکاتو واز لە جیاوازی و واز لە جوداخوازی بهێنێت (ڕەزای خوای لێ بێت)، نەك هەر ئەمە، بەڵکو ئیبن مەسعود ئەڵێ: "إن الله لاینتزع العلم إنتزاعا، ولکن ینتزعه بذهاب العلماء، وان الله لا یجمع أمة محمد على ضلالة فجامعوهم على ما اجتمعوا علیه.. ئەم قەناعەتەشی نووسی بۆ عوسمان.[٦١]

٣ ـ مێژووی ڕاستەقینەش ئەڵێ: "وقد ورد أن ابن مسعود رضي و تابع عثمان ولله الحمد".[٦٢] واتە ریوایەت هاتووە کە ئیبن مەسعود لە پاشاندا ڕازی بووەو شوێن عوسمان کەوتوەو سوپاس هەر بۆ خوایە.

٤ـ علی محمد محمد الصلابی ئەڵێ: گوێ بەوە نادرێ کە یەکێکی وەك (تاها حسین) لە کێشەی موصحەفدا هەرچی بڵێ و قسەی ناڕەوا بگوازێتەوە دەربارەی پەیوەندی (ئیبن مەسعود) و (عوسمان)و شێوازێکی ژەهراویانە بیهێنێ، چونکە ئەو بیروڕاکانی لە مامۆستا ڕۆژهەڵاتناسەکانییەوە وەردەگرێت کە پشتیان بە ریوایەتی لاواز و بوختان بەستووە یان ئەو ریوایەتانەی ڕافزەکان ئەیهێنن بۆ شێواندنی پەیوەندی صەحابە بەیەکەوە، ڕەزای خوا لە هەموویان بێت. باشە ئیبن مەسعودێك کە دەست لە نوێژی (قصر) هەڵبگرێت لە (مینا)دا لە ترسی ئەوەی نەوەك خەڵك جیاوازی بکەوێتە ناویانو فیتنە دروست ببێتو بەشوێن

---

[٦١] عیمان بن عفان، الصلابی، ص٢٥٦.

[٦٢] سیر أعلام الانبلاء، الذهبي، (١/٣٤٩).

خەلیفە عوسماندا ئەڕوات، ئایا ئەوەی لێچاوەڕوان ئەکرێت کە بکاتە سەر مینبەرو خەڵك هان بداتو فێری جوداخوازیان بکات، ئەوێك کە ئەفەرموێت: "أن الخلاف شرّ" جوداخوزایی یەکپارچە شەڕە.."[٦٣].

پاشان قسەیەکی (عبدالستار الشیخ) ئەگوازێتەوە لە کتێبی (عبدالله بن مسعود رضي الله عنه، ص٣٣٥)دا ئەڵێ: مێژوونووسەکانی رافزە، تەزویرێکی زۆریان لە ریوایەتەکاندا کردووە و داویانەتە پاڵ (ئیبن مەسعود) سەبارەت بە پەیوەندی ئەو بە حەزرەتی عوسمانەوە (رەزای خوای لێ بێت)، لە رێگەی ئەو ریوایەتە هەڵبەستراوانەوە وایان نیشان داوە کە گوایە صەحابە خەڵکێك بوون بەردەوام خەریکی پاشقول لەیەك گرتنبوونو رقیان لەیەکتری بووەو کەللەشەقو جنێوفرۆش بوون، کە بە راستی ئەو ریوایەتانە هەموو بوختانن‌و لەبەردەم لێکۆڵینەوەی هێمنانەو بابەتیانەدا خۆیان ناگرن‌و زەوقی ساغی هەموو ئیماندارێکیش پەرچیان ئەداتەوەو پیاوی ژیریش بڕوا بە شتی وا ناکات". پاشان ئەڵێ: "**هەندێکیان ئەم درۆیەی تر ئەکاتو بوختانێك ئەڵێ، گوایە: (ئیبن مەسعود) قسەی بە عوسمان وتووە و بە کافری زانیوە، و کە عوسمانیش بوەتە کاربەدەست ئەوەندەی لێداوە تا لە ژێر دەستییدا مردووە، دەی هەموو زانایانی مێژوو ئەوە ئەزانن کە (ئیبن مەسعود) عوسمانی بە کافر نەزانیوە، بەڵکو لە کوفەدا بەیعەتی بۆ وەرگرتووەو فەرموشێتی: "ئێمەی ئەصحابی موحەممەد (صلی الله علیه والـه وسلم) کۆبوینەوەو کەمتەرخەمییمان نەکردووە و باشترین کەسی ناو خۆمان کردوە بە خەلیفەو بەیعەتمان پێداوە، فەرموون ئێوەش بەیعەتی پێبدەن"[٦٤].

ئیتر دوای ئەمانە چی تر بڵێین بۆ رەتکردنەوەی ئەو گومانانەی کە پیاوی ناحەزو دەروون نەخۆش بەربادیان ئەکەن، نازانم لەناو ئەو هەمووە صەحابەشدا ئەگەر یەکێك رایەکی پێچەوانەشی بووبێ (بە گریمان) بۆ ئەبێ مانای خراپی لێدەربهێنرێ؟! ئەی بۆ نەوترێ ئەوە سەرەتا رای وابووە و پاشان هاتۆتە سەر

---

[٦٣] عثمان بن عفان، الصلابي، ص٢٥٧.

[٦٤] هەمان سەرچاوە، ص٢٥٧.

**رای هاوەڵان (بۆ نموونە)، یان ئەوەندەی لێزانیوە، یان وای زانیوە بەرژەوەندی لەوەدایە، یان ئەو رایە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە لەو کۆمەڵگەیەدا رێگە دراوە هەموو کەس رای تایبەتی خۆی هەبێت، چی تێدایە خۆ ئەو کۆمەڵگەیە بەرەیەك نەبوون لە فریشتە، بەڵکو کۆمەڵێك مرۆڤ بوون، بەڵام لە لوتکەی پیاوەتیو مرۆڤایەتیدا، هیچی تێدانییە یەکێ یان دوانو سیان هەڵەش بکاتو ریزپەڕییەکی تێدا هەبێت، گرنگ ئەوەیە ئەوانە بە راستی هێمای بەرەی دینن، بۆیە خوای گەورە دەربارەیان ئەفەرموێ: "کنتم خیر أمە أخرجت للناس" (ئال عمران)، پێغەمبەریش (صلی الله علیە والە وسلم) دەربارەیان ئەفەرموێ: "أصحابی کالنجوم بأیهم اقتدیتم اهتدیتم"٦٥. واتە: هاوەڵانی من وەك ئەستێرە وان چاو لە هەرکامیان بکەی رێت لە رێگەی هیدایەت ئەکەوێ، (عەبدوڵڵا کوڕی مەسعود)یش ئەفەرموێ: خوای گەورە سەیری دڵی هەموو بەندەکانی خۆی کرد بینی دڵی موحەممەد (صلی الله علیە والە وسلم) چاکترین دڵە لە ناو بەندەکانیدا بۆیە تایبەتی کرد بە خۆیەوە و پەیامی خۆی پێدا ناردو پاش ئەوە سەیری دڵی هەموو بەندەکانی کرد دوای دڵی موحەممەد، بینی دڵی هاوەڵەکانی چاکترین دڵن، بۆیە کردنییە وەزیری پێغەمبەرەکەی، لەسەر دین شەڕیان ئەکرد، ئەوەی موسڵمانان بە چاکی ئەبینن لای خواش چاکە، ئەوەشی ئەوان بە خراپی بزانن لای خواش خراپە).٦٦**

[٦٥] "ئیبن عەبدولبەڕ" لە کتێبی "جامع بیان العلم وفضله" ٩١/٢ دا هێناویێتیو هەندێ لە زانایان ئەفەرموون: "شوبهاندنی هاوەڵان بە ئەستێرەکانی ئاسمان چەند (وجه شبه)ێکی تێدایە لەوانە: ئەستێرە ئاسمان جوان ئەکەن (ولقد زینا السماء الدنیا بزینة الکواکب" ئەمانیش ئاسمانی دین ئەرازێننەوە، ئەستێرە شەیتانەکان بەردەباران ئەکەن (رجوما للشیاطین) ئەوانیش خەڵکانی شەیتان سروشت بەردەباران ئەکەن بە ژیاننامەی گەشیان، ئەستێرە هیدایەتی تێدایە "وبالنجم هم یهتدون" ئەوانیش هیدایەتیان پێوەیە ئەگەر چاویان لێ بکەی، ئەستێرە پارێزگاری ئاسمان ئەکات "وحفظا من کل شیطان مارد" هاوەڵانیش پارێزگاری لە دین ئەکەن و نایەڵن کەس دەستی تێ بخات!! ئەمەش راستییەکە هەرکەس کەمێك بیری لێ بکاتەوە ئەیسەلمێنێ.

[٦٦] شرح العقیدة الطحاویة، إبن أبي العز الحنفي، ص٦٩٦.

عەلیش–رەزای خوای لێبێت–ئەفەرموێ: " لقد رأيت اصحاب محمد{صلى الله عليه و اله وسلم } فما ارى احدا يشبههم منكم، لقد كانوا يصبحون شعثا غبرا و قد باتوا سجدا و قياما، يراوحون بين جباههم و خدودهم، و يقفون على مثل الجمر من ذكر معادهم " ٦٧ .

هەروەها ئەفەرموێت:" لقد كنا مع رسول الله{صلى الله عليه و اله وسلم } نقتل آبائنا و ابنائنا و اخواننا و اعمامنا، ما يزيدنا ذلك الا ايمانا و تسليما ..فلما راى الله صدقنا انزل بعدونا الكبت و انزل علينا النصر حتى استقر الاسلام ملقيا بجرانه، و متبوئا اوطانه، و لعمري لو كنا نأتي ما أتيتم، ما قام للدين عمود و لا اخضر لايمان عود "٦٨ .

مەولەوی گەورە شاعیریش دەربارەی ـ صەحابە ـ ئەفەرموێت:

ئەوانن ئەوان چاکیان بناس

(خير أمه أخرجت للناس)

ئەدەس ئەوان کەوت دەرەجەی قوبووڵ

رەزامەندی حەق، صوحبەتی رەسول

بکە بە چاوی تەماشایان

لە قورئانەدا مەدحو ثەنایان

ئینصافت بوێ نەظەرکە وور وورد

چلۆنە شەخصێ خودا سەنای کرد

نەك هەر لە جایێ، جایەکێ، جا دوو

راس وە بێ جا دوو (جاهدوا، جادوا)

بە موجاهیدەی ئەصغەرو ئەکبەر

بە جودی مەیسور یان مەعسور یەکسەر

بە نەفس و بە ماڵ (فی سبیل الله)

(بـالله، مع الله، فی الله، لله)..٦٩

---

٦٧ نهج البلاغه ص٢١٧ .

٦٨ نهج البلاغه:ص:١٢٩-١٣٠.

٦٩ عەقیدەی مەرضیە، مەولەوی، شەرحی مەلا عەبدلکەریمی مدرس، ل٤٦٥.

## ٤ـ قۆناغی سەردەمەکانی دوای عوسمان ( خوای لێ رازی بێت )

وتمـان حـەزرەتی عوسمـان لەسـەر قورئانەکـەی حـەزرەتی ئەبوبـەکر (هەشـت) قورئانی نووسییەوەو ناردی بە وڵاتاندا بۆ ئەوەی جیاوازی لە خەت و خوێندنەوەدا نەهێڵێ، هەموو موسڵمانان لە هەمو وڵاتێکدا ئەو قورئانە پێشـەوایان بێـت، بۆیـە نووسەرانی مێژوو ئەڵێن: ئەو قورئانانە ناونراون (قورئانـە پێشـەنگەکان= المصـاحف الأئمة) نووسینەوەی ئەم موصحەفانە وەك لـە ریوایەتەکانـدا هـاتووە بـە خـەتێکی (جـوانو درێـژکراوە) نووسـراون.. ئیمـامی بوخـاری لـە کتـێبی (التـأریخ الصـغیر: ١/٩٤) دا ئەڵێ: (وقد أدرك مصعب بن سعد صحابة النبي  حين مشق عثمان (رضي الله عنـه) المصـاحف، فـرآهم قـد أعجبـوا بهـذا الفعـل منـه".. زانایـانی زمانـەوانی ئەڵێن: "مشق في الكتابة: مدّ حروفها وأسرع فيها، ويقال: في قـده مشـق: أي طـول مع رقه".[٧٠] واتە: لە نووسـینەکەدا مەشـقی کـرد، یـانی پیتـەکانی درێـژکردەوەو خێراش ئەینووسی، ئەوتریَ: "في قدّه مشق" (باڵای مەشقی تێدایە) یـانی بـەرزەو باریکە. کەواتە مانای ریوایەتەکە بریتییە لە: موصعەبی کـوڕی سـەعد ئـەو کاتـەی کە عوسمان بەخەتێکی درێژو جوان[٧١]مەصحەفەکانی خێرا نووسـییەوە، گەیشـتە خزمەتی صەحابە بەڕێزەکان بینی هەموو (موعجەبەن= سەرسامن) بەو کارە".

ئیتر ئەوەبوو دوای ئەوە لە هـەر شـوێنێکدا قورئـان بنووسـرایەتەوە لەبـەر ئـەو قورئانانە ئەنووسرانەوەو کەس قورئانی تری لانەما، چونکە خەلیفەی موسـڵمانان فـەرمانی (دڕانـدنی، یـان سـوتاندن)ی هـەموو مەصـحەفێکی تـری دەرکـرد بـوو، هەموو ئوممەتیش فەرمانەکەیان جێبەجێ کرد، هەندێ لە مێژوونووسان ئەڵێن لـە کاتی شەڕی "صفين"دا خەڵکی شام پێنجصەد قورئانیان بەرز کردەوە بۆ ئـەوەی شەرەکە رابگیرێت، دەی خۆ ماوەی نێوان نووسینەوەی قورئانو شەڕی "صفين"

---

[٧٠] المنجد، وشەی (مشق)، ص٧٦٣.

[٧١] علی الصلابی لە (عیمان بن عفان، ص٢٥٢)دا ئەڵێ: (مشق في الكتابه: أی: مد حروفها و جوّدها، فالخگ مشق وممشوق).

نزیکەی حەوت ساڵ بوو.٧٢ کەواتە دوای ئەوە لەبەرئەو (قورئانە پێشەنگانە) قورئانی تر ئەنووسرایەوە و روونووسەکانی زیاد ئەکرا.

راستە قورئانەکانی سەردەمی عوسمان جوان نوسراونەتەوەو رۆشن بووە، بەلام لەبەر ئەوەی کە خاڵبەندی و سەرو بۆری نەبووە، هەندێ کەسی عەرەبینەزان کەوتوونەتە هەڵەوە لە کاتی قورئان خوێندندا بۆیە بیر لەوە کراوەتەوە کە خاڵ بۆ پیتەکان دابنرێ.. لە کاتی حەزرەتی عوسماندا مەصحەفەکە بەو شێوەیە نووسراوە تا زیاد لە خوێندنەوەیەك هەڵبگرێ بۆ نموونە نووسراوە: "وانظر الی العطام کیف ننسرها ثم نکسوها لحما" هەڵی گرتووە بە "ننشزها" بخوێنرێتەوەو هەڵی گرتووە بە "ننشرها" بخوێنرێتەوە، یان "ان جاءکم فاسق بنبا فتبینوا" هەڵی گرتووە بە "فتبینوا" بخوێنرێتەوە، هەڵیشی گرتووە بە "فتثبتوا" بخوێنرێتەوە کە ماناکانیان لەیەکەوە نزیکە.. ئەم جۆرە نووسینانە لای عەرەب شتێکی سەیر نەبوو، خوێندنەوەکەشی شتێکی زەحمەت نەبوو لای ئەوان، بەلام بۆ جگە لە عەرەب زەحمەت بوو، زۆرجار ئەکەوتنە هەڵەوە، بۆیە موسڵمانان بیریان لەوە کردەوە کە ئەو کێشەیە چارەسەر بکەن، و خاڵو سەروبۆر بۆ قورئان بکەن بۆ ئەوەی هەموو کەس بتوانێ قورئان بخوێنێتەوە بەبێ هەڵە، زانایان چەند رایەکیان هەیە دەربارەی ئەوەی ئایا یەکەم کەس کێ بیری لەمە کردوەتەوەو لەسەردەمی کێدا بووە.

- زۆربەی زانایان رایان وایە یەکەمین کەسێك کە بیری لەم کارە کردوەتەوە و پێی هەستاوە (ئەبوئەسوەدی دوئەلی) یە، کە پیاوێکی عەرەبیزانو زۆر خوێندەوار بووەو هەر ئەم (ئەبوئەسوەدە) بە فەرمانی عەلی کوڕی ئەبی تالیب بنەماو رێساکانی (زمانی عەرەبی) داناوە.٧٣

---

[٧٢] أحمد عادل كمال، علوم القرئن، ص٦٧و ٦٨.

[٧٣] القطان، مباحث في علوم القرآن، ص١٤٣، ئەبوئەسوەد یەکێکە لە (تابعینە) بەڕێوەکانو لەبەصرە دا ساڵی ٦٩ی کۆچی وەفاتی کردووە.

زییاد کە والی (بصره) بوو داوای کرد لە (ئەبوئەسوەدی دوئەلی) خزمەتێك بە قورئان بکاتو سەرو بۆر بۆ قورئان دابنێ تا خەڵکی لە خوێندنەوەدا هەڵە نەکەن، ئەویش هەر دوای ئەخاتو کارەکە ناکات، تا رۆژێك گوێی لە کابرایەك ئەبێت ئەم ئایەتە ئەخوێنێتەوە (إن الله بريء من المشركين ورسوله) ئایەتەکە یانی: خوا و پێغەمبەری خوا (بەرین) لە موشریکەکان، "رسولُهُ" لە ئایەتەکەدا (مەرفوعە)و بۆری هەیە کەچی کابرا (رسولِهِ)ی بە "مجرور"ی خوێندەوەو ژێری دا بە لامەکە، مانای ئایەتەکە هەڵەیەکی گەورەی تێکەوت، چونکە ئەوکاتە ماناکەی وایلێدێ: خوا "بەرییە" لە موشریکەکانو لە پێغەمبەرەکەشی ! !

(ئەبوئەسوەدی دوئەلی) راچڵەکیو وتی: "بێگەردی بۆ خوا لەوەی خۆی بەری بکات لە پێغەمبەرەکەی و بەپەلە خۆی گەیاندە "زیاد"و پێی وت: ئەو کارەی خستوتە سەرشانم رایئەپەڕێنم، هەستا دەستیکردە خاڵبەندی بۆ قورئان، بۆ (سەر= فتح) خاڵێکی لەسەر پیتەکە دادەناو بۆ (بۆر= ضم) خاڵێکی لە ناوەڕاستی پیتەکەدا دائەناو بۆ (ژێر= کسر) خاڵێکی لەژێر پیتەکەوە دائەناو بۆ (زەنە = سکون) دوو خاڵی لەسەر پیتەکە دائەنا.٧٤

ئیمامی سیوطی ئەڵێ: یەکەمین کەس کە ئەم کارەی کرد (ئەبوئەسوەدی دوئەلی) بوو بە فەرمانی خەلیفە عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان نەك بە فەرمانی (زیاد)، چونکە نزیکەی چلو ئەوەندە ساڵ خەڵك هەر لەبەر مەصحەفەکەی عوسماندا قورئانیان ئەخوێند تا هەڵەو خوێندنەوەی نادروست لە عێراقدا پەرەی سەندو کاربەدەستان بیریان لەخاڵو شێوەی نووسین کردەوە.

هەندێ ریوایەتی تریش هەیە کە ئەوکارە ئەدەنە پاڵ خەڵکی تر وەك: شێخ حەسەنی بەصری، یەحیای کوڕی یەعمور، نەصری کوڕی عاصمی لەیثی، ٧٥ (ئەبوئەسوەدی دوئەلی) کە بەو کارە ناوبانگی دەرکردووە، لەوانەیە هەریەك

---

[٧٤] القطان، مباحث في علوم القرآن، ص١٤٣.

[٧٥] "نەصری لەیپی" یەکێکە لە فیقهزانەکانی تابعینو لە بەصرەداو لە ساڵی (٨٩) کۆچی دا وەفاتی کردووە.

لەوانە لە گۆشەیەکەوە خزمەتێکیان لە جوانکاری قورئان دا بە جۆرێك ئەنجام دابێت بۆیە لەم باسەدا ناویان دەهێنرێت.

ـ نووسینەوەی قورئان سەردەم دوای سەردەم جوانکاریو ئاسانکاری زیاتری بەخۆیەوە ئەبینی و وای لێ هات چەند رەنگێك بۆ نووسینی پیتەکان بەکاردەهێنرا، هەر پیتێك بە رەنگی سوور بنووسرایە بەڵگەی ئەوەبوو کە لە کاتی خوێندنەوەدا ناخوێنرێتەوە (واتە تەلەفوزی پێ ناکرێ) وەك پیتە شەمسییەکان، پاشان (خليل بن أحمد الفراهيدی) ـ زانای گەورەی عەرەبیزانو دانەری زانستی (کێشو سەراوو بەحرەکانی عەروز و مامۆستای (سيبويه)ی ناوداریشە، ساڵی (٧٠) کۆچی لە بەصرە وەفاتی کردوە ـ هەستا بە دانانی (سەرو بۆرو زەنەو ژێر) بەشێوازێکی تری تازە، (ژێر) (لاکێشەیەکی درێژ) لە ژێر پیتەکەداو (سەر) لاکێشەیەکی درێژ لەسەر پیتەکەداو بۆر (واوێکی بچووك) لەسەر پیتەکەو بۆ (تنوین) دوو واوی بچووك، یان دوو ژێری بچوك، یان دوو سەری بچووكو بەرەنگی سور هەموو ئەو پیتانەی ئەنووسی کە ناخوێنرێنەوەو تەلەفوزیان پێ ناکرێ، تەنانەت نیشانەی (ئيقلاب)و (ئيدغام)یشی بەوشێوەیە دانا".[٧٦]

ـ پاشان سەردەمی سێیەمی کۆچی هاتە پێشەوە و نیشانەی (مدّ)و (شدّە)و (هەمزەی وەصل) دامەزرانو پاش ئەوەش پلە پلە خەڵکی ناوی سورەتەکانو (مکی)و (مدنی)یان لەسەرەتای سورەتەکاندا بە زەخرەفە و جوانکارییەوە ئەنوسیو نیشانەکانی (وەقف)و وەستان لەسەر ئایەتەکانیان دانا لە رووی ماناو ئەو ریوایەتانەی لەسەریان هەبوو، دوای ئەوەش (جوزئەکان)و (حیزبەکان)و نیشانەی (سجدە) و (سکتە)و هەموو ئەوانەیان دانا.

---

[٧٦] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص١٤٤، هەروەها (أصول الأحكام، د. حمد الكبيسي و دكتور صبحی جميل، ص٤٣).

راستە زانایان لەسەرەتادا بە ترسەوە دەستیان بۆ قورئان ئەبردو نەیان ئەوێرا دەسکاری هیچ شتێکی بکەن، نەشێوازی نووسینەکەو نە هیچی تری، چونکە ئەوە قورئانە و کەلامی خوایەو ئاسان نییە خەڵکی هەروا بێ ترس دەستی بۆ بەرێت، ئەم ترسەی موسڵمانان بۆ جوانکردنی قورئان و رێکخستنی زیاتری سورەتو ئایەتەکانی زیاتر لە دوو شتەوە سەرچاوەی گرتبوو:

یەکەمیان: ئەو هەمووە ترسو حەزەرەی کە ئەبوبەکرو عومەرو صەحابەکانی تر بە خەرجیان دا لە کۆکردنەوەو نووسینەوەی قورئاندا، ئەوەبوو بەرەدەوام پرۆسەی نووسینەوەیان ئەهێناو ئەبرد و نەیانئەزانی ئەنجامی بدەن یان نا، تاکە بەڵگەی دەستیان ئەوەبوو ئەیانووت: "إنه والله خير".

ئەم ترسەی صەحابە لەبەرئەوە بوو ئەترسان ئەوە بیدعەو بێ شەرعی بێت کارێك بکەن کە پێغەمبەر (صلی الله علیە والە وسلم) نەیکردبێت، بەڵام پاشان (بەرژەوەندی موسڵمانانیان) لەوەدا بینیوە کە ئەم قورئانە هەمووی کۆبکرێتەوەو هیچی لێ نەفەوتێ و کارەکەش بەڵێ پێغەمەبەر (صلی الله علیە والە وسلم) خۆی نەیکردووە، بەڵام خۆ رێگەی داوە خەڵکی بینووسنەوەو لای خۆیان هەڵی بگرنو بۆ خۆشی ئەو هەمووە "نووسەری وەحی" هەبووەو تەواوی ئایەتەکانی قورئانی پێ نووسیونەتەوە.

دووەمیان: قسەیەکی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود هەبوو دوای خۆی موسڵمانانی زۆر ئەترسان لەوەی دەست بۆ قورئان بەرن، قسەکە ئەفەرموێ: "جرّدوا القرآن ولاتخلطوه بشيء". قورئان لە هەمووشتێکی تر دابڕنو شتی تری تێکەڵ مەکەن. ئەمە وای کرد کە خەڵکی نەوێرن لەو رێورەسمە لابدەن کە حەزرەتی عوسمانو صەحابە دایان نابوو بۆ قورئان.٧٧بۆیە ماوەیەکی زۆر هەر بەو شێوازە قورئان

[٧٧] بیرمە لە ساڵی ١٩٨٢ دا بەرێز مامۆستا عومەر رێشاوی کە زانایەکی خوێندەوارو بە توانای ناوچەی هەڵەبجە بوو فەرمووی: من رام لەوەنییە قورئان جگە لەناوی سورەتو ئایەتەکان هیچی تری لەگەڵدا چاپ

ئەنووسرایەوەو ئەخوێنرایەوە کە نزیکەی پەنجا ساڵی خایاند.٧٨ بەڵام ئەوەبوو لە پاشاندا زانایان هەریەکەیان لە سەردەمی خۆیدا جۆرێك لە (خێر)ی ئەبینی لە جوانترکردنی ـ مصحف ـ داو هەندێ سەرەتادانانی خاڵیان بە (دروست) ئەزانی، چونکە لایان وابوو ئەوە دەستکاری کردنی قورئان نییە، بەڵام (پێنجیەك) کردن و (دەیەك کردن) و (ناوی سورەتەکان) و ئەو شتانەیان بە (دروست) نەئەزانی.. ئیمامی نەوەوی ئەفەرموێت: "هەموو زانایان یەکدەنگن لەوەدا کە نووسینەوەی قورئان و روونکردنەوەی و دەربڕینی‌و لێکدانەوەی رێنووسەکەی بێ زۆر لە خۆکردن‌و هەڵواسینی کارێکی زۆرباشە، زانایان ئەفەرموون: شتێکی باشە (موستەحەبە) خاڵ‌و شێوەی تایبەت بۆ قورئان دابنێی، چونکە قورئان لەوە ئەپارێزرێت کە ئاوازی هەڵەی بدەیتێ یان بە هەڵە بیخوێنیتەوە، ٧٩ئەو قسەیەی (شەعبی)و (نەخەعی) ئەیکەن وایە خاڵ دانان بۆ قورئان کەراهەتی هەیە، ئەوە ئەوان لە زەمانی خۆیاندا بەکەراهەتیان زانیوە لە ترسی ئەوەی نەك گۆڕانکاری لە قورئاندا دروست بکات‌و ئەمڕۆ ئەو ترسە نەماوەو ئەوەش نابێتە رێگر گوایە ئەوە (بیدعە)یە، چونکە ئەوە (بیدعەیەکی حەسەنە)یەو رێگەی لێ ناگیرێ وەك چۆن رێگە لەو شتانەی تریش نەگیراوە کەلەم ئیشە ئەچن، وەك دانانی کتێب لە زانستەکاندا، یان دروستکردنی قوتابخانەو پەیمانگاو٨٠ شتی تریش... والله أعلم).٨١

---

بکرێ، چونکە سەرئەکێشێ بۆ دەستبردن بۆ قورئان، دیارە هەر ئەو ترسە بوو کە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود باسی لێوەئەکات.

[٧٨] القطان، علوم القرآن، ص١٤٣.

[٧٩] لەلای أحمد عادل کمال نووسراوە (صيانة من اللحن فيه وتصحيحه)، بەڵام لە (تبيان)ەکەدا ئەڵێ: (.. وتصحيفه)، بۆیە ئێمە لەسەر دەقە سەرەکییەکەی رۆیشتین‌و ئەویان‌و بە هەڵەزانی.

[٨٠] نەوەوی وشەی (الرباط)ی بەکارهێناوە کە (الرباط) کۆیەکەی (رباطات)ە، بە مانای (المعاهد المبنية والموقوفة للفقراء) دێت، واتە پەیمانگای دروستکراو کە تایبەتەو وەقفە بۆ هەژاران.

[٨١] تفسير الجلالين، آداب حملة القرآن، النووي، ص٦٣٣.

ـ ئێستاش موناقەشەیەکی بەردەوام لەناو زانایاندا هەیە لەسەر ئەوەی ئایا دروستە قورئان بە ڕێنووسی ئێستا بنووسرێتەوە یان نا؟ واتە: بەهەمان شێوازو خاڵبەندیو فاریزەوە.. زانایانی ئیسلامیی سێ رایان هەیە لەسەر ئەم پرسەو هۆکەشی ئەوەیە کە هەر لە دێرزەمانەوە ئەو سێ رایە هەیەو لە هەموو سەردەمێکدا هەندێ (یار)و هەندێ (نەیار) بۆ یەکێك لەو رایانە دروست ئەبێت، بناغەی پرسەکەش ئەوەیە (ئایا ئەو رێوڕەسمەی مەصحەفی عوسمانی پێ نووسراوەتەوە شتێکی تەوقیفیو خواییە و دروست نییەو لێی لابدرێت، یان شتێکی عورفیو ئیعتبارییە[٨٢]و بۆ خەڵك دروستە لەهەر سەردەمێکدا بەپێی رێنووسی ئەوکاتەی خۆیان قورئان بنووسنەوە.

رای یەکەم: ئەڵێت: رێنووسی قورئان تەوقیفییەو دروست نییە لێی لابدرێو بگۆڕدرێ ئەمەش رای زۆرینەی زانایانە، و بەڵگەکانیشیان ئەوەیە کە نووسەرانی (وحی) هەر بەم پیتو رێنووسانە لە خزمەت پێغەمبەردا قورئانیان نووسیوەتەوەو پێغەمبەریش (صلى الله علیه واله وسلم) بۆی سەلماندوونو پێی رازیبووە، پاشان ئەبوبەکریش بەهەمان رێورەسم قورئانی نووسیوەتەوەو عوسمانیش هەر بە هەمان شێوە ئەو هەشت قورئانەی لەبەر قورئانەکەی ئەبوبەکر گرتەوەو هەموو صەحابەش پشتیوانیان لەو نووسەرانەو لە ئەبوبەکرو عوسمان کردووەو پاشان تابعینو شوێنەکەوتەی تابیعینیش هەر لەسەر ئەو رێورەسمە رۆیشتوونو تەنانەت لە چەرخی زێڕینی دانانو وەرگێڕانیشدا کە پرۆسەی نووسینەوە گەیشتە لوتکە،

---

[٨٢] (تەوقیفی) زاراوەیەکی شەرعییەو مەبەست پێی ئەوەیە شەرع ئەو شتەی داناوەو چەقی لەسەر گیراوەو دروست نییە کە بگۆڕدرێ، ئێستاکە ئەوترێ: تەرتیبی ئایەتەکان تەوقیفین، واتە: پێغەمبەر (صلى الله علیه واله وسلم) دایناون، یان بە هەمان شێوە ئەوترێت ریزبەندی سورەتەکان تەوقیفین، بەلام ئەوترێ دانانی خاڵ لەسەر پیتەکان ئیعتیبارین، واتە: صەحابە دایان ناوە، هەروەها دانانی جوزئەکانو سەروبۆرو ناوی سورەتەکانو دیاریکردنی (مەککی)و (مەدەنی) .. و هەروەها.

ڕێورەسمی عوسمانی لە نووسینەوەی قورئانـدا هـەر سـامو ڕێـزی خـۆی هـەبووەو کەس بیری لە گۆڕینی نەکردوەتەوە.

بەکورتی: ڕێوڕەسمی عوسمانی رای پێغەمبەر (صلی الله علیه واله وسـلم)و رای هەمو صەحابەو رای هەموو ئوممەتو رای هـەموو پێشـەوایانی خـاوەن ئیجتیهـادو رای هەموو چوار مەزهەبـە فیقهییەکـەی لەسـەرەو بەیهـەقی و نەیسـابوریش ئەمـە دەڵێنو لەو سەردەمانەدا کەس پێچەوانەی ئەم رایە نەبووە.٨٣

رای دووەم: زۆرێـك لـە زانایـان رایـان وایـە کـە ڕێـوڕەسمی عوسمـانی شـتێکی تەوقیفی نییەو پێغەمبەر (صـلی الله علیـه والـه وسـلم) دایینابێـت، بـەڵکو شـتێکی زاراوەییەو عوسمان پێی رازی بووەو ئوممەتیش لەویان وەرگرتووە بۆیـە دروسـت نییـە ئێمـەش بیگـۆڕینو پێچـەوانەی ئـەو قورئانـە بنووسـینەوە، (ئەشـهەب) کـە زانایەکی موسڵمانە ئەڵێ: پرسیاریان لە ئیمامی مالیك کرد ئایا دروستە بەپێی ئەم ڕێنووسـی هیجائییـەی ئێسـتا خـەڵکی دایـان هێنـاوەو لەسـەری ئـەڕۆن، قورئـان بنووسرێتەوە؟ فەرمووی: "نەخێر، هەر ئەبێ بـە شـێوەی نووسـینی یەکـەمجاری قورئـان بنووسـرێتەوە". ... ئیمـامی ئەحمـەدیش ئەفـەرموێ: "حەرامـە بـە پێچـەوانەی نووسـینی مەصـحەفەکەی عوسمانـەوە، (واو)، یـان (یـاو)، یـان (ئەلیف)، هەر پیتێکی تر بنووسرێتەوە (لەکاتی نووسینەوەی قورئاندا)".٨٤

رای سێیەم: هەندێ لە زانایان رایـان وایـە ئـەم ڕێورەسمـەی عوسمـان شـتێکی زاراوەیـیو عورفییـەو دروسـتە بـەڕێورەسمێکی جیـاوازتر لـەو ڕێورەسمـە قورئـان بنوسرێتەوەو هیچی تێدا نییە، (ئیبن خەلدون) و (عیزەددین کوڕی عەبدولسەلام) لەسەر ئەم رایەن، (ئەبوبەکری باقەلانی) ـ کە زانایەکی گـەورەی ئیسـلامییە ـ لـە کتێبی: "الإنتصار"دا ئەفەرموێ: "سەبارەت بە نووسینەوەی قورئان خوای گەورە هـیچ ڕێـورەسمێکی تایبـەتی فـەرز نـەکردووە و دایینابـێ هـەر ئـەبێ بەوشـێوە

---

[٨٣] أحمد عادل كمال، علوم القرآن، ص٦٤.

[٨٤] القطان، علوم القرآن، ص١٤٠.

خـەتخۆش‌و نووسـەرانی قورئـان کتـێبی خـوا بنووسـنەوەو خـۆ بـە دووربگـرن لـە ڕێنووسی تر، چونکە ئەمە بە ڕێگەی دەق دائەمەزرێ‌و هیچ دەقێکیش نـەهاتووە ئەمـەی کردبێتـە کـارێکی تـەوقیفی (نـە ئایـەتێکی قورئـانی‌و نـە حەدیسـێکی پێغەمبەرو نە ئیجماعێکی ئوممـەتی ئیسـلامیی‌و نـە قیاسـێکی شـەرعیش).٨٥ بـە کـورتی ئـەوەی لاف ئـەوە لێبـدات کـە واجبـە خـەڵکی هـەر ئـەبێت بـەڕێورەسمی تایبەت قورئان بنووسێتەوە، ئەوە ئەبێت بەڵگە بۆ ئەم لافلێدانەی بهێنێتەوەو لـە کوێ ئەشتوانێ بەڵگە پەیدا بکات).٨٦ هەندێ لەوانەی کە لـەم زانسـتی قورئانـەدا کتێبیان نووسیوە رایەکی تر ئەهێنن، گوایە هەندێ لە زانایان رایان وایە کـە نـەک هــەر "جـائیز"و دوورسـتە بـەڕێورەسمێکی تـر قورئـان بنووسـرێتەوە، بـەڵکو "واجبیشە" بەپێی ڕێنووسی سەردەم قورئان بنووسرێتەوە، چـونکە ڕێـورەسمی عوسمـانی هەنـدێ خـەڵکی نـەزان ئەخاتـە هەڵـەوە، لەگـەڵ ئـەوەدا پێویسـتە ڕێنـووس‌و ڕێورەسمـە عوسمانییەکـەش وەك کەلـەپورێکی بـەنرخ پارێزگـاری لـێ بکرێت کە لە پێشینە صاڵحەکانمانەوە بۆمان جێمـاوەو ئـەم رایـەش ئەدەنـە پـاڵ یەکێکی وەك عیزەدین عەبدولسەلام.٨٧

لە سۆنگەی ئەم رایەو رای پێشـووەوە، هەنـدێك لـەم ڕۆژانـەدا داوا ئەکـەن کـە قورئان بەڕێنووسی تازەو وەك هەموو کتێبێکی تر چـاپ بکرێتـەوە تـا خـەڵکی بـە ئاسانی بیخوێنێتـەوەو خوێنـدکاری هـەموو قۆناغـەکان لێـی تێبگـەن‌و هەسـت بـە جیاوازی قورئان‌و کتێبی تر نەکەن‌و سوود لە خاڵبەنـدی نـوێ بکـەن‌و بـزانن کـوێ پرسیارەو کوێ هاوارەو کوێ سەرسوڕمانەو ... هتد.

بەڵام ئەوەی کە رای گشت موسڵمانانی ئەم سەردەمەی لەسەرەو فەتوای کـۆڕە فیقهییەکان‌و سەنتەرەکانی زانستی لەسەرە ئەوەیە کـە دەسـتگرتن بـەڕێورەسمی

---

[٨٥] ئەو رایەی (باقەلانی)م کورتکردووەتەوە.

[٨٦] القطان، علوم القرآن، ص١٤١.

[٨٧] أحمد عادل کمال، علوم القرئن، ص٦٥.

عوسمانییەوە لە کاتی چاپکردنی قورئاندا کارێکی داواکراوەو نابێ لێی لابدرێت لەبەر چەند هۆیەك:

١ـ هێشتنەوەی ئەو ڕێورەسمە کە لەو چەرخە ئیسلامییە کۆنانەوە بۆمان ماوەتەوە.

٢ـ ڕێگەگرتن لە گۆڕینو یاری کردن بە وشەکانو گاڵتەکردن بە پیتەکان، چونکە ئەم ڕێنووسە تازانە ئەکەونە بەر گریمانی گۆڕینو لەبری دانانو ڕێگەگرتنیش لەوانە سەبارەت بە قورئان کارێکی پێویستە.

٣ـ زیادە ئیحتاتێکە بۆ ئەوەی قورئان هەر لە سەر بناغە بنەڕەتییەکەی خۆی وەك وێنەو وەك نووسینیش بمێنێتەوە.

٤ـ کارێکە تا ئەمڕۆ هەموو ئوممەتی ئیسلامیی لەسەری ڕۆیشتوونو بووەتە ڕێگەو ڕێبازی ئیمانداارانو خوای گەورەش ئەفەرموێ: (وَمَن يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَى وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّى وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ وَسَاءتْ مَصِيراً) (النساء: ١١٥) .

٥ـ ملکەچکردنی قورئان بۆ ڕێنووسی تازە سەرئەکێشێ بۆ ئەوەی فیتنەیەکی نوێ وەك فیتنەی سەردەمی حەزرەتی عوسمان دروست ببێتو یەکێك بڵێ "ڕێنووسەکەی من لەوەی تۆ چاکترە"و یەکێکی تر بڵێ: "قورئانەکەی من لەوەی تۆ چاکترەو سەر بۆ بێنەزمیو جۆرێك بێدینی بکێشێ.. حەزرەتی عوسمان ئەوکاتە فەرمووی: ".. ما تقولون في المصاحف؟ فان الناس قد اختلفوا في القراءة حتى ان الرجل ليقول: قراءتي خير من قراءتك وقراءتي افضل من قراءتك، هذا شبيه بالكفر، قالوا: ما الراي عندك ياأمير المؤمنين؟ قال: الرأي عندي أن يجتمع الناس على قراءة.."[88] واتە: خەڵکینە چی ئەڵێن دەربارەی ئەم قورئانەی لای خەڵکی هەیە؟ خەڵکی جیاوازییەکی زۆریان کەوتۆتە ناو لە کاتی قورئان خوێندنەوەدا، وای لێهاتووە ئەم پیاوە ئەڵێ: خوێندنەوەکەی من خێری لە

---

[88] هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٥١ـ ٥٢.

خوێندنەوەکەی تۆ زیاترەو خوێندنەوەکەی من لە خوێندنەوەکەی تۆ باشترەو ئەمەش لە کوفرو بێدینی ئەچێ، وتیان: جا رای جەنابت ئەی گەورەی ئیمانداران چییە؟ فەرمووی: رای من ئەوەیە هەموو خەڵکی لە دەوری یەك خوێندنەوە کۆببنەوە، ئەوەتا حەزرەتی عوسمان ئەو جۆرە قسانە بە جۆرێك لە بێدینی ئەزانێ، چونکە گاڵتەکردن بە ـ مصحف ـ و خوێندنەوەی یەکێکی تر ـ پەنا بە خوا ـ سەر لەو شتانەوە دەرئەهێنێت.

٦ـ بە ڕێوڕەسمی عوسمانی سام و تایبەتمەندی قورئان وەك خۆی ئەمێنێتەوەو کەس زات ناکات وەك کتێبێکی تر هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکات، بەڵکو وەك کتێبێکی پیرۆز و موعجیزەئامێز سەیر دەکرێ.

٧ـ لە رێگەی ئەو رێورەسمەوە ئەزانرێت ئەو وشەیە چەند جۆر خوێندنەوەی هەیەو کامیان دروستەو کامیان نادروستە".[٨٩]

٨ـ بوونی ئەم رێورەسمەی قورئان بەو شێوەیەی کە هەیە، هەمیشە ئاماژە بۆ ئەو بەرە نەجیبزادانە ئەکات کە تەمەنیان بۆ خزمەتکردنی ئەم قورئانە دانا، بەردەوام بە کردنەوەی دەمی ئەم قورئانە ئەو سەردەمانە حوزور پەیدا ئەکەنەوە و بەرجەستە ئەبنو ئامۆژگاری بەرەی نوێ ئەکەنو داوایان لێ ئەکەن: مەرد بن دەست بەم قورئانەوە بگرن، بیخوێننەوەو کاری پێ بکەنو بە دنیادا بڵاوی بکەنەوە، رایبگەیەنن کە ئەم قورئانە پەیامی خوایەو لە ئاسمانەوە هاتووە بۆ سەر دڵی بەڕێزترین خولقاوی خوا کە حەزرەتی موحەممەدە (صلی الله علیە والە وسلم)و ئەویش بەبێ ئەوەی یەك ئایەت یان یەك وشە چییە لێی بشارێتەوە، گەیاندی بە ئەصحابو ئەوانیش بە تابعینو ئەوانیش بە نەوەکانی دوای خۆیانو تاگەیشتە دەستی ئێوە. ئەم حزورەی ئەو هەمووە سەردەمە ئیسلامییە لە شێوازو رێورەسمی مەصحەفی عوسمانیدا کارێکە زۆر بە نرخو شایەنی ئەوەیە

---

[٨٩] بۆ وەرگرتنی ئەو خاڵانە سوودم لەم کتێبانە وەرگرتوە: (التفسیر المنیر، جەلدی یەکەم، مباحث في علوم القرآن، مناع القطان، أحمد عادل کمال، علوم القرآن).

لەسەری بوەستین، بەڵام ئەگەر قورئان بەرێنووسی تازە نووسرایەوەو چووە ریزی کتێبەکانی ترەوە ئەم هەمووە مەشهەدە ون ئەبێو وەك ئەوەسە کە تازە هاتبێتە بوون.

زانایانو بە تایبەتی (لیژنەی فەتوای ئەزهەر) لەگەڵ ئەوەدا کە چاپکردنەوەی قورئان بە دروست نازانن بەپێی رێنووسی تازە، بەڵام نووسینی هەندێ ئایات لە کاتی دەرسوتنەوەدا یان لە کاتی بەڵگە هێنانەوەدا لە کتێبێکدا کە ئەنووسرێ یان لە ناو کتێبەکانی وەزارەتی پەروەردەو فێرکردندا یان پیشاندانی لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنو ئەو شتانەدا، هیچ رێگرییەك نییەو دروستە بکرێت[٩٠]و ئەوەی دروست نییە بکرێت چاپکردنەوەی قورئانە بە رێنووسی تازە.

"محمد الغزالی"یش زاناو گەورە نووسەری ئیسلامیی میسریش بەرەحمەت بێت، لە کتێبی (السنة النبویة بین أهل الحدیث وأهل الفقه)دا ئەڵێ: لەبەرئەوە نەبوایە کە ئیجماعی ئوممەتی ئیسلامی لەسەر ئەوە هەیە پارێزگاری لە رێورەسمی عوسمانی بکرێت لە کاتی چاپکردنەوەی قورئاندا ئەموت چاپکردنەوەی قورئانیش بەرێنووسی تازە هیچی تێدانییە.[٩١] /مامۆستا مەلا کەریمی مودەڕیس–رحمە‌الله– دەربارەی ئەم رێوڕەسمەی قورئان ئەفەرموێت:

دەخیل سەد دەخیل نەکەونە خەیاڵ
بۆ گۆڕینی خەت بکەونە ضلال
رەسمی خەط (سەددە) کاتێ کە شکا
لافاوی نەگبەت عالەمێ ئەبا
با هەر بەو لەهجە لەسەر هەتا خوار
بەوشێوەیە خەططە گرتی ئیستقرار
بمێنێتەوە هەتا هەتایە

[٩٠] التفسیر المنیر ، وهبە الزحیلی، ٢٧/١. لەوێدا ناوو ژمارەی ئەو گۆڤارەی هێناوە کە ئەو فەتوایەی تێدا بڵاوکراوەتەوە.

[٩١] السنة النبویة بین أهل الحدیث وأهل الفقه، محمد الغزالی.

مایەی مانەوەی دینی خودایە.٩٢

هەر بۆ زیاتر سەلماندنی ئەوەی کە قورئان پارێزراوە و دەستی لادانی پێنەگەیشتووە پێمباشە وەك بەراوردکردنێك ئەم برگەیەش باس بکەین ئەویش ئەوەیە کە ئایا قورئان جیاوازی هەیە لە کتێبە ئاسمانیەکانی تر بەتایبەتی تەورات و ئینجیل؟چونکە لە میانەی ئەو بەراوردکاریەوە خوێنەر ئەو پانتاییەی بۆ رۆشنئەبێتەوە کە لە نێوان قورئان و کتێبەکانی تردا هەیەو زیاتر ئەگاتە ئەو یەقینەی کە: بەڵێ، قورئان تەنیا کتێبی ئاسمانی پارێزراوە، کە نە دەستی ترس و نە دەستی کەمدینی پێنەگەیشتووەو وەك خۆی نەوە بەنەوە بە پارێزراوی تا ئەمڕۆ هاتووەو تا قیامەتیش هەروا ئەبێت..

لە کتێبی دەروازەیەك بۆ زانستەکانی قورئان و لە باسی دەیەمی بەشی چوارەمدا باسێکی درێژی ئەو جیاوازییانەمان کردووە کە لە نێوان قورئان و هەریەك لە تەورات و ئینجیلەکاندا هەیە–چ لە شێوازی نووسینەوەیدا بێت، چ لە ناوەڕۆك و بابەتەکانیدا بێت– لێرەدا وەك وەڵامێك بۆ ئەو گومانەی کە ئەوترێ :چ جیاوازییەك هەیە لە نێوان قورئان و ئینجیلەکان و تەوراتدا، مەگەر هەموو کتێبی ئاسمانی نین؟ هەموو نەنووسراونەتەوەو تا ئەمڕۆ و نەپارێزراون؟ ئەی ئیتر بۆ ئەبێ قورئان تاکە کتێبی ئاسمانی پارێزراو بێت و ئەوانی تر وا نەبن؟!

## ئێمەش بە خاڵ و بە کورتی ئەڵێین:

١ـ ئەم کتێبانەی کە چ مەسیحیو چ یەهودی ناویان ناوە (العهد القديم)و(العهد الجديد) کە مەبەستیان بە یەکەمیان تەوراتو نامەکانی موسایە (سەلامی خوای لێ بێ)و مەبەستیان بە دووەمیان ئینجیلەکانو نامەکانی حەوارییەکانە، کەسیان بە سەنەدێکی نەپچڕاو (سند متصل) نەگەیشتوون بە خەڵکی، بەڵکو هەر هەموویان نزیکەی پەنجا شەست ساڵ دوای حەزرەتی مەسیح نووسراونەتەوە.

[92] نوری قورئان، مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، ص١١٥.

٢ــ هەریــەك لــەو ئینجیلانــەش كــە نووســراونەتەوە بــە دەســتی كەســێك نووسراوەتەوەو كاری شەخصی بوون، نووسینەوەی ژیان و راسپاردەكانی عیسایە لـە گۆشـەنیگای خۆیـەوە، كـە ئەمـەش هەڵـدەگرێ ئـەو كەسـە قسـەی خـۆی تێكەڵكردبێ وەك (وشە)و وەك (بیرۆكە)و وەك (مانـا)ش‌و هەڵیشـدەگرێ زۆر شـت هەیـە لـە بـیری كردبێـتو لـە بـیری نـەمابێت وەك (وشـە)و وەك (بیرۆكـە)و وەك (مانا)ش، چونكە پرۆسەی شەخصی هەروایە – لە هـەموو كـات و سـەردەمێكدا– تێكەڵ بە كەم و كـورتی، نـاكرێ ئـەو قسـانە بـە قسـەی خـوا دابنـرێن وەك چـۆن موسڵمانان بـۆ نمونـە سـیرەی ئـیبن هیشـام بـە قسـەی خـوا دانـانێن، چـونكە لـە راستیدا لێكچوونێكی زۆر لە نێوان كتێبەكانی سیرەو ئینجیلەكانـدا هەیـە لـە رووی بابـەت و شـێوازەوە، وەك هەنـدێ لـە زانایـان لەوانـە"دكتۆر سـەفەر حـەوالی" لـة كتێبي"العلمانيــة"دا ئــەڵێ:( إن أشــبه الكتــب الإســلامية بالأناجيــل، مــن جهــة موضوعها لا من جهة ثبوتها، هي كتب السيرة ... فهل يمكن بأى حال من الأحوال القول بأن سيرة ابن هشام مثلاً وحي منـزل مـن الله ؟ إن هـذا لمحـال شـرعاً وعقـلاً، فكيف وسيرة ابن هشام مقطوع بنسبتها إلى مؤلفها ومتصلة السند بصـاحب السـيرة صلى الله عليه وسلم ومحفوظـة بأصـلها العربـي، لم تتنـاولهـا الترجمـات، كمـا هـو الحال في الأناجيل)٩٣.

٣ـ مەسیحیەت و مەسیحییەكان دوای هەڵكێشانەوەی حەزرەتی مەسیح تووشـی راوەدونان‌و شكەنجەو ئازاری زۆربوونەوە، بە تایبەتی لە لایـەن یەهودییەكانـەوە، بۆیە هەر یەك لەو حەوارییانە و قوتابییەكانیان ئاوارەی وڵاتان بوون‌و كەوتنـە ژێـر چاودێری‌و كەسێك یان دەسەڵاتێك یان دەسەڵاتدارێك نـەبوو لـەو رۆژگارانـەدا ئـەم قوتابیانـەو مـژدەكانی حـەزرەتی مەسـیح بگرێتـە بـاوەش‌و كـار بـۆ نووسـینەوەو پاراستنیان بكات، لە راستیدا ریوایەتە مێژوویەكانیش باس لـەوە ئەكـەن كـە لـەو ماوەیەدا بووە كە ئینجیلەكان نوسراونەتەوە.

---

[٩٣] (٣٤/١).

٤ـ هەر پاش ئـەوەی کـە ـ حـەزرەتی مەسـیح ـ لـە دایـك ئـەبێت و سروشـی لـە خـواوە بـۆ دێـت یـەهود ئەچـنە بنکڵێشـەی حـاکمی رۆمـانی ئـەو کاتـە کـە نـاوی (قەیسـەر گیبـارۆس) ئـەبێ ئـەویش فـەرمانی دەسـتگیرکردنی حـەزرەتی مەسـیح ئەداتو لـە خاچـی ئـەدات—بـە پێـی قسـەی مەسـیحییەکان—و دەسـت بـە گرتنـی شوێنکەوتەکانیشـی ئـەکات، پـاش ئـەم قەیسـەرەش دوو قەیسـەری تـر دێـن کـە تاڵاوی دنیا ئەکەن بە قـوڕگی قوتابیـانی حـەزرەتی مەسیحداو قـڕان ئەخەنـە نـاو مەسحییەکانەوە، لەسەردەمی قەیسەری دووەمیانـدا "متـی" ئینجیلەکـەی خـۆی ئەنووسێتەوە بە زمانی "عیبرانی" و "یوحنا" کە ئینجیلێکی تایبـەتی بـە خۆشـی هەیە وەریئەگێڕێتە سەر زمانی "یۆنانی". سەختترین سـەردەم بـۆ مەسـیحییەکان سـەردەمی پاشـا (نـیرۆن) بـوو لـە سـاڵی (٦٤) زاینـیو پاشـان سـەردەمی پاشـا (تراجـان) لـە سـاڵی (١٠٦) زاینـی و سـەردەمی (دیسـیوس) بـوو لـە سـاڵی (٢٤٩) زاینیـدا و "پاشـا نـیرۆن" بـەوە تۆمـەتباری ئـەکردن گوایـە ئەمانـە (ڕۆما)یـان سوتاندبێت، بۆیە کەوتنە ئەشکەنجەدان و ئازاردانیان بە شێوەیەك کە مێژوو کەم شتی وای بە خۆیەوە بینیوە. بۆ نمونە:

ئەهاتن ئەم مەسحییانەیان ئەگۆڕی و جلی ئاژەڵیـان لـە بـەر ئـەکردن و فرێیـان ئەدانە بەر سەگی هار و ئەوانیش لەت و پەتیان ئەکردن.

ئەهاتن لە خاچیان ئەدان و جلێکی چەوری نەوتینیان لە بـەر ئـەکردن و پاشـان لە شەودا ئاگریان تێبەرئەدان و وەك چـرا بـە کاریانئـەهێنان بـۆ ڕووناککردنـەوەی ڕێگە و بانەکان و (نیرۆن) خۆی لە ژێر ڕۆشنایی ئەم (چرا ئادەمیانە)دا هاتووچۆی ئەکرد ! !.

(مەرقس) ئینجیلەکەی خۆی لەم سەردەمەدا نووسییەوە لەو کاتەدا لـە "ڕۆمـا" بـوو هـەروەها (لوقـا)ش ئینجیلەکـەی خـۆی لـە سـەردەمی ئـەم قەیسـەرەدا نووسییەوە.

پاش ئەم سەردەمە (یوحنا)ش ئینجیلەکەی خۆی نووسییەوە و لە سەردەمی (دەقلیدیانووس)دا کە نزیکەی سێ سەد هەزار مەسیحی کوشت ئەمەش ساڵی (٢٨٤) زاینی ئەکات، ئەوانەی مێژووی مەسیحییەت ئەنووسنەوە ئەو هەمووە ئەشکەنجە و ئازار و تۆقاندنە ئەکەنە هۆ کە (سند)ی نەپچڕاو نییە بۆ ریوایەتی کتێبەکانیان و ئەوەش وا دەکات کە پەنا بۆ کاری نهێنی ببرێت و لە کاتی نهێنی و خۆشاردنەوەشدا چەندین شت ڕوو ئەدات کە ڕاستی مەسەلەکان ئەشارێنەوە و دڵنیایی کز دەبێت لە مرۆڤدا بەرانبەر راستی ئەو زانیارییانە.

٥- ئەم پرۆسەی نووسینەوەی تەورات و ئینجیلانە پرۆسەی شەخصی بوون، "دوو"ان لەو ئینجیلنووسانە کە بریتین لە "لوقا"و"مەرقص"لە بناغەدا هەر حەزرەتی عیساشیان نەبینیوەو قوتابی ئەو نەبوون، کارێکی تاکەکەسی بووەو لە پەنهاندا ئەنجامدراوەو کاری پێداچوونەوەو تەوسیق و موناقەشەی نەکراوەو ئەوەندەی نووسیوە کە لە بیری ماوەو شتەکانیشی بە مانا گواستووەتەوە نەك بە لەفز، کە ئەمەش بە تەواوی پێچەوانەی پرۆسەی نووسینەوەی قورئانە کە کارێکی دەستەجەمعی و ئاشکرا بووەو بە دیاری چاوی خەڵکەوە بووەو پرۆسەی جەمعکردنەوەی قورئانە نووسراوەکان بووەو نەك نووووسینەوەی ئەوەی رابووردووەو لە لایەن صەحابەکانی پێغەمبەرەوە(صلى الله عليه و اله و سلم)نووسراوەتەوەو بە لەفز نووسراوەتەوە نەك بە مانا، و دونیایەك ووردەکاری و موناقەشەش تەنانەت لەسەر پیتێکیش کراوە، یان لەسەر شکڵی ئەو وشەیە کراوە کە چۆن ئەنووسرێت، هەر بۆ نمونە زانایان ئەفەرموون: لەهەر شوێنێکدا کە باس لە ئافرەتێکی ناسراو کرابێت ئەوە وشەی(إمرأت)نووسراوە -بە تێی درێژ-و لە هەر شوێنێکیشدا باس لە ئافرەت بە گشتی کرابێت ئەوە وشەی(إمرأة)نووسراوە -بە تێی خڕ-و لەو رێوڕەسمەی قورئان لایان نەداوە ! !

٦ـ خوای گەورە کەباسی ئایینی مەسیحییەت و یەهودییەت ئەکات ئەفەرموێ (یکتمون ما انزلنا من الكتاب)، هەروەها ئەفەرموێ: (یحرفون الكلم عن مواضعه).

هەروەها ئەفەرموێ (ويل للذين يكتبون الكتاب بايدكم ثم يقولون هذا من عندالله و ما هو من عندالله و يقولون على الله الكذب وهم يعلمون). جياوازی نێوان ئەم ئينجيلانەش لە ناو خۆياندا و جياوازيان لەگەڵ ئينجيلی (برنابا)دا و جياوازيان لە گەڵ قورئانيشدا، ئەو دڵنياييە ئەدات بە مرۆڤی عەودالّی ڕاستی کە ئەو کتێبانە دەستکاری زۆر کراون و بیر و ڕای بەشەری زۆريان تێکەڵ بووە و بەو شێوەيەش نێوان زەوی و ئاسمانيان لەگەڵ قورئان و حەديسی پێغەمبەردا (صلى الله عليه واله وسلم) هەيە.

قورئان کە هەر لە سەردەمی پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) خۆيدا هەمووی نووسرايەوە و پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) لە ڕێگەی نووسەرانی (وحی) يەوە کە ژمارەيان لە (چل) کەس و لە ريوايەتێکی تردا (شەست) کەس بوون بەو شێوەيەی کە لە حەزرەتی جوبرەئيلەوە وەری گرتبوو (وشە) بە (وشە) گەياندیە نووسەرانی (سروش)و هەر جارێك (وحی) بهاتايە سەری، ئەينارد بەشوێن يەکێك يان زياتر لەو شەست کەسەداو ئەو ئايەتانەی بۆ ئەخوێندەوە کە بۆی هاتبوون، پێشی ئەفەرموو، لە فلانە شوێنو لە لای فلانە ئايەتو سوورەتدا بينووسە. پاشان کە ئەينووسی پێی ئەخوێندەوەو ئەگەر هەڵەيەکی کردبايە بۆی راستە ئەکردەوە، وەك زەيدی کوڕی سابيت ئەفەرموێ:(كنت اكتب الوحي عند رسول الله (صلى الله عليه واله وسلم) وهو يملي علي، فاذا فرغت، قال: اقرأه، فاقرأه، فان كان فيه سقط أقامه)٩٤.من لە خزمەتی پێغەمبەردا(صلى الله عليه واله وسلم)نيگام ئەنووسييەوە و ئەو بۆی ئەخوێندمەوە،کە لێئەبوومەوە، ئەيفەرموو:بيخوێنەرەوە !منيش ئەمخوێندەوە،جا ئەگەر هەڵەيەکی تيابوايە راستی ئەکردەوە.

و پاشان حەزرەتی ئەبوبەکر لە ڕێگەی ليژنەی تايبەت و بەڵگە نامەی ورد و وردکردنەوە و وەردکردنەوەی هەموو ئەو پەڕە و پارچە قورئانانەوە کە هەبوون

[٩٤] علوم القرآن، محسن عبدالحميدو رشدي عليان و غانم قدوري: ص٤٣.

جارێکی تر قورئان دوای یەك ساڵ لە مردنی پێغەمبەر (صلى الله عليه والـه وسـلم) کۆکردەوە و نووسیەوە٩٥ و پاشان چۆن لـە سـەردەمی حـەزرەتی عوسمانـدا، لـە ڕووی ئەو قورئانەوە چەندین نوسخەی تر نووسرایەوە و نێردرا بە هەرێمەکانـدا تـا خەڵکی گومانیان لە سەر قورئان بۆ دروست نـەبێت و بـە دەردی یـەهودو نەصـارا نەچن، دوایی کەس نـەزانێ کامـە قسـەی خوایـە و کامـە قسـەی خـەڵکی تـرە کـە خراوەتە ناو کتێبی خواوە.

٧- ئینجیلەکان دونیایەك جیاوازی لە نێـوان خۆیانـدا هەیـە، جـارێ ئەمـە یـەك ئینجیـل نییـە بـەڵکو چـەندین ئینجیـل هەیـە وەك مێـژوو بۆمـان ئەگێڕێتـەوە کـە لەسەردەمی کۆندا چەندین ئینجیلی تر نووسراونەتەوەو دەست بـە دەسـتیان پـێ کراوەو جێگەی بڕوای خەڵکی نەصرانی بـووەو کاریـان پێکـردووە، وەك ئینجیلـی (مرقیون)و ئینجیلـی (دیصـان)و ئینجیلـی (مـانی)و ئینجیلـی (سـبعین)و ئینجیلـی (برنابا)و ئینجیلی (تەزکیرە)و هەندێ ئینجیلی تریش... بەڵام لە کۆتایی سـەدەی دووەمو سەرەتای سەدەی سێیەمدا کڵێسا ویستی سنورێك بۆ کتێبـەکانی ئینجیـل دابنێتو هات تەنیا چوار ئینجیلی لەو هەمووە ئینجیلە پەسـەند کـردو سـەلماندنی ئەویش ئەمانەن: (متی)و (مرقس)و (لوقـا)و (یوحنـا) کـە دوانیـان وەك وتمـان لـە لایـەن کەسـانێکەوە نووسـراونەتەوە کـە قوتـابی خـودی حـەزرەتی مەسـیحیش نەبوون! کە بریتین لە(مەرقوس)و(لۆقا).

جگە لەوەش ئـەم ئینجیلانـە لـەناو خۆشـیاندا جیـاوازی زۆر هەیـەو یـەك ئـەوی تریان هەڵدەوەشێنێتەوە لە بری ئەوەی یەکتری بسەلمێنن.. بۆ نمونە :

١- لە هەردوو ئینجیلی"متی"و ئینجیلی"لوقا"دا نەسەبی یەسوع ـ کە بریتییـە لـە خـوا لای ئـەوان ـ ئەگێڕێنـەوە بـۆ"داود"، دروسـت لـە"متی"دا لـە نـەوەی

---

[95] لە پێشەوەو لە سەرەتای کتێبی"دەروازەیەك بۆ زانستەکانی قورئان"دا بە درێـژی و وردەکاریـەوە پرۆسـەی نووسینەوەی قورئانمان باسکردووە چۆن لیژنەی بۆ دانـراوە و ڕەچـاوی وردتـرین سیسـتمی نووسـینەوە کـراوە بـۆ کۆکردنەوە و نووسینەوەی قورئان، تکایە بۆی بگەڕێنەوە.

"سولەیمانی کوڕی داوده (متی١:٦)، کەچی لای"لوقا" لە نەوەی"ناسانی کوڕی داوده (لوقا ٣١:٣) .

٢- لە"سفرالتكوين"دا (١:٣-٥) ئەڵێ:« خلق النور والليل والنهار في اليوم الأول »، کەچی لە "سفر التكوين"دا (١٤:١) ئەڵێ : « خلق النور في اليوم الرابع ».

٣- کێ ئەو خاچەی هەڵگرتووە کە بە حسابی ئەوان خوا یان کوڕی خوای لەسەر لەخاچدراوە؟!!

مرقس (٢١:١٥)، ولوقا (٢٦:٢٣)، ومتی (٣٢:٢٧)هەموویان ئەڵێن ئەو کەسە"سەمعانی قەیروانی"بووە، کەچی "یوحنا" (١٧:٩) باسی ئەوە ئەکات کە ئەو کەسە عیسا خۆی بووە-سەلامی خوای لێبێت- .

٤- پاش مردنی مەسیح هەریەك لە "مرقس" و"لوقا" و"متی" لەسەر ئەوە یەکڕان کە نێزە نەکراوە بە جەستەی عیسادا، کەچی"یوحنا"باس لەوە ئەکات کە لەخاچدراوەکە سەربازەکان نێزەیەك ئەکەن بە کەلەکەیداو ئاوو خوێنی لێدێتەدەرەوە، بڕوانە (یوحنا ١٩: ٣١-٣٤)

٥-لە"سفر التكوين (الإصحاح ٢: ٣)دا ئەڵێ:"تعب الرب فاستراح في اليوم السابع"، ئەمەش دژ بەوەیە لە"سفر اشعياو (الإصحاح٤٠: ٢٨)دا هاتووە کە ئەڵێ:"الرب لا يكَلّ ولا يعيا".

٦-لە"سفر التكوين (الإصحاح ٦: ٦-٧)دا ئەڵێ:"ندم الله أن خلق الإنسان وقرر أن يمحوه عن وجه الأرض"، ئەمەش پێچەوانەی ئەوەیە کە لە "سفر العدد (الإصحاح ٢٣: ١٩)دا هاتووە کە ئەڵێ:"ليس الله إنساناً فيكذب ولا ابن إنسان فيندم".

٧- لە "سفر التكوين (الإصحاح ٢٠: ١٢)دا ئەڵێ: ئیبراهیم سارەی هێنا لەبەر ئەوەی کەکچی باوکی بوو، کەچی لە "سفر اللاويين (الإصحاح ١٨: ٩)دا ئەو کارە بە حەرام دائەنێت و لە"سفر التثنية (الإصحاح ٢٧: ٢٢)دا نەفرەتئەکات لەو کەسەی کاری وا بکات!

٨-لە ئینجیلی "متی(الإصحاح ٨: ٢٨-٣٤)دا ئەڵێ: مجنونان يكلما المسيح لإخراج الشياطين منهم فأخرجها ودخلت في الخنازير، ئەمەش پێچەوانەی ئەوەیە لە ئینجیلی مرقس (الأصحاح ٥: ١-١٧)دا هاتووە کە: مجنون واحد وقد أخرج المسيح منه ٢٠٠٠ شيطاناً ودخلت في ٢٠٠٠ خنزير .

٩-لە ئینجیلی متی (الإصحاح ١١: ١٤)دا ئەڵێ: مەسیح وتوویەتی: یەحیا بریتییە لە"إيليا"، کەچی ئینجیلی "یوحنا" (الإصحاح ١: ١٩-٢٨)دا ئەڵێ: یەحیا نکولی لەوە ئەکرد کە ئەو"إيليا"بێت

١٠- لە ئینجیلی مرقس (الإصحاح ١٠ : ٢٧)دا ئەڵێ: لأن كل شيء مستطاع عند الله، ئەوەش دژ بەوەیە لە (الإصحاح ١ : ١٩)دا هاتووە کە ئەڵێ:"لم يستطع الله طردهم لأن مركباتهم حديد" !

٨- لەو زانیاریانەی پێشووەوە بۆمان دەردەکەوێت کە کتێبە ئاینەکانی تر، چونکە ئەرکی سەرشانی هەڵگرانی ئەو دینە بوە بیپارێزن و بیگەیەنن، کەلێن و کەموکورتی زۆریان تێکەوتووە و هەریەکەی لە لایەکەوە هەوڵێکی شەخصی خۆی داوە بۆ ئەوەی زۆرترین ڕاسپاردە و ڕێنماییەکانی ئەو پێغەمبەرە (صلى الله عليه واله وسلم) کۆبکاتەوە و بیگەیەنێتە خەڵکی، یەکێکی تر بە جۆرێکی تر و ئەوەی تریش بە جۆرێکی جیاواز لە هەمووان، بۆیە کارەکە وای لێهاتووە جیاوازی و ناسازی زۆر لەو کتێبانەدا دروست بوون و جیاوازییەکانیش شتی ورد و ناگرنگ نین، بەڵکو شتی گەورە و زۆر هەستیارن چ بیر و باوەڕ دەربارەی" خوای موتەعال یان دەربارەی پێغەمبەران یان دەربارەی یاسا و هەڵسوکەوتەکان"، یان دەربارەی خوای گەورەو بەندەکانی...

خوای گەورە دەربارەی پاراستنو ئەرکی پاراستنی ئەو کتێبانە ئەفەرموێ: (لِلَّذِينَ هَادُواْ وَالرَّبَّانِيُّونَ وَالأَحْبَارُ بِمَا اسْتُحْفِظُواْ مِن كِتَابِ اللّهِ وَكَانُواْ عَلَيْهِ شُهَدَاء) (المائده: ٤٤). وشەی (اسْتُحْفِظُواْ) واتە داوای ئەوەیان لێکرابوو کە کێتبەکانی خۆیان بپارێزن.. بەڵام خوای گەورە دەربارەی پاراستنی قورئان ئەفەرموێ: (إِنَّا

نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ) (الحجر: ٩) کە بە ئاشکراو بە چەند دڵنیا کردنەوە ئەفەرموێ (ئێمە خۆمان قورئان ئەپارێزین) ئەوەبوو کە پاراستنی ئەو کتێبانە سپێردرا بە خەڵکەکە خۆی نەیانتوانی وەك پێویست بیپارێزن‌و دەستی خەڵکی (کەم دین)، یان (بێ دین)ی پێگەیشت‌و ئەمان لەبەر (ستەمکاری خۆیان) و ئەوان لەبەر (نەزانینی خۆیان) ئەو هەموو کارەساتەیان بەسەر ئەو دینانەدا هێنا، بەڵام کە خوای گەورە وادەی پاراستنی قورئانی دا، هەر لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله عليه واله وسلم) ئەوە هەمووە کەرەسەیەی بۆ فەراهەم کرد و پاشان هەر لە ساڵی یەکەمی دوای مردنی پێغەمبەردا (صلى الله عليه واله وسلم) و دورست دوای شەڕی خێڵی (موسەیلەمەی درۆزن) خستییە دڵی صەحابەوە کە هەموو قورئان لەیەك (بەرگ)دا کۆبکەنەوە تا لە نەفەوتانی تەنانەت ئایەتو پیتێکیشی دڵنیا بن، ئەوەبوو لەسەردەمی عوسمانیشدا (رەزای خوای لێ بێت) خوای گەورە هەلومەرجەکانی وا رێکخست صەحابە بیر لە زیادکردنی رونووسی ئەو قورئانە بکەنەوەو بە هەرێمەکاندا بڵاوی بکەنەوە تاخوای گەورە بۆ هەتا هەتایە دڵنیایی بداتە خەڵکی کە ئەم قورئانە هەر ئەو قورئانەیە کە خوای گەورە دایە جوبرەئیل‌و ئەویش دایە حەزرەتی موحەممەد و ئەویش (صلى الله عليه واله وسلم) گەیاندییە صەحابەکان‌و ئەوانیش بەئەمانەتەوە (رەزای خوایان لێ بێت) نووسیانەوەو گەیاندیانە هەموو مرۆڤایەتی..

ئەمانە وامان لێئەکات کە قورئان وەك هیچ کتێبێکی تری ئاسمانی، یان زەمینی سەیر نەکرێت، بەڵکو مامەڵەی تایبەتی لەگەڵ بکرێت، بە راسپاردەی خوا دابنرێت‌و بەو رۆحیەتەوە چۆك لەبەردەمیدا دابدرێت وەك عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (رەزای خوای لێ بێت) ئەفەرموێ: "ان من كان قبلكم رأوا القرآن رسائل من ربهم فكانوا يتدبرونها بالليل ويتفقدونها في النهار".[٩٦] واتە: ئەوانەی پێش ئێوە واسەیری قورئانیان ئەکرد کە ئەمە چەند نامەیەکی خوای گەورەیەو بۆ ئەوان

[٩٦] التبيان، النووي، پەراوێزی: **مفردات القرآن**، ص٥٦١.

هاتووە، بۆیە بە شەو بەردەوام لێی وردئەبوونەوەو بەرۆژیش بەردەوام هەر لەبیرو خولیای ئەودا بوون.

لەبەر دوو خاڵی گرنگیش بوو کە ئەم برگەیەمان کردە سەرەتا بۆ وەڵامەکەمان:

یەکەم/قەشە فادی ئەپرسێ ئایا قورئان پارێزراوە؟..کەچی نە وەڵامی ئەو پرسیارە ئەداتەوە لە رووی مێژووییەوە، نە پێوەرێکی دروستیش ئەداتە خوێنەرانی تا لە رووی ئەو پێوەرەوە خۆیان وەڵامی پرسیارەکەی بدەنەوە..

دووهەم/پێوەری دروست بۆ سەلماندنی پارێزراوی قورئان –یان هەر تێکستێکی تر– ئەوەیە باسی پرۆسەی نووسینەوەی بکرێت لە رووە مێژووییەکەیەوەو تا دوای ئەوە بووترێت: بەم پێوەرە دەرئەکەوێت کە ئەم تێکستەو ئەم دەقە مێژووییە دروست هەڵگیراوەو رشتەی هاتنەکەی جێگەی متمانەیە، دوای ئەمە ئەکرێ خەڵکێك باس لەوە بکات ئایا قورئان مەبەست و ئامانجەکانی تەواو بووەو کەڵکی نەماوەو سەردەمی بەسەرچووە، یان نەخێر قورئان هەر بەسوودەو بۆ ئەوە ئەشێت کە ئاراستەی کۆمەڵگە بکات لە کایەیەك یان زیاتری ژیاندا..

ئومێد ئەکەم بەمەی رابوورد توانیبێتمان بە کورتی ئەوەمان سەلماندبێت کە نووسینەوەی قورئان لە رووی مێژووییەوە هیچ گومانێك هەڵناگرێت و تاکە کتێبێك کە ئەو هەمووە وردەکاریە بۆ نووسینەوەو پاراستنی کرابێت و بە بێ دەستکاری مابێتەوە تەنیا قورئانە، ئیتر دوای ئەوە قەشە فادی یان وەرگێرە بزرکاوەکەی لای خۆمان ئارەزووی خۆیانە وا بۆ قورئان ئەڕوانن وبە کتێبێکی بەسوودی ئەزانن یان بە کتێبێکی بێ کەڵکی ئەزانن و وا گومان ئەبەن کە زەمەنی بەسەرچووەو عەقڵ یان فەلسەفە، زانست یان تەکنەلۆژیا جێگەیان پێ لێژکردووەو پێویست بە قورئان نەماوە! !ئەوە ئیتر داهاتوو سەنگی مەحەککەو ئەیسەلمێنێت ئەو قسەیە چەندە راستە یان چەندە ناڕاستەو دوورە لە زانست و عەقڵەوەو خوای گەورەش ئەفەرموێ:" سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ"..

# پێشەکی ئەندازیار عوسمان

الحمدلله رب العالمين، والصلاة و السلام على رسوله الامين و على اله و اصحابه اجمعين، و بعد:

دوژمنان لەرێی گومان دروست کردنەوە لەسەر قورئان دەیانەوێت موسڵمانان ساردبکەنەوە لە قورئان ، وەك وەڵامێك بۆناحەزانناميلكەيەكم بەناوی (قورئان پارێزراوە) كەوەڵامی هەندێ لەو گومانانە بوو بڵاوكردەوە .

ئەمەبێجگە لەوەی لەپەڕاوەكانی ترمدا وەك (لەخزمەت قورئاندا ، رامان لە قورئان ، دیمەنەكانی قورئان ، فراوانی مانا لە قورئاندا ، خۆپاراستنی قورئان لەهەندێ مانا ...هتد)گرنگیەكی تایبەتم داوە بە وردبوونەوە لەقورئان و ئیعجازەكانی قورئان.

لەكۆنگرەی بەرگری لەقورئانیشدا كەسەنتەری زەهاوی سازی كرد ( ٢٢-٢٣) ی ١٢-٢٠١١ ، وەبەندەش شەرەفی بەشداریكردنم پێبڕا، داوام لەئامادەبووان كرد كەوەڵامی كتێبی (هل القرآن معصوم) بدرێتەوە كەئەوەش بەرگریەكی گرنگە لەقورئان .دیارە كارەكەیان پێباش بوو ، پرۆژەی تیشك كارەكەیان سپارد بەشەش نووسەر وبەندەش ئەم بەشەم بەركەوت .

پاش ئەوەی بەشەش بەرگ چاپ كرا ، داوام كرد كۆی بكەینەوە ، مامۆستا ئیكرام لە تۆڕی ئایە رەزامەندی نووسەرەكانی وەرگرت و بەندەش پیاچووومەوەو ئامادەم كردو پشت بەخوا كتێبخانەیەكیشی بۆ ئەدۆزمەوە ئەركی چاپ و بڵاوكردنەوەكەی بگرێتە ئەستۆ . .

خوایگەورە قورئان بكاتە بەهاری دڵمان و شەفاعەتكاری دوارۆژمان .

## وەڵامی پرسیارە زانستیەکان

پێش ئەوەی کە بچینە سەر وەڵامی پرسیارە زانستیەکانی (هل القرآن معصوم)ئەبێ چەند راستیەك هەیە بیزانین:

**١- قورئان زۆر ڕاستی شیوێنراو لەناو تەورات و ئینجیلدا ڕاست دەکاتەوە،**

بۆ نموونە: لەبارەی حەزرەتی سولەیمانەوە سەلامی خوای لێ بێ دەفەرموێت : (وماكفرَ سُلَيمانُ ولَكن الشياطينَ كَفَروا) البقرة/١٠٢ . واتە: سولەیمان کوفری نەکردووەو شەیاتینەکان کوفریان کرد .

ڕەنگە کەسێکی فیترەت پاك سەری بسوڕمێ لەم دیفاعەی قورئان لەحەزرەتی سولەیمان، بەڵام ئەگەر سەیری (العهد القديم) بکەین وسەیری بیروباوەڕی شێواویان بکەین، دەبینین کە زۆر بەخراپی باس لەپێغەمبەران دەکەن، بەتایبەت حەزرەتی سولەیمان کە کوفرو سیحری دەخەنە پاڵ و دەڵێن: بتی پەرستووە بەهۆی کاریگەری ژنەکانیەوە لەسەری ..

بەڵێ.. قورئان ئەو بیروبۆچوونە ناڕاستانەی جوولەکەو گاورەکانی ڕاست کردەوەوباسی (معصوم)ی پێغەمبەرانی کرد .. دیارە حەزرەتی سولەیمان هەزاران ساڵ پێش حەزرەت ژیاوەو، هیچ زانیاری‌یەکی وا لەبارەیەوە لەبەردەستا نەبووە لەو سەردەمەدا، کەچی چونکە قورئان کەلامی خوایەو وەحی یە، دەبینین زۆر بەجوانی بەبێ ئەوەی گوێ باتە خەڵکی دەڵێن چی، یان نالێن چی، هەقی خۆی دەچەسپێنێ و دوای چواردە سەدە لەهاتنی قورئانیش ئەوانەی کە (دائرە المعارف)ی بەریتانیان داناوە لەو هەڵانە خۆیان دەپارێزن و دەگەڕێنەوە سەرهەق و ڕاستی و دەڵێن: (لقد كان سليمان موحداً) واتە: بەڕاستی سولەیمان یەکتاپەرست بووە.

هەروەها لە(دائرە المعارف)ی (عهد القديم والجديد)یشدا کە هەوڵ و کۆششی زۆر زانای مەسیحی بەئینصافە، هەموو ئەو خورافاتانەیان دایە دواوەو

وتیان: (حەزرەتی سولەیمان دوور بووە لەبت پەرستی و شتی نالائیق) **دراسات قرآنية** – ل/٩٦ الندوی.

**٢- لە(عەهدی قديم ) دا ئەم دەقە هەيە** کە دەڵێ (خلق الله السماوات والأرض في ستة أيام، فاستراح في اليوم السابع) سفر التکوين ٢-٣ . واتە: خوا ئاسمانەکان و زەوی لە شەش ڕۆژدا بەدی هێناو ڕۆژی حەوتەميش پشووی دا (ئاشکرايە کە ئەمە تەحريف کراوە).

قورئانی پيرۆز ئەمەی ڕاست کردەوەو لەسوورەتی (ق/٣٨)دا و دەفەرموێت (ولَقَد خَلَقنا السماوات والأرض ومابينَهُما في ستةِ أيامٍ ومامَسنا مِنْ لُغُوب) واتە: بەڕاستی ئێمە ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی لەنێوانياندا هەيە بەشەش ڕۆژ دروستمان کردوون، هيچ ماندوويەتيەکيش ڕووی تێنەکردين .

ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەيە کە پاش چواردە سەدە زانايانی مەسيحی و وەرگێڕەرانی تەورات ناچاربوون ئەو دەقە بگۆڕن و بەم شێوەيەی لێبکەن (خلق الله السماوات والأرض في ستة أيام، فرغ من أعماله التي كان يقوم بها في اليوم السابع) سفر التکوين/٢٠٢ British And Foreignbible Society عەهدی قديم ساڵی/١٩٥٨ ❁ واتە: خوا بەشەش ڕۆژ ئاسمانەکان و زەوی بەدی هێناو لەکارەکانی بووەوە لە ڕۆژی حەوتەم دا (ل/٩٨ دراسات قرآنية/الندوی) .

## ٣ : کەسايەتی هامان وئيعجازی قورئان:

قورئانی پيرۆز هەندێ شتی فەرمووە لەبارەی ميسری کۆنەوە، کەکەس تا ئەم دواييە نەيزانيوە بۆ نموونە : يەکێ لەو کەسايەتيانەی کە لەزەمانی فيرعەوندا ژياوە، (هامان)بووە، کە لەگەڵ باسی فيرعەون دا قورئان باسی دەکات لەشەش جێگادا و ئەوەش دەردەخات کە زۆر نزيك بووە لەفيرعەونەوە.

شايانی باسە لەتەورات دا باسی (هامان) نەهاتووە، ئەوەنەبێ کە لەکۆتايی بەشی دوايی (العهد القديم)دا، ناوی هاتووە وەك يارمەتيدەری پاشای

بابل کە لەدوای هەزار و سەد ساڵ لەزەمانی حەزرەتی موسادا ژیاوەو زوڵمی زۆری لە جوولەکە کردووە (دیارە ئەوەی لەتەورات دایە دەستکاری کراوە) . دوژمنانی ئیسلام و زۆر لەناحەزان پڕوپاگەندەی ئەوەیان دەکرد کە حەزرەت (صلی الله علیه واله وسلم) لەتەورات و ئینجیلەوە شتی وەرگرتبێ، کە ئەمەش گرێی لەدڵی هەندێ نۆ موسوڵماندا دروست دەکرد کە تازەو کەم شارەزابوون، کەدیارە ئەمانەش هەمووی دوورن لەڕاستیەوەو قورئان هەڵە و کەم و کورتی و ناتەواوییەکانی تەورات و ئینجیل ڕاست دەکاتەوەو بە دەسەڵاتە بەسەریانا، وەك قورئان خۆی وەسفی خۆی دەکات و دەفەرموێ (ومهيمناً عليه) واتە: قورئان (مهيمن)ە و (مسيطر)ە بەسەر هەموو ئەو پەڕاوانەدا کە زووتر هاتوون و دەستکاری کراون .

قەدەری خوا وابوو کە ئەم ڕاستیەی قورئانیش بسەلمێنرێ بۆ جیهان، ئەویش بەوەی کە دووسەد ساڵێك لەمەوبەر نووسینی هیرۆغلیفی دۆزرایەوەو ڕەمزەکانی شیکارکرا، بەمەش توانیان نووسینەکانی میسری یە کۆنەکان بخوێننەوە، تا دووسەد ساڵ لەمەوبەر کەس نەیدەتوانی لەو زمانە تێبگات کە میسری یە کۆنەکان شتیان پێ نووسی بوو، ئەم زمانەش چەند سەدەیەك درێژەی کێشاوەو پاش بلاوبوونەوەی مەسیحیەت لە سەدەی دووەم وسێیەمی زایینیدا، میسری یەکان بێجگە لەگۆڕینی ئاینەکەیان زمانەکەشیان گۆڕدراو وردەوردە لاوازبوو، کەس پێی نەدەنووسی و دەڵێن دوانووسین کە بەزمانی هیرۆغلیفی یە لە ساڵی٣٩٤ زایینیدا بووە.

ئیتر ئەو زمانە لەبیر کرا تا ساڵی١٧٩٩ زایینی کە بەردی (ڕەشید) دۆزرایەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی١٩٦ی پێش زایین .

نووسینەکانی سەر ئەم بەردە سێ نووسین بوو، نووسینێك بەزمانی هیرۆغلیفی و نووسینێك بەزمانی دیمونیکی کە شێوەی نووسینی دەستی زمانی هیرۆغلیفی یەو نووسینێکیشی بەزمانی یۆنانی، جا بەهۆی یۆنانیەکەوە توانرا لەدەقی

نووسینی هیرۆغلیفی یەکە تێبگەن، کەئەمەش لەلایەن زانای فەڕەنسی (فرانجیس شامبیلون)ەوە جێبەجێ کرا .

دۆزینەوەی ئەم زمانە کۆنەی میسری یەکان خێری تیابوو، بەوەی کە ناوی هامان هاتووە لەسەر بەردێك لە مۆزەخانەی (هۆف) لە ڤییەننا و تیایا باس دەکات کە (هامان) نزیکی فیرعەون و لەحاشیەی بووە . وە لەقاموسی (الأشخاص في الملكية الجديدة)دا ( کە نووسراوە بەهۆی ئەو زانیارانەی کە دەستیان کەوتووە لەو بەردە و لەو دۆزراوانەی تری میسریە کۆنەکانەوە ) هاتووە کە هامان بەرپرسی بەرد هەڵکەنەکان وبەرپرسی بیناکردن بووە، بۆیە لەقورئاندا هاتووە کە فیرعەون داوا لەهامان دەکات کە بینایەکی بەرزی بۆ دروست بکات، تا گوایە لەسەر ئەو بینا بەرزەوە سەیری ئاسمان بکات و بزانێ خواکەی موسای لێیە یان نا، دیارە ئەمەش بۆ خلافاندنی خەڵك و سەرقاڵ کردنیان بووە .. جا قورئان لەبارەی هامانەوە دەفەرموێت :

أ.( وقال فرعون يأيها الملأ ماعلمت لكم من الهٍ غيري، فأوقد لي ياهامان على الطين، فاجعل لي صرحاً لعلي أطلع إلى إله موسى وإني لأظنه من الكاذبين) القصص/٣٨ .

واتە: فیرعەون سەرکەشانە وتی: ئەی خەڵکینە من کەسی تر شك نابەم کە شایستە بێت بەوەی خواتان بێت جگە لەخۆم، ئەی هامان تۆ لەگڵ خشتی سوورەوە کراوم بۆ دروست بکە و قەلایەکی بەرز و پتەوم بۆ بینا بکە بەڵکو پیایدا سەربکەوم، تا خوای موسا ببینم، هەرچەندە من بەڕاستی بڕوام وایە کە موسا لە درۆزنەکانە .

ب. (وقَاَل فرعونُ ياهامان ابن لي صرحاً لعلي أبلغُ الأسباب، أسبابَ السماوات فاطلعَ إلي إله موسي وإني لَأَظُنُهُ كاذبا) غافر/٣٧ .واتە: فیرعەون وتی: ئەی هامان بورجێکی بەرزم بۆ دروست بکەن، بۆئەوەی هەندێ هۆکارم دەستکەوێت، هۆکاری بەرزبوونەوە بۆ ئاسمانەکان، تا لەوێوە سەرکەوم و نهێنیەکان

شارەزاببم، تا سەردانێکی خوای موسا بکەم و ببینم، هەرچەندە من دڵنیام کە درۆزنە.

ج.(لقد أرسلنا موسى بِآياتِنا وسُلطانٍ مبين إلى فرعَونَ وهامان وقارون فقالوا ساحرٌ كَذاب) غافر/٢٤ واتە: سوێند بەخوا بە ڕاستی ئێمە موسامان ڕەوانەکرد هاوڕێ لەگەڵ چەندەها بەڵگەو نیشانەی ئاشکرادا، بۆ سەر فیرعەون و هامان و قارون، بەڵام ئەو ستەمکارانە وتیان: جادووگەرێکی درۆزنە .

د .(ونُريدُ أن نَمُن على الذينَ استضعفوا في الأرض ونَجعَلَهُم أئمةً ونَجعَلَهُم الوارثين، ونُمَكن لَهُمْ في الأرض ونُريَ فِرعَون وهامان وجنودَهُما منْهُم ماكانوا يَحذَرون) القصص/٦

واتە: بەناردنی حەزرەتی موسا ویستمان دەروو بکەینەوە لەبەنی ئیسرائیلیە چەوساوەکان ومنەتی خێر بکەین بەسەریاناو بیانکەینە پێشەواو میراتگری سامان و دەسەلاتی ستەمکاران، هەروەها ویستمان پایەداریان بکەین و دەسەلاتیان بچەسپێنین لە ولاتداو، ئەوە پێش بهێنین بۆ فیرعەون وهامان و سەربازانیان کە لێی دەترسان (وأوحَينا إلى امِ موسى أنْ أرضعيه فإذا خفتِ عليه فألقيه في اليم ولاتخافي ولاتَحزَني إنا رادوه إليك وجاعلوُه مِنَ المرسلين) (القصص/٧) ئێمە دایکی موسامان ئاگادارکرد، کەشیری بداتێ و پێمانوت جاکاتێك مەترسیت پەیدا کرد لەوەی کە پێی بزانرێت فڕێی بدەرە ڕووباری نیلەوە، نەبترسە تووشی بەلاببێت، نەخەفەتیشی بۆ بخۆ، چونکە ئێمە بەڕاستی دەیگێڕینەوە بۆلات و لەئایندەشدا دەیکەینە یەکێك لەپێغەمبەرە پەیامدارەکان .

و. (فالتقطه آل فرعَون لِيَكونَ لهُم عَدواً وحَزَناً، إن فِرعَونَ وهامان وجنُودَهُما كانوا خاطئين) (القصص/٨) .واتە: ئەوسا ئیتر دارودەستەی فیرعەون هەڵیان گرتەوە، تا سەرەنجام ببێتە دوژمن و خەفەت بۆیان، بەڕاستی فیرعەون وهامان و سەربازەکانیان گوناهکار و تاوانبارو هەڵەبوون .

هـ.(وقـارون وفرعـون وهامـان ولقـد جـاءَهُم موسى بالبيـاتِ فاسـتَكبَروا فـي الأرض وماكانوا سابقين) العنكبوت/٣٦ .. واتە: قارون و فیرعەون و هامانیشمان لەناوبرد، سوێند بەخوا بێگومان موسا بەڵگەی زۆری بۆهێنان، کەچی خۆیـان زۆر بەگـەورە دانا لەزەویدا، سەرەنجام نەیانتوانی لەسـزا و تۆڵـەی خـوا خۆیـان ڕزگـار بکـەن و لەدەستمان دەرچن ..(المعجزات القرآنيـة/هارون يحيـى/ل/٧٣ وەرگێڕانـی ئورخـان محمد علی/٢٠٠٣). (پەڕاوی ژیانەوە /ئەندازیار عوسمان).

## ٤ـ موعجیزەی هاتن بەرەو ئیسلام

قورئانی پیرۆز تاکە پەڕاوە کە خوای گـەورە پـەیمانی پاراسـتن وبڵاوبوونـەوەی داوە بـە ڕۆژهـەڵات و ڕۆژئـاوادا هـەروەك دەفـەرموێت (يُرِيـدُونَ لِيُطْفِئُوا نُـورَ اللَّـهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَاللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ * هُوَ الَّذِي أَرْسَـلَ رَسُولَهُ بِالْهُـدَى وَدِيـنِ الْحَـقِّ لِيُظْهِـرَهُ عَلَـى الـدِّينِ كُلِّـهِ وَلَـوْ كَـرِهَ الْمُشْـرِكُونَ) الصـف: ٩، و پێغەمبـەریش (د.خ)دەفەرموێت (سيبلغ هذا الأمر – أي الإسلام – ما بلغ الليل والنهار) ..

قورئـان بـە پێچـەوانەی پـەڕاوەکانی ترەوەیـە کـە دەسـتکاری کـراون و بـەردەوامیش دەسـتکاری دەکـرێن و، هەرچـی دەکـەن نـازانن چـۆن لـە هەڵـەو ناتەواویەکانی پەڕاوەکەیان ڕزگاریان بێت.

(کیتـابی موقـەدەس– تـەورات و ئینجیل)شـتی وای تیایـە کـە شـەرمەزارن لـە ئاستیا، ئەوەتا بوختان بۆ دەیان پێغەمبەر دەکەن سەلامی خوایان لێبێـت، کـە (مەی) یان خواردۆتەوە وزینایان لەگەڵ (محارم)دا کردووە..(هـەروەك **لـوط** و داود وابـراهیم وزکریا..هتـد) سـەلامی خوایـان لێ بێت..ئـەو کەسـانەش کـە کیتـابی موقەدەسـیان نوسـیوەتەوە وەك (مـرقص) و(پـولس) و(لوقـا) ..هتـد، قوتـابی حـەزرەتی عیسـا نـەبوون، ئـەوکیتابی بەناوموقەدەسـەش کەلەبـەر دەسـتایەو وەرگێـڕدراوە بـۆ ئینگلیـزی، نوسـخەی ئەسـڵی دیـار نیـە، باشـە لـە چـیەوە وەرگێڕدراوە کەس نازانێت؟!

## نمونەیەک لە تەحریف کردن:

لـە نوسـخەی ئینگلیـزی مـەلیك جـیمس ی کیتـابی موقــەدەس دا هـاتووە:(
Blessed are they that dwell in thy house. they will be still praising you, blessed is the man whose strength is in you, whose heart is set on <u>*piligrimage*</u> as they pass through the valley of <u>*Baca*</u> make it awel)

(4-6) /PSLAMS (وەرگێڕانە عەرەبیەکەی)**"طوبى لأناس عزهم بك طرق بيتك** (الأصل كلمة الحـج ) **في قلـوبهم،** (٨٤: ٦)**عـابرين في** <u>**وادي البكاء**</u>**يصـيرونه ينبوعاً أيضا ببركات يغطون مورة"**


Holy Bible

The New King James Version

CONTAINING THE OLD AND NEW TESTAMENTS

This Special Edition of the New King James Bible is presented as a gift from

HILLWOOD MINISTRIES
Mt. Juliet, Tennessee, U.S.A.

المزمور

387 PSALM 85:7

PSALM 84

The Blessedness of Dwelling in the House of God

To the Chief Musician. On an instrument of Gath. A Psalm of the sons of Korah.

HOW lovely *is* Your tabernacle,
O LORD of hosts!
2 My soul longs, yes, even faints
For the courts of the LORD;
My heart and my flesh cry out for the living God.

3 Even the sparrow has found a home,
And the swallow a nest for herself,
Where she may lay her young—
Even Your altars, O LORD of hosts,
My King and my God.
4 Blessed *are* those who dwell in Your house;
They will still be praising You. Selah

5 Blessed *is* the man whose strength *is* in You,
6 Whose heart *is* set on pilgrimage. بكة
As they pass through the Valley of Baca,
They make it a spring;

لـــــەم دەقـــــەدا دوو وشــــــە دەســــــتکاری کــــراوە، یەکـــــەم وشــــەی (**pilgrimage**)کەمانای(حەج)دەگەیەنێ لە نوسـخەی عەرەبیەکـەدا هـەر لایـان بردووە، هەروەها وشەی (baca)کە ناوێکی مەککەیەو لە قورئانیشدا هاتووە، لە نوسخەی عەرەبیەکەدا کردویانە بە (وادی البکاء)..جا بۆ ئەوەش ئەمەیان کردووە تا مەسیحیە عەرەبەکان کە قورئـان دەبیسـتن نـەڵێن ئـەو دەقـەی ئینجیـل باسـی مەککەی تیایە و ببێتە مایەی موسوڵمان بوونیان.

کەدەفەرموێت(كُلُّ الطَّعَامِ كَانَ حِلاًّ لِّبَنِي إِسْرَائِيلَ إِلاَّ مَا حَرَّمَ إِسْرَائِيلُ عَلَى نَفْسِهِ مِن قَبْلِ أَن تُنَزَّلَ التَّوْرَاةُ قُلْ فَأْتُواْ بِالتَّوْرَاةِ فَاتْلُوهَا إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ، فَمَنِ افْتَرَىَ عَلَى اللّهِ الْكَذِبَ مِن بَعْدِ ذَلِكَ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ، قُلْ صَدَقَ اللّهُ فَاتَّبِعُواْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ، إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَالَمِينَ، فِيهِ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ مَّقَامُ إِبْرَاهِيمَ وَمَن دَخَلَهُ كَانَ آمِنًا وَلِلّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ الله غَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ) (٩٧ ال عمران ).

ئەوەی سەیرە ئەوەیە لەپێش باسی بەککەوە قورئان باسی ئیفتیراو تەحریفاتی گاورو جوولەکەکان دەکات، ئەوەتا لای ئەوان ئەو بەڵگە گەورەیە هاتووەو ئاوا تەحریفیان کردووە ! !

ئەم بابەتە دکتۆر زەغلول النجار لە گۆشەیەکی خۆیدا لە رۆژنامەی (الاهرام )دا بڵاوی کردەوە، وتارەکانی ناوبراو لە ئەهرام دا بووەتە مایەی موسڵمانبونی ژمارەیەکی زۆر لەگاورەکانی میسر.

د.زەغلول دەڵێت: پاش بڵاوکردنەوەی ئەو وتارە، لەسەر سەفەربووم لە فڕۆکەخانە لاوێکی مەسیحی بەناوی (جۆن)هات بۆ لام وپرسیاری لەو بارەیەوە کرد، منیش وتم:ئینگلیزی دەزانی وتی: بەڵێ دەرچووی کۆلێژم و ئێستا ژمێریارم، وتم : زۆر چاکە ئەوە هەردوو دەقە ئینگلیزیەکە و عەرەبیەکەیە لەبەردەستایە خۆت بەراوردی بکە، بزانە تەحریف کراوە یان نا.

پاش ئەوەی گەڕامەوە میسر بینیمەوە مژدەی دامێ کە موسوڵمان بووە و تەنانەت ڕەمەزان بەڕۆژوو بوەو تەراویحیشی کردووە، هەروەها وتی: دایك و باوکم مەسیحین و زۆر دەوڵەمەندن و تەنها منیان هەیە، دەترسم موسڵمان بوونم ئاشکرا بکەم جەڵتە لێیان بدات، منیش وتم : دەتوانی جارێ ئاشکرای نەکەی لەبەر ئەوان.

پاش دوو مانگی تر بینیمەوە لە دوبەی وتی: هاتووم لێرە فێری ئیسلام ببم، تا بتوانم بە چاکی بەرپەرچی ناحەزانی ئیسلام بدەمەوە !

بەڵێ ..دەستكاری كردنی تـەورات و ئنجیـل و پـارێزراوی قورئـان وادەكـات كـە خەڵكی دەستە دەستە لەهەر چـوار قوڕنـەی دنیـاوە بـێن بـەرەو ئیسـلام، دكتـۆر زەغلول دەڵێت: بەراوردكردنی ئاینەكان وخستنەڕووی تەحریفاتی تەورات و ئنجیل مەسەلەیەكی زۆر گرنگە كە موسوڵمانان و بانگخوازان كاری لەسەر بكەن .

**پاش ئەو سەرەتایە كەزانینی پێویستە، فەرموون بابچینە لای پرسیارە بەناو زانستیەكانی فادی لەپەڕاوی ( ئایا قورئان پارێزراوە ؟ ):**

## ١ـ پەیكەرێك دەبۆڕێنێت

**پ١٧٨/** لەم پرسیارەدا نووسەری (ئایا قورئان پارێزراوە) ئەم ئایەتانـە دێنێـت كە باس لە گوێرەكەیەكی ئاڵتونی زەمانی حەزرەتی موسا دەكات:

أ- (وَاتَّخَذَ قَوْمُ مُوسَى مِن بَعْدِهِ مِنْ حُلِيِّهِمْ عِجْلاً جَسَداً لَّهُ خُوَارٌ أَلَمْ يَرَوْاْ أَنَّهُ لاَ يُكَلِّمُهُمْ وَلاَ يَهْدِيهِمْ سَبِيلاً اتَّخَذُوهُ وَكَانُواْ ظَالِمِينَ) (الأعراف : ١٤٨ ).

میللەتی موسا، لە دوای موسا لە خشڵەكانیان گوێرەكەیەكیان دروستكرد، كـە جەستەیەك بوو دەیبۆڕاند و دەیانپەرست، ئایا نەیاندەبینی كە ناتوانێت قسـەیان لەگەڵدا بكات و ڕێگەیان پیشاندات بەو كارەیان لە ستەمكاران بوون.

ب. (وَلَكِنَّا حُمِّلْنَا أَوْزَاراً مِّن زِينَةِ الْقَوْمِ فَقَذَفْنَاهَا فَكَذَلِكَ أَلْقَى السَّامِرِيُّ * فَأَخْرَجَ لَهُمْ عِجْلاً جَسَداً لَهُ خُوَارٌ) (طه: ٨٧ـ ٨٨). ئێمە هەندێك لە خشـڵی قیبتییـەكانمان لەگەڵ خۆمان هێنابوو لە بۆتەیەكدا تواندمانەوە، سامریش شتێكی تێكرد و بـووە جەستەی گوێرەكەیەك كە دەیبۆڕاند.

ئینجا پرسیار دەكات و دەڵێت: ئایا قورئان ئەم هەواڵەی لەكوێوە هـەڵهێنجاوە، كە هیچ بنەمایەكی مێژوویی نییە؟ ئایا ئەوە شیاوو مەعقولـە، كـە گوێرەكەیـەكی ئاڵتونی هەروەكو گوێرەكەیەكی سروشتی ببۆڕێنێت؟

ئایا ئەو سامریەی كە باسی لێوە دەكرێت ئاواتەخوازی ئەوەبووە، كە گوێرەكە زێڕینەكە ببوڕێنێت و هارونیش داوای ئەوەی لە خواوەنـد كـردووە و خواوەنـدیش

لەسەر چاککردن و دروستکردنی بتەکە ڕازی و موافق بووە و گوێرەکەکەش بۆڕاندوویەتی بۆ ئەوەی خەڵکی هەڵفریوێنێت تاکو جگە لە خوا ئەو گوێرەکە ئاڵتونیە بپەرستن؟ ئایا سامری و هارون و خواوەند کۆمپانیایەکی یەکگرتوو بوون بۆ دروستکردنی بت؟

**وەڵام:**

فادی ئەیەوێت بیسەلمێنێت کە قورئان هەڵبەستراوە، جا لەبەرئەوەی مرۆڤێکیش هەڵی بەستووە کەواتە دەبێت لە سەرچاوەیەکەوە وەری گرتبێت، کەواتە قورئان ئەم باسەی لەکوێوە هێناوە؟

ئێمەی موسڵمان دڵنیاین کە قورئان کەلامی خوایە و هەمووی ڕاستە، چونکە کەس لە خوا قسەی ڕاستتر نییە، ناگونجێ و ناکرێ بگەڕێین بە دوای سەرچاوەی ئەو شتانەی کە قورئان باسی دەکات، چونکە قورئان باسی سەردەمێك دەکات کە ئەوکاتە هەر ئادەمیزاد نەبووە ﴿هَلْ أَتَى عَلَى الْإِنسَانِ حِينٌ مِّنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْئاً مَّذْكُوراً﴾ (الإنسان : ١ )، کاتێك قورئان باسی دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی دەکات، نە مرۆڤ هەبووە، نە کەسیش هاوکاری خوا بووە، کەواتە تەنها خوا بۆ خۆی دەزانێت چۆنی دروستکردووە، یان سەرەتای بەدیهێنانی مرۆڤ لە گڵەوە و پاشان لە ئادەم و حەواوە، خۆ ئەمەش بۆ خۆی غەیب و پەنهانێکە و تەنها خوا خۆی دەیزانێت هەرچەندە ڕەنگە لە بەبەردبووەکان و شوێنەوارە هەرە دێرینەکاندا، مرۆڤ هەندێ بەڵگەی دەست بکەوێت و هەندێ ڕاستی بسەلمێنێت لەم بوارەدا، بەڵام عیلمی یەقین ئەوەیە کە لە قورئان و فەرموودەی ڕاست دا هاتووە، قورئانی هانی مرۆڤ دەدات بۆ گەڕان بە زەویدا و بۆ لێکۆڵینەوە تا شتێك لەم ڕاستییانەی بۆ دەربکەوێت هەروەك دەفەرموێت: ﴿قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ﴾ (العنكبوت : ٢٠).

قورئان لە هیچ سەرچاوەیەکەوە وەرنەگیراوە، هەرچەند هەندێ لە ڕووداوو بەسەرهاتەکانیش لە پەڕاوی پیرۆزدا (تەورات و ئینجیل)دا باسکراون، قورئان ئەو

تەحریفاتەی کە لەو پەڕاوانەدا هاتووە نەك هەر وەری نەگرتووە بەڵکو ڕاستیشان دەکاتەوە.

مەسەلەی ئەم گوێرەکە زێڕینە لەلای ئەوانیش هاتووەو فادی ئاگای لێ نیە؟!، لە سیفری خروج دا دەڵێت (گەل بینیان موسا دواکەوتووە لە دابەزین لە کێوەکە، گەلەکە لای هارون کۆبوونەوە و پێیان وت: هەستە خوایەکمان بۆ دروست بکە لە پێشمانەوە بڕوات، بەڕاستی موسا ئەو پیاوەی کە ئێمەی لە میسرەوە هێنا نازانین چی بەسەرهاتووە.

هارون پێی وتن: ئاڵتوون و گوارەی گوێی ژنەکانتان و کچەکانتان و کوڕەکانتان داکەنن و بۆم بهێنن، گەلیش هەموویان گوارەکانیان لە گوێیان داکەند و هێنایان بۆ هارون، وەریگرت و دایڕشت بە قاڵب و گوێرەکەیەکی لێ دروست کرد، وتیان: ئەمە خواکەتە ئەی بەنی ئیسرائیل کە لە خاکی میسرەوە هێناونی، کاتێ هارون ئەمەی بینی قەسابخانەیەکی لەبەردەم گوێرەکەکەدا دروست کرد و پێی وتن: سبەینێ جەژنە بۆ پەروەردگار.

بەیانی زوو هاتن، کەلوپەلی ئاگرو برژانیان هێناو قوربانیان کرد و گەل کەوتە خواردن و خواردنەوە و پاشان هەستان بۆ یاریکردن.

کاتێ موسا بە تووڕەیی و داخ و خەمەوە گەڕایەوە ناو گەلەکەی، سەرزەنشتێکی توندی هارونی کرد لەسەر ئەوەی کە کردوویەتی و پێی وت: ئەم گەلە چیان پێ کردووی، تا ئەم گوناهە گەورەیەت هێنایە سەریان؟).

لە ڕیوایەتی پەڕاوی پیرۆزیاندا هارون تاوانبارە بەوەی کە گوێرەکەی بۆ دروست کردوون، قورئانیش ئەمەی بۆ ڕاست کردوونەتەوەو دەفەرموێت (سامری) کە یەکێکە لە بەنی ئیسرائیل ئەو گوێرەکەکەی دروستکردووە و، هارون ناڕازی بووە بەمە و ئامۆژگاریشی کردوون و پێی وتوون: ئەوە تاقیکردنەوەو فیتنەیە بۆتان، کەچی ئەوان بەگوێیان نەکردووە و بەردەوام بوون لەسەر بت پەرستی (گوێرەکە پەرستی) هەتا موسا گەڕایەوە لایان (وَلَقَدْ قَالَ لَهُمْ هَارُونُ مِن قَبْلُ يَا قَوْمِ إِنَّمَا

فُتِنتُم بِهِ وَإِنَّ رَبَّكُمُ الرَّحْمَنُ فَاتَّبِعُونِي وَأَطِيعُوا أَمْرِي * قَالُوا لَن نَّبْرَحَ عَلَيْهِ عَاكِفِينَ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَيْنَا مُوسَى) (طه: ٩٠ـ ٩١).

بۆ ئەوەش کە فادی دەڵێت: گوێرەکەیەکی ئـاڵتونی چـۆن دەبۆڕێنـێ؟ دەڵـێین: ئەمـە ڕەنگـە وەك موعجیزەیـەك بووبـێ بـۆ فیتنــە و تاقیکردنــەوەی ئــەو گەلــە سەرسەختەی کە لە مێژوودا وێنەیان کەمە، ئاخر کەی ڕەوای هەقـە گـەلێك پـاش ئەوەی بە چاوی خۆیان تیاچوونی فیرعەون و دارودەستەکەیان بینی بەو موعجیزە گەورەیەی کە بەحرەکە شـەق بـوو، ئـەو فیرعەونـەی کـە خـۆی بـە خـوا دەزانـی خنکاو تیاچوو، ئنجا بە موسـایان وت: (اجْعَل لَّنَا إِلَـهاً كَمَا لَهُمْ آلِهَةٌ) (الأعراف : ١٣٨)، خوایـەکمان بـۆ دانـێ بیپەرسـتین هـەروەکو ئـەو گەلـەی کـە بینیـان بـت دەپەرستن.

ئینجـــا نـــازانم بـــۆ لای نـــاوبراو ســـەیرە شـــتی وا ڕوو بـــدات، مەســـەلەی موعجیزەبوونەکەشی بخەنە لاوە، مەگەر مرۆڤ لە ماددەیەکی بێ گیـان ئـامێری وا دروست ناکات کـە لاسـایی دەنگـی گیانلەبـەرانی پێدەکاتـەوە، ئـاخۆ وا دروسـت نەکرابێ کە هەوا بەناویا ڕۆیشتبێ و ئەو دەنگەی لێوە هاتبێ کە وەك بۆڕەی مانگا بووە، ئەم ڕووداوە هەرچۆنێك بووبێ، ئەوەتا لە پەڕاوی پیرۆزی خۆیاندا هـاتووە هەرچەند تـەحریفیش کـراوە، قورئـانیش بـە ڕاسـتی باسـی کـردووە، پاشـان نـە جوولەکەیە نە گاورێکی ئەو زەمانە نەهاتن ڕەخنە لەمە بگرن و بلێن: کوا شـتی وا بووە، مەگەر گاور و جولەکەی ئەو سەردەمە و زاناکانیان کەسیان عەقڵیان بەمـە نەشکا فادی نەبێت؟!

## ٢ـ موستیلەی جادویی!

پ١٧٩/ لـە سـورەتی ص/٣٤ــ ٣٥ دا هـاتووە: (وَلَقَدْ فَتَنَّا سُلَيْمَانَ وَأَلْقَيْنَا عَلَى كُرْسِيِّهِ جَسَداً ثُمَّ أَنَابَ * قَالَ رَبِّ اغْفِرْ لِي وَهَبْ لِي مُلْكاً لَّا يَنبَغِي لأَحَدٍ مِّنْ بَعْدِي) (صـ : ٣٥) سولەیمانمان تاقی کردەوە جەستەی ساوایەکی ناتەواومان خستە سەر

کورسی عەرشەکەی پاشان پەشیمان بووەوە و وتی: پەروەردگارم بمبەخشە و پادشایەتیەکم بدەرێ کە بۆ بێجگە لە خۆم و لە دوای خۆم بۆ کەس نەشێت.

ئینجا فادی لە هەندێ تەفسیرەوە باس و خواسێك دەهێنێ و دەیکات بە ماڵ بە سەر قورئانەوە و پرسیاریان لەسەر دەکات و دەڵێت: ئایا مانای ئەو موستیلە جادوییە چییە، کە هەرکەسێك لە مرۆڤ و جنۆکە بیکاتە پەنجەی دەبێتە پاشا؟ ئایا چۆن شەیتان ژن دەهێنێت لە کاتێکدا شەیتان لە ئەرواحەکانە؟ ئایا کەی سولەیمان پادشا (٤٠) رۆژ هەڵگری ماسی سواڵکەر بوو؟

ئەو داستان و حیکایەتانە ئەگەرچی لە هەندێ پەڕاوی تەفسیردا هاتووە و لە ئیسرائیلیاتەکانەوە سەرچاوەی گرتووە، بەڵام هیچی ماڵ نییە بەسەر قورئانەوە و زانایانی شارەزای تەفسیری قورئانیش هەموو ئەو رووداو بەسەرهاتانەیان بە درۆ داناوە و بڕوایان پێی نییە.

حەزرەتی سولەیمان سەلامی خوای لێبێت پێغەمبەرێکی (معصوم)ە و هەرگیز قایل نەبووە کە بتێك بۆ ژنەکەی دروستبکرێ و لە ماڵەکەیدا بپەرسترێ، شتی وا موسڵمانێکی ئاسایی نایکات، چ جای پێغەمبەرێك.

## ٣ـ ئازاردانی ناو گۆڕ

پ١٨٠: لە سورەتی (الجمعه /٨)دا هاتووە: (قُلْ إِنَّ الْمَوْتَ الَّذِي تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإِنَّهُ مُلَاقِيكُمْ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَى عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ) (الجمعه : ٨). بڵێ ئەو مردنەی لە دەستی ڕا دەکەن بە شوێنیانەوەیە، ئەوسا بۆ لای زانای پەنهان و شایەتیدان دەگەڕێنەوە و هەواڵی ئەو کارانەتان پێدەدات کە کردووتانە.

لە حەدیسی بوخاریدا هاتووە: لە عائیشەی ژنی پێغەمبەریان گێڕایەوە کە ئەو وتوویەتی دووان لە پیرەپیاوانی یەهودی شاری مەدینە هاتنە لام و وتیان: خەڵکی لەناو گۆڕەکانیاندا ئازار دەدرێن، منیش بە درۆم خستنەوە و ئەوانیش لەلای من چوونە دەرەوە.

پاشـان پێغەمبـەر هاتـەوە و ئـەوەم پـێ وت کـە ئـەوان پێیـان وتم، وە بـە پێغەمبەرم وت: من لەوەدا باوەڕم پێ نەکردوون.

ئـەویش وتـی: ئـەوان راسـتیان کـردووە ئەوانـە لـە نـاو گـۆڕدا سـزاو ئازارێـك دەدرێن، کە هەرچی گیانەوەر هەیە گـوێی لـە دەنگیانـە، عائیشـە وتـی: پاشـان هەرگیز لە نوێژدا پێغەمبەرم نەبینیوە مەگـەر دەیـوت: ئـەی خودایـە بـانگ لـە تـۆ دەکەم، کە بمپارێزیت لە پەککەوتـەیی و تەمبـەڵی و ترسـنۆکی و پـیری و بانگت لێدەکەم کە لە ئازاردانی ناو گۆڕ بمپارێزیت.

ئینجا ئەم فەرموودەیەی تری پێغەمبەر(صلى الله عليـه والـه وسـلم) دێنێـت کـە بوخـاری ڕیوایـەتی کـردووە: (کاتێـك کـە عەبـد (مـرۆڤ) دەخرێتـە گۆڕەکەیـەوە و هاوڕێکانی بـەجێی دەهـێڵن گـوێی لـە تەپـەی پێڵاوەکانیـان دەبێـت، ئەوسـا دوو فریشتە دێن و دایدەنیشـێنن و پێـی دەڵـێن: دەربـارەی ئـەم پیـاوە (موحەممـەد) چیت دەووت؟

ئەویش دەڵێت: شاهێدی دەدەم کە ئەو بەندەو نێردراوی خوایە، ئەوسـا پێـی دەوترێت: سەیری جێگاکەت بکە لە ئاگردا، خوا بۆی گۆڕیویتەوە بە جێگەیەك لـە بەهەشتدا. پێغەمبەر وتی: هەردووکیان بەیەکەوە دەبینێت.

بەڵام بێباوەڕو دووڕوو دەڵێت: نازانم، من ئەوەم دەووت کـە خـەڵکی دەیـووت، نە زانیومە و نە نوێژو نەزرم نەکردووە، یان نە قورئانم خوێندووەتەوە، ئەوسا بە چەکوشی ئاسن لە نێـوان هـەردوو گـوێی دەدەن، ئـەویش هاوارێـك دەکـات، کـە هەرچی لەو ناوەدایە گوێی لێی دەبێت تەنها مرۆڤ و جنۆکە نەبێت).

ئینجا فادی پرسیار دەکات و دەڵێت: ئەگەر مردوو لەناو گـۆڕدا بیسـتەر بێـت و هەست بە ئازار بکات، ئایا لەبەرچی جگە لە ئاژەڵان کەس هاواری ئازاری مردووی ناو گۆڕەکان نابیستێت؟ وە ئەگەر ئەوانەی لـەناو گـۆڕدان بـە پێغەمبەرایـەتی (موحەممەد)دا بنێن لە ئازاردان دەبەخشرێن؟ ئەی ئایا لەبەرچی موحەممەد خـۆی بانگی لە خوا کردووە بۆ ئەوەی لە ئازاردانی ناو گۆڕ بیپارێزێت؟

لەوانەیە ئەفسانەی ئەو دوو پیرەمێردەی کە عائیشە بە درۆی خستنەوە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە گوێیان لە دەنگی کەسێك بووە، کە دوای ئەوەی وایان زانیوە مردووە خێرا ناشتویانە و کاتێك کە بەئاگاهاتۆتەوە داوای کردووە کە فریای بکەون کەسیش نەبووە کە فریای بکەوێت هەتاکو مردووە، لەمەشەوە هەواڵی ئازاردانی ناو گۆڕ بڵاوبووەتەوە.

فادی کە بە حساب ڕەخنە لە قورئان دەگرێت، ئەو ئایەتەی سورەتی (الجمعە)ی کە هێناوە پەیوەندی بە سزای ناو گۆڕەوە نییە، بۆیە لێرەدا ڕەخنەکانی و پرسیارەکانی لەسەر فەرموودەکانی حەزرەتە(صلى الله عليه واله وسلم)کە باس لە سزادانی ناو گۆڕ دەکات.

نازانم کە فادی بۆ خۆی سەر بە کەنیسەیە و بڕوای بە تەورات و ئینجیل و عیسا و موسا هەیە، مەگەر ئەویش باوەڕی بە زیندووبوونەوە و سزاو پاداشتی قیامەت نییە کە ئەو پێغەمبەرانە سەلامی خوایان لێ بێت خەڵکیان لێ ئاگادار کردووەتەوە، باشە ئەگەر بپرسین تۆ چۆن باوەڕت بە شتی وا هەیە، دەڵێت: ئەوانە پێغەمبەرن و ئەو پەیامەیان لە خواوە هێناوە هەرچی ئەوان بیڵێن ڕاستە، جا ئێمەش بە هەمان شێوە بڕوامان بە پێغەمبەرایەتی حەزرەتی (موحەممەد) هەیە و هەرچی لە قورئان و فەرموودە ڕاستەکاندایە بڕوامان پێیەتی، چونکە (وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى) (النجم : ٣ ).

## ٤ـ وشتری مێ کچی بەردە؟

پ١٨١/ لە سورەتی (الأعراف ٧٣ـ ٧٨) دا هاتووە:

(وَإِلَى ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحاً قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُواْ اللّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ قَدْ جَاءتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ هَذِهِ نَاقَةُ اللّهِ لَكُمْ آيَةً فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِي أَرْضِ اللّهِ وَلاَ تَمَسُّوهَا بِسُوَءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ * وَاذْكُرُواْ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَاء مِن بَعْدِ عَادٍ وَبَوَّأَكُمْ فِي الأَرْضِ تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُوراً وَتَنْحِتُونَ الْجِبَالَ بُيُوتاً فَاذْكُرُواْ آلاء اللّهِ وَلاَ تَعْثَوْا فِي

الآرْضِ مُفْسِدِينَ * قَالَ الْمَلأُ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُواْ مِن قَوْمِهِ لِلَّذِينَ اسْتُضْعِفُواْ لِمَنْ آمَنَ مِنْهُمْ أَتَعْلَمُونَ أَنَّ صَالِحاً مُّرْسَلٌ مِّن رَّبِّهِ قَالُواْ إِنَّا بِمَا أُرْسِلَ بِهِ مُؤْمِنُونَ * قَالَ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُواْ إِنَّا بِالَّذِيَ آمَنتُمْ بِهِ كَافِرُونَ * فَعَقَرُواْ النَّاقَةَ وَعَتَوْاْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ وَقَالُواْ يَا صَالِحُ ائْتِنَا بِمَا تَعِدُنَا إِن كُنتَ مِنَ الْمُرْسَلِينَ * فَأَخَذَتْهُمُ الرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُواْ فِي دَارِهِمْ جَاثِمِينَ).

پاش ئەوەی فادی لە تەفسیری بەیزاویەوە ئـەم دەنگـو باسـە ئەگوێزێتـەوە بـۆ خوێنـەر ئینجـا پرسـیار دەکـات: ئایـا ئـەوە مەعقولـە کـە بـەردێك ژان بیگرێـت و ناقەیەکی لێ بێتە دەرەوە؟ ناقەکەش هەموو ئاوی بیرەکـەی سـەمود بخواتـەوە و شیر بە دانیشتوانی هەموو شارەکە بدات؟ ئایا ئەوە شیاوو مەعقولە کاتێك کە مـێ وشترەکە دەبێتە مایـەی ئـازار بـۆ خـەڵکی شـارەکە بـەوەی کـە ئاژەڵـەکانیان بـە زستان و هاوین دەربکات و خەڵکیش سـەری بـبڕن و خواوەنـدیش هـەموو خـەڵکی شارەکە لە بەرامبـەر سـەربڕینی وشـترەکەدا لـەناو بـەرێت؟ ئایـا ئـەوە لـە شـیاوو گونجاوەکانە کـە بـەرد وەڵامـی هـاواری بەچـکەی ناقەکـە بداتـەوە و لـەت بێـت و بەچکەکەش بچێتە ناویەوە و بگەڕێتەوە، ئایا ئەمە لە چـیرۆکەکانی هـەزار و یـەك شەوە ناچێت؟

ئێمەش لە وەڵامیدا دەڵێین ئەوەندەی قورئان باسی کردووە بڕوامان پێیەتی کە خـوای گـەورە بـۆ گـەلی سـەمودو حـەزرەتی صـاڵحی نـاردو، وشـترێك بەڵگـە و نیشـانەکەی بووکـە مـوعجیزە بـوو، گەلەکـەی بڕوایـان پێنـەکردو یـەکێکی زۆر سەرسەختی خۆیان بۆ نارد سەری بڕی و خوای گـەورەش لـەناوی بـردن، ئـەوەی کە لەمە زیاترە ئیسـرائیلیاتە و مـاڵ نییـە بەسـەر قورئانـەوە، قورئـان نافـەرموێ هەموو ئـاوی بیرەکـەی خواردۆتـەوە و شـیری داوە بـە هـەموو خـەڵکی ناوچـەکە، قورئان نافەرموێ ئاژەڵی ناوچەکەی بە زستان و هاوین ڕاوناوە، ئەم وردەکارییانە عـەقڵ بیـبڕێ یـان نـا پەیوەنـدی بـە قورئانـەوە نییـە، تـەنها ئەوەندەیـە کـە پێغەمبەرەکەیان داوایان لێدەکات کە وازی لێبێنن بـۆ خـۆی بلـەوەڕێت و زیـانی

پێنەگەیەنن، ئیتر لەبەرد هاتۆتە دەرەوەوە بەچکەکەی چۆتەوە ناو بەرد لە قورئاندا نەهاتووە، نەك فادی بەڵکو زانایانی ئیسلامیش ئەو دەنگو باسانە وەرناگرن و تەنها ئەوەندەی قورئان ئاماژەی پێکردووە بڕوایان پێیەتی.

## ٥ـ پشکۆ لەناو ئاگردا

پ١٨٢/ لە سورەتی (الشعراء ١٧٦ـ ١٩٠) دا هاتووە: (كَذَّبَ أَصْحَابُ الآيْكَةِ الْمُرْسَلِينَ * إِذْ قَالَ لَهُمْ شُعَيْبٌ أَلَا تَتَّقُونَ * إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ * فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ * وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ * أَوْفُوا الْكَيْلَ وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُخْسِرِينَ * وَزِنُوا بِالْقِسْطَاسِ الْمُسْتَقِيمِ * وَلَا تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءهُمْ وَلَا تَعْثَوْا فِي الآرْضِ مُفْسِدِينَ * وَاتَّقُوا الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالْجِبِلَّةَ الآوَّلِينَ * قَالُوا إِنَّمَا أَنتَ مِنَ الْمُسَحَّرِينَ * وَمَا أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا وَإِن نَّظُنُّكَ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ * فَأَسْقِطْ عَلَيْنَا كِسَفاً مِّنَ السَّمَاءِ إِن كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ * قَالَ رَبِّي أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ * فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمْ عَذَابُ يَوْمِ الظُّلَّةِ إِنَّهُ كَانَ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ * إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ).

بۆ تەفسیری ئەم ئایەتانە و دەنگو باسی (أصحاب الأيكة) لەگەڵ شوعەیبی پێغەمبەریاندا سەلامی خوای لێبێت، فادی لە تەفسیرەکانەوە هەندێ شت بۆ خوێنەر دێنێت گوایە ئیبن عەباس وتوویەتی و دەیکات بە ماڵ بە سەر قورئانەوە و کۆمەڵێ ڕەخنە دەگرێت و چەند پرسیارێك دەکات، کە خولاسەکەی ئەوەیە خوا گەرمایەکی زۆری لە جەهەننەمەوە بۆ ناردون بە جۆرێك کە نە سێبەر و نە ئاوو نە سەرداب سوودی پێنەگەیاندون، ڕایان کردووە بۆ چۆڵەوانی، پاشان خواوەند هەورێکی بۆ ناردن کە لە سێبەرەکەیدا ساردی و شنەی شەماڵیان بینیەوە، یەکتریان بانگکردو لە ژێریا خڕبوونەوە، خواش بەو هەورەی کە بە ڕاسەریانەوە بوو وەکو بڵێسەی ئاگر سووری کردەوە و لەژێر پێشیانەوە بە زەوی لەرزە لێیدان و هەروەکو سوتانی کوللە لەتاوەدا سووتان.

ئینجا فادی پرسیار دەکات و دەڵێت: (لە پەڕاوی پیرۆزدا وشەیەك لەمەڕ پیاوێکەوە کە ناوی شوعەیب بووبێت و بۆ سەر مەدیەن نێردرابێت نادۆزینەوەو نە مەدیەنیش بە ئاگر لەناو چووە، ئایا ئەوە لە گونجاوو شیاوەکانە کە هەورێك شنەی شەماڵ و هەوایەکی خۆشی هەبێت، کەچی لە هەمان کاتدا ئاگرێکی سوورەوەبوو بێت، شاران بسووتێنێت و لەناوی بەرێت؟

ئێنجا وەرگێڕی پەڕاوی (هل القرآن معصوم)یش بۆ زمانی کوردی ڕەخنەی خۆی دەگرێ و دەڵێت: (ئەمەش وەکو ئەوە وەهایە کە لە هەورەوە لە کاتێکدا بنچینەی هەور ئاوە، ئاگر بکەوێتەوە، واتە وەکو ئەوە وەهایە پشکوێ ئاگر لە ئاودا بێت) ئینجا دەڵێت: (ئایا خواوەندی خێرا سزادەر پێداویستی بەو هەموو تەکتیکاتە هەیە تاکو کۆکوژی خەڵکی بکات یان کارەکانی بە (کن فیکون) دەکات؟).

## وەڵام/

فادی لەم پرسیارەدا دەڵێت لە پەڕاوی پیرۆزدا باسی شوعەیب نەهاتووە، باشە ئەگەر هاتنی دەنگو باسێکی قورئان لە پەڕاوی پیرۆزدا بەلاتەوە گرنگە و بەڕاستی دەزانێت، ئەی بۆچی چیرۆکی گوێرەکە ئاڵتونییەکە کە لە قورئاندا هاتووە و لە پەڕاوی پیرۆزیشتاندا هاتووە کەچی نکوڵی لێ دەکەیت؟ پاشان زیادەڕەوی دەکەیت و دەڵێین هیچ بنەمایەکی مێژوویی نییە؟

قورئان خوای گەورە بە (موحەممەد)دا(صلى الله عليه واله وسلم) ناردوویەتی و پەیمانی داوە کە بیپارێزێت و ئەوەتا دوای هەزار و چوار سەد ساڵ نوسخەیەکی ئەمڕۆی هەروەك ئەو نوسخە دەستخەتانەیە کە کە لە زەمانی هاوەڵانەوە بۆمان ماونەتەوەو لە مۆزەخانەکانی جیهاندا پارێزراون (إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ) (الحجر : ٩).

بۆیە قورئان ڕاستترین و تەواوترین پەڕاوی سەر ڕووی زەمینە و مەرجەعمانە بۆ دەنگوباسی گەلانی دێرین لەگەڵ پێغەمبەرانیاندا و بەهیچ جۆرێك ناكرێت بەراورد بكرێت بە پەڕاوی پیرۆزی ئەهلی كیتاب.

لە كاتێكدا كە بە هەزاران دیراسات و باس و لێكۆڵینەوەی زانایان هەیە كە هەمووی جەخت دەكەنەوە سەر ئەوەی كە پەڕاوی پیرۆزیان (تەورات و ئینجیل) تەحریف كراون بۆ نموونە:

پەیمانگای ویستار لە ئەمریكا لەساڵی ١٩٨٥ دا لەئەمریكا دامەزراو سەرەتا سی زانا كاریان تیادەكردو پاشان بوونە دوو سەد زانای بواری جیاجیای زانست بۆ چەندین ساڵ دیراسەی ئینجیلیان كرد بۆیان سەلما كە تەنها(١٦٪ )لەسەدا شانزەی ئینجیل ڕاستە و لەسەدا هەشتاو چواری ئەوە نییە كە لە خواوە هاتووە، پەڕاوێك ئەمە حاڵی بێت كەی ڕەوایە بوترێت مادام باسێك تیا هاتووە یا نەهاتووە ببێتە پێوەر بۆ ڕاست و دروستی ئەو باسە یان هەر شتێكی تر؟!!

قورئان لەبارەی تیاچوونی گەلی شوعەیبەوە دەفەرموێت:

* (فَأَخَذَتْهُمُ الرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُواْ فِي دَارِهِمْ جَاثِمِينَ) (الأعراف : ٩١) ڕەجفەش زەمین لەرزەیە.

* (وَلَمَّا جَاء أَمْرُنَا نَجَّيْنَا شُعَيْباً وَالَّذِينَ آمَنُواْ مَعَهُ بِرَحْمَةٍ مَّنَّا وَأَخَذَتِ الَّذِينَ ظَلَمُواْ الصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُواْ فِي دِيَارِهِمْ جَاثِمِينَ) (هود : ٩٤).

(الصیحە)ش دەنگێكی گەورە و بەرزە كە بە هۆی زەمین لەرزەكەوە بووە.

* (فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمْ عَذَابُ يَوْمِ الظُّلَّةِ إِنَّهُ كَانَ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ) (الشعراء : ١٨٩).

(الظُّلَّةِ) هەورە، لە ئایەتەكانەوە دەردەكەوێت كە زەمین لەرزەیەكی بەهێزی وێرانكەر داوێتی لە شارەكە كە دەنگێكی گەورەی لێپەیدابووە و پاشان بوركانێك تەقیوەتەوە كە هەورێكی دروستكردووە لە تۆزو خۆڵ و ماددەی بوركانی كە ئاسمانی لێ تەنیون و بەوانەش لەناوچوون.

وەك دەركەوت قورئان بە هیچ جۆرێك ئەو شتانەی تیا نییە كە فادی لە ئیسرائیلیاتەوە دەیهێنێت و پرسیاری لەسەر دروست دەكات، ئاشكراشە كە زۆر قسەو باس و تەفسیریش لە كۆنەوە بەدەم ئیبن عەباسەوە هەڵبەستراون.

## ٦ـ رۆحی مرۆڤ لە ئاژەڵدا!

پ١٨٣/ لە سورەتی (الاعراف: ١٦٦)دا هاتووە: (فَلَمَّا عَتَوْاْ عَن مَّا نُهُواْ عَنْهُ قُلْنَا لَهُمْ كُونُواْ قِرَدَةً خَاسِئِينَ) (الأعراف : ١٦٦) كاتێك یاخیبوون لەوەی كە نەهیان لێكرابوو بیكەن، پێمان وتن ببن بە مەیمونی ڕسوا.

فادی ڕەخنە لەم بەسەرهاتەی جوولەكەكان دەگرێت كە لە تەفسیری بەیزاویەوە وەری گرتووە كە ئەو جوولەكانەی یاخیی بوون و فەرمانی خوایان شكاند بوون بە مەیمون و بەراز و مەسخ بوون، فادی پرسیار دەكات و دەڵێت: (ئایا سروشت ئەوەمان فێر ناكات، كە هەر شتێك وەچەكەی هەروەكو جۆرەكەی خۆی دەردەچێت؟ ئایا ئەو كەسەی كە بڵێت گەنم دەبێت بە جۆ و، ترێ دەبێتە هەنجیر هەروەكو ئەو كەسە وانییە كە بڵێت مرۆڤ بووەتە مەیمون و بەراز؟) وەرگێڕەكەش بۆ زمانی كوردی ڕەخنە دەگرێت و دەڵێت (ئایا خواوەند خەڵكی دەكاتە مەیمون لەبەرئەوەی ڕاوی ماسی یان نەهەنگیان كردووە لە ڕۆژی شەمواندا؟ ئەگەر هەموو ڕۆژەكان ڕۆژی خواوەندن ئایا لەبەر چییە كە دەبوو تەنها لەو ڕۆژەدا خواپەرستی بكرێت؟).

**وەڵام:**

لە پەڕاوی پیرۆزی ئەهلی كیتابدا باسی موعجیزات هاتووە، فادی باوەڕی پێیانە كە بەڵگەی دەستەڵاتی بێپایان و بێ سنووری پەروەردگارە، ئەی باشە بۆ چەندو چونمان لەگەڵ دەكات بۆ ئەم شتانەی قورئانیش كە موعجیزاتن.

دیارە لە باری ئاساسییدا نە گەنم ئەبێ بە جۆ و نـە بـە پێچەوانەشـەوە، بـەڵام ئەو خوایەی کە گەنم و جۆ و بوونەوەریشی بەدیهێناوە ئەگەر ویستی گەنم ئەکا بە جۆ و بەپێچەوانەشەوە (إِنَّمَا أَمْرُهُ إِذَا أَرَادَ شَيْئاً أَنْ يَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ) یس ٨٢ .

قورئان لەبارەی دانیشتوانی ناوچـەیەکی گـوێ دەریـاوە کـە جولەکـە بـوون لـە چـەند شـوێنێکدا سـەر گوزەشـتەیان بـاس دەکـات تـا ببێتـە پەنـدو عیـبرەت و دەفەرموێت:

١ـ (وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ الَّذِينَ اعْتَدَواْ مِنكُمْ فِي السَّبْتِ فَقُلْنَا لَهُمْ كُونُواْ قِرَدَةً خَاسِئِينَ * فَجَعَلْنَاهَا نَكَالاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهَا وَمَا خَلْفَهَا وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ) (البقرة: ٦٥-٦٦).

واتە: سوێند بە خوا بێگومان زانیوتانە و ئاگادارن چیمان بەسـەر ئەوانـە هێنـا ڕۆژانـی شـەممە دەسـتدرێژییان دەکـرد و لـە سـنوور دەردەچـوون، بڕیارمانـدا و وتمـان: ببنـە مـەیمونی دوورخـراوە لـە ڕەحمـەتی خـواو کردمـانن بـە پەنـد بـۆ هاوسەردەمەکانیان و ئەوانەش کە لە دواتر دێن، هەروەها کردمانە ئامۆژگاری بـۆ پارێزکاران.

٢. (وَاسْأَلْهُمْ عَنِ الْقَرْيَةِ الَّتِي كَانَتْ حَاضِرَةَ الْبَحْرِ إِذْ يَعْدُونَ فِي السَّبْتِ إِذْ تَأْتِيهِمْ حِيتَانُهُمْ يَوْمَ سَبْتِهِمْ شُرَّعاً وَيَوْمَ لاَ يَسْبِتُونَ لاَ تَأْتِيهِمْ كَذَلِكَ نَبْلُوهُم بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ) (الأعراف : ١٦٣ ).

واتە: پرسیار لە جووەکان بکە دەربارەی ئەو شـارەی لـە گـوێ دەریـابوو، لـە کاتێکدا ئەوان لە ڕۆژی شەممەدا سنووریان دەبەزاند (کـە بڕیـار بـوو لـە شـەممەدا هیچ کارێك نەکەن تەنها خواپەرستی نەبێ).

کاتێك لە ڕۆژی شەممەکەیاندا ماسیە گـەورەکانیان بـۆ دەهاتـە سـەر ئاوەکـە و ئەو ڕۆژانەش کە شەممە نەبوون ماسیەکانیان بۆ نـەدەهات، ئـا بـەو شـێوەیە بـە هۆی یاخی بوون و لادانیانەوە تاقیمان کردنەوە.

٣- ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ آمِنُواْ بِمَا نَزَّلْنَا مُصَدِّقاً لِّمَا مَعَكُم مِّن قَبْلِ أَن نَّطْمِسَ وُجُوهاً فَنَرُدَّهَا عَلَى أَدْبَارِهَا أَوْ نَلْعَنَهُمْ كَمَا لَعَنَّا أَصْحَابَ السَّبْتِ وَكَانَ أَمْرُ اللّهِ مَفْعُولاً﴾ (النساء : ٤٧ ).

واتە: ئەی ئەوانەی پەڕاوی ئاسمانیتان پێدراوە باوەڕ بهێنن بەو قورئانەی کە ناردوومانە و بەڕاست دانەری ئەوەی ئێوەیە، پێش ئەوەی رۆژێك بێت کە رووخسارانێکی بێ دین پان و پلیش بکەینەوە و ئاسەواری دەمو چاو نەهێڵین و بەرەو پشتی بکەین و وەکو پشتە سەری لێ بکەین، یاخود نەفرینیان لێ بکەین وەکو چۆن نەفرینمان لە خەڵکانی رۆژانی شەممەوان کرد کە بە فێڵ فەرمانی خوایان شکاند، بێگومان هەر فەرمانی خوایە کە هەمیشە و بەردەوام ئەنجامدراوە.

لە ئایەتەکانەوە تێدەگەین کە ئەهلی کیتاب ئەم بەسەرهاتەیان زۆر بەباشی زانیوە، بۆیە پێیان دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ الَّذِينَ اعْتَدَواْ مِنكُمْ فِي السَّبْتِ﴾. یان دەفەرموێت: ﴿وَاسْأَلْهُمْ عَنِ الْقَرْيَةِ الَّتِي كَانَتْ حَاضِرَةَ الْبَحْرِ﴾.

جا کاتێك عەبدوڵلای کوڕی سەلام لە شامەوە هات بۆ مەدینە و گوێی لەم ئایەتە بوو: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ آمِنُواْ بِمَا نَزَّلْنَا مُصَدِّقاً لِّمَا مَعَكُم مِّن قَبْلِ أَن نَّطْمِسَ وُجُوهاً فَنَرُدَّهَا عَلَى أَدْبَارِهَا أَوْ نَلْعَنَهُمْ كَمَا لَعَنَّا أَصْحَابَ السَّبْتِ﴾، بەپەلە هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و موسڵمان بوو، عەبدوڵلا یەکێ بوو لە زاناکانی جوولەکە و باش لەم پەندو عیبرەتە تێگەیشتبوو، دەیزانی کە هەڕەشەی خوا ڕاستەو دێتەدی و هیچ شتێك ناتوانێت رێی لێبگرێت.

کە موسڵمانیش بوو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لە ڕێ زۆر دەترسام کە خوا (مەسخم) بکات و شکڵ و شێوەم بگۆڕێت.

(کعب الأحباریش) کە زانایەکی تری جوولەکەیە خۆی و کەسوکاری لە زەمانی حەزرەتی عومەردا بەهۆی ئەو ئایەتەوە موسڵمان بوون، کاتێ گوێی لەو ئایەتە

بوو یەکسەر وتی: خوایە موسڵمان بووم، ئینجا دەڵێ کاتێ موسڵمان بووم و خۆم شت دەستم دەگێڕا بە دەمو چاوم دا دەترسام خوا مەسخی کردبم.

کاتێـك بـەنی قـورەیزە پـەیمانیان شـکاند و حەزرەت(صـلى الله علیـه والـه وسلم)چـووە سـەریان، لەسـەر شـووراکانیانەوە جنێویـان ئـەدا بـە موسـڵمانان، حەزرەت(صلى الله علیه واله وسلم) پێی فـەرموون: (ئـەی براکـانی مـەیمون، ئایـا خوا ریسوای کردن و سزا و خەشمی خۆی بۆ ناردون؟)، هـاوەڵان لـە حـەزرەتیان پرسی ئایا مەیمون و بەراز نەوەی ئەوانن؟ ئەویش فەرمووی: نەخێر هەرکەس خوا مەسخی بکات نەوەی نابێت!

## ٧ـ جنۆکە و عیفریتەکان

پ١٨٤/ لـە سـورەتی (الحجـر/ ٢٧)دا هـاتووە: (وَالْجَآنَّ خَلَقْنَاهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ السَّمُومِ) (الحجر: ٢٧) لەوەوبەر جنۆکەمان لە ئاگر وگڕ دروست کردووە.

لە سورەتی (الذاریات: ٥٦)دا هـاتووە: (وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ) (الذاریات: ٥٦). جنۆکە و مـرۆڤم دروسـت نـەکردووە مەگـەر بـۆ ئـەوە نـەبێت کـە بمپەرستن.

فادی چەند ئایەتێکی تریش دێنێت کە باس لە جنۆکە دەکەن و پاشان پرسـیار دەکـات و دەڵێـت: عیفریتـەکان لـە ئـاگر دروسـت کـراونو رۆحـانین و دادەبـەزن و بەهەموو شوێنەکاندا دێنە ناوەوە، ئایا چۆن زەواج دەکەن و دەمرن؟

فادی ئەیـەوێت جیهـانی جنۆکـە لـە چـاوی دنیـا و جیهـانی مـاددەوە تێبگـات، لەکاتێکدا پێکهاتە و هەڵسوکەوت و ژیانی ئەوان بەجۆرێکی ترە و تەنها رێگەش بۆ ناسینیان و تێگەیشتن لێیان قورئان و فەرموودەیە.

خوای گەورە مرۆڤی لە قوڕ دروسـت کـرد و پاشـان بـووە بـەم جەسـتەیەی کـە خوێن و گۆشـتە و دەخـواو دەخواتـەوە و هاوسـەرگیری دەکـات و نـەوە و وەچـە دەخاتەوە، جنۆکەش خوای گەورە لە بڵێسەی ئاگر دروسـتی کـردوون، ئینجـا چ

گۆڕانێکیان بەسەردا هاتووە یان نا نازانین، پاشان چۆن دەخۆن و دەخۆنەوە و دەژین و دەمرن و هاوسەرگیری دەکەن تەنها خوا دەیزانێ، ئێمە بڕوامان پێیەتی، چونکە مەرجەعمان قورئان و فەرموودەیە.

ئینجا وەرگێڕیش سەرە مەسەلەیەك دێنێت گوایە حەزرەتی سولەیمان باڵندەیەکی بینیوە وتوویەتی: (بۆ مردن لە دایك دەبن و بۆ کاول بوون بینا دەکەن) ئینجا ئەمە دەباتەوە بۆ ئەوەی گوایە ئیسلام وا لە خەڵك دەکات گوی بە دنیا نەدەن و بە هەژاری بژین و دەسەڵاتدارانیش دنیا بەرن بۆ خۆیان و نەوەکانیان.

ئەمەش ئەدرێتەوە بەسەر خاوەنەکەیدا و قسەیەکی ناڕاست و تێگەیشتنێکی سەقەتە، هەرگیز ئیسلام داوای لە خەڵکی نەکردووە بە هەژاری ڕازی بن، موسڵمانان هەمیشە پەنا دەگرن بە خوا لە کوفر و هەژاری، (اللهم إني أعوذ بك من الكفر والفقر)، هەروەها ئیسلام هەرگیز داوای لە موسڵمانان نەکردووە سەرشۆڕ بکەن بۆ ستەمکاران و تەرکی دونیا بکەن، قورئان و فەرموودە بە ڕێزەوە باسی ئیش کردن دەکەن و بە عیبادەت ناوزەدی دەکەن.

## ٨ـ هەنگوین دەرمانی هەموو نەخۆشیەکە!

پ١٨٥/ لە سورەتی (النحل: ٦٨ـ ٦٩)دا هاتووە: (وَأَوْحَى رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ أَنِ اتَّخِذِي مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتاً وَمِنَ الشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ * ثُمَّ كُلِي مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ فَاسْلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلاً يَخْرُجُ مِن بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاء لِلنَّاسِ).

پەروەردگارت سروشی بۆ هەنگ کرد کە لە چیاکاندا و لەناو درەختدا هێلانە دروست بکات، پاشان لەبەری هەموو جۆرە رووەکێك بخوات و بە ملکەچی ڕێگەی پەروەردگاری بگرێت، لە هەناویەوە هەمەڕەنگەی هەنگوین دەردەچێت کە بۆ خەڵکی چارەسەری تیایە.

فادی ڕەخنە لە ئایەتەکە دەگرێت گوایە فەرموویەتی هەنگوین شیفایە بۆ هەموو نەخۆشیەك، لەکاتێکدا ئایەتەکە دەفەرمویێت : (فِيهِ شِفَاءٌ لِلنَّاسِ) و نەیفەرمووە: (هو الشفاء للناس)، ئەم دوو تەعبیرە جیاوازن، قورئان دەفەرموێت شیفای تیایە بۆ خەڵکی ئیتر نەیفەرمووە شیفایە بۆ هەموو نەخۆشییەکی خەڵکی، هەرچەندە ئەمڕۆ هەزاران لێکۆڵینەوە کراوە لەسەر هەنگوین، هەمووی ئەوە دەسەلمێنن کە شیفایە بۆ زۆر نەخۆشی و سوودی زۆری هەیە بۆ مرۆڤ.

پاشان فادی تەزویرچی بەشێکی فەرموودەیەك دەهێنێ کە دەڵێت:

لە قەتادەوە دەگێڕنەوە: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر وتی: براکەم هاواری سکی دەکات، پێغەمبەریش وتی: هەنگوینی بدەرێ، ئەویش ڕۆیشت، پاشان گەڕایەوە وتی: هەنگوینم پێدا سوودی نەبوو، پێغەمبەریش وتی: بڕۆ هەنگوینی بدەرێ، چونکە خواوەند ڕاستی کردووە و سکی براکەت درۆ دەکات، ئینجا فادی پرسیار دەکات و دەڵێت: ئەگەر نەخۆش چاك نەبووبێتەوە چۆن خوا ڕاست دەکات و سکی نەخۆشەکە درۆ دەکات؟ ئایا ئەو وەڵامە ڕاستگۆیی محمد یان هەقیقەتی هەنگوین دەردەخات؟ بەشەکەی تری فەرموودەکە کە فادی نەیهێناوە ئەمەیە:

(پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر(صلی الله علیه واله وسلم)وتی: براکەم هاواری سکی دەکات فەرمووی: هەنگوینی بدەرێ، بۆ دووەم جار هاتەوە و هەمان شتی وتەوە، پێی فەرموو: هەنگوینی بدەرێ، بۆ سێیەم جار هاتەوە و پێی فەرموو: هەنگوینی بدەرێ... پاشان هاتەوە وتی: هەنگوینم دایە (چاك نەبوو)، حەزرەتیش فەرمووی: (خوا ڕاستدەکات (کە فەرموویەتی هەنگوین شیفای تیایە) و سکی براکەت درۆ دەکات، هەنگوینی بدەرێ، هەنگوینی تری دایە چاك بۆوە).

ئەم فەرموودەیە کە فادی بەشی دوایی نەهێناوە بەڵگەیە کە خوا ڕاستی فەرمووە و نەخۆشەکەش پاش چوار جار هەنگوین خواردن چاك بۆتەوە.

## ٩ـ شەوڕەوی بۆ ئاسمان و گەڕانەوە بۆ زەوی

پ١٨٦/ لە سورەتی (الإسراء: ١)دا هاتووە: (سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِّنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الآقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ) (الإسراء: ١).

پاکو بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە شەوڕەوی بە بەندەی خۆی کرد لە مزگەوتی حەرامەوە لە مەککە بۆ مزگەوتی ئەقسا کە دەوروبەریمان بەرەکەتدار کردووە.

ئینجا فادی لە تەفسیری بەیزاویەوە چۆنیەتی ڕووداوەکە باس دەکات و پاشان دەپرسێت (ئایا شاهیدەکانی شەوڕەوی محمد کێن؟ هەروەها لە مەرجەکانی موعجیزە ئەوەیە لەبەردەمی شاهیدەکاندا بێت و بۆ مرۆڤیش سوودمەند بێت، ئەمانەش لە شەوڕەوی و بەرزبوونەوەدا نییە، هەروەها مزگەوتی ئەقسا لە سەردەمی محمددا بوونی نەبووە بەڵکو ئەو مزگەوتە لە دوای مردنی محمد بە نزیکەی سەد ساڵ دروستکراوە، ئایا چۆن محمد لەو مزگەوتەدا نوێژی کردووە و وەسفی دەرگاو پەنجەرەکانی ئەو مزگەوتەی کردووە؟).

**وەڵام:**

شەوڕەوی موعجیزەیەکی پێغەمبەرە(صلى الله عليه واله وسلم)کە خوا ویستی دڵی پێغەمبەری(صلى الله عليه واله وسلم) پێ بداتەوە پاش ئەوەی لە تائیف تووشی ناڕەحەتی و ئازارێکی زۆر بوو، مەرجیش نییە شایەتی هەبێ (وكفى بالله شهيدا) خوا بەسە کە شایەتی بۆ محمد ئەدات و لە قورئاندا باسی دەکات، باشە ئەگەر ئەو برادەرە بڕوای بە حەزرەتی موسا و عیسا هەیە و بڕوای بەوە هەیە کە جوبرائیل وەحی بۆ هێناون (کە ئەمەش بۆ خۆی موعجیزەیەکە) باشە کێ جوبرائیلی بینیوە و کێ شایەتی بووە، ئینجا ئەو موعجیزەیە چەند بۆ مرۆڤ سوودبەخشە ئەوە شتێکە لای خوایە و و خۆی دەزانێت چی دەکات و بۆ دەیکات.

سوودی شەوڕەویش بۆ دڵدانەوەی حەزرەت ﷺ بووە کە لەو کاتەدا زۆر تووشی ناخۆشی و ئەزیەت و ئازار بووە.

بۆ مەسەلەی دروستکردنی (مسجد الأقصى)ش حەزرەت(صلى الله عليه واله وسلم) دەفەرموێت کەعبە یەکەم ماڵی خواپەرستییە کە ئیبراهیم دروستی کردووە و پاش چل ساڵیش مزگەوتی ئەقسا دروستکراوە، لەوەئەچێ هەر ئیبراهیم دروستی کردبێت، ئینجا تا سەردەمی حەزرەت(صلى الله عليه واله وسلم) چەند جار رووخاوە و دروستکراوەتەوە بەتایبەت لە زەمانی سولەیماندا سەلامی خوای لەسەر بێت.

لە زەمانی حەزرەتدا(صلى الله عليه واله وسلم) هەندێ دیوار و دەرگا و پەنجەرەی مابوو کە حەزرەت(صلى الله عليه واله وسلم) لە شوێنەکەدا نوێژی کردو ئەوەی کە دیبوی و خوا هێنایە پێش چاوی وبۆی وەسف کردن و کەس لە کافران کە ئەوانیش پێشتر دیبویان نەیانوت وانییە!

پاشان حەزرەتی عومەر فەتحی قودسی کرد چووە مزگەوتی ئەقسا و پاکی کردەوە و نوێژی تیا کرد، پاشان خەلیفەی ئومەوی (وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك) بینای کردەوە لەسەر ئەو ئەساس و دیوارەی کە مابۆوە ولە کۆنەوە دروستکرابوو.

## ١٠ـ پەپو سلێمانەی فەیلەسوف!

پ١٨٧/ لە سورەتی (النمل: ٢٠ـ٢٨)دا هاتووە: (وَتَفَقَّدَ الطَّيْرَ فَقَالَ مَا لِيَ لَا أَرَى الْهُدْهُدَ أَمْ كَانَ مِنَ الْغَائِبِينَ * لَأُعَذِّبَنَّهُ عَذَاباً شَدِيداً أَوْ لَأَذْبَحَنَّهُ أَوْ لَيَأْتِيَنِّي بِسُلْطَانٍ مُّبِينٍ * فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِ وَجِئْتُكَ مِن سَبَإٍ بِنَبَإٍ يَقِينٍ * إِنِّي وَجَدتُّ امْرَأَةً تَمْلِكُهُمْ وَأُوتِيَتْ مِن كُلِّ شَيْءٍ وَلَهَا عَرْشٌ عَظِيمٌ * وَجَدتُّهَا وَقَوْمَهَا يَسْجُدُونَ لِلشَّمْسِ مِن دُونِ اللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ السَّبِيلِ فَهُمْ لَا يَهْتَدُونَ * أَلَّا يَسْجُدُوا لِلَّهِ الَّذِي يُخْرِجُ الْخَبْءَ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُخْفُونَ وَمَا تُعْلِنُونَ * اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ * قَالَ سَنَنظُرُ أَصَدَقْتَ أَمْ

كُنتَ مِنَ الْكَاذِبِينَ * اذْهَب بِّكِتَابِي هَذَا فَأَلْقِهْ إِلَيْهِمْ ثُمَّ تَوَلَّ عَنْهُمْ فَانظُرْ مَاذَا يَرْجِعُونَ).

سولەیمان سەلامی خوای لێبێت دوای کۆکردنەوەی باڵندەکان بەناویاندا گەڕا و وتی: لەبەرچی هودهود نابینم یان ئەوەیە لە ئامادەبوان نییە؟

وتی: یان ئازارێکی توندی دەدەم یان سەری دەبڕم یان دەبێ بەڵگەیەکی ئاشکراو ڕوونم بداتێ، هودهودیش زۆر بە نادیاری نەمایەوە و نیشتەوە و بە سولەیمانی وت: دەرکم بە شتێك کردووە کە تۆ نایزانیت، لە سەبەئەوە هەواڵێکی دیار و ئاشکرام بۆ هێناویت، من بینیم ژنێك پادشایەتیان دەکات، کە هەموو شتێکی هەیە و تەخت و بارەگایەکی زۆر مەزنی هەیە و بینیم کە میللەتەکەی کڕنووش بۆ خۆر دەبەن نەك بۆ خواوەند، شەیتانیش ئەم ڕەفتارەی لا جوانکردوون و بەربەستی ڕێگەی خواوەندی لێکردوون و ڕێگەی ڕاست نادۆزنەوە، ئایا کڕنووش بۆ ئەو خواوەندە نابەن کە هەرچی نادیار هەیە لە ئاسمانەکان و زەویدا بەدەریدەخات، وە دەزانێ کە چی دەشارنەوە و چی ئاشکرا دەکەن، ئەو خودایەی کە جگە لە ئەو هیچ خواوەندێك نییە مەگەر ئەو نەبێت کە پەروەردگاری عەرشی مەزنە.

سولەیمان وتی: چاوەڕوان دەکەین بزانین ڕاست دەکەیت یان لە درۆزنەکانیت، ئادەی بڕۆ ئەم نامەیەی من ببە و بۆیان هەڵدە و کەناریان لێ بگرە و بزانە وەڵامێك دەدەنەوە.

پاش هەندێ باسی تری حەزرەتی سولەیمان، فادی پرسیار دەکات و دەڵێت: چ ئاقڵێك وێنای ئەوەی بۆ دەکرێت کە پەراوێزی سولەیمان پادشای دانا لە جنۆکە و باڵندە بێت؟

چۆن هودهود زانایی و دانایی لە سولەیمان زۆرتر بووەو کێبەرکێی سولەیمانی کردووە وتوویەتی: هەواڵێکم زانیوە کە تۆ نەتدەزانی و لە سەبەئەوە هەواڵێکی زۆر ڕاستم بۆ هێناویت؟!

چۆن هودهود سەرزەنشتی پەرستنی بت دەکات و بە شان و باڵی یەکتاپەرستییدا هەڵدەدات؟ وە چۆن هودهود بە ڕۆڵی نامە گۆڕینەوە هەڵدەستێت؟ وە چۆن هودهود لە پادشایەتی سولەیماندا وا هەڵسوکەوت دەکات، کە هەڵسوکەوتەکەی لە سەرو هەڵسوکەوتی پادشا و وەزیر و فەیلەسوفەکانەوەیە؟

**وەڵام:**

خوای گەورە کەهەرچی بویێ و چۆنی بـویێ دروسـتـی دەکـات (يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ وَاللّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ )المائدة١٧ ئەو توانایەی داوە بە هودهودو کردوویەتییـە دانایـەك کـە سەرزەنشـتـی بـت پەرسـتـی دەکـات و هـەواڵی گـەلی سـەبەئو پادشـاکەیان بـۆ حەزرەتی سـولەیمان دێنێـت، جـا نـە کێبـەرکێی سـولەیمان دەکـات و نـە دانـایی لـە سولەیمان زیاترە و نـە هەڵسوکەوتیشـی لـە سـەروو هەڵسـوکەوتی پادشـا و وەزیـر و فەیلەسوفەکانەوەیە، ئیتر فادی وا تێدەگات و وای تەفسیر دەکات کەیفی خۆیەتی و پەیوەندی بە ئایەتەکانەوە نییە.

ئینجا وەرگێڕیش دەپرسیێ چۆن موحەممەد(صلى الله عليه والـه وسـلم) زانیویـەتی کە ئەو مێرووله‌یەی سوپاکەی سولەیمانی بینیوە مێینە بووە؟

پاشان دەڵیێ: وشەی جوبرائیل و جنۆکە و عیفریت خەیاڵاتی مرۆڤـە و بـەو وشـانە وێنای دەکات.

هەرچی قورئـان باسـی کردبێـت لـە خواوەیـە و (موحەممەد)(صـلى الله عليـه والـه وسلم)هیچی لە خۆیەوە نەهێناوە (وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى).

ئینجا پرسیار دەکات ئەگەر لە قورئاندا وەسفی ئوممەتەکانی تریش بـە موسـڵمان دەکات ئەی کەواتە بۆ موسڵمانان وازیان لیێ نەهێناون و بۆ چوونەتە سەریان و داوای موسڵمانبوونیان لیێ کردوون؟

لەوەڵامدا دەڵێین: قورئان کە دەفەرموێت بڕوادارانـی گـەلانی دێرینیش موسـڵمانن بەو مانایەیە کە پەیڕەوی بەرنامەی خوایان کـردووە و تەسـلیم بـوون بـۆ ئـەوەی کـە خوا داوای لێکردوون، بەڵام کە حەزرەتی (موحەممەد)(صلى الله عليه واله وسلم)هات و قورئانی هێنا هەموو پەیامەکانی تـر کەتـەحریف کـراون نەسـخ دەبنـەوە و دەبێـت هەمووان شوێنی ئەم پێغەمبەرە بکەون کە دوا پێغەمبەرە و بۆ هەموو مرۆڤایەتییە تا قیامەت.

## ١١ـ ئاژەڵێك لە نێو پێغەمبەراندا

پ١٨٨/ لە سورەتی (النمل: ٨٢)دا هاتووە: (وَإِذَا وَقَعَ الْقَوْلُ عَلَيْهِمْ أَخْرَجْنَا لَهُمْ دَابَّةً مِّنَ الآَرْضِ تُكَلِّمُهُمْ أَنَّ النَّاسَ كَانُوا بِآيَاتِنَا لَا يُوقِنُونَ).

کاتێك کە قسەی ئێمەیان دێتە سەر لە ئاخر زەماندا گیانەوەرێکیان لە زەوییەوە بۆ دێتە دەرەوە، کە قسەیان لەگەڵدا بکات و دەڵێت خەڵکی باوەڕی تەواوەتییان بە نیشانە و بەڵگەکانی ئێمە نییە.

ئینجا فادی لە تەفسیری بەیزاوییەوە کۆمەڵێ سیفاتی ئەو گیانلەبەرە دێنێت کە لە قورئان و فەرموودەدا نییە.

لە نزیك قیامەتدا خوای گەورە وەك بەڵگەو نیشانەیەك گیانلەبەرێك لە زەوییەوە دروست دەکات و دێتە دەرەوە و قسە لەگەڵ خەڵك دەکات و دەڵێت خەڵکی باوەڕی تەواوەتییان بە نیشانە و بەڵگەکانی خوا نییە، بەڵام ئەمە چییە و چۆن دەبێت ئەوە تەنها خوا خۆی دەزانێت و کاری ئێمە نییە، ئینجا فادی بە ئارەزووی خۆی چی بوێ لە تەفسیرەکانەوە دەیهێنێ و تەعلیقی لێ دەدات، هەمووی ئەدرێتەوە بەسەر خۆیدا و پێش ئەویش بەسەدان ساڵ زانایانی شارەزا ئەو هەواڵانەیان هەمووی رەت کردۆتەوە.

ئینجا وەرگێڕیش ڕەخنە لە هاتنی دەجال و هاتنی رۆژی دوایی دەگرێت دیارە ئەمانەش هەموو غەیبن و تەنها مەرجەعمان قورئان و فەرموودەیە.

## ١٢ـ مردوویەك بۆ ماوەی ساڵێك خۆی دەدات بەسەر گاڵۆکێکدا

پ١٨٩/ لە سورەتی (السبأ: ١٤)دا هاتووە: (فَلَمَّا قَضَيْنَا عَلَيْهِ الْمَوْتَ مَا دَلَّهُمْ عَلَى مَوْتِهِ إِلَّا دَابَّةُ الآَرْضِ تَأْكُلُ مِنسَأَتَهُ فَلَمَّا خَرَّ تَبَيَّنَتِ الْجِنُّ أَن لَّوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ الْغَيْبَ مَا لَبِثُوا فِي الْعَذَابِ الْمُهِينِ).

کاتێك فەرمانی مردنی ئەومان براندەوە هیچ شتێك مردنی ئەوی بۆ دەرنەخستن (جنۆکەکان)، مەگەر مێرووی زەوی نەبێت کە گاڵۆکەکەی سولەیمانی خوارد،

کاتێك کە کەوت ئەوسا جنۆکەکان بۆیان دەرکەوت کە ئەگەر غـەیبیان بزانیایـە لـە ئازاری ریسواکەردا نەدەمانەوە.

ئینجا فادی لە تەفسیری بەیزاویەوە باسی چۆنیەتی مردنی حـەزرەتی سـولەیمانی هێناوە، گوایە ساڵێك یان زیاتر ماوەتەوە و خۆی داوە بەسـەر گاڵۆکەکەیدا، گوایـە چـۆن لـەو مـاوە درێـژەدا لاشـەی تێکنەچـووە، یـان کـەس و کـارو حاشـیەی لێیـان نەپرسیوە.

ئەوەی کە قورئان باسی کردووە تەنها بۆ ئەوەیە کە نە ئادەمی و نە جنۆکە غەیب نازانن، چونکە ئەگەر غەیبیان بزانیایە ئاوا لـە کـارو فەرمانـدا نەئەمانـەوە، چـونکە ئەوان بە فەرمانی حەزرەتی سولەیمان کاریان دەکرد.

ئینجا مەسەلەی مانەوەی حـەزرەتی سـولەیمان بەسـەر گاڵۆکەکەیـەوە و درێـژەی ئەو باسـە (کەچەنـد ماوەتـەوە ) پەیوەنـدی بـە قورئانـەوە نییـە، ئـەوە بـۆ خۆشـی موعجیزەیەکە و ویستی خوای لەسەر بووە، دیارە لە مەسەلەی موعجیزەشدا چەن و چۆنی ناوێت.

## ١٣ـ کێوێك بە ئاسماندا دەفڕێت

پ١٩٠/ لە سورەتی (النساء: ١٥٤)دا هاتووە: (وَرَفَعْنَا فَوْقَهُمُ الطُّورَ بِمِيثَاقِهِمْ).

کێوی گورمان بەسەریانەوە بەرزکردەوە لەبەرئەو بەڵێنەی کە دابوویان.

لە سورەتی (الأعراف: ١٧١)دا هاتووە: (وَإِذ نَتَقْنَا الْجَبَلَ فَوْقَهُمْ كَأَنَّهُ ظُلَّةٌ وَظَنُّواْ أَنَّهُ وَاقِعٌ بِهِمْ خُذُواْ مَا آتَيْنَاكُم بِقُوَّةٍ وَاذْكُرُواْ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ).

کاتێك چیاکەمان بەسەریاندا بەرزکردەوە هەروەکو سێبەرێك، پێیان وابـوو کـە بەسەریاندا دەکەوێت، ئەوەی کـە پێمانـداون لـە تـابلۆی یاسـاکان و ڕێنماییـەکان (ألواح موسى) تونـد بیگـرن و ئـەوەی کـە تیایـەتی بیخوێننـەوە و یـادی بکەنـەوە بەڵکو لەوانە بن کە خۆتان لە خوا دەپارێزن.

ئینجا فادی پرسیار دەکات و دەڵێت: ئایا ئەوە گونجاوە کـە خواوەنـد چـیایەك لە زەوی هەڵکەنێت و چیاکە بەرز بێتەوە بۆ ئاسمان و لە ئاسماندا بە هەڵواسراوی

بمێنێتەوە بەبێ ئەوەی لەسەر شتێك راگیر بێت، تاکو خەڵکی بترسێنێت و بە زۆر وایـان لێبکـات یاسـاکانی قبـوڵ بکـەن؟ ئایـا ئەمـە لـە رووی زانسـتییەوە لەگـەڵ یاساکانی هێزی راکێشـاندا دێتـەوە و لـە رووی نەریتیشـەوە لەگـەڵ خۆشەویسـتی خوایدا دێتەوە؟

**وەڵام:**

دیارە ئەمە موعجیزەیە و هەموو موعجیزاتەکانیش بۆ دەسەڵاتی بێ پایانی خوا ئاسانە، ئینجا ئەوەی سەیرە فادی مەسیحییە و بڕوای بـە پـەڕاوی پیرۆزیانـە کـە چەندەها موعجیزەی تیایـە وەك شـەق بـوونی ئـاوی دەریا و پەڕینـەوەی موسـاو شـوێنکەوتنی و تیاچـوونی فیرعـەون و سـوپاکەی، ئێمـەش دەپرسـین ئـەم دوو موعجیزەیە جیاوازییان چییە، مەگەر هـەردووکیان بـە ویسـتی خـوای باڵادەسـتی بەدیهێنـەری بوونـەوەر نـەبووە کـە هـیچ شـتێك لـە زەوی و لـە ئاسمانەکانـدا دەستەوسانی ناکات (وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعْجِزَهُ مِن شَيْءٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ إِنَّهُ كَانَ عَلِيماً قَدِيراً )فاطر٤٤، گەلی بەنی ئیسرائیلیش کە لەدوا پلـەی سەرسـەختی و پەیمان شکێنیدا بوون ئەگەر خـوای خـاوەن دەسـەڵات ئـەو موعجیزەیـەی پیشـان دابن تا باشتر پابەندبن بە عەهدو پەیمانەکەیانەوە چی تیایە، دیارە کەس نـاتوانێ لەخواپرسـێتەوە لەسـەر کارەکـانی، ئـەوە مرۆڤـە کـە لێپرسـینەوەی لەگـەڵ دەکرێت(لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ )الأنبياء٢٣

## ١٤ـ چیایەك قسە دەكات

پ١٩١/ لـە سـورەتی (سـبأ: ١٠) هـاتووە: (وَلَقَدْ آتَيْنَا دَاوُودَ مِنَّا فَضْلاً يَا جِبَالُ أَوِّبِي مَعَهُ وَالطَّيْرَ وَأَلَنَّا لَهُ الْحَدِيدَ).

ئێمە لەلای خۆمان زێدە چاکیمان بـە داوود دابـوو بـە چیـاو باڵنـدەمان وت کـە پـاکیزی خواوەنـد و تەوبـە و گریـەی بـە کـوڵ بـۆ گوناهـەکانی لەگـەڵ بلێنـەوە و ئاسنیشمان بۆ نەرم کرد.

ئینجا فادی پرسـیار دەکـات و دەڵێـت: ئایـا چیاکان لێتەگەیشـتنیان هەیـە، کـە دەرك بەوە بکەن کـە زۆربـەی مـرۆڤ نایزانێـت، وە ئـەو ئەمانەتـەی پێشـنیار کرابـوو هەڵی بگرن، چیاکان رەتی بکەنەوە؟ یان لەگەڵ داوودا ویردو دوعاکانی بڵێنەوە؟

لەوەڵامدا دەڵێین:

بەڵێ ئەو خوایەی کە هەسـت و هۆشـی داوە بـە ئـادەمیزاد کـە گۆشـت و خوێنـە، ئاسـاییە کـە بـە جۆرێـك لـە جۆرەکـان ئـەو هەسـت و هۆشـەش بـدات بـە چـیاکان و تەسبیحاتی خوا بکەن و پاشان ئەمانـەتی پێشـنیار کـراو کـە ئەمانـەتی پەیامدارییـە وەری نـەگرن، دیسـان لـە فـادی مەسـیحی دەپرسـین باشـە تـۆ بـڕوات بەوەیـە کـە عەسـاکەی موسـا لـە کـاتی هەڵدانیـدا ببێتـە مـار و ئـەژدەها و هـەموو سـیحرەکانی ساحیرەکان هەڵبلوشێ و دواییش ببێتەوە بە عەساکە و بەدەسـتیەوە بیگرێـت، ئـەو خوایـەی ئـەوەی بـۆ موسـا کـردووە هـەر ئەوخوایەیـە کـە ئـەم موعجیزاتانەشـی بـۆ پێغەمبەرەکانی تری ئەنجامداوە.

## ١٥ـ ئاسن هەروەکو مێو نەرم دەبێتەوە!

پ١٩٢/ لە سـورەتی (سـبأ: ١٠ــ ١١)دا هـاتووە: (وَلَقَدْ آتَيْنَا دَاوُودَ مِنَّا فَضْلاً يَا جِبَالُ أَوِّبِي مَعَهُ وَالطَّيْرَ وَأَلَنَّا لَهُ الْحَدِيدَ أَنِ اعْمَلْ سَابِغَاتٍ وَقَدِّرْ فِي السَّرْدِ وَاعْمَلُوا صَالِحاً إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ).

خوای گەورە ئاسنی بۆ داوود نەرم کردبوو کـە قـەڵغان و زرێپـۆش و مەنجـەڵی بـە زنجیر هەڵواسراوی لێ دروست بکـا، فـادی پرسـیار لـەم بارەیـەوە دەکـات کـە چـۆن ئاسن سیفاتی خۆی لەدەستی داوودا ون دەکات و نەرم دەبێت؟؟

ئەمـەش موعجیزەیەکـە و ویسـتی خـوای لەسـەرە و جێـی ڕەخنـە نییـە، ئەگـەر ڕەخنـە لەمـە بگـرێ دەی کەواتـە بـڕوای بـە عیسـاو لـە دایکبـوونی بـە مـوعجیزە و هەڵکێشانەوەی بۆ ئاسمان و باقی موعجیزەکانی تری هەمووی جێی پرسیارن، نازانم بۆ لای فادی بانێکەو دوو هەوا؟!!

هەر لێرەشدا وەرگێڕ دەڵێت پێغەمبـەران کـارو پیشـەیەکیان زانیـوە و بـە ڕەنـج و شانی خۆیان ژیـاون، کەچـی لـە وڵاتـە ئیسـلامییەکاندا زۆربـەی کـارو پیشـەکان بـە

چاوێکی نزم سەیر دەکرێن، ئێمەش دەڵێین هەندێ بیروبۆچوونی هەڵەی موسـڵمانان کە بـە سـووك سـەیری هەنـدێ کـار بکـەن پەیوەنـدی بـە ئیسـلامەوە نییـە، چـونکە کارکردن لـە ئیسـلامدا بـۆ پەیـداکردنی بـژێوی جۆرێکـە لـە عیبـادەت و ئیسـلام دژی تەمبەڵی و دەستەوسانی و کارنەکردنە.

## ١٦ـ نوستنێکی ( ٣٠٩ ) ساڵە

پ١٩٣/ لە سورەتی (الكهف: ٩ـ ٢٦)دا هاتووە: (أَمْ حَسِبْتَ أَنَّ أَصْحَابَ الْكَهْفِ وَالـرَّقِيمِ كَـانُوا مِـنْ آيَاتِنَـا عَجَبـاً * إِذْ أَوَى الْفِتْيَـةُ إِلَـى الْكَهْـف .....هەتا............أَبْصِرْ بِهِ وَأَسْمِعْ مَا لَهُم مِّن دُونِهِ مِن وَلِيّ وَلَا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَداً).

فادی پرسیار دەکات و دەڵێت: چۆن حەوت گەنج و سەگەکەیان توانیویانە ٣٠٩ ساڵ بە خـەوتوویی بمێننـەوە؟ ئایـا وانـە و دەرسـی سـودمەند لـەم چـیرۆکەدا بـۆ ئەمرۆ چییە؟

عەرەبـەکانی مەککـە لـە بـارەی (موحەممەد)ەوە(صـلی الله علیـه والـه وسـلم) پرسیاریان لە ئەهلی کیتاب دەکرد، کە ئایا هیچ دەزانن لەبارەیەوە و پێغەمبـەرە یان نا، ئەوانیش لە جارێکیاندا سێ پرسیاریان فێر کردن کە لێی بکـەن تـا بۆیـان دەربکەوێ کە ئایا ڕاست دەکا پێغەمبەرە یان نا، یەکێ لە پرسـیارەکان لـەبارەی (ذي القرنين)ەوە بوو، یەکێکیان لەبارەی ڕۆحەوە بـووە، یەکێکیشـیان لـەبارەی هاوەڵانی ئەشکەوتەوە بـوو، کـە لـە سـورەتی کەهفدا وەڵامـەکانیان هـاتووە بـۆ پێغەمبەر(صـلی الله علیـه والـه وسـلم)، دیـارە ئەمـەش هـەروەکو بابەتـەکانی تـر موعجیزەیە و ئەهلی کیتابی ئەوسا کە زانیارییـان هـەبووە لەوبارەیـەوە دەمکـوت بوون و حوججەو بەڵگە و بورهان بووە بۆیان کە (موحەممەد)(صلی الله علیـه والـه وسلم) پێغەمبەری خوایە.

دیارە قورئان پەیامی خوایە و بۆ ڕێنمایی ئادەمیزاد هـاتووە تـا چـی چاکە بـۆ دونیـاو قیامـەتی ئـەوە بکـات و چـیش خراپـە خـۆی لـێ لا بـدات، چـیرۆکەکانی قورئـانیش پـەروەردەکردنی مرۆڤـە، دیـارە چـیرۆکیش گرنگـی خـۆی هەیـە لـە پەروەردەدا و ئەمەش لای شارەزایانی بواری پەروەردە ڕوون و ئاشکرایە، جا کـە

ناوبراو دەپرسێت بۆ ئەمڕۆ سوودی چییە، دەڵێین: بۆ ئەمڕۆ و بۆ سبەینێو تا قیامەتیش سوودی خۆی هەیە لە پەروەردەکردنی مرۆڤدا، کە مرۆڤێکی ساڵحی موسڵیحی لێ دەربچێ و خزمەت بە خۆی و دەوروبەری بکات.

## ١٧ـ ڕەشەبا لە ژێر فەرمانی سولەیماندایە

پ١٩٤/ لە سورەتی (الأنبیاء: ٨١)دا هاتووە: (وَلِسُلَيْمَانَ الرِّيحَ عَاصِفَةً تَجْرِي بِأَمْرِهِ إِلَى الْأَرْضِ الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا وَكُنَّا بِكُلِّ شَيْءٍ عَالِمِينَ).

بۆ سولەیمان ڕەشەبامان ڕام کردبوو کە بە فەرمانی ئەو دەڕۆی بۆ ئەو زەوییەی کە پیرۆزمان کردووە و ئێمە بە هەموو شتێکمان دەزانی.

ئینجا فادی دوو ئایەتی تریش لە سورەتی (سبأ: ١٢) و سورەتی (الأنبیاء: ٨١) دەهێنێ کە باس لە هەمان ڕامکردن دەکەن و پاشان لە تەفسیری بەیزاوییەوە هەندی تەفسیر دێنێت و دەکەوێتە پرسیار کردن لەسەری و دەڵێت: ئایا سوودی ڕامکردنی ڕەشەبا کە عەرشی سولەیمان بۆ کوێی بوێت و کەی بیەوێت، وە بە توندی و بەخێرایی یان بەهێوری بەپێی حەزی سولەیمان هەڵکات چییە؟ ئایا ئامانج لەو باسە چییە؟ سوودی بۆ گەلی ئیسرائیل چی بووە؟

**وەڵام:**

هەروەکو وەڵامەکانی ترمان دەڵێین: ئەوەی زیاتر بڵێ لەوەی کە قورئان فەرموویەتی ماڵ نییە بەسەر قورئانەوە و قابیلی ڕەتکردنەوەیە، جا قورئان نەیفەرمووە ڕەشەبا عەرشی سولەیمانی هێناوە و بردووە، لەوە دەچێت ڕەشەباکە هەورو بارانی بردبێت بۆ شام و بووبێتە مایەی پیت و خێرو بەرەکەت بۆ ناوچەکە، کە ئەمەش دیسانەوە لە بابی موعجیزاتەو چەن و چوونی ناوێت، خوای گەورە چی بکات و چۆن بکات کەس ناتوانێ چەنو چوونی لەگەڵ بکات، بەڵام مرۆڤە هەردەم بەرپرسیارە لە کارەکانی.

ئینجا وەرگێڕیش بۆ خۆی باسی خێرایی بینین و خێرایی ڕەشەبا و خێرایی ئەسپ و فڕۆکەی کۆنکۆردی فەرەنسی دەکات و بۆ خۆی کەوتوەتە بەراورد کردن و لێکدانەوەیەك کە هی وەڵام دانەوە نییە.

## ١٨ـ باڵندە بە بەرد شەڕ دەكات

پ١٩٥/ لە سورەتی (الفيل)دا هاتووە: (أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَابِ الْفِيلِ * أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِي تَضْلِيلٍ * وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْراً أَبَابِيلَ * تَرْمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ *فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُول).

پاشان فادی پرسیار دەكات و دەڵێت: ئایا چۆن فیل یارمەتی بت پەرستان دەدات، بەڵام لە یارمەتی مەسیحییەكان هەڵدێت و ڕادەكات هەركە روویان كردبێتە كەعبەی بتەكان؟ ئایا دەبێت پۆلە باڵندەكان لە نێوان خۆیاندا چۆن لە یەكتری تێگەیشتبن و چۆن شوێنی رووداوەكەیان زانیبێ و بەردیان لە دەم و قاچیان نابێ وسوپای مەسیحییەكانیان جگە لە بت پەرستەكان بەردە باران كردبێت؟ ئایا چۆن خواوەند لایەنگری فیل و باڵندە و بت پەرستەكانی كەعبەی كردووە لە دژی مەسیحییەكان؟ وە چۆن ئەو سوپایە بەو بەردە بچوكانە تیاچوون؟

**وەڵام:**

ئەبرەهە بە سوپایەكەوە هاتە سەر مەككە تا كەعبە بڕوخێنێ نەك شەڕ لەگەڵ عەرەبە بت پەرستەكان بكات، بۆیە عەرەبەكانی قورەیش دەوروبەری كەعبەیان چۆڵ كرد و چوونە سەر شاخەكانی دەوری مەككە و سەیری كەعبە و سوپاكەیان دەكرد، عەبدولموتەلیبی باپیری پێغەمبەر(صلى الله عليه واله وسلم) هاتە لای ئەبرەهە و داوای حوشترەكانی لێ كرد كە لەلایەن سوپای ئەبرەهەوە دەستی بەسەردا گیرابوو، ئەبرەهە لای سەیر بوو كە خەمی حوشترەكانێتی و خەمی كەعبەی نییە، ناوبراویش بە ئەبرەهەی وت: من خاوەنی حوشترەكانم و كەعبەش خاوەنی خۆی هەیە كە دەیپارێزێ، ئەوەبوو سوپاكە بەو دەردە چوو كە بە هۆی باڵندەوە لە ئاسمانەوە بە بەردی بچووك بەردباران كران و تیاچوون.

ئەمە ئەو ساڵە بوو کە پێغەمبەر(صلى الله عليه واله وسلم) تیایدا لە دایك بـوو، زۆر لـەو عەرەبانـەی ئـەو رووداوەیـان دیبـوو مـابوون کـە ئـەم سـوورەتە هاتـە خوارەوە، ئەگەر وانەبوایە لە جیاتی جارێك هەزار جار بە درۆیان دەخستەوە.

پاشان خوای گەورە کەعبەی پاراست لە دەست مەسیحییەکانی ئەو زەمانە کە سـوپاکەی ئەبرەهـە بـوو، وەنـەبێ یەکتاپەرسـت بـووبن مەگـەر عیسـا و دایکـی سەلامی خوایان لێبێت بە خوا نازانن.

ئینجا خوای گەورە ویستی گەورەیی کەعبە پیشانی خەڵکی بدات و ئامادەکاری یـەك بێـت بـۆ داهـاتوو کـە (موحەممەد)(صـلى الله عليـه والـه وسـلم) دەبێتـە پێغەمبەر.ئینجا هەموو ئەوانەی کە فادی ڕەخنەی لێدەگرێت موعجیزەیە و لەگـەڵ موعجیزەشدا کە بە فەرمانی خوای گەورەیە هیچ ناوترێت.

## ١٩ـ شەڕی بەچاوەوە بوون

پ١٩٦/ لە سورەتی (یوسـف: ٦٧)دا هـاتووە: (وَقَالَ يَا بَنِيَّ لاَ تَدْخُلُواْ مِن بَابٍ وَاحِدٍ وَادْخُلُواْ مِنْ أَبْوَابٍ مُّتَفَرِّقَةٍ وَمَا أُغْنِي عَنكُم مِّنَ اللّهِ مِن شَيْءٍ).

ئـەی کوڕەکـانم لەیـەك دەرگـاوە مەچـنە ژوورەوە بـەڵکو لەچـەند دەرگایـەکی جیـاوازەوە بچـنە ژوورەوە و مـن نـاتوانم هـیچ توشـهاتێکی خواوەنـد لـە ئێـوە بگێڕمەوە.

فادی لە بەیزاویـیەوە هەنـدێ بـاسو خـواس دێنـێ کەگوایـە مەبەسـتی یـەعقوب ئەوەبووە کە کوڕەکانی لە یەك دەرگاوە نەچنە ژوورەوە لە دەروازەی میسر تا بە چاوەوە نەبن، ئینجا فادی پرسیار دەکات و دەڵێت: ئایا قورئان ئەم چیرۆکەی لە کوێـوە هێنـا کـە تـەورات باسـی نـەکردووە، وە ئەفسـانەیەکی داوەتـە پـاڵ پێغەمبەرێك کـە لەگـەڵ زانسـتدا نایەتـەوە و لەگـەڵ چـاودێری کردنـی خواوەنددا نایەتەوە.

**وەڵام:**

یەکەم: لە قورئاندا ئاماژەی بەوە نەکردووە کە لەبەر بەچاوەوە بوون ئەو فەرمانەی بە کوڕەکانی کردووە، کەواتە قسەکەی فادی و ڕەخنەکەی لە جێی خۆیدا نییە.

دووەم: چیرۆکەکە لەبەرئەوەی لە تەوراتدا نەهاتووە کەواتە ڕاست نییە و ئەفسانەیە، ئەمەش هەر هەمان وەڵامەکانی پێشوومان هەڵدەگرێ، کە تەورات و ئینجیلێکی تەحریف کراو کە بە هەزاران هەڵەی تیایە نابنە مەرجەع و پێوەر نین بۆ ڕاستی قورئان، کە ئەمەش سەدان زانای ئەهلی کیتاب دانیان پیاداناوە و زۆریشیان موسڵمان بوون لە کۆن و نوێدا.

نموونەش لەم بارەیەوە زۆرە، زانایەکی جوولەکە بە پرۆفیسۆر مۆریس بۆکای کە جەراحێکی ناوداری فەرەنسیەو موسڵمان بووە دەڵێت، ئایا هامان کەناوی لە قورئاندا هاتووەو لە تەورات و ئینجیلدا باس نەکراوە راستە کە لەزەمانی فیرعەوندا بووە؟؟

مۆریس بۆکای دەکەوێتە گەڕان و پرسیارکردن و پاش هەوڵێکی زۆر دەچێ بۆ مۆزەخانەی هۆف لە ڤیەننا و ئەو بەردە دەبینێت کە هی زەمانی فیرعەونەو میسری یە کۆنەکان ناوی هامانیان بەزمانی هیرۆگلیفی لەسەر تۆمارکردووە وبەمەش موعجیزەیەکی تری قورئان دەرکەوت، هەروەك لەسەرەتاوە ئاماژەمان بۆ کرد.

## ٢٠ـ نەوەی ئیسرائیل و مانگاکە

پ١٩٧/ لە سورەتی (البقرە: ٦٧ـ ٧٢)دا هاتووە: (وَإِذْ قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تَذْبَحُواْ بَقَرَةً قَالُواْ أَتَتَّخِذُنَا هُزُواً قَالَ أَعُوذُ بِاللّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْجَاهِلِينَ * قَالُواْ ادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لّنَا مَا هِيَ قَالَ إِنَّهُ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لاَّ فَارِضٌ وَلاَ بِكْرٌ عَوَانٌ بَيْنَ ذَلِكَ فَافْعَلُواْ مَا تُؤْمَرونَ * قَالُواْ ادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوْنُهَا قَالَ إِنَّهُ يَقُولُ إِنّهَا بَقَرَةٌ صَفْرَاء فَاقِعٌ لَّوْنُهَا تَسُرُّ النَّاظِرِينَ * قَالُواْ ادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ إِنَّ البَقَرَ تَشَابَهَ

عَلَيْنَا وَإِنَّا إِن شَاء اللَّهُ لَمُهْتَدُونَ * قَالَ إِنَّهُ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لاَّ ذَلُولٌ تُثِيرُ الأَرْضَ وَلاَ تَسْقِي الْحَرْثَ مُسَلَّمَةٌ لاَّ شِيَةَ فِيهَا قَالُواْ الآنَ جِئْتَ بِالْحَقِّ فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُواْ يَفْعَلُونَ * وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْساً فَادَّارَأْتُمْ فِيهَا وَاللَّهُ مُخْرِجٌ مَّا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ).

كاتێك كە موسا بە گەلەكەی خۆی وت: خواوەند فەرمانتان پێدەدات كە مانگایەك سەرببڕن، ئەوانیش وتیان :ئایا تۆ دەتەوێ گاڵتەمان پێ بكەیت، ئەویش وتی پەنا بە خوا كە من لە ریزی نەزانەكان بم، وتیان لە پەروەردگاری خۆتمان بۆ بپرسە بۆمان دیاری بكات مانگاكە چۆن بێت، ئەویش وتی: ئەو دەڵێت: مانگاكە نە پیری پەككەوتوو و نە كەم تەمەنە بەڵكو ناوەنجییە، دە ئەوە بكەن كە فەرمانتان پێ دەدرێت، وتیان لە پەروەردگارەكەتمان بۆ بپرسە كە ڕەنگەكەیمان بۆ دیاری بكات، ئەویش وتی: ئەو دەڵێت: مانگایەكی زەردی تۆخە سەیركەر دڵخۆش دەكات، وتیان: لە پەروەردگاری خۆتمان بۆ بپرسە كە مانگاكە چۆن چۆنییە، چونكە چۆنێتی مانگاكەمان لێ تێكچووە و ئەگەر خواوەند خوازیار بێت شارەزا دەبین.

موسا وتی: ئەو دەڵێت ئەو مانگایە مانگایەكی بێ هێزو لاواز نییە بە هۆی كێڵان و ئاوكێشانەوە و بەڵەكیش نییە. وتیان: ئێستا راستیت بۆ هێناین ئەوسا سەریانبڕی و خەریكبوو نەیكەن.

وە كاتێك ئێوە كەسێكتان كوشتبوو لەسەر بكوژ یەكترتان تووش دەكرد، خواوەند ئەوەی بەدەردەخست كە ئەتانشاردەوە، ئەوسا وتمان پارچەیەك لەسەربڕاوەكە بدەن لە لەشی كوژراوەكە زیندوو دەبێتەوە و ناوی بكوژەكەی دەڵێت، ئەئاوەها خواوەند مردوو زیندوو دەكاتەوە و نیشانەی خۆیتان پیشان دەدات بەڵكو تێبگەن.

فادی دەڵێت: مێژووی بەرەی ئیسرائیل هەر لە سەرەتاوە تا كۆتایی ئەم چیرۆكەی تیا نییە، لەوانەیە خاوەنی قورئان هەندێك لە چیرۆكەكەی لە تەوراتەوە وەرگرتبێت.

لەم پرسیارەی فادیشدا دیسان تەورات مەرجەعەو قورئان بەراورد دەكات بە تەورات و مادام ئەم چیرۆكە لە تەورات دا نەهاتووە كەواتە لە مێژووی بەنی ئیسرائیلدا شتی وا ڕووی نەداوە.

جارێ مەرج نییە هەموو ڕووداوێك و بەسەرهاتێكی نەوەی ئیسرائیل لە تەوراتدا تۆماركرابێت، لەلایەكی تریشەوە ڕەنگە كاتی خۆی هەبووبێ و لابرا بێت، چونكە ئەو تەحریفاتە زۆرەی بەسەر تەورات و ئینجیلدا هاتووە بەهای مێژوویی بۆ نەهێشتوونەتەوە و ناتوانرێت متمانەیان پێ بكرێت.

جارێكی تریش جەخت دەكەینەوە لەبەرئەوەی قورئان بە پەیمان و بەڵێنی خوا خۆی پارێزراوە، كەواتە قورئان مەرجەعە و تەورات و ئینجیل بە تەرازووی قورئان دەكێشرێن نەك بەپێچەوانەوە.

بۆ زیاتر شارەزابوونیش لە تەحریفاتەكانی تەورات و ئینجیل، پەڕاوەكانی ئەحمەد دیدات و دەیان نوسەری تر جەخت دەكەنە سەر ئەو مەسەلەیە و چەندەها پێگەی ئینتەرنێتیش باس لەم بابەتە دەكەن وەك (منتديات أتباع المرسلين) كە هەركەس بیەوێ دەتوانێ بگاتە ڕاستییەكان.

## ٢١ـ ئایا بروسكە فریشتەیە

پ١٩٨/ لە سورەتی (الرعد: ١٣)دا هاتووە: (وَيُسَبِّحُ الرَّعْدُ بِحَمْدِهِ وَالْمَلآئِكَةُ مِنْ خِيفَتِهِ).

هەورە گرمە ستایش و پاكیزی خواوەند دەكات و فریشتەكانیش لە ترسی خواوەند ستایش دەكەن.

ئینجا فادی لە تەفسیری بەیزاویەوە ئەوە دێنێت كە گوایە هەورە بروسكە و هەورە گرمە مەلائیكەتن، پاشان پرسیار دەكات كە چۆن هەورە بروسكە و هەورە گرمە كە دیاردەی سروشتین مەلائیكەتن.

**وەڵام:**

قورئان نەیفەرمووە مەلائیكەتن، تەفسیری بەیزاویش لەهەركوێیەكەوە ئەو قسەیەی هێناوە ڕاست نییە و پەیوەندی بە قورئان و فەرموودەی ڕاستی حەزرەتەوە نییە.

بـەڵام بـۆ مەسـەلەی تەسـبیحاتی هـەورە گرمـە، هەرچـی لـە بوونەوەردایـە تەسبیحاتی خوا دەكات، هەریەكەو بەجۆرێك كە مرۆڤ دەركی پێ ناكات، هەر لـە گەردیلەیەكەوە هـەتا هەسارەو هەریەكـە و شـێوازی خـۆی هەیـە لـە تەسـبیحاتی خوادا، قورئان دەفەرموێت: (تُسَبِّحُ لَهُ السَّمَاوَاتُ السَّبْعُ وَالآرْضُ وَمَن فِيهِنَّ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلآ يُسَبِّحُ بِحَمْدَهِ وَلَكِن لآ تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ إِنَّهُ كَانَ حَلِيماً غَفُوراً) الإسراء٤٤.

## ٢٢ـ ئازاری جادوو

پ١٩٩/ لە سورەتی (الفلق)دا هاتووە: (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ * مِن شَرِّ مَا خَلَقَ * وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ * وَمِن شَرِّ النَّفَّاثَاتِ فِي الْعُقَدِ * وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ).

بڵێ بانگ لە پەروەردگاری بەرەبەیان و بوونەوەران دەكەم لەهەرچی شەڕێك كە هەیە و خوڵقاوە و لە شەڕی شەو، كا تاریك دادێت و لە شەڕی ئەو ژنانەی كە فوو بە گرێی پەڕۆدا دەكەن و لە شەڕی حەسوودەكان كە ئێرەیی دەبەن.

ئینجا فادی ئەو بەسەرهاتە دێنێت كە باس لە جوولەكەیەك دەكات كە سیحر لە پێغەمبەر(صلى الله عليه واله وسلم) دەكات و پاشان دەپرسێت چۆن دەبێ سـیحر كار بكاتە سەر ئەو زاتە موبارەكە.

لە وەڵامدا دەڵێین:

پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه واله وسلم) لە ژیانیدا وەكـو هـەر ئـادەمیزادێكی تـر تووشـی نەخۆشـی و ناخۆشـی و ناڕەحـەتی بـوە، چـەندجار كافرەكـان و جوولەكـەكان پیلانـی كوشـتنیان بـۆ دانـاوەو چـەندەها جـار لـە جەنگەكانـدا لـە پێشەوەی هاوەڵاندا بووە و تەنها خوا پاراستوویەتی بەپێی ئەو پەیمانەی كە پێی داوە: (وَاللّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ) (المائدە : ٦٧ ).

ئەم بەسەرهاتەش شتێكە لەو بابەتە، جوولەكەیەك سیحری لـە پێغەمبـەر ﷺ كـرد، حـەزرەت ﷺ وای لێهـات وەیزانـی كـارێكی ئەنجامـداوە و ئەنجامیشـی

نـەدابوو، پاڕایـەوە لـە خـواو خـواش شـیفای داو سـیحرەکە بـەتاڵ بوویـەوە.
(سەرچاوە: القرآن ونقض مطاعن الرهبان. د. صلاح الخالدي).

لــەکۆتایی وەڵامــەکانی ئــەم بەشــەدا جــەخت دەکەمــەوە کــە قورئــان پارێزراوەوپـەڕاوەکانی تـر تـەحریف کـراون، لـە پـەڕاوی پیرۆزیانـدا هـاتووە کـە کەشـتیەکەی نـوح لەسـەر شـاخی ئـارارات لەنگـەری گرتـووە دوای تـەواوبوونی لافاوەکــە، هەرچــی گــەڕان و هــەوڵیان دا لەســەر ئــارارات هــیچ ئاســەوارێکیان نەدۆزیەوە، قورئانیش پاش هەزاران ساڵ دێت و نەك لە تەورات و ئینجیلەوە هـیچ وەرنــاگرێ بــەڵکو تەحریفەکــەی ئــەوانیش راســت دەکاتــەوە و دەفــەرموێت: کەشتیەکەی نوح لەسەر شاخی جودی دوای تۆفانەکـە لەنگـەری گرتـووەو دوایـش قسـەکەی قورئـان راسـت دەرچـوو، ئاسـەواری کەشـتیەکەی نـوح لەسـەر شـاخی جودی لە تورکیا دۆزرایەوە .هەروەك لە پەڕاوی بەرەو ئیسـلامدا لاپـەڕە ٣٦٥بـەم جۆرە باسم کردووە :

## ٢٣-تۆفانەکەی نوح

قورئان باسی بەسەرهاتی گەلانی دێرینـی کـردووە، یـەکێك لـەو گەلانـەش گـەلی نوحــە ودەفــەرموێت: {كَذَّبَتْ قَوْمُ نُوحٍ الْمُرْسَلِينَ * إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ نُوحٌ أَلَا تَتَّقُونَ* إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ* فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ* ..ثُمَّ أَغْرَقْنَا بَعْدُ الْبَاقِينَ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ* وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ } الشعراء:١٠٥-١٢٢...ئـەم باسـەش ئیعجـازی غـەیبی قورئـانی تیایـە کـە دۆزینـەوەیپاشماوە کۆنەکان ڕاستێتی دەسەلمێنێ.

سۆمەریەکان باسی تۆفانێکیان تۆمار کردووە لەسەر لەوحی قـوڕی سـورەوکراو کە ساڵانی ١٨٨٩ بۆ ١٩٠٠ی زاینی دا دۆزرایەوە لە لایەن کۆمـەڵێك شوێنەوارناسـی ئەمریکیەوە لە عێراق، کەباس لەوە دەکات کەپاشا (زیو سودا)خواناس و پارێزگار

بوو، ئاگادار کرا تۆفان دەبێت، کەشتی دروست کردوو خەڵکانێکی ڕزگار کرد لەو تۆفانەو کە حەوت شەو و حەوت ڕۆژی خایاند.

هەروەها بابلییەکانیش تۆماریان کردووە ،لەساڵی ١٨٧٢دا (سیدنی سمث)ڕایگەیاند کە پێویستە پارچەکانی( مەلحەمەی گلگامێش )کۆبکرێتەوە کە دوانزە لەوحەیە، کەلەوحەی یانزەی باسی تۆفانەکە دەکات کە دەڵێت:پیاوێك بەناوی گلگامێش، (خواکان ) فەرمانیان دایە کە کەشتیەك دروست بکات و واز لە موڵك وماڵ بێنێ و، لەسەر کەشتیەکەشی تۆوی هەموو شتێکی زیندووی هەڵگرت، ئەو کەشتیەی دروستی کرد درێژی و پانی وەکو یەك بوو ..بارانێکی زۆر باری و تادەگاتە ئەوەی کە دەڵێت:کەشتیەکە لەسەر شاخی (نیصیر)یان (نیزیر)نیشتەوە کەدەکەوێتە نێوان دیجلەو زابی خوارووەوە.

لەنیوەی یەکەمی سەدەی سێی پێش زاینیشدا، لە زەمانی پاشا (انتیوخوسی یەکەم)(٢٨٠–٢٦٠)ی پێش زاین یەکێ بەناوی (بیروسوس) یبابلی کە کاهینی خوای (ردوك)ی بابلی بووە ،بە زمانی بابلی مێژووی وڵاتەکەی بە زمانی یۆ نانی بە سێ بەرگ نوسیوەتەوە، کەتیایا باس لە تۆفانێك دەکات، کە گوایا پاشایەك بەناوی (ئەکسیسوپووس)لە خەویا خوا ئاگاداری دەکات لە تۆفانێك کە هەموو زەوی دەگرێتەوە و هیچ ناهێڵێ و، فەرمانی ئەداتێ کە کەشتیەك دروست بکات، ئەویش کەشتیەك دروست دەکات کەدرێژییەکەی ١١٠٠(یارد) ەو پانیەکەشی ٤٤٠(یارد) ەو هەموو خزم و هاوەڵان و زیندەوەرانیش لە باڵندەو چوار پێ لەکەڵ خواردن و خواردنەوە لەگەڵ خۆیدا بار دەکات .

تۆفانەکە زەوی داپۆشی، کەشتیەکە لەسەر شاخێك لەنگەری گرت، خۆی و ژن و منداڵەکانی و کەشتیەوانەکە دابەزین و پاشا سوجدەی بۆ خوا برد .

تەوراتیش لە (ئیصحاح)ی شەش تا (نۆ) لە سیفری تەکویندا باسی ئەو تۆفانە دەکاو دەڵێ : خوا بینی کەخراپەی مرۆڤ زۆر بووە لەسەر زەوی، خەمبار بوو لەم ڕەفتارەی مرۆڤ لە زەویداو پەشیمان بوو لە دڵیا، بڕیاریدا کە مرۆڤ و چوار پێ و

باڵندەو گیانەوەران لەسەر زەوی نەهێڵێ، وەتـەنها نـوح بهێڵێتـەوە کـە پیـاوێکی بەوەفا و چاك بوو، نوح ئاگادار کراو فـەرمانی درایـە کەشـتیەکی گـەورە دروسـت بکـات و بـە قـیرو (قەتران)لـە نـاوەوەو دەرەوە داپیۆشـێ تائـاو نەچـێتە نـاوی، وەلەهەموو گیانلەبەرێك دووان، نێرو مێیەکی تیا دابنێ، ئەمە بێجگە لە ژنەکەی و مناڵەکانی و ئافرەتانی ناوماڵی.

چل شەو و چل ڕۆژ باران باری و کانیەکانی زەوی تەقین و ئاسمـانیش کرایـەوە و تۆفانەکە چل ڕۆژی خایاند لەسەر زەوی ..هەرچی هەبوو لە مـرۆڤ و گیانـەوەران لەسەر زەوی لەناو چون و نـوح و ئەوانـەی لەگەڵیـدا بـوون مانـەوە، تاکەشـتیەکە لەسەر شـاخی ئـارارات گیرسـایەوە، هەنـدێ لەمێژوونوسـان و موفەسـیرەکان لـەو بڕوایەدان کەتۆفانەکە هەموو زەوی نەگرتەوە و دەڵێن :کەلە چـوار شـاری بـیلادی ڕافیدەین دابووە (ئور، ئریش، شورباك، کیش )شـوێنەوارەکانیش جـەخت دەکەنـە سەر ئەوەی کەئەو شارانە تۆفانێك لێی داوە لە ساڵانی ٣٠٠٠پێش زایینیدا ..

لەناوەڕاستی مانگی ئایاری سـاڵی ١٩٤٨ز دا شـوانێکی کـوردی تورکیـا بـەناوی ڕەشید سەرحان پاشمـاوەی تەختـەکانی کەشـتیەکەی نـوحی دۆزیـەوە کەلەسـەر شاخی جودی بوو، کەدانیشتوی دێی (نەسار)ە، ئـەوەی سـەیرە ئـەم نـاوە نـاوی هەمان ئەو دێیەیە کەبەزمانی بابلی بەدێیەکەی نوح وتراوە کەتیایا ژیاوە.

لەساڵانی دوای ١٩٥٣دا چەند کۆمەڵێکی شوێنەوارناس سەردانی شاخی جودیان کردو فەحسی تەختەی بەبەرد بووی کەشتیەکەیان کـرد وە بـە (هاوتـای کـاربۆنی تیشـکدەر) فەحسـیان کـردو بـۆ زانینـی مێـژووی تەختـەکان، بۆیـان دەرکـەوت دەگەڕێتەوە بۆ ٤٥٠٠ساڵ پێش ئێستا، فـەزڵی گـەورە دەگەڕێتـەوە بـۆ لێکۆڵـەران (دیفیـــد فاســـولد) و (رون وایت)وەهـــەولی زۆری پرۆفیســـۆری تورکی(احمـــد رسلان)لەماوەی چل ساڵدا پەنجا جار سەرکەوتە سەر شاخی جودی بـۆ دیراسـەی شوێنی کەشتیەکە، کەتەواو دەگـونجێ لەگـەڵ ئـەوەی کـە لـە قورئانـدا هـاتووە :

( وَقِيلَ يَا أَرْضُ ابْلَعِي مَاءكِ وَيَا سَمَاء أَقْلِعِي وَغِيضَ الْمَاء..)هود: ٤٤

وە ئەو وێنانـەی جیهـازی ڕادار لـەقوڵی ٢٥ مـەتردا کێشـاویەتی بـۆ ژێـر بەشـی دواوەی کەشتیەکە، زۆر وردە کـاری کەشـتیەکەی دیـاری کـردووە .کەدرێژیەکـەی نزیکەی ١٧١ مەتر دەبێ گەورەترین پانیئنزیکەی٤٦ مەترێك دەبـێ و معدلی پـانی نزیکەی ٢٨ مەترێك دەبێت، قوڵیەکەی نزیکەی ١٧ مەترێك دەبێت.

زانایان بە ڕێگایەکی زانستی تەواو دیراسەی زۆربەی پارچـەکانی کەشـتیەکەیان پشکنیوە. بەڵام لێرەدا باسی (انجر)یان(مرساه)یان لەنگەری کەشتیەکە دەکـەین، کە بۆ لەنگەرکردن و هاوسـەنگی کەشـتیەکە هەڵواسـراوە بـە گـوریس و شـتی زۆر بەهێز بەبنی کەشتیەکەوە .یەکەم پارچەی کەشتیەکە کەدۆزرایـەوە سـیانزە دانـە بـوو لـەو بەردانـەی لەنگـەر گـرتن کەلـە بـەرزایی هـەزاران پـێ لەئاسـتی دەریـاوە دۆزرایەوە لەو ڕێیەی کەوا دادەنرێت کەشتییەکەی پیا ڕۆیشتبێت.

کەڕەنگە کاتی تەواو بوونی تۆفانەکەو کەم بونـەوەی ئاوەکـە حـەزرەتی نـوح و هاوکارانی ئـەو گوریسـانەیان پچـڕانبێ و بـەردەکان بلاوبوبنـەوە .زانایـان دە ڵێن ڕەنگـە (٢٤)(مرسـاه)ی هـەبووبێ هەرچـەند ئێسـتا (١٣)ی دۆزراوەتـەوە، ئـەو لەنگەرە بەردانە معدلی بەرزی ٢,٥ مەترە قورسیشی (٤–١٠)تەنە، لێکۆڵەر (دیفیـد فاسولد)کەناودارترین دۆزەرەوەو پسپۆرە لەم مەسەلەیەدا، جـەخت دەکەنـە سـەر ئەوەی کە ئەو بەردی لەنگەرانە ئەوەیە کە لە قورئاندا ئامـاژەی بـۆ کـراوە کـە بـۆ خۆی موعجیزەیەو دەفەرموێت (وَقَالَ ارْكَبُواْ فِيهَا بِسْمِ اللّهِ مَجْرَاهَا وَمُرْسَاهَا إِنَّ رَبِّي لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ )هود: ٤١

ئەوەی کە لێکۆڵەرانی سەرسام کردووە، باشە چۆن ئەو بـەردە قورسـانە بـەرز کراونەتەوەو چۆن کون کراون، چۆن هەڵواسراون بەکەشـتیەکەدا بـۆ هاوسـەنگی و هەڵگرتنی کەشتیەکە لەبەردەم شـەپۆلی زۆر بـەرزدا کـە وەك شـاخ بـووە هـەروەك قورئان دەفەرموێ(وهی تجری بهم فی موج...)بەڵام دیارە وەڵامـی هـەموو ئەوانـە لەوەدایە کە خوای گەورە دەفەرموێ﴿وَاصْنَعِ الْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا﴾ هـود: ٣٧ وە بۆ ڕۆیشتنیشی دەفەرموێ ﴿تَجْرِي بِأَعْيُنِنَا﴾ القمر: ١٤...

# پێشەکی

الحمدلله رب العالمين و الصلاه و السلام على رسوله الامين و بعد:

پاش ئەوەی کە برایانی پرۆژەی تیشك ئەرکی وەڵامدانەوەی بەشی هەڵە رەوشتیەکانیان خستە سەرشانم لە کتێبی "ئایا قورئان پارێزراوە"، ناوی خوام لێهێناو بەشە وەڵامی خۆمم نووسی و تەواومکردو نزیکەی سێصەد لاپەڕە دەرچوو، کەچی قەدەری خوا بەهەڵە لە کۆمپیوتەرەکەمدا سڕرایەوەو پاش چەندین جار ریکۆڤەریش هەر نەهاتەوە، بۆیە بەناچاری دەستم بە وەڵامدانەوەی ئەو بەشەی تری کتێبەکە کرد کە بریتییە لە پێشبڕکێیەك قەشە فادی رێکیخستووە بۆ خوێنەرانی کتێبەکەی بەو هیوایەی کە خوێنەران چەواشەبکات و وایان لێبکات بەمەبەستەوە جارێکی ترو دوان کتێبەکەی بخوێننەوەو قسەکانی ئەو وەك موسەللەمات و بەلگەنەویست وەربگرن! بەو هیوایەی خەلاتێك وەربگرن کە بریتیە لە نوسخەیەك لە ئینجیل بەخۆڕایی! جا منیش ئەوەم بە دەرفەت وەرگرت و ئەمەویّ بەخوێنەرانی کتێبەکەی قەشە فادی و خوێنەرانی ئەم زنجیرە وەڵامەش ئەوە ڕابگەیەنم کە ئەو پێشبڕکێیە کارێکی منالانەو شتێکی گزیبازانەیە قەشە فادی پەنای بۆ بردووەو شوورەییە مرۆڤ دابەزێتە ئەو ئاستە لە نووسیندا.

وەڵامەکەی من بۆ ئەو پێشبڕکێیە دابەشئەبێت بۆ ئەم پێشەکیەو(١٠)بڕگەو کۆتاییەك.

دە بڕگەکە بریتین لە:

١-ئایا قەشە فادی راستئەکات کە ئەڵێ (١٠)جۆر هەڵە لە قورئاندا هەیە؟

٢-نمونەیەك لە هەڵە جوگرافییەکان وەك قەشە فادی ئەیڵێت.

٣- نمونەیەك لە هەڵە مێژووییەکان وەك قەشە فادی ئەیڵێت.

٤- نمونەیەك لەو هەڵە رەوشتیانەی کە قەشە فادی بە حەرام و بە تاوانی دائەنێت گوایە قورئان حەڵاڵیکردووە!

٥- نمونەیەك لە هەڵە لاهووتییەکان وەك قەشە فادی ئەیڵێت.

٦-نمونەیەك لە هەڵە زمانەوانیەکان وەك قەشە فادی ئەیڵێت.

٧- نمونەیەك لە هەڵە یاساییەكان وەك قەشە فادی ئەیلێت.

٨- نمونەیەك لە هەڵە كۆمەڵایەتیەكان وەك قەشە فادی ئەیلێت.

٩- نمونەیەك لە هەڵە زانستیەكان وەك قەشە فادی ئەیلێت.

١٠- نمونەیەك لەو كارانەی قەشە فادی بە شوورەیی دائەنێ لە ژیانی پێغەمبەردا(صلى الله علیه و اله وسلم).

قسەی كۆتاییش بریتییە لە تیشك خستنەسەر میتۆدێكی نمونەیی بۆ موناقەشەكردنی ئەو گومانانەی كە ناحەزانی ئیسلام لێرەو لەوێ ئەیخەنە ناو خەڵكی.

هەرچەندە برایان و خوشكانی تر بەدڵنیاییەوە ئەبێت وەڵامی هەریەك لەو دە بڕگەیان لە بەشەوەڵامی خۆیاندا دابێتەوە، بەڵام دیارە هەركەسەو لە دونیادا شێوازێكی تایبەت بەخۆی هەیە بۆ نووسین و وەڵامدانەوەو كەس ناتوانێ بە شێوازی ئەویتر بنووسێت و ئەمەش حیكمەتی گەورەی خوای تێدایە وەك چۆن ئەم هەمووە جۆرەی لە میوە دروستكردووەو هەریەكەیان تامێك ئەدەن و ئەم هەمووە جۆرەی لە گۆشت دروستكردووەو هەریەكەیان چێژێك ئەدەن هەرواش چەندین شێوازی نووسینی بە بەندەكانی بەخشیوە تا بەرهەمە ئەدەبی و فیكریەكان هەموو لەیەك نەچن و هەموو هەر یەك تام بدەن و خەڵك بێزاربێن لە خوێندنەوە، ئەم بەشەی كتێبەكەش وەك گوشراوێك وایە بۆ بابەتەكانی كتێبی ئایا قورئان پارێزراوە بۆیە گومان لەوەدا نیە كە نابێتە شتێكی دووبارەو ئەم وەڵامەش دوور لە چاوی وەڵامەكانی ترەوە ئەنووسرێت.

بەرنامەی ئێمەش بۆ وەڵامدانەوەی ئەو رەخنانە بە كورتی بریتیە لە:

سەرەتا رەخنەكەی ئەو باسئەكەین، پاشان تا بگونجێ لە كتێبی پیرۆزی قەشە فادیەوە هاوشێوەكانی ئەو بابەتانە ئەگوازینەوە كە قەشەفادی بەرەخنەو شورەیی ئەزانێ لە قورئاندا-و كەچی ئاگای لێ نیە ئەو باسە لە كتێبەی خۆشیدا هەیە-، تا لە سنووری خۆیدا رایبگرین، ئەگەر ئەوشتانەی كتێبی پیرۆزی خۆیی قەبووڵە، ئەی ئیتر بۆ ئەمەی قورئانی قەبووڵ نیە، ئەگەر ئەمانەی قورئانی لا نادروست و ناشیرینە

ئەی بۆ ئەوەی کتێبەکەی خۆی لا جوان و دروستە؟! بە چ پێوەرێك ئەو جوانەو ئەم ناشیرین؟ ئەو قەبووڵێەکات و ئەم ئەداتە دواوە، دوو پێوەری جیا بۆ یەك بابەت! ئەمە وەك ئەڵێن بریتیە لە"الكيل بمكيالين" کە ئەوەش شورەیی و گزیبازییەو کارێکیشە خەڵکی ژیرو بەویژدان نایکات، ئەگەر لەبەر ئەوەشە ئەوەی لە کتێبی پیرۆزی خۆیدایە بۆیە وەرئەگرێ لەبەر ئەوەی واڕاهاتووەو ئەمەی قورئان هەر بە هەوەس وەرناگرێ! ئەم هەڵسوکەوتەش ناعەقڵانیەو پیشەی پیاوی خوێندەوارو نووسەری بەڕێز نیەو زانایانیش ئەڵێن: "تەرجیحی بیلا مورەجیح"-یانی دوو شتی وەك یەك هەرکەس هەروا بێ بەڵگە باوی یەکێکیان بدات بەسەر شتێکی تردا- بێعەقڵی و ئارەزووپەرستیە، پاش ئەم بەراووردکاریە هەڵە حاڵیبوونەکەی فادی رۆشنئەکەینەوەو دەریدەخەین کە ئەوەی ئەو بەڕەخنەی ئەزانێ تەنیا بەدحاڵیبوونێکە یان ئارەزووپەرستنێکەو هیچی تر.

سەرفەنەزەریشمان لەو هەمووە قسەو زانیاریانە کردووە کە قەشە فادی و وەرگێڕەکەشی خزاندوویانەتە ناو کتێبەکەیان بە بێ ئەوە بیانگێڕنەوە بۆ سەرچاوەکانیان، چونکە ئەو هەویرە ئاوی زۆری ئەکێشا، و خەریکە لای ئەم جۆرە بنیادەمانە ئەوەش سادە ئەبێتەوە کە کاتێك رەخنەی ئەوەیان لێئەگری و پێیان ئەڵێیت: تۆ ناوی سەرچاوەکانت نەهێناوەو لە گیرفانی خۆتەوە قسە ئەکەی، ئەم کەسانە هەر زوو لە وەڵامدا ئەڵێن: جا چییە! با ناوی سەرچاوە نەهێنین! گرنگ ئەوەیە تۆ سەبارەت بەو چەمکەی ئێمە قسەی لەسەر ئەکەین ئێوەش قسەی لەسەر بکەن و زانستیانە وەڵاممان بدەنەوە!

ئەوەی کە ئێمە بینیومانە لەم قەشە فادیە-و لە راستیدا هەر ئەوەشە لە زۆربەی بڕگەکانی نووسینەکەیدا بەهەڵەیدا بردووە- ئەوەیە کە کتێبی پیرۆزی خۆی کردووە بە پێوەر بۆ(رەفزو قەبوڵی) ئایەتەکانی قورئان! یانی ئەوەی قورئان بیڵێت و تەورات و ئینجیل نەیانووتبێت یان ئەوان پێچەوانەی ئەمیان وتبێت ئەوە لای قەشە فادی وەرنەگیراوەو هەڵەیەو هەر ئەوە راستە کە کتێبی پیرۆز بیڵێت! ئەمەش ئاشکرایە کە قسەیەکی زانستی نیە، عەقلانیش نیە، مێژووش پشتی ناگرێت، واقیعیش ئەمە رەتئەکاتەوە، ئێمە لەوەڵامی یەکێك لە پرسیارەکانی ئەم کتێبەدا

ئـەوەمان بـە بەڵگـەوە روونکردووەتـەوەو– لـە کتـێبی یەکـەمی ئـەم زنجیرەیەشـدا ئەوەمان سەلماندووە کە قورئان بە پارێزراوی گەیشتووە بە ئێمەو قورئان ئـەو تاکـە کتێبـە ئاسمانییەیـە کـە وەك خـۆی ماوەتـەوە گیـانی هـەموو ئایینـەکانی تریشـی هەڵگرتووە بە پارێزراوی و هەموو شتەجوانەکانی ئەو ئایینانەی تری بە شێوەیەك لـە شێوەکان پاراستووەو تەنیا سـورەتێك یـان ئایـەتێك یـان وشـەو تەنانـەت پیتێکیش چییە لێی نەفەوتاوەو بە دەنگ و بە رەنگـی خۆیـەوە دەسـتپاکانە نـەوە دوای نـەوە گوازراوەتەوە بەڵام –نەتەورات و نەئینجیل دوور نەبووون لە دەستتێوەردان و ئەمەی بۆ قورئان کراوە بۆ ئەوان رێنەکەوتووەو بەڵگەکان و هۆیەکانمان لەوێدا باسـکردووەو ئومێدئەکەین کە راستیمان پێکابێت.

ئـەوەش زۆر جێگـەی پرسـیارە وەرگێـڕ جگەلـەوەی قسـەو سـەرنجەکانی خـۆی لەبری ئەوەی ببردایەتە پەراوێز کەچی هەمووی لە مەتنی کتێبەکەی فادیدا ناشتووەو تێکـەڵی کـردووە بـە کتێبـە بنەڕەتیەکـەو خوێنـەر زۆر ماندووئـەکات، جگـە لەمـەش زۆرجار لەگەڵ فادیشدا لێکئـەگیرێن و قسـەکانیان دژ بەیـەکتری ئەوەسـتنەوە، ئێمـە چاومان لـەوەش داخسـتووە کاتێـك نـەبێت کـە قسـەکە قـووڕگی گـرتبێ و پێویسـت بووبێت ئاماژەی بۆ بکەین.

ئەمەو لە سەرەتاو لە کۆتایشدا پشتمان هەر بە خوای گەورە قاییمە کـە چـێژو بەرەکەت بخاتە ئەم نووسینەو بیکاتە چرا بۆ عەودالآنی راستەقینە.

پەروەردگار! سۆزو رەحمەتی خۆت بـڕژە بەسـەر پێغەمبـەرو ئـالی پێغەمبـەرداو ئەم نزایەش لەئێمە وەربگرە.

لە سلێمانی و لە شەوی قەدرداو

لە ٢٣ی رەمەزانی١٤٣٣ دا ئیکرام کەریم نووسیویەتی

# بڕگەی یەکەم

## ئایا قەشە فادی ڕاستئەکات کە ئەڵێ (١٠)جۆر هەڵە لە قورئاندا هەیە؟!

قەشە فادی لە کتێبی"ئایا قورئان پارێزراوە"دا ئەڵێ قورئان دە جۆر هەڵەی تێدایە وەك هەڵەی یاسایی و هەڵەی مێژوویی و هەڵەی جوگراف و هەڵەی کۆمەڵایەتی و بەو شێوەیە، بەڵام کاتێك دەست بەخوێندنەوەی ئەو شتانە ئەکەیت کە ئەو بەهەڵەیان ئەزانێ بۆت دەرئەکەوێت کە ئەو شتانە هەڵە نین و ئەو خراپ خوێندنەوەی بۆکردوون، و چەندیش ئەگەڕێیت بۆ ئەوەی بزانی پاڵنەری ڕاستەقینە چییە کە وای کردووە ئەم قەشەیە ئەو شتانەی قورئان بەهەڵە بزانێت، هیچ نییە ئەوە نەبێت کە رقێکی بێ پاساو ئەیجولێنێت دژ بە ئیسلام و لەخۆڕایی شەڕی پێئەفرۆشێت، ئەگینا ئەو شتانەی ئەو بەهەڵەیان ئەداتە قەڵەم هەندێکیان لە کتێبی پیرۆزی خۆشیدا هەن و ئەو نەك بە هەڵەیان نازانێ بەڵکو بە پیرۆزیشیان ئەزانێ!و ئێمەش لە باسەکانی داهاتوودا ئەمە ڕوونئەکەینەوە بەبەڵگەوە. وەرگێڕەکەی لای خۆمان-کە نەناوی هەیەو نەنیشان!- لەژێر شەوقی چراقوتیلەکەی قەشە فادیدا لەو کتێبەدا ئەڵێ: قورئان پارێزراو نیەو چەندین هەڵەی تێدایە!لەمە خراپتریش ئەڵێ قورئان خۆی ئەمەی ڕاگەیاندووە!جا دێت دوو ئایەت لە قورئان ئەگرێ بەدەستەوەو نەزانانە-و بەڕاستی نەزانانەش- دوو مانای زۆر دووریان لێدەرئەهێنێ و ئەڵێ ئەوەتا قورئان خۆی شایەتی ئەدات لەسەر ئەوەی کە پارێزراو نیەو هەڵەی تێدایە!دوو ئایەتەکەش بریتین لەمانە:

١-(هُوَ الَّذِي أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلَّا اللَّهُ وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الْأَلْبَابِ).

٢-(أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِنْدِ غَيْرِ اللَّهِ لَوَجَدُوا فِيهِ اخْتِلَافًا كَثِيرًا).

ئایەتی یەکەم یانی: پەروەردگاری تۆ هەر ئەو خوایەیە کە ئەم قورئانەی نادرووەتەسەر تۆ، کە هەندێ ئایەتی ئەم قورئانە موحکەمن‌و بناغەن بۆ قورئانەکە هەمووی، و هەندێکی تر لەو ئایەتانە موتەشابیهن، بەڵام ئەو کەسانەی کە لادان لە دڵیاندا هەیەو مەیل بەو لادانە ئەدەن، دێن دوای موتەشابیهەکانی قورئان ئەکەون– نەك موحکەمەکانی–، بەمەبەستی ئەوەی فیتنەیەکی پێبنێنەوە یان سەرەنجامی ئەو ئایەتانە بدۆزنەوە، سەرەنجامی ئەو ئایەتانەش خوا نەبێ کەس نایزانێت و ئەو زانایانەش بنجدارو خاوەن ریشەن لە زانستدا ئەڵێن: ئێمە ئیمانمان بەم قورئانە هەیەو هەمووی هەر لە خوای خاوەنی ئێمەوە هاتووە، ئەوەی خاوەنی عەقڵ‌و ژیریی نەبێت ئەمە ناڵێت و نایخاتەوە یادی خۆی.

مانای ئایەتی دووەمیش ئەوەیە کە: ئەوە ئەو خەڵکە بۆ لەم قورئانە ووردنابنەوەو لێیڕابمێنن، خۆ ئەگەر ئەم قورئانە لەلای جگە لە خواوە بهاتایە ئەوە جیاوازی و قسەی دژبەیەکی زۆر تێدا ئەبوو.

وەرگێڕەکەی لای خۆمان ئەڵێ: (واتە ئەگەر قورئان ئایەتی لەگەڵ یەکتر ناکۆکی زۆری تێدا نەبێت ئەوا هەندێکی تێدایە..)[97]! جا لەسەر ئەم پێشەکیە نەخۆشە ئەنجامێکی نەخۆش دروستئەکات و ئەڵێت: (ئەگەر جیاوازی...لە قورئاندا هەبێت ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خواوەند خاوەنی قورئان نیە، هەروەها هەمان بەڵگەش ئەوە ئەسەلمێنێت کە قورئان (معصوم: پارێزراو)نیە لە هەڵە[98]، جا قەشە فادی و وەرگێڕەکەشی باجی ئەم بەدحاڵیبوونەی خۆیانیان داوەو هاتوون ئەوەندە عەقڵی خۆیان بڕیویەتی ئایەتیان هەڵبژاردووەو –وەك کەسێکی ساختەچی کە خۆی ئەکاتە دکتۆر لە خەڵکی و دەیان دەرمانی هەڵە ئەنووسێ بۆ خەڵکی و دەردەدارو کۆڵەوارییانئەکات– ئەمانیش هاتوون وایان کردووەو رایانگەیاندووە کە قورئان "دە" جۆر هەڵەی تێدایە! بەڵام با ئێمە پێش ئەوەی قسەی خۆمان بکەین لەسەر ئەو رەخنانە، قسە لەسەر ئەو دوو ئایەتە بکەین کە ئەو بەهەڵە حاڵیبووە لێیان.

---

[97] ل:٥.

[98] ل:٦.

## ئایەتەکەی سوورەتی النساء

وەرگێڕەکە ئەڵێ: مادامێك خوا ئەڵێ: ئەگەر ئەم قورئانە لەلای جگە لە خواوە بهاتایە ناکۆکی زۆری تێدا ئەبوو، کەواتە قورئان ناکۆکی زۆری تێدا نیە بەلاّم ناکۆکی کەمی تێدایەو ئەوەش یانی قورئان پارێزراو نیە لە هەڵەو بەوشێوەیەش قورئان هی خوا نیە!

ئەم چەمکە هەڵەیەی ئەو دروستی کردووە بۆ ماناکردنی ئەو ئایەتە لە عەقڵێکی نەخۆشەوە سەرچاوەی گرتووە، وەك شاعیرەکە ئەڵێ:

وكم من عائب قولا صحيحا

وأفته من الفهم السـقيم[99]

جا پەنی گەورە ئەوەیە وەك خۆهەڵکێشانێکیش لەبەردەم خوێنەرانیدا پەنا بۆ مەنتیق و بورهانی عەقڵی ئەبات! و ئەڵێ: قوتابیەك کە ئەڵێ: هیچ کۆششم نەکردووە مەبەستی ئەوەیە کە کۆششی زۆری نەکردووە، ئەگینا کۆششی هەرکردووە، قورئانیش کە ئەڵێ ئەگەر لە خواوە نەبووایە ناکۆکی زۆری تێدا ئەبوو، کەواتە کە ناکۆکی زۆری تێدا نیە، کەواتە ناکۆکی کەمی تێدایە.

من تەنیا دوو خاڵ بۆ وەلاّمی ئەم بەدحاڵیبوونەی وەرگێڕە کوردەکەی لای خۆمان ئەدەمەوە:

خاڵی یەکەم: ئەو تێگەیشتنەی تۆ نەك هەر وانیە بەڵکو پێچەوانەکەی راستە، چونکە خوای گەورە ئەفەرموێ: (وَلَوْ كَانَ مِنْ عِنْدِ غَيْرِ اللَّهِ لَوَجَدُوا فِيهِ اخْتِلَافًا كَثِيرًا).. یانی ئەم قورئانە کە لە لای خواوە هاتووە بۆ تۆ بێگومانبە کە هیچ هەڵەی تێدا نیە، چونکە ئەگەر ئەوە نەبوایە کە لە لای خواوە هاتووە هەڵەو ناکۆکیەکی زۆری تێدا ئەبوو، واتە ئایەتەکە باسی قورئان ناکات، بەڵکو گریمانی کتێبێك باسئەکات کە لە لای جگە لە خواوە بێت، جا ئەگەر کتێبێکی وا ببێت

---

[99] یانی چەندین کەس هەیە رەخنەو عەیبە ئەگرێت لە قسەیەکی دروست ، کەچی لە تێگەیشتنی نەخۆشی خۆیەوە ئەو رەخنانە سەرچاوەئەگرن!!

ئەوە هەڵەو ناكۆكی زۆری تێدا ئەبێت لەبەر ئـەوەی لای جگـە لـە خـواوە هـاتووە، كەواتە ماناكە رۆشنەو ئەم گریمانە بۆ قورئان نییە، بەڵكو بۆ كتێبێكـە كـە لـە لای خواوە نەهاتبێت و جگە لەخوا ئەو كتێبەی دانابێت، بۆ زیاتر رۆشنكردنەوەی ئـەم چەمكە ئەڵێین: ئـەم ئایەتـە بورهـانێكی عەقڵییـە بـەپێی زانسـتی مـەنتیق لـە دوو پێشەكی و ئەنجامێك دروستبووە

پێشـەكی یەكـەم: ئەگـەر ئـەم قورئانـە لـە لای جگـە لـە خـواوە بهاتایـە ئـەوە جیاوازی و ناكۆكیەكی زۆری تێدا ئەبوو.

پێشەكی دووەم: قورئانیش لای جگە لە خواوە  نەهاتووە.

ئەنجامەكەی: كەواتە قورئان كە لە لای خواوە هاتووە هیچ جیاوازی تێدا نیە.

یان بەم شێوەیە ئەو پێشەكیانە ریزئەكرێن:

پێشەكی یەكەم: ئەگەر  قورئانێك لە لای جگە لە خواوە بهاتایە ئەوە جیـاوازی و ناكۆكیەكی زۆری تێدا ئەبوو.

پێشەكی دووەم: قورئانێكیش لای جگە لە خواوە نەهاتووە.

ئەنجامەكەی: كەواتە قورئانێك بوونی نییە كە جیاوازی تێدا بێت(كەم بێت  یان زۆر بێت).

خاڵی دووەم: ئەم مەفهومی موخالەفەی كـە وەرگێـڕ دەریهێنـاوە لـە ئایەتەكـە هەڵەیـەكی زانسـتی و هەڵەیـەكی لۆژیكیشـە، هەڵەیـەكی لۆژیكییـە چـونكە ئـەو مەبەستەی قسەیەكی بۆ ئەهێنرێ دەریدەخات ئەو مەفهومی موخالەفەیە دروسـتە وەریبگری لەو قسەیە یان نادروسـتە،زانایان ئـەڵێن:"السـیاق تـدل علـی الوفـاق"، سیاقی قسە بەڵگەیە لەسەر گونجاوی رسـتەكە لەگـەڵ یـەكتردا، یـانی كـە خـوای گەورە ئەیەوێ باس لەگەورەیی قورئان بكات بۆ خەڵكی چۆن ئەبێ بفەرموێ: ئـەم قورئانە هەڵەو ناكۆكی زۆری تێدا نییە بەڵام چەند هەڵەیەكی كەمی تێدایە ! یان بۆ نمونە تۆ كە ئەڵێی: ئەم كۆمپیوتەرە ئەگەر یابان دروستی نەكردایە ئەوە پڕئـەبوو لـە كـەموكورتی، دیـارە مەبەسـتت نییـە بڵێـی پـڕ نییـە لـە كـەموكورتی بـەڵام

نیوەیە !یان تۆزێك كەم یان زیاتر لە نیوە كەموكورتی تێدایە، هەركەسیش ئەو خوێندنەوە بۆ قسەكەی تۆ بكات ئەوە باجی بێعەقڵی یان بێتامی خۆی ئەدات، یان كەسێك كە بە تۆ ئەڵێ: ئەگەر لە لای فلانە كەسەوە بهاتایەیت ئەوە دەفتەرێ دۆلارم پێئەدای، نابێ تۆ وا بزانی مادامێك لای ئەو كەسەوە نەهاتووی ئەوە راستە دەفتەرێ دۆلار وەرناگری بەڵام شتێ كەمتر لەو پارەیە وەردەگری، ئەمەی تۆ جگە لە هەڵە حاڵیبوون و خەیاڵپلاوی چیترە؟ دەی كە وەرگێرەكەی ئایا قورئان پارێزراوە ئەڵێ: ( مادامێك خوا ئەڵێ: ئەگەر ئەم قورئانە لەلای جگە لە خواوە بهاتایە ناكۆكی زۆری تێدا ئەبوو، كەواتە قورئان ناكۆكی زۆری تێدا نیە بەڵام ناكۆكی كەمی تێدایە !) ئەمە چ جیاوازییەكی لەو دووحاڵەتی سەرەوە هەیە؟..كە ئەشلێ: (قوتابیەك كە ئەڵێ: هیچ كۆششم نەكردووە مەبەستی ئەوەیە كە كۆششی زۆری نەكردووە، ئەگینا كۆششی هەركردووە)، ئەوەش هەر وانیە؟ چونكە لەراستیدا ئەگونجێ ئەو قوتابیە هەر كتێبەكەشی نەكردبێتەوەو راستبكات كە كۆششی هەر نەكردووە، ئیتر فریانەكەوتووە یان باوەڕی بە كۆششكردن نەبووە یان كەمتەرخەمی كردووە یان چاوەڕوانی ئەم و ئەو بووە لە تاقیكردنەوەكەدا وەڵامەكانی پێبلێنەوە.

ئەم مەفهومی موخالەفەیە هەڵەیەكی زانستیشە چونكە مەفهومی موخالەفە لە هەموو بارەكاندا كاری پێناكرێت و تەنیا لەچەند حاڵەتێكی تایبەتدا ئەو بنەمایە كاری پێئەكرێت[100]، بۆنمونە: خوای گەورە كە ئەفەرموێ:( وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي الْأَرْضِ

---

[100] زانایان روونیانكردووەتەوەكە بەچەند مەرجێك مەفهومی موخالەفە كاری پێئەكرێت و لەهەموو بارەكاندا ناكرێ كاری پێبكرێت، هەندێ لەو مەرجانە:

١-پێچەوانەی بنەمایەك نەبێت لەخۆی بەهێزتر بێت، بۆ نمونە: (وَقَضَى رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِنْدَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُلْ لَهُمَا أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُلْ لَهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا) نابێ بوترێت ئەگەر لێیانبدەیت قەیناكات و تەنیا ئۆفكردن حەرامكراوە!

٢-باسكراوەكە لە سیاقی مەدحكردندا نەبێت بۆ نمونە: (لِتَأْكُلُوا مِنْهُ لَحْمًا طَرِيًّا).نابێ بوترێت ئەگەر گۆشتەكە تازە نەبوو حەڵاڵ نییە!

فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَقْصُرُوا مِنَ الصَّلَاةِ إِنْ خِفْتُمْ أَنْ يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا إِنَّ الْكَافِرِينَ كَانُوا لَكُمْ عَدُوًّا مُبِينًا) النساء:١٠١. یانی کاتێك كە ئەكەونەسەر سەفەر گوناهتان ناگات كە نوێژەكانتان كورتبكەنەوە ئەگەر لە دوژمن ئەترسان پەلامارتان بدەن. ئایەتەكە باسی ئەوە ئەكات كە موسافیر بۆی هەیە نوێژەكانی كورتبكاتەوە ئەگەر ترسی لە دوژمن هەبوو، ئەی ئەگەر ترسی نەبوو؟ نابێ بووترێت بۆی نییە نوێژەكانی كورتبكاتەوە با لەسەفەریشدا بێت، چونكە ئەم مەفهومی موخالەفەیە لێرەدا كاری پێناكرێت.

لەو ئایەتەدا خوای گەورە ئەیەوێ ئەوە رابگەیەنێت بەپێغەمبەرو بەهەموو دنیاو دڵنیایی بدات: كە قورئان هیچ ناكۆكی و جیاوازیەكی تێدا نیە لەبەر ئەوەی لەخواوە هاتووەو خواش داناو زانایە، مەبەستی ئایەتەكە كەی ئەوەیە بڵێ: ببورن! ئەم قورئانە جیاوازی و ناكۆكی زۆری تێدا نییە بەڵام كەمێك جیاوازی و ناكۆكی تێدایە، چ بكەین هەر ئەوەندەمان لێزانیوە! بۆیە ئەم رستە نامۆو نەشازەی وەرگێڕ كە ئەڵێ: (كەواتە قورئان ناكۆكی زۆری تێدا نیە بەڵام ناكۆكی كەمی تێدایە) نە لەگەڵ سیاق و نەلەگەڵ مەبەستی ئایەتەكەدا نایەتەوە؟!

زیاد لەئەمەش خوای گەورەش لە چەندین شوێنی تری قورئاندا ئەم راستیە دووپاتئەكاتەوە ، وەك لە سورەتی"فصلت"دا ئەفەرموێ:( إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِالذِّكْرِ لَمَّا جَاءَهُمْ وَإِنَّهُ لَكِتَابٌ عَزِيزٌ (٤١) لَا يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِ تَنْزِيلٌ مِنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ (٤٢).. ئەوانەی كە كافربوون بەم قورئانە كاتێك هات بۆلایان (لێمان وننابن)و لەوەش دڵنیابن كە ئەم قورئانە كتێبێكی خاوەن دەسەڵاتە، پووچی و ناهەقی نە لە بەردەمیەوەو نەلە پشتیەوە روویتێناكات، ئەم قورئانە لە

---

٣-ئەوەی باسكراوە وەلاّم نەبێت بۆ پرسیارێكی دیاریكراو بۆ نمونە: ( لا تَأْكُلُوا الرِّبَا أَضْعَافًا مُضَاعَفَةً).نابێ بوترێت ئەگەر سووخواردنەكە لە سنورێكی كەمدابوو ئەوە قەیناكات.

٤-ناوبراوەكە لە سیاقی گشتاندندا نەبێت بۆ نمونە: (وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِير) .. نابێ بوترێت خوا دەسەڵاتی بەسەر شتە هەبووەكاندا هەیەو دەسەڵاتی بەسەر نەبووەكان و مومكینەكاندا نییە.

لایەن دانایەکی سوپاسکراوەوە دابەزیوە. یان ئەفەرموێ:(كِتَابٌ أُحْكِمَتْ آيَاتُهُ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِنْ لَدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ)، یانی ئەم پەڕاوە پەڕاوێکە ئایەتەکانی مەحکەم و پتەوکراون و لەپاشان لە لایەن کاربزانی زاناوە شیکراونەتەوە.یان ئەفەرموێ:(الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَنْزَلَ عَلَى عَبْدِهِ الْكِتَابَ وَلَمْ يَجْعَلْ لَهُ عِوَجًا)، سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ئەم کتێبەی بۆ عەبدی خۆی ناردووەو نەیهێڵاوە لاری تێدا بێت، کەچی سبحان الله خاوەن کتێبەکان ئەیانەوێ لاری بکەن و بەخواری پیشانی خەڵکی بدەن وەك خوای گەورە ئەفەرموێ:(قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ مَنْ آمَنَ تَبْغُونَهَا عِوَجًا وَأَنْتُمْ شُهَدَاءُ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ)، بڵێ ئەی خاوەن کتێبەکان! ئەوە بۆچی بەردەمی خەڵکی ئیماندار ئەگرن و نایەڵن بچن بەڕێگای خواداو ئەتانەوێ لارو خواری بکەن لەکاتێکدا ئێوە پێویستە شایەتی(بەهەق) بن، (ئاگاداریش بن) خواش بێئاگا نییە لەو ئیشانەی ئێوە ئەیکەن.

## ئایەتەکەی سوورەتی ئالی عیمران

خوای گەورە ئەفەرموێ: (هُوَ الَّذِي أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلَّا اللَّهُ وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الْأَلْبَابِ (٧)

ئەم ئایەتە-کە قەشە فادی و وەرگێڕی کتێبەکەی ئەو ئەیکەنە تانەیەك و بەڵگەیەك بۆ ئەوەی کە قورئان پارێزراو نییە لەهەڵەو کەموکورتی،چونکە ئایاتی موتەشابیهاتی تێدایەو چەند مانا هەڵدەگرن- میتۆدو دەستورێکی زۆر گەورەو فراوانە بۆ تێگەیشتن لە هەموو ئایەتەکانی قورئان و لە ئەو کەسانەش کە دەم ئەخەنە ناو ئەم کانیاوی قورئانەوە، ئایەتەکە پێنج برگەی زۆر گرنگ باسئەکات جێگەی خۆیەتی هەموو کەسێك لێیان ڕابمێنێت و وردیانبکاتەوە کە ئەوانیش بریتین لە:

یەکـەم: ناسـاندنی ئایاتـە موحکەمـەکان، ئایـا چـۆن سەرچـاوەن بـۆ تەفسـیری دروستی هەموو ئایەتە موتەشابیهەکان؟

دووەم: ناساندنی ئایاتە موتەشـابیهەکان و چـۆنێتی هێنانـەوەیان بـۆ ژێـر ئایەتـە موحکەمـەکان تـا تەفسـیری دروسـت بکـرێن و کـەس بـۆ مـەرامی نادروسـتی خـۆی بەکاریان نەهێنێت؟

سێیەم: باسی خەڵکانێك ئەکات کە هەر شوێن ئایەتـە موتەشـابیهەکان ئەکـەون و زەمیانئەکات، ئەوە چۆنەو بۆچی خوا زەمیان ئەکات؟

چوارەم: باسی خەڵکانێ ئەکات کە زانای ریشـەدارن لەزانسـتداو مەدحیانئـەکات، کەواتە ئەو زانا بنجدارانە کامانەن و بۆچی خوا مەدحیان ئەکات؟

پێنجەم: ئامـاژە بـۆ فەلسـەفەی ئـەم موتەشـابیهانە ئـەکات، کەواتـە فەلسـەفەی موتەشابیە چییەو بۆچی قورئان هەمووی موحکەم نییە؟

لەبەر ئەوەی لە کتێبی ژمارە(٤٣)ی پرۆژەی تیشکدا بەدرێژی باسـی ئـەم دەقـە دەستووریەو تەفسیرە دروستەکانیشمان کردووە بۆ ئـەم دەقـەو لەبـەر ئـەوەش ئـەم کتێبە لەقەبارەی خـۆی دەرنەچـێت، لێـرەدا هـەموو ئـەو خاڵانـە باسـناکەین و تـەنیا باسی خاڵی پێنجەمیان ئەکەین کە نووسەرو وەرگێـڕی ئایـا قورئـان پـارێزراوە لەبـەر ناخ ڕووخاوی خۆیان یان لەبەر نیـازی خراپیـان لـەدەوری ئـەو ئایەتـە موتەشـابیهانە خوول ئەخۆن بەو ئومێدەی تانەیەکیان دەست بکەوێت و بیدەن لە قورئان.

# خاڵی پێنجەم:

## فەلسەفەی موتەشابیە چییەو بۆچی قورئـان هەمووی موحکەم نیە؟

زۆرکەس لـە کۆنـدا هـەبووەو تـا ئێسـتاش هـەر هـەن ئەپرسـن: بۆچـی هـەموو قورئان بە(موحکەم)ی دانەبەزیووە تا هەموو کەس تێبگات لێـی و پێویسـت بـەوە نەبێت پرسیاری بۆ بکەی لە زانایان؟! ئەپرسن: ئەبێ هۆی چـی بێـت کـە قورئـان موتەشابهاتیشی تێدایەو ئەو موتەشابیهانەش بووەنەتە هۆی سەرگەردانی چەندین

کەس، چی ئەبوو قورئان هەمووی موحکەم بوایەو کەس ناچاری ئەوە نەبوایە بۆ ماناو مەبەستەکانی بگەڕێتەوە بۆ لای زانا ڕیشەدارو خاوەن بنجەکان لە زانستیی شەریعەتدا؟! مەگەر قورئان کتێبی هیدایەت و بەرچاوڕوونکردنەوە نییە؟.

بە بیروڕای من دوو فەلسەفەی زۆر ورد لە پشت بوونی ئەم ئایەتە موتەشابهانەوە هەن:

**یەکەمیان**: پێگەیاندنی زیاتری زانایان و ناساندنیان لەناو خەڵکداو مەدحکردنی ناخ و عەقڵیان، تا خەڵکی لێیان نزیك ببنەوەو بیانکەنە سەرچاوەی خۆیان.

**دووەمیان**: ترساندنی زیاترو ناساندنی یەکەبەیەکەی فیتنەچیەکان و زەمکردنی ناخ و عەقڵیان، تا لەلایەك خەڵك خۆیان لێبەدووربگرن و نەبن بەو داوو تەڵانەوە کە ئەو نیازپیسانە ئەیاننێنەوە، لەلایەکی تریشەوە گلۆپێکی سوور بێت بۆ ئەو کەسانەی کە بەشوێن موتەشابیهەکاندا ئەڕۆن و پێنازانن سەرەنجامیان لەچییەوە دەردەچێت زوو بەخۆیاندا بچنەوەو بچنەوە سەر میتۆدی زانا بنجدارەکان کە بریتییە لە تەفسیرکردنی ئەو ئایەتانە لەژێر ڕووناکی ئایەتە موحکەمەکاندا، تا خۆیان و خەڵکیشیان گەندەڵ نەکردووە.

پرسیار ئەکرێت ئەمە چۆن ئەسەلمێت؟ بە پشتیوانی خوا ئەڵێین:

سەبارەت ئامانجی یەکەمیان : زانایان چەند خاڵێك ئەڵێن، بۆ نمونە:

ـ ئیبن قوتەیبیە ئەڵێت: (ولو كانت القران كله ظاهراً مكشوفاً حتى يستوي في معرفته العالم و الجاهل، لبطل التفاضل بين الناس و سقطت المحنة و ماتت الخواطر)[١٠١]، واتە ئەگەر قورئان هەمووی هەر ڕووکەش‌و مانا ئاشکرا بوایەو زاناو نەزان وەك یەك بوونایە لە تێگیشتندا لێی، ئەوکاتە جیاوازی لە نێوان خەڵکدا نەئەما( ئەم زاناو ئەو نەزان)و تاقیکردنەوە نەئەماو فیکرو داهێنان پەکیان ئەکەوت‌و ئەمردن.

---

[١٠١] تأويل مشكل القران/ ابن قتيبة/ ص٨٦

ـ زەمەخشەری گەورە موفەسیرییش ئـەڵێ: (ئەگـەر بڵێـی: باشـە قورئـان بۆچـی گشتی موحکەم نیە؟ ئەڵێم: ئەگەر گشتی موحکەم بوایە ئەوە هەموو کـەس خـۆی پێداهەڵئەواسـی لەبـەر سـادەییەکەی‌و پشـتیانئەکردە ئـەو شـتانەی کـەزۆریان پێویسـتەو ئـەبێت لێیوردببنـەوەو توێژینـەوەی لەسـەر بکـەن‌و بەڵگـەی لـێ دروستبکەن[١٠٢] و وەك ئەڵێن: (مع الحاجة تقع الفكرة والحيلة و مع الكفاية يقع العجز و البلادة) واتە: پێویستی‌و ناچاری ڕێگە خۆش ئەکات بۆ بیرۆکـە دروسـت بـوون و نەخشـەدانان و تێـری و بێمنـەتیش ڕێگـە بـۆ هـیچ لێنـەهاتووی‌و پاڵدانـەوە خۆشئەکات[١٠٣]، لە یەکێکیان پرسی : بۆچی خۆزگە بەوە ناخوازی بگەیتە سنووری تێری و کیفایەت؟

وتی : حەزم لە خووڕەوشتی خەڵکی تەمەڵ و تەوەزەل نییە!

ـ زانایان ئەڵێن : "هەرچی زانیاری هەیە لەناو مرۆڤدا، چ زانیارییە ئایینیـەکان و چ زانیارییە مرۆییـەکان بەشـێکیان زانیـاری سـادەو سـەرەتاین‌و بەشـێکیان زانیـاری وورد و قورسـن، قوتـابی لەزانیاریـە سـەرەتاییەکانەوە سـەرئەخرێت بـۆ زانیارییـە قورس و ئاڵۆزەکان‌و ئەمەشـە وائـەکات کـە مامۆسـتاکان فـەزڵیان هـەبێت بەسـەر قوتابییەکاندا. زانایان ئەفەرموون: ئەگەر بەڕێڕەوی گێڕانـەوەی موتەشـابهەکان بـۆ ژێر موحکەمەکانـدا ڕێگـە بکـەین شـتێکی زۆر کـەمی قورئـان ئەمێنێتـەوە کـە لـەو ئایەتـە موتەشـابهانەیە کـەخوا نـەبێت کـەس ماناکـانی نازانێـت وەك: حەقیقـەتی (ڕۆح)و (کاتی هاتنی قیامەت)و (سیفەتە خەبەریـەکان)و (پیتـە تـاکو جووتـەکانی سەرەتای سورەتەکان).

ـ خوای گەورە لە ئایەتێکدا هـەموو قورئـانی نـاو نـاوە (موحکـەم) چـونکە هـەموو ئایەتێك موحکەمەو دامەزراوەو مەبەستو مانایەکی تایبەتی هەیە ئەگەر ببرێتـەوە

---

[١٠٢] الكشاف/ الزمخشري (١/ ٢٧٩)،

[١٠٣] ئەو پەندەش وەك پەندێکی کوردی لێهاتووە کە ئەڵێ(الحاجه ام الاختراع)،پێویسـتیی سەرچـاوەی داهێنانە.

بۆ پاڵ ئایەتەکانی تر و لە ژێر ڕۆشنایی قسەی خواو پێغەمبەری خوادا ماناو تەفسیربکرێت، وەك ئەفەرموێت: (کتاب احکمت اياته ثم فصلت من لدن حکيم خبير).

ـ لە ئایەتێکیشدا خوای گەورە هەموو قورئانی ناو ناوە (موتەشابهات) چونکە هەموو ئایەتەکان لەیەك ئەچن و هەموو بۆ یەك مانا و مەبەست ئاماژە ئەکەن، ئەی ئەمە چۆن ئاراستە ئەکرێت؟! زانایان لە وەڵامدا ئەڵێن : قورئان (تەشابوهی گشتی) تێدایە کە مەبەست پێی ئەوەیە هەمووی گونجاوەو پێکەوە بەستراون‌و یەك ڕاستیی ئەوی تریان دەرئەخات، ئەم تەشابوهە گشتیە پێچەوانەی (تەناقوزی گشتی)یە کە بریتییە لە سیفەتی قسەی بەشەر، چونکە قسەی جگە لە خوا ئەم (تەناقوزە گشتیی)ەی تێدایە، واتە یەك ئەویتریان هەڵدەوەشێنێتەوە و لەیەکتریان ئەترازێنێ و یەکتری پوچئەکەنەوە، ئیتر ئەو بەشەرە هەرچی بێت و لە هەر ڕشتەیەکی زانستدا قسەی کردبێت، ئەم ڕێسایە فەیلەسوفەکان و دکتۆرەکان و یاسادانەرەکان و زانایانی بوارە جیاجیاکانی ژیان هەموو ئەگرێتەوە، فەیلەسوفە تازەکان گاڵتەیان بەقسەو بیرۆکەی فەیلەسوفە کۆنەکان دێت، دکتۆرە هاوچەرخەکان بە زانست و بۆچوونی پزیشکی پەنجا ساڵی پێشتر پێئەکەنن، یاسادانەرەکانی ئەم سەردەمە سەیریان لە عەقڵبچوکی یاساناسەکانی سەدساڵ پێش ئێستا دێت..و بەو شێوەیە، وەك خوای گەورە ئەفەرموێت:

( ولوکان من عند غير الله لوجدوا فيه اختلافاً کثيراً)، بۆیە دەقە قورئانیەکان"تەشابوهی گشتیان" تێدایەو یەك ئەویتر مەحکەم ئەکات، بەڵام قسەی جگە لە خوا "تەناقوزی گشتی" تێدایەو یەك ئەویتریان لەرزۆك ئەکاتو پووچی ئەکاتەوە، خوای گەورە لەم مانایەدایە ئەفەرموێ: (انکم لفی قول مختلف)، بەڵام دەربارەی قورئان ئەفەرمووێ:" الله نزل احسن الحديث کتاباً متشابهاً مثاني تقشعر منه جلود الذين يخشون ربهم ثم تلين جلودهم وقلوبهم الى ذکر الله، ذلك هدى الله يهدى به من يشاء و من يضلل الله فما له من هاد"

الزمر/٢٣. خـوای پـەروەردگار ئـەو خوایـە کـە باشـترین قسـەی بـۆ ناردوونەتـە خوارەوە، کە بریتییە لە کتێبێك کە هەمووی لەیەکتری ئەچێت و دووبارەئەبنـەوە، –ئەوەنـدەش کەمەندکێشـە– ئەوانـەی لـە پـەروەردگاریان ئەترسـن–لـە کـاتی خوێندنەوەو گوێبۆگرتندا لێی– موویان گرژئەبێت و پاشان پێستیان و دڵیان نەرم ئەبێت و مەیلئـەدات بـە قورئانەکـەو یـادی خـوا، ئـەوە لەبـەر ئەوەیـە کـە قورئـان هیدایـەتی خوایـەو بـەهۆی ئـەو هیدایەتـەوە کێـی بـوێ بەرچاورۆشـن و دڵڕۆشـنی ئەکات و ئەو کەسەش خوا دەستی لێبەربـدات و وێـڵ ببێـت ئـەوە کـەس ناتوانێـت ببێتە رێنیشاندەری!

لەمانەوە ئەگەینە ئەوەی کە بێ حکمەت نییـە خـوای گـەورە کتێبەکـەی خـۆی بکاتە دوو بەشەوە: "موحکەمەکانو موتەشابیهەکان"، تا رێزو پلەو پایەی زانایـان دەربخـات و کـاری گـەورەو پڕمەترسـییان بخاتـە سەرشـان کـە بریتییـە لـە تەفسـیرکردنی دروسـتی ئـەم دەقـە دەسـتوورییانەی قورئـان، بەهێنانـەوەی موتەشـابیهەکان بـۆ ژێـر موحکەمـەکان و لـە ژێـر رۆشـنایی ئەوانـدا مانـا وردو قورسەکانی لێدەربهێنن و نەیـەڵن خـەڵکانێك کـە (زەیـغ)و (ئینحـراف) لـە دڵیانـدا هەیە قسەی خواو پێغەمبەری خوا بکەنە بەڵگـەی دەسـتیان بـۆ سـەرگەردانکردنی خەڵکیو بەتاڵکردنەوەی ئایین و پەیامەکانی خوا، وەك نەصاراکان هەندێ ئایـەتی قورئانیان ئەکرد بە بەڵگە بۆ خوایەتی عیسا و مەریـەمی دایکـی یـان وەك دەسـتە گومڕا و لادەرەکان کە بە شوێن ئایەتە موتەشابیهەکاندا ئەچن رێبەرو گـەورەکانی خۆیان لە خەڵکی ئەکەنە ئەولیاو ئەنبیاو شەڕی خوێناویشی لەسەر ئەکـەن و ئـەو رایە موتەشابیهانە ئەکەنە پێوەر و ترازوو بۆ خەڵکی، ئەوەی رای وەکو ئەوان بـوو دۆستو خۆشەویستەو ئەوەشـی رای وەك ئـەوان نـەبوو ئـەوە پـیس و نەگریسـە! وەك جاران ئەیانوت: "من كان معي فهو قديس ومن كان مع غيري فهو ابليس".

لەلایەکی تریشەوە بوونی ئەو موتەشابیهانە لە قورئاندا دەرگای لێکۆڵینـەوە لە زانایان و خـەڵکی ئەکاتـەوە و یارمـەتی عەقڵـەکان ئـەدات بجـوڵێن و ئیجتیهـاد

بکـەن، هـەر ئـەو لێکۆڵینـەوە و ئیجتیهـاد کردنەیـە وای کـردووە لـەناو کەلـەپوری ئیسلامییدا مەسەلەیەك نەمێنێ زانایـانی ئیسـلامی بـە ڕێگەیـەك یـان زیـاتر قسـەو باسیان لێی نەکردبێ، خۆ ئەگەر قورئان هـەمووی موحـەکم و وشـەی سـادە بوایـە وەك "ئیبن قوتەیبەو زەمەخشەری" فەرموویان ئەوە عەقڵـەکان دۆگمـا ئـەبوون و بواری جوولەو گەشەکردنیان کەم ئەبویەوەو گەورەو بچوکی ئوممەتی ئیسلامی لـە یەك ئاست و یـەك پلـەدا ئەمانـەوەو دنیـا لـە نـاو خۆیانـدا گرۆملـەی ئـەکردن و لـە گۆشەیەکی تەسك و تایبەتدا قەتیسی ئەکردن.

ـ ئـەم موتەشـابیهانە وەك ئـەو تـابلۆ نەخشـین و جوانـە وایـە کـە بـە مەبەسـتەوە پارچەپارچەکراوەو داوائەکرێت لە سەیرکەرانی کە هەموو پارچەکانی بدەنەوە دەم یەکتری و تابلۆ سەرەکیەکەی لێدروستبکەنەوەو خـەڵاتێك وەربگـرن، جـا ئەوانـەی کە ژیرو بنجدارن و خاوەنی سـەلیقەی وردن پـاش بیرکردنەوەیـەکی زۆرو هـەوڵ و کۆششێکی بەردەوام سەرلەنوێ هەموو پاچـەکان لـە پـاڵ یەکتریـدا ریزئەکەنـەوە، هەموو گریمانە هەڵەکانی خەڵکی تر ئەڕەوێننەوەو شایسـتەئەبن بـۆ ئـەو خـەڵات و ڕێزو ناوداربوونەی کـە هـەمووان باسـی بکـەن.. ئـەم موحکـەم و موتەشـابیهانەش هەمان ئەرك و پاداشت ئەخەنە بەردەم کەسە زاناو بنجدارەکان و ئەوانەش کە زوو هەناسەیان تەواوئەبێت یان ئەکەون بەسەر هەڵەدا یان کۆڵئـەدەن و ئەچـنە دواوە یـان خۆیـان و خـەڵکی تـریش بـە تابلۆیـەکی نوقسـان فریوئـەدەن، کەواتـە جێـی خۆیەتی قورئان هەم موحکەم و هەم موتەشابیهیشی تێدابێت و هەم زەمی ئەوانـە بکات کە نابنە هاوەڵی زانابنجدارەکان و وەك ئەوان بکەن، هـەم مـەدحی ئـەو زانـا ریشەدارانەش بکات کە بەردەوام بۆ داهێنانی زیاترو جوانتر تێدەکۆشن.

ئامـــانجی دووەمیـــان: کـــە ترســـاندن و رســـواکردنی ناخپیســـەکانە، ئەمـــە بەوردبوونـەوەی زیـاتر لـە ئایەتەکـە بـۆت دەرئەکـەوێ خـوای گـەورە چـۆن ئـەو ئایەتەی کردووەتـە پێوەرێك بـۆ ناسـینی کەسـی زانـاو ناخپـاك، بەهـەمان شێوە کردوویەتیـە پێوەرێك بـۆ ناسـینەوەی خـەڵکی دەروون نـەخۆش و فیتنەچـیش!

خوای گەورە لەبری ئەوەی لە ڕێگەی پێغەمبەرەوە(صلى الله عليه و اله وسلم) خەڵكی دووڕوو فیتنەچی بە موسڵمانان بناسێنێت تا ئاگایان لێیان بێت و فریویان نەخۆن و ڕێگەی وێرانكاریان لێبگرن، دێت پێوەرو دەزگایەكی دۆزەرەوە(كاشفە)بۆ هەتاهەتایە ئەداتە موسڵمانان و بەهۆی ئەو دەزگایەوە ئەتوانرێت هەموو ئەو كەسانە دەربخرێن كە بەرنامەی لەو شێوەیان لە خەیاڵدا هەیە، بۆ نموونە: ئەگەر كەسێك زۆر بەدواداچوون بكات بۆ كەسێكی دوكانداری دەوڵەمەندو هەمیشە بپرسێت: كابرا كەی ئەڕوات بۆ دوكان؟ كەی دێتەوە؟ لەكام ڕێگەوە ئەڕوات؟ كێ لەگەڵ خۆی ئەبات؟و لەگەڵ كێ دێتەوە ؟و كەی پشوویەتی و ناچێت بۆ دوكان؟ و بەو شێوەیە.. تۆ گومانت بۆ دروستئەبێت كە كابرا نیازێكی خراپی هەیە وا ئاڵاوە لەو بابەتەو ئیتر لەوەودوا حەزرەرێكی زیاتری لێئەكەیت و بەردەوام چاوت لەسەری ئەبێت نەك پەنێك بدات، دەستێ لەكابرا بوەشێنێت یان دوكانەكەی تاڵان بكات، ئایەتەكەی سوورەتی ئالی عیمرانیش شتێكی لەو شێوەیەی تێدایە وەك ئەفەرموێت:(فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِ)، بەڵام ئەو كەسانەی كە لادان لە دڵیاندا هەیەو مەیل بەو لادانە ئەدەن، دێن دوای موتەشابیهەكانی قورئان ئەكەون—نەك موحكەمەكانی—، بەمەبەستی ئەوەی فیتنەیەكی پێبنێنەوە یان سەرەنجامی ئەو ئایەتانە بدۆزنەوە[١٠٤].

---

[١٠٤] زانایانی ئیسلام بەناو ڕەگ و ریشەی وشەی"فتنە"دا گەڕاون و ماناكانی ئەو وشەیان چڕكردووەتەوە لە یەك مانادا ئەویش بریتییە لە : دروستبوونی ژینگەیەك ئالوودە بە بیروڕای ناكۆك كە سەر بۆ بێدینبوون بكێشێت ئەگەر زانایان میتۆدی دروست نەدەنە خەڵكی بۆ مامەڵەكردن لەگەڵ ئەو ژینگەیەدا: بۆ نموونە لەم ئایەتانە رابمێنێ بۆ ئەو چەمكە: خوای گەورە ئەفەرموێ: ( وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّى يَقُولَا إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ)،( وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلَّهِ)،( وَحَسِبُوا أَلَّا تَكُونَ فِتْنَةٌ فَعَمُوا وَصَمُّوا ثُمَّ تَابَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ ثُمَّ عَمُوا وَصَمُّوا كَثِيرٌ مِنْهُمْ)،( وَاتَّقُوا فِتْنَةً لَا تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْكُمْ خَاصَّةً وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ)،( وَالَّذِينَ كَفَرُوا بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ إِلَّا تَفْعَلُوهُ تَكُنْ فِتْنَةٌ فِي الْأَرْضِ وَفَسَادٌ كَبِيرٌ)،( فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَنْ تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ).

ئیمامی شاتیبی لە کتێبی(الاعتصام)ەکەیدا ئەفەرموێ: دایکمان عائیشە ئەفەرموێ: پێغەمبەر(صلی الله علیه و اله وسلم)ئەم ئایەتەی خوێندەوە: "هو الذي أنزل عليك الكتاب منه آيات محكمات "تا کۆتایی ئایەتەکە، جا فەرمووی: ( فإذا رأيتم الذين يجادلون فيه، فهم الذين عنى الله فاحذروهم "، ئەگەر ئەوانەتان بینی موجادەلەیان دەربارەی قورئان ئەکرد ئەوە ئەوانە ئەو کەسانەن کە خوا مەبەستێتی و با چاوتان لەسەریان بێت! دوای ئەمە ئیمامی شاتیبی ئەڵێ:(وهذا أبين لأنه جعل علامة الزيغ الجدال في القرآن، وهذا الجدال مقيد باتباع المتشابه)، ئەمە زۆر رۆشنە، چونکە ئایەتەکە قسەبەشەڕدانی لەناو قورئاندا کردووە بە نیشانە بۆ لادان و ناخپیسی و ئەم قسەبەشەڕدانەش هاوملە لەگەڵ ڕۆیشتن بە شوێن موتەشابیهەکانداو تایبەتە بە ئەوە.

کەواتە لە میانەی ئەم پێوەرە قورئانیەوە تێئەگەین کە قەشە فادی و وەرگێڕەکەی لای خۆشمان لەوانەن کە ناخیان لادان هەیەو بەشوێن فیتنەوەن و بەردەوام بۆ برینێك ئەگەڕێن تا بەسەریەوە بنیشنەوە، وەك ئیبن تەیمیەی بلیمەت(رەحمەتی خوای لێبێت) ئەفەرموێ:(بعض الناس كالذباب لايقع الا على الجرح)!! هەندێ کەس وەك مێش وان، بەسەر برینەوە نەبێت نانیشنەوە!

سەیر ئەوەیە ئەم ئایەتە پێوەرە بۆ زاناو کەسە باشەکان و پێوەریشە بۆ نەزان و کەسە خراپەکان، جیاوازی نێوان کەسە نەزان و ناخپیسەکان و کەسە زاناو ناخپاکەکان تەنیا لە میتۆدی مامەڵەکردنیاندایە لەگەڵ ئایەتەکانی قورئاندا، ئەگینا خۆ هەردوولایان هەوڵی تەفسیرکردنی موتەشابیهەکان ئەدەن، تەنیا ئەوەیە کە ئەمان بێ پێوەرو بە نیازی لەرزۆککردنی خەڵك و فیتنەنانەوەوە ئەئاڵێن لەماناکانی ئەو ئایەتانەو ئەچن بەدوایاندا، بەڵام زانایان بە پێوەرو بە نیازی زیاتر مەحکەمکردنی خەڵکی لەرووی عەقڵی و رۆحی و کۆمەڵایەتیەوە ئەچن بەدوای ئەو ئایەتانەداو بۆ تەفسیرکردن و ماناکردنی تێئەکۆشن.

بەم پێیە جێگە بۆ ئەو رەخنەیە نامێنێتەوە کە هەندێ کەس ئەیڵێ:

(باشە خوا لەقورئاندا لۆمەی ئەو کەسانە ئەکات کە بە دوای موتەشابهاتدا ئەڕۆن و ئێوەش ئەڵێن: ئەوە گەورەییە بۆ زانایان کە لەئایەتە موتەشابهەکان ووردئەبنەوە و مانای دروستی لێدەرئەهێنن، جا کەواتە لۆمەکراو کێیە لە ئایەتەکەدا؟

شێخی ئیسلام ئیبن تەیمییە ئەفەرموێت: (ولكن لم ينف علمهم بمعناه وتفسيره بل قال كتاب أنزلناه اليك مبارك ليدبروا آياته وهذا يعم الآيات المحكمات والآيات المتشابهات وما لا يعقل له معنى لا يتدبر وقال افلا يتدبرون القرآن ولم يستثن شيئا منه نهى عن تدبره والله ورسوله انما ذم من اتبع المتشابه ابتغاء الفتنة وابتغاء تأويله فأما من تدبر المحكم والمتشابه كما أمره الله وطلب فهمه ومعرفة معناه فلم يذمه الله بل أمر بذلك ومدح عليه)[١٠٥].

خوای گەورە سەبارەت بە موتەشابیهەکان نەیفەرمووە: کەس ماناو تەفسیرەکانی نازانێ خوا نەبێت، بەڵکو فەرموویەتی: کەس تەئویل و سەرەنجامی ئەو ئایەتانە نازانێ خوا نەبێت! ئەمەش قسەی کاربڕە لە نێوان هەموو ئەوانەدا کە لەم بابەتەدا بووەتە کێشمەکێشیان، خوای گەورە هەواڵیداوە کە هەر ئەو سەرەنجامی ئەو ئایەتانە ئەزانێ... بەڵام نەفی ئەوەی نەکردووە کە ماناکانی و تەفسیرەکانی نازانرێ، بەڵکو فەرموویەتی: ئەمە کتێبێکی موبارەکەو بۆیە ناردوومەتە خوارەوە تا لە ئایەتەکانی وردبینەوە(ناودێرەکانی بگەڕێن بۆ ماناو مەبەستەکانی)ئەمەش ئایەتە موحکەم و ئایەتە موتەشابیهەکانیش ئەگرێتەوە، و ئەوەشی نەچێتە عەقڵەوە داواناکرێت لێووردبوونەوەی بۆ بکرێت، هەروەها ئەفەرموێت: ئەوە بۆچی لە قورئان وردنابنەوە، دەی خۆ هیچ ئایەتێکی جیانەکردووەتەوە و رێگری کردبێت لەوەی وردبوونەوەی لێبکرێت! خواو پێغەمبەری خوا رێگرییان تەنیا لەوە کردووە کە شوێن موتەشابیهەکان ئەکەون

[١٠٥] دقائق التفسير (٩٧/١)ط، دار الانصار، پەراوێزی: النبذ في اصول الفقة/ ابن حزم/ ص١٠٢، هەروەها سەیری(مجموع الفتاوى:٢٧٥/١٣)بکە.

بەمەبەستی فیتنەنانەوەو سەرەنجامدۆزینەوە، بەڵام کەسێك وردببێتەوە لە ئایەتە موحکەمەکان یان موتەشابیهەکان وەك خوا فەرمانی پێکردووەو بەشوێن مەبەست و ماناکانیدا بگەڕێت ئەوە خوا زەمی ئەو کارەی نەکردووە، بەڵکو فەرمانی پێکردووەو پێشیدا هەڵئەدات.

"قەستەلانی"ش دەربارەی ئەو کەسانەی شوێن موتەشابیهەکان ئەکەون ئەفەرموێ :( ليفتنوا الناس عن دينهم لتمكنهم من تحريفها الي مقاصدهم الفاسدة كاحتجاج النصارى بان القرآن نطق بان عيسى روح الله و كلمته و تركوا الاحتجاج بقوله ان هو الا عبد انعمنا عليه وأن مثل عيسى عندالله كمثل آدم خلقه من تراب وهذا بخلاف المحكم فلا نصيب لهم فيه لأنه دافع لهم وحجة عليهم).[١٠٦]

یانی: ئەوانەن کە ئامانجیان دورخستنەوەی خەڵکە لە ئایینەکەیان، چونکە ئەتوانن ئەو ئایەتانە بۆ مەبەستە خراپەکانی خۆیان بەکاریبهێنن، وەك بەڵگەهێنانەوەی گاورەکان بەوەی ئەیانووت: قورئان ئەڵێ: عیسا رۆحی خوایەو وشەی خوایە !کەچی وازیان لەو بەڵگەیە ئەهێنا کە خوا ئەفەرموێ: نمونەی عیسا وەك ئادەم وایە کە خوا لە گڵ خولقاندی، موتەشابیهەکان پێچەوانەی موحکەمەکانن کە هیچ بەڵگەیەکی بۆ بیروڕاکانی ئەوان تێدا نیە بەڵکو وەڵامیان ئەداتەوەو خەتاباریان ئەکات.

"ئیبن قوتەیبە"جوان ئەفەرموێت: ( باشە خۆ تەفسیرزانێك نیە لەماناکردنی ئایەتێکدا وەستابێت و تەفسیری نەکردبێت و بڵێت : ئەمە موتەشابهەو خوا نەبێ کەس ماناکەی نازانێت، بەڵکو تەفسیری هەموو ئایەتەکانیان کردووەو تەنانەت پیتە تاك و جووتەکانی سەرەتای سورەتەکانیشیان تەفسیرکردووە وەك: الم ، حم ، طه..)،جا کە هەموو زانایانی ئیسلام مانایان بۆ ئایەتە موتەشابیهەکان کردبێت و خۆیان لێلانەدابێت، ئەی کەواتە ئایەتەکە زەمی کێ ئەکات کە ئەفەرموێ: (فأما

---

[١٠٦] ارشاد السارى القسطلاني، ٥١/٧. ط١ / ١٤١٠، مطبعة الذهبي للنشر والتوزيع.

الـذين فـى قلـوبهم زيـغ فيتبعـون ماتشـابه منـه اتبغـاء الفتنهـو ابتغـاء تأويلـه)؟.
ئایەتەکە زەمی ئەو کەسانە دەکات کە:

١ـ بەردەوام لە هەوڵی کۆکردنەوەی ئەو ئایەتە موتەشابهانەدان کـە ماناکانیـان بەبێ بردنەوەیان بۆ ژێر ئایەتە موحکەمەکان گریمان زۆر هەڵدەگرێتو کەم عیلم و خەڵکی نەخوێندەار تووشی( قەلەق) دەکەن.

٢ـ ئەو کەسانەی بەبێ ئەوەی ڕیشەداربن لـە زانسـتی شـەریعەتدا دەمئەکوتنـە ماناکردنو تەفسیرکردنی ئەو ئایەتانە.

٣ـ ئەو کەسانەی کە هەنـدێ قـەناعاتی پـێش وەختیـان هەیـەو ئەیانـەوێ بـەو ئایەتە موتەشابهانە بیانشەرعێننو نەگەڕێنەوە بۆ لای ئایەتە موحکەمەکان.

٤ـ ئـەو کەسـانەی بەگـەڕانیان بـۆ کۆکردنـەوەی ئـەو ئایەتانـەو مانادەرهێنـانی نازانسـتی لێیـان مەبەسـتیان نانـەوەی فیتنەیـە لـەناو موسـڵمانەکانداو ئەیانـەوێ سـەرقاڵیو (جـەدەلێکی نـەزۆك)لـەناو بازنـە ئیسـلامیەکەدا دروسـتبکەنو شـەڕە ئایەتو حەدیسی پێبکەن! لەکاتێکدا ئایەتەکانی قورئـان یـەك تەواوکـەری یـەکنو حەدیسو ئایەتیش یەك بەیانی ئەوی تریان دەکات.

٥ـ ئایەتەکە زەمی ئەو کەسانەش دەکات کە ئەیانەوێ خۆیان بەتـەنها بنیشـنە مل ئایەتەکان بۆ دەرهێنانی ماناکانیان بەبێ گەڕانەوە بۆ تەفسـیری زانـا گـەورەو متمانــەدارەکانی ئیســلام لــەناو صــەحابە بــەڕێزەکانو تابیعینــە سەرڕاســتو بەوەفاکاندا.

٦ــ ئایەتەکـە زەمێکـی تریشـی تێدایـە ئـەویش ئەوەیـە ئـەو کەسـانەی شـوێن موتەشابیهەکان ئەکەون وەك زانا ڕیشەدارەکان لە دڵەوە ناڵێن:( کل من عند ربنا) بـەڵکو هـەر یەکـەیان سـەری لەشـتێکەوە دەردەچێت، یـەکێ ئـەڵێت : قورئـان مەخلوقەو جووڵەو هەڵسوکەوتی کۆمەڵگـە سـەرەتاییەکەی عـەرەب لـە دوورگـەی عەرەبیـدا دروسـتیکردووە، یـەکێ ئـەڵی: قورئـان خـۆی مـەخلوق نییـە بـەڵام لەفزەکانی ئێمەو دەنگەکانمان کە قورئانی پێئـەخوێنین ئـەوە مەخلوقـەو هەنـدێ

سەری لەوەوە دەرچووە کە بڵێ: قورئان کەلامی خوا نیەو درۆیەو خواقسە ناکاتو ناکرێ قسە بکات و یەکێ ئەڵێ ماناکانی قورئان لەخواوەیەو لەفزو دەربڕینەکانی هی پێغەمبەرن(صلی الله علیەو الەوسلم)[١٠٧]... وە هەروەها.

٧ـ ئایەتەکە زەمێکی تریشی تێدایە ئەویش ئەوەیە ئەو جۆرە کەسانە خولیاو خەیاڵیان ئەبێتە مانا دەرهێنان لە ئایەتە موتەشابیهەکان بە بێ پێڕەویکردن لە مەنهەجێکی ئیسلامی ڕاستەقینە، ئەمەش پێچەوانەی (شەرع)و (عەقڵ)و (زانست)یشە،چونکە شەرع ئەفەرموێت(فاسأل به خبيراً )، (ولا ينبؤك مثل خبير)،

---

[١٠٧] زۆر بەداخەوە هەندێ کەس کە لەسەر نوخبەی ئیسلامییش حسێبئەکرێن ئێستا برەو بەم بیرۆکە ناشەرعی و ترسناکە ئەدەن لە نووسین و گۆڤارو کۆڕو کۆبوونەوەکانیاندا! کە لە بناغەدا بیرۆکەیەکی شیعی و رافزییەو یەکێکی وەك سروش و موستەفای مەلەکیان( تەنزیر)ی چەواشەکاری بۆ ئەکەن و هەوڵی ئەوە ئەدەن کە رەگ و ریشەی بۆ بدۆزنەوە، هۆکەشی ئەوەیە شیعە بەگشتی بڕوایان وایە ئەم قورئانە مادامێك صەحابە نووسیوویانەتەوەو گواستوویانەتەوە بۆ دوای خۆیان کەواتە دەستیان تێخستووەو گۆڕیویانە ! ئێستاش کە ئەم قورئانەی بەردەستی موسڵمانان رەفزناکەنەوە ئەوە ناچارن و پێڕەوی لەو بنەمایەی مەزهەبەکەیان ئەکەن کە ئەڵێ: (إقرأ كما يقرأ الناس حتى يقوم القائم، فإذا قام القائم قرأ كتاب الله عز وجل على حده)، (الكافي، للكليني، ٤٦٣/٢ كتاب فضل القرآن) یانی: وەك ئەو خەڵکە قورئان بخوێننەوە تا مەهدی دێتەوە ! کە مەهدی هاتەوە قورئان وەك خۆی ئەخوێنێتەوە.بڕواشیان وایە قورئان چوار بەشە: بەشێکیان باسی ئەوانە و بەشێکیان باسی دوژمنەکانی ئەوانە، بەشێکیان یاساکانە، بەشێکیان پەندوئامۆژگاریە(الكافى، الكلينى، نوادر: ح:٤)، بڕواشیان وایە کە ئەو قورئانەی لای مەهدیە هەر ئەو قورئانەیە دابەزیوەتە سەر پێغەمبەر(صلى الله عليەوالەوسلم)و ژمارەی ئایەتەکانیشی حەڤدە هەزار ئایەتە ! ! لە کاتێکدا قورئان نزیکەی(٦٠٠٠)ئایەتە، کولەینی لە کافیدا(أصول الكافي: كتاب فضل القرآن، باب النوادر: ١٣٤/٢)ئەڵێ:(إِنَّ الْقُرْآنَ الَّذِي جَاءَ بِهِ جَبْرَئِيلُ (عَلَيهِ السَّلام) إِلَى مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وآلِه) سَبْعَةَ عَشَرَ أَلْفَ آيَةٍ)! ! بە قسەی کولەینی بێت زیاتر لە سێیەکی قورئان نەماوەو لەو قورئانەدایە کەلای مەهدیە ! لەمە زیاتریش بڕوایان وایە کە هەموو پێغەمبەران تا ئێستا شتێکی وا شایانی باس بێت لە زانستیان نەخستووەتە ناو خەڵکی و مەهدی کە دێتەوە دنیا پڕئەکات لە زانست، مەلا باقری مەجلیسی لە(بحار الأنوار: ٣٣٦/٥٢)دا ئەڵێ:"عن أبان عن أبي عبد الله قال: العلم سبعة وعشرون حرفًا فجميع ما جاءت به الرسل حرفان، فلم يعرف الناس حتى اليوم غير الحرفين، فإذا قام قائمنا أخرج الخمسة والعشرين حرفًا فبثها في الناس، وضم إليها الحرفين حتى يبثها سبعة وعشرين حرفًا"! !

(ان الله يحب اذا عمل احدكم عملاً ان يتقنه)، (عەقڵ)یش ئـەڵێت: پێویسـتە دەرگـا بـەکلیلی خـۆی بکرێتـەوە، پێویسـتە سـەرەتای دروسـت دابنرێـت بـۆ ئـەوەی سەرئەنجامی دروست بدات بە دەستەوەو بە پێچەوانەشەوە پێچەوانە دەردەچێت، زانستیش بەو هەموو لق پۆپـەوە هەیـەتی پسـپۆڕی و (تەخەصوصـات)ی دانـاوەو ڕێگەنادات بەبێ بەرنامەیەکی زانستی دروست قسە لە هیچ لقێکی زانستدا بکرێـت، چونکە زانستەکەش ئەشێوێنرێتو زیانی گەورەش ئەدرێت لـە خـەڵك و کۆمـەڵگای مرۆڤایەتی.[١٠٨]

کەواتـە وردبوونـەوە لـە قورئـان کـارێکی داواکـراوە لەشـەرعداو کـارێکی گەورەشە، ئەو وردبوونەوەو شۆڕبوونەوە بۆ ناو ماناکانی ناو دێڕی ئایەتەکان چ لە ئایەتە موحەکەمەکاندا بێت یان لـە ئایەتـە موتەشـابیهەکاندا بێـت، نـەك زەمکـراو نییـە، بـەڵکو مەدحکراویشـە، ئەوەشـی لۆمـەکراوە وەك قەسـتەلانی لەسـەرەوە فـەرمووی ئەوەیـە بـە دوای تـەئویلو مانایەکـدا بگـەڕێت کـە فیتنەیـەکی پـێ دروستبکات لەناو موسـڵماناندا، یـان پێچـەوانەی ئایەتـە موحکەمـەکان بێـت، یـان پێچەوانەی حەدیسی ـ صحیح ـ بێت، یاخود پێچەوانەی بنەماکانی زمانی عەرەبی بێت، یان بەبێ هۆو ـ مورەجیح ـ باوی مانایەك بدات بەسەر مانایەکی تردا.[١٠٩]

---

[١٠٨] بۆنمونە لەسەر هەریەك لەوانەی سەرەوە سەیری کتێبی ( زانستەکانی قورئان / بەشـی موحکـەم و موتەشابە) بکە بەدرێژی لەوێدا باسمانکردووە.

[١٠٩] دەسـتەی قادیانیـەکان ئێسـتا دیـارترین دەسـتەو تـاقمن کـە پـەنا بـۆ مانـاکردنی نادروسـتی موتەشـابهات ئەبـەنو قەناعـەتو ئـاینێکی تایبـەت و سـەربەخۆیان دروسـت کـردوە بـۆ خۆیـان کـە پێچەوانەیە لەگەڵ شـتە نـەگۆڕەکانی شـەریعەتداو دژە بـە گیـانی ئیسـلامەتی، کتێبێکـی ڕەخنـەییمان دەربارەی دیدو بیروچوون و مێژووی قادیانەییـەکان نووسـیووە بـەناوی(قادیانییـەت لـە نێـوان وەحـی ئاسمـانی و ئیلـهامی بەریتانیـدا)بەدرێـژی باسـی قۆناغـەکانی لادانـی ئـەو تاقمـە ئـەکات لـە پێـوەرە ئیسلامیەکان، بەرادەیەك هەر بەوەوە نەوەستان شوێن موتەشابیهات بکەون بەڵکو ڕێبەرەکەی خۆیـان کە میرزا غولاّم ناوێکە لێیان بووەتە پێغەمبەرێك و خۆیان ناچاری ئەوەئەکەن کە ئایەتی(ماکان محمد ابا احد من رجالکم ولکن رسول الله و خاتم النبیین)تەئویل و تـەحریف بکەن و بازبدەن بەسەریدا!

بۆ نموونە: سەرانی موعتەزیلە بەردەوام بۆ ئەو ئایەتانە ئەگەران لە قورئاندا کە ئەو مانانەی لێوەردەگیرێ کە (خوا نابینرێت، قورئان مەخلوقە، قەزاو قەدەر نییە، کەسێ گوناهی کەبیرە بکات نەموسڵمانەو نە کافرە، بەڵکو لەو نێوانەدایە، (حوسنو قوبح) دووشتی عەقڵینو بە عەقڵ ئەزانرێت نەك بە شەرع...)، چونکە ئەو شتانەیان کردبوویە بناغەی مەزهەبەکەیانو ئەیانوویست بیشەرعێنن! خەواریجەکان یەکەمین کەس بوون کە دوور لە میتۆد ئالآن لە موتەشابیهەکانی قورئان و خۆیان و شوێنکەوتەکانیان بەو دەردەبرد، شیعەکانیش پاش ئەمان بەهەمان رێگەدا رۆشتن و سەریان لەدەیان بنەمای نالۆژیکی و ناشەرعیەوە دەرچوو، موعتەزیلەکانیش دوای ئەوان بەهەمان هەڵەدا رۆشتن، (واصڵی کوڕی عەتا) کە بۆ یەکەمین جار لە چڤاتەکانی حەسەنی بەصری گەورە تابیعی جیابوویەوەو بەردی بناغەی بۆ (ئیعتزال) دانا "کە شەوی لێئەهات رووی ئەکردە قیبلەو دەستی بە نوێژکردن ئەکردو قەڵەمێك و چەن لاپەڕە کاغەزیشی لە پێش خۆیەوە دادەنا و دەستی بە قورئانخوێندن ئەکرد، کە ئەگەیشتە ئایەتێك بەڵگە بوایە بە دەستییەوە بۆ بۆڕدانی بەرامبەرێکی دائەنیشت و ئایەتەکەی ئەنووسی و ماناکەی خۆی لێدەرئەهێناو دیسان دەستی بە نوێژەکە ئەکردەوە".[١١٠]

لە "بیشری میرسی"یەوە ئەگێرنەوە—کە ڕێبەرایەتی فیتنەی "خەلقی قورئان" ئەکرد— وتویەتی: "ليس شيء أنقض لقولنا من القرآن، اذا احتجوا عليكم بالحديث فغالطوهم بالتكذيب، و اذا احتجوا بالآيات فغالطوهم بالتاويل".[١١١]

هیچ شتێك نییە وەك قورئان قسە و بنەماکانی ئێمە خاو بکاتەوە، بۆیە هەرکەس بە حەدیس موناقەشەی کردن بەوە بە هەڵەیدا بەرن بڵێن ئەو حەدیسە

---

[١١٠] دراسات في الفرق و العقائد الاسلامية، عرفان عبدالحميد، ص١٠٥.

[١١١] مجلة البيان ـ عدد" ٩٦" شعبان، ١٤١٦ـ ص١٢.

صەحیح و راست نییە، ئەگەر بە ئایەت موناقەشەی کردن بەوە بە هەڵەیدا بەرن بڵێن ئەوە ماناکەی بەو شێوەیە نییە تۆ ئەیڵێی و تەئویلەکەی بەم شێوەیەیە..!!

هەر ئەمانە بوون کە یەك جار لە مێژوودا بۆیان ڕێکەوت دەسەڵات بگرنە دەست نەیانتوانی لەگەڵ نەیارەکانیاندا موسڵمانانەو عاقڵانە بجوڵێنەوە، ڕێگەیان نەدا کەس جیاواز لە ئەوان بیر بکاتەوە، نەیانتوانی ڕای بەرامبەر قەبوڵ بکەن یان بێن بە "فکر" و "عەقڵ" موناقەشەیان بکەن، بەڵکو هاتن بە زیندانی و شکەنجەو کوشتن ڕووبە ڕووی ئەوانە بوونەوە کە ڕایان لە ڕایەکانی ئەمان نەبوو، لە دوایشدا هەر ئەهلی سوونەت و جەماعەت بە "فیکر" و "موناقەشەی فیکری" تێکیانشکاندن و ئابڕووی بیروڕا نازانستییەکانی ئەمانیان بردو لە دەسەڵات دووریانخستنەوە. موناقەشەکانی ئیمام عبدالعزیز الکنانی المکی لە کتێبی "الحیدە"دا لەگەڵ "بیشری مریسی"و سەرانی موعتەزیلەدا شایەتی ئەوەن ئەهلی سوونەت بە چەکی فکرو "موعتەزیلە"ش بە چەکی تۆقاندنو دەسەڵات مامەڵەیان لەگەڵ مەسەلە زانستیو مەنتقییەکاندا کردووەو رێگەیان نەداوە ئەو ئایەتە موتەشابیهانە ببرێنەوە بۆ ژێر ئایەتە موحکەمەکان تا بەو میتۆدە ماناو مەبەستەکان رۆشن و گەشببنەوە".[١١٢]

لەمەوە بۆمان روونبوویەوە کە بوونی ئایەتە موتەشابیهەکان مانای ئەوە نیە قورئان پارێزراو نیەو هەڵەی تێدایە! بوونی موتەشابیه لە قورئاندا بۆ فراوانکردنی زانستی زانایان و جوڵاندنی عەقڵی عاقڵانەو دەزگایەکە بۆ کەشفکردنی خەڵکی ناخپیس و فیتنەچی، لەبەرئەوە بوونیان پێویستییەکە لە پێویستیەکان بۆ پاراستنی ژیانی رۆحی و عەقڵی و کۆمەڵایەتی.

---

[١١٢] کتێبی "الحیدە" عبدالعزیزالکنانی المکی، هەریەك لە ئیبن تەیمیەو ئیمامی شاتیبی باسی دەکەن و پەسەندیدەیی خۆیانی بۆ دەربڕن، ئەم کتێبە بە روونی دەریئەخات کێ ئەهلی فیکرو عەقڵە، موعتەزیلە، یان ئەهلی سونەتو جەماعەت؟ زانا بنجدارەکان یان فیتنەچییەکان؟ میتۆدی زانستی بۆ تێگەیشتنی دروست لە موحکەم و موتەشابیه چییەو میزاج و هەوەسپەرستیش چییە!

# بڕگەی دووەم

## نمونەیەك لە هەڵە جوگرافییەكان وەك قەشە فادی ئەیڵێت

قەشە فادی و وەرگێڕەكەی هاوڕێی لەم بەشەدا بە حسابی خۆیان (دە)هەڵەیان لەڕووی جوگرافیاوە لە قورئاندا دۆزیوەتەوە، بەڵام كە ئەیانخوێنیتەوە بەراستی بەزەییت بە عەقڵیاندا دێتەوە، نازانی ئەمە چ سەرلێشێواوییەكە ئەمانەی تێكەوتووە، باشە ئەمانە بۆ بەوشێوەیە خۆیان فریووئەدەن و دژایەتی ئەم قورئانە ئەكەن؟ ئەمانە چۆن قەناعەتیان بەوە كردووە كە ئەو شتانە هەڵەو هەڵەی كوشندەشن لەقورئاندا؟! قەشە فادی ئەڵێ: قورئان كە ئەڵێ: (فَأَنْشَأْنَا لَكُمْ بِهِ جَنَّاتٍ مِنْ نَخِيلٍ وَأَعْنَابٍ لَكُمْ فِيهَا فَوَاكِهُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ (١٩) وَشَجَرَةً تَخْرُجُ مِنْ طُورِ سَيْنَاءَ تَنْبُتُ بِالدُّهْنِ وَصِبْغٍ لِلْآكِلِينَ (٢٠)..باخی دارخورما وترێمان بۆ شینكردوون لەگەڵ میوەجاتێكی زۆر كە لەو باخاتانە دەخۆن و درەختێكی تریشمان بۆ رواندوون كە لەتووری سینا دێتەدەرەوە كە بەرۆن شینئەبێت و پێخۆریشە بۆ ئەوانەی وەك خواردن ئەیخۆن.

ئەمە  لای قەشە فادی هەڵەیە، ئەزانن بۆچی ئەمە هەڵەیە لای  ئەم رەخنەگرە بلیمەتە؟.. ئەڵێ: چۆن ئەبێ بیابانی وشكوبرنگی سینا بە درەختی زەیتون بەناوبانگ بێت، لە كاتێكدا فەلەستین شیاوترە كە بەزەیتونەكەی بەیادبخرێتەوە نەك ئەو سینایەی كە خواوەند لەبەر قاتووقڕییەكەی لەوێدا لە ئاسمانەوە (شۆكە: گەزۆ)و پەلەوەری بۆ گەلی ئیسرائیل نارد؟[113]

دەی  خوێنەری بەڕێز ئەوە رەخنەیە؟ ئەوە هەڵەیە؟! كابرا لەبەرئەوەی خۆی قەشەیەو رقێكی مێژوویی لە نێوان و ئەوان و جولەكەدا هەیە، ئەیەوێ قورئان مەدحی فەلەستین بكات لەبەر ئەوەی شوێنی لەدایكبوونی عیسا پێغەمبەرە (سەلامی خوای لێبێت) نەك مەدحی دەشتی سینا بكات كە شوێن و خەڵوەتگای

---

[113] ل:٢٨.

موسا پێغەمبەره(سەلامی خوای لێبێت)!.. باشە بۆ ئەبێ ئەمە هەڵەبێت، بە چ پێوەرێك ئەمە هەڵەیە لە رووی جوگرافیەوە؟!لە كاتێكدا لە رووی زانستیەوە ئەوە سەلماوە كە درەختی زەیتون و بەتایبەتی ئەو جۆرە زۆر چەورەی كە هەیە لە دەشتی سیناوە گوازراوەتەوە بۆ هەموو ناوچەكانی تری دەریای سپی ناوەڕاست[١١٤].

یان ئەڵێ: كە قورئان ئەڵێ:(وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَهَا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ) رۆژیش ئەڕوات بەرەو ئارامگایەك كە بۆی دانراوە، ئەمە نەخشەی كەسێكی بەدەسەڵات و زانایە. قەشە فادی ئەڵێ بەپێی زانستی جوگرافیا (!!) ئەمە هەڵەیە! ئەزانن بۆچی؟ خۆی وەڵامەداتەوەو ئەڵێ:(خۆر ئارام و جێگرەو بەدەوری خۆیدا ئەسوڕێتەوەو لە جێی خۆیدا جێگۆڕكێ ناكات و ئەوە (زەوی)ە، كە بەدەوری خۆردا دەسوڕێتەوە، ئایا چۆن قورئان دەڵێت: خۆر هاتوچۆ دەكات و ئارامگایەكی هەیەو بەرەو ئەو ئارامگایە دەڕوات؟!

نازانم جارێ ئەم بابەتە چ پەیوەندیەكی بە جوگرافیاوە هەیە؟وردتر نەبوو بیوتایە لەڕووی گەردووناسیەوە؟ ئەی ئەو چۆن زانی خۆر لە جێی خۆیدا جێگۆڕكی ناكات؟ یان خۆر نابێ ئارامگایەكی هەبێت بەو ئاڕاستەیە بڕوات و لەوێدا بكوژێتەوەو ئارام ببێتەوەو ئیتر نە تیشك و نە تەقینەوەو نە گەرمایی نەمێنێت؟

باشە خۆ زانستی تازە نەك دژ بە قسەكان و(تەحلیلە نازانستیەكانی قەشە فادیە) بەڵكو زۆر وورد ئەوەی قورئان ئەسەلمێنێت و رایئەگەیەنێت كە خۆریش وەك هەر ئەستێرەیەكی تر لە رێگەی ئەوەدایە كە پیر ببێت و بكوژێتەوەو ئارامبگرێت!

---

[١١٤] قضايا و اراء، السنة ١٢٧– العدد(٢٠٠٣)– يونيو– ٢ من ربيع الثانى ١٤٢٤ هـ ،الأثنين:(من أسرار القرآن: الإشارات الكونية في القرآن الكريم ومغزي دلالتها العلمية،الاية"وشجرة تخرج من طور سيناء تنبت بالدهن وصبغ للآكلين"زغلول النجار.

زانستی تازە دەریخستووە کە مانگ بـەخێرایی  ١٨ کیلۆمـەتر لەیـەك چرکەداو زەوی بەخێرایی١٥ کیلۆمەتر لە یەك چرکەداو خۆر بەخێرایی ١٢ کیلۆمەتر لـە یـەك چـرکەدا لەڕۆیشـتنی بەردەوامـدان، مـانگ و زەوی و خـۆر هـەموو ڕێگـە ئـەبڕن و ئەجولێن وەك خوای گەورە ئەفـەرمویْ:(وَ الشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ * وَالْقَمَرَ قَدَّرْنَاهُ مَنَازِلَ حَتَّى عَادَ كَالْعُرْجُونِ الْقَدِيمِ * لَا الشَّمْسُ يَنبَغِي لَهَا أَن تُدْرِكَ الْقَمَرَ وَلَا اللَّيْلُ سَابِقُ النَّهَارِ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ)، هـێمن ئـەڕوات و سەرکەوت ئەڕوات و سەردار ئەڕوات! ئەمـە یـانی چـی؟ مـانگ لـە پـێش خـۆرەوە ڕێدەکات و خۆر ناتوانێت بیگرێتەوە چونکە مانگ بەخێرایی  ١٨ کیلو مەتر لەیـەك چـرکەداو زەوی بـەخێرایی١٥ کیلۆمـەتر لـە یـەك چـرکەداو خـۆر بـەخێرایی ١٢ کیلومەتر لە یـەك چـرکەدا لەڕۆیشـتندا بـەردەوامن، کەواتـە خـۆر چـەند بکۆشـێت ناتوانێت بگاتەوە بە مانگداو هەموانیش پارێزگـاری لـە خولگـەی خۆیـان ئەکـەن، ئەمە چیترە ئەوەنەبێت کە ئایەتەکە ئەیفـەرمویْ: (ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ)ئەمـە ئەندازەدیاریکردنێکە دەسەڵاتداری زانا کردوویەتی.

ئەمانە چ جۆرە بنیادەمێکن! خۆیان و ئایـدۆلۆژیا نازانسـتی و نەخۆشـەکانیان کردووەتە پێوەر بۆ ڕاست و هەڵە! یان میزاج و هەوەسی خۆیان کردووەتـە پێـوەر بۆ ڕەفزو قەبووڵ! ئەمانە یان عەقڵیان بچوکەو ناتوانن بڕوا بەوە بکەن زانست زۆر پێشکەوتووەو ئـەمان و بیروڕاکـانی ئـەمانی بەجێهێشـتووە، یـان زۆر بێویـژدانن و نایانەوێ بە هیچ جۆرێك دان بەوەدا بنێن کە قورئـان کتێبێکـی ئاسمانیـەو تـەریب لەگەڵ عەقڵ و زانست و پێشکەوتنەکاندا ڕێئەکات!

ئەمانە بۆ خۆدزینەوە لەهەموو ئەو شتانەی پەیوەندیان بە ئـایینی ئیسـلامەوە هەبێت هەموو ڕێگەیەك ئەگرنە بەر با ئـەو ڕێگەیـە ناعـەقلانی و نازانسـتیش بێـت، ئـەم فرتـو فێـڵ و خۆفریودانـەمان بـە درێـژی لـە کتـێبی (پوختەیـەك دەربـارەی بنەماکانی ئیسلام)دا باسکردووە، لەوێدا ووتوومانە: خـەڵکانی عـەلمانی بـە چـەند

رێگـەو شـێواز ئایینیـان لـە خۆیـان دوورخسـتووەتەوەو ڕیشـەو بنجیـان بـۆ ئـەم دوورگرتنەیان لە ئایین دروستکردووە، بۆ نمونە:

١–لە نووسین و داڕێـژانی راسـتیە زانسـتییەکاندا زیـاتر (صـیغەی فعلـی لازم ) بـەکار دەهێـنن، تـا باسـی خولقێنـەر نەیەتـەناو! بـۆ نمونـە ئـەڵێن:"زەوی بـە پارچەیەك هەوری چڕ دەور دراوە کە ڕێگە ئەدات تیشکی ڕۆژ لێوەی بگاتـە سـەر زەوی و پلەی گەرماش وەکو خۆی بهێڵێتـەوە)، نـاڵێن: خـوا زەوی بـە پارچـەیەك هەوری چڕ دەورە داوە کە ڕێگە ئـەدات تیشـکی ڕۆژ لێـوەی بگاتـە سـەر زەوی و پلەی گەرماش وەکو خۆی بهێڵێتەوە، یان ئەڵێن: (دووەم ئۆکسیدی کاربۆن کە لـە هـەوادا هەیـە لەگـەڵ هـەڵمی ئـاودا یـەکیانگرتووە کـە لـە سەرچـاوە گەرمـەکان هەڵدەستێت..)یان وەك (أوبارین)[115] دەڵێت:( ژیان لەسەر ئەم زەویە لـە ئـەنجامی زنجیرەیەك کارلێکی کیمیایی مادە نائەندامیەکانەوە دروست بووە)[116].

٢– دێن لە بری وشەی پەروەردگار وشـەی سروشـت بەکارئـەهێنن، کـە ئەگـەر وشــەی خــوا بخەینــە جێگەکــەی لــەو رســتانەدا، رســتەکانیش جــوان ئــەبن و ماناکانیشـیان هـەموو ڕاسـتئەبنەوە، بـۆ نمونـە: داروین دەڵێـت:( سروشـت ئـەو هێزەیە کە ئەتوانێ هەموو شتێك دروستبکات و سنوور بۆ دەسەڵاتی نییە لـە شـت دروستکردندا)، دەی خۆ ئێمەش هەر بەو شێوەیە پێناسەی خوا ئەکەین: ئـەڵێین: (خوای گەورە ئـەو هێزەیـە کـە ئـەتوانێ هـەموو شـتێك دروسـتبکات و سـنوور بـۆ

[115] ئۆبارین مامۆستای کیمیای ئەندامی و زانای ئەکادیمیای سۆڤیەتی جاران، کە ستالین رایسپارد لـە ڕێگەی زانستەوە ئەوە بسەلمێنێت کە ژیان خودبەخود لە ماددەوە دروستبووە، تـا عەقیـدەی رەسمـی دەوڵـەتی پـێ پشتڕاسـت بکاتـەوە، بـەڵام ئـەو لەگـەڵ هـەموو ئەنـدامانی ئەکادیمیاکـەی خۆیـدا هـەر ئەوەنـدەی بـۆکرا پـاش بیسـت سـاڵ ئـەزموون لـەو مەیدانـەدا و لـە سـاڵی ١٩٥٥دا بڵـێ:" ئەزموونـە بایۆلۆژییەکان تا ئێستا ئـەوەیان دەرخسـتووە کـە مـومکین نییـە لـە مـاددە کـائینی زینـدووی سـادە دروستبکرێت، بەڵام لە داهاتوودا ئەم(پەیمانە)هەر دێتە دی)!! ئەمەش هەر بۆ رازیکردنی ستالین بوو، بڕوانە کتێبی(الله:سعید حوی،ص٧٥).

[116] سلسة تراث الأنسانية (١٧٤/٢.

دەسەڵاتی نییە لە شت دروستکردندا )، ئەوان تەنیا وشەی خوایان لە رستەکە دەرهێناوەو وشەی سروشتیان خستووەتە جێگەی، یان بڕوانە(امیل بوترۆ)–یەکێك لە فەیلەسوفە هاوچەرخەکان– لە کتێبی (العلم والدين في الفلسفة المعاصرة[١١٧]) دا لەسەر زمانی (هیگڵ)ەوە دەڵێت : (سروشت هەموو هێزە پێویستەکانی لەخۆگرتووە بۆ ئەوەی هەموو شتێکی لێدروست ببێت بەپێی سیستەمێك کە ئێستا ئەتوانرێت دیاری بکرێت، هیچ شتێك نییە کە سروشت نەتوانێ تەفسیری بکات، هیچ شتێکیش لەسەروو سروشتەوە نییە، سروشت لای ئەوانەی کە زانیاریان دەربارەی هەیەو یاساکانی شارەزان بەتایبەتی (سیستمی هەڵبژاردن و گەشەی سروشتی) ئەزانن کە سروشت هەر خۆی خۆی دروستکردووە !).

## بڕگەی سێیەم

## نمونەیەك لە هەڵە مێژووییەکان وەك قەشە فادی ئەیڵێت.

لەم بەشەدا قەشە فادی–بە حسابی خۆی– (٥٥) هەڵەی مێژوویی لە قورئان ئەگرێ، جا بۆ زیاتر ئاگاداربوون لە رەخنە نازانستی و نامەنتیقیەکانی ئەم قەشەیە سەیری ئەم رەخنە سەیرەی بکەن لە قورئانی گرتووە لە رووە مێژووییەکەیەوە ! قەشە فادی ئەڵێ: قورئان لەوەدا هەڵەیە کە ئەڵێ:( وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ لأَبِيهِ آزَرَ أَتَتَّخِذُ أَصْنَامًا آلِهَةً إِنِّي أَرَاكَ وَقَوْمَكَ فِي ضَلاَلٍ مُبِينٍ (٧٤)..ئیبراهیم بە ئازەری باوکی ووت: ئەوە چەند بتێکت کردووە بەخوا بۆخۆت؟ من وائەبینم کە تۆش و گەلەکەشت لە گومڕاییەکی ئاشکراداان.. جا قەشە فادی ئەڵێ: لە رووی مێژووییەوە ئەمە هەڵەیە، باوکی ئیبراهیم ناوی"تارح"بووە نەك"ئازەر"!، بەڵگەی چییە؟ بەڵگەکەی ئەوەیە کە تەورات

---

[١١٧] العلم والدين في الفلسفة المعاصرة: (ص١٠٥–١٠٦).

وایوتووە لە سیفری تەکویندا![١١٨]، ئێمەش لە وەڵامی ئەم خۆڵبەسەرخۆداکردنەی فادیدا ئەڵێین:

١-ئایا گریمانی ئەوەنییە کە باوکی ئیبراهیم(سەلامی خوای لێبێت) دوو ناوی هەبووبێت، وەك چۆن حەزرەتی یەعقوب دووناوی هەبوو،(یەعقوب) و(ئیسرائیل)، ئیتر بۆ ئەبێ ئەوە هەڵەبێت کە کەسێك لەناوێ زیاتری هەبێت؟

٢-ناکرێ تارح ناوی باوکی ئیبراهیم بووبێت و ئازەر شۆرەت و لەقەبی بووبێت؟[١١٩]

٣-باشە تۆ پێکەنینت نایەت بەو کەسەی هەڵە لە وتارێك بگرێت کە نووسەری ئەو وتارە لەبری ئەوەی بڵێ"بارزانی" نووسیویەتی کاك" مەسعود"؟!یان لەبری مام جەلال حوسامەدین بنووسێ؟!باشە ئەوە کەی رەخنەیە تۆ بڵێی:( لە رووی مێژووییەوە ئەمە هەڵەیە چونکە(بارزانی ناوی "مەسعود"بووە نەك"بارزانی"!).

---

[١١٨] قورئان بە پێوەر نازانێ بەڵام سفری تەکوین بە پێوەر ئەزانێ بۆ راست و هەڵە کە دەیان قسەی نامەنتیقی و نازانستی تێدایە، بۆ نمونە ئەڵێ: خوا لە شەش رۆژدا زەوی و ئاسمانەکانی دروستکردو ماندووبوو، بۆیە بڕیاری دا رۆژی شەمە پشوبدات و بحەوێتەوە! "سفر التكوين الإصحاح٢:٣"(فأُكملت السموات والأرض وكل جندها. وفرغ الله في اليوم السابع ...فاستراح.."!

[١١٩] فەخری رازی لە تەفسیرەکەیداو لە منای"ئازەر"دا ئەڵێ: (.. قال ابن إسحاق ومقاتل والكلبي والضحَّاك : اسم أبي إبراهيم تارح وآزر لقب له، مثل يعقوب الملقب إسرائيل..)، شێخ محمد تاهیر ئیبن عاشوریش ئەڵێ:( والذي يظهر لي أنَّه : أنّ ( تارح ) لُقِّب في بلد غربة بلقب( آزر ) باسم البلد الذي جاء منه، ففي(معجم ياقوت) آزر- بفتح الزاي وبالراء- ناحية بين سوق الأهوازو رامهرمز . وفي الفصل الحادي عشر من سفر التكوين من التوراة أنّ بلد تارح أبي إبراهيم هو ( أور الكَلْدَانيين)، وفي (معجم ياقوت) ( أور ) -بضم الهمزة وسكون الواو- من أصقاع رامهرمز من خوزستان،ولعلّه هوأور الكلدانيين أو جزء منه أضيف إلى سكّانه، وفي سفر التكوين أنّ ( تارح ) خرج هو وابنه إبراهيم من بلده أور الكلدانيين قاصديْن أرض كنعان وأنهما مرّا في طريقهما ببلد (حَاران) وأقاما هناك ومات تارح في حَاران، فلعلّ أهل حاران دعَوه: آزر، لأنَّه جاء من صقع آزر، وفي الفصل الثاني عشر من سفر التكوين ما يدلّ على أنّ إبراهيم عليه السلام نُبِّىء في حاران في حياة أبيه..)،سەیری تەفسیری "التنوير و التحرير"بکە بۆ ئایەتی(٧٤)لە سورەتی(الانعام) .

٤– قەشە فادی لەو (٥٥) رەخنەیەی لە قورئان گرتوویەتی زیاد لە(٣٥)یان بە حوكمی ئەوەی كە مادامێك ئینجیل وەك قورئان ناڵێت كەواتە قورئان هەڵەیەو ئەوەی ئینجیل راستە ! ! باشە بۆ ئەبێ تەورات و ئینجیل پێوەر بن بۆ راستی و ناڕاستی شتێكی مێژوویی، بەڵام قورئان پێوەر نەبێت، لە كاتێكدا ئەو وردەكاریەی بۆ نووسینەوەی قورئان كراوە نە بۆ تەورات و نەبۆ ئینجیل نەكراوە، با بۆ نمونە ئەم بەراوردكاریە كورتە بكەین، تا بێویژدانی و نازانستی قەشە فادی روونببێتەوە[١٢٠]:

١ـ ئەم كتێبانەی كە چ مەسیحیو چ یەهودی ناویان ناوە (العهد القدیم)و (العهد الجدید) كە مەبەستیان بە یەكەمیان تەوراتو نامەكانی موسایە (سەلامی خوای لێ بێ)و مەبەستیان بە دووەمیان ئینجیلەكانو نامەكانی حەوارییەكانە، هیچیان بە سەنەدێكی نەپچڕاو (سند متصل) نەگەیشتوون بە خەڵكی، بەڵكو هەر هەموویان نزیكەی پەنجا شەستساڵ دوای حەزرەتی مەسیح نووسراونەتەوە.

٢ــ هەریەك لەو ئینجیلانەش كە نووسراونەتەوە بە دەستی كەسێك نووسراوەتەوەو كاری شەخصی بوون، نووسینەوەی ژیان و راسپاردەكانی عیسایە لە گۆشەنیگای خۆیەوە، كە ئەمەش هەڵدەگرێ ئەو كەسە قسەی خۆی تێكەڵكردبێ وەك (وشە)و وەك (بیرۆكە)و وەك (مانا)و هەڵیشدەگرێ زۆر شت هەیە لە بیری كردبێتو لە بیری نەمابێت وەك (وشە)و وەك (بیرۆكە) و وەك (مانا)ش، چونكە پرۆسەی شەخصی هەروایە – لە هەموو كات و سەردەمێكدا– تێكەڵە بە كەم و كورتی، ناكرێ ئەو قسانە بە قسەی خوا دابنرێن وەك چۆن موسڵمانان بۆ نمونە سیرەی ئیبن هیشام بە قسەی خوا دانانێن، چونكە لە راستیدا لێكچوونێكی زۆر لە نێوان كتێبەكانی سیرەو ئینجیلەكاندا هەیە لە رووی

[١٢٠] بەدرێژی لە كتێبی یەكەمی ئەم زنجیرەوەلأمەدا باسمان لە پارێزراوی قورئان كردووە لە رووی مێژووییەوەو بەراوردێكی وردمان كردووە بە ناپارێزراوی ئینجیلەكان..ئەتوانن بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێنەوە بۆی.

بابـەت و شـێوازەوە، وەك هەنـدێ لـە زانايـان لەوانـە"دكتـۆر سـەفر حـەوالی" لـە كتێبی"العلمانيـە"دا ئـەڵێ:( يـەكێك لـەو كتێبـە ئيسـلاميانەی كـە زۆر لـە ئينجيـل ئەچێت لە رووی بابەتەكانيەوە نەك لە رووی مێژووی نووسـينەكەيەوە بريتييـە لـە كتێبەكانی ژياننامەی پێغەمبەر(صلى الله عليەوالەوسلم)..جا ئايا بە هيچ شێوەيەك ئـەگونجێ بووترێـت ژياننامەكـەی ئـيبن هيشـام بـۆ نمونـە بريتييـە لـە نيگـای خـوا؟!..ئەمـە لـەڕووی شـەرع و لـە رووی عەقڵيشـەوە محاڵـە..لـە كاتێكـدا كـە ژياننامەی ئيبن هيشـام بێگومانـەو بڕاوەتـەوە كـە هـی خۆيـەتی و بـە ڕشـتەيەكی نەبچڕاو گوازراوەتەوە بۆ نووسەرەكەی و روونووسی سـەرەكی بـە زمـانی عـەرەبی پـارێزراوەو دەسـتی وەرگێڕانـی پێنەگەيشـتووە، كـە ئەمانـە(تەنانـەت) بـۆ ئينجيلەكانيش رێنەكەوتووون![121].

٣ـ مەسيحيەت و مەسيحييەكان دوای هەڵكێشانەوەی حەزرەتی مەسيح تووشی راوەدونانو شكەنجەو ئازاری زۆربوونەوە، بە تايبەتی لە لايـەن يەهودييەكانـەوە، بۆيە هەر يەك لەو حەوارييانە و قوتابييەكانيان ئاوارەی وڵاتان بوونو كەوتنـە ژێـر چاودێریو كەسێك يان دەسەڵاتێك يان دەسەڵاتدارێك نـەبوو لـەو رۆژگارانـەدا ئـەم قوتابيانەو مژدەكانی حەزرەتی مەسيح بگرێتە باوەشو بـەرگرييان لێبكـات و كـار بۆ نووسينەوەو پاراستنيان بكات، لە راستيدا ريوايەتە مێژوويەكانيش بـاس لـەوە ئەكەن كە ئينجيلەكان لەو ماوەيەدا نوسراونەتەوە.

٤ـ هەر پاش ئەوەی كە ـ حـەزرەتی مەسـيح ـ لـە دايـك ئـەبێت و سروشـی لـە خـواوە بـۆ دێـت يـەهود ئەچـنە بنكڵيشـەی حـاكمی رۆمـانی ئـەو كاتـە كـە نـاوی (قەيسـەر گيبـارۆس) ئـەبێ ئـەويش فـەرمانی دەسـتگيركردنی حـەزرەتی مەسـيح ئەداتو لە خاچـی ئـەدات–بـە پێـی قسـەی مەسـيحييەكان ـ و دەسـت بـە گرتنـی شوێنكەوتەكانيشـی ئـەكات، پـاش ئـەم قەيسـەرەش دوو قەيسـەری تـر دێـن كـە تاڵاوی دنيا ئەكەن بە قـوڕگی قوتابيـانی حـەزرەتی مەسـيحداو قـڕان ئەخەنـە نـاو

---

[121] العلمالنيە،(١/٣٤).

مەسحییەکانەوە، لەسەردەمی قەیسەری دووەمیاندا "متـی" ئینجیلەکـەی خـۆی ئەنووسێتەوە بە زمانی "عیبرانی" و "یوحنا" کە ئینجیلێکی تایبـەتی بـە خۆشـی هەیە وەریئەگێڕێتە سەر زمانی "یۆنانی". سەختترین سـەردەم بـۆ مەسـیحییەکان سـەردەمی پاشـا (نـیرۆن) بـوو لـە سـاڵی (٦٤) زاینـیو پاشـان سـەردەمی پاشـا (تراجـان) لـە سـاڵی (١٠٦) زاینـی و سـەردەمی (دیسـیوس) بـوو لـە سـاڵی (٢٤٩) زاینیـدا و "پاشـا نـیرۆن" بـەوە تۆمـەتباری ئـەکردن گوایـە ئەمانـە (ڕۆمـا)یـان سوتاندبێت، بۆیە کەوتنە ئەشکەنجەدان و ئازاردانیان بە شێوەیەك کە مێژوو کەم شتی وای بە خۆیەوە بینیـوە. بـۆ نمونـە: ئـەهاتن ئـەم مەسـحییانەیان ئـەگۆڕی و جلی ئاژەڵیان لە بەر ئەکردن و فرێیان ئەدانە بـەر سـەگی هـار و ئـەوانیش لـەت و پەتیان ئەکردن. یان ئەهاتن لە خاچیان ئەدان و جلێکی چەوری نەوتینیان لە بـەر ئەکردن و پاشان لە شەودا ئاگریان تێبەرئـەدان و وەك چرا بـە کاریانئـەهێنان بـۆ ڕووناککردنـەوەی ڕێگـە و بانـەکان و (نـیرۆن) خـۆی لـە ژێـر ڕۆشـنایی ئـەم (چـرا ئادەمیانە)دا هاتووچۆی ئەکرد ! !.

(مەرقس) ئینجیلەکەی خۆی لەم سەردەمەدا نووسییەوە لەو کاتەدا لە "ڕۆمـا" بـوو هـەروەها (لوقـا)ش ئینجیلەکـەی خـۆی لـە سـەردەمی ئـەم قەیسـەرەدا نووسییەوە.

پاش ئەم سەردەمە (یوحنا)ش ئینجیلەکەی خۆی نووسییەوە و لـە سـەردەمی (دەقلیدیانووس)دا کە نزیکەی سـێ سـەد هـەزار مەسـیحی کوشـت ئەمـەش سـاڵی (٢٨٤) زاینـی ئـەکات، ئەوانـەی مێـژووی مەسـیحییەت ئەنووسـنەوە ئـەو هـەموو ئەشکەنجە و ئازار و تۆقاندنە ئەکەنە هۆ کە (سـند)ی نەپچـڕاو نییـە بـۆ ریوایـەتی کتێبەکانیان و ئەوەش وا دەکات کە پەنا بۆ کاری نهێنی ببرێت و لە کاتی نهێنی و خۆشاردنەوەشدا چەندین شـت ڕوو ئـەدات کـە ڕاسـتی مەسـەلەکان ئەشـارێنەوە و دڵنیایی کز دەبێت لە مرۆڤدا بەرانبەر راستی ئەو زانیارییانە.

٥- ئەم پرۆسەی نووسینەوەی تەورات و ئینجیلانە پرۆسەی شەخصی بوون، "دوو"ان لەو ئینجیلنووسانە کە بریتین لە "لوقا"و"مەرقص"لە بناغەدا هەر حەزرەتی عیساشیان نەبینیوەو قوتابی ئەو نەبوون، کارێکی تاکەکەسی بووەو لە پەنهاندا ئەنجامدراوەو کاری پێداچوونەوەو تەوسیق و موناقەشەی نەکراوەو ئەوەندەی نووسیوە کە لە بیری ماوەو شتەکانیشی بە مانا گواستووەتەوە نەك بە لەفز، کە ئەمەش بە تەواوی پێچەوانەی پرۆسەی نووسینەوەی قورئانە کە کارێکی دەستەجەمعی و ئاشکرا بووەو بە دیاری چاوی خەڵکەوە بووەو پرۆسەی جەمعکردنەوەی قورئانە نووسراوەکان بووەو نەك نووسینەوەی ئەوەی رابووردووەو لە لایەن صەحابەکانی پێغەمبەرەوە(صلی الله علیه و اله و سلم) نووسراوەتەوەو بە لەفز نووسراوەتەوە نەك بە مانا، و دونیایەك وردەکاری و موناقەشەش تەنانەت لەسەر پیتێکیش کراوە، یان لەسەر شکڵی ئەو وشەیە کراوە کە چۆن ئەنووسرێت، هەر بۆ نمونە زانایان ئەفەرموون: لەهەر شوێنێکدا کە باس لە ئافرەتێکی ناسراو کرابێت ئەوە وشەی(إمرأت)نووسراوە —بە تێی درێژ—و لە هەر شوێنێکیشدا باس لە ئافرەت بە گشتی کرابێت ئەوە وشەی(إمرأة)نووسراوە —بە تێی خڕ—و لەو رێورەسمەی قورئان لایان نەداوە!

٦- خوای گەورە کەباسی ئایینی مەسیحییەت و یەهودییەت ئەکات ئەفەرموێ (یکتمون ما انزلنا من الکتاب) هەندێ لەو شتانەی لە کتێبەکەدا بۆمان دابەزاندن ئەیانشاردەوە، هەروەها ئەفەرموێ: (یحرفون الکلم عن مواضعه). هەروەها ئەفەرموێ:(ویل للذین یکتبون الکتاب بایدهم ثم یقولون هذا من عندالله و ما هو من عندالله و یقولون علی الله الکذب وهم یعلمون). جیاوازی نێوان ئەم ئینجیلانەش لە ناو خۆیانداو جیاوازیان لەگەڵ ئینجیلی (برنابا)داو جیاوازیان لە گەڵ قورئانیشدا، ئەو دڵنیاییە ئەدات بە مرۆڤی عەودالی ڕاستی کە ئەو کتێبانە دەستکاری زۆر کراون و بیروڕای بەشەری زۆریان تێکەڵ بووەو بەو شێوەیەش نێوان زەوی و ئاسمانیان لەگەڵ قورئان و حەدیسی پێغەمبەردا (صلی الله علیه واله وسلم) هەیە.

قورئان کە هەر لە سەردەمی پێغەمبەر(صلى الله عليه واله وسلم) خۆیدا هەمووی نووسرایەوەو پێغەمبەر(صلى الله عليهواله وسلم) لە ڕێگەی نووسەرانی (وحی)یەوە کە ژمارەیان لە (چل) کەس و لە ریوایەتێکی تردا (شەست) کەس بوون بەو شێوەیەی کە لە حەزرەتی جوبرەئیلەوە وەری گرتبوو (وشە) بە (وشە) گەیاندیە نووسەرانی (سروش)و هەر جارێك (وحی) بهاتایە سەری ئەینارد بەشوێن یەکێك یان زیاتر لەو شەست کەسەداو ئەو ئایەتانەی بۆ ئەخوێندەوە کە بۆی هاتبوون، پێشی ئەفەرموو، لە فلآنە شوێنو لە لای فلآنە ئایەتو سوورەتدا بینووسە. پاشان کە ئەینووسی پێی ئەخوێندەوەو ئەگەر هەڵەیەکی کردبایە بۆی راستئەکردەوە، وەك زەیدی کوڕی سابیت ئەفەرموێ:(كنت اكتب الوحي عند رسول الله (صلى الله عليه واله وسلم) وهو يملي علي، فاذا فرغت، قال: اقرأه، فاقرأه، فان كان فيه سقط أقامه)[١٢٢]، من لە خزمەتی پێغەمبەردا(صلى الله عليهوالهوسلم) نیگام ئەنووسییەوەو ئەو بۆی ئەخوێندمەوە، کە لێئەبوومەوە، ئەیفەرموو: بیخوێنەرەوە! منیش ئەمخوێندەوە، جا ئەگەر وشەیەکم لێبکەوتایە، پێغەمبەر(صلى الله عليهوالهوسلم) بۆی راستئەکردمەوە.

و پاشان حەزرەتی ئەبوبەکر لە ڕێگەی لیژنەی تایبەت و بەڵگەنامەی وردو وردکردنەوەو وەردکردنەوەی هەموو ئەو پەڕەو پارچە قورئانانەوە کە هەبوون جارێکی تر قورئانی دوای یەك ساڵ لە مردنی پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) کۆکردەوە و نووسیەوە[١٢٣] و پاشان چۆن لە سەردەمی حەزرەتی عوسماندا، لە ڕووی ئەو قورئانەوە چەندین نوسخەی تر نووسرایەوە و نێردرا بە هەرێمەکاندا تا خەڵکی گومانیان لە سەر قورئان بۆ دروست نەبێت و بە دەردی یەهودو نەصارا نەچن، دوایی

---

[١٢٢] علوم القرآن، محسن عبدالحميدو رشدي عليان و غانم قدوري: ص٤٣.

[١٢٣] لە پێشەوەو لە سەرەتای کتێبی"دەروازەیەك بۆ زانستەکانی قورئان"دا بە درێژی و وردەکاریەوە پرۆسەی نووسینەوەی قورئانمان باسکردووە چۆن لیژنەی بۆ دانراوە و ڕەچاوی وردترین سیستەمی نووسینەوە کراوە بۆ کۆکردنەوەو نووسینەوەی قورئان، تکایە بۆی بگەڕێنەوە.

کەس نەزانێ کامە قسەی خوایە و کامە قسەی خەڵکی ترە کە خراوەتە ناو کتێبی خواوە.

٧- ئینجیلەکان دونیایەك جیاوازی لە نێوان خۆیاندا هەیە، جارێ ئەمە یەك ئینجیل نییە بەڵکو چەندین ئینجیل هەیە وەك مێژوو بۆمان ئەگێڕێتەوە کە لەسەردەمی کۆندا چەندین ئینجیلی تر نووسراونەتەوەو دەست بە دەستیان پێکراوەو جێگەی بڕوای خەڵکی نەصرانی بووەو کاریان پێکردووە، وەك ئینجیلی (مرقیون)و ئینجیلی (دیصان)و ئینجیلی (مانی)و ئینجیلی (سبعین)و ئینجیلی (برنابا)و ئینجیلی (تەزکیرە)و هەندێ ئینجیلی تریش... بەڵام لە کۆتایی سەدەی دووەمو سەرەتای سەدەی سێیەمدا کلێسا ویستی سنورێك بۆ کتێبەکانی ئینجیل دابنێتو هات تەنیا چوار ئینجیلی لەو هەمووە ئینجیلە پەسەند کردو سەلماندنی ئەویش ئەمانەن: (متی)و (مرقس)و (لوقا)و (یوحنا) کە دوانیان وەك وتمان لە لایەن کەسانێکەوە نووسراونەتەوە کە قوتابی خودی حەزرەتی مەسیحیش نەبوون! کە بریتین لە(مەرقوس)و(لۆقا).

جگە لەوەش ئەم ئینجیلانە لەناو خۆشیاندا جیاوازی زۆر هەیەو یەك ئەوی تریان هەڵدەوەشێنێتەوە لە بری ئەوەی یەکتری بسەلمێنن..هەر بۆ نمونە با سەیری ئەم چەند نمونەیە بکەین:

أ: لە هەردوو ئینجیلی "متی" و ئینجیلی "لوقا" دا نەسەبی یەسوع ـ کە بریتییە لە خوا لای ئەوان ـ ئەگێڕێنەوە بۆ "داود"، لە "متی" دا لە نەوەی "سولەیمانی کوڕی داودە (متی١:٦)، کەچی لای "لوقا" لە نەوەی "ناسانی کوڕی داودە (لوقا ٣:٣١) .

ب: لە "سفرالتکوین" دا (١:٣-٥) ئەڵێ:«خلق النور والليل والنهار في اليوم الأول»، کەچی لە "سفر التکوین" دا (١:١٤) ئەڵێ : «خلق النور فى اليوم الرابع».

ج: کێ ئەو خاچەی هەڵگرتووە کە بە حسابی ئەوان خوا یان کوڕی خوای لەسەر لەخاچدراوە؟!

مـرقس (٢١:١٥)، ولوقـا (٢٦:٢٣)، ومتـى (٣٢:٢٧)هـەموويان ئـەڵێن ئـەو کەسە"سەمعانی قەیروانی"بووە، کەچی "یوحنا" (١٧:٩) باسی ئەوە ئەکات کە ئـەو کەسە عیسا خۆی بووە (سەلامی خوای لێبێت) .[١٢٤]

٨- لەو زانیاریانەی پێشووەوە بۆمان دەردەکەوێت کە کتێبە ئاینەکانی تری وەك تەورات و ئینجیل، چونکە ئـەرکی سەرشـانی هـەڵگرانی ئـەو دینـە بـووە بیپـارێزن و بیگەیەنن، کەڵێن و کەموکورتی زۆریان تێکەوتووە و هەریەکەی لە لایەکەوە هەوڵێکی شەخصـی خـۆی داوە بـۆ ئـەوەی زۆرتـرین ڕاسـپاردەو ڕێنماییـەکانی ئـەو پێغەمبـەرە(صـلی الله علیەوسـلم) کۆبکاتـەوەو بیگەیەنێتـە خـەڵکی، یـەکێکی تـر بـە جـۆرێکی تـرو ئـەوەی تـریش بـە جـۆرێکی جیـاواز لـە هـەمووان، بۆیـە کارەکـە وای لێهاتووە جیاوازی و ناسازی زۆر لەو کتێبانەدا دروست بوون و جیاوازییەکانیش شـتی وردو ناگرنگ نین، بەڵکو شتی گەورە و زۆر هەستیارن، بۆنمونە یەکێکیان عیسـا بـە عەبدی خوا ئەداتە قەڵەم و ئەویتریان ئەڵێ: عیسا خوایە یان کوڕی خوایە !لە هـەموو کایەکانی تردا هەر بەو شێوەیەیە چ بیرو باوەڕ دەربارەی" خوای موتەعال بێت یـان دەربارەی پێغەمبەران یان دەربارەی یاساو هەڵسوکەوتەکان" بێت.

خوای گەورە دەربارەی پاراسـتن‌و ئـەرکی پاراسـتنی ئـەو کتێبانـە ئەفـەرموێ: (لِلَّذِينَ هَادُواْ وَالرَّبَّانِيُّونَ وَالأَحْبَارُ بِمَا اسْتُحْفِظُواْ مِن كِتَابِ اللّهِ وَكَانُواْ عَلَيْهِ شُهَدَاء) (المائدة: ٤٤). وشەی (اسْتُحْفِظُواْ) واتـە داوای ئـەوەیان لێکرابـوو کـە کێتبـەکانی خۆیان بپارێزن.. بەڵام خوای گەورە دەربارەی پاراستنی قورئـان ئەفـەرموێ: (إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ) (الحجر: ٩) کـە بـە ئاشـکراو بـە چـەند دڵنیـا کردنەوە ئەفەرموێ (ئێمە خۆمان قورئان ئـەپارێزین) ئـەوەبوو کـە پاراسـتنی ئـەو کتێبانە سپێردرا بە خەڵکەکە خـۆی نـەیانتوانی وەك پێویسـت بیپـارێزن‌و دەسـتی خەڵکی (کەم دین)، یان (بێ دین)ی پێگەیشت‌و ئەمان لەبەر (ستەمکاری خۆیـان) و ئەوان لەبەر (نەزانینی خۆیـان) ئـەو هـەموو کارەسـاتەیان بەسـەر ئـەو دینانـەدا

---

[١٢٤] لە کتێبی یەکەمی ئەم زنجیرەوەلأمەدا بەدرێژتر لە ئەم بابەتەمان کۆڵیوەتەوە.

هێنا، بەڵام کە خـوای گـەورە وادەی پاراسـتنی قورئـانی دا، هـەر لـە سـەردەمی پێغەمبەردا (صلى الله علیه واله وسلم) ئەو هەموو کەرەسەیەی بۆ فەراهـەم کـرد و پاشان هەر لە ساڵی یەکەمی دوای مردنی پێغەمبەردا (صلى الله علیه واله وسلم) و دروست دوای شەڕی خێڵـی (موسـەیلەمەی درۆزن) خسـتییە دڵـی صـەحابەوە کـە هـەموو قورئـان لەیـەك (بـەرگ)دا کۆبکەنـەوە تـا لـە نەفـەوتانی تەنانـەت ئایـەتو پیتێکیشی دڵنیا بن، ئەوەبوو لەسەردەمی عوسمانیشدا (رەزای خوای لـێ بێـت) خوای گەورە هەلومەرجەکانی وا رێکخست صەحابە بیر لـە زیـادکردنی روونووسـی ئەو قورئانە بکەنەوەو بـە هەرێمەکانـدا بـڵاوی بکەنـەوە تـاخوای گـەورە بـۆ هـەتا هەتایە دڵنیایی بداتە خەڵکی کە ئەم قورئانە هەر ئەو قورئانەیە کـە خـوای گـەورە دایە جوبرەئیلو ئەویش دایە حەزرەتی موحەممەد و ئەویش (صلى الله علیـە والـە وسلم) گەیاندییە صەحابەکانو ئەوانیش بەئەمانەتـەوە (رەزای خوایـان لـێ بێـت) نووسیانەوەو گەیاندیانە هەموو مرۆڤایەتی..

ئیتر کەوایە بۆچی قەشە فادی قورئان بە پێوەر نازانێ بەڵام تەورات بە پێـوەر ئەزانێ و بەپێی ئەو نیشانەی راست و هەڵە ئەدات لە بابەتەکان؟!

## بڕگەی چوارەم

## نمونەیەك لەو هەڵە رەوشتیانەی کە قەشە فادی بە حەرام و بە تاوانی دائەنێت گوایە قورئان حەلاڵیکردووە!

قەشە فادی ئەوەی لا هەڵەیـە کـە قورئـان مـافی بـەرگریکردن ئەداتـە کەسـانی ستەملێکراو لە بەرانبەر ستەمکارەکانیداو ئەوە بە هاندان ئەزانێ بۆ توندوتیژی! رەخنە لەوە ئەگرێت کـە قورئـان فەرموویـەتی:( فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ (١٩٤) یـانی: هەرکەسێك دەستی بۆ درێژکردن ئێوەش دەسـتی لێبکەنـەوە وەك ئـەو، خۆشـتان لە(سزای)خوا بپارێزن و ئەوەش بزانن خوا لەگەڵ خەڵکی خۆپارێزدایە.

قەشە فادی بڕوای وایە کە ئەگەر کەسێك لە خۆڕایی و هەر بۆ چێژبردن زللەیەکی دا لە لای ڕاستت، تۆ لای چەپیشتی بدەرێ با زللەیەکی تری لێبدات! !ئەم بوختانەش ئەداتە پاڵ حەزرەتی عیسا(سەلامی خوای لێبێت) ، گوایە ئەو ئەم ڕەوشتەی دامەزراندووە! ١٢٥

سەیر ئەوەیە کە هەوڵەدات ئەم بوودەڵەییە بکاتە بەهایەکی باڵا لە ژیانداو سێ چوار دەق لە ئینجیل ئەگوازێتەوە بۆ سەلماندن و شیرینکردنی ئەم ڕەوشتە! سروشتییە لای ئەم قەشەیە کە مرۆڤەکان لەناو کۆمەڵگەکاندا ببنە دوو توێژ: ستەمکارێکی زللەوەشێن و ستەملێکراوێکی زللەلێدراو،دەی لەڕاستیدا ئەم قسەیە ئەوەندە بێماناو نامەنتیقیە تەنانەت وەرگێڕەکەی لای خۆشمان ناتوانێ قەبوڵیبکات و بە تێکەڵ و پێکەڵییەکەوە ئەڵێ: (..ئەگەر بەو شێوەیەی کە مەسیح ئەڵێت لەگەڵ ستەمکاردا هەڵسوکەوت بکەین، ئەوە خەڵکە کاڵفام و سەتحی و سەربۆش و بەدئیحساسەکان و خەڵکە گۆشت و خوێن پەرست و خەڵکە خێڵەکی و بنەماڵەچییەکان هیچ وانەیەك لەو ڕەوشتەبەرزانە وەرناگرن بەڵکو پتر لە بەدکاریەکانیاندا ڕۆدەچن و بەردەوام دەبن هەروەکو وتراوە—من امن العقاب اساء الادب—ئەو کەسەی لەوە دڵنیابێت سزانادرێت(بێ ئەدەبی دەنوێنێت)، واتە کوڕی سەرجادەو کوڕی دەرچووی بەندیگەکان و شەقاوەو چەقۆکێشەکان گەر لە سزای تووند نەترسن لە خراپەکاریدا بەردەوام دەبن).

جگە لەمە، باشە ئاخر ئەوە کەی ڕەخنەیە تۆ ئاراستەی قورئانی بکەی کە ڕێگەئەدات دەست لە ستەمکار بکەیتەوە؟! چۆن ژیان بەو جۆرە ڕێنماییانە بەڕێوەئەبرێت، کە ئەگەر کەسێك لە خۆڕایی و هەر بۆ چێژبردن زللەیەکی دا لە لای ڕاستت، تۆ لای چەپیشتی بدەیتی تا زللەیەکی تریشی لێبدات!؟ کام کەس هەیە لە دنیادا ئەگەر بۆیبڕواتەسەر خۆی ناکات بەکەڵەگا بەسەر خەڵکانی ترەوە؟..ئەم قسەیەی قەشە فادی زۆرتر لە موزایەدە ئەچێت، چونکە نەخۆی و

---

[١٢٥] ل:٩٦.

نـە کتـێبی پـیرۆزی و نـە مێـژووی و نـە ئێسـتای جێگەیـەکی تێـدا نیـە بـۆ وەهـا رەوشتێك:

١ـ خۆی: ئایا ئامادەیە ئەم بنەمایە جێبەجێبکات، یەکێك لەو لای بەلاوە بێت و بۆ خۆشی شەقێکی تێهەڵبدات ئەو جارێکی تر هەڵبسێتەوەو پشتی بۆ بکاتـەوە تـا شەقێکی تری تێهەڵبدات؟! بەدڵنیاییەوە نـەخێر ئامادەنیـەو دوور نیـە لەسـەر ئـەو شەقە ئەگەر لە پێشی بڕوات خاکی وڵاتێك بەتوورەکە نەبێژێت، باشـە خـۆ ئێمـەی موسـڵمان نـە زڵلـەمان داوە لـە فـادی و نـە شـەقمان تێهەڵـداوە، ئـەی بـۆ ئـەم بنەمایەمان لەگەڵدا بەخەرجنادات و جنێوو بوختانی خۆیمان لێدووربخاتەوە؟ دەی خۆ ئەگەر بـەپێی ئـەو بنەمایـە بێـت ئـەوە ئەگـەر تێشـیهەڵبدەین هـەر ئـەبێ ئـەو بمانبوورێت و لە گوڵێ کاڵترمان پێنەڵێ! دەی کوا ئـەو وای کـردووە؟ ئایـا قەشـە فـادی وایکـردووە لەگـەڵ موسـڵماناندا؟ ئـێ دیـارە نـەخێر، دەی کەواتـە ئـەم خۆهەڵکێشان و موزایەدەکردنە لە پێی چی؟

٢ـ کتێبە پیرۆزەکەی خۆی: لە ئینجیلەکەی قەشە فادیدا چەند دەق هاتووە کە ئەو بنەمایە هەڵدەوەشێنێتەوە، بۆ نمونە:

لە(سفر التثنية)دا هاتووەو ئـەڵێ:«حِينَ تَقْرُبُ مِنْ مَدِينَةٍ لِتُحَارِبَهَا اسْتَدْعِهَا لِلصُّلحِ ١١فَإِنْ أَجَابَتْكَ إِلى الصُّلحِ وَفَتَحَتْ لكَ فَكُلُّ الشَّعْبِ المَوْجُودِ فِيهَا يَكُونُ لكَ لِلتَّسْخِيرِ وَيُسْتَعْبَدُ لكَ.١٢وَإِنْ لمْ تُسَالِمْكَ بَل عَمِلتْ مَعَكَ حَرْباً فَحَاصِرْهَا. ١٣وَإِذَا دَفَعَهَا الرَّبُّ إِلهُكَ إِلى يَدِكَ فَاضْرِبْ جَمِيعَ ذُكُورِهَا بِحَدِّ السَّيْفِ. ١٤وَأَمَّا النِّسَاءُ وَالأَطْفَالُ وَالبَهَائِمُ وَكُلُّ مَا فِي المَدِينَةِ كُلُّ غَنِيمَتِهَا فَتَغْتَنِمُهَا لِنَفْسِكَ وَتَأْكُلُ غَنِيمَةَ أَعْدَائِكَ التِي أَعْطَاكَ الرَّبُّ إِلهُكَ. ١٥هَكَذَا تَفْعَلُ بِجَمِيعِ المُدُنِ البَعِيدَةِ مِنْكَ جِدّاً التِي لَيْسَتْ مِنْ مُدُنِ هَؤُلاءِ الأُمَمِ هُنَا. ١٦وَأَمَّا مُدُنُ هَؤُلاءِ الشُّعُوبِ التِي يُعْطِيكَ الرَّبُّ إِلهُكَ نَصِيباً فَلا تَسْتَبْقِ مِنْهَا نَسَمَةً مَا ١٧بَل تُحَرِّمُهَا تَحْرِيماً)(تثنية٢٠: ١٠– ١٨).

ئەگەر نزیکبوویتەوە لە شارێك بۆ ئەوەی شەڕی لەگەڵدا بکـەی سـەرەتا بـانگی بکە بۆ رێکەوتن، ئەگەر وەلامیاندایتەوە و شارەکەیان بـۆ کردیتـەوە ئـەوە هـەموو

ئەو میللەتانەی لەوێدا هەن ئـەتوانی بخەیتـە ژێـر بـارو بیانکەیتـە کۆیلـەی خـۆت، ئەگـەر شـارەکەیان تەسـلیمنەکردی و بـەڵکو شـەڕیان راگەیانـد لـە دژت ئـەوە گەمارۆیان بدە و کە خوای پەروەردگارت زاڵیکـردی بەسـەریاندا بەشمشـێر سـەری هەموو نێرینەکانیان بپەڕێنە، سەبارەت بە ژن و منـاڵ و ئاژەڵـەکان و هـەموو ئـەو شتانەی لەو شـارەدا هـەن دەسـتکەوتن بـۆ خۆتیـان هـەڵگرە و دەسـتکەوتێك کـە خوای پەروەردگارت لە دوژمنەکەتەوە پێتئەدات بیخۆ، ئابەم شێوەیە بکـە لەگـەڵ هــەموو ئــەو شــارانەدا کــە زۆر دوورن لێتــەوەو شــاری ئــەم میللەتانــە نــین و پــەروەردگارت خســتوویەتیە ژێرچــنگت ئــەوە زینــدوویان تێــدا مەهێڵــەو هــەموو ناوچەکە بکە بە قەدەغە!! دەی ئیتر یانی چی "ئەگەر کەسێك زللەیەکی دا لـە لای راستت، تۆ لای چەپیشتی بدەرێ با زللەیەکی تری لێبدات؟! !ئەمـە موزایـەدە نەبێت چیترە؟ ئەو دەقەی سەرەوە نـەك هـەر رێگـە بـە بـەرگری لـەخۆکردن ئـەدا بەڵکو شەڕی سەروماڵی و شەڕی سووتاندنی تەڕو وشکە بەیەکـەوە، ئەمـە شـەڕی جینۆسایدەو (شەڕێکی ئاسایی)ش نییە!

دەیان دەقی تری لەو شێوەیەی سەرەوە هەیە لە تەورات و ئینجیلدا ئیتر یان قەشە فادی ئاگای لێیان نیـە یـان ئاگـای لێیانـەو خـەڵکی فریوئـەدات و موزایـەدە ئەکات، هەندێ لەو دەقانە:

-" لا تظنوا أني جئت لأرسي سلاماً على الأرض، ما جئـت لأرسـي سـلاماً، بـل سيفاً، فإني جئت لأجعل الإنسان على خلاف مع أبيه، والبنـت مـع أمها والكنـة مـع حماتها وهكذا يصير أعداء الإنسـان أهـل بيتـه ".. واگومـان مەبـەن مـن بـۆ ئـەوە هاتووم ئاشتی لەسەر زەویدا بروێنم بەڵکو هاتووم بۆ رواندنی شمشێر!!

-لە کتێبی( سفر العدد:٣١: ١- ١٨)دا هاتووە و ئەڵێ:

وَقَالَ الرَّبُّ لِمُوسَى: انْتَقِمْ مِنَ الْمِدْيَانِيِّينَ لِبَنِي إِسْـرَائِيلَ، وَبَعْـدَهَا تَمُـوتُ وَتَنْضَـمُّ إِلَى قَوْمِكَ. فَقَالَ مُوسَى لِلشَّعْبِ: جَهِّزُوا مِنْكُمْ رِجَالًا مُجَنَّـدِينَ لِمُحَارَبَـةِ الْمِـدْيَانِيِّينَ وَالانْتِقَامِ لِلرَّبِّ مِنْهُمْ. فَحَارَبُوا الْمِدْيَانِيِّينَ كَمَا أَمَرَ الرَّبُّ وَقَتَلُـوا كُـلَّ ذَكَـرٍ" وَقَتَلُـوا

مَعَهُمْ مُلُوكَهُمُ الْخَمْسَةَ: أَوِيَ وَرَاقِمَ وَصُورَ وَحُورَ وَرَابِعَ، كَمَا قَتَلُوا بَلْعَامَ بْـنَ بَعُـورَ بِحَدِّ السَّيْفِ. وَأَسَرَ بَنُو إِسْرَائِيلَ نِسَاءَ الْمِدْيَانِيِّينَ وَأَطْفَالَهُمْ، وَغَنِمُوا جَمِيـعَ بَهَـائِمِهِمْ وَمَوَاشِيهِمْ وَسَائِرَ أَمْلاَكِهِمْ، وَأَحْرَقُوا مُدُنَهُمْ كُلَّهَا بِمَسَـاكِنِهَا وَحُصُـونِهَا، وَاسْـتَوْلَوْا عَلَى كُلِّ الْغَنَائِمِ وَالآسْلاَبِ مِنَ النَّاسِ وَالْحَيَوَانِ.

—لە(سفر حزقيال) ئامۆژگاری و وەسێت بۆ بەنی ئیسرائیل ئەکات پێیـان ئـەڵێ: " لا تشفق أعينكم، ولا تعفوا عن الشيخ والشاب والعذراء والطفل والنساء اقتلـوا حتى الهلاك."(!) .

—لە(سفر التكوين)يشدا بە ڕۆشنی ئەڵێ: "اضرب أهل تلك المدينة بحـد السـيف بجميع ما فيها حتى بهائمها"!! ئا ئەمانە چ ڕاسپاردەیەکن کە ئینجیـل ئـەیکات بـۆ شوێنکەوتەکانی و قەشە فادیش چی دەڵێ!؟

٣- مێژووی قەشە فادی: نەمێـژووی دووری و نـە مێـژووی نزیکـی قەشـە فـادی تۆمارێکی تێدا نیە بۆ ئەو بنەمایە، بەڵکو بە پێچەوانەوە، لە مێژووی دووریـدا وەك کتێبــە پیرۆزەکــەی خــۆی باســیئەکات پرۆســەی جینۆســایدیان بــەرپاکردووە، شمشـێریان هەڵکێشـاوە لـە نـەیارەکانیان نـەك ڕوومـەتی دووەمیـان پێـدابێت تـا زللەیــەکی تریشــی لێبــدەن، ( کــە خــوای پــەروەردگارت زاڵیکــردی بەســەریاندا بەشمشێر سەری هەموو نێرینەکانیان بپەڕێنە)... مێـژووی تـازەی خاچپەرسـتیش لە وڵاتاندا لەو مێژووە کۆنە خوێناویترەو مایەی ئەوەیە قەشـە فـادی سـەردابخات نەك ئاوەها خـۆی هەڵبکێشـێت بەسـەر خەڵکیدا! باشـە دادگاکـانی پشـکنین کـێ داینان؟ [١٢٦]لەسەردەمی صەلاحەدیینی ئەیوبیدا خێڵی فادی چییان نەکرد لـەکاتی

---

[١٢٦] گۆستاڤ لۆبۆن ئەڵێ:( " لما أجلي العرب – يعني المسلمين – سـنة ١٦١٠ م اتخـذت جميـع الـذرائع للفتك بهم فقتل أكثرهم ، وكان من قتل إلى ميعاد الجلاء ثلاثة ملايين من النـاس، في حـين أن العـرب لما فتحوا أسبانيا تركوا السكان يتمتعون بحريتهم الدينية ، محـتفظين بمعاهـدهم ورئاسـتهم ، وقـد بلـغ مـن تسامح العرب طوال حكمهم في أسبانيا مبلغا قلما يصادف الناس مثله هذه الأيـام "، حضـارة العـرب – گۆستاڤ لۆبۆن، ص ٢٧٩.

پەلامارەکانیاندا بۆ دونیای موسڵمانان؟ یان لە کاتی پەلامارەکانی بۆ سەر بۆسنەو هێرزەگۆڤین؟.

محمد عەلی شەحود لە کتێبی(موسوعة البحوث والمقالات العلمية)دا–کە نزیکەی پێنج هەزارو نۆسەد وتاری تێدایە–لەو کتێبەدا بە درێژی باسی ئەو هێرش و پەلامارانە ئەکات کە خاچپەرستان کردوویانەتە سەر جیهانی ئیسلامی و چۆن گۆمی خوێنیان هەستاندووەو جیاوازیان نەکردووە لە نێوان پیرو گەنج و ژن و منداڵ و تەنانەت بێزمانیشدا، شەحود ئەفەرموێ: (لەو هێرشەدا کە خاچپەرستەکان کردیانەسەر شاری قودس لە شەوی١٤ی یۆلیۆی ساڵی١٠٩٩ی زاییندا و لەرۆژی دوای ئەودا ئەوەندە شەڕەکە توند بوو، سەربازە موسڵمانەکان توانای بەرگریکردنیان لەشارەکە نەما، ئەوە نەبێت رایان کردوو پەنایان برد بۆ مزگەوتی قودس و خۆیان حەشاردا تێیدا، خاچپەرستەکانیش شوێنیان کەوتن و چوونە ناو مزگەوتەکەو لەناو ئەو مزگەوتەدا قەسابخانەیەکی زۆر ترسناکیان بەرپاکرد، وەك هەندێ لە مێژوونووسەکانیان ئەڵێ:(كان جنودنا يخوضون حتى سيقانهم في دماء المسلمين )، سەربازەکانمان قاچیان لە خوێنی موسڵمانەکاندا چەقیوە!!

خاچپەرستەکان تاکە موسڵمانێکیش چییە جێیان نەهێڵاو خوێنیان حەڵاڵکردو کوشتیان، ئیتر لە رێگەدا بینیبێتیان یان لەماڵەکاندا یان لە مزگەوتەکاندا، بە بێئەوەی جیاوازی بکەن لە نێوان پیاوو ژن و منداڵدا، پەلاماری هەموو ئەوانەشیان دا کە پەنایان بۆ مزگەوتی ئەقصا برد، کە ژمارەیان زیاتر لە هەفتا هەزار کەس ئەبوون، هەندێ لەوانە پێشەواو زاناو خواناس و دونیانەویستەکانی ناو موسڵمانان بوون، ئیبنولئەسیریش –لە مێژوونووسانی موسڵمانان– ئەم ژمارەیە باسئەکات، هەروەها "ئیبنولعەبەری ماڵتی"ش –لە مەسیحییەکان– هەر باسی ئەکات، کە ئەو بەدەق ئەڵێ:( ولبث الفرنج في البلد أسبوعا يقتلون فيه المسلمين، وقتل بالمسجد

الأقصى ما يزيد على سبعين ألفا )!! ئیتر قەشە فادی باسی کوڵمی راست و چەپ بۆ کێ ئەکات؟!

هەروەها(گیبۆن)نووسەری ناوداری ئینگلیزی(مەسیحی) بۆ پشتڕاستکردنەوەی ئەم زانیاریانە ئەڵێ: (خاچپەرستەکان کە خزمەتکاری خواوەندن ئەو ڕۆژەی کە دەسەڵاتیان پەیداکرد بەسەر قودسدا لە ١٠٩٩ /٧/١٥ زاییندا بیرو ڕایان وابوو کە بۆ ئەوەی ڕێز بۆ خواوەند بنوێنن هاتن حەفتا هەزار موسڵمانیان سەربڕی! هاوکات هیچ جۆرە سۆزو بەزەییەکیشیان نەهاتەوە نە پیرەکان و نە منداڵان و نە ژنان، ئەم قەسابخانەیە سێ شەوو ڕۆژی تەواوی خایاند، مێشکی منداڵانیان ئەکێشا بەدیوارداو ئەیانپژاند، منداڵی شیرەخۆریان لەسەربانەوە هەڵئەدایە خوارەوە و ژن و پیاوەکانیشیان بە ئاگر ئەبرژاندو سکی خەڵکەکەیان هەڵئەدڕی و ئەیانووت: با بزانین ئاڵتوونی نەخواردووە ! ..

پاش ئەمانە ئەو نووسەرە بە سەرسوڕمانێکەوە ئەڵێ:(كيف ساغ لهؤلاء بعد هذا كله أن يضرعوا إلى الله طالبين البركة والغفران)[١٢٧]، نازانم ئەمانە دوای ئەم هەمووە خوێنڕشتنە چۆن ڕێگەیان بە خۆیان ئەدا کە لە خوا بپاڕێنەوە و داوای لێبووردن و بەرەکەتی لێبکەن؟!

ئەمە پێڕەویکردنێکی پیت بە پیتی ئەوە نیە کە ئینجیل فەرمانی پێکردوون کە ئەڵێ:" لا تظنوا أني جئت لأرسى سلاماً على الأرض، ما جئت لأرسى سلاماً، بل سيفاً"؟! ئیتر قەشە فادی بۆچی موزایەدەمان بەسەرەوە ئەکات و باسی ڕوومەتی چەپ و راست ئەکات؟ کێ ئەخەڵەتێنێت: خۆی یان وەرگێڕەکەی؟ ئێمە یان خوێنەرەکانی؟!

ئەوان تەنانەت بیرمەندو ڕۆژهەڵاتناسەکانیشیان هەڵگری ئەم ڕق و قینەیەن و بەو پاڵنەرە پارەو وزەکانیان خەرجئەکەن، ئەوەتا(ڕوبرت بین) ڕۆژهەڵاتناسی

---

[١٢٧] المفصل في شرح آية لا إكراه في الدين،جمع وإعداد،الباحث في القرآن والسنة،علي بن نايف الشحود(٣٤٠/١).

دیـاری ئـەمریکی لـە پێشـەکی کتێبەکەیـدا کـە نـاوی لێنـاوە (السـیف المقـدس)– شمشێری پیرۆز– زۆر راشکاوانە ئـەڵێ :( ئێمـە فاکتـەری زۆر بـەهێزمان هەیـە بـۆ ئـەوەی توێژینـەوە لـە عەرەبـە موسـڵمانەکان بکـەین، و لـە شـێوازی ژیـان و هەڵسـوکەوتیان شـارەزا ببین، چـونکە ئـەم موسـڵمانانە رۆژێـك بـوو کـە هـەموو دونیایـان خسـتەژێر رکێفـی خۆیـان، و دووریـش نییـە جارێکی تـریش ئـەو کـارە بکەنەوە، ئەو ئاگرەی کە موحەممەد هەڵیگیرسـاندووە تـا ئێسـتاش هـەر بڵێسـەی لێدێت، هەزار هۆ هەیە بۆ ئەوەی ئێمە لەو قەناعەتەدا بین کـە ئـەو ئـاگرە هـەرگیز ناکوژێتـەوە)![128]، (کایتـانی)ش کـە میرێکـی دەوڵەمەنـدی ئیتـالی بـوو، هـەموو سەروەت و سامانەکەی خەرجکرد تا ئەو سنوورەی مایـەپووچ"ئیفلاسـی"ی خـۆی راگەیانـد، بـۆ ئـەوەی توێژینەوەیـەکی وردی بـۆ بکـەن لەسـەر هـەموو جیهـانی ئیسلامی–مێژووی، ئێستای، سنوورە جوگرافیەکەی، خاڵە بـەهێزەکانی ئیسـلام و موسڵمانان...هتد–ئەوەبوو بەو خەرجیانە کـە سـێ کـاروانی گـەورەی یەکلـەدوای یەکی رێکخست بۆ دونیای موسڵمانان و نۆ بەرگی گەورە کتـێبی بـۆ بەرهـەمهات و ناوینا(حولیات الإسلام)، ئەم میرە لە سەرەتای ئـەو کتێبـەدا ئـەزانن چـی ئـەڵێ و چۆن باس لەو فاکتەرانە ئەکات کە پاڵی بەمـەوە نـاوە ئـەو کـارە بکـات؟ کایتـانی ئەڵێ:( إنه إنما یرید بهذا العمل أن یفهم سـرَّ المصـیبة الإسـلامیة الـتي انتزعـت مـن الدین المسیحي ملایین مـن الأتبـاع في شـتی أنحـاء الأرض، مـا یزالـون حتـی الیـوم یؤمنون برسالة محمد، ویدینون به نبیًّا ورسولاً)!![129] کەواتـە لـە راسـتیدا ئەمەیـە وادەکات فادی جگـە لـە فـادی کـە کەسـانی رەگەزپەرسـتن چـاویان بـە ئیسـلامدا هەڵنەیەت و بەبوختان و ناهەقی بکەونە رەخنەگرتن لە ئیسلام و لە قورئان بـەڵکو بەری ئەم هەڵکشانە ئیسلامیە بگرن!

[128] رسالة في الطریق إلی ثقافتنا لمحمود محمد شاکر،ص٨٦.

[129] مذاهب فکریة معاصرة لمحمد قطب،ص ٥٩٧ .

٤–ئێستای خێڵی قەشە فادی: لەئێستاو ئەم رۆژگارەدا کام کەس یان کام دەوڵەتی مەسیحی پێڕەو لەوە ئەکەن کە قەشە فادی بە خەڵکی ئەفرۆشێت؟ ئەگەر زللەیەکی لێبدەی ئەو روومەتەکەی ترت بداتێ تا زللەیەکیش بدەی لەوی تریان؟ محمد عەلی شەحود لە کتێبی" موسوعة الخطب والدروس"دا بەدرێژی باسی تاوانەکانی دەوڵەتە مەسیحیەکان ئەکات بەرانبەر موسڵمان و ئەڵێ:

(..أيها المسلمون، وأما جرائمهم في دماء المسلمين فحدث ولا حرج، فملفاتهم سوداء من دماء المسلمين، ودم المسلم دم وحشي في قاموس أمريكا، ليس له حرمة ألبتة، بل هو في نظر أمريكا أخس من الكلاب النجسة، وقد ثبت أنهم يقولون عن الرسول أنه رجل شاذ، وتزوج عدة مرات للوصول إلى السلطة، ومثل هذه الادعاءات الملعونة، تدرس لديهم في مناهجهم الدراسية، وقد أنتجوا أكثر من ٧٠٠ فيلم يسيء للإسلام والمسلمين. ويرى الرئيس السابق نكسون أن ليس هناك من شعب ـ حتى ولا الصين الشعبية ـ له صورة سلبية في ضمير الأمريكيين، بالقدر الذي للعالم الإسلامي.

أيها المسلمون، وهذه بعض جرائم أمريكا الديمقراطية، في قتلهم الوحشي الشنيع ضد المسلمين، لقد قُتل أكثر من مليون طفل عراقي، بسبب قصف الطائرات الأمريكية للعراق، وحصارها الظالم له خلال أكثر من عشر سنوات، وأصيب الآلاف من الأطفال الرضع في العراق بالعمى لقلة الأنسولين، وهبط متوسط عمر العراقيين ٢٠ سنة للرجال، و١١ سنة للنساء، بسبب الحصار والقصف الأمريكي، وأكثر من نصف مليون حالة وفاة بالقتل الإشعاعي. وقد رفع أحد المحامين النصارى الأمريكيين دعوى على الرئيس الأمريكي جورج بوش ـ الأب ـ يطالب فيها بمحاكمته على أنه مجرم حرب، بسبب ما أحدثه في العراق من قتل وتدمير.

وارتكب الأمريكان المجازر البشعة، في حرب الخليج الثانية ضد العراق، فقد استخدمت أمريكا متفجرات الضغط الحراري، وهو سلاح زنته ١٥٠٠ رطل. وكان مقدار ما ألقي على العراق من اليورانيوم المنضب أربعين طنًا، وألقي من القنابل

الحارقة ما بين ٦٠ إلى٨٠ ألف قنبلة، قتل بسببها ٢٨ ألف عراقي. وقتل الآلاف من الشيوخ والنساء والأطفال الفلسطينيين بالسلاح الأمريكي. وقتل الآلاف من اللبنانيين واللاجئين الفلسطينيين في المجازر التي قامت بها إسرائيل بحماية ومباركة أمريكية.

وما بين تاريخ ١٤١٢و١٤١٤هـ قتل الجيش الأمريكي الآلاف من الصوماليين أثناء غزوهم للصومال. وفي عام ١٤١٩هـ شنت أمريكا هجومًا عنيفًا بصواريخ كروز على السودان وأفغانستان، وقصفوا خلاله معمل الشفاء للدواء في السودان، وقتلوا أكثر من مائتين، وحتى هذه الساعة، لا يوجد سبب واحد ومعلن للفجوة بين أمريكا والسودان غير الإسلام، بصفته كيانًا عربيًا أفريقيًا إسلاميًا موحدًا، ولأجل ذلك كثفت أمريكا جهودها، وسعت للالتقاء بجميع المعارضين "الميرغني والصادق المهدي وقارنق" وألّبت جميع جيرانها ضدها، ودعمت حركة التمرد، وبعض الدول المحيطة بها.

والعجيب أن أمريكا تسعى بكل طاقاتها، للضغط على العرب من أجل السلام مع إسرائيل، وفي نفس الوقت تقف بكل إمكانياتها في عرقلة السلام في السودان، من خلال توظيف النصارى في الجنوب، والذي تصل نسبتهم إلى ٥٪ من السكان فقط، ويأتي القرار الأمريكي المشؤوم يدين السودان، ثم تأتي الصواريخ الأمريكية لتقصف مصنع الشفاء للأدوية، وهي لا تملك أدلة تستدل بها، وهل يقبل المنطق أن هذا المصنع يهدد الأمن الأمريكي؟ إن الهدف الحقيقي لضرب السودان هو العنجهية الأمريكية، وإضعاف السودان اقتصاديًا والضغط عليها سياسيًا.

وقتل في أفغانستان خلال ثلاثة أشهر فقط، نتيجة القصف الأمريكي ما لا يقل عن ٥٠.٠٠٠ أفغاني، جُلّهم إن لم يكونوا كلهم من المدنيين. وتسبب حصارهم لأفغانستان في قتل أكثر من ١٥.٠٠٠ طفل أفغاني.

وحصارها علـى ليبيـا، إذ أدى هـذا الحصـار الغاشـم إلى كـوارث كـبرى، وفواجـع عظمى، إذ بعد خمسة أشهر فقط من بدايـة الحظـر الجـوي والحصـار، بلغـت خسـائر ليبيا ما يزيد على ٢ مليار دولار.

وقتل عسكريو أندونيسيا أكثر من مليون شخص بدعم أمريكي.

وأما معاملتهم للأسرى فأسوء معاملة، فالإنسانية معدومة لديهم، والقيم الأخلاقية ليس لهم فيها ناقة ولا جمل، وقد تمثلت في أمريكا أعظم أنواع الإرهاب المنظم، وبلغ فيهم الاضطهاد والإرهاب مبلغًا لم يشهد مثله في عالمنا الحاضر، بل وعلى مر التاريخ المتقدم، لقد خالفوا الأديان والشرائع بل والقوانين الوضعية.

لقد حرص الأمريكيون على إظهار التشفي من هـؤلاء الأسـرى في "غونتنـاموا" في كل مناسبة، حتى بلغ بهم الحال أن يتركوا هؤلاء الأسرى في مقاعدهم، لأكثر من يوم ونصف بلا أي حراك، ومن دون تمكينهم من استخدام دورات المياه، ثم يعلنون ذلـك لمجرد التشفي والتهكم والسخرية من هؤلاء الأسرى.

كما توضح الصور، أن الأمريكيين حرصـوا علـى تعطيـل كافـة الحـواس: السـمع والبصر بل وحتى الفم والأنف، وضع عليها أغطيـة كثيفـة، والمتأمـل للصـور يشـعر بأن الأسرى يفتقدون حتى الإحساس بالمكـان، وربمـا الزمـان، ومـن الواضـح خـلال تصريحات المسؤولين الأمريكيين، أنهم لن يـترددوا في اسـتخدام أي وسـيلة يـتم مـن خلالها إهانة وتحطيم هؤلاء الأسرى. فهم بذلك خالفوا كل الأديان والشرائع، وخـالفوا ـ أيضًا ـ القوانين الوهمية" فإن من الاتفاقات القانونية أن إجبـار أسـير الحـرب علـى الإدلاء باعترافاته هو عمـل إرهـابي. هـذه هـي أمريكـا لمـن لا يعرفهـا وهـذه بعـض إنجازاتها.)[١٣٠].

ئەمانە هەموو لە لایەك، لە لایەکی ترەوە بـا قسـەیەکیش بـۆ دز بکـەین، ئـەرێ وەرگێڕەکەی لای خۆمان لەوەدا هەقی نیە کە ئەڵێ:(..ئەگـەر بـەو شـێوەیەی کـە مەسـیح ئـەڵێت لەگـەڵ سـتەمکاردا هەڵسـوکەوت بکـەین، ئـەوە خەڵکـە کاڵفـام و

[١٣٠] حەزمانکرد وەك دەقێکی مێژوویی لەم کتێبەدا تۆماری بکەین و بیگوازینەوە بۆ خوێنەران.

سەتحی و سەربۆش و بەدئیحساسەکان و خەڵکە گۆشت و خوێن پەرست و خەڵکە خێڵەکی و بنەماڵەچییەکان هیچ وانەیەك لەو رەوشتەبەرزانە وەرناگرن بەڵکو پتر لە بەدکاریەکانیاندا رۆدەچن و بەردەوام دەبن هەروەکو وتراوە—من امن العقاب اساء الادب—ئەو کەسەی لەوە دڵنیابێت سزانادرێت(بێ ئەدەبی دەنوێنێت) واتە کوڕی سەرجادەو کوڕی دەرچووی بەندیگەکان و شەقاوەو چەقۆکێشەکان گەر لە سزای توند نەترسن لە خراپەکاریدا بەردەوام دەبن).

ئەریّ باشە دین ئەگەر ئەمە ئیشی بێت و ببێتە تلیاك بۆ بەنجکردنی میللەتان و گیانی موقاوەمەتیان تێدا بکوژێت و فێری ئەوەیان بکات کە: "سمعتم أنه قيل عين بعين وسن بسن، وأما أنا فأقول لكم: لا تقاوموا الشر! بل مَن لطمك على خدك الأيمن فحوِّل له الآخر أيضاً"[١٣١] ئەبێ ئەو دینە چ رۆڵێك بگێرێت لە رێکخستنی ژیاندا، دین چۆن ئەبێت ستەمکار قەڵەو بکات و ستەملێکراو بکاتە یاری دەستیان؟

بەڵام یەك شت هەیە بە پێویستی ئەزانم بۆ قەشە فادی و خوێنەرانی بەڕێزی روونبکەمەوە، ئەویش ئەوەیە کە ئەبێ بە شێوەیەکی واقیعی سەیری ژیان بکەین، ژیان کەسی چاکی تێدایەو مامۆستا هەژار واتەنی کەسی واش هەیە لە چاك چاکترەو هەشە لە شەیتان خراپترە، ژیان شەڕی تێدایەو ئاشتیشی تێدایە.. بۆیە نابێت لەکاتی رێنمایی دابەزاندندا میسالیانە رێنمایی دابەزێنیت و تەنیا یەك باری ژیان لە پێش چاو بگری، ئەمەیە جیاوازی راستەقینەی ئیسلام و ئایین و بیروڕاکانی تر، ئیسلام ژیان وەك مەنزومەیەك سەیرئەکات ئەمیان پەیوەستئەکات بەویانەوەو ئەمیان ئەویتریان تەواوئەکات، هەندێك هەیە بە ڕاستیانە یان بە مەبەستەوە ئەڵێن: کاکە! دین ئیشی ئەوە نییە قسە لە مەسەلە سیاسیو ئابورییەکاندا بکاتو باس لە ئیدارەدانی دەوڵەتو یاساو حوکم بکات و رێنمایی دابەزێت بۆ خەڵکی چۆن بژین، چونکە ئەوانە کاری سیاسەتمەدارانەو ئەبێت دین

[١٣١] ئینجیلی متی (٥ : ٣٨ – ٣٩)

دەخالـەتی تێـدا نـەکاتو خـۆی نەپێچـێت بـە سیاسـەتو دەوڵەتـەوە، چـونکە سیاسەت (مودەننەسە)و دین (موقەدەسە)!! دین کاری ئەوەیە کە ویژدانەکان بە خەبـەر بهێنـیّو دڵـەکان پـڕ لـە ئومێدو دڵنیـایی بکـاتو کۆمـەڵێك بـەهای ڕۆحـی بسەلمێنێتو لە پێش چاوی مرۆڤدا دایان بنێتو پاشان بە چیرۆكو باسـی ڕۆحـی خەڵکەکەی بۆ کەمەندکێش بکاتو پەیوەنـدی عەبـدو خـوا ڕێك بخـاتو بـەس!لـە وەڵامدا ئەڵێین:

ئەمە ئەگەر بەرامبەر دینێکی تری جگە لە ئیسلام بووتریێت جێگـەی خۆیـەتی، بـەڵام بەرامبـەر ئیسـلام ئـەوە بووترێـت ئـەوە زۆر ناڕەوایـە بـەدەیان بەڵگـەی (شەرعی)و (واقیعی).. چونکە لەئیسلامدا نە مرۆڤ کراوەتە دوو لەتەوە، لەتێکی بۆ دینو لەتێکی بـۆ دونیـا بجوڵێـت، نـە دونیـاش کراوەتـە دوولەتـەوە، لـەتێکی هـی (قەیسەر) بێت لەتەکەی تری هی (خـواو دیـن) بێـت.. بـەڵکو لەئیسـلامدا دیـن بـۆ خۆشـکردنی دونیـاو سـۆگەرکردنی ئـاخیرەت هـاتووە، بـۆ پـەروەردەکردنی ڕۆحو عەقڵو دونیای مرۆڤ هاتووە، ئیسلام وەك چۆن مەنزومەیـەکی ڕۆحـیو ئـەخلاقیو عیبادی لە خۆگرتووە، واش مەنزومەیەکی فیکریو سیاسـیو ئـابوریو زانستیشـی لەخۆگرتووە... کێش بڕوا ناکات با بڕوات دیراسەیەکی ئیسلام بکاتو پاشان بێتەوە سەرلەنوێ موناقەشەی ئەم مەسەلانە بکات.

زیاد لە ئەمانـەش ئیسـلام دەورەیـەکی تـەتبیقی بـە درێـژای (چـواردە) سـەدە بەخۆیەوە بینیوە کە لە هەندێك دەورانی دەسـەڵاتیدا "مرۆڤایـەتی" گەیشـتووەتە چڵەپۆپەی ڕەفاهو خۆشگوزەرانی و دەیان و سەدان بەهای بەرزی داوە بـە خـەڵك لە هەموو کایەکانی ژیاندا وەك: سەماحەت و پێکەوە ژیان و گەشکردنەوەی ڕۆح و یەکسانی نێوان مرۆڤەکان و پەیام بۆ جەنگ و ئاشتی و کەرەسە بـۆ دروسـتکردنی شارستانییەتێکی ڕۆحی و ماددی و عەقڵی پێکـەوە...پێغەمبـەر(صـلى الله عليـە و الە وسلم)ئەفەرموێ: ( إنما بعثت لأتمم مكارم الأخـلاق )،رواه أحمـد.یـانی مـن بـۆ ئەوە هاتووم کە سیستمی ڕەوشتەکان تێروتـەواو بکـەم، ئەمـەی قەشـە فـادی لـە

ئینجیلەوە ئەیگوازێتەوە، رەوشتێکی جوانە لە سنوورێکی دیاریکراودا، بۆ نمونە منالێ لەگەڵ باوك و دایکیدا، هاورِێی گیانی بەگیانی لەگەڵ یەکتردا...بەڵام ئەم رەوشتە نوقسانی هەیەو ئەبێ تێروتەواو بکرێت بۆ نمونە: ئەو شتە لە کەسی نامەرد قەبوڵنەکرێ، لە ستەمکار قەبوڵنەکرێ.. وەهەروەها.

قورئان ئەفەرموێ: :( فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ (١٩٤)،هەروەها ئەفەرموێ: (مَا لَكُمْ لَا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ وَالْوِلْدَانِ الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا وَاجْعَلْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ وَلِيًّا وَاجْعَلْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ نَصِيرًا)ئەوە بۆچی لە پێناوی خوا و هەروەها لە پێناوی ئەو خەڵکە مەزڵومەدا ناجەنگن کە تێکەڵەیەکن لە ژن و لە پیاو و گیروگازیانە بەدەست ستەمکارانەوە.

پێغەمبەریش(صلى الله عليه و اله وسلم)ئەفەرموێ:(من رأى منكم منكراً فليغيره بيده ، فإن لم يستطع فبلسانه ، فإن لم يستطع فبقلبه ، وذلك أضعف الإيمان). رواه مسلم . هەرکەس لە ئێوە ئەگەر خراپەیەکی بینی با بەدەست بیگۆرِێت،ئەگەر نەیتوانی بابە زمان بیگۆرِشێت، ئەگەر نەیتوانی بابەدڵ بیگۆرِێت و ئەوەش لاوازترین پلەی ئیمانە.

هەروەها ئەفەرموێ:(انْصُرْ أَخَاكَ ظَالِمًا أَوْ مَظْلُومًا ، قَالُوا : يَا رَسُولَ اللَّهِ ، هَذَا يَنْصُرُهُ مَظْلُومًا ، فَكَيْفَ يَنْصُرُهُ ظَالِمًا ؟ قَالَ : تَمْنَعُهُ مِنَ الظُّلْمِ).براکەت ستەمکاربێت یان ستەملێکراو پشتی بگرە، وتیان: ئەگەر ستەملێکراو بوو پشتگرتنی باشە ئەی ئەگەر ستەمکاربوو چۆن پشتی بگرین؟ فەرمووی: دەستی بگرن و مەیەڵن ستەم لە خەڵکی بکات.

هەروەها ئەفەرموێ:(مَنْ أُذِلَّ عِنْدَهُ مُؤْمِنٌ فَلَمْ يَنْصُرْهُ وَهُوَ يَقْدِرُ عَلَى أَنْ يَنْصُرَهُ أَذَلَّهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى رُءُوسِ الْخَلائِقِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ). رَوَاهُ أَحْمَدُ .هەرکەسێك بەدیاری چاوی ئەمەوە موسڵمانێکیان زەلیل کردو ئەم بەرگری لێنەکردو

ئەشیتوانی بەرگری لێبکات، ئەوە خوا لە رۆژی قیامەتدا ئەو بەدیاری چاوی هەموو خولقاوەکانەوە زەلیل ئەکات!

ئیمامی عومەر(رەزای خوای لێبێت) ئەفەرموێ: (ولست أدع أحداً يظلم أحداً حتى أضع خدّه على الأرض، ثم أضع قدمي على الخدّ الآخر. ثم إني أضع خدّي على الأرض لأهل العفاف وأهل الكفاف)..نایەڵم کەس ستەم لە کەسی تر بکات و ئەگەر کردی رووەتێکی ئەخەمە سەر زەوی و قاچم ئەخەمە سەر رووەتەکەی تری، هاوزەمان لەگەڵ ئەمەشدا رووەتی خۆشم ئەخەمە سەر زەوی بۆ ئەو کەسانەی کە خەڵکێکی پاکن و بێزەرەرن.

شاعیرەکەش جوان ئەڵێ:

انك ان اكرمت الكريم ملكته

وان اكرمت اللئيم تمردا

یانی : تۆ ئەگەر رێز لە کەسی بەرێز بگری ئەوە ئەیکەیتەماڵی خۆت، بەلام ئەگەر رێز لە نامەرد بگری ئەوەندەیتر هارو یاخی ئەبێت.

لەبەر ئەمانەیە ئەڵێین ئەو رێنماییە لەگەڵ ئەوەدا لە سنورێکدا بەهایەکی جوانە بەڵام تێرو تەواو نیەو نوقسانەو راکێشانیشی بۆ ئەوەی بیدەیت بەسەر هەموو ژیاندا هەڵەیەو هەڵەیەکی کوشندەشەو ژیان پڕئەکات لە نادادی و نامەردی.

# بڕگەی پێنجەم

## نمونەیەك لە هەڵە لاهووتییەكان وەك قەشە فادی ئەیڵێت.

لەم بەشەدا قەشە فادی (٢٩)ڕەخنە ئەگرێ لە قورئان گوایە نەیزانیوە باسی بابەتە رۆحیەكان بكات، بۆنمونە ئەڵێ قورئان لەوە تێنەگەیشتووە كە چۆن خواو عیساو مەریەم هەرسێكیان هەر خوان و یەك شتن! فادی ئەڵێ:(..هیچ مەسیحییەك نەیوتووە كە مەریەم خواوەندە(لەگەڵ هەموو رێزو تەقدیرێكدا بۆ مەریەم)و مەسیحیەكانیش سێ خواوەند ناپەرستن، بەڵكو یەك خواوەند لە(وحدانیه جامعه) تاك و تەنیاییەكی كۆكراوەدا ئەپەرستن كە باوك و كوڕو گیانی پیرۆزە..[١٣٢]). جا سەیر لەوەدایە كە ئەڵێ (قورئان لەگەڵ پەڕاوی پیرۆز(كتاب مقدس)[١٣٣]دا لەسەر ئەوە رێكەوتوون كە كردارو راناوی بگۆ لە رەوت و صیاغی كۆدا بۆ خواوەند ئەگەڕێتەوە چونكە نە لە پەڕاوی پیرۆزداو نە لە قورئاندا گوتەی(هیچ مەخلوقێكی قسەكەر نیە، هەركێیەك بێت ئەو مەخلوقە كاتێك بە، كە دەربارەی خۆی بەشێوەی كۆ، قسەی كردبێت)، ئەمەش –واتە قسەكردن بەكۆ–، بەڵگەیە لەسەر یەكێتی ناوەڕۆك و جەوهەر لەگەڵ فرەیی(بنچینەكان: الاصول: الاقانیم)دا لە خودی خواوەندی باڵادا.[١٣٤]جا نمونە بە ئایەتەكانی (وَإِنْ كُنْتُمْ فِي رَيْبٍ مِمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِنْ مِثْلِهِ)[١٣٥]( إِنَّ وَلِيِّيَ اللَّهُ الَّذِي نَزَّلَ الْكِتَابَ وَهُوَ يَتَوَلَّى الصَّالِحِينَ)، جا قەشە فادی بە حسابی خۆی مادامێك خوای گەورە لە ئایەتی یەكەمدا بەكۆ قسەئەكات و لەدووەمدا بە تاك قسەئەكات كەواتە خوا كۆكراوەیەكە

---

١٣٢ ل:١٠٠.

١٣٣ ئێمە هەڵەكانی وەرگێڕمان راست نەكردووەتەوەو وەك خۆی نووسیومانەتەوە،ئەگەر پێی بزانێت.

١٣٤ ل:١٠٠.

١٣٥ هەرچەندە ئەو ئایەتەكەشی بە هەڵە نووسیوە.

لە عیساو مەریەم و خۆی! !و بە هەرسێکیانەوە خواوەند پێکئەهێنن و ئەمە ئاماژەیەکی قورئانە بۆ سێ ئەقنومەکە! !

بۆ وەڵامی ئەم سەرگەردانیە بە پێویستی ئەزانین کە وەڵامێکی رۆشن و تەواو بنووسین:

١–ئەوە وانیە کە لە قورئاندا (هیچ مەخلوقێکی قسەکەر نیە، هەرکێیەك بێت ئەو مەخلوقە کاتێك، کە دەربارەی خۆی بەشێوەی کۆ، قسەی کردبێت)، چونکە لە راستیدا قورئان ئایەتی زۆری لەو شێوازە تێدایە کە یەك کەسەو بە کۆ قسەئەکات و ئاماژەش نیە بۆ ئەوەی کە لەگەڵ خەڵکی تردا لە یەك خوددا کۆبووبێتەوە: ئەوەتا قورئان لەسەر زمانی داود پێغەمبەر(سەلامی خوای لێبێت)ئەڵێ: (وَوَرِثَ سُلَيْمَانُ دَاوُودَ وَقَالَ يَا أَيُّهَا النَّاسُ عُلِّمْنَا مَنْطِقَ الطَّيْرِ وَأُوتِينَا مِنْ كُلِّ شَيْءٍ).فیرعەون ئەڵێ:( سَنُقَتِّلُ أَبْنَاءَهُمْ وَ نَسْتَحْيِي نِسَاءَهُمْ وَإِنَّا فَوْقَهُمْ قَاهِرُونَ).سولەیمانیش(سەلامی خوای لێبێت) ئەڵێ:(سَنَنْظُرُ أَصَدَقْتَ أَمْ كُنْتَ مِنَ الْكَاذِبِينَ).. ئیتر نازانم کتێبە پیرۆزەکەی ئەو ئایەتی لەو شێوەیەی تێدایە یان نا، ئەوە خۆی و ویژدانی خۆی، بەڵام بنەمایەکی لۆژیکی هەیە ئەڵێ:"استدل بالمعلوم علی المجهول" شتێکی زانراو بکە بەبەڵگەو بۆ شتێکی نەزانراو، یانی شتێك کە زانیاریت لەسەری هەیە بیکە بە پێوەر بۆ ئەو شتانەی تر کە زانیاریت لەسەریان نیە، واتە: کەسێك کە لە شتێکدا قسەئەکات تۆ نازانی راست ئەڵێ یان درۆئەکات، وەرە هەندێ پرسیاری لێبکە لەو شتانەی کە خۆت وەڵامەکانیان ئەزانی، جا ئەگەر نەزانانەو لە خۆیەوە وەڵامی ئەدایتەوەو ئەوە بەڵگەیە کە لەوانی تریشدا هەر لە خۆیەوەو نەزانانە قسەی تێدا کردووە!

٢–ئەم عەقیدە ئاڵۆزەی مەسیحییەت کە بریتییە لە بوونی سێ خوا لە یەك خوادا، بووەتە بارێکی زۆر قورس بەسەر شانی مەسیحییەتەوەو مایەی لەرزۆکبوونی ئایینی مەسیحییەت لەدڵی ئەندامەکانیانداو زاناو خوێندەوارە بەویژدانەکانیان دان بەم راستییەدا ئەنێن و لەبەرانبەردا سەرسوڕمان و ئیعجابی

خۆشیان بۆ روونی و سادەیی ئایەتەکانی قورئان دەرئەبڕن کە چۆن توانیویەتی عەقیدەی یەکخواپەرستی زۆر بە ئاسانی و سادەیی رۆشنبکاتەوە، گۆستاڤ لۆبۆن[١٣٦] لە ژێر ناونیشانی (فلسفة القرآن وانتشاره في العالم)دا ئەڵێت:

"ئەگەر قورئان بگێڕینەوە بۆ عەقیدە سەرەکییەکانی: هەڵئەگرێ ئیسلام بە وێنەیەکی نەصرانیەتی بزانی، لەگەڵ ئەوەدا کە ئیسلام لە زۆرێك لە بنەماکانیدا جیاوازە لە نەصرانیەت، بەتایبەتی لە یەکخواپەرستی رەهادا کە بریتییە لە بناغە بنەڕەتییەکەی، هۆکەشی ئەوەیە کە ئەو خوا تاکو تەنیایەی کە ئیسلام خەڵك بۆ لای ئەو بانگ ئەکات بە دەسەڵاتە بەسەر هەموو شتێکداو فریشتەو پیاوە پیرۆزەکانو ئەو شتانەی تر کە پێویستە بە پیرۆز رابگیرێن (وەك لە نەصرانیەتدا هەیە) چواردەوری ئەو خوایەیان نەتەنیوە! لە راستییدا تەنیا ئیسلام مافی ئەوەی هەیە کە بەوەدا بنازێ کە یەکەمین ئاینێکە یەکخواپەرستی هێناوەتە ناو جیهانەوە.

"لۆبۆن" ئاماژە بۆ ئاسانی (رێنماییەکانی) ئیسلام ئەکات کە ئەوپەڕی سانایی لە یەکخواپەرستییەکی پوختدا ئەبینێ، کە نهێنی هێزی ئیسلام لەو ئاسانییەدایە و ئەوەیە وائەکات لە هەموو کەسێك زوو لە ئیسلام تێبگات، بەدڵنیاییەوە ئایینی

---

[١٣٦] لۆبۆن رۆژهەڵاتناسێکی خوێندەوارو بەویژدانی فەرەنسی ناودارە، راستە کەسێکی ماتریالیستە بەڵام بەویژدان و بابەتیانە ئەنووسێت بەتایبەت بەرانبەر ئیسلام و شارستانێتی ئیسلامی، سەرەتای ئەو کتێبەی بەم رستەیە کردووەتەوە کە ئەڵێ: " لم يعرف التاريخ فاتحاً اعدل ولا أرحم من العرب المسلمين "، هەر لەو کتێبەدا ئەڵێ:"إن حضارة العرب المسلمين قد أدخلت الأمم الأوربية الوحشية في عالم الإنسانية، فلقد كان العرب أساتذتنا ... وإن جامعات الغرب لم تعرف لها مورداً علمياً سوى مؤلفات العرب، فهم الذين مدّنوا أوربة مادة وعقلاً وأخلاقاً، والتاريخ لا يعرف أمة أنتجت ما أنتجوه ... إن أوربة مَدينة للعرب بحضارتها ... والحق إن أتباع محمد كانوا يذلّوننا بأفضلية حضارتهم السابقة، وإننا لم نتحرر من عقدتنا إلا بالأمس! وإن العرب هم أول من علّم العالم كيف تتفق حرية الفكر مع استقامة الدين ... فهم الذين علّموا الشعوب النصرانية وإن شئت فقل حاولوا أن يعلموها التسامح الذي هو أثمن صفات الإنسان ... ولقد كانت أخلاق المسلمين في أدوار الإسلام الأولى أرقى كثيراً من أخلاق أمم الأرض قاطبة ...(ص:٤٢٠،٤٦).

ئیسلام هیچ ناڕوونیی و گرێوگۆتاڵێکی تێدانییە، کە لە ڕاستییدا لە ئایینەکانی تـردا ئەو تەناقوزات و ناڕوونیانە ئەبینین و سروشتی ساغیش پێی قەبووڵناکرێت.

هەروەها ئەڵێ: ( هیچ شتێك ئەوەندەی پایەکانی ئیسلام ڕوون نین و دووربن لـە ئاڵۆزی، کە باس لە بوونی تاکە خوایەك ئەکات و هـەموو مرۆڤـەکان لەبـەردەم ئـەو تاکە خودایەدا یەکسان ئەکات بە یەکتری و پێنج شەش(١٣٧) شت فەرز ئەکات کە هەرکەس کاریان پێبکات ئەچێتە بەهەشت و هەرکەسیش پشتیان تێبکـات ئەچـێتە ناو ئاگر، سەیرکە! تۆ کە لەگـەڵ هـەر موسـڵمانێکدا کۆئەبیتـەوە، ئـەو موسـڵمانە لەهەر چین و توێژێك بێت، ئەبینی چاك ئاگای لەو شتانە هەیە کە پێویستە ئیمـانی پێیـان هـەبێت و لەچـەند خولەکێکـدا بـە ئاسـانی هـەموو پایـەکانی ئیسـلامت بـۆ باسئەکات بەچـەند رسـتەیەك! ئـەم حاڵەتـەش بـە تـەواوەتی پێچـەوانەیە لەگـەڵ خەڵکانێکی نەصرانیدا کە(لێی بپرسی)نازانێ باسی (تثليـث)و (اسـتحالة)[١٣٨] و ئـەو شتانەت بۆ بکات کە پڕن لەناڕوونی مەگەر ئـەو کەسـە زانایـەکی لاهـوتی بێـت کـە خەریکی وردەکاریەکانی جەدەل و موناقەشەن بە بەردەوامی.

ئەوەی کە زۆر بە ڕوونی یارمەتی ئیسلامی داوە بۆ بڵاوبوونەوەی بەدونیادا ئەو فەرمانانەیـە کـە بـاس لـە دادپـەروەری و چـاکەکردن ئـەکات، بـەهۆی ئـەم

---

[١٣٧] دەقە عەرەبییەکە ئەڵێت: (وببضعة فروض) کە (بضع) لە (٣ تا ٩) ئـەکات و ئێمـە لـە نێـوان شـەش ئەسڵی دین و پێنج فەرعی دیندا، (پێنج شەش)مان بـۆ (بضع)ەکـە دانـا.. (بضـع)ئەگـەر پـیتی(ب)ژێـری هەبێت یانی(٣تا ٩)، ئەگەر سەری هەبێت یانی پارچەیەك لەو شتە، ئەگەر بۆری هەبێت یانی لـەزەتگاو بەو شێوەیە مانای(فاطمة بضعة مني)و(و في بضع احدكم صدقة)و (الايمان بضع و سبعون شعبة) مانائەکرێن.

[١٣٨] (تثليث) واتە کۆبوونەوەی خواوەند لە سێ کەسدا (خوا) و (عیسا) و (مەریـەم)، کـە کـەس نازانـێ چۆن؟ عیساو مەریەم ئەگەر خوابن چۆن ئەبێ بمرن؟ چـۆن ئـەبێ نـان و ئـاوو ئـەو شـتانە بخـۆن کەلـە پاشاندا ئەبنە پاشەڕۆ!!؟ یان ئایا خوا چ پێویستییەکی بە کوڕ هەیـە؟!! "اسـتحاله"ش بریتییـە لـە توانەوەو حەلبوونی خوا لە عیسادا یـان لـە مەریەمـدا(سـبحان اللـە عمـا یشـرکون)، کـە پـڕە لـە شـتی ناڕوون و نامەنتیقی و خوێنەوارو بیرمەندەکانی خۆیانی ماندوو بێزارکردووەو هەنـدێکیان هـەر گاڵتـەیان بەو بیروڕایانە دێت.

تایبەتمەندییانەوە ئەتوانین تەفسیری ئەو هەمووە پەرۆشیەی گەلە نەصرانییەکان بکەین لە وەرگرتنی ئیسلامدا، بۆ نموونە وەك میصرییەکان کە کاتی خۆی لە کاتی دەسەڵاتی قەیصەرەکانی قوستەنتینییەدا هەموو نەصرانی بوون کەچی هەرئەوەندەی بنەماکانی ئیسلامیان ناسی خێرا موسڵمانێتی خۆیان راگەیاند، هەر بە هۆی ئەم تایبەتمەندییەی ئیسلامەوە ئەتوانین تەفسیری ئەوەش بکەین بۆچی هیچ میللەتێکی تر نابنە نەصرانی! دوای ئەوەی کە بە ئاینی ئیسلام رازی ئەبن، ئیتر ئەو میللەتە زاڵو دەسەڵاتدار بێت یان ژێردەستەو بێدەسەڵات بێت.

پێویستە ئەو کەسەی کە ئەیەوێت بڕیار لەسەر سوودی کتێبێکی ئایینی بدات هەر تەنیا سەیری بنەما فەلسەفییە بێهێزەکانی نەکات بەشێوەیەکی گشتی، بەڵکو ئەبێ سەیری مەودای کاریگەری ئەو بیروڕایانە بکات، ئەگەر لەم رووەوە سەیری ئیسلام بکرێت دەرئەکەوێ کە لە هەموو ئایینەکانی تر کاریگەری زیاتری لەسەر خەڵکی بەجێهێڵاوە، ئیسلام لەگەڵ ئەوەشدا لە رووی فەرمانکردن بەدادپەروەریو چاکەکردنو نوێژ کردنەوە.. هتد لە زۆربەی ئایینەکانی تر ئەچێت، کەچی ئەم بەشێوەیەکی زۆر سادەو ئاسان خەڵکی لەو کاروبارانە حاڵیئەکاتو بۆ هەموو کەس قووتئەچێت و زیاد لەمە ئیسلام باشیش ئەزانێت چۆن ئیمانێکی دامەزراوی توندوتۆڵ ئەڕژێنێتە ناو دەروونەکان بەرادەیەك هیچ گومانو گریمانێك لەرزەی تێنەخات![139]

٣-ئەم عەقیدەی سێ خواوەند لەناو یەك خواوەنددا، عەقیدەیەکی داهێنراوەو هەندێ لە قەشەو پیاوە ئایینیەکان پاش مەسیح(سەلامی خوای لێبێت)دایانهێناوەو خزاندوویانەتە ناو مەسیحییەت و مەسیح(سەلامی خوای لێبێت)لێی بەرییە، وەك چۆن هەندێ لە سۆفیەکانی لای ئێمەش عەقیدەی (فەنا فی الله و فەنا فی الشیخ و فەنا فی الرسول)یان داهێنا، کە هەمان تەسلیسی

---

[139] بڕوانە: (حضارة العرب)ی گۆستاڤ لۆبۆن.

نەصرانیەکانە[١٤٠] و خواو پێغەمبەرو ئیسلام لێی بەریین، ئەمەش ئەیلێین مێژوو شایەتە، چونکە ئیجیلی بەرنابا بە ئاشکرا ئەم عەقیدەی تەسلیسە ئەداتەدواوە، ئەم ئینجیلە وەك شێخ محمد رشید رەزا[١٤١] (ڕەحمەتولاّ)ی هیندی[١٤٢] و پاش ئەوانیش یەکێکی وەکو (موحەممەد عەلی قوتب) لێکۆڵینەوەی لەسەرکردووە چەند خاڵێکی تێدایە کە کلێساو قەشەو پاپاکان لێی بێزارنو نایانەوێ دانی پێدابنێن لەوانە:

أ- ئەوە رەتئەکاتەوە کەحەزرەتی عیسا کوڕی خوابێت ـ سبحانەوتعالی ـ. ئەوەتا بە دەق هاتووە "أيها الأعزاء.... ان الله العظيم العجيب قد افتقدنا في هذه

---

[١٤٠] سەیر ئەوەیە هەندێ نووسەری نەصرانی هەوڵی ئەوە ئەدات کە ئەم عەقیدەی تەسلیسە بخزێنێتە ناو ئیسلام و موسڵمانانیشەوە، وەهیب خەلیل ئەڵێ: تەسلیس لە ئیسلامیشدا هەیە! ئەوەتا ئەڵێ:"کە کەسێکی موسڵمان سوێند ئەخوات بەچی سوێند ئەخوات؟ ئەڵێت: سوێند بەخوا سێ جار، باشە بۆ تەنیا یەك جار سوێند ناخوات؟ لەبەر ئەوەیە کە ئەویش مەبەستی "خواو باوك" و "خواو کوڕ"و"خواو گیانی پیرۆز"ە!..هەروەها تەلاقیش لە ئیسلامدا هەر سیانە، ئەزانن ئەمەش بۆچییە؟ چونکە ئێمە بەناوی خواو کوڕەکەی و گیانی پیرۆزەوە زەواج ئەکەین! و ئەمەش لەگەڵ هەندێ نۆژەنکاریدا گوازراوەتەوە بۆ ناو ئیسلام.."... زانایانی ئیسلام وەلاّمی ئەم ورێنەکردنە ئەدەنەوە و ئەڵێن:(ئەوەی گومانی تێدا نیە کە موسڵمانان تەنیا یەك خوا ئەپەرستن و شەریکی بۆ بڕیارنادەن و کاتێکیش کە سوێند ئەخۆن یان تەلاّق ئەخۆن بەهیچ جۆرێك مەبەستیان ئەوە نیەو ئەوە نایەت بەخەیاڵیاندا کە وەهیب خەلیل ئەیلێێت).هەروەها وەك شۆخیکردنێك بەو جۆرە بیرۆکانە عەلیفی نایف شەحود لە زمانی زانایانەوە ئەگوازێتەوەو ئەڵێت:(.. يمكن للنصارى أن يستدلوا أيضاً لصحة معتقد التثليث بكون المخلفين ثلاثة، و عدة المطلقة اليائس ثلاثة أشهر، و يفرض على المتمتع أن يصوم في الحج ثلاثة أيام...و هكذا فكل هذه تصلح دليلاً على التثليث؟! بڕوانە کتێبی:(موسوعة البحوث والمقالات العلمية،جمع وإعداد الباحث في القرآن والسنة،حوالي خمسة آلاف وتسعمائة مقال وبحث ،علي بن نايف الشحود،المصدر: موقع شبكة مشكاة الإسلاميةKhttp://www.almeshkat.net/..

[١٤١] خاوەنی (دار المنار)ە،زانایەکی گەورەی میسریەو قوتابی شێخ موحەممەد عەبدەیەو خاوەنی تەفسیری"المنار"ە کە زیاتر گرنگی بە وەلاّمدانەوەی گومانەکان داوە تێیدا، (بەرەحمەت بێت).

[١٤٢] خاوەنی کتێبی (إظهار الحق)ە، کە لێکۆڵینەوەیەکی وردو زانستیانەی تێدایە لەسەر مەسیحیەتو سەرچاوەکانیان.

الأيام بنبيّه "يسوع المسيح" برحمة عظيمة للتعليم والآيات التي اتخذها الشيطان ذريعة لتضليل كثيرين بدعوى التقوى مبشرين بتعليم شديد الكفر، داعين المسيح ابن الله".

ب–رەتکردنەوەی بیروباوەڕی سێگانەیی (التثليث).... بەدەق هاتووە لە ئینجیلی برنابادا کە ئەڵێ: "... فنرجوك من كل قلبنا ان ترضي بازالة الفتنة التي ثارت بسببك، لان فريقا يقول: انك الله، وآخر يقول: انك ابن الله، ويقول فريق انك نبي... فأجاب يسوع: .. إني أشهد أمام السماء واشهد كل ساكن على الارض اني بريء من كل ماقال الناس عني من اني أعظم من البشر .. لأني بشر مولود من امرأة، عرضة لحكم الله، اعيش كسائر البشر عرضة للشقاء العام".

ج–لە خاچدانی ـ حەزرەتی مەسیح ـ رەتئەکاتەوە، ئەوەتا بەدەق هاتووە "الحق أقول ان صوت يهوذا وشخصه بلغت من الشبه بـ"يسوع" ان اعتقد تلاميذه والمؤمنون به كافة انه "يسوع" كذلك خرج بعضهم من تعاليم "يسوع" معتقدين ان يسوع كان نبيا كاذبا".

د- ئینجیلی برنایا بەدەقو بەسێ شێوە مژدەی هاتنی حەزرەتی موحەممەد (صلى الله عليه واله وسلم) ئەدات بە خەڵکی: جارێك بە ناوی بێ پێچوپەنای خۆی (محمد)و دووجار بەرەمزو لە رێگەی صیفەتەکانییەوە، ئەوەتا ئەڵێ: ".. ولكن سيأتي بعدي "مسيا" المرسل من الله لكل العالم.." لە شوێنێکی تردا ئەڵێ: ".. لكن رسول الله متى جاء يعطيه الله ما هو بمثابة خاتم يده فيحمل خلاصا ورحمة لامم الارض الذين يقبلون تعليمه.. وسيأتي بقوة على الظالمين ويبيد عبادة الاصنام بحيث يخزي الشيطان".[١٤٣]

هـ– ئەیسەلمێنێ (زەبیح) و فیداکە بریتییە لە حەزرەتی ئیسماعیل نەك ئیسحاق.

٤–ئەو سەفسەتەو فەلسەفەلێدانەی قەشە فادیش کە ئەڵێ: مادامێك خوای گەورە لە ئایەتی یەکەمدا بە کۆ قسەئەکات و لە دووەمدا بە تاك قسەئەکات

[١٤٣] هەموو ئەو دەقانە لە کتێبی (نظرات في انجيل برنابا، محمد علي قطب) وەرگیراون.

کەواتە خوا کۆکراوەیەکە لە عیساو مەریەم و خۆی و بە هەرسێکیانەوە خواوەند پێکئەهێنن و ئەمە ئاماژەیەکی قورئانە بۆ سێ ئەقنومەکە!

لە وەڵامی ئەمەدا زانایانی زانستی کەلامی ئیسلامی لە بابەتی" نەفی پێنج کەموماتەکە"یان بە پێی پۆلێنی هەندێکیان"شەش کەموماتە" بەپێی پۆلێنی هەندێکی تر"حەوت کەموماتە"، ئەو زانایانە ئەڵێن: پێنج یان شەش یان حەوت گریمان هەیە بۆ ئەوەی کە خوا ئەگەر تاقانە یان تاك و تەنیا نەبێت–سبحانە وتعالی– ئەبێ یەکێك لەم ریمانە بوونی هەبێت:

١- یان چەند زاتی تری جیاو سەربەخۆی وەك خوا بێت، هەموو خوا بن.

٢–یان چەند زاتی تری جیا هەبێت وەك خوا بەڵام تەواوکەری خوا بن و سەربەخۆ نەبن.

٣- یان چەند زاتی تری وەك خوا هەبن، بەڵام هەندێکیان خوابن و ئەوانی تر خوانەبن. بەم سیانە ئەوترێت"نەفیکردنی چەندێتی جیا: نفی الکم المنفصل".

٤- یان چەند زاتی تری پەیوەست بەخواوە هەبن کە هەریەکەیان خوایەك بن بۆ خۆیان و سیفەتی ئەویان وەرگرتبێت.

٥- یان چەند زاتی تری پەیوەست بەخواوە هەبن هەموو پێکەوە خوابن و پێویستیان بە یەکتری هەبێت.

٦– یان چەند زاتی تری پەیوەست بەخواوە هەبن هەندێکیان سیفەتی خوایەتیان وەرگرتبێت نەك هەموویان، بەم سیانەی تر ئەوترێت"نەفیکردنی چەندێتی پەیوەست : نفی الکم المتصل".

٧- یان چەند زاتی تر هەبن –نەجیا بن لە خواو نە پەیوەست بن بەخواوە– بەڵام وەك خوا کاروکردەوەی ببێت لەناو ئەم گەردوونەدا..[١٤٤]

---

[١٤٤] مجلة المنار،محمد رشيد رضا، (٥٣/٣)،هەروەها بڕوانە،شرح السنوسيە،ص: ٤١،لەوێدا ئەڵێ: "حقيقة الوحدانية عبارة عن نفي التعدد في الذات والصفات والأفعال"، پاشان ئەڵێ:"فوحدانية الذات تنفي الكم المتصل والمنفصل، فالمتصل أن تكون ذاته مركبة من جواهر وأعراض أو أن تكون مركبة. ووحدانية

زانایان بۆ پوچکردنەوەی هەموو ئەو گریمانانە بە گشتی یەك بەڵگە ئەهێننەوە کە بورهانێکی عەقڵیەو لەدوو پێشەکی و ئەنجامێك دروستبووە:

پێشەکی یەکەم:ئەگەر ئەم بوونەوەرە زیاد لە خوایەکی تێدابووایە ئەوە هەرزوو تێکئەچوون و ئەبوو بەناکۆکیان لەسەر بڕیارەکان.

**پێشەکی دووەم:**

بوونەوەر تێکنەچووەو ملیۆنەها ساڵە لە چەرخ و خولدایە بەبێ بشێوی.

ئەنجام: کەواتە تەنیا یەك خوا هەیە لەم بوونەوەرەدا..

بۆ سەلماندنی ئەمەش چەندین نمونە دێننەوە، بۆ نمونە ئەڵێن: ئەگەر دوو خوا یان زیاتر ببوایە کەواتە دوو ئیرادە یان زیاتریش ئەبوو، دوو ئیرادە یان زیاتریش رووبکەنە شتێك (بۆ نمونە مراندنی کەسێك یان هەژارکردنی کەسێك یان گیرۆدەکردن یان رزگارکردنی کەسێك)، ئەوە ئەبێ یان ئیرادەی هەر هەموویان بێنەدی کە ئەوە محاڵە لە عەقڵدا، یان ویستی هەر هەموویان نەیەنەدی ئەوە دەستەوسانی هەموویان ئەگەیەنێت، یان ئیرادەی بەهێزەکەیان دێتەدی و بێهێزەکانیان ئەبەزن و تەسلیم ئەبن بە ویستی ئەو، ئەو کاتە دەرئەکەوێ کە ئەوانەی تر خوا نین و کەسانێکی دەستەوسان و پاشکۆن و هەر ئەوەیان خوایە کە هەرچی ویست بیکات.

جا ئەگەر ئەم پێوەرە بەکاربهێنین بۆ ئەم دایك و کوڕو باوکەی کە قەشە فادی ئەیەوێ بەزۆرو زۆرکاری بیخاتە عەقڵی خەڵکەوە، ئەوە ئەبێ بڵێین: یان هەموویان بەیەکەوە خوان، یان تەواوکەری یەکترین و بێیەکتری هەموخوای کەموکورتن، یان درۆیە یەکێکیان خوایەو ئەوانی تر هەموو بەندەو خولقاوی ئەون،

---

الصفات تنفي الكم المتصل والمنفصل، فالمتصل أن يكون له قدرتان وإرادتان، وتنفي المنفصل بأن يكون لأحد من المخلوقين كصفات الله تعالى، ووحدانية الأفعال تنفي الكم المنفصل فقط بأن يكون غيره يفعل كفعله وهذا محال لأن الله لا شريك له في أفعاله بل هو المنفرد بالإيجاد والإعدام.".بڕوانە:"كتب ورسائل سعيد فودة في ميزان النقد العلمي،عبد الباسط بن يوسف الغريب،ص٢١١.

وەك ئینجیلی بەرنابا ئەڵێ:" أني بشر مولود من امـرأة، عرضـة لحكـم الله، اعـيش كسائر البشر عرضة للشقاء العام"،یان وەك قورئان ئەڵێ:(مَا الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِ الرُّسُلُ وَأُمُّهُ صِدِّيقَةٌ كَانَا يَأْكُلَانِ الطَّعَامَ انْظُرْ كَيْفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ الْآيَاتِ ثُمَّ انْظُرْ أَنَّى يُؤْفَكُونَ).

لەبەر ئەمانەیە كە ئەڵێین: قەشە فادی خۆی فریوو‌داوە لەوەدا كە ئەوە ئەكاتە بەڵگە بۆ ئەوەی بیسەلمێنی كە قورئان پارێزراو نیە چونكە ناڵێ: "عیساو مەریـەم و خوا بوونەتە یەك خواوەند لە(وحدانیە جامعە)–تـاك و تەنیاییـەكی كـۆكراوەدا– كە بریتیە لە باوك و كوڕو گیانی پیرۆز.."، كە مەگەر هەرخۆی بزانێ ئەوە چۆنەو چۆن شتی وا لە عەقڵدا جێی ئەبێتـەوە. چـونكە ئەگـەر خـوان بـۆ ئـەمرن؟ ئەگـەر بەشێكیشن لە خوا چۆن ئەبێ بەشێك لـەخوا بمـرێ؟ ئەگـەر عەبـدی خواشـن ئـیتر خوایەتی یانی چی؟ ئەگەر ئەڵێن: نەخێر نەعیساو نەمەریەم خوان نین–وەك قەشە فادی ئەڵێ: :(..هیچ مەسیحییەك نەیوتووە كە مەریـەم خواوەنـدە(لەگـەڵ هـەموو رێزو تەقدیرێكدا بۆ مەریەم)و مەسیحیەكانیش سێ خواوەند ناپەرستن، بەڵكو یـەك خواوەند لە(وحدانیە جامعە)تـاك و تەنیاییـەكی كـۆكراوەدا ئەپەرسـتن كـە بـاوك و كوڕو گیانی پیرۆزە..[١٤٥])، كەواتە ئەپرسین: عیسا چۆن بووەتە كوڕی خوا، ئەگـەر لە مەریەم بووە، ئەوە عیسای كـوڕی مەریەمـە، و ئەگـەر لـە ژنێكـی تـریش بـووە ئەوە عیسای كوڕی ئەو ژنەیە! ئەو ژنە ئەگەر بە ژنی خوا ئەزانن–سبحانەو تعالی– ئەوە خوا ئەفەرموێ: (أَنَّى يَكُونُ لَهُ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُنْ لَهُ صَاحِبَةٌ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ) خـوا چۆن كوڕی ئەبێ كە ئەو ژنـی نییـەو هـەر خـواش هـەموو شـتەكانی خولقانـدووە؟ ئەمە ئەگەر عیسا(سەلامی خـوای لێبێـت)بـە لـەدایكبوونێكی سروشـتی و لـە ژنێـك بووبێت، خۆ ئەگەر ئەڵێن: مەرج نیـە لـەدایكبوون هـەر لـە تـۆوی پیـاوو بەرێگـەی دووگیانبوون و مناڵلێبوونەوەوە ببێـت، بـەڵكو درەخـت لـە درەخـتی تـر ئـەبێت و جوجك لە هێلكە دەبێت و بەوشێوەیە...باشە ئێمەش ئەپرسین: ئایـا عیسـاش كـە

---

[١٤٥] ل:١٠٠.

ئێوە بەکوڕی خوای ئەزانن لەخوا خۆی بووەو لە زاتی پاکی ئەو جیابووەتەوە یان لە ژنێك بووە؟ ئەگەر لە ژنێك بووە، ئەو ژنە ژنی خوایە یان ژنێکی ئاساییە وەك هەموو ژنەکانی تر، ئەگەر یەکەمیانە(واتە لە خوا بووە نەك لە کەسی تر)، ئەپرسین ئەی مەریەمی پاکیزە چیە لەم نێوەندەدا باسیئەکەن و کڵێساکانتان پڕکردووە لە پەیکەری ئەو؟ دیسان ئەپرسین: ئایا ئەم کوڕەی خوا بووەتە خوایەکی سەربەخۆ بۆ خۆی یان بووەتە بەشێك لە خوا، ئەگەر خوایەکی سەربەخۆیە ئەوە بۆچی ئەمرێ و لە خەڵکی ئەبچڕێت؟ ئەگەر بەشێکیشە لەخوا عەقڵ نایبڕێت بەشێك لەخوا بمرێت و لەسێدارە بدرێت و قەمەبکرێت بە کەلەکەیداو خوێن فیچقەبکات لێی! !ئەگەر دووەمیشیانە (واتە لە ژنێك بووە کە ژنی خوایە، ئەوە مەریەم زیادە لەو ناوەداو ئەبێ ئەو پیرۆزیە بۆ ئەو ژنە بێت نەك بۆ مەریەم، ئەگەر سێیەمیشیانە(واتە لە مەریەم بووە) ئەو بۆ کەستان دانیپێدانانێن و باسی ناکەن؟ هەموو ئەم گریمانانە بەتاڵن و نابێ ئاستی عەقڵی هیچ کەسێك ئەوەندە نزم ببێتەوە وەڵامی ئەم پرسیارانە بە ئەرێ بداتەوە، چونکە بەراستی، خوا ئەبێ تاك و تەنیا بێت نە کەسی لێببێت و نەلەکەس بووبێت، چونکە لەهەرکەس بووبێت ئەوە ئەبێ ئەو کەسە لەم گرنگترو گەورەتر بێت کە هۆی بوونی ئەمە، هەرکەسیشی لێبووبێت ئەوە ئەبێ وەك ئەو بێت و سیفەتەکانی ئەو وەربگرێت و وەك ئەو بتوانێ حوکم بکات و ئەوەش محاڵە وەك عەقڵ و وەك واقیعیش..خوای گەورە چەند جوان ئەفەرموێت:

قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ (١) اللَّهُ الصَّمَدُ (٢) لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ (٣) وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ (٤) بڵێ: خوا یەکە، خوا پێویستی بەبەندەکانی نیە و ئەوان هەموو پێویستیان بە ئەو هەیە، کەسی لێنەبووەو لە کەسیش نەبووە، کەسیش نیە هاوتای ئەو بێت(نە لە زاتیداو نەلە سیفاتیداو نەلە کارەکانیدا). خوا یەکە یەکیش تەنهایە، سەرچاوەیە بۆ ژمارەکانی تر، ژمارەکانی تر پێویستیان بەم هەیە ئەم پێویستی بەوان نیە پێش یەك هیچ نیە پێش هەموو ژمارەیەکی تر یەك هەیە، یەك

دابەش نابێ بەسەر جگە لە خۆیدا هەموو ژمارەکانی تر دابەشئەبن بەسەر ژمارەی تردا، ژمارە یەك سەرەتای هەموو ژمارەکانی ترە، هیچ سەرەتا نیە بۆ ژمارە یەك، خوای گەورەش وایە، سبحانە و تعالى، سەرچاوەی بوونە، لەکەس نەبووە، هۆی هەموو شتێکە، هیچ شتێك هۆ نیە بۆ ئەو، هەموو کەس پێویستی بەئەو هەیە، ئەو پێویستی بەکەس نیە، کەسی لێنەبووەو لەکەسیش نەبووەو تاك و تاقانەیەو کەس لەئەو ناچێت نەوەك زات و نەوەك سیفات و نەوەك کارو کردەوەش.

پێغەمبەر(صلى الله علیە و الە وسلم) لەگەڵ کۆمەڵێك مەسیحی سەردەمی خۆیدا مونازەرەیەکی عەقڵی و زانستی ئەکات پێمانباشە کە کورتەیەکی لێرەدا بنووسین بۆ زیادە سوودی خوێنەرانی بەڕێز.

ئیبن ئەبی حاتیم و ئیبن جەریری تەبەری و ئیبن ئیسحاق و ئیبن مونزیر دەڵێن : شاندێکی گاورەکان لە نەجرانەوە هاتنە خزمەتی پێغەمبەر(صلى الله علیە و الە وسلم)، نزیکەی شەست سوار بوون، چواردە کەسیان لەگەورە پیاوانی ناویان بوون، لەسەرووی هەمووشیانەوە فەرماندە و گەورەپیاوی ئایینەکەشیان هاتبوون، لەناو ئەو چواردە پیاوەدا سێ نەفەریان هەموو کاروباری ئەوانی بەدەست بوو، ئەمیرەکەیان ناوی "عەبدولمەسیح"بوو، کەسی خاوەن بیروڕای ناویان بوو، هەموو هەر بە قسەی ئەویان ئەکرد، بەپرسی کاروانەکەشیان ناوی"ئەیهەم"بوو، قەشە گەورەی ناویشیان ناوی"ئەبوحاریسە"بوو، بریتیی بوو لە زاناو حەبری گەورەیان کە پێشەواو بەپرسی قوتابخانەکانیانیشیان بوو، دەربارەی عیسا پێغەمبەر(سەلامی خوای لێبێت)کەوتنە دەمەدەمێ و موناقەشەکردن لەگەڵ پێغەمبەردا(صلى الله علیە و الە وسلم)، سیان لەوان قسەیان دەکرد : جارێك وتیان: عیسای کوڕی مەریەم خوایە، چونکە مردوو زیندووئەکاتەوە ، جارێك وتیان: کوڕی خوایە، چونکە باوکی نەبووە. جارێکیش وتیان : عیسا یەکێکە لەسێ خواکە، چونکە خوا هەر دەفەرمووێت :– کردمان و وتمان و بڕیارمان داو، ئەگەر خوا تەنیا یەك خوا بوایە دەیفەرموو: کردم، وتم، بڕیارم دا، ئەمانە بەدەم

خواوە درۆیان دروست دەکرد. پێغەمبەر(صلی الله علیه و اله وسلم)فەرمووی موسڵمان ببن!وتیان ئێمە هەر موسڵمانبووین پێش ئەوەش بێین بۆ لای تۆ، پێغەمبەر(صلی الله علیه و اله وسلم)فەرمووی: موسڵمان نین، ئەزانم لەبەرچیش موسڵمان نابن، لەبەر خواردنی گۆشتی بەرازو هاوارکردنتان لە شتێ ناوتان ناوە کوڕی خواو لەبەر خاچپەرستنتان..

وتیان: باشە باوکی عیسا کێیە؟ پێغەمبەر (صلی الله علیه و اله وسلم)بێدەنگ بوو خوای گەورە سەرەتای سوورەتی ئالی عیمرانی دابەزاند..پێغەمبەر(صلی الله علیه و اله وسلم) فەرمووی : ئێوە ئەوە دەزانن کە هەموو کوڕێك لەباوکی خۆی دەچێت؟

وتیان : بەڵێ وایە، فەرمووی: ئەی نازانن کە خوای هەموومان زیندووەو نامرێت کەچی عیسا مردووەو نەماوە!

وتیان : بەڵێ وایە، فەرمووی : ئەی نازانن کە خوا بەهەموو شتێك ڕادەگات و ڕزقی دەدات و دەیشیپارێزێت؟

وتیان: وایە، فەرمووی : دەی عیسا کامە لەمانە دەکات؟

وتیان : هیچیان ناکات. فەرمووی : هەر خوا خۆی وێنەی عیسای لەسکی دایکیدا کێشا هەرچۆنێك کە ویستبووی، ئێ خۆ خوا ناخوات و ناشخواتەوە. ئایا ئێوە نازانن کە دایکی عیسا بەعیساوە سکی پڕ بووە وەك هەموو ژنێکی تر، و عیسا هەر وەکو منالآنی تریش لەدایك بووە، وەك منالآنی تر گۆشکراوەو خواردن و خواردنەوەو چوونە سەر ئاویشی وەك ئەوان بووە؟

وتیان: بەڵێ وابووە، فەرمووی: دەی ئیتر چۆن ئێوە قسەی لەوشێوەیە دەکەن؟ ئەوانیش بێدەنگ بوون، خوای گەورە دەربارەی ئەمان سەرەتای سوڕەتی ئالی عیمرانی دابەزاند تا ئایەتی هەشتاو ئەوەندە[١٤٦] و ئەوەبوو

---

[١٤٦] تەفسیری مونیری شێخ وەهبە زوحەیلی، تەفسیری ئایەتی:( ان مثل عیسی عند الله کمثل ادم)ال عمران.

پێغەمبەر(صلى الله عليه و اله وسلم)بانگیکردن بۆ موباهەلەکردن[١٤٧] ، ئەوانیش وتیان: سێ رۆژ لێمان بوەستەو وەڵامتئەدەینەوە، جا هەستان و دوور لە چاوی خەڵکی لەگەڵ عەبدولمەسیحەکەیاندا کۆبوونەوەو وتیان: عەبدولمەسیح رات چییەو چی بکەین؟ ئەویش وتی: کۆمەڵی نەصارا!وەڵاهی باش ئەزانن کە ئەم موحەممەدە پێغەمبەری خوایەو لای ئەوەوە هاتووە!و دەربارەی هاوەڵەکەی ئێمەش قسەی کاربڕی هێناوە، ئێوە ئەوەش ئەزانن کە هیچ پێغەمبەرێك نەبووە نەفرینی لە گەلێك کردبێت و گەورەیان مابێت و بچوکیان لەوەودوا بۆ شین بووبێت، ئەگەر شتی وابکەن ئەوە بەدەستی خۆتان رەگ و ریشەی خۆتان دەردەهێنن!جائەگەر هەر سوورن لەسەر ئەوەی دەست بە ئاینی خۆتانەوە بگرن و تا ئێستا چۆنتان هێناوە هەروا بمێننەوەو هەر هەمان قسە بکەن دەربارەی هاوەڵەکەتان، ئەوە وەرن لەگەڵ ئەم پیاوەدا رێبکەون و بگەرێنەوە بۆ وڵاتی خۆتان!ئەوەبوو هاتن و رێکەوتن لەگەڵ پێغەمبەری خوادا کە ملکەچی دەسەڵاتی ئیسلامی بن و برێك سالانە بدەن بە پێغەمبەری خواو هەر لەسەر ئاینەکەی خۆیان بەردەوام بن، پێغەمبەریش (صلى الله عليه و اله وسلم)پاشان بە صەحابە بەرێزەکانی فەرموو: (ان كان العذاب لقد نزل على أهل نجران، ان لو فعلوا لاستؤصلوا من الارض)، لە ریوایەتێکی تردا ئەفەرموێ: ( لو باهل أهل نجران رسول الله صلى الله عليه وسلم لرجعوا لا يجدون أهلا ولا مالا).[١٤٨]، ئەگەر خەڵکی نەجران موباهەلەیان بکردایە لەگەڵ پێغەمبەردا(صلى الله عليه و اله وسلم))ئەوە کاتێك کە ئەگەرانەوە بۆ وڵاتی خۆیان نەماڵ و نەمناڵی خۆیانیان دەستنەئەکەوتەوە.

---

[١٤٧] موباهەلە: بریتییە لەوەی دوو کەس هەر یەکەیان لاف شتێك لێئەدات کە ئەوی تریان بە درۆزنی ئەزانێ ، دێن لەسەر ئەوە رێئەکەون کە بەیەکەوە دوعا بکەن خوا لەعنەت لەوەیان بکات کە درۆ ئەکاتو سەرەنجامی شتەکە بسپێرن بەخوا تا درۆزنەکە رسوابێت و بۆ خەڵکی دەرئەکەوێت کێ خاوەن هەقە.

[١٤٨] سبل الهدى والرشاد، في سيرة خير العباد، وذكر فضائله وأعلام نبوته وأفعاله وأحواله في المبدأ والمعاد، محمد بن يوسف الصالحي الشامي(٩٩/١).

ئەم عەقیدە ئاڵۆزە لە کوێ و ئەو عەقیدە سادەیە لە کوێ کە قورئان بە چەند ئایەتێك رۆشنیئەکاتەوە، وەك خوای گەورە ئەفەرموێ: (وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ يَدْعُو مِنْ دُونِ اللَّهِ مَنْ لَا يَسْتَجِيبُ لَهُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَهُمْ عَنْ دُعَائِهِمْ غَافِلُونَ)واتە: کێ لەو کەسە وێڵترە کە هاوار بکاتە جگە لە خوا کە تا قیامەت ناتوانێ بێت بەدەمیەوە، ئەو جگە لە خوایانە هەر ئاگاشیان لە هاواری ئەو کەسانە نییە!.. دەی خۆ دیارە تەواوی فریشتەکان و پێغەمبەران و ئەولیاکان...هەموو بەبێ ئیستیسنا(من دون الله)ن و کەس نییە بوێری بڵێ: ئەوانەش هەر خوان یان نیوەخوان! -العیاذ بالله-

هەروەها ئەفەرموێ: ( إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ عِبَادٌ أَمْثَالُكُمْ فَادْعُوهُمْ فَلْيَسْتَجِيبُوا لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ (١٩٤) أَلَهُمْ أَرْجُلٌ يَمْشُونَ بِهَا أَمْ لَهُمْ أَيْدٍ يَبْطِشُونَ بِهَا أَمْ لَهُمْ أَعْيُنٌ يُبْصِرُونَ بِهَا أَمْ لَهُمْ آذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا قُلِ ادْعُوا شُرَكَاءَكُمْ ثُمَّ كِيدُونِ فَلَا تُنْظِرُونِ)یانی: ئەوانەی کە بێجگە لە خوان و ئێوە هاواریان تێئەکەن، ئەوانیش وەك ئێوە بەندەیەکن و هیچی تر،ئادەی بانگیان بکەن و با ئەوانیش بێن بەدەمتانەوە ئەگەر ئێوە بەڕاستتانە! ئایا قاچیان هەیە پێی برۆن؟یان دەستیان هەیەو دەستی پێبوەشێنن؟ یان چاویان هەیە پێی بڕوانن؟ یان گوێیان هەیە شتی پێ ببیستن؟..پێیان بڵێ:(فەرموون)!هاوبەشەکانی خۆتان بانگ بکەن و لە پاشاندا هەر پیلانێکتان هەیە لێمی بکەن و لەڕێی هیچ مەوەستن!..

پێغەمبەریش(صلی الله علیه واله وسلم) ئەم چەمکە زیاتر ڕۆشن ئەکاتەوەو ئەفەرموێ:( إِذَا سَأَلْتَ فاسأَلِ الله ، وإِذَا اسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ باللهِ .وَاعْلَمْ : أنَّ الأُمَّةَ لَوْ اجْتَمَعَتْ عَلَى أنْ يَنْفَعُوكَ بِشَيءٍ لَمْ يَنْفَعُوكَ إلا بِشَيءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللهُ لَكَ ، وَإِن اجتَمَعُوا عَلَى أنْ يَضُرُّوكَ بِشَيءٍ لَمْ يَضُرُّوكَ إلا بِشَيءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللهُ عَلَيْكَ ، رُفِعَتِ الآقْلاَمُ وَجَفَّتِ الصُّحفُ »،رواه الترمذي، وَقَالَ:حديث حسن صحيح.

یانی: ئەگەر داوای هەرشتێکت کرد هەر لە خوای بکە(چونکە جگە لەو توانای هێنانی سوود یان لابردنی زیانی نییە)وە ئەگەر پشتیوانت ئەویست ئەوە تەنیا خوا بە پشتیوان بزانە بۆ خۆت(بۆ کاروباری دونیاوئاخیرەتیش) ، ئەوەش بزانە ئەگەر

هەموو ئوممەت کۆببنەوە بۆ ئەوەی سوودێك بە تۆ بگەیەنن توانای ئەو شتەیان نییە کاتێك نەبێ کە خوا بڕیاری دابێت، ئەگەر بشیانەوێت زیانێکت پێبگەیەنن ناتوانن، زیانێك نەبێت کە خوا بڕیاری بۆ دابیت، قەڵەمەکان هەڵگیراون و کتێبەکانیش وشك بوونەتەوە.

بەڕوونتر لەمە خوای گەورە لە ئایەتی(١٠٦)و(١٠٧)ی سورەتی (یونس) ئەوە رائەگەیەنێت کە هەم(زیان)و هەم(سوود)تەنیا هەر بە دەستی خوایەو هەرکەسیش هاوار بکاتە جگە لە خوا ئەوە ستەم لە خۆی ئەکات و لە دینی ئەکات و لە خەڵکی ئەکات...(وَلَا تَدْعُ مِنْ دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَنْفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ فَإِنْ فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِنَ الظَّالِمِينَ (١٠٦) وَإِنْ يَمْسَسْكَ اللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُ إِلَّا هُوَ وَإِنْ يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَادَّ لِفَضْلِهِ يُصِيبُ بِهِ مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَهُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ (١٠٧) .یانی: هاوار مەکەرە جگە لە خوا کە نەئەتوانێ سوودت پێبگەیەنێت و نە ئەتوانێ زیانت پێبگەیەنێت، ئەگەر وا بکەی ئەوە ئەبیتە کەسێکی ستەمکار، خۆ ئەگەر خوا زیانێکت بهێنێتە رێگە ئەوە خۆی نەبێت کەسی تر ناتوانێ لێتی دوور بخاتەوە، خۆ ئەگەر ویستیشی تووشی خێرێکت بکات ئەوە کەس ناتوانێ ئەو فەزڵەت لێدوور بخاتەوە، خوا کە بیەوێ هەر عەبدێکی تووشی خێر بکات ئەیکات و هەر ئەویشە کە لێبووردەو بەسۆزە..

## بڕگەی شەشەم

## نمونەیەك لە هەڵە زمانەوانیەکان وەك قەشە فادی ئەیڵێت

قەشە فادی لەم بەشەدا بەعەقڵی کولی خۆی(٢٥)هەڵەی رێزمانی لە قورئان گرتووە، بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت قورئان پارێزراو نیەو نابێ بە کتێبێکی ئاسمانی دابنرێت، ئەو خۆی لە خوێنەرانی ئەکاتە ئەخفەش و سیبەوەیهی و ئیبن هیشامی ئەنصاری و دەمئەکوتێتە نەحو صەرفی عەرەبی و وەرگێڕە هەژارەکەی لای خۆشمان چاویلێئەکات و پێ لەو ئاوە ئەخشێنێ کە قەشە فادی گەورەی بۆی

رۆئەكات، قەشە فادی ئەڵێ: ئەبوو قورئان نەیوتایە (عشره كامله)لە ئایەتی(١٦٩) ئەلبەقـەرەدا كـە ئەفـەرموێ:( فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلاثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌ ذَلِكَ لِمَنْ لَمْ يَكُنْ أَهْلُهُ حَاضِرِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ)، هـەر بەس بوو بیوتایە: (فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ تِلْكَ عَشَرَةٌ(....) ذَلِكَ لِمَنْ لَمْ يَكُنْ أَهْلُهُ حَاضِرِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ)و ئـیتر تـەواو! !مـادام قورئـــان وایوتـــووەو وەك قەشـــە فـــادی نـــەووتووە كەواتـــە قورئـــان پـــارێزراو نیە !وئاسمانی نیە! وپڕە لە هەڵە! ![149]

یان ئەڵێ: قورئان راناوی كەسی تاكی بەكارهێناوە كە بۆ جـووت ئەگەڕێتـەوە، ئەمە چۆن؟ ئەڵێ:لـە سـورەتی تـەوبـەدا هـاتووە(يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَكُمْ لِيُرْضُوكُمْ وَاللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَقُّ أَنْ يُرْضُوهُ إِنْ كَانُوا مُؤْمِنِينَ)، قەشە فادی ئەڵێ: ئەبوو بیوتایـە(يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ لَكُمْ لِيُرْضُوكُمْ وَاللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَقُّ أَنْ يُرْضُوهما إِنْ كَانُوا مُؤْمِنِينَ)، بـەڵام ئـەم قەشـە ماڵوێرانـە ئەوەنـدە بـەخت یـاوەری نـەبووە بڵـێ ئـەرێ بـا مـن سـەیرێكی تەفسیرەكانی قورئان بكەم بزانم ئەمـەی مـن ئـەیڵێم راستـە یـان هەڵەیـە، ئایـا لـە زمانی عەرەبیدا ئەمەی من قەبووڵە یان شورەییە وا بڵێم، ئیمـام فـەخری رازی لـە تەفسیرەكەیدا –بۆنمونە– ئەڵێ: هەیە ئەپرسێ: بۆچی خـوای گـەورە نافـەرموێ" يُرْضُوهما"؟ وەڵامەكەی ئەوەیە كە:

١–لە زمانی عەرەبیدا شتی وا ئەوترێت و دروسـتـە، بـۆ نمونـە ئـەڵێن:( إحسـان زيد و إجماله نعشنى وجبرنى)، خۆ ئەوە دوو شتە كەچی"جبرنى ونعشنى" بۆ تاك بەكاردێت، ئـێ خـۆ لەكوردیشـدا ئـەو جـۆرە دەربڕینـە هەیـەو دروسـتـە، ئـەوترێ:

---

[149] ماوەردی لە كتێبی "النكت و العيون"ەكەیدا و لـە(١٤١/١)دا باسـی ئـەو مانایانـە ئـەكات كـە لـە وشەی"كامله"دا دەستئەكەوێت و ئەفەرموێ:(أحدها : أنها عشرة كاملة في الثواب كمن أهدى، وهو قول الحسن، والثاني: عشرة كَمَّلَت لكم أجر من أقام على إحرامه فلم يحل منه ولم يتمتع .والثالث: أنـه خـارج مخرج الخبر، ومعناه معنى الأمر، أي تلك عشرة، فـأكملوا صـيامها ولا تفطـروا فيهـا .والرابـع : تأكيـد في الكلام، وهو قول ابن عباس .

چاکەو پیاوەتی تۆ هەڵیساندمەوە، تورەیی و بێمەحەببەتی مامۆستا کورەکەمانی تێکشکاند، دەی خۆ لەهەردوو حاڵەتەکەدا دوو شت وتراوە نەك یەك شت، کەچی لە پاشاندا کرداری تاکی بۆ بەکارهاتووە. ـ هەڵیساندمەوە نەك هەڵیانساندمەوە، تێکشکاند نەك تێکیانشکاند ـ

٢ـ مادامێك رەزامەندی خوا رەزامەندی پێغەمبەرە، ئیتر پێویست نیە هی ئەویش باسبکرێت.

٣ـ پێغەمبەریش هەر بۆ ئەوە کارئەکات کە خەڵکی وا لێبکات لە خوای خۆیان رازیبن و کارێ بکەن خواش لێیان رازی ببێت، کەواتە ئەبێ هەموو هەر لە هەوڵی ئەوەدا بن کە خوا رازیبکەن.

٤ـ نیازو مەبەستی ناودڵەکان تەنیا خوا پێی ئەزانێت، بۆیە ئایەتەکە تەنیا باسی خوای کردووە.

٥ـ ناکرێ خوای گەورە بەیەکەوە لەگەڵ کەسی تردا باس بکرێن و یەکسان بکرێن، وەك رێزو بەرزڕاگرتنێکی پەروەردگار...ئیمامی رازی خاڵێکی تریش باس ئەکات و ئەفەرموێ: ئەشگونجێ و زمانی عەرەبی ئەوەش هەڵئەگرێ کە مانای ئەوەبێت: (والله أحق أن يرضوه ورسوله كذلك).

ئەم شێوازە لە قورئاندا زۆر بەکارهاتووەو خەڵکی عەرەبیزان نەك هەر لێی حاڵیئەبن، بەڵکو رەوانبێژی و بیرۆکەی جوانیشی لێدەرئەهێنن، بۆ نمونە خوای گەورە ئەفەرموێ: (فَقُلْنَا يَا آدَمُ إِنَّ هَذَا عَدُوٌّ لَكَ وَلِزَوْجِكَ فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ الْجَنَّةِ فَتَشْقَى)، واتە: وتمان ئادەم! ئائەمە دوژمنی تۆو خێزانەکەتە، لە بەهەشت وەدەرتان نەنێت و بکەویتە زەحمەت، نافەرموێ: "فَتَشْـقَيا"، هەردووکتان بکەونە زەحمەت، چونکە ئەوەی پێویستە شانبداتە ژێر زەحمەت و ببێتە قەڵغان لە سەر زەویدا پیاوە نەك ژن، خوا ماسولکەی پتەوو جەستەی بەهێزی بەو داوە نەك بەژن..یان ئەفەرموێ:( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اسْتَجِيبُوا لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ) نافەرموێ:( إِذَا دَعَواكُم) ، چونکە:

١ـ ئەوە پێغەمبەرە هاوار ئەكات و بانگەوازئەكات  نەك خوای گەورە.

٢ـ هاوارو بانگەوازی ئەویش هەر هی خوایە و یەك بانگەوازە. ریوایەتكراوە كە كەسێكی دیلیان هێنایە خزمەت پێغەمبەرو دیلەكە بەدەنگی بەرز ووتی: ( اللَّهُمَّ إنِّي أَتُوبُ إِلَيْكَ، وَلاَ أَتُوبُ إِلَى مُحَمَّدٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ:(عَرَفَ الْحَقَّ لآَهْلِهِ)"[١٥٠]، واتە: من بۆلای خوا ئەگەڕێمەوە نەك بۆ لای موحەممەد! پێغەمبەر(صلى الله عليه و اله وسلم) گوێی لەو قسەیە بوو فەرمووی: مافەكەی بۆ خاوەنمافەكە سەلماندو لە شوێنی خۆیدا داینا!

جا كەواتە ئیتر قەشە فادی كە وەك پێویست عەرەبی نازانێت و ئاگای لە وردەكاری ئەو زمانە فراوانە نیە بۆ چێو لە تاریكی ئەوەشێنێت و خۆی بەڕسوابوون ئەگەیەنێت؟ و ئەدات لەو بەرەوژوورە؟! باشە كەسێك رستەی "یا اصحاب سورە البقرة"بە" ئەی هاوەڵانی مانگا"تەرجەمە بكات، یان جیاوازی نەكات لە نێوان "أيمانكم"–ئەیمانەكوم– و أيمانكم–ئیمانەكوم–[١٥١]، شورەیی نیە بۆی لە رووی زمان و ڕەوانبێژی عەرەبیەوە رەخنە لە رەوانبێژی قورئان بگرێ؟! !بە راستی عەرەب راست ئەڵێ:"شر البلية مايضحك"، كوردیش ئەڵێ:"نەگبەتی باشە، قۆرتەكەی خراپە"یان ئەڵێ:"مەیمون جوان بوو ئاوڵەشی دەردا"!

# بڕگەی حەوتەم

## نمونەیەك لە هەڵە یاساییەكان وەك قەشە فادی ئەیلێت

قەشە فادی وەك چۆن لە بەش و بابەتەكانی تردا ئەچێتە سەر كورسی ئوستادی و خۆی بە كەسی خاوەن رەگوڕیشە ئەزانێ لەو بابەتانەدا، لێرەشدا بە هەمانشێوە ئەو پلەیە بەرنادات و وەك یاساناسێكی موخەزرەم ئەكەوێتە

[١٥٠] أخرجه أحمد ٣/٤٣٥(١٥٦٧٢).

[١٥١] ئایا قورئان پارێزراوە، ل٢٥٤.

پشـــكنینی قورئـــان بـــۆ ئـــەوەی هەڵـــە یاســـاییەكانی تێـــدا بدۆزێتـــەوەو خـــەڵكی فریوخواردووی قورئانی لێئاگادار بكاتەوە ! !

بڕوانن ئەم پیاوە كلۆڵە چـی ئەكاتـە رەخنـەو بـە حسـابی خـۆی قورئـانی پـێ هەڵئەوەشێنێتەوە، قەشە فادی دەستبڕینی دزی پێ نامرۆڤانەیە و ئـەڵێ: قورئـان بـــە پێچـــەوانەی هـــەموو یاســـا ئاسمانیـــەكان و زەوییـنەكانـــەوە یاســـای بـــڕینی دەستەكانی دزی دانا، هـەروەها ئـەڵێ: ئایـا ئـەو یاسـایە سـوكایەتیكردن نیـە بـە مرۆڤایـەتی، هـەروەها ئـەڵێ: ئایـا بـڕینی دەسـتی دز ئـەو كەسـە لـە كـاركردن و پەیداكردنی بژێوی بە عارەقی ناوچەوان بێبەش ناكات؟ هـەروەها ئـەڵێ: ئەوانـەی دەستیان ئەبڕێتەوە (تەنانەت دوای پەشیمانبوونەوەشیان لە دزیكردن).

جارێ من نازانم ئەمە چ پەیوەندیەكی بەوەو هەیە كە قورئان پارێزراوە یـان نـا ئەگەر دز زیندانی بكرێـت یـان غەرامـە بكرێـت یـان دەسـتی ببڕێـت؟!پاشـان ئـەم لێكدانەوەی فادیە كێ ئەڵێ دروستەو وایە؟.

دزی تـاوانێكی گـەورەو قێزەونـە، لـە نـاخێكی پـیس و بۆگەنـەوە سەرچـاوە ئەگرێت، دز ئەیەوێت ئەوەی خەڵكی تر بە عارەقی ناوچەوانی پەیـدایكردووە- بـۆ ماڵ و منداڵی و دەیان ئومێدی مەشروعی خۆی و ماڵ و منداڵی پێـوە بەنـدكردووە- ئـەم هـەروا بـە بـێ هـیچ مانـدووبوونێك بەدزییـەوە لەماڵەكـەی دەریبهێنێـت و بیخاتەسەر ساجی عەلی، ئامادەیە لە رێگەی ئەو دزیكردنەیـدا ئەگـەر پێیـان زانـی ئـــەوە خـــاوەن ماڵەكـــەش زۆر خوێنســـاردانە بكوژێـــت و ماڵەكەشـــی بـــەرێت و مناڵەكانیشی قەتڵ و عام بكات ئەگەر بزانێ پێیانزانیوەو هەواڵی لێئـەدەن، دز كـە شەوانە لەسەر نووكی پێی بـە ئەسـپایی ئەچـێت بـۆ دزی ئـەوەی نایـەت بـە بـیرو ویژدانیدا ئەوەیە كە لە شیرینی خەودا ماڵێكی هەژار بەخەبەر ئەهێنێت و مناڵەكان تووشـی دڵەخورپـەو تـۆقین ئـەبن و دوور نیـە كـە لـە ئەنجامـدا تووشـی چـەندین نەخۆشی دەروونیش ببن و ژیانیان لەبەین بڕوات، دز بیری لای ئەمانە هیچـی نیـە، بیری لای ئەوە نیە ئاخر خۆ ئەو خەڵكەی ئەم ئەیەوێ دزییان لێبكـات ئـەو مـاڵ و

سامانەی بە رەنج و زەحمەت پەیداکردووە و عارەقی بۆ رشتووەو بۆ خۆشکردن و جوانکردنی ژیانی مناڵەکانی پەیدایکردووەو بەئەو حەرامەو ئەبێ ئەویش بڕوات رەنج بدات و شەریفانەو بە رەنجی شان و عارەقی ناوچەوانی بژێوی بۆ خۆی و ماڵ و مناڵی پەیدابکات نەك بە دزیکردن و رووتکردنەوەی خەڵکی، ئیتر نازانم قەشە فادی ئەم بەرگرییە زۆرە بۆ لە دز ئەکات، لەبەر خۆیەتی یان لەبەر چییە؟ ئایا لە دیدی ئەودا ئەبێ دز چی لێبکرێت؟ ئافەرین بکرێت؟ خەڵات بکرێت؟ زیندانی بکرێت؟ دوو ئەوەندە یان کەمتر یان زیاتری ماڵە دزێنیەکە غەرامە بکرێت؟ لەناوببرێت؟ کۆت و زنجیر بکرێت؟ چی لێبکرێت؟ ئێمە بە باشی ئەزانین پێش وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە، وەڵامی ئەو یەك دوو رەخنە نابەجێ و نا لۆژیکانەی قەشە فادی بدەینەوە کە ئەڵێ: (قورئان بە پێچەوانەی هەموو یاسا ئاسمانیەکان و زەوییەکانەوە یاسای بڕینی دەستەکانی دزی دانا)، هەروەها ئەڵێ:( ئایا ئەو یاسایە سوکایەتیکردن نیە بە مرۆڤایەتی)، هەروەها ئەڵێ: (ئایا بڕینی دەستی دز ئەو کەسە لە کارکردن و پەیداکردنی بژێوی بە عارەقی ناوچەوان بێبەش ناکات؟)! هەروەها ئەڵێ: ئەوانە دەستیان ئەبڕێتەوە(تەنانەت دوای پەشیمانبوونەوەشیان لە دزیکردن).

ئەم پەرەگرافەی فادی چوار چەواشەکاری تێدایە:

١ــ دز ئەگەر بڕوای بە عارەقی ناوچەوان ببوایە دزی نەئەکرد! دزەکان کەسانێکی تەمەڵ و بێکاران و لە راستیدا مشەخۆرن و بارن بەسەر کۆمەڵگەکانیانەوەو هانی خەڵکی ئەدەن بۆ بێکاری و مشەخۆری.

٢ـ دزیکردن سوکایەتیە بە مرۆڤایەتی نەك بڕینی دەستی دز، کە ماڵی خەڵك و رەنجی خەڵك و ئاسایشی خەڵکی هەموو ئەبڕێت.

٣ ـ دز ئەگەر پەشیمانببێتەوە لەدزیکردن دەستی نابڕرێت[١٥٢].

---

[١٥٢] زانایانی شافیعی مەزهەب — لە راسترین قسەیاندا حەنبەلیەکانیش بەهەمان شێوە بیروڕایان وایە کە تۆبەکردن حەددی دزیکردن لەکۆڵی تەوبەکارەکە دائەگرێت، لەبەر ئەوەی خوای گەورە —دوای

٤ـ ئەوە هەر قورئان نیە کە بەتەنیا یاسای دەستبڕینی دەستی بڕیاردابێت، بەڵکو ئەم یاسایە پێش ئیسلامیش هەبووەو لە ئایینەکانی تریشدا هەبووەو کتێبی پیرۆزی تۆش ئەمە ئەسەلمێنێت و شەرم بتگرێت کە ئەو قسانە ئەکەی، تەنانەت ئەگەر واشبێت تەنیا ئیسلام ئەم سزایەی دانابێت ئەوە کەی مایەی نیگەرانی و رەخنەیە کاتێك کە ئەو دەرمانە پرپێستی دەردەکەبێت و بنەبڕی بکات؟!

کامیان توندو تیژترە، حوکمی قورئان یان هی کتێبی پیرۆزی تۆ کە ئەڵێ: (من سرق انساناًو باعه أو وجد في يده، يقتل قتلاً)، "خروج:٢١: ١٦".

ئەم حوکمە توندو تیژە یان ئەوەی کە لە کتێبی پیرۆزدا هاتووەو ئەڵێ:( إِذَا تَخَاصَمَ رَجُلاَنِ رَجُلٌ وَأَخُوهُ وَ تَقَدَّمَتِ امْرَأَةُ أَحَدِهِمَا لِتُخَلِّصَ رَجُلَهَا مِنْ يَدِ ضَارِبِهِ وَمَدَّتْ يَدَهَا وَ أَمْسَكَتْ بِعَوْرَتِهِ فَاقْطَعْ يَدَهَا وَلا تُشْفِقْ عَيْنُكَ) ،سفر التثنية (٢٥ : ١١) ئەمە قورس و توندو تیژە لەسەر ئەوەی ژنە هەژارەکە لەتاو مێردەکەی دەستی بۆ گونی ئەو پیاوە بردووە، سزاکەی ئەوەیە کە دەستی ببڕیت!! بێئەوەی قۆڕی کردبێت یان لەبن دەریهێنابێت یان مەشلولی کردبێت! ئەوپەڕی ئەوەیە ئێشی پێگەیاندووە لەتاو مێردەکەی، ئایا گرتنی گونی زەلامێك–و ئێشگەیاندن پێی کە هێشتا لە دەقەکەشدا باسی ئەوەش نەکراوە بڵێ ئەگەر ئێشی پێگەیاند، بەڵکو تەنیا ئەڵێ: –وَمَدَّتْ يَدَهَا وَأَمْسَكَتْ بِعَوْرَتِهِ– سزاکەی ئەوەیە ئەو دەستە ببڕی؟! ئەمە سوکایەتیکردنە بە مرۆڤایەتی یان ئەوەی قورئان کە لەسەر دزینی ماڵی خەڵکانی هەژارو زەحمەتکێش کە بە هەزار کوێرەوەری پێکەوەی ناوە، ئیسلام ئەو سزای دەستبڕینەی بۆ داناوە؟ ئەی ئەوەنیە لە کتێبە پیرۆزەکەی خۆتانداو وەك تەشریعێکی ئایینی دەقی لەسەر هاتووە؟

---

ئەوەی کە حەددی دزیکردن روونئەکاتەوە– ئەفەرموێ:(فَمَن تَابَ مِن بَعْدِ ظُلْمِهِ وَأَصْلَحَ فَإِنَّ اللّهَ يَتُوبُ عَلَيْهِ إِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ)، ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە تۆبەکار حەددەکەی لەسەر نامێنێ، چونکە ئەگەر دوای تۆبەکردنیش هەر حەددی بەسەردا جێبەجێ بکرێت هیچ فەلسەفەیەك نامێنێ بۆ ئەوەی خوا باسی تۆبە بکات لە ئایەتەکەدا. بڕوانە:(الموسوعة الفقهية الكويتية).

ئەی مەگەر لە ئینجیلی متی (١٨ : ٨)دا نەهاتووەو لەسەر زمانی مەسیح (سەلامی خوای لێبێت)کە ئەڵێ: (فان اعثرتك يدك او رجلك فاقطعها وألقها عنك .خير لك ان تدخل الحياة أعرج او أقطع من ان تلقى في أتون النار الابدية ولك يدان او رجلان . وإن أعثرتك عينك فاقلعها وألقها عنك . خير لك أن تدخل الحياة أعور من أن تلقى في جهنم ولك عينان)، ئەگەر دەستت یان قاچت تاوانێکی پێکردی ئەوە دەست و قاچی خۆت ببڕەوەو فڕێیان بدە، ئەوە باشترە بچیتە ناو ژیان بە شەلی و دەستبڕاوی تا ئەوەی بخرێیتە ناو ئاگری هەتاهەتایی و دوو دەست یان دوو قاچت هەبێت، ئەگەر چاوت گوناهێکی پێکردی ئەوە دەریبهێنەو فڕێی بدە، ئەوە باشترە بەکوێری ژیان بەریتەسەر تا بخرێیتە جەهەننەم و دووچاوت هەبێت! ! ئەی ئەمە چی لێدەکەی قەشە فادی؟! ئەی باشە هەر لە ئینجیلی متی (١٩ : ٣) دا مەسیح نالێ:(لانه يوجد خصيان ولدوا هكذا من بطون امهاتهم .ويوجد خصيان خصاهم الناس.ويوجد خصيان خصوا انفسهم لاجل ملكوت السموات .من استطاع ان يقبل فليقبل)، لەبەر ئەوەی کە کەسی واهەیە هەر بەخەساوی لەدایك بووە، هەشە خەڵك خەساندوویانە ، هەشە لەبەر چوونە ناو مەلەکوتی ئاسمانەکان خۆی خەساندووە! هەر کەس ئەتوانێ ئەوە قەبوڵبکات ئەوە با قەبووڵی بکات و وابکات!

باشە خۆ ئەگەر ئیسلام ئەم سزایەی دابنایە هات و هاواری دونیات لێ بەرزئەبوویەوە، ئایا کابرا دەستێکی ببڕی باشترە یان بیخەسێنی و ئەو ئەندامە پێویستەی لە ژیاندا بۆ لەناوبەری؟ خۆ کابرا کە دەستێکیشی ببڕی دەستەکەی تری ئەمێنێتەوە بۆی و هەموو کارێکی خۆیی پێ ئەنجامئەدات، بەڵام خەساندت ئیتر چی جێگەی بۆ ئەگرێتەوە؟ خۆ کەسێ دەستێکی لە مووچدا بۆ ببڕێتەوە دیارە خەڵکی ئەیبینێت و پەندی لێوەرئەگرن، بەڵام کابرا کە خەساندت کێ پێیئەزانێت و ئەو شتەی ئەبینێت تا بۆی ببێتە پەند؟ کابرا دەستیشی ببڕیت هەر ئەژی و ئەتوانێ ڕۆڵ ببینێت لە ژیاندا، بەڵام کە خەساندت چ ڕۆڵێکی ئەمێنێ لە

ژیاندا؟ چۆن ئەتوانێ دوای ئەوە نەوە بخاتەوە، ئەمە جگە لەوەی کە ئەوەی ئەیخەسێنی ئیتر هەموو دونیای لێتاریك ئەکەیت و چرای هیوای بە ژیان لێئەکوژێنیتەوەو ئەیکەیتە توخمێکی بێئومێدو غەمباری هەمیشەو نازانێ بۆچی ئەژی و بۆ کێ ئەژی؟

قەشە فادی! کورد ئەڵێ: ئەگەر ماڵەکەت لە شوشە بوو بەرد مەگرە کەس ! عەرەبیش هەروا ئەڵێن، دەی وەك قورئان ئەفەرموێ دەربارەی جولەکە "فاعتبروا یا اولی الابصار"، دەی تۆش وانەیە فێربە !

نەك ئەمانە، بفەرموو بزانە کتێبی پیرۆزی خۆتان چی ئەڵێ دەربارەی ئەوەی ئەگەر گای کابرایەك قۆچی دا لە پیاوێك یان لە ژنێك و مناڵەکەی پێلەباربرد، بزانە سزاکەی چیە؟ لە سیفری خروجدا(٢١:٢٨)دا ئەڵێ:

(إِذَا نَطَحَ ثَوْرٌ رَجُلاً أَوِ امْرَأَةً فَمَاتَ، يُرْجَمُ الثَّوْرُ حَتَّى الْمَوْتِ وَلاَ تَأْكُلُونَ لَحْمَهُ، وَيَكُونُ صَاحِبُ الثَّوْرِ بَرِيئاً. ٢٩أَمَّا إِنْ كَانَ الثَّوْرُ نَطَّاحاً مِنْ قَبْلُ، وَسَبَقَ إِنْذَارُ صَاحِبِهِ، فَلَمْ يَكْبَحْهُ، فَقَتَلَ رَجُلاً أَوِ امْرَأَةً، يُرْجَمُ الثَّوْرُ، وَيُقْتَلُ صَاحِبُهُ)!

پاش ئەمە با باسی فەلسەفەی ئەم دەستبڕینە بکەین زۆر بە کورتی[١٥٣]:

"دەستبڕین" کراوە بە سزای دزیکردن، نەك "زیندانی"، یان "غەرامەی دارایی"، یان هەر جۆرە "تەعزیر"ێکی تر، فەلسەفەکەی ئەوەیە بەبڕینی دەستی چەند کەسێکی دەستپیس لەناو کۆمەڵگەدا–کە دەستیان خێر بۆ کۆمەڵگە ناداتەوەو ئەیانەوێت وەك "زەروو"لەسەر خوێنی خەڵکی بژین– هەموو خەڵکی تری دەستپیس تەمێخوارد ئەبێ‌و ئەسڵەمێتەوە لە دزیکردن‌و ترساندن‌و تۆقاندنی خەڵکی بێوەی‌و کاسبکار، بەڵام ئەگەر وانەکرێ، بۆ نموونە سزای دزیکردن بریتی بێت لە "غەرامەی دارایی"، یان "زیندانیکردن"، یان "ئیعدامکردن" ، ئەوە دزیکردنەکە وەك خۆی ئەمێنێتەوە، بەڵکو لەوانەیە زیادیش بکات وەك "چەندێتی" وەك "چۆنێتی"یش، پرسیارئەکرێت ئەمە چۆن؟

---

[١٥٣] هەرکەس بیەوێت بەدرێژتر لەم مەسەلەیە بتوێژێتەوە ئەوە با کتێبی ژمارە(٨٠)ی تیشك بۆ نمونە بخوێنێتەوە.

خـۆ دیـارە هـیچ عـەقلێك لێناگـەڕێ دزەكـانی نـاو كۆمەڵگەكـەی ئـازاد بـن و ڕێوڕەسمی توونـد لەگەڵیاندا نەگیرێتەبەر...با وا دابنێین لە شارێكدا چەند كەسێك لەسەر دزیكردن ئەگیرێنو ئەخرێنە زیندانیو حوكمی چەند ساڵ زینـدانی بـۆ هـەر یەكەیان دەرئەكرێت، ئایا ئەم زیندانییانە لە زیندانـدا چی ئەكەن؟ خۆ دیارە لەزگە لـە دەمیـان نادرێـت، بـەڵكو دەسـت بـە قسـەكردنو ڕاگۆڕینـەوە ئەكـەن لـە زیندانەكەداو دیارە یەكەم پرسیارو حیواریش كە ڕوو ئەدات لـە نێوانیانـدا شـتێكی لەم شێوەیە ئەبێت:

دزێك: لەسەرچی گیراوی ئەفەنی؟

دزێكی تر: لەسەر دزی.

دزەكە: چیت دزیوە؟

دزەكەی تر: ماڵی فلان كەس.

دزەكە: چۆنو چەندت دزیوە؟

دزەكـەی تـر درێـژەی دزی كردنەكـەیو شـێوازی ماڵدزینەكـەو چـۆنێتی گرتنەكەیو خاڵە بێهێزەكانی خۆی بە خەیاڵڕاحەتی باسئەكات.

دیارە حیوارەكە پێچەوانە ئەبێتەوەو ئەمی تریان دەست بە پرسیاركردن لەوی تریان ئەكاتو دەستئەكەنە حیـوارو موناقەشـەو ڕاگۆڕینـەوە لەسـەر شـێوازەكانی دزیكردنو ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ یاساو بەرنامەكانی ڕاوەدوونانـدا.

ئەوكاتە زیندانەكە ئەبێتـە خێوەتگەیـەكو چـەندین شـێوازی دزیكـردن تـاوتوێ ئەكرێتو وەك خولێكی زانستی لێدێتو هەریەكـەیان پـاش ئـەوە، نـەك شـێوازێك، بەڵكو چەندین شێوازی دزیكردن فێر ئەبێتو لەوەو دوا بەرئەبێتە گیانی كۆمەڵگەو باری ئەمنی خەڵكی (بێگوناه) ئەخەنە مەترسییەوە..لەبەر ئەمە هەرچـی دز هەیـە كاتێك ئەزانێ سزاكەی بریتیە لە زیندانی، خەیاڵڕاحەت ئەبێت و ترسی نامێنێت لـە گرتن و بەخۆی ئەڵێ: من لە دزیكردندا نـاگیرێم و ئەگـەر گیراشـم ئـەوە ماوەیـەكی كەم زیندانی ئەكرێم و بەرئەبم و ئەزموونێكیش وەرئەگرم. ئەگەر سـزاكەش بـریتی

بێت لە غەرامەی مالی ئەوە دیسان دزەکە هەر خەیاڵ ڕاحەت ئەبێت و ئەڵێ بەخۆی: ناگیرێم و ئەگەر لە دانەیەکیشدا گیرام دەستکەوتەکانی دزیەکانی تر ئەدەم بە تەنگەی ئەو دزیەداو کایەو مایە بۆخۆم هەڵدەسمەوە، ئەگەر سزاکەش ئیعدام و لەناوبردنیش بێت بە هەمانشێوە دز ناسڵەمێتەوەو قیروسیا ئەکات لە ژیان و ئەڵێ بەخۆی: تا هەم دزیئەکەم و هەرکاتیش گیرام و ئیعدامکرام ئەوە (...) بەگۆڕم و دوای من خەڵکی هەرچی ئەڵێن چاویان دەرئەهات!! باشترین بەڵگەش هەموو کۆمەڵگە نائیسلامیەکانە کە خواخوای ئەوەیانە کارەبا بکوژێتەوەو بکەونە دزیکردنی دوکان و ماڵی خەڵکی.

بەڵام ئەگەر سزاکە دەستبڕین بێت وەك خوای گەورە ئەفەرموێت: (وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا جَزَاء بِمَا كَسَبَا نَكَالاً مِّنَ اللّهِ وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ) (المائدة : ٣٨ ). هەرکەس لە پیاوو ژن دزیکرد خێرا دەستیان ببڕن، وەك پاداشتێك بۆ ئەو کردەوەی کە کردوویانەو وەك مۆرو سزایەکیش کە لە خواوە بۆیان بڕاوەتەوە، خواش بە دەسەڵاتەو لە رووی داناییشەوە ئەم بڕیارەی داوە...ئەوە بەدڵنیاییەوە دزەکان لەم سزایە ئەسڵەمنەوەو هەزار حساب بۆ ئەوە ئەکەن: ئەگەر لە دزیەکەدا گیران چۆن بتوانن دوایی بەدەستێکی بڕاوەوە بەناو خەڵکیدا بگەڕێن و دۆست و دوژمن بە تیلەی چاو لەژێرەوە بۆیان بڕوانن! !ئیتر ئەو کۆمەڵگەیە هەنگاو بەهەنگاو بەرەو ئارامی ئەڕوات و وای لێدێت خەڵکی دەرگای ماڵەکانیان بخەنە سەرپشت و بەئارامی و بێترس لێیبخەون.

زانایانی ئیسلامی ئەفەرموون: دەستەکان بە گشتی چوار جۆرن:

- يد عاملة، الاسلام يكرمها.(دەستێك کاردەکات ئیسلام رێزی لێدەگرێت)
- يد عاجزة، الاسلام يطعمها.( دەستێك پەککەوتەیە ئیسلام ئەیژێنێت)
- يد عاطلة، الاسلام يشغلها.( دەستێك بێکارە ئیسلام ئەیخاتەسەر کارێك)

ـ يد عابثة، الاسـلام يقطعها[١٥٤] ( دەسـتێك يـاری بـە شـتە پیرۆزەكـانی خـەڵكی ئەكات ئیسلام، ئەو دەستە ئەبڕێت)

(دەسـتی ئیشـكەر) ئیسـلام رێـزی دەگرێـت و ماچیشـی دەكـات و (ئیسـپاتی) موڵكیـەتی بـۆ ئـەكات و ئـەڵێ: (ان الله یحـب العبـد المحـترف)خـوا بەندەیـەكی خۆشئەوێت كە پیشەیەك مومارەسە بكات،ئیسلام كەسی ئیشكەر ئەكاتە خـاوەنی ماڵ و سەروەت و سامانی خۆی و ئـەو سـامانەی بـۆ ئـەپارێزێت و هـەر كەسـیش بەناڕەوا ئەو ماڵەی داگیربكات یان بیدزێت ئەوە سـزا ئـەدرێت، و خـەڵكیش فێـری ئەوە ئەكات كـە كرێـی كەسـی ئیشـكەر بـدەن پـێش ئـەوەی عـەرەقی ناوچـەوانی وشكببێتەوە ! ، (دەستی پەككەوتە)ش ئیسـلام مەعاشـی بـۆ بڕیوەتـەوە و بەشـی كیفایەتی پێئەدات وپێویستی بە دزینی مـاڵی كـەس نابێـت، (دەسـتی بـەتاڵ وبـێ كار)یش ئیسلام كاری بۆ ئەدۆزێتەوەو ئەیخاتە سەر كار و دایدەمەزرێنێ و بەشـی كیفایەتی ئەداتێ وپێویستی بە دزی نابێـت، ئەمێنێتـەوە دەسـتێك بـەتاڵ و بێكـار نییە وگۆج و پەككەوتە نیە و كـاریش ناكـات و ئەیـەوێت بـە (دزیـنی مـاڵی خـەڵك) ژیانی بەڕێوەببات ! و لەسەر خەڵكی وەك مشەخۆر بژی، ئـەو (دەسـتە دەسـتێكی پیسە)و ئیسلام دێت و دەیبڕێت، تا میكرۆبەكەی نەداتە خەڵكی و ئاسایشـی (تـاك )و(كۆمەڵ) نەخاتە مەترسییەوە، چـونكە ئـەوە باشـترین چارەسـەرە لـە راسـتیدا وەك لە پێشەوە باسمانكرد.

كەواتە قەشە فادی بۆ رەخنە لە قورئان ئـەگرێ كـە دەسـتبڕینی كـردووە بـە سزا بۆ دزیكردن؟ كە لە شـت تێناگـات و لـە فەلسـەفەی شـتەكە وردنابێتـەوە بـۆ گلەیی لە قورئان ئەكات و گلەیی لە خۆی و عەقڵی خۆی ناكات؟

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئیسلام هەروا لە خۆڕا دەستی خـەڵكی نابڕێـت، ئـەبێ ئەو ماڵە لە شوێنی قایمدا بێت(یانی لە"حرز"دا بێت، ئەبێ بە دزیـەوە بیبـات نـەك بـــە ئاشـــكرا،ئەبێ ئـــەو كەســـە ناچـــاری دزیكـــردن نـــەبووبێت و نـــەبوونی

---

[١٥٤] سەیری كتێبی "المال ڤ الاسلام) محمود غریب بكە بۆ درێژەی ئەم باسو خواستە

پاڵپێوەنەنابێت، کاتی گرانی و قاتوقڕی نەبێت و گومانی تێدا نەبێت،...بەو شێوەیە، بەڵێ یاساکانی سزا لە ئیسلامدا کاتی وا هەیە هەڵئەپەسێنرێن لەبەر"گومانێك"یان لەبەر "بارێکی نائاسایی"یان لەبەر "حاڵەتێکی تایبەتی"یان لەبەر ئەوەی "خەڵك ئاگای لەو سزایانە نییەو نایزانن".

پێغەمبەر(صلى الله عليه واله وسلم)ئەفەرموێ:"ادرؤا الحدود عن المسلمين ما استطعتم فإن كان له مخرج فخلوا سبيله. فإن الإمام إن يخطئ في العفو خير من أن يخطئ في العقوبة "[155].

عومەری کوڕی خەتتاب ئەفەرموێ: "لأن أعطل الحدود بالشبهات أحب إلى أن أقيمها بالشبهات" هەر بۆیە ساڵە گرانیەکە"عام الرمادة"دەستبڕینی هەڵپەسارد لەبەر ئەوەی هەموو خەڵکی برسی بوو، ناچاربوو کە دزی بکات بۆ ئەوەی نەمرێت، هەروەها کاتێك غوڵامەکەی حاتەبی کوڕی ئەبی بەلتەعە هوشترێکی لە خێڵی"مزينة"دزی دەستی نەبڕی چونکە بۆی دەرکەوت سەردارەکەیان وەك پێویست تێریان ناکات، بۆیە دووقاتی نرخی هووشترەکە غەرامەی لە سەردارەکەیان سەند بۆ ئەوەی تەمێخوارد ببێت . کە کار بە بنەمای"درء الحدود بالشبهات" ئەکرێت لەبەر ئەوەیە کە ئیسلام وەنەبێ عەشقی سزاو تۆڵەکردنەوە بێت، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە کە خەڵکی تەمێخوارد بکات و تاوان تا ئەو پەڕی توانا کەمبکاتەوە، چونکە کەمێکیش لەو سزایە بەسە بۆ ترساندنی خەڵکی خراپ[156]زانایان نمونەی زۆر دێننەوە بۆ ئەم بنەمایە: بۆ نمونە ئەڵێن:"ئەگەر دز بریتی بوو لە باوك یان لە مێرد دەستی

---

[155] محمد بن على بن محمد (الشوكاني)– نيل الأوطار– طبعة شركة الطباعة الفنية المتحدة: (١١٨/٧).
– وقد أخرج الحديث ابن ماجة من حديث أبي هريرة، وأخرجه الترمذي والحاكم والبيهقي من حديث عائشة وأخرجه البيهقي أيضا عن عمر وعقبة بن عامر ومعاذ بن جبل موقوفا وأخرجه من حديث علي مرفوعا ادرؤوا الحدود فقط وأخرجه الطبراني موقوفا (الأشباه والنظائر للسيوطي طبعة مصطفى البابي الحلبي سنة (١٩٥٩م)، ص١٢٢).

[156] مجلة مجمع الفقه الاسلامي التابع لمنظمة المؤتمر الاسلامي بجدة، تصدر عن منظمة المؤتمر الاسلامي بجدة

نابڕرێت"یان لەکاتی گرانی و برسێتیدا بێت، ئیسلام لەو کاتانەشدا دەستی دز نابڕێت،بەڵام دیارە خۆ خەڵات و بەراتیشی ناکات لەسەر ئەو دزیانە بەڵکو سزای تری ئەدات جگە لە دەستبڕین..ئەمانەش بەدرێژی لە کتێبە یاساییەکانی ئیسلامدا بەدرێژی باسیان لێوەکراوەو ئێرە شوێنی درێژەدان بەو بابەتانە نیە.

## بڕگەی هەشتەم

## نمونەیەك لە هەڵە کۆمەڵایەتیەکان وەك قەشە فادی ئەیڵێت

ئەمە ئەو بەشە بوو کە ئەرکی سەرشانی من بوو وەڵامی هەمووی بدەمەوە، بەڵام نەبوو بە نسیبی من، لەم بەشەدا قەشە فادی (٢١) تانە ئەدات لە قورئان لە روانگەی ئەو رەخنە نالۆژیکی و نازانستیانەی خۆیەوە بڕیارئەدات کە قورئان پارێزراە نیەو ئاسمانی نیە!

یەکێك لەو رەخنانەی قەشە فادی بریتیە لە رەتکردنەوەی چەمکی جزییە، ئەڵێ: چۆن میللەتێك رێگە بەخۆیان ئەدەن کە بەناوی ئایینەوە لەگەڵ خەڵکیدا بجەنگن و هەڵبژێریان بکەن لەنێوان موسڵمانبوون یان مردن یان سەرانەداندا؟[157].

لە وەڵامی ئەم رەخنەیەدا دوو بڕگە بڵێین:

یەکەم: ئایا کتێبە پیرۆزەکەی قەشە فادی چی ئەڵێ لەم بارەیەوە؟

دووەم:چەمکی جزیە لە ئیسلامدا چییەو پاساوەکانی چەندێك لۆژیکی و ئینسانین؟

### یەکەم: جزیەو کتێبی پیرۆز

ئەوەی جێگەی سەرسوڕمانە لەم قەشە چەواشەکەرە ئەوەیە لە هەرشوێنێك و لە هەر بابەتێکی قورئان رەخنە ئەگرێت لەدوور لە نزیك ئاماژە بۆ ئەوە ناکات کە

---

[157] ل: ٢٤٨

کتێبی پیرۆزی خۆشیان ئەو باس و بابەتەی باسکردووە یان نەیکردووە؟!جوان باسیکردووە یان ناشیرین باسیکردووە؟ ئیتر یان ئەو ئاگای لە کتێبی پیرۆزی خۆی نیە! یان ئاگای لێیەتی بەڵام وائەزانێ کەس ئاگاداری ئەو زانیاریانە نیەو قەیناکات ئەم باسیانبکات و بیانخاتە ملی ئیسلام و قورئان!ئەگینا یانی چی ئەوەندە بەسەرسوڕمانەوە باسی جزیەئەکات و ئەڵێ: چۆن میللەتێك رێگە بەخۆیانئەدەن کە بەناوی ئاینەوە لەگەڵ خەڵکیدا بجەنگن و هەڵبژێریان بکەن لەنێوان موسڵمانبوون یان مردن یان سەرانەداندا؟؟!..لە کاتێکدا کتێبی پیرۆزدەیان جار باسی ئەم جزییە وەرگرتنە ئەکات لە سیاقی مەدحدا بۆ نمونە:

ـ لە (سفر القضاة ١ : ١ )دا هاتووە کە نەوەکانی ئیسرائیل داوا لە خوا ئەکەن و ئەڵێن:( من منّا يصعد الى الكنعانيين اولا لمحاربتهم . فقال الرب يهوذا يصعد. هوذا قد دفعت الارض الى يده)[١٥٨]

* لە شوێنێکی تردا ئەڵێ:(فلم يطردوا الكنعانيين الساكنين في جازر. فسكن الكنعانيون في وسط افرايم الى هذا اليوم وكانوا عبيداً تحت الجزية)، سفر يشوع ١٦: ١٠

* لە( الأعداد ٣٠ _ ٣٣ )دا ئەبینین کە جزیە لەکەنعانیەکان ئەسەنن، هەروەها جزیە لە دانیشتوانی(قطرون و نهلول وبيت شمس و بيت عناة) و جگە لەوانیش ئەسەنن .

* هەر لە کتێبە پیرۆزەکەیاندا ئەبینین کە حەزرەتی سولەیمان (سەلامی خوای لێبێت) دەسەڵاتی بەسەر هەموو میرنشینەکاندا هەبووە لە رووبارەوە بۆ سەرزەمینی فەلەستین و تا ئەگاتە سنوورەکانی میصر، هەموو ئەو هەرێمانەش

---

[١٥٨] لە نوسخەی بەردەستی مندا (١٩٩٩، عربی/ انكليزی) نووسراوە: (بعد موت يشوع سأل بنو اسائيل الرب: من منا يذهب اولا لمحاربة الكنعانين؟ فاجاب الرب: يهوذا يذهب، فقد اسلمت الارض الى يده). الكتاب المقدس، كتاب الحياة، (كتاب القضاة:ص٣٩٦)، لە (ص٣٩٧)یشدا ئەڵێ: "و لم يطرد ابناء زبلون الكنعانيين المستوطنين في قطرون و نهلول، فاقام الكنعانيون بينهم، و فرضوا عليهم الجزية...)، پاشان باسی چەند خێڵ و میللەتی تر ئەکات کە جزیەیان خراوەتەسەر!.

جزیەیان پێئەداو لە تەواوی ژیانیاندا ملکەچی ئەو بوون. لە"ملوك الأول ٤ : ٢١ "دا و بەدەق لە کتێبی"الحياة"دا هاتووە: (فكانت هذه الممالك تقدم له الجزية وتخضع له كل ايام حياته )، لە ژیاننامەی (الفانديك)یشدا هاتووە :( كانوا يقدمون الهدايا ويخدمون سليمان كل أيام حياته ).

* نەك هەر ئەمە بەڵكو کتێبی پیرۆزیان پڕە لە شەریعەت و سیستەم دەربارەی باج و سەرانە کە زۆر قورسترە لە جزیەو مایەی نادادیشە بۆ خەڵکی، بۆ نمونە لە(سفر التثنية ٢٠ : ١٠)دا هاتووە کە خوا فەرمان بە موسا ئەکات و پێیئەڵێ:( حين تقرب من مدينة لكي تحاربها استدعها الى الصلح. فان اجابتك الى الصلح وفتحت لك فكل الشعب الموجود فيها يكون لك للتسخير ويستعبد لك).

* نووسەری"سفر صموئيل الثاني ٨ : ١ " وەك لە ژیاننامەی داوددا هاتووە و دەربارەی ئەو ئەگێڕێتەوەو ئەڵێ:( وقهر أيضاً الموآبيين وجعلهم يرقدون على الأرض في صفوف متراصة، وقاسهم بالحبل . فكان يقتل صفين ويستبقي صفاً . فأصبح الموآبيين عبيداً لداود يدفعون له الجزية.)،لە ( العدد ١٥ )یشدا هاتووەو ئەڵێ:( وكان الرب ينصر داود حيثما توجه).

* بابەتی جزیەوەرگرتن بابەتێکی روونی ناو تەوراتەو مەسیحیش( عليه‌السلام) یەك وشە چییە لێوەی دەرنەچووە باس لەوە بکات کە ئەو شەریعەتەی سڕیوەتەوە یان گۆڕیویەتی و نەسخیکردبێت بە شتێکی تر، نەك ئەوە بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەو سیستەمەی دوپاتکردووەتەوە لەناو مەسیحیەکاندا، وەك لە(رسالة رومية٧:١٣)دا بەدەق هاتووەو ئەڵێ: (( فاعطوا الجميع حقوقهم . الجزية لمن له الجزية . الجباية لمن له الجباية . والخوف لمن له الخوف والاكرام لمن له الاكرام) !

* مەسیح خۆشی جزیەی داوەو ملکەچی ئەو یاسایە بووە لە ژیانیدا وەك لە (إنجيل:متى ١٧ : ٢٤– ٢٧)دا هاتووەو ئەڵێ: " ولما جاءوا إلى كفر ناحوم تقدم الذين يأخذون الدرهمين إلى بطرس وقالوا أما يوفي معلمكم الدرهمين ؟ قال بلى . فلما دخل البيت سبقه يسوع قائلًا ماذا تظن يا سمعان من يأخذ ملوك الأرض الجباية أو الجزية

أمن بينهم أم مز الأجانب . قال له بطرس من الأجانب . قال له يسوع فإذًا البنون أحرار . ولكن لئلا نعثرهم اذهب إلى البحر والق صنارةوالسمكة التي تطلع أولا خذها ومتى فتحت فاها تجد إستارًا فخذه واعطهم عني وعنك "

ئيتر نازانم قەشە فادی یان جگە لەویش چۆن دێن قورئان بەوە عەیبدار ئەکەن کە باسی جزیەی کردووە؟ ئەی مەگەر قەشە فادی نازانێ کە ئەوە لە راستیدا عەیبدارکردن و تانەدانە لە کتێبە پیرۆزەکەی خۆی پێش ئەوەی تانەبێت لە قورئان؟!

## دووەم: جزیە لە ئیسلامدا

چەمکی جزیە چییە لە ئیسلامدا؟ لەسەر کێ دائەنرێ؟ برەکەی چەندە؟ ئایا لەسەری لائەچێت؟ کەی لەسەری لائەچێت؟

* (جزیە): بریتییە لەو برە پارەیەی کە ساڵانە ئەخرێتە سەر پیاوی عاقڵی ئازادی ئیشکەری دەوڵەمەندی باڵغی غەیری موسڵمان کە لە ناو دەوڵەتی ئیسلامیدا ئەژیو قبووڵی (هاوڵاتێتی) کردووە لەو وڵاتەدا، بەڵام ئیسلامی قبووڵ نەکردووەو ئامادە نیە بەرگری لە قەوارەی ئیسلامی بکات.

* جزیە تەنیا لە پیاوانی عاقڵ و باڵغ وەردەگیرێت واتە نەلە ژنو نە لە مناڵ نە لە شێتو نە لە کۆیلە وەرناگیرێت.

* جزیە لە پیاوانی هەژارو بێئیش وەرناگیرێت.[١٥٩]

ئاستەکانی توانای جزیەدان سێ ئاستە:

* یەکەم: ئاستە دەوڵەمەندەکان وەك: ئاڵتونچی، بازرگان، خاوەن کۆمپانیاکان، دکتۆری ناودار.. هتد.

* دووەم: ئاستە مامناوەندەکان وەك ئەوانەی سەرەوە بەڵام وەك ئەوان ناوبانگیان نییە بۆ دەوڵەمەندیو سەرمایەداری.

---

[١٥٩] الأحكام السلطانية ـ الماوردي ١٣٨.

* سێهەم: ئاستەکانی خوار ئەوان وەك: ئاسنگەرەکان، دارتاشەکان، بەکورتی ئەوانەی کە پیشەیەکیان هەیە.[١٦٠]

* ئیمامی شافیعی ئەفەرموێت: "ساڵێك جارێك جزیە ئەسەنرێتو لانی کەم دینارێك لای سەروەشی ئەدرێتە دەست بڕیاری موسڵمانان".[١٦١] ئەبوحەنیفە ئەفەرموێت: "لای کەمی (٥) درهەمەو لای سەری جێگەی ئیجتیهادە".

* جزیە لە زمانی عەرەبیدا بەو مانایە دێت، شتێك لە پاداشتو جەزای شتێکی تردا بدرێت واتە: لە پاداشتی ئەوەی کە ئەمان سەروماڵیان ئەپارێزرێت ساڵانە (پێنج) درهەم یان (یەك) دینار ئەدەن، یان لە جەزای ئەوەی کە ئەمان کافرنو ئیسلام قەبووڵ ناکەن (و ئامادەنین بەرگری لە قەوارەو دەوڵەتی ئیسلامی بکەن) ئەوە جزیە ئەدەن.[١٦٢]

* پێغەمبەر(صلى الله عليه واله وسلم)بنەمایەکی داناوە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکی ناموسڵمانداو ئەفەرموێ:(سنوا بهم سنة اهل الكتاب)، واتە: بە یاساو سیستەمی خاوەن کتێبەکان مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن، ئەم فەرموودەیە بووبە بنەماو لە دەورانی خیلافەتی ئیسلامیدا هەموو دینەکان چ ئەو دینانەی تەرزیان لە ئاسمانەوە هاتبوو چ ئەو دینانەش تەرزیان لە زەمینەوە هاتبوو، واتە: چ ئاینە ئاسمانیەکان و چ ئایینە زەمینییەکانیش! مامەڵەی ئەهلی کیتابیان لەگەڵدا ئەکرا بە قیاس لەسەر ئەم حەدیسەی پێغەمبەر(صلى الله عليه واله وسلم) کە دەربارەی ئاگرپەرستان ئەیفەرموێ: "سنوا بهم سنة اهل الكتاب"، وەك"عبد

---

[١٦٠] الخراج، أبويوسف (ص١٤٨).

[١٦١] الأحكام السلطانية الفراء ١٣٨.

[١٦٢] الأحكام السلطانية الفراء ١٥٣.، رستەی(ئامادەنین بەرگری لە قەوارەو دەوڵەتی ئیسلامی بکەن) لە پێناسەکەی ماوردییدا نیە بەڵام بۆ ئەوەی پێناسەکە وەك ئەڵێن"جامع و مانع"بێت پێویستە ئەوەی تێدا بێت، چونکە هەرکات ئامادەبوون بەرگری لە دەوڵەتی ئیسلامی بکەن ئەوە یەکسەر جزیەکەیان لەسەر لائەچێت.

الرحمن"ی کوڕی"عوف"دەربارەی ئاگرپەرستان ئەفەرموێ: (أشهد لسمعت رسول الله صلّى الله عليه وسلم يقول: سنوا بهم سنة أهل الكتاب).

ئیمامی شافیعی ریوایەتی ئەکات، ئیمامی مالیکیش لە"الموطأ"دا لـە جەعفـەری کوڕی موحەمەدەوە ئەویش لە باوکیەوە ئەگێڕێتەوە : کە عومەری کـوڕی خـەتاب فەرمویـەتی: "لا أدری مـا أصـنع بـالمجوس"، عەبـدوڕڕەحمانی کـوڕی عـەوف فەرموی:"أشهد لسمعت رسول الله صلّى الله عليه وسلم يقول: «سنوا بهم سنة أهـل الكتاب»، من شایەتم کە پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) ئەیفەرموو: مامەڵەی ئـەهلی کتێبیـان لەگەڵـدا بکـەن، هەرچـەندە ئـەم فەرموودەیـە"منقطـع"ە ،بـەڵام پیـاوانی رشـتەکەی هـەموو"ثقـات"ن، هـەروەها بـەزار ودارەقـوتنی وئـیبن ئـەبی شەیبەش بە مورسەلی ریوایەتیان کردووە.[١٦٣]

* ئیمامی بەیهەقی بەسـەنەدی خـۆی ریوایـەت ئـەکات و ئەفـەرموێ: (وَرُوِّينَـا عـن النَّبِيِّ صلى الله عليه وسـلم أنـه قـال : ألا مـن ظلـم معاهـدا اوانتقصـه اوكلفـه فـوق طاقته أو أخذ منه شيئا بغير طيب نفس منه فأنا حجيجه يوم القيامة ، ألا ومن قتل معاهدا حرم الله عليه ريح الجنة ، وإن ريحها لتوجد مـن مسـيرة سـبعين خريفـا، وفي رواية أخرى: أربعين عاما)[١٦٤].

لە عومەریشەوە ئەگێڕنەوە کە: «أنه لم يأخذ الجزية من المجوس حتـى شـهد عبد الرحمن ابن عوف أن رسول الله صلّى الله عليه وسلم أخذها مـن مجـوس هجَـر» ئیمام ئەحمەد وبوخاری وئەبو داود وتیرمیزی ریوایەتی ئەم حەدیسە ئەکەن.[١٦٥]

* ئەبو یوسف لـە " کتـاب الخـراج "دا ئـەڵێت:" جميـع أهـل الشـرك مـن المجـوس وعبدة الأوثان وعبدة النيران والحجارة والصابئين يؤخـذ مـنهم الجزيـة مـا خـلا أهـل

---

[١٦٣] بڕوانە: (جامع الأصول: ٣/٢٦٤، نصب الراية: ٣/٤٤٨، نيل الأوطار: ٨/٥٦).

[١٦٤] السنن الصغرى، البيهقى(٣/١٤١)، باب:الصلح على غير الدينار.

[١٦٥] بڕوانە (جامع الأصول: ص ٢٦١، نصب الراية: ص٤٤٨، نيل الأوطار: ٨/٥٦، سبل السلام: ٤/٦٥).

الردة من أهل الإسلام وأهل الأوثان من العرب والعجم فإن الحكم فيهم أن يعرض عليهم الإسلام فإن أسلموا و إلّا قتل الرجال منهم..).[١٦٦]

* ئیمامی شافیعی لە موسنەدەکەیدا ئەفەرموێ:(أن رجلاً من المسلمين أُخذ على عهد علي(رضي الله عنه)وقد قتل رجلاً من أهل الذمة، فحكم عليه بالقصاص، فجاء أخوه، واختار الدية بدلاً عن القود، فقال له علي: "لعلهم فرقوك أو فزّعوك أو هددوك؟" فقال: لا ، بل قد أخذت الدية، ولا أظن أخي يعود إلي بقتل هذا الرجل، فأطلق علي القاتل، وقال: "أنت أعلم، من كانت له ذمتنا، فدمه كدمنا، وديته كديتنا"..یانی: لەسەردەمی حەزرەتی عەلیدا کابرایەکیان گرت کە یەکێك لە ئەهلی زیممەی کوشتبوو، بڕیاردرا بەسەر کابرادا کە بکوژرێتەوە، برای کابرا کوژراوەکە هات و خوێنوەرگرتنی هەڵبژارد لە بری کوشتنەوەی کابرادا، عەلی پێیفەرموو: لەوانەیە کە ترساندبێتیان یان هەڕەشەیان لێکردبی؟ کابرا ووتی: نەخێر(وانیە)، من خۆم خوێنم داواکردووە، چونکە ئەزانم خۆ بە کوشتنی ئەو کابرایە براکەم زیندوونابێتەوە! عەلیش کابرای بکوژی بەرەڵاکرد، پاشان فەرمووی: "أنت أعلم، من كانت له ذمتنا، فدمه كدمنا، وديته كديتنا"، تۆ خۆت باشتر ئەزانی، هەرکەس پەیمانی لەگەڵمان هەبێت ئەوە خوێنی وەك خوێنی ئێمە وایەو خوێندانەکەشی وەك خوێندانی ئێمە وایە.. لە دەربڕینێکی تردا هاتووە کە ئەڵێ: قەرزیشی وەك قەرزی ئێمە وایە.

* هەر ئیمامی عەلی ئەفەرموێ: (إنما بذلوا الجزية، لتكون دماؤهم كدمائنا، وأموالهم كأموالنا).. لە"مصنف الامام عبدالرزاق"دا هاتووە کە کەسێکی موسڵمان کەسێکی ئەهلی زیممەی کوشت لە سەردەمی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزدا،عومەریش کابرای موسڵمانی کوشتەوە ، ئەمەش بۆیە وایە چونکە فەرموودەی پێغەمبەر(صلى الله عليهوالە وسلم) ئەوەی بریوەتەوە وەك ئەفەرموێ:(من قتل معاهَداً لم يرح رائحة الجنة، وإن ريحها ليوجد من مسيرة أربعين

---

[١٦٦] بڕوانە:"أحكام القرآن : الجصاص : ( ٣ / ١٠٠ – ١٠٢ )" ..

عاماً)[١٦٧] . ئیبن حەجەریش ئەفەرموێ: "المراد به من له عهد مـع المسـلمين، سـواء كان بعقد جزية أو هدنة من سلطان أو أمان من مسلم"[١٦٨] .

ئیبنولقـەییمی جەوزییـە ئەفـەرموێ:"المسـتأمن يحـرم قتلـه، وتضـمن نفسـه، ويقطـع بسـرقة مالـه"[١٦٩].ئەوکەسـەی ئـەمانی پێـدراوە حەرامـە بکوژرێـت و ئـەبێ خوێنی بپارێزرێت، هەرکەسیش ماڵەکەی بدزێت دەستی ئەبڕرێت.

عەبدوڕەززاق لە ئیبراهیمی نەخەعییەوە ئەگێڕێتەوە کە لە سـەردەمی عومـەردا پیـاوێکی موسـڵمان کەسـێکی لـە ئـەهلی زیممـە کوشـت کـە خـەڵکی حـیرە بـوو، عومەریش لەبری ئەو پیاوەدا کوشتیەوە.[١٧٠]

* مەیمونی کوڕی مەهران ئەگێڕێتەوە کە عومـەری کـوڕی عەبدولعـەزیز نامەیـەکی نووسی بۆ هەندێ لەوالیەکانی سەبارەت بەئەو موسـڵمانەی کـە یـەکێك لـە ئـەهلی زیممـەی کوشـتبوو، فـەرمانی پێکـرد کـە بکوژەکـە تەسـلیم بـە کـەس و کـاری کوژراوەکە بکەن تا ئەگەر ویستیان لەبری کوژراوەکەیان بیکوژنەوە، یان ویستیان لێیخۆش بن، مەیمونی کوڕی مەهران ئەڵێ: والیەکەش بکوژەکەی تەسـلیمکردن و درا لەملی و منیش سەیرمئەکرد![١٧١] .

* فەلسەفەی جزیەدان وەك زانایان باسی ئەکەن چەند شتێکە:

١ـ لەبەرئەوەی "ئەهلی زیممە" هـاوڵاتین‌و وەك موسـڵمانان تـەواوی سـوود لـە تەواوی دامەزراوەو دەزگاکانی دەوڵـەت وەردەگـرن و"ئـەمان" یـان پـێ ئـەدرێت‌و نـەك هـەر ئـەوە بـەڵکو کـەمترین سـتەم چـییە ناکەوێتـە سـەریان، چـونکە ئـەوان

---

[١٦٧] الحضارة الإسلامية بين أصالة الماضي وآمال المستقبل،جمع وإعداد:الباحث في القرآن والسـنة علـي بن نايف الشحود.کتێبێکی گەورەی نۆ بەرگییـەو دکتـۆر عـەلی نـایف لـە ئینتەرنێتـەوە وەریگرتـووەو کۆیکردوونەتەوە، بەراستی یەکێکە لەهەرە کتێبە ناوەزەکان..

[١٦٨] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[١٦٩] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[١٧٠] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[١٧١] هەمان سەرچاوەی پێشوو

پێغەمبـەری ئیسـلام(صـلى الله علیـه و الـه وسـلم)خاوەنیانـەو ئـەو لـە پـەیمانو بەڵێنـەکانیان ئەپرسـێتەوە.. ئـیبن عومـەر ئەفـەرموێت: "کـان آخـر مـا تکلـم بـه النبی(صلى الله علیه و اله وسلم) ان قال: احفظونی في ذمتی"[١٧٢].

٢ـ داوا لە "ئەهلی زیممە" ناکرێت، سـەربازی بکـەن، بـۆ دەوڵـەتی ئیسـلامی و سـنوورەکانی دەوڵـەت بپـارێزنو بەشـداری شـەڕو غـەزا بکـەن وەك چـۆن داوا لـە موسڵمانەکان ئەکرێتو فەرزە لەسەریان، ئـەوەش "لـۆژیکێکی واقیعـی" ئیسـلامە کە داوا لە کەسێك ناکرێت کە بڕوای بە عەقیدەو دینی ئیسلام نییە بێت بەرگری لە قەوارەکەی بکات!

٣ـ هەرکەسێکیش کە بەشـداری (شـەڕ) بکـاتو بـەرگری لـەوڵاتو گـەل بکـات، جزیەی لەسەر هەڵدەگیرێت.

٤ـ هەرکەسێکیش لە "ئەهلی زیممە" موسڵمان ببێت ئەوە ئۆتۆماتیکی جزیـەی لەسەر نامێنێتو وەك موسڵمانان تەنیا زەکاتی شەرعی ئەکەوێتە سەر.

٥ـ ئەگەر دەوڵەمەندی موسڵمان ساڵانە زەکات بدات، بۆ ئەهلی زیممە دوو حاڵ هەیە: یان زەکاتیش لە دەوڵەمەندەکانی ئەوان بسـەنرێت کـە نـەبڕوایان بەئیسـلام هەیەو نەبڕوایان بەزەکات هەیە، یان ئەبێت هیچیان لێنەسەنرێت و هیچ ئەرکێکیان لەسەر نەبێت بەرانبەر بە دەوڵەت.

جا لە هەردوو حاڵەتەکەدا ستەمو جیاکردنـەوە دروسـتئەبێت، ئەمـەی زەکـاتی لێبسەنرێت وەك موسڵمانەکان ستەمو ناڕەواییەو ئەو بڕوای بە زەکـاتو بەئیسـلام نییە چۆن زەکاتی لێئەسەنرێت؟! ئەگەر موسڵمانەکان زەکات بـدەنو ئـەوان هـەر هیچ نەدەن ئەوەش ستەمو جیاکردنەوەیە، وای لێدێ "ئـەهلی زیممـە" هـەموویان پاڵیلێئەدەنـەوە و بـەردەوام داوای (مـاف) ئەکـەنو هـیچ (ئـەرك)ێکـیش ناکەوێتـە سـەریان و سیسـتمێکی چـینایەتی بێپاسـاو –کـە سەرەنجامیشـی بـاش نابێـت– دروست ئەبێت لە کۆمەڵگەدا.

---

[١٧٢] الأحکام السلطانیة (١٢٧و ١٢٨).

٦ـ جزیە لەسەر"ئەهلی زیممە" نامێنێت کاتێك موسڵمانان توانای پاراستن‌و بەرگریکردنیان نەمێنێت لێیان.

(بەلازەری) مێژوونوسی چەرخی عەبباسی لە کتێبی (فتوح البلدان)دا ئەڵێت:

"موسڵمانان کاتێك چوونە (حمص) جزیەیان لە ئەهلی کیتابی ئەوێ سەند لەوانەیان کە نەیانویست بێنە ناو ئیسلام، بەڵام کاتێك کە زانییان ڕۆم سوپایەکی گەورەی ناوە بەیەکەوە بەنیازە بکاتە سەریان و شارەکەیان لێ بسەننەوە، موسڵمانان هەستیانکرد کە ناتوانن بەرگری لە شارەکەو خەڵکەکە بکەن، بۆیە هەموو ئەو جزیەی وەریانگرتبوو گەڕاندیانەوە بۆ خەڵکەکەو پێیان وتن: ئێمە توانای پاراستنی ئێوەمان نییە بۆیە خۆتان ئازادن چیدەکەن. "ئەهلی حمص" وتیان: أن ولايتكم وعدلكم أحب الينا مما كنا فيه من الظلم والغشم، ولندفعن جند هرقل، عن المدينة مع عاملكم". ڕیوایەتەکە دەڵێت: "ونهضوا بذلك فسقط عنهم الجزية"[١٧٣]. (*)

* خاڵێك هەیەو من زۆر بە گرنگی ئەزانم کە سەرنجی خوێنەرانی بۆ ڕابکێشم ئەویش ئەوەیە، ئەم جزیەدانە لەسەرەتادا لای ئەهلی کیتاب و ئەوانەی حوکمی ئەوانیان هەیە زۆر سووکترو چاکترە لە شەڕ یان قەبوڵکردنی ئیسلام، چونکە نەئیسلام‌و نەئەهلی ئیسلام ناناسن، بەڵام بە درێژایی مێژوو ئەوە دووبارە بووەتەوە کە کاتێك "ئەهلی زیممە" –بە تێپەڕبوونی کات‌و ساڵ– جوانی‌و گەورەیی ئیسلامیان بۆ دەرکەوتووەو دادی ئیسلامیان بۆ ڕۆشنبۆتەوە، شایەتمانیان هێناوەو بوونەتە موسڵمان‌و ئیتر جزیەیان لەسەر نەماوە.

مێژوو ئەڵێت:"لەسەردەمی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزدا ئەوەندە خەڵك لە "ئەهلی زیممە"موسڵمان بوون‌و ڕوویانکردە ئیسلام یەکێك لە کاربەدەستەکانی عومەر کاغەزێکی بۆ عومەر نوسی‌و تێیدا پێشبینی ئەوەی کردبوو کە لەوانەیە هەموو "ئەهلی کتاب" موسڵمان ببن، و سەرچاوەیەکی دارایی کە جزیەیە هەر

---

[١٧٣] فتوح البلدان ص١٤٣.

نـەمێنێتو (بیـت المـال) زیـانێکی گـەورەی لێبکـەوێت بـۆ مەحکـەمکردنی سـوپاو سنورەکانی دەوڵەت. عومەریش بۆی نوسییەوەو فەرمووی: نامەکـەتم پێگەیشـتو لە مەبەستەکەت حاڵی بووم، وەڵڵاهی من حەزم لەوەیە هـەموو خـەڵکی موسـڵمان بن. منو تۆش ببینە جوتیارو ئەو کاتەم خۆشە کە دیاردەی وا دەبینم و ئامـادەم و پێمخۆشــە مــنو تــۆیش بچــین زەوی بکـێڵینو نـانی کاسـبی دەسـتی خۆمـان بخۆین"[١٧٤].

* جزیە چ بڕەکەی و چ چۆنییەتیەکەی کارێکی ئیجتیهادییەو سەرۆکی

وڵاتو شـوورای ئیسـلامی بۆیـان هەیـە قسـە لەسـەر هـەموو بڕگـەکانی بکـەنو یاساو ڕێنمایی تایبەتی بۆ دابنێنو هەندێك لە زانایان دەڵێن: دیاری کردنـی جزیـەو چۆنییەتییەکەی پەیوەندی بە هەردوو لایەنی (ئیسلامی)و (غەیرە ئیسلامی) یـەوە هەیە، واتە بە ڕەزامەندی ئەهلی ئیسلامو ئەهلی ئایینەکانی تر دائەنرێت، تەنانەت ئەو بڕیارانە ئەچـێتە نـاو شـوورای ئیسـلامیو لەوێـدا (متمانـە)ی پێئەبەخشـرێتو ئەبێتە یاسا، جا کەواتـە جزیـە هـەر تـەنیا وشـەیەك نییـە دووسـێ قسـەی لەسـەر بکرێـت و تــەنیا گــوێ بـۆ ڕایــەکی تایبــەتی زانایــەکی تایبــەت بگیرێـت کـە لـە سەردەمێکی تایبەتدا کردوویەتیو وابزانرێت ئەوە ئیتر تانو پۆی باسەکەیە.

* جزیەش هەمیشە هاوڕێ نابێت لەگەڵ ئەهلی زیممەدا وەك هەندێ

کەس واگومانئەبەن، بەڵکو زانایان هەموو لەسەر ئەوە یەکڕان کە ئـەم جزیەیـە لەبری سـەربازی نـەکردن وەردەگیرێـت و ئـەوەی ئامادەبێـت سـەربازی بکـات بـۆ دەوڵەتی ئیسلامی و بـەرگری لـە قەوارەکـەی بکـات ئـەوە ئۆتۆمـاتیکی جزیەکـەی لەسەر لائەچێت، بۆیە صەحابەو تابیعینەکان جزیـەیان لەسـەر ئەوانـە لائـەبرد کـە ئـەو ئامادەییـەیان دەرئـەبڕی، وەك چـۆن موسـڵمانان لەگـەڵ خـەڵکی ئـەرمینیادا ئەمەیانکرد لە ساڵی(٥٢٢) دا، یان حەبیبی کوڕی مەسلەمەی فیهری لەگەڵ خەڵکی ئەنتاکیەدا هەمان ئیشی کرد، نوێنەری ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەرراحیش وایکـردو

---

[١٧٤] سیرة عمر بن عبدالعزیز ـ السیوطی ص٩٩ـ ١٠٠.

هەموو ئەو صەحابانەش لەگەڵیدا بوون ئەوەیان قەبوڵکردو سەلماندیان، خەڵکی قوبروسیش لە سەردەمی موعاویەدا لەسەر ئەوە رێکەوتن کە بێلایەن بن لەبەرانبەر ئەمان و رۆمەکانداو تەنیا خەراجێك بدەن.

* هەندێ لە زانایان و نووسەرانی ئەم سەردەمە قەناعەتیان وایە کە

چەمکی هاوڵاتیبوون لەم رۆژگارەدا جێگەیەکی بۆ چەمکی جزیە و ساڵانە نەهێشتووەتەوەو هیچ حکومەتێك قەبووڵناکات لەکەس بەرگری لە نیشتمان و دەوڵەتەکەی نەکات، خزمەتی سەربازی ئیشێکی تەوزیمیەو بەو شێوەیەش جێگەیەك نەماوە بۆ جزیەوەرگرتن، مەگەر حاڵەتێکی تازە لەناو دەوڵەتی ئیسلامیدا بێتەپێش و لەسەر داواو پێشنیاری ناموسڵمانەکانی ناو دەوڵەتی ئیسلامی داوای وەها ئیمتیازێك لە دەوڵەت بکەن و بڵێن: ئێمە تا ئێستا بەبێ ویستی خۆمان سەربازیمان پێکراوەو داواکارین ئەو ئەرکەمان لەسەرلابرێت و لەبەرانبەردا ساڵانەیەکمان لەسەر دابنرێت، دەوڵەتیش ئەو داواو پێشنیارەیان لێقەبوڵبکات و خزمەتی سەربازی و بەرگری لە دەوڵەتیان لەسەرشان بخات و لە بەرانبەریدا جزیەیەك یان ساڵانەیەکیان بخاتەسەر.

لە میانەی ئەم دوو برگەیەوە کە باسمانکردن(جزیە لە مەسیحییەتداو جزیە لە ئیسلامدا) روونئەبێتەوە کە قەشە فادی چەندە نەزانانەو بێویژدانانە دەمی بردووە بۆ باسی جزیە بە گشتی و جزیە بە تایبەتی لە ئیسلامداو بەناڕەوا کردوویەتی بە تانەیەك لە قورئان .

# برگەی نۆیەم

## نمونەیەك لە هەڵە زانستیەکان وەك قەشە فادی ئەیڵێت

قەشە فادی لەم بەشەدا وەك بەشەکانی تر(٢٢) رەخنە لە قورئان ئەگرێ بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت کە قورئان پارێزراو نیە، بەڵام لە میانەی ئەو رەخنانەوە بۆت دەردەکەوێت کە ئەم کابرایە چەندە خۆی فریوداوەو لە راستی

دووركەوتووەتـەوەو خـۆی تووشـی تـەناقوز كـردووە، بـا بـۆ نمونـە سـەیری ئـەم رەخنەیەی بكەین: قەشە فادی ئەڵێ:

لە سورەتی (الجمعه/٨)دا هاتووە: (قُلْ إِنَّ الْمَوْتَ الَّذِي تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإِنَّهُ مُلَاقِيكُمْ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَى عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ) (الجمعة:٨). بلـێ ئەو مردنەی لە دەستی ڕادەكەن بە شوێنیانەوەیە، ئەوسا بۆ لای زانای پـەنهان و شایەتیدان دەگەڕێنەوەو هەواڵی ئـەو كارانـەتان پێـدەدات كـە كردووتانـە. پاشـان ئەڵێ:

لە حەدیسی بوخاریدا هاتووە: لە عائیشەی ژنی پێغەمبەریان گێڕایەوە كە ئـەو وتوویەتی دووان لە پیرەپیاوانی یەهودی شاری مەدینە هاتنە لام و وتیان: خەڵكی لەناو گۆڕەكانیاندا ئازار دەدرێن، منیش بە درۆم خستنەوە و ئەوانیش لـەلای مـن چوونە دەرەوە.

پاشـان پێغەمبـەر هاتـەوە و ئـەوەم پـێ وت كـە ئـەوان پێیـان وتم، وە بـە پێغەمبەرم وت: من لەوەدا باوەڕم پێ نـەكردوون، ئـەویش وتـی: ئـەوان راسـتیان كردووە ئەوانە لە ناو گۆڕدا سـزاو ئازارێك دەدرێـن، كـە هەرچـی گیانـەوەر هەیـە گوێی لە دەنگیانە، عائیشە وتی: پاشان هەرگیز لـە نوێـژدا پێغەمبـەرم نـەبینیوە مەگەر دەیوت: ئەی خودایە بانگ لە تۆ دەكەم، كە بمپارێزیت لـە پەككەوتـەیی و تەمبـەڵی و ترسـنۆكی و پـیری و بانگـت لێدەكـەم كـە لـە ئـازاردانی نـاو گـۆڕ بمپارێزیت.[١٧٥]

---

[١٧٥] ل:٢٦٦. بـۆ زانیـاری زیـاتری خوێنـەرانی بـەڕێز ریوایەتەكـە نـاڵێ (دووان لـە پیرەپیـاوانی یەهودی)! !بەڵكو ئەڵێ: دخل عليّ رسول الله صلى الله عليه وسلم ، وعندي امرأة من اليهود، وهي تقول : هل شعرت أنكم تُفتنون في القبور؟..( جانـازانم ئـەم قەشـە خانەگومانـە بۆچـی ئـەڵێ: دوان لـە پـیرە پیاوانی یەهود هاتنەلام )! ...بۆ فەرموودەكە بڕوانە( إتحاف الكرام بشرح عمدة الأحكام) عبد الـرحمن بن عبد الله بن صالح السحيم..هەروەها بڕوانە: (إكمال المعلم شرح صحيح مسلم – للقاضـي عيـاض، العلامة القاضي أبو الفضل عياض اليحصبي(٢/٥٣٧).-

دوای ئەمە ئەم فەرموودەیەی تری پێغەمبەر(صلى الله عليه واله وسلم) دێنێت کە بوخاری ڕیوایەتیکردووە، پێغەمبەر(صلى الله عليه واله وسلم) ئەفەرمویٚ: (کاتێك کە عەبد (مرۆڤ) دەخرێتە گۆڕەکەیەوە و هاوڕێکانی بەجێی دەهێڵن گوێی لە تەپەی پێڵاوەکانیان دەبێت، ئەوسا دوو فریشتە دێن و دایدەنیشێنن و پێی دەڵێن: دەربارەی ئەم پیاوە (موحەممەد) چیت دەووت؟ ئەویش دەڵێت: شاهێدی دەدەم کە ئەو بەندەو نێردراوی خوایە، ئەوسا پێی دەوترێت: سەیری جێگاکەت بکە لە ئاگردا، خوا بۆی گۆڕیویتەتەوە بە جێگەیەك لە بەهەشتدا. پێغەمبەر وتی: هەردووکیان بەیەکەوە دەبینێت.

بەڵام بێباوەڕو دووڕوو دەڵێت: نازانم، من ئەوەم دەووت کە خەڵکی دەیووت، نە زانیومە و نە نوێژو نەزرم نەکردووە، یان نە قورئانم خوێندووەتەوە، ئەوسا بە چەکوشی ئاسن لە نێوان هەردوو گوێی دەدەن، ئەویش هاوارێك دەکات، کە هەرچی لەو ناوەدایە گوێی لێی دەبێت تەنها مرۆڤ و جنۆکە نەبێت/بوخاری،ج١ص١٧٣)[١٧٦].

پاشان قەشە فادی بۆ دروستکردنی گومان ئەڵێت: ئێمەش پرسیار دەکەین: ئەگەر مردوو لەناو گۆڕدا بیستەر بێت و هەست بە ئازار بکات، ئایا لەبەرچی جگە لە ئاژەڵان کەس هاواری ئازاری مردووی ناو گۆڕەکان نابیستێت؟ وە ئەگەر ئەوانەی لەناو گۆڕدان دان بە پێغەمبەرایەتی (موحەممەد)دا بنێن لە ئازاردان دەبەخشرێن؟ ئەی ئایا لەبەرچی موحەممەد خۆی بانگی لە خوا کردووە بۆ ئەوەی لە ئازاردانی ناو گۆڕ بیپارێزێت؟ لەوانەیە ئەفسانەی ئەو دوو پیرەمێردەی کە عائیشە بە درۆی خستنەوە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە گوێیان لە دەنگی کەسێك بووە، کە دوای ئەوەی وایان زانیوە مردووە خێرا ناشتویانە و کاتێك کە بەئاگاهاتۆتەوە داوای کردووە کە فریای بکەون کەسیش نەبووە کە فریای بکەوێت هەتاکو مردووە، لەمەشەوە هەواڵی ئازاردانی ناو گۆڕ بڵاوبووەتەوە.

---

[١٧٦] ئایا قورئان پارێزراوە،ل٢٦٦.

ئێمە بۆ وەڵامی ئەم کابرا حولحولی مەزهەبە ئەڵێین:

١- ئەم ئایەتەی سورەتی ئەلجومعە چ پەیوەندییەکی هەیە بە بابەتی سزای ناو قەبرەوە وا تۆ لێیئالاویت ونەشتەری رەخنەت لێهەڵگرتووە؟!

٢- تۆ ئەگەر ئەتەوێ باری سەرنجی قورئان دەربارەی سزای ناوگۆڕ بزانی ئەوە برۆ ئایەتی(٤٦)ی سورەتی(غافر)بخوێنەرەوە کە ئەفەرموێ:( النَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ أَدْخِلُوا آلَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ الْعَذَابِ)..واتە: سزای خوا چواردەوری شوێنکەوتەکانی فیرعەونی گرت سزاکە ئاگرە کە بەیانیان و ئێواران ئەبرێن بۆ ناوی و کە قیامەتیش دێتە پێشەوە فەرمانئەکرێت کە شوێنکەوتەکانی فیرعەون بخەنەناو توونددترین سزاوە. زانایانی ئیسلامی ئەم ئایەتە ئەکەنە بەڵگە بۆ سزای ناوگۆڕ، یان سزای دوای مردن و پێش هاتنی قیامەت[١٧٧].

٣–ئەمەی قەشە فادی رەخنەیە لە حەدیس نەك لە قورئان، پێدەچێت ئەوە لەو قەناعەتەی مەسیحیەکانەوە هاتبێت کە قورئان و حەدیس وەك یەکن و هەردووکیان دانراو و زادەی بیری پێغەمبەرن، یان لەوانەیە لە بیروڕایەوە هاتبێت کە چۆن لای ئەوان جیاوازی نیە لە نێوان تەورات و تەلموددا و لە نێوان ئێجیلەکان و رێنمایی پاپاو کڵێساو راسپاردەکانی کۆڕە جیاجیاو زۆرەکانی کڵێساو پیاوە ئایینیەکانیاندا، هەرواش سەیری قورئان و حەدیسی کردبێت! بەهەرحاڵ ئەمەی قەشە فادی پەیوەندی بە حەدیسەوە هەیە نەك قورئان، جا ئەگەر هەرئەوەندەی

[١٧٧] ایسر التفاسیر، ابوبکر الجزائیری (٣/٤٥٦). قورتوبی ئەڵێت:( والجمهور على أن هذا العرض في البرزخ واحتج بعض أهل العلم في تثبيت عذاب القبر بقوله ـ تعالى ـ: { النار يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوّاً وَعَشِيّاً } ما دامت الدنيا..قال مجاهد وغيره : هذه الآية تدل على عذاب القبر في الدنيا ألا تراه يقول – سبحانه – عن عذاب الآخرة : ( أدخلوا آلَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ العذاب)،وفي الحديث عن ابن مسعود : إن أرواح آل فرعون ومن كان مثلهم من الكفار ، تعرض على النار بالغداة والعشي ، فيقال : هذه داركم . . بڕوانە:(التفسیر الوسیط، محمد سيد طنطاوي)، تەفسیری ئەو ئایەتە.

لێزانیبێت ئەوە شتێکەو ئەگەر نیازی گزیکردن و چەواشەکردنی خوێنەرانیشی بێت ئەوە شتێکی ترەو لە هەردووحاڵەکەشدا شورەییە بۆی وەك شاعیرەکە ئەڵێ:

ان كنت تدري فتلك مصيـــــــــبة

و ان كنت لاتدري فالمصيبة اعظم

٤–ئەوەش کە ئەڵێ: ئایا لەبەرچی جگە لە ئاژەڵان کەس هاواری ئازاری مردووی ناو گۆڕەکان نابیستێت؟ لەوەڵامدا ئەبێ دوو خاڵ روونبکەینەوە:

أ- تواناکانی مرۆڤ سنووردارن و ناتوانن ئەو هاوارانە ببیستن.

ب–ئەگەر ئەوەندە توانا بە مرۆڤ بدرایە ئەو ئازارانە ببیستن ئەوە لە لایەك ژیان تاڵ ئەبوو لێی و خۆشی و چێژ نەئەما لەتاو ئەو ئازارانە، لە لایەکی تریش نهێنی نەئەما لە ژیانداو دەیان و بەڵکو سەدان کێشە بۆ ئەم مرۆڤە دروست ئەبوو دوای مردنی کەسە کوژراوو مردووەکانیان، چونکە هەرچی نهێنی هەیە دەرئەکەوت و ئەزانرا ئەم مردووە کێی کوشتووەو کێی بریوەو کێی کۆڵەوار کردووەو ماڵی کێی خواردووە، لە لایەکی تریشەوە ئازایەتی نەئەما لەوەدا کە خەڵکی موسڵمان ببن و شوێن دین بکەون! چونکە ئەوکاتە هەموو شتێکیان بەچاوو گوێی خۆیان دەرك ئەکردو نەیانئەتوانی موسڵمان نەبن! لەبەر ئەمانەو لەبەر ئەو شتانەش کە خوا خۆی ئەیانزانێ مرۆڤ گوێی لە سزاو لێپرسینەوەی ناو گۆڕ نابێت. پێغەمبەر(صلى الله عليه واله وسلم) ئەفەرموێ: لولا أن لا تَدافَنوا لدعوت الله أن يسمعكم من عذاب القبر ما أسمع" (مسلم ٢٨٦٨، النسائي ٢٠٥٨). واتە: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە کە دوای ئەوە مردووتان نەئەناشت داوام ئەکرد لەخوا ئەوەی من ئەیبیستم لەسزای ناو قەبر ئێوەش بتانبیستایە. لە ئەسەرێکیشدا هاتووە ئەفەرموێ: (لو تكاشفتم ما تدافنتم)[١٧٨]، یانی ئەگەر بۆ یەکتری دەربکەوتنایە ئەوە مردووتان نەئەناشت!

---

[١٧٨] لە کتێبی(الاخوان المسلمون رؤية من الداخل)وەرگیراوە.

٥-تواناکانی ئەم مرۆڤە هەموویان سنورێکی دیاریکراویان بۆ دانراوە، بینینی، بیستنی، بۆنکردنی، چەشتنی...وە هەروەها. ئەگەر بهاتایە خوای گەورە سنووری ئەو توانایانەی لەمەی کە ئێستا هەیە فراوانتر بکردایە ئەوە ژیانی دونیا لارەسەنگ ئەبوو، کۆمەڵگە تێکئەچوو، ئەم دونیایە بە کەڵکی ئەوە نەئەما کە گوزەرانی تێدا بکەی، کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی ئەگۆڕرا بۆ کۆمەڵگەیەکی ئاژەڵی و بگرە گەنتریش، ئەمانە چۆن وایە؟

زانایان ئەڵێن: توانای بینینی مرۆڤ لە سنوورێکی دیاریکراودایە، توانای بیستنی لە نێوان(٥٠٠٠) تا(٢٠٠٠٠)لەرەلەردایە، توانای بۆنکردنی لەسنوورێکدایەو ...بەو شێوەیە هەموو هەستەکانی تریشی هەروا سنوورێکیان بۆ دانراوە، بۆنمونە: مێرولەیەك لە دووری سەد مەتر نابینرێ چونکە لە ناو سنووری بینینی ئێمەدا نیە، هەر ئەو مێرووولەیە چەند دەنگێك دەرئەکات بەڵام ئێمە گوێمان لێی نییە، چونکە لە دەرەوەی سنووری بیستنی ئێمەدایە، هەر ئەو مێرووولەیە بۆنێك دەرئەکات، بەڵام ئێمە ناتوانین ئەو بۆنە بکەین، چونکە نەهاتووەتە ناو سنووری بۆنکردنی ئێمەوە، بۆ هەستەکانی تریش هەر بەو شێوەیەیە..بەڵام دروستکراوی تر هەیە ئەتوانێ ئەو بۆنە وەربگرێت یان ئەو دەنگە ببیستێت یان ئەو رەنگ و بارستاییە لەو دووریەوە ببینێت، بۆ ئێمە نیەو جوان نیەو عاقڵانە نییەو بڕیارێکی زانستیانەش نیە کە نکولی لەو شتانە بکەین هەر لەبەر ئەوەی خۆمان بۆنیان ناکەین یان نایانبیستین یان نایانبینین! !چونکە ئەوە ئاماژەیە بۆ بەجێماوی ئێمە لەزانست و لە شارو شارستانییەت و بەڵگەی نەزانین و عەقڵبچوکیە بۆمان!

با ئەمە بە شێوەیەکی تریش بڵێین: ئەگەر خوای گەورە ئەوەندەی هێز بە بینینی ئێمە بدایە-بۆ نمونە- بمانتوانیایە شت لەسەرو رەنگی وەنەوشەییەوە شت ببینین، یان بمانتوانیایە بۆن لە دووری یەك کیلۆمەترەوە بکەین، یان بمانتوانیایە گوێمان لە ئەو دەنگانەوە بوایە کە لە دووری پێنج صەد مەترەوەیە لێمان، چی روویئەدا لە ژیانماندا؟

ئەوکاتە ئەبوو قسەکردن بەسەرە بوایەو هەرکەسەو هەر گەڕەکە سەرەیان بۆ دابنرایە وەك چۆن سەرە ئاوو سەرەی نان و نۆبەتی کارەبا دیاریئەکرێت، مرۆڤ ئەگەر ئەوەندە تواناى بیستنی فراوان بکرایە گوێی لە دەنگی ماڵە دراوسێکانی بەرو دواو تەنیشتەکانی خۆی بوایە و ئەوانیش بۆ ئەم هەروەها، ئەوکاتە ژیان ئەبوویە ژاوەژاوو کەس بەکەس نەئەبوو، یان ئەگەر خوای گەورە سنووری بۆنکردنی ئێمەی مرۆڤی ئەوەندە فراوان بکردایە کە بۆنی دراوسێکانی خۆمانمان بکردایە ئەوە ئەوەندە بێزارئەبووین لە بۆنی عارەق و مەیخواردنەوەو زێرابەکانی چواردەورمان کە ناچارئەبووین سەری خۆمان هەڵگرین و ژیانمان لێتێکئەچوو، یان ئەگەر خوای گەورە سنووری بینینی ئێمەی ئەوەندە فراوان بکردایە بمانتوانیایە بە ئەندازەی تیشکی "ئێکس" چاومان بڕیبکردایە، ئەوە هیچ نرخێك بۆ جل و بەرگ و دیوارو خۆشاردنەوە نەئەماو هەموو بەدەرەوە ئەبووین و وەك ئاژەڵمان لێئەهات و هەموو نەك لەش و لاری یەکترمان ئەبینی لەژێر جلەکانمانەوە بەڵکو ناووهەناوی یەکتریشمان ئەبینی و تەنانەت دیوارەکانیش ڕێگەیان لە بینینمان نەئەگرت و هەموو لەیەکەوە دیاربووین و بەکەڵکی ژیان نەئەماین وەك مرۆڤ!! کەواتە بۆچی ئێمە تواناکانمان سنووردارکراوەو بۆ نمونە دەنگی ئەو سزایانە نابیستین کە مردوو لە گۆڕەکەیدا تووشی ئەبێت، یان ئەو فریشتانە نابینین کە بەرپرسن لەو سزادانە، ئەمە هۆکەیەتی کە ئێمە سنوور بۆ هەموو هەستەکانمان دانراوە تا بەکەڵکی ژیان بێین و ئەگەر وانەبێت ئەوە سوودی ژیان و مەبەست لە ژیان نامێنیٚ.

مرۆڤ ئەگەر لەو رووبەرە بچوکەی تێیدایە –ژوورێك بێت یان دەشتێك بێت - کەمێك وردببێتەوە، هەزاران دەنگ هەیە لەو شوێنەدا کەچی ئەو نایانبیسێت، هەزاران رەنگیش هەیە ئەو نایانبینێت، هەزاران بۆنیش هەیە ئەو بۆنیان ناکات، هەزاران تەن و تەنۆلکەش هەیە ئەو هەستیان پێناکات و نایانبینێت، هەزاران تام و چێژی جیاواز جیاوازیش هەیە ئەو ناتوانێت تامیان بکات...کەچی نەعەقڵی خۆی

و نە زانست و نە واقیع رێگەی پێنادەن نکولی لەو شتانە بکات لەبەر ئەوەی خۆی بە هەستەکانی دەرکیان پێناکات، چونکە ئەگەر رادارێك یان رادیۆیەك بهێنیٚ هەموو ئەو دەنگانەی بۆ ئەدۆزێتەوەو ئەیداتەوە کە لەدرەوەی سنووری بیستنی ئەمدان، تەلەفزیۆنێك بهێنی هەموو ئەو رەنگانەی بۆ دەرئەخات کە نەهاتوونەتە سنووری بینینی ئەمەوە، تەرمۆمەترێك بهێنیٚ رادەی شێی بۆ ئەخوێنێتەوە، مایکرۆسکۆبێك بهێنیٚ هەموو تەن و تەنۆلکە وردەکانی پیشانئەدات و بەو شێوەیە..کەواتە بۆ دونیا هەر ئەوەندە سنوور بە ئاستی دەرکی مرۆڤ بدرێت بەکەڵکەو زیاتر لەوەی پێبدرێت ئەوە ئەبێتە بەڵا بەسەریەوەو ژیانی لەبەینئەبات و ئەیباتەوە بۆ ئاستی ئاژەڵ و بگرە خوارترو خراپتریش.

با لەگۆشەنیگایەکی تریشەوە بۆ ئەم پرسی سزای ناوگۆڕە بڕوانین: لەژێر رووناکی زانستی ئەم سەردەمەدا هەندێ دەزگا دروستکراوە بۆ پاراستنی کێڵگەو شوێنە گەشتیاری و کشتیاریەکان، دەنگێکی ناخۆش و زیکن دەرئەکات کە هەرچی مارو مێرووی ئەو ناوە هەیە هەراسان ئەکات و راویانئەنێت، بەڵام مرۆڤ ئەو دەنگانە نابیستێ چونکە لەخوار سنووری بیستنی ئەوەوەیە، دەی دیارە نکولی لێکردنی ئەو راستیە نکولیکردنە لە زانست، لە عەقڵ، لە واقیع و هەرکەسیش نکولی لەوە بکات کە ئەو دەزگایە ئەو جۆرە دەنگە دەرئەکات خۆی ئەکاتە جێگەی گاڵتەی خەڵکی!.

٦ـ لە دیدی ئیسلامدا زۆر جیهان هەیە کە ئەمڕۆ لە دونیاداو بەم ئیمکاناتە سنووردارانەوە مرۆڤ ناتوانێت بیانبینێت، وەك: خوای پەروەردگار، بەهەشت، جەهەننەم، فریشتە، پەری... هەموو جیهانە فراوان و گەورەکەی غەیب و پەنهانی، بەڵام مرۆڤ لە قیامەتدا هەم فۆرم و هەم تواناکانیان ئەگۆڕدرێن، مرۆڤ لە شێوەی باوکە ئادەمدا دروستئەکرێنەوە، سنووری جەستەو هەستیەکانیشی فراوان ئەکرێن، سنووری بینین و بۆنکردن و بیستن و غەریزەی سیکس و خواردن

و... هتد، فراوان ئەبێت و توانای بینینی هەموو ئەوانەی پێئەدرێت و بەو شێوەیە دروستئەکرێتەوە کە بەکەڵکی قیامەت بێت، خوای گەورە ئەفەرموێ:

(وَنُفِخَ فِي الصُّورِ ذَلِكَ يَوْمُ الْوَعِيدِ (٢٠) وَجَاءَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَعَهَا سَائِقٌ وَشَهِيدٌ (٢١) لَقَدْ كُنْتَ فِي غَفْلَةٍ مِنْ هَذَا فَكَشَفْنَا عَنْكَ غِطَاءَكَ فَبَصَرُكَ الْيَوْمَ حَدِيدٌ).

فووئەکرێت بە کەڕەنادا، ئەوە ئەو ڕۆژەیە کە پەیماندراوە بێتە پێشەوە، هەموو کەسێك دێتە پێشەوە یەکێك کێشی ئەکات و یەکێك شایەتی لەسەر ئەدات، بێگومان تۆ لە بێئاگاییدا بووی لەم ڕاستیانە، ئێمەش پەردەمان لەسەر چاوت لادا، وا ئەمڕۆ چاوت زۆر تیژە(شتی زۆر ئەبینێت). مرۆڤ لە قیامەتدا ئەتوانێت خواو بەهەشت و جەهەننەم و فریشتەو و شتەغەیبیەکانی تر ببینێت و لەبەردەم ئەو ڕاستە گەورانەدا بوەستێتەوەو زانیاری و زانستی بگاتە پلەی "حق اليقين"[179].

٧-شاعیری گەورە مەولەوی عەللامە لە پاچەشیعرێکی تەعلیمی جواندا ئەم ڕاستیانە هەموو ڕۆشنئەکاتەوە کە بەدبەختێکی وەك قەشە فادی لێیان بێئاگایەو لەو نیعمەتە گەورەیە بێبەشە کە نیعمەتی تێگەیشتنە لە ئایین و لە خواو کاروباری خوا(جل جلاله).. مەولەوی بلیمەت ئەفەرموێ:

---

[179] زانایان زانست (علم)ئەکەنە چوار قۆناغ: وەهم، دوودڵی، گومان، زانست(یان یەقین)، زانست و یەقینیش ئەکەنە سێ پلە(علم اليقين)(عين اليقين)(حق اليقين).وەهم بوونی لە خوار لەسەدا پەنجاوەیە، دوودڵی بوون و نەبوونی لەسەدا پەنجایە، گومان بوونی لەسەروو لەسەدا پەنجاوەیە، یەقین بوونی نزیك لەسەدا سەدە، ئەم یەقینەش بڕوابوون بە بووونی شتێك(علم اليقين)ە، بینینی ئەو شتە(عين اليقين)ە، چوونە ناو ئەو شتە (حق اليقين)ە، یانی بڕوابوون بە بوونی وڵاتی چین-بۆ نمونە-(علم اليقين)ە، بینینی وڵاتی چین لە دوورەوە یان لە نزیکەوە(عين اليقين)ە، چوونە ناو وڵاتەکەو شارەکانی ئەوە(حق اليقين)ە...بۆ مەسەلە زانستی و مەعریفی و دینییەکانیش بە هەمان شێوەیە، لە وەهمەوە دەستپێئەکات تا ئەگاتە دوا پلەی بڕوابوون، بۆ زانیاری زیاتر سەیری(أضواء البيان،محمد الأمين الشنقيطي)بکە، تەفسیری ئایەتی٥١ی سوورەتی الواقعە.یان (تعريف عام بدين الاسلام،عەلی تەنتاوی).

تەعزیب و تەنعیم لە حەق لا مەدە
پێکەوە لەسەر ڕۆح و جەستە
لەلای ئەهلی حەق راسەو تاقییە
ڕۆح بەعدەز[١٨٠] مەوتی بەدەن باقییە
وابزان ئەصەح خەبەری داویێ
وەك "عەجبی ذەنەب"[١٨١] فەنای بۆ ناویێ
قول لە ئەمری ڕۆح هەڵنەکەی ، بیبەس!
قُل "الروحُ من أمر ربّی" بەس
ئەمە کە دەڵێن "مەییت" جەمادە
نەحوی تەعذیبی بۆ ناویێ، بادە
بۆچ؟ با ئیجاد کا (معطي للجزا
لە گشت ئەجزادا یا بەعضێ ئەجزا،
(نوعاً من حیاة بقَدَرِ ما
یُـدرك اللذة أو الالـما)
(وَذا ، لَعمري، لا يَستَلزِمن
إعادة الروح لِذاك البـدن)
(ولا التّحرك و لا الاضطراب
ولا ان يُرى اثر العذاب)
حەتتا مەصلووب و مەقتولی پەل پەل
مەئکولی (في البطن يُحيي و يـسأل )
مونەعەم دەویێ، موعەذەب دەویێ

---

١٨٠ لە بنەڕەتدا(بعد ان)ە، بەلاَم مامۆستا مەلا کەریمی مودەڕیس دەنگەکەی نووسیوە.

١٨١ عجب الذنب:واتە: بناغەی کلك، پێغەمبەر(صلی الله علیه واله وسلم)ئەفەرمویێ: ( وَيَبْلَى كُـلُّ شَـيْءٍ مِنَ الإِنْسَانِ إِلاَّ عَجْبَ الذَّنَبِ ، فِيهِ يُرَكَّبُ الخَلْقُ ، ثُمَّ يُنَزِّلُ اللهُ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَيَنْبُتُونَ كَمَا يَنْبُتُ البَقْلُ )) . متفق علیه . یانی: مرۆڤ هەموو شوێنێکی تیائەچێت بناغـەی کلکـی نـەبێت، لـەو بناغـەوە جـارێکی تـر دروستئەکرێتەوە، پاشان خوا بارانێك ئەبارێنێت لـە ئاسمانـەوە، هـەموو ئـەو بناغانـە ئەڕوێنـەوە وەك چۆن تۆوی پاقلە ئەڕوێتەوە.

هیچ کەسیش چاوی با پێی نەکەوێ

(مُخفي النار في الشجَرَ الاخضـر)

دەتوانی ئیخفای ئەمانە یەکسەر

ئەم نەشتەفتن و نەدینی تۆیە

ناوێ بە (نافی)ی ئەم گفتوگۆیە

دەلائیل زۆرن باوەڕت بوێ

تێفکرێ لەلات کەسێ کە[١٨٢] دەنوێ

لەخەودا دەگری و دەڵێ و دەشنەوێ

هەڵدەسێ و دەڕۆت پێی هەڵدەکەوێ

ئازاری دەوێ ،یا شادمانی

تۆیچ هەر وای لە لای هیچ پێی نازانی

(تَنَبَه الى ذلك التحريـر

"النومُ اخُ الموت" قد يشير)

(قال في الاحيا حُجة الاسـلام

عليه الرحمة في هذا المقام)

مەقاماتێ پڕ شیفا و ئیشارات

(بعينها اشرب دَفعَ الحرارات)

مامۆستا مەلا کەریمی مودەریس شەرحێکی کورتی ئەم شیعرە ئەکات و ئەفەرموێ: لە باسی سزای مردوو یا خۆشی و ئارامیی لە گۆڕدا لە ڕێگای ڕاستی حەق لامەدەو باوەڕت وابێ کە ئەم خۆشی و ناخۆشییە، ئەم ئازارو حەسانەوەیە بۆ تێکڕای لەش و گیانە، واتە ئەم دوانە پێکەوە ئازاریان پێدەگا و پێکەوە بێ ئازارو بەختیاردەبن، چونکە لای ئەهلی حەق ڕۆح، واتە گیان، پاش مردنی ئینسانەکە هەر دەمێنی، وای بزانە کە موخبیری ڕاستگۆ خەبەریداوە، وەك چۆن دەفەرموێت: سەری کلێنچکە لە دوادوای زنجیرەی بربڕەی پشتی ئینسان نارزێ و

---

[١٨٢] ئەم (کە)لە شیعرەکەدا نیە بەڵام بە رای من بێئەو(کە)یە شیعرەکە لەنگەو مامۆستا مەلا کەریمیش هیچی دەربارەی نەفەرمووە.

دەمێنێتـەوە، جا مـادام ڕۆح باقییـەو لەشـیش هـەر هەیـە سـزاو خۆشـی و ئـازارو ڕەحەتی بۆ لەش و گیانە هەردوکییان، کەواتە: دەخیل صەد دەخیل نەکەی قولی لێهەڵکەیت و ، بلێیت: ڕۆح خوێنە یان تەڕاییەو، کاتێ کە ئینسان مرد ئەو خوێن و تەڕاییـە نـامێنێ و وشـك و برینگـە و هەسـت بـە ئـازارو ڕەحـەتی یـان خۆشـی و بەختەوەی ناکات، ئیتر قولی بیر کردنەوەت ببەستەو مەهێڵە ئەملاولا بکات، تەنها بلـێ: نهـێنی گیـان و چۆنیەتییەکەی کـاری خوایـەو هـەر ئـەو دەیزانـێ، وەك لـە قورئانی پیرۆزدا خوا ئەفەرموێ: (قل الـروح مـن امـر ربـي) بـە پێـی ئـەم ئایەتـە حەقیقەتی ڕۆح هەر خوا ئـەیزانێ و، لەوانەیـە چـەندان سـزا و پاداشـت ڕوو بکاتـە گیان بێ ئەوەی کەس پێیبزانێ .

ئەو قسەیە دەیکەن و دەڵێن مردوو ماددەیەکـەی بـێ گیانـە وەك داری وشـك و بەردی ڕەق و تەقە، سزاو خۆشی ڕووی تێناکـات و هەسـتی پێناکـات ، قسـەیەکی بۆش و بێکەڵکەو وەك بایە، لەوانەیە خوا هەست لە هـەموو ئەنـدام و بـەش بەشـی لەشدا یان هەندێکیاندا دروستبکات، ئەوەندەی هەست بە خۆشی وناخۆشی بکات، لەمەشیاندا پێویست ناکات گیان بە تەواوی بۆ ئەو لەشە بگەڕێتەوە یـا مردووەکـە جموجوڵ بکات، یا نیشانەی سزاکات بە لەشیەوە دیار بێ .

تەنانەت یەکێ کرابێ بە دارا، یا کوژرابێ و پەل پەل کرابێ، یـا دڕنـدەی کێـوی خواردبێتی، یا نەهـەنگی دەریـا قـوتی دابـێ، هـەر چـۆن بـێ و بەهـەر حاڵێـك بـێ زیندوودەکرێتەوە و پرسیاری لێدەکرێ و هەست بە خۆشی و ناخۆشـی دەکـات، با هیچ کەسیش چاوی پێی نەکەوێ و کەسیش پێی نەزانێ .

ئەو خودا بـە دەسـەڵاتە کـە بتـوانێ لـە داری تـەڕا مـاددەی ئـاگر بشـارێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئـاوو ئـاگر دژی یـەکن و پێکـەوە نایـانکرێ، دەتـوانێ بـە هـەر شێوەیەك لە شێوەکان کە هەر خۆی دەیزانێ، مردوو زیندووبکاتەوە تـا پرسـیاری لێبکرێ و هەست بە ئازاروو خۆشی بکات .

ئیتر نەبینین و نەبیستنی تۆ بۆ ئەم سزاو ناسزای ناو گۆڕدا نابێتە دەلیلی ئەوە کە نییە، ئەگەر بە چاوی باوەڕەوە سەیری مەسئەلەکە بکەیت بەڵگە زۆرە، نەختێ وردبەرەوە، یەکێ لە پاڵتا دەخەوێ، لە خەوەکەیدا کە خەو دەبینێ، دەگری، پێدەکەنێ، قسەئەکا، قسە ئەبیستێ، هەڵئەسێ، دائەنیشێ، راست دەڕوات، یا پێی هەڵدەکەوێ، یان ئازاری پێدەگا یان شاد دەبێ .

ئەمانە هەمووی لە بن دەستتا ڕوودەدەن و تۆش زەڕرەیەك ئاگات لێی نییە، بەڵێ ڕاستیان گوتووە کە خەو برای مەرگە .

زانای گەورەو ناوداری ئیسلام ئیمامی غەزالی لە کتێبی (احیاء علوم الدین) دا لەم بابەتەوە چەند پایەیەکی باس کردووە کە دەرمانی دەردی بێباوەڕی و دوودڵییە، دە لەو سەرچاوەیەوە بخۆرەوە با تینویەتیت بشکێ و گڕی دڵت دامرکێتەوە .

بەڵی ئیمامی غەزالی خوای لێیخۆش بێ لەو کتێبەدا ئەفەرموێت: (لە باوەڕکردن لەم مەسئەلەیە سێ پایە هەیە: یەکەم ئەوەیە کە باوەڕت ببێ بەوە کە مار لە پاڵ مردووەکەدا هەیەو پێیەوە دەدا، بەڵام ئێمە بە چاو نایبینین، چونکە چاوی ئێمە بە کاری بینینی ئەم جۆرە شتە نایەت، ئەم شتانە لە کاروباری غەیبین و زانینیان لە وزەی ئێمەدا نییە، نابینن یارانی پێغەمبەر(صلى الله علیه واله وسلم) باوەڕیان بەوە هەبووە کە جبرەئیل دێت بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله علیه واله وسلم) باوەڕیشیان بەوە هەبووە کە حەزرەت دەیبینێ، کەچی خۆیان هەرگیز نەیاندەبینی، جا ئەگەر باوەڕت بەوە نییە کە جبرئیل هاتۆتە لای پێغەمبەر ئەوا برۆ ئیمانی خۆت ڕاستبکەرەوە، چونکە باوەڕ بەوە بایەخدارترە، خۆ ئەگەر باوەڕیشت بەوە هەیە ئەوا بزانە لەوانەیە هۆکانی ئازارو سزاو خۆشی بەختیاری مردوو هەبن و ئێمە پێیاننەزانین.

پایەی دووەم ئەوەیە کە تەماشای ئەحواڵی ئینسان بکەی کە لە خەودا تووشی ماری دەبێ و پێیەوەئەدات، یا لەگەڵ کەسێکا شەڕدەکاو لەیەك دەدەن و

بەو پەرێشانی و ترسەوە خەبەری ئەبێتەوە، ئەو کەسانەش کە وان لە لایا هیچ نابینن، گومان لەوەدانیە کە نیسبەت بە کابرای نووستوو ئەو ئازارە راستەو خەیاڵ نیەو تیایا دەژی، ئای چەند پێیخۆشە کە خەبەر دەبێتەوەو لەو ئازارە رزگار دەبێ، ئاخۆ ئەگەر تا ماوەیەك یان تا رۆژی دوایی و زیندووبوونەوەی دووەم لەو خەوەدا بێ، حاڵی چۆن دەبێ؟

هەروەها ئیمامی غەزالی دەفەرموێ:"پایەی سێهەم ئەوەیە باش بیربکەرەوە کە زیانی مار لە زاتی خۆیدا نیە، بەڵکو وا لە زەهرەکەیا، زەهرەکەیش بەهۆی ئێشەکەیەوە ئینسان پەرێشان دەبێ، جا ئەگەر ئەو نەوعە ئێش و ئازارە لە گیانی یەکێکا ببێ بە بێ مارو ژار، (بە دڵنیاییەوە) راستە ئەگەر بڵێین: فلانەکەس ئێشی ژاری مار وا لە لەشیدا..). پاش ئەمانە مامۆستا مەلا کەریم(بە رەحمەت بێت) ئەفەرموێ:

هەموو ئەم سێ پایەیە نیسبەت بە مردوو لە قەبرا شتێکی مومکینەو، هەرکەس باوەڕ بە یەکێ لەمانە نەکا لەبەر ئەوەیە فکری کورتەو ناگاتە مەعنا، ئەگەرنا هەموو سەهل و ئاسانن..[١٨٣]

مامۆستا مەلا کەریم راست ئەفەرموێ ئەوانەی باوەڕ بەم شتانە ناکەن عەقڵیان کول و کورتەو بڕناکات تا بگاتە ماناو مەبەستەکان، ئەگینا لە راستیدا ئەم بابەتانە سوك و ئاسانن و عەقڵ تەسەووریان ئەکات، بەڵام دیارە قەشە فادی لەمانەیە نەك لەوانەی تر.

٨ـ لەو وەڵامی ئەو پرسیارەشدا کە ئەڵێ: ئەگەر ئەوانەی لەناو گۆڕدان دان بە پێغەمبەرایەتی (موحەممەد)دا بنێن لە ئازاردان دەبەخشرێن؟ ئەی ئایا لەبەرچی موحەممەد خۆی بانگی لە خوا کردووە بۆ ئەوەی لە ئازاردانی ناو گۆڕ بیپارێزێت؟.. ئێمەش ئەڵێین: بەڵێ، ئەوانەی کە لە قەبردا دان بە پێغەمبەرایەتی

[١٨٣] شەرحی عەقیدەی مەرضییە،مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس،ل:٦٠٤–٦٠٨.

حەزرەتی موحەممەددا ئەنێن لە ئازارو سزا ئەبەخشرێن، تۆش بڕواناکەیت کەیفی خۆتە، خوا ئەفەرموێ:

﴿ وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ النَّبِيِّينَ لَمَا آتَيْتُكُمْ مِنْ كِتَابٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مُصَدِّقٌ لِمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِ وَلَتَنْصُرُنَّهُ قَالَ أَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَى ذَلِكُمْ إِصْرِي قَالُوا أَقْرَرْنَا قَالَ فَاشْهَدُوا وَأَنَا مَعَكُمْ مِنَ الشَّاهِدِينَ (٨١) فَمَنْ تَوَلَّى بَعْدَ ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ (٨٢) أَفَغَيْرَ دِينِ اللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُ أَسْلَمَ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ (٨٣)

واتە: خوای پەروەردگار پەیمانی لە هەموو پێغەمبەران وەرگرتووە بەهۆی ئەو کتێب و داناییەی پێمداون و پاشان پێغەمبەرێکیشتان بۆ ئەنێرم کە ئەوە ئەسەلمێنێت کە ناردوومە لەگەڵتاندا ئەوە بەدڵنیاییەوە بڕوای پێدەهێنن و سەریدەخەن و ئەم پەیمانەی لێتانم وەرگرتووە ئەیپارێزن، هەموو وتیان: دان بەوەدا ئەنێین، خواش فەرمووی: دەی ئەم شایەتیە بدەن! و منیش لەگەڵتاندا بەشایەت ئەبم، هەرکەسیش دوای ئەمە پشتهەڵبکات ئەوە لە ریزی گوناهباراندایە، ئایا شوێن جگەلە ئایینی خوا ئەکەون کە هەرچی هەیە لە ئاسمانەکان و زەمیندا ملیان بۆ ئەو داوە حەزبکەن یان حەزنەکەن و هەموو بۆ لای ئەو ئەگەڕێنەوە.

هەروەها ئەفەرموێ:(وَقَالُوا كُونُوا هُودًا أَوْ نَصَارَى تَهْتَدُوا قُلْ بَلْ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ (١٣٥) قُولُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنْزِلَ إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَى وَعِيسَى وَمَا أُوتِيَ النَّبِيُّونَ مِنْ رَبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ (١٣٦) فَإِنْ آمَنُوا بِمِثْلِ مَا آمَنْتُمْ بِهِ فَقَدِ اهْتَدَوْا وَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا هُمْ فِي شِقَاقٍ فَسَيَكْفِيكَهُمُ اللَّهُ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ (١٣٧)..ئەڵێن: ئێوە ببنە یەهود یان نەصارا ئەو کات ئەکەونە سەر رێگەی هیدایەت، بڵێ نەخێر وانیە بەڵکو ئەبێ لەسەر رێبازی میللەتی ئیبراهیم بیت رێك و راست، ئەو کەسێکی موشریك نەبوو، بڵێن: ئێمە بڕوامان بە خوا هەیەو بڕوامان هەیە بەوەی دابەزیوە بۆمان و بەوەی دابەزیوە بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و

ئیسحاق و یەعقوب و کوڕەکانی و بەوەی بۆ موساو بۆ عیساو بۆ هەموو پێغەمبەران دابەزیوە، جیاوازی ناکەین لە نێوانیان هیچ کامێکیانداو ئێمە خۆمان تەسلیم هەر بەو خوایە ئەکەین، ئەگەر ئەوانیش ئیمانیان هێنا بەو شێوەیەی ئێوە ئیمانتان هێناوە ئەوە ئەکەونە سەر رێگەی هیدایەت و ئەگەر پشتیشیان هەڵکرد ئەوە بەدڵنیاییەوە ئەکەونەناو چەرمەسەری و خواش بەسە بۆ ئێوەو ئەو خوایەش هەموو قسەیەك ئەبیسێت و ئاگاداریشە لە نهێنی ناو دڵەکان.

پێغەمبەریش ئەفەرموێ: (مَنْ قَالَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ وَأَنَّ عِيسَى عَبْدُ اللَّهِ وَابْنُ أَمَتِهِ وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِنْهُ وَأَنَّ الْجَنَّةَ حَقٌّ وَأَنَّ النَّارَ حَقٌّ أَدْخَلَهُ اللَّهُ مِنْ أَىِّ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ الثَّمَانِيَةِ شَاءَ .[١٨٤]

سەبارەت بەوەش کە بۆچی پێغەمبەر(صلى الله عليه واله وسلم)پەنای بەخوا ئەگرت لە سزای گۆڕ، ئەوە لەبەر ئەوەیە ئەرکی سەرشانیەتی ئەو دوعایە بکات، پاشان ئەو مامۆستای ئەم مرۆڤەشەو پێویستە خەڵکی فێری هەموو جۆرە دوعایەك بکات، تا خەڵکیش بە شوێنیدا بچن و وەك ئەو لە خوا بپارێنەوە.

٩ـ لە خۆشیەوە ئەنجامگیری ئەکات و ئەڵێ: لەوانەیە ئەفسانەی ئەو دوو پیرەمێردەی کە عائیشە بە درۆی خستنەوە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە گوێیان لە دەنگی کەسێك بووە، کە دوای ئەوەی وایان زانیوە مردووە خێرا ناشتویانە و کاتێك کە بەئاگاهاتۆتەوە داوای کردووە کە فریای بکەون کەسیش نەبووە کە فریای بکەوێت هەتاکو مردووە، لەمەشەوە هەواڵی ئازاردانی ناو گۆڕ بڵاوبووەتەوە.

ئەمە بەڵگەی عەقڵبچووکی فادیە کە بەو شێوەیە بۆ مەسەلەیەکی ترسناکی لەو شێوەیە ئەڕوانێت کە دوارۆژی خۆی پێوەی بەندەو بابەتێکی لەو شێوەیە ئەکاتە گاڵتە جاڕی خۆی و بڕوا بە خورافەی لەوشێوەیە ئەکات!

---

[١٨٤] اخرجه أحمد ٥/٣١٣(٢٣٠٥١).

بە هەر حاڵ ئێمە لە پێشەوە بەدرێژی و بە بەڵگەوە باسی ئەوەمان کرد کە سزای ناوگۆڕ راستیەکەو عەقڵ ئەیسەلمێنێت و ئاییینەکانیش بۆ ئەوە هاتوون کە بۆ ئەم مرۆڤە ئەوە رۆشن بکەنەوە کە مردن کۆتایی ژیان و بوون نیەو تەنیا گواستنەوەی قۆناغێکە بۆ قۆناغێکی ترو لەوێدا رۆحەکان یان ئەکەونە ناو خێرو خۆشی و کامەرانیەوە یان ئەکەونەناو سزاو ئازارو بەدبەختیەوە..وەك ئەو دوو قوتابیەی کە ئەمیان بڕوای بەدوارۆژ هەیەو چاویبڕوەتە بڕوانامەی بەرزو رەنئەدات و خۆی لەو شتانە ئەگرێتەوە کە قوتابیە تەمەڵەکەی هاوڕێیی سەرقاڵکردووەو نرخی بڕوانامەو دوارۆژی لا نەهێشتووەو هەر خەریکی (مالا یەعنی)یەو هەموو وەقتی زایە ئەکات و لە پرێکدا ئەکەوێتە بەردەم تاقیکردنەوەو هیچ نازانێت و رسوای لای مامۆستایان و قوتابیان و خزم و کەسوکار ئەبێت، کەچی هاوڕێکەی کە بۆ ئەو رۆژە خۆی ئامادەکردووەو لە خۆشیەکاتیەکان خۆی بەدوورگرتووە، پلەی بەرز بەدەستئەهێنێت و ئەکەوێتە خێرو خۆشی و ئەوی تر کە گاڵتەی بە خوێندن و دوارۆژو شەهادە ئەهات ئەکەوێتە ناو ژینێکی تاڵ و لە ژیان جێئەمێنێت، خۆ ئەگەر ژیان قەرەبووکردنەوەی تێدا هەیە ئەوە ئەو دونیا قەرەبووکردنەوەی تێدا نیەو کێش گاڵتەی بە قەبرو قیامەت و بەهەشت و جەهەننەم دێت، موبارەکی بێت، با بزانین کێ رەنجخەسارئەبێت ..

أَفَمَنْ كَانَ عَلَى بَيِّنَةٍ مِنْ رَبِّهِ وَيَتْلُوهُ شَاهِدٌ مِنْهُ وَمِنْ قَبْلِهِ كِتَابُ مُوسَى إِمَامًا وَرَحْمَةً أُولَئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِ وَمَنْ يَكْفُرْ بِهِ مِنَ الْأَحْزَابِ فَالنَّارُ مَوْعِدُهُ فَلَا تَكُ فِي مِرْيَةٍ مِنْهُ إِنَّهُ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكَ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ (١٧) وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أُولَئِكَ يُعْرَضُونَ عَلَى رَبِّهِمْ وَيَقُولُ الْأَشْهَادُ هَؤُلَاءِ الَّذِينَ كَذَبُوا عَلَى رَبِّهِمْ أَلَا لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ (١٨)الَّذِينَ يَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا وَهُمْ بِالْآخِرَةِ هُمْ كَافِرُونَ (١٩)

# بڕگەی دەیەم

## نمونەیەك لەو كارانەی قەشە فادی بە شوورەیی دائەنێ لە ژیانی پێغەمبەردا( صلى الله عليه و اله وسلم ).

قەشە فادی لەو پێشبڕكێ بێبناغەدا كە دایناوە بۆ خوێنەرانی، دوور لـە هـەموو ئەتەكێت و شەرمێك ئەڵێ: دانەر(٣٣)كاری شورەیی لە ژیانی پێغەمبەری ئیسلامدا دۆزیوەتەوە، باسی ئەوەیان بكە كە تـۆ بـەخراپترین كـاری دادەنێیـت و راڤـە یـان شیكاری بكە پاشان باسی هەركام لەو كارانە بكە كـە تـۆ بەشـورەیی دایـنانێیـت و بەرگری لە دیدو بۆچوونی خۆت بكە[185]

ئێمە لە وەڵامی ئەم قەشە فریوخواردووەدا ئەڵێین:

١–ئێوە ئەوە خوونەریتی ناوتانە كە قسە بە پێغەمبەرانی خوا بڵـێن و تانـەیان لێبدەن و شتی نائەخلاقی بدەنە پاڵیان، ئەوەنیە بەرانبـەر بـە حـەزرەتی لـوط لـە ئینجیلدا ئەوەی نەشێ بـۆ خـەڵكی بـازاڕییش ئەیدەنـە پـاڵی! خوێنـەرانی بـەڕێز! سەیركەن چی دەربارەی ئەم پێغەمبەرەی خوا ئەڵێن:

" وخاف لوط أن يسكن في صوغر، فصعد الجبـل وأقـام بالمغـارة هـو وابنتـاه ، فقالت الكبرى للصغرى : شاخ أبونـا ومـا في الأرض رجـل يتزوجنـا علـى عـادة أهـل الأرض كلهم، تعالي نسـقي أبانـا خمـرا ونضـاجعه ونقـيم مـن أبينـا نسـلا ، فسـقتا أباهما خمرا تلك الليلـة، وجـاءت الكبرى وضـاجعت أباهـا وهـو لا يعلـم بنيامهـا ولا قيامها.وفي الغد قالت الكبرى للصغرى : ضاجعت البارحة أبي، فلنسـقه خمـرا الليلـة أيضا، وضاجعيه أنت لكي نقـيم مـن أبينـا نسـلا، فسـقتا أباهمـا خمـرا تلـك الليلـة أيضا، وقامت الصغرى وضاجعته وهو لا يعلم بنيامها ولا قيامها. فحملت ابنتا لـوط مـن أبيهمـا، فحملـت الكـبرى إبنـا وسمتـه مـوأب، وهـو أبـو المـؤابيين إلى اليـوم. والصغرى أيضا ولدت إبنا وسمته بن عمي، وهو أبو بني عمون إلى اليوم. "

---

[185] ل:٤٤٩.

یان ئەڵێن: کوڕە گەورەی یەعقوب بە دزی باوکیەوە سەرجێی کرد لەگەڵ خێزانەکەی باوکیداو باوکیشی بەمەی زانی و هیچیشی نەکرد!!

" ثم رحل يعقوب من هناك ونصب خيمته على الجانب الآخر من مجدل عدر، وبينما هو ساكن في تلك الأرض ذهب رأوبين فضاجع بلهة، محظية أبيه فسمع بذلك يعقوب "، سفر التكوين ( ٣٥ : ٢١-٢٢ )..ئەمە ئەو یەعقوبەیە کە خۆیان ئەڵێن جارێکیان لەگەڵ خوادا زۆران ئەگرێت و خوا ئەدا بە ئەرزاو ئەویش خەڵاتی ئەکات و بەرەکەت ئەڕژێنێ بەسەریدا! هەمان کاری گەن ئەدەنە پاڵ ئامنونی کوڕی داود لەگەڵ تاماری خوشکیدا، یان تۆمەتی عارەقخواردنەوەو گەڕان بەرووت و قووتی ئەدەنە پاڵ نوح وداودو ئەشعیاو کۆمەڵێ پێغەمبەری تر!!

ئەم قسە هەڵەق و مەڵەقانە ئەدەنە پاڵ کەسانێك کە خوا کردوونی بە پێغەمبەرو ناردوونی تا ببنە هیدایەت و ڕەحمەت بۆ خەڵکی و فێری دینی ڕاستەقینەو ژینی بەختەوەریان بکەن و فێری ئەوەیان بکەن دەمپاك و دڵپاك و داوێنپاکیی پێڕەوی بکەن..کەواتە سەیر نیە لە بەرانبەر پێغەمبەری ئیسلامیشدا بێنەزاکەتانە بوەستنەوە، ئەمانە پەروەردەی دەستی"نشيد الانشاد"ن کە پەیامێکی ناو کتێبی پیرۆزیانەو ئەوەی کە مرۆڤ رووی نایەت لە ژێر جێگەشدا بیخوێنێتەوە ئەوەندە شتی بەرەڵایی تێدایە، هەر بۆ نمونە سەیر بکەن "نشيد الانشاد"چی ئەڵێت:

خوا تێر عارەقی خواردەوەو سەرخۆش بوو جا بە خەڵکەکەشی ووت: (كُلُوا أَيُّهَا الآصْحَابُ.اشْرَبُوا وَاسْكَرُوا أَيُّهَا الآحِبَّاءُ.)!! نشيد الإنشاد١:٥، هەروەها ئەڵێ: (..ما أجملك وما أحلاك أيتها الحبيبة باللذّات. قامتك هذه شبيهة بالنخلة، وثدياك بالعناقيد..وتكون ثدياك كعناقيد الكرم و رائحة أنفك كالتفاح، وحنكك كأجود الخمر لحبيبي السائغة المرقرقة السائحة على شفاه النائمين، أنا لحبيبي، وإليّ اشتياقه. تعال يا حبيبي لنخرج إلى الحقل ولنبت في القرى.

لنبكرنّ إلى الكروم لننظر هل أزهر الكرم هل تفتح القعال؟ هل نور الرمان. هنالك أعطيك حبي.. ليتك كأخ لي، الراضع ثديي أمي، فأجدك في الخارج وأقبلك، ولا يخزونني. وأقودك وأدخل بك بيت أمي، وهي تعلمني، فأسقيك من الخمر الممزوجة من سلاف رماني، شماله تحت رأسي، ويمينه تعانقني. (نشيد ٧/١-١٣).

بەراستی بوونی ئەو هەمووە هاندانەی کتێبی پیرۆزی مەسیحیەکانە بۆ خەڵك کوشتن و مەیخواردنەوەو سێکسکردن وایکردووە نووسەرێکی گەورەی وەك بەرنادشۆ دەربارەی ئەو کتێبە بڵێ:"کتێبی پیرۆز ترسناکترین کتێبە لەسەر ئەم رووی زەمینە، تا ئەتوانن لە گەنجینەیەکی داخراودا بە کلیل بیپارێزن"[١٨٦].

٢-پێغەمبەران تەرزێکی تایبەتن لە مرۆڤەکان، خوای گەورە بۆ ئەوە ئەیاننێرێت کە ببنە رێپیشاندەری هەمووان، ئەوەی بۆ خەڵکی قەینەکات بۆ ئەمان قەیئەکات بیکەن، و ئەوەی بۆ خەڵکی ئەتەکێتە بۆ ئەمان فەرزو حەتمە، و ئەبێ بە رەوشتی خۆیان زیاتر خەڵکی بانگبکەن بۆلای خوا تا بە قسە شیرینەکانیان.

. قَالَ يَا قَوْمِ أَرَأَيْتُمْ إِنْ كُنْتُ عَلَى بَيِّنَةٍ مِنْ رَبِّي وَرَزَقَنِي مِنْهُ رِزْقًا حَسَنًا وَمَا أُرِيدُ أَنْ أُخَالِفَكُمْ إِلَى مَا أَنْهَاكُمْ عَنْهُ إِنْ أُرِيدُ إِلَّا الْإِصْلَاحَ مَا اسْتَطَعْتُ وَمَا تَوْفِيقِي إِلَّا بِاللَّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ (٨٨)

- (عَفَا اللَّهُ عَنْكَ لِمَ أَذِنْتَ لَهُمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَتَعْلَمَ الْكَاذِبِينَ (٤٣)

زانایان کە باس لە سیفەتی پێغەمبەران ئەکەن، ئەڵێن: چوار سیفەت فەرزە ئەبێ لە پێغەمبەراندا هەبێ، دژەکانی ئەو چوارەش محاڵە لە پێغەمبەراندا هەبن، هەندێ سیفاتیش مومکینە لە پێغەمبەراندا هەبن، چوارە فەرزەکە بریتین لە: راستگۆیی، چونکە ئەگەر درۆیان لێبینرا ئەوە خەڵکی لە پەیامەکانیان ئەکەونە گومان، دەستپاکی چونکە ئەگەر ناپاکیان لێوەشایەوە خەڵکی متمانەیان بە

---

[١٨٦] إباحيات الكتاب المقدس(مسموح فقط لمن تجاوز ١٨ عام)، قام بالتجميع و عمل الكتاب، وليد المسلم.

خۆیان و قسەکانیشیان نامێنێ، وریایی چونکە ئەگەر گێلێتیان تێدا بێت خەڵکی هاوەڵێتیان ناکەن، گەیاندنی پەیامی خوا بێشاردنەوە چونکە ناکرێ پێغەمبەربێت و خوا رایسپاردبێت بە پەیامێك و ئەو نەیگەیەنێت، دژەکانی ئەم سیفەتانەش محاڵە لە پێغەمبەراندا هەبن، واتە: درۆزنی، ناپاکی، بێعەقڵی، شاردنەوەی دین لەبەر ترسنۆکی یان هەر شتێکی تر، بۆ ئەوەی هیچ کەسێك بیانووی نەمێنێ لە لای خوا، بۆ نمونە بڵێ: پێغەمبەرەکەی ئێمە درۆزن بوو، یان ناپاك بوو یان پەیامەکەی پێنەگەیاندین یان کابرایەکی گێلحاڵ بوو، لەبەر ئەوە ئێمە شوێنی نەکەوتین..

﴿ إِنَّا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ كَمَا أَوْحَيْنَا إِلَى نُوحٍ وَالنَّبِيِّينَ مِنْ بَعْدِهِ وَأَوْحَيْنَا إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ وَعِيسَى وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَارُونَ وَسُلَيْمَانَ وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُورًا (١٦٣) وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَاهُمْ عَلَيْكَ مِنْ قَبْلُ وَرُسُلًا لَمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَى تَكْلِيمًا (١٦٤) رُسُلًا مُبَشِّرِينَ وَمُنْذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا (١٦٥) لَكِنِ اللَّهُ يَشْهَدُ بِمَا أَنْزَلَ إِلَيْكَ أَنْزَلَهُ بِعِلْمِهِ وَالْمَلَائِكَةُ يَشْهَدُونَ وَكَفَى بِاللَّهِ شَهِيدًا (١٦٦)..

لەبەر ئەوە شورەییە بۆ مرۆڤ تانە لە پێغەمبەران بدات، چونکە تانەدان لە ئەوان تانەدانە لە خوا کە نەیتوانیوەو نەیزانیوە کەسێکی رێکوپێك بنێرێ بۆ ئەم خەڵکە، ئەم کابرا گێلە یان ئەم کابرا ناپاکە یان ئەم کابرا ترسنۆکە یان ئەم کابرا درۆزنەی بۆ ناردووین! بۆیە لە راستیدا پێغەمبەران لە پێوەرەکان ئەدرێن ئەوجا رەوانەئەکرێن بۆ ناو خەڵکی.

﴿ ثُمَّ جِئْتَ عَلَى قَدَرٍ يَا مُوسَى (٤٠) وَاصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِي (٤١) اذْهَبْ أَنْتَ وَأَخُوكَ بِآيَاتِي وَلَا تَنِيَا فِي ذِكْرِي (٤٢) اذْهَبَا إِلَى فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَى (٤٣) فَقُولَا لَهُ قَوْلًا لَيِّنًا لَعَلَّهُ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَى (٤٤) .

٣ــ پێغەمبەری ئیسلامیش وەك هەموو برا پێغەمبەرەکانی تری(صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێت)ئەوەندە کامڵ و ساغ بووە، نەك ژیانی خۆی

نەشاردووەتەوە، بەڵکو ژیانی خۆی وەك کتێبێکی کراوە کردووەتەوە بۆ خەڵکی و ڕێگەی داوە کە بێنە ناو ژیانی و هەرچی لێئەبینن لە کاتی خۆشی یان ناخۆشیدا، لە کاتی تووڕەیی یان ئارامیدا، لەگەڵ دۆستا بوو یان لەگەڵ دوژمن، لە ماڵدا بوو یان لە مزگەوت یان لە دەشت...هەمووی ڕیوایەت بکەن و بیگێڕنەوە بۆ خەڵکی و هیچی نەشارنەوە!

نەك هەر ئەوە بەڵکو ئەفەرموێ: رووگەش بێت ئەو کەسەی شتێك لە ئێمەوە ئەبیسێت و بەو شێوەیەی لە ئێمەی بیستووە ئەیگەیەنێت، چونکە لەوانەیە کەسێك کە ئەو شتەی پێئەگات هۆشیارتربێت لەو کەسەی شتەکەی پێئەگەیەنێت! لەوانەیە کەسێکی تێگەیشتوو شتێك بگەیەنێ بەکەسێك لە خۆی تێگەیشتووتر بێت[١٨٧]..نەك هەر ئەمەش بەڵکو لۆمەو گلەیی قورس لەو کەسە ئەکات کە شتێکی لە پێغەمبەر(صلى الله عليه واله وسلم) بیستووە یان بینیوەو لە خەڵکی ئەشارێتەوە[١٨٨]!!

هەمان ڕێگەشی بە ژنە بەڕێزەکانی داوە کە لە ماڵەوەو لەناو ئەواندا هەرچی ئەڵێ و هەرچی ئەکات..بیگێڕنەوە بۆ خەڵکی، چونکە قسەو هەڵسوکەوت و دانپێدانانەکانی پێغەمبەر هەموو دین و شەریعەتن بۆ خەڵکی و ئەو زاتە پڕکەماڵاتە بەسەر لووتکەی ڕەوشتبەرزیەوە ڕاوەستاوە، وەك خوای گەورە ئەفەرموێ: (وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ).

پێغەمبەران (صەلات و سەلامی خوایان لەسەربێت)زانستێکی زۆریان لای خواوە هێناوەو ئەرکی سەرشانیشیان بووە کە ئەو زانستانە بگەیەننە خەڵکی و

---

[١٨٧] پێغەمبەر(صلى الله عليه واله وسلم)ئەفەرموێ:((نَضَّرَ اللهُ امْرَأً سَمِعَ مِنَّا شَيْئًا ، فَبَلَّغَهُ كَمَا سَمِعَهُ ، فَرُبَّ مُبَلَّغٍ أَوْعَى مِنْ سَامِعٍ)) . رواه الترمذي ، وقال : ((حديث حسن صحيح)) .

[١٨٨] پێغەمبەر(صلى الله عليه واله وسلم)ئەفەرموێ: (( مَنْ سُئِلَ عن عِلْمٍ فَكَتَمَهُ ، أُلْجِمَ يَوْمَ القِيَامَةِ بِلِجَامٍ مِنْ نَارٍ )) . رواه أبُو داود والترمذي ، وقال : ((حديث حسن)) .محمد ئیقباڵ لاهوریش جوان ئەفەرموێ: "سيرتعد المسلم من خزي يومٍ يسأله فيه الرسول : لقد أخذت منا كلمة الحق فلماذا لم تُسلِّمها إلى الخلق ؟!"قسەی هەقت لە ئێمە بیست ئەی بۆچی نەتگەیاند بە خەڵکی.

تاکــە رێگــەش بــۆ ئــەوە وەرگــرتن و گەیانــدنی ئــەو زانســتانە بــووە، وەك پێغەمبەر(صلى الله عليه واله وسلم) ئەفەرموێت:(مَنْ سَلَكَ طَرِيقاً يَبْتَغِي فِيـهِ عِلْمـاً سَهَّلَ اللهُ لَهُ طَرِيقاً إِلَى الجَنَّةِ، وَإِنَّ المَلآئِكَةَ لَتَضعُ أجْنِحَتَهـا لِطَالِـبِ العِلْـمِ رِضـاً بِمَـا يَصْنَعُ، وَإِنَّ العَالِمَ لَيَسْتَغْفِرُ لَهُ مَنْ فِي السَّماوَاتِ وَمَـنْ فِـي الأرْضِ حَتَّـى الحِيتَـانُ فِي المَاءِ، وَفضْلُ العَالِمِ عَلَى العَابِدِ كَفَضْلِ القَمَرِ عَلَى سَائِرِ الكَوَاكِبِ، وَإِنَّ العُلَمَاءَ وَرَثَـةُ الأنْبِيَاءِ، وَإِنَّ الأنْبِيَاءَ لَمْ يَوَرِّثُوا دِينَاراً وَلآ دِرْهَماً وَإِنَّمَا وَرَّثُوا العِلْمَ، فَمَنْ أَخَـذَهُ أَخَـذَ بِحَظٍّ وَافِرٍ).رواه أبُو داود والترمذي .

هەرکـەس رێگەیـەك بگرێتەبـەر لێـوەی فێـری زانسـتێك ببێـت خـواش رێگـەی بەهەشتی بۆ ئاسان ئەکات، بەدڵنیاییەوە فریشـتەکانیش باڵیـان ڕائەخـەن بـۆ ئـەو کەسانەی بەدوای زانستدا ئەگەڕێن چونکە لەو کارەیان ڕازین، بەدڵنیاییەوە ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەمیندان و تەنانەت ماسی ناو دەریاکانیش نزای خێر بۆ زاناکـان ئەکەن، ڕێزو پلەو پایەی زانـا وەك ڕێـزو پلـەو پایـەی مـانگ وایـە بەسـەر هـەموو ئەستێرەکانی تـرەوە، زانایـان میراتگـری پێغەمبـەرانن، پێغەمبـەرانیش دیرهـەم و دیناریان لێ بەجێنەماوە، بەڵکو زانستیان لێ بـەجێماوە، هەرکـەس ئـەو زانسـتانە وەربگرێت ئەوە پشکێکی زۆری بۆ خۆی بردووە.

واش دەرچـوو، ئەصـحابە بـەڕێزەکانی پێغەمبەر(صـلى الله عليـه والـه وسـلم) هەموو قسەو هەڵسوکەوتەکانی پێغەمبەریان(صلى الله عليه واله وسلم) گواسـتەوە بۆ دوای خۆیان، هەموو دنیایان ئاگادارکردووە لـەوەی پێغەمبـەر (صـلى الله عليـه والـه وسـلم) چـۆن نـانی خواردووە،چۆن خەوتووە،چۆن بـەرگی پۆشـیوە، چـۆن دەستی بـەئاو گەیانـدووە، چـۆن دەسـتنوێژی گرتـووەو نوێـژی کـردووەو حـەجی کردووەو جیهادی کردووەو شەڕی کردووەو ئاشتی کـردووە، ڕەوشـت و ئەتـەکێتی پێغەمبەریان لە چوونەسەرئاوەوە بۆ گواستووینەتەوە تا چونەسەر کورسی حـوکم و دەسەڵات! وەك بەڕێز شێخ عەلی تەنتاوی ئەفەرموێ:(ئادەی کەسێکی گەورەم جگە لە پێغەمبەر(صلى الله عليه واله وسلم) پیشانبدەن وێرابێتی بە خـەڵکی بڵـێ:

هانێ ئەوە هەموو ژیانم.. قسەکانم... ئیشەکانم..هەمووی بگێڕنەوە: بۆ دۆست... بۆ دوژمن.. بۆ دوور.. بۆ نزیك.. بۆ شاری.. بۆ لادێیی.. بۆ نەخوێندەوار.. بۆ خوێندەوارو پسپۆڕەکان.!

پیشانم بدەن! کام پیاوی گەورە هەیە لە مێژوودا بەو شێوە دووردرێژە هەموو ژیانی تۆمارکرابێت، ژیانی گشتیی و ژیانی تایبەتی خۆشی، گشت رووداوە گەورەو بچوکەکانی ژیانی ئاوەها نووسرابێتەوە؟ ئەوە هەزارو چوارصەدو سە(٣٠)ی[189] و ئەوەندە ساڵە خەڵك دوای ئەو دێن و دەچن، کێ هەیە وەك ئەو ئاوەها وردو درشتی ژیانی تۆمارکرابێت؟[190]

شێخ عەلی تەنتاوی(بەرەحمەت بێت) خاڵێکی جوانی تر باسئەکات سەبارەت بە ژیاننامەی پێغەمبەر(صلی الله علیه واله وسلم)، ئەویش ئەوەیە کە هەرچی گەورەپیاوەکانی دونیا هەیە یان تایبەتن بە میللەتانی خۆیان یان لە کایەکی تایبەتدا ئەو گەورەیەتیەیان دەرکەوتووە، بەڵام پێغەمبەری ئیسلام(صلی الله علیه واله وسلم)لە هەموو کایەکانی ژیاندا گەورە بووەو گەورەیەتیەکەشی شتێکی جیهانی بووەو بۆ هەموو مرۆڤایەتی بووە، بۆ دین و بۆ دونیا، بۆ شەڕو بۆ ئاشتی، بۆ دۆست و بۆ دوژمن، بۆ قەومی خۆی و بۆ قەومەکانی تر، بۆ ژن و بۆ پیاو، بۆ گەورەو بۆ بچوك، بۆ عەقڵ و بۆ دڵ، بۆ خێزان و بۆ کۆمەڵگە...رێنمایی داناوە، خۆشی پێشەنگ بووە لەجێبەجێکردنی ئەو رێنماییانەداو شتێکی نەکردووە پێچەوانەی ئەو رێنماییانە بووبێت، یان پشتگوێخستنی ئەو رێنماییانەی تێدا بووبێت..ئەبێ واش بێت، چونکە ئەو پەروەردەی دەستی خودایەو دیاری خواوەندە بۆ ئەم مرۆڤایەتیەو جوبرەئیل مامۆستای بووە، وەك خوای گەورە ئەفەرموێ:

---

[189] ئەو ئەفەرموێ:"هەزارو سیصەد"، چونکە باسی سەردەمی خۆی ئەکات، ئێمە کردمانە هەزارو چوارسەدو سی و ئەوەندە، بۆ زانیاری خوێنەری بەڕێز.

[190] تعریف عام بدین الاسلام، ص٢٠٤.

﴿ وَالنَّجْمِ إِذَا هَوَى (١) مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَى (٢) وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى (٣) إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى (٤) عَلَّمَهُ شَدِيدُ الْقُوَى (٥) ذُو مِرَّةٍ فَاسْتَوَى (٦) وَهُوَ بِالْأُفُقِ الْأَعْلَى (٧) ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّى (٨) فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَى (٩) فَأَوْحَى إِلَى عَبْدِهِ مَا أَوْحَى (١٠) مَا كَذَبَ الْفُؤَادُ مَا رَأَى (١١) أَفَتُمَارُونَهُ عَلَى مَا يَرَى (١٢) وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى (١٣) عِنْدَ سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى (١٤) عِنْدَهَا جَنَّةُ الْمَأْوَى (١٥) إِذْ يَغْشَى السِّدْرَةَ مَا يَغْشَى (١٦) مَا زَاغَ الْبَصَرُ وَمَا طَغَى (١٧) لَقَدْ رَأَى مِنْ آيَاتِ رَبِّهِ الْكُبْرَى (١٨)﴾

٤–سەبارەت بەوەی کە قەشە فادی هەندێ شت بە شورەیی ئەزانێ کە پێغەمبەر(صلی الله علیه واله وسلم)کردوویەتی، ئەوە ئێمە لێرەدا تەنیا دوو نمونە باسئەکەین لەو (٣٣) نمونەی کە ئەو باسیانئەکات، تا لەو دوو نمونەوە خوێنەر تێبگات ئەم قەشە بێویژدانە چەندە قاییم عەقڵی خۆی داخستووە لە ترسی ئەوەی نەوەك راستیەکی ئەم قورئانەی تێبچێت و سەرنجی رابکێشێت و بیسەلمێنێت و بۆی ببێتە پێوەرو ژیانی بگۆڕێت وەك ژیانی سەدانی گۆڕی! ئەگینا یانی چی ئەو کابرایە ئەوە بە شورەیی ئەزانێ کە پێغەمبەر(نەخوێندەوارە)[191]!

یان قورئان رێگەی گرتووە لەوەی ژنەکانی دوای خۆی شووبکەنەوە[192]، یان وەرگێڕە بێناونیشانەکەی ئەوە بە شورەییەکی گەورە ئەزانێ کە پێغەمبەر(صلی الله علیه والە وسلم) لە ژنێ زیاتری هێناوە[193]، یان ئەوە لای قەشە فادی شورەییەکی زۆر گەورەیە کە بووترێت پێغەمبەر لە پێشترە بە موسڵمانان لە خودی خۆیان[194]!! یان ئەوە بە شورەیی ئەزانێ کە پێغەمبەر(صلی الله علیه والە وسلم) دەست لە دوژمنەکانی بکاتەوەو شەڕیان لەگەڵدا بکات و ئەو شەڕانە

---

[191] ل:٤٤٤.

[192] ل:٣٥٨.

[193] ل:٣٥٨ تا ٣٦٤.

[194] ل:٤٤٥.

ناوبنێت(شەڕە داگیرکاریەکان)[١٩٥] !! ئاخر لە راستیدا ئەم رەخنانە جگە لە رقبوون لە هەر شتێك پەیوەندی بە ئیسلام و پێغەمبەری ئیسلامەو هەبێت چیترە؟ بۆ ئەبێ ئەوە شوورەیی بێت خوا پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار بنێرێت بە پەیامێکی ئاسمانی هەمەلایەنەوە کە هەموو جوانیەکانی ئایینەکانی تری تێدا بێت لە کاتێدا کە جوانیەکانی ئەو لەو ئایینانەی تردا نەبێت[١٩٦].

## نمونەی یەکەم

### نەخوێندەواری پێغەمبەری ئیسلام( صلی الله علیه واله وسلم )

لەگەڵ ئەوەدا قەشە فادی مانای وشەی (امی) تێکئەدات و ئەڵێ:(امی)یانی کەسی غەیرە یەهودی، بەڵام موحەممەد بۆیە مانای نەخوێندەواری بۆ (امی) بەکاربردووە بۆ نەخوێندەوار تا جێگە بۆ ئەوە بکاتەوە کە قورئان وەك موعجیزە بناسرێت[١٩٧]!!

ئەم رەخنەیە لەگەڵ ئەوەدا قسەیەکی نازانستیانەیە وەك لە دواوە باسی ئەکەین، شتێکی دووریشەو شورەیشە تۆ ناوی بنێی کارە شورەییەکان!

لە وەڵامی ئەم رەخنە نازانستی و ناجوانەدا ئەڵێین:

بەڵێ پێغەمبەر(صلی الله علیه واله وسلم) لەگەڵ ئەو شکۆو گەورەیەتییەی کە هەیبوو پیاوێکی نەخوێندەواریش بوو، ئەوەش نەکەمییە بۆ پێغەمبەر(صلی الله علیه واله وسلم)و نە زیانیش بە دینەکەی ئەگەیەنێ، لە دوو ئایەتەدا وشەی (**امي**) لە قورئاندا هاتووە:

---

[١٩٥] ل:٣٦٤.

[١٩٦] قسەکەی هی نووسەری گەورە جۆرج بەرنادشۆیە،هەروەها ئەڵێ: ( لقد درست محمدا باعتباره رجلا مدهشا، فرأيته بعيدا عن مخاصمة المسيح، بل يجب أن يدعى منقذ الإنسانية، وأوربا في العصر الراهن بدأت تعشق عقيدة التوحيد، وربما ذهبت إلى أبعد من ذلك فتعترف بقدرة هذه العقيدة على حل مشكلاتها، فبهذه الروح يجب أن تفهموا نبوءتي)، بڕوانە: (أرشيف ملتقى أهل الحديث – ٣).

[١٩٧] ل:٤٤٣.

خــوای گــەورە ئەفــەرموێت: (وَاخْتَارَ مُوسَى قَوْمَهُ سَبْعِينَ رَجُلًا لِمِيقَاتِنَا فَلَمَّا أَخَذَتْهُمُ الرَّجْفَةُ قَالَ رَبِّ لَوْ شِئْتَ أَهْلَكْتَهُمْ مِنْ قَبْلُ وَإِيَّايَ أَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ السُّفَهَاءُ مِنَّا إِنْ هِيَ إِلَّا فِتْنَتُكَ تُضِلُّ بِهَا مَنْ تَشَاءُ وَتَهْدِي مَنْ تَشَاءُ أَنْتَ وَلِيُّنَا فَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا وَأَنْتَ خَيْرُ الْغَافِرِينَ (١٥٥)

الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِنْدَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنْكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالْأَغْلَالَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ فَالَّذِينَ آمَنُوا بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُوا النُّورَ الَّذِي أُنْزِلَ مَعَهُ أُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ (١٥٧) قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ يُحْيِي وَ يُمِيتُ فَآمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ النَّبِيِّ الْأُمِّيِّ الَّذِي يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَكَلِمَاتِهِ وَاتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ (١٥٨) وَمِنْ قَوْمِ مُوسَى أُمَّةٌ يَهْدُونَ بِالْحَقِّ وَبِهِ يَعْدِلُونَ (١٥٩)،(الأعـراف: ١٥٥ ـ ١٥٨).

واتە: موسا هەفتا کەسی لە گەلەکەی خۆی هەڵبژارد، تا بچن بۆ ئـەو شـوێنەی ئێمە بۆمان دیاریکردبوو، (کێوی تور)، کە کاتێکیش زەمین لەرزەکە هاتو گرتنـی (موسا) وتی: پەروەردگاری من ئەگەر تۆ بتویستایە منیش‌و ئەوانیشت بە هیلاکدا ئەبرد، ئایا لە بەر کاری نەزان‌و گێلەکانی ناومان ئێمە لە ناو ئەبەی ـ پەروەدگارا ـ ئـەوە ئاقیکردنـەوەی خۆتـە ئەیکەیتـە مایـەی گـومڕاهی بـۆ هەرکەسـێك بتـەوێ‌و ئەیکەیتە مایەی هیدایەتیش بۆ هەرکەسێك بتەوێ، هەر تۆ پشتیوانی هـەموومانی، لێمان خۆش ببەو سۆزت بێتەوە پێماندا کە هـەر تـۆ باشـترین لێخۆشـبوی* شـتی چاکمان لەم دونیایەدا بۆ بنووسەو لە ئاخیرەتیشدا هەروەها ئێمە گەڕاوینەتەوە بۆ لای تۆ، خواش فەرمووی: سزام تووشی هەموو ئەوانە ئەکەم کە ئەمـەوێت‌و سـۆزو ڕەحمەتیشم هەموو شتێکی ئاخنیوەو بۆ ئـەو کەسانەشـی ئەنووسـم کـە تـەقوایان هەیەو زەکاتئەدەن‌و هەروەها ئەوانەی کە بڕوایان بە ئایەتـەکان(بەڵگـەکان)ی مـن هەیـە*ئەوانـەی کـە شـوێن ئــەو پێغەمبــەرە نەخوێنــدەوارە ئەکــەون کــە(نــاوو

سیفەتەکانی ) لە تەوراتەکەی لای خۆیاندا ئەبینن، هەروەها لە ئینجیلدا، ئەو پێغەمبەرەی کە فەرمانیان پێئەکات چاکە بکەن‌و بەری خراپەکردنیان لێدەگرێت‌و شتە پاکو بەسوودەکانیان بۆ حەڵاڵ ئەکات‌و شتە پیس‌و زیانبەخشەکانیشیان لێ حەرامئەکات‌و ئەرکە قورسەکانیان لەسەر لائەبات‌و ئەو کۆت‌و زنجیرەش لە گەردنیاندایە ئەیشکێنێ‌و هەموو ئەو کەسانەش کە بڕوای پێدێنن‌و بەرز ڕایئەگرن‌و سەری ئەخەن‌و بەشوێن ئەو (نور)ەدا ئەچن کە لەگەڵیدا دابەزێنراوە، ئەوانەو تەنیا ئەوانە سەرکەتوو ئەبن* ئەی پێغەمبەر تۆش بڵێ: خەڵکینە، من پێغەمبەری خوام بۆلای هەمووتان هاتووم ئەو خوایەی کە خاوەنی موڵکی ئاسمانەوکان‌و زەوییە کە هیچ خوایەکی تر نییە ئەو نەبێ کاری زیندووکردنەوەو کاری مراندن هەر بەدەست ئەوە بڕوا بەخواو بەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارە بکەن، کە ئەوپەڕی بڕوای بەخواو قسەی خوا هەیەو بە شوێنیدا بڕۆن بەڵکو هیدایەت وەربگرن.

لەم چەند ئایەتەدا دووجار وشەی (الأمـي) بەکار هاتووە کە هەموو زانایانی زمانەوانی عەرەب ئەڵێن: "الأمـي: من لايعرف الكتابـة ولا القـراءة، والاميـة: جهـل الكتابـة والقـراءة، نقـول مكافحـة الاميـة"[١٩٨]، واتـە: (امـي) کەسێکە نەنووسین و نەخوێندنەوە نەزانێت، (امية)ش (نەخوێندەواری) بریتییە لە نەزانینی نووسین‌و خوێندنەوە، ئەوتریێ قەڵاچۆکردنی (امية) واتە نەخوێندەواری.

پێغەمبەریش (صلى الله عليه واله وسلم) خۆی ئەفەرموێت: (انا امة امية) یان ئەفەرموێت: (ما أنا بقارئ) (ئێمە میللەتێکی نەخوێندەوارین)، (من نازانم بخوێنمەوە) زانایانی مێژووش بە درێژی باسی هەموو ژیانی پێغەمبەریان (صلى الله عليه واله وسلم)کردووە، کە هیچ کەسێکی تر نییە لە هەموو دنیادا بەو درێژیە ژیانی نووسرابێتەوە ئەو نەبێت، کەچی هیچ مێژوونووسێك باسی ئەوەی نەکردووە کە فڵانە ساڵ چوبێتە بەر خوێندن یان لای فڵانەکەس خوێندوویەتی، یان فڵانە کتێبی نووسیبێت، هەروەها ئەوە قورئان باسی نەخوێندەواری (امـي) پێغەمبەر

[١٩٨] المنجد في الغة والاعلام/ ماددەی "ام".

(صلى الله عليه واله وسلم)دەکاتو ئەوەش زمان (اللغـة) کـە شـتێکی (بێلایـەن)ەو (امـي) بـە نەخوێنـدەوار مانـا ئـەکاتو ئـەوەش پێغەمبـەر (صـلى الله عليـه والـه وسلم)خۆی دانیپێدائەنێ وەك ئەشلێن: (الاقرار سيد الادلة) ئـەوەش مێـژوو.. ئـیتر نازانم بۆچی هەندێ کەس هەر سـواری سـەریان ئـەبنو نکـولی لـە(نەخوێنـدەواری) پێغەمبەر(صلى الله عليه والـه وسـلم) ئەکـەنو گـوێ بـە ئـەم هـەموو سـەلماندنەی نادەن.. هۆکەی، خوا زاناترە. ئەوەیە ئەیانەوێ بە بەردێ دوو نیشانە بشکێنن:

یەکـەم: سـیفەتی پێغەمبەرایـەتی لـە (محمـد) بکەنـەوەو وەك فەیلەسـوفێكو پیاوێکی عەبقەری دەریخەن، تا خۆیان لـەوە بدزنـەوە کـە بـاس لـە شـوێنکەوتنی خۆیو دینەکەی بکرێو باسی یاساو ڕێنماییـەکانی وەك حـەڵاڵو حـەرام بکـرێ تـا ئەوو ئەفلاتونو ئەرستۆو کێو کێ یەکسان بکرێن..

دووەم: بەم سەلماندنە ڕەتی هەموو ئەو ئایەتو فەرموودانە بکەنەوەو کە باس لە نەخوێنندەواری پێغەمبەر(صلى الله عليه واله وسلم)ئەکەنو بەوەش ڕێگەیان بۆ خۆشئەبێت گومانو دوودڵی لەسەر هەموو بڕگەکانی ئیسلام دروسـتبکەنو ڕەخنـە لە تەواوی ڕێنماییو یاساکانی بگرنو خەڵکی وەك دیاردەیـەکی کۆمەڵایـەتی–نـەك ئاینێکی خوایی– خەڵك سەیربیکەن.

شـتێکی سـەیرتر ئەوەیـە هەنـدێ لـەم تەزوویرچـیانە ( کـە وەرگێڕەکـەی ئایـا قورئان پارێزراوە) یەکێکیانەو لە کتـێبی فشـۆڵی ئیسلامناسـیەوە هەنـدێ قسـەی عەلی میرفترۆس ئەگوازێتەوە کە بە فێڵبازانە میرفیترۆس) ئەڵێن: "بە پێچەوانەی ئـەو شـتەی کـە سەرچـاوە ئاینییـەکان دەیڵـێن: حـەزرەتی موحەممـەد نـەك هـەر کابرایەکی نەخوێندەوار نەبووە بگرە زۆریش خاوەنهۆشو بەفەرهەنگ بـووە، هـەر بە پشتبەستن بەو زانیاریو فەرهەنگانەوە بوو کە ئاینی ئیسلامی دامەزراند"[١٩٩].

[١٩٩] عەلی میرفیترۆس، (ئیسلامناسی) (ل٢٣)، ئەوەیە ئامانجی سەرەکی ئەو کەس و سـەنتەرانەی کـە رەواج بۆ خوێندەواری و عەبقەرییەتی پێغەمبەر(صلى الله عليـه والـه وسـلم)دروسـتئەکەن و نکـولی لـە نەخوێندەواریەکەی ئەکەن.

ئەو نووسەرە گوماناویە بە زمانێکی تری ساختەکارانەوە فێڵ لە خوێنەری ئەکاتو ئەڵێ: "بێگومان سەرپەرشتی کردنی دامەزراوە گەورە بازرگانییەکەی خەدیجە پێویستی بە زانینو شارەزاییەکی زۆر بووە، ئەم مەسەلەیە دەبێت بەتایبەتی بە گوێی ئەو مێژوو نووسانەدا بدریتەوە کە پێغەمبەر بە کەسایەتییەکی بێ ئاگاو نەخوێندەوار دەناسێنن"[٢٠٠].

فێڵەکەی لەوەدایە دوو وشەی (بێئاگا)و (نەخوێندەوار) پێکەوە گرێ ئەدات وەك ئەوەی گوایە موسڵمانان کە ئەڵێن پێغەمبەر(صلى الله عليه واله وسلم) نەخوێندەوارە ئەوە وەك ئەوە وایە بڵێن بێئاگایە!! یان وەك ئەوەی هەموو نەخوێندەوارێك هەر ئەبێ بێ ئاگابێت یان هەموو خوێندەوارێ حەتمەن بەئاگایە، لە کاتێکدا ئەو دوو شتە–وەك ئەڵێن– کەسیان (لازم)و (مەلزوم)ی یەکتر نین، ئەگونجێ کەسێك نەخوێندەوار بێتو زۆر عاقڵو هۆشیارو لێوەشاوەش بێت هەروەك ئەبینرێ خوێندەواری وا هەیە هەژارە (قل) لە (فل) جیا ناکاتەوە، بەڕاستی ئەم نووسەرانەی ئێستا کە پەلاماری ئیسلام ئەدەنو نەشتەری ڕەخنەی نەزانانەی لێهەڵئەگرن! زۆرجار ئەکەونە هەڵەی واوە کە هیچ منداڵێکی سەرەتایشی تێناکەوێ[٢٠١].

---

[٢٠٠] هەمان سەرچاوە (ل٩٩).

[٢٠١] بۆ نموونەو تەنیا بۆ نموونە (مەزدەکی) لە کیتبی (عەرەبو ئیسلام)دا لاپەڕە (١٨٢) ئەڵێ: هەرچەندە عومەر بە دادپەروەری ناسراوە کەچی خۆی لە کوشتنەوەی بکوژانی عوسمانی کوڕی عەفان لاداوە بە بیانووی ئەوەی کە ئیمامی عەلی گوتوویەتی نابێ چەند کەسێك لەبری یەك کەس بکوژرێ.. جا توخوا خوێنەری بەڕێز! هیچ نەخوێندەوارێك نەزانینی وا ئەکات، (عومەر) کە پێش (عوسمان) مردبێتو عوسمان دوای ئەو بووبێتە خەلیفە ئیتر چۆن عومەر هاتە ژیانو دادگای بۆ بکوژانی عوسمان دانا؟ ئەگەر نەیوتایە (عومەر کە بەدادپەروەر ناسراوە) من گومانی هەڵەی چاپم ئەبردو ئەموت: لەوەئەچێت ناوێکی تر بێت جگە لە عومەری کوڕی خەتتاب، بەڵام دیارە کابرا هەر بە ڕاستیی مەبەستی عومەری کوڕی خەتتابە. یان ئەم وەرگێڕەی ئایا قورئان پارێزراوە لە دەیان شوێندا ئەو جۆر هەڵانە ئەکات بۆنموونە ڕەخنە لەوە ئەگرێ کە پێغەمبەر(صلى الله عليه واله وسلم) راوێژی زۆری بە هاوەڵە بەڕێزەکانی کردووە، ئەڵێ:(..کەواتە محمد راپرسی بە هاوڕێکانی کردووەو رای کامیان توندو

ئەم (میر فیتروس)ە–ی کە وەرگێڕەکەی ئایا قورئان پارێزراوە قسەکانی دەربارەی نەخوێندەواری پێغەمبەر بە سەنەدو قسەی کاربڕ ئەزانێ– لە لاپەڕە (٢٤)ی کتێبەکەیدا بە راشکاوی ئەڵێ: "مەسەلەی خوێندەوار نەبوونی پێغەمبەر درۆیەکی مێژووییە، ویستیان کەڵك لەم ئامرازە وەربگرن و (محمد) وەك کەسایەتییەکی ئەفسوناوی و سەرو سروشت بنوێنن و بۆ بەرەو پێش بردنی باوەڕە ئەندێشەکانی (بەناوی قسەی خواوە) کەڵك لەم پەرجووە (معجزە) وەربگرن، لەکاتێکدا دەزانین وشەی (امی) دەگەڕێتەوە بۆ (ام القراء= مەککە)ی زێدی پێغەمبەر"ت.

دوای ئەمانە پەراوێزێکی دوورو درێژی هێناوە کە گوایە (ام القری) ئەگەر (ی) نیسبەتی بچێتە سەر ئەبێتە (امی)، بەو شێوەیەش(امی)مانای نەخوێندەوار نیەو بەڵکو مانای خەڵکی مەککە ئەگەیەنێت، لە وەڵامی ئەم (سواری سەری خۆی بووەی (میر فیتروس))دا ئەڵێین:

١ـ تۆ لەوەدا بەهەڵەداچووی کە هەرچی (أم القری) هەیە کردووتە بە (ام القراء)، چونکە (القری) کۆی (القریة)یەو (القراء) کۆی (قارئ)ە، وەك کابرای کورد ئەڵێ: "ئەو دوانە تەنیا خوایان یەکە"[202] و زۆر لەیەکتر جیاوازن.

٢ـ لە زمانی عەرەبیدا وشەکان دوو جۆرن: وشەی سادەو وشەی لێکدراو، وشەی لێکدراویش سێ جۆرە: (مرکب مزجي)و (مرکب اضافي)و (مرکب أسنادي)،

---

تیژتر بووبێت ئەو رایەیانی وەرگرتووە،بۆ نمونە لە یەکێك لە جەنگەکاندا حەفتا کەسیان بەدیل گرت، دوای راپرسی بە ابوبکرو عەلی و عومەر،رای عەلی ئازادکردنیان بوو، رای بەکریش هێشتنەوەی دیلەکان بوو، بەڵام محمد دوا رای وەرگرت کە رای عومەر بوو بۆ کوشتنیان، ئەوەبوو محمد حەفتا دیلی جەنگی کوشت..)(ل:٣٩١)،دەی خۆ منالی سەرەتایش ئەزانێ ئەو مەسەلەیە هیچ وا نیە،نە کەس کوژراوەو نە ئەوەش روویداوە! بەڵکو پێچەوانەکەی راستە.

[202] شایانی باسە لە هەموو کتێبەکەدا هەر بە (**القراء**) (ام **القراء**) ئەینوێ، چونکە دیارە هەر نازانێ جیاوازییان چییە، ناشکرێ بوترێ ئەمانە هەڵەی چاپن، چونکە ئەی هەلەی چاپ لە وشە کوردییەکاندا بۆ نییە یان دەگمەنە!.

وشەی (مركب مزجي) وەك بعلبك، معدی كرب.. وشـەی (مركـب اضـافي) وەك (أم القرى، صلاح الدين)، (مركب اسنادي) وەك (تأبط شرا، ذرحيا، حيص بيص)..

جا زانایانی زمانەوانی (علماء اللغة) ئەڵێن:

ـ وشەی لێكداراوی (مزجي) كاتێك (ياء)ی نیسبەتی بچێتە سەر ئەوە پاشكۆكەی لائەبرێتو (ياء)ەكە ئەچێتە سەر پێشەكەی، وەك: (بعلبكی) بۆ وشەی (بعلبك) هەندێكیش ئەڵێن ئەچێتە سەر هەردووكیان واتە: ئەبێتە (بعلی بكی).

ـ وشـەی لێكـداروی (اضـافي) كاتێـك (يـاء)ی نیسـبەتی بچـێتە سـەر ئـەوە سەرەتاكەی لائەبرێو (ياء)ەكە ئەچێتە سەر پاشكۆكەی وەك (ام القروی) (صـلاح الديني) هەندێكیش ئەڵێن: ئەچێتە سەر هەردووكی لە هەنـدێ وشـەدا وەك وشـەی لێكدراوی (مزجي) نیسبەت ئەدرێت.

ـ وشەی لێكدراوی (اسنادی)یش (ياء)ەكـە ئەخرێتـە سـەر سـەرەتاكەی، وەك: (تأبطي).

٣ـ هەموو ئەو وشانەی كە لە عەرەبیدا پێیان ئـەوترێ (كونيـة) واتـە (أب) يـان (ام) يان (ابن)ی پێـوە بێـت (يـاء)ی نیسـبەتەكەی ئەچـێتە سـەر بەشـی دووەمـی وشەكە، وەك:

أبو حنيفة – حنفي

ابن حنبل – حنبلي

ام القرا – قروي

ام غيلان – غيلاني

ابن سبأ – سبأي

ئـیتر ئـەوە بنـەما (قاعـدة)یـە لـە زمـانی عەرەبیـدا نـاکرێ یـەکێ لـەو لاوە ڕاسـت بێتەوەو عەرەبی نەزانێو پێچەوانەی (قاعدة) قسە بکات[٢٠٣].

هەوڵێکی نەزۆکانەی (میر فگروس) بۆ سەلماندنی ئەوەی پێغەمبەر(صلى الله عليه والـه وسـلم)کابرایـەکی خوێنـدەوار بـووە بـە پێچـەوانەی ڕاسـتییە مێژووییـەکانو زمانەوانیو سەلماندنی خوا لە قورئانداو پێغەمبەر(صلى الله عليه واله وسلم)خـۆی لـە فەرمودەدا ـ ئەوەیە گوایە پێغەمبـەر(صـلى الله عليـه والـه وسـلم)لـە ڕێکەوتننامـەی (حودەیبییەدا کە قورەیش داوا دەکەن وشەی (رسول الله) بکوژێننـەوە، عـەلی نکـولی لێ ئەکاتو پێغەمبەر(صلى الله عليـه والـه وسـلم) خـۆی ئەیکوژێنێتـەوەو لـە جیـاتی (محمد رسول الله) ئەنووسێ (محمد بن عبدالله) جا ئەم بەڵگەیەش لەوانەی پێشووتری بێماناترە:

١ـ چونکە ئەوە دژی ڕیوایەتە ڕاستەکانی مێژووە.

٢ـ ئەوە دژی هەموو ئەو ڕاستیانەی ترە کە ئێمە لە پێشەوە باسمان کرد (قورئان ـ فەرمووده ـ زمانەوانی ـ ڕاستییە مێژووییەکان).

٣ـ دژی خوێندنەوەی لۆژیکانـەی ئـەو دەقەیـە کـە باسـی سـڕینەوەو نووسـینەوە ئەکات لەو ڕیوایەتەدا..

سەرەتا ڕیوایـەتی ڕاسـتەقینەی مێـژوو بـۆ ڕووداوەکـەی حودەیبییـە ئەمەیـە کـە هەموو نووسەرانی (سیرە) باسی دەکەن..

ئیمامی بوخاری لە (صحیح)ەکەیدا ئەڵێ: بەڕائی کوڕی عازب (ڕەزای خوای لێبێ) ئەڵێ: کاتێك پێغەمبەر(صـلى الله عليـه والـه وسـلم) ئاشـتی ڕاگەیانـد لەگـەل خـەڵکی حودەیبییەدا، عەلی کوڕی ئەبوتالیب (ڕەزای خوای لێبێ) ئاشتینامەکەی لە نێوانیاندا ئەنووسی، نووسی (محمد رسول الله)، موشریکەکان وتیان: مەنووسـن (محمـد رسـول الله)، چونکە ئێمە ئەگەر بمانزانیایە پێغەمبەری خوایت شـەڕمان لەگـەڵ نەئـەکردی، پێغەمبەر(صلى الله عليه واله وسلم) بە عەلی فەرمووی: بیسڕەوە، (عەلی)یش وتـی: مـن

[٢٠٣] چۆن ئێمـەی کـورد ئەگـەر یـەکێ بڵـێ فلانەکـەس خـەڵکی (چوارییە) لـە جیـاتی نیسبەتدانانی بـەلای (چوارتا)ی لای سلێمانی، ئەچین بەگژیا ئەمەی (میر فیتروس)یش هەر شتێکی وایە..

ئەو کەسە نابم ناوی تۆ ئەسڕێتەوە، پێغەمبەر(صلی الله علیه واله وسلم)خۆی سڕییەوە"[٢٠٤]، ئیمامی (موسلیم)یش هەمان فەرموودە ئەهێنێو تەنیا لەفزی (بە دەستی خۆی سڕیەوە)ی زیادە لە بوخاری[٢٠٥].

هیچ یەکێك لەو دوو کتێبە (صحیح)ە باسی ئەوە ناکەن کە پێغەمبەر(صلی الله علیه واله وسلم)خۆی نووسیبێتی، هەموو ئەو کتێبانەش لە (سیرە)دا نوسراون بەم شێوەیە باسی نووسینی ئەو ئاشتینامەیە ئەکەن.. بۆنمونە (ابن کثیر) لە تەفسیرەکەیداو لە (البدایة والنهایة)کەشیدا ئەڵێ: "..

کە سوهەیلی کوڕی عەمر هاتە لای پێغەمبەر(صلی الله علیهوالهوسلم)وتی: بێنە با ئاشتینامەیەك لە نێوان ئێمەو ئێوەدا بنووسین، پێغەمبەر(صلی الله علیه واله وسلم) (عەلی) بانگ کردوو فەرمووی: (اکتب بسم الله الرحمن الرحیم)، سوهەیلی کوڕی عەمر وتی: بەڵام وەڵڵاهی من نازانم (الرحمن) چییە، نا، بنوسە (باسمك اللهم) وەك چۆن لەمەو پێش ئەتنوسی، موسڵمانەکان وتیان: سوێند بەخوا هەر ئەبێ بنوسێ (بسم الله الرحمن الرحیم)، پێغەمبەر (صلی الله علیه واله وسلم)فەرمووی (قەیناکا) بنوسە (بسمك اللهم) پاشان پێغەمبەر فەرمووی: ئەمە ئەو ئاشتینامەیە کە موحەممەدی پێغەمبەری خوا نووسیویەتی..

سوهەیل هەڵیدایەوەو وتی: وەڵڵاهی ئەگەر بمانزانیبا تۆ پێغەمبەری خوای نە شەڕمان لەگەڵ ئەکردیو نە بەرگری ماڵی خواشمان لێ دەکردی، بەڵکو بنووسە (محمد بن عبدالله) پێغەمبەر(صلی الله علیه واله وسلم) فەرمووی: (والله انی لرسول الله وان کذبتمونی، أکتب محمد بن عبدالله)، لە ڕیوایەتێکی تردا ئیمامی ئەحمەد ئەفەرمووێ: سوهەیل وتی: (لو نعلم انك رسول الله لأتبعناك، ولکن أکتب اسمك واسم ابیك)"[٢٠٦](*).

---

[٢٠٤] ارشاد الساری (٤/٤٢٢).

[٢٠٥] ارشاد الساری (٧/٤١٤).

[٢٠٦] مختصر تفسیر ابن کثیر/ علي الصابوني ج٢/ص٣٥٢/ط (٥)/١٩٨٦/ دار التعليم/ بيروت/ لبنان.

* لە هەموو دنیادا هەروایە (ئاشتینامە) ئەبێ بە ڕەزامەندی هەردوولایەنی شەڕکەر بنووسرێت نەك یەك لایەنە.

(محمد حسين هيكل)يش له (حياه محمد)دا ئەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم)عەلی کوڕی ئەبوتالبی بانگ کردوو پێی وت: "اكتب بسم الله الرحمن الرحيم، سوهەيل وتی: امسك لا اعرف الرحمن الرحيم، بل اكتب: بسمك اللهم"، پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم)فەرمووی: اكتب بسمك اللهم، پاشان پێغەمبەر(صلى الله عليه واله وسلم) فەرمووی: هذا ما صالح عليه محمد رسول الله سهيل بن عمرو..، سوهەيل وتی: امسك، لو شهدت انك رسول الله لم اقاتلك، ولكن اكتب اسمك واسم ابيك، پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم)فەرمووی: اكتب هذا ما صالح عليه محمد بن عبدالله". پاشان تەواوی بڕگەکانی ئاشتینامەکەیان نووسی[٢٠٧]، (مباركفوری)یش له (الرحيق المختوم: ص ٣٢٩)و موحەممەد ئەلغەزالی لە (فقه السيرة: ص ٣٦٠)و موحەممەد عەلی ئەلصەلابیش له (السيره النبويه: ٢/ص٢٥٤ ـ ٢٥٥).دا هەر بەهەمان شێوە باسی ئەو ڕێککەوتننامەیە ئەکەن و کەسیان باس لەوە ناکەن پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) خۆی ئاشتینامەکەی لە عەلی وەرگرتبێت و لە جیاتی (محمد رسول الله) (محمد بن عبدالله)ی نووسیبێ.

(ابن كثير) له (البداية والنهاية)دا ئەڵێ: له ڕیوایەتێکی صەحیحدا هاتووە کە عەلی وتی: (والله لأمحوك ابدا) پێغەمبەر ئاشتینامەکەی لەدەست وەرئەگرێت و ئەنووسێ: (هذا ما قاضي عليه محمد بن عبدالله) بەڵام ئەم ڕیوایەتە زانایان قسەیەکی زۆریان لەسەر کردووەو ئێمەش لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا کە ئەفەرموێ: (وَمَا كُنتَ تَتْلُو مِن قَبْلِهِ مِن كِتَابٍ وَلَا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ إِذاً لَّارْتَابَ الْمُبْطِلُونَ) (العنكبوت: ٤٨)[٢٠٨]، هەندێکمان باس کردووە[٢٠٩]، جا (ابن كثير) له تەفسیرەکەیدا دەربارەی ئەم ئایەتە ئەڵێ: واتە ئەی پێغەمبەر تۆ ماوەیەکی زۆر لەناو ئەم گەلەدا بوویو تەمەنێکت لەناویاندا سەرف کردووە پێش ئەوەی ئەم قورئانەت بۆ بێت، کە نەخوێندنەوەو نە

---

[٢٠٧] **حياة** محمد/ هيكل/ ص٣٧٤.

[٢٠٨] مەبەستی (ابن كثير) ئەوەیە لە تەفسیرەکەی خۆیدا واتە: (تفسير القرآن العظيم: ابن كثير) ئەو مەسەلەیەی باس کردووە.

[٢٠٩] البداية والنهاية (٤/٥٣٣).

نووسینت نەزانیوە، هەر بەو شێوەیەش وەسفکراوی لە کتێبە پێشووەکاندا وەك خوای گەورە ئەفەرموێت:

(الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِنْدَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنْكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالْأَغْلَالَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ فَالَّذِينَ آمَنُوا بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُوا النُّورَ الَّذِي أُنْزِلَ مَعَهُ أُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ)،(الأعراف: ١٥٧).

به پێی ئایەکە پێغەمبەر(صلى الله عليه واله وسلم) بە هەر بەو شێوەیەش تا قیامەت ئەمێنێتەوە نە ئەتوانێ دێڕێ یان پیتێ بنووسێ‌و نە ئەتوانێ شتی بخوێنێتەوە، بەڵکو پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه واله وسلم) بۆ هەموو شتێ نووسەری تایبەتی هەبووە، چ بۆ (سروش) نووسینەوە چ بۆ نامە ناردن بە هەرێمەکاندان هەندێ کەسیش فەرموودەیەك باس ئەکەن گوایە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه واله وسلم) پێش ئەوەی بمرێ خۆی فێری نوسین کردووە ئەوە فەرمودەیەکی (ضعيف)ەو هیچ بناغەیەکی نییە[٢١٠].

ئەمە بۆ ڕاڤەی حاڵی یەکەم کە وتمان ئەوەی کە ئەڵێ: دژی ڕیوایەتە ڕاستەکانی مێژووە(!!)

هەروەها ئەمە دژی هەموو ڕاستییەکانی ترە کە باسمانکردن:

ـ قورئان بە (امي) ناویبردووە، هەروەها قورئان ئەفەرموێ: (وَمَا كُنتَ تَتْلُو مِن قَبْلِهِ مِن كِتَابٍ وَلَا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ إِذاً لَّارْتَابَ الْمُبْطِلُونَ) (العنكبوت: ٤٨)، واتە تۆ ئەی پێغەمبەری خوا پێش هاتنی ئەم قورئانە بۆ سەرت، نەت ئەزانی هیچ کتیبێك بخوێنیتەوە یان بەدەست شت بنووسی، ئەگەر وانەبوایە کەواتە، (خەڵکی ناهەق ئەکەوتنە ناو گومانەوە.

(سبحان الله)! وەك ئەوەی ئەم ئایەتە بۆ ئەمڕۆو دەربارەی کەسانی وەك (میر فیترۆس و مەزدەکی‌و زەردەشتی‌و بابەك و قەشە فادی و..)و ئەو پێڕانە دابەزیبێ!

---

[٢١٠] مختصر تفسير ابن كثير (٤٠/٣).

ئایەتەکە ئەفەرموێ (بـە مـەعنا) ئەگـەر خوێندەواربویتایـە "خـەڵکێکی ناهـەق"ی وا هەبوو گومانی ئەبرد کە ئەم قورئانە زادەی بیرو بیرکردنەوەی خۆت بێتو سودت لـە سەرچاوەو خـەڵکی تـرەوە وەرگرتبێـت، ئەمـە بنەمایـەکی لـۆژیکی وردە کـە لـە دوو سەرەتاو ئەنجامێك پێکهاتووە، وەك لە زانستی (منگق)دا باس ئەکرێ.

ـ تۆ نە خوێندنەوەو نە نووسینت نەزانیوە لەوەو پێش

ـ قورئانیش کتێبێکە نووسینو خوێندنەوەی تێدایە.

ـ کەواتە قورئان زادەی بیرو بیرکردنەوەی تۆ نییەو با هەموو کـەس دڵنیـابن لـەم ڕاستییە، ئەگەر تۆ خوێندەواربویتایە جێگەی خۆی بوو گومانێکی وەهـا ببرێـت پێـت لەلایەن خەڵکەوە، مادامێك ئەوەیان وانییە کەواتە ئەمیشیان وانییە..

بە نیسبەت خوێندنەوەی لۆژیکیانەش بۆ ئەومەسەلەیە کە ئەڵێ: پێغەمبەر(صلی اللە علیە والە وسلم) ئاشتینامەکەی لە عـەلی وەرگـرتو بـە دەسـتی خـۆی سـڕییەوەو پاشان نووسی (محمد بن عبـداللە) خوێندنەوەکـەی ئەوەیـە کـە (عـەلی) ڕەزای خـوای لێبـێ، پێـی ناخۆشـبووە وشـەی (رسـول اللە) بکوژێنێتـەوەو بـەبێ ئـەدەبی زانیـوەو نەیویسـتووە خــەڵکی وابـزانن سـڕینەوەی وشـەی (رسـول اللە) لای شـوێنکەوتوانی پێغەمبەر (صلی اللە علیە والە وسلم)مەسەلەیەك نییەو زۆر شـتێکی سروشـتییە بۆیـە حەزی کردووە پێغەمبەر(صلی اللە علیە والە وسلم)خۆی ئەو کارە بکات.

کە پێغەمبەر خۆی سڕیویەتییەوە دیارە یەکێکی تر نووسیویەتییەوە، ئـیتر عـەلی بووبێـت یـان جگـە لـە عـەلی بووبێـت.. ئـەوە خوێندنەوەیـەکی لۆژیکیانـەو هـەر لـە خوێندنەوەی پیاوی عاقڵە کە کاتێك کەسێك ئەڵێ: سـەرۆك فـلان نامـەی نووسـی بـۆ فلانە سەرۆکی تر واتێئەگات کە مەرج نییە بە دەسـتو پەنجـەی خـۆی نووسـیبێتی، چونکە هەڵئەگرێ ـ ئەنجومـەنی شـوراکەی یـان ئۆفیسـی تایبـەتی خـۆی نامەکـەیان نووسیبێو ئەویش مۆری کردبێ، ئەوە شتێکی سروشتییە ئەوەتا ئەوترێ "بنی الامیر المدینة" واتە: بە بڕیارو ئاگاداری ئەو، نەك وەك ئەم نووسـەرانە حـاڵی بـوون، گوایـە

"ئەمیرەکە خۆی پاچو بێڵی هەڵگرتبێتو بەرد بەبەرد خەریکی دروستکردنی شارەکە بوو بێت"[٢١١].

ئەمانە هەمووی لە لایەك، لەلایەکی ترەوە باشە قورئان کەی ئەوەندە شتێکی بچووكو سادەیە پێغەمبەر(صلى الله عليه واله وسلم)بتوانێ دایبنێ و دایبڕێژێت ـ هەرچەندە زۆر خوێندەوارو لێوەشاوەش بێت؟ نەك پێغەمبەر(صلى الله عليه واله وسلم)بەڵکو تەواوی زاناو فەیلەسوفو خوێندەوارەکانی دونیا تا قیامەت ناتوانن شتێکی وەکو قورئان دابنێن.. کێش بڕوا ناکات فەرموو ئەوە عەرزو ئەوەش گەز.. (وَإِنْ كُنْتُمْ فِي رَيْبٍ مِمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِنْ مِثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ (٢٣) فَإِنْ لَمْ تَفْعَلُوا وَلَنْ تَفْعَلُوا فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ (٢٤)[٢١٢].

## نمونەی دووەم: چیرۆکی ئەفسانەیی غەرانیق

قەشە فادی لە چەند شوێنێکی ئەم کتێبەدا ئەوە دووبارەو چەند بارەئەکاتەوە کە پێغەمبەر(صلى الله عليه واله وسلم) بۆ راکێشانی بێباوەڕەکان لە بیروباوەڕی یەکخواپەرستی لایداوەو مەدحی بت و ئالیهەکانی قورەیشی کردووەو ویستوویەتی بە قسەگەلێکی شەیتانی سەرۆکایەتیکردنی خۆی بەسەر قورەیشیەکاندا بباتەوە!! ئەم قسەیە هەر ئەو قسەیەیە کە نووسەری ئیسلامناسی عەلی میرفیترۆس—کە یەکێکە لە سەرچاوەکانی وەرگێڕی ئایا قورئان پارێزراوە لە کاتی نووسینی کۆمێنت و سەرنجە تایبەتیەکانی خۆیدا—، میرفیترۆس لەوێدا ئەڵێ: "ئەستۆکراتو دەوڵەمەندەکان وای بۆدەچوون کە ئاینی موحەممەد کۆتایی بە دەسەڵاتی ئابووریو ژیانی سیاسییو سەروەری چینایەتییان دێنێت،

---

[٢١١] بۆ زیاتر بەڵگە لەسەر ئەم خاڵە بڕوانە (مدخل الى القران الكريم) **عرض تأريخ وتحليل مقارن**، د. محمد عبدالله دراز، ص ١٤٠.

[٢١٢] بۆ بەرزی قورئانو هەمەڕەنگی بابەتەکانیو ئیعجازی قورئان سەیر کتێبی (**مناهل العرفان/ الزرقاني**) بکە، بەتایبەتی بەرگی دووەمی.

ئەرستۆكراتو دەوڵەمەندەكانی قورەیش بەپێی لێكدانەوەیان بـەجۆرێك دەسـتیان دایە دژایەتی كردنو ئـازاردانی موحەممـەد تەنانـەت حـەزرەتی موحەممـەدیان بـۆ ماوەیـەكیش تووشـی نائومێـدی كـردو درێـژەی كێشـا، بـەڵام لـە درێـژەی ئـەو نائومێدییـەدا بـۆ ئـەوەی ئەرسـتۆكراتەكانی قـورەیش بكاتـە لایـەنگری خـۆیو ڕایانكێشێت بەلای خۆیدا دەستی كرد بە ستایشو پێدا هەڵگوتنی بتـە گرنگـەكانی قـورەیش"[٢١٣]، جـا فـادی دوای ئەمـە باسـی ڕووداوی هەڵبەسـتراوی (غـەرانیق) ئەكات[٢١٤]، گوایە پێغەمبەر(صلى الله عليه واله وسلم) لە مەككەدا ڕۆژێك لە كەعبەدا ئەبێ سورەتی (النجم) ئەخوێنێ تا ئەگاتە ئەو ئایەتەی ئەفـەرموێ (أَفَـرَأَيْتُمُ اللَّاتَ وَالْعُزَّى* وَمَنَاةَ الثَّالِثَةَ الْأُخْرَى) (النجم: ١٩ ـ ٢٠)، پێغەمبـەر(صـلى الله عليـه والـه وسلم)ئەم دوو سێ ڕستەیە زیاد ئەكاتو ئەڵێ: (تلـك الغرانيـق الاولى وان شـفاعتهن لترتجـى!)، ئەوانـە باڵنـدەی بەرزاییـەكانن، تكایـان وەردەگـیرێ و ئومێیـان پێوەئەبەسـترێت[٢١٥]، دوای ئـەوە بـەردەوام ئـەبێت لەسـەر ئایەتـەكان تـا ئەگاتـە كۆتایی كە ئەفەرموێت:(فَاسْجُدُوا لِلَّهِ وَاعْبُدُوا)،ئیتر خۆی كڕنوش ئـەباتو هەرچـی موسـڵمانو كـافریش هەیـە كڕنـوش ئەبـەنو ئـەو هەواڵـە ئەگاتـە هـەموو دنیـاو كۆچەرانی حەبەشەش ئەمە ئەبیستن و ئەگەڕێنەوە بۆ مەككە..

ئـەم چـیرۆكە درۆینـە لـە دێـر زەمانـەوە دەم بـەدەم گێڕراوەتـەوەو هەنـدێ لەموفەسیرو نووسەرانی (سـیرە) كـە گـوێ بـە (سـەنەد)ی فـەرموودە نـادەن ئـەم چیرۆكە پووچەیان باسكردووە بێ ئەوەی موناقەشەی بكەنو لەوانیشەوە زۆربـەی زۆری (ڕۆژهەڵاتناسـان)[٢١٦] وەك دوو هـەنگیان لـە دارێكـدا دۆزیبێتـەوە بـەردەوام باسی دەكەن، ئەم درۆو بوختانە لـە زۆر ڕووەوە پووچـیو بـێ مانـایی ئاشـكرایە،

---

[٢١٣] ئیسلامناسی، ل ٢٦.

[٢١٤] ل:٣٦٨.

[٢١٥] لەدواوە ڕۆشنی ئەكەینەوە كە غەرانیق بە باڵندە ناوترێت وەك وەرگێر مانایكردووە.

[٢١٦] لەوانە (كارل برۆكلمان) كە هەڵدەگرێ (مير **فطروس**) لەمی وەرگرتبێ، لە (تأريخ الشعوب الاسلاميه)دا، ل٣٤دا ئـەڵێ: "محمد بتەكانی قورەیشی لاپوچ بوو، بەڵام هەر لەسەرەتای بانگەوازەكەیەوە دانی نا بە گەورەیی ئەو بتانەدا!!".

بەڵام ئێمە زۆر بە کورتی ئەو وەڵامانە ئەنووسینەوە کە بە ڕێز "محمد حسین هیکل" لە (حیاە محمد)دا هێناونی بۆ ڕەتکردنەوەی ئەم چیرۆکی (غەرانیقە).

"هیکل" لەژێر ناونیشانی "فشۆڵی (تهافت) چیرۆکی غەرانیق"دا ئەڵێ: "ئەم چیرۆکی (غەرانیق)ە زیاد لە یەکێك لە نووسەرانی سیرە باسیان کردووە، زیاد لە موفەسیرێکیش ئاماژەیان بۆ کردووە، زۆرێك لە ڕۆژهەڵاتناسانیش لەسەری ڕاوەستاون، ئەم هەواڵەش هەواڵێکی فشۆڵو پووچەو بە کەمترین لێکۆڵینەوە لەبەریەك هەڵدەوەشێت، سەیرم دێ هەندێ موفەسیرو نووسەری (سیرە) باسیان کردووە، هەر لەبەر پووچیو بێ مانایی ئەم چیرۆکەیە کە لە "ئیبن ئیسحاق"[٢١٧] یان پرسی ڕات چییە بەرامبەری: بێ دودڵی وتی: زەندیقەکان(*) دایانناوە! هەرچەند هەندێ لەوانە ئەم چیرۆکەیان هێناوە ئەیانەوێ پشت بە هەندێ ئایەت ببەستن بۆ ڕاستکردنەوەی چیرۆکەکە وەك ئایەتی: (وَإِن كَادُواْ لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ الَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ..)، هەروەها ئایەتی: (وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ وَلَا نَبِيٍّ إِلَّا إِذَا تَمَنَّى أَلْقَى الشَّيْطَانُ فِي أُمْنِيَّتِهِ فَيَنسَخُ اللَّهُ مَا يُلْقِي الشَّيْطَانُ ثُمَّ يُحْكِمُ اللَّهُ آيَاتِهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ * لِيَجْعَلَ مَا يُلْقِي الشَّيْطَانُ فِتْنَةً لِّلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَالْقَاسِيَةِ قُلُوبُهُمْ وَإِنَّ الظَّالِمِينَ لَفِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ) (الحج: ٥٢ . ٥٣). جا هەندێ وشەی (تمنی) بە خوێندنەوە مانا ئەکەن! هەندی تریش هەر بە (هیواو حەزە) زانراوەکە تەفسیری ئەکەن[٢١٨].

ئەمانە بە دواشیاندا ڕۆژهەڵاتناسان ئەڵێن.. موحەممەد بۆ ڕزگارکردنی خۆیو شوێنکەوتەکانی لە دەست ئەشکەنجەی قورەیش خۆی بردە پێشەوە لە

---

[٢١٧] کۆنترین مێژوونووسەکە ژیانی پێغەمبەری ﷺ نووسیبێتەوە بە سەنەدی خۆی ناوی (سیرە النبی ﷺ: بن اسحاق)ەو بەناوی (السیرە والمغازی)ەوە چاپ کراوە.

* (زەندیق) بە کەسێك ئەوترێ کە هەوڵی تێکدانی دین بداتو لەڕووکەشیدا وەك باوەڕدار خۆی دەربخات و لە ژێرەوە کەنە لەدین بکات، (المنجد: تزندق).

[٢١٨] حیاە محمد/ ص١٦٢.

قـورەیش‌و ئـەو پیاهەڵدانـەی کـرد بـەناو ئایەتـەکانی سـورەتی (الـنجم)دا لەوانـە ڕۆژهەلاّتناس (سیر ولیم مویر)[٢١٩]، کە ئەمەیان ئەڵێ: بەڵگە لەسەر ئەوەی چیرۆکی غەرانیق ڕاستە ئەوەیە کۆچکەرانی حەبەشە دوای ئەم هەواڵە گەڕانەوە بۆ مەککە، جـا (محمـد حسـین هیکـل) یـەك یـەك ئـەو بەڵگـە لاوازانـە ڕەت ئەکاتـەوەو بـە گومانەکەی (مویر) دەست پێدەکات.

١ـ هاتنەوەی کۆچکەرانی حەبەشە لەبەر دوو هۆ بوو:

یەکـەمیان: (موسـڵمانبوونی عومـەری کـوڕی خـەتتاب دوای کۆچـی ئـەوان بـە کەمێك)، موسڵمانبوونی عومەریش بە نهێنـی نـەبوو بـەڵکو بـە ئاشـکرا چـووە نـاو موشریکەکان‌و (تحدی)شی کردن‌و لەگەڵ موسڵماناندا چووە ناو کەعبەو بە کۆمەڵ نوێژیان کردو قورەیش ترسی ئەوەیان لێ نیشت ئەگەر دەسـتیان بـۆ ببـەن، دوور نییە شەڕی ناوخۆیی (الحرب الأهلية) ڕووبدات[٢٢٠]، ئیبن مەسـعود ئـەڵێ: (ان اسـلام عمـر کـان فتحـا وان هجرتـه کـان نصـرا، وان امارتـه کانـت رحمـة)[٢٢١]. واتـە: موسڵمانبوونی عومەر دەرگای خستە سـەر پشـت بـۆ موسـڵمانبوونی خـەڵکی تـرو کۆچکردنەکەشی سەرکەوتنێکی گەورەو بوو، خەلیفایەتییەکەشی سـۆزو ڕەحمـەت بوو بۆ خەڵك.

دووەمیـان: لـە حەبەشـەدا کودەتایـەك کـرا بەسـەر نەجاشـیدا موسـڵمانانی کۆچکردوو گەڕانەوەیان بە چاکترزانی لە مانەوەیان لە حەبەشەدا..

٢ـ ئەوانەش پشت بەو ئایەتانە ئەبەستن بەڵگەکانیان لە بەڵگەی (مویر) پووچ‌و سوکترە.. ئەوەندە بەسە مانای ئایەتـەکان خـۆی بکەینـە بەڵگـە.. خـوای گـەورە بـەدوای ئـەو ئایەتـەدا ئەفـەرمووێ: (وَلَوْلآ أَن ثَبَّتْنَاكَ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْئاً

---

[٢١٩] هەمان سەرچاوە، (ل١٦٢).

[٢٢٠] زانایانی (سـیرە) ئـەڵێن: موسـڵمانبوونی (حـەمزەو عومـەر) بـە دوای یەکدا هـۆی گـەورەی گەڕانـەوەیان بـوو (السـيرە النبويه) الصلابی (٣٧٩/١).

[٢٢١] هەمان سەرچاوەی پیشوو.

قَلِيلاً) (الإسراء: ٧٤). واتە: ئەگەر ڕامان نەگرتايەی خەريك بوو شتێكی كەم مەيل بدەی بە كافران

واتە: خوای گەورە پێغەمبەری پاراستووەو مەيلی نەداوە بە كافران، كەواتە هێنانی چيرۆكی (غەرانيق) بە تەواوەتی ئاوەژوو كردنەوەی ئايەتەكەيە (خوا ئەفەرمویٚ: خەريكبوو ببنە فيتنە بۆتو لەوەی بۆ تۆمان دابەزاندووە دوورت بخەنەوە، تا بوختانت پیٚ بكەن بەدەم ئێمەوەو جگە لە قورئان شتی تر بلٚێی بە ناوی ئێمەوە، ئەگە وات بكردايە ئەوە موشريكەكان ئەيانكردی بە هاورِیٚو دۆستی خۆيان، خۆ ئەگەر ئێمە ڕاوەستاوو دامەزراومان نەكردايەی ئەوە زۆری نەمابوو شتێكی كەم مەيليان بدەيتیٚ، ئەگەر وات بكردايە كەواتە حەقی ئەوەبوو ئێمەش تووشی لاوازیو داماوی دونياو ئاخيرەتمان بكردايەی ئەوكاتەش كەس نەبوو پشتيوانی لیٚ بكرديتايە دژ بە ئێمە)[222] ، ئايەتەكان ماناكەی ئەوەيە كە پێغەمبەر ئەو كارەی نەكردووە بۆيە ئەمە نەك بەڵگە نييە بۆ ئەو مەسەلەيە بەڵكو بەڵگەيەكی فشۆڵو نەخۆشە[223].

٣- ئەم چيرۆكە لە ڕووی (زانست)يشەوە ناڕاستە، چونكە بە جياوازييەكی زۆرەوە گێڕاوەتەوە، هەيە ئەڵیٚ وتی: "تلك الغرانيق العلا وان شفاعتهن لترىحى"، هەيە ئەڵیٚ: "الغرانقه العلا ان شفاعتهن ترتجى"، هەيە ئەڵیٚ وتوويەتی: "ان شفاعتهن ترتجى"، بیٚ باسی (تلك الغرانيق) يان (الغرانقه) يەكیٚ تر ئەڵیٚ: "وانها لهی الغرانيق العلا" ڕيوايەتێكی پێنجەم ئەڵیٚ: "وانهن لهن الغرانيق العلا وان شفاعتهن لهی التی تربحى".

[222] ئەوەی ناو كەوانەكە لە (**حياة محمد**)ەكەدا نيەو تەفسيری ئايەتەكەيەو من بۆ ڕوونكردنەوەی زياتر هێناومە.

[223] **حياة محمد**/ ص١٦٤.

هەندێ کتێبی فەرموودە جگە لەم پێنج ڕیوایەتە هی تریش ئەهێنێ، ئەم هەمووە جیاوازییە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی (چیرۆکی غەرانیق) شتێکی (موضوع)و داهێنراوەو (ابن اسحاق) واتەنی داهێنراوی زەندیقەکانە[٢٢٤].

٤ـ بەڵگەیەکی تر کە لەوان بەهێزترە.. سیاقی سورەتی (النجم)ە کە هەڵناگرێ چیرۆکی (غەرانیق) ڕووی دابێ ئایەتەکان ئەفەرموون: (لَقَدْ رَأَى مِنْ آيَاتِ رَبِّهِ الْكُبْرَى* أَفَرَأَيْتُمُ اللَّاتَ وَالْعُزَّى* وَمَنَاةَ الثَّالِثَةَ الْأُخْرَى* أَلَكُمُ الذَّكَرُ وَلَهُ الْأُنثَى* تِلْكَ إِذاً قِسْمَةٌ ضِيزَى* إِنْ هِيَ إِلَّا أَسْمَاء سَمَّيْتُمُوهَا أَنتُمْ وَآبَاؤُكُم مَّا أَنزَلَ اللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَانٍ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَمَا تَهْوَى الْأَنفُسُ وَلَقَدْ جَاءهُم مِّن رَّبِّهِمُ الْهُدَى) (النجم: ١٨ ـ ٢٣).

واتە: "پێغەمبەر هەندێ لە بەڵگە گەورەکانی خوای دیوە بە دڵنیاییەوە ئێوەش (لات)و (عزی)تان نەدیوە، هەروەها (مەنات)ی سێیەمین[٢٢٥]، ئایا شتی نێرینە بۆ خۆتان بڕیار ئەدەنو شتی مێینەش بۆ خوا* کەواتە ئەوە بەشکردنێکی بێ ویژدانانەیە* ئەمانە هیچ نین ئەوە نەبێت هەندێ ناوە خۆتانو باوو باپیرانتان داتانهێناون، هیچ پیرۆزیو دەسەڵاتێکیان لە خواوە پێ نەدراوە، ئەو موشریکانە دوای وەهمو گومانو دوای هەواو ئارەزووی نەفسیان نەبێت دوای هیچ نەکەوتوون، بە دڵنیاییەوە لە خوای پەروەردگاریانەوە ئەم هیدایەتەیان بۆ هاتووە، (واتە با شوێنی بکەون).."، کەواتە عەقڵ نایبڕێ دوو ڕستە مەدحی لاتو عوززا بکاتو چوار ئایەت بەدوایدا زەمیان بکات، ئەمە دەری ئەخات چیرۆکی (غەرانیق) خورافەیەو زەندیقەکان دایان هێناوە[٢٢٦].

٥ـ بەڵگەیەکی تریش کە (خوا لێخۆشبوو) شێخ موحەممەد عەبدە، هێناویێتیی ئەویش بەڵگەی زمانەوانییە، شێخ موحەممەد عەبدە ئەڵێ: "عەرەب لە هیچ کاتو

---

[٢٢٤] هەمان سەرچاوە/ ل١٦٥

[٢٢٥] عەرەبەکان (لات)و (عزا)و (مەنات)یان بەکچی خوا ئەزانی (**العياذ بالله**) بێ ئەوەی ئەو شتانەیان بینیبێ، (مختصر تفسير ابن كثير/ الصابوني) (٣/٤٠٠).

[٢٢٦] حياة محمد/ ص ١٦٥.

شوێنێکدا وەسفی خواکانیان بە تەیرو تیور نەکردووەو (غرانیق) کە کۆی (غرنق)ە بریتییە لە باڵندەیەکی ئاوی ڕەش یان سپیی یان گەنجێکی سپیکەلەی جوان".

٦ــ بەڵگەیـەکی تـر کـە لـە هـەموویان یەکلاکـەرەوەترە ئـەویش ژیـانی پێغەمبەر(صلى الله عليه واله وسلم) خۆیـەتی: موحەممـەد هـەر لەمناڵیشـەوە بـە (محمـد الامـين) ناسـرابووەو تەمـەنی هێشـتا نەگەیشـتبووە بیسـتو پێـنج سـاڵی، ڕۆژێك پرسـیاری لـە قـورەیش کـردو وتـی: ئەگـەر بڵـێم لـە پشـت ئەشـکەوتێکەوە سوپایەك بۆتان دامەزراوە بڕوا دەکەن.. قورەیش وتیان: (نعم ماجربنا عليك كذبا قط)، ئێمە نەمان دیوە تۆ درۆت کردبێ، بیسـتووتانە کەسـێك درۆ بـەدەم خـۆیو خەڵکەوە نەکات درۆ بەدەم خواوە یکـات؟! لـە خـەڵك بترسـێ لـەخوا ناترسـێ؟! ئەوە کارێکی دەگمەنەو ئەوانەی لێکۆڵینەوەیان دەربارەی کەسایەتییە بەهێزەکان هەیە زوو لەمە تێئەگەن.. لە هـەمووی سـەیرتر نەترسـی ئـەم درۆزنانەیـە کـە ئـەو درۆیانەیان ئاخنیبووەتە ناو هەستیارترین باسەکانی ئیسلام کـە باسـی (توحيـد)و یەکتاپەرستییە کە موحەممەد تەنیا بۆ ئەو پرسە هاتووە، لە یەکـەم سـاتەوەختی هاتنیـەوە هـیچ موسـاوەمەیەکی لەسـەر ئـەو مەسـەلەیە نـەکردووە لـە کاتێکـدا قـورەیش ئامـادەبوون هەرچـی داوابکـات بیـدەنێ بـەو مەرجـەی وازبێنـێ لـە یەکتاپەرستی.. کەواتە مەسەلەی (غەرانیق) بەڕەهایی هیچ بناغەیەکی نییە[٢٢٧].

زیاد لەمانەش بەرێز (موحەممەد حەسین هيكل) هێناونی زانایانی تـری ئیسـلام لە چەند ڕووی ترەوە ئەم چیرۆکە هەڵبەستراوەیان ڕەت کردووەتەوە..

ـ ابن حجر (رحمه الله) ئەڵێ: ئەوەی ئەوترێ هۆی سـوجدەبردنی موشـریکەکان لەکاتی خوێندنی سورەتی (النجم)دا ئەوە بـووە گوایـە شـەیتان شـتی خسـتووەتە دەمی پێغەمبـەر لـەو کاتـەدا نـە لـە ڕووی (نقـڵ)و نـە لـە ڕووی (عقـڵ)ەوە ڕاسـت نییە[٢٢٨].

---

[٢٢٧] حياة محمد/ ص ١٦٧.

[٢٢٨] فتح الباري (٨/٦١٤).

- (ابن كثير) (رحمه الله) ئەڵێ: "زۆر لە موفەسیرەكان لێرەدا چیرۆكی غەرانیق باس ئەكەن.. هەموو ئەو ڕیوایەتانەی ئەم چیرۆكەی پێ گێڕراوەتەوە (مرسل)ن‌و كەسیان (اسناد)یان نییە، لە هیچ ڕوویەكەوە، خوازاناترە"[٢٢٩].

لەمانەش زیاتر ئەوەیە، پێغەمبەران وەك زانایانی (زانستی كەلام) باسی دەكەن چوارشت لە هەقیاندا دروستەو دژەكانیان لە هەقیاندا (مەحاڵ)ە..ڕاستگۆیی (الصدق)، ژیری، وریایی (الفطنة)، گەیاندنی دین (التبليغ)، بە پێچەوانەشەوە (درۆ)و (گێلی)و (شاردنەوەی دین)و (خیانەت‌و دەسپیسی) لە هەقیاندا مەحاڵە.. جا زانایان ئەڵێن: هۆكەشی ئەوەیە، ئەو پێغەمبەرانە ئەگەر تەنانەت لە گەنجێتیشیاندا (درۆ) یان لێدەربكەوێ لەوەودوا خەڵك بڕوایان پێناكات كە بڵێن (لە خواوە سروشمان بۆ هاتووە)، یان ئەگەر گێل بن كێ شوێنیان ئەكەوێ، یان ئەگەر (خیانەت)یان لێ دەردەكەوێ، یان ترسنۆك بن‌و نەوێرن دین بگەیەنن بە خەڵكی.. جا چیرۆكی هەڵبەستراوی (غەرانیق) هەموو ئەو بنەمایانە هەڵدەوەشێنێتەوەو (درۆ)و (ترسنۆكی)و (خیانەت)و (نائەمینی) ئەداتە پاڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه واله وسلم)و ڕێگە خۆشئەكات بۆ ئەوەی چی خوا پێی ناخۆشە بەرانبەر پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم) بوترێت[٢٣٠].

(موبارەكفوریش) ئەڵێ: كە پێغەمبەر(صلى الله عليه واله وسلم) بە دەنگی پڕ كاریگەری خۆی سورەتی (النجم)ی ئەخوێند لە كەعبەدا موشریكەكانیش كەمەندكێش بوون‌و لەگەڵ مۆسیقای ئایەتەكاندا ئەڕۆشتن، ئاگایان لە شیركەكەیان نەماو كە گەیشتنە كۆتایی ئایەتەكان (بێ ویستی خۆیان) دوای ئایەتی (فَاسْجُدُوا لِلَّهِ وَاعْبُدُوا)، ئەمانیش كڕنوشیان برد.. بەڵام كە لە ژێر كاریگەری ئایەتەكان‌و

---

[٢٢٩] السيرة النبوية/ الصلابي: ١/٣٧٧

[٢٣٠] هەندێ لە زانایان كتێبی تایبەتی داناوەو بەدرێژی موناقەشەی هەموو ڕووەكانی ئەم چیرۆكە هەڵبەستراوەی كردووەو لە هەموو ڕووەكانەوە ڕەتیدەداتەوە، لەوانە كتێبی (نصب المجانيق لنسف قصة الغرانيق)، محمد ناصرالدين الالباني.

دەنگە خۆشەکەی پێغەمبەردا نەمانو هاتنە سەر خۆیان بۆ ئەوەی خەڵك گاڵتەیان پێ نەکاتو ڕیسوا نەبن، لەبەردەم جەماوەرەکەیاندا هاتنو وتیان: موحەممەد بە (لات)و (عوززا)و (مەنات)دا هەڵیداوەو بە ڕێزەوە باسیکردوونو سەلماندوویەتی شەفاعەتیان وەرگیراوە[٢٣١].

"عمر فروخ" لە پەراوێزەکانیدا لەسەر (تأريخ الشعوب الاسلاميه)ەکەی (کارل بروکلمان)، لەم باسی (غرائیق)ەدا ئەڵێ: "باشترین وەڵام بۆ ئەم بوختانە ئەو وەڵامەیە کە زانای بەناوبانگی هیندی (مولانا محمد علی) نووسیویەتی کە ئەڵێ: ئەم ڕیوایەتە تەنیا لای (واقیدی)و (تەبەری) هەیە لەگەڵ ئەوەدا هیچ سێبەرێکی ڕاستییان بەسەروە نییە، چونکە هەموو کارەکانی پێغەمبەر(صلى الله عليه واله وسلم) دژ بەم ئاڕاستەیەیەو (واقیدی)ش بەوە بەناوبانگە کە کتێبەکەی پڕە لە (ئیسرائیلیات)و (خورافیات)و (تەبەری)یش بەوە بەناوبانگە کە هەرچی ڕیوایات هەیە کۆیکردۆتەوە.. بەڵام ئیبن ئیسحاق کە هەموو ژیانی پێغەمبەری هێناوە هیچ باسێکی ئەم (غرانیق)ەی نەکردووە کە ئیبن ئیسحاق (٤٠) ساڵ پێش (واقیدی) ژیاوەو (١٥٠) ساڵ زیاتریش پێش (تەبەری) بووە (واقیدی)ش لەناو زانایانی فەرموودەدا بەوە بەناوبانگە کە فەرموودەی هەڵبەستووەو ئەوترێ (يضع الاحاديث) و (غير ثقة)"[٢٣٢] ، دەی ئیتر شوورەیی نییە فادی و تاقمەکەی بنیشن بە بە شتی لەم جۆرەوە؟!

بەم وەڵامانە هاتینە کۆتایی ئەو پێشبڕکێ بێمانایەی کە قەشە فادی بۆ کتێبەکەی دایناوەو ئەوەی کە ناشێ بەرانبەر بە قورئان و ئیسلام و پێغەمبەری ئیسلام بوترێت ئەو ووتوویەتی، بێئەوەی سڵ لە هیچ ئەتەکێتێکی نووسین و پێوەرە زانستیەکان بکاتەوەو گوێ بەوەبدات کە ماڵەکەی خۆی لە شووشەیە نابێ

---

[٢٣١] الرحيق المختوم/ المباركفوري، ص٩١

[٢٣٢] تأريخ الشعوب الاسلامية، (ص٣٥)، (يضع الحديث) واتە/ فەرمووده هەڵدەبەستێ (فەرموودە ئەکات)، (غير ثقة) متمانە نییە بە هەر فەرموودەیەك ئەو بیگێڕێتەوە..

بەرد بگرێتە ماڵە دراوسێكانی، ئێمەش ئەوەی راستی بووبێت لـەوەڵامی ئـەو رقـە ڕەشانەی ئەودا ووتوومانەو پاش پشتیوانی خوا پشتمان بەسەرچاوە بەستووەو وەك ئەوو وەرگێڕەكەی ئەومان نەكردووە نزیكەی هەزار لاپەڕە قسەیان نووسیوە، بە بێ ئەوە سەرچاوەكانی باس بكەن، ئەوە نـەبێت لـە سـەرەتای كتێبەكـەداو لـە پشـت بەرگەكەیـدا بیسـت و دوو سەرچـاوەیان نووسـیوە، كـە دوانیـان قورئـان و ئینجیلن و ئەوانی تریان هەر شورەییە بچنە ناو لیستی سەرچاوەوە.

## قسەیەك لە كۆتـاییدا

### چەند میتۆدێكی نمونەیی بۆ بەدەستهێنانی موناقەشەیەكی سەركەوتوو

لــە زمــانی قورئانــدا وشــەی (جــدل) زیــاتر بــەكاردەهێنێت بــۆ راگۆڕنــەوەو موناقەشەكردن، مەبەستیش بەو وشەیە موناقەشەو حیواركردنە لەگەڵ بەرانبـەردا بە مەبەستی ئەوەی راستییەكی بـۆ دەربخـەیت، خـوای گـەورە ئەفـەرموێ: (وَكَانَ الْإِنسَانُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلاً) (الكهف: ٥٤).مـرۆچ لەهـەموو شـتێك زیـاتر جـەدەل و موناقەشە ئەكات.

**بەوردبوونــەوە لــە ئایەتــەكانی قورئــان بــۆت دەرئەكــەوێت كــە حیــوارو موناقەشەكان لە قورئاندا بۆ چەند مەبەستێكە:**

١ــ ســەلماندنی بیروبــاوەڕە ئاینییــەكان وەك: بــوونی خــوا، كــەماڵی خــوا، زیندووبوونەوە، جیایی خولّقاو خولّقێنەرو..... هتد.

٢ـ بەرپەرچدانەوەی نكولیكـەران و پووچـكردنەوەی بەڵگـەو گومانـەكانیان بـە زۆر شێواز.

٣ـ مەحكومكردنی بەرانبەر بە قسەكانی خۆی.

٤ــ دانــانی چــەند بنەمایــەك بــۆ مونــازەرەو حیــوار تــا بەرامبەرەكــە خــۆی لەوەڵامەكان نەدزێتەوە.

٥ــ قورئـان ئـەنجامی حیـواری لا زۆر مەبەسـتە، بۆیـە داوا لەوانـە دەکـات کـە بانگئەکرێن بۆ موناقەشەکردن ئەگەر لەسەر یەك وشەش بـووە(رێبکـەون) باشـترە لەوەی هەر کەسەو بەلایەکدا بڕواتو حیوارەکـە بـێ ئـەنجام بێـت. بـۆ سـەلماندنی هەریەك لەو خالأنە چەند روونکردنەوەیەك بدەین:

بۆ یەکەمیان (سـەلماندنی بیروبـاوەڕە ئاینییـەکان)، بـۆ نموونـە خـوای گـەورە ئەفەرموێ:

ـ (لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا فَسُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ) واتە: ئەگـەر دوو خـوا ببوایـە لـەم زەویو ئاسمانـەدا ئـەوە هـەردووکیان (چ زەویو چ ئاسمان) گەندەڵ ئەبوون، تێك ئەچوون... ئەم بەڵگەیە (بورهانێکی عەقڵییەو لە دوو سەرەتاو ئەنجامێك دروست بووە:

سەرەتای یەکەم: ئەگەر دوو خوا ببوایە، زەویو ئاسمانەکان تێکئەچوون.

سەرەتای دووەم: زەوی و ئاسمانەکان تێکنەچوونو بەردەوامن.

ئەنجامەکـەی: کەواتـە یـەك خـواو ئـیرادەی یـەك خـوا هەیـە لـە زەویو ئاسمانەکاندا. ئەمە چۆن؟

زانستی (مەنتیق) ئەڵێت: "ئەگەر ئـەم جیهانـە دوو خولقێنـەری هەبوایـە ئـەوە دوو ئـیرادەش کاریـان ئـەکرد تێیـدا، جـا ئەگـەر یـەکێکیان مەبەسـتی بوایـە فـلأن بمرێتو ئەویان مەبەستی بوایە نەمرێت، ئەوکاتە هەردوو ئیرادەکە ئەکەوتنـە سـەر ئەو کەسە جا ئەو کاتە یان هەردووکیان ئەهاتنە دی کە ئەمە کۆبوونەوەی دو دژە لەیەك کاتداو لە عەقڵدا ئەمـە مەحاڵـە، یـان ئـیرادەی هـیچ کامیـان نەئەهاتـەدی، ئـەوەش نوقسـانیو دەستەوسـانی هـەردووکیانی ئەسـەلماند، یـان هـی یـەکێکیان سەری ئەگرتو نوقسانی ئەویان ئەسەلماو دەرئەکەوت کـە ئـەویان خوایـەو ئـەمی تریان درۆیە خوانییەو نوقسانو دەستەوسانە".٢٣٣

---

[٢٣٣] علوم القرآن، مناع القطان، ص٢٩٧. لە پێشەوەو لـە باسـی چـزکردنی پێـنج چۆنیەتیەکە بەدرێـژی باسمـان لـەم بابەتـە کردووە.

ـ یان ئەفەرموێت: (أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَن يُتْرَكَ سُدًى * أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَى * ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّى * فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَى * أَلَيْسَ ذَلِكَ بِقَادِرٍ عَلَى أَن يُحْيِيَ الْمَوْتَى) (القيامة: ٣٦ ـ ٤٠) . واتە: "ئایا مرۆڤ وا حساب دەكات هەروا لە خۆرایی دەستی لێ بەربدرێتو لێپرسینەوەی لەگەڵ نەكرێت * باشە ئەو سەرەتا (دڵۆپە مەنییەك) نەبوو كە فڕێ درایە ناو رەحم * پاشان بوو بە زالویەكو خوا كردیە خوڵقاوێكی رێكو پێكو پاشان دوو توخمی نێرومێی لێ خستەوە * ئەمانە دەری ناخەن كە خوای گەورە ئەتوانێ مردووش زیندوو بكاتەوە...".

ئەم بەڵگەیەش دیسان بورهانێكی لۆژیكییەو لە چەند سەرەتاو ئەنجامیك دروست بوون كە كورتەكەی ئەوەیە مادامێك خوایەك بتوانێ هەموو ئەو سەرەتایانە كۆنترۆڵ بكات، زیندووبوونەوەش كۆنترۆڵ ئەكات...

یەك تێبینی ورد هەیە لەم پرسی زیندووبوونەوەدا ئەویش ئەوەیە: خوای گەورە بە دوو شێواز پرسی زیندووبوونەوە ئەسەلمێنێت:

یەكەمیان لە رێگەی لە رێگەی كۆرپەلەی مرۆڤەوە.

دووەمیان: لە رێگەی كۆرپەلەی رووەكەوە. ئەمەیان چۆن؟

خوای گەورە بۆ یەكەمیان ئەفەرموێت: (فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ * خُلِقَ مِن مَّاء دَافِقٍ * يَخْرُجُ مِن بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ * إِنَّهُ عَلَى رَجْعِهِ لَقَادِرٌ) (الطارق: ٥ـ ٨).

واتە: با مرۆڤ وردبێتەوە لە چی دروستكراوە، لە ئاوێك دروست كراوە كە بەگوڕ دەردەچێت، لەنێوان سنگی ئافرەتو پشتی پیاوەو دێتە دەرەوە، * خواش توانای بەسەر ئەوەدا هەیە جارێكی تریش دوای مردن زیندووی بكاتەوە. لە قورئاندا لە چەندان ئایەتی تردا ئەم چەمكە باسكراوە.

بۆ دووەمیشیان ئەفەرموێت: (فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ إِلَى طَعَامِهِ * أَنَّا صَبَبْنَا الْمَاء صَبّاً * ثُمَّ شَقَقْنَا الْأَرْضَ شَقّاً * فَأَنبَتْنَا فِيهَا حَبّاً * وَعِنَباً وَقَضْباً * وَزَيْتُوناً وَنَخْلاً * وَحَدَائِقَ غُلْباً * وَفَاكِهَةً وَأَبّاً * مَّتَاعاً لَّكُمْ وَلِأَنْعَامِكُمْ * فَإِذَا جَاءتِ الصَّاخَّةُ * يَوْمَ يَفِرُّ الْمَرْءُ

مِنْ أَخِيهِ * وَأُمِّهِ وَأَبِيهِ * وَصَاحِبَتِهِ وَبَنِيهِ * لِكُلِّ امْرِئٍ مِّنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ) (عبس: **٢٤ ـ ٣٧**). واتە: (با مرۆڤ وردبێتەوە لە خواردنەکەی خۆی، ئێمە لە ئاسمانەوە ئاو خوڕئەکەینەوە و پاشان زەوی شەقو لەت ئەکەینو یەکسەر تۆو سەر دەردێنێو شین ئەبێتو ترێ و قامیشو زەیتونو دارخورماو باخی چڕو میوەو ئالیك سەوز دەبن بۆ خۆشی و خزمەتی خۆتانو ئاژەڵەکانتان، کە لە پڕ شریخەی قیامەت دێت ئەوکاتە خەڵکی لەبراو دایكو باوكو هاوڕێ (خێزان)و مناڵەکانی خۆی را ئەکاتو هەموو کەسێك لەو رۆژەدا ئەوەندە سەرقاڵی هەیە نەیپەرژێتە سەر کەسی تر)، لە قورئاندا لە چەندان ئایەتی تردا ئەم چەمکەی دووەمیش دووبارە کراوەتەوە.

ئەبێ پەیوەندی ئەم دووانە (کۆرپەلە)ی (مرۆڤ)و (رووەك) چی بێت لەگەڵ دووبارە زیندووبوونەوەی مرۆڤەکاندا؟ یەك پەیوەندی سەیرو زۆر ئاشکرا هەیە لەو نێوانەدا ئەویش ئەوەیە کە: خوایەك بتوانێ لەیەك دڵۆپ ئاو (مەنی) مرۆڤێکی زیندوو دروست بکات، یان لەیەك دەنکە (تۆوی) رەق ئەم دەشتو دەرە هەمووی بە گژوگیاو دارودرەختییەوە زیندووبکاتەوە، ئایا ناتوانێ جارێکی تر ئەو کارە دووبارە بکاتەوە؟

ئەم دوو کارە زیندووکردنەوەی دارودرەخت لە رێگەی تۆوێکەوە، زیندوو کردنەوەی مرۆڤ لە رێگەی تنۆکە ئاوێکەوە کارێکی ئاسانە، چونکە بناغەو بنچینەی ئەو دووشتە بە کەبسکراوی پارێزراوە لەو (تۆو)و (تۆمە)دا، وەك چۆن (جامی وێنەیەك) لە پاشاندا هەزاران وێنەی لەبەر دەگیرێتەوە، ئەوانیش هەروا... خوایەك بتوانێ لە تۆوی بنیادەمێك مرۆڤێکی خاوەن گیان دروست بکات لە رەحمی ئافرەتاندا ئەشتوانێ لەرەحمی قەبەرکاندا سەرلەنوێ زیندووی بکاتەوەو بیهێنێتەوە بوون، خوایەك چۆن ئەتوانێ لە خواردنێکی مردووی ناو گەدە، وزەو زیندوێتی دروست بکات هەرواش ئەتوانێ لەناو گەدەی خاکدا سەرلەنوێ زیندوێتی بە رووەك بداتەوە... ئەو تۆمە رووەکە بە بارانی سروشتی زیندوو ئەبێتەوە، ئەم

(تۆوەی مرۆڤیش) بە بارانێکی تری لینج کە حەدیس باسی دەکات سەرلەنوێ ئەڕوێتەوەو پاشان (گیان)ەکەشی بۆ ئەگەڕێتەوە.

بۆ دووەمیان: (بەرپەرچدانەوەی نکوڵیکەران)، خوای گەورە بۆ نموونە ئەفەرموێت:

- (أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ * أَمْ خَلَقُوا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بَل لَّا يُوقِنُونَ) (الطور: ٣٥ ـ ٣٦). واتە: ئەبێت یان هەروا لە هیچەوە دروست بووبن و خولقێنەریان نەبێت، یان خۆیان خولقێنەری خۆیانن، یان ئاسمانەکانو زەوییان دروس کردبێ، نەخێر ئەمانە لە دوودڵیدا ئەژین..

زانایان ئەفەرموون: (أم) لە زمانی عەرەبیدا بە دوو شت تەقدیر و مانا ئەکرێ، بە (بل)و بە (همزەی استفهام)، واتە: وای لێ دی (أم خلقوا) ئەبێتە: بل أخلقوا؟ هەروەها ئەڵێن: (أم) مانای (أضراب و أستفهام)ی تێدایە، واتە: ئەو شتە نەوایەو نەئەبێ واش بێت (إبن قتيبه) ئەڵێت: "بل تأتي لتدارك كلام غلطت فيه".[٢٣٤]... بەم پێیە مانای ئایەتەکە وای لێدێت: "ئەگەر ئەوان بڕوایان وایە کە بە بێ خولقێنەر دروست بوون، یان خۆیان خۆیانیان خولقاندووە، یان ئەوان زەویو ئاسمانەکانیان خولقاندووە، ئەوە ئەو شتە نەوایەو نەئەشێ واش بێت بە چەندان بەڵگە کە عەقڵ پشتیان ئەگرێت..

- شت لە خۆیەوە نایەت، هەموو دروستکراوێك ئەبێت دروستکەرێکی هەبێت.

- ئەم دوو خولقاوە (مرۆڤ)و (زەویو ئاسمانەکان) ئەبێ (خولقێنەرەکەیان) کێ بێ؟

- ئەگەر مرۆڤ ئەڵێ (خۆم) خولقێنەری خۆمم، یان دایكو باوکم خولقێنەری منن، ئەی کێ دایكو باوکی ئەوی خولقاندووە، و تائەگاتە یەکەم مرۆڤ، ئەو یەکەم مرۆڤە کێ خولقاندویەتی: (خۆی)، یان (جگە لە خۆی)؟

---

[٢٣٤] تأويل مشكل القرآن، إبن قتيبة، ص٥٣٦.

ـ ئەگەر خۆیەتی، ئەی بۆ هەزاران کاری خۆیی ئاگای لـێ نییـە، هـەزاران کـاری بەسەردا دێت حەزی لێی نییەو نایەوێتو ناشتوانێ رێگەیان لێ بگرێ، ئـەو کەسـە کێیە کە حوکم بەسەر ئەودا ئەدات، پێی ئەڵێ: بمرە، ناتوانێ نەمرێ، پێـی ئـەڵێ: پیر ببە، نەخۆش بکەوە، هەژار ببە، ئازار بدەرە فلانـە شـوێنی لـە لەشـیدا، دڵـی، سەری ددانی، گورچیلەی... کەواتە ئەوە وانییە کە مرۆڤ خـۆی خولقێنـەری خـۆی بێت، بەڵکو کەسێکی تر لە سەروو خۆیـەوە خولقاندوویـەتی کـە خـوای گەورەیـەو حاکمە بەسەریەوەو فـەرمانی (بـوون)و (لەناوچـوون)و (زیندووبونـەوەی دووبـارە) بەسەردا ئەکات.

ـ ئـێ خـۆ زەویو ئاسمانـەکانیش بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە جگـە لـە مـرۆڤ (خولقینــەرە) خــۆ مــرۆڤ خولقێنــەری زەویو ئاسمانــەکان نییــە،دەی هــەر ئــەو خولقێنەرە، هەمان کەسە کە مرۆڤیشی خولقاندووەو ئامـانجی دروستکردنەکەشـی دیاری کردووە.. لەم جۆرە ئایەتانە لە قورئاندا زۆر هەیە بۆ نموونە:

ـ (أَفِي اللّهِ شَكٌّ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ ).

ـ (أَنَّى يَكُونُ لَهُ وَلَدٌ وَلَمْ تَكُن لَّهُ صَاحِبَةٌ وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ وهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ) (الأنعام : ١٠١ ).

ـ (وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ اللّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ اخْتِلاَفاً كَثِيراً) (النساء : ٨٢ ).

ـ (وَمَا كُنتَ تَتْلُو مِن قَبْلِهِ مِن كِتَابٍ وَلَا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ إِذاً لَّارْتَابَ الْمُبْطِلُونَ) (العنكبوت: ٤٨ )

بـۆ سێیەمیشـیان (مـەحکومکردنی بەرانبـەر بـە قسـەکانی خـۆی) بـۆ نموونـە ئەفەرموێ:

ـ (قُلْ مَنْ أَنزَلَ الْكِتَابَ الَّذِي جَاء بِهِ مُوسَى نُوراً وَهُدًى لِّلنَّاسِ تَجْعَلُونَهُ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيراً وَعُلِّمْتُم مَّا لَمْ تَعْلَمُواْ أَنتُمْ وَلاَ آبَاؤُكُمْ قُلِ اللّهُ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِي خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ) (الأنعام: ٩١ )

ـ (أَفَعَيِينَا بِالْخَلْقِ الْأَوَّلِ بَلْ هُمْ فِي لَبْسٍ مِّنْ خَلْقٍ جَدِيدٍ) (ق: ١٥ )

- (أَمْ تَقُولُونَ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالأسْبَاطَ كَانُواْ هُوداً أَوْ نَصَارَى قُلْ أَأَنتُمْ أَعْلَمُ أَمِ اللّهُ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَتَمَ شَهَادَةً عِندَهُ مِنَ اللّهِ وَمَا اللّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ) (البقرة: ١٤٠)

. (يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تُحَآجُّونَ فِي إِبْرَاهِيمَ وَمَا أُنزِلَتِ التَّورَاةُ وَالإنجِيلُ إِلاَّ مِن بَعْدِهِ أَفَلاَ تَعْقِلُونَ) (آل عمران: ٦٥).

. (أَفَرَأَيْتُم مَّا تُمْنُونَ * أَأَنتُمْ تَخْلُقُونَهُ أَمْ نَحْنُ الْخَالِقُونَ * نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ الْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ * عَلَى أَن نُّبَدِّلَ أَمْثَالَكُمْ وَنُنشِئَكُمْ فِي مَا لَا تَعْلَمُونَ * وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ النَّشْأَةَ الْأُولَى فَلَوْلَا تَذَكَّرُونَ) (الواقعة: ٥٧. ٦٢ ).

بۆ چوارەمیان (دانانی چەند بنەمایەك بۆ حیوار تا بەرانبەر خۆی نەدزێتەوە لە وەلامەکان) بۆ نموونە خوای گەورە ئەفەرمویٚ:

- (قُلْ هَاتُواْ بُرْهَانَكُمْ)

- (اِئْتُونِي بِكِتَابٍ مِّن قَبْلِ هَذَا أَوْ أَثَارَةٍ مِّنْ عِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ) الأحقاف: ٤ .

. (فَلاَ تَجْعَلُواْ لِلّهِ أَندَاداً وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ) (البقرة: ٢٢ ).

. (قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ اللَّهِ وَكَفَرْتُم بِهِ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّن بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَى مِثْلِهِ فَآمَنَ وَاسْتَكْبَرْتُمْ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ) (الأحقاف: ١٠ ).

لەم چەند ئایەتەو هاوشێوەکانییەوە ئەگەینە ئەوەی کە قورئان چەند بنەمایەك دائەنێت پێش ئەوەی دەست بە حیوار و مونازەرە بکرێت، لەوانە:

یەکەم: پێویستە قسەی بێ بەڵگە وەرنەگیرێ و بدرێتەوە بەسەر خاوەنەکەیدا.

دووەم: بەڵگەش سێ جۆرە: ١- بەڵگەی ئاینی (قورئان یان ریوایات)[٢٣٥].

٢- بەڵگەی زانستی.

---

[٢٣٥] شێخولئیسلام "ئیبن تەیمیە" ئەفەرمویت: "أو أثارة من علم" یانی: "ریوایات" بهێنن کە زانیاری ئەدات بەدەستەوە، هەروەها ئەفەرموێت: سیفەتی مرۆڤی دووڕوو ئەوەیە کە رەتی بەڵگەکانی (کیتاب)و (سوننەت) ئەکاتەوە، ئەوەتا خوای گەورە ئەفەرموێت: "وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ إِلَى مَا أَنزَلَ اللّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ رَأَيْتَ الْمُنَافِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُوداً) (النساء: ٦١).

٣- بەڵگەی لۆژیکی،[٢٣٦] قورئانیش بە زۆر شێواز ئەم سێ بەڵگەیە بەکاردێنێ بۆ حیوار کردن..

سێیەم: دانانی (حەکەم)ێك لە حیواردا بۆ ئەوەی کۆنترۆڵی حیوارەکە بکاتو هەق بدات بەوەی هەقیەتیو ئەوەش مەحکوم و رسوا بکات کە ناهەقی ئەکاتو سواری سەری خۆی ئەبێت. لە زمانی قورئاندا بە (حکم)و بە (شاهد) زۆر جار ناو ئەبرێ (حَكَماً مِّنْ أَهْلِهِ وَحَكَماً مِّنْ أَهْلِهَا)، (أَئِنَّكُمْ لَتَشْهَدُونَ أَنَّ مَعَ اللّهِ آلِهَةً أُخْرَى).

چوارەم: هەر شتێك پێچەوانەی (ئایینی راستەقینە ـ قورئانو حەدیس ـ بوو یان پێچەوانەی (زانستو لۆژیك) بوو، ئەهلی تەخەصوصو شایەتحاڵەکانیش رەتیان ئەکردەوە لە رووی (بەڵگەو سەلماندنەوە ـ الحجة والاثبات)ەوە، ئەوە پێویستە فرێ بدرێ و وازی لێ بهێنرێ..

ئەگەر سەیری قورئان بکەین نموونەی زۆر ئەبینی لە قورئاندا ئەم بنەمانەی رەچاو کردووە، بۆ نمونە ئەو ئایەتانەی کە باسمانکردنو ئەم بنەمانەمان لێیان وەرگرت، هەروەها بۆ ئەم نموونانەی تریش بروانن... خوای گەورە ئەفەرموێ:

. (أَفَغَيْرَ اللّهِ أَبْتَغِي حَكَماً وَهُوَ الَّذِي أَنَزَلَ إِلَيْكُمُ الْكِتَابَ مُفَصَّلاً وَالَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْلَمُونَ أَنَّهُ مُنَزَّلٌ مِّن رَّبِّكَ بِالْحَقِّ فَلاَ تَكُونَنَّ مِنَ الْمُمْتَرِينَ) (الأنعام: ١١٤).

. (قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَادةً قُلِ اللّهِ شَهِيدٌ بِيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَذَا الْقُرْآنُ لأُنذِرَكُم بِهِ وَمَن بَلَغَ أَئِنَّكُمْ لَتَشْهَدُونَ أَنَّ مَعَ اللّهِ آلِهَةً أُخْرَى قُل لاَّ أَشْهَدُ قُلْ إِنَّمَا هُوَ إِلَهٌ وَاحِدٌ وَإِنَّنِي بَرِيءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ) (الأنعام: ١٩)

(الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءهُمُ الَّذِينَ خَسِرُواْ أَنفُسَهُمْ فَهُمْ لاَ يُؤْمِنُونَ) (الأنعام: ٢٠).

. (فَاسْأَلُواْ أَهْلَ الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ) (النحل: ٤٣).

---

[٢٣٦] بۆ بەڵگەی لۆژیکی بۆ نمونە خوای گەورە ئەفەرموێت: (قُلْ أَرَأَيْتُكُم إِنْ أَتَاكُمْ عَذَابُ اللّهِ أَوْ أَتَتْكُمُ السَّاعَةُ أَغَيْرَ اللّهِ تَدْعُونَ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ * بَلْ إِيَّاهُ تَدْعُونَ فَيَكْشِفُ مَا تَدْعُونَ إِلَيْهِ إِنْ شَاء وَتَنسَوْنَ مَا تُشْرِكُونَ) (الأنعام: ٤٠ـ ٤١).

. (وَمِنَ النَّاسِ مَن يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَابٍ مُّنِيرٍ * ثَانِيَ عِطْفِهِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ اللَّهِ لَهُ فِي الدُّنْيَا خِزْيٌ وَنُذِيقُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَذَابَ الْحَرِيقِ) الحج .٩.

بۆ پێنجەم مەبەست لە مەبەستەكانی حیوار لە قورئاندا كە بریتییە لە (حیوار ئەبێت ئەنجامی هەبێت) بۆ نموونە قورئان ئەفەرموێت:

. (إِنَّ مَثَلَ عِيسَى عِندَ اللّهِ كَمَثَلِ آدَمَ خَلَقَهُ مِن تُرَابٍ ثِمَّ قَالَ لَهُ كُن فَيَكُونُ * الْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلاَ تَكُن مِّن الْمُمْتَرِينَ * فَمَنْ حَآجَّكَ فِيهِ مِن بَعْدِ مَا جَاءكَ مِنَ الْعِلْمِ فَقُلْ تَعَالَوْاْ نَدْعُ أَبْنَاءنَا وَأَبْنَاءكُمْ وَنِسَاءنَا وَنِسَاءكُمْ وَأَنفُسَنَا وأَنفُسَكُمْ ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَةَ اللّهِ عَلَى الْكَاذِبِينَ) (آل عمران: ٥٩. ٦١) .

. (قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئاً وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً مِّن دُونِ اللّهِ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ) (آل عمران: ٦٤).

. (فَقُولُواْ اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ) (آل عمران: ٦٤).

ئەمەش بۆ ئەوەیە كە (حیوار) نەبێتە مەبەست و ئامانج، بەڵكو ئەبێ هۆكارێك بێت بۆ مەبەستێك، تا نە(حیوار) ببێتە مەبەستو (حوار من أجل الحوار) بێت و نە (حیوار)یش ببێتە گاڵتەجاڕی و سوعبەتكردن بە یەكتریو كابرا تەواو ماندووت بكاتو پاشان وەك بەرزەكی بانان بۆی دەربچێتو تێر پێبكەنێ پێت.٢٣٧

بۆیە قورئان بۆ نموونە ئەو سێ ڕێگەیەی داناوە بۆ ئەنجامی گفتوگۆ ئەگەر هەردوولا نەهاتنە سەریەك رای دیاریكراو.

---

[٢٣٧] برادەرێك بۆی گێڕامەوە كوڕێكی مولحید ڕۆژێكیان داوای لێ ئەكات باسی بوونی خوای بۆ بكات، ئەویش پێی ئەڵێ: باشە ئەگەر من بۆم سەلماندی كە خوا هەیە وەك چۆن ئەو جگەرەی دەستت هەیە تۆ ئەیسەلمێنیو تەسلیم بە دین ئەبێ؟ وتی: جا تۆ هەقت چییە بە منەوە من تەسلیم بە دین ئەبم یان نا ! وتم: ئەی ئیتر موناقەشە بۆچی بكەین؟ وتی: حەز ئەكەم بزانم خوا هەیە یان نا ! وتم: باشە من بۆت ئەسەلمێنم تۆش بە گوێی بكە، ئەگەر واش ناكەی قەبووڵ بكە من "دە" شەقت تێ هەڵئەدەم بە دیارچاوی خەڵكەوە ! كوڕەكە پێكەنیو سەیری لێ هات؟؟ وتم: ئێ خۆ من نایەم یەك سەعات تۆ بمهێنیو بمبەی و پاشان تێر پێ بكەنی پێمو بڕۆی بەبێ هیچ!

١ـ یان لەسەر یەك (بیرۆكە)ش بێت رێبكەون (على كلمة سواء بيننا وبينكم).

٢ـ یان (موباهەلە) رووبداتو درۆزن رووڕەش و ڕسوا بكەن (ثُمَّ نَبْتَهِلْ فَنَجْعَل لَّعْنَةَ اللّهِ عَلَى الْكَاذِبِينَ). (آل عمران: ٦١).

٣ـ یان ئەوان شایەتی بدەن بۆ بەرانبەر كەبەرانبەرەكەی هەقیەتیو ناهەقی ناكات:(اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ)!

هەندێ لە زانایان زیاتر لە بنەمایەك بۆ حیواركردن دائەنێن بۆ ئەوەی حیوارەكە بەرهەمدار بێت و خەڵكی حیوارو موناقەشەكردن نەكەنە هیوایەت و تەنیا بۆ چێژبردن وقسەبەشەڕدان كۆببنەوە لەگەڵ بەرانبەرەكانیاندا بۆ نمونە هەندێ ئەڵێن: ئەبێ ئەم بنەمانە دابنرێن بۆ گفتوگۆكردن و هەردوو لا پەیوەند بن پێیانەوە:

- ان كنت ناقلاً فالصحة أو مدّعيا فالدليل.
- موافقة النصوص الشرعية لفظا ومعنى، أولى من موافقتها في المعنى دون اللفظ.
- لا ينبغي بتر الدليل والاستدلال بجزئه.
- الحق ما وافق الدليل بغض النظر عمن قاله أو أعرض عنه.
- السكوت عما سكت الله عنه ورسوله(صلى الله عليه واله وسلم).
- الدليل المقدم هو الدليل القطعي.
- الاثبات مقدم على النفي.
- الاستدلال على المسألة المتنازع فيها إنما يكون بالدليل المتفق عليه.
- الباطل لا يُرد بالباطل، بل بالحق.
- الامتناع عن مناظرة أهل السفسطة.
- النقل الصحيح لا يمكن أن يتعارض مع العقل الصريح والفطرة السليمة.
- درء التعارض بين نصوص الكتاب والسنة.
- لا يرد الحق لمجرد أن قائله مبطل، فالعبرة بالقول لا بالقائل.
- الإقرار بفضل المخالف لا ينقص قدر مخالفه.

- الرجوع إلى الحق خير من التمادي في الباطل.
- العبرة بغلبة المحاسن وكثرة الصواب لا بالهفوة والزلة لأن المحسن غير معصوم.
- خطأ المخالف لا يبيح ظلمه ولا يهدر حقه ولا يبيح الافتراء عليه.
- نأخذ بالظاهر والله يتولى السرائر.
- البينة على المدعي و اليمين على من انكر.
- التاريخ لا يثبت بالنفي.[٢٣٨]

هەندێکی تر پێیان باشە کە لەژێر ئەم بنەمانەدا–بۆ نمونە– مونازەرە بکرێت:

١–وەڵام ئەبێ بەڵگەی حاشاهەڵنەگری تێدابێت، (واتە لە سەرچاوەی رەسەنەوە بگوازرێتەوە).

٢– رەخنە ئەبێ وەڵامی بەڵگەی نەیارانیشی تێدابێت ئەوجا وەردەگیرێت.

٣–وەڵام بە بەراوردکاری بێت بەهێزترە، لە نێوان ئایینەکاندا بێت یان لە نێوان بیرو بیرکردنەوەکاندا بێت.

٤–پێشەکیەکان پێویستە ساغ بن و خاڵی بن لە رەخنە، تا ئەنجامی ساغ بدەن بە دەستەوە.

٥–تەرجیحی ئەم پێوەر یان ئەم دەق یان ئەم ئایین ئەدەی بەسەر ئەوی تریاندا ئەبێ لەرووی مورەجیحاتەوە بێت نەك هەوەسپەرستی و میزاجکاری.

بە هەر حاڵ ئەبێ حیوارو موناقەشە بەبەرنامەو میتۆدی تایبەتی بکرێت تا بەسوود بێت و ببێتە مایەی گۆڕینی قەناعەتەکان، هەروەها دووریش بێت لە ستەم و بوختانکردن بۆ بەرانبەرەکانت، ئەوەش کە گومانی تێدا نیە ئەوەیە هەرکەسەو هەر شوێنەو هەربابەتە میتۆدی تایبەتی ئەوێ و مەرج نیە ئەو میتۆدەی بۆ فلانە کەس ئەشێ کە جیدال و حیواری پێبکات هەمان میتۆدبێت کە فلانەکەسی تر جیدال و حیواری پێئەکات، یان مەرج نیە ئەو میتۆدەی بۆ فلانە بابەت ئەشێ کە

---

[٢٣٨] ئەم بنەمایانەم لە چەند سەرچاوەیەکی جیاواز وەرگرتووە نەك یەك سەرچاوەی تایبەت، بۆ سوودی زیاتری خوێنەرە بەڕێزەکانی تیشك.

جیدال و حیواری تێدا بکەیت هەمان میتۆد بێت کە جیدال و حیواری پێئەکەیت لە فڵانە بابەتی تردا، وەك ئەڵێن: (لکل مقام مقال).

بەم پێشنیارانە بۆ چۆنێتی بەڕێوەبردنی موناقەشەکردنێکی سەرکەوتوو، دێینە کۆتایی ئەم پەڕتووکەو هیوام وایە ئەم کتێبە رەخنەییەمان بەسوودبێت و توانیبێتمان کە بەشێك لەو ئەرکەی ئایینەکەمان و عەقڵ و ویژدان خستوویەتە سەرشانمان بەجێمانهێنابێت، لەو پەروەردگارە داناو زانایەش ئەپاڕێمەوە کە عەقڵ و دڵمان پڕبکات لە خۆشەویستی خۆی و پێغەمبەرانی و پەیامی پیرۆزی خۆی و نەماندانە دەستی ئارەزووپەرستان و شەیتان و نەفسی یاخیمان.

و اخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمین ..سلێمانی ٦ی شەوالی١٤٣٣بەرانبەر ٢٤ ی ٨ی٢٠١٢

## سەرچاوەکان

بەپێی بەکارهێنانیان لە سەرەتاوە تا کۆتایی بەکاربراون

١. الاعتصام، الشاطبي.
٢. ئایا قورئان پارێزراوە، عەبدوڵا فادی.
٣. الجامع لأحكام القرآن، القرطبي.
٤. مباحث فى علوم القران، مناع القطان.
٥. الاحكام في أصول الأحكام، ابن حزم الظاهري.
٦. النبذ في أصول الفقه، تحقيق ابو عبدالله النجدي.
٧. تفسير النصوص، الجصاص.
٨. الإصابة، ابن حجر العسقلاني .
٩. تأويل مشكل القرآن، ئیبن قوتەیبە.
١٠. الابريز ، عبدالعزيز الدباغ الفاسى.

١١. تفسير القرآن العظيم، محمود شلتوت.

١٢. التفسير المنير، وهبة الزحلي .

١٣. الصواعق المرسلة، ابن قيم الجوزية.

١٤. الفتاوي المدينية، ابن تيمية.

١٥. درء تعارض العقل و النقل، ابن تيمية.

١٦. تفسير الكشاف، الزمخشرى .

١٧. ارشاد السارى القسطلاني، ٥١/٧. ط١ / ١٤١٠، مطبعة الذهبي للنشر والتوزيع.

١٨. دراسات في الفرق و العقائد الاسلامية، عرفان عبدالحميد.

١٩. مجلة البيان ـ عدد" ٩٦" شعبان، ١٤١٦.

٢٠. سلسة تراث الأنسانية.

٢١. العلم اسرار وخفايا

٢٢. العلمانية، سفر الحوالي.

٢٣. مواقف حاسمة في تاريخ العلم : جيمس . ب . كونانت.

٢٤. كۆزارا، حەمەرەشيد هەورامی.

٢٥. موسوعة الإعجاز العلمي، محمد كامل عبدالصمد.

٢٦. سروشت لە تەرازووی ژيرييدا، محمد ملا صالح شارەزووری.

٢٧. علوم القرآن، محسن عبدالحميدو رشدي عليان و غانم قدوري.

٢٨. ئينجيلي متى

٢٩. حضارة العرب، گۆستاڤ لۆبۆن.

٣٠. نظرات في انجيل برنابا، محمد على قطب.

٣١. مجلة المنار، محمد رشيد رضا.

٣٢. سبل الهدى والرشاد في سيرة خير العباد، وذكر فضائله وأعلام نبوته وأفعاله وأحواله في المبدأ والمعاد، محمد بن يوسف الصالحي الشامي.

٣٣. النكت و العيون، الماوردي.

٣٤. المال في الاسلام، محمود غريب.

٣٥. نيل الأوطار، الشوكاني، طبعة شركة الطباعة الفنية المتحدة.

٣٦. مجلة مجمع الفقه الاسلامي التابع لمنظمة المؤتمر الاسلامي بجدة، تصدر عن منظمة المؤتمر الاسلامي بجدة.

٣٧. الأحكام السلطانية ، الماوردى .

٣٨. الخراج، أبو يوسف .

٣٩. فتوح البلدان، البلاذري.

٤٠. سيرة عمر بن عبدالعزيز ، السيوطى.

٤١. ايسر التفاسير، ابوبكر الجزائيري .

٤٢. الاخوان المسلمون رؤية من الداخل، عبدالحليم محمود.

٤٣. شەرحی عەقیدەی مە رضییە، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس.

٤٤. إباحيات الكتاب المقدس(مسموح فقط لمن تجاوز ١٨ عام)، قام بالتجميع وعمل الكتاب، وليد المسلم.

٤٥. تعريف عام بدين الاسلام، علي الطنطاوي.

٤٦. المنجد في الغة والاعلام، ماددةى "ام".

٤٧. ئیسلامناسی، عەلی میرفیترۆس.

٤٨. مختصر تفسير ابن كثير، علي الصابوني، ط (٥)،١٩٨٦، دار التعليم، بيروت، لبنان.

٤٩. حياة محمد، محمد حسين هيكل.

٥٠. البداية والنهاية، ابن كثير.

٥١. فتح الباري، ابن حجر العسقلاني.

٥٢. السيرة النبوية، الصلابي.

٥٣. الرحيق المختوم، المباركفوري.

٥٤. تأريخ الشعوب الاسلامية، كارل بروكلمان.

# پێشەکی

قوتابی بە وەڵامدانەوەی پرسیارە سووکەکان پێشناکەوێتو زانیارییەکی ئەوتۆ ناخاتە سەر زانیارییە کەمەکانی، ئەگەر ژیانیشی بە وەڵامی ڕەخنە سادەکان بەرێتەسەر پێویستە بیر لە شارەزابوون نەکاتەوە.

وەڵامدانەوەی کتێبی (ئایا قورئان پارێزراوە) وەکو راهێنانە سووکەکانی قوتابییانە کە ئەگەر لەبەر خەڵکە هەرە نەشارەزاکە نەبوایە بیر لەوە ناکەیتەوە دێڕێکیش لەبارەیەوە بنووسی.

ئەمە کێشەیە بۆ نووسەر کە ناچارە لەبەر نەشارەزایی بەشێك لە خوێنەران وەڵامی کتێبێك بداتەوە ئەو ئاستە نزمەی هەیە، بەڵام ئەگەر نووسەر ناچار بوو وەڵامی ڕەخنەی سادە بداتەوە با بەلای کەمەوە بە ئەندازەی زانیارییە هەڵەو سادەکان زانیاریی دروستو دەوڵەمەند پێشکەش بە خوێنەران بکات. لەم کتێبەش هەوڵمان داوە ئەوە بکەین ئەگەرچی ئەو هەوڵە هەموو ڕەخنەکانی نەگرتۆتەوە.

ئەمە بۆ ڕەخنەی سادە، بەڵام وەنەبێت رەخنەی تر لە ئیسلامو قورئان ئەو بەهێزە بن کە ببنە تەحەدایەکی جددی بۆ نووسەر چونکە کۆتاییەکەی ئەوەیە هەموو رەخنەکان سادەنو ئەوەندە هەیە ئاستەکانی سادەیی جیاوازنو لەو ئاستەوە دەستپێدەکەن کە قسەی بازاڕین تا دەگەنە ئەو رەخنانەی تەنها کەمێك زیرەکانەترنو تێکەڵن بە چاوبەست ئەویش کاتێك بەرگی دەرەوەیان قەبارەیەکی زانستیو فیکریی زۆر گەورەیان پێدەدات.

بەڵام بۆچی ئەو ڕەخنانەی لە ئیسلامو قورئان بەزۆری سادەن؟

خوێنەر بۆی هەیە بڵێت: ئەوە بەهۆی لاوازیی رەخنەگرانە، ئەوە ڕاستە بەڵام نەك بەڕەهایی چونکە ئەگەر دە نووسەر لاواز بن دەیان نووسەری ((بەهێز)) هەن.

خوێنەر هەروەها بۆی هەیە بڵێت: ئەوە بەهۆی بەهێزیی ئیسلامەوەیە، بەڵام دەتوانین وەڵامی ئەوە بدەینەوەو بڵێین: بەڵێ خودی ئیسلام بەهێزە بەڵام هێشتا هەر ڕەخنەی لاواز دەبینین.

بۆ ئەوەی پرسیارەکە نەبێتە مەتەڵ دەڵێم: ((نیازی نووسەر)) هۆی ئەوەیە کە ڕەخنەکان بەزۆری لاواز بن. نووسەری لەو جۆرە کاتێك دەست دەداتە ڕەخنە پێشتر نیازێکی هەبووە کە شتێك بنووسێت ئیسلام ((تەفروتونا بکات))، کەسێکیش لەو نیازەوە دەست پێبکاتو عەقڵیەتی بەپێی ئەو نیازە کاربکات نەك تەنها ناتوانێت ئەو شتانە ببینێت کە تەنانەت ئەوی ناحەز بە ئیسلام پێویستە بڵێت شتی جوانن بەڵکو لەوە زیاتر ناتوانێت ڕەخنەیەك بنووسێت کە بچێتە خانەی ڕەخنەی جیددییەوە.

ئەوەی ئێمە دەمانەوێت ڕەخنەی جیددییە، مەرجیش نییە ڕاست بێت چونکە ڕاستیو ناڕاستی پاش هەڵسەنگاندنی ئەو ڕەخنەیە بڕیاریان لێدەدرێت. گرنگ ئەوەیە ڕەخنەکە جیددی بێت، لەوەش گرنگتر ڕەخنەیەك بێت بەرەو تێگەیشتنێکی زیاترو باشتر لە ئیسلام بمانبات.

کتێبی (ئایا قورئان پارێزراوە) وەرگێڕانی کوردییە بۆ کتێبێکی عەرەبی بەناوی (هل القران معصوم)و لە نووسینی کەسێکە بەناوی (عبدالله عبدالفادی). ناوی دووەمی نووسەر ئاشکرای دەکات کە کەسێکی مەسیحییە چونکە مەسیح لە بیروباوەڕی مەسیحی بە (فادی) ناسراوە لەبەر ئەوەی گوایە بۆ (فیدا) لەخاچدرابوو، ئەویش باوەڕێکە لە شوێنی خۆی باسی دەکەین.

بەم جۆرەشو بەر لەوەی کتێبەکە بخوێنیتەوە نیازی نووسەر دەزانی، دەشزانی هەروەها کە مەبەستی نووسەر ئەمەیە: ڕەخنە لە تەوراتو ئینجیل دەگیرێت کە دەستکاری کراون بەڵام ئەوەتا بۆتانی دەسەلمێنم کە قورئان کتێبی خودا نییە. ئەنجامی ئەو بیرکردنەوەیەش شتێکی سەیرە: نووسەر دەیەوێت بیسەلمێنێت کە

قورئان کتێبێکی خودایی نییە بەڵام بێئەوەی بتوانێت بیسەلمێنێت کە تەورات و ئینجیل کتێبی خودایین و دەستکاری نەکراون.

ئیتر لەوە زیاتر کارمان بە نیازی نووسەر نییە و ئەوەندە بەسە بزانین کە حەزکردن بەڕاستی و هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی ڕاستی لەپشت نووسینی کتێبەکەوە نین، لەوەشەوە دەزانین بۆچی نووسەر ئەو هەڵانەی کردووە، بێگومان بەئاسانیش دەزانین نیازی پشت وەرگێڕانی کوردیی کتێبەکە چییە کە دیسان حەزکردن نییە بەڕاستی و هەوڵدان نییە بۆ دۆزینەوەی بەڵکو وەرگێڕانێکە لەمیانەی شەڕ دژی ئیسلام یان دژی هێزە ئیسلامییەکان یان دژی هەردووکیان.

ئێمە ئەوە دەزانین ئەی خوێنەرێك کە باوەڕی بە ئیسلام نییە یان باوەڕەکەی تەواو نییە؟

بۆ خوێنەر ئەوەی گرنگە بیزانێت ئەم پرسیارەیە: ئەگەر کتێبێك بەو نیازە نووسرابێتەوەو وەرگێڕدرابێت ئەی چۆن بتوانم مامەڵەی لەگەڵ بکەم؟ چی بکەم باشە؟ بڕوای پێبکەم و بڵێم نووسەر شارەزایە؟ بەدرۆی بزانم و بڵێم نووسەر دوژمنە؟ یان چی بکەم؟

بەبۆچوونی خۆم ئەوەی پێویستە خوێنەرێك لەم جۆرە، واتە خوێنەرێك نەشارەزایە و باوەڕی لەقە، بیکات ئەوەیە زانیارییەکان هەڵپەسێرێت تا وەڵامی لەبارەیانەوە دەستبکەوێت، واتە بڕیار بدات بڕیاری کۆتایی نەدات تا گوێ بۆ هەردوو لایەنەکە نەگرێت. ئەمە ڕەفتاری کەسێکە کە بەلای کەمەوە ڕێز لە عەقڵی خۆی دەگرێت.. دەڵێم بەلای کەمەوە هەرچەندە ئەوە شتێکی کەم نییە.

وەڵامی کتێبی لەم جۆرە لەبەر خوێنەری نەشارەزایە، بەڵام لەبەر سادەیی کتێبەکە ئەرکەکە ناڕەحەتە وەك چونکە کارێکی ناڕەحەتە، بۆ نموونە، هەوڵ بدەی بیسەلمێنی خۆر کاتێك لە ڕۆژهەڵاتەوە هەڵدێت ئەوە زەوییە کە بەئاڕاستەی ڕۆژئاوا دەخولێتەوە. هەرچەندە بە دوو تۆپی بچووك یان دوو سێو و مۆمێك سەلماندنی ئەوە ئاسانە بەڵام دەزانی کە خەڵکێك هەن سەلماندنی تەنانەت

ئەمەش بۆیان کارێکی ئاسان نییە، کە کاریش گەیشتە ئەوە ناڕەحەتی دەبێتە نیعمەتو ئەرکی وەڵامدانەوە دەبێتە ئەشکەنجەیەکی عەقڵی، بەڵام ئەگەر وەڵام بەهێزو دەوڵەمەند بوو ناڕەحەتییەکان پاش تەواوبوونی وەڵامەکان تەواو دەبن، ئەنجامەکەش چاندنی سەوزاییە لەناو بیابانی دەبەنگی.

ئەوەی لەو کتێبەی کابرای ڕەخنەگرو لە چوارچێوەی کارەکانی پرۆژەی (تیشك) بەر خۆم کەوتبوو (ڕاستتر بەسەرم سەپێنرا)و بەنابەدڵییەوە وەرمگرتبوو ڕەخنە جوگرافییەکان بوو (نووسەری ڕەخنەکەش ناوی پرسیاریان لێ دەنێت). دواتریش بەشی ڕەخنە مێژووییەکانیشم خستە پاڵ، بەڵام ئەمەیان خۆم وەرمگرت ئەویش وەکو ئەرکێك بەرامبەر قورئانو خۆشەویستییەك بۆی، دواییش زانیم ئەو کەسەی ئەو بەشەی پێ سپێردرابوو داوای لێبوردنی کرد چونکە باسەکان هی مێژووی کۆنن.

کەواتە بەشە جوگرافییەکە ئەرکی پرۆژەکە بوو بەسەرمەوە، کاریش لەو بەشە بە بێزارییەوە بەڕێوەچوو ئەویش بەهۆی ئەو ئەرکەو بەهۆی ناچاربوون بە وەڵامی ڕەخنەی سادەو منداڵانەو تووشبوون بە ئەشکەنجەی عەقڵیو دەروونی بەهۆی مامەڵەکردن لەگەڵ دوو کەسی دەبەنگ، نووسەری عەرەبو وەرگێڕی کوردی.

بەڵام بەشە مێژووییەکە خۆم کردبوومە ئەرك بەسەر خۆم" ئەرکێك بەرامبەر قورئان، بۆیە بەشێوەیەکی تر بەڕێوەچوو: سەرباری مانەوەی دەبەنگیی نووسەرەکە (لەو بەشەش وەرگێڕم پشتگوێخست) بەڵام وەڵامدانەوە تامی هەبوو، دواییش بەرەکەتی ئەو بەشە بەشی جوگرافیشی گرتەوە کاتێك بۆ پڕکردنەوەی کەموکورتییەکان گەڕامەوە بۆی.

کارێکی تری ئەم کتێبەش کە هێندەی وەڵامی ڕەخنەکان بە گرنگی دەزانم قسەکردنە لەسەر موفەسیرە ئیسلامییەکان کە شتی سەیروسەمەرەیان نەقڵکردووەو لە لێکۆڵینەوەیەکی پێشتر نموونەی ئەو شتانەم بینیبوو. زۆریی ئەو گێڕانەوانەش لە جوولەکەو مەسیحییەکانو پێویستە لێیان بەئاگا بینو بزانین چ

زیانێکیان بە عەقڵی موسڵمان گەیاندووە.. بێگومان جگە لە زیانگەیاندن بە ئیسلام چونکە ئەو تەفسیرانە بوونەتە توێشووی ڕەخنەگرانی وەك ئەوەی خۆمان. عبدالفادیش تا ڕاددەیەکی گەورە پشتی بە شتە سەیرو بێبناغەکانی لای موفەسیران بەستووە بێئەوەی بزانێت کە بەو کارەی کەمتر ڕەخنە لە قورئان دەگرێتو زۆرتر شەڕ لەگەڵ کەفی دەریا دەکات.

لەم کتێبە ناوونیشانی پرسیارەکانی ڕەخنەگرم وەکو خۆی داناوە، پشتیشم بە دەقە عەرەبییەکە بەستووە مەگەر کاتێك کارم بە وەرگێڕە کوردییەکە هەبووبێت، ئەویش تەنها بۆ ئەوەی وەڵامی خۆیو زانیارییەکانیو وەرگێڕانەکەی بدەمەوە، تەنهاش بۆ بەشی جوگرافی ئاماژەم بۆ بەشێك لە قسەکانی وەرگێڕ کردووەو وەك وتم لە بەشی مێژوویی پشتگوێم خستووە ئەویش چونکە قسەکانی پێویست نین، خۆشی وەکو شتێکی زیادەی بێ لزووم خۆی خنیوەتە ناو باسەکانەوە، ئەو برِەش کە ئاماژەی بۆ کراوە نموونەیەك دەبێت لەسەر کاری ئەو وەرگێڕە، مرۆڤی هەر ئەوەندە کاری بە بوونەوەری وا دەبێت.

ئەم کتێبە زاراوەو زانیاریی زۆری لەخۆگرتووەو بەشێکیان پێناسەیان بۆ کراوە، بەتایبەتیش لە پەراوێزەکان، بەڵام هێشتا زۆری تر ماوە پێناسەی بۆ بکرێت.

کتێبەکە ماوەیەکی زۆر لەلام مایەوەو ماوەیەك ئیشم لێ دەکردو ماوەیەك بۆ کاری تر وازم لێدەهێنا، دواکەوتنیشی لە سنووری خۆی دەرچوو بۆیە بەباشم زانیبوو زانیاریی زیاترو قسەی زیاترو ڕەخنەی زیاتر بۆ چاپی دووەم هەڵبگرم، ئەوەش ئەگەر خوێنەر بڕیاری دا شایەنی چاپی دووەمە، هیواداریشم وا بێت.




روژهەڵاتی نزیک و ناوەڕاستی کۆن

نەخشە ئەسڵییەکە: Bible History Online




پادشانشینەکان و ناوچەکانی فەلەستینی کۆن و دەوروبەری سەدەی نۆیەمی پێش زاین

نەخشە ئەسڵییەکە: Richard Prins

# ١-ئاوابوونی خۆر لەناو بیر

یەکەم پرسیاری جوگرافیی عبدالفادی لەبارەی چیرۆکەکەی زولقەرنەین و باسی خۆرئاوابوونە. سەرەتا ئایەتەکان دەهێنێتەوە:[٢٣٩]

((وَيَسْأَلُونَكَ عَن ذِي الْقَرْنَيْنِ قُلْ سَأَتْلُو عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا * إِنَّا مَكَّنَّا لَهُ فِي الْأَرْضِ وَآتَيْنَاهُ مِن كُلِّ شَيْءٍ سَبَبًا * فَأَتْبَعَ سَبَبًا * حَتَّى إِذَا بَلَغَ مَغْرِبَ الشَّمْسِ وَجَدَهَا تَغْرُبُ فِي عَيْنٍ حَمِئَةٍ وَوَجَدَ عِندَهَا قَوْمًا...-الكهف: ٨٣-٨٦)).

ئینجا تەفسیری (بەیزاوی) دەهێنێتەوە کە جوولەکەکان لەبارەی ئەسکەندەری گەورە لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)یان پرسی ئەویش پێی وتن کە خودا دەسەڵاتی لەسەر زەویی پێ بەخشیبوو، ئەویش بۆ ئەو شوێنە کەوتەڕێ کە خۆر لێی ئاوا دەبێتو بینی لە بیرێکی قوڕو لیتە (بئر حمئة) ئاوا دەبێتو لە چواردەوری بیرەکە کەسانێکی هەبوون بتیان دەپەرست. ئینجا بەیزاوی دەڵێت کە ئیبنو عەبباس بیستی موعاویە وشەکە بە (حامية) واتە گەرم دەیخوێندەوە ئەویش پێی وت نەخێر خوێندنەوەکە حەمیئە (حمئة)یە موعاویەش ناردی بەدوای کەعبولئەحبار (ئەو زانا جوولەکەیەی ببووە موسڵمان)و لێی پرسی: خۆر چۆن ئاوا دەبێت؟ ئەویش وتی لەناو ئاو و قوڕ.

عبدالفادی دەپرسێت: ئەگەر خۆر ملیۆنێك وسی هەزار جار لە زەوی گەورەتر بێت چۆن لە بیرێك ئاوا دەبێت، مەبەست ئەو بیرەی زولقەرنەین بینیبووی‌و ئاو و قوڕەکەی بینی‌و ئەو خەڵکانەشی بینی کە لەلای بوون؟

قسەکانی عبدالفادی تەواو.

یەکەم شت دەربارەی ئەو تەفسیرە ئەوەیە بەیزاوی وشەی (قيل)، واتە وترا، بەکاردەهێنێت، ئەو وشەیەش شێوازێکە بۆ (تَمريض)، واتە لاوازکردنی

---

[٢٣٩] لەم بەشەو لە بەشی پرسیارە مێژووییەکان ئەگەر ویستبێتمان ئەو ئایەتانە تەواو بکەین کە عبدالفادی تەواوینەکردبوون تەواوکارییەکەمان بە خەتی لار داناوە.

گێڕانەوەکە. لە زانستی فەرموودەش تەعبیری (رُوِيَ عن النبي) واتە لە پێغەمبەر گێڕدراریەوە بۆ لاوازکردنە، بەڵام وشەی وترا (قیل) زۆر لە خوار ئەوەشەوەیە چونکە قسەیەکە خاوەنەکەی دیار نییە. کەسێکی نەشارەزاش کە نەزانێت وشەی (وترا) واتای چییە گێڕانەوەکە دەبێتە گێڕانەوەیەکی باوەڕپێکراو.

ئینجا لەکۆتایی ئەو گێڕانەوەیەش کەعبولئەحبار دەڵێت: ((ئاوا لە تەورات[٢٤٠] دەیبینین)) پێویستیشە هەر وا بێت چونکە پرسیارەکە لە جوولەکەیەك لەبارەی شتێکەوە کراوە، پرسیاری لەو جۆرەش واتا پرسیارکردنە لە هەبوونی یان چۆنێتیی باسکردنێتی لە تەورات، لەبەر ئەوەش لەو گێڕانەوە بێبنەمایە موعاویە پرسیویەتی: ((چۆن دەبینی خۆر ئاوا دەبێت؟))، واتە چۆن لە کتێبەکانی جوولەکە هاتووە.

---

[٢٤٠] وشەی تەورات بە چەند واتایەك بەکاردێت: بەواتای پێنج کتێبی یەکەمی پەیمانی کۆن **Pentateuch** و ئەو واتایە لەو کتێبانەو لە کتێبی تری جوولەکە هاتووە، لەو پێنج کتێبە هەروەها بەواتای هەموو یاساکانی تایبەت بە یەك بابەت بەکارهاتووە، وشەکە بەواتایەکی فراوانتریش بەکاردێت وەك هەموو پەیمانی کۆن:

**Louis Isaac Rabinowitz, *Torah*, in; Encyclopaedia Judaica, vol.20, p.39.**

پەیمانی کۆن زاراوەیەکە مەسیحییەکان بۆ کتێبەکانی جوولەکە بەکاریدەهێنن‌و بە عیبری پێی دەوترێت (تەناخ)و بریتییە لە سێ بەش: تەورات (پێنج کتێبی یەکەم)، پێغەمبەران، نووسینەکان. پەیمانی نوێش بریتییە لە چوار ئینجیلەکە لەگەڵ ژمارەیەك نووسراوی تر وەك نامەکانی پۆلس‌و کارەکانی نێردراوان‌و نامەی نێردراوی تر.. تاد. کەنیسە مەسیحییەکان ڕێك نین لەسەر کتێبە قانوونییەکانی هەردوو پەیمانەکەو جیاوازییان هەیە لە وەرگرتنی هەندێك کتێب یان ڕەتکردنەوەیان. لەم کتێبەش ناوی کتێبەکانی تەورات (پێنج کتێبی یەکەم) کە زۆر دێن: تەکوین (دروستبوون) **Genesis**، خروج (دەرچوون) **Exodus**، تەثنیة **Deuteronomy**، کەمتریش لەوانە دوو کتێبەکەی تر: ژمارەکان (العدد) **Numbers**و لاوییەکان **Leviticus**. لە دەقە عیبرییەکە ناوەکان جیاوازن‌و بریتین لە وشەی سەرەتای هەر کتێبێك. لێرە بۆ ئاماژە بۆ کتێبەکان بەزۆری وشە عەرەبییەکان دەنووسین بۆ ئەوەی خوێنەر بگەڕێتەوە بۆ وەرگێڕانی عەرەبی، بەڵام بێگومان لەگەڵ ئاگاداربوون لەوەی وەرگێڕانەکانی تەورات جیاوازییان هەیە. سەبارەت بە پەیمانی نوێش ئاماژەکە بۆ چوار ئینجیلەکە بە قانوونی لە قەڵەم دراون هەر بە عەرەبی: مەتتا **Matthew**، مەرقوس**Mark** ، لوقا **Luke**، یوحەننا **John** لەگەڵ کتێبەکانی تر بە عەرەبی‌و کوردی.

عبـدالفادی کۆتـایی قسـەکەی کەعبولئـەحباری نەنووسـیوە چـونکە دەیزانـی کـە لەجیاتی ئەوەی ببێتە ڕەخنە لە قورئـان دەبێتـە رەخنـە لـە تـەورات. نـەك تـەنها ئەمەشمان هەیە وەك نیشانە لەسەر هەڵبژاردنی عبدالفادی بەپێی حەزی دڵی خۆی بـەڵکو بەڵگـەی تـر هەیـە ئـەویش پشتگوێخسـتنی قسـەکەی بەیزاوییـە: ((رەنگـە گەیشـتبێتە کـەنار دەریـای چـواردەور (بـەحری موحیـت)و[٢٤١] خـۆری بـەو جـۆرە بینیبێت چونکە تەنها ئاوی لەبـەردەم بـوو بۆیـە قورئـان دەڵێـت: بـینی خـۆر ئـاوا دەبێتو قورئان نەیوت: خۆر ئاوا دەبوو)).

کەواتە هەر ئەو کاتەو سەرباری هێنانـەوەی باسـی سـەیرو دوور لـە عـەقڵ هێشـتا موفەسیرەکان عەقڵیان فەرامۆش نەکردووەو بیریان لەو ئیحتمالانـە کردۆتـەوە کـە زیاتر لەگەڵ عەقڵو واقع گونجاون. ئەوەش کە پێویسـتە تێبینیـی بکـەین ئەوەیـە بەیزاوی قسەی سەیروسـەمەرەو بێبەڵگـەی زۆری نـەقڵ کـردووە ئەمـەش کـارێکی باوی ناو زۆر موفەسـیرو گێـڕەرەوەی فـەرموودە بـوو بـۆ ئـەوەی نووسـینەکانیان جێگەی سەرنج بن، یان بەلای کەمەوە بۆ ئەوەی هەرچییەکیان زانیوە بـە خـەڵکی بگەیەنن.

نموونەیەك لە باسی سەیر باسەکەی بەیزاوییە کاتێك لـەو خەڵکـە دەدوێت کـە لای دەریاکە بوونو دەڵێت: وتـراوە پۆشـاکیان پێسـتی ئاژەڵـە دڕەنـدەکان بـوو. یـان لەباسی زولقەڕنەینو بۆچی وا نـاونراوە ژمارەیـەك قسـە دەهێنێتـەوە کـە هیچیان هیچ بەڵگەیەکیان لەسەر نییەو لەم جۆرانـەن: وتـراوە بۆیـە نـاونرابوو خـاوەن دوو شاخەکە چونکە ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوای جیهان گەڕابوو، وتراویشـە لەبـەر ئـەوەی لـە کاتی زولقەڕنەین دوو قـەڕن (سـەدە یـان نـەوە)ی خـەڵك تێپـەڕین، وتراویشـە دوو

---

[٢٤١] البحر المحیط: باوەڕی ئەو کاتە بوو، کە لە یۆنانییەکانەوە وەرگیراوەو کـە دەریایـەك هەیـە دەوری هـەموو وشـکانیی داوە، وشـەی نـوێی مـوحیتی عـەرەبی بـەواتای ئۆقیـانووس لـەوەوە هاتووە. ئۆقیانووس (ئۆکیانۆس) خوداوەندێکی یۆنانی بوو.

شاخ، واتە دوو پرچی هەبوو، وتراویشە چونکە تاجەکەی دوو شاخی پێوە بوو...تاد. هیچیش لەمانە بەڵگەیان لەسەر نییەو تەنها قسەن.[٢٤٢]

بەدوورزانینی ئەوەی خۆر لەناو بیرێك یان كانییەك ئاوا ببێت لە تەفسیری تریش هەن" ئیبنو كەثیر (ساڵی ٧٧٤ی كوچی مردووە) لە تەفسیرەكەی دەڵێت: واتە زولقەرنەین خۆری بینی لە دیدی خۆی لە دەریای چواردەور (موحیت) ئاوا دەبێت، هەموو كەسێكیش بگاتە كەناری ئەو دەریایە خۆر بەجۆرێك دەبینێت وەك چۆن لەنا ئەو دەریایە ئاوا ببێت.[٢٤٣]

ئیبنو كەثیر هەروەها ئەو قسانەش بەدرۆ دەخاتەوە كە گوایە زولقەرنەین ماوەیەك دەرۆشتو خۆر لە پشتەوەی ئاوا دەبوو. بەڵام سەرباری ئەوە هەر خورافاتی نەقڵكردووە بێئەوەی گومانی خۆی لەبارەیانەوە پیشان بدات وەك ڕوایەتێكی دووردرێژی باسەكەی كەعبولئەحبارو ئیبنو عەبباس‌و موعاویە كە (ابن حاضر) شیعرێك دەڵێتەوە گوایە هی (توببەع)ـە كە پێش ئیسلام بوو و باسی زولقەرنەین دەكات‌و باسی چوونی بۆ ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵات‌و باسی ئاوابوونی خۆر لەناو قوڕ.. كە شیعری لەو جۆرە هەڵبەستنێكی ئاشكرایە. لەوەش خراپتر ئەوەیە گێڕانەیەوەك لە تەفسیری (ئیبنو جورەیج) دەهێنێتەوە لەبارەی ئەو خەڵكەی لای ڕۆژئاوا بوون‌و شارە دوانزە هەزار دەرگاییەكەیان‌و كە ئەگەر دەنگەدەنگی خەڵكی ئەو شارە نەبووایە خەڵكی (واتە مرۆڤەكانی سەر زەوی) گوێیان لە دەنگی خۆر دەبوو كە دەكەوێتە خوارەوە (یان كە ئاوا دەبێت).

---

[٢٤٢] بەبۆچوونی خۆم ئەوەی دوایی لەهەموویان مەعقوولترە واتە خاوەنی تاجێكی دوو شاخی. ئەو جۆرە شاخانەش نموونەیان لە مێژوو هەیە بۆ نموونە لە وڵاتی نێوان دوو ڕووبار تاجی شاخدار تایبەت بوو بە خوداوەندەكان، ئەو تاجە دوو شاخ یان زیاتری پێوە بوو.

[٢٤٣] تفسیر ابن كثیر، ج٥، ص١٩١

بەم جۆرەش ئەگەر پشت بە تەفسیرەکان ببەستین رەخنەگرتن لە قورئان دەبێتە کارێك هێندە ئاسان تەنانەت عەبدالفادیشو وەرگێڕە کوردییەکەش دەتوانن بیکەن.

(تەبەری) لە تەفسیرەکەی گومانی لە باسی کانیی لیتە یان کانییە گەرمەکە نەکردووە بەڵکو وەکو موفەسیرەکانی تر ویستوویەتی رێکبخات لەنێوان دوو خوێندنەوەی (حمئة)و (حامية).

(ئەلبەغەوی)ش لە تەفسیرەکەی قسەی (ئەلقوتەیبی) نەقڵ دەکات کە دەکرێت واتاکە ئەوە بێت لای خۆرئاوا کانییەکی لیتە هەبوو یان لەبەر چاو وا دیار بوو.[٢٤٤]

شتە سەیرەکانی ناو تەفسیرەکان کەسێتی زولقەرنەینیشی گرتۆتەوە، (ئەلشەوکانی)، زانای ناوداری یەمەن، قسەکان نەقڵ دەکات کە هیچیان بەڵگەیان لەسەر نییەو بەم جۆرەن:

زۆر جیاوازییان هەبووە لەبارەی دەربارەی زولقەرنەینەوە" وتراوە: ئەسکەندەر کوڕی فەیلەقووسی یۆنانییە (بزانە چۆن فیلیپوس بووە فەیلەقووس) کە موڵکی هەموو دونیای کەوتە دەستو ئەسکەندەرییەی بنیات نا، ئیبنو ئیسحاقیش وتی: پیاوێکی میسرییە ناوی مەرزەبان کوڕی مەرزەبەی یۆنانییە لە نەوەی یۆنان کوڕی یافث کوڕی نووح. وتراویشە: پادشایەکە ناوی (هرمس)ـە، وتراویشە: پادشایەکە ناوی (هردیس)ـە، وتراویشە: لاوێکی رۆمە، وتراویشە: پێغەمبەرێك بووە،هەروەها وترا عەبدێکی صالح بوو، وتراویشە: ناوی عەبدوڵلا کوڕی ئەلضەحاك، وتراویشە: موصعەب کوڕی عەبدوڵلا لە نەوەی کەهلان کوڕی سەبەئـ... تاد تەنانەت وتراویشە فریشتە بووە.[٢٤٥]

ئینجا (شەوکانی) چەند قسەیەك دەکات کە دەربڕی ئەو کەسانەیە کە خۆیان بە زاهیری دەق دەبەستنەوە. شەوکانی قسەی ئەوانە دەگێڕێتەوە کە وتوویانە

---

[٢٤٤] تفسير البغوي، ج٥، ص ١٩٩.

[٢٤٥] الشوكاني، فتح القدير، ج٣، ص ٣٠٧.

رەنگە خۆر لەبەرچاوی زولقەرنەین بەو جۆرە ئاوا بووبێت دوای ئەوە دەڵێت دووریش نییە بوترێت کە رێگری نییە لەوەی خودا توانای ئەوەی دابێتی کە دەریای چواردەور (بەحری موحیت) ببڕێت تا بگاتە ئەو کانییەی کە خۆر تێی ئاوا دەبێت، چیش ڕێگری لەوە دەکات پاش ئەوەی خودا باسی ئەوەی کردووە کە گەیشتبووە خۆرئاوا بوون و دەسەڵاتی لە زەوی پێ بەخشیبوو؟ دەریا بەشێکە لە زەوی، بەدوورزانینیش (بەدوورزانینی ئەوەی خۆر لە کانییەك ئاوا بێت) نابێتە هۆی ئەوەی قورئان بەپێچەوانەی زاهیرەکەی وەربگێرێت.[٢٤٦]

هەر بۆیە پێویستە وتەی زانایانی پێشوو نەکرێتە ماڵ بەسەر ئیسلامو قورئان. کارێکی موسڵمانیش بەپاڵ وەڵامی ئەو ڕەخنانە پاککردنەوەی ئەو تەفسیرانەیە لەو جۆرە قسانە. پێویستیشە ئەوە بڵێین کە شەوکانی زانایەکی موجتەهیدی لێهاتوو بوو لە زانستە ئیسلامییەکانو مرۆڤ بەسێتی کتێبە ناودارەکەی (نیل الاوگار)ی بخوێنێتەوە بۆ ئەوەی لە شارەزابوونی ئاگادار بێت.

شتێکی سەیری شەوکانیش ئەوەیە کە ئەو ساڵی ١٢٥٠ کۆچی مردووە واتە (١٨٣٤)ی زاینی کەچی ئاگای لە دوو کیشوەرەکەی ئەمەریکا نییە. ئەوەتا دەڵێت: ((کە گەیشتە خورئاوابوون، واتە کۆتایی زەوی لەلای خۆرئاواوە چونکە لەپشت ئەو کۆتاییە دەریای چواردەور (موحیت) هەیە کە مرۆڤ ناتوانێت بەناوی بڕوات)).[٢٤٧] کە ئەمە زانیاریی سەردەمەکەی نەبوو بەڵکو هی زۆر پێش ئەو سەردەمە" زۆر لە شەوکانیش کۆنتر ئۆقیانووسی ئەتڵەسی بەشی خۆرئاوای بەحری موحیت بوو.

شەوکانی ئەو قسانەی دەوروبەری ساڵی ١٨١٠ی زاینی (١٢٢٤ ی کۆچی)[٢٤٨] نووسیبوو، ئەمەریکای ئەودیو ئەتڵەسیش ساڵی ١٤٩٩ دۆزرابووەوە، واتە زیاتر لە

[٢٤٦] الشوكاني، فتح القدير، ج٣، ص٣٠٨

[٢٤٧] سەرچاوەو لاپەڕەی سەرەوە.

[٢٤٨] وەك لە کۆتایی بەرگی یەکەم خۆی نووسیویەتی.

سێ سەد ساڵ پێشتر، ئەو ساڵەش کە شەوکانی ئەو قسانەی نووسیبوو نزیکەی دوانـزە سـاڵ بـوو دەسـتووری دەوڵـەتی ئەمـەریکا دانرابـوو و کۆمـاری ئەمـەریکا دامەزرابوو، لەو کاتەش پاپۆڕەکان لە ئەورووپاوە ئۆقیانووسی ئەتڵەسییان بـەرەو کیشـوەری ئەمـەریکای بـاکوورو باشـوور دەبـڕیو لـەوێوە دەهـاتن، هەمووشـی بەهێزی با.

نۆ ساڵیش دوای ئەو قسەیەی شەوکانی، واتە هێشتا شەوکانی مابوو، یەکەم پاپۆڕ کە بە هێزی هەڵم کار بکات ئۆقیانووسی ئەتڵەسیی بڕی لە ساڤانای (لـە ویلایـەتی جیۆرجیا) بۆ لیڤـەرپووڵ لـە بـەریتانیاو بـە ٢٧ ڕۆژ ئـەو ئۆقیانووسـەی بـڕی. لـەو ماوەیـە پاپۆڕەکـە تـەنها ٨٠ سـەعات هێـزی هـەڵمی بـەکارهێنا،[٢٤٩] بـەڵام مـاوەی گەشـتەکەی نـاو ئـەو دەریـای موحیتـە، کـە دەرکـەوت موحیـت نییـە، کـەمتر دەبووەوەو ساڵی ١٨٣٨واتە چوار ساڵ دوای مردنی شەوکانی دوو کەشتی لە یەك ڕۆژ گەیشتنە ئەمەریکا، یەکێکیان لە ئایرلەنداو ١٩ ڕۆژی پێ چوو و ئەوەی تـر لـە بەریتانیاو ١٤ ڕۆژو نیوی پێ چوو و هەموو گەشتەکەیان بە هێزی هەڵم بوو.[٢٥٠] لەو سـەردەمە بـوو کـە ئیمـامێکی زانـا وەکـو باسـە کۆنـەکان تەماشـای ئۆقیانووسـی دەکرد.[٢٥١]

---

[249] **Paul Butel, The Atlantic, p.234.**
[250] ***Ibid.*, p.233-4.**

[٢٥١] باسمان لەوە نییە موسڵمانان ئاگایان لەودیو ئەتڵەسی نەبوو، ئەگینا ئـەو ئاگاییـە هـەبووە، بەڵکو مەبەستمان نموونەی کاری موفەسیرانە لەسەر قورئان کاتێك پشـت بـە قسـەی بێبەڵگـە دەبەسـتن یـان ئاگایـان لـە سـەردەمی خۆیـان نـەبێتو دەبنـە هـۆی ڕەخنـەگرتن لـە قورئـانو پەروەردەکردنی خراپی عەقڵی مرۆڤی موسڵمان. بەڵام وەنەبێت تەنها زاناکـەی سـەدەی نـۆزدە ئەوە حاڵی بووبێت بەڵکو نموونەی سەیرتری پاش زیاتر لە سـەدەو نیوێك هەیـە، نموونەکـەش شێخ (عبدالله الدویش)ی فەرموودەناسە کە ساڵی ١٩٨٩ کۆچی دوایی کردووەو کە لـە ڕەخنـەو ڕاستکردنەوەکانی بۆ کتێبەکەی سەید قوتب (في ظلال القران) کە لەسـەر داوای هەنـدێك کـەس نووسیویەتیو ساڵی ١٩٩٠ بڵاوبۆتەوە، واتە تـەنها (٢٤) سـاڵ پـێش ئێسـتا، ڕەخنـە لـە سـەید دەگرێت کاتێك باس لە خولانەوەی زەوی دەکاتو تەنانـەت دەڵێـت باسـکردنی جووڵـەی زەوی

ئینجا بزانە فخر الدین الرازی کە زیاتر لە ٦٠٠ ساڵ ساڵ پێش شەوکانی ژیاوە چۆن نزیکتر لە زانست وعەقڵ ئەوەی لێك داوەتەوە. ئەو باسی سێ جۆر بۆچوونی کردووە یەکەمیان تەفسیرە بڵاوەکە کە کانیی لیتە یان کانیی گەرم، پاشان دووەم و سێیەمیش دەڵێت:

لێکۆڵینەوەی دووەم: بەبەڵگە سەلمێنرا کە زەوی تۆپەو ئاسمان چواردەوری داوە.. ئینجا دەڵێت خۆر چەندین جار لە زەوی گەورەترە ئیتر چۆن بەعەقڵ دەچێت ئەو خۆرە بچێتە ناو کانییەکی زەوی. پاشان باسی تەئویلەکانی ئایەتەکە دەکات کە یەکێکیان ئەوەیە خۆر لەپشتی دەریاوە ئاوا دەبێت، یەکێکی تر ئەوەیە لای رۆژئاوای زەوی دەریا دەورەی داوەو زۆر گەرمە، سێیەمیشیان ئەوەیە ئەهلی هەواڵەکان (واتە گێڕانەوەکان) دەڵێن خۆر لە کانییەکی پڕ ئاو و لیتە ئاوا دەبێت ئەمەش زۆر دوورە چونکە ئەگەر مانگیرانێکمان تەماشا کردو بینیمان رۆژئاواییەکان دەڵێن ئەو مانگگیران لە سەرەتای شەو روویدابوو، خەڵکی رۆژهەڵاتیش دەڵێن لە سەرەتای رۆژ ڕوویدابوو، ئەو کاتە دەزانین کە سەرەتای شەو لای خەڵکی رۆژئاوا سەرەتای رۆژی دووەمە لای خەڵکی رۆژهەڵات، بەڵکو ئەو کاتەش کە لای ئێمە سەرەتای شەوە لە وڵاتێکی تر کاتی عەسرەو لە وڵاتێکی تر کاتی نیوەڕۆیەو لە وڵاتێکی سێیەم کاتی چێشتەنگاوەو کاتی هەڵهاتنی خۆرە لە وڵاتێکی چوارەمو نیوەی شەوە لە وڵاتێکی پێنجەم... ئینجا لەوەوە دەگاتە

---

خیلافی قورئانو سوننەتو ئیجماعی زانایانە: عبدالله بن محمد بن احمد الدویش، المورد الزلال في التنبيه على اخطاء الظلال، مجلد ٣، ص ١٩٧.

سەبارەت بە قسەکەی سەیدیش کە: زەمانێك تێپەڕیبوو خەڵك وایاندەزانی زەوی جێگیرە (الدویش) دەڵێت: هەق ئەمەیە کە قورئان و سوننەت دەلالەتیان لەسەر داو پێغەمبەرو صەحابەو سەلەفی ئوممەتو ئیمامەکانی لەسەر ڕۆشتبوون (فماذا بعد الحق الا الضلال).

هەروەها بۆ قسەکەی سەید کە زەوی تۆپێکی بچووکە لە بۆشایی مەلە دەکات دەڵێت: ئەمە قسەیەکی باتڵە لەبەر چەند هۆیەك یەکەمیان ئەوەیە قسەیەکی داهێنراوەو دەرچووە لە قسەی سەلەفی ئوممەتو ئیمامەکانیو ئیجماعی موسڵمانان (ل٢٠٠).

ئـەوەی کـە ئـەو قسـەیەی دەڵێـت خـۆر لـە قـوڕو لیتـە ئـاوا دەبێـت پێچـەوانەی یەقینە.[٢٥٢]

بگەڕێینەوە سەر تەفاهەتی قسەکانی عبدالفادیو ئەم چەند تێبینییە بڵێین:

نابراو باسی دیوارەکەی یـەئجووج و مـەئجووج دەکـات کـە بـە ئاسـن کـراوە بـەڵام باسـی ڕۆکردنـی مسـی تـەواوەی بەسـەری نـەکردووە، دەشـڵێت دیوارەکـە بـووە بەربەستێکی قـایم کـە تـا ڕۆژی قیامـەت کـەس دەرکـی پـێ ناکـات خـودا نـەبێت. واشبزانم هەڵەیەك لێرە هەیەو لەجیاتی وشەی (لا یدرکە) پێویستە (لا یدکە)، واتـە نایکوتێت، بێت چونکە ئایەتەکە لەسەر زمانی زولقەڕنەین دەڵێت: (فاذا جاء وعدُ ربي جعله دَكّاء). بەهەر حاڵ وەرگێڕی کوردی چی نووسراوە وەریگرتووە گوایە تا ڕۆژی قیامـەت خـودا نـەبێت کـەس نازانێـت لەکوێیە(لاپـەڕە ١٧). ئینجـا لـە پاشکۆکەی خۆی (لاپەڕە ١٨) کەمێك وڕێنەی کردووەو نووسـیویەتی کـە شـوورای چین زۆر گەورەیەو زۆر کۆنە کەچی تا ئێستا ماوە ئـەی ئـەو بەربەسـتە بۆچـی تـا ئێستا نەدۆزراوەتەوە؟ وڕێنەکـەش لەوەیـە کـە هـەر خـۆی دەڵێـت شـووڕای چـین هێندە مەزنە لەڕووی مانگەوە دیارە واتە ئاساییە خەڵکیش دەرکی پێبکـەنو بـەم جۆرە لەگەڵ کەمێك بەکارهێنانی عەقڵ مرۆڤ دەزانێت کە بەربەسـتێکی نێـوان دوو کێو کە ڕەنگە دەربەندێکی زۆر تەسك بێـت زیـاتر بـۆی هەیـە لـەژێر بـەردو خـۆڵی هەرەسـکردووی دوو بەشـی کێوەکـە ون بێـت ئـەوەش جگـە لـەوەی مـەرج نییـە شێوەی بەربەستەکە دیوارێکی ڕێك بێتو هەر ئەوەندە بەسە تا ڕادەیەك سـتوونی بێت بۆ ئەوەی ئەو دوو گەلە نەتوانن بەسەری سەرکەون ئیتر بەدرێژایی کات بۆتە بەشێك لە زنجیرە چیاکە.

وەرگێڕی کوردی لەباسی خۆر ئامـاژە بـۆ ئـەو فەرموودەیـە دەکـات کـە خـۆر لـە ڕۆژی قیامەت بەدووری میلێك لە سەری خەڵکەوە نزیـك دەبێـت بـەڵام ئـەو دەڵێـت یەك میل لەکاتێك فەرموودەکە گومـانی ڕاوییەکـەی تـێ هەیـە کـە دەڵێـت نازانێـت

---

[٢٥٢] تفسير الفخر الرازي، ج٢١، ص١٦٧-١٦٨.

پێغەمبەر مەبەستی لە میل چییە: ماوەی سەر زەوی یان ئەوەندەی کلچۆك (ئەو دارەی بۆ کردنی کل لە چاو بەکاردێت) درێژە، بەواتای دووەمیش وشەی میل مەجاز دەبێتو نیشانەیە لە نزیکیو بە بەواتای دووەم میلی ئەو کاتە برێك زۆرتر بوو لە میلی ئێستا، بێگومان هێشتا زۆر نزیکە بۆیە ڕەنگە واتا مەجازییەکە راستتر بێت هەرچەند ئایەتی تەکویر باسی خۆر دەکات (اذا الشمسُ كوِّرَت) واتە خڕ کرا کە ڕەنگە ئەمە ئاماژە بێت بۆ بچووککردنی قەبارەی خۆر ئیتر مەرج نییە بەو بارستەو تینو هێزەی ئێستای بێت. ئەمەش وەکو هاوکێشەیەکە کە پرێتی لە نەزانراو و کەس ناتوانێت لەخۆیەوە بڕیار لەسەر یەك نەزانراو لەوانە بدات کە چەندە.[٢٥٣]

وەرگێڕی کوردی ئەو باسەی تەبەری دەهێنێتەوە کە گوایە کە خۆر ئاوا دەبێتولە ئاسمانێکەوە بۆ ئاسمانێکی تر بەرز دەکرێتەوە تا دەگاتە ئاسمانی حەوتەم ئینجا دەگاتە ژێر عەرشی خوداو سوجدە بۆ خودا دەباتو ئەو فریشتانەش کە کاروباری خۆریان پێ سپێردراوە سوجدە دەبەن ئینجا خۆر لە خودا دەپرسێت لەکوێوە هەڵدێت ئیتر جبریل پۆشاکێکی تیشك لە رووناکیی عەرشی بۆ دەهێنێت ئەویش دەیکاتە بەری... تاد. (لە گێڕانەوەکە وشەی "حلّە" هەیە کە پۆشاکە بە چەند واتایەك: پۆشاکێکی باشی نوێ یان پۆشاکی دوو پارچەیی یان سێ پارچەیی.. بەڵام وەرگێڕی کوردی دەڵێت ملەوانە)، لە سەنەدی ئەو فەرموودەیەك دوو کەس هەن (خلف بن واصل و عمر بن صبح أبو نعيم البلخي) کە هەڵبەستنی فەرموودەیان دراوەتە پاڵ.[٢٥٤] شێخەکەی تەبەریش (واتە ئەوە فەرموودەکەی لێ

---

[٢٥٣] فەرموودەکە لە صەحیحی موسلم (كتاب الجنة وصفة نعيمها وأهلها–باب صفة القيامة، ح٢٨٦٤، ص١٣١٠)، وەرگێڕی کوردیش نالێت لە چ کتێبێك هاتووە، سەرباری ئەوەش دەقێك بە عەرەبی دەهێنێت کە فەرموودە نییە بەڵکو کۆکراوەی کورتی ئەو فەرموودەیەو چەند فەرموودەیەکی ترە.پاش گەڕانێکی خێراش بە ئینتەرنێت بینیم ئەو قسەیە بەشێکە لە چەند ئامۆژگارییەك بۆ لاوان.

[٢٥٤] د. محمد بن طاهر البرزنجي، ضعيف تاريخ الطبري، ج٦، ٨٣، ص٣٧، هـ١.

وەرگرتووە)، محمد بن أبى منصور الآملي، نەناسراوە[٢٥٥] کە ئەم نەناسراوییە بەسە بۆ لاوازکردنی هەر فەرموودەیەك. تەبەری خۆشی لاوازی کردووە.[٢٥٦]

## ٢-زەوی جێگیرە

عبدالفادی ئەم ئایەتانە دەهێنێتەوە:

((خَلَقَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا وَأَلْقَى فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ –لقمان:١٠)).

((وَهُوَ الَّذِي مَدَّ الأَرْضَ وَجَعَلَ فِيهَا ... –الرعد:٣)).

((وَالأَرْضَ مَدَدْنَاهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ شَيْءٍ مَّوْزُونٍ –الحجر:١٩)).

((وَأَلْقَى فِي الأَرْضِ رَوَاسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ وَأَنْهَارًا وَسُبُلاً لَّعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ –النحل:١٥)).

((وَجَعَلْنَا فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ أَن تَمِيدَ بِهِمْ وَجَعَلْنَا فِيهَا فِجَاجًا سُبُلًا لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ –الانبياء:٣١)).

دیسانەوەش پەنا بۆ تەفسیری بەیزاوی دەبات کە باسی ئەو ئایەتانە دەکات و دەڵێت تەفسیری ئایەتەکانی سوورەتی (النحل) دەکاتە پوختەی تەفسیری هەموو ئەو ئایەتانە: خودا کێوەکانی سەقامگیر کردووە نەوەکو[٢٥٧] زەوی لار بێتەوە و جووڵەجووڵ بکات و ناجێگیر بێت.

بەیزاوی دەڵێت زەوی تۆپێکی سووکەڵەی ساکار بوو و هەقی هەبوو وەکو فەلەکەکان بەخولانەوە بجووڵێتەوە یان بەهۆی بچووکترین هۆکاری جوولە بجووڵێتەوە ئیتر کە کێوەکان لەسەر ڕووەکەی دروستکران لاکانی لاسەنگ بوون و

---

[٢٥٥] وەك خاوەنی کتێبی شێخەکانی تەبەری باسی کردووە کە هیچ باسێکی نەبینیوە لە کتێبەکانی تایبەت بە گێڕەرەوەکانی فەرموودە: اکرم بن محمد الاثري، معجم شيوخ الطبري، ٣٣٣، ص٦١٢.

[٢٥٦] د. محمد بن طاهر البرزنجي، ضعيف تاريخ الطبري، ج٦، ٨٢، ص٣٨، هـ ٢.

[٢٥٧] وشەی (كراهة) لێرە واتا (نەوەکو) وەرگێڕی کوردیش پێتاوپێت وەریگێڕاوەو وای لێ کردووە: خوا پێی ناخۆش بووە زەوی لاریان بکاتەوە!!

کێوەکان بەهۆی قورساییەکەیانەوە بەرەو مەرکەز چوون ئیتر وەکو مێخیان لێهات کە ناهێڵن زەوی بجووڵێتەوە (بەیزاوی، ج٣، ص٣٩٠).

هەرچەندیش ئەو تەفسیرە ویستوویەتی لە زانستەوە نزیك بێتەوە بەلام هێشتا تەفسیرێکی سەردەمی خۆیەتیو کارێکی دوورە لە گیانی زانستەوە ئەگەر ئەو تەفسیرە بکرێتە ماڵ بەسەر قورئان. وەك وتیشم تەفسیرەکە ویستوویەتی لە زانستی سروشت نزیکبێتەوە، لەو ڕووەشەوە کە زەوی وەکو گۆ باس دەکات تا ڕادەیەك نزیك ببووەوە.

رەخنەی عبدالفادیش ئەمەیە:

ئێمە دەپرسین: کە ئەوە روون بێت زەوی هەر بیستوچوار سەعات جارێك بەدەوری خۆی دەخولێتەوەو لەو جووڵەیە شەو و رۆژ دروست دەبنو زەوی لەساڵێك یەك جار بەدەوری خۆر دەخولێتەوەو لەو خولانەوەیە چوار وەرزەکە دروست دەبن ئیتر چۆن زەوی راخراو و تەختکراو و جێگیر دەبێتو ناجووڵێتو کێوەکان رێگریی لێدەکەن لەوەی لاربێتەوەو بجووڵێتەوە؟

لەبەر ئەوەش مەبەستی ئەم وەڵامە باسکردنی ئیعجازی زانستی لە قورئان نییە خوێنەر دەتوانێت ئەو بابەتو کتێبانە لەو بارەیەوە بخوێنێتەوە. تێکەڵکردنی تەفسیری قورئانیش بە خودی قورئان کارێکی هەڵەیەو بۆ خۆی جێگەی ڕەخنەیە چونکە تەفسیر نابێتە حاکم بەسەر قورئان بەتایبەت لەو مەسەلانەی پەیوەندییان بە زانستی رۆژگارەوە هەیە.

زانراویشە کە زەوی بەواتایەك تەختەو بەواتایەکی تر گۆییە. زەوی گۆییە ئەگەر باسی هەموو زەوی یان هەسارەی زەوی بکەین. زەویش تەختە ئەگەر مەبەستمان لەو رووبەرەی لەسەر دەژین. زانراویشە کە لەهەر خاڵێکی دیاریکراویو ئەو قەوسەی لەو شوێنە بەهۆی خڕیی زەوییەوە دروست دەبێت گۆشەیەکی هێندە بچووکە کە وەکو نەبوو وایە. باسکردنی تەختکردنی زەوی بۆ کەسانێکە لەسەر ڕووی زەوی دەژین کە مرۆڤەکانو خیتابەکە لەگەل مرۆڤ کراوەو بۆ ژیانو

گوزەرانی ئەوە: ((زەویم بۆ درێژو پان کردنـەوەو شـاخم تـێ دانـاو هـەموو جـۆرە ڕووەکێکم تـێ ڕوانـد)).. ئەمـە خیتابەکەیـە، ئینجـا ئایـا گونجـاو دەبـوو بوترایـە: ((زەویم بۆ خڕکردنو شاخم تێ داناو هەموو جۆرە ڕووەکـێکم تـێ ڕوانـد))؟ بـاس باسی ژیانو گوزەرانی مرۆڤە کە لێرە باسـی تـەختکردنی زەوی گونجـاوترە. بـەم جۆرە ڕەخنەگرتن لە وەسفی زەوی بەوەی تەختـە لەجێگـەی خـۆی نییـە چـونکە یـەك ڕووی ڕاسـتییەکەی وەرگرتـووەو ڕەچـاوی سـیاقی باسـەکەی نـەکردووە کـە لەبارەی ژیانی مرۆڤ لـەو شـوێنەی لەسـەری ڕاوەسـتاوە نـەك لـەبارەی زەوی وەك تەنێکی ئاسمانی.

دەوری کێوەکانیش لە ڕاگرتنی زەوی چـەند واتایـەك هەڵـدەگرێت نـەك تـەنها ئـەو واتایەی بەیزاوی باسی کردووەو عبدالفادی کردوویەتی بە ماڵ بەسەر قورئان، واتە دەوری چیاکان لەوەی زەوی وەکو تەنێکی ئاسمانی لە جووڵە بکەوێتو عبدالفادی ئـەو جووڵەیـە بکاتـە جووڵـەی زەوی بـەدەوری خـۆی و بـەدەوری خـۆر... ئەمـە بازێکی گەورەیە، ئەگینا جووڵەکان زەوی هەر ئەو دوانە نین.. ئەی چی دەڵێین بۆ جووڵەی چینەکانی زەوی؟ ئەگەر بمانەوێت لـەو ئایەتانـە تێبگـەین پێویسـتە بـەم جۆرە بیربکەینەوە: کێوەکان ڕێگری لە چینەکانی زەوی دەگرن کە بجـووڵێن یـان بەسەر یەکتر بخزێن، یان بەو شێوەیەی جیۆلۆجیا وردکارییەکانی داوە: کێوەکـان بـەهۆی جووڵـەی چـینەکانی زەوی دروسـت بـوون، واتـە لـەو سـەردەمە جووڵـەی چینەکانی زەوی هەبووەو لەدوای ئەوەوە جوولەکەیان سنووردار بووەو هـی ئـەوە نییە زەوی لەبنی پێی مرۆڤ بجووڵێنێت.[٢٥٨]

---

٢٥٨وەرگێڕی کوردی ویستوویەتی زانستییانە قسە بکاتو باسی جووڵەی ئەو چینانەی کردووە بەڵام داماوییەکە لەوەیە کە هەر ئەو باسە خـۆی پشتگیریی دەوری کێوەکان لە سەقامگیرکردنی ڕووی زەوی دەکات بەڵام چونکە بە چاوێکی نووقاوەوە قسە دەکات خۆی دەخەڵەتێنێت

## ٣-ئەستێرەكان بۆ بەردەبارانكردنی شەیتانەكانن

((وَلَقَدْ زَيَّنَّا السَّمَاء الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَجَعَلْنَاهَا رُجُومًا لِّلشَّيَاطِينِ وَأَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابَ السَّعِيرِ – تبارك:٥)).

إِنَّا زَيَّنَّا السَّمَاء الدُّنْيَا بِزِينَةٍ الْكَوَاكِبِ * وَحِفْظًا مِّن كُلِّ شَيْطَانٍ مَّارِدٍ * لَا يَسَّمَّعُونَ إِلَى الْمَلَإِ الْأَعْلَى وَيُقْذَفُونَ مِن كُلِّ جَانِبٍ * دُحُورًا وَلَهُمْ عَذَابٌ وَاصِبٌ * إِلَّا مَنْ خَطِفَ الْخَطْفَةَ فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ ثَاقِبٌ – الصافات: ٦-١٠))

وَلَقَدْ جَعَلْنَا فِي السَّمَاء بُرُوجًا وَزَيَّنَّاهَا لِلنَّاظِرِينَ * وَحَفِظْنَاهَا مِن كُلِّ شَيْطَانٍ رَّجِيمٍ * إِلاَّ مَنِ اسْتَرَقَ السَّمْعَ فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ مُّبِينٌ – الحجر:١٦-١٨))

عبدالفادی تەفسیری بەیزاوی دەهێنێتەوە كە هەسارەكان چرانو بۆ جوانین (سوورەتی الحجر، ج٣، ص٣٦٤ و الصافات، ج٥، ص٤) ئینجا بەیزاوی لە تەفسیری (وجعلناها رجوما للشياطين) دەڵێت: واتە: سوودێكی تریشمان بۆ داناون ئەویش ڕەجمكردنی دوژمنەكانتان، وتراویشە كە ئەوانەمان كردۆتە گومان بۆ شەیتانە مرۆڤەكان كە بریتی لە ئەستێرەگرەكان (ج٥، ص٣٦٢)، مەبەستی لەوەیە كە ئەو ئەستێرانەی دەكەونە خوارەوە دەبنە سەرچاوەی زانیاری بۆ ئەستێرەگرەكان (شەیتانە مرۆڤەكان) سەبارەت بە پێشبینیی دوارِۆژ بەڵام ئەمانە زانیاری نین بەڵكو گومانن.

عبدالفادی ئەوەی سوورەتی (ئەلحیجر-الحجر) وا باس دەكات: كە ئاسمان لە دەستی شەیتانەكان پارێزراون بەوەی ناتوانن بۆی سەركەونو وەسوەسە بخەنە دڵی خەڵكەكەیو تەسەروف بكەن بەشێوەیەك فەرمان بەو ئاسمانە بدەنو ئاگایان لە كاروبارەكانی بێت مەگەر یەكێكیان نهێنییەك بدزێت. ئینجا باسی قسەكەی ئیبنو عەبباس دەهێنێتەوە كە شەیتانەكان ڕێگرییان لێ نەدەكرا گوێ لە هەواڵەكانی ئاسمان بگرن بەڵام كە عیسا لەدایكبوو بۆ ماوەی سێ ساڵ ڕێگرییان لێ كراو كاتێكیش موحەممەد لەدایكبوو بە نەیزەكەكان ڕێگرییان لێ كرا.

عبدالفادی دەپرسێت: ئەگەر هەر هەسارەیەك جیهانێكی زەبەلاح بێت بۆ خۆی ئیتر چۆن دەتوانین تەسەور بكەین كە فریشتەیەك بە قەبارەی مرۆڤ وەكو بەردێك دەست بداتە ئەو هەسارەیەو بیگرێتە شەیتان بۆ ئەوەی دەنگی خەڵكی ئاسمان نەبیستێت؟ ئایا ئەو هەموو تەنە ئاسمانییانە بۆ ئەوە دروستكراون كە ببنە تفاقی سەربازی بۆ بەردەبارانكردنی شەیتانەكان؟

عبدالفادی دەڵێت بەیزاوی وا تەفسیری دەكات وەك چۆن تەفسیری خۆی بێت لەكاتێك بەیزاوی ڕوونكردنەوەی داوە چونكە گرتنی نەیزەكەكان لەو شەیتانو جنۆكانەی دەچنە ئاسمانی یەكەم بۆ بیستنی هەواڵ لە فەرموودەكان هاتووە. فەرموودەكان دەڵێن جنۆكەكان ئەو گوێگرتنە بۆ فاڵچیو كاهنەكان دەكەنو هەواڵێكی ڕاستی ئاسمان دەبیستنو دەیگەننە جادووگەرانو كاهنەكانو ئەمان سەد درۆی لەگەڵ تێكەڵ دەكەن.[٢٥٩] سوورەتی (الجن) باسی گوێگرتنەكە دەكاتو باسی ئەوە ناكات بۆ كاهنەكان بووە، لەسەر زمانی جنۆكەكانیش دەڵێت كە شوێنیان هەبوو لە ئاسمان تێی دادەنیشتنو گوێیان دەگرت بەڵام لەمەودوا هەر كەسێكیان گوێ بگرێت نەیزەكێك چاوەڕێی دەكات ئینجا هەر لەسەر زمانی جنۆكەكان دەڵێت: ئێمەش نازانین بەم ڕێگرییە ویستراخراپەیەك بە ئەهلی زەوی بگەیەنرێت یان خودا ویستی ژیری (یاخود هیدایەت)یان پێبەخشێت: ((وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَاعِدَ لِلسَّمْعِ فَمَن يَسْتَمِعِ الْآنَ يَجِدْ لَهُ شِهَابًا رَّصَدًا * وَأَنَّا لَا نَدْرِي أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِي الْأَرْضِ أَمْ أَرَادَ بِهِمْ رَبُّهُمْ رَشَدًا –الجن: ٩–١٠)).

عبدالفادی وەك ئاگاشی لە فەرموودەو تەفسیری تر نییە ناشزانێت كە سەرجەم ئایەتەكان لەگەڵ فەرموودەكان باسی هەسارە ناكەن كە دەگیرێنە جنۆكەكان

---

[٢٥٩] صحیح البخاری، كتاب التفسیر، باب الا من استرق السمع فاتبعه شهاب مبین، ج٦، ح٤٧٠١، ص٨٠–٨١" كتاب التفسیر، باب قوله حتى اذا فُزّع عن قلوبهم..، ج٦، ح٤٨٠٠، ص١٢٢" لەوەش كورتتر لەهەمان كتێب: كتاب الطب، باب الكهانة، ج٧، ح٥٧٦٢، ص١٣٦. صحیح مسلم، كتاب السلام، باب تحريم الكهانة واتيان الكهان، ح٢٢٢٩، ص١٠٦٢، كورتەكەش: ح٢٢٢٨، ص١٠٦١.

بـەڵكو بـاس لـە نەیزەكـە. عبـدالفادی وەك چـۆن قـەبارەی نەیزەكـەكانی گـەورە كردووە قەبارەی فریشتەكانیشی بچووك كردۆتەوە كاتێك دەڵێت هێندەی مـرۆڤن. ئینجا ئایەتەكان ناڵێن فریشـتەكان ئـەو بەردانـە دەگرنـە شـەیتانەكان، ئێمـە هـەر ئەوەندە دەزانین كە بەردەكانیان تێدەگیرێت.

ئەو ڕەخنەیەش لەجێگەی خۆی نییە كە گوایە ئەو هەسارانە بـۆ بـەردەبارانكردنی شـەیتانەكان دروسـتكراون چـونكە ئایەتـەكان وا نـاڵێن، تەنانـەت بـەیزاویش كـە عبدالفادی پشتی پێوە بەستووە وا ناڵێت چونكە عبـدالفادی هـەر خـۆی قسـەكەی بەیزاوی نەقڵ دەكات كە بەردەبارانكردنی دوژمنەكانی مـرۆڤ سـوودێكی تـرە نـەك تاكە سوودە.

قسە لەسەر وەرگێڕانی كوردی:

لەپــەراوێز دەنووســێت زانســت هەڵــەی زاراوەكــانی ڕۆژهــەڵاتن‌و ڕۆژئــاوابوونی سەلماندو هەروەها لە گەردوون نزم (دنیـا)و بـەرز (سمـاء) دوو چـەمی ڕیـژەیین‌و كتێبە ئاینییەكان لەوە هەڵەن (لاپەڕە ٢٠، پ ١٤).

ئەمەش تەنها قسەیە چونكە قورئان یان هـەر كتێبێك یـان قسـەیەك كـە دەكرێت پێویستە بەپێی حاڵی ئەو كەسانە بێت كـە قسـەكەیان لەگـەڵ كـراوە، بۆیـە هـەر كەسـێكی سـەر زەوی ئاسمـان بەرزاییـەو ڕۆژهـەڵاتن لـە ڕۆژهەڵاتـەوە دەبێـت‌و ڕۆژهەڵات ناوێكە وەسفی شوێنێك دەكات كە دەكەوێتە دەستە ڕاستی ئەو كەسەی ڕوودەكات باكوور، باكووریش خاڵێكە یان تەوەرێك بە ئاڕاستەیەك دەڕوات گۆشەی نەوەد پلە لەسەر تەوەرەكەی تر دروست دەكات كە تەوەری ڕۆژهەڵات–ڕۆژئاوایە.

بەو پێیەی وەرگێڕیش پێویستە لەجیاتی وشـەی (رب المشـرق–خـودای ڕۆژهـەڵات یان ڕۆژهەڵهاتن) لە قورئـان دەبوایـە بوترایـە: ((خـودای ئـەو خاڵـەی كـە تیشـكی خۆری بەردەكەوێت كاتێك زەوی بەدەوری خـۆی دەسـووڕێتەوە))!! یـان هـەموو جارێك لەجیاتی ((السماء الدنیا–ئاسمانی نزم)) بوترێـت ((ئـەو بۆشـاییە نـزیكترین شوێنە لە زەوی)). خۆ ئەگەر ئەوەش كرا ئەو كاتە دەوترا قورئـان نازانێـت زاراوە

بۆ ئاسانکردنەوە بەکاربهێنێت‌و بە ڕستەی درێژ تەعبیر لە وشـەی کـورت دەکـات. پێویستە ئەوەش بڵێین کە ((السماء الدنیا)) مەرج نییە ئاسمانی نـزم بێـت چـونکە وشەکە لە (دنی) واتە نزیك بوووەوە هاتووە واتـە ئاسمـانی دنیـا ئاسمـانی نزیکـە چونکە نزیکترین شوێنە لە زەوی.

عبدالفادی قسەکەی بەیزاویی نەقڵکردووە: ((والتـنکیر للتعظـیم))، مەبەسـتیش لـە وشەی (مصابیح) کە بە (نەکیرە–نەناسێندراو)، بەکوردیش: چراگەل، هاتووە نەك وەك (موعــەررەف–ناســێندراو) کــە بــە کــوردی (چراکان)ــەو بــە عــەرەبی (المصابیح)ـە. بەیزاوی دەڵێت ئەو تەنکیرە بۆ گەورەکردنە. بەش بە حاڵی خۆشـم نازانم بۆچی ئەمە (واتـە مصـابیح) گەورەکردنـەو بۆچـی ناسـاندنی وشـەکە (واتـە المصابیح) گەورەکردن نییە، گرنگ ئەوەیە بەیزاوی مەبەستی ئەوە بوو بۆیە پاش باسی (ئاسمانی نزیك) دەڵێت: ئەوەش ڕێگری لەوە ناکات کە هەندێك هەسـارە لـە ئاسمانەکانی سەرەوە هـەبن. وەرگێـڕی کـوردی لەمـە تێنگەیشـتووەو ((والتـنکیر للتعظـیم–نەناســاندنەکە بــۆ گەورەکردنــە))ی کــردووە بــە ((شــرۆڤەکەش بــۆ گەورەکردنە))، واتە ڕوونکردنەوە یان تەفسیر بۆ گەورەکردنە.

عبــدالفادی دوای باســی قســەکەی ئیبنــو عەبباســە کــە لــەدوای لــەدایکبوونی موحەممــەدەوە بــە نــەیزەك شــەیتانەکان ڕێگرییــان لــیٚ کـرا بچـنە ئاسمانـەکان، قسەکەی بەیزاوییش نـەقلٚ دەکـات:((ولا یقـدح فیـە تکونهـا قبـل المولـد لجـواز أن یکون لها أسباب أخر وقیل الإستثناء منقطع أي ولکن من استرق السمع))، کە ئەمە وەڵامی ڕەخنەیەکە کە بەیزاوی زانیویەتی لە قورئان دەگیرێت: بۆچی نەیزەکەکان لەدوای لەدایکبوونی پێغەمبەرەوە بۆ ڕاونـانی شـەیتانەکان بـەکارهاتوون لـەکاتێك ئەو نەیزەکانە پێش ئەویش هەر هەبوون‌و هەر دەکەوتنە خوارەوە؟ وەڵامەکەشـی ئەوەی سەرەوەیە کـە بـەکوردی ئەمەیـە: دەکرێـت هۆکـاری تریـان هـەبێت، واتـە هۆکاری تـر هـەبن بـۆ کەوتنـە خـوارەوەی نەیزەکـەکان. وەرگێـڕی کـوردیش ئـاوا دەنووسێت: ((وە نابێت کەسی موسڵمان بۆ ئەو باسە هۆی تر لێکبداتەوە)). واتـە

وەرگێڕەکە لە قسەکە تێنەگەیشتووەو بە حەزی خۆیو بەپێی نیازی خۆی لە وەرگێڕانەکە ئەو قسەیەی کردۆتە کوردی، بەیزاوی دەڵێت کە ئەوە رەخنە نییە کە نەیزەکەکان پێش لەدایکبوونی پێغەمبەر هەبوون چونکە دەکرێت هۆی تر بۆ کەوتنە خوارەوەیان هەبووبێت، وەرگێڕەکەش دەیکاتە فەرمانێکی رێگری کە کەسی موسڵمان بەدوای هۆی تر بگەڕێت، ئەمەش تەنها بۆ نەزانییەکەی ناگەڕێتەوە بەڵکو هەروەها بۆ فیکرەیەکی ئامادە لە مێشکی ئەویش نابێت موسڵمان پرسیار بکات، کە دیارە ئەم پرسیارنەکردنە بۆ چەند شتێکی زۆر کەمن کە خۆخەریککردنی پێیانەوە دەبێتە فرێدانی قسەی بێبەڵگە، وەك پرسیار لەوەی چۆن خودا ئەزەلییەو سەرەتایەك نەبووە بۆ هەبوونی.

بەیزاوی هەر لەو قسەیەی سەرەوەی بۆچوونێکی تر دەڵێت کە وشەی (الا- بێجگە، مەگەر) ئەمەی ئیستسنائی (مونقەطیع)ـە کە لە زمانی عەرەبی بریتییە لە دەرکردنی شتێك لە شتێکی تر کە بەشێك نییە لێی. ئەگەر ئەو جۆرە ئیستسنائە نەبێت ئایەتەکە ئەم واتایەی دەبێت: ((خودا بورجی لە ئاسمان دروست کردو رازاندنیەوە بۆ تەماشاکەرانو پاراستنی لە هەر شەیتانێکی بەردباراونکراو مەگەر لە شەیتانێك پارێزراو نەبێت کە بەدزییەوە گوێ بگرێت ئەو کاتە نەیزەکێك شوێنی دەکەوێت)). بەپێی ئەمەش خودا ئاسمانی لەو شەیتانانە نەپاراستووە کە بگەنە ئەوێو گوێ بگرن مەگەر دواتر کە نەیزەکیان بۆ دەنێرێت. بەپێی ئەو جۆرە ئیستسنائەش بێت وشەی (الا-بێجگەلە ، مەگەر) بەواتای (لکن-بەڵام) هاتووەو بەم جۆرە ئاسمان پارێزراوە لە هەموو شەیتانێك بەڵام ئەگەر هاتو شەیتانێك گەیشتە ئەوێ.. تاد. وەرگێڕی کوردی کە نازانێت ئیستسنائی مونقەطیع چییە دەڵێت: ((وە وتراوە بێجگەلێکردنی تێدا نییە))!!

ئەنجامی لێکدانەوەی سەرجەم ئایەتەکانیش ئەوەیە کە جنۆکەکان گوێیان لە هەواڵەکانی ئاسمان دەگرت بەڵام رێگریی ئەوەیان لێ کرا، هەر یەکێکیش ئەوە بکات نەیزەکی تێدەگیرێت (نەوتراوە هاوێژەرەکە فریشتەیە یان هۆکارێکی ترە).

موسڵمان باوەڕی بەو ئەندازەیەیە چونکە باوەڕی بە قورئانە. فەرموودەش ئەوە ڕوون دەکاتەوە چۆن کاهنەکان هەواڵەکانی دواڕۆژ دەزانن: جنۆکەکە شتێکی کەمی دەستدەکەوێت (وەکو ئایەتەکەش دەڵێت: الا من خطف الخطفة) کاهنەکەش نەوەدو نۆ درۆ لەگەڵ ئەو زانیارییە تێکەڵاو دەکات.

بۆ کەسێکیش باوەڕی بەوانە نییە ئەمە تەفسیرێکە بۆ بەشێك لە پێشبینییەکانی جادووگەرانی ناودار کە راست دەرچوون (ئەوانەی لێ دەرچێت کە پێشبینی گشتین وەك شەڕی نێوان دوو هێزو هەندێك باسی گشتیی ناو شەڕەکە).

کەسێکیش بیەوێت بەپێی زانستە سروشتییەکان تەفسیری نەیزەك بکات رێگری نییە چونکە:

١-هەر جنۆکەیەك بچێتە ئاسمان بۆ گوێگرتن نەیزەکێکی تێدەگیرێت بەڵام پێچەوانەکەی مەرج نییە راست بێت واتە هەر نەیزەکێك بکەوێتە خوارەوە بۆ جنۆکەیەك نێردراوە، ئەوەش کە پێویستە مرۆڤ هەوڵی بۆ بدات ئەوەیە لێکۆڵینەوە لە نەیزەکان بکاتو هۆکارە سروشتییەکەی کەوتنیان بزانێت.. تاد، ئەوەش کە پەیوەندیی بە شتی ترەوە هەیە زانیارییەکی کەمەو پێویست ناکات بەدوای بچێت چونکە ئەوە دەبێتە لێکۆڵینەوە بەبێ بەڵگەو تەنها بە قسەکردن نەك لێکۆڵینەوەی زانستی.

٢-لێکدانەوە بەپێی زاستەکانی سروشت لایەنە سروشتییەکەی دەردەخات ئەوەش واتای ئەوە نییە کە بەپاڵ ئەوە لایەنێکی شاراوە هەیە. گەورەترینو فراوانترین نموونە خودی بوونو گەردوونە. کاتێك زانستەکانی سروشت لە گەردوون دەکۆڵنەوە خۆیان لەبەردەمی بوونێکی ماددی دەبیننەوە لە پێکهاتەی لەشی زیندەوەرانو پێکهاتی ئاسمانو زەویو ماددە.. تادو هەوڵ دەدەن لێیان تێبگەنو راستییەکانی ئاشکرا بکەنو پاشان مامەڵەیان لەگەڵ بکەن بەڵام بەشێکی شاراوە هەیە کە ئاینەکان ئاشکرای دەکەن ئەویش کە دروستکارێك بۆ ئەم بوونە هەیەو لەخۆڕاو بۆ رابواردن دروستی نەکردووەو مرۆڤ لێی

دەپرسرێتەوەو رۆژی زیندووبوونەوەو بەهەشتو دۆزەخ هەن. ئەگەر زانستەکانی سروشت هەموو نهێنییەکانی گەردوون بدۆزنەوە (کە ئەستەمە ئەمە لە ژیانی مرۆڤایەتی ئەنجام بدرێت) هێشتا ناتوانێت ئەو لایەنە شاراوەیە بەدرۆبخاتەوە. وەنەبێت زانستەکانی سروشت بەتەواوی لەو دیوە شاراوەیە بێدەنگ بن چونکە لەگەل گەشەسەندنی زانست زیاترو زیاتر دەردەکەوێت کە دروستکارێك بۆ ئەم گەردوونە هەیە، لەبەر ئەوەشە بێباوەڕی تەوژمێکی بەهێز بوو لەسەدەی نۆزدەی زایینی لەبەر ئەوەی زانست تازە خەریك بوو دەچووە ناو نهێنییەکانی گەردوون بەڵام سەدەی بیست ئەو لەخۆبایی بوونەی ڕەواندەوە.

خاڵێکی تریش کە گرنگە باسی بکەینو دەچێتە خانەی فیکرو فەلسەفە ئەمەیە: ئینکارکردنی هەبوونی جنۆکەو شەیتانو هەر بوونەوەرێکی تر کە نایبینین تەنها هەوڵ نییە بۆ بیرکردنەوەی زانستی بەڵکو خودپەرستییەکی مرۆڤ دەشارێتەوەو پرسیارێك هەیە شایستەی ئەوەیە لە مرۆڤی بێباوەڕ بکرێت: بۆچی دەبێت لەم گەردوونە فراوانە تەنها تۆی مرۆڤ هەبی؟

ئەو مرۆڤەی وا دەزانێت بوونەوەری تر لەم گەردوونە غەیری خۆی نییە جگە لەوەی بیرکردنەوەکەی زانستی نییە، چونکە بڕیار لەسەر شتێك دەدات کە بەڵگەی لەسەر نییەو باوەڕی بە وەحیی خوداییش نییە، بەڵکو هەروەها بێبەشە لە خەیاڵ، دەشزانین بەشێکی زانست توانای خەیاڵە، زانستی سەردەمی نوێش خەیاڵی مرۆڤی فراوان کردو زانستی فەلەك بەشێکی گەورەی لەو خەیاڵە بەرکەوتووە.

## ٤-حەوت ئاسمان و حەوت زەوییەکە

عبدالفادی ئەم ئایەتانە دەهێنێتەوە:

((اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ وَمِنَ الْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ الْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ لِتَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا -الطلاق:١٢)).

((هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاء فَسَوَّاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ –البقرة:٢٩)).

((فَقَضَاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ وَأَوْحَى فِي كُلِّ سَمَاء أَمْرَهَا وَزَيَّنَّا السَّمَاء الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَحِفْظًا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ –فصلت:١٢)).

((وَجَعَلْنَا السَّمَاء سَقْفًا مَّحْفُوظًا وَهُمْ عَنْ آيَاتِهَا مُعْرِضُونَ –الانبياء:٣٢)).

((أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي الْأَرْضِ وَالْفُلْكَ تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِأَمْرِهِ وَيُمْسِكُ السَّمَاء أَن تَقَعَ عَلَى الْأَرْضِ إِلَّا بِإِذْنِهِ إِنَّ اللَّهَ بِالنَّاسِ لَرَؤُوفٌ رَّحِيمٌ –الحج:٦٥)).

((أَفَلَمْ يَنظُرُوا إِلَى السَّمَاء فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا وَزَيَّنَّاهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ –ق:٦)).

عبدالفادی پەنا دەباتەوە بەر تەفسیری بەیزاویو دەڵێت کە بەیزاوی تەعبیری ((سقفا محفوظا))ی سوورەتی الانبیاء بەوە تەفسیر دەکات کە ئەو سەقفە بەفەرمانی خودا پارێزراوە لەوەی کە بکەوێتە خوارەوە، هەروەها ((مالها من فروج)) ی سوورەتی (ق)ی بەوە تەفسیر کردووە کە خودا ئەو ئاسمانەی بە لووسی دروستکردووەو چینەکانی بەیەکەوە نووساون.

عبدالفادی دەپرسێت:

چۆن دەڵێت ئەو بۆشاییەی کە بەناکۆتایی لەسەروومان بەرزبۆتەوە سەقفێکی لووسەو بۆی هەیە بکەوێتو حەوت سەقف لەو جۆرە هەن؟ چۆن ملیۆنەها هەسارە کە لەناو بۆشایی بێسنووری ئاسمان مەلە دەکەن چرایەکن نووسێنراون بەو سەقفە؟ چۆنیش دەڵێت کە زەوییەکەمان، کە یەکێکە لە ملیۆنەها هەسارەو ئەستێرە، حەوت هەسارە لەجۆری خۆی هەیە؟[٢٦٠]

[٢٦٠] ئایەتەکە مەبەستی لە شەشی زەویی ترەو بەهەموویان حەوت زەوین. هەروەها مەرج نییە ئەو شەش زەوییەی تر وەکو زەویی خۆمان بن چونکە بەکارهێنانی وشەی (مثلهن) بۆ ژمارەیە واتە: حەوت زەویشی دروستکردووە... نەك حەوت هاوشێوەی زەویی دروستکردووە. لێکۆڵینەوە لەو زەوییانەو ئەو ئاسمانانە کارێکی مرۆڤە کە خودا نەك تەنها رێگەی پێداوە بەڵکو هانیشی داوە، نەك تەنهاش بۆ زەوییەکانو ئاسمانەکان بەڵکو بۆ هەموو بوونەوەر: قل سیروا في الارض فانظروا كيف بدأ الخلق ثم الله ينشئ النشأة الآخرة (العنكبوت: ٢٠). تێبینی بکە کە ئایەتەکە باسی دروستکردنی دووەم، کە زیندووبوونەوە دەگرێتەوە، دەکاتو بەم

وەك بينيمان ديسانەوە تەفسيرێك دەكاتە ماڵ بەسەر قورئان ئەگينا قورئان باسى حەوت ئاسمانو حەوت زەويى كردووە بەلآم باسى لووسيى ئاسمانى نەكردووەو باسى چۆنێتيى ئەو ئاسمانانە ناكات. تەعبيرێكيش هەقە سەرنجى ئێمەى خەڵكى ئەم سەردەمە ڕابكێشێت ئەوەى لە سوورەتى (فصلت) هەيە: ((وَأَوْحَى فِي كُلِّ سَمَاء أَمْرَهَا)). منى كەسى ئەو سەردەمە مێشكم يەكسەر بۆ ئەوە دەچێت كە هەر ئاسمانێك (يان هەر گەردوونێك) لەو حەوت ئاسمانە ياسايى فيزيايى تايبەتى خۆى هەيە، وەكو ئەوەشە خودا بڵێت: هەر ئاسمانێكيش ياسا فيزياييەكانى خۆى پێ بەخشيوە.

وەحى زياتر لەگەڵ قورئان پەيوەست دەكرێت چونكە زانراوە قورئان وەحيى خودايە بۆ پێغەمبەرەكەى. بەلآم ئەوەش زانراوە كە وەحى بۆ شتى تريش بەكارهاتووە وەك بۆ هەنگ: (( وَأَوْحَى رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ أَنِ اتَّخِذِي مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ الشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ – النحل:٦٨)) كە ئاشكرايە خودا قسەى بۆ هەنگ نەكردووە بەڵكو وەحييەكەى بۆ هەنگ بريتييە لەو غەريزەيەى خستوويەتييە ئەو ئاژەڵە.

بەم جۆرە قورئان وەحيى كەلاميية (وەحيى قسەيە) بۆ پێغەمبەر بۆ ئەوەى خۆىو ئيمانداران بەپێى ئەو وەحييە بجووڵێنەوەو وەحيى هەنگ غەريزەيە بۆ ئەوەى پێى بجووڵێتو وەحيى گەردوونيش ياساكانێتى كە دەيجووڵێنن. ئينجا تێبينى بكەين لەگەڵ وشەى وەحى ئامرازى (الى) واتە (بۆ) لە حاڵەتى قورئانو هەنگ بەكارهاتووە، واتە وەحييەكە ((بۆ)) پێغەمبەرانەو ((بۆ)) هەنگە، بەلآم لە حاڵەتى ئاسمانەكان ئامرازى (فى) واتە (لە) بەكارهاتووە، بەم جۆرەش خودا وەحيى دا بە هەنگ، بەلآم وەحيى دانا لە ئاسمانەكان ئەويش چونكە ئەو وەحييەى لە ئاسمانەكان هەيە چۆتە ناو ئەو ئاسمانانەو بۆتە بەشێك لێيان، ئاسمانەكانيش گيانەلەبەر نينو بۆيان نييە لەدەرەوەى ياساكان كار بكەن،

---

جۆرە ئايەتەكە ئاماژەيە نەك تەنها بۆ دروستبوونى زەوىو ئاسمان كە خودا مرۆڤى هانداوە بزانێت چۆن بووە بەڵكو دروستبوونى مرۆڤى يەكەميش، واتە ئادەم.

تەنانـەت لەناوچـوونی ئەسـتێرەکانیش بـەپێی یاسـا دەبێـتو ئاسمانـەکان نـازانن خۆیـان چـی دەکـەن لـەکاتێك تەنانـەت ئـاژەڵیش کـە بـە غـەریزە دەجووڵێتـەوە دەزانێت چی دەکاتو جۆرە ئیرادەیەکی هەیە.

سەبارەت بەوەی خـودا ناهێڵێـت ئاسمـان بەسـەر زەوی بکـەوێتو ئـەوە دەکرێتـە ڕەخنە لـە قورئـان" تـەنها عـەقڵی منداڵانەیـە کـە ئـەو جـۆرە ڕەخنەیـە دەگرێـت چونکە هەسارەکانو ئەستێرەکان بەشێکن لە ئاسمانو کاتێك دەڵێین ((ئاسمـان)) ناتوانین هەسارەکانو ئەستێرەکانی لێ دەربکەین بۆیە هەر بەپێی ئەو یاسـایانەی خـودا لــە گــەردوون دانیــاون هەسـارەکانو ئەسـتێرەکان لەگـەل زەوی تووشـی پێکداادان نابن یـان زەوی بـۆ لای خۆیـان ڕابکێشـن، باسـکردنی کـەوتنیش بەسـەر زەوی بۆ تێگەیشتنی خەڵکـە چـونکە ئەگـەر خـۆر زەوی بـۆ لای خـۆی ڕابکێشـێت لەبەرچـاوی ئێمـە وەکـو ئەوەیـە خـۆر بەسـەر زەوی بکـەوێت، قورئـانیش ناچـێت تەعبیرێك بەکاربهێنێت کە ببێتە سەرلێشـێوانی خـەڵکی ئـەو سـەردەمە وەك بڵێـت خۆر زەوی بۆ لای خۆی ڕابکێشێت، زانینی ئەوەی کە ئەمە حاڵەتە ڕاستەقینەکەیە کاری سەردەمەکانی دوای هاتنی قورئانە.

ئێمەش کە دەزانین ئەمە تایبەتە بە زانستی فەلـەك و فیزیـا ئـەوەش دەزانـین کـە ئەوەی دۆزراوەتەوە زۆر لەوە کـەمترە کـە هێشـتا نەدۆرزراوەتـەوە، کـێش ناڵێـت ئەگەر ئەو یاسایانە تێکبچن هەموو ئەو گەردوونەی دەیبینین (کە ڕەنگە ئاسمـانی یەکەم بریتی بێت لەم گەردوونە) هەرەس نـەهێنێتو ئـەو هەرەسـە بـەرەو چـەقی گەردوون نابێت؟ ئەو کاتە زەویشو هەسارەکانیش و ئەسـتێرەکانیش بـەرەو ئـەو چەقە هەرەس دەهێنن، لەو کاتـەشو لـەو کاتـە زەوی بـەرەو ئـەو چـەقە دەڕوات ئەستێرەی تر بە خێراییەکی زیاتر بەرەو هەمان چەق دەڕۆنو بـەم جـۆرە بـەر لـە گەیشتنی زەوی بۆ ئەو چەقی گەردوونە ئەستێرەیەك یان هەسـارەیەك لەوانـە بـەر زەوی دەکەوێتو بەم جۆرە کەوتنی ئاسمان بەسەر زەوی تـەعبیر لـە واقـع بکـات نەك تەنها تەعبیرێکـە بـەپێی بینـینی خـەڵکی سـەر زەوی. سـەرباری پێشـکەوتنی

سەردەم گەردوون هێندە نەزانراوە کە هەر قسەیەك لەبارەیەوە بۆی هەیە ڕاست دەربچێت.

دەتوانین زۆر لەسەر زەوی‌و ئاسمان قسە بکەین، دەتوانین زانیارییەکانی سەردەم بە بەلگە بهێنینەوە بەو شێوەیەی پسپۆڕانی ئیعجازی قورئان باسی لێوە دەکەن بەڵام پاش هەموو ئەو باسانە ئەو بنەما سەرەکییەمان لەبیر نەچێت ئەگەر رەخنەگر بین یان وەڵامی رەخنە بدەینەوە: بەدرۆخستنەوەی قورئان بەپێی زانستی سەردەم کارێکی زانستی نییە چونکە زانست نەگەیشتۆتە کۆتاییەکانی.

## ٥-مانگەکانی نەسیئ

((إِنَّ عِدَّةَ الشُّهُورِ عِندَ اللّهِ اثْنَا عَشَرَ شَهْرًا فِي كِتَابِ اللّهِ يَوْمَ خَلَقَ السَّمَاوَات وَالأَرْضَ مِنْهَا أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ فَلاَ تَظْلِمُواْ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمْ وَقَاتِلُواْ الْمُشْرِكِينَ كَآفَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَآفَّةً وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ * إِنَّمَا النَّسِيءُ زِيَادَةٌ فِي الْكُفْرِ يُضَلُّ بِهِ الَّذِينَ كَفَرُواْ يُحِلِّونَهُ عَامًا وَيُحَرِّمُونَهُ عَامًا لِّيُوَاطِؤُواْ عِدَّةَ مَا حَرَّمَ اللّهُ فَيُحِلُّواْ مَا حَرَّمَ اللّهُ زُيِّنَ لَهُمْ سُوءُ أَعْمَالِهِمْ وَاللّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ -التوبة: ٣٦-٣٧)).

عبدالفادی دەڵێت: هەموو زانایان بەحسابی ساڵی هەتاوی مێژوو دادەنێن کە ئەمەیان جیاوازیی مانگی (نەسیئـ)ی هەیە لە ساڵی مانگی. ئایا ئەمە کوفرە؟ چۆنیش حسابی ئەستێرەناسیی سروشتی بە کوفر بزانین؟

قسەکانی تەواوبوون.

پێویست ناکات زۆر لەسەر ئەوە برۆین چونکە سەرلەبەری زانیارییەکانی عبدالفادی هەڵەن لەبەر ئەوەی مانگی (نسیئـ) جیاوازیی نێوان ساڵی هەتاوی‌و ساڵی مانگی نییە بەڵکو (نەسیئ) بەواتای دواخستن بریتی بوو لەو کارەی موشریکەکانی پێش ئیسلام دەیانکرد ئەویش گۆڕینی شوێنی مانگە حەرامەکان.

مانگە حەرامەکان مانگەکانی ذو القعدة و ذو الحجة و موحەڕڕەم بوون کە بەدوای یەك دەهاتن هەروەها مانگی ڕەجەب کە تەنیا بوو. موشریکەکانی عەرەب شەڕکردنیان لەو چوار مانگە حەرام کردبوو، سیانی یەکەم لەبەر حەجکردن‌و ماوەی چوون بۆ حەج‌و گەڕانەوە لێی‌و مانگی ڕەجەبیش بۆ عومرە[٢٦١] بەڵام ماوەیەك بەر لە ئیسلام دەستکاریی ئەوەیان کردو بۆ مانگی موحەڕڕەم کە شەڕی تێی حەرامکرابوو دەیانوت ئەمساڵ حەڵاڵە‌و ئەو حەرامکردنەیان دەبردە مانگی دوای ئەو واتە صەفەر.[٢٦٢] بەیزاوی کە عبدالفادی پشتی پێوە بەستبوو شتێك لەم بارەیەوە بەکورتی باس دەکات بەڵام دیارە عبدالفادی ئاگای لێ نەبووە.

بەم جۆرە ئەو دواخستنە ((زیادەیە لە کوفر))، واتە کوفرێکی ترە موشریکەکان دەیانکرد ئیتر ئەوە نە پەیوەندیی بە ساڵی هەتاوی‌و مانگییەوە هەیە‌و نە پەیوەندیی بە حسابی ئەستێرەناسییەوە هەیە.

نیازی دوور لە مەبەستی زانستی، واتە نیازی شەڕی ئایدیۆلۆجیا دژی ئیسلام، لە پاشکۆی وەرگێڕی کوردی ئاشکرایە کە لە وەرگێڕانی ئایەتەکە باسی ئاڵۆگۆڕکردنی مانگە حەرامەکانی کردووە، واتە کەمێکی زانیوە دەربارەی ئەو باسە کەچی ڕەخنە لە مامۆستا نەزانەکەی ناگرێت کە هەڵەی کردووە‌و لەجیاتی ئەوە باسی ڕۆژژمێرەکانی (مایا)و (ئینکا) دەکات –بڕوانە خوارەوە بۆ هەڵەکانی لەو باسە– کە بەکەڵکی ڕەخنەگرتن لە ئایەتەکەی نایەت، بەڵام چۆن وای لێ بکات بەکەڵك بێت؟ دەڵێت: کەواتە مەرج نییە ژمارەی مانگەکان بەپێی سووڕی مانگ بەدەوری زەوی دیاری بکرێت. کەواتە ئەژمارکردنی مانگ‌و ڕۆژەکانی ساڵ بەهەر شێوەیەك بێت لە ئەوپەڕی نەگونجانی دەشێت هەڵە بێت بەڵام کوفر نییە

---

[٢٦١] تفسیر ابن كثیر، ج٤، ص١٤٨.

[٢٦٢] تفسیر ابن كثیر، ج٤، ص١٥٠، ئیبنو کەثیر قسەی تریش دەربارەی چۆنێتیی حەرامکردن‌و حەڵاڵکردنی مانگەکە دەگێڕێتەوە بەڵام ئەمەیان پەسەند دەکات‌و ڕوایەتەکان دەهێنێتەوە کە کەسێکی ئەو سەردەمە ئەو بڕیارەی بۆ دەدان، لاپەڕە ١٥١–١٥٣.

(ل٢٥). یەعنی چی؟ یەعنی وەرگێڕ سەرەتا ویستی هەڵەی مامۆستاکەی داپۆشێت کەچی کە دەستی خستە تەفسیری ئایەتەکە واتاکەی لەدەست دەرچوو و قسە هەڵەکەی مامۆستاکەی کردەوە. ئەوەی سەیرە یەکسەر لەدوای ئەو قسەیە جارێکی تر تەفسیرە ناسراوەکە دەڵێتەوە واتە باسی ئاڵوگۆڕکردنی مانگە حەرامەکان. ئیتر نازانم ئەو بەهرەیە ناوبنێین چی کە مرۆڤ نەزانێت خۆی چی دەڵێت.

ئینجا وەرگێڕی کوردی نەزانییەکی تر دەخاتە پاڵ ئەوە کاتێك دەڵێت پێغەمبەر لە کاتی بێهێزی گلەیی ئەوەی کردووە موشریکەکان ڕێزیان لەو چوار مانگە نەگرتووەو لەکاتی پەیداکردنی دەسەڵاتی تەواوەتی ئیعتیباری بۆ ئەو چوار مانگە دانەناوە بە بەڵگەی ئایەتی پێنجەمی سوورەتەکە (فاذا انسلخ الاشهر الحرم فاقتلوا المشركين حيث وجدتموهم..) واتە دوای تەواوبوونی ئەو چوار مانگە شەڕ بکەن دژی موشریکەکان، ئیتر فەرمانی جەنگ سەرتاسەری دژی موشریکەکان ماوە بەڵام سەرەتای ئایەتەکە واتە (فاذا انسلخ الاشهر الحرم) نەسخ کراوە، بەواتایەکی تر سەرەتا وتراوە کە جەنگ لەو چوار مانگە قەدەغەیەو کە ئەو چوار مانگە تەواو بوون شەڕی سەرتاسەری دژی موشریکەکان بکەن بەڵام دوایی وتراوە نەخێر شەڕە سەرتاسەرییەکە لەو چوار مانگەش بکەن. ئاشکراشە ئەمە تەنها قسەیە چونکە بەڵگە نییە کە ئەو بەشەی ئایەتەکە نەسخ کراوە.

باسی ئەو چوار مانگەی ئایەتی (فاذا انسلخ الاشهر الحرم) بەجۆری تر کراوە. بۆچوونێك دەڵێت ئەو چوار مانگە چوار مانگە حەرامکراوە ناسراوەکانن: ڕەجەب و ذو القعدة و ذو الحجة و موحەڕڕەم (ئایەتی ٣٦ و ٣٧) بەڵام بۆچوونی تر ئەوەیە کە ئەو چوار مانگە بریتین لەو چوار مانگەی لەسەرەتای سوورەتەکە باسیان کراوە (ئایەتی ٢): فسيحوا في الارض اربعة اشهر، ئەوانیش چوار مانگی مۆڵەت بۆ موشریکەکان نەك چوار مانگە حەرامکراوە ناسراوەکەو ئیبنو کەثیر ئەوە پەسەند

دەكات[٢٦٣]، ئەوەش لەڕاستتر دەچێت چونكە دوو باسەكە پەیوەندییان بەیەكەوە هەیە. بەیزاویش بەهەمان شێوە ئەوە بەڕاست نازانێتو دەڵێت: دوای ئەو ئایەتەی باسی چوار مانگە حەرامكراوەكە (ڕەجەبو ذو القعدة وذو الحجة و موحەڕڕەم) دەكات هیچ ئایەتێك نەهات نەسخی بكات (بەیزاوی، ج٣، ص١٢٩–١٣٠). بەم جۆرە ئایەتەكانو موفەسیرەكان باسی شتێك دەكەنو وەرگێڕ باسی شتێكی تر دەكات.

نیازی شەڕ دژی ئیسلامو قورئان لەوەش دەردەكەوێت كاتێك وەرگێڕ دەیەوێت ئیسلام وەك ئاین تاوانبار بكات بەڵام مەسیحیەت وەك ئاین تاوانبار نەكرێت كاتێك باسی ئیسپانییەكانو داگیركردنی ئەمەریكای باشوور دەكاتو دەڵێت: لەڕێی خراپ كەڵك وەرگرتن لە سۆزی مەسیحیەتی ئاشتیخوازەوە كوشتوبڕێكی زۆریان لە هیندییە سوورەكان كردبوو (ل٢٥)، ئینجا تاوانێكیش دەخاتە پاڵ ئەو هیندییە سوورانە كە قوربانیی بەشەرییان بۆ خوداوەندەكانیان دەكردو ئەوە لەگەڵ موسڵمانان بەراورد دەكات، ئەوەش پاڕانەوەیەكی سەیرە بۆ هاودینەكانی مامۆستاكەی: لەبەر ئەوەی هیندییە ئەمەریكییەكان[٢٦٤] قوربانی بەشەرییان بۆ خوداوەندەكانیان دەكرد كەواتە شایەنی ئەوە بوون قەتلوعام بكرێن![٢٦٥]

---

[٢٦٣] تفسیر ابن كثیر، ج٤، ص١١١.

[٢٦٤] وەرگێڕی كوردی دەنووسێت (هندە سوورەكان). لێكۆڵەرەوانی ئەنترۆپۆلۆجیا زاراوەی هیندییە ئەمەریكییەكان لەجیاتی هیندییە سوورەكان بەكار دەهێنن.

[٢٦٥] ئەو بیركردنەوەیەی پاساو بۆ ئاینەكانی تر دەهێنێتەوەو نیشانەی دۆڕاندنی كەسایەتییە نموونەی هەیە لە وڵاتانی موسڵمانان. چەند ساڵێك لەمەوبەرو لەكۆڕێك نووسەرێكی لاو لە موداخەلەیەكی باسی بەزەیی ڕۆژئاوا دەكرد كە چۆن جەللاد (ئەوە ملپەڕاندنی خەڵكی جێبەجێ دەكرد) كاتێك بەو كارە هەڵدەستا هێندە دلگران دەبوو فرمێسك بە چاوی دەهاتە خوارەوە!! ئەو نووسەر عەقڵی ئەوەی نەبوو لەخۆی بپرسێت: كە ئەوەندە دلگران بوو كارێكی تر نەبوو بیكاتو واز لەو كارە بهێنێت؟ كاتێك مرۆڤ كەسایەتیی دۆڕاند عەقڵیشی لەگەڵ لەدەست دەدات.

بێبنەمایی ئەو بەراوردییەش کە وەرگێڕ لەنێوان ئەو قوربانیدانەو جەنگی موسڵمانان دەیکات ئاشکرایە چونکە کوشتار لە ئیسلام جەنگو ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمنەو ئەگەر دوژمن وازی هێنا موسڵمانانیش وازی لێدەهێنن: ((فاذا انسلَخَ الأَشْهُرُ الحُرُمُ فاقتلوا المُشْرِكِينَ حيثُ وجَدتُّمُوهُمْ وخذوهُمْ واحْصُرُوهُمْ واقعُدوا لهم كلَّ مَرْصَدٍ فإن تابوا وأَقاموا الصلاةَ وآتَوا الزكاةَ فخَلّوا سبيلَهُمْ إنَّ اللّهَ غفورٌ رحيمٌ)) لەکاتێك قوربانییە بەشەرییەکان قوربانیدان بە منداڵو کۆیلەو دیلی جەنگە واتە کوشتنی دوو جۆر مرۆڤە: دیلی جەنگو کەسانێك جەنگاوەر نین.

هەقیشە بپرسین: ئەگەر موسڵمانان قەسابخانەی بەکۆمەڵیان بۆ هیندییە ئەمەریکییەکانیان بکردایە ئایا وەرگێڕ بەو جۆرە باسی تاوانی قوربانیی بەشەری هیندییە ئەمەریکییەکانی دەکرد؟

وتمان وەرگێڕی کوردی باسی ڕۆژژمێرەکانی مایاو ئینکای کردووە. وەرگێڕ بەو داماوییەی خۆی پێشنیارێك بۆ مامۆستا داماوەکەی دەکات: من پێموایە دەبوو بەڕێز عبداللە عبدالفادی لەسەر ساڵژمێری گەلانی تر قسەی بکردایەو لەوێوە ڕەخنەی لە دەقی ئایەتەکەی بگرتایە بۆ نموونە لای (ئنکایی‌و مایاییەکان) ژمارەی مانگەکانی ساڵ (١٨) مانگەو ئەو چوار ڕۆژەی کە دەمێننەوە لە (٣٦٤) ڕۆژەکە بە ڕۆژە شوومەکانی ساڵ دەیانناساندن هەرچەندە (هندە سوورەکانی ئەمەریکا–وای نووسیوە) واتا (مایاییەکان) کە خاوەنی شارستانیەتێکی بەرز بوون ڕۆژەکانی ساڵیان بە (٣٦٥) ڕۆژ دانابوو... تا دوای قسەکانی (لاپەڕە ٢٤–٢٥).

دواییش هەر وەگێڕ خۆی دەنووسێت: دەکرێت باسی ئەوەش بکەین کە هندە سوورەکان سیستەمێکی تریان هەبوو کە ساڵەکەی ٢٠ مانگەو مانگی ١٨ ڕۆژە لەگەڵ پێنج ڕۆژی تاقانەو ئەمانە دەیانکردە ٣٦٥ ڕۆژی ساڵەکە (ل٢٥).

ئاشکرایە وەرگێڕ (یان ئەو کەسەی ئەو زانیارییانەی لێوە نەقڵ کردووە) ئەوەی یەکەمی لە سەرچاوەیەك وەرگرتووەو ئەوەی تر کە جیاوازیی هەیە لە سەرچاوەیەکی ترو ناڕێکییەکەی بە وشەی (دەکرێت) داپۆشیوە.

بەدەر لەوەی (هندە سوورەکان) نینو بەدەر لەوەی بەتەنیا مایا هیندیی ئەمەریکی نەبوون، زانیارییەکانی تر هەڵەو بێسەروبەرن. وەرگێڕ ڕۆژژمێری ئینکاییو مایایی تێکەڵ کردووە لەکاتێك ئەو دوانە دوورن لە یەك. زانیارییەکان سەبارەت بە ڕۆژژمێری ئینکا (لە وڵاتی پێرو لە ئەمەریکای باشوور) کەمنو هەموویان لەو تۆمارنووسە ئیسپانییە کەمانە وەرگیراون (سەدەی ١٦ و ١٧ی زاینی) و بەپێی ئەوان ساڵەکە ١٢ مانگ بوو بەڵام کێشە لەو باسانەی ئەوان هەیە بۆیە لێکۆڵەرەوەیەك دەگاتە ئەو ئەنجامەی ١٣ مانگ بوون نەك ١٢[٢٦٦] و تێکڕای ژمارەی ڕۆژەکانی مانگەکان دەوروبەری ٢٨ ڕۆژ بوو.[٢٦٧]

ڕۆژژمێری مایا (لە گواتیمالاو باشووری مەکسیكو شوێنی تر) هاوشێوەی هەیە لە ئەمەریکای ناوەڕاست وەك ئەوەی (ئەزتێك)و بەپێچەوانەی ڕۆژژمێری ئینکاییش کە زانیاری لەبارییەوە کەمە وردەکاریی زۆرتری لەسەرەو تەنانەت، وەك لێکۆڵەرەوەیەك دەڵێت، ئەو ڕۆژژمێرە بوو خەیاڵی جیهانی ڕاکێشابوو.[٢٦٨] لەو ڕۆژژمێرە ١٨ ماوە هەن هەر یەکێکیان ٢٠ ڕۆژە (نەك وەك وەرگێڕ نووسیویەتی ٢٠ مانگ هەر یەکێکیان ١٨ ڕۆژە)و پێنج ڕۆژی تر هەن بۆ ئەوەی ساڵەکە ببێتە ٣٦٥ ڕۆژ،[٢٦٩] ئینجا هەر یەك لە بیست ڕۆژەکە ناوی تایبەتیی خۆی هەیە.[٢٧٠] بەپاڵ ساڵی ٣٦٥ ڕۆژی ساڵی ٢٦٠ ڕۆژیش هەبوو کە لە ١٣ ژمارەی ڕۆژ (لە ١ تا ١٣)و

---

[266] **R. Tom Zuidema*, Calendars in South America*, in; Encyclopaedia of the History of Science, p.20 (Let. C).**
[267] **ibid, p.21.**
[268] **Tom Jones, *Calendars in Mesoamerica*, in; Encyclopaedia of the History of Science, p.13 (Let. C).**
[269] **ibid, p.14.**
[٢٧٠] بڕوانە سەرچاوەی سەرەوە (ل١٥) بۆ ناوەکانیان لەوەی مایاو لەوەی ئەزتێك.

٢٠ نـاوی ڕۆژ پێکهـاتبوو و بناغـەی سـرووتەکانو فالـّەکان... تـاد بـوو و زۆرتـرین گرنگیی هەبوو لە ژیانی ڕۆژانەی[٢٧١] ئەمەریکای ناوەڕاست.

ئەمە بەشێك بوو لە زانیارییەکان دەربارەی ڕۆژژمێرەکانی ئەو گەلانە ئەوەش قسە فرێدانی وەرگێڕ بوو.

## ٦-ئاودانی زەوییەکانی میسر بە باران

عبدالفادی کە کەسێکی میسرییەو پێویستە بەر لەهەموو کەسێك گرنگیی باران بـۆ میسر بزانێت ڕەخنەی ئەوە دەگرێت کە گوایە قورئـان وایزانیـوە میسـر بـە بـاران دەبووژێتەوە لەکاتێك میسـر بـارانی کەمـەو ژیـانی لەسـەر ڕوبـاری نیلـە. ئەمـەش ئایەتەکەیە لە سوورەتی یووسف:

((ثُمَّ يأتي مِن بعدِ ذلك عامٌ فيهِ يُغاثُ النَّاسُ وفيهِ يَعْصِرُونَ -یوسف:٤٩)).

باسەکە لە چیرۆکی یووسفە کە خەونەکـەی پادشـای بـەوە لێکدایـەوە کـە حـەوت سـاڵی بـەپیت دینو دوای ئـەوان حـەوت سـاڵ میسـر تووشـی قـاتوقڕی دەبێـتو ساڵەکەی دوای ئەوە باران دەبارێت. وەك وتم عبدالفادی دەڵێت ئەمـە پێچـەوانەی واقعە چونکە باران بـە کـەمی لـە میسـر دەبارێـتو پەیوەنـدیی نییـە بـە بـەپیتیی میسرەوە کە ئەوە بەهۆی لافاوی نیلەوەیە نەك باران.

* * * *

قسەکەی عبدالفادی ڕاستەو زانیارییەکی زانراوە کە کشتوکاڵ لـە میسـر پشـت بـە باران نابەستێ بە ڕوباری نیلەوە، بەڵام بەر لەهەموو شتێك ئایەتەکە دەڵێت (يُغاثُ النَّـاسُ)، فرمـانی (أغـاث)یـش واتـە فریایکـەوت یـان بـەهانای چـوو و ئایەتەکـە بەئاشکرایی باسی بارانی نەکردووە. بەڵام گریمان باسی باران کرابێت ئەوە هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێتو ئەنجام یەکە چونکە باران سەرچاوەی ڕوباری نیلە.

---

[271] ibid, p.14.

هەموو ساڵێك روباری نیل لە وەرزێكی دیاریكراو بەرزدەبێتەوەو ئەو لافاوە زەویی چواردەوری دادەپۆشێتو ئەو لافاوە ئاودێرییەكی سروشتییەو كاری مرۆڤی دەچێتە پاڵ كاتێك جووتیاران سوود لەو لافاوە وەردەگرن. بەڵام خودی لافاوەكە بەهۆی چییەوەیە؟ خۆ ئەگەر هیچ دەربارەی چۆنێتیی دروستبوونی لافاوەكە نەزانین بەڵكو ئەگەر تەنانەت هەر ئەوەندە بزانین كە میسر ڕوبارێكی هەیە بیركردنەوەیەكی قووڵی ناوێت تا بزانین ئەو ڕوبارە بەرهەمی بارانە كە هۆی ئاوی سەرچاوەكانێتی.

گومان لەوە نییە كە عبدالفادی زانیویەتی باران سەرچاوەی ئاودێریی میسرە، بەڵام باسكردنی ئایەتەكە بەو شێوەیە پەنابردنە بۆ درۆ، یانیش ئەگەر درۆكردن نەبێت هێندە لەسەر ئایەتەكە نەوەستاوە تا بزانێت چەند لەگەڵ واقع دەگونجێت كە ئەمەش كاری كەسانی دەمارگیرە كە لەئاست ئەو مەبەستەی خۆیان بیركردنەوەیان پەكی دەكەوێتو بە یەك ئاڕاستە دەچێت.

ڕوباری نیل كە لە دوو لق (لەگەڵ لقێكی بچووكتر لە باكوور[٢٧٢]) پێكدێت سەرچاوەی خۆی لەباران وەردەگرێت. دەریاچە گەورەكانی رۆژهەڵاتی ئەفەریقا سەرچاوە لقەكەی نیلن كە پێی دەوترێت نیلی سپی. ئەو دەریاچانە بارانی سەرەتای هاوینو پایز بەشێوەیەكی كاتی كۆدەكەنەوەو دوای چەند مانگێك بەتاڵی دەكەنەوە.[٢٧٣] ئەو لقە گیاو گەڵاو ماددەی ئۆرگانیی زۆر لە دارستانەكانەوە دەبات.[٢٧٤] بارانێكی زۆری هاوینیش لە حەبەشە سەرچاوەی لقەكەی ترە كە نیلی شینەو بەزۆری ئەمیان سەرچاوەی لیتەیە كە لەگەڵ خۆی دەیباتو دەیگەنێتە زەویی میسرو ئەو زەوییە هەموو ساڵێك بەپیت دەكات.

---

[٢٧٢] ج.هـ. بریستد، تاریخ مصر من اقدم العصور حتی الفتح الفارسي، ص١.

[273] **Karl W. Butzer, *Nile*, in; Oxford Encyclopedia of Ancient Egypt, Vol. 2, p.543.**

[٢٧٤] ف.زاماروفسكي، اصحاب الجلالة–الاهرامات، ص ١٢٠.

میسرییەکان سوود لەو لافاوە وەردەگرن بەوەی جۆگە هەڵدەکەنو پرد دروست دەکەن بۆ گرتنی ئاوی لافاوەکە، دوای دابەزینی ئاستی ئاوەکەش جۆگەکان بۆ ئاودێری بەکاردەهێنن.[٢٧٥]

سەرەتای لافاوەکە کە ئەو بارانە دەیهێنێت لە ١٨/١٧ی حوزەیران دەگاتە قاهیرەو ئاستەکەی بەرەبەرە بەرزدەبێتەوەو ڕەنگەکەی بەهۆی لیتەوە دەگۆڕێتو ئەمە تا ٢٦ی ئەیلوول بەردەوام دەبێتو پاشان دادەبەزێتو لەسەرەتای کانوونی دووەم دەگەڕێتەوە ئاستە کۆنەکەیو ڕەنگەکەشی وەکو خۆی لێ دێتەوە.[٢٧٦]

وەنەبێت ئەمە زانیارییەك بێت ئێستا زانرابێت، ئەوە لەکۆنەوە زانرابوو و ئەوەتا ئیبنو کەثیر (ساڵی ٧٧٤ك-١٣٧٣ زاینی مردووە) لە تەفسیری سوورەتی (المؤمنون) ئایەتی ١٨: ((وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاء مَاء بِقَدَرٍ فَأَسْكَنَّاهُ فِي الْأَرْضِ وَإِنَّا عَلَى ذَهَابٍ بِهِ لَقَادِرُونَ)) دەڵێت: خودا باران بەپێ پێویست دەبارێنێت" نە زۆر دەبێت زەویو ئاوەدانی تێکبداتو نە کەم دەبێت بەشی کشتوکاڵو بەروبووم نەکاتو تەنانەت ئەو زەوییانەی پێویستیان بە ئاوی زۆرەو بەرگەی باران ناگرن خودا ئاویان لە وڵاتی ترەوە بۆ دەهێنێت هەروەك زەویی میسر کە خودا کاتی باران لە وڵاتی حەبەشەوە ئاوەکەی بۆ دەهێنێت، ئەو ئاوەش بە قوڕێکی سوورەوە دێتو زەویی میسر ئاودەدات.[٢٧٧]

سەردەمی میسری فیرعەونیش بۆچوونی ئەفسانەیی هەبوو دەربارەی نیل وەك ئەوەی سەرچاوەکەی لەپشتی تاڤگەی یەکەمەوەیەو لە دوو ئەشکەوتی ژێر زەوییەوە دەردەچێت، خوداوەند (ئۆزیریس)شیان بە سەرچاوەی ئەو ڕووبارە

---

[٢٧٥] بڕوانە: بریستد، تاریخ مصر..، ص٤

[٢٧٦] زاماروفسکي، اصحاب الجلالة، ص ١٢٠.

[٢٧٧] تفسیر ابن کثیر، ج٥، ص٤٧٠.

دەزانیو هەرچەندە لە کاتی بنەماڵەی بیستوپێنجەوە[٢٧٨] دەیانزانی بارانەکانی سوودان پەیوەندییان بە لافاوی نیلەوە هەیە بەڵام ئەو باوەڕیان هەر مابوو کە سەرچاوەکەی لەپشتی تاقگەی یەکەمەوەیە.[٢٧٩]

## ٧-هەورەگرمە یەکێکە لە فریشتەکان

گوایە قورئان هەورەگرمە بە فریشتە دەزانێت. ئایەتەکەش دەهێنێتەوە:

((وَيُسَبِّحُ الرَّعْدُ بِحَمْدِهِ وَالملائكةُ مِنْ خِيفَتِهِ ويُرْسِلُ الصَّواعِقَ فيُصيبُ بها من يشاء وهم يُجادِلونَ في اللّهِ وهو شديدُ المِحالِ –الرعد:١٣)).

کوا ناوبردنی ئەو فریشتەیە؟

عبدالفادی وەکو جارەکانی تر تەفسیری بەیزاویو فەرموودەیەك دەکاتە ماڵ بەسەر قورئان:

بەیزاوی دەڵێت: لە ئیبنو عەبباسەوە" لە پێغەمبەریان پرسی دەربارەی هەورەگرمە ئەویش وتی: فریشتەیەکە هەوری پێ سپێردراوەو قامچی(مخاريق)ی[٢٨٠] ئاگر پێیە پاڵ بە هەورەوە دەنێت (بەیزاوی، ج٣، ص٣٢٢).

عبدالفادی ئینجا فەرموودەیەکی (ترمذي) دهێنێتەوە هەر لە ئیبنو عەبباسەوە: جوولەکە چوونە لای موحەممەدو وتیان پێمان بڵێ هەورەگرمە چییە؟ ئەویش وتی یەکێکە لە فریشتەکان هەوری پێ سپێردراوەو (مخاريق)ی ئاگری پێیە پاڵ بەو هەورەوە دەنێت بۆ ئەو شوێنەی خودا دەیەوێت. وتیان: ئەی ئەو دەنگە چییە کە

---

[٢٧٨] پێدەچێت یووسف لە سەردەمی هیکسۆس ژیابێت کە بنەماڵەی پانزەیەمە واتە نزیکی نۆ سەدە پێش بنەماڵەی بیستوپێنجەم.

[٢٧٩] د. سمير اديب، موسوعة الحضارة المصرية القديمة، ص٣٧٣.

[٢٨٠] وشەکە (مخاريق)ـە کە کۆی (مخراق)ـەو بە چەند واتایەك دێت، یەك لەوانە شمشێر، بەڵام لەوە بڵاوتر قامچیی پەڕۆیە ئەویش پەڕۆیە یان پۆشاکە منداڵان لوولی دەکەنو شەڕی پێدەکەن یان یەکتری پێدەترسێنن، بڕوانە، ابن منظور، لسان العرب، ج ١٣، ص١١٤٣.

دەبیسترێت؟ وتی: سەرزەنشتکردنێتی بۆ هەور تا ئەو کاتەی ئەو هەورە دەگاتە ئەو شوێنەی فەرمانی پێدراوە. وتیان: راست دەکەیت.[٢٨١]

عبدالفادی دەڵێت: ئێمەش دەپرسین: ئەگەر هەورەگرمە بریتی بێت لەو کارەبایەی لە پێکدادانی هەورەکان دروست دەبێت ئیتر بۆچی دەڵێت هەورەگرمە یەکێکە لە فریشتەکان؟

بەدەر لەوەی هەورەگرمە کارەباکە نییە بەڵکو تەوژمی هەوایە بەهۆی جیاوازیی پاڵەپەستۆکە پاش گەرمبوونەوەی هەوای ئەو شوێنە بەهۆی گەرمیی بروسکەوە" وەك دەبینین عبدالفادی تەفسیرێك دەکاتە ماڵ بەسەر قورئان، لەو تەفسیرەش و لە سونەنی (ترمذي)ش ڕوایەت دەهێنێتەوە و بێئەوەی باس لەوە بکات صەحیحە یان لاوازە یان هەڵبەستراوە ئینجا ئەو دوو ڕوایەتە (کە یەك ڕوایەتن) دەکاتە قسەی قورئان لەسەر ئەو دیاردەیە.

سەبارەت بە باسی هەورەگرمە کە فریشتەیە لێکۆڵینەوەیە لەبارەیەوە هەن وەك بۆ نموونە ئەوەی دوکتۆر (حاکم المطیري) کە رەتی دەکاتەوە، چ ئەو گێڕانەوەکەی (مەرفووع)ن، واتە ئەوانەی سەنەدەکەیان دەگاتە پێغەمبەر، کە دروست نین و چ ئەوانەی (مەوقووفن) واتە ئەوانە سەنەدەکەیان دەگاتە صەحابییەکە کە قسەی زۆر لەسەر سەنەدەکەیان هەیە.[٢٨٢]

---

[٢٨١] وەرگێڕی کوردی لەدوای وەڵامی جوولەکەکە: (ڕاست دەکەیت) نیشانەی پرسیاری داناوە. کەسێك ئەو نیشانەیە بەهەند وەربگرێت وا دەزانێت جوولەکە گومانیان لە وەڵامەکەی پێغەمبەر هەیە بەڵام ڕاستەکەی ئەوەیە ئەوان پشتگیریی وەڵامەکەی ئەویان کردووە. ئینجا ئایا دانانی نیشانەی پرسیار هەڵەی چاپە یان بەمەبەست بووە یان نەزانیی وەرگێڕە؟

[282] http://www.dr-hakem.com/portals/Content/?info=TlRRNUpsTjFZbEJoWjJVbU1RPT0rdQ==.jsp

لیکۆڵینەوەیەکی تری دوورودرێژیش هەیەو کورتەکەی ئەوەیە روایەتە (مرفوع)ـەکان صەحیح نین و روایەتە مەوقووفەکانیش صەحیح نین بەڵام هەیانە صەحیحن و دەگەڕێنەوە بۆ (کەعبولئەحبار) کە زانایەکی جوولەکەیەو سەردەمی عومەر کوڕی خەتتاب یان پێشتر ببووە موسڵمان و شتی زۆری ئیسرائیلیات لەوەوە وەرگیرابوون. باسی هەورەگرمەش تێکەڵ بە باسی تر کراون کە لە فەرموودەی صەحیح هاتوون:

ئـەوەی خۆشـە عبـدالفادی کـە ریوایەتەکـەی (ترمـذي)ی هێنـاوە قسـەی لەسـەر جوولەکە نەکردووە کە باوەڕیان بەوە کردووە خۆ ئەگەر هەڵـە لـە قورئـان هـەبێت هەڵە لەزانیارییەکانی زاناکانی جوولەکەش هەیە کە سەرچـاوەکەیان تـەورات بـوو، بەڵام کاتێك مرۆڤ مەبەستی چاڵ هەڵکەندن بێت ئاگای لەوە نەبێت کەی دەکەوێتـە ناو چاڵەکەی خۆیەوە.

## ٨-دۆڵی تووا

لەمیانەی قسەی خودا لەگەڵ مووسا ئەمە هاتووە:

((إِنِّي أَنَا رَبُّكَ فَاخْلَعْ نَعْلَيْكَ إِنَّكَ بِالْوَادِ الْمُقَدَّسِ طُوًى –طه: ١٢)).

هەروەها لە النازعات هەیەو عبدالفادی نەینووسیوە:

((إِذْ نَادَاهُ رَبُّهُ بِالْوَادِ الْمُقَدَّسِ طُوًى –النازعات: ١٦)).

عبدالفادی دەڵێت موفەسیرە موسڵمانەکان وتوویانە تووا (طُـوی) نـاوی دۆڵەکەیـە بـەڵام بـەپێی تـەورات مووسـا مـەڕەکانی (یـەثـرون)ی[٢٨٣] دەلەوەڕانـد، کـە کـاهنی (میدیەن–میدیان)و خـەزووری بـوو ئینجـا چـوو بـۆ لای (حۆرێـب)، چـیای خـوداو فریشتەی خوداوەند بەگڕێکەوە لـەناو تـووتڕك دەرکـەوت.. تـاد. عبـدالفادی دوای باسی ئەوە دەڵێت: ئەگەر مووسـا لـە چـیای حۆرێـب بووبێـت ئـیتر قورئـان نـاوی (تووا)ی لەکوێوە هێنا لەکاتێك حۆرێب ناوی کێوێکی ناودارە لە (سینائـ)؟

عبدالفادی ناوی بەیزاویی نەبردووە بۆ ئەوەی سەرچاوەکە بـە نادیـاری بمێنێتـەوە ئەگینا بەیزاوی جگە لـە تەفسـیری وشـەکە وەك نـاوی دۆڵەکـە تەفسـیری تریشـی وتووە کە تووا ناو نییـە (ج٤، ص٤٣). لـە تەفسـیرکانی تـریش هـەروەها بـەو دوو

http://www.ahlalhdeeth.com/vb/showthread.php?t=134442

[٢٨٣] بـەپاڵ ئـەو نـاوەی خـەزووری مووسـا بـە دوو شـێوەی تـر هـاتووە، بڕوانـە پرسـیارە مێژووییەکان، پرسیاری: مارەیی ژنەکەی مووسا.

جۆرە باس کراوە، بۆ نموونە ئیبنو کەثیر بەڵام دەڵێت تەفسیری یەکەم، کە ناوی دۆڵەکەیە، راسترە،[٢٨٤] ئەوەش گونجاوترە بۆ ئایەتەکە.

لەلایەکی ترەوە ئێمە دوو ناومان هەیە بۆ دوو شوێن نەك بۆ یەك شوێن، یەکەمیان ناوی چیایە (=حۆرێب)و ئەوەی تر ناوی دۆڵە (=تووا) کەواتە ڕەخنەکە لەجێگەی خۆی نییە، بەتایبەتیش کە باسەکە لە تەورات ناڵێت چۆتە سەر چیاکە بەڵکو چوو بۆ چیاکە (خروج٣: ١)، کە دەکرێت ئەو شوێنەی لێی بوو دۆڵێکی نزیك چیاکە بووبێت. تەنانەت ئەگەر ناوی ناوچەکەش حۆرێب بێت پێویستە ڕاستییەك دەربارەی ناوە کۆنەکان بزانین ئەویش کە ژمارەی ناوە جوگرافییە فەوتاوەکان زۆرترن لەو ناوانەی ماونەتەوە، هەروەها ناوی شوێنەکان لە دۆڵو چیاو ڕووبار دەگۆڕێنو هەر سەردەمێك ناوێکیان هەیە جگە لە ژمارەیەك ناو کە ئەسڵە کۆنەکەیان دەپارێزن.

لە مێژووی کوردستان هەزاران ناو فەوتاون کە ناوی ڕووبارەکانو شارەکانو گوندەکانو چیاکانن. ئەگەر ئێستا یەك ناومان هەبێت بۆ دۆڵێك ئەوا کاتی خۆی ناوێکی تری هەبووە، لە سەردەمی لەوە کۆنتریش دۆڵەکەی ناوێکی کۆنتری هەبووەو تەنها بەشێك لەو دۆڵانە ناوی کۆنیان پاراستووە. بۆ نموونە ناوی شارێکی کۆنی ناودارمان لە باشووری ڕۆژئاوای کەرکووك هەیە کە شوێنەوارەکەی ئێستا پێی دەوترێت (یورغان تەپە)و لە ناوەڕاستی هەزاری دووەمی پێش زاین ناوەکەی (نوزی) بوو، بەڵام پێشو ئەوەو لە سەردەمی ئەکەدی کە سەدان ساڵ پێشتر بوو ناوەکەی (گاسور) بوو.

لەو ناوانە جوگرافییە کۆنانە تەنها کەمێکیان دەزانین ئەوانەشن کە لە نووسراوە کۆنەکان هەن وەك ناوی (زاموا) بۆ ناوچەی پارێزگای ئەمڕۆی سلێمانی یان (ئارراپخا) بۆ کەرکووك هەروەها ژمارەیەك ناوی چیاو ڕووبارو شارو گوند. بەشێکیش لەمانە تا ئێستا ماونەتەوە وەك کێوی (کوللار) کە لە نووسینەکانی

---

[٢٨٤] تفسیر ابن كثیر، ج٥، ص٢٧٦–٢٧٧.

پادشایانی ئاشور هاتووەو بریتییە لە زنجیرەی ئاسۆس–کێوەڕەش‌و کە تا ئێستا لە یەك شوێن ناوی ماوەتەوە ئەویش لە بەشی باشووری زنجیرەکە بەناوی (کۆلارە) یان چیای ئەزمڕ کە کۆن (ئازیرو– رەنگە ئەسڵەکەی ئازیر بێت) بوو.

خوێنەرە مەسیحییەکانی عبدالفادی کە وا دیارە کتێبەکەی خۆی بۆ ئەوان نووسیوە بەرەوڕووی ئەو گومانە دەبنەوە کە نازانرێت چیای حۆرێب کام چیایەیە چونکە ئەو ناوە ئێستا وجوودی نییە بۆیە دیارە عبدالفادی دەیەوێت بڵێت: ئەوەتا قورئانیش باسی دۆڵی تووا دەکات کە وجوودی نییەو لەگەڵ حۆرێب لێی تێکچووە.

بەڵام ئایا چیاکە بەڕاستی ناوی حۆرێب بوو؟ کێشەیەك لەو چیایە هەیە چونکە لە بەڵگەنامەی (ئێلۆهیمی)و بەڵگەنامەی (تەثنەوی) چیاکە ناوی حۆرێبە بەڵام لە بەڵگەنامەی (یەهوەهی)و (کەهەنووتی) ناوی (سینا)یە.[٢٨٥]

زانیاریی زۆر کەمیش هەن بۆ ئەوە بتوانرێت چیا پیرۆزەکە دەستنیشان بکرێت کامەیەو ئەو باسانەی پێنج کتێبی یەکەمی پەیمانی کۆن وا دەکەن موستەحیل بێت شوێنەکەی دەستنیشان بکرێت.[٢٨٦]

بۆ تەواوکردنی ئەو بەشەش خراپ نییە ئەگەر باسێکی کورتی هەڵەکانی وەرگێر بکەین:

عبدالفادی دەڵێت مووسا چووە پشتی دەشتایی یان چۆڵەوانی (ماوراء البریة)، وەرگێڕیش، کە (تووا) دەکاتە (تەوا)، وایزانیوە باسی ئاوەدانی کراوە بۆیە دەڵێت: پشتی ئاوەدانی. عبدالفادی دەڵێت: چیای خودا حۆرێب (جبل الله

---

[285] Ora Lipschitz, S. David Sperling, *Mount Sinai*, in; Encyclopaedia Judaica, vol.18, p.627.

لێکۆڵەرەوان چوار سەرچاوەیان بۆ پێنج کتێبە یەکەمەکەی پەیمانی کۆن (واتە تەورات) دەستنیشان کردووە کە ئەوانەی سەرەوەن‌و ئەوانە بەلای کەمەوە لە سەدەی شەشەمی پێش زاین کۆکرانەوەو پێکەوە ئەو پێنج کتێبانەیان پێکهێنا کە ئێستا لەبەردەستمان: ستیفن م. میلر، روبرت ف. هوبر، تاریخ الکتاب المقدس ص٢٩.

[286] *ibid*, p.628.

حوريب)، وەرگێڕیش دەڵێت: چیای (ئەڵلا حورەیب)، واتە جگە لە هەڵەی ناوی چیاكە (حورەیب لەجیاتی حۆرێب) وایزانیوە (الله حوريب) ناوی چیاكەیە. عبدالفادی باسی قسەكردنی خودا لەگەڵ مووسا دەكات كە مووسا فریشتەی خودای بەگڕێكەوە لەناوەڕاستی درەختی تووتركەوە[٢٨٧] دەركەوت، ئینجا خودا قسەی لەگەڵ كرد، وەرگێڕی كوردیش وشەی تووترك بە عەرەبی (واتە: علّیقة) نەزانیوەو وایزانیوە ئەمە وشەیەكە پەیوەندیی بە هەڵواسین (علّق) هەیە بۆیە دەنووسێت: لەوێ ((لە شێوەی بڵێسەی ئاگر بەهەڵواسراوی فریشتەی خوداوەندی بۆ دەركەوت))!! ئیتر نازانین كامیان هەڵواسرابوو" مووسا یان فریشتەكە!

## ٩-زەیتوون لە چیای سینا

((فَأَنشَأْنَا لَكُم بِهِ جَنَّاتٍ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ لَّكُمْ فِيهَا فَوَاكِهُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ * وَشَجَرَةً تَخْرُجُ مِن طُورِ سَيْنَاء تَنبُتُ بِالدُّهْنِ وَصِبْغٍ لِّلْآكِلِينَ -المؤمنون:١٩-٢٠)).

عبدالفادی دەڵێت: موفەسیرەكان وتوویانە مەبەست لە درەختەكە زەیتوونە ئینجا دەپرسێت: بیابانی سینا بە درەختی زەیتوون ناسراو نییە، باشتر نەدەبوو فەڵەستین ناوبەرێت كە زەیتوونی هەیە نەك سینا كە هێندە بێ بەروبووم بوو خودا لە ئاسمانەوە گەزۆ (مەن)ی بۆ بەنو ئیسرائیل ناردبوو؟

بەواتایەكی تر عبدالفادی دەڵێت ئەگەر زەیتوون لە سینا هەبووایە خودا گەزۆی بۆ بەنو ئیسرائیل نەدەباراند، ئێمەش دەڵێین بێگومان زەیتوونی ناوچەكەو ناوچەكانی دراوسێش، بەشی ئەو خەڵكەی نەدەكرد كە بەپێی كتێبی دەرچوون شەش سەد هەزار پیادە بوون جگە لە ئافرەتانو منداڵانو ژمارەیەكی زۆری

---

[٢٨٧] بە عیبری لە كتێبی دەرچوون: סְּנֶה بە عەرەبی علّيقة، بە ئینگلیزی bush. درەختێكی دڕكاوییەو بە كوردی درەختی تووتركە، بڕوانە ئەم سەرچاوەیە بۆ باسی ئەو درەختە، هەروەها ئەو قسەیەی كە درەختەكە لە سینا نییە بۆیە بە درەختی لە جۆی ئاكاسیا زانراوە:
Norman McLean, *Bush*, § 1, in; Encyclopædia Biblica, vol. I, col. 614.

بێگانــە، ئــەوەش جگــە لــەوەی زەیتــوون پێویســتی بــە ئــاو و کــاتی زۆرە بــۆ خۆشکردن. ئەمەش بە کەمێك بیرکردنەوە، کە دیارە ڕەخنەگر ئەو بڕە کەمەشی نییە، مرۆڤ دەیزانێت.

عبـدالفادی کـە پشـت بـە بـەیزاوی دەبەسـتێت ئـەمجارەش پشـتگوێی دەخـاتو بەگشتی باسی موفەسیرەکان دەکات بۆ ئـەوەی قسـەکەی تـری ئـەو موفەسـیرانە بشـارێتەوە کـە یـەکێك لـە قسـەکان سـەبارەت بـە کێوەکـە ئەوەیـە کێوێکـە لـە فەڵەستینە (ج٤، ل ١٥١).

بەهەر حاڵ ئەوەی گونجاوە درەختەکە زەیتوون بێت، زەیتوونیش لە سینا هەیـە، قورئانیش باسی هەموو سینای نەکردووە بەڵکو کێـوی سـینا، بۆشـی هەیـە کـاتی خۆی داری زەیتوون لەوێ زۆربووبێت وەك چۆن چیای زەیتوون لـە فەڵەسـتین کـە کەمتر بەردەڵانە لەچاو کێوەکانی نزیکیو کاتی خۆی دەوڵەمەنـد بـوو بـە ڕووەكو بەتایبــەتی زەیتــوون بــەڵام ژمارەیــان زۆر کەمبۆتــەوە (ئەمــە قســەی ســاڵی ١٩٠٢ـە).[٢٨٨] ڕووبەری ئەو زەوییانەش کە بـە زەیتـوون چـێنرابوون تەنانـەت دوای ئەو ساڵەش ڕووەو کەمبوون چووبوون وەك چـۆن باسـکراوە کـە لـە دروسـتبوونی دەوڵەتی ئیسرائیلەوە ڕووبەرەکە لـە کەمبوونەوەیـە (ئامـاری سـاڵەکانی ١٩٥٩ تـا ١٩٦٩).[٢٨٩]

هەبوونی زەیتوون لەناو بەردەڵانەکان لە کتێبی تەثنیە (کتێبی پێنجـەمی تـەورات) وەك یەکێك لە نیعمەتەکانی خودا بەسەر بەنو ئیسرائیل باس کراوەو لەسەر زمانی مووسا هاتووە: زەیتی دەدەمێ لە بەردە ئەستێ (تثنیة٣٢: ١٣)، واتە زەیتوون لە ناوچە شاخاوییەکانو تەنانەت لەناو بەردیش زیاد دەکات.[٢٩٠]

---

[288] **Lucien Gautier, *The Mount of Olives*, in; Encyclopædia Biblica, vol. III, cols. 3498-9.**

[٢٨٩] بڕوانە:

**Shaked Gilboa, *Olive (In Israel)*, in; Encyclopaedia Judaica, vol.15, p.407.**

[290] **Jehuda Feliks, *Olive*, in; Encyclopaedia Judaica, vol.15, p.406.**

# ١٠-ڕۆشتنی خۆر

((وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ – یس: ٣٨)).

عبدالفادی تەفسیری بەیزاوی دەهێنێتەوە کە پێویست ناکات لێرە نەقڵی بکەین چونکە ئەوەی گرنگە تەعلیقی عبدالفادی لەسەر باسی جووڵەی خۆر. ئەو دەڵێت: خۆر جێگیرەو بەدەوری خۆی دەخولێتەوەو لەو شوێنەی ناجووڵێتو زەوی خۆی بەدەوری خۆر دەسووڕێتەوە ئیتر چۆن قورئان دەڵێت خۆر دەڕواتو بەرەوە شوێنێکی جێگیربوونی دەجووڵێتەوە؟

وەڵامی ئەوە زۆر بەکورتی دەدرێتەوە: زانیارییەکانی عبدالفادی زۆر کۆنن چونکە ئەوەی ئێستا زانراوە کە خۆرو سەرجەمی سیستەمەکە (خۆرو هەسارە وابەستەکانی) دەجووڵێنو بەدەوری چەقی مەجەڕەی کاکێشان دەخولێنەوە. کەواتە خۆر وەستاو نییەو دەجووڵێتەوە. مەبەستیش لە شوێنێکی جێگیربوونی خۆر یان وەستانی ئەو جووڵەیەیە بەهەر هۆیەك بێت، یانیش وەستانی لەکاتی ڕوودانی قیامەت کە یەکەمیان بابەتی زانستی فەلەکەو کاری ئەو زانستەیە ئەوە ئاشکرا بکاتو دووەمیان زانیارییەکە لە قورئان هەیەو پەیوەندیی بە قیامەتەوە هەیەو ڕەنگە زانستی فەلەك بتوانێت تیۆرێك لەو بارەوەیە، واتە تێکچوونی گەردوونو چارەنووسی خۆرو زەوی، تەرح بکات.

سەبارەت بە خوێندنەوەی (لا مستقر لها) لەجیاتی (لمستقر لها)، کە عبدالفادی لە بەیزاویی نەقڵکردووە، واتە لەجیاتی ئەوەی خۆر بجووڵێتەوە تا دەکاتە شوێنی جێگیربوون (لمستقر لها) خوێندنەوەکە (لا مستقر لها) واتە خۆر دەجووڵێتەوەو وەستانی نییە.. عبدالفادی ئەوە دەکاتە ڕەخنە کە هەبوونی خوێندنەوەی جیاوازی ئایەتەکە بەجۆرێك واتاکە بگۆڕێت واتای ئەوەیە قورئان دروست نییە.

ئەو ڕەخنەیە لە جێگەی خۆی نییە چونکە ئەگەر دوو خوێندنەوە هەبنو هەریەکێکیان واتایەکی هەبێت ئێمە دوو حاڵەتمان هەیە: دوو واتاکە دژ بەیەك

نەبن کە ئەمە کێشە نییە، حاڵەتی دووەمیش دوو واتاکە دژ بە یەك بن وەك حاڵەتی ئێستا ئەو کاتەش پێویستە یەکێك لە دوو خوێندنەوەکە ڕاست بێت ئەوەش ئەگەر بەڕاستی دژ بە یەك بن کە گومانم هەیە وا بێت لەبەر ئەوەی واتای هەردوو خوێندنەوەکە ڕاستن: یەکەمیان ڕاستە چونکە ڕۆژێك دێت جووڵەی خۆر بوەستێت، دووەمیشیان ڕاستە چونکە لە ئێستاوە تا ئەو کاتە خۆر بەردەوام لە ڕۆشتنەو وەستانی نییە.

## ١١-شێوەی مانگ

((وَالْقَمَرَ قَدَّرْنَاهُ مَنَازِلَ حَتَّى عَادَ كَالْعُرْجُونِ الْقَدِيمِ * لَا الشَّمْسُ يَنبَغِي لَهَا أَن تُدْرِكَ الْقَمَرَ وَلَا اللَّيْلُ سَابِقُ النَّهَارِ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ - يس: ٣٩-٤٠)).

عبدالفادی تەفسیر بەیزاوی دەهێنێتەوە کە ڕۆشتنەکە چەند مەنزڵگایەکە کە بیستوهەشتن‌و ناویان دەهێنێت، هەر شەوێکێش دادەبەزێتە یەکێکان‌و نە تێی دەپەڕێنێت‌و نە لێی بەجێدەمێنێت ئینجا کە دەگاتە دوایەمین مەنزڵگا باریك دەبێتەوەو دەبێتە کەوانەو (عرجون) واتە (شمراخ)ی کۆن،[٢٩١] نە خۆر بۆی هەیە بگاتەوە بە مانگ لە خێرایی ڕۆشتن‌و نە شەو پێش ڕۆژ دەکەوێت‌و هەموویان لە فەلەکێك مەلە دەکەن واتا بە تەختی بەناو ئەو فەلەکە دەڕۆن (بەیزاوی، ج٤، ص٤٣٤).

بەیزاوی بە کەمێك درێژتر ئەوانەی سەرەوە دەنووسێت بەڵام بەهەر حاڵ نازانین پرسیارەکەی عبدالفادی چییەو لە چی ناڕازییە. ئەو تەنها ئەو تەفسیرەی نەقڵکردووە. وەرگێڕی کوردی لای خۆیەوە ئەوەی ڕوونکردۆتەوە کە بەپێی ئەو دوو ئایەتە زەوی چەقی گەردوونەو هەموو تەنە ئاسمانییەکان بەخۆریشەوە لە

---

[٢٩١] عرجون هێشووی خورمایە یان هێشووی خورمای وشکە یاخود ئەو لاسکە ئەستوورەیە کە هێشووی خورما هەڵدەگرێت: لسان العرب، ج٣٢، ص ٢٧٨١ بەڵام وەرگێڕی کوردی دەنووسێت: قەدی دارخورما.

رووتەختێکی بازنەیی بەدەوری زەوی دەسوورێنەوە بەڵام هەموویان لە هەمان ڕووتەخت نین (لاپەڕە ٢٩). بەڵام کێ باسی تەختیی کردووە؟ ئەوە تەفسیری بەیزاوییە نەك ئایەتەکەی قورئانە کە وا دەڵێت. ئایەتەکە وەك ئایەتی تر باسی (فەلەك) دەکات، کە لە زمانی عەرەبی، بەدەر لەو واتا فەلەکییەکان کە پێی دراون، چەند واتایەکی هەیە کە زۆریان لەدەوری واتای (خڕی) دەخولێنەوە.[٢٩٢]

وەرگێڕی کوردی بۆ باسی ئایەتەکە کە شەو پێش ڕۆژ ناکەوێت باسی ناوچەکانی باکووری فنلەنداو نەرویجو ئالاسکا دەکات کە هەڵهاتنو ئاوابوونی خۆر لە کاتی نیوەشەو دەبینن (ل٣٠). بەڵام نیوەشەو چییە؟ ئەی شەو خۆی چییە؟ ئێمە شەو بەو کاتە دەڵێین کە ئاسمانی تاریکمان لێوە دیار دەبێت، بە سەعاتی دیاریکراوی ڕۆژەکەش دەڵێین شەو، بەڵام سەعاتەکان ڕێککەوتنی خۆمانە بۆ ئەوەی بە زمانی ژمارە قسە بکەینو باشتر لەیەکتر تیبەگەین، ئیتر با لە هەر شوێنێکی زەوی سەعات ژمارەیەك بخوێنێت، ئەوە بەپێی زاراوەی خۆمان شەوە ئەگینا شەو لە ئەسڵ تاریکییە ئیتر با ئەو تاریکییە شەش مانگیشی پێ بچێتو با ئەو کاتەی کە بە حساب شەوە خۆر ببینرێت" لەبەر ئەوەی خۆر دەبینرێت کەواتە ڕۆژە. شەو و ڕۆژیش ئەوانەن کە لەسەر زەوی هەن، ئەگەر ئێرە ئێستا شەو بێت نیوەکەی تری گۆی زەوی ڕۆژە.

## ١٢-کێوی قاف

ئەمەش گوایە کێوێکە چواردەوری هەموو زەوییی داوە.

عبدالفادی هیچی دەستناکەوێت لە تەفسیری بەیزاوی (بڕوانە کە تەنانەت بەیزاویش ئەو حیکایەتانە نەقڵ ناکات) پشت بە کتێبی (عرائس المجالس!!)[٢٩٣]

---

[٢٩٢] بڕوانە، ابن منظور، لسان العرب، م٥، ص٣٤٦٤-٣٤٦٥.

[٢٩٣] عرائس المجالس لە نووسینی الثعلبي پڕە لەخورافەتو ئەو چیرۆکە لەناو قسەیەکی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب هەیەو گێڕانەوەکە بێ سەنەدە: الثعلبي، عرائس المجالس، ص٥.

دەبەستێت بۆ تەفسیری پـیتی (ق) لـەو سـوورەتەی هـەمان نـاوی هەیـە، ئەمـەش حیکایەتەکەیە:

خودا کێوێکی گەورەی دروست کرد لە یەك (زەبەرجـەد)[٢٩٤]ی سـەوز کـە سـەوزایی ئاسمان هی سەوزیی ئەوە. بەو کێوە دەوترێت قـاف چـواردەوری هـەمووی داوەو ئەوەشە کە خودا سوێندی پێ خواردووەو فەرموویەتی: ق والقران المجید.

ئینجا باسی کتێبی (قصص الانبیاء) دەکات کە ئەمەی تێ هـاتووە: عبـدالله کـوڕی سەلام پرسیاری لە موحەممەد کرد: بەرزترین لوتکەی سـەر زەوی چـییە؟ ئـەویش وتی: کێوی قافە، وتی: ئەو کێـوە چـییە؟ وتـی: لـە زومڕودیـی سـەوزەو سـەوزیی ئاسمان لەوەوەیە. وتی ئەی پێغەمبەری خـودا راسـتت کـرد، ئـەی بـەرزیی کێـوی قاف چەندە؟ وتی سەفەری پێنجسەد ساڵە وتی ئەی ئەو ماوەیە چەندە کـە مـرۆڤ بەدەوری هەمووی دەڕوات؟ وتی سەفەری دوو هەزار ساڵە.[٢٩٥]

ئەو بەشەی ڕەخنەکەی عبدالفادی تەواو بوو (لەخوارەوەش قسە لەسەر بەشەکەی تری دەکەین). ئینجا نۆرەی ئێمەیە بپرسین: ئەمە قسانە شایەنی ئەوەن وەڵامیان بدرێتەوە؟ قسـەکان خۆیـان خۆیـان بەدرۆدەخەنـەوە چـونکە باسـەکە دەربـارەی قورئانە کە گوایە مەعسووم نییە کەچی وەکو پرسیارەکانی پێشـوو تەفسـیری بـۆ دەهێنرێتەوە.

بزانین ئیبنو کەثیر چۆن باسی قاف دەکات:

دەگێڕنەوە لە هەندێ سەلەف کـە (ق) کێوێکـە چـواردەوری هـەموو زەویـی داوە، لەوەش دەچێت ئەمە لە خوڕافەکانی ئیسرائیلییەکان بێت کە هەندێ خـەڵك لێیـان وەرگرتوون کاتێك بینیان ئـەو شـتانەی کـە ئیسـلام نـە پشـتگیرییان دەکـاتو نـە بەدرۆیان دەخاتەوە جـائیزە لـە جوولەکـە وەربگیرێـنو بـاس بکـرێن. بەبۆچـوونی

---

[٢٩٤] جۆرە بەردێکی گرانبەهایە.

[٢٩٥] نەینووسـیوە سەرچـاوەکە هـی کێیـە، هـی هـەر کەسـێکیش بێـت ئاشـکرایە وەکـو ئـەوەی پێشووە.

خۆشم (واتە ئیبنو کەثیر) ئەمەو هاوشێوەکانی دروستکراوی هەندێك زندیقی ئیسرائیلییەکانن کە دین لە خەڵکی تێکەڵدەکەن.. ئینجا دەڵێت: فەرموودەی پێغەمبەریش ((شت بگێڕنەوە لە بەنو ئیسرائیلو هیچ ئیحراجییەکیش نییە)) بۆ شتێکە عەقڵ قبووڵی بکات.[٢٩٦]

بەم جۆرە ئیبنو کەثیر چۆن ئەو درۆیەی داوەتە پاڵ زندیقەکانی جوولەکە کەچی عبدالفادی بە پێنووسی خۆی ئەوە نەقڵ دەکات کە قسەی فلانو فیسارەو هێشتا دەیداتە پاڵ قورئان.

عبدالفادی دوای قسەکەی سەرەوەی دەڵێت: سەرچاوەی چیرۆکی کێوی قاف ئەوەیە کە لە کتێبی یەکێك لە جوولەکەکان هاتووە کە پێی دەوترێت (حکیکاە)، بەشی ١١ فەسڵی ١، لە تەفسیری وشەی عیبری (تو هو) کە بەدەگمەن بەکاردێتو واتاکەی فەزاو بۆشاییە. لە سیفری تەکوینیش (٢:١) هاتووە. کتێبی حکیکاە دەڵێت: ((تو هو ئەو هێڵە سەوزەیە کە چواردەوری هەموو جیهانی داوەو لەوەوە تاریکی دەردەچێت)). بەم جۆرە وشە عیبرییە وەرگێڕدراوەکە واتە (هێڵ) بریتییە لە (تاو). کاتێکیش صەحابییەکان، هێشتا ئەمە قسەی عبدالفادییە، بیستبوویان نەیانزانیبوو کە واتاکەی (هێڵ)ـە بەڵکو لێیان تێکچووبوو و وایانزانیبوو زنجیرە چیایەکی گەورەیە ناوی قافە. ئیتر چۆن قورئان ئەوەی پێی دەڵێین ئاسۆ (کە هێڵێکی وەهمییە) بە کێوێکی ڕاستەقینە دەزانێت؟

بینیمان عبدالفادی دەڵێت ئەسڵی باسی کێوی قاف لە کتێبێکی کەسێکی جوولەکە هاتووە کە ناوی (حکیکاە)ـە. ڕاستەکەشی ئەوەیە حەگیگاە کتێبێکی سەربەخۆ نییەو هی کەسێکی جوولەکە بەتایبەت نییە بەڵکو بەشێکە لە تەلموود. تەلموود پێنج بەشەو هەر بەشێك ژمارەیەك باسە، کۆی باسەکانیش ٦٣ باسن.[٢٩٧]

---

[٢٩٦] تفسير ابن كثير، ج٧، ص٣٩٤.

[٢٩٧] تەلموود תַּלְמוּד بریتی بوو لە ڕاڤەکردنی تەورات بە وتە نەك بە نووسین، کە باوەڕی جوولەکەش وایە ئەو ڕاڤەکردنە وەکو تەورات خودا دابووی بە مووسا بەڵام بەشێوەی دەمی.

حەگیگاه חֲגִיגָה دوایەمین باسی دووەمینە بەشە کە بەو بەشە دەوترێت مۆعێد מוֹעֵד واتە فیستیڤاڵەکان. حەگیگاهیش بریتییە لە بەخشینەکانی فیستڤاڵەکانو پەیوەستە بە جەژنی دەرچوون لە میسرو[٢٩٨] بەخشینی قوربانیی خۆبەخشانە هەر کەسێك بۆخۆی،[٢٩٩] کە ئاهەنگ گێڕان بە دەرچوون لە تەورات باسکراوە، هەروەها پەیوەستە بە دوو جەژنی تریشەوە.[٣٠٠]

سەبارەت بە تۆهوو תֹהוּ کە عبدالفادی بە (تو هو) [٣٠١] ناوی دەباتو دەڵێت لە حەگیگاه بە هێڵی سەوز ناوبراوە" باسی هێڵی سەوز لەو شوێنەی حەگیگاه دێت

---

دواتریش کە ڕاڤەکردنەکان زۆر بوون ئەوانە نووسرانەوە. ئەو نووسینە دوروبەری ساڵی ٢٠٠ی زایینیو بۆ پاراستنی لەلایەن رابی یەهوودا هەناسی (یەهوودای ناسی)یەوەو بەهاوکاریی زانای تر دەستی پێکردو ئەمەیان بەشی یەکەمی تەلموود پێکدەهێنێت واتە (میشناه)، لەدوای ئەوەش موناقەشەی زۆر لەسەر میشناه کران کە وردەکارین لەسەر شەریعەتو راڤەکردنو چیرۆكو ئامۆژگاریو مێژوو کە بەو بەشە وترا گەمارا גְּמָרָא (لەوە بەدوا تا دەوروبەری ٥٠٠ ی زایینی). دوو تەلموودیش هەن: تەلموودی ئۆرشەلیمی (یەروشالمی) کە دەوربەری ٤٥٠ی زایینی نووسینەوەی کۆتایی پێهاتو تەلموودی بابلی کە سەدەیەك دوای ئەوە لە وڵاتی بابل نووسینەوەی کۆتایی پێهاتو ئەمەیان درێژترەو تەلموودە قانوونییەکەیە: ستیفن م. میلر، روبرت ف. هوبر، تاريخ الكتاب المقدس، ص١١٤–١١٥، بەکورتیش لەبارەی میشناه و گەمارا:
**A. W. Streane, A Translation Of The Treatise Chagigah from The Babylonian Talmud, pp. 148-9, p.150.**
هەردوو تەلموودەکە بەشێوەی حیوار داڕێژراون بەشێوەی پرسیارو وەڵام یان ئیعترازو وەڵامدانەوە.

[٢٩٨] جەژنی پێساح (فصح بە عەرەبی) ، بڕوانە بەشی مێژوویی. جیاوازی لەبارەی واتای وشەکەوە هەیەو لێرە بەستوومانەتەوە بە ڕووداوەکەوە.

[299] **A. W. Streane, *op. cit.*, p. 147.**

[300] **ibid., p. 147 n3.**

[٣٠١] لە کتێبی تەکوین، یەکەم کتێبی تەورات، تۆهوو و بۆهوو תֹהוּ וָבֹהוּ هاتووە کە وسفی زەوییە سەرەتای دروستبوونی، واتاکەشی: بێ شێوەو بەتاڵ، یاخود وێرانەو بەتاڵ، ئەمەی دوایی، واتە (وێرانە) لەجیاتی (بەتاڵ) جگە لەوەی لە هەندێك وەرگێڕانی تەورات هەیە هەروەها لە حەگیگاه هاتووە:

**A. W. Streane, , *op. cit.*, p. 58.**

قسەی عبدالفادیش ئەوە دەگەیەنێت تۆهوو تەنها لە حەگیگاه و کتێبی تەکوین هاتبێت، بەڵام وشەکە هەروەها لە کتێبی ئیرمیا (٤: ٢٣). لە کتێبی (ئیشعیا)و لە یەك ئیصحاح جارێك بە

دوای باسی سەرەتای بوون کە بەتاڵیو وێرانی بوو وەك چۆن لە کتێبی تەکوین هاتووە: زەوی بێ شێوە (یان وێرانە)و بەتاڵ بوو (تەکوین١: ٢)، دوای ئەوەش خودا فەرمانی دا ڕووناکی هەبێتو جیایکردەوە لەنێوان ڕووناکیو تاریکیو شەو و ڕۆژی دروستکرد (تەکوین١: ٢–٥)، لەو شوێنەش کە باسی شەو و ڕۆژە، واتە تەکوین١: ٥، حەگیگاه دەڵێت: ئەمە (بارایتا)[٣٠٢] یە: بەتاڵی هێڵێکی سەوز بوو دەوری هەموو جیهانی داوەو لەوەوە تاریکی دەرچوو.[٣٠٣]

لەم باسەو لەباسەکانی خوارەوە (ئەوانەی پەراوێز دەربارەی تۆهوو و بۆهوو) خوێنەر دەزانێت کە هیچ شتێك کێوی قاف لەگەڵ هێڵە سەوزەکەی حەگیگاه کۆبکاتەوە جگە لەوەی کە هەردووکیان دەوری شتێکیان داوە: یەکەمیان دەوری

---

واتای (وێرانە) دێتو دوای ئەوە بە واتای لەبەرهیچ یان بێمەبەستی (بەعەرەبی: عبث بەئینگلیزی in vain) دێت، بڕوانە هەروەها:

**F.F. Bruce, *And the Earth was without Form and Void, An Enquiry into the exact Meaning of Genesis 1, 2*, p.23.**

لە ئیشعیا (٣٤: ١١) لەگەڵ پەتو بەرد باسکراوەو دواتر بە گوریسی پێوانەو شاوڵ لێکدرابوونەوە، بۆ ئەمەیان بڕوانە:

**Hannu Töyrylä, Slimy Stones and Philosophy: Interpretations of tohu wa-vohu as Matter and Form, p.3.**

ئەم سەرچاوەیە لێکۆڵینەوەیەکە دەربارەی تۆهوو و بۆهوو لە سەرچاوەکانی جوولەکەو لێکدانەوەیان لای زاناو فەیلەسووفەکانیان. تۆهوو و بۆهوو لە تەرگومی بابلی یاخود تەرگومی ئۆنکیلۆس بە واتای وێرانەو بەتاڵی هاتووە (بڕوانە بەشی پرسیارە مێژووییەکان بۆ تەرگوم):

**J. W. Etheridge, The Targums of Onkelos and Jonathan Ben Uzziel on the Pentateuch (Genesis and Exodus), p.36.**

لە تەرگومی یوناتان کوڕی عوزیئیل (ڕاستەکەی: تەرگومی فەڵەستینی) بەم جۆرە ڕوونکراونەتەوە: چۆڵ بووە لە کوڕانی مرۆڤو بەتاڵ بووە لە ئاژەڵ:

**J. W. Etheridge,*ibid*., p.157.**

[٣٠٢] تەعبیری ((ئەمە بارایتایە)) واتە ئەو قسەیە لە بارایتا בְּרָיְתָא هاتووە کە ئەمیان بریتییە لە یاسایەك یان بنەمایەکی دەرەوەی (مشناه)ـەکەی رابی یەهوودای ناسی:

**A. W. Streane, *op. cit.*, p.147.**

بابەتەکانیشی بریتین لە بابەتی دژ بە بەهەمان بابەتەکانی (میشناه)، هەروەها زانیاریی زیاتر بۆ میشناه دەدات، هەروەها بابەتێکی جیاواز لێی:

**Stephen G. Wald, *Baraita*, in; Encyclopaedia Judaica, vol. 3, p.124.**

[303] **A. W. Streane*, op. cit*., pp. 58-9.**

زەویی داوەو ئەوەی تر دەوری جیهانی داوە، ئیتر چ شتێك هێڵێكی سەوز لەگەڵ كێوێك كۆدەكاتەوەو كوا باسی دروستبوونی تاریكی لەو كێوە؟ عبدالفادی یەكێكە لەو ڕەخنەگرە بێبەهرانەی خشتێك لە شوێنێك دەبینن‌و هەوڵ دەدەن لەو خشتە كۆشكێك دروست بكەن.

سەبارەت بە قسەكەشی كە ڕەچەڵەكی تۆهوو بریتییە لە وشەی (تاو) بەواتای هێڵ‌و صەحابییەكان ئەو وشەیەیان بینیوە نەیانزانیوە واتاكەی هێڵەو وایانزانی زنجیرە چیایەكی مەزنە پێی دەوترێت قاف.. دەڵێین ئەو قسەیەی عبدالفادی دیسان پێكەوەبەستنی دوو شتی دوور لە یەك: هێڵ‌و زنجیرە چیا، هەروەها تاو و قاف، سەباری ئەوەش وشەی تاو תָו تەنها واتای هێڵ نادات بەڵكو هەروەها هێما و نیشانە.. تاد و وشەی گونجاوتر بۆ هێڵ هەن.

## بە شـــــی دووە م

# پرسیـارە مێژوویـیەکـان

**لەم بەشە بابەتە لەیەکچووەکانمان پێکەوە کۆکردۆتەوە، بۆ نموونە هەموو باسەکانی مەسیح و مەریەممان لە یەك بەش کۆکردۆتەوە یان هەموو باسەکانی پێغەمبەران...تاد**

# میسر و فیرعەون و ئیسرائیلییەکان

## ١-هامان وەزیری فیرعەون بوو

((... إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا خَاطِئِينَ– القصص:٨)).

((وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَهٍ غَيْرِي فَأَوْقِدْ لِي يَا هَامَانُ عَلَى الطِّينِ فَاجْعَل لِّي صَرْحًا لَّعَلِّي أَطَّلِعُ إِلَى إِلَهِ مُوسَى وَإِنِّي لَأَظُنُّهُ مِنَ الْكَاذِبِينَ – القصص:٣٨)).

((وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَا هَامَانُ ابْنِ لِي صَرْحًا لَّعَلِّي أَبْلُغُ الْأَسْبَابَ – غافر: ٣٦)).

عبدالفادی نووسیویەتی: قورئان دەڵێت هامان وەزیری فیرعەون بوو بەڵام مێژوو دەیسەلمێنێت هامان وەزیری ئەحشویریش بوو و ماوەی نێوان فیرعەونو هامان نزیکەی هەزار ساڵ بووە. فیرعەون پادشای میسر بوو و هامان وەزیر بووە لە بابل. کتێبی ئەستیریش لە تەورات دەڵێت هامان وەزیری ئەحشویریش پادشای فارسەکان بوو کە یۆنانییەکان پێیان دەوت زرکیس (قسەی عبدالفادی تەواو).

* * * *

ئەگەر ڕاست بێت پێغەمبەری ئیسلام ناوی هامانی لە کتێبی ئێستێر אֶסְתֵּר وەرگرتووە ئەو پرسیارە دێتە پێشەوە: بۆچی لەو هەموو باسەی مۆردخایو ئێستێرو هامانو[٣٠٤] ئەحەشوێرۆیش[٣٠٥]، موحەممەد لێی تێك بچێتو بە وەزیری فیرعەونی[٣٠٦] بزانێت؟ ئەوە چیرۆکێك بوو نەك دێڕێك لەناو بەسەرهاتێك تا لێی تێك بچێت.

ئەگەرچی یادی ئێستێر بۆتە جەژنێك بەناوی (پوریم)و لەو جەژنە کتێبەکە بەدەنگی بەرز دەخوێنرێتەوە بەڵام گومان لەوە کراوە کە کتێبی ئێستێر کە ناوو بەسەرهاتی هامانی لەخۆگرتووە کتێبێکی قانوونی (واتە دروست)ی پەیمانی کۆن بێت، تاکە کتێبێکیشە لە دەستنووسەکانی دەریای مردوو نییە[٣٠٧] و یەکێکە لەو کتێبانەی گومان لە ڕاستێتییان هەیە.

سەبارەت بە هامانیش کتێبەکە بە هامانی (عەمالیقی)[٣٠٨] ناوی دەبات. ئەگەر هامان خەڵکی ناوچەی باکووری نیمچەدورگەی عەرەب بووبێت ئەوە زیاتر گونجاوە وەزیری فیرعەونێکی میسر بێت، نەك تەنها لەبەر نزیکیی ناوچەکە بەڵکو لەبەر ئەوەی هەندێك کەسانی ئاسیایی گەیشتبوونە پلەی بەرز لە میسر. لەو سەردەمە خەڵکێکی زۆری کەنعانیو سووری چووبوونە میسرو ببوونە بەشێك لە

---

[٣٠٤] باسێکی لەوە دووروردرێژترم هەیە لەبارەی هامان لە لێکۆڵینەوەی (ئاماژەکانی قورئان بۆ ڕەمسیسی دووەم وەك فیرعەونەکەی مووسا) کە لە کۆنگرەی (بەرگری لە قورئان) پێشکەش کرا، لێرەش زیادە زانیاری هەن کە لەو لێکۆڵینەوەیە نین.

[٣٠٥] ئەحەشوێرۆش אֲחַשְׁוֵרוֹשׁ بە عیبری، خشایارشا بە فارسیو کسێرکسیس Xerxes بە یۆنانی ، لە ئینگلیزی بە زێرکسیس دەخوێنرێتەوە.

[٣٠٦] قورئان تەنها ناوی هامان دەباتو پلەکەی ناڵێت، واتە دانانی پلەی وەزیر بۆ هامان تێگەیشتنی خەڵکە لە قورئان.

[٣٠٧] ستیفن م. میلر، روبرت ف. هوبر، تاريخ الكتاب المقدس، ص ٤٤.

[٣٠٨] عەمالیق עֲמָלֵק گەلێکن شەڕیان دژی مووساو گەلەکەی کرد پاش دەرچوونیان لە میسر پاش ئەوەی گەیشتنە سینا. لە کتێبی تەکوین عەمالیق کوڕەزای (عێساو)ی برای یەعقووبە (تکوین ٣٦: ١٢). عەمالیق وەك یەکێك لە دوژمنەکانی بەنو ئیسرائیل باس کراون.

کۆمەڵگەی میسری. ئەوانە ناوی میسرییان لەخۆیان نابوو بەڵام هەشبووە ناوی ئەسڵیی خۆی هێشتبووەوە وەك ئورخییا کە بووە سەرکردەیەکی سەربازیی سێتیی یەکەم، باوکی رەمسیسی دووەم. ئورخییا بەئەسڵ ناوێکی (خورری)یە: ئورخی–تێشوپ.[٣٠٩] کوڕەکەی ئورخییاش ناوی یوپا (یوپئـ) بوو کە ناوێکی کەنعانییەو[٣١٠] ئەویش فەرمانبەرێکی گەورە بوو لای رەمسیسی دووەم.

هەندێك نووسەری ئیسلامی هەوڵیان داوە بۆ دۆزینەوەی ناوێکی میسریی کۆن لە هامان بچێت یان لێوەی نزیك بێت، بۆ نموونە باسی هاوڕێیەکی منداڵیی رەمسیسی دووەم کراوە کە چەند پلەیەکی بەرزی لای رەمسیس وەرگرتبوو ئەویش ئیمن ئم ئنت (ئامون ئم ئینت) و کە ناوی خوداوەند ئامون لە ناوەکەی لە هامانەوە نزیکە.

ئامون ئم ئینت یاوەری رەمسیس بوو لەو کاتەی رەمسیس جێگری باوکیو میراتگری بوو. جگە لەوەش کەسوکاری دەسەڵاتداریشی هەبوون[٣١١].

دوای مردنی (سێتیی یەکەم)ی باوکیشیو بوونی رەمسیسی دووەم بە فیرعەونی نوێ پلەی ئامون ئم ئینتی بەرزکردەوە بۆ پلەی سەرکردە عارەبانەکانی پادشاو چاودێریی ئەسپەکان[٣١٢] کە پلەیەکی بەرز بوو چونکە هەموو کەسێك نەدەبووە بەشێك لە هێزی ئەسپسواری، دواتریش کرایە سەرکردەی میلیشیاکانی (معجئی– mɛd̪ʒi)، کە هێزێکی تایبەتی پۆلیسن بۆ پاراستنی شارەکانو گۆڕستانەکان، ئینجا بەڕێوەبەری پیشەسازی.[٣١٣] ناوبراو کاری رامسیوم

---

[٣٠٩] کینیث کیتشن، رمسیس الثاني، ص ٥٦.

[٣١٠] ك. کیتشن، رمسیس الثاني، ص ٥٦. لەم وەرگێرانە عەرەبییە نووسراوە (اورحی)، راستەکەشی (خ) نەك (ح). لە ئەسڵە ئینگلیزییەکەش: ئورهییا، واتە بە (هـ).

[٣١١] ك. کیتشن، رمسیس..، ص ٥٥.

[٣١٢] ك. کیتشن، رمسیس..، ص ٧٣.

[٣١٣] ك. کیتشن، رمسیس..، ص ١٩٩.

(پەرستگەی جەنائیزیی رەمسیس) پێ سپێردرابوو و بەڕێوەبەری پرۆژە شوێنەوارییەکانی پادشا بوو[٣١٤].

سەبارەت بە باسی ئێستێر وەزیرێکی خشایارشا بەناوی هامانەوە نەناسراوە بەڵکو لەوەش ناچێت هیچ لەو بەسەرهاتانەی چەوساندنەوەی جوولەکە لەسەردەمی خشایارشاو شووکردنی ئێستێر بەو هەبووبن. چیرۆکەکەش ناماقووڵە چونکە بەهۆی ئەوەی مۆردخای، مامی ئێستێر، کڕنووشی بۆ هامان نەبردبوو هامان بڕیاری دابوو جوولەکە لەناوبەرێت.

وەگرتنی باسەکان وەك مێژوویەکی راستەقینە کێشەی زۆری مێژوویيان بەدواوەیە، جگە لەوەش پیلانەکە پڕە لەو شتانەی دوورە ڕووبدەن وەك ئەوەی مۆردخای ناسراوە کە جوولەکەیەکی ناو کۆشکە کەچی ئێستێر کە ئامۆزایەتی و تەبەنای کردووەو رۆژانەی سەردانیی دەکات دەتوانێت ڕەگەزو ئاینی خۆی بشارێتەوە.[٣١٥] لێکۆلەرەوان هەوڵیان داوە ئێستێر بکەنە کەسێکی تر لە سەردەمێکی تر وەك بۆ نموونە ئێستێر کلیۆپاترای سێیەم بێت کە هاوڕێی جوولەکە بوو و ژنی پەتلیمۆسی سێیەم یوریگێتیس (سەدەی دووەمی پێش زاین) کە ئەمیان لەجیاتی خشایارشا بێت، هامانیش حزبی دژ بە جوولەکە لە کۆشکی پەتلیمۆس[٣١٦]. بۆچوونێکی تر ئەوەیە نووسەری کتێبەکە چیرۆکەکەی هۆنیوەتەوە بۆ ئەوەی تەفسیری فیستڤاڵێك بکات کە هەیە، واتە پوریم.[٣١٧] بۆچوونێکی تریش دەڵێت ئێستێرو مۆردخای دوو خوداوەندی بابلیی مەردوخ و عشتارن.[٣١٨] دەشکرێت جوولەکە جەژنێکی وەکو نەورۆزیان وەرگرتبێت و کردبێتیان فیستڤاڵی خۆیان و دوایی چیرۆکی سەرکەوتنی جوولەکە بەسەر

---

[٣١٤] ك. کیتشن، رمسیس..، ص ١٧٩.

[315] **Albert I. Baumgarten, S. David Sperling, Scroll of Esther, in; Encyclopaedia Judaica, vol. 18, p.216.**

[٣١٦] بۆ ئەمەو بۆ بۆچوونی تر بڕوانە سەرچاوەی سەرەوە.

[317] **ibid, p.217.**

[318] **ibid, p.216.**

هامانیـان بـۆ زیادکردبێـت وەك چـۆن چـیرۆکی کـاوەو زوحـاك لای کـورد بۆتـە چـیرۆکێکی هاوشـانی نـەورۆز، بۆیـەش وا دەڵـێین چـونکە بۆچـوونێك دەڵێـت کـە پێدەچـێت پـوریم، کـە لـە ١٤ و ١٥ ی ئـادار[٣١٩] دەگێـڕدرا، لـە فیسـتڤاڵی ئێرانیـی (فاڤاردیگـان) وەرگیرابێـتو کـە ئـەمیان لـە ١١ ی ئـازارەوە بـۆ ١٤ی ئـازارەوە بەردەوام دەبێـتو لـە وەرگێڕانـی حـەفتایی پـەیمانی کـۆنیش[٣٢٠] لـەجیاتی پـوریم جەژنەکە بە فرورایا Phrouraia یان فوردایا Phourdaia ناوبراوە[٣٢١].

بـەکورتی زۆر شـت هـەن دەربـارەی چـیرۆکەکەی ئێسـتێرو جـەژنی پـوریم باسکراونو ئەوەی لێرە گرنگە ئەوەیە باسی ئێسـتێرو هامـان لـە چـیرۆك دەچـنو گومانەکان بەتەواوەتی ئەو باسەیان دەورەداوەو هیچ لەو باسانە نـە لـە دوورو نـە لە نزیك پەیوەندییان بە باسی هامانی قورئانەوە نییە مەگـەر تـەنها نـاوی هامـان. هامان لە قورئان خاوەن پیلانێك نەبوو بەڵکو جێبەجێکاری فەرمانەکانی فیرعـەون بوو.

## ٢-قـاروون و هـامان میسری بوون

((وَقَارُونَ وَفِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَلَقَدْ جَاءهُم مُّوسَى بِالْبَيِّنَاتِ فَاسْتَكْبَرُوا فِي الْأَرْضِ وَمَا كَانُوا سَابِقِينَ -العنكبوت: ٣٩)).

((وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَى بِآيَاتِنَا وَسُلْطَانٍ مُّبِينٍ * إِلَى فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَقَارُونَ فَقَالُوا سَاحِرٌ كَذَّابٌ * فَلَمَّا جَاءهُم بِالْحَقِّ مِنْ عِندِنَا قَالُوا اقْتُلُوا أَبْنَاء الَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ وَاسْتَحْيُوا نِسَاءهُمْ وَمَا كَيْدُ الْكَافِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَالٍ -غافر: ٢٣-٢٥)).

---

[٣١٩] جوولەکـە مانگـەکانیان لـە بابلییـەکان وەرگرتـووە، ئـادار دەکەوێتـە دوو مـانگی ئێسـتای شوباتو ئازار.

[٣٢٠] چیرۆکەکە، کە بۆتە جێگەی ڕەخنە، بەکورتی دەڵێت پادشای پەتلیمۆسی دووەم، سـەدەی سـێیەمی پـێش زایـن، لـە میسـر داوای کـرد پـەیمانی کـۆن بکرێتـە یۆنـانی بـۆ ئـەوەی بیخاتـە کتێبخانەی ئەسکەندەریە ئیتر حەفتاو دوو زانای جوولەکەی هێناو ئەوان وەرگێڕانەکەیان کرد.

[321] ibid, pp.216-217.

عبـدالفادی دەڵێـت: مـرۆڤ لـەو ئایەتانـەوە وا ی دەچـێت کـە قـاروونو هامـان لـە نەتەوەی فیرعەون بوون بەڵام ئەمە هەڵەیە چونکە قـاڕوون ئیسـرائیلی بـووە نـەك میسری‌و لە قەومی مووسا بوو وەك چۆن لە قورئان هاتووە: ((ان قارون كـان مـن قوم موسى فبغى عليهم–القصص:٧٦)).

* * * *

ئەگەر مەبەست لە ناردنی مووسا بۆ قاڕوون ئەوە بێت قاڕوون میسری بووبێـت چونکە پێکەوە لەگەڵ فیرعەون‌و هامان ناوی براوە ئەوە قسەی ڕەخنـەگر ڕەخنـە نییە بەڵکو بیانوو چونکە هەر خۆی ئایەتەکەی سەرەوەی نووسیوە بۆ سەلماندنی ئەوەی قاڕوون لە نەتەوەی مووسا بوو. سەبارەت بە قاڕوونیش کە گوایە قۆرەحی تەوراتە بڕوانە دواتر.

## ٣- گوێرەکەی زێڕینی دروستکراوی سامیری بوو

((قَالَ فَإِنَّا قَدْ فَتَنَّا قَوْمَكَ مِن بَعْدِكَ وَأَضَلَّهُمُ السَّامِرِيُّ (٨٥) فَرَجَعَ مُوسَى إِلَى قَوْمِهِ غَضْبَانَ أَسِفًا قَالَ يَا قَوْمِ أَلَمْ يَعِدْكُمْ رَبُّكُمْ وَعْدًا حَسَنًا أَفَطَالَ عَلَيْكُمُ الْعَهْدُ أَمْ أَرَدتُّمْ أَن يَحِلَّ عَلَيْكُمْ غَضَبٌ مِّن رَّبِّكُمْ فَأَخْلَفْتُم مَّوْعِدِي (٨٦) قَالُوا مَا أَخْلَفْنَا مَوْعِدَكَ بِمَلْكِنَا وَلَكِنَّا حُمِّلْنَا أَوْزَارًا مِّن زِينَةِ الْقَوْمِ فَقَذَفْنَاهَا فَكَذَلِكَ أَلْقَى السَّامِرِيُّ (٨٧) فَأَخْرَجَ لَهُمْ عِجْلًا جَسَدًا لَهُ خُوَارٌ فَقَالُوا هَذَا إِلَهُكُمْ وَإِلَهُ مُوسَى فَنَسِيَ – طه: ٨٥–٨٨)).

عبدالفادی دەپرسێت: سامیرە شارێکی فەڵەستینەو ئەو کاتەی ئیسرائیلییەکان لـە میسـر دەرچـوون وجـوودی نـەبووەو هـاروون لەسـەر داوای ئـەوان گوێرەکـەی بـۆ دروست کردن. ئیتر چـۆن کەسـێکی سـامیری گوێرەکەکـەیان بـۆ دروسـت دەکـات پێش ئەوەی سامیرییەکان بێنە بوون؟

* * * *

ئـــەو باســـانەی خوارەوەشمـــان هەرچـــەندە لـــەڕووی لێکۆڵینـــەوەی مێـــژوویی‌و شـــوێنەوارییەوە ئـــەو دوورودرێـــژە نـــین، بـــەڵام ڕەنگـــە خوێنـــەری ئاســـایی بـــە دوورودرێژیان بزانێت، ئەم درێژەپێدانەش پێویستە بۆ ئەوەی خوێنـەر بزانێت کـە بـاس لـە مێـژووی کـۆن بـەو سـادەییە نییـە کـە عبـدالفادی کردوویـەتی کاتێـك ویستوویەتی بە چەند وشەیەك باسێك ببڕێنێتەوە.

## هاڕوون گوێرەکەکەی دروستکردبوو؟

قسەکەی عبدالفادی کە هاڕوون گوێرەکەی بۆ ئیسرائیلییەکان لەسەر داوای خۆیان دروسـتکردبوو قسـەیەکە لـە تـەورات هەیـە، بـاوەڕێکی نەشیاویشـە پێغەمبـەرێك کارێکی وا بکات، قورئانیش بۆمـان بـاس دەکـات کـە هـاڕوون بـەو دروسـتکردنەی گوێرەکەکـەو بـە پەرسـتنی نـاڕازی بـوو، ئەمـەش گونجـاوترە لـە گێڕانەوەکـەی تەورات.

وەنـەبێت گێڕانەوەکـەی تـەوراتی بەردەسـتمان تـەنها لەگـەڵ کـاری پێغەمبـەران نەگونجاو بێت بەڵکو لەوە زیاتر لەگەڵ باسەکانی خودی تەورات گونجاو نییە.

ئێمە دەبینین کە لە تەورات‌و لەو کاتەی هاڕوون گوێرەکەکە دروست دەکات خـودا قسە لەگەڵ مووسا دەکات‌و باسـی هـاڕوونی بـرای بـۆ دەکـات کـە بیکاتـە کـاهن‌و باسـێکی دوورودرێـژی بـۆ دەکـات کـە چـیی بـۆ بکـات وەك باسـی وردەکـاریی جلوبەرگی کاهنێتی کە بۆ هاڕوون‌و کوڕەکـانی بکـرێن، ئـەو کـارەش بـۆ هـاڕوون‌و نەوەکـەی تاهـەتا دەبێـت، ئـەم باسـەش یـەك ئیصـحاحی تـەواوی داگیرکـردووە (ئیصحاحی ٢٨ کە ٤٣ برگەیە) ئینجا ڕێوڕەسمی بەکاهنکردنی هاڕوون کە دەبێت مووسا بیکات‌و ڕێوڕەسمـەکانی تـر کـە پەیوەنـدییان بـە هـاڕوون‌و کوڕەکانییـەوە هەیـە کـە ئیصـحاحی ٢٩ یـان داگیرکـردووە، پاشـان ئـەو شـتانەی دروسـتبکرێن‌و لەوانەش باسی هاڕوون هاتووە کە چی بکات (ئیصحاحی ٣٠).

واتە لەو کاتەی خودا ئەو هەموو قسە دوورودرێژانە لەگەڵ مووسا دەکات سەبارەت بە هارپوونو کورەکانیو کارە نوێکەیان کە کاهنێتیی بوون لەپڕ دەبینین هارپوون خەریکی شتێکی ترە کە خودای توورە کردو ئیسرائیلییەکانی لەسەر سزا دا ئەویش دروستکردنی گوێرەکەکە لەسەر داوای ئیسرائیلییەکان (ئیصحاحی ٣٢: ١-٥).

ئەم باسانە وا پیشان دەدەن کە خودا ئاگای لە کارەکەی هارپوون نەبوو و لەو کاتەی هارپوون ئەو گوناهە گەورەیەی دەکرد خودا دوارۆژێکی شکۆداری بۆ خۆیو نەوەکانی دادەمەزراند، کە ئەمە نارێکییەکی ئاشکرایە.

## شاری سامیرە لەکاتی مووسا

ڕەخنەی ئەوە گیراوە کە سامیرە لەو کاتەی مووسا بنیات نەنرابوو ئیتر چۆن ناوی سامیری هاتووە، وەڵامەکەش یەکێکە لە سێ وەڵام:

یەکەم ئەوەیە گێڕانەوە دەتوانێت ناوی شوێنێك بڵێت کە کاتی ڕووداوەکە نەبووبێت وەك چۆن کاتێك ناوی کوردستان بەکاردەهێنین بۆ باسکردنی مێژووی کۆنی کوردستانی سەردەمی گەلە کۆنەکانی وەك گوتییەکانو لوللوییەکانو خوررییەکان..تاد، واتە کاتێك کورد وەك ئەم نەتەوەیەی ئێستا پەیدا نەبوو و ناوی کوردستانیش هەروەها پەیدا نەببوو. نموونەیەکی تر بەکارهێنانی زاراوەی فەڵەستین لەلایەن مێژوونووسانو شوێنەوارناسانەوە بۆ سەردەمانێك کە هێشتا ئەو ناوە پەیدا نەببوو. بەم واتایەش دەکرێت ناوی سامیری بۆ نیشاندانی ئەوەی ئەو کەسە خەڵکی شوێنێکە کە کاتی خۆی ناوێکی تری هەبووەو دوایی ناوەکەی بۆتە سامیرەو هەروا ماوەتەوە. ئەم وەڵامەش بۆ ئەم حاڵەتە کەمتر پەسەند دەکەین لەچاو دوو وەڵامەکەی تر لەبەر ئەوەی لە قورئان وەسفی سامیری لەمیانەی گفتوگۆوی ڕاستەوخۆوە هاتووە: ((قَالَ فَإِنَّا قَدْ فَتَنَّا قَوْمَكَ مِن بَعْدِكَ وَأَضَلَّهُمُ السَّامِرِيُّ (طه: ٨٥).. قَالَ فَمَا خَطْبُكَ يَا سَامِرِيُّ –طه: ٩٥)) مەگەر لەو حاڵەتەی ناوی شارەکە لە کۆنەوە سامیرە بووبێتو ناوی شەمرۆن یان شۆمەرۆن

(نـاوی عیبریـی سـامیرە) دەسـتکاریکردنێکی عیـبری بـووە وەك چـۆن دەقـە ئاشورییەکان بەو شارەیان دەوت سامیرینا نەك شۆمەرۆن (بڕوانە خوارتر).

## سامیرە یان شۆمەرۆن

وەڵامی دووەمیش ئەوەیـە کـە سـامیرە کـاتی مووسـا بەهـەمان نـاوەوە هـەبووەو گێڕانەوەکـەی (کتـێبی پادشـایان) لـە پـەیمانی کـۆن سـەبارەت بـە دروسـتکردنی دواتری سامیرە ڕاست نییـە. ئـەو شـارەی پێـی دەڵـێین سـامیرە بـە عیـبری پێـی دەوترێـت شـۆمەرۆن שֹׁמְרוֹן. بـەپێی کتـێبی پادشـایان (١پادشـایان ١٦: ٢٤) شـۆمەرۆن پێشـتر گردێـك بـوو پادشـای ئیسـرائیل (پادشانشـینە باکوورییەکـەی جوولەکـە)[٣٢٢] عـۆمری (عامـەری یـاخود عۆمـەری) עָמְרִי (دەوروبـەری ٩٠٠ پـێش زاین) کڕیبووی لە خاوەنەکـەی کـە نـاوی شـێمێر שֶׁמֶר بـوو و شـاری شـۆمەرۆنی لەسـەر لوتکەکـەی بنیـات نـا. نـاوی شـاری شـۆمەرۆن (سـامیرە)ش لـە نـاوی (شێمێر)ـەوە هاتووە. ئـەو چیرۆکەی کـە ڕەچـەڵەکی نـاوی شـاری شـۆمەرۆن بـۆ شێمێر دەگێڕێتەوە جێگەی گومانە چونکە کەمتر ڕێـی تێدەچێت کەسـێك شـارێك بنیات بنێتو بیکاتە پایتەختی پادشانشینەکەیو لەجیاتی هـەر نـاوێکی تـر نـاوی ئـەو کەسـە بـەکاربهێنێت کـە شـوێنی ئـەو شـارەی لـێ کڕیبـوو. ئـەم هەوڵـە بـۆ دیاریکردنی ڕەچەڵەکی ناوەکان نموونە تری هەیە کاتێك خەڵك واتای ناوی شـارێك یان گوندێك نازانن‌و نزیکترین وشە لە زمانی خۆیان یان زمانێکی بێگانە دەدۆزنەوە بۆ ئەوەی ناوی ئەو شوێنەی بدەنە پاڵی. جـاری وایشـە کـە وشـەیەکی مـەعقوولی نزیك نەبێت تەفسیری زۆر سەیر پەیدا دەبن.[٣٢٣] لەبەر ئەوە وای بـۆ دەچـین نـاوی

[٣٢٢] لەدوای سولەیمانی پێغەمبەرەوە دەوڵەتەکەی بـووە دوو بـەش: دەوڵـەتی بـاکوور کـە پێـی وترا ئیسرائیلو سامیرە سێیەمو دوایەمین پایتەختی بـوو، دەوڵـەتی باشـووریش کـە پێـی وتـرا دەوڵەتی یەهووداو پایتەختەکەی قودس بوو.

[٣٢٣] لە کوردەواریی خۆمان نموونەی لەمە هەیە وەك تەفسیرکردنی ناوی گوندی (دێگەڵـە) بـەوە کابرایەك ((گەڵاوگەڵ)) دەڕۆشت!

گردەکــە پێشــتریش هــەر شــۆمەرۆن بــووەو عــۆمری ناوەکــەی وەکــو خــۆی هێشتۆتەوەو نموونەش لە مێژوو لەسەر ئەمە زۆرە.

جێگەی سـامیرە شـوێنەواری پـێش شـوێنەوارە ئیسـرائیلییەکانی لـەخۆ گرتـووە. پشکنینە شـوێنەوارییەکانی زانکـۆی (هارڤـارد) لـە سـەرەتای سـەدەی بیسـت لـە سـامیرە دەریانخسـتبوو کـە لـە ژێـر ئـەو چـینەی وا گومـان دەبرێـت هـی ئیسرائیلییەکان بێـت کەلوپـەل دۆزراونەتـەوە کـە دیـارە دەگەڕێنـەوە بـۆ خـەڵکی پێش ئەوانو لە سەرانسـەری فەڵەسـتین ئـەو کەلوپەلانـە دۆزراونەتـەوە.[٣٢٤] بـەڵام ئەگەر تەنانەت پێش عۆمریش ناوەکە شـۆمەرۆن نـەبووبێت ڕەنگـە نـاوی گردەکـە شێمێر (ناوی کەسەکەی گردەکەی بـە عـۆمری فرۆشـتبوو) بووبێـت کـە ئـەم نـاوە نزیکە لە نـاوی شـۆمەرۆن. هـەروەها دەکرێـت نـاوی ئـەو شـوێنە بـەرز لـە وشـەی (شامەر)، بەواتای (دیمەن)، داڕێژرابێت.[٣٢٥]

کێشەیەکیش ئەوەیە تا چـەند بـاوەڕ بـە گێڕانەوەکـەی پـەیمانی کـۆن بکـەین کـە عـۆمری سـامیرەی بنیـات نـابوو. ئێمـە نـازانین کـۆنترین کۆشـك کـە لـەوێ دۆزراوەتەوەو بۆ ئەو سەردەمە دەگەڕێتـەوە هـی عۆمرییـە یـان هـی پـێش ئـەوە. (رایزنەر)، کە بەڕێوەبـەری پشـکنینی دوو سـاڵی ١٩٠٩ و ١٩١٠ لـە ڕاپـۆرتی سـاڵی ١٩٠٩ دەربارەی پشکنینی شوێنەواریی زانکـۆی هارڤـارد لـە سـامیرە دەڵێـت هـیچ نووسـراوێك لـە کۆشـکە ئیسـرائیلییەکە نەدۆزراوەتـەوەو پشـکنینەکانیش نـاوی تەنانەت یەك پادشای ئیسرائیلییان لـێ بەئـەنجام نەکـەوتوونو دەستنیشـانکردنی ئـەوەی بیناکـە کۆشـکە ئیسـرائیلییەکەی عۆمرییـە، دوای ئـەویش هـی ئاخئـاب، دەگەڕێتەوە بۆ بەڵگە شوێنەوارییەکان.[٣٢٦] دواتریش لە ڕاپۆرتی تـەواوی هـەر سـێ ساڵەکە کە لەدوو تۆی کتێبێك دەرچووە دەڵێت کە لە پشکنینی سـاڵی ١٩٠٩ـەوە

---

[324] George A. Reisner, The Harvard Expedition to Samaria Excavations of 1909, in; JSTOR, vol. 3, No. 2, April, 1910, p.252.

[325] A. E. Cowley, Samaria, in; Encyclopædia Biblica, vol. IV, col. 4255.
نووسەرەکە دەڵێت کە دەکرێت هەروەها شێمێر ناوی تیرە بێت.

[326] G. A. Reisner, *op.cit.*, p.248.

وا دیار بوو کە یەکەم بینای سەر لوتکەی گردەکە لەڕووی قەبارەو پێکهاتەوەو دروستکردنەوە پادشایانە بووەو دەبێت کاتی کڕینی گردەکە لەلایەن پادشاکانی ئیسرائیلەوە دروستکرابێت، بەڵگەش لەسەر ئەوە لە پشکنینی ١٩١٠ بوو کاتێك ژمارەیەك لەتەگۆزەی نووسراو دۆزرانەوە" گۆزەیەکی سەردەمی ئۆسۆرکۆنی دووەم (پادشای بنەماڵەی ٢٢ی میسر کە بە ڕەچەڵەك لیبی بوو)ی هاوچەرخی ئاخئاب کە ئەمیان دوای عۆمری بوو، لەتەسواڵەتی نووسراوی ئیسرائیلی.. تاد. رایزنەر هێشتا گومانەکان پیشان دەدات کاتێك دەڵێت بیناکە لە کۆشك دەچێت نەك پەرستگەو هەرچەندە بەڵگەکان ئاشکرا نین بەڵام خۆیان ناویان ناوە کۆشکی ئیسرائیلی.[٣٢٧] مێژووی تەواوی لەتەسواڵە نووسراوە ئیسرائیلییەکان نەزانراوەو لەو کۆشکە نەدۆزراونەتەوە کە بە هی عۆمری زانراوە بەڵکو لەو بەشەی کۆشکەکە کە درێژکراوەی ئەو کۆشکەیەو بە هی ئاخئاب زانراوە.[٣٢٨]

بەم شێوەیەو هەرچەندە بەڵگە شوێنەوارییەکان پشتگیریی ئەوە دەکەن کە یەکەم بینای سەر گردەکە کۆشك بووە، بەڵام بڕیاردان لەسەر ئەوەی کۆشکەکە هی عۆمری بووە ناکرێت سەد لە سەد بەدڵنیاییەوە وەربگیرێتو دەمێنێتەوە ئەو پرسیارە: ئایا پێش ئەوەی عۆمری ئەو شوێنە بکاتە پایتەختی خۆی شوێنەکە شارێك نەبوو؟ بەو جۆرەش ناوبردنی سامیری لەلایەن قورئانەوە مەبەست لێی کەسێکی خەڵکی شاری سامیرەی کاتی مووساو پێش ئەوەی ببێتە پایتەختی پادشانشینە باکوورییەکەی جوولەکە.

ئەوەی جێگەی سەرنجە سامیرە لە دەقە ئاشورییەکان، واتە سامیرینا یان سامێرینا، وەکو شێوە عیبرییەکەی نییە کە شۆمەرۆنە. ئینجا ئایا ناو عیبرییەکە دەستکاریکراوەو سامیرینا ناوە ئەسڵییەکەیە؟

[327] G. A. Reisner, in; Harvard Excavations at Samaria, 1908-1910, vol. 1, p.60.
[328] G. A. Reisner, The Harvard Expedition to Samaria, *op.cit.*, p.227.

## شاری صومور

وەڵامی سێیەمیش ئەوەیە مەرج نییە سامیری لە سامیرەوە هاتبێتو بۆی هەیە کابرای سامیری خەڵکی شوێنێکی تر بووبێت. تەوراتیش کاتێك باسی دەرچوونی ئیسرائیلییەکان لە میسر باسی ئەوە دەکات کە شەشسەد هەزار کەس بوون جگە لە منداڵەکان، هەروەها ژمارەیەکی زۆریان لەگەڵ دەرچوون (خروج ١٢: ٣٨)، واتە ئەوانەی دەرچوون هەموویان ئیسرائیلی نەبوونو بۆی هەیە سامیری یەکێك لەوان بووبێت.

زۆر پێش رەمسیسی دووەم، کە زۆرترین بۆچوون کە ئەو فیرعەونی سەردەمی مووسا بوو، شارێك لە سووریا هەبووە بەناوی صومور **Şumur**. دوور نییە سامیری خەڵکی ئەوێ بووبێتو چووبێتە میسرو لەگەڵ ئیسرائیلییەکان میسری جێهێشتبێت. ئیحتمالی ئەوەی سامیریو خەڵکێکی تری صومور چووبێتنە میسر بەوە بەهێزتر دەبێت کاتێك دەزانین ئەو شارە مەڵبەندی ئەو ناوچەیەی سووریا بوو کە سەر بە میسر بوو. لەوەش زیاتر صومور گرنگترین شاری سەر بە میسر بوو لە باکوور.[٣٢٩]

صومور لە رۆژئاوای سووریا بوو بەڵام شوێنی تەواوی نەدۆزراوەتەوە. پێشتر بە (سومرە)ی ئەمڕۆ زانرابوو لە باکووری شاری تەڕابلوس[٣٣٠]، بەڵام بۆچوونە نوێکان شوێنەکەی بە (تەل کازەل) دەستنیشان دەکەن(بڕوانە خوارەوە).

بەپێی (ئۆتۆ ڤێبەر) کە تێبینییەکانی سەر نامەکانی تەل ئەلعەمارنەی[٣٣١] نووسیوە صومور بریتییە لە سیمورۆس (Simyros) **Σίμυϱος** لای ستیفانوسی

---

[٣٢٩] بڕوانە:

**Trevor Bryce, Letters of the Great Kings of the Ancient Near East, p.151.**

[330] **O. Weber, in; Die El-Amarna Taflen, 2, S.1141.**

[٣٣١] تەل ئەلعەمارنە، (ئخت ئاتون)ی کۆن، شوێنەواری پایتەختی ئیخناتون بوو. لەو گردە ژمارەیەك نامە دۆزرانەوە کە بە خەتی مێخیو زمانی ئەکەدی نووسرابوون. ئەکەدی زمانی جیهانیی ئەو سەردەمە بوو و بۆ ئاڵۆگۆڕکردنی نامە بەکاردەهات. نامەکان لە پادشایانی بابلو ئاشورو میتتانیو خاتی... تاد هەروەها لە فەمانڕەواکانی شام بۆ ئیخناتونو ئامینحوتپی

بیزەنتی (سـەدەی شەشـەمی زایـنی)، کسـیمورا (Ximyra) Ξίμυρα لای سـترابۆنی جوگرافیاناسـی یۆنـانی (٦٤پ.ز—٢٤ ن)، زیمـیرا Zimyra لای پلینیۆسـی رۆمـایی (سەدەی یەکەمی زایینی). بە نووسینی هیرۆگلیفـیش دەنووسـرا صـمر (یـان جمـر) *ḏmr*[٣٣٢]. بەپێی ئەو نووسـینەش ڤاوڵـەکان نەدەنووسـران بۆیـە دەکرێـت صـومور بێت یان صەمەر یان صیمیر.. تاد.[٣٣٣] ئەوەی گرنگەو جێگەی سەرنجە شێوەیەکی نووسینی ناوەکەیە لای تحۆتمسی سێیەمی بنەماڵەی ١٨ی میسر کە بەم جۆرەیـە: صئمیرئـ*ḏȝ-my-rȝ* کە نزیکە لە صامیرا یـان صـەمیرە. پادشـا لـە لەشکرکەشـیی شەشەمی لە سـاڵی سـییەمیو دوای چـوونە قـادش (قدشـو بـە میسـری) دەچـێتە صەئمیرئـ ئینجـا ئارڤـاد یـان ئـارواد ( بـە هیرۆگلیفـی: *ȝ-rȝ-ṯ-wt*)[٣٣٤] کـە ئـەو دوو شارە نزیکی صومور بوون. پادشا باسی زیانگەیاندن بە دوو شارەکە دەکات بەڵام هیچ سەبارەت بە صومور ناڵێت. فیرعەونەکە دەڵێت کوڕانو برایانی سـەرۆکەکانی ئەو ناوچانەی بۆ میسـر گواسـتەوە، واتـە لـەو کاتـەوە کەسـانی سـەر بـە بنەماڵـە فەرمانڕەواکان لە میسر دەژیانو دیارە کەسانی سەر بـە صـومور لـەناویان بـوون. ناوی صومور بەهەمان ئەو شێوەیەی لـە نووسـینی تحۆتمسـی سـێیەم هـاتووە لـە نووسینەکانی (کەڕنەك)ی سێتیی یەکەمی بنەماڵەی ١٩ و باوکی ڕەمسیسی دووەم هاتووە.[٣٣٥]

---

باوکی لەگەڵ ژمارەیەك نامە بێ ناوبردنی پادشاکە، چەند نامەیەکی کەمی ئەمانیش بۆ پادشـاو فەرمانڕەوای تر، نامەی کەسانی تریش لەو ئەرشیفە هەن جگە لە چەند دقێکی داستانەکان.

[332] **O. Weber, , in; Die El-Amarna Taflen, 2, S.1141.**

[٣٣٣] لە ناوە میسرییەکە هێمـای یەکـەم تێکەڵـە لـە (د) و (ج)و بـە هێمـاگۆڕینی لاتـینی بـە d و خەتێك لەژێر تەعبیری لێ دەکرێـت، هـەروەها (ڵا)ی عیـبری، واتـە (ص) کـە ئێسـتا بـە (تـس) دەخوێنرێتەوە.

[334] Breasted, vol, II, S465, p.198.

[335] **Breasted, vol. III, S114, p.114.**

برێستد بۆ ئەمەیان دەڵێت لە دەقەکە *ṯy* هاتووە کە پێویستە رئـ *rȝ*. بێت (هـەمان سەرچـاوەو لاپەڕە پەراوێزی **b**).

وەك وتمان بۆچوونێکی نوێتر سەبارەت بە صومور ئەوەیە (تەل کازەل)ی[٣٣٦] سووریایە نزیك دەریاو رۆژئاوای شاری (حیمص)ـەو ئەمەیان پشتگیریی شوێنەواریی زیاتری هەیە. صومور هەروەها رۆژئاوای شاری (قادش)ـە کە شەڕی میسرییەکان‌و خاتییەکانی لەسەر هەبووەو یەکێك لە قۆناغەکانی ئەو جەنگە لە کاتی رەمسیسی دووەم بوو.

تەل کازەل **Tell Kazel** کە پشکنینی شوێنەرایی تێ کرا بۆ ئەوەی بزانرێت شاری سومور یان سیمورا **Simyra** یە ناوی لە کتێبی تەکوین‌و دەقەکانی میسری کاتی تحۆتمسی سێیەم‌و لەوحەکانی تەل ئەلعەمارنەو دەقە ئاشوورییەکان‌و نووسەرە کلاسیکییەکان (یۆنانی‌و رۆماییەکان) هاتووە.[٣٣٧]

لە کتێبی تەکوین (١٠: ١٨)و لە کتێبی یەکەمی هەواڵەکانی رۆژان (سفر اخبار الايام الاول، ١: ١٦) کەسی صەماری (تسەماری) צְמָרִי کوڕی کەنعانە ئەویش کوڕی حام کوڕی نووحە. هەرچەندە ئەمە باسی سەردەمێکی زۆر کۆن دەکات بەڵام ئاشکرایە کەرەستەی نوێ بەکارهاتووە واتە ناوی شارێك یان تیرەیەکی سەردەمی نووسینەوەی ئەو ڕستەیەی پەیمانی کۆن بەکارهاتووە بۆ باسکردنی سەردەمێکی کۆنتر.

ناوی صومور لە چەندین نامەی تەل ئەلعەمارنە هاتووە. ناوی شاری صومور لەو نامانە بە چەند شێوەیەك هاتووە: صوموری، صومور، صومورا، زوموری[٣٣٨].

---

[٣٣٦] هیچ نووسراوێك لە تەل کازەل نەدۆزراوەتەوە پشتگیریی ئەوە بکات بەڵام تەواو دیارە کە ئەوێیە ئەویش بەپشتبەستن بە شوێنە ستراتیجییەکەی‌و بە دۆزراوە زۆرەکانی کە دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی برۆنزیی نوێ‌و چینەکانی ١ و٢ ی سەردەمی ئاسنین، واتە ئەو کاتەی صومور دەورێکی سەرەکیی هەبووە لە ئامورو:

**Leila Badre, Tell Kazel-Simyra, BASOR, 343, Aug. 2006, p.67.**

[337] **Leila Badre, Tell Kazel-Simyra, p.65.**

[٣٣٨] بۆ ئەو شێوانەو شێوەی نووسینی ناوەکەو ژمارەی ئەو نامانەو ئەو دێڕانەی ناوی شارەکەی تێ هاتووە بڕوانە ناوی شارەکە لە پێڕستی ناوی جوگرافییەکان:

**E. Ebeling, in; Die El-Amarna Taflen, II, S.1158.**

یەکێك لەو نامانە نامەی ریب—ئاددا (ریب—ئاددی، ریب—خاددا)یە (نامەی ژمارە **EA68**) کە فەرمانڕەوای گوبلا (جوبەیلی ئێستا لە لوبنان) بوو و بۆ پادشای میسر ئیخناتون ناردبووی، ریب—ئاددا بە فیرعەونەکە دەڵێت کە بەهۆی صومورەوە، کە فەرمانبەرێکی فیرعەون فەرمانڕەوای بوو، گوبلا پارێزرابوو. دەشڵێت دوژمنایەتیی جەنگاوەرانی (خاپیرو) **SA.GAZ.MEŠ** بەرامبەری زۆر گەورەیە بۆیە فیرعەونەکە دوانەکەوێت لە ناردنی یارمەتیی بۆ صومور نەوەکو پەیوەندی بە خاپیروۆە بکەن[٣٣٩] نامەیەکی تری هەمان کەس (**EA76**)، ناوی شارەکە بەشێوەی صومورا دەبات. لەم نامەیە ریب—ئاددا بە فیرعەون کە وڵاتی پادشا (واتە ناوچەکانی سەر بە فیرعەون)و شاری صومور کە پایتەختی پادشایە لەوێ پەیوەندییان بە خاپیرو **GAZ.MEŠ** [amêlu] وە کرد ئەویش دەستەوەستان بوو. ئینجا داوای ناردنی سەرباز دەکات.[٣٤٠]

جگە لە خاپیرو پادشانشینی بچووکی (ئامورru) دوژمنێکی تر بوو و لە باکووری گوبلا بوو و تا ئوگاریت درێژ دەبووەوە و سەرەتا سەر بە میسر بوو و دوایی لێی یاخی بوو. نامەیەکی تر ریب—ئاددا (**EA71**) بۆ وەزیری فیرعەونەکەیەو لۆمەی دەکات کە بۆچی بە پادشای نەوت بۆ ناردنی سەرباز بۆ گرتنی صومور (صومورا). قسەش بە عەبدی عەشیرتا، فەرمانڕەوای ئاموررو، دەڵێت کە ئەو

---

[339] **Knudtzon, Die El-Amarna Taflen, I, 68, S.361.**

لەو نامانە ناوی ئەو خەڵکە کە بە کۆچەری‌و چەتەیی، هەروەها کۆیلە، ناسرابوون بە زاراوەی سومەری **SA.GAZ** یان **GAZ** .. هاتووەو بە (خاپیرو) زانراوە کە ئەمیان بە ئەکەدییە. خاپیرو یان عاپیرو نەتەوەیەکی دیاریکراو نەبوون بەڵکو زاراوەیەك بوو بۆ کەسانێکی وڵاتی دووڕوبارو سووریاو دەوروبەری‌و ناوەکەیان زۆر پێش پەیدابوونی ئیسرائیلییەکان هەبوو بۆیە بۆچوونی جیاواز دەربارەی پەیوەندیی ئەوان بە زاراوەی (عیبرییەکان)ـەوە هەیە بەڵام بەشێوەیەکی گشتی بۆچوونی زاڵ ئەوەیە خاپیرو پەیوەندییان بە عیبرییەکانەوە نییەو زاراوەیەکی نەتەوەیی نییە. میسرییەکان پێیان وتوون (عپرو) کە دەکرێت بە (عەپرو) یان عەپیرو بخوێنرێتەوە.

[340] **Knudtzon, Die El-Amarna Taflen, I, 76, S.383.**

چییە تا وڵاتی پادشا بۆ خۆی بەرێت؟ باسی بەهێزبوونی عەبدی عەشیرتاش دەکات بەهۆی کۆمەڵانی خاپیرو GAZ amêlu وە.[٣٤١]

صومور کەوتبووە دەستی عەبدی عەشیرتا، دوای مردنی ئەمیش کەوتەوە دەستی میسرییەکان، بەڵام گەورەتربوونی دەسەڵاتی کوڕانی عەبدی عەشیرتا بەسەر ناوچەکە وای کرد صومور لە مەترسی بێت، ئەوەش بوو جارێکی تر کەوتە دەستیان، ئەو کەسەش کە زیاتر ناوی دێت (ئازیرو)ی کوڕی عەبدی عەشیرتا بوو کە هێشتا خۆی وەك وابەستەی فیرعەونی میسر خۆی بۆ ئەو فیرعەونە پیشان دەدا.[٣٤٢] شارەکە بەهۆی شەڕو گەمارۆوە خراپی بەسەر هاتبوو، ئیخناتونیش فەرمانی بە ئازیرو دابوو بنیاتی بنێتەوە، ئەویش بەڵێنی پێدا بەڵام بەڵگە لەسەر ئەوە نییە کە بەڵێنەکەی جێبەجێکردبێت..[٣٤٣]

لە دەقە ئاشورییەکان هەر سێ ناوی صومور (بە شێوەی صیمیرا)و زیمارا (ڕەنگە صەماری تەورات بێت)و سامیرە (سامیرینا) وەك سێ شوێنی جیاواز دەردەکەون و ئەمە ئیحتمالی سەرچاوەی ناوی کابرای سامیری زیاد دەکات بۆ دوان وەك لە خوارتر ڕوونی دەکەینەوە.

صومور لای ئاشوورییەکان بە صیمیرا Şimirra ناوبراوە" تیگلات پلاسەری سێیەم (٧٤٥–٧٢٧ پ.ن) باسی ژمارەیەك شاری ناوچەکە دەکات کە صیمیرا یەکێکیانە دوای ناوی گوبلا .. کە ئەمانەی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی. هەر لەو نووسراوەو پاش صیمیرا شارێکی تر هەیە ئینجا ناوی شاری زیمارا Zimarra.[٣٤٤] شارەکانی باکووری کەناری سووریا لە هەرێمێك رێکخرابوون کە مەرکەزەکەی صیمیرا بوو.[٣٤٥] دواتر ناوی صیمیرا بەپاڵ سامیرە لە نووسراوێکی سارگۆنی دووەمی

---

[341] Knudtzon, Die El-Amarna Taflen, I, 71, S.367
[342] Trevor Bryce, Letters of the Great Kings of the Ancient Near East, p.146ff.
[343] *ibid.*, pp.151-2.
[344] Luckenbill, Ancient Records of Assyria and Babylonia, vol. I, S815 (p.292).
[345] Nicholas Geoffrey Lemprière Hammond ,Empires and Other States of the Near East, p.468.

ئاشوری سەبارەت بە شەڕی ساڵی دووەمی (٧٢٠ پ.ز) دژی چەند شارێکی سووریاو فەڵەستین وەك قارقارو صیمیرراو دیمەشقو سامیرە (لە دەقەکە: Samirina)و غەززە.... و بەپشتیوانیی فیرعەونی میسر جەنگا.[٣٤٦] هەبوونی ناوی زیماررا بەپاڵ صیمیررا لە یەك دەقی تیگلات پلاسەری ئاشوری ئیحتمالێکی ترمان بۆ سەرچاوەی ناوی (سامیری)ی قورئان زیاد دەکاتو بەم جۆرە نەك تەنها صومور یان (صیمیررا)مان هەیە بۆ ئەسڵی ناوی سامیری بەڵکو (زیماررا)شمان هەیە. لەڕێگەی ئەو دەقەی سەرەوەی تیگلات پلاسەرو دەقێکی تری ئاشکرا دەبێت کە زیماررا شارێکی ترەو جیایە لە صیمیررا و سامیرە. ناوی سامیرە لەم دەقەی تری تیگلات پلاسەر بەشێوی سامێرینا Samerina بوو و لە هەمان ئەو دەقە ناوی صیمیررا هاتووە کە لەگەڵ چەند شارێك لەسەر کەناری دەریا بوون.[٣٤٧] کەواتە دەکرێت سامیری خەڵکی زیماررا بووبێت هەرچەندە ئێمە زیاتر ئەوە پەسەند دەکەین کە خەڵکی صومور (صیمیررای ئاشوری) بووبێت، ئەوەش بەبێ ئەوەی ئیحتمالی هەبوونی سامیرە لە کاتی مووسا پشتگوێبخەین وەك چۆن لە سەرەوە ڕوونمان کردەوەو کە بەم جۆرە دەکرێت سامیری خەڵکی یەکێك لەو سێ شارە بووبێت.

بەم شێوەیەش نەك تەنها وەڵامی ئەو ڕەخنەیە دەدەینەوە بەڵکو هەروەها ئێمە زیاتر لە یەك وەڵاممان هەیە. وەك وتیشم باسی مێژووی کۆنو شوێنەوار بەو ئاسانییە نییە کەسێك ناوێك ببینێتو بەسەرپێیی ئەنجامێکی لێ دەربهێنێت.

---

لە سەرچاوەی خوارەوە: سترابۆ پێی وتووە سیمورا Simyra (بەپێی خوێندنەوەی یۆنانیی y شتێکی نزیکە لە "و")و ئێستا (سومرا)یە، بەڵام نووسەرەکە صومور بە زەمار Zemar دەنووسێت کە لە تەورات هاتووە (تەکوین ١٠: ١٨)، بەڵام بەبۆچوونی خۆمان ئەوە هەڵەیە چونکە وەك باسمان کرد لە نووسراوەکەی سەرەوەی تیگلات پلاسەری سێیەم لە دوای ناوی سیمیررا شارێکی تر ئینجا شاری زیماررا Zimarra هاتووە کە ناوی ئەمیان نزیکترە لە زەمار.

[346] Luckenbill, Ancient Records of Assyria and Babylonia, vol. II, S5 (p.3).

[347] D. D. Luckenbill, Ancient Records of Assyria and Babylonia, vol. I, S772 (p.276).

## ٨-فیرعەون لە خنکان ڕزگاری دەبێت

وَجَاوَزْنَا بِبَنِي إِسْرَائِيلَ الْبَحْرَ فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ وَجُنُودُهُ بَغْيًا وَعَدْوًا حَتَّى إِذَا أَدْرَكَهُ الْغَرَقُ قَالَ آمَنتُ أَنَّهُ لا إِلِهَ إِلاَّ الَّذِي آمَنَتْ بِهِ بَنُو إِسْرَائِيلَ وَأَنَاْ مِنَ الْمُسْلِمِينَ * آلآنَ وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ وَكُنتَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ * فَالْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنْ خَلْفَكَ آيَةً وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ عَنْ آيَاتِنَا لَغَافِلُونَ – یونس: ٩٠-٩٢)).

عبدالفادی دەڵێت ئەم ئایەتە دەڵێت فیرعەون لە خنکان ڕزگاری بوو بەڵام لە سوورەتی القصص دەڵێت فیرعون خنکا:

وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَا أَيُّهَا الْمَلأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَهٍ غَيْرِي فَأَوْقِدْ لِي يَا هَامَانُ عَلَى الطِّينِ فَاجْعَل لِّي صَرْحًا لَّعَلِّي أَطَّلِعُ إِلَى إِلَهِ مُوسَى وَإِنِّي لَأَظُنُّهُ مِنَ الْكَاذِبِينَ * وَاسْتَكْبَرَ هُوَ وَجُنُودُهُ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَظَنُّوا أَنَّهُمْ إِلَيْنَا لَا يُرْجَعُونَ * فَأَخَذْنَاهُ وَجُنُودَهُ فَنَبَذْنَاهُمْ فِي الْيَمِّ فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الظَّالِمِينَ – القصص: ٣٨-٤٠)).

کەواتە قورئان لەگەڵ خۆی ناڕێکە هەروەها ناڕێکە لەگەڵ قسەی داوودی پێغەمبەر کە وتبووی: ((پاڵی بە فیرعەون و هێزەکەیەوە نا بۆ ناو دەریای سووف (یەم سووف) יַם-סוּף)) (مەزموورى ١٣٦: ١٥).

* * * *

ئەگەر بەپێی تەفسیری باو قسە بکەین دەڵێین ناڕێکی نییە لە نێوان دوو باسەکەی قورئان چونکە دووەمیان بەئاشکرا باسی خنکانی فیرعەون دەکات، یەکەمیشیان هەر باسی خنکان دەکات بەڵام ئەوە لاشەی فیرعەون بوو کە ڕزگاری بوو نەك فیرعەون بەزیندوویی.

ئایەتەکە دەڵێت (ڕزگارت دەکەین بە لاشەتەوە) یان (بەهۆی لاشەتەوە ڕزگارتان دەکەین)و ئەوەی لێ تێدەگەین کە فیرعەون خنکا بەڵام لاشەکەی ڕزگاری بوو، ئەوەشە ئەوانەی باسی ئیعجازی قورئان دەکەن دەیکەنە بەڵگە لەسەر ئیعجاز، واتە قورئان باسی ئەوە دەکات لاشەی فیرعەون ڕزگاری بوو بۆ ئەوەی ببێتە

نیشانە بۆ ئەو کەسانەی دوای خۆی، لە سەدەی نۆزدەش مۆمیاکەی رەمسیسی دووەم دۆزرایەوەو تا ئێستا ماوەو خەڵك دەتوانن بیبینن.

ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەوەیە ئەو مەزموورەی عبدالفادی کردوویەتی بە بەڵگە کە فیرعەون خنکا بۆ خۆی بەڵگە نییە: خودا فیرعەونو هێزەکە پاڵ پێوەنا بۆ ناو دەریای (سووف)، بەڵام بەئاشکرا ناڵێت خنکا. ئەوەش وای کردووە لە لێکۆڵەرەوەیەکی تەورات کە بڵێت مووسا باسی تێکشکاندنی لەشکری فیرعەونی کردووە بەڵام قەت باسی لەناوچوونی خودی فیرعەونی نەکردووە[348]، واتە هەمان ئەو قسەیە دەکات کە عبدالفادی کردوویەتی بە ڕەخنە بەسەر قورئان.

لێرە ئەگەر بەکورتیش بێت پێم باشە باسێکی خنکانی فیرعەون بکەم کە باسێکە لە لێکۆڵینەوەیەکی پێشتری خۆمە:[349]

زۆربەی بۆچوونەکانو بەڵگەکان ئەوەن کە رەمسیسی دووەم فیرعەونی مووسا بوو، بەڵام شیکردنەوەی مۆمیای رەمسیسی دووەم (کە لەڕووی دەرەوە کرابوو) نەیسەلماندووە کە بە خنکان مردبوو، هەروەها ئەوەشی ئاشکرا کردبوو کە لەکۆتایی ژیانی ژمارەیەك نەخۆشیی پیریی هەبوو و نەخۆشییەکانی بەجۆرێك بوون نەیاندەهێڵا سواری عارەبانەی جەنگ بێتو شوێنی بەنو ئیسرائیل بکەوێت. لەوەشەوە ئەو بۆچوونەم خستە ڕوو کە ڕووداوی دەرچوون لە کۆتایی ژیانی رەمسیس نەبوو بەڵکو پێشتر بوو و رەمسیسی دووەم لە دەریا خنکابوو بەڵام خنکان (غرق) واتای مردن نییە بۆیە وای بۆچووبووم کە رەمسیسی دوای ئەوە تا مردنی لە حاڵەتی بێهۆشی بوو. بۆ پاڵپشتی ئەوەش ئەوەم کردە بەڵگە کە تەنها یەك جار باسی خنکانی خودی فیرعەون کراوەو جارەکانی تر باسی ئالی فیرعەون یان سەربازەکانی فیرعەون کراوە. هەروەها ئایەتی ((فاخذناه وجنودَه فنبذناهم في اليم وهو مُليم–الذاريات: ٤٠)) هەیە کە موفەسیران وشەی (مليم)یان بە لۆمەکراوە

[348] Douglas Petrovich, Amenhotep II and the Historicity of the Exodus-Pharaoh, pp.89-90.

[349] لێکۆڵینەوەکەم لە کۆنگرەی بەرگری لە قورئان کە پێشتر ئاماژەم بۆ کردبوو.

تەفسیر کردووە بەمەرجێك ئەوە لەگەڵ زمانی عەرەبی ناگونجێت، ئەو وشەیەش یەك جاری تر بەکارهاتووە ئەویش بۆ یوونسی پێغەمبەر کە خۆی فرێدایە دەریاو نەهەنگەکە قووتی داو نەمردو ئەو حاڵەتەی تووشی ببوو لە هی لۆمەکردن ناچێت: ((فالْتَقمَهُ الحوتُ وهو مُليم –الصافات: ١٤٢))، بۆیە لەوە دەچێت ئەوەی فیرعەون حاڵەتێکی لەو جۆرە بێت نەك مردن بەهۆی خنکانەوە.

## ٣٠–کچی فیرعەون یان ژنەکەی؟

((وَقَالَتِ امْرَأَتُ فِرْعَوْنَ قُرَّتُ عَيْنٍ لِّي وَلَكَ لَا تَقْتُلُوهُ عَسَى أَن يَنفَعَنَا أَوْ نَتَّخِذَهُ وَلَدًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ –القصص:٩)).

سوورەتی قەصەص باسی ئەو ئافرەتە دەکات کە مووسای لە روبارەکە هەڵگرتەوە کە ژنی فیرعەون بوو، تەوراتیش دەڵێت کچی فیرعەون چووە ڕووبارەکە خۆی بشواتو سەبەتەکەی بینیو کەنیزەکەی نارد بۆ هەڵگرتنەوەیو بینی منداڵێکە دەگری ئیتر دڵی بۆی نەرم بوو و وتی ئەمە منداڵێکی عیبرییەکانە... تا دەگاتە ئەوەی کە گەورە دەبێت دایکی دەیهێنێتەوە بۆ کچەکەی فیرعەونو ئەم دەیکاتە کوڕی خۆی (خروج٢: ٥–١٠). عبدالفادی ئەم باسە بەکورتی دەهێنێتەوە.

* * * *

لە قورئان باسی ئەوە نەکراوە کێ مووسای هەڵگرتەوە، ئایەتەکەی پێش ئەوە دەڵێت : ((فالتقطه آل فرعون ليكون لهم عدواً وحَزَناً..)). دەکرێت کچەکەی فیرعەون بێت. لە ئایەتەکەی دوای ئەوەش ژنەکەی فیرعەون بە فیرعەون دەڵێت مەیکوژن بەڵکو بەکەڵکمان بێت یان بیکەینە منداڵی خۆمان. کەواتە گێڕانەوەکەی تەورات باسەکەی کورتکردۆتەوەو کەسایەتییەکەی کردۆتە یەك کەس ئەویش کچی فیرعەون. نموونەی تریشمان هەیە لە کورتکردنەوە لە باسەکانی تەورات کە دواتر دەیانبینین. بەئاسانیش تێدەگەین حەزی ژنەکەی فیرعەون بەوەی منداڵەکە بکاتە

کوڕی خۆی بۆچی بووە. ڕەمسیسی دووەم چەند ژنێك بوو و نزیکەی سەد کوڕو کچی هەبووە، منداڵەکانیشی بەردەوام دەمردن و کاتێك خۆی مرد ئەوەندەی کوڕی نەمابوو. ڕەنگە ئەو ژنەی فیرعەون منداڵی نەدەبوو، یان کچی بووەو حەزی دەکرد کوڕی هەبێت.

بەڵام جگە لەم وەڵامە دەتوانین ئەوەش بڵێین کە هەردوو باسەکە ڕاستن واتە ئافرەتەکە کچی فیرعەون و ژنێشی بوو. چەندین فیرعەون خوشکی خۆیان یان، ئەمەشیان کەمتر، کچی خۆیانیان دەهێنا. واش دیارە ئەوە تایبەت بووە بە بنەماڵەی پادشایانە. ڕەنگە هۆیەکی ئەوەش بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەو جۆرە ژنهێنانە، کە لە ئەفسانەکانی تایبەت بە خوداوەندەکان هەیە، وەك ئیمتیازێکی پادشایانە تەماشا دەکرا کە پادشاکە لە خەڵکەکە جیادەکاتەوە.[350] هەرچەندە بەپاڵ ئەوە ڕێی تێدەچێت دەوری هەبووبێت لە هێشتنەوەی دەسەڵات لەناو بنەماڵەکە.[351]

ڕەمسیسی دووەم کە پاڵێوراوی گەورەیە بۆ ئەوە فیرعەونی مووسا بێت ژمارەیەك ژنی هەبووە کە یەکێکیان بنت عنات، کچی گەورەی خۆی لە ئیزیس نفرت (ئست نفرت)ی ژنی. کچێکی تری ڕەمسیس مریت ئیمن (مریت ئامون) لە ژنەکەی نفرتاری. کچێکی تری کە دواتر بووە ژنی ناوی (نبت تاوی) بوو. یەکێکی تر (حنت می رع) کە ناسراو نییە.

بەپێی لێکۆڵینەوەیەکیش نموونەی زۆر کەم هەن بۆ ژنهێنانی لەم جۆرە لە ناو خەڵکی سادە لە میسری فیرعەونی.[352] ڕەنگە ژنهێنانی براو خوشك لە ناو پادشایانی سەردەمی پادشانشینی نوێ و بەتایبەتی بنەماڵەی ١٨ (بنەماڵەکەی پێش ئەوەی ڕەمسیسی) زیاتر هەبووبێت، بەڵام لە سەردەمی تریش هەبووە،

---

[350] **Ian Shaw, Paul Nicholson, The British Museum Dictionary of Ancient Egypt, p.171, Terry G. Wilfong, Marriage and Divorce, in; Oxford Encyclopedia of Ancient Egypt, vol. II, p.343.**

[351] **Wilfong, *ibid*, p.343.**

[352] ***ibid*, p.344.**

تەنهاش لە سەردەمی ڕۆمایی لە میسر ژنهێنانی براو خوشك لەناو خـەڵكی ئاسـایی بڵاوبیووەوە.[٣٥٣]

## ٣١-فڕێدانی منداڵان بۆ ناو ڕوبارەكە پێش لەدایكبوونی مووسا بوو نەك دواى ناردنی بە پێغەمبەر

((وَقَالَ الْمَلأُ مِن قَوْمِ فِرْعَونَ أَتَذَرُ مُوسَى وَقَوْمَهُ لِيُفْسِدُواْ فِي الأَرْضِ وَيَذَرَكَ وَآلِهَتَكَ قَالَ سَنُقَتِّلُ أَبْنَاءهُمْ وَنَسْتَحْيِي نِسَاءهُمْ وَإِنَّا فَوْقَهُمْ قَاهِرُونَ -الاعراف:١٢٧)).

((إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِي الْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا يَسْتَضْعِفُ طَائِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَاءهُمْ وَيَسْتَحْيِي نِسَاءهُمْ إِنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ * وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا فِي الْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ الْوَارِثِينَ * وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِي الْأَرْضِ وَنُرِي فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُم مَّا كَانُوا يَحْذَرُونَ * وَأَوْحَيْنَا إِلَى أُمِّ مُوسَى أَنْ أَرْضِعِيهِ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِي الْيَمِّ وَلَا تَخَافِي وَلَا تَحْزَنِي إِنَّا رَادُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ الْمُرْسَلِينَ - القصص: ٤-٧)).

عبـدالفادی دەڵێـت لـە سـوورەتی ئـەعراف میسـرییەكان شـكاتی مووسـایان لای فیرعەون كرد ئـەویش وتـی منداڵـەكانیان دەكـوژینو ئافرەتـەكانیان دەهێڵینـەوە، سوورەتی قەصەصیش باس لـە فیرعـەون دەكـات كـە پـێش لـەدایكبوونی مووسـا منداڵەكانی دەكوشتو ئافرەتـەكانی دەهێشـتەوە، بـەم جـۆرەش ئـەو دوو ئایەتـە ناڕێكن بەیەكتر.

* * * *

كاتێك ڕەخنە دەگیرێت بەوەی كە ناڕێكی لە باسەكان هەیە پێویسـتە بزانرێـت كـە ناڕێكی كاتێك ڕاستە ئەگەر یەكێك لە دوو شتەكە هەبێتو ئەوەی تـر نـەبێت. ئـەم حاڵەتەش ئەو ناڕێكییە نایگرێتەوە چونكە هەردوو كارەكە دەكرێت هەبووبن، واتـە دەكرێت پێش لەدایكبوونی مووسا كوشتنی منداڵەكان ڕوویدابێت، دەشكرێت دوای

[353] *ibid*.

ئەوەی مووسا بووە پێغەمبەر کارەکە دەستی پێکردبێتەوە. کاتێکیش دەڵێین ((دەکرێت هەبووبن)) مەبەستمان لە مەنهجی بیرکردنەوەو ڕەخنەیە ئەگینا لە قورئان بە ئەکیدی هەبووە چونکە جاری دووەم کە باسکراوەو وەك لە ئایەتەکان دیارە دوای ئەوەی سیحری جادووگەرانی فیرعەون بەتاڵ بوو و ئەمان باوەڕیان بە مووسا هێنا:

((قَالَ فِرْعَوْنُ آمَنتُم بِهِ قَبْلَ أَن آذَنَ لَكُمْ إِنَّ هَذَا لَمَكْرٌ مَّكَرْتُمُوهُ فِي الْمَدِينَةِ لِتُخْرِجُواْ مِنْهَا أَهْلَهَا فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ * لأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلافٍ ثُمَّ لأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ * قَالُواْ إِنَّا إِلَى رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ * وَمَا تَنقِمُ مِنَّا إِلاَّ أَنْ آمَنَّا بِآيَاتِ رَبِّنَا لَمَّا جَاءتْنَا رَبَّنَا أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَتَوَفَّنَا مُسْلِمِينَ * وَقَالَ الْمَلأُ مِن قَوْمِ فِرْعَونَ أَتَذَرُ مُوسَى وَقَوْمَهُ لِيُفْسِدُواْ فِي الأَرْضِ وَيَذَرَكَ وَآلِهَتَكَ قَالَ سَنُقَتِّلُ أَبْنَاءهُمْ وَنَسْتَحْيِي نِسَاءهُمْ وَإِنَّا فَوْقَهُمْ قَاهِرُونَ –الاعراف: ١٢٣–١٢٧)).

عبدالفادی نازانێت کە ئەو ڕەخنە هەڵەیە باسێکی تەورات دەگرێتەوە ئەویش ئیشی سوخرەی بەنو ئیسرائیل کە فیرعەون پێی دەکردن پێش لەدایکبوونی مووسا (خروج: ئیصحاحی ١)و بەردەوام بوو بۆ دوای ئەو کاتەی مووسا بووە پێغەمبەر، بەڵکو قورستریش کرا لەسەریان (خروج: ئیصحاحی ٥). ئایا دەکرێت بڵێین دوو باسەکە دژ بە یەکن؟

## ٣٢–مارەیی ژنەکەی مووسا

((قَالَ إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أُنكِحَكَ إِحْدَى ابْنَتَيَّ هَاتَيْنِ عَلَى أَن تَأْجُرَنِي ثَمَانِيَ حِجَجٍ فَإِنْ أَتْمَمْتَ عَشْرًا فَمِنْ عِندِكَ وَمَا أُرِيدُ أَنْ أَشُقَّ عَلَيْكَ سَتَجِدُنِي إِن شَاء اللَّهُ مِنَ الصَّالِحِينَ – القصص: ٢٧)).

عبدالفادی دەڵێت زانراوە کە یەثرۆن، خەزووری مووسا حەوت کچی هەبووە نەك دوان و یەکێکیانی دا بە مووسا بێئەوەی هەشت یان دە ساڵ خزمەتی بکات. ئەوەی خزمەتی خەزووری کرد وەك مارەیی کچەکەی یەعقووب بوو کە حەوت ساڵ خزمەتی کرد (تکوین ٢٩: ١٨).

* * * *

تا چەند دەتوانین باوەڕ بەوە بکەین لەکاتێك خودی تەورات ناڕێکە لەبارەی خەزووری مووسا؟ تەورات (خروج ٢: ١٨) ناوەکەی بە رەعوئیل רְעוּאֵל دەبات (هەروەها لە کتێبی ژمارەکان ١٠: ٢٩ کە چوارەم کتێبی پێنج کتێبی تەورات)، بەڵام لە ئیصحاحی دوای ئەو (خروج ٣: ١،هەروەها لە چەند شوێنێکی تری کتێبی دەرچوون) ناوی بە یەثرۆن (یترۆ، یثرۆ) יִתְרוֹ دەبات. لە کتێبی ژمارەکان حۆباب חֹבָב کوڕی رەعوئێلە بەڵام لە کتێبی قازییەکان (٤: ١١) حۆباب خۆی خەزووری مووسایە. لەو دوو کتێبەی تەورات (دەرچوون، ژمارەکان) خەزووری مووسا بە میدیانی (خەڵکی میدیان) ناوبراوە بەڵام لە قازییەکان بە قینی קֵינִי (قضاة١: ١٦ و ٤: ١١).[٣٥٤]

هەر لەوێش تەورات دەڵێت مووسا مەڕەکانی خەزووری دەلەوەڕاند کە ئەمە واتای ئەوەیە کاری بۆ خەزووری دەکرد. سەبارەت بەوەش کە یەعقووب وەکو مارەیی حەوت ساڵ خزمەتی خەزووری کرد شتی نامەعقوول لەو باسە هەیە ئەویش کە یەعقووب حەزی لە راحیل بوو و حەوت ساڵ خزمەتەکەی بۆ باوکی تەواو کرد ئینجا باوکی پێی دا، واتە یەعقووب حەوت ساڵ چاوەڕێی کردو کاری کرد تا ئەوی دەستکەوت. چیرۆکەکە دوای ئەوە دەڵێت باوکی راحیل کچەکەی تری دا بە یەعقووب، چونکە گەورەکەیان بوو، بێئەوەی یەعقووب بزانێت چونکە شەو بوو بۆیە یەعقووب داوای راحیلی کردەوە ئەویش وتی دوای هەفتەیەك دەیداتێ بەو مەرجەی حەوت ساڵی تر کاری بۆ بکات (تەکوین ٢٩: ٩–٢٨).

جگە لە نامەعقوولیەتی چیرۆکەکە بەڵام وا دیارە دوو چیرۆکن‌و تیکەڵ بە یەك کرابن. چیرۆکی دووەم، ئەویش تەنها ئەم برە: راحیل دەدرێت بە یەعقووب ئینجا حەوت ساڵی کار بکات، رێی تێدەچێت بۆیە دوور نییە لە چیرۆکێکی تر

---

[٣٥٤] بۆ ئەمانەو هەوڵی وەڵامی ئەو ناڕێکییانە بڕوانە:

**Nahum M. Sarna, S. David Sperling, *Jethro*, in; Encyclopaedia Judaica, vol. 11, pp. 251-2.**

وەرگیراوەو تێکەڵ بە چیرۆکە سەیرەکەی پێشتر کراوە ئەویش کارکردن بۆ حەوت ساڵ ئینجا یەعقووب راحیل بهێنێت، سەرباری ئەوەش فێڵی لێدەکرێت.

## ٣٣-ئیسرائیل میراتیی میسری نەگرت

((قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ اسْتَعِينُوا بِاللّهِ وَاصْبِرُواْ إِنَّ الأَرْضَ لِلّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَاء مِنْ عِبَادِهِ وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ * قَالُواْ أُوذِينَا مِن قَبْلِ أَن تَأْتِينَا وَمِن بَعْدِ مَا جِئْتَنَا قَالَ عَسَى رَبُّكُمْ أَن يُهْلِكَ عَدُوَّكُمْ وَيَسْتَخْلِفَكُمْ فِي الأَرْضِ فَيَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ -الاعراف: ١٢٨-١٢٩)).

عبدالفادی ڕەخنەی ئەوە دەگرێت کە قورئان هەڵەی کردووە کاتێك باسی ئەوەی کردووە میسر بووە میراتیی بەنو ئیسرائیل. عبدالفادی قسەی بەیزاوی دەگێڕێتەوە کە گێڕاویانەتەوە کە میسر بەشێك بوو لە وڵاتانەی دەست بەنو ئیسرائیل لە کاتی داوود کەوت (ج٣، ص٥١). عبدالفادی دەڵێت هەموو کەس دەزانێت کە خاکی کەنعان نەك میسر بووە میراتیی بەنو ئیسرائیل.

* * * *

هەڵبەت لەو دوو ئایەتەی کە عبدالفادی هێناونی ئاشکراتر و گونجاوتر بۆ مەبەستەکەی هەیە ئەوەیش لە سوورەتی الشعراء:

فَأَخْرَجْنَاهُم مِّن جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ * وَكُنُوزٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ * كَذَلِكَ وَأَوْرَثْنَاهَا بَنِي إِسْرَائِيلَ (الشعراء: ٥٧-٥٩).

ئەگەر ئەوەشی ببینیایە دڵی خۆشتر دەبوو بەڵام مەخابن دڵخۆشییە یەکەمەکەی لەجێگەی خۆی نییە چونکە قسەی بەیزاوی تەنها قسەیە، ئەم ئایەتەی دوایش ئەگەر بیزانیایە هەر سوودی نەدەبوو چونکە بەڵێ بەڕاستی بەنو ئیسرائیل میراتیی میسریان گرت بەڵام لەکوێ؟

لە فەڵەستین‌و دەوروبەری لەبەر ئەوەی ئەوانە موڵکی میسر بوون. دوای رەمسیسی دووەم مرنپتاحی کوڕی‌و فیرعەونەکانی دوای ئەو هەوڵی گەڕاندنەوەی

هەیبەتی میسر لەو ناوچانەیان دابوو بەڵام وردەوردە ئەو ناوچانەیان لەدەست دەردەچوون‌و بەنو ئیسرائیل وردەوردە دەستیان بەسەر چەند ناوچەیەك دەگرت تا شكۆمەندییەكی گەورەیان لەسەردەمی داوود و زیاتر سەردەمی سولەیمان دامەزرا.

## دەربارەی گورزەكان لە میسر

دوو پرسیار هەن: ژمارە ٣٤ كە باسی هەموو گورزەكانەو ژمارە ٥١ كە باسی لافاوە.

## ٣٤–گورزەكان كە لە میسر دران دە بوون نەك نۆ

وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى تِسْعَ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ فَاسْأَلْ بَنِي إِسْرَائِيلَ إِذْ جَاءهُمْ فَقَالَ لَهُ فِرْعَونُ إِنِّي لَأَظُنُّكَ يَا مُوسَى مَسْحُورًا * قَالَ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا أَنزَلَ هَؤُلاء إِلاَّ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ بَصَآئِرَ وَإِنِّي لَأَظُنُّكَ يَا فِرْعَونُ مَثْبُورًا * فَأَرَادَ أَن يَسْتَفِزَّهُم مِّنَ الأَرْضِ فَأَغْرَقْنَاهُ وَمَن مَّعَهُ جَمِيعًا * وَقُلْنَا مِن بَعْدِهِ لِبَنِي إِسْرَائِيلَ اسْكُنُواْ الأَرْضَ *فَإِذَا جَاء وَعْدُ الآخِرَةِ جِئْنَا بِكُمْ لَفِيفًا*

(الاسراء : ١٠١–١٠٤).

عبدالفادی لێرە سێ ڕەخنەی هەیە:

١–لە قورئان باسی نۆ گورز كراوە بەڵام تەورات باسی دە گورز دەكات.

٢–پاش لەناوچوونی فیرعەون‌و لەشكرەكەی لە دەریا بەنو ئیسرائیل لە میسر نیشتەجێ نەبوون بەڵكو لە كەنعان.

٣–فیرعەون نەیدەویست جوولەكە لە میسر دەربكات بەڵكو دەیویست بیانهێڵێتەوە بۆ ئەوەی كۆیلەیان بكات.

* * * *

سەبارەت بە گورزەكان ئایەتەكە باسی نۆ گورز ناكات بەڵكو نۆ نیشانە كە موفەسیرەكان بەچەند جۆرێك تەفسیریان كردووەو ئەمانەی خوارەوە نزیكترن لە دەقەكانی قورئان:

نیشانەی کردنی دارەکە بە مار، نیشانەی دەستەکە، خوێن، بۆق، کولله، لافاو، ((قوممەل))، قاتوقڕی، خنکان لە دەریا.

نیشانەی دوایەمین نیشانە نەبوو بۆ فیرعەون چونکە دوای لەناوچوونی لەشکرەکەی فیرعەون بوو بەڵام دەتوانرێت بوترێت نیشانە بوو بۆ خەڵکی میسر بەگشتی. دەشکرێت لەجیاتی ئەوە (الرجز) بێت کە سزایەکی ناونەبراوە:

((وَلَمَّا وَقَعَ عَلَيْهِمُ الرِّجْزُ قَالُواْ يَا مُوسَى ادْعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ لَئِن كَشَفْتَ عَنَّا الرِّجْزَ لَنُؤْمِنَنَّ لَكَ وَلَنُرْسِلَنَّ مَعَكَ بَنِي إِسْرَائِيلَ * فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُمُ الرِّجْزَ إِلَى أَجَلٍ هُم بَالِغُوهُ إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ– الأعراف: ١٣٤–١٣٥)).

سزاکانی تەوراتیش دە سزان: خوێن، بۆق، مێشوولە، مێش، تەپوتۆز، دوومەڵ، تەرزە، کولله، تاریکی، مردنی نۆبەرەکانی میسرییەکان. بەم جۆرەش ئەوانەی لە قورئان باسکراون جیاوازن لەوانەی تەورات چونکە ئەوانەی قورئان نیشانەن کە بەشێکیان سزانو ئەوانەی تەورات سزانو دەکرێت سزای تر هەبن لە قورئان باس نەکرابن یان بەپێچەوانەوە دە سزاکەی تەورات لەوە کەمتر بنو نووسەرانی تەورات زیادیان کردبن.

سەبارەت بە ڕەخنەی دووەمیش کە گوایە قورئان وتوویەتی ئیسرائیلییەکان لە میسر نیشتەجێ بوون، ئەوە هەڵەیەکە دەگەڕێتەوە بۆ تێگەیشتنی عبدالفادی چونکە ئایەتەکە دەڵێت: ((وَقُلْنَا مِن بَعْدِهِ لِبَنِي إِسْرَائِيلَ اسْكُنُواْ الأَرْضَ))، مەبەستیش لە زەوی لێرە ئەو زەوییەیە کە لە ئایەتی تر بە ((زەویی پیرۆز)) ناوبراوە واتە فەڵەستینو دەوروبەری وەك چۆن لەسەر زاری مووسا دەڵێت: ((يَا قَوْمِ ادْخُلُوا الأَرْضَ الْمُقَدَّسَةَ الَّتِي كَتَبَ اللّهُ لَكُمْ..– المائدة: ٢١))، لەدوای خنکاندنی قەومەکەی فیرعەونیش: ((وَأَوْرَثْنَا الْقَوْمَ الَّذِينَ كَانُواْ يُسْتَضْعَفُونَ مَشَارِقَ الأَرْضِ وَمَغَارِبَهَا الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا... – الاعراف: ١٣٧)).

سەبارەت بە ڕەخنەی سێیەم کە قورئان دەڵێت فیرعەون ویستبووی بەنو ئیسرائیل لە میسر دەربکات بەڵام تەورات دەڵێت فیرعەون دەیویست بۆ کۆیلێتی

بیانهێڵێتەوە قورئان ڕوونـە لـەوەی فیرعـەون نەیویسـت ئیسـرائیلییەکان دەربچـن چـونکە جگـە لـەوەی کـە لـە قورئـان فیرعـەون نـە زۆری لێکردبـوونو نـە ڕێگـەی پێدابوون دەربچن ئەو تەنانەت قبووڵیشی نـەکردبوو دەربچـن (بڕوانـە ئایەتـەکانی دواتر)و دەرچوونەکەیان بە شەو بوو: ((وَلَقَدْ أَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِي فَاضْرِبْ لَهُمْ طَرِيقًا فِي الْبَحْرِ يَبَسًا لَّا تَخَافُ دَرَكًا وَلَا تَخْشَى–طه: ٧٧))، ((وَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِي إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ–الشعراء: ٥٢))، ((فَأَسْرِ بِعِبَادِي لَيْلًا إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ–الدخان: ٢٣))، شەوڕەوییەکەش، کە ڕواڵەتی دەقی تەوراتیشـە، گونجـاوترە لـە باسـەکەی تەورات کە لەلایـەك دەڵێت فیرعـەون پـاش گـوڕزی مردنـی نۆبـەرەکان ڕێگـەی دا ئیسرائیلییەکان دەربچن، میسرییەکانیش خۆیان داکۆکییـان لێکـردن کـە دەربچـن (خروج ١٢: ٣١–٣٣)، کەچی هەرچەندە میسرییەکان زانییان بەنو ئیسـرائیل وڵات جێدەهێڵن قبووڵیشیان کـرد کەلوپـەلی زیـو و زێـڕ و پۆشـاکیان بـە قـەرز بـدەنێ. دیارە نووسەرانی تەورات بۆ پاساو هێنانەوە بـۆ ئەمـە ئـەوەیان زیـاد کـردووە کـە خودا نیعمەتی بە ئیسرائیلییەکان بەخشی کە میسرییەکان ئـەو کەلوپەلانـەیان بـە قەرز پێـدان (خـروج ١٢: ٣٥–٣٦، هـەروەها ٣: ٢١–٢٢، هـەروەها ١١: ٢–٣).[٣٥٥] ئەو قسەیەش کە لە کتێبی (ژمارە) هاتووە تەفسیری ئەوە ناکات بەڵکو ئـاڵۆزتری دەکات. لەو کتێبە وتراوە کە ئیسرائیلییەکان بەبەرچـاوی میسـرییەکان دەرچـوون چـونکە میسـرییەکان خـەریکی ناشـتنی نۆبـەرەکانیان بـوون (العـدد ٣٣: ٣–٤) چونکە کتێبی دەرچوون باسـی وەرگـرتنی کەلوپەلـەکان پـاش مردنـی نۆبـەرەکان دەکـات، کەواتـە نـەك تـەنها میسـرییەکان شـتەکانیان بـە ئیسـرائیلییەکان دا

[٣٥٥] داواکارییە کۆنەکەی مووسا ئەوە بوو بۆ ماوەی سێ ڕۆژ بچنە چۆڵەوانی بـۆ ئـەوەی جـەژنی خودا بگێڕنو ئەمە وەکو فێڵێك بوو بـۆ ئـەوەی بەتـەواوەتی لـە میسـر هـەڵبێن (خـروج ٥: ٣)، بەڵام سیاقی باسی ڕێگەپێدانەکەی فیرعەونو داواکەی میسرییەکان وا دەخوازێت ڕێگەپێدانەکە بۆ دەرچوونێکی تەواوەتییە نەك کاتی، ئەوەش بەئاشکرایی لە (خروج ١١: ١) دیـارە کـە خـودا پێش گوڕزی نۆبەرەکان دەڵێـت: ((کـاتێکیش بـەرەڵاتان دەکـات بەتـەواوەتی لێـرە دەتانکاتـە دەرەوە))، هەروەها (خروج ١٢: ٣٩): ((چونکە لە خاکی میسر دەرکران)).

هەرچەندە دەیانزانی وڵات جێدەهێڵن بەڵكو لەوە زیاتر ئەو كارەیان كرد لەو كاتەی ئەو كارەساتە لە هەمووماڵەكان قەومابوو.

قورئان باسی داواكارییەكەی مووسا كە فیرعەون ئیسرائیلییەكان بەرەڵا بكات: ((وَقَالَ مُوسَى يَا فِرْعَوْنُ إِنِّي رَسُولٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِينَ*حَقِيقٌ عَلَى أَن لاَّ أَقُولَ عَلَى اللّهِ إِلاَّ الْحَقَّ قَدْ جِئْتُكُم بِبَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ فَأَرْسِلْ مَعِيَ بَنِي إِسْرَائِيلَ–الاعراف: ١٠٤–١٠٥))، ((وَلَقَدْ فَتَنَّا قَبْلَهُمْ قَوْمَ فِرْعَوْنَ وَجَاءهُمْ رَسُولٌ كَرِيمٌ *أَنْ أَدُّوا إِلَيَّ عِبَادَ اللَّهِ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ– الدخان: ١٧–١٨)). ئەوان بەڵێنیان بە مووسا دا قەومەكەی بەرەڵا بكەن بەلام پاشگەزبوونەوە: ((وَلَمَّا وَقَعَ عَلَيْهِمُ الرِّجْزُ قَالُواْ يَا مُوسَى ادْعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ لَئِن كَشَفْتَ عَنَّا الرِّجْزَ لَنُؤْمِنَنَّ لَكَ وَلَنُرْسِلَنَّ مَعَكَ بَنِي إِسْرَآئِيلَ* فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُمُ الرِّجْزَ إِلَى أَجَلٍ هُم بَالِغُوهُ إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ–الاعراف: ١٣٤–١٣٥)).

بۆیە ڕەنگە وشەی (زەوی) لە ئایەتی ((فَأَرَادَ أَن يَسْتَفِزَّهُم مِّنَ الأَرْضِ فَأَغْرَقْنَاهُ وَمَن مَّعَهُ جَمِيعًا)) هەمان وشەی زەوییە كە مەبەست لێی زەویی پیرۆز، واتە فیرعەون ویستی نەچنە ناو فەڵەستین كە سەر بەو بوو و هەر ئەو بوو ناچاری كردبوون ئەو ڕێگەیە بگرنە بەر كە لە ڕێگەی میسر–فەڵەستین دووریاندەخاتەوە. لە تەوراتیش گۆڕینی ئەو ڕەوتە باس كراوە بەڵام تەفسیرێكی تری پێدراوە كە گوایە خودا ئەو ڕەوتەی پێ گۆڕین:

((كاتێكیش فیرعەون گەلەكەی بەرەڵا كرد خودا ڕێگەی خاكی فەڵەستینییەكانی پێ پیشان نەدان هەرچەندە نزیك بوو چونكە خودا وتی: نەوەكو گەلەكە پەشیمان ببنەوە ئەگەر تووشی جەنگ ببن و بگەڕێنەوە بۆ میسر، ئیتر خودا ڕووی گەلی وەرچەرخان بەرەو ڕێگەی چۆڵەوانیی دەریای سووف– خروج ١٣: ١٧–١٨)).

ئەوەش كە ئەم بۆچوونەمان بەهێز دەكات ئەوەیە باسی ئەم هەوڵەی فیرعەون بۆ ڕێگەگرتن لە بەنو ئیسرائیل بچن بۆ فەڵەستین و خنكانی لە دەریا لە یەك ئایەت هاتووە بەجۆرێك تێدەگەین لە یەك كات بوو، دیاریشە پێش ئەوەی لەشكرەكەی

نوقمی دەریا بێت بەنو ئیسرائیل بەرەو فەڵەستین دەچوون ئەویش نەیویست بچن بەڵکو ویستی دەستگیریان بکات.[٣٥٦]

## ٥١- لافاو بۆ میسرییەکان

((فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الطُّوفَانَ وَالْجَرَادَ وَالْقُمَّلَ وَالضَّفَادِعَ وَالدَّمَ آيَاتٍ مُّفَصَّلاَتٍ فَاسْتَكْبَرُواْ وَكَانُواْ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ -الاعراف:١٣٣)).

عبدالفادی پاش ناوبردنی دە گورزەکە کە لە میسرییەکانی دا دەڵێت لافاو لە میسری کاتی فیرعەونی نەدا بەڵکو ڕووداوێکی ناودار بوو تووشی قەومی نووح بوو وەك لە قورئان هاتووە.

* * * *

یەکێك لەو گورزانەی لە تەورات هاتوون ڕووداوێکی نزیکە لە لافاو. گورزەکە بە کورتی بە گورزی تەرزە ناسراوە بەڵام ئەگەر وردەکارییەکەی ببینین دەزانین کە پێویستە ئەنجامەکەی لافاو بووبێت چونکە باسی ناردنی تەرزە بە ئەندازەیەکی زۆر گەورە دەکات کە لەوەتەی میسر دامەزرابوو نموونەی نەبووە (خروج ٩: ١٨)و سەرانسەری میسر گرتەوە(خروج ٩: ٢٢ و ٢٥)و شتێکی زۆر مەزن بوو کە هاوشێوەی لە هەموو زەویی میسر ڕووی نەدابوو لەو کاتەوە ببووە نەتەوە (خروج ٩: ٢٤)، دواییش دەزانین تەنها تەرزەو هەورەگرمەش نەبوو بەڵکو بارانیش بوو (خروج ٩: ٣٣). تەرزەو بارانی مەزنی وا لە هەر شوێنێك ببارێت لافاوی بەدوا نایەت؟ بێگومان لافاوەکە دێت ئەگەر لە زەوییەکی ئاسایی بێت، بەڵام بۆ میسر

---

[٣٥٦] وشەی (استفز) و شێوەکانی لە چەند ئایەتێکی قورئان هاتوون کە یەکێکیان لەگەڵ دەرکردن ناگونجێت: واستفزز من استطعت منهم بصوتك کە قسەی خودایە لەگەڵ ئیبلیس. واتایەکی (فزّ) بریتییە لە ترساندن (لسان العرب، ٥، ص ٣٠٤٩). ئەسڵی فرمانی (استفزز)یش لای قورتوبی (بڕین)ـە (الجامع لاحكام القران، ١٣، ص ١١٨)، بەم شێوەیەش دەتوانین بڵێین فیرعون ویستی ڕێگەی گەیشتن بە زەویی پیرۆزیان پێ ببڕێت کە دیارە ئەمە نیازی بوو.

لافاوەکە حەتمییە چونکە بەشە ئاوەدانەکەی میسر بریتییە لە دۆڵێك نیلی بەناو دەڕوات، دۆڵی نیلیش هێندە بەرتەسکە بەجۆرێك کە لەو شوێنەی تاڤگەی یەکەم (لە باشووری میسر) جێدەهێڵێت بۆ تەنها ١٠ میل (١٦ کیلۆمەتر) فراوان دەبێتو کاتێك دەڕژێتە ناو دەریا (واتە لە باکوور و کە زەوییەکە فراوان دەبێت) دەوروبەری ٣١ میل (نزیکە ٥٠ کیلۆمەتر) دەبێت[٣٥٧]، بەڵام لە هەندێك شوێن زۆر لەوەش کەمتر دەبێت، بۆیە هەموو ئەو تەرزە بارانە لە شوێنێکی بچووك کۆدەبنەوەو ئاستی رووبارەکە بەرزدەکەنەوەو دەبنە لافاو.

## ٣٥-بەردەکەی حۆرێب بیرەکانی ئێلیم نییە

وَإِذِ اسْتَسْقَى مُوسَى لِقَوْمِهِ فَقُلْنَا اضْرِب بِّعَصَاكَ الْحَجَرَ فَانفَجَرَتْ مِنْهُ اثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْناً قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ كُلُواْ وَاشْرَبُواْ مِن رِّزْقِ اللَّـهِ وَلاَ تَعْثَوْاْ فِي الأَرْضِ مُفْسِدِينَ- البقرة: ٦٠)).

وَقَطَّعْنَاهُمُ اثْنَتَيْ عَشْرَةَ أَسْبَاطًا أُمَمًا وَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى إِذِ اسْتَسْقَاهُ قَوْمُهُ أَنِ اضْرِب بِّعَصَاكَ الْحَجَرَ فَانبَجَسَتْ مِنْهُ اثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ وَظَلَّلْنَا عَلَيْهِمُ الْغَمَامَ وَأَنزَلْنَا عَلَيْهِمُ الْمَنَّ وَالسَّلْوَى كُلُواْ مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَكِن كَانُواْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ-الاعراف: ١٦٠)).

قورئان باسی موعجیزەیەکی مووسا دەکات: کاتێك قەومەکەی داوای ئاویان لێ کرد خودا فەرمانی پێدا بە دارەکەی لە بەرد بدات ئیتر دوانزە کانی، بە ژمارەی دوانزە تیرەی قەومەکەی، تەقینەوە. عبدالفادی دەقی تەورات دەهێنێتەوە کە خەڵکەکە گەیشتنە (ئێلیم)و دوانزە کانیو حەفتا دارەخورمایان بینی (خروج ١٥: ٢٧) پاشان ئەوێیان جێهێشتو چوونە چۆڵەوانیی (سین) کە کەوتۆتە نێوان ئێلیمو سینای (سینائـ) סִינַי (خروج ١٦: ١)، لەوێشەوە چوونە (رفیدیم)و ئاو لەوێ

[٣٥٧] ج. هـ. بریستد، تاریخ مصر، ص٢.

نەبوو، خەڵکەکەش بێزاریی خۆیان لە مووسا دەربڕی ئەویش داوای لە خودا کرد، خوداش پێی وت دەچمە سەر ئەو بەردەی لە (حۆرێب)ـە تۆش بە دارەکە لێی بدەو ئاوی لێ دەردەچێت (خروج ١٧: ١-٦).

* * * *

ڕەخنەکەی عبدالفادی ئەوەیە ئەو دوانزە کانییەی ئێلیم ئەو بەردەی حۆرێب نییە. ڕەنگە مەبەستی ئەوە بێت دوانزە کانییەکە لە ئێلیم هەبوون و لێدانی بەردەکە لە حۆرێب بوو بەڵام لەوێ دوانزە کانی نەبووە بەڵکو تەنها باسی ئاو دەرچوون کراوە.

ماف خۆشمانە بپرسین: چۆن بوو لە ئێلیم אֵילִם بە ژمارەی تیرەکانی بەنو ئیسرائیل کانی هەبوون، بەڵام لە حۆرێب חֹרֵב دوانزە کانی بە دارەکەی مووسا هەڵنەقوڵان؟ ئەمەش بۆ خۆی دوو پرسیارە: یەکەمیان ئەوەیە دوانزە تیرەکە دەگەنە شوێنێکو دەبینن دوانزە کانی بۆیان ئامادەن (لە هەندێك وەرگێڕانی تەورات لەجیاتی دوانزە کانی دوانزە بیر هەبوون)، کە ئەمەیان لە ڕێکەوتێکی زۆر سەیر دەچێت بەپێچەوانەی قورئان کە ئەمە بۆ کارێکی بەئەنقەست دەگەڕێنێتەوە. دووەم پرسیاریش ئەوەیە پاش ئەو ڕێکەوتە سەیرە دەچنە رفیدیم רְפִידִים کە ئاوی لێ نەبوو و داوای ئاو دەکەن کەچی کارە بەئەنقەستەکەو موعجیزە خوداییەکە وەکو ڕێکەوتەکەی پێ نەکراو لەجیاتی دوانزە کانی یەك کانی هەڵقوڵا.

ئاشکرایە هەبوونی دوانزە کانی بۆ دوانزە تیرە بۆ ئەوەی هەر تیرەیەك کانیی خۆیی هەبێت هەر وەك قورئان دەڵێت: ((قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ)). تەنانەت لە تەوراتیشو لە باسی رۆیشتن لە سینەوە بۆ رفیدیم وتراوە: ((پاشان هەر کۆمەڵێکی بەنو ئیسرائیل لە چۆڵەوانیی سین دەرچوون بەپێی قۆناغەکانیان)) (خروج ١٧: ١). کەواتە کێشەکە لە دەقی تەورات هەیە.

بەپاڵ هەموو ئەمانەشەوە ناڕێکییەك لەباسەکانی تەوراتی بەردەستمان هەیە چونکە ئەوەی لەسەرەوە بینیمان لە کتێبی (دەرچوون) بوو، بەڵام لە کتێبی (ژمارە) شتی تر هەیە: بێزاریی ئیسرائیلییەکان لە رفیدیم نەبوو بەڵکو لە چۆڵەوانیی صین (تسین) بوو ((کە قادێشە)). چیرۆکەکەش لێرە جیاوازە چونکە لەجیاتی فەرمانی خودا کە مووسا بە دارەکەی لە بەردەکە بدات پێی وت قسە لەگەڵ بەردەکە بکات بەڵام مووسا دوو جار دارەکەی بە بەردەکە کێشاو ئاو دەرچوو. ئەمەش شتێکی بچووکە لەچاو ئەمەی خوارەوە:

ئەم ڕووداوەی کتێبی (ژمارە) لە دوای ساڵی دووەمی دەرچوونیان بوو، بەڵام باسەکەی کتێبی (دەرچوون) لە سەرەتای دەرچوونیان بوو، ئەویش لە مانگی دووەمی دەرچوونیان (خروج ١٦: ١)، زیاتریش لەوە تەئیکد دەبین کاتێك دەبینین لە مانگی سێیەمی دوای دەرچوونیان لە رفیدیم چوون بۆ سینائـ (خروج ١٩: ١).

کتێبی (ژمارە)ش چۆڵەوانیی سین מִדְבַּר סִין و چۆڵەوانیی صین (تسین) מִדְבַּר צִן ی بە دوو شوێنی جیاواز پیشان داوە. ڕێڕەوی ئیسرائیلییەکانیش ئەوە دەردەخات: دەچنە چەند شوێنێك پاشان ئێلیم کە دوانزە کانییەکەی لێ بوو پاشان دەریای سووف (دەریای سوور)، پاشان چۆڵەوانیی سین پاشان دوفقە דָּפְקָה پاشان ئالووش אָלוּשׁ پاشان رفیدیم لەویش ئاو نەبوو بیخۆنەوە بەڵام کتێبەکە باسی دەرچوونی ئاو لە بەردەکە ناکات پاشان چۆڵەوانیی سینائـ، ئینجا پاش ژمارەیەك قۆناغو شوێنی تر گەیشتنە چۆڵەوانیی صین کە قادێشە (العدد ٣٣: ٩-٣٦). ئا لێرەش، واتە چۆڵەوانیی صین باسی دەرچوونی ئاوەکە لە بەردەکە کراوە (ئیصحاحی ٢٠) نەك رفیدیم، وەك کتێبی دەرچوونی باسی کردووە، کە ئەم ریفیدیمە دوای سین بوو (العدد ٢٠: ١-١١)، ئەمەش مانگی یەکەمی ساڵی سێیەم بوو نەك سەرەتای دەرچوونیانو بەم جۆرە ناڕێکیی نێوان دوو کتێبەکە هەیە. ئەوەشی زیاتر گومانەکە ناهێڵێت ئەوەیە لە کتێبی دەرچوون مووسا شوێنەکە ناو دەنێت مەسساه מַסָּה و مەریباه מְרִיבָה لەبەر ئەوەی

گەلەکە ناکۆکیی لەگەڵ خودا کردو لەبەر ئەوەی خودایان تـاقیکردەوە(خروج ١٧: ٧)، لە کتێبی ژمـارەش خـودا شـوێنەکە نـاو دەنێـت مـەریباه لەبـەر ئـەوەی بـەنو ئیسـرائیل ناکۆکییـان لەگـەڵ پـەروەدگاریان کرد(العـدد٢٠: ١٣)، واتـە باسـی یـەك ڕووداوی دەرچوونی ئاو لە بەرد کراوە بەڵام لە هەر کتێبێك لـەم دوانـە لـە کاتێـكو شوێنێکی جیاواز باس کراوە" لە کتێبی دەرچوون لە ڕفیدیم بوو و لە کتێبی ژمارە لـە چـۆڵەوانیی صـین بـوو. سـەرباری هـەموو ئەمـەش نـاوی مـەریباه لـە هـەردوو شوێنەکە هەیە.

لەناو ئەم ناڕێکییانەش چۆن دەتوانین بڵێین تەوراتی بەردەسـتمان حاکمـە بەسـەر قورئانو قسەکەی ئەو ڕاستە سەبارەت بە چیرۆکی دوانزە کانییەکە؟

## ٣٦-دوو لەوحەکەی شەریعەت

((وَكَتَبْنَا لَهُ فِي الأَلْوَاحِ مِن كُلِّ شَيْءٍ مَّوْعِظَةً وَتَفْصِيلاً لِّكُلِّ شَيْءٍ فَخُذْهَا بِقُوَّةٍ وَأْمُرْ قَوْمَكَ يَأْخُذُواْ بِأَحْسَنِهَا سَأُرِيكُمْ دَارَ الْفَاسِقِينَ –الاعراف:١٤٥)).

عبـدالفادی دەڵێـت زانـراوە کـە مووسـا شـەریعەتی لەسـەر دوو لـەوح نـەك چـەند لـەوحێك نووسـییەوەو لەسـەر ئـەو دوو لەوحـە دە ئامۆژگارییەکـەی نووسـی نـەك وردەکاریی هەموو شتێك.

* * * *

ئێمەش دەڵێین هەروەها زانراوە کە لە کتێبی دەرچوون دە ئامۆژگارییەکە بـەپاڵ ئامۆژگارییـەکانو یاسـاکانی تـر هـەن کـە ئەوانـەی جگـە لـە دە ئامۆژگارییەکـە (خروج٢٠) سێ ئیصحاح داگیردەکەن" ئیصحاحی ٢١ تا ٢٣ ، ئەوەش ئـەو کاتـەی مووسا (لەگەڵ هارون) لە کێوی سـینا بـوو و خەڵکەکـە لـە خـوارەوە بـوون، ئـەو یاسایانەش ئەوانەن کە قورئان بە وردەکـاریی هـەموو شـتێك (تفصـیلا لکـل شـئ) ناویان دەبات. مووسا دوایی هەموو ئەو حوکمانـەی بـە خەڵکەکـە وت و ئـەوان بـە یـەك دەنـگ وتیـان کـار بـە هـەموویان دەکـەین، مووسـاش هـەموو ئـەو شـتانەی

نووسی(خروج٢٤: ٣-٤)، کەچی دەبینین بۆ بەیانی کتێبی پەیمانیان بۆ دەخوێنێتەوە (خروج ٢٤: ٧)، ئینجا بە فەرمانی خودا خۆیو هاڕوونو حەفتاو دوو گەورەی بەنو ئیسرائیل سەرکەوتنو خودایان بینیو پێکەوە خواردیانو خواردیانەوە(خروج٢٤: ٩-١١)، ئینجا خودا پێی دەڵێت تەنها تۆ سەربکەوەو لەوێ چاوەڕێ بکە تا دوو لەوحی بەردەکەت بدەمێ کە شەریعەتو ئامۆژگارییەکانیان لەسەرە کە بۆم نووسین (خروج٢٤: ١٢).. کەواتە

١-مووسا پێشتر حوکمەکانی شەریعەتی نووسی.

٢-دواتر خودا پێی وت لەسەر دوو لەوحەکە شەریعەتیشو ئامۆژگارییەکانی بۆ دەنووسێت.

دوای ئەوەش ژمارەیەك داواکاریی زۆری خودا کە بەنو ئیسرائیل بیکەن: کەلوپەلی زێرو زیۆ و مسو قوماشی وەنەوشەییو... تاد و دروستکردن تابووت و مێزی نانی پێشکەشکاریو منارەو نیشەجێیەكو شوێنی سەربڕینو پۆشاکی کاهنەکان.... ئەمانەو شتی زۆری ترو هەموو بە وردەکاریی زۆر کە پێنج ئیصحاح (٢٥-٣٠) داگیردەکەن، ئینجا تەورات دەڵێت: کە خودا قسەکانی لەگەڵ مووسا لەسەر کێوی سینا تەواوکرد دوو لەوحی ئامۆژگارییەکەی دایە (٣١: ١٨)، بەڵام وەك وتمان نەك تەنها ئامۆژگاری بەڵکو شەریعەتیشی بۆ نووسیبوو.

لەدوای ئەوەش گەڕانەوەکەیو بینینی گوێرەکە زێڕینەکەو شکاندنی دوو لەوحەکە (خروج ٣٢)و دوایی خودا پێی دەڵێت دوو لەوحی بەرد بتاشە وەکو ئەوانەی پێشوو و من قسەی سەر دوو لەوحی پێشوویان لەسەر دەنووسم (خروج٣٤: ١)، هەر وەکو جارەکەی تریش مووسا چل ڕۆژو چل شەو لە کێوی سینا دەمێنێتەوە (ئەمجارە بەڕۆژوو دەبێت)و خودا چەند ئامۆژگارییەکی دەکات کە لەناو ئەوانە تەنها نەپەرستنی غەیری خوداو پاراستنی شەممەیان لە دە ئامۆژگارییەکەی پێشوو دەچن کەچی تەورات لێرە دەڵێت: خودا پێی دەڵێت ئەم قسانەم بنووسە، پاش باسی مانەوەی بۆ چل رۆژو چل شەو: مووسا لەسەر دوو

لەوحەکە قسەی پەیمانی نووسی (واتە خۆی نووسی نەك خـودا بـۆی نووسـی) کـە دە ئامۆژگارییەکـەن(خروج٣٤: ١٤–٢٨)، بەواتایـەکی تـر دە ئامۆژگارییەکـە لێـرە دەبنە شتێکی تر، جگەلەوەی وەکو وتمان پێشتر پێی دەڵێت من قسەکانی خۆمت لەسـەر دوو لەوحـە تـازە دەنووسـمو دوایـی دەبیـنین مووسـا خـۆی ئەوانـە (کـە جیاوازییان زۆرە لەوانەی پێشوو) دەنووسێت.

ناڕێکییەکی تریش ئەوەیە ئەو شوێنە لە کتێبی دەرچوون چیای سینا بـوو (خـروج ١٩: ١٦ و ٢٠) بەڵام لە کتێبی تەثنیە بە خەڵکەکە دەڵێت خودا لـە چیای حۆرێب قسەی لەگەڵ کردن (تثنية ٤: ١٠، ١٥).

کەواتـە جارێـك باسـی دە ئامۆژگارییەکەیـەو جارێـك باسـی ئـەوانو شـەریعەتە، سەرلەبەری باسـەکانیش ناڕێکییـان لـەخۆ گرتـووە، لـەناو ئـەو ناڕێکییانـەش کـێ دەتوانێت بڵێت ئەوەی مووسا وەریگرتبوو دوو لەوح بوون یان هەزار؟

## ٣٧–ئایا داوایان کردبوو خودا ببینن؟

((وَإِذْ قُلْتُمْ يَا مُوسَى لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّى نَرَى اللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْكُمُ الصَّاعِقَةُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ * ثُمَّ بَعَثْنَاكُم مِّن بَعْدِ مَوْتِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ–البقرة: ٥٥–٥٦)).

((يَسْأَلُكَ أَهْلُ الْكِتَابِ أَن تُنَزِّلَ عَلَيْهِمْ كِتَابًا مِّنَ السَّمَاء فَقَدْ سَأَلُواْ مُوسَى أَكْبَرَ مِن ذَلِكَ فَقَالُواْ أَرِنَا اللّهِ جَهْرَةً فَأَخَذَتْهُمُ الصَّاعِقَةُ بِظُلْمِهِمْ ثُمَّ اتَّخَذُواْ الْعِجْلَ مِن بَعْدِ مَا جَاءتْهُمُ الْبَيِّنَاتُ فَعَفَوْنَا عَن ذَلِكَ وَآتَيْنَا مُوسَى سُلْطَانًا مُّبِينا–النساء: ١٥٣)).

عبدالفادی دەڵێت قورئـان باسـەکەی تـەوراتی پێچـەوانە کردۆتـەوە لەبـەر ئـەوەی دەڵێت بەنو ئیسرائیل داوایان کرد خودا ببیـنن لـەکاتێك تـەورات دەڵێـت کـە بـەنو ئیسرائیل لە خودا ترسانو بـە مووسـایان وت تـۆ قسـەمان لەگـەڵ بکـەو با خـودا قسەمان لەگەڵ نەکات با نـەمرین (خـروج ٢٠: ١٩). ڕەنگـە موحەممـەد ویسـتبێتی عەرەب بترسێنێت کاتێك داوایان کردبوو کتێبێکیان لە ئاسمانەوە بۆ دابەزێنێت.

* * * *

عبدالفادی تەنها ئـەو ڕستەیەی سـەرەوە دەهێنێتـەوە سـەبارەت بـە باسـی بـەنو ئیسرائیل کە دەنگی خودایان نەبیستبوو، بـەڵام هـەر تـەورات خـۆی باسـی ئـەوە دەکات کە بەنو ئیسرائیل دەنگی خودایان بیستبوو:

لە کتێبی تەثنیە دوای دە ئامۆژگارییەکە مووسا پێیان دەڵێت: ئێوە وتتان ئەوەتا پـــەروەردگار (یـــەهوەه) شـــکۆمەندیو مـــەزنێتیی خۆیمـــان پـــێ پیشـــانداینو لەناوەڕاستی ئاگر گوێمان لە دەنگی بوو (تثینة ٥: ٢٤). کەواتە گوێیان لـە دەنـگ بوو هەرچـەندە دواتـر باسـی قسـەکەیانە کـە دەڵـێن: ئەگـەر دەنگـی پـەروەردگار ببیستن دەمرین (تثنیة ٥: ٢٥). لە ئیصحاحی پێش ئەوەش مووسا هەمان شـتیان پێ دەڵێت: پەروەردگار (یـەهوە) لـە ناوەڕاسـتی ئاگرەکـە قسـەی لەگـەڵ کـردنو دەنگی قسەکردنتان دەبیستو وێنەتان نەدەبینی (تثنیة ٤: ١٢).

داواکردنی بینینی خودا شتێکی ون نییە لە تـەورات بـەڵکو ئامـاژە هـەن بـۆی، بـۆ نموونە:

دابەزە گەل ئاگادار بکەرەوە نەوەکو خۆیان بکەن بە شوێنەکە بۆ لای پەروەردگار بۆ ئـەوەی تەماشـا بکـەن[٣٥٨] ئـیتر کەسـانێکی زۆریـان دەکـەون (خـروج ١٩: ٢١). کەواتە نیازێکی تەماشاکردن هەبوو. لە هەمان کتێبیش (خروج ٢٤: ٩–١١) باسـی مووساو هـاروونو نـاداب و ئـەبیهوو لەگـەڵ حـەفتا شـێخی ئیسـرائیل سـەرکەوتنو خودای ئیسرائیلیان بینیو لـەژێر دوو پێـی وەکـو عـەقیقی شـینی ڕوونو[٣٥٩] وەکـو ئاسمان بوو لە پاکی بەڵام دەستی نەبرد بۆ ئەشراف بەنو ئیسرائیل ئـیتر خودایـان بینیو خواردیانو خواردیانەوە. دەقێکی تریش بۆ قبووڵنەکردنی خودا کـە ببیـنن

[٣٥٨] یان بەپێی وەرگێڕانی تر: بۆ ئەوەی پەروەردگار ببینن.. یان: بۆ ئەوەی هەوڵ بـدەن خـودا ببینن.

[٣٥٩] ئەم ڕستەیە بەپێی وەرگێڕانەکان دەگۆڕێت: شتێکی دروستکراو وەك عەقیقی شـینی ڕوون، وەکو ئەرزیەی یاقووتی شینی ڕوون...

لە (تثنية ٤: ١٥): ئێوە هیچ وێنەیەکتان نەبینی ئەو رۆژەی پەروەردگار لە حۆرێب لەناوەڕاستی ئاگرەوە قسەی لەگەڵ کردن ئەویش نەوەکو گەندەڵ بىن و پەیکەرێکی تاشراو بۆ خۆتان دروست بکەن.

## ٣٨-قۆرەح نەك قاروون

((إِنَّ قَارُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَى فَبَغَى عَلَيْهِمْ وَآتَيْنَاهُ مِنَ الْكُنُوزِ مَا إِنَّ مَفَاتِحَهُ لَتَنُوءُ بِالْعُصْبَةِ أُولِي الْقُوَّةِ إِذْ قَالَ لَهُ قَوْمُهُ لَا تَفْرَحْ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْفَرِحِينَ –القصص:٧٦)).
((فَخَسَفْنَا بِهِ وَبِدَارِهِ الْأَرْضَ فَمَا كَانَ لَهُ مِن فِئَةٍ يَنصُرُونَهُ مِن دُونِ اللَّهِ وَمَا كَانَ مِنَ المُنتَصِرِينَ –٢٨: ٨١))

عبدالفادی دەڵێت زانراوە کە قاروونی قورئان (کرۆسوس)ی پادشای لیدیایە (٥٦٠–٥٤٦ پێش زاین) کە کەسێکە لەناو عەرەبو غەیری عەرەب بە دەوڵەمەندی ناودارەو هیچ پاساوێك نییە بۆ تێکەڵکردنی بە قۆرەح کە باسەکەی لە تەورات هاتووەو هیچ پەیوەندییەك نییە لەنێوان قاڕوونو قۆرەح کە لەگەڵ داثان و ئەبیرام شۆڕشیان لەدژی مووسا گێڕا، زەویش دەمی کردەوەو قووتی دان (العدد ١٦).

* * * *

بەڵێ لەوە ناچێت هیچ پەیوەندییەك هەبێت لە نێوان قاڕوونو قۆرەح קֹרַח چونکە قاڕوون، بەپێی قورئان، کەسێك بوو لەڕادەبەدەر دەوڵەمەند بوو و گوناهەکەی ئەوە بوو سامانەکەی بە بەخششی خودای نەدەزانیو ستەمکاریی بەرامبەر قەومی مووسا کردبوو، بەڵام هیچ باسێکی سامانی قۆرەح لە تەورات نەکراوە جگەلەوەی لە باسی نغرۆبوونی وتراوە: ((هەموو ئەوانەی هی قۆرەح بوون لەگەڵ هەموو ئەو شتانەی هەیانبووە))[٣٦٠] نغرۆبوون (العدد ١٦: ٣٢). سەرەتای باسەکەش ئەوە بوو

[٣٦٠] ((ئەو شتانەی هەیانبووە)) یان ((هەموو کەلەوپەلەکانیان)) یان ((هەموو پارەکان)).

سێ کەس: قۆرەح و دوو برا: داثان דָּתָן و ئەبیرام (ئەڤیرام) אֲבִירָם هەروەها ئۆن און کـوڕی پێلێـــث פֶּלֶת و کـوڕانی رائـوبین (ریئـۆبێن) בְּנֵי רְאוּבֵן لەگـەڵ خەڵکانێکی بەنو ئیسرائیل: ٢٥٠ سەرۆکی کۆمەڵەکە. ئەوانە بە مووساو هاڕوونیـان وت: بەسە! هەموو کۆمەڵەکە پـیرۆزە ئـیتر بۆچـی خۆتـان بەسـەر کۆمـەڵی خـودا بەرزدەکەنـەوە. ڕووداوی نغرۆبوونەکـەش لـەو کاتـە بـوو کـە بـەنو ئیسـرائیل لـە چۆڵەوانی بـوون و ئەمـە لەگـەڵ سـەروەت و سامانی قـاڕوون ناگونجێـت، هـەروەها لەگەڵ خانووەکەی چونکە ئەوانە لـە خێـوەت بـوون. داثـان و ئـەبیرام بـە مووسـا دەڵێن: تۆ لە زەوییەك ئێمەت دەرکرد کە شیرو هەنگوینی لێ دەڕژێت بـۆ ئـەوەی لە چۆڵەوانی بمانمرێنی.. پێشی دەڵێن ئێمەت نەهێنا بۆ زەوییەك شیرو هـەنگوینی لێ دەڕژێت.. (العدد١٦: ١٢–١٤). تەنها یەك شـت قـاڕوون و قـۆرەح کۆدەکاتـەوە: نغرۆبـوون لـە زەوی، وەك چـۆن تـەنها یـەك شـت قـاڕوون و کرۆسـوس Croesus کۆدەکاتەوە ئەویش دەوڵەمەندی. کرۆسوس پەیوەندیی نییە بە قاڕوونەوە چونکە لیدیا کە دەکەوتە ڕۆژئاوای تورکیای ئێسـتا دوور بـوو لـە میسـر و لـە فەڵەسـتین و کرۆسوس پادشای وڵاتێك بوو نەك تەنها کەسـێکی دەوڵەمەنـد. ئـەو مەنهەجـەش، واتە زانینی کەسێکی سەرچاوەیەك بە کەسێکی تری سەرچاوەیەکی تر تەنها لەبەر یەك شتی لەیەکچوو مەنهەجێکی لاوازەو مەبەستی زیاتر ڕەتکردنەوەی یەکێکـە لـە سەرچـاوەکانەو لـە کـاری ئەوانـە دەچـێت کـە نـاوی شـارێك لەوپـەڕی جیهـان دەبیستن و لەگەڵ شارێکی وڵاتی خۆیان بەراوردی دەکەن.

## ٣٩–سولە یمان یان ئەبشالۆم؟

((وَدَاوُودَ وَسُلَيْمَانَ إِذْ يَحْكُمَانِ فِي الْحَرْثِ إِذْ نَفَشَتْ فِيهِ غَنَمُ الْقَوْمِ وَكُنَّا لِحُكْمِهِمْ شَاهِدِينَ * فَفَهَّمْنَاهَا سُلَيْمَانَ وَكُلًّا آتَيْنَا حُكْمًا وَعِلْمًا وَسَخَّرْنَا مَعَ دَاوُودَ الْجِبَالَ يُسَبِّحْنَ وَالطَّيْرَ وَكُنَّا فَاعِلِينَ–الانبياء: ٧٨–٧٩)).

ئەم چیرۆکە دەربارەی ناکۆکییەکە کە سولەیمان بە ئامادەبوونی داوودی باوکی چارەسەری کرد. بەکورتی عبدالفادی قسەی موفەسیرەکان دەهێنێتەوە کە ئەو کاتە سولەیمان یانزە ساڵ بوو. عبدالفادی ڕەخنەی ئەوە دەگرێت کە ناکرێت داوودی خاوەن ئیلهام نەتوانێت ئەو کێشەیە چارەسەر بکاتو سولەیمان کوڕی قسە لە حوکمەکانی بکات. ئەو کەسەش کە ڕەخنەی لە حوکمەکانی داوودی باوکی گرتبوو ئەبشالۆم کوڕی بوو کە ویستبووی شۆڕش لەدژی باوکی بکاتو دڵی خەڵکی بۆ لای خۆی ڕادەکێشاو دەیوت: کێ دەمکاتە دادوەر بۆ ئەوەی هەقی ستەملێکراو بسەنم، پاشان شۆڕشێکی سەرنەکەوتووی بەرپاکرد (٢ صەموئیل: ١٥).

* * * *

ئەوەی عبدالفادی باسی دەکات شتێکی جیاوازە، ئەوەی کتێبی دووەمی صەموئیل باسی ئەبشالۆم (ئەڤشالۆم) אַבְשָׁלוֹם ـ کە داوودی باوکی ناشیرین دەکرد. ئەو ڕێگەی بە هەر کەسێك دەگرت کە دەچووە لای باوکی بۆ ئەوەی حوکمی بۆ بداتو دیوت: کەس نییە لەلایەن پادشاوە گوێت بۆ بگرێت، خۆشی لای خەڵکەکە شیرین دەکرد تا دواتر لە باوکی یاخی بوو، بەڵام چیرۆکەکەی سولەیمان یەك ڕووداو بوو ئەویش چارەسەری کێشەی نێوان خاوەنی کێڵگەکەو خاوەنی مەڕەکان بوو.

## ٥٢-شائوولی پادشا یان جدعونی قازی؟

((وَقَالَ لَهُمْ نَبِيُّهُمْ إِنَّ اللّهَ قَدْ بَعَثَ لَكُمْ طَالُوتَ مَلِكًا قَالُوَاْ أَنَّى يَكُونُ لَهُ الْمُلْكُ عَلَيْنَا وَنَحْنُ أَحَقُّ بِالْمُلْكِ مِنْهُ وَلَمْ يُؤْتَ سَعَةً مِّنَ الْمَالِ قَالَ إِنَّ اللّهَ اصْطَفَاهُ عَلَيْكُمْ وَزَادَهُ بَسْطَةً فِي الْعِلْمِ وَالْجِسْمِ وَاللّهُ يُؤْتِي مُلْكَهُ مَن يَشَاء وَاللّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ (٢٤٧) وَقَالَ لَهُمْ نِبِيُّهُمْ إِنَّ آيَةَ مُلْكِهِ أَن يَأْتِيَكُمُ التَّابُوتُ فِيهِ سَكِينَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَبَقِيَّةٌ مِّمَّا تَرَكَ آلُ مُوسَى وَآلُ هَارُونَ تَحْمِلُهُ

الْمَلآئِكَةُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ (٢٤٨) فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِالْجُنُودِ قَالَ إِنَّ اللّهَ مُبْتَلِيكُم بِنَهَرٍ فَمَن شَرِبَ مِنْهُ فَلَيْسَ مِنِّي وَمَن لَّمْ يَطْعَمْهُ فَإِنَّهُ مِنِّي إِلاَّ مَنِ اغْتَرَفَ غُرْفَةً بِيَدِهِ فَشَرِبُواْ مِنْهُ إِلاَّ قَلِيلاً مِّنْهُمْ فَلَمَّا جَاوَزَهُ هُوَ وَالَّذِينَ آمَنُواْ مَعَهُ قَالُواْ لاَ طَاقَةَ لَنَا الْيَوْمَ بِجَالُوتَ وَجُنودِهِ قَالَ الَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلاَقُو اللّهِ كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللّهِ وَاللّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ (٢٤٩) وَلَمَّا بَرَزُواْ لِجَالُوتَ وَجُنُودِهِ قَالُواْ رَبَّنَا أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ (٢٥٠) فَهَزَمُوهُم بِإِذْنِ اللّهِ وَقَتَلَ دَاوُدُ جَالُوتَ وَآتَاهُ اللّهُ الْمُلْكَ وَالْحِكْمَةَ وَعَلَّمَهُ مِمَّا يَشَاء وَلَوْلاَ دَفْعُ اللّهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَّفَسَدَتِ الأَرْضُ وَلَكِنَّ اللّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَى الْعَالَمِينَ–البقرة: ٢٤٧–٢٥١)).

لە چیرۆکی داوودو تالووتو جالووت لە قورئان تالووت (پادشـای ئیسـرائیلییەکان) بـە لەشـکرەکەی دەڵێـت خـودا بـە رووبارێـك تاقیتـان دەکاتـەوە" ئـەوەی لێـی خواردەوە ئەوە لە منەو لەوە لێی نەخواردەوە لە من نییە مەگەر کەسێك چـنگێك ئاوی هەڵگرت، کاتێکیش گەیشتنە رووبارەکە زۆربەیان لێیان خواردەوە.

عبدالفادی دەڵێت قورئان ئەم چیرۆکەی شـائوول، کـە بـە تـالووت (طـالوت) نـاوی دەبات، لەگەڵ چیرۆکی جدعونی قازی (گیدعۆن גִּדְעוֹן)ی تێکەڵ کـردووە کـە بـە خواردنەوەی ئاوی رووبارەکـە تاقیکرایـەوە ئـەویش لەمیانـەی شـەرەکەیان دژ بـە میدیانییەکان (خەڵکی میدیەن یان میدیان) (قضاة٧: ١–٨)و بەم جـۆرە قورئـان شائوول یاخود تالووتی بە گیدعۆن داناوەو شەڕ دژی فەڵەسـتینییەکانی لـەجیاتی شەڕ دژی میدیانییەکانی داناوە.

* * * *

ئەگەر پـەیمانی کۆنی بەردەستمان بەڵگەنامەیەکی مێژوویی دوور لـە گومـان بوایـە ئەو رەخنەیە جێگەی بایەخ دەبوو، بـەڵام حـاڵی پـەیمانی کـۆن پێچـەوانەیەو لـەم باسـەی شـائوول שָׁאוּל و داوود (داویـد דָּוִד) نـارێکی هەیـە. بـۆ نموونـە جارێـك باپیری شائوول بە ئەبیئێل אֲבִיאֵל ناوبراوە (اصموئیل ٩ :١)، جارێکیش بـە نێـر נֵר ناوی هاتووە (١ أخبار ٨ :٣٣ و٩ :٣٩). تەنانەت لە کتێبی تایبـەت بـە هـەمان

پێغەمبەر جیاوازییەکی وەك ئەمە دەبینین: لە کتێبی ١ی صەموئێل پاش ئەوەی داوود گۆلیات גָּלְיָת (جالووتی قورئان)ی فەڵەستینیی کوشت سەرەکەی بۆ ئۆرشەلیم (یەروشەلایم) برد (١صموئیل ١٧ :٥٤) ئەو کاتەش هێشتا شائوول وەك پادشای ئیسرائیلییەکان مابوو، کەچی لە کتێبی ٢ی صەموئێل کاتێك داوود کرایە پادشا ئۆرشەلیم لە دەستی ئیسرائیلییەکان نەبوو بەڵکو لەدەستی (یەبووسییەکان) بوو و ئەوانە نەیانهێشتبوو داوود بچێتە شارەکە (٢صموئیل ٥ :٦). لە هەمان شوێنیش باسی ئەوە کراوە کە تەمەنی داوود سی ساڵ بوو کاتێك بووە پادشا، چل ساڵیش پادشایی کرد، لە حێبرۆن חֶבְרוֹן حەوت ساڵو شەش مانگ پادشایی بەسەر یەهوودا کردو لە ئۆرشەلیم سیوسێ ساڵ پادشایی بەسەر هەموو ئیسرائیلو یەهوودا کرد (٢صموئیل ٥: ٤–٥).

ناڕێکییەکی تر ئەوەیە لە کتێبی یەکەمی صەموئیل داوود دەبێتە عوودژەنی شائوولو شائوول زۆری خۆشدەوێتو دەبێتە چەکهەڵگرىو دەشزانێت باوکی داوودییشای יִשַׁי یە چونکە پێی دەوترێت ییشای کوڕێکی هەیە دەزانێت عوود بژەنێت، هەروەها شائوول پەیامبەران بۆ ییشای دەنێرێت کە داوودی بۆ نێرێت، دواییش کە داوودی بەدڵ دەبێت بۆ باوکی دەنێرێت کە داوودی بەدڵ بووەو با لای بمێنێتەوە(١ صەموئیل ١٦: ١٨–٢٢)،

کەچی لەهەمان کتێبو کاتێك داوود دەچێتە بەردەمی لەشکری فەڵەستینییەکان بۆ شەڕکردن لەگەڵ گۆلیات شائوول لە ئەبنێر אַבְנֵר ی سەرۆکی لەشکر دەپرسێت ئەو کوڕە کوڕی کێیە ئەویش سوێندی بۆ دەخوات کە نازانێت، دوایی لە داوود دەپرسێت (١ صەموئیل ١٧: ٥٥–٥٨).

لەم ئیصحاحە باوکی داوود خواردن بەدەست داوود بۆ سێ براکەی دەنێرێت کە شوێنی شائوول بۆ شەڕی فەڵەستینییەکان کەوتبوونو لەو قسەیەی نێوان داوودو شائوول کاتێك داوود وتی بۆ شەڕی گۆلیات دەچێت هەست بەوە ناکرێت کە

شائوول پێش ئەوە داوودی ناسیبێت یان ئەو کەسە بێت کە لە ئیصحاحی پێشتر ئەو کەسە بوو کە زۆری خۆشدەویستو هەڵگری چەکی بوو.[٣٦١]

کە حاڵی سەرچاوەکەش وا بێت بۆمان هەیە بپرسین: ئەی بۆچی پەڕینەوە لە روبارەکەو باسی خواردنەوەی ئاوەکەی سەر بە چیرۆکی شەڕی شائوولو گۆلیات، نەك گیدعۆنو میدیانییەکان نەبووبێت؟

## مەریەم و مەسیح

چەند پرسیارێکی عبدالفادی هەن پەیوەندییان بە مەسیحو مەریەمی دایکییەوە هەن:

پرسیارەکانی ٥ – ٩ – ١٠ – ١١– ٤٠ تایبەتن بە مەریەم.

پرسیارەکانی ٤١ – ٥٣ – ٥٤ – ٥٥ تایبەتن بە مەسیح.

## ٥–مەریمی پاکیزە خوشکی هاڕوونە و کچی عیمرانە

((وَمَرْيَمَ ابْنَتَ عِمْرَانَ الَّتِي أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا وَصَدَّقَتْ بِكَلِمَاتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِ وَكَانَتْ مِنَ الْقَانِتِينَ–التحريم: ١٢)).

((فَأَتَتْ بِهِ قَوْمَهَا تَحْمِلُهُ قَالُوا يَا مَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْئًا فَرِيًّا * يَا أُخْتَ هَارُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ امْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيًّا–مريم: ٢٨–٢٩)).

عبدالفادی دەپرسێت: ئینجیل دەڵێت مەریمی پاکیزە کچی (هالی)یە (لوقا٣: ٢٣) ئیتر چۆن قورئان دەڵێت کچی عیمرانە کە ئەم باوکی مووسایە یان دەڵێت

---

[٣٦١] بۆ سێ ڕەخنەکەی سەرەوە: ناوی باپیری شائوول، وەزعی ئورشەلیم کاتی کوشتنی گۆلیات، نەناسینەوەی داوود.. سوودمان لە پێگەیەکی مەسیحی وەرگرتووە کە گوایە وەڵامی ئەو گومانانەو گومانی زۆری تر دەداتەوە. هەندێك زانیاریشمان بۆ ئەو ڕەخنانەی سەرەوە زیاد کردووە:

http://www.answering-islam.org/Arabic/Books/Claims/1sa.html

خوشکی هارۆونە لەکاتێك لەنێوان مەریەمو لەلایەكو عیمڕانو هـارۆونو مووسا لـە لاکەی تر ١٦٠٠ساڵ ماوە هەیە؟

* * * *

ئەمـە یەکێکـە لـەو ڕەخنانـەی کـە بـەردەوام دووبـارە دەکرێنـەو دەبێتـە مایـەی دڵخۆشییان گوایە بەڵگەیە لەسەر ناڕاستیی قورئـان لـەکاتێك کـە بەڵگەیـە لەسـەر نەشارەزایی خۆیان.

بڕیـار لـەوەی کـە قورئـان مەریـەمی بـە خوشـکی ڕاسـتەوخۆی هـارۆونی زانیـوە نیشانەی نەشارەزاییە لە قورئان چونکە خـودی قورئـان لـەدوای مووسـاو هـارۆون باسـی تـاڵووتو داوودو سـولەیمانی کـردووە، باسـی پێغەمبـەرەکانی بـەنو ئیسرائیلیشـی کـردووەو باسـی ئـەو پێغەمبەرانـەی کـردووە کـە ئیسـرائیلییەکان باوەڕیان بە هەندێکیان نەکردووەو هەندێکیانیان کوشتووە. بەواتەیەکی تر قورئان باسی سەردەمانێکی زۆری نێوان مووساو هارۆون لەلایەكو مەریەمی دایکی مەسیح لەلاکـەی تـر کـردووە. ئـەوەش ئەوپـەڕی بێئاگاییـە لـە قورئـان کـە ئـەو باسـانە نەزانرێنو تـەنها باسـی تەعبیرەکـەی قورئـان بکرێـت ((ئـەی خوشـکی هـارۆون)). موفەسیرە کۆنەکان ئەوەیان زانیوەو زانیویشیانە ئەو تـەعبیرە واتـای ڕەچـەڵەکی مەریەمە کە سەر بە لقەکەی هارۆونە.

هـەمان شـتیش بـۆ نـاوبردنی مەریـەم وەك کچـی عیمـڕان (عـەمرام) עַמְרָם و کـە هارۆونو مووساش کوڕی عیمـڕانن کـە ئاشـکرایە بـاس لـە دوو عیمڕانـە یـەکێکیان عیمرانە کۆنەکەیەو ئەوەی تری باوکی مەریەمـە، یـان لـە یـەك کـات مەبەسـتی لـە هەردووکیان بێت.

سەیریشە عبدالفادی ناوی ئینجیلی لوقا (٣: ٢٣) دەبات وەك سەرچاوە بۆ ئـەوەی کە گوایە مەریەم کچی (هالی)یە لەکاتێك لەو شـوێنە نەسـەبی مەسـیح وتـراوە کـە کوڕی یووسفە کوڕی هـالی کـوڕی ... تـاد تـا دەگاتـە یـەهوودا کـوڕی یـەعقووبو لەوەش بـۆ کـۆنتر تـا ئـادەم. واتـە رواڵـەتی دەقەکـە پێمـان دەڵێـت هـالی بـاوکی

یووسفی دەزگیرانی مەریەم بوو نەك باوکی مەریـەم کـە ئەمـەیان، واتـە زنجیرەکـە هی مەریەمو عیسایە، بۆچوونە نەك ڕواڵـەتی دەقەکـە (بڕوانـە هـەروەها پرسـیاری تایبەت بە قسەکردنی مەسیح لە بێشکە). عبدالفادی ئاگای لە ئینجیلەکەی خۆشی نییە.

## ٩-زەکەرییا سەرپەرشتیی مەریەم دەکات

((إِذْ قَالَتِ امْرَأَةُ عِمْرَانَ رَبِّ إِنِّي نَذَرْتُ لَكَ مَا فِي بَطْنِي مُحَرَّرًا فَتَقَبَّلْ مِنِّي إِنَّكَ أَنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ * فَلَمَّا وَضَعَتْهَا قَالَتْ رَبِّ إِنِّي وَضَعْتُهَا أُنثَى وَاللّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ وَلَيْسَ الذَّكَرُ كَالأُنثَى وَإِنِّي سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ وِإِنِّي أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ * فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ وَأَنبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا الْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقاً قَالَ يَا مَرْيَمُ أَنَّى لَكِ هَذَا قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ اللّهِ إنَّ اللّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَاء بِغَيْرِ حِسَابٍ- ال عمران: ٣٥-٣٧)).

قورئان باسی ژنی عیمران، کە دایکی مەریمە، دەکات کە سکی بە مەریـەم پڕبـوو و منداڵەکەی سکی، کە بەتەمابوو کوڕ بێت، بـۆ خـودای نـەزر کـرد. دوایـیش کـە مەریـەمی بـوو خـودا وایکـرد زەکـەرییا کەفالـەتی بکـات. هـەر کـاتێکش زەکـەریا دەچووە میحراب لای مەریم دەیبینی خواردنی لایـە. لێشـی پرسـی سـەبارەت بـەو خواردنە ئەویش وتی ئەوە لەلای خوداوەیە.

عبدالفادی دەڵێت ئەمە لەگـەڵ ڕووداوەکـانی مێـژوو نارێکـە چـونکە مەریـەم کچـی عەمرام (بەپێی تەورات) نە شـووی کردبـوو و نـە منـداڵی ببـوو. مەریـەم خوشـکی هارۆونەو ناوی دایکی یۆکابد (یۆکێبێد، یۆخێبێد) יוֹכֶבֶד ـە. عبدالفادی لێرە ژنـی عیمرانی بە دایکی مووسـاو هـارۆون زانیـوە ئـەوەش تـەنها لەبـەر ئـەوەی قورئـان وتوویەتی (ژنی عیمران)، عیمرانیش باوکی مووساو هاروونە، لەکاتێك قورئان لێـرە مەبەستی لە دایکی مەریەمە کە دایکی مەسیحە (بڕوانە پرسیاری ٥ و ٥٣).

دوای ئەوە عبدالفادی دەنووسێت:

تاکە ئافرەتیش کە ئەوەی ناو سکی خۆی نەزر کردبوو حەننا חַנָּה ی دایکی صەموئێلی پێغەمبەر بوو. باسی ئەوەش نەهاتووە کە زەکەرییا لە هەیکەل لە ئورشەلیم دەژیا تا سەرپەرشتیی مەریەم بکات چونکە زەکەرییا خەڵکی (حێبرۆن) بوو و کاتێك دەچوو لە هەیکەل خزمەت بکات تەنها بۆ ماوەی پانزە ڕۆژ لە ساڵێك بە تیروپشك دەچوو (لوقا١: ٥–٤٠). کەسیش ناچێتە ناو میحراب یان تێی نامێنێتەوە جگە لە سەرۆکی کاهنەکان ئەویش ساڵی یەك ڕۆژ لە ڕۆژی گەورەی کەفارەتو بە خوێنی قوربانییەك بۆ ئەوەی کەفارەتی گوناهەکانی گەل بکات (١ ملوك٨: ٦ و و ٩: ١٦). زەکەرییاش سەرپەرشتیی مەریەمی نەکرد چونکە مەریەم سەر بە سیبتی یەهوودا بوو و زەکەرییا لە سیبتی لاوی بوو (عبرانیین٧: ١٤)، زەکەرییاش لە حێبرۆن دەژیاو مەریەم لە ناصیرە.

لەو شوێنەی عبدالفادی ئاماژەی بۆ دەکات کە مەریەم لە سیبتی یەهوودا بوو و زەکەریا لە سیبی لاوی بوو واتە (عبرانیین ٧: ١٤) تەنها باسی ئەوە کراوە کە مەسیح لە سیبتی یەهوودا بوو و باسی زەکەرییا نەکراوە، ئەوەش گرنگ نییە چونکە دەزانین زەکرییا لە سیبتی لاوی بوو لەبەر ئەوەی کاهن بوو، کاهنەکانیش لە سیبتی لاوی بوون. هەموو باسی (عیبرانییەکان)یش گرنگ نییە چونکە ئەوە قسەی پۆلسە. (عیبرانییەکان) بریتییە لە نامەکانی پۆلسە بۆ عیبرانییەکان (سەدەی یەکەمی زاینی) کە هەندێك زانای مەسیحیی کۆن گومانیان هەبووە هی پۆلس بێت یان هەر نووسینێکی تری نێردراوان بێت.[٣٦٢]

ئەو بەشەش قسەی سەیرو سەمەرەی تێ هەیە. لەو بەشە پۆلس باسی پادشایەك دەکات ئەویش مەلکی صادق (مەلکی تسێدێق) מַלְכִּי צֶדֶק کە ئیبراهیم دە یەکی لە هەموو شتێك دایە ئەویش بەرەکەتی لێ کرد (تەکوین ١٤: ١٨). پۆلس دەڵێت لاوییەکان دە یەك لە گەل وەردەگرن، بەڵام کاتێك لاوی لە پشتی ئیبراهیم

---

[٣٦٢] بڕوانە: ستیفن م. میلر، روبرت ف. هوبر، تاریخ الکتاب المقدس ص٦٩ ، هەروەها: ٩٤، ٩٧ ، مارتن لوتەریش بە ڕاستی نەزانیوە، ل ٢٠٩.

بوو ئیبراهیم دە یەکی دا بە مەلکی صادق (عبرانیین ٧: ٥—١٠). پۆلس دەڵێت گوایە خودا بە مەسیحی وتووە تۆ کاهنی تا هەتا لەسەر پلەی مەلکی صادق (عبرانیین ٥: ٦). ئەمەش شتێکە لە باسەکە پۆلس بەڵام عبدالفادی بەو ڕستەیە ویستوویەتی بیسەلمێنێت زەکەرییا سەرپەرشتیی مەریەمی نەکردووە. شایەنی وتنیشە ئەگەر بەپێی ئەو نامەیەی پۆلس بێت پێویستە پێچەوانەی قسەکەی عبدالفادی بێت، واتە لەبەر ئەوەی مەسیح کە کوڕی مەریەمە کەهەنووتی هەیە ئەگەرچی لە سیبتی یەهوودایە هەروەکو کەهەنووتی زەکەرییا کە لە سیبتی لاوی بوو دەکرێت زەکەرییا سەرپەرشتیی مەریەم بکات وەك چۆن ئیبراهیم (باپیری گەورەی لاوی) دە یەکی دا بە مەلکی صادق کە مەسیح لەسەر پلەی ئەو بووە کاهن.

بەدەر لە پۆلسو نامەکەیو هەر سەبارەت بە قسەکەی عبدالفادی گوایە زەکەرییا کەفالەتی مەریەمی نەکردووە چونکە زەکەرییا لە سیبتی لاوی بوو و مەریەم لە سیبتی یەهوودا بوو، ئەو زانیارییە هەیە کە ئەلیصابات (ئێلیشێبەع אֱלִישֶׁבַע بە عیبری) ژنی زەکەرییا لە کچانی هارۆون بوو، مێردەکەشی لە گرووپی ئەبییا بوو (لوقا ١: ٥)، کە گرووپێکی کاهنەکان بوو، واتە هەردوو لە سیبتی لاوی بوونو ئەلیصابات بە خزمی مەریەم ناوبراوە[٣٦٣] و بەم جۆرە خزمایەتی لەنێوان زەکەرییاو مەریەم هەبوو، ئەمەش هەموو ئەگەر نەکرێت کەفالەتی بکات لەبەر ئەوەی لە سیبتێکی تر بێت، بەڵام عبدالفادی ئەوەی نەوتووەو بەڵگەشی لەسەر نەهێناوە.

---

[٣٦٣] ئینجیلی لوقا ئیصحاحی یەکەم: ٣٦. قسەکە لەسەر زمانی جبریلە کە مژدەکە بە مەریەم دەدات و دەڵێت هەمان مژدە دراوە بە ئەلیصاباتی خزمت. گریمانەیەکیش هەیە کە لەتەرەفی دایکییەوە لاوی بووەو لە تەرەفی باوکییەوە نەوەی داوود (لە سیبتی یەهوودا) بوو، بەڵام دەبوایە ئەمە باس بکرایە:

**Paul W. Schmiedel, Mary, in; Encyclopædia Biblica, vol. III, col. 2957.**

زنجیرە بنەماڵەی مەسیح لە مەتتاو لوقا هێندە جیاوازیی زۆریان هەیە کە زۆر جار پەنا براوە بۆ گریمانەی ئەوەی یەکێکیان هی یووسفەو ئەوەی تریان هی مەریەمە بەڵام ئەوە نارێکە بەوەی کە باسکراوەو کە هەردووکیان ئاماژە بۆ یووسف دەکەن، بەڵکو هەروەها دوورخستنەوەی ئەوەی یەکێکیان هی مەریەم بێت هەر لەسەرەتای لوقاوەیە کە وتراوە مەریەمی خزمی ئەلیصاباتی هاروونییە، بەڵام ئەگەر واش بوترێت کە یەکێکیان هی مەریەم بێت ئەوانە کاتێك دانران بیرۆکە پاکیزەیی مەریەم نەبوو، کەواتە بۆ عەقیدەی پاکیزەیی ناچار بوون تەعبیری ((وا زانرابوو)) بخنە ناو قسەکە، بەڵام ئەگەر لە سەرەتاوە بیر لە تێخنینێکی وا کرابێت کەواتە بەهیچ جۆرێك زنجیرەی پشتەکان بایەخی نییە.[٣٦٤]

سەبارەت بە باسی میحرابیش کە عبدالفادی ڕەخنەی لێگرتووە بڕوانە پرسیاری ژمارە ١٠.

## ١٠-دوورکەوتنەوەی مەریەم

((وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ مَرْيَمَ إِذِ انتَبَذَتْ مِنْ أَهْلِهَا مَكَانًا شَرْقِيًّا * فَاتَّخَذَتْ مِن دُونِهِمْ حِجَابًا فَأَرْسَلْنَا إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا * قَالَتْ إِنِّي أَعُوذُ بِالرَّحْمَن مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيًّا * قَالَ إِنَّمَا أَنَا رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَامًا زَكِيًّا * قَالَتْ أَنَّى يَكُونُ لِي غُلَامٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ وَلَمْ أَكُ بَغِيًّا * قَالَ كَذَلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ وَلِنَجْعَلَهُ آيَةً لِلنَّاسِ وَرَحْمَةً مِّنَّا وَكَانَ أَمْرًا مَّقْضِيًّا-مريم: ١٦-٢١)).

عبدالفادی دەڵێت قورئانناڵێت بۆچی مەریەم چووە شوێنێکی ڕۆژهەڵاتیو لە کەسوکاری خۆی دوورکەوتەوەو حیجابێکی دانا لەنێوان خۆیو ئەوان پێش ئەوەی مژدەی مەسیحی پێبدرێت. ئایا شەڕی بووە لەگەڵ کەسوکاری هەرچەندە بە تەقوا ناسرابوو؟ بۆچیش کچێك دوور لە کەسوکارییەوە دەژی هەرچەندە قورئان دەڵێت مەریەم لە میحراب بوو بە سەرپەرشتیاریی زەکەریا؟ ئینجیلیش دەڵێت مەریەم لە ناصیرە بوو و دەزگیرانی یووسفی دارتاش بوو (لوقا١: ٢٦-٣٦).

---

[364] Paul W. Schmiedel, *ibid.*, cols. 2957-2958.

* * * *

ئەمەش شایەنی قسەکردن نییە چونکە شتێك نییە لەو باسەی قورئان لە دوورکەوتنەوەی مەریەم جێگەی پرسیار بێت، کاتێکیش زەکەرییا کەفالەتی مەریەم دەکات ئەوە بەهیچ واتایەکی ئەوە ناگەیەنێت کە بەردەوام لای خۆی بووبێت، عبدالفادیش بەهەڵە لە هەبوونی مەریەم لە میحرابەکە تێدەگات چونکە وای داناوە میحرابەکە لە ماڵی زەکەرییا یان شوێنێك لەو جۆرە بێت. لە ئینجیلی سەرەتای یەعقووب کە یەکێکە لە ئینجیلەکانی ئەپۆکریفا باسی ئەوە کراوە کە دایکی مەریەم، کاتێك هێشتا مەریەم شەش مانگ بوو، میحرابێکی لە ژوورەکەی خۆی بۆ دروستکرد (انجیل البدایه لیعقوب ٦: ٢).[٣٦٥] هەروەها تا تەمەنی گەیشتە دوانزە ساڵ لە هەیکەل مایەوە ئینجا یووسف هەڵبژێدرا بۆ کەفالەتکردنی (انجیل البدایه لیعقوب ٨-٩).

دیاریش نییە چوونی مەریەم بۆ ئەو شوێنە رۆژهەڵاتییە ماوەیەکی پێ چوو یان کەمی پێچوو ئینجا فریشتەکە چووە لای و مژدەی مەسیحی پێدا.

## ١١-مەریەم لە دەشتایی منداڵەکەی دەبێت و ئەم لەژێرییەوە قسەی لەگەڵ دەکات

((فَحَمَلَتْهُ فَانتَبَذَتْ بِهِ مَكَانًا قَصِيًّا (٢٢) فَأَجَاءَهَا الْمَخَاضُ إِلَى جِذْعِ النَّخْلَةِ قَالَتْ يَا لَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هَذَا وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا (٢٣) فَنَادَاهَا مِن تَحْتِهَا أَلَّا تَحْزَنِي قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيًّا (٢٤) وَهُزِّي إِلَيْكِ بِجِذْعِ النَّخْلَةِ تُسَاقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا (٢٥) فَكُلِي وَاشْرَبِي وَقَرِّي عَيْنًا فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ الْبَشَرِ أَحَدًا فَقُولِي إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَنِ صَوْمًا فَلَنْ أُكَلِّمَ الْيَوْمَ إِنسِيًّا - مريم: ٢٢-٢٦)).

---

[٣٦٥] ابوکریفا العهد الجدید ، ج١، ص٥٤

عبدالفادی دەڵێت: مەریەم لە (بەیت لەحم) عیسای بوو هەروەك چۆن پێغەمبەرانی تەورات سەدان ساڵ بەرلەوە پێشبینییان کردبوو نەك لە تەنیشت قەدی دارخورمایەك. مەریەم مەسیحی لە بەیت لەحم بوو و کۆرپەکەی لە گەوڕەکە دانا (لوقا٢: ١–٢٠) سەیریشە منداڵەکەی لەژێرییەوە قسەی لەگەڵ دەکاتو پێی دەڵێت قەدی دارخورماکە ڕابوەشێنێتو لە خورماکەی بخواتو ئاوی جۆگەکە بخواتەوە، ئەگەر کەسێکیش بەلای تێپەڕی پێی بڵێت نەزرم کردووە بۆ خودا بەڕۆژوو بمو قسە لەگەڵ هیچ مرۆڤێك نەکەم. ئیتر کوا ڕۆژوو لەکاتێك خورمای خواردووەو ئاوی خواردۆتەوەو قسەشی کردووە؟

* * * *

قورئان ئاشکرا باسی جۆری ئەو ڕۆژووە دەکات کە ڕۆژووە لە قسەکردن، گوناهی عبدالفادیشە لەوە تێناگات، خۆ ئەگەر ڕۆژوو بێت لە خواردنو خواردنەوە ئەوە لەدوای خواردنی خورماکەو خواردنەوەی ئاوەکەیە. ڕووژووگرتنی قسەنەکردنیش ناڕێك نییە لەگەڵ قورئان کە دەڵێت ((فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ الْبَشَرِ أَحَدًا فَقُولِي إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَنِ صَوْمًا فَلَنْ أُكَلِّمَ الْيَوْمَ إِنسِيًّا)) چونکە (قەول) لە زمانی عەرەبی مەرج نییە بە زمان بێت بەڵکو هەر ئاماژەیەك بە ئەندامێکی لەش کە واتایەکی هەبێت بە قەول ناو دەبرێت، بۆ نموونە کەسێك ئاماژەیەك بە دەستی دەکات ئەمەی بۆ بەکاردێت: ((فقال بيده هكذا))، قسەی مەریەمیش لەو جۆرەیە واتە ئاماژەی بۆ دەمی کرد کە ڕۆژووی لە قسەکردن گرتووە.

سەبارەت بەوەش کێ قسەی لەگەڵ مەریەم کردووە ئەوەیان دیار نییەو هەندێك بە عیسای دەزانن و هەندێکی تر بە جبریلی دەزانن،[٣٦٦] هیچ موفەسیرێك قسەی یەکلاکەرەوەی نییە، ئەگەر گرنگیش بوایە قورئان باسی دەکرد بەڵام لای قورئان قسەکە گرنگتر بوو لە قسەکەر.

---

[٣٦٦] بڕوانە: تەفسیر ابن کثیر، ج ٥، ص ٢٢٤.

# ٤٠-هاجەر یان مەریەم؟

(هەمان پێنج ئایەتەکەی سوورەتی مریم لە پرسیاری ١١).
عبدالفادی ڕەخنە لە قورئان دەگرێت کە باسی هاجەری دایکی ئیسماعیل لە تەوراتی کردووە بە باسی مەریەم. ئایەتەکانی سوورەتی مەریەم دەڵێن کاتێك خەریك بوو مەریەم منداڵەکەی لای قەدی دارەخورماکە ببێت وتی خۆزگە پێشتر بمردمایە، ئیتر لە خوارەوە بانگی کرد خەفەت نەخۆی چونکە خوداکەت کانییەکی لەژێرتەوە داناوە، قەدەکەش بجووڵێنە خورمات بەسەر دەبارێنێ.
عبدالفادی دەڵێت ئەوە هاجەر بوو کە بۆ چۆڵەوانی هەڵهات بە خۆیو ئیسماعیلی کوڕییەوە، کاتێکیش تینووی بوو خودا کانییەکی بۆ ڕەخساند، بەڵام مەریەم نە بۆ چۆڵەوانی هەڵهاتو نە پێویستی بە ئاو بوو و نە لەژێر دارەخورما بوو.

* * * *

ئەمە تێگەیشتنێکی لارە چونکە قورئان باسی چۆڵەوانی ناکات. قورئان باسی شوێنێکی دوور دەکات. بەڵام ئایا مەریەم بەڕاستی قەت هەڵنەهاتبوو؟ بەپێی ئینجیل نەخێر" ئەوەتا لە ئینجیلی مەتتا مەریەم لەگەڵ یووسفی دەزگیرانیو کۆرپەکەی بۆ میسر هەڵهاتن ( مەتتا ٢: ١٣-١٥).
تەنانەت قورئان کە باسی ڕۆشتنی مەریەم بۆ شوێنێکی دوور پێش ئەوەی منداڵەکەی ببێت لەگەڵ لوقا گونجاوە کاتێك باسی ئەوە دەکات کە قەیسەر بڕیاری دا خەڵك ناونووس بکرێن، یووسفیش کە خەڵکی بەیت لەحم بوو مەریەمی بە سکپڕییەوە لەناصیرەوە بۆ بەیت لەحم لەگەڵ خۆی برد (لوقا ٢: ١-٦)، نێوان ناصیرەو بەیت لەحم زیاتر لە سەد کیلۆمەترە. کەواتە مەریەمی چووە شوێنێکی دوور لە کەسوکارییەوەو لەوێ منداڵەکەی بوو.

# ٤١-خوانێك لە ئاسمان دانەبەزییوو

((إِذْ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ أَن يُنَزِّلَ عَلَيْنَا مَآئِدَةً مِّنَ السَّمَاء قَالَ اتَّقُواْ اللّهَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ * قَالُواْ نُرِيدُ أَن نَّأْكُلَ مِنْهَا وَتَطْمَئِنَّ قُلُوبُنَا وَنَعْلَمَ أَن قَدْ صَدَقْتَنَا وَنَكُونَ عَلَيْهَا مِنَ الشَّاهِدِينَ * قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا أَنزِلْ عَلَيْنَا مَآئِدَةً مِّنَ السَّمَاء تَكُونُ لَنَا عِيداً لِّأَوَّلِنَا وَآخِرِنَا وَآيَةً مِّنكَ وَارْزُقْنَا وَأَنتَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ * قَالَ اللّهُ إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيْكُمْ فَمَن يَكْفُرْ بَعْدُ مِنكُمْ فَإِنِّي أُعَذِّبُهُ عَذَابًا لاَّ أُعَذِّبُهُ أَحَدًا مِّنَ الْعَالَمِينَ –المائدة: ١١٣-١١٥)).

عبدالفادی دەڵێت لە ئینجیل نە قوتابییەکانی مەسیح داوای خوانێکی ئاسمانییان لێ کردبوو و نە خوانێك لە ئاسمان دابەزییوو بەڵکو ئەو کەسانەی لە چۆڵەوانی شوێنی مەسیح کەوتن بۆ ئەوەی رێنماییەکانی ببیستن زۆر لەگەڵی مانەوە، مەسیحیش نەیویست ئەوانە بەزمانی بەرۆژووەوە بنێرێتەوە نەوەکو هێزیان لێ ببڕێت ئیتر ئەوە بوو پێنج نانو دوو ماسیی هێناو بەرەکەتی بەسەر ئەو خواردنە ڕژاند ئەوانیش لێیان خواردو لێشی مایەوە. عبدالفادی دەڵێت ڕەنگە چیرۆکەکەی قورئان دەربارەی دابەزینی خوانێك لە ئاسمان ئەنجامی خراپ تێگەیشتنە لە هەندێك ئایەتی ئینجیل ئەگینا لە چوار ئینجیلەکە باسی شیوی خودایی (العشاء الرباني) هاتووە کە مەسیح کردییە یادەوەرییەك بۆ لەخاچدانی.

* * * *

ئەوەی عبدالفادی باسی دەکات ڕووداوێکی ترە ئەگینا لە ئینجیل ئاماژەیەك هەیە بۆ شیوی خودایی (دواشیو). لە ئینجیلی یوحەننا دوای ئەم ڕووداوە کە موعجیزەی زۆرکردنی خواردن بۆ خەڵکە زۆرەکە بوو و کە نزیکەی پێنج هەزار پیاو بوون بۆ ڕۆژی دوایی خەڵکێکی زۆر چاوەڕێیان دەکردو دوایی کە دۆزییانەوە لێیان پرسی: چی بکەین بۆ ئەوەی کردارەکانی خودا بکەین، یەسووعیش وەڵامیدانەوە: ((ئەمە کرداری خودایە: باوەڕ بەو کەسە بکەن کە ناردوویەتی)).

پێیان وت: ((چ نیشانەیەك دەكەی بۆ ئەوەی ببینین‌و باوەڕت پێبكەین؟ چی دەكەی؟ باوكانمان گەزۆیان لە چۆڵەوانی خوارد، وەك نووسراوە: خودا نانی لە ئاسمانەوە دانێ بۆ ئەوەی بخۆن)) (یوحنا ٦: ٢٨–٣١).

دواتریش مەسیح پێیان دەڵێت خۆی نانی ژیانە، هەركەسێك بۆلای بچێت برسی نابێت‌و كێ باوەڕی پێ بهێنێت قەت تینووی نابێت (یوحنا ٦: ٣٥)، پاشان وەڵامی جوولەكەكانی دایەوە كە ڕەخنەیان لێگرتبوو كاتێك وتبووی منم ئەو نانەی لە ئاسمان دابەزی: ئەو كەسەی باوەڕم پێبهێنێت ژیانێكی هەتاهەتایی دەژی، منم نانی ژیان، باوكانتان گەزۆریان لە چۆڵەوانی خواردو مردن.. پاشان دەڵێت نانەكە لاشەمە كە بۆ ژیانی جیهان دەیبەخشم (یوحنا ٦: ٤١–٥١)، پاشان: ((ئەگەر لاشەی كوڕی مرۆڤ نەخۆن‌و خوێنەكەی نەخۆنەوە ژیانتان تێ نییە، ئەو كەسەی لاشەم بخوات‌و خوێنم بخواتەوە ژیانێكی هەتاهەتایی هەیە)) (یوحنا ٦: ٥٣–٥٤).[٣٦٧]

تێبینی بكە كە لە ئینجیلی یوحەنا باسی خواردنی لاشەی مەسیح‌و خواردنەوەی خوێنەكەی دوای باسی بەرەكەت خستن لە ماسی‌و نانەكە بۆ ئەو خەڵكە زۆرە، بەڵام باسەكەی لە ئینجیلە لەیەكچووەكان، واتە مەتتاو مەرقوس‌و لوقا دواترەو لە جەژنی فصح (فیصح)ـە، (پێسەح פֶּסַח) بووە، كە جەژنی جوولەكەیە بەبۆنەی دەرچوونیان لە میسرو ڕزگاربوونیان.[٣٦٨]

---

[٣٦٧] خواردنی لەتە نانەكەو خواردنەوەی شەراب بەپێی ئەو باوەڕە سرووتێكی مەسیحییەو یەكێكە لە حەوت نهێنییەكانی كەنیسەی كاتۆلیكی‌و دوو نهێنییەكەی كەنیسەی پرۆتستانتی‌و پێی دەوترێت ئەفخارستیا **Eucharist** یان نهێنی قوربانیی پیرۆز. بەپێی زۆربەی مەزهەبە مەسیحییەكان نانەكە بەڕاستی دەبێتە لاشەی مەسیح‌و شەرابەكە بەڕاستی دەبێتە خوێنی مەسیح. مەزهەبی تری مەسیحیەت ئەوە بە هێمایەك‌و بەیادكردنەوە دەزانن.

[٣٦٨] لە مەتتا باسی چیرۆكی بەرەكەتی خواردنەوە لە ئیصحاحی ١٤ـەو باسی خواردنی لاشەكەی‌و خواردنەوەی خوێنەكەی لە ئیصحاحی ٢٦ـە، لە مەرقوس دوو چیرۆكی لەیەكچووی دوو كاتی جیاواز لە ئیصحاحی ٦ و٨، باسی لاشەو خوێنەكەش لە ئیصحاحی ١٤ ـە، لە لوقا چیرۆكەكە لە ئیصحاحی ٩یەو لاشەو خوێنەكە لە ئیصحاحی ٢٢ـە.

کەواتــە لــە ئینجیلــی یوحــەننا باســی خــواردنی لاشــەی مەســیحو خواردنــەوەی خوێنەکەی لەمیانەی دواشیو یاخود شیوی خودایی نەکراوەو باسی لاشەو خـوێنی مەسیح لەو شوێنە، واتە لە باسی مـوعجیزەی زۆرکردنـی خـواردن، باسـی دواشـیو لاواز دەکات، بەم شێوەیەش ناتوانین دواشیو بە ڕووداوێکی مێـژوویی ڕاسـتەقینەو بێ گومان بزانین.

عبدالفادی بۆ دواشیو ئامـاژە بـۆ هـەر چـوار ئینجیلەکـە، بـە ئینجیلـی یوحـەنناوە (یوحنـا ١٣: ١–٣٠)، دەکـات، بـەڵام ئەمــەیان جیـاوازە لەبـەر ئـەوەی لـە سـێ ئینجیلەکەی تر ڕووداوەکە لەکاتی جەژنی فیصح بوو و لە یوحەننا پێش جەژنەکـە قوتابییەکانی بینی (یوحنا ١٣: ١). لەوەی یوحەنناش تەنها باسی کـاتی خـواردنی ئێوارە کراوە (یوحنـا ١٣: ٢)، باسـی نـانخواردنیش نـەکراوە تـەنها لـە دوو بڕگـە: یەکەمیان کاتێك مەسیح دەڵێت: ئەوەی نانم لەگەڵ دەخوات پاژنـەی خـۆی لـەدژم بەرزکردەوە (یان: لەدژم وەستا) (یوحنا ١٣: ١٨)و ئـەو بڕگەیـەی پەیوەنـدیی بـە یەهوودای سکاریۆتەوە هەیە کە مەسیحی ڕادەستی جوولەکـە کـرد ئـەویش کاتێـك مەسیح دەڵێت یەکێکتان ڕادەستم دەکات، یەکێکیش لە قوتابییەکانی لە باوەشـی دەبێتو لەسەر داوای قوتابییـەکی تـر لێـی دەپرسـێت کێیـە ئـەویش دەڵێـت ئـەو کەسە نانەکەی بۆ تێهەڵدەسووموو دەیدەمێ ئینجا مەسیح ئەوە دەکـاتو دەیداتـە یــەهوودا (یوحنــا ١٣: ٢١–٢٦). ئــیتر ئــەو باســانە ماڵئــاوایینو ئامۆژگــارینو کۆبوونەوەکە نانخواردنێکی تەقسـی نـەبوو، لـەوەی باسیشـمان کـرد زیـاتر باسـی نانخواردنی لەخۆنەگرتووەو باسی لاشەو خوێنی مەسیحی نەکردووە.

## ٥٣–لە بێشکە قسە دەکات

((وَيُكَلِّمُ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ وَكَهْلاً وَمِنَ الصَّالِحِينَ–آل عمران: ٤٦)).

((إِذْ قَالَ اللّهُ يَا عِيسى ابْنَ مَرْيَمَ اذْكُرْ نِعْمَتِي عَلَيْكَ وَعَلَى وَالِدَتِكَ إِذْ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ الْقُدُسِ تُكَلِّمُ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ وَكَهْلاً وَإِذْ عَلَّمْتُكَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَالتَّوْرَاةَ وَالإِنجِيلَ وَإِذْ تَخْلُقُ مِنَ الطِّينِ كَهَيْئَةِ الطَّيْرِ بِإِذْنِي فَتَنفُخُ فِيهَا فَتَكُونُ طَيْرًا بِإِذْنِي وَتُبْرِىءُ الأَكْمَهَ وَالأَبْرَصَ بِإِذْنِي وَإِذْ تُخْرِجُ الْمَوتَى بِإِذْنِي وَإِذْ كَفَفْتُ بَنِي إِسْرَائِيلَ عَنكَ إِذْ جِئْتَهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ فَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْهُمْ إِنْ هَذَا إِلاَّ سِحْرٌ مُّبِينٌ– المائدة: ١١٠)).

((فَأَشَارَتْ إِلَيْهِ قَالُوا كَيْفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِي الْمَهْدِ صَبِيًّا –مريم: ٢٩)).

عبدالفادی دەڵێت بەپێی ئینجیل مەسیح لە حیکمەتو باڵاو نیعمەت گەشەی دەسەند (لوقا٢: ٥٢) بۆیە ڕووینەدابوو مەسیح لە بێشکە قسەی کردبێت (قسەی عبدالفادی تەواو).

* * * *

ئەگەر سەرچاوەش نەبێت بۆ قسەکردنی مەسیح لە بێشکە عەقڵ ئەو قسەکردنە (یان هەر موعجیزەیەکی تری لەو جۆرە) دەخوازێت چونکە چۆن تۆمەت لەسەر دایکی لابچێت ئەگەر منداڵێکی ئاسایی بێت؟[٣٦٩] ئەی بۆچی جوولەکە بەپێی

---

[٣٦٩] لە ئینجیلی ناقانوونیی مەتتا (ئیصحاحی ١٢) یووسف و مەریەم سرووتێك دەکەن (خواردنەوەی ئاوی تاقیکردنەوەی خوداوەندو حەوت جار ڕۆشتن بەدەوری مەزبەحی هەیکەل) کە ئەگەر درۆزن بن نیشانەیەك لە دەموچاویان دەردەکەوێت. ئەوان سرووتەکەیان کردو هیچ نیشانەیەك دەرنەکەوتو ئەوە بوو بەڵگەیەك بۆ بێتاوانییان: عبدالمسیح بسیط، ابوکریفا العهد الجدید، .ص ١١١، د. ابراهیم سالم الطرزي، ابوکریفا العهد الجدید، الکتاب الاول،ج١، ص ٩٥–٩٦. لە ئینجیلە قانوونییەکان شتێك نییە بۆ بەڵگە لەسەر بێتاوانیی مەریەم جگە لە چەند شتێکی ناڕاستەوخۆ وەك هاتنی مەجووسەکان کە هاتن بۆ لای پادشای جوولەکە چونکە ئەستێرەکەیان لە ڕۆژهەڵات بینیبوو (مەتتا٢: ١ بەدواوە)، لە لوقا فریشتەی خودا قسە لەگەڵ چەند شوانێك دەکاتو مژدەی مەسیح دەدات (لوقا٢: ٨–٢٠)، دواتر خواناسێك بەناوی سیمعان داوای بەرەکەت بۆ منداڵەکە دەکاتو مژدە دەدات کە دەبێتە ڕزگاریو شکۆمەندی (لوقا٢: ٢٥–٣٥)، پێغەمبەرێکی ئافرەتیش بەناوی حەننا کچی فەنوئیل باسی مەسیحی کردووە(لوقا٢: ٣٦–٣٨) کە هیچ لەمانە بەس نەبوون وەك نیشانەیەکی خودایی بۆ بێتاوانیی مەریەم، سەبارەت بە دوو ئینجیلە قانوونییەکەی تریش واتە مەرقوسو یوحەننا ئەو دوانە باسی منداڵێتیی مەسیح ناکەن.

شەریعەتی خۆیان سزای ڕەجمیان بەسەر مەریەم نەسەپاند؟ بەپێی شەریعەتی جوولەکە سزای بەردباران بۆ چەند کەسێك هەیە: ئەو کەسەی ژنێکی هێناو کاتێك چووە لای رقی لێ هەڵگرتو تۆمەتی خستە پاڵی ئەگەر تۆمەتەکە درۆ بوو پیاوەکە سزا دەدرێت بەڵام ئەگەر قسەکەی راست دەرچوو تا مردن بەردباران دەکرێت (تثنية ٢٢: ١٣–٢١)، پیاوێکیش ئەگەر لەگەڵ ژنێکی مێردار بنوێت هەردوکیان بەردباران دەکرێن (تثنية ٢٢: ٢٢)، حاڵەتێکی تریش کە نزیکە لە حاڵەتەکەی مەریەم ئەوەیە پیاوێك لەگەڵ ئافرەتێکی دەزگیراندار بنوێت ئەگەر لە شار بوو هەردوکیان بەردباران دەکرێن چونکە ئافرەتەکە دەیتوانی هاوار بکات بەڵام ئەگەر لەناوی کێڵگە بوو تەنها پیاوەکە بەردباران دەکرێت چونکە ئافرەتەکە هاواری کردبوو و کەس گوێی لێ نەبوو (تثنية ٢٢: ٢٣–٢٧).

ئینجیلی بەردەستمان ئەوەی بە قسەیەکی سەیر چارەسەر کردووە ئەویش ئەوەیە لای خەڵك یووسفی دەزگیرانی مەریەم لای خەڵك باوکی منداڵەکە بوو:

لە لوقا هاتووە کە کاتێك عیسا دەستی پێکرد (واتە دەستیکرد بە وەعزو بانگەوازو موعجیزە) تەمەنی دەوروبەری سی ساڵ بوو.. دوای ئەوەش پشتەکانی دەژمێرێت تا ئادەمو بەم جۆرە: کوڕی یووسف[٣٧٠] کوڕی هالی[٣٧١]... تاد(لوقا ٣: ٢٣–٣٨)، لە ئینجیلی مەتتاش: یەعقووب یووسفی لێ بوو ئەویش پیاوەکەی مەریەمە کە یەسووعی لێ بوو (مەتتا ١: ١٦).

---

[٣٧٠] ژمارەیەك وەرگێڕان وەك ڕوونکردنەوەی قسەکە رستەی : (وەك خەڵك وایاندەزانی) دەخاتە ناو کەوانەوە بەنیشانەی ڕوونکردنەوەی وەرگێڕە بەڵام وەرگێڕانی تر ڕستەکە دەخاتە ناو قسەکە بێ کەوانە بەجۆرێك وا تێدەگەی لە خودی قسەی ئینجیلی لوقایە. بۆ وەرگێڕانە جیاوازەکانی ئەمە (بۆ ئینگلیزی) تەماشای ئەم لینکە بکە:

http://www.biblegateway.com/passage/?search=Luke+3%3A23

[٣٧١] دەقەکە ڕوونە کە هالی باوکی یووسفە، بەڵام تەفسیرێك دەڵێت باوکی مەریەمە: قاموس الكتاب المقدس، ص ١٩٥٨. بەڵام باسی پشتەکانی یووسف کە باوکی عیسا نییە شتێکی بێمانایە بۆیە ئەو بۆچوونە لەڕاستتر دەچێت کە زنجیرەی پشتەکان هی مەریەمە.

ئەمە بەشێكی گەورەی چیرۆكی عیسا لەبنەوە هەڵدەتەكێنێت چونكە یەكەم موعجیزەی عیسا لە ئینجیل بریتی بوو لەوەی بیٚ باوك هاتۆتە بوون، كاتێكیش خەڵك وادەزانن كوڕی یووسفە موعجیزەكە هیچ واتایەكی نامێنێت. خۆ ئەگەر باسی باوەڕەكەیان بكەین كە كوڕی خودایە ئەو كاتە گرفتەكە لە بێواتاییەوە دەچێتە خانەی نامەعقوولی لەبەر ئەوەی ئیددیعای ئەوەی كوڕی خودایە نامەعقوول دەبێت لەگەڵ هەبوونی باوكێكی بەشەری.

لەوەش ناچێت ئیسرائیلییەكان باوەڕیان بە باوكێتیی یوسسف هەبووبێت، باوەڕیشیان بە لەدایكبوونە موعجیزەكەیان نەكردبوو بۆیە ئاساییە تۆمەتی زینای بدەنە پاڵ مەریەم چونكە باوكی دیار نەبوو، بەڵام بەهۆی شتێكی نادیارەوە نەیاندەتوانی ئەوە بسەلمێنن تا سزای بدەن، چیش لە موعجیزەیەك شیاوترە ئەو شتە نادیارە بێت؟ قورئان ڕێكە كاتێك باسی قسەی جوولەكە لەبارەی مەریەمەوە دەكات: ((وبكفرهم وقولهم على مريم بهتانا عظيما- النساء:١٥٦))، واتە وتنی بوهتانێكی گەورە بەرامبەر مەریەم، لەوەشەوە قسەكردنی مەسیح بەساوایی لەگەڵ ڕووداوەكە ڕێكە.

ترس لە كوشتنی مەریەم بە ئاشكرایی لە ئینجیلی یەعقووب، كە بە ئەپۆكریفا زانراوە، هەیە ئەویش كاتێك یووسف دەزانێت مەریەم سكی پڕ بووەو دەگریەو لەخۆی دەپرسێت ئەگەر گوناهەكەی بشارێتەوە دژی شەریعەتی خودا دەوەستێتو ئەگەر ئابڕووی بەرێت دەترسێت ئەوەی سكی فریشتەیەك بێتو ئەو كاتە خوێنێكی بێتاوان بداتە دەست سزای مردن.[٣٧٢]

ترسی یووسفیش كە مەریەم ئابڕووی بچێت لە ئینجیلە قانوونییەكەی مەتتاش هەیە، پێویستیشی كرد فریشتەی خودا لە خەو پێی بڵێت مەریەم تاوانی

---

[٣٧٢] عبدالمسيح بسيط، ابوكريفا العهد الجديد، .ص ٨٧، د. ابراهيم سالم الطرزي، ابوكريفا العهد الجديد، الكتاب الاول،ج١، ص ٨٥.

نەکردووەو باسی چۆنێتیی سکپڕبوونەکەی بۆ بکاتو فریشتەکە بەڵگەی لە پەیمانی کۆن بۆ بهێنێتەوە (مەتتا ١: ١٨–٢٣)

بەڵام بەپاڵ حوکمی عەقڵو مەنتق ئینجیلی تر هەن ئەگەرچی ئەوانیش بەهەمان شێوە بە ئەپۆکریفا دانراون باسی قسەکردنی مەسیح بە ساوایی دەکەن. یەك لەو دەقانە پێی دەوترێت ئینجیلی عەرەبیی منداڵێتیی کە کەنیسە بە هەڵبەستراوی دەزانێت. لەو ئینجیلە (ئیصحاحی ١) مەسیح لە بێشکە قسەی لەگەڵ دایکی کردووە.[٣٧٣] دەقێکی تر کە پێی دەوترێت ئینجیلی ناقانوونی(ئەپۆکریڤا)ی مەتتا مەسیح تەمەنی دوو ساڵ دەبێتو قسە لەگەڵ ئەژدیهاکان دەکات.

ڕەنگە ئەم پرسیارە بکرێت: ناشێت پێغەمبەری ئیسلام زانیارییەکانی لە ئینجیلی منداڵێتیی عەرەبی، کە باسی قسەکردنی مەسیحی کردووە، وەرگرتبێت؟

ئەوەی ئەو ئیحتماله ڕەت دەکاتەوە ئەوەیە هیچ شتێکی ئەو ئینجیلە، کە باسی منداڵێتیی مەسیح دەکات، لە قورئان باس نەکراوە هەرچەندە بەشی زۆر باسی موعجیزەکانی مەسیحە. لەکۆی ٥٥ ئیصحاحی تەنها سێ موعجیزەی ناو قورئان باسکراون: چاککردنەوەی گولیو زیندووکردنەوەی مردوویەکو دروستکردنی چۆلەکە بە قوڕ و بەخشینی گیان پێیان. هەروەها ئەو موعجیزانە لە قورئان بەناو باسکراون بێ هیچ وردەکارییەك وەك لەوەی لەو ئینجیلە هاتوون. جگە لەوەشو وەك لە قورئان دیارە ئەو موعجیزانە لەکاتی گەورەیی مەسیح کران نەك بە منداڵی وەك لەو ئینجیلە باس کراون. موعجیزەیەکی تر کە چاککردنەوەی نەخۆشییەك بوو تووشی چاوی منداڵەکان دەبوو جیاوازە لە موعجیزەی قورئان چونکە ئەوەی قورئان چاککردنەوەی چاوی کوێری زگماکە. بەهەر حاڵێش موعجیزە یەکەمو دووەم بەشێوەی تر لە ئینجیلە قانوونییەکان باسکراون. بەم جۆرەش ئەو ئینجیلە

---

[٣٧٣] عبدالمسيح بسيط، ابوكريفا العهد الجديد، .ص ١٣١، د. ابراهيم سالم الطرزي، ابوكريفا العهد الجديد، الكتاب الاول،ج١، ص ١١٥.

زۆر لە باسەکانی قورئانەوە دوورەو ناتوانرێت بە سەرچاوەی موعجیزەی قسەکردنی مەسیحی ساوا بزانرێت.

## ٥٤-لە قوڕ باڵندە دروست دەکات

((إِذْ قَالَ اللّهُ يَا عِيسى ابْنَ مَرْيَمَ اذْكُرْ نِعْمَتِي عَلَيْكَ وَعَلَى وَالِدَتِكَ إِذْ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ الْقُدُسِ تُكَلِّمُ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ وَكَهْلاً وَإِذْ عَلَّمْتُكَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَالتَّوْرَاةَ وَالإِنجِيلَ وَإِذْ تَخْلُقُ مِنَ الطِّينِ كَهَيْئَةِ الطَّيْرِ بِإِذْنِي فَتَنفُخُ فِيهَا فَتَكُونُ طَيْرًا بِإِذْنِي وَتُبْرِىءُ الأَكْمَهَ وَالأَبْرَصَ بِإِذْنِي وَإِذْ تُخْرِجُ الْمَوتَى بِإِذْنِي وَإِذْ كَفَفْتُ بَنِي إِسْرَائِيلَ عَنكَ إِذْ جِئْتَهُمْ بِالْبَيِّنَاتِ فَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْهُمْ إِنْ هَذَا إِلاَّ سِحْرٌ مُّبِينٌ–المائدة: ١١٠)).

((وَرَسُولاً إِلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنِّي قَدْ جِئْتُكُم بِآيَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ أَنِّي أَخْلُقُ لَكُم مِّنَ الطِّينِ كَهَيْئَةِ الطَّيْرِ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيْرًا بِإِذْنِ اللّهِ وَأُبْرِىءُ الأكْمَهَ والأَبْرَصَ وَأُحْيِي الْمَوْتَى بِإِذْنِ اللّهِ وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأْكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِي بُيُوتِكُمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ–آل عمران: ٤٩)).

ئایەتەکانی قورئان باسی موعجیزەیەکی مەسیح دەکەن کە باڵندەی بە قوڕ دروست دەکردو بە فەرمانی خودا گیانی دەکرد بە لەشیانو دەیکردن بە باڵندەی زیندوو. عبدالفادی دوای هێنانەوەی ئەو ئایەتانە دەڵێت: موسڵمانان دەڵێن مەسیح بەمنداڵی باڵندەی لە قوڕ دروست دەکرد، مەسیحییەکانیش باوەڕیان ئەوەیە مەسیح وشەی خودایەو ئەو بوو ((هەموو شتێك بەو بوو، بە غەیری ئەویش هیچ شتێك لەوەی بوو نەببوو–یوحنا ١: ٣)). کاتێکیش مەسیح بوو بە جەستە ٣٠ ساڵ مایەوە پێش ئەوەی وەعز بکاتو موعجیزەکانی لێ بوەشێنەوە (لوقا ٣: ٢٣).. (قسەی عبدالفادی تەواو).

* * * *

ئایەتەکانی قورئان ئاشکران کە دروستکردنی باڵندەکان لە کاتی گەورەییو پێغەمبەرایەتییەکەی بوو نەك کاتی منداڵی. باسنەکردنی ئەو موعجیزەیەش لەو

ئینجیلانە بەڵگە نییە کە کە نەکرابوو. مەسیح موعجیزەی زۆری نواندبوو کە هەموویان لە ئینجیلەکان باس نەکراون وەك دوایەمین ئایەتی ئینجیلی یوحەننا ئاشکرای دەکات کاتێك دەڵێت: ((شتی زۆری تری کردبوو کە ئەگەر یەك بە یەك بنووسرێن باوەڕ ناکەم کە جیهان خۆی کتێبە نووسراوەکان لەخۆ بگرێت– یوحنا ٢١: ٢٥)). لە کۆتایی ئیصحاحی پێشتریش: ((نیشانەی زۆری تریش کە یەسووع لەبەردەم قوتابییەکانی کردنی لەم کتێبە نەنووسراون– یوحنا ٢٠: ٣٠)).[٣٧٤]

باسی دروستکردنی باڵندەی قوڕو زیندووکردنیان لەکاتی منداڵیی مەسیح لە ئینجیلە ئەپۆکریفەکان هاتووە. لە ئینجیلی ئەپۆکریفای مەتتا (ئیصحاحی ٢٧)[٣٧٥] باسی ئەوە کراوە کە لە منداڵییەوە، کە تەمەنی چوارساڵ بوو[٣٧٦]، ئەوەی دەکرد، هەمان شتیش لە ئینجیلی ئەپۆکریفای تۆما بەڵام بە پێنج ساڵی[٣٧٧] هەروەها ئینجیلی عەرەبیی منداڵێتی ئەویش کاتێك حەوت ساڵی تەمەنی تەواو کرد (ئیصحاحی ٣٦ و ٤٦).[٣٧٨] کەواتە باسێك لەو جۆرە هەبووە لەدەرەوەی ئینجیلە قانوونییەکان.

بینیمان عبدالفادی پشت بە ئینجیلی یوحەننا دەبەستێت بۆ ڕەتکردنەوەی ئەوەی مەسیح باڵندەی لە قوڕ دروست دەکرد ئەو کاتەی منداڵ بوو، وتیشمان قورئان

---

[٣٧٤] هەرچەندە ئەمەی دواییان لە باسی گەڕانەوەی مەسیحو خۆدەرخستنی بۆ قوتابییەکانی باس کراوە، بەڵام لەو باسە هیچ نیشانەیەك نەوتراوە جگە لەوەی شوێنی بزمارەکانی لەخاچدانەکەی پیشاندان بەجۆرێك دەقەکە تەنها ئەوە هەڵدەگرێت کە نیشانەکان بریتی بن لەوانەی لە ڕۆژی یەکەمەوە کردنی.

[٣٧٥] بڕوانە: عبدالمسیح بسیط، ابوکریفا العهد الجدید، .ص١٢٠–١٢١، د. ابراهیم سالم، ابوکریفا العهد الجدید، الکتاب الاول ، ج١، ص١٠٤.

[٣٧٦] وا دەردەکەوێت لە باسەکەی ئیصحاحی ٢٦ هەرچەندە بۆ دروستکردنی چۆلەکەکان نەوتراوە تەمەنی چەند بووە.

[٣٧٧] بڕوانە: عبدالمسیح بسیط، ابوکریفا العهد الجدید، .ص٩٦، د. ابراهیم سالم، ابوکریفا العهد الجدید، الکتاب الاول ، ج١، ص٦٥، ص ٧٢–٧٣، ص٧٧–٧٨.

[٣٧٨] عبدالمسیح بسیط، ابوکریفا العهد الجدید، .ص١٤٦ و ١٥٠، د. ابراهیم سالم، ابوکریفا العهد الجدید، الکتاب الاول ، ج١، ص١٣١ و ١٣٥.

باسی منداڵیی نەکردووە، بەڵام گریمان مەسیح موعجیزەی وا بە منداڵی کردبێت ئەوە کارێکی پێویستە بۆ ئەو دوو ڕستەیەی ئینجیل یوحەننا، واتە: ((هەموو شتێك بەو بوو،[٣٧٩] بە غەیری ئەویش هیچ شتێك لەوەی بوو نەبووو))، هەروەها بۆ رستەکانی پێشتر: سەرەتا وشە بوو، وشە لای خودا (یان لەگەڵ خودا) بوو، خودا وشە بوو.. چونکە ئەگەر وابێت پێویستە مەسیح لە یەکەم رۆژی لەدایکبوونییەوە موعجیزە بنوێنێت نەك ئەو کەسەی کە هەموو شتەکان لەڕێگەی ئەوەوە دروست ببوون چاوەڕێ بکات تا تەمەنی سیساڵی بۆ ئەوەی مژدە بکاتو وەعز بکاتو موعجیزە بنوێنێت.

## ٥٥-باوەڕنەهێنان بە لەخاچدانی مەسیح

((وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا الْمَسِيحَ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ اللّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَكِن شُبِّهَ لَهُمْ وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُواْ فِيهِ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مَا لَهُم بِهِ مِنْ عِلْمٍ إِلاَّ اتِّبَاعَ الظَّنِّ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًا * بَل رَّفَعَهُ اللّهُ إِلَيْهِ وَكَانَ اللّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا - النساء: ١٥٧- ١٥٨)).

عبدالفادی دەڵێت: بۆچی قورئان لەخاچدانی مەسیحو کوشتنی لەسەر دەستی جوولەکە رەتدەکاتەوە هەرچەندە جوولەکە ددان بەوە دەنێنو مەسیحییەکان تەئیکدی لەسەر دەکەنو شانازیی پێوە دەکەن؟ سەرتاپای ئینجیلیش باسی لەخاچدانی مەسیحەو مژدەدانە بە مەسیح وەك فیداکاری مرۆڤایەتی. لە قورئانیش دەیان ئایەت هاتوون کە قورئان تەوراتو ئینجیل پشتڕاست دەکاتەوە، قورئانیش

[٣٧٩] ئەو ڕستەیەی عبدالفادی هێناویەتی بە چەند جۆرێك وەرگێڕدراوە: خودا هەموو شتێکی لەڕێگەی ئەوەوە دروست کرد، خودا هەموو شتێکی لەڕێگەی وشەوە دروستکرد، هەموو شتێك لە دەستی ئەو بوون، ئەو هەموو شتەکانی دروست کرد...

لـە شـوێنی تـر باسـی مردنـی مەسـیحو هەڵسـانەوەیو بەرزبوونـەوە بـۆ ئاسمـان دەکات[٣٨٠]، ئینجا، بەپاڵ ئایەتەکانی سەرەوە، ئەم ئایەتانە دەنووسێت:

١-((إِذْ قَالَ اللّهُ يَا عِيسَى إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ)).

تەواوکردنی ئایەتەکەش: ((وَمُطَهِّرُكَ مِنَ الَّذِينَ كَفَرُواْ وَجَاعِلُ الَّذِينَ اتَّبَعُوكَ فَوْقَ الَّذِينَ كَفَرُواْ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأَحْكُمُ بَيْنَكُمْ فِيمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ – آل عمران: ٥٥)).

٢-((فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِي كُنتَ أَنتَ الرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ)).

سەرەتای ئایەتەکەش: ((مَا قُلْتُ لَهُمْ إِلاَّ مَا أَمَرْتَنِي بِهِ أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ –المائدة: ١١٧)).

**هەروەها:**

((وَالسَّلَامُ عَلَيَّ يَوْمَ وُلِدتُّ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا – مريم: ٣٣)).

عبدالفادی دەڵێت:

ئایا سەیر نییە کەسێك پاش شەشسـەد سـاڵ بێـتو لەخاچـدانی مەسـیح بەڕاسـت نـەزانێت؟ ڕووداوی لەخاچـدان ڕاسـتییەکی مێژوویـە ڕۆماییـەکانو یۆنانـەکانو جوولەکەو مەسیحییەکان تۆماریان کردبوو. لە مەجمەعی (نیقیە)ش کە ساڵی ٣٢٥ سازدرا ئوسقوفەکان یاسای باوەڕیان نووسی کە لەخاچدانی مەسـیح بـۆ ڕزگـاریی مرۆڤ پشتڕاست دەکاتەوە، ئەویشە ئەو یاسایەی کە هەموو مەسیحییەك لە هـەموو کەنیسـەیەك لـە هـەموو شـوێنو سـەردەمێك دەیخوێننـەوە. شـوێنەوارەکانی مەسیحییەکانیش لە بیست سەدە ڕابوردووەکە نیشانەکانی خاچیان پێوەیـە ئـیتر چۆن کەس مێژوویێتیی لەخاچدان بەڕاست نازانێت؟ (قسەی عبدالفادی تەواو).

* * * *

---

[٣٨٠] لێرە وەڵامی ئەوە بەدووروودرێژی نادەینەوە کە قورئان باسی مردنی مەسـیحو هەڵسـانەوەی نەکردووە چونکە واتای وشەی (متوفيك) دیار نییە مردنە یان بردنـەوەی بـێ مردنـە. سـەبارەت بە بەرزبوونەوەی، یان ڕاستتر بەرزکردنەوەی، ئەوەیان لە قورئان هاتووە.

سەرەتا پێویستە مەجمەعی نیقیە نەکرێتە بەڵگە لەسەر ئاینی مەسیح لەبەر ئەوەی کۆدەنگیی مەسیحییەکان لەسەر ئەو بڕیارەی مەجمەعەکە نەبوو.[٣٨١] مەجمەعەکەش لە بناغەوە بۆ یەکلاکردنەوەی ناکۆکییەکان بوو و بەتایبەتی سەبارەت بە بیروباوەڕەکانی (ئاریوس)، واتە ناکۆکییەکە هەبووە. سەبارەت بە لەخاچدانیش دیسان بڕیارەکەی مەجمەعەکە، کە سێ سەدە لە دوای دیارنەمانی مەیسح سازدرا، نابێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی خودی مەسیح بوو کە لەخاچدرا، بەڵکو ناشبێتە بەڵگە لەسەر ڕووداوی لەخاچدانەکە خۆی.

## لەخاچدانی مەسیح

عبدالفادی دەڵێت: ڕووداوی لەخاچدان راستییەکی مێژوویی‌یە رۆماییەکانو یۆنانەکانو جوولەکەو مەسیحییەکان تۆماریان کردبوو. ئێمەش دەڵێین خۆ ئەگەر دەیان سەرچاوەی وا باسی لەخاچدان بکەن هیچ لەمانە بایەخەیان نییە ئەگەر لەلایەن کەسانێکەوە نەنووسرابن کە بۆ خۆیان ئاگاداری ئەو ڕووداوە بووبن[٣٨٢] چونکە باسکردنی ڕووداوەکە بە تەنها بەس نییە بۆ سەلماندنی لەبەر ئەوەی بۆی هەیە ئەو سەرچاوانە باسی ڕووداوەکەیان لە خەڵکەوە وەرگرتبێت، بەم جۆرەش هەموو مەسەلەکە وای لێ دێت: کەسێك لە خاچ درا کە وازانرابوو مەسیحە، ئەو باسەش لەناو خەڵك بڵاوبووەوە، دواتریش مێژوونووس و نووسەر هاتوون ئەو ڕووداوەیان باس کردووەو کەسیان شایەتحاڵ نەبوون، تەنانەت شایەتحاڵی خودی مەسیحیش نەبوون.

بەڵام گومانەکان لە ڕووداوی لەخاچدان گەورەترن چونکە گومانێکی گەورەتر هەبووە ئەویش کە بەڕاستی مەسیح هەبووبێت بۆیە ئەو جۆرە سەرچاوانە نەك

---

[٣٨١] بڕوانە دەقەکە کە بە یاسای باوەڕی پێ وترا لە: د. حنا جرجس الخضري، تاريخ الفكر المسيحي، ص ٦٣١.

[٣٨٢] مەبەستمان لێرە نووسینە مێژووییەکانە ئەگینا گوایە یوحەننا ئاگای لە مەسیحو لەخاچدانی بوو، بەڵام کێ دەتوانێت بەدڵنیاییەوە بڵێت یوحەننا کەسێکی ڕاستەقینە بووە یان خۆی ئەو ئینجیلەی نووسیبوو؟

تەنها بۆ سەلماندنی ڕووداوی لەخاچدان بەڵکو لەوە زیاتر وەکو بەڵگە لەسەر هەبوونی مەسیح دەهێنرێنەوە.

قسەکەی عبدالفادیش کاتێك دەڵێت: سەیرە پاش شەشسەد ساڵ کەسێك بێتو لەخاچدانەکە بەدرۆبخاتەوە ڕەخنەیەکە ئاڕاستەی خۆی دەبێتەوە چونکە ئەگەر بیوتایە پاش شەش ساڵ ڕەخنەکەی مەعقوول دەبوو چونکە ماوەکە کەمەو ئیحتمالی تێخنینی درۆ کەمترە لە ماوەی شەشسەد ساڵ کە ئەمەیان ماوەیەکی زۆرە بەجۆرێك بەئاسانی درۆکان دەچنە پاڵ ڕاستییەکان. دووبارەکردنەوەی زانیارییەکیش بۆ ماوەی شەشسەد ساڵ نابێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی زانیارییەکە ڕاستە وەك چۆن دووبارەکردنەوەی چیرۆکی مردنی (تەممووز)و گەڕانەوەی لە بەهاران، وەك دواتر باسی دەکەین، بۆ ماوەی سەدان ساڵ نەبۆتە بەڵگە بۆ ڕاستێتیی ئەو چیرۆکە.

ئێمە دەتوانین لێرە بوەستین چونکە ئەمە بەسە بۆ وەڵامدانەوەی قسەکانی عبدالفادی بەڵام لەگەڵ باسی لەخاچدانو فیدا[٣٨٣] دەڕۆین بۆ ئەوەی خوێنەر بزانێت چۆن شەپۆلەکانی دەریایەکی گومان یاری بەو باوەڕە دەکەنو چۆن مرۆڤ لەدوای خوێندنەوەی زیاتر لەبارەیانەوە خۆی لەناو چ گێژاوێك دەبینێتو بەم جۆرە دەزانێت ئەو باوەڕە لەسەر چ بناغەیەك دروستکراوە.

نموونە لەسەر سەرچاوەی مێژوویی کە گوایە باسیان لەخاچدانی مەسیحیان وەك ڕووداوێکی مێژوویی کردووە ئەمانەن:

سەرچاوەیەکی ڕۆمایی لەوانە هی وتاربێژو کاربەدەستو مێژوونووسی ڕۆمایی تاکیتوس Tacitus ـە، دەوروبەری (٥٦ — ١٢٠)ی زایینی، ئەویش کتێبی ساڵنامەکانو لەمیانەی باسی سووتانی شاری ڕۆما لە سەردەمی ئیمپراتۆرەکەی،

[٣٨٣] وشەی عەربیی فیدا (الفداء) کە بۆ ئەم مەبەستە بەکاردێت لەجیاتیی قوربانی یان قوربانیدان بەکاردەهێنین بۆ ئەوەی ئەو واتا تایبەتەی بدەینێ کە لە بیرباوەڕی مەسیحیی هەیە.

واتە نیرۆن‌و دوای باسی ڕووداوەکەو دوای باسی هۆکارەکەی کە دیار نییە ئەگەر ڕووداوێکی نەخوازراو بووبێت یان بە نەخشەی ئیمپراتۆر و کە نووسەران باسی هەردووکیان کردبوو (کتێبی ١٥ : ٣٨)[٣٨٤]، تاکیتوس دەڵێت کە بۆ نەهێشتنی ئەو باوەڕەی کەوا ئاگرەکە بەهۆی فەرمانێکەوە بووە نیرۆن گوناهەکەی خستە سەر توێژێك کە پێیان دەوترێت مەسیحییەکان‌و ئەشکەنجەیەکی باشی بەسەر سەپاندن. تاکیتوس دەڵێت ئەم ناوە، واتە مەسیحییەکان، بەهۆی خریستوس (مەسیح) Christus ـەوە بوو کە تووشی سزایەکی سەخت بوو لە سەردەمی تیبێریوس لەسەر دەستی پۆنتوس پیلاتوس کە یەکێکە لە نوێنەرەکانمان (کتێبی ١٥ : ٤٤).[٣٨٥] کەواتە نەك تەنها کاتی لەدایکبوونی تاکیتوس بەڵکو خودی دەقەکەش ئاشکرایە کە باسی ئاکامی مەسیح دووبارەکردنەوەی قسەیەکی بڵاوە، سەرباری ئەوەش نە باسی کوشتن‌و نە لەخاچدانی نەکردووە.

نموونەیەکی تر مێژوونووس فلاڤیوس جۆسیفوس Flavius Josephus ـە کە بە ڕەچەڵەك جوولەکە بوو و دوایی چووە پاڵ ڕۆمایییەکان‌و کە لە کتێبێکی خۆی باس مەسیح‌و لەخاچدانی‌و هەڵسانەوەی دەکات،[٣٨٦] هەروەها ئەو دەقەی لای مەسیحییەکان بۆ هەبوونی مەسیح گرنگەو بە (شایەتیی فلاڤیانی) ناسراوە، بەڵام گومان لەو باسە کراوەو لێکۆڵەرەوەکان وای بۆچوون کە یان باسەکە لەلایەن مەسیحییەکانەوە لەو کتێبە تێخنراوەو یان باسەکە هەیە بەڵام مەسیحییەکان دەستکارییان کردووە چونکە جۆسیفوس بەگەورەیی باسی مەسیح دەکات‌و وەکو کەسێك باوەڕی بە مەسیح هەبێت وەسفی دەکات لەکاتێك ئەو کە جوولەکە بوو و

---

[384] **The Annals of Tacitus, p.301.**

[385] ***ibid*, p.304.**

[٣٨٦] جۆسیفوس مەسیح بەوە وەسف دەکات کە پیاوێکی دانا بوو ئەگەر ڕەوا بێت پێی بڵێین پیاو (واتە مرۆڤ) و شتی نایابی کردبوو و مامۆستا بوو و ڕاستیی فێر دەکردن.. بۆ دەقەکە بڕوانە:

**Flavius Josephus, The Antiquities of the Jews, Book 18, Ch. 3, Section 3.**

دوای بەشداریکردنی لە شۆڕشی جوولەکەکان دژی ڕۆما خۆی دا بەدەستەوەو چووە پاڵ ڕۆماییەکان.

ناوبردنێکی تری مەسیح لەلایەن جۆسیفوسەوە هیچی لەخۆ نەگرتووە چونکە باسی بەسەرهاتێکی کورتە، کە دوای مەسیح بوو، ئەویش لەبارەی برای مەسیحەوەیەو بەم جۆرەیە: برای ئیسوس (عیسا) کە (ئەمیان) پێی دەوترا مەسیح.[٣٨٧] بەم شێوەیەو لە کتێبێکی بیست بەرگی سەبارەت بە مێژووی جوولەکە لە دروستبوونی بوونەوەرە تا جەنگی یەکەمی جوولەکەو ڕۆما (کە ساڵی ٦٦ ی زاینی دەستیپێکردو جۆسیفوس لەو شۆڕشە یەکێك بوو لە سەرکردە جوولەکەکان) جۆسیفوس تەنها لەم دوو نموونەیە باسی مەسیح دەکات کە یەکێکیان جێگەی گومانە.

نووسەری تریش ثاللوس Thallus ی سامیرییە[٣٨٨] ئەویش لەبارەی ڕۆژگیران لە ڕۆژی لەخاچدانی مەسیح، بەڵام ئەمەشیان جێگەی گومانە چونکە کتێبەکەی ثاللوس فەوتاوەو کەسی تر قسەکەی لێ وەرگرتووە ئەویش جولیوس ئەفریکانوس Julius Africanus (نووسەرێکی مەسیحیی سەدەی سێیەم)و ڕەخنەی لێ گرتووە کە ئەو ڕۆژگیرانەی بە دیاردەی سروشتی ناوناوە نەك موعجیزە چونکە ئەو کاتە مانگ تەواو بوو و ڕۆژگیران لەکاتی مانگی تەواو ناگیرێت.[٣٨٩] کەواتە ثاللوس باسی ڕۆژگیرانی کردووە نەك مەسیحو ئەمە لە ئەفریکانوسەوە هاتووە.[٣٩٠] ئەمەش جگە لە گومان دەربارەی ئەو کاتەی ثاللوس ئەوەی نووسیبوو کە گوایە ساڵی ٥٢ ی زاینی بووەوئەمە لە ڕاست ناچێت بەڵکو زۆر لەوە دەچێت لە سەدەی دووەم بووبێت.[٣٩١]

---

[387] Flavius Josephus, *op. cit.*, Book 20, Ch. 9, Section 1.

[٣٨٨] د. حنا جرجس الخضري، تاريخ الفكر المسيحى، ص ٣٤١ هەروەها ص ١٥٤ بەڵام بێ باسی مەسیح.

[389] Richard Carrier, Thallus and the Darkness at Christ's Death, p.186.

[390] *ibid.*, p.187.

[391] *ibid.*, pp.188-189.

بەم شێوەیە ئەگەر بەدوای ئەو ئیدیعایانە بچین کە سەرچاوە مێژووییەکان باسی لەخاچدانی مەسیحیان کردووە هیچمان دەستناکەوێت،[٣٩٢] شتی راستەقینەش دەستبکەوێت گرنگ نییە چونکە وەك باسمان کرد مێژوونووس باسی شتێکی کردووە بەو شێوەیەی لە خەڵکی بیستووە واتە لە خەڵکی بیستووە مەسیح لەخاچدراوە.

ئەمەیان بۆ سەرچاوە رۆماییەکان، بۆ سەرچاوەی جوولەکەش ئەو لەخاچدانە لە تەلموود هاتووە،[٣٩٣] بەڵام لەخاچدانەکە بەشێوەیەکی جیاواز لەوەی ئینجیلەکان باسکراوە. کەواتە ڕاستە جوولەکە ددان بەوە دەنێن کە میسیحیان لەخاچداوە، بەڵام ئەمە قسەی خۆیانەو ئەو گومانە دەمێنێتەوە کە ئایا بەڕاستی ئەو کەسەی لەخاچدرا مەسیح بوو یان کەسێکی تر.

قورئان ئەوە تەئکید دەکاتەوە کە جوولەکە دەڵێن مەسیحیان کوشتووە بەڵام نە کوشتبوویانو نە لەخاچیان دابوو بەڵکو وایانزانیبوو ئەوەیان کردبوو: ((وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا الْمَسِيحَ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ اللّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَكِن شُبِّهَ لَهُمْ وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُواْ فِيهِ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مَا لَهُم بِهِ مِنْ عِلْمٍ إِلاَّ اتِّبَاعَ الظَّنِّ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًا – النساء:١٥٧)) کە عبدالفادی خۆی ئەو ئایەتەی هێناوەتەوە.

موفەسیرەکانی قورئان سەبارەت بە ڕستەی (ولكن شبه لهم) دەڵێن کەسێکی هاوشێوەی مەسیح بووە کە لەخاچدراوەو چەند گێڕانەوەیەك بۆ ئەمە دەهێننەوە کە زۆرتریان بەم جۆرەن: مەسیح بە قوتابییەکانی وت: کامتان خودا وەکو

---

[٣٩٢] بەپاڵ ئەوەی بەڵگەی مێژوویی لەسەر چیرۆکی لەخاچدان نییە دەبینین کە حاڵی چیرۆکی هەڵسانەوەی مەسیح لەوە خراپترە. سەرباری ئەو حاڵە خراپەی چیرۆکی لەخاچدان کەچی کاتێك ئەوان دێنە سەر چیرۆکی هەڵسانەوە دەڵێن ڕووداوی لەخاچدان دەتوانرێت لەڕووی مێژووییەوە بسەلمێنرێت بەڵام ئەمە بۆ هەڵسانەوە ئاسان نییە، بڕوانە ئەم سەرچاوە کە چۆن باسی کێشە مێژووییەکانی لەخاچدانو دواتر باسی هەڵسانەوە دەکات: تاريخ الفكر المسيحي، ص ٣٥٤-٣٥٥.

[٣٩٣] بڕوانە: تاريخ الفكر المسيحي، ص ١٤٨.

شێوەی منی لێدەکاتو دەکوژرێتو دوایی دەبێتە هاوڕێم لە بەهەشت، ئیتر یەکێکیان ئەوەی قبووڵ کردو ئەویان گرتو لەخاچیان دا.[٣٩٤] لە گێڕانەوەیەکی ئیبنو ئیسحاقو پاش باسکردنی ئەوە، کە لە مەسیحییەکی وەرگرتبوو کە ببووە موسڵمان، پاش باسی خۆکوشتنی یەهوودای سکاریۆت (يهوذا الاسخريوطي)ش کە بە (يودس زكريا يوطا) ناوی دەبات دەڵێت: هەندێك نەصرانی دەڵێن ئەو کەسەی شێوەی بووە شێوەی مەسیح (يودس زكريا يوطا)[٣٩٥] بوو ئەوانیش لەخاچیان دا ئەویش دەیوت: من ئەو نیم، من ئەو کەسەم کە شوێنەکەیم پێ پیشان دان.[٣٩٦] بەچاوپۆشینیش لە دروستیی ئەو گێڕانەوەیەش" گێڕانەوەکە[٣٩٧] گرنگە چونکە ئیبنو ئیسحاق لە سەدەی هەشتەمی زاینی ژیاوەو بەم شێوەیە لەو کاتە ئەو باسە هەبووە. گرنگیی ئەو گێڕانەوەیەش لەوەیە کە شێوەکەی لەو گێڕانەوەیە دەچێت کە لەو ئینجیلەی بە ئینجیلی بارنابا[٣٩٨] ناسراوە باس کراوە.

لەو ئینجیلە وتراوە کە یەهوودای سکاریۆت پاش ئەوەی پێش دوژمنەکان کەوت بۆ شوێنی مەسیح شێوەکەی گۆڕاو وەکو ئەوی لێ هات ئەوانیش بە مەسیحیان زانیو گرتیان (برنابا ٢١٦: ١–٩)، دوایش لە خاچدراو ئەو هەر نکۆڵیی لەوە

[٣٩٤] تفسير ابن كثير، ج٢، ص٤٤٨–٤٥٢.

[٣٩٥] دیارە (یودەس)ـە کە شێوەی (یوداس)ی یۆنانییە.

[٣٩٦] تفسير الطبري، ج٩، ص ٣٧٤ ، تفسير ابن كثير، ج٢، ص ٤٥٢.

[٣٩٧] تەبەری لە محمد بن حميد الرازي لە سلمة بن الفضل لە ابن اسحاق گێڕاویەتییەوە. جیاوازی لەبارەی موحەممەد کوڕی حومەیدەوە هەیە لەنێوان (ثقة)و (درۆزن)، بڕوانە: الحافظ المزي، تهذيب الكمال، ج ٢٥، ٥١٦٧، ص٩٧–١٠٨. ڕەنگە نزیکترین بۆچوونیش لە ئینسافەوە قسەیەکی یەحیا کوڕی مەعینە کە ئیبنو حومەید جێگەی متمانەیەو کێشەکە خۆی نییە بەڵکو ئەو فەرموودانەی لە شێخەکانییەوە وەریاندەگرێت (ل ١٠١). لە پەراوێزی موحەققیقی کتێبەکەش هاتووە: بەپێی ترمذي بۆچوونی بوخاری لەبارەیەوە باش بوو پاشان لاوازی کرد (پەراوێزی ٥، ل١٠٧). ئەو ڕوایەتەش لە شێخەکەییەوەیە، واتە سلمة بن الفضل الابرش کە زۆرینە لاوازیان کردووە: تهذيب الكمال، ج١١، ٢٤٦٤، ص٣٠٥–٣٠٩.

[٣٩٨] جگە لە ئینجیلی بارنابا نامەکانی بارنابا هەن کە پەیوەندییان بەو ئینجیلەوە نییە.

دەکرد کە مەسیحە (برنابا ٢١٧)[٣٩٩]. ئیتر بەدەر لە دروستیی گێرانەوەکەی ئیبنو ئیسحاق‌و لە ڕاستیی ئینجیلی بارنابا ئەوە بڕە ڕاستییە دەمێنێتەوە کە قسەیەکی وا هەیەو ئەو ئیحتیمالەی لە سەرەوە ئاماژەمان بۆ کردو کە لە ئینجیلی بارنابا هەیە، واتە لەیەکچوونەکە بریتی بووە لەوەی یەهوودای سکاریۆت شێوەی گۆڕاو بووە شێوەی مەسیح، لەناو موسڵمانان زۆر کەمتر ناسرابوو و ئەوەی زۆرتر پەسەند کرابوو ئیحتمالەکەی تر ئەویش کە یەکێك لە حەوارییەکانی مەسیح لەسەر داوای خۆی چووە سەر شێوەی مەسیح.

کێشەو موناقەشەی زۆریش هەبووە لەبارەی ئینجیلی بارنابا، کە نوسخەی ئیتاڵیی هەیە کە وەرگێڕدراوە بۆ ئینگلیزی‌و نوسخەی ئیسپانیی هەبوو کە ون بووە[٤٠٠]. نوسخە ئیسپانییەکە لەسەری نووسرابوو کە لە ئیتاڵییەوە وەرگێڕدراوە[٤٠١] کەسێکیش لە ساڵی ١٥٧٥ ئەم ئینجیلەی کۆپی کردووە یان دایهێناوە.[٤٠٢]

بەپێی بڵاوکراوەی عەقیدەیی گێلاسیوس Gelasian Decree ئینجیلی بارنابا یەکێکە لە ئینجیلە قەدەغەکان، ئەگەر سەردەمی ئەو بڵاوکراوەیەش وەك بەشێوەیەکی گشتی پێشنیار کراوە سەدەی پاش پاپا گێلاسیوس بووبێت ئەو کاتە ئەمە دەبێتە شایەتییەك بۆ مانەوەی ئەو ئینجیلە تا کاتی موحەممەد.[٤٠٣]

(مارگۆلیۆث)ی ڕۆژهەڵاتناس، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئەو ئینجیلە لای موسڵمانان نەناسراو بوو ئەویش وەکو وەڵامی ئەو قسەیەی دەڵێت ئەو ئینجیلە

---

[٣٩٩] بۆ ئەمانە بڕوانە وەرگێڕانی ئینگلیزیی ئەسڵە ئیتاڵییەکە:
**Lonsdale and Laura Ragg, The Gospel of Barnabas, p.417ff.**
هەروەها وەرگێڕانە عەرەبییەکە:
انجیل برنابا، ت. د. خلیل سعادة، ص ٣١٣ بەدواوە.

[400] **Lonsdale and Laura Ragg, The Gospel of Barnabas, p.x.**

[401] ***ibid*, p.xi.**

[402] ***ibid*, p.xliii.**

[403] ***ibid*, p.xlv.**

لای عــەرەب ناســرابوو، ســێ لــە زانــا ئیســلامییەکانیش نــاو دەبــات[٤٠٤] کــە ئــەو ئینجیلەیان نەناسیوە هەرچەندە لەبارەی مسیحییەتەوە نووسیویانە: کۆنترینیـان ئیبنو حەزم (٤٥٦ی کۆچی مردووە) لـە کتـێبی الفصـل فى الملـل والاهـواء والنحـل، ئەوەی تر ئیبنو تەیمیە (٧٢٨ی کۆچی مردووە) لە (الجواب الصحیح لمن بدل دیـن المسـیح)، هـەروەها لێکۆڵینەوەکـەی ابــو الفضــل السـعودي کـە ٩٢٤ی کۆچــی نووسراوەو لەسەر بناغەی کتێبی ابو البقاء صالح الجعفری بـوو. بـەپاڵ ئەمانـەش بیبلیۆگرافیای حـاجی خەلیفـە (١٠٦٧ك– ١٦٥٦–٧ ز) هـیچ ئاماژەیـەکی بـۆ هـیچ ئینجیلێکی لەم جۆرە، بە زمانی عەرەبی، نەکردووە.[٤٠٥]

کورتەی هەموو باسەکانی سەرەوەش بەم جۆرە دەبێت:

–قورئان ناڕاستەوخۆ پیلانی جوولەکە بۆ لەخاچـدانی مەسـیح بـاس دەکـات بۆیـە ڕووداوی لەخاچـدان ڕاسـتە بـەڵام ئـەوەی لەخاچـدرا مەسـیح نـەبووەو جوولەکـە وایانزانیبوو ئەو بووە، بـەم جـۆرەش ڕووداوی لەخاچـدانی بەدرۆنەخسـتۆتەوە وەك عبدالفادی دەڵێت بەڵکو لەخاچدانی خودی مەسیحی بەدرۆخستۆتەوە.

–هەوڵـدان بـۆ ئـەوەی لەخاچـدانی مەسـیح بـە بەڵگـەی مێـژوویی بسـەلمێنرێت سەرکەوتوو نییـە چـونکە هـەر کەسـێك باسـی کردبێـت شـایەتحاڵ نـەبووە بـەڵکو قسەکەی لە خەڵکی تر وەرگرتووە.

–ئەوەی وەکو بەڵگەی مێژوویی لەسەر لەخاچدان هێنراوەتەوە جێگەی گومانە.

–ناکۆکی لەنێوان مەسیحییەکان لەبارەی کۆتایی مەسیحەوە هەبووە: ((وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُواْ فِيهِ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مَا لَهُم بِهِ مِنْ عِلْمٍ إِلاَّ اتِّبَاعَ الظَّنِّ))، جوولەکەش خۆیان لـەوە

[٤٠٤] مارگۆلیۆث پشت بە لیستی (شتاینشنایدەر)ی ڕۆژهەڵاتناس دەبەستێت بۆ ئەمـەو نـاوبردنی سێ زانا  کە کتێبی ئەوانە ئەو کاتە چاپکرابوون، واتە نموونەکان لەوە زیاترن.

[405] **ibid, p.xlviii.**

ابو الفضل السعودي خـاوەنی کتـێبی (المنتخـب الجلیـل مـن تخجیـل مـن حـرّف الأنجیل)ــە کـە هەڵبژاردەی کتێبی (تخجیل مـن حـرّف الانجیل)ــە لـە نووسـینی ابـو البقـاء صـالح بـن الحسـین الجعفري.

دڵنیا نەبوون کە مەسیحیان کوشتووە: ((وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًا)). ئێستاش کە باسی باوەڕی فیدا دەکەین دەزانین بۆچی ڕەوایە گومان لەوە بکەین مەسیح بوو کە لەخاچ درابوو.

## فیدا و چوار ئینجیلەکە

باوەڕی فیدا باوەڕێکی گەورەی مەسیحییەتە. باوەڕەکە بە کورتی ئەوەیە مەسیح کە لەخاچ درا هەڵگری گوناهەکانی مرۆڤایەتی بوو و ئەو لەخاچدانەی کەفارەتی گوناهەکانمان بووە. ئەمەش وەك وتمان بەکورتی ئەگینا وردەکاریی تری هەن‌و باوەڕەکە لەوە ئاڵۆزترەو لە خوارەوە هەندێك لەو وردەکارییانە باس دەکەین.

قسەکەی عبدالفادی کە گوایە ((سەرتاپای ئینجیلیش باسی لەخاچدانی مەسیحەو مژدەدانە بە مەسیح وەك فیداکاری مرۆڤایەتی)) هەڵەیە چونکە سەرتاپای ئینجیل باسی ئەوە نییە. لەخاچدانەکە بەشێکە، بەشێکی بچووکیشە، لە باسەکانی ئینجیلەکان، ئەوەش دیارە بۆ هەر کەسێك ئەو ئینجیلانەی خوێندبێتەوە. دیسانەوەش سەرتاپای ئیجیل باسی فیدا نییە، بەڵکو ئاماژەکان بۆ فیدا تەنها لە چەند شوێنێك هەن، دەشڵێین ((ئاماژە)) ئەگینا لە هیچیان بەشێوەیەك باس نەکراوە یەکلاکەرەوە بێت. تەرکیزکردن لەسەر لەخاچدان‌و هەڵسانەوەو فیدا لە ئینجیل کاری کەنیسە بوو نەك خودی ئینجیلەکان.

ئەوەی باوەڕی فیدا دەخاتە گومانەوە ئەو هاوارەی مەسیحە لەسەر خاچ لە ئینجیلی مەتتاو مەرقوس: ((خوداکەم، خوداکەم، بۆچی جێتهێشتم؟)) (مەتتا٢٧: ٤٦، مرقس١٥: ٣٤). لە ئینجیلی یوحەنناش دیسان قسەیەك هەیە کە مەسیح لەسەر خاچ دەیڵێت‌و هی کەسێکی ئاساییە لەسەرە مەرگ: ((پاشان یەسووع بینی کە هەموو شتێك تەواو بوو ئیتر بۆ ئەوەی کتێبەکە تەواو بێت وتی: تینوومە))[٤٠٦]

[٤٠٦] وەرگێڕانی تر بۆ ئەمە هەیە وەك (وەرگێڕانی ژیانی نوێ) کە وەرگێڕانێکی پیتاو پیت نییە: یەسووع زانی کە ئێستا هەموو شتێك تەواو بوون. هەموو شتێك بەو شێوەیە روویان دا کە نووسینە پیرۆزەکان وتبوویان ڕوو دەدەن. ئەو وتی: تینوومە.

(یوحنا١٩: ٢٨)، قسەیەکی تریش کە ڕێك پێش مردنیو هی کەسێك نییە لەبەر فیدا لەخاچ درابێت: ((یەسووع بەدەنگێکی بەرز هاواری کردو وتی: باوکە! گیانی خۆم بە دوو دەستی تۆ دەسپێرم)) (لوقا ٢٣: ٤٦).

ئەوەی لە ئینجیل هاتووە تەئکیدکردنە لەسەر باوەڕهێنانی خودی مرۆڤەکەیە وەك ڕێگەی ڕزگاری. ئەوە لە هەر چوار ئینجیلەکە دەبینرێت، وەك نموونەش لە ئینجیلەکانی مەتتاو مەرقەس و لوقا ئامۆژگارییەکەی مەسیح بۆ قوتابییەکانی هاتووە: ئەو کەسەی دەیەوێت بەدوام بێت با خاچەکەی هەڵگرێتو شوێنم بکەوێت (مەتتا١٦: ٢٤، مەرقس٨: ٣٤، لوقا٩: ٢٣ ). یان لە یوحەننا: ئەو کەسەی گوێ بۆ قسەکانم دەگرێتو باوەڕ بەو کەسە بهێنێت کە ناردمی ژیانێکی هەتاهەتایی هەیە (یوحنا٥: ٢٤)، زۆری تریش لەو جۆرە، بەڵام باسی فیدا، واتە مەسیح بۆ فیدای جیهان لەخاچ درا، ئاشکرا نییە لەبەر ئەوەی هەموو باسەکان بەپاڵ فیدا ئەو تەفسیرەش هەڵدەگرن کە مردنی مەسیح قوربانییەکە لەپێناوی گەیاندنی پەیامەکە بووە (وەك چۆن پێغەمبەرانی پێشتر هەمان قوربانییان دابوو) نەك بە مردنی ئەو گوناهەکانی ئەوان بسڕێتەوە.[٤٠٧]

ئەگەر تەماشای باسەکانی فیدا لە ئینجیلەکان ئەمانە دەبینین:

مەسیح لە دواشیو نانەکە دەداتە قوتابییەکانیو دەڵێت ئەمە لاشەکەمە کە لەجیاتی ئێوە دەبەخشرێت، بۆ پەرداخەکەش دەڵێت ئەم پەرداخە پەیمانی نوێیە

---

[٤٠٧] لەبارەی عەقیدەی فیداوە وتراوە کە مەسیح کاتێك بۆ گوناهەکانی مرۆڤ لەخاچ درا خۆی بوو بە گوناه وەك پۆلس دەڵێت: ((خودا ئەو کەسەی گوناهی نەکردبوو کردیە گوناه لەبەر ئێمە بۆ ئەوەی ئێمە ببینە چاکەی خودا لەو))!! (٢کۆرنثوس ٥: ٢١). کاریش دەگاتە ئەوەی لەبارەی ئەو قسەیەی مەسیح، واتە ((خوداکەم، بۆچی جێتهێشتم؟)) بوترێت کە خودا غەزەب لە مەسیحی لەخاچدراو دەگرێت کە نوێنەری مرۆڤایەتی گوناهکارە، ئەو مرۆڤایەتییەی حوکمی مردنی بەسەر دراوە، بڕوانە: تاريخ الفكر المسيحى، ص ٣٥٨ ئەویش لە قسەیەکی کارل بارت کە لاهوتییەکی ناودارە.

بە خوێنەکەم کە بۆ ئێوە دەڕێژرێت (لوقا ٢٢: ١٩–٢٠)، [٤٠٨] ئەمە نەك تـەنها بـۆی هەیە واتای قوربانیدان بۆ گەیاندنی پەیامەکە بێت بـەڵکو واتایـەکی بچووکتریشـی هەبێت ئەویش قوربانیدانی مەسیحە بـۆ ئـەوەی قوتابییـەکانی سـەلامەت بـن وەك چۆن لە ئینجیلی یوحەنناو کاتێك بۆ گرتنی مەسیح دەچن مەسـیح پێیـان دەڵێـت: پێم وتن من ئەوم، ئەگەر منتان دەوێت با ئەمانە (واتە قوتابییەکانی) بڕۆن، ئینجا نووسەری ئینجیلەکە دەڵێت: ((ئەویش بۆ ئـەوەی ئـەو قسـەیە جێبـەجێ بێـت کـە کردبووی: ئەو کەسانەی بە منت دان کەسیانم لەناونەبرد))(یوحنا ١٨: ٨).

هەروەها باسـی دوو قوتابییەکـە کـە مەسـیح گوایـە پـاش هەڵسـانەوەی لـە مـردن قسەی لەگەڵ کردن‌و سەرەتا نەیانناسییەوەو کاتێك لێی پرسین باسی چی دەکەن وتیان باسی ڕووداوەکانی تایبەت بە یەسووع دەکەین دواییش دەڵێن: بەتەمابووین ئەو فیداکاری ئیسرائیل بێت (لوقا ٢٤: ١٣ بەدواوە). تێبینـیش بکـە ئـەو کەسـەی وەڵامی دەداتەوە بەم جۆرە باسی مەسیح دەکات: مرۆڤێکی پێغەمبەری بەتوانا لە کردارو گوفتار بوو لەبەردەم خوداو هەموو گەل.

دوای ئـەوەش بـۆ یـانزە قوتابییەکـەی دەرکـەوت‌و قسـەی بـۆ کـردن‌و یـەکێك لـە قسەکانی ئەوە بوو کە نووسرابوو مەسیح ئازار بچێژێت‌و لە مردووان لە سێیەم ڕۆژ هەڵسێت و *بەناوی ئەوەوە* بانگەوازی سڕینەوەی گوناهـەکان بـۆ هـەموو میللـەتان بکرێت (لوقا ٢٤: ٤٧). دیاریشە ئەمە بەڕاشـکاوی فیـداکاری نییـە بـەڵکو چـەمکی گشتیی سڕینەوە گوناهەکانی میللەتانە لەڕێگەی نـاوی مەسـیحەوە نـەك لەڕێگـەی فیداکارییەکە.

---

[٤٠٨] لە ئینجیلی مەرقوس باسی خوێنەکەی دەکات کە بۆ زۆرێك دەبەخشێت (مـرقس ١٤: ٢٤)، لە ئینجیلی مەتتاش کە نوێترەو پشتی بەستووە بە مەرقوس هەمان شت هەیـەو تـەعبیری (بـۆ سڕینەوەی گوناهەکان)ی بۆ زیادکراوە (متی ٢٦: ٢٨).

لە ئینجیلی مەرقوس[٤٠٩] کە بە کۆنترین ئینجیل لە چوار ئینجیلەکە زانراوە ئەمە هەیە:

چونکە کوڕی مرۆڤ هەروەها بۆ ئەوە نەهاتووە خزمەت بکرێت بەڵکو بۆ ئەوەی خۆی خزمەت بکاتو بۆ ئەوەی خۆی وەك قوربانییەك بۆ زۆر خەڵك ببەخشێت (مرقس ١٠: ٤٥)، کە دیسانەوە ئەو واتایەی قوربانییەش هەڵدەگرێت کە لەسەرەوە باسمان کرد، واتە خۆبەختکردن لەپێناوی گەیاندنی پەیامەکە.

فیداکارییەکە لە یۆحەنناش هەیە بەڵام دیسان مانای تر هەڵدەگرێت. با تێبینیی ئەوەش بکەین کە ئینجیلی یۆحەننا جیاوازییەکی زۆری هەیە لە سێ ئینجیلەکەی تر. ئەگەر لەو ئینجیلانەش مەسیح بە نموونە قسە دەکات دەبینین لە یۆحەننا قسەکردن بە نموونە دواتر دێتو لە سەرەتا ئەو قسانەی مەسیحی گوایە وتوونی لە قسەی کەسێك دەچن پەیوەندیی بە جیهانی دەوروبەری خۆیەوە نەبێت. ئەوەش کە گومان دەخاتە باسەکانی ئەو ئینجیلە ئەوەیە گوایە یوحەننا نووسیویەتییەوەو گوایە یەکێك بوو لە دوانزە قوتابییەکە مەسیح بوو[٤١٠] بەڵام

---

[٤٠٩] دوو نووسەری کتێبی مێژووی کتێبی پیرۆز دەڵێن کە لە دەستنووسە کۆنەکان ئینجیلی مەرقوس کتوپڕی بە باسی ئەو ئافرەتانەی لای گۆڕە بەتاڵەکەی مەسیح بوونو کە ترسابوون کۆتایی پێ دێت، هەر لە سەرەتاشەوە ئەم کۆتاییە سەری لە هەندێك مەسیحی تێکدابوو چونکە سلبی بوو ئەگینا بۆچی ئەو ئافرەتانە بە هەڵسانەوەی مەسیح دڵیان خۆش نەبوو؟ بۆ وەڵامی ئەوەش کەسێك لە سەدەی دووەم ژمارەکانی ٩ تا ٢٠ ی بۆ ئەو ئیصحاحە زیادکرد ئەویش بەپشتبەستن بە ئینجیلەکانی تر هەروەها بەپشتبەستن بە کارەکانی نێردراوان: ستیفن م. میلر، روبرت ف. هوبر، تاريخ الكتاب المقدس، ص ٧٣. دوو نووسەری ئەم کتێبە دەڵێن بەشێکی زۆری ئینجیلی مەرقوس باسی ئازارەکانی مەسیحو مردنی دەکات (ل ٧٣)، بەڵام ئەمە موبالەغەیە چونکە لە کۆی ١٦ ئیصحاح تەنها سێ ئیصحاحی کۆتایی باسی هەموو بەسەرهاتی پیلانگێڕان لەدژی مەسیح تا گرتنیو لەخاچدانی، جگە لەوانەش باسێکی کورت لەبارەی ئازارەکانو هەڵسانەوەی مەسیح لە ئیصحاحەکانی ٨ و ٩ و ١٠ هەیە.

[٤١٠] گومان ئێستا هەیە کە یوحەننا خۆی نووسیبێی بەڵکو شوێنکەوتەیەکی یوحەننا بووەو دوایی یەکێك یان زیاتر زیادەی لەسەر کرد: ستیفن م. میلر، روبرت ف. هوبر، تاريخ الكتاب المقدس، ص٧٦. نموونەی ئەوەش ئەوەیە ئینجیلەکە دوو کۆتایی هەیە یەکێکیان لە

شێوازی ئاڵۆزی باسەکان لە قسـە سـادەکان شـوێنکەوتووانی پێغەمبـەران ناچـن.
هەر لە سەرەتای ئینجیلەکەش باسی فیداکاری کراوە:
یوحەننای عیمادکـار[٤١١] مەسـیح دەبینێـتو دەڵێـت: ئەمـەتا بەرخەکـەی خـودا کـە گونـاهی جیهـان لادەبـات (یوحنـا ١: ٢٩)، بـەڵام هێشـتا ئـەوە تەفسـیری تـریش هەڵدەگرێت جگە لە فیدا، بەهەمان شێوەش قسەی مەسیح کە خودا لەبەر ئـەوەی جیهانی خۆشویست تاکە کوڕەکەی بەخشی هەروەها قسەکەی کە خودا کوڕەکەی نارد بۆ ئەوەی جیهان ڕزگار بکـات (یوحنـا ٣: ١٧)، ئاماژەکـانی تـریش بەهـەمان شـێوە بـۆ خۆبەخشـین: ئـەو نانـەی دەیـدەم لاشـەکەمە کـە بـۆ ژیـانی جیهـان دەیبەخشم (یوحنا ٦: ٥١)، هەروەها: منم شوانی باش، شوانی باشیش ئەوەیە کە خۆی بۆ مەڕەکان دەبەخشێت (یوحنا ١٠: ١١).
ئایا فیداکارییەکە دەستکاریکردنێکی مەسیحییەکانی دواتـرە بـۆ قسـەکانی کاهنـە جوولەکـەکان؟ لـە ئینجیلـی یوحـەننا هـاتووە کـە کاهنـەکانو فەریسـییەکان کۆبوونەوە بـۆ باسـی موعجیزەکـانی مەسـیحو وتیـان ئـەو مرۆڤـە مـوعجیزەی زۆر دەکاتو ئەگەر وازی لێبهێنین خەڵکێکی زۆر بـاوەڕی پێـدەهێنن ئـیتر ڕۆماییـەکان دێنو شوێنەکەمانو میللەتەکەمان دەبەن، ئینجا سەرۆکی کاهنەکان لەو سـاڵە کـە قەیافا Caiaphas ی ناو بوو وتی: ئێوە هیچ شتێك نازاننو بیر لـەوە ناکەنـەوە کـە یەك مـرۆڤ بـۆ گـەل بمرێـت باشـترە بـۆ ئێمـە نـەك هـەموو میللەتەکـە لەناوبچێت.
نووسەری ئینجیلەکەی یوحەننا لێرە دەڵێت: ئەم قسەیەی لەخۆوە نەوتووە بەڵکو لەبەرئەوەی سەرۆکی ئەو ساڵەی کاهنـەکان بـوو پێشـبینیی کـرد مەسـیح بڕیـاری

---

ئیصحاحی ٢٠ و ئەوەی تر لە ٢١ کە دوایەمین ئیصحاحە، بەپێی ئەوەو بەڵگـەی تـر پێدەچێت کە نووسەرێکی تر ئیزافەی بۆ کردووە بەڵام ڕێزی لە ئەسڵەکە گرتووە بۆیـە هـەردوو دەقەکـەی بەتەنیشت یەکەوە داناوە: تاریخ الکتاب المقدس، ص٧٦-٧٧.

[٤١١] لای مەسیحییەکان، بەعەرەبیش: یوحنا المعمدان، یـەحیای پێغەمبەریشـە لای موسـڵمانان. یوحەنناش کە ئینجیلی یوحەننای بەناوی ئەوەوە نراوە کەسێکی ترە.

داوە بۆ میللەت بمرێت، نەك تەنهاش بۆ میللەت بەڵكو بۆ ئەوەی كوڕانی خـودا كـە پەرتەوازەن لە تاكێك كۆبكاتەوە (یوحنا١١: ٤٧–٥٢).

ئەگەر ئینجیلی یوحەننا ئاشكراتر باسی فیدا بكات (هەرچـەندە وەك وتمـان واتـای تر هەڵدەگرێت) ئەوا كۆتایی ئەو ئینجیلە، یان ڕاستتر هەردوو كۆتاییەكـەی، گـورز لـە بـاوەڕی فیـدا دەوەشـێنن. لـە كۆتـایی یەكـەمی ئینجیلەكـە (ئیصـحاحی ٢٠) نووسەری ئینجیلەكە، كە چەند جارێك خۆی بـەم شـێوەیە وەسـف دەكـرد: ((ئـەو قوتابییەی یەسووع خۆشی دەویست))، لەگەڵ قوتابییەكی تر چـوو بـۆ گۆڕەكـەی مەسیحو دوای ئەوەی چووە ناو گۆڕەكەو كفنەكانو دەسڕەكە سـەر سـەری بـینی ((بـاوەڕی هێنـا چـونكە هێشـتا كتێبەكـەیان نـەدەزانی: پێویسـتە لـە مـردووان هەڵسێت)) (یوحنا ٢٠: ٩). واتە لەو كاتە هەر ئەوەنـدەی زانـی: مەسـیح لـە مـردن هەڵدەستێت.

هەموو ئیصحاحەكەش باسی فیدا ناكات ئەگەرچی مەسیح بۆ مەریـەمی مەجـدەلی دەركەوتو قسەی لەگەڵ كردو دوایی بۆ قوتابییـەكانی دەركـەوتو قسـەی لەگـەڵ كردن، یەكێكیش لە قوتابییەكان كە ناوی تۆما بوو لـەوێ نـەبوو و بـاوەڕی نـەكرد ئینجا مەسیح بۆ ئەوانو بۆ تۆما دەركەوتو قسەی لەگـەڵ ئـەم كـرد، لـە هیچـیش لەمانە باسی فیدا نەكراوە. كۆتایی ئیصـحاحەكەش ئەوەیـە نووسـەرەكە دەڵێـت: نیشانەی زۆری تریش لەبـەردەمی قوتابییـەكانی كردنـی لـەم كتێبـە نەنووسـراون، بـەڵام ئەمانـە نووسـراون بـۆ ئـەوەی بـاوەڕ بهێـنن كـە یەسـووع مەسـیحی كـوڕی خودایەو بۆ ئەوەی بەناوی ئەو ژیانێكتان هەبێت ئەگەر باوەڕتان هێنا (یوحنـا ٢٠: ٣٠–٣١). ئەمـەش پـەیامی ئینجیلەكەیـە: بـەهۆی باوەڕهێنـان بـە مەسـیح مـرۆڤ ژیانێكی جیاوازی دەبێت.

لـە ئیصـحاحەكەی تـریش كـە دیـارە بـۆی زیـادكراوەو بۆتـە كۆتـایی دووەمـی ئینجیلەكەو سەرباری باسی دەركـەوتنی بـۆ قوتابییـەكانیو قسـەكردنی لەگـەڵیان بەدرێژایی ئیصحاحەكە باسی فیدا نەكراوە بەمەرجێك باوەڕێكی وا گـرنگ دەبوایـە

لەلایەن مەسیحەوە بۆیان ئاشکرا بکرایە، بەجۆرێك ئەو بۆچوونەمان بۆ دروست دەبێت کە باسی فیدا لە سەرەتای ئینجیلەکە هەروەها لە بەشەکانی دواتر کە لە سەرەوە باسمان کردن زیادکراون‌و لە ئەسڵێکی ترەوە وەرگیراون‌و خراونەتە ناو ئینجیلی یوحەننا یان بەپێچەوانەوە باسی ئەسڵیی ئینجیلی یوحەننان بەڵام کۆتاییەکە هی ئەسڵێکی ترەو وەکو خۆی خنراوەتە ناو ئەو ئینجیلە.

ئەوەی بەئاشکرایی فیدا لە نامەکانی پۆلسی نێردراو هەیە کە مەسیحی نەبینیوە بەڵکو قوتابییەکانی بینیوە.[٤١٢] بۆ نموونە لە نامەی یەکەمی پۆلس بۆ مەسیحییەکانی کۆرنثوس دەربارەی ئەو ناکۆکییانەی کەوتۆتە نێوانیان هەروەها بۆ ئامۆژگاریکردنیان دەڵێت: مەسیح بۆ گوناهەکانمان مرد بەپێی کتێبەکان‌و نێژراو لە سێیەم رۆژ هەڵسایەوە[٤١٣] بەپێی کتێبەکان.. (١ کورنثوس ١٥: ٣-٤)،

---

[٤١٢] پۆلس، کە ناوە عیبرییەکەی شائوولە پیاوێکی ئاینیی جوولەکە بوو مەسیحییەکانی دەچەوساندەوە، دواتر کە بەرەو دیمەشق بۆ ئەو کارە دەچوو گوایە مەسیح بۆی دەرکەوتو پێی وت: شائوول .. شائوول بۆچی دەمچەوسێنیتەوە؟ پاشان شائول باوەڕی پێدەهێنێت (اعمال الرسل ٩: ١ بەدواوە). لێکۆڵەرەوەکان وای بۆ دەچن نامەکانی پۆلس یەکەمینن لەناو کتێبەکانی پەیمانی نوێ کە نووسرابێتنەوەو تەنانەت پێش ئینجیلەکانیش بوون کە باسی ژیانی مەسیحیان دەکرد: ستیفن م. میلر، روبرت ف. هوبر، تاریخ الکتاب المقدس، ص٦٩. پۆلس دەورێکی گەورەی لە مەسیحیەت هەبووەو بە دامەزرێنەری دووەمی مەسیحیەت دەزانرێت.

[٤١٣] باسی ئەوە کراوە کە زیندووبوونەوەی مەسیح لاسایی کردنەوەی چیرۆکی تەمموز (دوموزی)یە، کە چیرۆکێکی سومەرییەو کە بەهاران زیندوو دەبێتەوەو هاوینان‌و پاییزان دەگەڕێتەوە بۆ جیهانی مردووان‌و سرووتی میللی هەبوون بۆ گریان بۆی. بەپێی چیرۆکەکە شەیتانەکانی جیهانی خوارەوە بەدوای تەمموز، کە خوداوەندێکی شوانە، دەگەڕێن بۆ ئەوەی بیخەنە جێگەی ئینانا (عشتار)ی ژنی کە تازە لەو جیهانە دەرچووبوو و دەبینن لە گەورەی مەڕەکانێتی ئیتر بە چەکەکانیان پەلاماری دەدەن‌و دەیکوژن، لای کەنعانییەکان خوداوەند بەعل لەسەر دەستی خوداوەندە دوژمنەکەی دەکوژرێت، ئەدۆنیسی خوداوەندیش وەکو ئەو دوانە دەمرێت‌و زیندوو دەبێتەوە، بۆ ئەمانەو بۆ بەراوردی لەگەڵ مردن‌و ئازارەکانی مەسیح‌و هەڵسانەوەی بڕوانە: د. فاضل عبدالواحد علي، من الواح سومر الی التوراة ، ص٣٥١-٣٥٦. بۆ چیرۆکی دابەزینی عشتار بۆ جیهانی خوارەوە (دەقی سومەری‌و بابلی)و پەیوەندیی ئەوە بە

بەڵام وا دیارە ئەو بەشە بۆ ئەوەی قەناعەتیان پێبکات کە زیندووبوونەوە هەیە چونکە لە بڕگەی ١٢ی ئەو ئیصحاحە تا کۆتاییەکەی باسی ئەوە هەیە: بەڵام ئەگەر مژدە بە هەڵسانەوەی مەسیح لە مردووەکان دەکرێت چۆن کەسانێك لە ئێوە دەڵێن هەڵسانەوەی مردووان نییە؟[٤١٤]

بەڵام نامەکەی بۆ خەڵکی ڕۆما فیکرەیەکمان دەداتێ سەبارەت بە ڕەچەڵەکی فیدا کە مەسەلەی کاری چاکەو ڕزگارییە: ئایا کاری چاکە پێویستە بۆ ڕزگاری؟ باسێکی وا ، بەڵام بەشێوەیەکی تر، لەناو موسڵمانان هەبووە ئەویش ئایا کردارەکان بەشێکن لە باوەڕ یان بەشێك نین لێی. لە ئیسلام تاقمی مورجیئە تەیکیدیان لەسەر باوەڕ دەکردو کرداریان نەدەکردە بەشێك لە باوەڕ. هەرچەندە دوو باوەڕەکە، واتە فیدا لای مەسیحییەکانو ئیرجاء لای موسڵمانان جیاوازییان هەیە بەڵام یەکێك لەو شتانەی کۆیاندەکاتەوە بریتییە لە ڕزگاربوون بەهۆی کردارەوە.

مەسەلەی کردار لە ئاینی جوولەکە پەیوەندیی بە شەریعەتەوە هەیە کە پێویستە باوەڕدار پابەندی شەریعەت (نامووس) بێت. ئەرکەکانی شەریعەتیش بۆ میللەتانی بتپەرستان زۆر قورس بوون بۆیە ئەو بۆچوونە دروست بوو کە ئەو کارانە بۆ باوەڕ

---

تەممووزەوە بڕوانە هەروەها: طە باقر، مقدمة في ادب العراق القديم، ص٢٣٥–٢٤٩، بۆ وەرگێڕانی تەواوی دەقە سومەرییەکە بڕوانە:

S. N. Kramer, Inanna's Descent to the Nether World, in; ANET, pp.52-57.

گریان بۆ تەمموز لەناو جوولەکەش بڵاوببووە وەك چۆن لە کتێبی حەزقیال (حزقیال٨: ١٤) هاتووە کە بینی ئافرەتانێك دانیشتبوون بۆ تەمموز دەگریێن، من الواح سومر ، ص٣٥٥، ئەوەش یەکێك بووە لە کارە خراپەکانی ئیسرائیلییەکان کە خودا پیشانی حەزقیالی دابوون. داستانە میسرییەکەشمان لەبیر نەچێت کە باسی کوشتنی ئۆزیریس لەسەر دەستی سێتی برای و زیندووکردنەوەی لەسەر دەستی (حۆر)ی کوڕی دەکات.

[٤١٤] قورئان لە باسی ئەهلی ئەشکەوت دەڵێت کە خودا ویستی خەڵك باوەڕ بهێنن بە بەڵێنەکەی و بە قیامەت: (وَكَذَلِكَ أَعْثَرْنَا عَلَيْهِمْ لِيَعْلَمُوا أَنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَأَنَّ السَّاعَةَ لَا رَيْبَ فِيهِ– الكهف: ٢١)، تێگەیشتنیش لەمە ئاسانە چونکە زەحمەت بوو بۆ میللەتانێك لە منداڵییەوە فێرکراون کە مردوو ناگەڕێتەوە باوەڕ بە زیندووبوونەوەی هەموو مردووان بکەن.

گـرنگ نـین. یـەکێك لـە ئەرکـە گرنگـەکانی شـەریعەت خەتەنـەکردن بـوو کـە جیاکەرەوەیـەکی نێـوان بـاوەڕداران‌و بتپەرسـتان بـوو و بـەپێی تـەورات پـەیمانی خودایە لەگەڵ گەلەکەی. پۆلس لەو نامەیە باسـی ئـەوە دەکـات چـاکەی خـودا[٤١٥] بەبێ شـەریعەت دەرکـەوت (واتـە چـاکە خـودا پێویسـتی بـە شـەریعەت نـەبوو بـۆ ئەوەی دەربکەوێت)، چاکەی خودا بەهۆی باوەڕهێنانە بە مەسیح (رومیـە ٣: ٢١-٢٢). ئەم چاکبوونەش بەخۆڕایی دەبێت لەڕێگەی فیداوە بۆ ئەوەی چـاکەی خـۆی پیشـان بـدات بـۆ سـڕینەوە گوناهــە کۆنـەکان (رومیـە ٣: ٢٤-٢٥)، نموونـەی ئیبراهیمیش دەهێنێتەوە کە ئەگەر بە کردارەکان چاك بووبێت ئەوە شانازییە بۆی بەڵام نەك لای خودا چونکە بەپێی کتێبەکە بـاوەڕی هێنـابوو ئـیتر بـۆی بـە چـاکە حساب بوو (رومیە ٤: ٢-٣). بەڵێنیش بۆ ئیبراهیم یان نەوەکەی بۆ ئەوەی ببێتـە میراتگـری جیهـان بـە شـەریعەت نـەبوو بـەڵکو بـە چـاکەی ئیمـان (رومیـە ٤: ١٣) چاکەش تەنها بۆ ئەو نەژمێردرا بەڵکو بۆ ئێمەش کە باوەڕمان بەو کەسە هێنـا کـە مەسیحی لە مردووان هەڵساند، ئەو مەسیحەی لەبەر گوناهـەکانمان تەسـلیم کـرا و بۆ ئەوەی چاك بین هەڵسێنرا)) (رومیە ٤: ٢٣-٢٥).

پۆلس لەو نامەیە باسی نـەك تـەنها چـاکبوون بـەهۆی قوربانییەکـەی ((کوڕەکـەی خودا)) دەکات بەڵکو هەروەها ئاشتبوونەوە لەگەڵ خودا بـەهۆی ئـەو قوربانییـەی ((کوڕەکەی))، ئەوەش نەك تەنها لەو قۆناغە، واتە ئەو کاتەی مرۆڤ خراپە یان ئەو کاتەی دوژمن بوو بەڵکو دەڵێت لەدوای چاکبوونمان زۆر لەپێشترە بـە خوێنەکـەی

[٤١٥] وشەی چاکە هەرچەندە واتای پیتـاوپیتی زاراوە مەسـیحییەکە دەدات بـەڵام واتـای تـەواوی نـادات. وشـەکە بـە عـەرەبی (بر)ــە، چـاککردنیش (تبریـر) justification ـە. زاراوەکـە لـە عەقیدەی مەسیحی بریتییە لە ڕاگەیاندنی چاکی‌و ئاشتبوونەوە لەگەڵ خودا، ئەو کەسانەش کە باوەڕ بە مەسیح دەهێنن خودا چاکییان ڕادەگەیەنێت. لای کەنیسەی کاسـۆلیکی چاککردن بـە هەردوو باوەڕو کـردارە، لای پرۆتسـتانتیش چاککردن بـە بـاوەڕە بەتـەنیا. چـەمکەکە تـەرکیز لەسەر بەخششی خودایی‌و باوەڕو فیدا دەکات. لەو وشەیەش بەکارهێنانی نوێ کـە بـە کـوردی پێی دەڵێن (پاسـاوهێنانەوە) هـاتووە، چـونکە پاسـاوهێنانەوە نیشـاندانی چاکەی کارێك کـە پاساوی بۆ دەهێنرێتەوە.

لە تووڕەیی ڕزگارمان بێتو زۆر لەپێشترە لەدوای ئاشتبوونەوەمان بـەهۆی ژیـانی ئەوەوە ڕزگارمان بێت (رومیە ٥: ٨–١٠)، بەواتایەکی تر فیدا تەنها بۆ سـڕینەوەی گوناه پێویست نییە بەڵکو لەدوای ئەو سڕینەوەیە زۆرتر پێویستە.

لەمەوە نەك تەنها عەقیدەی فیدا لای پۆلس ئاشکرا دەبێت بەڵکو ڕەچەڵەکەکەشی دەزانـین ئـەویش پێشخسـتنی بـاوەڕەو سـووککردنی کـردارە لەسـەر بـاوەڕداران. ئاشکراشـە کـە بچـووککردنی کـردار پێویسـتی بـە پڕکردنەوەیـە، بـاوەڕیش ئـەو پڕکردنەوەیە دەکات، بەڵام، ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەڵ ئیسلام دەبینین کە لەو کاتە خودی باوەڕ لای بەشێك لە موسڵمانان بەس بوو لە عەقیدەی پۆلس باوەڕ بە مەسـیح پەیوەسـت کـرا بـە ڕووداوی لەخاچـدانەکەو پێکـەوە عەقیـدەی فیـدایان دروست کرد.

بـەڵام وەنـەبێت کێشـەی قورسـیی شـەریعەتی جوولەکـەو کـرداری چـاکە بەتـەنیا بەرهەمهێنەری باوەڕی فیدا بووبن، بەڵکو وای بـۆ دەچـین شـتی تـریش هـەن وەك خۆجیاکردنەوە لە جوولەکەو نموونەی قوربانییەکەی ئیبراهیمو کوڕەکەی:

١–خۆجیاکردنەوە لە جوولەکە، کە باوەڕیـان بـە مەسـیح نـەهێنابوو و لەخاچـیان دابوو و شـوێنکەوتووەکانیان دەچەوسـاندنەوە، پێویسـت بـوو بـۆ دوورکەوتنـەوە لێیان، هەروەها بۆ ئەوەی ئەو ئاینە وەکـو ئـاینێکی نـوێ دەربکـەوێت نـەك تـەنها تەواوکەری ئاینی پێغەمبەرەکانی جوولەکـە. وێسـتگەیەکی ئـەو خۆجیاکردنەوەیـە بریتییـە لـە جـەژنی فیصـح کـە بـۆ ئیسـرائیلییەکان بـریتی بـوو لـە یادکردنـەوەی ڕزگاربوونیان لە فیرعەون.[٤١٦] فیصحی مەسیحی لـەجیاتی ئـەوەی پەیوەنـدیی بـە

---

[٤١٦] خواردنەکەی کاتی دەرچوون بەم جۆرەیـە لـە (خـروج ١٢: ١–٢٠): نـانی هەڵنـەهاتوو یـادی ئەوەی کـە ئیسـرائیلییەکان بەپەلـە میسـریان جێهێشـتو هەویرەکـەیان فریانەکـەوت هـەڵبێت، خوێنی بەرخە سەربڕاوەکانیش درا لـە دوو لاتەنیشـتو بەشـی سـەرەوەی دەرگـای ئـەو ماڵـەی بەرخی تێ دەخورێت بۆ ئەوەی بەڵای خودا (مردنی نۆبەرەکان) ئـەو ماڵانـە جیابکاتـەوەو بـەر ئەوان نەکەوێت (خروج ١٢: ٧ و ١٣). لە کتێبی تەثنیە، کە باسی سـەردەمی دوای دەرچـوونە، کەمێك جیاوازی هەیە (تثنیة ١٦).

سەربڕینی مەڕێكو خوێنی ئەو مەڕەو خواردنی نـانی هـەویرێكی هەڵنـەهاتوو بـووە قوربانیدانی ((بەرخەكەی خودا))و تەئكیدكردن لەسەر خـوێنی مەسـیحو خـواردنی نانەكـە لـەو جەژنـە مەسـیحییە.[٤١٧] بـەم شـێوەیەش پەیوەسـتكردنی فیصـح بـە ڕزگاربوون شێوەیەكی تری لە مەسیحیەت وەرگرتو بووە خاڵێكی خۆجیاكردنـەوە لە جوولەكە.[٤١٨]

فیصحی جوولەكە بەم شێوەیەیە: شەوەكەی گۆشتی مەڕێكی نێـر یـان گیسـكێكی یەك ساڵە دەخورێت (پێویستە بە ئاگر ببرژێنرێت نەك بكوڵێنرێـت یـان بـە كـاڵی)و بۆ بەیانییەكەی هیچی لێ نەمێنێتو ئەوەی دەمێنێت بـە ئـاگر بسـووتێنرێت، لـەو حەوت ڕۆژەش هیچ نانێك نەخورێت جگە لـە نانێـك كـە هەویرەكـەی هەڵنـەهاتووە دواشیوی مەسیح هاوشێوە كرا لەگەڵ خواردنی فیصح كە رزگاریی ئیسرائیلییەكان بوو لە میسـر، مەسـیحیش بەهـەمان شـێوە بـووە هـۆی ڕزگـاری، هـەروەها بـووە بەرخە سەربڕاوەكەی جەژنەكە.

٢–لە مێژووی بەنو ئیسرائیل قوربانییەكەی ئیـبراهیم هـەبوو ئـەویش كاتێـك خـودا فـەرمانی پێـدابوو ئیسـحاقی كـوڕی سـەرببڕێت (و بیسـووتێنێت) فریشـتەی خـودا بانگی دەكات كە دەستی بۆ نەبات، ئینجا ئیـبراهیم بـەرانێك دەبینێـت دوو شـاخی لە دەوەنەكە گیریان خواردووە ئەویش دەیباتو لەجیاتی كوڕەكەی دەیسووتێنیت

---

[٤١٧] دواشیوەكەی مەسیح كە لە ئینجیلەكان باسـكراوە كێشـەیەكی گـەورەی ناوەتـەوە لـەڕووی دەستنیشانكردنی تەواوی كاتەكەی لەگەڵ ئەوەی كە ئایا مەسیح خواردنی فیصحی جوولەكەی دەخوارد بڕوانە: حنا جرجس الخضري، تاريخ الفكر المسيحى، ج٢، ص٣١٥–٣٢٠.

[٤١٨] لـە سـێ ئینجیلـە لەیەكچووەكە (مـەتتاو مـەرقوسو لوقـا) دواشـیو خـواردنی فیصـحەكەو یادكردنەوەی دوا خـوانی ئیسـرائیلییەكان پـێش هـەڵهاتنیان لـە میسـر بـوو بـەڵام لـە ئینجیلـی یوحەننا ئەوە ڕۆژی پێشتر بوو. لەو سێ ئینجیلە كە خواردنی فیصحیان خوارد نانو شـەرابەكە بوونە لەشو خوێنی مەسیح بەڵام یوحەننا وای دەبینی كە مەسیح خـۆی ئـەو بەرخەیـە كـە لـە خوانی فیصح دەخورێت بۆیە وتی كە مەسیح ئـەو كاتـە مـرد كـە بـەرخی فیصـح سـەردەبڕدرا: ستيفن م. ميلر، روبرت ف. هوبر، تاريخ الكتاب المقدس، ص٧٥. بڕوانـە تەئكیـد كـردن لەسـەر خوێنی مەسیح چ لە دواشیوو چ لە ئەدەبیاتی مەسیحی.

(تەکوین٢٢). [٤١٩] بەم جۆرەش ئیسحاق ڕزگاری بوو و نەوەیەکی لێ دروستبوو. کردنی مەسیحیش بە بەرخێك کە دەکرێتە قوربانی (ئەمەتا بەرخەکەی خودا کە گوناهی جیهان لادەبات – یوحنا ١: ٢٩) دەبێتە مێژوویەکی نوێ بۆ ئاینە نوێکە. خوداش دوای ڕزگارکردنی ئیسحاق پەیمان بە ئیبراهیم دەدات کە بەرەکەتی لێ بکاتو نەوەکەی وەکو ئەستێرەی ئاسمانو لمی سەر کەنار دەریا زیاد دەکات (خروج٢٢: ١٧)، چیش لە چیرۆکی مەسیحیش هاوشێوەی ئەو پەیمانە بۆ دامەزراندنی پەیمانێکی نوێ لە قوربانییەك باشترە؟ کەواتە با مەسیح لەجیاتی بەرانەکە (لێرە دەبێتە بەرخ) بۆ رزگاری بێت. ئەوەتا پۆلس دەڵێت: ((بە خوێنی خۆی، نەك بە خوێنی گیسك یان گوێرەکە، یەك جار چووە شوێنە پیرۆزەکەو فیدایەکی هەتاهەتایی دەستکەوت–عبرانیین٩: ١٢))

****

ئەگەر هەموو زانیارییەکانی سەرەوە کۆبکەینەوە دەگەینە چەند ئەنجامێك لەبارەی لەخاچدانو هەڵسانەوەی مەسیحو بوونی بە قوربانیی گوناهەکان:

١–کەسێك لەخاچدرا کە باوەڕی مەسیحی دەڵێت مەسیح بووەو قورئان دەڵێت کەسێکی تر بووە.

٢–شوێنکەوتەیەك یان چەند شوێنکەوتەیەکی مەسیح لاشەی کەسە لەخاچدراوەکەی لە گۆڕەکە فڕاندو وایزانیبوو مەسیحە.

---

[٤١٩] جیاوازیی ئەو چیرۆکە لەگەڵ ئەوەی قورئان زۆرە چونکە ئەمەیان باش نەهۆنراوەتەوە: ئیسحاق نازانێت بۆ کوێ دەبرێتو بۆچی، بەڵام قورئان پێمان دەڵێت کە ئیبراهیم بە کوڕەکەی (کە ناوی نەوتراوە) دەڵێت بەتەمای چییەو کوڕەکەی قبووڵی دەکات فەرمانی خودا بەجێبهێنێت، لەوەی تەوراتی بەردەستمان پەیدابوونی بەرانەکە لە ڕێکەوت دەچێتو کەس پێی ناڵێت ئەوە قوربانیی کوڕەکەیەتی، بەڵام لەوەی قورئان لەلایەن خوداوە نێردراوەو بە ئاشکراییە وتراوە کە قوربانیی کوڕەکەیەتی

٣-هەموو باسەکانی بینینی مەسیح دروستکراون یان وەهمن هەر وەکو بینینی مەسیح لەلایەن پۆلسەوە کە ماوەیەکی زۆر بوو دوای ((لەخاچدانی)) کە ناچار نین بڕوا بەو بینینە بکەین.
٤-لەخاچدانەکە پەیوەست کرا بە قوربانییەکەی جەژنی فیصحی جوولەکەو بووە بەدیل بۆ فیصحی جوولەکەو مەسیح بووە بەرخی فیصح کە سەردەبڕدرێت.
٥-بەهۆی پەیوەستبوونی فیصح بە ڕزگارییەوەو بەهۆی ڕووداوی لەخاچدانەکە ئەو لەخاچدانە بووە هۆی ڕزگاری ئەویش لەڕێگەی قوربانییەوە.
٦-لە سەردەمەکانی دواتر پاساوی گەورە هەبووە بۆ قوربانی وەك هۆکاری لێخۆشبوون ئەویش بەهۆی باوەڕ بە مەسیحەوە چونکە نێردراوەکان چوونە ناو میللەتانی تری غەیری جوولەکە، ئەوانە وەکو جوولەکە شەریعەتیان نەبوو، شەریعەتی جوولەکەش زۆر قورس بوو بۆیە سووککردنی باری سەرشانیان پێویست بوو. لەمەشەوە تەئکید لەسەر بەخششی خوداییو لەسەر باوەڕ بە مەسیح کرا، هیچ شتێکیش بۆ ئەمە لەو باوەڕە گونجاوتر نییە کە خودا کوڕەکەی خۆی کردبێتە فیدای گوناهەکانی مرۆڤ. چیرۆکی ئیبراهیمیشمان لە یاد نەچێت کە ویستی کوڕەی بکاتە قوربانی.
٧- باوەڕی نوێش کە مەسیحییەتە دەورەکانی فیداکارییەکەی ئیبراهیمو ئیسحاقی گۆڕی: کوڕەکە لە پەیمانی کۆن ئیسحاق بوو و لە پەیمانی نوێ بووە مەسیح کە پەیمانی نوێ لێوەی دەست پێ دەکات.
٨-هەڵسانەوەی مەسیح لاساییکردنەوەی داستانو چیرۆکی میللەتانی ترە، هەوڵێشە بۆ ئەوەی تازە باوەڕداران قەناعەت بە زیندووبوونەوەی مردووان بکەن کە شتێکی نوێیە بۆیان یان بە عەقڵیان ناچێت.

# دەربارەی پێغەمبەران

## ئیبراهیم

### ٤-ئازەر باوکی ئیبراهیمە

((وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ لأَبِيهِ آزَرَ أَتَتَّخِذُ أَصْنَامًا آلِهَةً إِنِّي أَرَاكَ وَقَوْمَكَ فِي ضَلاَلٍ مُّبِينٍ-الانعام: ٧٤)).

عبدالفادی دەڵێت راستەکەی ئەوەیە کە کتێبی پیرۆز وتوویەتی ئەویش باوکی ئیبراهیم ناو تارەح بوو (تكوين ١١: ٢٧).

* * * *

چۆن بزانین تارەح، کە ناوەکەیە لە وەرگێڕانە عەرەبییەکانو کە بە عیبری تێراخ תֶּרַח ـە بەڕاستی ناوی باوکی ئیبراهیم بوو؟

ئەو کەسەی باوەڕی بە تەورات وەك وەحییێکی ئاسامانی نەبێت ناتوانێت هیچمان پێ بڵێت لەبارەی ڕاستیو دروستیی ناوی تارەح. لەنێوان ئیبراهیمو مووسا، کە گوایە ئەمیان تەوراتی نووسیبووەوە، نزیکەی شەشسەد ساڵ بوو و ماوەیەکی دووری وا ناوەکانو بەسەرهاتەکان دەخەنە خانەی گومانەوە. ئەوانەی باوەڕیان بە تەورات وەك وەحییێکی ئاسمانی هەیە (بەم جۆرەش ڕەخنە لە قورئان دەگرن کە تارەحی کردووە بە ئازەر) ناتوانن هەروەها وەڵامی ئەو پرسیارە بدەنەوە کە بۆچی قورئان لەناو ئەو بەسەرهاتانەی کە گوایە لە تەورات وەریگرتوون هەڵە لە شتێکی سادەی وا بکات کە ناوی کەسێکەو بەو جۆرە زۆر جیاوازە باسی بکات.

بەڵام تەنانەت ئەو کەسەش کە باوەڕی وایە خودی مووسا تەوراتی نووسیبووەوە ناتوانێت لەوە دڵنیامان بکاتەوە کە ناوەکە بە دروستی نووسراوەتەوە. ناوەکانی تەورات نموونەن لەسەر ئەو دڵنیانەبوونو لەو نموونانە ئەوانە وەردەگرین کە لە سەردەمی ئیبراهیم بوون:

نموونەیەك لەوانە ناوی پادشاکانی ئەو کاتانە (لە کتێبی تەکوین: ئیصحاحی ١٤):
پادشای عیلام עֵילָם کە کتێبی تەکوین پێی دەڵێت (کدەرلـەعۆمێر) כְּדָרְלָעֹמֶר
کە ئێلام پادشای وای بەو ناوە نەبووەو بڕگەی یەکەمی لەناوی پادشایانی تر وەرگیراوە کە (کودور)ـەو کراوەتە کدەر. ناوێك لەم جۆرەو لە نزیك سەردەمی ئیبراهیم بریتییە لە (کودور–مابوك) کە ناوێکی ئێلامییە، ناوی باوکیشی هەر ئێلامییەو خۆشی بە ئێلامی زانراوە هەرچەندە ناکۆکی لەبارەیەوە هەیەو بە ئامورریەکانەوە پەیوەست کراوە.[٤٢٠] ئایا بەشی دووەمی ناوی کدەرلەعۆمێر بەتایبەتی (عۆمێر) پەیوەندیی هەیە بە ئامورریەکانەوە؟ نازناوێکی کودور–مابوك بریتی بوو لە ((باوکی وڵاتی ئاموریی)).[٤٢١] دوو کوڕەکەی کودور–مابوك پادشای شاری (لارسا) بوون لە باشووری وڵاتی دوو ڕووبار. ناوێك لە بەسەرهاتەکەی ئیبراهیم لە تەورات کە لەگەڵ باسی کدەرلەعۆمێرو ئێلام هاتووە بریتییە لە شوێنێك بەناوی ئێلاسار אֶלָּסָר کە نزیکە لە ناوی لارساو لە سەردەمی ئیبراهیم پادشانشینێکی بەهێز بوو و بەتایبەت لە کاتی کوڕی دووەمی کودور–مابوك" واتە ریم–سین.

ریم–سین (١٨٢٢–١٧٦٣ پ.ز)، کە وەکو براکەی خاوەنی ناوێکی ئەکەدی بوو، بەبۆچوونی خۆم هاوچەرخی ئیبراهیم بوو. ریم–سین دوایەمین پادشای لارسا بوو و حامورابیی بابل (١٧٩٢–١٧٥٠ پ.ز) بەزاندیو شارەکەی گرت، ئەویش هەڵهات بەڵام دوایی حامورابی گرتی.[٤٢٢] ریم–سین وەکو پادشاکانی ئەو سەردەمە خۆی کردبووە خوداوەندو دوور نییە ئەو پادشایە بێت کە قورئان باسی موناقەشەی ئەو و ئیبراهیمی کردووە. ئەگەر ئێلاساری تەوراتیش لارسا بێت ئەو کاتە ناوی ئاریۆك אַרְיוֹךְ کە تەورات وەك پادشای ئێلاسار ناویبردووە هەڵەیەکی تر دەبێت

---

[٤٢٠] بڕوانە بۆچوونەکان دەربارەی ئەوەی ئێلامی بێت یان ئاموری بێتو پەیوەندیی نزیکی لە ئێلامییەکانەوە یان نیو ئێلامیو نیو ئاموری:
**Madeleine A. Fitzgerald, The Rulers of Larsa, pp.130-131.**

[421] ***ibid*, p.132.**

[422] ***ibid* p.148.**

چونکە شارەکە هیچ پادشایەکی نەبووە بەو ناوەو ناوی ئاریۆك لە ناوێکی خـورری دەچـێتو[٤٢٣] ڕەنگـە ئـاریۆك نـاوێکی سـەردەمێکی دواتـر بووبێـت لـە باسـەکان تێخنراوە.

لە هەمان باس ناوی ئەمرافێل אַמְרָפֶל هاتووە کە پادشای شینعار שִׁנְעָר بوو، کە ئەمیان وڵاتی بابل بوو. ڕەنگە ئەمرافێل گۆڕینی ناوی حامورابی بێت (بـە ئەکـەدی دەنووسرێت: خاممورابی بەڵام پێدەچێت بەشێوەی تـر بخوێنرێتـەوە وەك عـەممو رافی، حەموو رابی... تاد). بزانە چۆن کتێبی تەکوین لەجیاتی بابـل نـاوی شـینعار دەبات، ئەمرافێلیش دەکاتـە هاوپـەیمانی کدەرلـەعۆمێر بـەڵام ئەگـەر ڕاسـت بێـت ئـەمرافێل حـامورابی بێـتو کدەرلـەعۆمێر کـودور-مـابوك بێـت هەڵەیـەك لـە مێژووەکـەی تـەوراتی بەردەسـتمان هەیـە لەبـەر ئـەوەی حـامورابی هاوچـەرخی کودور-مابوك نەبوو بەڵکو هاوچەرخی ریم-سینی کوڕی بوو.

هەڵەیەکی مێژوویی تری ئەو کتێبە ئەوەیە گوایە خودا بـەڵێنی بـە ئیـبراهیم دابـوو نەوەکـەی ئـەو وڵاتانـەیان دەسـتدەکەوێت کـە دەکەونـە نێـوان نیـلو فـورات، یەکێکیش لەو ناوانە وڵاتی خاتییەکان (خێت) کە ئاشکرایە ئەو کاتە، واتە سەدەی ١٩ یـان ١٨ ی پـێش زایـن، خاتییـەکان نەهاتبوونـە گۆڕەپـانی مێـژوو. مێـژووی خاتییەکان زۆر لەوە نوێترە. پێشتر خاتییە کۆنەکان هەبوون کە لە ئەنادۆڵ بـوون بەڵام ئەو خاتییانەی لە سووریا دەسترۆشتوو بوونو وڵاتەکـەیان لـە ئـەنادۆڵ بـوو دەگەڕێنەوە بۆ سەدەی ١٤ ی پێش زاین. باسی خاتییەکان بۆ سـەردەمی مووسـا گونجاو بوو کـە لـە سـەردەمی ڕەمسیسـی دووەم، هاوچـەرخی مووسـا، شـەڕ لـە سووریا لەنێوان میسرو خیتا هەبوو و دواتر پەیمانی ئاشتییان پێکەوە بەست.

---

[٤٢٣] خوررییـەکان لـە بەشـێکی گـەورەی کوردسـتان نیشـتەجێبوونو بەتایبـەتی لـە بـاکووری کوردسـتان بـەڵام لـەو سـەردەمە گەیشـتبوونە باشـوورتر وەك ناوچـەکانی پشـدەرو هـەولێرو کەرکووکو نەگەیشتبوونە ناوەڕاستو باشووری وڵاتی دووڕووبار.

بـەپاڵ ئەوانـەوەو هەرچـەندە نـاوی بـاوکی ئیـبراهیم لـە قورئـان ئـازەرە بـەڵام موفەسیرە ئیسلامییەکان ئاگایان لەناوی تارەح بوو کـە لـە تـەورات هـاتووە بۆیـە ئەوانیش ئەو قسەیەیان وتووەو بۆ ناوی ئازەر چەند شتێکیان وتووە وەك ئـەوەی ناوی باوکی ئیبراهیم تارەح بـووەو ئـازەر نـاوی بتـە، تەفسـیرێکی تـریش ئەوەیـە ئازەر جنێوێکە، تەبەریش کە ئەوانە نەقڵ دەکات ئەوەی پەسەند کردووە ناوەکـە ئازەر بێتو دەکرێت دوو ناوی هەبووبێت یان یەکێکیان نازناو بووبێت.[٤٢٤]

سەیریش نییە ئەگەر عبدالفادی کە هەموو جارێك پـەنا بـۆ بـەیزاوی بـەرێت ئێسـتا پشـتگوێی بخـات چـونکە بـەیزاوی ئـەو بۆچـوونانە دووبـارە دەکاتـەوە. بـەیزاوی دەڵێت لە کتێبەکانی مێژوو هاتووە کە ناوی باوکی ئیبراهیم تارەح بـوو بۆیـە وتـرا کە تارەحو ئـازەر دوو نـاوی ئـەون، وتراویشـە ناوەکـە تارەحـە ئـازەریش وەسـفە بەواتای پیاوی بەتەمەن یان کەسی لار وتراویشە بتێك بـوو تـارەح دەیپەرسـت.[٤٢٥] واتە تەنها بۆ مەبەستی ڕەخنە عبدالفادی بەیزاویی پشتگوێ خستووە.

بۆچوونی خۆشم دەربارەی ناوی باوکی ئیـبراهیم ئەوەیـە کـە نـاوی ئـازەرە، وەك چـۆن بەشـێك لـە موفەسـیرەکان دەڵـێنو زاهـیری قورئـانیش نیشـانی دەدات، قسەکانی ئەو موفەسیرانەش کە دەڵێن کە ئەوە ناوی بتە یان جنێـوە یـان... تـاد بۆ گونجاندنە لەگـەڵ باسـەکەی تـەوراتو قسـەیەکی بێبناغـەن. بـۆ ئەوانـەش کـە قورئـان بـۆ سەرچـاوە عیـبریو مەسـیحییەکان دەگەڕێننـەوە ئـەوە دووبـارە دەکەمەوە کە ئەوان ناتوانن وەڵامـی ئـەم پرسـیارە بدەنـەوە: چـۆن قورئـان ئـەو هەموو بەسەرهاتانەو ناوی هەموو ئەو کەسـانەی وەرگرتـووە بـەڵام لـە شـتێکی وا ئاسان هەڵە دەکاتو نازانێت ناوی باوکی ئیبراهیم لە تەورات چی بووە؟

---

[٤٢٤] تفسير ابن كثير، مجلد ٣، ص ٢٨٨-٢٨٩.

[٤٢٥] تفسير البيضاوي، مجلد ٢، ص ٤٢٢.

## ٢٢-ئیبراهیم لەکوێ و نەمروود لەکوێ؟

((أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِي حَآجَّ إِبْرَاهِيمَ فِي رِبِّهِ أَنْ آتَاهُ اللّهُ الْمُلْكَ إِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّيَ الَّذِي يُحْيِي وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا أُحْيِي وَأُمِيتُ قَالَ إِبْرَاهِيمُ فَإِنَّ اللّهَ يَأْتِي بِالشَّمْسِ مِنَ الْمَشْرِقِ فَأْتِ بِهَا مِنَ الْمَغْرِبِ فَبُهِتَ الَّذِي كَفَرَ وَاللّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ –البقرة: ٢٥٨)).

ئایەتەکە باسی موناقەشەی نێوان ئیبراهیمو ئەو کەسەی خۆی بە خوداوەند ناوبردبوو کە ناوی نە لە قورئانو نە لە فەرموودەی صەحیح نەهاتووە. لە تەفسیرەکان، بەڵکو تا ئێستاش، وا باوە پادشاکە نەمروودی ناو بووە کە ئەو ناوە لە تەورات هاتووە، عبدالفادیش پاش هێنانەوەی قسەیەکی بەیزاوی دەپرسێت: چۆن ئەو شتە لەنێوان ئیبراهیمو نەمروود ڕووی دا لەکاتێك نەمروود سێ سەد ساڵ پێش ئیبراهیم بوو؟ لەنێوان ئیبراهیمو نووح دوانزە نەوە هەبوون (لوقا٣: ٣٤-٣٦)و لەنێوان نەمروودو نووح چوار نەوە هەبوون (تەکوین ١٠: ١-٨).

* * * *

وەك وتم ناوی نیمرۆد (نەمروود) נִמְרֹד نە لە قورئانو نە لە فەرمووده نەهاتووە، کەواتە خەتای ئەو کەسانەیە کە خەتایانە.

لەڕووی مێژووییشەوە پادشایەك نەناسراوە لە سەردەمی ئیبراهیم ناوی نیمرۆد بووبێت. ئەگەر شوێنی ئیبراهیم دیار نەکرابێت دەتوانین بڵێین ڕەنگە پادشای وا هەبووبێتو ناوی تۆمار نەکراوە بەڵام لەبەر ئەوەی تەورات باسی ئەوە دەکات ئیبراهیم لە ئوری کلدانییەکان[٤٢٦] بوو گومان سەبارەت بە نیمرۆد زۆر بەهێز دەبێت چونکە ناوی پادشایانی ئەو سەردەمەو ئەو شوێنە زانراون. ناشلێین ناوبردنی ئوری کلدانییەکان لەلایەن تەوراتەوە هەڵەیە هەرچەندە کلدانییەکان، کە تیرەیەکی ئارامین، نزیکەی هەزار ساڵ دوای ئیبراهیم ڕوویان کردە وڵاتی دووڕووبار، ئەویش لەبەر ئەوەی دیارە تەورات ئەو ناوە بەکاردەهێنێت کە کاتی نووسینەوەی یان دیسانەوە نووسینەوەی باو بوو.

---

[٤٢٦] بە شێوەی (ئوور کاسدیم) אוּר כַּשְׂדִּים هاتووە.

ڕاستیشە باسی نیمرۆد وەك پادشایەکی هاوچەرخی ئیبراهیم هەڵەیەکی گەورەیە، بەڵام ئەو هەڵەیە گوناهی کێیە؟ قورئان ئەوەی نەوتووە بەڵکو قسەی موفەسیرە ئیسلامییەکانە، بەڵام گوناهەکە هی ئەوانیش نییە چونکە ئەوان باسی هاوچەرخێتیی ئیبراهیمو نیمرۆدیان لە سەرچاوەکانی جوولەکەوە وەرگرتووە وەك لە خوارەوە ڕوونی دەکەینەوە.

بەپێی تەورات نیمرۆد کوڕی کووش כּוּשׁ ـە، کووشیش کوڕی حام کوڕی نووحە (تکوین ١٠: ١–٨)، واتە ڕاستە نیمرۆد زۆر کۆنترە لە ئیبراهیم، ئەویش ئەگەر نیمرۆد کەسێکی راستەقینە بێت کە وای نازانین ڕاستەقینە بێت. باسەکەی نیمرۆدیش پڕ لە هەڵەیە چونکە گوایە سەرەتای پادشانشینەکەی بابلو ئوروكو ئەکەد بوو (تکوین ١٠: ١٠) کە ئەمە هەڵەیە چونکە ئەگەر نیمرۆد ڕاستەقینە بێت هێندە کۆنە کە هێشتا هیچ لەو شارانە دروست نەببوون بەڵکو باشووری عیراق هیچ نیشەجێیەکی لێ نەبوو و دەریا داپۆشیبوو. نووسەرانی تەوراتی بەردەستمان مێژوویەکیان نووسیوە بەپێی زانیاریی سەردەمی خۆیان (بڕوانە زیاتر لە باسی بورجی بابل).

دیارە موفەسیرە ئیسلامییەکان ناوی نیمرۆد (نەمروود)و بەسەرهاتی لەگەڵ ئیبراهیمیان لە کتێبەکانی تری جوولەکە وەرگرتووە وەك بۆ نموونە (کتێبی یاشەر) יָשָׁר. ئەو کتێبە فەوتابوو بەڵام لە دوو کتێبی قانوونیی جوولەکە ناوی هاتووە: یەشووع (١٠: ١٣)و (٢صموئیل ١: ١٨)، ئینجا گوایە دوایی دۆزرایەوەو بڵاوکرایەوە بەڵام بێئەوەی دڵنیایی هەبێت لە ئەگەری ئەوەی ڕاست بێت. ئیبراهیم لەو کتێبە بتەکانی تێراخی باوکی دەشکێنێت (یاشەر ١١: ٣٣)،[٤٢٧] پاشان نیمرۆد

[427] The Book of Jasher, p.29.

ئەمە وەرگێڕانێکی ئینگلیزیی نوسخەیەکی عیبرییە کە سەدەی حەڤدە بۆ یەکەم جار لەچاپدرا، ئاماژەش بۆ نوسخەی تر کراوە کە بە ساختەی دەزانن، نوسخەی ساختەش جار جار دەردەکەوتن.(لاپەڕە V پێشەکیی لێکۆڵەرەوەیەك).

ئیبراهیم دەگرێت (یاشەر ١٢: ١)و[٤٢٨] دواتر لەسەر پێشنیاری گەورەکانی وڵاتەکە دەیخاتە ناو ئاگرەوە بەڵام ڕزگاری دەبێت (یاشەر ١٢: ٥–٢٧).[٤٢٩] سەرچاوەی تری جوولەکەش کە باسی هاوچەرخێتیی ئیبراهیمو نیمرۆد بکات تەلموودە، بۆ نموونە ئەم قسەیە: با نیمرۆد بێتو شایەتی بدات کە ئیبراهیم بتەکانی نەپەرستبوو (عابۆداه زاراه– ٣أ)[٤٣٠] و نیمرۆد بوو کە ئیبراهیمی فڕێدایە ناو ئاگرەکە (پێسەحیم– ١١٨أ).[٤٣١]

کەواتە گوناهی موفەسیرە ئیسلامییەکان نییە چ جای ئەوەی باسەکە پەیوەندیی بە قورئانەوە هەبێت. هەڵەی موفەسیرەکان ئەوەیە کە ئەو باسەیان نەقڵکردووە، پێش ئەوەش گوناهی عبدالفادییە کە ئاگای لەو سەرچاوانە نییە.

# یووسف

پرسیارەکان سەبارەت بە یووسف: ژمارە ٦ و ژمارەکانی ٢٤ تا ٢٩.

## ٦–یووسف نیازی بوو خراپە بکات

((وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِ وَهَمَّ بِهَا –یوسف: ٢٤)).

عبدالفادی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە قورئان وای باسکردووە کە یووسف نیازی بوو کاری خراپە لەگەڵ ژنی عەزیزی میسر بکات بەڵام ئەمە دژی مێژووی پیرۆزە کە دەڵێت کاتێک ئافرەتەکە ویستی کاری خراپە بکات یووسف داواکەی قبووڵ

[428] The Book of Jasher, p.31.
[429] *ibid*, pp.32-34.
[430] The Soncino Babylonian Talmud, Abodah Zarah, book I, p.7; M. L. Rodkinson, The Babylonian Talmud, vol.XI, ch.I, p.4.
[431] The Soncino Babylonian Talmud, Pesochim, book IV, p.93; M. L. Rodkinson, The Babylonian Talmud, vol 5, ch.X, p.252.

نەکردو کاتێك دەستی دایە کراسەکە یووسف کراسەکەی بۆ جێهێشت و هەڵهات (تکوین ٣٩: ٩).

* * * *

ئایەتەکەش بەتەواوی:

((وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِ وَهَمَّ بِهَا لَوْلا أَن رَّأَى بُرْهَانَ رَبِّهِ كَذَلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ السُّوءَ وَالْفَحْشَاء إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُخْلَصِينَ)).

ئەوەی لای عبدالفادی سەیر بوو، واتە یووسف نیازی فاحیشەی بووبێت، لای موفەسیرە کۆنەکانیش سەیر بوو بۆیە بەپاڵ ئەو لێکدانەوەیە باسەکە بەجۆرێکی تر لێك دراوەتەوە. تەعبیری ((هم بها)) بۆ یووسف نەك نیازی پەلامارە بۆ کردنی فاحیشە لەلایەن یووسفەوە بەڵکو تەنها ئەو نیازەی چووە دڵ، بەپێی تەفسیری تریش کە ئاواتەخواز بوو ببێتە ژنی خۆی، بەپێی تەفسیری تریش ویستی لێی بدات.[٤٣٢]

بەبۆچوونی خۆشم ئەو تەفسیرانە بێمانان چونکە لەگەڵ ئایەتەکە یەکناگرنەوە کە دەڵێت (لَوْلا أَن رَّأَى بُرْهَانَ رَبِّهِ كَذَلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ السُّوءَ وَالْفَحْشَاء إِنَّهُ مِنْ عِبَادِنَا الْمُخْلَصِينَ) کە زاهیری ئەو ئایەتە زۆر ئاشکرایە: ئافرەتەکە ویستی پەلاماری بداتو یووسفیش ویستی پەلاماری بدات نیشانەکەی خاوەنەکەی نەبینیایە، ئاواش بۆ ئەوەی خراپەو فاحیشە لە یووسف دووربخەینەوە.

ئایەتەکە زۆر ئاشکرایە کە ئەو شتە بەدڵی یووسف چوو بەڵام خودا پاراستی، ئیتر پێویست بە زۆر لەخۆکردن ناکات بۆ ئەوەی تەفسیرێکی دوور لە واتای ئایەتەکە بهێنرێتەوە.

بگەڕێینەوە سەر عبدالفادی و بڵێین کە ئەسڵەن ئەوە جێگەی ڕەخنە نییە چونکە خودا باسی یەك ساتی کورتی لاوازیی یووسفی کردووە کە ئەویش مرۆڤەو جاروباری تووشی ئەو لاوازییە دەبێت. دەشبوایە عبدالفادی ڕەخنەی لە تەورات

---

[٤٣٢] تفسیر ابن کثیر، ج ٤، ص ٣٨١.

بگرتایە کە شتی زۆر خراپی پێغەمبەران باس دەکات وەك بۆ نموونە (لووت) کە بەپێی تەورات لەدوای لەناوبردنی سەدۆم סְדֹם و عامۆرە (عامۆراە) עֲמֹרָה دوو کچەکەی سەرخۆشیان کردو لەگەڵی نوستن بۆ ئەوەی وەچەیان لە باوکیان هەبێت چونکە باوکیان پیر ببوو وماڵەکە پیاوی تێ نەدەما، ئیتر یەکی منداڵێکی لە باوکیان بوو (تەکوین ١٩: ٣١ بەدواوە). جیاوازیی دوو چیرۆکەکە جیاوازیی دوو تێڕوانینەکەمان بۆ دەردەخات: قورئان بۆمان باس دەکات کە یووسف لە کاری خراپە پارێزرا، تەوراتیش، کە دیارە لەم بەشە پەیوەندیی بە وەحیی خوداییەوە نییە، ناڕاستەوخۆ پێمان دەڵێت کە خودا بێباك بوو لەو کارە خراپە.[٤٣٣]

## ٢٤-کوڕانی یەعقووب داوا دەکەن یووسف یارییان لەگەڵ بکات

((قَالُواْ يَا أَبَانَا مَا لَكَ لاَ تَأْمَنَّا عَلَى يُوسُفَ وَإِنَّا لَهُ لَنَاصِحُونَ * أَرْسِلْهُ مَعَنَا غَدًا يَرْتَعْ وَيَلْعَبْ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ -يوسف: ١١-١٢).

قورئان باسی ئەوە دەکات براکانی یووسف لە یەعقووبی باوکیان داواکرد یووسفیان لەگەڵ بنێرێت بۆ ئەوەی ئەویش یاری بکات. عبدالفادیش دەبینێت لە تەورات شتی تر هەیە ئەویش کە یەعقووب یووسفی نارد بۆ ئەوەی دڵنیا بێت لە سەلامەتی ئەو برایانەی، کاتێکیش بینییان وتیان ئەوەتا خاوەنی خەونەکان هاتووە با ئێستا بیکوژینو فڕێی بدەینە بیرێكو بڵێین دڕندەیەکی خراپ خواردی‌و

[٤٣٣] هۆی دروستکردنی چیرۆکەکە دیارە: گەڕاندنەوە ڕەچەڵەکی دوو گەلی ناوچەکە بۆ کارێکی فاحیشە چونکە کۆتایی چیرۆکەکە ئەوەیە کە کچە گەورەکە کوڕەکەی ناو نا مۆئاب מוֹאָב و ئەو بووە باوکی مۆئابییەکانو کچە بچووکەکە کوڕەکەی ناو نا بێن عامی בֶּן-עַמִּי ئەمیان باوکی عامۆنییەکان (بەنی عامۆن בְּנֵי-עַמּוֹן). ئەو گەڕاندنەوەیە جگەلەوەی واتای سووکایەتییە، هەروەها هەوڵێکە بۆ تەفسیرکردنی ڕەچەڵەکی گەلان.

بــزانين خەونــەكانی چــی دەبــن. (تــەكوين ٣٧: ١٢–٢٠– عبــدالفادی بــەكورتی دەيهێنێتەوە).

قورئان ڕێكتر باسی ئەوە دەكات: سەرەتا باسی ئەوە دەكات كە براكانی يووسـف بڕياری كوشتنی دەدەن، يەكێكيشان دەڵێت فڕێی بدەنە بيرێك، ئينجا دەچـنە لای باوكيانو داوای لێ دەكەن يووسفيان لەگەڵ بنێرێت بۆ یاریو لێی دەپرسن بۆچـی متمانــەی بــەوان نييــە، ئينجـا قەناعــەتی پێدەكــەن. بــەڵام باســەكەی تــەوراتی بەردەستمان لە نامەعقوول دەچێت: يەكەم لەبەر ئەوەی براكانی يووسف كە زۆرن دەچـن بـۆ لەوەڕانـدی ئاژەڵـەكانيانو دوادەكـەون كەچـی يووسـف بـۆ سـۆراغيان دەنێرێت كە يەعقووب لەوانی خۆشتر دەويست چونكە بـەپيری بوويـەتی (تـەكوين ٣٧: ٣)و يەك كەسەو منداڵترە. كاتێكيش يووسف دەگاتە لايـان بـير لـە كوشـتنی دەكەن. ئەمەی دوايی ڕێگـەی تێدچـێت بـەڵام ناگاتـە ڕێكيـی سـياقی قورئـان كـە نەخشەو پيلانەكە پێشتر داڕێژرابوو.

## ٢٥–داهێنـانی منداڵێك شايە تمانی دەڵێت

((وَاسُتَبَقَا الْبَابَ وَقَدَّتْ قَمِيصَهُ مِن دُبُرٍ وَأَلْفَيَا سَيِّدَهَا لَدَى الْبَابِ قَالَتْ مَا جَزَاء مَنْ أَرَادَ بِأَهْلِكَ سُوَءًا إِلاَّ أَن يُسْجَنَ أَوْ عَذَابٌ أَلِيمٌ * قَالَ هِيَ رَاوَدَتْنِي عَن نَّفْسِي وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنْ أَهْلِهَا إِن كَانَ قَمِيصُهُ قُدَّ مِن قُبُلٍ فَصَدَقَتْ وَهُوَ مِنَ الكَاذِبِينَ * وَإِنْ كَانَ قَمِيصُهُ قُدَّ مِن دُبُرٍ فَكَذَبَتْ وَهُوَ مِن الصَّادِقِينَ * فَلَمَّا رَأَى قَمِيصَهُ قُدَّ مِن دُبُرٍ قَالَ إِنَّهُ مِن كَيْدِكُنَّ إِنَّ كَيْدَكُنَّ عَظِيمٌ * يُوسُفُ أَعْرِضْ عَنْ هَذَا وَاسْتَغْفِرِي لِذَنبِكِ إِنَّكِ كُنتِ مِنَ الْخَاطِئِينَ –يوسف: ٢٥–٢٩)).

باس لە ڕووداوەكەی نێوان يووسفـو ژنی عەزيزی ميسر دەكات كاتێك يووسـف لـە دەسـتی ژنەكـە ڕای كـردو ئـەو كراسـەكەی لـەدواوە ڕاكێشـاو دڕانـدی، ژنەكـەش تۆمـەتی خسـتە پـاڵ يووسـف، ئينجـا كـە بينييـان كراسـەكەی يووسـف دڕاوە

((شایەتێك لە كەسوكاری ئافرەتەكە وتی ئەگەر كراسەكەی لەپێشەوە دڕابێت ژنەكە ڕاست دەكاتو یووسف درۆ دەكاتو ئەگەر كراسەكەی لەپشتەوە دڕابێت ژنەكە درۆ دەكاتو یووسف ڕاست دەكات)).

وەك دیارە قورئان ناڵێت ئەو شایەتە كێ بووە، بەڵام بە بیركردنەوەیەكی كەم، یان هەر بەبێ بیركردنەوە، مرۆڤ دەزانێت كەسێكی گەورەیە نەك منداڵ چونكە مێشكی مرۆڤ بۆ منداڵ ناچێت. ئەی بۆچی فەرموودەیەك هەیە دەڵێت منداڵێكی ناو بێشكە بوو؟ بەیزاوی كە عبدالفادی شتی لێوە نەقڵ دەكات دەڵێت: وتراوە ئەو كەسە ئامۆزایەكی ژنەكە بووە، وتراویشە خاڵۆزایەكی بووە كە منداڵێكی ناو بێشكە بوو (بەیزاوی ٣، ل٢٨٣).[٤٣٤] واتە بەیزاوی هەدوو قسەكە نەقڵ دەكاتو هەردووكیان بە (وتراوە) وەسف دەكات. بۆ دووەمیشیان پشت بە فەرموودەیەك دەبەستێت كە چوار كەس بە منداڵی قسەیان كردووە كە یەكێكیان ئەوە بوو (ج٣، ص ٢٨٣)[٤٣٥]، كە فەرموودەكە بەو لەفزە دروست نییە.[٤٣٦]

كارەكەی بەیزاوی خۆی لە خۆی هەڵەیە، واتە هەڵەیە ئەو تەفسیرانە نەقڵ بكرێن كە (وا وتراوەو وا وتراوە)، عبدالفادیش لەوە خراپتری دەكات بەوەی تەنها قسەی دووەمی نەقڵكردووەو ئینجا دەیكاتە ڕەخنە بەسەر قورئانەوە، بەڵام كارەكەی عبدالفادیش لەوەش خراپتر چونكە شایەتیی منداڵەكە لە سەرچاوەیەكی جوولەكە هەیە ئەویش (كتێبی یاشەر)، كە پێشتر باسمان كردبوو. لەو كتێبە، كە وەكو چیرۆكەكانی تر چیرۆكی یووسف درێژتر لەوەی تەورات دەگێڕێتەوە، لەو كاتەی پیاوانی (پۆتیفار) لە یووسف دەدەن پۆتیفار منداڵەكەی كە یانزە مانگ تەمەنی

---

[٤٣٤] عبدالفادی قسەكەی بەیزاویی بەهەڵە وەرگرتووەو نووسیویەتی: وتراوە ئامۆزایەكی بوو كە منداڵێكی ناو بێشكە بوو.

[٤٣٥] تفسیر ابن كثیر، ج٤، ص ٣٨٣-٣٨٤.

[٤٣٦] فەرموودەی صەحیح بەو شێوەیە هەیە بەڵام شێوازەكەی جیاوازەو باسی شایەتەكەی یووسفی تێ نییە، بڕوانە (السلسلة الضعیفة والموضوعة)ی ئەلبانی (ج٢، ح٢٨٨٨). بەپاڵ ئیسنادەكەش ئەلبانی لەبەر ناڕێكیی لەگەڵ قورئان ڕەتی دەكاتەوە (لاپەڕە ٢٧٣).

بوو دەکەوێتە قسەو دایکی خۆی تاوانبار دەکاتو ڕاستیی ڕووداوەکەیان بۆ دەگێڕێتەوە (کتێبی یاشەر ٤٤: ٦٤-٦٦).[٤٣٧]

باقیی ڕەخنەکانی عبدالفادیش نیشانەی ڕەخنەی سەرپێیین: چۆن مێردەکەی قبووڵ دەکات خۆیو یووسف پێکەوە لەماڵەکە بمێننەوە؟ بۆچیش یووسف لەبەر پاکییەکەی دەخاتە بەندیخانە؟

ئێمە نازانین یووسف دوای ئەو ڕووداوە لە چ شوێنێکی ماڵەکە مایەوە، بەڵام دەزانین خانووی دەوڵەمەندانو بەرپرسان گەورە بوونو دەزانین ئەو خانووە وەکو خانووەکەی عبدالفادی نەبووە تەنها ژنو پیاو و منداڵەکانیان لەخۆ گرتبێت بەڵکو کۆیلەیو خزمەتکاریشی لێ بووە، دەشزانین قورئان قسەی پیاوەکە دەگێڕێتەوە کە بە ژنەکەی وتووە داوای لێخۆشبوون بکات چونکە تاوانی کردووە، واتە پیاوەکە دەرفەتێکی بە ژنەکە دابوو، دەشزانین هەموو پیاوەکان وەکو یەك لە حاڵەتی وا ڕەفتار ناکەن. کارەکەی دواتریش هەر خۆی تەفسیری هێشتنەوەی یووسف دەکات، واتە بەپێویستیان زانی ماوەیەك یووسف دووربخەنەوە بەجۆرێك دووربکەوێتەوە لەو ماڵەو قسەی خەڵك ببڕنو وایان تێبگەیەنن یووسف تاوانبار بووە.

عبدالفادی وەڵامی ئەوەی نییە کە بۆچی بێتاوانیی یووسف ئاشکرا نەبوو. عەزیزی میسر لە تەورات باوەڕی بە ژنەکەی کرد کە یووسف تاوانبارە، پاشان دەرچوونی یووسف لە بەندیخانە بەهۆی ئەوەی تەفسیری خەونی پادشای کرد، بەڵام قورئان باسی ئەوە دەکات کە یووسف هەر لە بەندیخانە خەونەکەی بۆ پادشا تەفسیر کرد، کاتێکیش پادشا ناردی بەدوای یووسف بۆ ئەوەی لە بەندیخانەی دەربچێتو بچێتە لای، یووسف قبووڵی نەکردو بە نێردراوەکەی وت: بگەڕێرەوە بۆ لای گەورەکەتو پێی بڵێ مەسەلەی ئەو ئافرەتانە چی بوو کە دەستی خۆیان بڕی. کە پادشاش ئەو ئافرەتانەو ژنی عەزیزی میسری کۆکردنەوە ئافرەتەکان وتیان شتی

---

[437] **The Book of Jasher, p.141.**

خراپمان لە یووسف نەبیستووەو ژنی عـەزیزی میسـر ددانـی بـە تـاوانی خـۆی نـا، ئینجا یووسف لەبەرچاوی پادشـا گـەورەتر بـوو و وتـی بیهێـنن بـۆ لام بـۆ ئـەوەی بیکەمە کەسێکی تایبەتی خۆم. ئەم سیاقە زۆر گونجاوە بۆ دەرخستنی بێتـاوانیی یووسف نەك تەنها توانای یووسف لەبواری تەفسیری خـەون کـە ئـەوە بـەس نییـە چـونکە بـۆی هـەبوو خـەڵك بڵـێن تواناکـەی ڕزگـاری کردبـوو، هـەر بۆیـەش لـە گێڕانەوەکەی قورئان یووسف نەیویست بەهۆی ئەو توانایەوە لە بەندیخانە ڕزگاری بێت. لە باسەکەی تەورات یووسف تەنانەت لەبەردەمی خاوەنەکەی بەرگریشی لـە خۆی نەکرد.

ئەو باسانە لە تـەوراتی بەردەسـتمان ونـن، لەبـەر ئـەوەش کـە موسـڵمان بـاوەڕی بەوەیە تەورات لەلایـەن خـوداوە هـاتووە پێویسـتە موسـڵمان بڵێـت ئـا لێـرە ئـەو باسانە بۆ مەبەستی کورتی پەڕێنراون، نموونەی تریشمان لە ڕەخنەی (بەندکردنی بنیامین) هەیـە. ئـەوەش بـزانین کـە کتـێبی تـەکوین لـە دروسـتبوونی بوونـەوەرە دەست پێ دەکاتو بە چیرۆکەکەی یووسـف کۆتـایی پـێ دێـت، ئـەو بەسـەرهاتو زەمەنە زۆرانەش دیارە پێویستیان بە کورتکردنەوە هەبووە.

## ٢٦-داوەتێکی ئافرەتـانەی وەهمی

((وَقَالَ نِسْوَةٌ فِي الْمَدِينَةِ امْرَأَةُ الْعَزِيزِ تُرَاوِدُ فَتَاهَا عَن نَّفْسِهِ قَدْ شَغَفَهَا حُبًّا إِنَّا لَنَرَاهَا فِي ضَلاَلٍ مُّبِينٍ * فَلَمَّا سَمِعَتْ بِمَكْرِهِنَّ أَرْسَلَتْ إِلَيْهِنَّ وَأَعْتَدَتْ لَهُنَّ مُتَّكَأً وَآتَتْ كُلَّ وَاحِدَةٍ مِّنْهُنَّ سِكِّينًا وَقَالَتِ اخْرُجْ عَلَيْهِنَّ فَلَمَّا رَأَيْنَهُ أَكْبَرْنَهُ وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ وَقُلْنَ حَاشَ لِلّهِ مَا هَذَا بَشَرًا إِنْ هَذَا إِلاَّ مَلَكٌ كَرِيمٌ * قَالَتْ فَذَلِكُنَّ الَّذِي لُمْتُنَّنِي فِيهِ وَلَقَدْ رَاوَدتُّهُ عَن نَّفْسِهِ فَاسَتَعْصَمَ وَلَئِن لَّمْ يَفْعَلْ مَا آمُرُهُ لَيُسْجَنَنَّ وَلَيَكُونًا مِّنَ الصَّاغِرِينَ -یوسف: ٣٠-٣٢)).

عبدالفادی دوو ڕەخنەی هەیە: یەکـەمیان ئەوەیـە چـۆن ژنـی ئەفسـەرێکی گـەورە داوەتێك بۆ گەورەژنانی شارەکە دەکات بۆ ئەوەی لەبەردەمی ئەوان راییگەیـەنێت

شەیدای کۆیلەکەی بووەو پەردەی حەیا لەڕووی خۆی هەڵبماڵێت بێئەوەی لە ئابڕووچوون بترسێت؟ دووەمیشیان چۆن ئەو ئافرەتانە لەجوانیی یووسف ئاگایان لە خۆیان نابێتو دەستی خۆیان بە چەقۆی دەستیان دەبڕن بێئەوەی هەستی پێبکەن.

* * * *

عبدالفادی دووەمیان بە خەیاڵی نەخۆش ناودەبات، بەڵام ئەوە نیشانەی نەخۆشیی عەقڵەکەیەتی چونکە ئەوە حاڵەتێکە تووشی هەموو کەس دەبێت، واتە شتێك دەبێتە هۆی سەرسامبوون یان ترسی یان ئەو کەسە لەناکاو دەبڕێتو بێئەوەی ئاگای لەخۆی بێت کارێك دەکات ڕەنگە ئازاریشی بدات. ئینجا لەبەر ئەوەی مرۆڤەکان زۆرنو سروشتەکانیش زۆرن کاردانەوەشیان زۆر جیاواز دەبێت، واتە لەگەڵ زۆربوونی ژمارەی کەسەکان ئیحتمالەکانیش زۆرتر دەبن.

کەواتە ئەگەر ڕەخنەت گرت ڕەخنە لە ڕووداوێك مەگرە بەوەیە ناماقووڵە ئەگەر ڕووداوەکە پەیوەندیی بە کەسی زۆرەوە هەبێت (کە لێرە مرۆڤە). نموونە لەوەی سەرەوە ئاسانتر ڕەخنەگرتنە لە ڕاستێتیی هەبوونی کەسێك بە بیستنی دەنگی فڕۆکە تووشی وڕبوون دەبێت. هەڵەی ئەم ڕەخنەیە ئەوەیە مرۆڤەکان زۆرنو جیاوازنو کاردانەوەشیان بەرامبەر بە شتەکانو ڕووداوەکان جیاوازە.

هەمان بنەمای ڕەخنەگرتنیش ڕەخنەی یەکەمیش دەگرێتەوە، واتە هەڵەیە پرسیار بکرێت کە چۆن ژنی عەزیزی میسر بێ شەرم بەو ئافرەتانە دەڵێت حەزی لە کۆیلەکەی بوو. هەڵەکەو وەك پێشتر ڕوونم کردەوە لەوەیە کە ئیحتمالیەتی ڕووادوەکە زۆرە لەبەر زۆریی ئەو کەسانە کە پەیوەندییان پێوەی هەیە (کۆی مرۆڤەکان). ڕەخنەکەی عبدالفادیش ناڕاستەوخۆ پێمان دەڵێت لە کۆی ملیاران ئافرەت یەك ئافرەت نییە ئاوا بێ پەردە باسی حەزی خۆی ئاشکرا بکات.

وەڵامی تریشمان بۆ ئەو ڕەخنەیە ئەوەیە بەدەر لەوەی نازانین عەزیزی میسر ئەفسەر بووە یان نا و بەدەر لەوەی مەرج نییە ژنەکان ژنی ئاسایی بوون یان

گەورەژنی شار بوون وەك عبدالفادی دەڵێت، ژنی عەزیزی میسر ئەوانی بۆ ئەوە کۆنەکردبووەوە تا حەزی خۆی بۆ یووسف ڕابگەیەنێت چونکە ئەو قسەیە پێشتر بڵاوبیوەوە، کۆکردنەوەیان بۆ ئەوە بوو پیشانیان بدات لۆمەکردنی ئەوان لەجێگەی خۆی نییەو یووسف ئەوە دەهێنێت حەزی لێ بکرێت. خاڵێکی تر کە نیشانەی بێئاگایی عبدالفادییە لە مێژووی میسری فیرعەونی ئەوەیە ئەو جۆرە باسانە لەو کۆمەڵگەیە ئاسایی بوون. دەقێکی ناسراو هەیە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمێکی دواتر ئەویش سەردەمی ڕەمسیسی دووەمو لە دەقە لەسەر زاری کچێك کە قسە لەگەڵ خۆشەویستەکەی دەکاتو پێی دەڵێت کە دەیەوێت بچێتە ناو ڕوبارەکە بۆ خۆشتنو ئەویش تەماشای بکاتو ڕێگەی پێ بدات جوانییەکەی لە تەنکترین جلەوە ببینێت.[٤٣٨] پەیوەندییەکانی نێوان ئافرەتو پیاو لە میسری فیرعەونی، بەڵکو تا ئێستا کەمترین موحافزکاریی هەبووە لەچاو کۆمەڵگەی تری ڕۆژهەڵاتی.

## ٢٧-بۆچی بەندکردنی یووسف درێژەی کێشا؟

((وَقَالَ لِلَّذِي ظَنَّ أَنَّهُ نَاجٍ مِّنْهُمَا اذْكُرْنِي عِندَ رَبِّكَ فَأَنسَاهُ الشَّيْطَانُ ذِكْرَ رَبِّهِ فَلَبِثَ فِي السِّجْنِ بِضْعَ سِنِينَ –يوسف: ٤٢))

پاش ئەوەی یووسف خەونی هەر یەکێك لەو دوو کەسەی لە بەندیخانە لەگەڵی بوون تەفسیر دەکات بەو کەسە دەڵێت کە ڕزگاری دەبێتو بەپێی خەونەکە دەبێتە ساقیی پادشا باسم بکە لای گەورەکەت، واتە لای پادشا، ئیتر شەیتان ئەوەی لەبیر دەباتەوەو یووسف چەند ساڵێك لە بەندیخانە دەمێنێتەوە. عبدالفادی قسەی بەیزاوی نەقڵ دەکات کە پێغەمبەری ئیسلام وتوویەی: ڕەحمەتی خودا لە یووسفی برام ئەگەر ئەوەی نەوتایە پاش پێنج ساڵەکە حەوت

---

[٤٣٨] کینیث کیتشن، رمسیس الثاني، ص ٢١٣–٢١٥.

ساڵ لە بەندیخانـە نەدەمایـەوە. عبـدالفادی ئینجـا دەپرسـێت ئایـا حەرامـە مـرۆڤ لەکاتی تەنگانە پشت بە برای خۆی ببەستێت؟

* * * *

عبدالفادی نموونە دەهێنێتەوە کە ئەوە حـەرام نییـەو هەڵبـەت ئێمـەش دەتـوانین نموونەی تر بهێنینەوە کە حەرام نییـە بـەڵام مەسـەلەکە بـەو جـۆرە نییـە. جـارێ عبـدالفادی تـەواوی قسـەی بـەیزاویی نـەقڵ نـەکردووە کـە ئایەتەکـەی (فانسـاه الشیطان ذکر ربە– شەیتان باسی خاوەنەکـەی لـەبیر بـردەوە) دەگەڕێنێتـەوە بـۆ ساقییەکە، واتە شەیتان باسی یووسف لای خاوەنەکـەی، واتـە لای پادشـا، لـەبیر ساقییەکەی بردەوە. ئینجا بەیزاوی تەفسیرەکەی تر دەڵێـت ئـەویش کـە شـەیتان زیکری خودای لەبیر یووسف بردەوە بۆیە پشتی بە غەیری خودا بەسـت. ئـەم دوو تەفسیرە لای موفەسیری تریش هەن، بۆ نموونە ئیبنو کـەثیر هـەردووکیان بـاس دەکـاتو کـە کـێ لـە موفەسـیرەکان ئـەو دوانـەی وتـووە، یەکەمیشـیان پەسـەند دەکاتو دەڵێت ئەو فەرموودەیە زۆر لاوازە.[٤٣٩] قورتـوبیش باسـی دوو بۆچـوونەکە دەکـاتو بـۆ ئـەو لەتەفسـیرەی بیرچـوونەوەکە بـۆ یووسـف دەگەڕێنێتـەوە دوو گێڕانەوەی بێبنەما دەهێنێتـەوە کـە گوایـە جبریـل چـووە لای یووسـفو پێـی وت سزاکەی ئەوەیە چەند ساڵێك لە بەندیخانە بمێنێتەوە.[٤٤٠]

بەیزاوی دەڵێت هەرچەندە پشتبەستن بە مرۆڤەکان لەکاتی تەنگانە بەشێوەیەکی گشتی دروسـتە بـەڵام شـایەنی پایـەی پێغەمبـەران نییـە (ج٣، ص٢٩٠) کـە ئەمـە قسەی خۆیەتیو بەڵگەی پێچەوانە هەیە بۆ ئەوە.

---

[٤٣٩] تفسیر این کثیر، ج٤، ص٣٩١. فەرموودەکە بەشێوەیەکی ترە نەك پاش پێنج حەوت، بڕوانە هەروەها تەفسیری قورتوبی، الجامع لاحکام القران، ج١١، ص ٣٥٦.

[٤٤٠] تفسیر القرطبي، ج١١، ص ٣٥٥.

کەواتــە عبــدالفادی تــەنها یــەك تەفســیری وەرگرتــووەو ئــەوەی تــری پشــتگوێ خستووە. بەبۆچوونی خۆشمان تەفسیرکردنی ئەوە بە سزادانی یووسف لەڕووی سیاقی باسەکەوە تەفسیرێکی لاوازە.

ئەگەر بشگەڕێینەوە بۆ کتێبی یاشەر دەبینین هەردوو باسەکە هەیە: کاتێك یووسف بەو کەسە دەڵێت کە ڕزگاری دەبێت باسم بکە لای گەورەکەت (یاشەر ٥٦: ١٠)و[٤٤١] باسی ئەوەی کە کابراکە لەبیریچوو باسی یووسف بکات بەڵام باسی شەیتان نەکراوەو باسی لەبیرچوونەوەش نەکراوە بەڵکو هۆی باسنەکردنەکە گەڕێنراوەتەوە بۆ خودا ((باسی نەکرد لای پادشا وەك بەڵێنی پێ دابوو، ئەمەش لەلایەن پەروەردگارەوە بوو بۆ ئەوەی سزای یووسف بدات لەبەر ئەوەی متمانەی بە مرۆڤ کرد)) (یاشەر ٥٦: ١٩) ئیتر یووسف بۆ ماوەی دوو ساڵی تر لە زیندان مایەوەو مانەوەکەی بوو بە دوانزە ساڵ (یاشەر ٥٦: ٢٠).[٤٤٢] هەمان شتیش لە کتێبی تر هەن وەك تەرگومی[٤٤٣] یەکەمی ئورشەلیمی لەسەر پێنج کتێبی یەکەمی

---

[441] **The Book of Jasher, p.145.**

[442] ***ibid.*, p.146.**

[٤٤٣] (تەرگوم) ڕاڤەکردنو ڕوونکردنەوەو درێژەپێدانی پەیمانی کۆنە بۆ زمانێکی تر کە بەدەم دەوترێت. کاتێکیش باسی تەرگوم دەکرێت مەبەست لە وەرگێڕانە بۆ زمانی ئارامی. وشەکە هێندە بەرامبەری زمانی ئارامی زانراوە کە جوولەکەکانی کوردستان کە بە ئارامی قسە دەکەن بە زمانەکەیان دەڵێن تەرگوم:

**Encyclopaedia Judaica, vol. 19, p.513.**

زمانی عیبری لەدوای ڕاگواستنی جوولەکەوە بۆ بابل چیتر وەکو زمانی ڕۆژانە نەمایەوە. لە سەرەتای سەردەمی مەسیحی جوولەکەی میسر بە یۆنانییەکی مەکدۆنی قسەیان دەکرد، ئەوانەی بابلیش بە زمانێك قسەیان دەکرد کە بنچینەکەی ئارامی بوو لەگەڵ تێکەڵەیەکی کەمی عیبریو زمانی بێگانە، بڕوانە:

**J. W. Etheridge, The Targums of Onkelos and Jonathan Ben Uzziel on the Pentateuch (Genesis and Exodus), p.3f.**

تەرگومەکان سەرەتا بە دەم بوونو دوایی بوونە نووسین. چەند تەرگومێکیش هەبوون" تەرگومی بابلی یان تەرگومی ئۆنکیلۆس کە تەرگومی ڕەسمییە. تەرگومی ئورشەلیمی، یان ڕاستتر فەڵەستینی، هەیە کە ئەو شێوەیەی ماوەتەوە هی پاش پێغەمبەری ئیسلامە، تەرگومی تریش هەن، بڕوانە:

**F. C. Burkitt, *Targums*, in; Encyclopædia Biblica, vol.IV, col.5028.**

پەیمانی کۆن، کە مانەوەی یووسف بۆ هەمان هۆ دەگەڕێنێتەوە[٤٤٤] هەروەها لە پارچەکانی تەرگومی ئورشەلیمی کە ئەمیان درێژە بەو قسەیە دەداتو دەگەڕێتەوە بۆ نووسینی پیرۆز کە لەوێ هاتووە: نەفرەت لەو کەسەی متمانە بە گۆشت (واتە: لاشە، مرۆڤ...) ببەستێتو موبارەك بێت ئەو کەسەی متمانە بە وشەی پەروەردەگار دەکات.[٤٤٥]

کەواتە بەپاڵ جیاوازیی باسەکانی قورئانو موفەسیرەکان لەلایەكو کتێبی یاشەرو تەرگوم لەلاکەی تر باسی مانەوەی زیاتری یووسف لە زیندان وەکو سزایەکی خودایی بەئاشکرایی لەو کتێبانە هەیەو بەم جۆرە تەنها گوناهی نەقڵکردنی ئەو جۆرە باسانە دەچێتە ئەستۆی موفەسیرانی ئیسلام، کە لەڕووی بابەتی سەرەکیی ئەم کتێبەمان، واتە ڕەخنەگرتن لە ڕەخنەگر لە قورئان، گوناهی ئەوان نییە بەڵکو گوناهی کتێبەکانی جوولەکەیە، بەڵام لەڕووی تەفسیری قورئان ناتوانین بە گوناهی نەزانین لەبەر ئەوەی تەفسیر پڕکرا بەو قسانەی خەڵك وەکو ڕاستی تەماشایان دەکرد چونکە لە زاناوە دەرچوون، لەوەش خراپتر ئەوەیە حوکمو بیرکردنەوەو ڕەفتار لەسەر ئەو جۆرە قسانە بینا کراوە

ئەو بیرکردنەوەیەش کە بۆ هیچ شتێك پشت بە غەیری خودا نەبەسترێت تەنانەت کاتی زەروورەتیش بیرکردنەوەیەك بوو لە کۆمەڵگە موسڵمانە کۆنەکان هەبووەو زیاتر پەیوەست بووە بە تەسەووفی کۆن کە دەیویست پەیوەندیی ڕاستەخۆ لەنێوان خوداو مرۆڤ هەبێت بۆیە تەنانەت ئەو تەسەووفە بایەخی بە فەرموودەش

---

بەهەڵەش بە تەرگومی فەڵەستینی وترابوو تەرگومی یوناتان کوڕی عوزیئیل، کە ئەمیان تەرگومێکی ترە. ئاشکرایە وشەکە لەگەڵ فرمانی عەرەبیی (ترجم)و ناوی عەرەبیی (ترجمە) یەکدەگرێت. لە کۆتایی سەدەی نۆزدەو لە سەدەی بیست ژمارەیەکی تری دەستنووس، وەك ئەوانەی قاهیرەو دەریای مردوو دۆزرانەوە کە ڕێژەیەکی کەمیان تەرگومن.

[444] **J. W. Etheridge, The Targums of Onkelos and Jonathan Ben Uzziel on the Pentateuch (Genesis and Exodus), Section IX, Ch. XL, pp.299f.**

[445] **J. W. Etheridge, *ibid*., p.300.**

نەدەداو هەیانبووە دەیوت (حدثني قلبي عن ربي)، بۆیە ئاساییە تەفسیری لەو جۆرە هەبێت یان ئەو هۆکارەی لە کتێبەکانی جوولەکە وتراوە پەسەند بکرێت.

## ٢٨-بەندنەکردنی بنیامین

((قَالَ بَلْ سَوَّلَتْ لَكُمْ أَنفُسُكُمْ أَمْرًا فَصَبْرٌ جَمِيلٌ عَسَى اللّهُ أَن يَأْتِيَنِي بِهِمْ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ * وَتَوَلَّى عَنْهُمْ وَقَالَ يَا أَسَفَى عَلَى يُوسُفَ وَابْيَضَّتْ عَيْنَاهُ مِنَ الْحُزْنِ فَهُوَ كَظِيمٌ-يوسف: ٨٣-٨٤ )).

عبدالفادی باسی چوونی براکانی یووسف بۆ میسر و خۆنەناساندی یووسفو گلدانەوەی شەمعوونی برای تا براکانی تری برا بچووکەکیان بهێنن کە لە وڵاتی خۆیان مابوو ئەویش بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە سیخوڕ نین، ئەمەش لە قورئان باس نەکراوە پاشان کە لەگەل بنیامین گەڕانەوە یووسف بنیامینی بە تۆمەتی دزینی پەرداخەکەی گرت ئەوانیش بەرگرییان لە بنیامین کرد ئینجا یووسف خۆی بەوان ناساند، بەم جۆرە براکانی یووسف سێ جار چوونە میسر بەڵام قورئان دەیکاتە چوار جار.

* * * *

جگە لە ڕەخنە گشتییەکە ئەویش ساغنەبوونەوەی دروستیی هەموو باسەکانو وردەکارییەکانی تەوراتی بەردەستمان بۆ ئەوەی بیکەنە بناغە بۆ زانینی دروستیی قورئان، ڕەخنەیەکی ترمان هەیە:

باسەکەی تەورات شتێکی ناڕێکی هەیە ئەویش گرتنی بنیامین کە شتێکی زیادەیە لەبەر ئەوەی یووسف یەکسەر لەوێ خۆی ناساند، بەواتایەکی تر یووسف پیلانێکی گێڕا، کە تۆمەتی دزیکردن بوو، بۆ ئەوەی بنیامینی برای لای خۆی گل بداتەوەو براکانی تر بڕۆنەوە بەڵام کە براکانی باسی حاڵی خۆیانو باوکیان کرد دەستی کرد بە گریانو خۆی ناساند، ناشزانین چۆن یووسف دەیویست پاش

گەڕانەوەی براکانی باوکی بزانێت خۆی یووسف بووەو بچێتە میسر بۆ لای، بەڵکو لە چیرۆکەکە هیچ نەخشەیەکی یووسف دیار نییە بۆ هاتنی باوکی. ڕەنگە لەبەر ئەوەش بێت قسەیەکی یووسف زیادکراوە (تەکوین ٤٥: ٣) دوای ئەوەی خۆی بە براکانی ناساند ئەویش کاتێك پرسیاری لێ کردن: ((باوکم هێشتا زیندووە؟))، ئەم پرسیارەش لە جێگەی خۆی نییە چونکە یووسف دەیزانی باوکی ماوە لەبەر ئەوەی هەر لەو شوێنەو پێش ئەو پرسیارەو پاش ئەوەی بڕیاری دا بنیامین گل بداتەوە پێی وتن: ئێوەش بەئاشتییەوە بچن بۆ لای باوکتان (تەکوین ٤٤: ١٧)، یەکسەریش یەهوودا قسەیەکی دوورودرێژی لەگەڵ دەکاتو باسی باوکی دەکات کە پیرەو دڵی بە بنیامینەوە بەستراوەتەوەو ئەگەر بزانێت ونبووە دەمرێت (تەکوین ٤٤: ١٨ بەدواوە)، دیسانەوە یەکسەریش یووسف خۆی دەناسێنێتو دەپرسێت: باوکم هێشتا زیندووە؟(تەکوین ٤٥: ١ بەدواوە)، بۆیە وای بۆ دەچین پرسیارەکە زیادەیەکە بۆ پڕکردنی ئەو کەلێنەی باسمان کرد، واتە ئەگەر بنیامین لای یووسف بمایەوە، براکانی تریشی بڕۆشتنایەوە لای باوکیان باسی چوونی یەعقووب بۆ لای یووسف نەدەکرا، بەڵکو پێویستیشی دەکرد جارێکی تر لەسەر فەرمانی باوکیان بچوونایە لای یووسف.

کەواتە وا دیارە لەم شوێنەو بۆ کورتی شتێك پەڕێنراوە کە زنجیرەی ڕووداوەکان تەواو بکاتو ببێتە هۆکار بۆ چوونی یەعقووب هەروەها بۆ ئەوەی پیلانەکەی یووسف بۆ گلدانەوەی بنیامین وەکو شتێکی زیادە دەرنەکەوێت.

گێڕانەوەکەی قورئانە ڕێکترە چونکە پیلانەکەی یووسف بۆ هێشتنەوەی بنیامین بوو تا لای خۆی گلی بداتەوەو لەو برایانەی ڕزگاری بکات. براکانی یووسف جگە لە گەورەکەیان دەگەڕێنەوە لای باوکیانو پاشان بەفەرمانی باوکیان دەگەڕێنەوە بۆ لای یووسف ئینجا یووسف خۆی دەناسێنێت، لەم سیاقەش پیلانەکەی یووسف شتێکی زیادە نییە.

.

# ٢٩-كراسێكی سیحری

((اذْهَبُواْ بِقَمِيصِي هَذَا فَأَلْقُوهُ عَلَى وَجْهِ أَبِي يَأْتِ بَصِيرًا وَأْتُونِي بِأَهْلِكُمْ أَجْمَعِينَ-يوسف: ٩٣)).

عبدالفادی قسەی موجاهید، موفەسیری بەناوبانگ كە لـە ئیبنـو عـەبباس تەفسـیر دەگێڕێتەوە، دەهێنێتەوە كە ئەو كراسەی یووسف كە دای بە براكـانی بـۆ ئـەوەی بیدەن بەسەر دەموچاوی یەعقووبی باوكیو ئەویش چاوی چاكبووەوە.. ئەوە هـی ئیبراهیم بوو و دواتر دای بـە ئیسـحاقو ئیسـحاق دای بـە یـەعقووبو كـە یووسـف گەورە بوو یەعقووب كردیە ناو قامیشێكی زیو و وەكو نوشتە بـە ملـی هەڵیواسـی. ئەو كراسەی ئیبراهیم ئەوە بوو كە جبریل لە ئاوریشمی بەهەشت بـۆی هێنـا پـاش ئەوەی جلەكەیان لەبەر داكەندو خستیانە ناو ئاگر..تاد.[٤٤٦]

عبـدالفادی دەپرسـێت چـۆن خـەڵكی زەوی جلـی بەهەشـت لەبـەر دەكـەنو چـۆن موعجیزە دەكات بۆ ئەوانەی كراسەكە بووە میراتییانو چـیی بەسـەرهاتووەو ئایـا گاڵتە بەو كەسانە ناكەین كە نوشتە دەكەنە ملو بەری منداڵەكانیان...

پێویست ناكات هیچ وەڵامی عبـدالفادی بدەینـەوە چـونكە ئەمـەی نـەقڵی كـردووە قسەیەو پەیوەندیی بە قورئانەوە نییەو گێڕانەوەكەش دروست نییە، بۆیە نەقڵمان كرد بۆ ئەوەی خوێنەر بزانێت چـۆن تەفسـیری بێبنـەما، بەتایبـەتیش كـە بـەناوی موفەسیرانی ناودار دەلكێنرێت، زیان بە ئیسلام دەگەیەنێت.

.

[٤٤٦] بڕوانە بۆ ئەوە تەفسیری قورتوبی، ١١، ص ٤٤٦. گێڕانەوەكە لە (السُدّی) لە باوكییەوە لە موجاهید. هەروەها بڕوانە تفسیر البغوی، مجلد ٤، ج١٣، ص ٢٧٥ كە تـەنها نـاوی موجاهیـدی هێناوە، لە (الضحاك)یشەوە كراسێكی بەهەشت بوو.

# نـــــووح

## ٧-نووح داوای گومڕایی دەكات

((وَلَا تَزِدِ الظَّالِمِينَ إِلَّا ضَلَالًا-نوح: ٢٤)).

عبدالفادی دەپرسێت: چۆن نووح داوا لـە خوداكـەی دەكـات خـەڵكی زیـاتر گـومڕا بكەن؟ خوداش سەرچاوەی گومڕایی نییەو نووح حەز بە گومڕایی ناكاتو مێـژووی پـیرۆز شـایەتیی ئـەوەی بـۆ دەدات: نـووح پیـاوێكی چاكەكاری كامـڵ بـوو لـەناو نەوەكانی خـۆی (تـەكوین٦: ٩)، هـەروەها ((نـووح وەعـزی چاكەكاریی دەكـرد)) (٢پوتروس ٢: ٥)

* * * *

ئایەتەكە هەمووی: وَقَدْ أَضَلُّوا كَثِيرًا وَلَا تَزِدِ الظَّالِمِينَ إِلَّا ضَلَالًا.

نـووح داوای گـومڕایی كێـی كـردووە؟ هـەر قەومەكـەی خـۆی بـووە و هـەمووش كەللەڕەق بوون. ئینجا دوعاكە بۆ ستەمكارانە نەك بۆ هـەموو خـەڵكی. عبـدالفادی كە دەڵێت نووح لە مێژووی پیرۆز بە پیاوێكی چاكەكار ناوبراوە نەك پیاوێكە دوعـا لە خـەڵك دەكـات دەیسـەلمێنێت كـە ئاگـای لـە تـەورات نییـە چـونكە لـە تـەورات بەشێوەیەكی خراپتر وێنەكراوە. لە تەورات هاتووە كاتێك خودا بینی خراپـەكاریی مرۆڤ لە زەوی زۆر بووە خەفـەتی خـوارد كـە مرۆڤـی دروسـت كردبـوو و وتـی ئـەو مرۆڤە لەسـەر ڕووی زەوی دەسـڕمەوە كـە دروسـتم كـردووە، مـرۆڤ و ئاژەڵـەكانو باڵندەكانی ئاسمانیش (تەكوین٦: ٥-٧).[٤٤٧]

.

[٤٤٧] دوای لافاوەكەش دیسان پەشیمان بوونەوە دەخاتە پاڵ خـودا كـە گوایـە دەڵێـت لەمـەودوا نەفرەت لە زەوی ناكەم لەبەر مرۆڤ و هەموو زیندەوەرێك لەناو نابەم (تەكوین٨: ٢١).

## ١٤-خنكانی كوڕەكەی نووح

((وَهِيَ تَجْرِي بِهِمْ فِي مَوْجٍ كَالْجِبَالِ وَنَادَى نُوحٌ ابْنَهُ وَكَانَ فِي مَعْزِلٍ يَا بُنَيَّ ارْكَب مَّعَنَا وَلاَ تَكُن مَّعَ الْكَافِرِينَ * قَالَ سَآوِي إِلَى جَبَلٍ يَعْصِمُنِي مِنَ الْمَاء قَالَ لاَ عَاصِمَ الْيَوْمَ مِنْ أَمْرِ اللّهِ إِلاَّ مَن رَّحِمَ وَحَالَ بَيْنَهُمَا الْمَوْجُ فَكَانَ مِنَ الْمُغْرَقِينَ-هود: ٤٢-٤٣)).

عبدالفادی قسەی بەیزاوی دەهێنێتەوە كە كەنعان كوڕی نووحەو قبووڵی نەكرد لەگەڵ نووح سواری كەشتییەكە بێت ئیتر خنكا. زانراویشە (ئەمەش قسەی عبدالفادییە) نووح تەنها سێ كوڕی هەبوو: سامو حامو یافث و سێ ژنیان هەبوو، بەو جۆرە ئەوانەی چوونە كەشتییەكە هەشت كەس بوون: نووحو ژنەكەیو سێ كوڕەكەیو ژنەكانیان. ئیتر كوا باسی خنكانی كەنعان؟ زانراویشە كە كەنعان هێشتا لەدایك نەببوو. كەنعانیش كوڕی نووحی نەبوو بەڵكو كوڕی حام بوو ئەویش پاش لافاوەكە (تەكوین١٠: ١ و ٦ و ١٥).

* * * *

بەیزاوی (ج٣، ل ٢٣٥) باسی خوێندنەوەی تری ڕستەی (ونادی نوح ابنه) دەكات ئەویش (ونادی نوح ابنها) واتە كوڕی ژنەكەی كە بەخێوی كردووە... ئیتر هەموو ئەمانە قسەنو دەكرێنە ماڵ بەسەر قورئان ئەگینا قورئان باسی نەكردووە ئەو كوڕەی نووح كێ بوو و ناوی چی بوو، ئەوەی تەوراتیش باسی دەكات ئەكید نییە واتە ناوی كوڕەكانی نووح و ئەوەش ئەكید نییە بەڕاستی كەنعان كوڕی حام بووە، بەڵكو ئاشكراشە بۆچی كەنعان كراوەتە كوڕی حام وەك لەخوارەوە باسی دەكەین.

كەنعان لە هەزاری دووەمی پێش زاین وەك زاراوەیەكی جوگرافی بریتی لە زەوییەكانی ڕۆژهەڵاتی دەریای ناوەڕاست كە ڕۆژئاوای ڕوباری ئوردونن، هەروەها فینیقیا (زەوییەكانی كەنار دەریا لە لوبنانو بەشێكی كەناری دەریا لە سووریاو

فەڵەستین)و بەشێکی باشووری سووریا.[٤٤٨] هیچ ناوبردنێکی ئەکیدیش نییە بۆ ئەو زاراوەیە لە هەزاری سێیەمی پێش زاین.[٤٤٩] یەکەم ناوبردنی کەنعانیش لە لەوحێکی مێخیی شاری ماری[٤٥٠] لە سەدەی هەژدەیەمی پێش زاین بوو.[٤٥١] کەنعان لە دەقە میسرییەکانیش دەردەکەوێتو یەکەم جار ناوبرێت لەسەردەمی ئامنحوتپی دووەم (١٤٥٤–١٤١٩ پ.ز) بوو[٤٥٢] و دواتریش لە نووسینی فیرعەونەکانی تریش هاتووەو لە سەردەمی ڕەمسیسەکان بەپاڵ وڵاتی کەنعان شاری کەنعان هەبوو کە ئەمیان شێوازێکی تری ناوی شاری (غەززە) بوو[٤٥٣] یەکێك لەوانەی لەسەردەمی ئەو ناوی

[448] James M. Weinstein, *Canaan*, in; Oxford Encyclopedia of Ancient Egypt, vol. 1, p.227.
[449] *ibid*.

[٤٥٠] ماری شارێکە لە سووریا لەسەر فورات ماوەیەك دەوڵەتێکی سەربەخۆ بوو و ماوەیەك سەر بە ئاشوورییەکان بوو و حامورابیی بابل پاش ئەوەی ماوەیەك هاوپەیمانی بوو وێرانی کردو ناوی سڕایەوە لە مێژوو. بیعسەیەکی فەڕەنسی لە سییەکانی سەدەی بیست کاری تێ کردو هەزاران دەقی مێخیی دۆزییەوە کە بەشێکیان نامە بوون لە فەرمانڕەوایانی شارەکە یان بۆ ئەوان هاتبوون جگەلە نامەی تریش. نامەکانی ماری کە لەناو مێژووناسانو شوێنەوارناسان زۆر ناودارن زانیاریی بەنرخو زۆریان پێشکەش کرد دەر بارەی سیاسەتو جەنگو کاری دیپلۆماسیو سیخوڕیی ئەو سەردەمانەو بەشێك لەو زانیارییانە پەیوەندییان بە کوردستانی کۆنەوە هەیە.

[451] J. Weinstein, ibid.
[452] ibid, p.228.

ئەم سەرچاوەیە، واتە مەوسووعەی ئۆکسفۆردی تایبەت بە میسری کۆن، مێژووی ((بەرز)) بەکاردەهێنێت، بەپێی مێژووی ((نزم))یش ئامنحوتپی دووەم لە ١٤٢٧–١٤٠٠ پ.ز حوکمی کردووە. لە مێژووی میسری فیرعەونی دیاریکردنی ساڵی فەرمانڕەوایی پادشاکان جیاوازیی هەیەو مێژووی نزمو بەرز هەیە. لە پادشانشینی نوێ جیاوازییەکە نزیکەی چارەکە سەدەیەکە، لە پادشانشینی ناوەڕاستو کۆنیش لە پەنجا ساڵ زیاترەو بۆ بنەماڵە کۆنترەکان لەوە زیاترە:
W. A.Ward, in; Encyclopedia of the Archaeology of Ancient Egypt, p.273.
جیاوازی لەو جۆرەش لە مێژووی وڵاتی دووڕووبار هەبووەو کاتی خۆی سێ جۆر بوو: درێژو ناوەڕاستو کورت، بەڵام ئێستا تەنها ناوەڕاستو کورت بەکاردێن. کۆنترین ساڵیش کە بەوردی دەستنیشان کرابێت لە مێژووی میسر ساڵی ٦٦٤ی پێش زاینەو لەوە بەدواوە ساڵەکانی بەپێی فەرمانڕەوایی پادشاکانو بەپێی هاوچەرخێتیی پادشایانی وڵاتە جیاکان دەستنیشان کراون.
[453] J. Weinstein, *op. cit.*, p.227.

کـەنعان هـاتووە رەمسیسـی دووەمـە کـە پـاڵێوراوێکی بـەهێزە بـۆ ئـەوەی بـە فیرعەونەکەی مووسا بزانرێت.

لەبەر ئەوە ئاشکرایە کە زاراوەی کەنعان کە لە کـاتی دەرچـوونی ئیسـرائیلییەکان لە میسر هەبووەو ناوچەیەکی فراوان بووە دزەی کردووە بەناو باسەکانی تەوراتو لەوەوە نـاوی ئـەو ناوچـە گرنگـە دراوە بـە نـاوی کوڕەزایـەکی نـووح، واتـە نـاوی ناوچەکە سەرچاوەی ناوی کەسەکەیە. ناوێکیش ئەوە سەرچاوەکەی بێت بایەخ بۆ باسکردنی لە تەورات یان لای موفەسیرەکانی قورئان کە شتی زۆریان لە جوولەکـە وەرگرتووە نابێتو بەم جۆرە ڕەخنە لە قورئان بەپشتبەستن بـە قسـەی بـەیزاوی کارێکی بێ بنەمایە، هەروەها بەر لـەوەی ڕەخنـە لـە موفەسـیرەکان بگیرێت (کـە هەقە ڕەخنەیان لێ بگیرێت) پێویستە ڕەخنە بگیرێت لـە باسـەکانی جوولەکـە کـە خنراونەتە ناو تەورات.

لێـرەش پێکەوەبەسـتنێك هەیـە لـەنێوان کـەنعان کـوڕی حـامو کەنعانییـەکان. کەنعانییەکان کە بتپەرست بـوونو دوژمـنی ئیسـرائیلییەکان بـوون خنراونەتـە نـاو تەورات کە ئەمانە نەوەی کەنعانن‌و حامی باوکی کەنعان کـاری نەشـیاوی کردبـوو. بەپێی تەورات نووح سەرخۆش ببوو و لەناو ڕەشماڵەکـەی خـۆی ڕووتکردبـووەوە، حامیش باوکی بینی‌و بـە دوو براکـەی تـری وت ئـەوانیش چـۆن باوکیـان داپۆشـی بێئەوەی تەماشای بکەن ئینجا کە نووح ئەوەی زانی بەرەکەتی بـۆ سـام داواکـردو دوعای بۆ یافت کردو لەعنـەتی لـە کـەنعان کـردو کـە ببێتـە کۆیلـەی سـامو یافـت (تەکوین ٩: ٢١–٢٧). تەوراتی بەردەستیش تەئکید لەسەر کەنعان دەکـات کاتێـك دوای ئەوەی باسی ئەوە دەکات کە کوڕەکانی نووح کە لە کەشـتییەکە دەرچـوون سامو حامو یافث دەڵێت: حامیش بـاوکی کەنعانـە (تکـوین ٩: ١٨)، ئینجا باسـی کردەوەکەی حام دەکات.

هەر بۆیەش سەیر نییە کە مصراییم، بـاوکی میسـرییەکان، بکرێتـە کـوڕی حـام، بەڵکو بەشێوەیەکی گشتی ئەوانەی کە دژ بـە خـودان لـە نـەوەی حـام بـوون وەك

نیمرۆد کوڕی کووش کوڕی حام کە لە خاکی شینعار بوو (کە لەو خاکەوە بابلییە کلدانییەکان پەلاماری جوولەکەیان دا)، لە خاکی نیمرۆدیش ئاشور دەرچوو (ئاشورییەکانیش دژی جوولەکە جەنگابوون)، فەڵەستینییەکانیش کە دیسان دژی جوولەکە شەڕیان کردبوو لە نەوەی میصراییم بوون، لە کەنعانیش خاتییەکانو یەبووسییەکانو ئامورییەکانو گرگاشییەکان.. تاد (تکوین ١٠: ١-٢٠)، کە گوایە خودا بەڵێنی دابوو بە ئیبراهیم خاکی ئەم چوارە گەلە لەگەڵ کەنعانییەکان (لەگەڵ گەلی تریش) بداتە نەوەکەی (تکوین ١٥: ١٨-٢١).

لەمەشەوە ئاساییە بزانین بۆچی کەنعان بووە ئەو کوڕەی نووح کە لە خودا یاخی ببوو و لەگەڵ خەڵکەکەی خنکاو دەزانین سەرچاوەی ئەو باسەی موفەسیرەکانی قورئان کێ بوو.

## ١٩- نزم و بێ ئەرزشەکان شوێنی نووح نەکەوتبوون

((وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَى قَوْمِهِ إِنِّي لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ * أَن لاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ اللّهَ إِنِّيَ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ أَلِيمٍ * فَقَالَ الْمَلأُ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قِوْمِهِ مَا نَرَاكَ إِلاَّ بَشَرًا مِّثْلَنَا وَمَا نَرَاكَ اتَّبَعَكَ إِلاَّ الَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ الرَّأْيِ وَمَا نَرَى لَكُمْ عَلَيْنَا مِن فَضْلٍ بَلْ نَظُنُّكُمْ كَاذِبِينَ - هود: ٢٥-٢٧)).

((وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُ هُمْ الْبَاقِينَ-الصافات: ٧٧)).

عبدالفادی دەڵێت قورئان باسی ئەوەی کردووە کە نزمەکانو بێ ئەرزشەکانی قەومی نووح باوەڕیان پێ کردبوو، بەڵام بەپێی تەوراتو ئینجیل کەس لە قەومەکەی باوەڕی پێ نەهێنابوو و ئەوانەی لەگەڵی چوونە ناو کەشتییەکە ژنەکەیو کوڕەکانی و ژنەکانی کوڕەکانی کە ئەمانە نزمو بێ ئەرزشن. لەلایەکی ترەوە عبدالفادی ئایەتەکەی سوورەتی (الصافات) دەکاتە بەڵگە کە خودا نەوەی نووحی هێشتەوە، کەواتە ئەو قسەیەی لەنێوان نووحو قەومەکەی کە هەندێك لە قەومەکەی باوەڕیان پێ هێنابوو قسەیەکە ڕووی نەدابوو.

عبدالفادی کە ئایەتەکەی صافات دەهێنێتەوە ئایەتەکەی پێشتری باس ناکات : ((وَنَجَّيْنَاهُ وَأَهْلَهُ مِنَ الْكَرْبِ الْعَظِيمِ –الصافات: ٧٦)) کە تەئکیدە لەسەر ئەوەی کەسوکاری لەگەڵ بوون. لەلایەکی ترەوە عبدالفادی نەیتوانیوە کەمێك بیربکاتەوە تا بزانێت کە راستە کەسانێك لە قەومی نووح باوەڕیان پێهێنابوو ئەوانیش ژنەکانی کوڕەکانی! ئەمەش هەمووی ئەگەر بڵێین ڕاستە تەنها کەسوکاری نووح لەگەڵ بوون لە کەشتییەکە، بەڵام قورئان شتێکی تر دەڵێت:

((حَتَّى إِذَا جَاءَ أَمْرُنَا وَفَارَ التَّنُّورُ قُلْنَا احْمِلْ فِيهَا مِنْ كُلٍّ زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلَّا مَنْ سَبَقَ عَلَيْهِ الْقَوْلُ وَمَنْ آمَنَ وَمَا آمَنَ مَعَهُ إِلَّا قَلِيلٌ–هود: ٤٠))، بەجۆرێك وا تێدەگەین کە ئەوانەی باوەڕیان پێهێنابوو جگە لە کەسوکاری چەند کەسێکی کەمن، لە زاوزێی ئەمانەش لەگەڵ نەوەی نووح هەموو نەوەکانی داهاتوو بوونە نەوەی نووح.

سەبارەت بە وەسفکردنی شوێنکەوتووانی نووح بەوەی کە نزمو بێ ئەرزشن ئەوە قسەو تێڕوانینی قەومەکەی نووح بوو بۆ کوڕەکانی نووحو بەتایبەت ژنەکانیان کە ئافرەتن، هەروەها بۆ ئەو خەڵکە کەمەی باوەڕیان هێنابوو.

## ئەییووبی پێغەمبەر

دوو پرسیاریش هەن پەیوەندییان بە ئەییووبی پێغەمبەرەوە هەیە:

پرسیاری ژمارە (١٥): ئەییووب کوڕەزای ئیسحاقەو پرسیاری ژمارە (٤٩):ژنی ئەییووب.

## سەردەمی ئەییووب

### ١٥– ئەییووب کوڕەزای ئیسحاقە

((وَوَهَبْنَا لَهُ إِسْحَقَ وَيَعْقُوبَ كُلاًّ هَدَيْنَا وَنُوحًا هَدَيْنَا مِن قَبْلُ وَمِن ذُرِّيَّتِهِ دَاوُودَ وَسُلَيْمَانَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَى وَهَارُونَ وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ– الانعام: ٨٤)).

ئایەتەکە ئەییووب دەکاتە نەوەی ئیبراهیم، ڕەخنەکەی عبدالفادیش ئەوەیە ئەییووب لە سەردەمی ئیبراهیم نەبوو. لە پرسیاری ژمارە (٤٩)ش دەڵێت: زانراوە ئەییووب پێش یەعقووب بوو. کەواتە ئەگەر دوو قسەکەی عبدالفادی کۆبکەینەوە ئەییووب پێش ئیبراهیم بوو، بەواتایەکی تریش ئەییووب پێغەمبەرێك بووە لە غەیری بەنو ئیسرائیل، بەڵکو هەر خۆشی لەم پرسیارە دەڵێت ئەییووب لە وڵاتی عەرەب پەیدا ببوو، بەم جۆرەش لەبیری چۆتەوە کە هەر خۆی لە پرسیاری (١٢) دەڵێت پێغەمبەران لە بەنو ئیسرائیلەوە بوون نەك لە میللەتانی تر.

عبدالفادی قسەکەی بەیزاوی نەقڵ دەکات کە دەڵێت: ئەییووب کوڕی (ئاموص)ـە،[٤٥٤] لە سیبتەکانی (عیص) کوڕی ئیسحاق، دەشپرسێت ئاموص باوکی (ئیشعیا)ی پێغەمبەر لەکوێ‌و ئەییووب لە کوێ؟

وتمان ئەنجامی قسەکانی عبدالفادی ئەوەیە ئەییووب پێش سەردەمی ئیبراهیم بووە، بەڵام هەرچییەك لەبارەی سەردەمەکەیەوە دەوترێت تەنها قسەیەو نازانرێت سەردەمەکەی کەی بووە. چەند بۆچوونێکیش دەربارەی سەرەدمەکەی هەن: سەردەمی ئیبراهیم، سەردەمی تیرەکانی بەنو ئیسرائیل (کاتێك –بەپێی تەلموود/ف.ق– ئەییووب دینای کچی یەعقووبی هێنا)، کاتی دەرچوونی لە میسر، سەردەمی قازییەکان، کاتی گەڕانەوە لە ئاوارەییەکەی بابل، وتراویشتە هاوچەرخی شاژنی (سەبەئـ) و ئەحەشوێرۆش (پادشای هەخامەنشی) بوو هەندێکیش دەڵێن ئەییووب قەت نەبووەو باسەکە چیرۆکێکی ڕەمزییە. بۆچوونی زۆر بڵاویش سەردەمی مووسا بوو و راوێژگاریی فیرعەون بوو، تەنانەت جوولەکە ناڕێکن ئەگەر ئەییووب جوولەکە بووبێت یان نا.[٤٥٥]

---

[٤٥٤] ئامۆص، ئامۆتس אָמוֹץ باوکی ئیشعیا (یەشەعیاهوو) יְשַׁעְיָהוּ. شتێکی وای لەبارەوە نەزانراوە، ئەویش جیایە لە عامۆس עָמוֹס (سەدەی هەشتەمی پێش زاین) کە ماوەیەکی کەم دوای ئامۆص بوو و پێغەمبەرێکی ناسراوەو کتێبێك هەیە بەناویەوە.

[455] **Judith R. Baskin, *Book of Job* (section: *in the Aggadah*), in; Encyclopaedia Judaica, vol. 11, p.356.**

سەبارەت بەوەش کە خودی مووسا ئەو کتێبەی ئەییووبی نووسیبوو یان تەنانەت پێش مووساش بووە" بەپێی ڕەخنەگرێکی نوێ کەس ئێستا[٤٥٦] بەرگری لەو جۆرە بۆچوونانە ناکات[٤٥٧].

ناوی ئەییووب، جگە لەو کتێبە ناوی ئەوی هەڵگرتووە، لە کتێبی حەزقیال (یحێزکێل) יְחֶזְקֵאל هاتووە: خودا ئەو خاکە سزا دەدات کە گوناه دەکاتو ئەگەر نووحو دانیال و ئەییووبیش لەوێ بن دەتوانن تەنها خۆیان ڕزگار بکەن بەهۆی کردارە چاکەکانیانەوە(حزقیال١٤: ١٤)[٤٥٨]،

سەردەمی دانیالی پێغەمبەر کە گوایە خاوەنی کتێبی دانیالە لەگەڵ هی حەزقیال (کە ساڵی ٥٩٢ پ.ز بانگەوازی پێغەمبەرایی کردبوو) زۆر لە یەکەوە نزیکن، بۆیە هاتنی ناوی دانیال لەگەڵ دوو پێغەمبەری زۆر کۆن جێگەی سەرنجە. ڕەنگە ئەمە هۆی ئەوە بێت ئەو دانیالە بە کەسێکی تر بزانرێت کە زۆر کۆنە. ناوەکە لە دەقی عیبریی کۆن (کە بێ بزوێنەکانە) بریتییە لە دنئل דנאל و لە دەقی (ماسۆری)ش[٤٥٩] کە بزوێنەکان بۆ دەقە عیبرییەکان دانراون: دانیئێل דָּנִיֵּאל. لەهەموو حاڵەتێکیش هێشتا هەر کێشەکە لەناو تەمومژ دەمێنێتەوەو سەردەمی

[٤٥٦] مەبەست لە وشەی ئێستا کاتی نووسینەوەو بڵاوکردنەوەی ئینسکلۆپیدیایی کتێبی پیرۆز (ساڵی ١٩٠١ یەکەم جار بڵاوبووەوە) .

[457] **T. K. Cheyne, *Book of Job*, in; Encyclopædia Biblica, vol. II, col. 2465.**

[٤٥٨] ڕەخنە لە ناوی دانیال گیراوەو بە نووسینی هەڵە زانراوە کە راستەکەی (حەناك)ـە واتە ئەخنۆخ:

**T. K. Cheyne, *Enoch*, in; ; Encyclopædia Biblica, vol. II, col. 1295.**

بەڵام ئەو دانیالەی ئەو دەقە بە دانیالی پێغەمبەر نەزانراوە بەڵکو بە کەسێکی زۆر داناو ڕاست، سەردەمەکەشی زانراو نییە (هەمان سەرچاوەو ستوونی سەرەوە).

[٤٥٩] ماسۆرا دەقی تەقلیدیی عیبریی پەیمانی کۆنەو لە سەدەی شەشەمی زاینی دەستی پێکردو لە سەدەی دەیەمی زاینی کۆتایی پێهات بە مەبەستی ڕێکخستنیو دیاریکردنی کتێبە قانوونییەکانو دانای بزوێنەکان بۆی.

ئەییووب چارەسەر نەکراوە تا بەدڵنیاییەوە بتوانرێت ڕەخنە لە قورئان بگیرێت بەوەی کردوویەتی بە نەوەی ئیبراهیم.

جگە لە کتێبی ئەییووبو ئاماژەکەی کتێبی حەزقیال باسی ئەییووب لە کتێبێکی تر هەیە کە ناوی (پەیمانی ئەییووب)ـە کە گوایە ئەییووب دەڵێت من لە کوڕانی عێساو עֵשָׂו (برای یەعقووب)م،[٤٦٠] بەلاَم بێگومان پشت بەوە نابەسترێتو هەیە لەم باسەو لە باسەکانی تری جوولەکەو مەسیحییەکان ئەسڵێك هەیە بۆ قسەی موفەسیرە موسڵمانەکانو ڕەخنەی عبدالفادی لە بەیزاوی، کە ناوی عێساو بە عیص دەبات،[٤٦١] لەجێی خۆی نییە.

بەیزاوی رەچەڵەکی ئەییووبی لە مێژوونووسانە وەرگرتووە بۆ نموونە مێژووی تەبەری کە لەڕێگەیەکی لاوازەوە لە وەهب کوڕی مونەببیە و[٤٦٢] کە ئیبنو ئیسحاقی[٤٦٣] تێیە کە ئەییووب کابرایەکی ڕۆمی بووەو کوڕی ئاموص کوڕی رازح کوڕی عیص کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم بوو.[٤٦٤] تەبەری دەڵێت غەیری ئیبنو ئیسحاقیش دەڵێت: کوڕی مووص کوڕی رەعویل کوڕی ئەلعیص کوڕی ئیسحاق.[٤٦٥]

---

[460] **M. R. James, Testament of Job, p. 1.**

لەم سەرچاوەیەی خوارەوە ئەییووب ئاشکراتر باسی پەیوەندییەکەی لەگەڵ یەعقووب دەکات بەوەی بە کوڕو کچەکانی دەڵێت: ئێوە لە ڕەگەزێکی هەڵبژێردراو و ڕێزلێگیراوی نەوەی یەعقووبن کە باوکی دایکتانە:

**Maarten Wisse, Scripture between Identity and Creativity, p.35.**

[٤٦١] وەك چۆن تەبەری باسی کردووە کە ئیسحاق دوو کوڕی هەبوو لە رفقەی ژنی: عیصو یەعقووب کە بە یەك سك ببوون: ضعيف تاريخ الطبري، مجلد٦، ص٢٢٨.

[٤٦٢] تابعییەکە کە شتی زۆر لە ئیسرائیلیاتو کتێبەکانی ئەهلی کیتابی گێڕاوەتەوە.

[٤٦٣] خاوەنی کتێبی سیرەتی پێغەمبەر.

[٤٦٤] ضعيف تاريخ الطبري، مجلد ٦، ص٢٣١.

[٤٦٥] ئەوەی بێ سەنەد وتووە.

دەمێنێتەوە قسەکەی کە ئەییووب کـە لـە وڵاتـی عـەرەب بـوو لـەکوێ‌و ئیـبراهیم‌و ئیسحاق کە لە خاکی فەڵەستین بوون لەکوێ. بۆ ئەمەش پێویستە باسی شوێنی ئەییووب بکەین

## وڵاتی ئەییووب

قورئـان باسـی دەکـات کـە ئـەییووب نـەوەی ئیـبراهیم بـوو، ئەگـەر ئـەییووب لـە دوورتـرین شـوێنی وڵاتـی عـەرەبیش بووبێـت ئایەتەکـە کێشـەی نییـە چـونکە ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیم بوو و چووبووە ئەو شوێنەی دوایی بووە وڵاتی عەرەب‌و ڕەخنەکەی عبدالفادی بێ بناغەیە، بەڵام نەك تـەنها ئـەوە بـەڵکو کتـێبی ئـەییووب باسی وڵاتی عەرەب ناکات.

لە کتێبی ئەییووب وتراوە ئەییووب لە وڵاتی عووص بوو. عـووص (عـووتس) עוּץ (بە ئینگلیزیUz ) وەکو ناوی وڵات هاتووە، بەڵام هەمان ناو بەکارهاتووە بۆ ناوی مرۆڤ:

عووص עוּץ کوڕێکی ئارامـە کـە ئـەمیان کـوڕی سـام کـوڕی نووحـە (تـەکوین١٠: ٢٣)ن هەروەها عووصـێکی تـر هەیـە کـە کـوڕی گـەورەی (ناحۆر)ـە واتـە بـرازای ئیبراهیمـە (تـەکوین٢٢: ٢١)، هـەروەها عووصـێکی تـر کـە کـوڕی (دیشان)ـە کـە ئەمیان کوڕی سەعیر שֵׂעִיר ی خۆرییە חֹרִי (تەکوین٣٦: ٢٨)کە لە وڵاتـی ئێـدۆم אֱדוֹם بوون (٣٦: ٢١). [٤٦٦] و بەپێی تەکوین (ئێدۆم) هەر (عێساو) עֵשָׂו خۆیـەتی کە برای یەعقووبە‌و لە ناوچەی سەعیر نیشتەجێ بوو (تەکوین٣٦: ٨).

سـەبارەت بـە عووصـیش وەك نـاوی شـوێن بـەپێی تێـڕوانینی تەقلیـدی ناوەکـە پەیوەست کراوە هەم بە ناوچەیەك لە باکووری فەڵەستین‌و هـەم بـە ناوچـەیەك لـە باشووری فەڵەستین. [٤٦٧] وەك لە کتـێبی ئـەییووبیش هـاتووە‌و شـوێنەکەی دیـار

---

[٤٦٦] بۆ ئەمانە‌و قسەکردن لەسەریان بڕوانە:

T. K. Cheyne, *Uz*, in; Encyclopædia Biblica, Vol. IV, 5238-9.

[467] *ibid.*, 5238.

نییە: پیاوێك هەبوو لە وڵاتی عووص עוּץ نـاوی ئـەییووب (ئییـۆب، ئییـۆڤ) אִיּוֹב بوو. عـووص لـە (لاواندنـەوەکان)[٤٦٨] وتـراوە لـە وڵاتـی ئێدۆمـە. لـەو دەقـە ئەمـە هاتووە: دڵت خۆش بێت ئەی کچی ئێـدوم کـە لـە عـووص نیشـتەجێیە (مراثـي ٤: ٢١).[٤٦٩]

ناوچەی ئێدۆم باشووری فەڵەستینو باشـووری ڕۆژئـاوای ئـوردون بـوو ئـیتر چـۆن عبدالفادی دەیباتە سەر وڵاتی عەرەبو بە هەڵەی دەزانێـت کـە لەگـەڵ فەڵەسـتین پەیوەست کراوە؟ بەپێچەوانەشـەوەو وەك باسمـان کـرد ئێـدۆم بـە عێسـاو، بـرای یەعقووب، پەیوەست کراوە چونکە عێساو بە باوکی ئێدۆم لە تەورات ناوبراوە.

لەسەر قسەکەی بەیزاویش لە پرسیاری (٤٩) کە دەڵێت وتـراوە ژنەکـەی ئـەیووب (لیا)ی کچی یەعقووبە وتراویشـە (ڕەحمـە) کچـی (ئـەڤرایم)ی یووسـفە عبـدالفادی دەنووسـێت: زانـراوە ئـەییووب پـێش یـەعقووبو یووسـف بـوو ئـیتر چـۆن کچـی یـەعقووب دەهێنێـت یـان کـوڕەزای یووسـف دەهێنێـت؟ وتیشـمان هیچـی ئەکیـد لـەبارەی سـەردمی ئەییووبـەوە نـەزانراوەو بـەیزاوی هەرچـییەکی نـەقڵکردووە لەسەرچاوەکانی جوولەکەو مەسیحییەکانی نەقڵکردووە.

# خۆڕاگریی ئەییووب

## ٤٩–ژنی ئەییووب

((وَخُذْ بِيَدِكَ ضِغْثًا فَاضْرِب بِّهِ وَلَا تَحْنَثْ إِنَّا وَجَدْنَاهُ صَابِرًا نِعْمَ الْعَبْدُ إِنَّهُ أَوَّابٌ —ص: ٤٤)).

[٤٦٨] ئەو لاواندنەوانە بەهی ئیرمیای پێغەمبەر زانراونو لەناوبردنی قودس وتراون کە سـاڵی ٥٨٦ پێش زاین بوو.

[٤٦٩] یان لەوانەیە عووص نەبێت بەڵکو تێکدانی وشەی ئـارص (ئـارتس) ، واتـە خـاك یـان وڵات، بێت یان دووبارەکردنەوەی وشەی خاکە کە پێش ئەو وشەیە هاتووە:

**T. K. Cheyne, *ibid*.**

عبدالفادی لە پرسیاری ژمارە ٤٩ و لەبارەی ژنەکە ئەییووبەوە دەڵێت:

١-ئەییووب ئارامگرو بەحیلم بوو چۆن لە ژنەکەی توورە دەبێتو هەڕەشەی لێدەکات سەد جەڵدەی لێ بدات تەنها لەبەر ئەوەی خاوەخاوی کردبوو (کاتێك بۆ کارێك چووبوو).

٢-چۆنیش سوێند دەخوات سەد قامچیی لێ بدات بەڵام خودا ئامۆژگاریی دەکات بە سەد چیلکە (ڕاستەکەی: لاسك)[٤٧٠] یەك جار لێی بدات ئیتر سوێندەکەی ناکەوێت؟

ئەم دوانەشی لە تەفسیری بەیزاوی وەرگرتووە (ج٥، ص٤٩)و شتی لەم جۆرە لە تەفسیرەکانی تر هەیە.[٤٧١]

---

[٤٧٠] ئەگەر باس لە گیا بکرێت بەڵام ئەوە بە شتی تر تەفسیر کراوە، وا دیارە مەبەست لە چەپکێك بوو و باس لە سەد لاسك بێ بناغەیە.

[٤٧١] تفسیر ابن کثیر، ج ٧، ص٧٦. هۆکەش لەو تەفسیرە: وترا پرچی فرۆشتو بەپارەکەی خواردنی بۆ کڕی، وتراش لەبەر هۆی تر. لە تەفسیری (الفخر الرازی)ش: ناکۆك بوون سەبارەت بە هۆی سوێندەکەی ئەییووب. الرازی بەدووری دەزانێت هۆکە ئەوانە بن کە باس کراون وەکو ئەوەی هانی مێردەکەی دابوو بەقسەی شەیتان بکات بۆ ئەوەی چاکبێتەوە یان لەبەر ئەوەی پرچی فرۆشتبێت بۆ کڕینی خواردنو دەڵێت نزیکتریان ئەوەیە بۆ کارێك چوو و دواکەوت: تفسیر الفخر الرازی، ج٢٦، ص٢١٥، پێشتریش چیرۆکێك دەگێڕێتەوە کە ئەو قسەیەی شەیتانی تێ هاتووە (ص٢١٢). قورتوبی لە تەفسیرەکەی چوار قسە نەقڵ دەکات: تفسیر القرطبي، ج١٨، ص٢١٧-٢١٨. پێش ئەوەش باسی چیرۆکەکەو شەیتانو ژنی ئەییووبو ئەو قسانە دەهێنێتەوە سەبارەت بە هۆی نەخۆشییەکەی‌و دوایی هەموویان پووچەڵ دەکاتەوە، ئینجا قسەی قازی ابن العربی دەهێنێتەوە کە هیچ شتێك لەبارەی ئەییووبەوە نەهاتووە جگە لە دوو ئایەتو یەك پیت لە فەرموودە لەبارەیەوە ڕاست نییە جگە لە یەك فەرموودە (کە پەیوەندیی بە نەخۆشییەکەیەوە نییە)و دەڵێت کەواتە چۆن ئەو باسە بیسترا؟ ئیسرائیلیاتیش لای زانایان بەتەواوەتی ڕەفز کراوە بۆیە تەماشایان مەکەو گوێیان لێ مەگرە (ص٢١٢-٢١٥). جێگەی تێبینیشە کە دوایی‌و وەك وتمان لەبارەی سوێندخواردنەکەی ئەییووب چوار هۆ دەهێنێتەوە کە یەکەمیان هی ئیبنو عەبباسە (صەحابییە ناودارەکە کە بە تەرجومانی قورئان ناسراوە)و دووەمیان هی سەعید کوڕی موسەییبە (گەورە تابیعی فەرموودەی لە ژمارەیەك صەحابی بیستبوو)و سێیەمیان هی یەحیا کوڕی سەللامە (موفەسیرو فەرموودەزانو عەرەبیزان کە ژمارەیەك تابیعیی بینیبوو)و غەیر ئەو، بۆ چوارەمیش ناوی کەسی نەوتووە (ص٢١٧-٢١٨)،

چیرۆکی ئەییووب، وەك لە کتێبی ئەییووب هاتووە، یەکێکە لە بەشەکانی پەیمانی کۆن‌و چیرۆکێکی بێتام دووردرێژەو پڕە لە قسەو حیکمەت‌و سکاڵاو باسی خودا بەجۆرێك بە دروستکراو دێتە بەرچاومان، بەلای کەمەوە وردەکارییەکان‌و قسەکان‌و موناقەشەکان. ڕەنگە لەبەر ئەوەشە هەندێك زانای جوولەکە بە ڕووداوێکی ڕاستەقینەیان نەزانیوە. کورتەی ئەو چیرۆکەش ئەوەیە شەیتان بە خودا دەڵێت ئەییووب بێ بەرامبەر خواپەرستی ناکات خوداش پێی دەڵێت: بچۆ زیانی لێ بدە بەڵام دەست لەخۆی مەدە، ئەویش دەچێت‌و دەبێتە هۆی لەدەستدانی منداڵەکانی‌و ئاژەڵەکانی بەڵام ئەییووب هەر خۆڕاگر دەبێت. ئەیووب سکاڵا لای سێ هاوڕێکەی دەکات (کە لە چیرۆکەکە ناویان هاتووە)و گوناه دەخاتە بەر خودا کە چاکەکاران سزا دەدات‌و واز لە خراپەکاران دەهێنێت، ئەوانیش سەرزەنشتی دەکەن‌و ئامۆژگاریی دەکەن، ئەویش وەڵامیان دەداتەوە، بەو شێوەیەش هەر دوو لا قسە دەکەن‌و وەڵامی یەکتر دەدەنەوە، دواتر یەکێکی تر کە تەمەنی لەوان کەمتر بوو و لەوێ بوو و تا ئەو کاتە بێدەنگ بوو لە ئەییووب تووڕە دەبێت چونکە وای دانابوو کە لە خودا باشترە هەروەها لە سێ هاوڕێکەی ئەییووب تووڕە دەبێت لەبەر ئەوەی وەڵامێکیان نەبوو و ئەییووبیان بە تاوانبار زانی (ئەییووب ٣٢: ٢)، پاشان گوایە لەناو زریانەوە دەنگی خوا دێت سەرزەنشتی ئەییووب دەکات (ئەییووب، ئیصحاحی ٣٨ بەدواوە)، بۆ نموونە پێی دەڵێت: من تاوانبار دەکەی بۆ ئەوەی تۆ چاکەکار[٤٧٢] بی (ئەییووب ٤٠ : ٨) هەروەها سەرزەنشتی سێ کەسەکە دەکات.. تاد.

---

بەڵام ئەو هۆیانەش لەو قسانەن کە قورتوبی بەو شێوەیەی سەرەوە باسیان دەکات، ئەوەی گرنگە لێرە قسەکەی ئیبنو عەبباسە کە بەر ئەو وەسفە دەکەوێت، قورتوبیش بەشێوەی لاوازکردن (واتە: وترا) باسی ناکات بەڵکو دەڵێت (گێڕایەوە یان وتی– حکاه).

[٤٧٢] بۆ زاراوەی (چاکە)و واتا تایبەتەکەی بڕوانە باسی پۆلس لەو بەشەی تایبەتە بە لەخاچدانی مەسیح.

بەم جۆرە عبدالفادی خۆشی نەیزانیوە چی لەو چیرۆکەی پەیمانی کۆن هاتووە کاتێك باسی خۆڕاگریی ئەییووب دەکاتو کە بە ژنەکەی دەڵێت: ((تۆ وەکو یەکێك لە نەزانەکان قسە دەکەی، خێر لە خودا قبوولْ بکەینو خراپەی لێ قبوولْ نەکەین؟))و ئاگای لە باقی چیرۆکەکە نییە کە چۆن ئەییووب کاتێك سێ کەسەکە لا دەبن جنێو بە ڕۆژەکەی دەداتو دەڵێت ((خۆزگە ئەو ڕۆژە لەناوبچووایە کە تێی لەدایك ببووم)) (ئەییووب ٣: ١بەدواوە)، سکاڵای ئەوەش دەکات کە خودا چاکەکاران ئازار دەداتو واز لە خراپەکاران دەهێنێتو ئەوە دەخاتە پاڵ خوداوە کە دەرووخێنێت ئیتر ئەوەی ڕووخاندی بینا ناکرێتەوەو دەرگا لەسەر مرۆڤ دادەخات ئیتر ئەو دەرگایە ناکرێتەوە (ئەییووب ١٢: ١٣–١٤)و میللەتان زیاد دەکات ئینجا لەناویان دەبات (ئەییووب ١٢: ٢٣).. تاد.

دەبوایە عبدالفادی باسی ئەو چیرۆکەی پەیمانی کۆنی نەکردایەو تەنها باسی خۆڕاگریی ئەییووبی لە قورئان بکردایە.

بەڵام تەنانەت ئەوەش بە کەڵك نایەت چونکە چیی تر هەیە بیزانین قورئان نەیوتووە؟ هیچمان نییەو قورئان تەنها ئەمەی وتووە: ((چەپکێك ببەو پێی لێ بدەو سوێنەکەت مەشکێنە–ص: ٤٤)). ئەوەی لەم بەشە ئایەتە دەیزانین ئەوەیە ئەییووب سوێندێکی خواردبوو کە بەپێی سیاقەکە ئەوە بوو لە کەسێك بدات، بەڵام کەسەکە کێیەو سوێندخواردن بۆ لێدانەکە لەبەر چی بووە؟ قورئان هیچمان پێ ناڵێت، باسی ژمارەی لێدانەکانیشمان بۆ ناکات. ئێمە هەر ئەو ئایەتە دەزانین، لەوەش بەدواوە قسەی موفەسیرەکان، هەر کەسێك بن، بەڕێزەوە لەسەر ڕەفەیەك دادەنێین، عبدالفادیش با بە ئارەزووی خۆی پشت بەو تەفسیرانە ببەستێتو بە حەزی خۆی نەشارەزایی خۆی لە کتێبە پیرۆزەکەی خۆی بسەلمێنێت.

دەمێنێتەوە بەراوردیی چیرۆکی ئەییووب لەگەڵ چیرۆکەکانی وڵاتی دووڕووبار کە عبدالفادی باسی نەکردووە. ئەو چیرۆکانە لای ڕەخنەگران ئەسڵی چیرۆکە ئیسرائیلییەکەی ئەییووبن، چیرۆکەکانیش ئەمانەن:

١-ناودارترین چیرۆكو نزیكترینیان لە چیرۆكی ئەییووب چیرۆكێكی بابلییە بەناوی (خودای دانایی شكۆمەند بكەم)، كە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی كاشییەكانو[٤٧٣] زیاتر بە ناوە نوێكەی: ئەییووبی بابلی ناسراوە. پاڵەوانی چیرۆكەكە پیاوێكی دەوڵەمەندی خوداناسە كە خوداوەندەكان پشتی بەردەدەنو ئاغاكەی لێی تووڕە دەبێتو پیاوە گەورەكان پیلانی لەدژ دەگێڕنو تەنانەت كەسوكاریشی خراپ مامەڵەی لەگەڵ دەكەن، بەڵام هەر باوەڕی بە دادپەروەریی قەدەر دەكاتو كە ڕۆژی ڕزگاری دێت، دواییش ئەو ڕۆژە دێت.[٤٧٤] لەو چیرۆكە پاڵەوانەكە هاوشێوەی ئەییووب دەوڵەمەندو خوداناس بوو، هاوشێوەی ئەویش هەموو كەس، بەكەسوكارییەوە، جێی دەهێڵێن. هۆی نەهامەتییەكانی ئەییووبیش ئەوە بوو خودا تەسلیمی بە شەیتان كردبوو، لە چیرۆكە بابلییەكەش هۆكە ئەوە بوو مەردوخ، گەورە خوداوەندی بابلی، لەگەڵ خوداوەندەكانی تر تەسلیمیان كردبوو بۆ خەڵكە خراپەكە.[٤٧٥]

٢-چیرۆكی دووەم، كە پێدەچێت هی كۆتایی سەردەمی كاشی یان سەرەتای هەزاری یەكەمی پێش بێتو حیوارێكە لەنێوان پیاوێكی بەئازارو هاوڕێیەكی دانا كە دڵنەوایی دەكات. شێوازی ئەم چیرۆكە جیاوازەو ئەو كەسەی تووشی نەهامەتی بووە گومانو گاڵتەجاڕیی خۆی پیشان دەداتو كار دەگاتە ڕادەی كوفر كردن.[٤٧٦]

---

[٤٧٣] كاشییەكان خەڵكی لوڕستانی كوردستان بوونو لە سەدەی ١٦ی پێش زاینی وڵاتی دووڕووباریان داگیركردو بۆ زیاتر لە چوار سەدە فەرمانڕەواییان كرد ( ١٥٩٥-١١٥٧پ.ن).

[٤٧٤] بۆ كورتەی چیرۆكەكە بڕوانە: د. فاضل عبدالواحد علی، من الواح سومر الى التوراة، ص٣٧٩-٣٨٩، طه باقر، مقدمة في ادب العراق القديم، ص١٤٨-١٥٠. بۆ وەرگێڕانی تەواوی چیرۆكەكەش:

**Robert H. Pfeiffer, Akkadian Observations on Life and the World Order, *"I will praise the Lord of Wisdom"*, in; ANET, pp.434-437.**

[٤٧٥] د. فاضل عبدالواحد علی، من الواح سومر الى التوراة، ص٣٨٩.

[٤٧٦] بۆ كورتەكەی بڕوانە: د. فاضل عبدالواحد علی، من الواح سومر..، ص٣٧٧-٣٧٩، طه باقر، مقدمة في ادب العراق القديم، ص١٥٢-١٥٣. بۆ وەرگێڕانی تەواویشی:

٣-لەو دوانەش کۆنتر چیرۆکێکی سومەرییە کە لە پێنج بەش پێکهاتووە بەم شێوەیە: پێویستە مرۆڤ خزمەتی خوداوەندەکانی بکات، ئەو کەسەی تووشی نەخۆشیو بەدبەختی بووە بە فرمێسكو دوعا ڕوودەکاتە خوداوەندەکەی، بەشەکە گەورەکەش پاڕانەوەکانی ئەو کەسەیە، کۆتاییەکی باش کاتێك خوداوەند پاڕانەوەکانی قبووڵ کرد، دواییش شکۆمەندکردنی خوداوەندەکەی.[٤٧٧]

هیچ لەمانەش نابنە سەرچاوە بۆ چیرۆکە قورئانییەکەی ئەیووب چونکە ئەوەی لە قورئان هاتووە تەنها باسی ئارامگرتنی ئەیووب لەگەڵ ئاماژەیەکی ناڕاستەوخۆ بۆ لەدەستدانی ماڵو کەسوکاری، کە ئەمە حاڵەتێکە لە هەموو کۆمەڵگەو سەردەمێك ڕوودەدات، بەڵام چیرۆکەکەی پەیمانی کۆن شتێی زۆری لەخۆ گرتووە کە لەو چیرۆکانەی سەرەوە بچنو بەتایبەتی چیرۆکی ئەیووبی بابلی، بۆیە دەکرێت چیرۆکی ناو پەیمانی کۆن ئەسڵێکی ڕاستەقینەی تێکەڵ بە باسەکانی چیرۆکە بابلییەکە کردبێت، بەتایبەتیش ئەگەر تێبینی بکەین، وەك پێشتر باسمان کرد، کە چیرۆکی پەیمانی نوێ باسی خوڕاگریی ئەیووب دەکات بەڵام ناوەکەی پڕە لە بێئارامیو سکاڵا کردنو دووری لە خۆڕاگری.

## ١٢-هەر ئوممەتێك پێغەمبەرێك لەخۆی بۆی دەنێردرێت

((وَلِكُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولٌ فَإِذَا جَاء رَسُولُهُمْ قُضِيَ بَيْنَهُم بِالْقِسْطِ وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ-یونس: ٤٧)).

---

**Robert H. Pfeiffer, Akkadian Observations on Life and the World Order, *"A Dialogue about Human Misery"*, in; ANET, pp.438-440.**

[٤٧٦] د. فاضل عبدالواحد علی، من الواح سومر الی التوراة، ص٣٨٩.

[477] **S. N. Kramer, *Man an his God, A Sumerian Variation of "Job" Motif*, in; ANET, p.589.**

وەرگێڕانی هەموو چیرۆکەکەش لە لاپەڕە ٥٨٩-٥٩١. بڕوانە کورتەکەی لە: : د. فاضل عبدالواحد علی، من الواح سومر..، ص٣٧٦.

((وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ وَاجْتَنِبُواْ الطَّاغُوتَ فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى اللّهُ وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ الضَّلالَةُ ...- النحل: ٣٦)).

((وَيَوْمَ نَبْعَثُ فِي كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا عَلَيْهِم مِّنْ أَنفُسِهِمْ وَجِئْنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَى هؤُلاء...- النحل: ٨٩)).

عبدالفادی دەڵێت بەپێی ئەو دوو سوورەتە مەککییە خودا بۆ هەر ئوممەتێك پێغەمبەرێکی ناردووە کە کەسی خۆیانە. کتێبی پیرۆزیش دەڵێت پێغەمبەران لە بەنو ئیسرائیلەوەن بۆ ئەوانو بۆ هەموو جیهان، ئینجا عبدالفادی دەپرسێت ئەگەر قسەکانی قورئان ڕاست بن ئەی بۆچی خودا پێغەمبەرانی نەناردووە بۆ ئوممەتەکانی ئەفەریقاو ئەورووپاو ئەمەریکاو ئوستڕالیا کە کەسی ئەو ئوممەتانە بن؟

* * * *

ئەوە ڕاست نییە کە تەورات پێغەمبەرانی بەستۆتەوە بە بەنو ئیسرائیل چونکە بەنو ئیسرائیل کوڕانو نەوەی یەعقووبن، پێش یەعقووبیش پێغەمبەرانی تر هەبوون: نووح، ئەخنۆخ. تەنانەت ئەوە بۆ ئیبراهیم و ئیسحاق باوکی یەعقووبیش ڕاست نییە.

جگە لەمەش پێغەمبەرانی تر باس کراون کە ئیسرائیلی نەبوون ئەگەرچی موناقەشەی ئەوەش کراوە کە بەڕاستی ئیسرائیلین یان نا. تەلموود باسی ئەوەی کردووە کە حەوت پێغەمبەر هەبوون لە غەیری جوولەکە وەك ئەییووبو بیلعام کوڕی بەعۆر בִּלְעָם בֶּן-בְּעוֹר.[٤٧٨] کە ئەمیان لە تەورات لەگەڵ خودا قسە دەکاتو خودا قسەی لەگەڵ دەکاتو وەحیی خودای بۆ دێتو پێشبینی دەکات (کتێبی ژمارە ئیصحاحی ٢٢ بەدواوە).

---

[478] ; M. L. Rodkinson, The Babylonian Talmud, Tract Baba Bathra (Last Gate), Ch.1, p.46.

موناقەشەی ئەوەش دەکرێت کە ئەوانە ئیسرائیلی بوون یان نا و بەتایبەتی ئەییووب کە ڕای یەکێکیانە کە ئیسرائیلی نەبوو: هەمان سەرچاوە لاپەڕە ٤٧.

سەبارەت بە پێغەمبەرانی تر بۆ ئەفەریقاو ئەورووپاو ئەمەریکاو ئوستڕالیاش.. نەبوونی تۆمار دەربارەی پێغەمبەران واتای ئەوە نییە نەنێردراون وەك چۆن نەبوونی تۆماری زۆرێك لە پادشاکانی ئەو کیشوەرانە بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی پادشایان نەبووە.

## ١٣-ئادەم و بتەکان

((هُوَ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَجَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا لِيَسْكُنَ إِلَيْهَا فَلَمَّا تَغَشَّاهَا حَمَلَتْ حَمْلاً خَفِيفًا فَمَرَّتْ بِهِ فَلَمَّا أَثْقَلَت دَّعَوَا اللّهَ رَبَّهُمَا لَئِنْ آتَيْتَنَا صَالِحاً لَّنَكُونَنَّ مِنَ الشَّاكِرِينَ * فَلَمَّا آتَاهُمَا صَالِحاً جَعَلاَ لَهُ شُرَكَاء فِيمَا آتَاهُمَا فَتَعَالَى اللّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ- الاعراف: ١٨٩-١٩٠)).

عبدالفادی قسەی موفەسیرەکانو بەتایبەت بەیزاوی دەگێڕێتەوە کە کورتەکەی ئەوەیە کاتێك حەووا سکی پڕ بوو ئیبلیس چووە بۆ لایو لەوە ترساندی کە لەوانەیە ئەوەی سکی ئاژەڵێك بێت سەگێك یان بەرازێك (وشەی بەراز زیادکردنی عبدالفادییە)و نازانێت لەکوێیەوە دەردەچێت" لە پاشەوە یان لە دەمی یان سکی هەڵدەدڕێتو دەیکوژێت. حەوواش ئەوە بۆ ئادەم دەگێڕێتەوەو تووشی خەفەت دەبن ئینجا ئیبلیس دەچێتەوە لایو دەڵێت: من پلەم لای خودا بەرزە ئەگەر داوا لە خودا بکەم بوونەوەرێکی ڕێك بێتو بەئاسانی لێتەوە دەرچێت ناوی بنێیت عبدالحارث، ناوی ئیبلیسش لای مەلائیکەت الحارث بوو، ئیتر بەردەوام خەریك بوو لەگەڵ حەوواو ئادەم تا ناویان نا عبدالحارث. بەیزاویش سەبارەت بەو ئایەتە (جعلا له شركاء فيما اتاهما) منداڵەکانیان ناو نا عبدالعزیو عبد مناف. عبدالفادی دەپرسێت: ئەو چیرۆکە سەیرە لەکوێوە هاتووە؟ عوززاو مەناف کە خوداوەندی عەرەبەکان لەکوێو ئادەم کە لە بەهەشت بوو لەکوێ بۆ ئەوەی بتەکانی عەرەب خوداوەند بن بۆ ئادەمو منداڵەکانی بەناوی ئەوانەوە بنێت؟

دیسانەوەش ئاماژە بۆ وشەی وترا (قیل) نییە کە بەیزاوی بەکاریهێناوەو وتمان بۆ قسەی لاواز بەکاردێت. بەیزاوی دوای گێڕانەوەی ئەو چیرۆکە دەڵێت: شتی لەم جۆرە شایستەی پێغەمبەران نییە (بەرگی ٣، ل ٨٣)، بەڵام عبدالفادی ئەوە نەقڵ ناکات بۆ ئەوەی چیرۆکەکە وەك قبوولکراو پیشان بدات. ئیتر جگە لە بەیزاوی ناوی موفەسیرەکانی تر ناڵێت.

ئیبنو کەثیر لە باسی ئەو ئایەتە چەند فەرموودەیەك دەهێنێتەوەو لەدوای قسەکردن لەسەریان دەگاتە ئەوەی ئەو باسە قسەی صەحابییەو ڕەنگە لەو جوولەکانەی بوونە موسڵمان وەریگرتبێت (جزء ٣، ل ٥٢٧). دواتریش ڕوایەتەکانی ئیبنو عەبباسی صەحابی دەهێنێتەوە کە چەند تابیعییەك لێیان وەرگرتووەو ژمارەیەکی زۆری سەلەفو خەلەفو کەسانێك کە لە ژماردن نایەن لە موفەسیرەکانی دوایی.. ئینجا دەڵێت ئەمە لە قسەی ئەهلی کیتاب، ئەو تەفسیرەش هەڵدەبژێرێت کە ئەم ئایەتە تایبەت نییە بە ئادمو حەووا بەڵکو موشریکەکان لە نەوەی ئەوان(٥٢٧–٥٢٨).

## ١٦–مووسا و خەزر

((فَوَجَدَا عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَا آتَيْنَاهُ رَحْمَةً مِنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَاهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا–الکهف: ٦٥)).

ئایەتەکە باسی ئەو کەسە دەکات کە لە مووسا زاناتر بوو و وەکو پێغەمبەر باس نەکراوە هەرچەندە ئەو شتانەی دەیزانین لە هی وەحیی پێغەمبەران دەچن. فەرموودە ئەو کەسە بە خەزر (الخضر) نادەبات. تا ئێرە کێشەیەکمان نییە. کێشەکە لەو کاتەوە دەست پێدەکات کە موفەسیرەکان قسە دەکەن. عبدالفادی قسەی بەیزاویی دەربارەی ئەو کەسە هێناوەتەوە کە ئەوەی لێرە جێگەی

مەبەست بێت ئەوەیە خەزر ئیلیای پێغەمبەر بووە، کە ئەمە قسەی بەیزاوییە[٤٧٩] نەك قورئانو فەرموودە، لەژێر ئەو دیوارەش کە هی دوو کوڕە بێباوکەکە بوو گەنجینەیەك هەبووە کە ئەمە قسەی قورئانە، لەسەر ئەو گەنجینەیەش چەند حیکمەتێك نووسرابوون کە یەکێکیان ئەمەیە: لا الە الا الله محمد رسول الله[٤٨٠].. کە ئاشکرایە ئەمەیان قسەی حیکاتخوانەکانە، هەموو ئەو بەسەرهاتەش کاتی ئەسکەندەری زولقەرنەین بوو، ئەویشیان قسەی قورئان نییە.

عبدالفادی دەڵێت مووسا ساڵی ١٥٠٠ پێش زاین لە میسر ژیابوو و ئیلیا ساڵی ٩٠٠ ی پێش زاین لە فەڵەستین ژیابوو و ئەسکەندەر ساڵی ٣٣٢ پێش زاین لە یۆنان ژیابوو ئیتر چۆن شایەتمانی بۆ موحەممەد کە لە نیمچە دورگەی عەرەب لە سەدەی حەوتەمی زاینی ژیابوو دەدەن؟ چۆن ئەو کەسانە کە هەر یەکێکیان لە سەردەمێكو وڵاتێك بوون لە یەك کاتو لە یەك شوێن کۆببنەوە؟

ئەگەر بەیزاوی بەو زانیارییەی سەردەمی خۆی هەیبوو بگەڕایەتەوە ژیان وەڵامی عبدالفادی دەدایەوە کە مووسا لە میسر ژیابوو بەڵام چووبووە دەرەوەی میسرو ئەسکەندەر لە یۆنان بوو بەڵام بە ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا گەڕابوو، شایەتمانیش بۆ موحەممەد بە نووسین بوو و ئەو نووسینە باسی دواڕۆژی کردووەو باسی کۆبوونەوە لەگەڵ ئەو کەسانە نەکراوە.

بەیزاوی دەڵێت خەزر کاتی فەرەیدوون ژیابوو و لە پێشەوەی لەشکرەکەی ئەسکەندەر زولقەرنەین بوو و تا سەردەمی مووسا مایەوە (ج٣، ص ٥٠٨). هەڵبەت ئەمە بەیزاویو ئەم قسە سەیرەی لەو کەسە وەرگرتووە کە لێی

---

[٤٧٩] ڕاستەکەی بەیزاوی چەند قسەیەك سەبارەت بە خەزر دەهێنێتەوە کە ئیلیاس یەکێکیانە، ج٣، ص ٥١٠.

[٤٨٠] بەیزاوی چەند (وترا)یێك نەقڵ دەکات کە یەکێکیان ئەوەیە گەنجینەکە نووسراوی عیلم بوو یان لەوحێکی زێڕ بوو لەسەر نووسراوە: لام سەیر بوو چۆن کەسێك باوەڕ بە قەدەر دەکات ئینجا خەفەت دەخواتو لام سەیر بوو کەسێك باوەڕ بە ڕزق دەکات چۆن ماندوو دەبێت... تاد، لەکۆتایی نووسراوەکەش: لا اله الا الله محمد رسول الله. ج٣، ٥١٧.

وەرگرتووە، ئێمەش بەو زانیارییەی سەردەممان کە هێشتا هەر کەمن شتی تر دەڵێین وەك: جێگەی گومانە مووسا وا کۆن ژیابوو (واتە ١٥٠٠ پێش زاین) و ئیحتمالی گەورەتر ئەوەیە لە سەردەمی رەمسیسی دووەم بووە کە سێ سەدە دوای ئەوە بوو، ئیلیاش بەهەمان شێوە وا کۆن نییە، ئەسکەندەریش ساڵی ٣٣٢ شەڕی لە سووریاو لوبنان دەکردو بەرەو میسر دەچوو نەك لە یۆنان بوو.
عبدالفادیش قسەی بێبنەمای هەندێك موفەسیری تێکەڵ بە گێڕانەوەکانی بوخاریو موسلم دەکات.

## ١٧-تێکەڵکردنی ناوەکان

((وَوَهَبْنَا لَهُ إِسْحَقَ وَيَعْقُوبَ كُلاًّ هَدَيْنَا وَنُوحًا هَدَيْنَا مِن قَبْلُ وَمِن ذُرِّيَّتِهِ دَاوُودَ وَسُلَيْمَانَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَى وَهَارُونَ وَكَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ * وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَى وَعِيسَى وَإِلْيَاسَ كُلٌّ مِّنَ الصَّالِحِينَ * وَإِسْمَاعِيلَ وَالْيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطًا وَكُلاًّ فضَّلْنَا عَلَى الْعَالَمِينَ -الانعام: ٨٤-٨٦)).

عبدالفادی ڕەخنەی ئەوە دەگرێت کە ئەو ناوانە بەبێ ڕیزبەندی ڕێکخراون چونکە هەندێکیان لە پێشترن بەڵام دواتر ناوبراونو بەپێچەوانەوە، بۆ نموونە داوودو سولەیمان دوای ئەیووب[٤٨١] و یووسف و مووسا و هاڕوون ژیابوون کەچی ناوەکانیان پێش ئەوان هاتوون... تاد.
پێویستیش ناکات لەسەر وەڵامی ئەو ڕەخنەیە بڕۆین چونکە دیارە ئەو کەسە نازانێت لە زمانی عەرەبی ئامرازی (و) بۆ کۆکردنەوەیە بێ مەرجی ریزبەندی واتە ئەگەر بڵێین: (جاء الرجل وابنه- پیاوەکەو کوڕەکەی هاتن) دەکرێت هەردووکیان پێکەوە هاتبن، دەشکرێت پیاوەکە پێش کوڕەکەی هاتبێت هەروەها دەکرێت کوڕەکە پێش باوکی هاتبێت. بۆ دیاریکردنی پاشو پێش ئامرازی (پاشان)

[٤٨١] کاتی ئەیووب نەزانراوەو تەنانەت جوولەکەش جیاوازییان لەبارەی سەردەمەکەیەوە هەیە. بڕوانە باسی تایبەت بە ئەیووب لەم کتێبەمان.

بەکاردێت کە دوو جۆری هەیە ئەویش بەپێی ماوەی نێوان دوو هاتنەکە: (فـ) بۆ ماوەی کورتو (ثم) بۆ ماوەی درێژ. سەرباری ئەوەش کام پێغەمبەر پێشترو کامیان دواتر ژیابوو لە ئایەتەکانی تری قورئان دیارکراوە.

## ١٨-ئەخنۆخ نەك ئیدریس

((وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِدْرِيسَ إِنَّهُ كَانَ صِدِّيقًا نَّبِيًّا * وَرَفَعْنَاهُ مَكَانًا عَلِيًّا - مريم: ٥٦-٥٧)).

عبدالفادی قسەی بەیزاوی پاشان قسەی تەورات دەهێنێتەوە. سەرەتا دەڵێت بەپێی بەیزاوی ئیدریس باپیری باوکی نووحەو ناوی (أخنوخ)ـە، ناوی ئیدریسیش لە (دەرس)ـەوە هاتووە[٤٨٢].. تاد پاشان قسەی تەورات دەهێنێتەوە کە ئەخنۆخ باوکی مەتوشالەحە[٤٨٣] (کە ئەمیان باپیری نووحە)و ئەخنۆخ ٣٦٥ ساڵ ژیابوو و دوایی نەدۆزرایەوە چونکە خودا بردییە لای خۆی (تەکوین ٥: ٢١-٢٤) کە شتێك لەم بابەتە لە ئینجیل (عبرانیین ١١: ٥) هەیە.

عبدالفادی ڕەخنەی ئەوە دەگرێت ناوەکە ئەخنۆخە[٤٨٤] نەك ئیدریس. وادیاریشە موفەسیرەکان بەهۆی ئایەتی (ورفعناه مكانا عليا) لە باسی ئیدریس وتوویانە ناوی ئەخنۆخە چونکە بەپێی تەورات خودا بۆ لای خۆی بردییەوە. ڕەنگە ئەوە ڕاست بێت بەڵام ئەوە قسەی موفەسیرەکانە. هەر موفەسیرەکانیشن کە وتوویانە خودا سی لاپەڕەی لەسەر دابەزاندووەو یەکەم کەس بووە بە قەڵەم شتی نووسیوەو زانستی ئەستێرەو ژماردنی زانیوە، کە ئەمەیان باوەڕی جوولەکە بووەو مەسیحییەکانو دواتر موسڵمانان لێیان وەرگرتوون.[٤٨٥] تەرگومی

---

[٤٨٢] بەیزاوی ڕەخنە لەوە دەگرێت لەڕووی صەرفەوە دروست نییە بەڵام دەڵێت دوور نییە لەو زمانە واتاکەی لەوەوە نزیك بێت (ج٤، ص٢٢).

[٤٨٣] מְתוּשָׁלַח یان مەتوشێلەح מְתוּשָׁלַח.

[٤٨٤] خەنۆخ، حەنۆخ חֲנוֹךְ .

[485] T. K. Cheyne, *Enoch*, in; Encyclopædia Biblica, vol.II, col.1296.

فەڵەستینیش دەڵێت ناوی ئەخنۆخ پێی وترا مێتاترۆن **Metatron** واتە نووسەری گەورە.[٤٨٦] هەر بەپێی زمانی عەرەبیش موفەسیرەکان وتوویانە ناوی ئیدریس لە دەرسەوە هاتووە، بەڵام بەپێی زمانی عیبری ڕەنگە واتای (لێبڕان) یان (ڕینمایی)ی هەبێت،[٤٨٧] بۆیە ناوە عەرەبییەکە لە واتای دووەمەوە نزیکە.[٤٨٨]

## نەمروود و بورجی بابل

سێ باسیش دەربارەی نەمروود یەکەمیان پرسیاری ژمارە ٢٠ و ئەوەی تر ژمارە ژمارە ٢٢و ئەوەی تریان ژمارە ٥٠ پەیوەندیی بە بورجی بابلەوەیە. سەرەتا دووەمیان:

### ٢٠-قسەی سەرسامکەری خەیاڵی دەربارەی بورجی بابل

((قَدْ مَكَرَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَأَتَى اللّهُ بُنْيَانَهُم مِّنَ الْقَوَاعِدِ فَخَرَّ عَلَيْهِمُ السَّقْفُ مِن فَوْقِهِمْ وَأَتَاهُمُ الْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لاَ يَشْعُرُونَ –النحل: ٢٦)).

ئایەتەکە باسی کەسانێکی پێش موشریکەکانی مەککە دەکات کە چۆن فێڵو پیلانیان دەگێڕا خوداش لە بناغەوە بینای ئەو گەلانەی دارمان، سەقفیش بەسەریان ڕووخا (واتە ئەو گەلانەی لە بنجەوە هەڵکێشا). بەیزاوی لێرە دەڵێت ئەوە وەکو نموونەو وێنەکردن باسکراوە ئێنجا دەڵێت: وتراویشە کە مەبەست لەمە

---

[486] ***ibid*.**

دەقەکەش لە:

**J. W. Etheridge, The Targums of Onkelos and Jonathan Ben Uzziel on the Pentateuch (Genesis and Exodus), Ch.5, p.175.**

[487] **T. K. Cheyne, *Enoch, op. cit*., col.1294.**

[٤٨٨] واتایەکی ناوەکە (بەئەزموون)ـە، بڕوانە وشەی (اخنوخ) لە: قاموس الكتاب المقدس. ڕەنگە ناوەکە یەکبگرێتەوە لەگەڵ وشەی (محنك)ی عەرەبی کە داڕێژراوی فرمانی (حنك) بێت کە هەمان واتای هەیە.

نەمرووود کوڕی کەنعانە کە لە بابل کۆشکەکەی دروستکرد کە ئەستوورییەکەی (واتە بەرزییەکەی) پێنج هەزار گەز بوو بۆ ئەوەی ئاگای لە کاروباری ئاسمان بێت خوداش فەرمانی دا بە با هەڵبکات ئەویش کۆشکەکەی بەسەر خۆیو قەومەکەی ڕووخاندو لەناوچوون (ج٣، ص ٣٩٣).

عبدالفادی دەپرسێت: بەیزاوی ئەمەی لەکوێ هێناوە کە نەمرووود کوڕی کەنعانە؟ نەخێر نەمرووود کوڕی کوش کوڕی حام کوڕی نووحە (تەکوین١٠: ٦–٨).

دەبوایە عبدالفادی ئەمەی بکردایەتە ڕەخنە لە بەیزاوی نەك قورئان، بەلام بەر لەوە ڕەخنە لەو باسە خەیاڵەییەی خنراوەتە ناو تەوراتی بەردەستمان. هەروەها باسە خەیاڵییەکەی نیمرۆد کە دەڵێت نیمرۆد کوڕی کوش بوو و بووە کەسێکی بەهێزو سەرەتای فەرمانڕەواییەکەی لە بابلو ئێرێك (ئوروك)و ئەکەدو کەلنە لە وڵاتی شینعارو لەوێوە بۆ ئاشور دەرچوو و شارەکانی نەینەواو رەحۆبۆت–عیر و کالەحو ڕێسێنی نێوان نینەواو کالەحی دروست کرد (تەکوین١٠: ٨–١٢).

وەك لە پرسیارێکی پێشتر باسمان کرد ناوبردنی ئەو شوێنانە ئاشکرای دەکات کە ئەم باسە تێکەڵکردنی باسی نوێترە بە باسە ئەسڵییەکەی تەورات، بۆ نموونە ئاشور لێرە وەکو فەرمانڕەوایەك باس کراوە لەکاتێك ناوی خوداوەندی ئاشورییەکان بوو هەروەها ناوی شاری ئاشور بوو. ئەگەر ئەو گریمانەیەش بڵێین کە ئەسڵی ناوەکە هی کەسێکە ئەوە دەمێنێتەوە کە نینەوا (نینوا) لە ئاشور کۆنترە، کالەحیش (بە ئاشوری: کالخو) زۆر نوێترە.[٤٨٩] ناوبردنی کالخوش لەو دەقە نیشانەیە لەسەر ئەهمیەتی لەو سەردەمە بۆیە وای بۆ دەچین تێخنینی ئەو ناوە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی شالمانەسەری سێیەمی کوڕی ئاشور ناصیرپالی

[٤٨٩] پادشای ئاشوری شالمانەسەری یەکەم (١٢٧٤–١٢٤٥ پ.ز) کالخوی دروست کرد بەلام دوای ئەو فەرامۆش کرا. ئاشور ناصیرپالی دووەمی (٨٨٣–٨٥٩ پ.ز) شارەکەی دروستکردەوەو کردییە پایتەختی خۆیو بەتایبەتی بنکەی سەربازیو دوای ئەو دیسانەوە فەرامۆش کرا.

دووەم یـان کـەمێك دواتـر بەتایبـەت کـە شالمانەسـەر جـەنگی لـەدژی جوولەکـە بەرپاکردبوو.

عبدالفادی دوای ئەوە بەهەموو قەناعەتێکەوە باسی چیرۆکی بورجەکـەی بابـل لـە تەورات دەگێڕێتەوە کە خەڵك لەدوای لافاوەکە شارێكو بورجێکیان دروستکرد ئیتر خودا زمانەکەیان شێواند (بەعەرەبی: بلبل) ئەوانیش نـەیانتوانی لەیـەکتر تێبگـەن بۆیەش شارەکە ناونرا (بابل).

ئەوەی سەیرەو لەپێشتریش بینیمان ئەوەیە چـۆن عبـدالفادی دەیـەوێت قەناعـەت بە شوێنکەوتووانی ئاینەکەی بکات کە قورئان هەڵەی کردووە لەو کاتەی دەقێکی ئەفسانەیی خودی تەورات بەراورد بکات لەگەڵ قسەی موفەسیرەکانی قورئان نەك خودی قورئان.

سەبارەت بە ڕەخنە ناڕاستەخۆکەی عبدالفادیش کە خـەڵکی دوای لافاوەکـە، نـەك نیمـرۆد وەك بـەیزاوی دەڵێـت، بـورجی بابلیـان دروسـتکردووە" لـە کەلـەپووری جوولەکە ئەوە هەیە کە دروستکردنی بورجەکە ئـەو کاتـە بـوو کـە نیمـرۆد پادشـا بوو،[٤٩٠] موفەسیرە ئیسلامییەکەش هیچی لەخۆیەوە نەهێناوە.

## ٥٠-فیرعەون بورجی بـابلی لە میسر بینـات نـا!

((وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَهٍ غَيْرِي فَأَوْقِدْ لِي يَا هَامَانُ عَلَى الطِّينِ فَاجْعَل لِّي صَرْحًا لَّعَلِّي أَطَّلِعُ إِلَى إِلَهِ مُوسَى وَإِنِّي لَأَظُنُّهُ مِنَ الْكَاذِبِينَ –القصص:٣٨)).

هەر لەبارەی باسی بورجەکەی بابل عبدالفادی دەڵێت ئەو بورجەی قورئان دەڵێـت گوایە فیرعەون داوای کرد دروست بکرێت بورجەکەی بابلە کە پـاش لافـاو دروسـت کرا. باسی هامانیش دەکات کە وەزیری فیرعەون نەبووە.

[490] The Soncino Babylonian Talmud, Book II, Abodah Zarah 53b, p.63, note 20.

سەبارەت بە هامان بڕوانە پێشتر. ئەو ئایەتەی قورئانیش زۆر ئاشکرایە نە لە دوورو نە لە نزیك پەیوەندیی بە بورجە خەیاڵییەکەی بابلەوە نییە. باسی بورجەکەشمان پێشتر باس کردو ئێستا خوێنەر دەزانێت ئەو قسەیە لە وڕێنە زیاتر نییە. بەڵام لاشمان سەیر نەبێت ڕەخنەی وا بگیرێت چونکە کەسێك نە مەبەستو نە مەنهەجی زانستی بنو نووسین بۆ جەنگی ئاینەکان بەکاربهێنێت تووشی وڕێنەی وا هەر دەبێت.

## باسی کەعبە

عبدالفادی لە دوو خاڵی جیاواز باسی کەعبە: پرسیاری ژمارە ٢١ بەناوی: کەعبە ماڵی زوحەلە و پرسیاری ژمارە ٤٨ بەناوی کەعبە مەقامی ئیبراهیمە و قسەکانیان لە یەکەوە نزیکن:

### ٢١-کەعبە ماڵی زوحەلە

((وَإِذْ جَعَلْنَا الْبَيْتَ مَثَابَةً لِّلنَّاسِ وَأَمْناً وَاتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى وَعَهِدْنَا إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْعَاكِفِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ * وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّ اجْعَلْ هَـَذَا بَلَدًا آمِنًا وَارْزُقْ أَهْلَهُ مِنَ الثَّمَرَاتِ مَنْ آمَنَ مِنْهُم بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ قَالَ وَمَن كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُ قَلِيلاً ثُمَّ أَضْطَرُّهُ إِلَى عَذَابِ النَّارِ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ * وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَاهِيمُ الْقَوَاعِدَ مِنَ الْبَيْتِ وَإِسْمَاعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّكَ أَنتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ - البقرة: ١٢٥-١٢٧)).

عبدالفادی دەڵێت تەورات باسی چوونی ئیبراهیم لە ئوری کلدانییەکان بۆ خاکی کەنعان دەکاتو باسی چوونی بۆ وڵاتی عەرەبو دروستکردنی کەعبە لەگەڵ ئیسماعیل ناکات. عبدالفادی باسی کەعبەو بتە زۆرەکانی پێش ئیسلام دەکاتو دەڵێت چۆن کەعبە ماڵی خوداو خانەی پاداشتو ئەمان دەبێت لەکاتێك کە ماڵی بتەکانەو یەکەم جار بۆ پەرستنی زوحەل دروست کرابوو و هەر کەسێك بەسەری زاڵ بێت زۆر لە خەڵکەکەی دەکات سرووتەکانی مەزهەبەکەی بکات؟ کاتێکیش موحەممەد دەستی بەسەر کەعبە گرت زۆربەی سرووتە ئاینییەکانی هێشتەوە وەك

حەجکردنو تەوافو ئیحرامو عومرەو بەرد هاویشتنو ماچکردنی بەردی ڕەشو سەربڕین.. تاد ئاماژەش بۆ کتێبی (تاريخ الكعبة)ی دوکتۆر خەربوطلي و کتێبی (الجذور التاريخية للشريعة الاسلامية)ی (عەبدولکەریم خەلیل–ڕاستەکەی خەلیل عەبدولکەریم). وەڵامی ئەمانەش لە خوارەوەیە.

## ٤٨-کەعبە مەقامی ئیبراهیمە

((إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَالَمِينَ * فِيهِ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ مَّقَامُ إِبْرَاهِيمَ وَمَن دَخَلَهُ كَانَ آمِنًا وَلِلّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ الله غَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ –ال عمران: ٩٦–٩٧)).

لێرەش بەشێك لە قسەکانی سەرەوە دووبارە دەکاتەوە، کتێبەکەی تاها حسێنیش دەربارەی شیعری جاهیلی زیاد دەکات کە ئەو فیکرەیە وتووە.

پێویستمان بە کتێبی هیچ کەسێك نییە تا بزانین کە ئیسلام بەشێکی سرووتەکانی سەر بە کەعبەی هێشتەوە ئەوەش هیچ کێشەیەك دروست ناکات لەبەر ئەوەی ئەو سرووتانە پاشماوەی سەردەمی ئیبراهیمنو ئیسلام ئەوانەی گەڕاندەوە بۆ ئیسلامو پاکی کردن لە شیرکو کارە خراپەکان کە تێکەڵی ببوون. خۆ ئەگەر هی سەردەمی ئیبراهیمیش نەبن ئاساییە ئەو سرووتانە وەربگیرێن ئەگەر لە شیرك پاك بنو گەورەکردنی خودا لەخۆ بگرن، ئەو سرووتەش کە شیرکی لەخۆگرتووە دەکرێت ئەو شیرکەی لێ لابرێتو بەشە گونجاوەکەی بهێڵرێتەوە.

ئەوەی جێگەی سەیریشە ئەوەیە ئەگەر باسی ئیبراهیم و پاشماوەی سرووتەکان لای عەرەبی سەردەمی پێغەمبەر مابن بەجۆرێك دەبنە سەرچاوەیەکی مێژوویی بۆیان.. ئەوانە یەکسان دەکرێن بە ئەفسانەکانی سەر بە کەعبە وەك ئەوەی عەرەب کەعبەی بۆ پەرستنی زوحەل دروست کردبوو. نووسەری (تاريخ الكعبة) خۆی ئەو چیرۆکانە نەقڵ دەکاتو هەر خۆی دەیانخاتە خانەی ئەفسانە. ئەو

دەڵێت چیرۆك هەن دەڵێن پێش ئیبراهیم مەلائیکەت کەعبەیان دروست کردو هەیە دەڵێت کەعبە لەگەڵ ئادەم هاتە خوارەوەو هەیە دەڵێت ئادەم‌و حەووا دروستیان کردبوو.. تاد[٤٩١] ئیتر هیچ شتێکم لەو کتێبە نەبینوە باسی زوحەل بکاتو ئەو قسەیە لە داهێنانی عبدالفادی دەچێت یان لە سەرچاوەیەکی تر وەریگرتووە کە ئەمیان بە هەڵە قسەکانی ئەو کتێبەی نەقڵ کردووە. باسی زوحەل لەلایەن کەسانێکی ترەوە کراوە کە باوەڕی هەندێك کەس وایە کەعبەماڵی زوحەلە، ئینجا لەبەر ئەوەو لەبەر ئەوەی زوحەل سەرپەرشتیاری کەعبە بوو ئەو کەعبەیە زۆر ماوەتەوە.[٤٩٢] هەموو ئەمەش لەمیانەی ژمارەیەك قسەی ئەفسانەیی‌و بێبەڵگە. سەبارەت بە ئاماژەش بۆ کتێبەکەی خەلیل عەبدولکەریم هیچ شتێك لە حاڵەکە ناگۆڕێت چونکە ئەوەی وتوویەتی دەربارەی هێشتنەوەی سرووتەکانی حەج‌و عومرە شتێکی زانراوە. بۆ کتێبەکەی تاها حسێنیش ئەوەی وتوویەتی بریتییە لە بە ئەفسانە زانینی ئەو قسەیەی دەڵێت ئیبراهیم کەعبەی دروست کردووەو چیرۆکێکی نوێیە، ئیسلامیش کە هات لەبەر هۆیەکی ئاینی قبووڵی کرد، قورەیشیش لەبەر هۆیەکی ئاینی‌و سیاسی قبووڵی کرد.[٤٩٣]

---

[٤٩١] د. علي حسني الخربوطلي، تاريخ الكعبة، ل ١١ بەدواوە.

[٤٩٢] محمد حسين الطباطبائي، الميزان في تفسير القران، تەفسیر سوره الانعام، ج٧، ص٢٤٦، سەرباری ئەوەش دەڵێت شتی وای تریان وتووە هێندە ناشیرینن باسیان ناکەم. ئاماژەش بۆ مەسعوودی دەکات کە دەڵێت کە سابیئە حەوت ماڵیان لا گەورە بوو کە یەکێکیان کەعبەیە بەناوی زوحەل (ص٢٤٧).

[٤٩٣] طه حسين، في الشعر الجاهلي، ص١٧. ئەو کتێبەی تاها حسێن نموونەیەکە لەسەر فیکرەیەکی بەهێز کە خاوەنەکەی سەقەتی دەکات. فیکرەی کتێبەکە ئەوەیە کە شیعری جاهیلی هی پێش ئیسلام نییە بەڵکو هی سەردەمە ئیسلامییەکانەو خراوەتە پاڵ شاعیرانی پێش ئیسلام بۆیە ئەو شیعرە نابێتە بنەما بۆ تەفسیری قورئان‌و فەرموودە بەڵکو بەپێچەوانەوە قورئان‌و فەرموودە بنەمان بۆ تەفسیری ئەو شیعرە، لاپەڕە ٥-٧، بەڵام شتی تری بێبەڵگە لەم فیکرەیە دەپێچێتەوەو ڕەوتی باسەکان دەبێتە قسەی نازانستی‌و بێبەڵگەو یان سەرچاوە ناڵێت یانیش سەرچاوەی وا دەڵێت کە باسەکانیان جێگەی متمانە نین.

## ٢٣-ئیسماعیل یەکێکە لە پێغەمبەران

((وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِسْمَاعِيلَ إِنَّهُ كَانَ صَادِقَ الْوَعْدِ وَكَانَ رَسُولًا نَّبِيًّا – مریم: ٥٤)).

عبدالفادی دەپرسێت: چۆن ئیسماعیل یەکێکە لە پێغەمبەران لەکاتێك تەورات بەم شێوەیە وەسفی دەکات ((کەسێکی کێوی دەبێت دەستی لەسەر هەموو کەسێك دەبێتو دەستی هەموو کەسێك لەسەر ئەو دەبێت))(تەکوین١٦: ١٢).

عبدالفادی تەنها ئەو قسەیەی تەورات وەردەگرێتو تەنها ئەو وێنەیە بۆ دەکێشێت بەڵام تەورات شتی تریش دەڵێت وەك قسەی خودا لەگەڵ ئیبراهیم: سەبارەت بە ئیسماعیل ئەوە داواکەی تۆم بیست. ئەوەتا بەرەکەتی لەسەر دەکەمو بەرهەمداری دەکەمو ژمارەکەی زۆر زۆر دەکەم. دەبێتە باوکی دوانزە سەرۆكو دەیکەمە میللەتێکی گەورە (تەکوین١٧: ٢٠).

هەروەها قسەی فریشتەکە لەگەڵ هاجەری دایکی ئیسماعیل: دەیکەمە میللەتێکی مەزن(تەکوین ٢١: ١٨).

بەم جۆرەش تەورات باسی ئیسماعیل دەکات: خوداش لەگەڵ کوڕەکە بوو ئیتر گەورە بوو (تەکوین٢١: ٢٠).

خۆ ئەگەر پێغەمبەرایەتیی ئیسماعیل لە باسەکانی تەورات دەستکاری کرابێت شتێکی ئاسایی دەبێت ئەویش بۆ ئەوەی هەموو سەروەرییەکان بۆ ئیسحاق، باوکی ئیسرائیلییەکان، بێت. تێبینیی ئەوەش بکە کە یەعقووب لە سەرەمەرگی خۆی دوانزە کوڕەکەی بانگ دەکاتو پێیان دەڵێت لە دوارۆژ هەر یەکیان چیی بەسەر دێت. هەندێکیش لەو کوڕانە بە خراپ باس دەکات (تەکوین ٤٩). یەك لەوانەش (لاوی)یە کە بەخراپە باسی دەکات هەرچەندە لاوی بۆ ماوەیەکی زۆر کاهنێتی، واتە کاری بەجێهێنانی سرووتە ئاینییەکان وەك سەربڕینی ئاژەڵو هەڵگرتنی تابووتی پەیمانو تەفسیرکردنی شەریعەتو خزمەتکردن لە ئاهەنگەکانو قەزاوەتکردن.. تاد، تایبەت بە سیبتی ئەوەوە بوو.

لاشمان سەیر نەبێت ئەگەر تەوراتی بەردەستمان پێغەمبەرایەتیی ئیسماعیلی سڕیبێتەوە چونکە نموونە لەسەر نووسینەوەی تەورات بەپێی خواست تەنانەت خودی ئیسرائیلییەکانیشی گرتۆتەوە وەك چۆن لە چیرۆکی یووسف تێبینی کراوە کە سەرەتا رێئۆبێن یووسف ڕزگار دەکات کاتێك بە براکانی دەڵێت لەجیاتی کوشتنی یووسف فڕێی بدەنە ناو بیرەکە (تەکوین ٣٧: ٢١–٢٤)، بەڵام یەکسەر دوای ئەوە یەهوودا دەبێتە ڕزگارکەرەوەی یووسف کاتێك پێشنیار دەکات یووسف بە ئیسماعیلییەکان بفرۆشرێت (تەکوین٣٧: ٢٥–٢٧)، هۆی ئەمەش، وەك دوو لێکۆڵەرەوە دەڵێن، لایەنگیرییە چونکە باسی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ سەرچاوە (ئێلۆهیمی)یەکەی تەورات چونکە نەوەی رێئۆبێن لە پادشانشینە باکوورییەکە نیشتەجێ بوونو بەم جۆرە رێئۆبێن کراوەتە ڕزگارکەرەوەی یووسف، باسی دووەمیشیان دەگەڕێتەوە بۆ سەرچاوە (یەهوەهی)یەکەی تەورات چونکە نەوەی یەهوودا لە پادشانشینە باشوورییەکە نیشتەجێ بوون بۆیە ئەو کراوەتە ڕزگارکەرەوەی[٤٩٤].

هۆی دوورخستنەوەی ئیسماعیل هەروەکو دوورخستنەوەی (عێساو) עֵשָׂו ـە. عێساو برای گەورەی یەعقووب بوو بەڵام یەعقووب ((برا گەورەیی))یەکەی لێ کڕیبووەوە(تەکوین ٢٥: ٣١–٣٤)، یان وەکو دوای دوو ئیصحاح یەعقووب بە

---

[٤٩٤] ستیفن م. میلر، روبرت ف. هوبر، تاريخ الكتاب المقدس، ص٣١. تەورات چەند سەرچاوەیەکی هەیە" یەکێکیان سەرچاوەی یەهوەهیی پێ وتراوە (زۆرتر پێدەچێت هی سەدەی نۆیەمی پێش زاین بێت) چونکە ناوی خوداوەند بە (یەهوەه) هاتووەو هی پادشانشینەکەی باشوورە (یەهوودا) پاش پەرتبوونی دەوڵەتەکەی سولەیمان، سەرچاوەیەکی تریش ئێلۆهیمیی پێ وتراوە (زۆرتر پێدەچێت هی سەدەی هەشتەمی پێش زاین بێت) چونکە ناوی خوداوەند بە شێوەی (ئێلۆهیم) هاتووەو هی پادشانشینەکەی باکوورە (ئیسرائیل)، ڕەنگە دوای کەوتنی ئیسرائیلیش بەدەستی ئاشوورییەکان چەند دەستنووسێکی ئەو سەرچاوەیە برابێتە باشوورو لەگەڵ سەرچاوە یەهوەهییەکە کۆکرابێتەوە ئەویش لەدەوروبەری سەدەی حەوتەمی پێش زاین. جگە لەم دوانەش دوو سەرچاوەی تر هەن: تاريخ الكتاب المقدس، ص٣٠–٣١.

پلانی دایکی فێڵی لە ئیسحاقی باوکی کرد، کە وای تێگەیاند عێساوەو نەیوت یەعقووبەو یەعقووب بەرەکەتەکەی لێ وەرگرت (تەکوین٢٥)، ئیسماعیلیش بەهەمان شێوە برا گەورەی ئیسحاقە بەڵام براگەورەییەکە بۆ ئیسحاق بوو و خودا، هەرچەندە بەرەکەتی لە ئیسماعیلیش کردبوو، بەڵام وتی کە پەیمانەکەی لەگەڵ ئیسحاق دەبێت (تەکوین ١٧: ١٩). عێساو بە باوکی ئێدۆم אֱדוֹם ناوبراوە (تەکوین٣٦: ٤٣)و کتێبی تەکوین چەند جارێك دووبارەی دەکاتەوە: ((عێساوش کە ئێدۆمە))، ئەدۆمییەکانیش دراوسێی جوولەکە بوونو کێشەیان لەگەڵیان هەبووەو لەچاو ئیسماعیلییەکان (عەرەب) کێشەکانیان زۆرتر بوون، بەواتایەکی تر ئەو هەڵوێستە لە ئیسماعیلو عێساو دەگەڕێتەوە بۆ پەیوەندیی جوولەکە بە دراوسێکانیانەوە.

لە دوو کتێبی جوولەکە هەڵوێست لە ئیسماعیل باشترە. لە کتێبی یۆبیلەکان[٤٩٥] (بەشێوەیەکی گشتی لە ناوەڕاستی سەدەی دووەمی پێش زاین) ئیبراهیم بەرەکەتی کردووە لە کوڕەکانیو خێزانەکانیانو نەوەکانیان ئەویش بەشێوەی کۆ بێئەوەی کەس جیابکرێتەوە. ئیسحاقو ئیسماعیلیش وەکو یەك مامەڵەیان لەگەڵ کراوەو ئەو بڕگەیەی باسی دەرکردنی هاجەر (دایکی ئیسماعیل) لەلایەن سارا (دایکی ئیسحاق)وە کە لە کتێبی تەکوین هەیە لابراوە هەرچەندە هێڵێکی جیاکەرەوە لەنێوان ئیسماعیلو عێساو لەلایەكو ئیسرائیل لەلایەکی تر کراوە.[٤٩٦]

---

[٤٩٥] تایبەتە بە کتێبی تەکوینو بەشێك لە کتێبی دەرچوون. لە زۆربەی زۆری تایفە مەسیحییەکان بە نادروست زانراوە بەڵام لای کەنیسەی ئەرتۆدۆکسیی حەبەشی بە قانوونی زانراوە.

[496] **Roger Syrén, *Ishmael and Esau in the Book of Jubilees and Targum Pseudo-Jonathan*, in; The Aramaic Bible, p.311.**

لە تەکوین (٢٥: ١–٦) باسی بەخششی ئیبراهیم بۆ کوڕەکانی کراوە، بەڵام لە کتێبی یوبیلەکان (ئیصحاحی ٢٠) پێش ئەو بەخششە ئیبراهیم ئیسماعیلو دوانزە کوڕەکەیو ئیسحاقو دوو کوڕەکەیو کوڕەکانی قەطوورا (ژنی ئیبراهیم)و کوڕەکانی ئەمانی بانگ کردو ئامۆژگاریی دووروودرێژی کردنو لەکۆتایی بەرەکەتی لە هەر هەموویان کرد ئینجا بەخششەکەی دانێ :

هەڵویستی کتێبەکەی تر، واتە (تەرگومی یۆناتانی ساختە) بەو ئەندازە باشە نییە چونکە ئیسماعیلو کوڕەکانی بە ڕێگر ناودەبات بەڵام هەڵوێستێکی باشی هەیە لەو کاتەی هێشتا ئیسحاق لەدایك نەببوو و دوایی لەپڕ ئەو هەڵوێستە دەگۆڕێت.[497] هەڵویستیش لە عێساو خراپترە لەچاوە کتێبی یۆبیلەکان. ئەم هەڵوێستانەش پێدەچێت دەربڕی گۆڕانکاریی پەیوەندیی جوولەکە بە دراوسێکانیانەوە بن کە ماوەیەك ئاشتی بووەو ماوەیەك شەڕ بووە.[498] جیاوازیی کتێبەکان لە تەرگومە قانوونییەکە دیارە، واتە تەرگومی بابلی کە هەروەها بە تەرگومی ئۆنکیلۆس ناسراوە کە ئەو بڕگەیەی تەورات دەربارەی ئیسماعیل: ((کەسێکی کێوی دەبێت دەستی لەسەر هەموو کەسێك دەبێتو دەستی هەموو کەسێك لەسەر ئەو دەبێت– تەکوین ١٦: ١٢)) دەبێتە پەیوەندیی پشتبەستن بە

---

George H. Schodde, The Book of Jubilees, pp.61-62.

هەڵبژاردنی ئیسرائیل (یەعقووب)و نەوەکەشی نەك ئیسماعیلو عێساو (١٥: ٢٢):

*ibid*., p.51.

497 R. Syrén*, op. cit.*, pp.313-314.

498 *ibid*, p.314.

پێدەچێت باسی ئیسماعیلییەکان لە (تەرگومی ئۆرشەلیمی بۆ کتێبی تەثنیە) نموونەیەك بێت لەسەر کاری بارودۆخی کاتی نووسراو لەسەر هەڵوێستو لەسەر هۆنینەوە چیرۆك. لەو تەرگومەو لە تەرگومی فەڵەستنی (گە بە هەڵە پێی دەوترێت تەرگومی یوناتان بێن عوزیئیل) بۆ پێنج کتێبەکە باسی ئەوە کراوە کە گوایە مووسا دەڵێت خودا شەریعەتی دابوو بە منداڵانی عێساو بەڵام قبووڵیان نەکردو دابووی بە منداڵانی ئیسماعیل ئەوانیش قبووڵیان نەکرد بەڵام تەرگومی ئۆرشەلیمی هۆکە دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەوەی منداڵانی عێساو بینیان تێی نووسراوە کە نابێت کوشتن ئەنجام بدەن بۆیە قبووڵیان نەکردو منداڵانی ئیسماعیل بینیان نووسراوە نابێت ببنە دز:

J. W. Etheridge, The Targums of Onkelos and Jonathan Ben Uzziel (Leviticus, Numbers and Deuteronomy), Ch.XXXIII, pp.672-673.

ئاشکرایە کە واقعی عەرەبی نیمچەدورگەی عەرەبی ئەو کاتە بریتی بوو لە نیشتەجێبوونێکی کەم لەگەڵ کۆچەرییەکی زۆر کە بەشێکیان خەریکی پەلامارو تاڵانی بوون وەك چۆن ئەوە پێش ئیسلام هەبووە.

یەکەوە: پێویستی بە هەموو کەسێکەوە دەبێتو هەموو کەسێك پێویستی پێی دەبێت.[499]

بەم شێوەیە دەتوانین تێبگەین بۆچی پێغەمبەرایەتیی ئیسماعیل لە تەورات باس نەکراوە.

## ٤٢-خەڵکی شارەکە

((وَاضْرِبْ لَهُم مَّثَلاً أَصْحَابَ الْقَرْيَةِ إِذْ جَاءهَا الْمُرْسَلُونَ (١٣) إِذْ أَرْسَلْنَا إِلَيْهِمُ اثْنَيْنِ فَكَذَّبُوهُمَا فَعَزَّزْنَا بِثَالِثٍ فَقَالُوا إِنَّا إِلَيْكُم مُّرْسَلُونَ (١٤) قَالُوا مَا أَنتُمْ إِلاَّ بَشَرٌ مِّثْلُنَا وَمَا أَنزَلَ الرَّحْمن مِن شَيْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلاَّ تَكْذِبُونَ (١٥) قَالُوا رَبُّنَا يَعْلَمُ إِنَّا إِلَيْكُمْ لَمُرْسَلُونَ (١٦) وَمَا عَلَيْنَا إِلاَّ الْبَلاَغُ الْمُبِينُ (١٧) قَالُوا إِنَّا تَطَيَّرْنَا بِكُمْ لَئِن لَّمْ تَنتَهُوا لَنَرْجُمَنَّكُمْ وَلَيَمَسَّنَّكُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ (١٨) قَالُوا طَائِرُكُمْ مَعَكُمْ أَئِن ذُكِّرْتُم بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ (١٩) وَجَاء مِنْ أَقْصَى الْمَدِينَةِ رَجُلٌ يَسْعَى قَالَ يَا قَوْمِ اتَّبِعُوا الْمُرْسَلِينَ (٢٠) اتَّبِعُوا مَن لاَّ يَسْأَلُكُمْ أَجْرًا وَهُم مُّهْتَدُونَ (٢١) وَمَا لِي لاَ أَعْبُدُ الَّذِي فَطَرَنِي وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ (٢٢) أَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِ آلِهَةً إِن يُرِدْنِ الرَّحْمَن بِضُرٍّ لاَّ تُغْنِ عَنِّي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئًا وَلاَ يُنقِذُونِ (٢٣) إِنِّي إِذًا لَّفِي ضَلاَلٍ مُّبِينٍ (٢٤) إِنِّي آمَنتُ بِرَبِّكُمْ فَاسْمَعُونِ (٢٥) قِيلَ ادْخُلِ الْجَنَّةَ قَالَ يَا لَيْتَ قَوْمِي يَعْلَمُونَ (٢٦) بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ الْمُكْرَمِينَ (٢٧) وَمَا أَنزَلْنَا عَلَى قَوْمِهِ مِن بَعْدِهِ مِنْ جُندٍ مِّنَ السَّمَاء وَمَا كُنَّا مُنزِلِينَ (٢٨) إِن كَانَتْ إِلاَّ صَيْحَةً وَاحِدَةً فَإِذَا هُمْ خَامِدُونَ- يس: ١٣-٢٩)).

بەیزاوی حیکایەتی ئەو شارە، کە گوایە ئەنتاکیا بوو، دەگێڕێتەوە کە بەکورتی ئەمەیە: حەبیبی دارتاش باوەڕی بە دوو نێردراوی عیسا کرد کە یەحیاو یوونس

[499] R. Syrén, *op. cit.*, pp.313-314.

جێگەی سەرنجیشە کە ئەو تەرگومە ناوی کوڕەکانی ئیسماعیل دەهێنێتو دەڵێت لە گوندو شارەکانیان... واتە نەوەی ئیسماعیلی کردە نیشتەجێبوو نەك کۆچەر، ڕەنگە بۆیە هەڵوێستەکە لێرە جیاوازەو نەوەی ئیسماعیل بە چەتە نەناسێنراون ، بڕوانە بۆ ئەو قسەیەی تەرگومەکە:

J. W. Etheridge, The Targums of Onkelos and Jonathan Ben Uzziel (Genesis and Exodus), Ch.XXV, p.87.

بـوون، وتراویشــە کەسـی تـر بـوون، پادشـاش ئـەو دوانـەی گـرت پاشـان عیسـا شــەمعوونی نــاردو ئــەو خــۆی نەناســاند ئینجـا بــووە هــۆی ئــەوەی دوانەکــە موعجیزەکان ئەنجام بدەن... تاد (ج٤، ص٤٢٨)، پاشـان دەڵێـت حـەبیب یـەکێك بوو لەوانەی باوەڕیان بە موحەممەد هێناو شەشسەد ساڵیان لە بەینـە..(ص٤٢٩–٤٣٠). ئەمەش بەشێکی مەعقوولی چیرۆکەکەیە کە پڕە لە شتی سەیرو سەمەرە.
عبدالفادی دەڵێت ئەنتاکیا لەدەستی رۆمەکان بـووە ئـیتر چـۆن پادشـای دەبێـت؟ چـۆنیش حــەبیب بـاوەڕ بــە موحەممــەد دەهێنێـت لــەکاتێك شەشســەد ســاڵیان لەنێوانیان هەیە؟ پاشان لەناو نێردراوانی عیسا کەس نەبووە بـەناوی شـەمعوون و یـوونس چـونکە شـەمعوون کـوڕی یەعـەقووب کـوڕی ئیسـحاق کـوڕی ئیبراهیمـە، یوونسیش یان یوونان ئەو پێغەمبەرە بوو کە نەهەنگەکە قووتی دا.
دیارە عبدالفادی ئاگای لەو قسەیەی بەیزاوی نەبووە کە بۆ یەحیاو یوونس دەڵێت: وتراویشە کەسی تر بوون، بەش بە حاڵی خۆشمان نـازانین بـەیزاوی ئـەو قسـانەی لەکوێ هێناوە بەڵام پێدەچێت وەك زۆر شتی تر لە سەرچـاوە مەسـیحییەکانی تـر وەریگرتووەو تاکە خەتای بەیزاوی‌و غەیری بەیزاوی ئەوەیە ئەو چـیرۆکانەیان لـەو سەرچـاوانە وەرگرتـووە، خۆشـیان لـە ئەگـەری هەڵبەسـتن بـە وشـەی ((وتـرا)) پەڕاندۆتەوە، بەڵام بەم کارە تەفسیریان بە چیرۆکی لەو جۆرە پڕکردووە.
عبدالفادی کاتێك ڕەخنە لە بەیزاوی سەبارەت بە شەمعوون دەگرێت نەیزانیوە کـە شەمعوون ناو هەبووە لەناو دوانزە قوتابییەکەی مەسیح، لەجیاتی یەکێکش دووان کە یەکێکیان بە پوتروس (پێترۆس بە یۆنانی) ناسـراوەو پێـی دەوترێـت سـیمعان (کە ئەمە شێوە عەرەبییەکەیەتی) یاخود شەمعوون پوتروس کە کاسـۆلیکیەت بـە یەکەم پاپای خۆی دەزانێت‌و کەنیسەی ئەنتاکیای دامەزراندبوو پاشـان کەنیسـەی رۆما! تەنانەت ناوێك نزیکیش لە یوونس، کـە بـەیزاوی نـاوی هێنـاوەو عبـدالفادی دەڵێت کەسی وا نییە لەناو قوتابییەکانی مەسـیح، هەیـە ئـەویش یوحـەننا کـە بـە

یۆنانی پێی دەوترێت ئیوانیس Ἰωάννης و نزیکە لە ناوی یوونس بە یۆنانی: یۆناس *Ionas* هەرچەندە دوو کەسی جیاوازن.

سەبارەت بە باوەڕهێنانی حەبیبیش بە موحەممەد، ئەگەر گێڕانەوەکە ڕاست بێت، شتێکی سەیر نییە چونکە دیارە لە پێغەمبەرانی تری بیستووە، بەڵام بەیزاوی پێمان ناڵێت ئەوەی لە کێ وەرگرتووە، چارەسەری سەرچاوەی پڕگومان و نەبوونی سەرچاوەش وشە باوەکەیە ((وترا)). بەئەندازەی نازانستیی ئەو قسانەش قسەکەی عبدالفادی بێبایەخە کە دەڵێت چۆن ئەنتاکیا پادشای دەبێت لەکاتێك کە دەوڵەتی ڕۆما حوکمی دەکرد. چیرۆکەکە خۆی بێ بناغەیە ئیتر چ شتێکی ڕاستی لەسەر بینا دەکرێت؟ گریمان لەجیاتی پادشا فەرمانڕەوایەکی هەبوو" چی لەو حیکایەتە سەیرە دەگۆڕێت؟ بەهەر حاڵ دەبوایە عبدالفادی ڕەخنەی لە ئینجیلی بەردەستمان بگرتایە کە وتوویەتی کاتی مەسیح هیرۆدۆس پادشای یەهوودیە بوو (لوقا ١: ٥)، هەرچەندە ئەویش وەکو پادشای ئەنتاکیا سەر بە ڕۆما بوو، یەکەم جاریش نییە عبدالفادی بیسەلمێنێت ئاگای لە ئینجیلەکەی خۆشی نییە.

## ٤٣- هوود و عاد؟

((وَإِلَى عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُواْ اللّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ إِنْ أَنتُمْ إِلاَّ مُفْتَرُونَ – هود: ٥٠)).

((وَلَمَّا جَاء أَمْرُنَا نَجَّيْنَا هُودًا وَالَّذِينَ آمَنُواْ مَعَهُ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَنَجَّيْنَاهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ –هود: ٥٨)).

((وَإِلَى عَادٍ أَخَاهُمْ هُوداً قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُواْ اللّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ أَفَلاَ تَتَّقُونَ (٦٥) قَالَ الْمَلأُ الَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوْمِهِ إِنَّا لَنَرَاكَ فِي سَفَاهَةٍ وِإِنَّا لَنَظُنُّكَ مِنَ الْكَاذِبِينَ (٦٦) قَالَ يَا قَوْمِ لَيْسَ بِي سَفَاهَةٌ وَلَكِنِّي رَسُولٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِينَ (٦٧) أُبَلِّغُكُمْ رِسَالاتِ رَبِّي وَأَنَاْ لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ (٦٨) أَوَعَجِبْتُمْ أَن جَاءكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَى رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْ وَاذكُرُواْ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَاء مِن بَعْدِ قَوْمِ نُوحٍ وَزَادَكُمْ فِي الْخَلْقِ بَسْطَةً فَاذْكُرُواْ آلاء اللّهِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ (٦٩)

قَالُواْ أَجِئْتَنَا لِنَعْبُدَ اللّهَ وَحْدَهُ وَنَذَرَ مَا كَانَ يَعْبُدُ آبَاؤُنَا فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَا إِن كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ (٧٠) قَالَ قَدْ وَقَعَ عَلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ رِجْسٌ وَغَضَبٌ أَتُجَادِلُونَنِي فِي أَسْمَاء سَمَّيْتُمُوهَا أَنتُمْ وَآبَآؤُكُم مَّا نَزَّلَ اللّهُ بِهَا مِن سُلْطَانٍ فَانتَظِرُواْ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ الْمُنتَظِرِينَ (٧١) فَأَنجَيْنَاهُ وَالَّذِينَ مَعَهُ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَقَطَعْنَا دَابِرَ الَّذِينَ كَذَّبُواْ بِآيَاتِنَا وَمَا كَانُواْ مُؤْمِنِينَ– ألأعراف: ٦٥–٧٢)).

بەیزاوی دەڵێت: هوود كوڕی عەبدوڵلا كوڕی ڕەباح كوڕی ئەلخەلوود كوڕی عاد كوڕی عووص كوڕی أرم (ئارام؟) كوڕی سام كوڕی نووحە، وتراویشە هوود كوڕی شالح كوڕی ئەرفەخشەد كوڕی سام كوڕی نووح.. ئینجا حیكایەتێك نەقڵ دەكات كە ئەوانە بتیان دەپەرستو هوودیان بەدرۆخستەوەو سێ ساڵ بارانیان لێ گیرا وخودا سێ هەوری نارد" سپییەكو سووریكو ڕەشێك، كەسێكیش لە ئاسمانەوە هاواری بۆ یەكێك لە گەورەكانیان كرد كە ناوی (قیل بن عثر) بوو: هەڵبژێرە بۆ خۆتو قەومەكەت ئەویش وتی ڕەشەكەم هەڵبژارد.. تا كۆتایی ئەو چیرۆكە بێ سەروبنە (بەیزاوی ج٣، ص٣١–٣٥)، كە ئەمەی سەرەوە بەشێكی كەمی بوو و بەیزاوی لەوە زیاتری باس كردووە كە عبدالفادی نەقڵی كردووە.[٥٠٠]

عبدالفادی لەسەر ئەو باسانە ناوەستێت بەڵكو ڕەخنەی ئەوە دەگرێت كە تەورات ناوی هیچ پێغەمبەرێكی نەبردووە لەنێوان نووحو ئیبراهیمو ناوی هیچ كەسێك لە نەوەی نووح نابات ناوی عاد بووبێتو باسی سزای باران بڕان بۆ سێ ساڵ ناكات مەگەر لە سەردەمی ئیلیای پێغەمبەر.

هێشتا ئەوەی عبدالفادی نەقڵی كردووە زۆر لەوە كەمترە كە بەیزاوی باسی كردووە بەڵام وا دیارە عەقڵی عبدالفادی ئەوەندە بچووكە حیكایەتەكەی بەیزاویی بەهەند وەرگرتبوو بۆیە ڕەخنەی لێ نەگرتبوو. ئوممەتی ئیسلامیش ئەوەندە كێشەی لەو جۆرە حیكایەتانە تووش بووە بە ڕەخنەیەكی لە جۆری عبدالفادی

---

[٥٠٠] بەپێی ناوی ئەو كەسانەی لە چیرۆكەكە هاتوونو بەپێی باسكردنی چوون بۆ كەعبە سەرچاوەی چیرۆكەكە هی مەسیحیو جوولەكە نییە بەڵكو داهێنانی موسڵمانێكە.

تووشی نەبووە. وەڵامی عبدالفادی بەئاسانی بەوە دەدرێتەوە کە نەبوونی ناوی پێغەمبەرێك لەنێوان نووح‌و ئیبراهیم لە تەورات بەڵگە نییە لەسەر نەبوونی پێغەمبەری وا. سەبارەت بە نەوەی نووحیش‌و قسەکەی عبدالفادی کە هیچ کەسێك لە نەوەی نووح نییە ناوی عاد بێت خودی تەورات لە کوڕەکانی ئارام دەوەستێت کە (عووص) עוּץ یەکێکیانە ئیتر دوای ئەوانە کوڕانی ئەوان ناڵێت ئەمەش ((وتراوە))کەی بەیزاوی دەگرێتەوە کە عاد (باوکی باپیری هوود) کوڕی نووح کوڕی ئارام کوڕی سامە، سەبارەت بە ((وتراوە))کەی تر، واتە هوود کوڕی شالەح کوڕی.. تاد، تەورات یەك کوڕ بۆ شالەح دادەنێت ئەویش عابەر (عەبێر) עֵבֶר (تەکوین ١٠: ٢٤). ئەو ناوانەش جێگەی گومانن‌و هەندێکیان بەدڵنیاییەوە ڕاست نین، بۆ نموونە عیلام‌و ئاشورو ئارام کراونەتە کوڕی سام بەمەرجێك هیچ لەمانە ئەو کۆنە نەبوون وەك سام، وەك پێشتریش باسمان کرد نووسەرانی تەوراتی بەردەستمان گەل‌و ناوچەکانی کاتی خۆیانیان خنیوەتە باسە هەرە کۆنەکان.

سەبارەت بەوەش کە باران بڕان بۆ ماوەی سێ ساڵ تەنها کاتی ئیلیای پێغەمبەر بووە، لە ئینجیلی لوقا سێ ساڵ‌و شەش مانگ بوو (لوقا ٤: ٢٥ و نامەی یەعقووب ٥: ١٧)، سێ ساڵەکەش (یان کەمتر) لە کتێبی یەکەم پادشایانە (باسی باران بڕان لە ١ ملوك ١٧: ١) چونکە باسی باران بارین لە ساڵی سێیەم کراوە (١ملوك ١٨: ١) کە ئەمە دەکات سێ ساڵ یان کەمتر. دیاریشە عبدالفادی زانیویەتی ئەم جیاوازییە لە ماوەکە هەیە بۆیە سەرچاوەی باران بڕانی سەردەمی ئیلیای نەنووسیوە، دەشڵێین (دیارە زانیویەتی)و حوسنی زەنی پێ دەبەین ئەگینا پێشتر بینیمان چۆن ئەو شارەزاییەی لە ئینجیل‌و تەورات نییە.

بەکورتی نە باسەکەی بەیزاوی‌و نە ڕەخنەکەی عبدالفادی هی ئەوە نین کاتیان پێوە بکوژرێن مەگەر بۆ باسکردنی دوو کارەسات: کارەساتی دەستی موفەسیران‌و کارەساتی ڕەخنەگران لە قورئان.

# ٤٤-زولكيفل

((وَإِسْمَاعِيلَ وَإِدْرِيسَ وَذَا الْكِفْلِ كُلٌّ مِّنَ الصَّابِرِينَ – الانبياء: ٨٥)).

((وَاذْكُرْ إِسْمَاعِيلَ وَالْيَسَعَ وَذَا الْكِفْلِ وَكُلٌّ مِّنْ الْأَخْيَارِ – ص: ٤٨)).

عبدالفادی دەڵێت کە تەورات ناوی زولکیفل (ذو الکفل)ی نەهێناوە، قسەکەی بەیزاویش نەقڵ دەکات سەبارەت بە بۆچوونەکان دەربارەی ئەو پێغەمبەرە کە وتراوە سەد پێغەمبەری بەنو ئیسرائیل بۆ لای ئەو هەڵهاتن ئەویش داڵدەی دان‌و کەفیلیان بوو (بەیزاوی، ج ٥، ص٥٠)، کە ئەمە یەکێکە لە دوو تەفسیر بۆ زولکیفل کە هیچ بەڵگەیەکی قورئان‌و فەرموودەی صەحیحیان لەسەر نییەو تەنها قسەن. عبدالفادی بەپاڵ رەخنەکەی کە ئەویش وەکو ئەو قسانە هیچ بایەخێکی نییە، واتە کە ناوەکە لە تەورات نەهاتووە، دەڵێت ئەو کەسەی ئەو سەد پێغەمبەرەی شاردەوە عۆبەدیا (عۆبەدیاهوو، عۆڤەدیاهوو עֹבַדְיָהוּ)، وەزیری پادشا ئاخئاب (ئاخئاڤ) אַחְאָב بوو و کە پیاوێکی لە خوداترس بوو کاتێك شاژن ئیزێبێل (ئیزێڤێل) אִיזֶבֶל پێغەمبەرانی کوشت (١ملوك ١٨: ٣–٤). عبدالفادی باسی تەفسیری خەڵکی تریش بۆ زولکیفل دەکات.

دیاریشە موفەسیرە ئیسلامییەکان باسی عوبەدیایان لە تەورات بیستبوو و کردبوویان بە زولکیفلی قورئان بەحسابی کەفالەتکردن. دیارە لەبەر ئەوەی تەورات وەکو خوداناسێك نەك پێغەمبەرێك باسی کردووە بەیزاوی وتوویەتی ناکۆکی هەبووە کە پێغەمبەر بووە یان نا.

# ٤٥-خەڵکی ڕەس؟!

((وَعَادًا وَثَمُودَ وَأَصْحَابَ الرَّسِّ وَقُرُونًا بَيْنَ ذَلِكَ كَثِيرًا – الفرقان: ٣٨)).

لە باسی خەڵکی (ڕەس) عبدالفادی قسەی بەیزاوی دەهێنێتەوە کە چەند بۆچوونێك لەبارەیانەوە هەیە، ئێمەش تەنها بۆ ئەوەی خوێنەر بێبایەخیی ئەو قسانە بزانێت کە بێبەڵگە هاتوون خۆشمانو خوێنەریش پێیانەوە سەرقاڵ دەکەین: خەڵکی ڕەس بتیان دەپەرست خوداش (شوعەیب)ی بۆ ناردن ئەوانیش بەدرۆزنیان زانی. کاتێکیش لەدەوری ڕەس بوون کە بیرێکی بینانەکراوە[501] ڕۆچوو و خۆشیانو خانووەکانیان نغرۆ بوون، وتراویشە ڕەس شارێکی لای (یەمامە)یە پاشماوەی (ثەموود)ی لێ بوون خودا پێغەمبەرێکی بۆ ناردن... وتراش ڕەس خەندەکە، وتراویشە ڕەس بیرێك بوو لە ئەنتاکیا حەبیبی دارتاشیان تێی کوشتبوو. وتراویشە ئەوانە خەڵکی حەنزەلە کوڕی سەفوانی پێغەمبەر بوون خودا بە باڵندەیەك تاقیی کردنەوە کە هەموو ڕەنگێکی لەخۆ گرتبوو و ناویان نابوو عەنقا لەبەر ئەوەی ملی درێژ بوو، لە کێوەکەی ئەوانیش دەژیا و منداڵەکان ئەو خەڵکەی دەفڕاند ئیتر حەنزەلە دوعای لێکردو بروسکەیەك لێیدا، پاشان خەڵکەکە حەنزەلەیان کوشت بۆیە لەناوچوون، وتراویشە خەڵکێکن پێغەمبەرەکەیان بەدرۆخستەوەو خستیانە ناو بیرێك (بەیزاوی، ج٤، ص ٢١٨)[502]. پاش نەقڵکردنی ئەو وڕێنانەش کە تەنها ئیسلامیان پێ لەکەدار دەبێت عبدالفادی دەپرسێت ئەو ڕەسە چییە؟ لە چ وڵاتێکە؟ چ کاتێکە؟ بۆچی قورئان ئەمەی بۆ ڕوون نەکردینەوە ئەگەر ئەو ڕەسە ئەسڵەن هەبێت؟

---

[501] لە لسان العرب، ج١٩، ص ١٦٤١ واتایەکی رەس: بیرێکی کۆن.

[502] بۆ ئەمانە و تەفسیری تر بڕوانە تەفسیر ابن کثیر، ج٦، ص١١١ کە ئەو قسە بێبەڵگانە لێرەش بەردەوام دەبن.

پێویستیش ناکات خوێنەر زۆر زیرەك بێت بۆ ئەوەی بزانێت ئەمە تەنانەت ڕەخنە نییە چونکە کاتێك قورئان باسی ئەوەی کردووە گرنگ شوێنەکەو کاتەکە نەبووە بەڵکو وانەکە بوو سەبارەت بە پێغەمبەرانو خەڵکەکەیانو ئاکامی ئەو خەڵکانەی پێغەمبەرانیان بەدرۆخستۆتەوە. هەڵبەت ڕەخنەگری وا ئاگای لەوە نییە کە لە تەورات ناوی شوێنی وای هەن کە ڕوون نەکراونەتەوەو ڕوونکردنەوەی شوێنەکان هێندەی خودی باسەکان گرنگ نییە، یەك لەوانە وڵاتی عووص کە عبدالفادی لەبارەی ئەییووبەوە باسی کردووەو شوێنەکەی دیار نییەو ئەو بەدڵنیاییەوە دەڵێت لە وڵاتی عەرەب بووە.

## ٤٦–تەنانەت لوقمانیش پێغەمبەرە!

((وَلَقَدْ آتَيْنَا لُقْمَانَ الْحِكْمَةَ أَنِ اشْكُرْ لِلَّهِ وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ * وَإِذْ قَالَ لُقْمَانُ لِابْنِهِ وَهُوَ يَعِظُهُ يَا بُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ– لقمان: ١٢–١٣)).

عبدالفادی قسەی بەیزاوی دەهێنێتەوە کە لوقمان کوڕی باعوراء لە نەوەی ئازەر خوشکەزای ئەییووبە یان پووری (؟)و تا سەردەمی داوود ژیاو علمی لێ وەرگرت..تاد. عبدالفادی دەڵێت: چۆن ئەم لوقمانە پێغەمبەرە؟ چۆنیش بەیزاوی دەڵێت هاوچەرخی ئەییووبو داوودە لەکاتێك لەنێوان ئەم دوانە ٩٠٠ ساڵ هەن؟ وڵاتی (عووص)یش لەکوێ کە ئەییووب لەوێ ژیابوو و وڵاتی فەلەستین لە کوێ کە داوود لەوێ ژیابوو؟ (قسەی عبدالفادی تەواو).

سەبارەت بە سەردەمی ئەییووبو وڵاتی عووص هیچ شتێکی دڵنیاکەرەوە نییە لەبارەیانەوە، هەر بۆیەش ناتوانین بزانین لەنێوان داوودو ئەییووب چەند ساڵ بووەو ئەمەمان پێشتر باس کردبوو. بەڵام ئەمە گرنگ نییە چونکە لەسەر نەزانی بنیاتنراوەو ئەوەی گرنگە ئەوەیە نە قسەی زانایانو نە قسەی بەیزاویی موفەسیر

بەڵگەن بۆ ئەو باسانەی کە دەقێکی قورئان یان فەرموودەی صەحیحیان لەبارەوە نەهاتووە، بۆیە قسەکەی بەیزاوی کە لوقمان کوڕی کێی بووە وەکو نەبوو وایەو وەك پێشتر وتبوومان عبدالفادی شەڕی لەگەڵ کەڤ دەریا کردووە. تەنها یەك شتی دڵنیاکەرەوە لە دەقەکان هەیە ئەویش هەبوونی لوقمانە کە ئاشکرا نییە پێغەمبەر بووە یان وەك بەیزاوی ئاماژەی بۆ کردووە کە زۆریی زانایان لەسەر ئەوەن کە دانا بووە نەك پێغەمبەر(بەیزاوی، ج٤، ص٣٤٦).

## ٤٧-ئەسکەندەری گەورە پێغەمبەرە؟

((حَتَّى إِذَا بَلَغَ مَغْرِبَ الشَّمْسِ وَجَدَهَا تَغْرُبُ فِي عَيْنٍ حَمِئَةٍ وَوَجَدَ عِندَهَا قَوْمًا قُلْنَا يَا ذَا الْقَرْنَيْنِ إِمَّا أَن تُعَذِّبَ وَإِمَّا أَن تَتَّخِذَ فِيهِمْ حُسْنًا * قَالَ أَمَّا مَن ظَلَمَ فَسَوْفَ نُعَذِّبُهُ ثُمَّ يُرَدُّ إِلَى رَبِّهِ فَيُعَذِّبُهُ عَذَابًا نُّكْرًا -الكهف: ٨٦-٨٧)).

عبدالفادی قسەی بەیزاوی‌و ئیبنو هیشام نەقڵ دەکات کە زولقەرنەین ئیسکەندەری گەورە بوو، پاشان قسەی بەیزاوی کە زولقەرنەین ئیسکەندەری ڕۆمی بوو کە پادشای فارس‌و ڕۆم بوو، وتراویشە پادشای ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوا بوو بۆیەش پێی وترا زولقەرنەین.. بەیزاوی ژمارەی قسەی تر لەسەر زولقەرنەین دەهێنێتەوە کە بێ بێبناغەو بەڵگەن. پاشان دەڵێت ناکۆکی هەبووە کە ئایا زولقەرنەین پێغەمبەر بووە یان نا بەڵام زاناکان ڕێکەن کە باوەڕدارو چاکەکار بوو (بەیزاوی، ج٣، ص ٥١٩).

عبدالفادی دەڵێت چۆن خودا ئەسکەندەری بتپەرست دەکاتە پێغەمبەر؟ ئەم قسەیەش لە قسەکانی ناو تەفسیرەکەی بەیزاوی بێماناترە چونکە قورئان نەیوتووە زولقەرنەین ئەسکەندەر بوو. بەیزاوی تەنانەت نەشیزانیوە ئەسکەندەر ڕۆمایی نەبووە بەڵکو مەکدۆنی بووەو یۆنانییەکانی لە پرۆژە فراوانکارییەکانی خۆی بەشدار کردبوو. عبدالفادیش هەڵە دەکات‌و دەڵێت یۆنانی بوو. موفەسیری

تر وەکو ئیبنو کەثیر زانیویانە کە ئەسکەندەر زولقەڕنەین نەبوو بەڵام ئـەو هێشـتا قسەی کەسانی تر نەقڵ دەکات کە زولقەڕنەین لە سەردەمی ئیبراهیمـی پێغەمبـەر بووە[٥٠٣].

قسەکانی تری عبدالفادیش سەبارەت بەوەی گوایە خـۆر لـە بیرێك ئـاوا دەبـوو لـە پرسیارە جوگرافییەکان باس کراوە، بەڵام لێرە دەپرسـێت: خـۆر بـەدەوری زەوی دەخولێتـــەوە یـــان زەوی بـــەدەوری خـــۆر دەخولێتـــەوە؟ هـــەروەها باســـی بەربەستەکەی ئەسکەندەر دەکات کە شـوێنەواری نییـە. ئـەم ڕەخنەیـەش کاتێك ڕاستە ئەگەر وێنەی لەم جۆرەمان بۆ ئەو بەربەسـتە هـەبێت: دیـوارێکی سـتوونیی تەواو بێتو زۆر درێژ بێتو لەو کاتەوە تا ئێستا کەشوهەوا هیچـی لـێ نـەکردبێت، بەڵام بێگومان ئەو وێنەیە خەیاڵییەو دەتـوانین وێنەیـەکی واقعـیتری بـۆ بکێشـین: مـــەرج نییـــە ســـتوونی بێـــت بـــەڵکو ئەوەنـــدە بەســـە گۆشـــەیەکی لەگـــەڵ زەوی دروستکردبێت کە سەرکەوتن بەسەری زەحمـەت بێـت، زۆریـش بـەرز بـوو، ئەگـەر لـەدەمی گەلییـەکی تەسـکیش بێـت پێویسـت ناکـات درێـژ بێـت تـا بـە زەقـی دەربکەوێت، لەو کاتەشەوە تا ئێستا کەشوهەوا دەسـتکاریی کـردووەو وەکـو دوو کێوەکـەی دوو لاتەنیشـتی لـێ کردبێـت، دارمـانی دوو کێوەکـەش ژێرەکـەیانی پڕکردووە لە بەردو خۆڵ.. تاد. وێنەی لەم جۆرە ئاساییە بۆ ئەوانەی دەزانن چۆن زەمـەنو کەشـوهەوا کـار دەکەنـە سـەر شـوێنەوارەکانی دەسـتکردی مـرۆڤ و دەیانشارنەوە یان بەشێکیان دەشارنەوە، بـەڵام عـەقڵی چەقبەسـتوو لەسـەر ئـەو وێنەیـەی یەکـەم جـار دروسـت بـووە چەقدەبەسـتێت. کەواتـە ڕەخنەکـە لەسـەر بناغەی وێنەیەکی خەیاڵی کراوە.

---

[٥٠٣] تفسیر ابن کثیر، ج٥، ص١٨٩

# وتەیەك بۆ كۆتـایی

وەك بینیمان ڕەخنەی كورتو بێبەڵگە یان بەڵگەلاوازەكانی عبـدالفادی چـەند بایــەخیان هەیــە ئــەویش كاتێــك ئــەو ڕەخنانــە دەخەینــە بــەر تیشــكی سەرچاوەكانو زانیاریی بەڵگەدار، ئەوەش بەمەرجێك هێشتا ئەو وەڵامانە بـە كورت دەزانین‌و هێشتا بەحـەزی دڵـی خۆمـان سەرچـاوەمان بەكارنـەهێناوە. لەمەشــەوە خوێنــەر دەزانێــت چــەند بێبایــەخن ئــەو جــۆرە ڕەخنانــەی لــە كتێبــەكانو لــە ئینتــەرنێت بڵاوبوونەتــەوەو تاكــە خــاڵی بــەهێزیان ئەوەیــە ڕوودەكەنە خوێنەرێك ئاگای لە هیچ شتێك لەو باسانە نییە.

بەڵام وەنەبێت ئەو ڕەخنانەی كە بەڕواڵەت زانستین‌و ئەو ڕەخنانەی پشت بە سەرچاوە دەبەسـتن حاڵیـان لەوانـەی عبـدالفادی باشـتر بێـت، بـەڵكو ڕەنگـە موبالەغە نەبێت ئەگەر بڵێین ئەوانەی عبدالفادیو ئەوانەی ڕواڵەتیان ڕەخنەی زانستین یەك ئاستیان هەیە.. بۆچی؟ چونكە بناغەی هەردووكیان یەك شـتە، هەردووكیان هەمان قسەیان هەیە بەڵام هاوشـێوەكانی ئـەوەی عبـدالفادی بـە ڕسـتەی كـورتو بـێ سەرچـاوە بـاس دەكـرێن، ئەوانــەی تـریش درێـژترو بەپشتبەسـتن بـە سەرچـاوەوە بـاس دەكـرێن. بناغـەی ڕەخنـەكان یەكـە، كرۆكیشیان یەكـە، ئەوەنـدە هەیـە ئەوانـەی ڕەخنـەكانیان بـە سەرچـاوە پـڕ دەكەنو گوایە بە زمانو مەنهـەجێكی زانسـتی قسـە دەكـەن. كـاتێكیش لـەو سەرچاوانە دەكۆڵیتەوە دەبینی سەرچاوەكان باسی شـتێك دەكـەن دەچـێتە خانـەی ئیحتیمـال نـەك دڵنیـایی، ئـەو كەسـانەش كـە نـاوی ئـەو سەرچـاوانە دەنووسن موناقەشەكانی ئەو سەرچاوانە دەكەنـە زانیـاریی ئەكید. بەشـێكی تری سەرچاوەكانیشیان زانیاریی تریان لەخۆگرتووە كە پەیوەندییان نییە بـە ئەسڵی بابەتەكە یان پەیوەندییەكی لاوازیان هەیەو ئەمان وەكـو چاوبەسـتێك

لە خوێنەر ناویان دەنووسن وەك چۆن پشتگیریی بۆچوونەکانیان دەکەن. بەم شێوەیەش ئەوانەی لەڕێگەی ڕیزکردنی سەرچاوەوە چاوبەست لە خوێنەر دەکەن وەکو ئەکرۆباتەکانی سێرك دێنە بەرچاو لەکاتێك کەسانی وەکو عبدالفادی وەکو موهەرریجی ئەو سێرکە دەردەکەون.

ئەوانەی یەکەم ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بە خوێنەر دەڵێن: لێکۆڵینەوەکەمان زانستییەو پڕ سەرچاوەیە، بەڵام ئەو زانیارییانەی ئەوان دەیانڵێن دەریایەکی گومانو گێژاوێکن لە شتە نائەکیدەکان وەك چۆن بەشێك لەو گومانو نائەکیدییەمان لەم کتێبە بینی. گومان گەیشتۆتە ئەوەی نەك تەنها کتێبەکانی ئەهلی کیتابو خاوەنەکانیانو باسەکانیان بگرێتەوە بەڵکو گومان لە خودی ئەو کەسانە بکرێت کە ئەو کتێبانە باسیان دەکەن. وەك باسیشمان کرد گومان تەنانەت لە هەبوونی مەسیح هەبووەو مەسیحییەکان پێویستیان بەوە بوو بە بەڵگە بیسەلمێنن کە مەسیح هەبووە. گومان لەوانی تریش هەیە وەك مووساو ئیبراهیمو نووحو باقی پێغەمبەران. ئەوان، وەکو موسڵمانەکان، پێویستیان بە باوەڕە بۆ سەلماندنی هەبوونی ئەو کەسانە. موسڵمانو مەسیحیو جوولەکە باوەڕ دەکەن ئەو کەسانە هەبوون لەبەر ئەوەی خودا باسی ئەوانەی کردووە، بەڵام کە بەڵگەکە باوەڕ بێت چۆن جوولەکەیەك دەتوانێت غەیری خۆی قەناعەت پێبکات کە مووسا کەسێکی ڕاستەقینە بوو نەك پاڵەوانی چیرۆکێکی خەیاڵی؟ مەسیحییەك چۆن دەتوانێت بۆ غەیری خۆی بیسەلمێنێت مەسیح هەبووە چ جای ئەوەی لەخاچدراو دوای سێ ڕۆژ هەڵسایەوەو بووە فیداکار؟

موسڵمان دوورترین کەسە لەو گێژاوە چونکە مێژووەکەی نزیکەو باسی پێغەمبەرەکەی دەماودەمو بێ پچڕان، بەپاڵ نووسراو، پێی گەیشتووە. مێژووی پێغەمبەری ئیسلام وەکو ئێستایەکی لێ هاتووە نەك مێژوویەکی

دوور. کتێبەکەی ئیسلام، کە لە کاتی پێغەمبەرەوە تا ئێستا کەسانێکی زۆر هەبوون لەبەریان بوو، باسی ئەو ڕووداوانەو ئەو پێغەمبەرانە دەکات کەواتە بۆ موسڵمانێك باوەڕی پێی بێت گومان لەو ڕووداوەو لە هەبوونی ئەو پێغەمبەرانە نییە، تەنها ئەو کێشەیەش دەمێنێتەوە کە چۆن قەناعەت بە غەیری خۆی بکات کە ئەوانە ڕاستن، بەڵام ئەمەیان تەنها یەك کێشەیە لەکاتێك کێشەی جوولەکەو مەسیحییەکان دوانن: خەڵکی تر باوەڕیان نییە بە باسەکانیان، خۆشیان ناتوانن بەڵگەیەکی بێگومان لەسەر دروستیی نەقڵکردنی کتێبەکانیان پێشکەش بکەن.

بەڵام ئەو نەقڵکردنە بێپچڕانەی قورئان بە تەفسیری موفەسیران تێکدرا، تەفسیر پڕ کرا لە قسەی بێبناغەو لەو قسانەی لە کتێبەکانی جوولەکەو مەسیحی وەرگیراون‌و هەندێکیان بوونەتە ڕاستی، وەك ناوی نەمروود، پادشاکەی کاتی ئیبراهیم، کە وابزانین وای لێهاتووە کەس گومانی لە ڕاستیی ئەو ناوە نییە. بەم جۆرەش موفەسیران ئەو گێژاوەیان بۆ نەقڵکردین کە ئەهلی کیتاب تێیکەوتبوون.. با ئەمەیان بۆ لێکۆڵینەوەیەکی داهاتوو بێت.

## سەرچاوە


١. قورئانی پیرۆز.

٢. صحيح البخاري، النسخة اليونينية (الطبعة السلطانية)، اشراف محمد بن زهير بن ناصر الناصر،ط١، دار طوق النجاة،بيروت، ١٤٢٢.

٣. صحيح مسلم، ط١، دار طيبة،الرياض، ١٤٢٧-٢٠٠٦.

٤. ژمارەیەك لە وەرگێڕانەكانی پەیمانی كۆن‌و پەیمانی نوێ(چاپكراو و ئەلكترۆنی).

٥. ابن كثير، ابو الفداء اسماعيل بن عمر، تفسير ابن كثير (تفسير القران العظيم)، تحقيق سامي بن محمد السلامة،ط٢، دار طيبة،١٤٢٠-١٩٩٩.

٦. الطبري، محمد بن جرير، تفسير الطبري (جامع البيان في تفسير القران)، طبعة دار المعارف، نسخة الكترونية.

٧. القرطبي، محمد بن أحمد بي ابي بكر، تفسير القرطبي (الجامع لاحكام القران)، تحقيق: د. عبدالله بن عبدالمحسن التركي واخران، ط١، دار الرسالة، ١٤٢٧-٢٠٠٦.

٨. البغوي، ابو محمد الحسين بن مسعود، تفسير البغوي (معالم التنزيل)، تحقيق وتخريج الاحاديث: محمد عبدالله النمر واخران، دار طيبة، ١٤١١.

٩. الشوكاني، محمد بن علي بن محمد، فتح القدير، الجامع بين فني الرواية والدراية، دار الفكر، بيروت (المكتبة الشاملة، مرقمة بالتوافق مع المطبوع).

١٠. الرازي، فخرالدين محمد بن ضياء الدين عمر، تفسير الفخر الرازي (التفسير الكبير، مفاتيح الغيب)، ط١، دار الفكر، ١٤٠١-١٩٨١.

١١. الطباطبائي، محمد حسين، الميزان في تفسير القران، ط١ المحققة، مؤسسة الاعلمي، بيروت، ١٤١٧-١٩٩٧.

١٢. المزي، الحافظ جمال الدين ابو الحجاج يوسف، تهذيب الكمال في اسماء الرجال، تحقيق وتعليق د. بشار عواد معروف، ط١، مؤسسة الرسالة، ١٤١٣–١٩٩٢.

١٣. البرزنجي، محمد بن طاهر، تاريخ الطبري، تحقيق، دار ابن كثير، دمشق، بيروت، ١٤٢٨–٢٠٠٧.

١٤. الثعلبي، ابو اسحاق احمد بن محمد بن ابراهيم النيسابوري، قصص الانبياء (عرائس المجالس)، مطبع الحيدري، ١٢٩٤.

١٥. محمد ناصرالدين الالباني، سلسلة الاحاديث الضعيفة والموضوعة واثرها السئ في الامة، الطبعة الاولى للطبعة الجديدة، مكتبة المعارف، الرياض، ١٤١٢–١٩٩٢.

١٦. الدويش، عبدالله بن محمد بن احمد، المورد الزلال في التنبيه على اخطاء الظلال، ط ١، دار العليان، ١٤١١–١٩٩٠.

١٧. الفالوجي الاثري، اكرم بن محمد زيادة، معجم شيوخ الطبري، ط١، الدار الاثرية، دار ابن عفان، ١٤٢٦–٢٠٠٥.

١٨. الطرزي، الدكتور ابراهيم سالم، ابوكريفا العهد الجديد، تجميع لكتابات الابوكريفا المسيحية الكتاب الاول، اناجيل الابوكريفا المخفية، الجزء الاول، ط ١، ٢٠٠١.

١٩. الطرزي، الدكتور ابراهيم سالم، ابوكريفا العهد الجديد، تجميع لكتابات الابوكريفا المسيحية الكتاب الثاني، اناجيل الخدمة و الحكمة الغنوسية لمكتبة نجع حمادي، ط ١، ٢٠٠٥.

٢٠. الطرزي، الدكتور ابراهيم سالم، ابوكريفا العهد الجديد، تجميع لكتابات الابوكريفا المسيحية الكتاب الثالث، ...الاناجيل السرية و مكتبة نجع حمادي، ط ١، ٢٠٠٧

٢١. القس عبد المسيح بسيط أبوالخير، أبوكريفا العهد الجديد، كيف كتبت؟ ولماذا رفضتها الكنيسة؟ الجزء الأول: الكتب المُسماه بأناجيل الطفولة والآلام، ط١، ٢٠٠٧

٢٢. نخبة من الأساتذة ، قاموس الكتاب المقدس، نسخة الكترونية، د.ت.

٢٣. ستيفن م. ميلر، روبرت ف. هوبر، تاريخ الكتاب المقدس منذ التكوين وحتى اليوم، ت. وليم وهبة، مجدي وهبة، ط١، دار الثقافة، القاهرة، ٢٠٠٨.

٢٤. جيمس هنري بريستد، تاريخ مصر من اقدم العصور حتى الفتح الفارسي، ت. الدكتور حسن كمال، ط٢، مكتبة مدبولي، القاهرة، ١٩٩٦ (الاصل الانكليزى: ١٩٠٥).

٢٥. كينيث كيتشن، رمسيس الثاني، فرعون المجد والانتصار، ت. د. احمد زهير امين، الهيئة العامة المصرية للكتاب، ١٩٩٧.

٢٦. ف.زاماروفسكي، اصحاب الجلالة–الاهرامات، ترجمة د. هاشم حمادي، دار السوسن، دار الكلمة، دمشق، ١٩٩٩.

٢٧. د.سمير اديب، موسوعة الحضارة المصرية القديمة، ط١، العربي، القاهرة، ٢٠٠٠.

٢٨. انجيل برنابا، ت. خليل سعادة، ط١، مطبعة المنار، القاهرة، ١٩٠٧.

٢٩. القس الدكتور حنا جرجس الخضري، تاريخ الفكر المسيحي، يسوع المسيح عبر الاجيال، القاهرة، دار الثقافة، ١٩٨١.

٣٠. ابن منظور، جمال الدين محمد بن مكرم بن علي، لسان العرب، دار المعارف، القاهرة، د.ت.

٣١. د. علي حسني الخربوطلي، تاريخ الكعبة، ط٣، دار الجيل، بيروت، ١٩٩١.

٣٢. د. طه حسين، في الشعر الجاهلي (الاصل )، نسخة الكترونية.

٣٣. د. فاضل عبدالواحد علي، من الواح سومر الى التوراة، ط١، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، ١٩٨٩.

٣٤.طه باقر، مقدمة في ادب العراق القديم، دار الحرية، بغداد، ١٩٧٦.

1. Badre, Leila, *Tell Kazel-Simyra: A Contribution to a Relative Chronological History in the Eastern Mediterranean during the Late Bronze Age*, Bulletin of the American Schools of Oriental Research (BASOR), 343, Aug. 2006.

2. Bard, Kathryn A. (*editor*), Encyclopedia of the Archaeology of Ancient Egypt, Taylor & Francis e-Library, 2005.

3. Beattie, D.R.G., McNamara, M.J. (*editors*), Targums in their Historical Context, Sheffield Academic Press, 1994.

4. The Book of Jasher Referred to in Joshua and Second Samuel, New York, 1840.

5. Breasted, James Henry, Ancient Records of Egypt, Historical Documents from the Earliest Times to the Persian Conquest, vols. II-III, Chicago, 1906.

6. Bruce, F.F., *And the Earth was without Form and Void, An Enquiry into the exact Meaning of Genesis 1, 2*, in; Journal of the Transactions of the Victoria Institute, 78, 1946, pp.21-37.

7. Bryce, Trevor, Letters Of The Great Kings Of The Ancient Near East, The Royal Correspondence of the Late Bronze Age, Taylor & Francis e-Library, 2005.

8. Butel, Paul, The Atlantic, Seas in History Series, transl. by Iain Hamilton Grant, London, New York.

9. Carrier, Richard, *Thallus and the Darkness at Christ's Death*, Journal of Greco-Roman Christianity and Judaism, 8, 2011-2012, pp.185-191.

10. **Cheyne, T. K., Black, J. Sutherland (*editors*), Encyclopædia Biblica, A Critical Dictionary of the Literary Political and Religious History, The Archaeology Geography and Natural History of the Bible, Vols. I-IV, New York, 1899-1903.**

11. **Epstein, Rabbi I. (*editor*), The Soncino Babylonian Talmud (E-Book).**

12. **Etheridge, J. W., The Targums of Onkelos and Jonathan Ben Uzziel on the Pentateuch with the Fragments of the Jerusalem Targum from the Chaldee, Genesis and Exodus, London, 1862.**

13. **Etheridge, J. W., The Targums of Onkelos and Jonathan Ben Uzziel on the Pentateuch with the Fragments of the Jerusalem Targum from the Chaldee, Leviticus, Numbers, and Deuteronomy, London, 1865.**

14. **Fitzgerald, Madeleine A., The Rulers of Larsa, A Dissertation presented to the Faculty of the Graduate School of Yale University in Candidacy for the Degree of Doctor of Philosophy, 2002.**

15. **Hammond, Nicholas Geoffrey Lemprière, The Cambridge ancient history, III, Part 2, Empires and other States of the Near East, from the eighth to the sixth Centuries B.C., Volume 3, 1991.**

16. **James, M. R. (*translator*), Testament of Job, the Blameless, the Sacrifice, the Conqueror in many Contests (*e-article*).**

17. **Josephus, Flavius, The Antiquities of the Jews, Translated by William Whiston, (e-book).**

18. **Knudtzon, J. A., Die El-Amarna Taflen mit Einleitung und Erlaeuterungen, Leipzig, 1915.**

19. **Luckenbill, Daniel David Ancient Records of Assyria and Babylonia, vol. II, Chicago, 1927.**

20. **Petrovich, Douglas, Amenhotep II and the Historicity of the Exodus-Pharaoh, The Master's Seminary Journal, 17/1 (Spring 2006) pp.81-110.**

21. **Pritchard, James B. (*editor*), Ancient Near Eastern Texts relating to the Old Testament (ANET), 3rd ed., Princeton, 1969.**

22. **Ragg, Lonsdale and Laura, The Gospel of Barnabas, Oxford, 1907.**

23. **Redford, Donald B., (*editor in chief*), Oxford Encyclopedia of Ancient Egypt, Oxford University Press, 2001.**

24. **Reisner, George A., The Harvard Expedition to Samaria Excavations of 1909, in; JSTOR. vol. 3, No. 2, April, 1910.**

25. **Reisner, George A., C. S. Fisher, D. G. Lyon, Harvard Excavations at Samaria, 1908-1910, vol. 1, Cambridge, Harvard University Press, 1924.**

26. **Rodkinson, Michael L. (*translator*), The Babylonian Talmud, 1918 (E-Book).**

27. **Schodde, George H., The Book of Jubilees, Translated from the Ethiopic, Oberlin, Ohio, 1888.**

28. **Selin, Helaine (*editor*), Encyclopaedia of the History of Science, Technology, and Medicine in Non-Western Cultures, 2nd edition, Springer , 2008 (E-Version).**

29. **Shaw, Ian, Paul Nicholson, The British Museum Dictionary of Ancient Egypt, The American University in Cairo press, 1997.**

30. **Skolnik, Fred (*editor in chief*), Encyclopaedia Judaica, 2nd Edition, Keter Publishing House, 2007.**

31. **Streane, A. W., A Translation of The Treatise Chagigah from The Babylonian Talmud, Cambridge, 1891.**

32. **Tacitus, Publius, The Annals of Tacitus, Translated by A. J. Church, W. J. Brodribb, London, 1906.**

33. **Töyrylä, Hannu, Slimy Stones and Philosophy: Interpretations of tohu wa-vohu as Matter and Form, 2000 (*e-article*.)**

34. **Wisse, Maarten, Scripture between Identity and Creativity, A Hermeneutical Theory Building upon four Interpretations of Job (*e-book*).**

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## پێشەکی

نەیارانی ئیسلام بە گشتی و گاورەکان بەتایبەتی هەر لەسەرەتای هاتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە تا ئەم ساتە وەختە بە هەموو شێوازێك دژایەتی ئیسلامیان کردووەو بۆ ئەم مەبەستەش دژایەتی کردنی قورئان لەیەکەمایەتی کارەکەیاندا بووە، چونکە ئەو راستیانەیان زانیوە کە قورئان گەورەترین کاریگەری لە سەر دڵ و دەروون و هەست و نەست و ژیانی مسوڵمانان هەیە، و نهێنی هێزو توانای مسوڵمانان بەهۆی پابەند بوونیانەوەیە بەقورئانەوە، ئەمەو قورئان تاکە کتێبی خوایە، کەوەك خۆی ماوەتەوەو دەستکاری نەکراوە.

هەر خوێندنەوەی قورئان و گوێلێگرتن و توێژینەوەی بۆتە مایەی مسوڵمان بوونی ژمارەیەکی زۆری خەڵکی نامسوڵمان.

دژایەتی ئیسلام و پەیامە پاك و بێگەردەکەی هۆکاری خۆی هەیەو، چونکە تاکە ئایینە سەرەڕای هەموو ئاستەنگ و بەربەستەکان بەردەوام لەگەشەکردن و بڵاو بونەوەدایە، ئەوەتا راپۆرتی رێکخراوی لێبووردەیی ئایینی)لەکەنەدا ئاماژە بەوە دەکات ئایینی ئیسلام تاکە ئایینە کەبەردەوام ژمارەی شوێنکەوتوانی لەهەڵکشان و زیادبووندان، و لەکاتێکدا بەردەوام ژمارەی گاورەکان لەکەمبوونەوەدان. بەپێی ئاماری تازەی مەوسوعەی جیهانی ویکیبیدیا ژمارەی مسوڵمانان لەجیهاندا گەشتۆتە (١٥٢٠٠٠٠٠٠٠) ملیارێك و پێنج سەدو بیست ملیۆن کەس، ئەمەش دەگاتەرێژەی لە ٢٣،٦ ٪ کۆی دانیشتوانی جیهان، رێکخراوی لێبووردەیی ئایینی پێشبینی دەکات ئیسلام ببێتە ئایینی پلە یەك پێش هاتنی ساڵی ٢٠٢٣.

هەربۆیە بەردەوام هێرش دەکرێتە سەر ئیسلام و هەوڵی دوورخستنەوەی خەڵکی لێدەدرێت و لەبەرچاوی گەلان ناشیرین دەکرێت، بۆ ئەم مەبەستە

بەردەوام کۆنگرەو کۆنفرانس دەبەسترێت، و ملیارەها دۆلار خەرج دەکرێت بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجە قێزەونە.

خوای گەورەش لەقورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی (إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا يُنْفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ لِيَصُدُّوا عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ وَالَّذِينَ كَفَرُوا إِلَى جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ) الانفال ٣٦.

بەواتای: بێگومان ئەوانەی بێباوەڕن، ماڵ و سامانی خۆیان بەخت دەکەن بۆ ئەوەی بەشێنەیی بەربەست دانێن و ڕێگری بکەن لەبەردەم ئایین و ڕێبازی خوادا، جاماڵ و سامانیان لەئاییندەدا بۆ ئەم مەبەستە خەرج دەکەن! پاشان دەبێتەپەشیمانی و حەسرەت لەسەریان، لەدوایدا شکست دەهێنن، بێگومان ئەوانەش کە بێباوەڕبوون بۆ دۆزەخ کۆدەکرێنەوەو راپێچ دەکرێن. تەفسیری ئاسان لاپەڕە ١٨١ .

هەروەها فەرمویەتی: (يُرِيدُونَ أَنْ يُطْفِئُوا نُورَ اللَّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَيَأْبَى اللَّهُ إِلآ أَنْ يُتِمَّ نُورَهُ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ) التوبة ٣٢.

بەواتای: دەیانەوێت نورو ئایینی خوا بەقاڵەی دەمیان بکوژێننەوەو خامۆشی بکەن (بەڵام خەیاڵیان خاوە) خوا ناهێڵێت ئاواتیان بێتەدی و هیچ شتێکی تری ناوێت جگە لەوە نەبێت ئایین و نوری خۆی سەربخات ونوری خۆی تەواو بکات و دەری بخات، هەرچەندە کافرو بێباوەڕان پێی سەغڵەت و دڵتەنگ بن. تەفسیری ئاسان لاپەڕە ١٩١.

لێرەدا ئاماژە بە بەسەرهاتێك دەکەین کەراستی وتەکانمان دەسەلمێنێت، سەرۆك وەزیرانی پێشووتری بەریتانیا (ویلیام گلادستۆن) لە ئەنجوومەنی عمومی بەریتانیا، قورئانێکی بەدەستەوەگرت و وتی: ئێمە ناتوانین ئیسلام و مسوڵمانان لەناوبەرین تا سێ شت لەناو نەبەین، نوێژی هەینی، حەج، ئەم کتێبە، یەکێك لەئامادەبوان هەستا تا قورئانەکە بدڕێنێ و لەت و پەتی بکات، ئەویش وتی: گەمژە من ئاوهام ناوێت، من دەمەوێ لەدڵ و هەڵسوکەوتیاندا بیدڕێنین. هەروەها

وتی: مادام ئەم قورئانە لەدەست مسوڵمانانندا بێت ئەوروپا ناتوانێت دەست بەسەر ڕۆژهەڵاتدا بگرێت.

کتێبی ئایا قورئان پارێزراوە؟ لەنووسینی عبدالله فادی، بەشێکی ئەو هەوڵە نەزۆکانەیە کەدژی ئیسلام و قورئانیش وەك سەرچاوەی یەکەمی گیراوەتە بەر، وەرگێڕێکی نادیاریش بەسەقەتی کردویەتی بەکوردی و کۆمەڵێ سەرنج و تێبینی داوە، بەهیوای ئەوەی ڕۆڵەکانی ئەم میللەتە لەدینی هەق و ڕاستی دورخاتەوەو خزمەتێك بەنەیارانی ئیسلام بکات.

بەندەش کەئەرکی وەڵامدانەوەی بەشی حەوتەمی کتێبەکەم پێسپێردرا لەلایەن برایانی بەڕێزی(پرۆژەی تیشك)ەوە، کەتایبەتە بەپرسارە کۆمەڵایەتیەکان، وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارە سواوانە کارێکی ئەوتۆ نیەو بەڵام داواکرا بەکورتی بێت چونکە خوێنەرانی ئەم سەردەمە زیاتر حەز بەکتێب و نامیلکەی قەبارە بچوك دەکەن.

سبحانك اللهم وبحمدك اشهد ان لااله الا انت

یاسین ئەحمەد زەنگەنە

سلێمانی، کانوونی یەکەم ٢٠١٢

## ١ـ بۆچی شایەتی دانی ژن نیوەی شایەتی دانی پیاوە؟!

(فادی) رەخنە لە قورئان دەگرێت بەوەی لە شایەتیداندا جیاوازی کراوە لە نێوان ژن و پیاودا، بەوەی شایەتی دانی ژن، نیوەی شایەتیدانی پیاوە، هەروەك لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە (وَاسْتَشْهِدُوا شَهِيدَيْنِ مِنْ رِجَالِكُمْ فَإِنْ لَمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ مِمَّنْ تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاءِ أَنْ تَضِلَّ إِحْدَاهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الآخْرَى) البقره ٢٨٢. بەواتای: بادوو پیاو لە خۆتان شایەتی لەسەر(قەرزو مامەڵە) بگرن ئینجا ئەگەر دوو پیاو دەست نەکەوتن بۆشایەتی، ئەوا با پیاوێك و دوو ژن بن شایەتیەکە بدەن لەو کەسانەی کە رازین بەشایەتیدانیان، نەوەکو یەکێك لە ئافرەتەکان بیری بچێت با ئەویتریان بیری بهێنێتەوە. (تەفسیری ئاسان لاپەڕە ٤٨)

بەڵام (فادی) ئەم مانا و راستیانانە نازانێت و بۆیە رەخنە لە قورئان دەگرێت و وای دادەنێت ئەمە سوکایەتیکردنە بە ئافرەتان، هەر وەك دەڵێت (ئێمەش پرسیار دەکەین) بڕی ئەو سەرزەنشت و رسوا کردنە چەندە، کە لەم دید و بۆچونە سوکایەتی پێکەرەوە دەردەچێت، کە ئێجگار دوورە لە پرەنسیبەکانی هاوسانی لە کەسێتی مرۆڤایەتیدا ؟ ئایا چەندین لە ژنان وەکو کەسی تاك بونیان نیە، کە زۆر چاکترن لە ژمارەیەکی زۆر لە پیاوانی نەزان ؟)

**لەوەڵامدا دەڵێین:**

ئەو بابەتەی ئایەتەکە فەرمانی شایەتیدانی پێ دەکات بابەتی قەرزە، ئەمەش بابەتێکی دارایی روتەو رێوشوێنی دیاریکراوی خۆی هەیە، پەیوەندی بە مامەڵە و سەودای نێوان خەڵکەوە هەیە، وەك ئاشکرایە ئەم وردەکاریانە زیاتر پەیوەندی بە پیاوانەوە هەیە، ژنانیش زۆرجار بایەخ بەم بابەتانە نادەن و فەرامۆشی دەکەن، چونکە لەگەڵ سروشت و حەز و خولیایاندا یەکناگرێتەوە، بەگشتی گەر داوا لە ژنان بکرێت ئاگاداری ئەو وردەکاریانە بن و لە یادی نەکەن و بیپارێزن ئەوا ناتوانن

بیپارێزن، گەر داوایان لێ بکرێت ئەو وردەکاریانە باس بکەن و رونی بکەنەوە و بیگێڕنەوە ئەوا ناتوانن وەك خۆی بە تەواوی روونی بکەنەوە.

گەر ئافرەتیش بکرێتە شایەت لەم وردەکاریە داراییانەو دواتر داوای شایەتی دانیان لێ بکرێت ئەوا زۆرجار ناتوانن ئەو وردەکاریانە وەك خۆی بخەنە روو، ئەمەش دەبێتە مایەی فەوتانی مافی خەڵکانی دی.

وتەکانی (فادی) هەڵەوناڕاستەو بەو شێوەیە نیە کە ئەو دەرکی پێ کردووە، بابەتەکەش هیچ پەیوەندیەکی بە زوڵم و رق و سوکایەتیکردنەوە نیە و پەیوەندیشی بە چاك دانانی رەگەزی پیاوان بە سەر ئافرەتانەوە نیە، ئەم بابەتە بابەتێکی داراییە و وردەکاری و رێوشوێنی خۆی هەیە.

بە پێیی دیدوبۆچونی ئیسلامی، ژنان یەکسانن بە پیاوان لە مرۆڤایەتیدا، بەڵام هەندێك جیاوازی لە نێوان هەردوو رەگەزدا هەیە، لە پێکهاتەیدا تا بتوانێت پەیامە مرۆڤایەتیەکەی جێبەجێ بکات، هەروەها پیاوانیش خاڵی جیاوازی تایبەتیان هەیە تا پەیامە مرۆڤایەتیەکەی بەدی بێنێت.

کەس نکۆڵی لەوە ناکات هەندێك لە ژنانی باوەڕدارو چاکەکار و خوا پەرست باشترینن لە زۆر لەو پیاوانەی کە خراپ و نا لەبارن، ئەمەو خۆپارێزی و خوا پەرستی بنەمای رێزلێنانە لای خوای گەورە.

هەروەها ئەم شایەتیدانە بۆ بەردەم دادگا نییەو، تایبەتە بە سەوداو مامەڵەی نێوان هاووڵاتیانەوە، کاتێك قەرز دەدەن بەکەسێك، بابینوسنەوە گەر نەیان توانی باشایەت راگرن. لەدادگادا قازی و دادوەر بەپێی سروشتی کێشەکان شایەتیدان قبولێ دەکات، دادوەر لەهەندێ حاڵەتدا تەنها شایەتی ژنان وەردەگرێت لەو کێشەو پرسانەی کەتایبەتن بەئافرەتانەوە،چونکە ئافرەتان لەوبوارانەدا زانیاری و شارەزاییان زیاترە، وەك شیردان، حەیز، سەلماندنی منداڵبوون، لە هەندێ حاڵەتدا شایەتیدانی ژن و پیاو وەك یەك وەردەگیرێت وەك لە(لیعان) و زۆر بابەتی ئایینی گرنگ وەك ریوایەتی فەرمودە، بینینی مانگ....هتد

## ٢ـ بۆچی بەشە میراتی ژن نیوەی بەشە میراتی پیاوە؟

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا فەرمویەتی (يُوصِيكُمْ اللَّهُ فِي أَوْلَآدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ). النساء ١١.

بەواتای: خوا ڕێنموویتان دەكات و فەرمانتان پێ دەدا دەربارەی نەوەكانتان لەبواری میراتی گرتندا(ئەویش ئەوەیە) كەبەشی نێرینەیەكیان بەشی دوو مێینەیانە.

(فادی) دەڵێت (ئایا لەبەرچی كوڕو كچ لە میراتدا هاوسان نەبن ؟ ئایا هەر یەكەیان هەمان جەستەیان نیە، كە پێویستی بە خۆراك و پۆشاك هەیە؟ ئایا پێداویستی ژیان لەسەر هەردوو لایان هەر یەكێك نیە و هەمان شت نیە؟ بەڵكو لەوانەیە داواكاریەكانی ژیان لەسەر كچانی منداڵ یان قەیرە كچ و بێوەژنەكان سەخت و گرانتر بێت)

(فادی) پێشنیار دەكات ژنان و پیاوان لە میراتدا یەكسان بن، بە پاساوی یەكسان بوونیان لە پێداویستی خواردن و خواردنەوەو پۆشاك، وە وای دادەنێت ئافرەت لە پیاو زیاتر پێویستی بەمانەیە، وە وەرگرتنی دوو بەش لە لایەن پیاوەوە بە ستەم و ناڕەوا دەزانێت و بە پێشخستنی پیاوی دادەنا بەسەر ئافرەتەوە.

**لە وەڵامدا دەڵێین:**

پێدانی پیاو دوو هێندەی ئافرەت(لە هەندێك باردا) پەیوەست نیە بە چاكدانانی پیاوەوە، چونكە پیاو چاكتر نیە لە ئافرەت بە هۆی ڕەگەزەوە، چاك نیە لە بەر ئەوەی پیاوە، بەڵكو چاكێتی لای خوای گەورە بە پێیی تەقواو كردەوەكانە، بێ گوێدانە ڕەگەز، ڕەنگ، زمان، تەمەن، ڕەچەڵەك، ماڵ و سامان، پلەوپایە، بەڕێزترین كەس لای خوای گەورە ئەو كەسەیە كە خۆپارێزتر بێت جا ئەو كەسە پیاو بێت یان ژن، دەوڵەمەند یان هەژار، ڕەش یان سپی.... هتد.

هەروەك خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی (إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ) الحجرات ١٣.

بەواتای: بەڕێزترینتان لای خوا ئەو کەسانەتانە کەزۆرتر لە خواترسەو فەرمان بەرداری خوایە، بێگومان خوا زاناوئاگایە بەهەمووان. تەفسیری ئاسان لاپەڕە ٥١٧.

دابەشکردنی میرات لە روانگەی پێداویستەکانی لاشە بۆ خواردن و خواردنەوە و پۆشاک تەماشا ناکرێت، چونکە پیاو و ژن لەوەدا یەکسانن.

کاتێك پیاو دوو هێندەی ئافرەتێکی پێ دەدرێت لە (هەندێك حاڵەتدا) بەهۆی ئەو ئەرك و بەرپرسیاریەتیەوەیە کە پێی سپێردراوە، پیاو بەرپرسە جا لەهەر بارێکی خێزانی و داراییدا بێت، باوك بێت یان هاوسەر، برا بێت یان کوڕ، دەبێتە موعیل و بەخێوکەری ئەو ئافرەتانەی کە لەلایەتی، جا هاوسەری بن یان دایك یان خوشك یان پور دەبێت پێداویستی و خەرجیەکانیان دابین بکات، بەڵام ژنان هیچ لەمانە لە ئەستۆ ناگرن باری دارایی و خێزانیان لەهەر حاڵەتێکدا بێت، هەر کات ئافرەت ویستی لە ماڵی خۆی خەرج بکات ئەوە وەك بەخشش و هاوکاری دێتە ئەژمار کردن، بە واتایەکی تر پیاو بەردەوام دەبێت خەرج بکات و ئافرەتیش بەردەوام وەری دەگرێت.

ئایا هەموو ئەمانە بەڵگەو پاساو نین بۆ ئەوەی پیاوان لەو حاڵەتانەدا دوو هێندەی ژنان وەرگرن لە میراتدا.

ئەمەو ژنان لەچوار حاڵەتدا نیوەی پیاوان وەردەگرن، دووهێندەی ئەم حاڵەتانە وەك پیاوان وەردەگرن، زۆر حاڵەت هەیە زیاتر لە پیاوان وەردەگرن، یان بەش وەردەگرن وپیاوان بێبەشن، ئەمەش بابەتێکی دوور و درێژەو بوار نیە بە درێژی روونی بکەینەوە.

## ٣ـ فرە ژنی

(فادی) ڕەخنە لەو ئایەتە دەگرێ کە فرەژنی حەڵاڵ کردووە، هەروەك خوای گەورە فەرمویەتی (وَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَى فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُمْ مِنَ النِّسَاءِ مَثْنَى وَثُلاَثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ذَلِكَ أَدْنَى أَلاَّ تَعُولُوا) النساء ٣.

بەواتای: ئەگەرترسان لە ئەنجام نەدانی دادپەروەری لەگەڵ کچە بێ باوکەکاندا (ئەگەر بیانکەنە هاوسەرتان، ئەوە واز لەوان بهێنن) ئەوە لەئافرەتانی تر کەحەڵاڵن بۆتان ژن مارە بکەن دوو دوو، یان سیان سیان، یان چوار چوار(ئەڵبەتە لەیەك هاوسەر زیاتر مەرج و بارودۆخی تایبەتی خۆی هەیە) خۆ ئەگەر ترسان لەوەی کەنەتوانن دادپەروەر بن(لەنێوان هاوسەرەکانتاندا) ئەوە بایەك ژن مارە بکەن، یان ئەو کەنیزەکانەی کەهەتانن (کە دیاردەیەکی کاتی بوو، ئیسلام بنەبڕی کرد) ئەوەی باسکرا نزیکترە لەوەی ستەم نەکەن (ئەگەر پەیڕەوی بکەن). تەفسیری ئاسان لاپەڕە ٧٧.

دوای ئەوەی (فادی) پوختەی تەفسیری بەیزاوی سەبارەت بەو بابەتە تۆمارکردووە و ئایاتەکە ڕەتدەکاتەوەو دەڵێت (ئێمەش پرسیار دەکەین: ئایا خێزان خانەیەکی بچوککراوەی کۆمەڵگا نیە؟ وەهەبونی پیاوێك لە نێوان چوار ژن و ژمارەیەکی زۆر کەنیزەکدا شێوەیەکە لە ستەمکاریەکان، وە گۆڕەپانی خەشم و قین و پێکدادانە و کارگەیەکە، کە ژنانی تەڵاقدراو و منداڵانی ئاوارەی بێ تاوان بەرهەم دەهێنێت، وەئەگەر پیاوێك لە هەمان کاتدا چوار ژن یان زیاتری هەبوو، ئایا لەبەر چی ژنانیش  هەوڵ نەدەن لە یەك کاتدا شوو بە چوار پیاو نەکەن؟ ئایا دادپەروەری لەوەدا نیە کە یاسای بنچینەیی پیادە بکەین، کە یەك (حەوا) بۆ یەك (ئادەم) بێت؟).

هەروەها بە (ما) دەربڕنی لەژنان کردووە، کە بۆ نا ئاقڵ بەکاردێت، بەمەبەستی هەنگاونان بۆ پیادەکردنی ئەوبۆ چونەی کەژنان لەبەر ناتەواوی ئەقڵیان رەوتێکی نا ئەقڵانیان هەیە.

**لەوەڵامدا دەڵێین:**

فرەژنی لەپێش ئیسلامدا لەسایەی ئایینە ئاسمانی و دەسکردەکان و لەنێو موشریك و بێباوەڕەکاندا حزووری هەبووە، ئیسلام فرەژنی دا نەهێناوە، بەڵکو رێکی خستۆتەوەو سنووری بۆداناوەو مەرجداری کردووە، تاخراپ بەکار نەهێنرێت.

ئەمەو فرەژنی رێپێدراوێکی مەرجدارە، و واجب نیە لەسەر پیاوان، مەرجدارە بە دادپەروەری پیاو لە نێوان خێزانەکانیدا، گەر دادپەروەر نەبوو، ئەوا گوناهبارە، هەر کاتێك پیاو لە نێوان هاوسەرەکانیدا دادپەروەر بوو، ئەوا هەموو ئەو مەترسیانە نامێنێت و دەڕەوێتەوە کە نەیارانی فرەژنی باسی لێوە دەکەن. بە دادپەروەری لە نێوان هاوسەرەکاندا ماڵ دەبێتە مێرگی ئاشتی و ئارامی وسۆز و خۆشەویستی و منداڵەکانیش بە شێوەیەکی تەندروست و چاك پەروەردە دەبن، لە ژیانی هاوەڵان و دواتریشدا کە چەند ژنێکیان هێناوەو دادپەروەر بوون لە نێوانیاندا، نمونەی جوان و بەرجەستەن.

گەر هەندێك مسوڵمان ئەم رێپێدانی فرە ژنیە بە خراپ بەکاربێنن و زوڵم و ستەم لە هاوسەرە کانیان بکەن، ئەوا بەرامبەر  بە خوای گەورە بەرپرسیارن، خۆشیان دەرەنجامی ستەم و هەڵسوکەوتە خراپەکانیان لە ئەستۆ دەگرن، خوای گەورە کە بواری داوە لە هەمان کاتدا مەرجی دادپەروەری بۆ داناوە.

بەڵام سەبارەت بەوەی کە سونەتی خوای گەوەر ئەوەیە کە پیاو تەنها یەك ژن بهێنێت ئەوە درۆ و بوهتانێکی گەورەیە بەناوی خواوە دەکرێت، سەبارەت بەوەی ئادەم تەنها حەوای مارەکردووە، ئەوە بەڵگەیەکی لاوازە چونکە لەو کاتەدا لە نێو مرۆڤدا تەنها حەوا هەبووە، ئەمەو زۆرێك لە پێغەمبەران سڵاوی خوای گەوەرەیان

لێبێت چەند خێزانێکیان هەبووە، وەك محمد و داود، سولەیمان،.... سڵاوی خوایان لێبێت.

رەخنە گرتنی (فادی) لەم پرسەدا بەڵگەی نەزانی و بێباوەڕییەتی، ئەوەی خوای گەورە حەڵاڵی بکات و رێی پێبدات ئەوا بەرژەوەندی و واقیع بینی و حیکمەت هەر لەوەدایە.

دەپرسین ئایا فرەژنی بۆ ژنان چاکتر و پاکتر و شکۆدارترە بەوەی چەند ئافرەتێك هاوسەری پیاوێك بن بەو مەرجانەی ئاماژەمان پێدا یان فرە دەزگیران و بەناو خۆشەویستان کە سەرتاپای سوکایەتیکردنە بەئافرەت و وەك کاڵایەك تەماشا دەکرێت بۆ تێرکردنی ئارەزووە سێکسیەکان و دەبێتە مایەیی بڵاوبونەوەی خراپەو داوێنپیسی و تێکچوونی شیرازەی کۆمەڵایەتی.

ئەمەو فرەژنی وەك رێپێدانی شەرعی پاساوو حیکمەت و بەرژەوەندی تێدایە وەك:

١- زۆربوونی ژمارەی ئافرەتان لەچاو پیاواندا: بەهۆی شەڕو کارەسات و رووداوە جۆراو جۆرەکانەوە کەزۆربەی زۆری قوربانییەکان پیاون،ژمارەی ژنان چەند بارە دەبێتەوە. بۆنموونە گەر(٢٠٠) پیاو هەبوو، لەبەرامبەردا (٤٠٠) ژن هەبوو، هەرپیاوێك ژنێکی هێنا، ئەوا (٢٠٠) ئافرەت بەبێ مێرد دەمێنێتەوە، رەنگە دەوڵەت، کەسوکار، کۆمەڵگا، بتوانن پێداویستی دارایی ژیانیان بۆدابین بکەن، بەڵام بەسروشت و فیترەتی خۆی ژن پێویستی بەپیاوە بۆ تێرکردنی لایەنی سێکسی، جا بۆ تێرکردنی سێکسی سێ گریمانی لەبەردەمدایەو چوارەمی نیە: یان بەرێگایەکی شەرعی چێژ لەپیاو ببات یان بەرێگایەکی ناشەرعی یان ئەبێ خۆی خەفەبکات و نەفسی کوێربکاتەوە! ئیسلام و عەقڵ و واقیع و بەرژەوەندی دوو گریمانەکەی ئەخیر رەتئەکەنەوەو ئەوەی یەکەم بەبژاردەی چاك ئەزانن چونکە دەیان سوودو فەلسەفەی لەپشتەوەیە، رۆژئاوا ئەگەری دووەم هەڵەبژێرێت کە

سەراپا زیان وماڵوێرانیە بۆ ئافرەت، هەندێ ئاییني دەستكردیش گریمانەی یەكەم هەڵدەبژێرن كەلەراستیدا پڕە لەستەم و نادادی.

٢ـ بەشێك لەئافرەتان بەهۆكاری جیاواز وەك نەخۆشی، ناتوانن خواستی مێردەكانیان بهێننە دی، پیاوەكانیش مافی خۆیانە لەم بارانەدا هاوسەرێكی تر هەڵبژێرن، رێزو مافی هاوسەری یەكەمیشیان بپارێزن.

٣ـ نەزۆكی، جاری واهەیە ئافرەت بەهەرهۆكارێك بێت، منداڵی نابێت و راپۆرتی پزیشكی روونی دەكاتەوە، پیاویش حەز بەمنداڵ دەكات و مافی سروشتی خۆیەتی ژنێكی تر بهێنێت، بەهیوای ئەوەی خوای گەورە نەوەی پێ ببەخشێت.

٤ـ هەندێك لەپیاوان بەسروشت و پێك هاتەی خۆیان لایەنی سێكسیان بەهێزەو هاوسەرە كانیشیان ناتوانن لەئاستی حەزوو خواستە سێكسیەكانی مێردەكانیاندابن. لەم كاتەدا هانا بۆئەوە دەبەن كەژنێكی تر بهێنن.

٥ـ چارەسەرە بۆزۆر كێشەی كۆمەڵایەتی وەك قەیرەیی كچان، بێوەژنان... هتد.

سەبارەت بەوەی كە ژنان بۆیان هەبێت چەند پیاوێكیان هەبێت بەڵگەی نەزانینی نووسەرەكەیە، وەڵامدانەوەی ئەمەش زۆر هەڵدەگرێت ئەوەندە بەسە بڵێیین لەگەڵ سروشت و توانای ژندا یەكناگرێتەوەو، دەبێتە مایەی تێكەڵبوونی نەوەكان، هیچ نەوەیەك نازانێت كێ باوكێتی، ئەگەری ئەوە هەیە هەرەیەك لەو پیاوانە بانگەشەی ئەوە بكەن كە باوكی ئەو منداڵەن، لەمەشدا خراپە و تاوانی كۆمەڵایەتی و دەرونی و مرۆڤایەتی هەیە.

هەروەها نوسەر بە نەزانی دەڵێت ئایەتەكە (بە (ما) دەربڕنی لەژنان كردووە، كە بۆ نا ئاقڵ بەكاردێت، بەمەبەستی هەنگاونان بۆ پیادەكردنی ئەو بۆ چونەی كەژنان لەبەر ناتەواوی ئەقڵیان رەوتێكی نا ئەقڵانیان هەیە) ئەمەش وانیە، چونكە

(أو) حرف عطف للتخيير (ما) اسم موصول مبنيّ في محلّ نصب معطوف على واحدة) بۆیە (ما) لێرەدا (اسم معطوف)ە.

هەروەها وەرگێڕیش لەپەراوێزی باسەکەدا(مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ) بەهەڵەو بەبێ بەڵگە لێکدەداتەوەودەڵێت (خاوەنی قورئان (کچانی بێ باوك و کۆیلەمێ، وەچەی هەژار کراوان وەك یەك سەرنج دەدات و بەیەك چاو لەگەڵ کچانی خاوەن سامانەکاندا سەیریان ناکات. هەرلەم دیدو تێڕوانینەشەوەیە کەلەناو مسوڵمانانندا منداڵی بێ باوان بەسوك سەیریان دەکرێت، یان وەك کچانی باوکدارو خاوەن سامان سەرنج نادرێن.) دیارە ئەم قسانە سەراپای درۆیەو دوورە لەراستی و هیچ بنەمایەکی نیە، ئیسلام زۆر رێزی لەبێ باوکان ناوەو خودی پێغەمبەریش (صلى الله علیەواله وسلم)بەبێ باوك و دایك گەورەبووە، داوای لەمسوڵمانان کردووە کەیارماتی و چاودێری هەتیوان بکەن ئەوەتا فەرموویەتی (انا وکافل الیتیم في الجنة هکذا. واشار بالسبابة والوسطی، وفرج بینهما شیئا) رواه البخاري. بەواتای من و سەرپەرشتیاری بێ باوکان لەبەهەشتدا پێکەوەین هەروەك چۆن ئەو دوو پەنجەیە پێکەوەیە. بۆیە چەندین دەقی پیرۆز هەیە ئاماژە بەم بابەتە دەکات و بواری خستنە روویمان نیە گەر کەسێکیش بەزبری مامەڵە لەگەڵ کەسێکی بێ باوکدا بکات ئەوە نیشانەی تێنەگەبشتنێتی لەئیسلام و پێی گوناهبار دەبێت.هەروەها ئیسلام تاکە پەیام و بەرنامەیە کەرێزی هەژارانی گرتووەو کاری بۆ نەهێڵان یان کەمکرنەوەی ئازارو مەینەتەکانیانی کردووە. بوونی کەنیزە کەدیاردەیەکی کاتی ئەو سەردەمە بووە، ئیسلام بەهەنگاوی کرداری و بەپلە بەندی چارەسەری کردووەسەرەتا رێزو شکۆو کەسایەتی بۆگێڕاونەتەوەو مامەڵەی چاك و تەندروستی لەگەڵکردوون.

## ٤ـ لێدانی ژنان

(فادی) ڕەخنە لەوە دەگرێت کە لێدانی ژنان لە هەندێ حاڵەتدا ڕێپێدراوە، هەروەك لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە (وَاللاَّتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلاَ تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا) النساء ٣٤.

بەواتای: ئەو ئافرەتانەی ئێوە دەترسن سەرپێچی و سەرکەشی بکەن، سەرەتا ئامۆژگاریان بکەن (ئەگەر سوودی نەبوو) لەناو جێدا پشتیان تێبکەن، (ئەگەر ئەوەش سوودی نەبوو) لێیان بدەن (بەمەرجێك لێدانەکە لە دەم و چاو نەبێت و ئاسەوار بەجێنەهێڵێت) ئەگەر بەم هۆیانە لەلادان و یاخی بوون وازیان هێنا، ئەوە ئیتر ستەمیان لێ مەکەن و ڕێگەی تر مەگرنە بەر(بۆ ئازاردانیان) بێگومان خوا بەرزو بڵندو گەورەیە (ئەگەر ستەمیان لێبکەن تۆڵەتان لێدەسێنێت). تەفسیری ئاسان لاپەڕە ٨٤

قورئان بانگەشە بۆ ئەوە دەکات ئەگەر (ژنێك لە لێدان و وشکی هەڵسوکەوت یان لە خۆ لێگرتنەوەی مێردەکەی ترسا، ئەوە با ژنەکە پەنا بەرێتە بەر کۆمکارێکی هەڵسەنگاندن لە کەسوکاری خۆیی و مێردەکەی تاکو لە نێوانیاندا بەچاکە ناوبژیوانی بکەن.

(وَإِنْ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِنْ بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَنْ يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا وَالصُّلْحُ خَيْرٌ وَأُحْضِرَتْ الآنفُسُ الشُّحَّ وَإِنْ تُحْسِنُوا وَتَتَّقُوا فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا) النساء ١٢٨

هەروەها نووسەردەڵێت: ئەگەر پیاو لە یاخی بوون و سەرکێشی ژنەکەی ترسا ئەوا لەسەریەتی کە ئامۆژگاری بکات پاشان لێی داببڕێت، پاشان لێی بدات ئەگەر چی بە زللە یان بە مست بێت یان بە قاچ (لەقە) یان شەقی تێ هەڵدات یان بە قامچی لێی بدات یان دار.

دواتر ناوبراو دەقێك لە ئینجیل دەهێنێ سەبارەت بە خۆشەویستی پیاو بۆ خێزانەکەی، بەمەش دەیەوێت بەراورد بکات لە نێوان قورئان و ئینجیلدا، قورئان تۆمەتبار دەکات بەوەی بانگەشە بۆ زوڵمکردن لە ئافرەتان و سوکایەتیپێکردنیان دەکات، بەڵام ئینجیل بانگەشە بۆ خۆشەویستی و رێزلێنانی ئافرەتان دەکات.

**لە وەڵامدا دەڵێین:**

قورئانی پیرۆز بانگی پیاوان دەکات بۆ ژیانی پڕ لەخۆشەویستی ومیهرەبانی لەگەڵ هاوسەرە کانیاندا، ئەمەش بە ئایەتێك لە ئایەتەکانی خوا دادەنرێت (وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ...) الروم ٢١.

بەواتای: یەکێك لەنیشانەو بەڵگەکانی ئەوەیە: کە هەر لەخۆتان هاوسەری بۆ درووست کردوون بۆ ئەوەی ئارام بگرن لەلایداو لەنێوانتاندا خۆشەویستی و سۆزو میهرەبانی فەراهەم هێناوە، بەڕاستی ئا لەو دیاردانەدا نیشانەو بەڵگەهەیە بۆ کەسانێك بیردەکەنەوەو تێدەفکرن. تەفسیری ئاسان لاپەڕە٤٠٦.

هەروەها خوای گەورە نەهی لە پیاوان کردوە ستەم لە ئافرەتان بکەن و ئازاریان بدەن (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَرِثُوا النِّسَاءَ كَرْهًا وَلاَ تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ إِلاَّ أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِنْ كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا(١٩)وَإِنْ أَرَدْتُمْ اسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَكَانَ زَوْجٍ وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنطَارًا فَلاَ تَأْخُذُوا مِنْهُ شَيْئًا أَتَأْخُذُونَهُ بُهْتَانًا وَإِثْمًا مُبِينًا(٢٠) وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُ وَقَدْ أَفْضَى بَعْضُكُمْ إِلَى بَعْضٍ وَأَخَذْنَ مِنْكُمْ مِيثَاقًا غَلِيظًا) النساء ١٩ـ٢١.

بەواتای: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە درووست نیە بۆتان ژنان بەزۆر بکەنە میراتی خۆتان و دەستیان بەسەردا بگرن، (وەکو کەل و پەلی تری ناوماڵ)، ناچاریان مەکەن تا هەندێك مارەییتان بۆ بگەڕێننەوە، مەگەر ئەوان گوناهێکی ئاشکراو دیار ئەنجام بدەن، هاوژینیان بەجوانی لەگەڵدا بەرنە سەر، ئەگەر

خۆشتان نەویستن و لێیان بێزاربوون، ئەوە دوورنیەو دەشێت حەزتان لەشتێك نەبێت و خوا بیکات بەمایەی خێرو بێری زۆرو بێ سنوور.

خۆ ئەگەر ویستتان هاوسەرێك بخەنە جێگەی هاوسەرێکی ترو مارەییەکەی (ئاڵتون و سامانێکی) زۆرتان پێدابوو، ئەوە نابێت هیچ شتێکی لێ بگێڕنەوەو لێی کەم بکەنەوە، ئایا ئەو مارەییەی کەپێتان داوەو وەری دەگرنەوە لێان بەدرووست کردنی بوختانێکی ناڕەواو گوناهو ستەمێکی ئاشکرا! ؟

جاچۆن دروستە مارەییان لێ وەربگرنەوە، لەکاتێکدا ئێوە چوونەتە لای یەکترو ژنانیش پەیمان و بەڵێنێکی گەورەو گرنگیان لێوەرگرتوون(لەکاتی مارەکردنیاندا).تەفسیری ئاسان لاپەڕە ٨٠ـ ٨١.

بە دەگمەن ژن لەگەڵ مێردەکەیدا جیاوازی دەبێت و سەرکەش و یاخی دەبێت، لەم بارەدا پێویستە پیاو چارەسەری ئەم بارە بکات، بڕیاری درووست بدات، پێش ئەوەی بگاتە تەڵاق و جیابوونەوە، خوای گەورە سێ هەنگاوی پلە بەندی داناوە:

ئامۆژگاری کردن و بیرخستنەوەی بە پەیامی خواو و ئاگادارکردنەوەی لە دەرئەنجامی سەرکەشی، گەر ئەم شێوازە سودی نەبوو ئەوا پەنا بۆ دورکەوتنەوە لێی لەسەرە جێگادا، گەر ئەم هەنگاوەش سودی نەبوو ئەوا دەتوانێ بە لێدانێکی سوك لێی بدات.

نە قورئانی پیرۆز و نە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕێگای داوە بەو شێوازە لێدانەی کە (فادی) وەسفی دەکات، ئەمە و هیچ زانا و فەقیهو توێژەرێك بەم شێوە وەسفە باسی نەکردووە، ئەمە و ناشێت بەکارهێنانی دار یان لەقە بەکاربهێنرێت بۆ لێدانی ئافرەت چونکە ئەمە شێوازێکە لە تۆڵە سەندن نەك میکانیزمێکی پەروەردەیی و شێوازێکی چارەسەر بێت.

لێدانی ئافرەتی سەرکەش وەك شێوازێکی چارەسەر دەبێت لێدانێکی سوك بێت بە ناو لەپ یان بە پەنجەکان، یان بەسیواك، ئەمە و نابێت دەم و چاو

بگرێتەوە و لەبەر ئەوەی لای خوا بەرێزە، هەروەها هیچ شوێنەوەرێك بەجێ نەهێڵێت، هەروەها نابێت توند بێت، لێدان بەم مەرجانەی زانایان باسیان کردووە تەنها ناوی لێدانەو لەختووکەدان دەچێت، و لایەنێکی مەعنەوییە. دوپاتی دەکەینەوە زۆربەی پیاوان مەگەر زۆر ناچاربن پەنا بۆ ئەم شێوازە بەرن، ئەمەو لە حاڵەتی زۆر دەگمەندا بە کاردێت، بەشێکی بەرچاو لە زانایان وتویانە چاکترین شت دوور کەوتنەوەیە لە لێدان ئەمەو لە سونەتی کرداری پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) هەرگیز لە هاوسەرەکانی نەداوە و هەر چەند کێشەو گرفت و پاساو هەبوبێت.

## ٥ـ ژن و جیابوونەوە

لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە گەر پیاو ژنەکەی تەڵاقی سێ بەسێ دا ئەوا بۆی حەڵاڵ نابێتەوە مەگەر کاتێك پیاوێکی تر مارەی بکاتەوە(فَإِنْ طَلَّقَهَا فَلاَ تَحِلُّ لَهُ مِنْ بَعْدُ حَتَّى تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ فَإِنْ طَلَّقَهَا فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَنْ يَتَرَاجَعَا إِنْ ظَنَّا أَنْ يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ) البقرة ٢٣٠.

بەواتای: خۆ ئەگەر(بۆجاری سێیەم، پیاو ژنەکەی خۆی) تەڵاق دا ئەوە ئیتر جارێکی تر بۆی حەڵاڵ نابێت مەگەر دوای ئەوەی شوویەکی تر بکات و (هاوسەر ی دووەمی بەشێوەیەکی ئاسایی تەڵاقی بدات، یان بمرێت)، ئەوە بۆیان هەیە بگەڕێنەوە بۆلای یەکترو(ژیانی ژن و مێردایەتی دەست پێبکەنەوە)، ئەگە ر گومان و رایان وابوو دەتوانن سنوورەکانی خوا راگرن و(ژیانێکی ئاسودەیی ببەنە سەر)، جا ئەوەی کەباسکرا سنورەکانی خوای گەورەن، روونیان دەکاتەوە بۆگەلێك کە بزانن و تێبگەن. تەفسیری ئاسان لاپەڕە ٣٦.

بەڵام گەر مێردی تەنها گرێبەستی هاوسەرگیری ئەنجامدا بە مەبەستی حەڵاڵ بوون و گەڕانەوەی بۆ لای هاوسەری یەکەمی و سەرجێیی لەگەڵ نەکرد ئەوە نابێت، هەروەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نەفرەتی کردووە لە دووو پیاو

(المحلل) مێردی دووەم و(المحلل له) مێردی یەکەم هەروەك فەرموویەتی: (لعن رسول الله المحلل والمحلل له) رواه احمد والنسائي والترمذي وصححه

(فادی) بەسروشتی خۆی ئەم راستیانە رەت دەکاتەوەو نکۆڵی لێ دەکات و جنێو و سوکایەتی بە پێغەمبەر دەکات و دەڵێت (ئێمەش پرسیار دەکەین: ئایا کەسانی ئەقڵ مەند ئەم سیستمە نامۆیە رەتناکەنەوە؟ ئایا لە بەرچی قورئان بانگەشە بۆ رێکەوتنی تەڵاقدار و گەڕانەوەی ژنێك بۆ لای مێردی یەکەمی بە مەرجی جووتبونی ژنە تەڵاقدراوەکە لەگەڵ پیاوێکی تردا گرێ دەدات، کە بە (المحلل) حەڵاڵ کەر ناوزەدی دەکات؟ وە ئایا لەبەرچی پێغەمبەر نەفرەتی لە (المحلل) حەڵاڵ کەر و (المحلل له) حەڵاڵ بۆ کراو مێردی پێشوو کردوە، ئایا یاسادانەرەکە مستەحەق و شایستە تر نیە بە نەفرەت؟)

**لە وەڵامدا دەڵێین:**

(فادی) بە فرت و فێڵ و چەواشەکردن و دەیەوێت خوێنەر چەواشە بکات، ناوبراو بەناو بانگەشە بۆ ئەوە دەکات داوا لە ژیر مەندان دەکات کە ئەم سیستەمە نامۆیە رەت بکەنەوە، چونکە بە پێی دیدی ئەو پێچەوانەی ئەقڵ و ژیرییە، بەڵام دەڵێین ئەم یاسایە لەچیدا لەگەڵ ئەقڵ و ژیریدا یەکناگرێتەوە، خوای گەورە یاسای تەڵاقی بۆ داناوین و بە سێ تەڵاق دیاری کردووە، لە کاتێکدا لە سیستەمی نەفامیدا بە شێوەیەکی رەهاو کراوە بووە، پیاو ژنەکەی سەد جار تەڵاق دەدا و دواتر دەیهێناوە، بەڵام ئایینی ئیسلام هات و تەڵاقی دیاریکرد بە سێ تەڵاق.

ئافرەتیش دوای تەواو بوونی ماوەی عیدەکەی لە مێردی یەکەمی دەتوانێت شوو بکاتەوە، ئایا ئەم رێپێدانە چ تێگیرانێکی هەیە لەگەڵ ژیریدا، پیاوی دووەمیش گەر تەڵاقیدا هیچی تێدا نیە، هیچ رێگریەکیش نیە جارێکی تر ئەم ئافرەتە شوو بکاتەوە بە مێردی یەکەمی دوای تەواو بوونی عیدەکەی لە مێردی دووەمی، بۆیە ئەقڵی دروست بە هیچ شێوەیەك پێچەوانە نیە بەم شەریعەت و پەیامە.

مێردی دووەم گەر ئافرەتەکەی مارە کرد بە پێی بنەما شەرعیەکان و وەك ژن و مێردێکی تەواو لە رووی ئەرك و مافەوە ئەمە پێی ناوترێت (المحلل) چونکە ئەم

کەسە مەبەستی نیە بیگێڕێتەوە بۆ مێری یەکەم و هیچ مەرجێکی لەسەر نیە کە سەرجێیی لەگەڵ نەکات.

وەرگێڕ یش لە پەراوێزدا دەڵێت (المحلل، حەلاڵکەر) پیاوی دووەم، کەژنەکەی لێ مارە دەکرێت کەزۆربەی جار دەبێ تەلاقی بداتەوە بۆ مێردی یەکەمی ئەمەش بەپێی ڕێککەوتنێکی پێش وەخت بووە، واتە ئەو پیاوەی ژنی سێ بەسێ تەلاقدراو دەهێنێ پاشان تەلاقی دەدات بۆ مێردی پێشووی ژنەکەو بۆی حەلاڵ دەبێ)، (محلل لە، حەلاڵ بۆکراو) مێردی یەکەمی ژنەکە(یان ئەو مێردەی کە تەلاقی داوە) کەپێغەمبەر نەهی لێکردووە بەپێی دەقی ئایەتی(بعولتهن احق بردهن) واتە مێردەکانیان موستەحەقترن، کەژنە تەلاقدراوەکانیان بگەڕێننەوە لای خۆیان ئاماژەیەکە بۆ بەجاش مارەکردنەوە، کەلە سزادان و تەمێکردنێکی سێکسی شەرعیکراو دەچێت و میصریەکان بەو پیاوەی دووەم دەڵێن کوبری، واتەپرد) لەوەلامی قسە بێ بنەماو بێ سەروو بەرەکانی وەرگێڕدا دەڵێین: ئەم ڕوونکردنەوانەی سەرتاپا هەڵەیەو وانیەو نازانین کامیانی بۆ ڕاست کەینەوە، ئەوەی خەڵکی پێی دەڵێن مارە بەجاش لەئیسلامدا بوونی نیەو تاوان و فرت و فێڵەو هەر ڕێککەوتنێك لەو بارەیەوە حەرامەوە هەروەك پێشتر لەفەرمودەکەدا ئاماژەمان پێدا (لعن رسول الله المحلل والمحلل له) واتە: پێغەمبەری خوا(صلي الله عليه وسلم) نەفرەتی لە حەلاڵ کەر و حەلاڵ بۆ کراو کردووە

هەروەها ئایەتی(وبعولتهن احق بردهن) البقره ٢٢٨.

بەمانای: هاوسەرەکانیان شایستەن بەگێڕانەوەیان، لەماوەی چاوەڕوانی و عیدەدا ئەمەش بۆ تەلاقی ڕەجعییە، بەهیچ شێوەیەك پەیوەندی بەم باس و تەوەرەوە نیە.

## ٦ـ ژن و حیجاب

لە سورەتی النور ئایەتی ٣١دا هاتووە (وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ) با سەرپۆشەکانیان بدەن بەسەر سینەیاندا، (خومر) کۆی (خەمار) ە کە ژن سەری

پێ دادەپۆشێ وە (جیوب) کۆی (جیب)ە کە سنگ دەگرێتەوە، هەروەها جیب ملیوانی کراس دەگرێتەوە، بەمەش ماناکەی دەبێت بە (با بە سەرۆپۆشەکانیان سەر و ملیان داپۆشن – یسترن اعناقهن بغطاء راسهن) ئێمەش پرسیار دەکەین) (ئایا چۆن ژن دەخرێتە پۆشاکێکی (داشاردنەوە) کە لە بەندینگە دەچێت ؟ (داشاردن) حیجاب) و خۆشاردنەوەی ژنان گیانی کارکردن و چالاکی و ئازادی کەسێتی ژنان دەکوژێت و مرۆڤایەتی بۆ سەردەمی کۆیلایەتی دەگێڕێتەوە).

لەوەڵامدا دەڵێین:

(فادی) کەهێرش دەکاتەسەر حیجابی ئافرەتان و بەشێوازێکی ناشیرین باسی دەکات خۆی قەشەیەکی گاورەو گاورەکانیش گوایە بانگەشەی پاکیزەیی و خاوێنی دەکەن و دژایەتی داوێن پیسی و تێکچوونی شیرازە دەکەن، حیجاب پاراستنی ئافرەتەو بڵاوکردنەوەی پاکی و چاکەخوازییە لە کۆمەڵگادا.

کێ دەڵێت حیجاب بەندیخانەی ژنانە؟بەڵگەی ژیری و زانستی و واقیعی حاڵ، پێچەوانەی وتەکانی (فادییە)ئافرەتانی داپۆشراو نموونەی کارو چالاکی و زیرەکی و داهێنانن و ڕۆڵی پۆزەتیف و کاریگەریان لەکۆمەڵگادا بینیوە، وەك پەرلەمانتار، پزیشك، ئەندازیار، مامۆستا، فەرمانبەر..... هتد. هیچ کات حیجاب گیانی ئازادی ژنانی نەکوشتووە، بەڵکو پێچەوانەکەی راستە.

ئەوانەی دژایەتی حیجاب دەکەن مەبەست و مەرامی تریان هەیەو بەناوی ئازادی و یەکسانی ژنانەوە پیلانەکانی خۆیان جێبەجێ دەکەن، بازرگانی بەجوانی و لاشەی ئافرەتەوە دەکەن و وەك کاڵایەك سەوداو مامەڵەی پێوە دەکەن، ریکلامی کەناڵ و روپەڕی رۆژنامەو گۆڤارو ماڵپەڕەکان راستی وتەکانمان دەسەلمێنن.

هەروەها نوسەر گوایە قەشەیە و خاوەن ئایینی ئاسمانییەو بەرگری لەئینجیلی دەستکاری کراو دەکات ئایا چی دەقێکی ئایینی مەسیحی دژایەتی باڵاپۆشی و

حیجاب دەکات و بانگەشە بۆسفوری و روت و قوتی دەکات، بێگومان وەڵامەکەی دیارەو شتی لەو بابەتە بوونی نیە.

## ٧ـ زۆر لێکردن بۆ زەکاتدان

(فادی) ئایەتەکانی سورەتی تەوبە دەخاتە روو کەباس لەدەرکردنی زەکات دەکات(وَمِنْهُمْ مَنْ يَلْمِزُكَ فِي الصَّدَقَاتِ فَإِنْ أُعْطُوا مِنْهَا رَضُوا وَإِنْ لَمْ يُعْطَوْا مِنْهَا إِذَا هُمْ يَسْخَطُونَ(٥٨)وَلَوْ أَنَّهُمْ رَضُوا مَا آتَاهُمُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَقَالُوا حَسْبُنَا اللَّهُ سَيُؤْتِينَا اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ وَرَسُولُهُ إِنَّا إِلَى اللَّهِ رَاغِبُونَ(٥٩)إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ.....)التوبه ٥٨ـ٦٠

بەواتای: هەیانە تانەو تەشەر لە تۆ دەدات لەدابەشکردنی زەکات و دەستکەوتدا(پڕو پاگەندە دەکات کە گوایە عەدا لەت و دادی تێدا نیە)، جا ئەوانە ئەگەر بەشیان بدرێت رازین، ئەگەر بێبەش بکرێ لێی، ئەوا خێرا ئەوان رق هەڵدەگرن و کینە لەسینە دەگرن. خۆ ئەگەر ئەوانە رازی بونایە بەو بەشەی کە خوا بە نسیبی کردون و پێغەمبەر (صلی الله علیەواله وسلم) پێی بەخشیون و بەدڵ بیان وتایە) خوامان بەسە(کەلێمان رازی بێت)، ئێمە فەرامۆش ناکات لەئاییندەدا هەر پێمان دە بەخشێت لەفەزڵ و زیادە رێزی خۆی، پێغەمبەرەکەشی لەوەی دەستی دەکەوێت پێمان دەبەخشێت، بە راستی ئێمە ئاوات و مەبەستمان گەڕانەوەیە بۆ لای خواو بەدەست هێنانی رەزامەندی ئەوە (ئەوکاتە پاداشتی هەردوو جیهانیان بۆ خۆیان مسۆگەر دەکرد). بێگومان زەکات تەنها بۆ هەژاران و نەداران و ئەوکەسانەی کە کارمەندن بەسەریەوەو بەو مسوڵمانە نوێیانەی کە هێشتا ئیمان جێگیر نەبووە لە دڵیانداو بۆ ئازاد کردنی کۆیلەکان و بۆ (یارمەتی دانی) قەرزدارەکان و بۆ گەیاندنی ئایینی خوا(هەر بوارێك کەخزمەت بە بانگەوازی ئیسلام بکات و ئاییني خوا بەرەو پێش و سەرکەوتن ببات) هەروەها بۆ ئەو

ڕێبوارانەش كە پارەیان لێدەبڕێت و نەدار دەكەون،(دابەشكردنی زەكات بەو شێوەیە) فەرزە لەلایەن خواوە لەگەردنی ئیمانداراندا، خواش زاناو دانایە (لەسامان بەخشین و فەرز كردنی زەكاتدا). تەفسیری ئاسان لاپەڕە ١٩٦.

دواتر باسی شەڕی هەڵگەڕاوەكان دەكات لەلایەن خەلیفە ئەبوبەكری سدیقەوە(خوای لیٚ ڕازیبێت)كەڕێگرییان لەزەكاتدان گرت وخەلیفەش خالیدی كوڕی وەلیدی بۆناردن و شەڕی لەگەڵ كردن و گەڕانەوە ژێر سایەی ئیسلام.

(فادی) دەڵێت) (ئێمەش پرسیاردەكەین: ئەگەر زەكات پایەیەكە لەپایەكانی ئاین و ئایینیش بۆخوایە، ئایا ئەو ئایینە بەئایینێكی ڕاست دادەنرێت ئەگەر ئێمە مومارەسەی بكەین، بەڵام نەك وەك خوازیاروو خۆبەخشێك، بەڵكو بەزۆرە ملیٚ و سەركوتگەری؟وەئەو زەكاتەش كەشمشێری خالیدی كوڕی وەلیدو هاوشێوەكانی كۆی دەكاتەوەخواوەند ڕەفزی دەكات چونكە ئەوە چاكەگەری نییە.

**لەوەڵامدا دەڵێین:**

زەكات پایەیەكە لە پایەكانی ئیسلام دەبێت مسوڵمان بە سنگفراوانی و ڕەزامەندی و خۆشحاڵیەوە بیدات، نەك سزای دارایی و سەرانە، هەروەك لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە(خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِمْ بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلَاتَكَ سَكَنٌ لَهُمْ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ) التوبە ١٠٣.

بەواتای: لەهەندیٚ ماڵ و سامانی ئەو(ئیمانداراندا) زەكات و خێر وەربگرە، چونكە دەبێتە هۆی خاوێنكردنەوەی ماڵەكەیان و پاك كردنەوەی دڵ و دەروونیان و دوعای دابارینی ڕەحمەت بكە بەسەریانداو ئەگەر مردیشن نوێژیان لەسەر بكە، چونكە بەڕاستی دوعاو نوێژكردنی تۆ مایەی دڵنیایی و ئارامییە بۆیان، خواش هەمیشە بیسەرو زانایە. تەفسیری ئاسان لاپەڕە ٢٠٣

مسوڵمانان پابەندن بە دروشمە ئیسلامیەكان و ئارەزووەمەندانە جێبەجێی دەكەن و چونكە بەمە نزیك دەبنەوە لە خوای گەورە و شاد و خۆشحاڵن چونكە بە پابەند بوون بەهەشت و ڕەزامەندی خوا بە دەست دەهێنن.

شەڕکردن لەگەڵ ئەوانەی ڕێگری زەکاتیان دەکردلەلایەن ئەبوبەکری سدیقەوە(خوای لێ رازیبێت) لەبەر ئەوە نەبوو کە زۆریان لێ بکرێت تا زەکات بدەن، هەروەك (فادی)گومان دەبات، بەڵکو لەبەر ئەوەی ئەوان هەڵگەڕابوونەوە چونکە نکۆڵیان لە واجبوونی زەکات دەکرد، نکۆڵی کردن لە واجبکردنی زەکات دەرچوونە لە ئایینی خوا، هەروەك زانراوە شەڕ کردن لەگەڵ پاشگەزبووەکان واجب و ڕێپێدراوە.

وەرگێڕ لە پەراوێزدا دەڵێت (خالیدی کوڕی وەلید هەرئەوشەوەی، کە مالیکی کوڕی نوێرەی کوشت چوە لای ژنەکەی سەرەڕایئەوەی مالیکی کوڕی نوێرەو ژنەکەی موسوڵمانیش بوون، ئەو ڕەفتارەی خالید ئەو کاتە ئاسایی بوو کەمالیکی کوڕی نوێرە بەهەڵگەڕاو (مرتد) ناوزەد کراو تەکفیرکرا.هەڵبەتە لەیاسای جەنگی ئیسلامدا هەڵگەڕاوە یان نا موسڵمان دەبێت بکوژرێت و ژنەکەیشی بۆ موسڵمانان بێت،کەواتە کفراندن (التکفیر) هەر لەسەرەتاوەلەگەڵ خودی ئیسلامدا هاتووە).

ئەمەش درۆیەکی ترە و هەڵبەستراوەو هیچ بەڵگەیەك نیە بیسەلمێنێت، خالید کوڕی وەلید کاتێك ڕووبەڕووی مالیکی کوڕی نوێرە بووەوە لەبەر ئەوەی ناوبراو خۆی و هۆزەکەی بەبڕیاری ئەم زەکاتیان نەدەدا کەپایەکی سەرەکی ئیسلامە دوای وتو وێژو مشتومڕ لەو بارەیەوە کوژرا، خالیدیش لەو شەوەدا نەچۆتە لای خێزانی مالیك هیچ بەڵگەیەکی ڕاست نیە بیسەلمێنێت ئەمەو لەرووی شەرعەوە درووست نیەو ڕێپێنەدراوە.

هەروەها وەرگێڕ وەك نەریتی خۆی هەندێ قسەی بێ سەروبەرو بێبنەمای هێناوەو دەڵێت (زەکات: پاککردنەوە...واتە دارایی پەیدا کراو پیسە، واتە بەفرو فێڵ کۆکراوەتەوەو بەبەخشینی (٢،٥٪)پاك دەبێتەوە، زەکات لەخاوەن سامان ودارایی دەسەندرا تاکو لەڕێی دەسەڵاتەوە بەسەرهەژاراندا ببەخشرێتەوە، بەڵام پاشان بوو بە(بیت المال) و دارو دەستەی دەسەڵات بۆ خۆیان قۆرخیان دەکر دو خودی محەمەدیش لەوە پەشیمان بووە وە کەزەکات بەهەژاران بدرێت، ئەگەر

ناچەمکی وشەی (سوئالکەر بۆ بژێوی ژیان) بەو شێوە بەرفراوانە لەکولتوری ئیسلامدا سەری هەڵنەدەدا) وتەکانی ناوبراو هەروەك سەرنجەکانی تری هەڵبەستراوو بێبنەمان

نیشانەی رق و قینێتی لەئیسلام و چاوی بەهیچ دەقێکی قورئاندا هەڵنایەت، زەکات پایەیەکی سەرەکی ئیسلامەو مسوڵمانی راستەقینە بەئەرکی سەشانی دەزانێت پێوەی پابەند بێت و لەبەرژەوەندی چین و توێژە هەژارو لێقەوماوو دەست کورتەکانە کەئایەتەکە بەجوانی روونی کردۆتەوە،ئەم ماڵ و سامانە بەشێوەیەکی جوان و شەرعی و کۆدەکرێتەوەو دابەشدەکرێت،

هیچ کات پێغەمبەر لەپێدانی زەکات بەهەژاران پەشیمان نەبۆتەوە ئەمەش درۆیەکی شاخدارەو، هەرکات مسوڵمانان بەتەواوی پابەندبن بەدانی زەکات ئەوەندە ئاشتی کۆمەڵایەتی و دادپەروەری و خۆشگوزەرانی مەیسەر دەبێت، تا ئەم ساتە وەختەش زەکات رۆڵی بەرچاوی هەیە لەیارمەتی و کۆمەکی هەژاران پرۆژە خێر خوازیەکاندا.

## ٨ـ دابەشکردنی دەسکەوتەکان

فادی رەخنە لە قورئان دەگرێت سەبارەت بە دابەشکردنی دەسکەوتەکان (وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ...) الانفال ٤١.

بەواتای: (ئەی ئیمانداران) ئاگاداربن و بزانن کە) بە راستی هەرچیەکتان دەست کەوت (لەجەنگی بێباوەڕاندا) ئەوە بێگومان پێنج یەکی بۆ خواو پێغەمبەرو خزمانی نزیکی پێغەمبەرو هەتیوان و هەژاران وڕێبوارانداـ... تەفسیری ئاسان لاپەرە ١٨٢

فادی دەڵێت ئێمەش پرسیار دەکەین (ئایا چۆن بە ناوی خواوە لە دوای رشتنی خوێنی خەڵکی سەروسامانیشیان تالآن دەکرێت؟ وە چۆن سەرکردەی

ئایینی تاڵانی وەردەگرێت، (ئایا خواوەند کاری بە تاڵانکردنی ماڵی خەڵکی چیە ؟ تاکۆ بگۆی قورئان پێنج یەکی لە تاڵانی بۆ لادات وەرگێڕ)

**لەوەڵامدا دەڵێین:**

جیاوازی زۆر هەیە لە نێوان تاڵان و دەستکەوتی جەنگ و سەرکردەی ئایینی تاڵان ناکات و دژی تاڵانیە، بەشەرع و یاساش دەستکەوتی جەنگد دروست و رێپێدراوە، دەسکەوتەکان بریتین لە هەموو ئەو کەلوپەل و کەرەستانەی لە بێباوەڕان وەردەگیرێتەوە دوای شکستهێنان و تەسلیم بوونیان لەمەیدانی جەنگدا، ئەم دەسکەوتانە خوای گەورە حەڵاڵی کردووە بۆ بڕوادارە موجاهیدەکان، لە کاتێکدا بۆ مسوڵمانانی پێشوو حەڵاڵ نەبوو، ئەو کات ئەوان دەسکەوتەکانیان کۆدەکردەوە و پاشان دەیان سوتاند لەم بارەیەوە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی (...و احلت لی الغنائم، ولم تحل لاحد من قبلی...) رواه مسلم

فادی نکۆڵی لە شەڕی بێ باوەڕان دەکات تەنانەت گەر بێباوەڕان دەستپێشخەر بوون و شەڕیان بە مسوڵمانان فرۆشت، کوشتنی ئەوان بە خوێن رشتن دادەنێ و مسوڵمانان بە ستەمکار.

## ٩ـ وەرگرتنی سەرانە لە لە خاوەن کتێبەکان

فادی رەخنە لە قورئان دەگرێت سەبارەت بە وەرگرتنی جیزبیة (قَاتِلُوا الَّذِينَ لَآ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلَآ بِالْيَوْمِ الآخِرِ وَلَآ يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَلَآ يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنْ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حَتَّى يُعْطُوا الْجِزْيَةَ عَنْ يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ) التوبة٢٩.

**بەواتای:** (ئەی ئیمانداران) دژی ئەوانەی کەباوەڕی (راست و دروستیان بەخواو بەرۆژی قیامەت نیەو ئەوشتانەی خواو پێغەمبەرەکەی بە حەرامیان داناوە بەحەرامی نازانن و پێڕەوی دینی حەق نابن، لەوانەی کەکتێبیان پێدراوە لە(گاورو جوو) بجەنگن، هەتا ئەوکاتەی بەناچاری باج پێشکەش بەدەوڵەتی

ئیسلام دەکەن، (لەجیاتی ئەوەی کەگیان و ماڵ و سامانیان پارێزراوەو بەشداری جەنگ ناکەن). تەفسیری ئاسان لاپەڕە ١٩١

(فادیش) دەڵێت ئێمەش پرسیار دەکەین (چۆن میللەتێك ڕێگە بە خۆیان دەدەن بەناوی ئایینەوە لەگەڵ خەڵکیدا بجەنگن و هەڵبژێریان بکەن لە نێوان مسوڵمان بوون یان مردن یان سەرانە داندا ؟

**لە وەڵامدا دەڵێین:**

شەڕکردن لەگەڵ بێباوەڕانی خاوەن کتێبەکان و وەرگرتنی جزیە لێیان ئیجتیهادی مسوڵمانان نیە تا بڵێین پێکاویانە یان بە هەڵەدا چوونە، بەڵکو فەرمانێکی ڕاشکاوانەی خوای گەورەیە و لەسەر مسوڵمانانە جێبەجێی بکەن. هۆکاری وەرگرتنی جیزیە بەڵگەیە لەسەر پابەند بونیان بۆ دەستەڵاتی ئیسلام و ڕاگرتنی زوڵم و ستەمیان لەسەر مسوڵمانان، لەبەرامبەردا مسوڵمانان دەیانپارێزن و بەرگریان لێ دەکەن، پارێزگاری لە ماڵ و سامان و خوێنیان دەکەن، ئەوان لەبەرامبەردا بڕێك پارە دەدەن بە مسوڵمانان بەرامبەر ئەو پاراستنە، بۆیە پێیی وتراوە جیزیە چونکە بریتیە لە پێدانی شتێك لەبەرامبەر شتێکدا، ئەوان لە مسوڵمانانەوە ئەمن و ئاسایش و ئەمانیان بۆ دابین دەکرێت، لەبەرامبەردا بڕێك پارە دەدەن.

ئەمەو جیزیە لە ئافرەتان و منداڵان و بەساڵاچوان و هەژار و دەستکورتەکان وەرناگیرێت، گەر تێفکرین دەبینین دانی جیزبە زیاتر لە بەرژەوەندی بێباوەڕاندایە، چونکە ئەوان زەکاتیان لەسەرنیە، چونکە زەکات پایەو کۆڵەکەیەکی ئیسلامەو لەمسوڵمانان وەردەگیرێت.

وەرگێڕ لەم سەرە باسەشدا کۆمەڵێ قسەی بێ سەرو بەرو بێبنەما دەهێنێت، سوکایەتی و بەخواو قورئان و ئیسلام دەکا، لەوەڵامدا دەڵێین: ئیسلام ئایینی هەق و ڕاستی خوایەو دواپەیامی ئاسمانە بۆ مرۆڤایەتی و ئیسلام ئایینی عەرەب یان گەلێکی دیاری کراو نەبووەو نابێت، هیچ دەقێکی ئەم ئایینە ئاماژە بەمە

ناکات، ئیسلام کاتێك باجی لەسەر خاوەن ئایینەکانی تر داناوە بەناوی جیزیە لەبەرامبەردا ئازادی کەسی و ئایینی و سەرو ماڵیانی پاراستووەو زەکاتیش نایانگرێتەوە چونکە زەکات پایەیەکی ئیسلامیە و ئەوان ناگرێتەوە، هەروەها بەشداری شەڕیشیان پێنەکراوە چونکە ئەو شەڕانەی ئەوکات کراوە لەپێناوی بەرگری کردن لەئیسلام و بڵاو کردنەوەی پەیامەکەیدا بووە، بەڵام بەشداری کارایان هەبووە لەدامو دەزگاکانی دەوڵەتداو پۆستی هەستیاریان هەبووە وەك وەزارەتی دارایی.

ناوبراو ئیسلام بەدینی تایبەتی عەرەب دادنێت، لەکاتێکدا کوردو گەلانی تری وەك تورك و فارس و مەلاوی و....هتد مسوڵمانن و رۆڵیَ کاریگەریان هەبووەو هەیە لەئیسلامدا، و کودیش زۆرینەی هەرە زۆری هەر مسوڵمانە ناوبراو بە قسە زبرو بیَ ماناکانی سوکایەتی بەکوردو کوردستان و هەست و سۆزی ملیۆنەها کورد دەکات.

هەروەها ناوبراو کۆمەڵێك قسەی ساویلکانەو بیَ ئەرزش دەکات یەك لەوانە دەڵێت بۆ جیزیە وەردەگیرێت بەڵام دیاری لە بیَ باوەڕان وەرناگیرێت، فەرموودەیەکی هێناوە(انا لانقبل زبد المشرکین) بەڵام دەق و فەرمودەی ترمان هەیە کە پێغەمبەری خوا دیاری وەرگرتووەوەك فەرموودەی (أنّ يهودية أهدت لرسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ شاة مسمومة) متفق عليه. بۆیە رای پەسەند ئەوەیە کەدیاری لەبێباوەڕان وەردەگیرێت جا خاوەن کتێب بن یان نا، بەمەرجێك بابەتی دیاریەکە شتێکی قەدەغەکراو نەبێت لە ئیسلامداو پێغەمبەریش دیاری وەرگرتووە، هەروەها ناوبراو فەرمودەی (لاتستضیئو بنار المشرکین) بەهەڵە لێکداوەتەوە، وتویەتی بەئاگری هاوبەش پەیداکەران رووناك مەبنەوە، بەڵام فەرموودەکە زانایان وتویانە ئەمە رەوانبێژی تێدایە و بەمانای راوێژو پرس و را بە بێباوەڕان مەکەن دێت، چونکە ئەگەری ئەوە هەیە زانیاری هەڵەتان بدەنیَ.

## ١٠ـ زۆرکردن لە کەنیزەکان بۆ خرا پەکاری

فادی رەخنە لە فەرموودەی خوا دەگرێت لەم بارەیەوە (وَلَآ تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا لِتَبْتَغُوا عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَمَنْ يُكْرِهُّنَّ فَإِنَّ اللَّهَ مِنْ بَعْدِ إِكْرَاهِهِنَّ غَفُورٌ رَحِيمٌ) النور ٣٣.

بەواتای: بەزۆر کەنیزەکانتان هان مەدەن بۆ داوێن پیسی، ئەگەر ئەوان پاك داوێنیان دەویست(دبێ پیاوی ئازاد زیاتر پاك داوێنی مەبەست بێت)، بۆ ئەوەی لەو رێگە چەوتەوە ماڵ و سامانی ژیانی دنیا بەدەست بهێنن، جا ئەوەی بە زۆر ئەو گوناهەیان پێ بکات ئەوە بە راستی خوا دوای ئەو زۆر بۆهێنانەیان لێ خۆشبوو میهرەبانەو چاو پۆشییان لێ دەکات. تەفسیری ئاسان لاپەرە ٣٥٤

ناوبراو راڤەی ئایەتەکە و هۆکاری دابەزینی لە تەفسیری بەیزاوی وەرگرتووە، پوختەکەشی ئەوەیە عبداللە ی کوڕی ئوبەی شەش کەنیزەی هەبووە زۆری لێ دەکردن بۆ زیناکردن و باجی خستبوە سەریان، هەندێکیان لە لای پێغەمبەری خودا (صلی اللە علیە وسلم) سکاڵایان کرد ئەوکات ئایەتەکە دابەزی بۆ سەرزەنشتکردنی عبداللە ی کوڕی ئوبەیی و رێگریکردن لەو کارە خراپە.

ماناکەشی نابێت زۆر لە کەنیزەکان بکرێت بۆ زیناکردن یان ناردنیان بۆ زیناکردن، تەنانەت گەر زۆرشیان لێ نەکرێت چونکە رەزامەندی نواندن لەسەر زیناکردن حەرامە، هەروەها ناردنیان بۆ زیناکردن یان زۆرلێکردنیان هەر حەرامە، مەرجیش لە (ان اردنا تحصنا) بە قەید و بەربەستێك نیە نەهی کردن، چونکە نەهی کردن لەزیناکردنیان گشتیە، جا ئەگەر ویستیان پارێزراو بن یان نا، بەڵام ئەم مەرجە بۆ رونکردنەوەی واقیعی حاڵە، چونکە ئایەتەکە دابەزیوە بۆ ئەو کەنیزانەی کە پاکیزە بونەو خۆپاراستنیان ویستووە.

گەر ئەمانە پاکیزەیی و پاراستنیان بوێت کە کەنیزەن، ئەوا ئازادەکان هەر لە سەرتاوە نەفرەت لە کاری زینا دەکەن.

فادی دەڵێت (ئێمەش دەپرسین) ئایا چاکتر نەبوو کە فەرمان بە کەنیزەکان بدات تاکو گوێڕایەڵییان بۆ خواو یاخیبونیشیان لە مرۆڤ ئاشکرا بکەن و نەخوازراو قبولْ نەکەن، ئایا لەبری ئەوەی بڵێت (خواوەند لێبوردەو میهرەبانە) ئەوە باشتر نەبوو، کە بڵێت خواوەند سزای سەختە مەگەر بۆ ئەوانە نەبێت کە پەشیمان دەبنەوە و تۆبە دەکەن (ان الله شدید عقاب الا علی من تاب)

**لە وەڵامدا دەڵێین:**

پێشنیاری فادی بەڵگەی نەزانینە چونکە وا دەڵێت با ئایەتەکە فەرمان بەو کچە کەنیزەنەکان بدات تا گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوا بن و ئەنجامدانی کاری خراپ قبولْ نەکەن، کێ دەڵێت ئەوان ئەم کارەیان نەکردووە چونکە ئەوان فەرمانی خاوەنەکەیان(عبدالله ی کوڕی ئوبەیان) ڕەتکردۆتەوە و ئەنجامدانی داواکاریەکانیشیان ڕەتکردۆتەوە، سکاڵای حاڵی خۆیان هێناوە بۆ لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەم کارەیان لە میانەی گوێراڵیان بۆ خوای گەورە بوو، ناوبراو ڕەخنە بەوە دەگرێت کە ئایەتەکە بە (ان الله غفور الرحیم) کۆتایی هاتووە، پێشنیار دەکاتە بە دەستەواژەی (ان الله شدید عقاب الا علی من تاب) چونکە کۆتایی ئایەتێك کە نەهی لە حەرام و خراپەکاری بکات ناشێت بە تەرغیب و لێخۆشبوون و سۆز و بەزەیی کۆتایی بێت چونکە نەگونجاوە، دەبوایە بە سزا و و هەڕەشە کۆتایی بێت.

کۆتایی هاتنی ئایەتەکە بە تەرغیب و لێخۆشبوون و دروست و گونجاوترینیانە ئەم تەرغیبە بۆ ئەو کەسانە نین کە زۆر لەو کەنیزانە دەکەن بۆ کاری داوێن پیسی بەڵکو تەرغیب بۆ کەنیزەکانە چونکە ئەو کەنیزانە بە زۆر زینایان پێ دەکەن، بەڵام ئەوانەی زۆر لە کەنیزەکان دەکەن بۆ زیناکردن ئەوا خوای گەورە سزای سەختیان دەدا.

## ١١ـ پەکخستنی شاهێدی دان و جەڵدەلێدانی شاهێدەکان

(فادی) رەخنە لە قورئان دەگرێت لەم بارەیەوە (وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلاَ تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا وَأُوْلَئِكَ هُمْ الْفَاسِقُونَ) النور ٤.

بەواتای) ئەوانەی کە بوختان دەکەن بۆ ئافرەتانی داوێن پاك و خاوەن مێرد پاشان ناتوانن چوار کەسیش بە شاهێد بهێنن،ئەوانە هەشتا قامچیان لێ بدەن و هەرگیز شایەتیان لێ وەرمەگرن، ئەوانە لە ریزی تاوانبارو لەسنور دەرچوەکانن. تەفسیری ئاسان لاپەڕە ٣٥٠.

ئەم ئایەتە ئاگاداری دەداتە مسوڵمانان تا لە خۆیانەوە خەڵکی تۆمەتبار نەکەن بە زیناکردن، وە داوا لە مسوڵمانان دەکات خۆیان بە دوور بگرن و وریابن، بۆیە داوای چوار شایەتی کردووە کە بەچاوی خۆیان ببینن پیاوێك لەگەڵ ئافرەتێکدا زینا دەکات، گەر چوار شایەت شایەتی نەدەن ئەوا ئەوانەی تر هەشتا جەڵدیان لێ دەدرێت.

(فادیش) دەڵێت ئێمەش پرسیار دەکەین (ئایا چۆن بۆ چوار کەس هەڵدەکەوێت کە چاودێری و شاهیدی روداوێك بن کە هەمیشە لە پەنهان ونهێنیدا روودەدات؟! وە چۆن فەرمان دەدرێت بە لێدانی هەشتا لیس لە سێ شاهید ئەگەر هات و بەچاوی خۆیان روداوێکیان بینی و شایەتیان تێدا دا، لەبەر ئەوەی ئەوان شاهیدی چوارەمیان لەگەڵدا نیە، داواکردنی چوار شاهید لە هەرگیزو مەحاڵەوە نزیکەو بێ تواناکردن و پەکخستنی شاهێدی دان بەمەبەستی ئەوەیە کە تاوانبار تەبریە بێت).

لەوەڵامدا دەڵێین:

ئەوەی لە ئایەتەکەدا بەمەرج هاتووە، بریتیە لە چوار شایەت راست و دروستن و حیکمەت و دانایی و بەرژەوەندی گشتی تێدایە، چونکە دەبێتە مایەیی پاراستنی رێز و شکۆیی و ناموسی هاوڵاتیان و، رێگری دەکات لەهەر هۆکارێك بۆ

بڵاوکردنەوی واتە وات و قسەلۆکە لە نێو خەڵکیدا بە مەبەستی سوکایەتیکردن بە کەسێك یان خانەوادەیەك، بەمەش خراپەکاری بڵاودەبێتەوە و خەڵکان لەوانەیە بەهۆکاری ناڕەواو بوونی کێشەو بەرژەوەندی کەسی بوختان بۆ خەڵکی بکەن و لەکەداری بکەن، لەمەشدا زیانێکی زۆر بەر تاك وخێزان و کۆمەڵگا دەکەوێت.

بۆیە ئیسلام رێگری کردووە لەوانەی کە ناتوانن چوار شایەت ئامادە بکەن کە کرداری زیناکەیان بە چاوی خۆیان بینیبێت ئەوا هەشتا لیس لەوانە دەدرێت کە باسیان لە کرداری زیناکە کردووە.

راستە بینینی چوار کەس کە دوو کەسی زیناکەر ببینن لە کاتی زیناکردندا کارێکی ئەستەمە چونکە زیناکردن بە نهێنی و لە شاراوەدا ئەنجام دەدرێت، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا پێویستی بە بەڵگە و شایەت و رونکردنەوەهەیە.

ئامانجی بنەڕەتی قورئان جێبەجێکردنی سزا بەسەر زیناکەراندا نیە، بەڵکو ئامانجی خاوێنکردنی کۆمەڵگایە لە کرداری چەپەڵی زینا و دژایەتی کردنی، وە دورخستنەوەی زینا لە هزر و سۆزی ئەوانەشی کە حەزی لێدەکەن، ئەمەو زیناکەران گەر لە سزایی دنیایی رزگاریان بێت ئەوا هەرگیز لە سزای رۆژی دوایی رزگاریان نابێت.

مایەیی سەرسوڕمانە کە(فادی) هەر ئایەتێك لە ئایەتەکانی قورئان رەتدەکاتەوە و نکۆڵی لێ دەکات، بە مەرجدانانی چوار شاهید لای (فادی) پەکخستنی شایەتی دان و تەبریە کردنی تاوانبارە بەڵام گەر ئایەتەکە مەرجی سوکی دابنایە بۆ سەلماندنی زینا ئەو کات دەیوت ئایەتەکە توندو تیژە، جا قورئان هەرچی بڵێت لای ئەو هەر هەڵەیە چونکە لە بنەڕەتەوە بڕوای پێی نییە.

## ١٢ـ جەڵدەلێدانی زیناکەر بە ئاشکرا

خوای گەورە سەبارەت بە جەڵدەلێدانی زیناکەر فەرموویەتی (الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ وَلاَ تَأْخُذْكُمْ بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِنْ كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ) النور ٢ بەواتای) سەد قامچی لەهەر یەکە لە پیاوو ئافرەتی زیناکەر بوەشێنن، بەزەیی نەتانگرێت لە جێهێنانی فەرمانی خودا بۆیان، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بەخواو ڕۆژی دوایی هێناوە، با دەستەیەکیش لە ئیمانداران ئامادەی سزاکەیان بن. تەفسیری ئاسان لاپەڕە ٣٥٠.

فادیش دەڵێت: ئێمەش پرسیار دەکەین (ئایا چاکتر نیە کە بە ڕۆحێکی سوك و میهرەبانیەوە چارەسەری ئەو هەڵەکارانە بکرێت؟ مەسیحیەت فەرمان بە جەڵدەلێدانی هەڵەکار نادات، بەڵکو شەرمەزاری کۆمەڵی دەکات،پاشان ئەگەر پەشیمان بۆوە و تۆبەکردنی خۆی ڕاگەیاند قبوڵی دەکاتەوە و پێشوازی لێدەکات).

### لە وەڵامدا دەڵێین:

(فادی) وای دەبینێت کە سزای زیناکەر توندەو تۆڵەسەندنەوەو توندوتیژی تێدایە، بە تایبەت کە جەڵدەلێدانی کەسەکان بەشێوەیەکی ئاشکرایەو بەشێك لە بڕواداران دەیبینن، وەسزای زیناکەر لە ئینجیلدا بە باشتر دەزانێت لە سزای زیناکەر لە قورئاندا، چونکە سزا لە ئینجیلدا بەگیانێکی بەزەیی و نەرمی جێبەجێ دەکرێت.

قسەکانی فادی ناڕەواو ڕەتکراوەتەوە چونکە خوای زانا و دانا دەزانێت جێبەجێ کردنی ئەم حوکمە دەبێتە مایەیی دورخستنەوەی خەڵکی لە زیناکردن و تەمبێ دەبن، لەبەر ئەوەی دەترسن لەبەرچاوی خەڵکیدا شەرمەزار بن و خەڵکی سزاکەیان ببینێت، ئەوانەشی ترسی خوایان لە دڵدا نەبێت ئەوا لە ترسی خەڵك و

شەرمەزاریدا خۆیان دەپارێزن، ئەمەو سزا لەرەگەزی کارو کردەوەکانە(الجزاء من جنس العمل) هەر تاوانێك تا گەورەترو زیان بەخشتر بێت ئەوا سزاکەی سەختترە.

وەرگێڕیش خۆی ئاسا کۆمەڵێ بابەتی تێکەڵکردووە، وەك: سێکس خۆشەویستیە بەڵام ئیسلام بەزینا ناو زەدی کردووە، ئەمەش وانیە مەگەر لەکلتوری وەرگێڕدا وا بێت، کاری سێکسی و ئەنجامدانی بەشێوەیەکی شەرعی و درووست رێپێدراوەو پێویستیەکی سروشتی مرۆڤە، بەڵام زینا کردن ئەنجامدانی کاری سێکسیە لەگەڵ کەسانێکدا کەهیچ گرێبەستێکی هاوسەرگیری لەنێوانیاندا نیە، زیان و خراپەکانی زینا کردن زۆرن و بابەتی سەربەخۆی دەوێت، سەبارەت بەوەی جەڵدە لێدانی زیناکار لەئێران کراوەتە هەڵواسین، ئەمە کەی خەتای ئیسلامە ئێران بەو شێوەیە رەفتاربکات.

هەروەها دەڵێت لەوڵاتی ئێمەدا بەهۆی زیناکردنەوە ئەوەی دەکوژرێت تەنها کچ یان ژنەکەیە بەڵام کوڕ یان پیاو وەك بەرزەکی بانان بۆی دەردەچێت، بە ناوبراو دەڵێین لە سزاداندا جیاوازی نیە لەنێوان نێرو مێدا، ئەوەی لەکۆمەڵگادا دەکرێت ئیسلام لێی بەرپرس نیە خەڵکی بەشێوەیەکی ناڕەواو دور لەشەرع و بەرنامەی خواو یاسادا سزای کچان و ژنان دەدەن.

## ١٣ـ بەندکردنی هەمیشەیی

فادی باس لە سزایەك دەکات سەبارەت بە زینا کە لە قورئاندا نەسخ بۆتەوە (وَاللاَّتِي يَأْتِينَ الْفَاحِشَةَ مِنْ نِسَائِكُمْ فَاسْتَشْهِدُوا عَلَيْهِنَّ أَرْبَعَةً مِنْكُمْ فَإِنْ شَهِدُوا فَأَمْسِكُوهُنَّ فِي الْبُيُوتِ حَتَّى يَتَوَفَّاهُنَّ الْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ اللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلاً)النساء ١٥.

بەواتای) ئەو ئافرەتانەی کە زینا دەکەن لە ژنانتان ئەوە چوار شایەتیان لە خۆتان لەسەر بگرن،جا ئەگەر شایەتیاندا ئێوە لە ماڵدا بەندیان بکەن، تا مردن

یەخەیان پێ دەگرێت یان خوا دەرویەکیان لێ دەکاتەوە. تەفسیری ئاسان لاپەڕە ٨٠.

ئەم حوکمە فادی دەشێوێنێ و دەڵێت ئێمە پرسیار دەکەین (ئایا لە حاڵەتی بەم شێوەیەدا بۆ خەتاکار وا چاکە کە بۆ هەمیشەیی بەند بکرێت؟ ئایا چۆن کچێکی ١٦ساڵان بۆ نمونە ئەگەر قەدەری وابوو ٨٠ ساڵ بژەیت بەند دەکرێت ؟ چاکتر وایە بوار و هەل بە کچان و ژنانی هەڵەکار بدرێت بۆ پەشیمان بوونەوە و ژیانێکی پیرۆز و نوێ.

زانایانی ئیسلام دەڵێن ئەم ئایەتە واتە (النساء ١٥) بە ئایەتی (النور ٢) جەڵدەلێدانی زیناکار لە ژنی بێ مێرد مەنسوخە، وە بە ئایەتی سەنگەسارکردنی ژنی مێرداری زیناکاریش مەنسوخە، هەر چەندە ئایەتی بەردبارانکردن خوێندنەوەکەی نەسخ کراوە،وە قورئان لە سورەتی النساء ٢٥ دا دەڵێت (ومن لم یستطع منکم...) وە ئەگەر کەسێك لە ئێوە هەر نەیتوانی ژنی (محصنە) داوێن پاکی ئیماندار بهێنێت ئەوا با (لە کەنیزەك) ما ملکت ایمانکم کۆیلەمێ) ئیماندارەکان بهێنێت، وە ئەگەر خراپەیەکی سێکسی لێیان رویدا ئەوا نیو هێندەی ژنە محصەنەکانیان لەسەرە وە ئەگەر دان بە خۆدا بگرن ئەوە بۆ ئێوە چاکترەو خوداوەندیش خۆشنود و میهرەبانە) جەڵدەکردنی کۆیلەمێ نیو هێندەی جەڵدەکردنی ژنی ئازادە بەڵام نازانین نیوەی رەجم بەردەباران کردن چەندە؟.

**لە وەڵامدا دەڵێین:**

قسەکانی فادی و پاساوەکانی نیشانەی نەفامییەتی، چونکە ئەو نازانێت حوکمی بەند کردنی زیناکار حوکمێکی کاتیە، دواتر خوای گەورە نەسخی دەکاتەوە ئەم حوکمەش لەسەردەمی پێغەمەری خوادا جێبەجێ نەکراوە، هیچ ریوایەت و فەرمودەیەکی راست تاکە روداوێکیان بۆ باس نەکردوین کە ئافرەتێکی زیناکار لە ماڵەکەیدا تا مردن بەند کرابێت، هیچ ئافرەتێکی زیناکار نەمردووە بە هۆی بەند کردنەوە، چونکە هیچ حاڵەتێکی زینا لەو ماوەیەدا روویندەداوە، بەڵگەش

لەسەر ئەوەی حوکمی بەندکردن کاتیە، وتەی پەروەردگارە کە فەرموویەتی (او یجعل الله لهن سبیلا).

حوکمی نەسخبونەوەی لە قورئاندا هاتووە (الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ وَلَآ تَأْخُذْكُمْ بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِنْ كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ) النور ٢.

راستر و سەلمێنراو ئەوەیە رەجمکردن لە قورئاندا باس نەکراوە هیچ ئایەتێکیش تیلاوەتەکەی لە قورئاندا نەسخ نەبۆتەوە، ئەمەو نەسخ لە قورئاندا نەسخی حوکمە لەگەڵ مانەوەی خوێندنەوەیدا.

ئەمەو سزای کەنیزەکان نیوەی سزایی ئازادەکانە (فَانكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ وَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ مُحْصَنَاتٍ غَيْرَ مُسَافِحَاتٍ وَلَآ مُتَّخِذَاتِ أَخْدَانٍ فَإِذَا أُحْصِنَّ فَإِنْ أَتَيْنَ بِفَاحِشَةٍ فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى الْمُحْصَنَاتِ مِنْ الْعَذَابِ ذَلِكَ لِمَنْ خَشِيَ الْعَنَتَ مِنْكُمْ وَأَنْ تَصْبِرُوا خَيْرٌ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ) النساء ٢٥.

کەنیزەکان کاتێك شویان کرد دوای شوکردن گەر زینایان کرد ئەوا سزایان بەسەردا دەچەسپێت نیوەی ئەو سزایەیی کە بەسەر ئافرەتێکی ئازاددا جێبەجێ دەکرێـت، لەبەر ئەوەی سزایی ئافرەتێکی ئازادی مێردار رەجم کردنە ئەوا کەنیزەکان سزایان دەدرێت بە جەڵدەلێدان چونکە نیو رەجم کردن نیەو رەجم کردنیش دوو لەت نابێت، لەم حاڵەتەدا جەڵدەی لێ دەدرێت.

وەرگێڕیش کۆمەڵێ قسەی بێجێ و سوکایەتی دەکات و هەندێکی لەدو توێ باسەکەماندا وەڵام دراوەتەوە، ناوبراو دژایەتی پرۆسەی هاوسەرگیری شەرعی دەکات و بە کۆیلایەتی ناوزەدی دەکات و گوایە ئەمە دەبێتە مایەی چەوسانەوەی ئافرەتان و پێشێلکردنی مافەکانی، هەروەها دەڵێت: ئایە وشەی کەنیزەك لە ئەمرۆدا کام لەژنان و کچان دەگرێتەوە؟ ئایا کەنیزەك یەکسان نیەبە (باعة الحب: البغاء)یان ئەوژنانەی کەئارەزووی مومارەسەی سێکس دەکەن لەگەڵ زیاتر لەپیاوێکدا؟ جارێ بوونی کەنیزە حاڵە تێکی تایبەتی قۆناغێکی مێژوویی بووەو ئیسلام بەتەندروستی مامەڵەی لەگەڵدا کردووەو کاری جدی بۆ لەناوبردنی کردووە، هەربۆیە ژنان و کچانی

ئەم سەردەمە ناگرێتەوە، ئەو ژنانەشی کەکاری لەشفرۆشی دەکەن سەرەتا ستەمی گەورە لەخۆیان و کۆمەڵگا دەکەن و شیرازەی ژیانی کۆمەڵایەتی دەشێوێنن، زۆر جار ئەوانە بەناچاری بازرگانی سێکسیان پێوە دەکرێت و وەك کۆیلەی سپی ئەم سەردەمە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت، هیچ ژنێکی ژیرو بەرەوشت ناڕوات هەر ساتەی لەگەڵ کەسێکدا کاری سێکسی بکات و خۆی و خەڵکی تووشی ئایدزو چەندین نەخۆشی تری مەترسیدار بکات، ناوبراو بەم قسانەی بانگەشە بۆ بەرەڵایی و داوێن پیسی دەکات وکار لەسەر تێکدانی شیرازەی خێزان دەکات.

## ١٤ـ تۆڵەسەندنەوە

خوای گەورە لە قورئانی پرۆزدا فەرموویەتی (وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُمْ بِهِ وَلَئِنْ صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِلصَّابِرِينَ) النحل ١٢٦.

ئەگەر تۆڵەتان سەندەوە ئەوا بە هەمان ئەو سزایەی دراون سزا بدەن وە ئەگەر دان بەخۆدا بگرن ئەوە چاکترە بۆ دان بەخۆدا گرەکان، ئەم ئایەتە دوای جەنگی ئوحود لە ساڵی دووەمی کۆچیدا دابەزی کە مسوڵمانان توشی ناڕەحەتی و شکست بوون، ئیمامی حەمزە (خوای لێ رازی بێت) شەهید کرا و بێ باوەڕەکان سکیان دڕی و لاشەکەیان شێواند.

فادی لە بەیزاویەوە گواستویەتیەوە و دەڵێت بەیزاوی وتی (گوتراوە کاتێك کە پێغەمبەر (صلى الله عليەوالە وسلم) بینی جەستەی حەمزە شێوێندراوە وتی: سوێند بەخوا ئەگەر خوا بەسەریاندا سەری خستم ئەوا لە جێیی تۆ جەستەی حەفتا کەسیان دەشێوێنم) ئەوسا ئەم ئایەتە دابەزی و پێغەمبەریش (صلى الله عليەوالە وسلم) کەفارەتی سوێندەکەی دا.

فادی رەخنە دەگرێ و دەڵێت ئێمەش پرسیار دەکەین (ئایا تۆڵە سەندنەوە رۆح رێك و پێك دەکات و ئەمنیەت دەپارێزێت؟ ئێمە بەدەست وەیشومە تاڵەکانی تۆڵە سەندنەوە دەناڵێنین.

مەسیح وتی: ئەوانەی شمشێر بە شمشێر دەکەن، واتە ئەوانەی تۆڵە دەسەندنەوە لەناو دەچن. ئەو جیاوازیە چەند زۆرە لە نێوان گوتەی محمد کە وتویەتی سوێند بەخوا ئەگەر خودا بە سەریاندا سەری خستم ئەوا لە جێیی تۆ جەستەی ٧٠ کەسیان دەشێوێنم، وە لەنێوان وتەی مەسیح کە دەڵێت: ئەگەر براکەت حەفتا کەڕەتی حەوت جاری هەڵەی لەگەڵ کردیت ئەوا لێیی ببورە.

**لە وەڵامدا دەڵێین**

ئایەتەکە رێگەی داوە بە کەسێك زوڵمی لێ کرابێت تۆڵەی خۆی لەو کەسە بکاتەوە کە زوڵمی لێ کردووە، لە هەمان کاتدا ئامۆژگاری و رێنوێنی دەکات بە ئارامگرتن لەسەر ئەو ناڕەحەتیە و لێبوردن لە کەسی بەرامبەر. رەخنەکانی فادی لاوازن، چونکە تۆڵەسەندنەوە بە ئەندازەی ئەو زوڵم و ستەمەی کراوە و بواردان بە رێگری کردن لەستەمکاری ناچێتە خانەی تۆڵەسەندنەوەی عەشایەرییەوە، سزای هاوشێوە بنەمایەکی ئیسلامیە و جیاوازی زۆرە لە نێوان ئەو دوو بارەدا، هەر چەندە قورئان بواری داوە تۆڵە لە زاڵم و ستەمکار وەربگیرێت، بەڵام لە هەمان کاتتدا رێنمایی مسوڵمانان دەکات بۆ چاکتر لەمانە کە بریتیە لە لێبوردەیی و بەخشین، هەروەك خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا فەرمویەتی (وَالَّذِينَ إِذَا أَصَابَهُمْ الْبَغْيُ هُمْ يَنْتَصِرُونَ(٣٩)وَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِثْلُهَا فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الظَّالِمِينَ(٤٠)وَلَمَنْ انتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِ فَأُوْلَئِكَ مَا عَلَيْهِمْ مِنْ سَبِيلٍ(٤١)إِنَّمَا السَّبِيلُ عَلَى الَّذِينَ يَظْلِمُونَ النَّاسَ وَيَبْغُونَ فِي الآرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ أُوْلَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ(٤٢) وَلَمَنْ صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَلِكَ لَمِنْ عَزْمِ الأُمُور) الشورى ٣٩ـ٤٣.

وتەکانی فادی رەتکراوەتەوە و چونکە لەسەر بنەمایەکی ناڕاست بیناکراوە، چونکە ئەو وتەیەی خراوەتە پاڵ پێغەمبەر (صلى الله عليەوالە وسلم) پێغەمبەری خوا نەی وتووە، زانایانی فەرموودە و تەفسیر کۆکن لەسەر ئەوەی ئەم فەرمودەیە راست نیە، ئەمەو ئەو وتەیە کە خراوەتە پاڵ پێغەمبەر بە شێوازو دەقی تریش

هاتوون بەڵام هەموویان لاوازن و کاریان پێ ناکرێت جا ئەو رەخنانەی فادی گرتویەتی خۆی لە خۆیدا بەتاڵ دەبێتەوە.

هەروەها کاتێك پێغەمبەری خوا(صلی الله علیەواله وسلم) شاری مەككەی فەتح کرد لە هەموو ئەوانە خۆش بوون کە دەستیان سور بوو بە خوێنی مسوڵمانان ئەوەتا بکوژی حەمزە (وەحشی کوڕی حەرب) و (هندی کچی عوتبە) کە ناوسکی حەمزەیان بۆ برد لێیان خۆش دەبێت.

فادی هەموو ئەم راستیانە دەزانێت و باسی ناکات و بە ئەنقەست وتەو فەرموودەی لاواز دەهێنێتەوە تا زەمی پێغەمبەری خوا بکات و بەخەیاڵی خۆی لە پایەیی کەمبکاتەوە.

## ١٥ـ غەزا کردن

فادی رەخنە لەم ئایەتەی قورئان دەگرێت سەبارەت بە تێکۆشان و خۆئامادەکردن لە پێناوی خوادا (وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَآخَرِينَ مِنْ دُونِهِمْ لَا تَعْلَمُونَهُمُ اللَّهُ يَعْلَمُهُمْ وَمَا تُنفِقُوا مِنْ شَيْءٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنْتُمْ لَا تُظْلَمُونَ) الانفال ٦٠. هەرچیەك لە تواناتاندا هەیە لە هێز و سوارە خۆتانیان بۆ ئامادە بکەن، دوژمنانانی خوا و دوژمنانی خۆتانی پێ بترسێنن، وە هەندێکی تری جگە لەوان کە ئێوە نایانناسن و نایانزانن بەڵکو و خوا دەیانناسێت وە هەرچی شتێك کە لە رێگەی خودا سەرفی دەکەن، پێتان دەدرێتەوە و ئێوە ستەمتان لێ ناکرێت.

ناوبراو هەندێ لە تەفسیری بەیزاوی وەرگرتووە سەبارەت بە تەفسیری ئایەتەکە کە فەرمان بە مسوڵمانان دەکات بە خۆئادەکردن بە هەموو توانایانەوە لە هێز و چەك بۆ روبەڕوبونەوەی دوژمنانی خواو دوژمنانی خۆیان و رێگری کردن لە پەلامار و هێرشەکانیان.

فادیش دەڵێت ئێمەش پرسیار دەکەین (کە چۆن قورئان فەرمان بە خۆئامادەکردن و هەڵگرتنی چەك دەدات بۆ غەزاو داگیرکردن لە پێناو ئاییندا و هەر لە پێناو ئاییندا ماڵ و دارایی خەڵك زەوت دەکەن و بەزۆری زۆرداری وا لە خەڵك دەکەن کە ئەو دینەیان قبوڵ بێت ؟ شمشێر ئەو بەڵگەیەیە کە هیچ چەند و چونێکی تێدا ناکرێت).

**لە وەڵامدا دەڵێین:**

(فادی) ئەوەی لە قورئان ناوێ کە رێنمایی مسوڵمانان بکات بۆ چەك هەڵگرتن و شەڕکردن لەگەڵ دوژمنێکی شەڕکەردا کە چاویان بڕیوەتە وڵاتی مسوڵمانان و تاڵانکردنی ماڵ و سامانیان، ئەو دەیەوێت مسوڵمانان تەسلیمی نەیارەکانیان بن گەر دوژمنەکانیان شەڕیان پێ فرۆشت باتەسیلم بن، وە قورئانیش با کتێبی خۆشەویستی بێت فەرمان بە مسوڵمانان بکات دڵ و دەست و دەرونیان بۆ دوژمنەکانیان بکەنەوە.

نەیارانی ئیسلام بەردەوام چاویان بڕیوەتە خاك و وڵاتی مسوڵمانان، بەردەوام لە پیلاندا بوونە و بەدووی هەلومەرجی گونجاودا گەڕاون بۆ هێرشکردنە سەریان و داگیرکردنی وڵاتەکانیان و مێژووی ئیسلامی پڕە لە گەواهی دانی کرداری ئەم راستیانە.

ئەوەی (فادی) دەیڵێت دوورە لە بنەمای زانستی و لۆژیکەوە چونکە هەر گەل و نەتەوەیەك خاوەنی هەر ئایین و بیروباوەڕێك بێت، بەرامبەر بە دوژمنە شەرەنگێز و پەلامار دەرەکانیان دەوەستن چونکە بەرگری کردن لە خاك و ماڵ و خۆیان و بەرپەرچدانەوی پەلامارو شەڕەکانیان مافێکی سرووشتی و فیترەیەکی مرۆڤایەتیەو خوای گەورە بەخشیویەتی بە مرۆڤەکان.

ئەوانەی کە خوای گەورە فەرمانی خۆئامادەکردن و خۆ سازدان و روبەڕوو بونەوەیانی کردووە، بریتین لە دوژمنێکی شەڕکەری پەلاماردەر، لەو بێ باوەڕانەن کە دژایەتی مسوڵمانان دەکەن و پیلانیان لێ دەگێرن و پلان دادەنێن بۆ شەڕ

کردن و کۆسپ و بەربەست لە بەردەم دینەکەیان دادەنێن، ئامانجیش لە خۆئامادەکردن ترساندنی دوژمنان و هەڵوەشاندنەوەی پیلانەکانیانە. ئامانجی مسوڵمانان لە ئامادەسازی بریتی نیە لە داگیرکردنی وڵاتەکانیان و کوشتن و بردنی ماڵ و سامانیان یان زۆرلێکردنیان بۆ نێو ئایینی پیرۆزی ئیسلام هەروەك (فادی) وای بۆ دەچێت، مسوڵمانان پەیام و بەرنامەکەیان بە بەڵگە و سەلماندنەوە بڵاودەکەنەوە و ڕوودەکەنە ئەقڵ و دڵ و دەرونی خەڵکی. مسوڵمانان فەرمانیان پێ کراوە بە بانگەواز کردن بۆ دینی خوا بە حیکمەت و ئامۆژگاری جوان و بە پێز، ئەمەش کاری بنچینەییە لە بانگەوازدا بەڵام گەر بێ باوەڕە ستەم کارەکان بەرامبەر بە بانگخوازان ڕاوەستان و دەستیان کرد بە ئازاردان و کوشتنیان و هیچ بوارێکی ئاشتی و پێکەوە ژیانیان نەهێڵایەوە، ئەو کات مسوڵمانان بێ دەنگ نابن و بەرگری لە ئایین و بەرنامەی خۆیان دەکەن و ڕووبەڕوی ئەو ستەمکارانە دەبنەوە.

## ١٦ـ دەمارگیری بێزراو

فادی رەخنە لە قورئان دەگرێت بەوەی ڕێگری کردووە لە بڕواداران پشتگیری بێ باوەڕ و جولەکە و گاورەکان بکەن، هەروەك لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاءَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ مِنْكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ إِنَّ اللَّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ) المائدە ٥١.ئەی ئەوانەی باوەڕتانان هێناوە پشت بە بە جولەکە و گاورەکان مەبەستن چونکە ئەوان پشتیوانی یەکترن، هەر کەسێك لە ئێوە پشتیان پێ ببەستێت ئەوا لە ئەوانە و خواوەندیش ڕێنمایی بە خەڵکی خراپ نابەخشێت.

ناوبراو دوای ئەوەی ڕاڤەی ئایەتەکەی لە تەفسیری بەیزاوی وەرگرتووەو دواتر دەڵێت (ئێمەش پرسیار دەکەین ئایا ئەنجامی ئەم ئامۆژگاریە قورئانیە جگە لە داخران بەسەر خوددا چی ترە؟ ئایا مسوڵمانان چۆن لە نێوان ژنهێنان لە (اهل

الكتاب) دا کە ژنی کیتابی منداڵەکانیان بۆ پەروەردە دەکات و ئیش و کاری ماڵەکانیان بۆ بەڕێوە دەبات، وە لە نێوان ئەم ئایەتە فکر داخراوەدا گونجاندن و تەبایی دەکەن.

چەند زۆر بووە ئەو تواناو لێوەشاوەییەی کە بەهۆی دووبەرەکی ئایینیەوە بەفیڕۆ چووە! مەسیحیەت بانگەشە بۆ ئاشتی و خۆشەویستی و خزمەتی هەموو مرۆڤ دەکات،هەروەك پەروەردگاری ئاشتی ئەو مەسیحەی کە لە نمونەی سامرییەکی کارچاکدا فێری کردین،کە چۆن قوربانی بدەین و خزمەتی هەموو مرۆڤ لە هەموو نەژاد و زمان و ئایینێك وەك یەك بکەین.

ئامۆژگاری قورئان کاتێك لە جێگەی خۆیدا بوو کە مسوڵمانان براوە بوون بەڵام دەمارگیری ئایینی ئەمڕۆ گیانی برایەتی لە نێو گەلاندا پەرت و بڵاو دەکاتەوەو پەکی پێشخستنی مسوڵمانان دەخات.

**لە وەڵامدا دەڵێین:**

(فادی) جیاوازی ناکات لە نێوان وەلاو پشتگیری لەگەڵ مامەڵەکردنی جوان و دروست و ڕێگەپێدراو، وەلاو پشتگیری لەسەر بنەمای هاوپەیمانی و پەیوەند کردنی چارەنووس بە یەکتریەوە، بەڵام مامەڵەکردنی چاك و پێکەوە ژیان هەماهەنگی و هاوکاری لەنێوان مسوڵمانان و بێ باوەڕە موسالیمەکان کارێکی خوازراوو پێویستە و لە بەرژەوەندی هەموو لایەك کۆتایی دێت. قورئانیش جیاوازی کردووە لە نێوان پشتگیری قەدەغەکراو لەگەڵ مامەڵەکردنی چاك و باشدا، هەروەك قورئانی پیرۆز فەرموویەتی (لَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُمْ مِنْ دِيَارِكُمْ أَنْ تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ(٨)إِنَّمَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ قَاتَلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَأَخْرَجُوكُمْ مِنْ دِيَارِكُمْ وَظَاهَرُوا عَلَى إِخْرَاجِكُمْ أَنْ تَوَلَّوْهُمْ وَمَنْ يَتَوَلَّهُمْ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ) الممتحنه ٨ـ٩.

بەواتای: دڵنیاش بن کە خوا قەدەغەی ئەوەتان لێ ناکات کە چاك رەفتاری و دادپەروەری بکەن لەگەڵ ئەو کەسانەدا جەنگیان دژ نەکردون و دژایەتی ئایینیان نەکردون و لە شوێنەوارتان دەریان نەکردون،چونکە بەراستی خوا دادپەروەرانی خۆش دەوێت.بەڕاستی خوا تەنها قەدەغەی ئەوەتان لێ دەکات کە پشتیوانی بکەن لەوانەی کە جەنگیان بەرپاکرد دژی ئایین و دەریانکردن لە شوێنەواری خۆتان و پشتیوانی ئەوانیان کرد رۆڵیان هەبوو لە دەرکردنتاندا،ئەوەش پشتیوانیان لێ بکات، و خۆشی بوێن جا ئەوانە هەر ستەمکارن. تەفسیری ئاسان لاپەڕە ٥٥٠.

ئەمەو ئامۆژگاری قورئانی هەرگیز بیرو هزری مرۆڤ داناخات بەڵکو بە پێچەوانەوە دەبێت مایەی کرانەوەو فراوان بوونی بازنەی بیرکردنەوە چونکە راسپاردەکانی قورئان بەردەوام جەختی کردۆتەوە لەسەر(یعقلون، تتفکرون، اولی الالباب.....) ژنهێنان لەخاوەن کتێبەکان بۆیە رێی پێدراوە چونکە مسوڵمانان بڕوایان بە هەموو بپێغەمبەران و کتێبە ئاسمانیەکان هەیەو ستەمی ئایینی لە ژنەکان ناکەن و رێگری یان لێناکەن و منداڵەکانیش پەروەردەی ئیسلامی وەردەگرن، چونکە ئەرکی باوکە منداڵەکانی بەچاکی و بەپێی پەیام و بەرنامەی خوای گەورە پەروەردە بکات.

ئیسلام دژی دەمارگیری ئایینی بووەو کەس بەزۆر ناکرێت بە مسوڵمان چونکە زۆر کردن کەسی دوو ڕوو بەرهەم دێنێت نەکە مسوڵمانی بڕوادار ئایەتی (لاکراه في الدين) باشترین بەڵگەیە، پابەند بوون بە ئیسلامەوە بەردەوام بەڵگەو خاڵی بەهێزی مسوڵمانان بووە کاتێك لایان دابێت و دوور کەوتبێتنەوە لەرێنمایی و ئامۆژگاریەکانی تووشی لاوازی و دواکەوتن بوونە.

## ١٧ـ ئایا قورئان بانگەشە بۆ رق و کینە دەکات

فادی رەخنە لەو ئایەتانەی قورئان دەگرێت گوایە بەدیدو بۆچونی ئەو بانگەشەیە بۆ رقبونەوە لە هەموو مرۆڤایەتی،ئایەتەکانیش بریتین لە( فَإذا لَقِيتُمْ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ حَتَّى إِذَا أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً حَتَّى تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ذَلِكَ وَلَوْ يَشَاءُ اللَّهُ لاَنتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَكِنْ لِيَبْلُوَ بَعْضَكُمْ بِبَعْضٍ وَالَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَلَنْ يُضِلَّ أَعْمَالَهُمْ) محمد ٤

بەواتای) (ئەم فەرمانە بۆ کاتی روبەڕوو بونەوەیە لەگۆڕەپانی جەنگدا) جا کاتێك گەیشتن بەوانەی بێ باوەڕ بوون، بێنە دەست لێیان و لە گەردنیان بدەن (ئەگینا ئەوان ئێوە دەکوژن)تا کاتێك کوشتاری زۆریان لێ دەکەن،ئینجا کە هێزیان نەما بەدیل بیانگرن و بە توندی باڵبەستیان بکەن ئەوسا یەکێك لەم دوو کارەیان لەگەڵدا ئەنجام بدەن یان بە پیاوەتی و منەت،یاخود بەگۆڕینەوەو فیدیە ئازادیان بکەن،تا شەڕ کۆتایی دێت و ئاسەواری نامێنێت و دوژمنان چەك دادەنێن بڕیارەکە ئاوهایە، ئەگەر خوا بیویستایە خۆی تۆڵەی لێدەسەندن بەڵام دەیەوێت بەیەکتر تاقیتان بکاتەوە،ئەوانەش لە پێناو خوادا شەهید بوون هەرگیز پاداشتی هەوڵ و کۆششیان بەزایە نادات.تەفسیری ئاسان لا ٥٠٧.

هەروەها ئایەتی (يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ جَاهِدْ الْكُفَّارَ وَالْمُنَافِقِينَ وَاغْلُظْ عَلَيْهِمْ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ) التحريم ٩. بەواتای: ئەی پێغەمبەر(صلى الله عليەواله وسلم) کۆشش بکەو بجەنگە دژی کافرو دووروەکان و توند تیژ بە لەسەریان، ئەوانە شوێنیان دۆزەخە،ئای کە سەرەنجامێکی خراپە، تەفسیری ئاسان لا٥٦١.

فادی دەڵێت کاتێك کە محمد لە مەککە بوو لەگەڵ هەموو خەڵکیدا ئاشتی خواز بوو، رێزی یەهودی و مەسیحی و صابیئەی دەگرت و دەیگوت ئەوان دەچنە بەهەشتەوە هەروەکو لە سورەتی المائده ٦٩ دا هاتووە (إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ هَادُوا وَالصَّابِئُونَ وَالنَّصَارَى مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَعَمِلَ صَالِحًا فَلاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ)

بە واتای بەراستی ئەوانەی  کە ئیمان و باوەڕتان هێناوە لە ئومەتی محمد(صلی الله علیەواله وسلم) و ئەوانەی بوون بە جوو و ئەوانەی صابیئەن (فریشتە پەرست و ئەستێرە پەرستن) و گاورەکان، هەر یەك لەو دەستەو تاقمانە ئەگەر باوەڕی دامەزراو بەخواو بە رۆژی دوایی بهێنێت،و کارو کردەوەی چاك و دروست و بەسود ئەنجام بدات،ئەوانە نەترس و بیم یەخەیان دەگرێت نە خەم و پەژارە روویان تێدەکات (کاتێك لەبەر رۆشنایی قورئانەوە ئەو باوەڕە دەهێنن). تەفسیری ئاسان لا ١١٩.

بەڵام کاتێك کە محمد لە مەدینەدا بەهۆی (الانصار) پشتیوانەکانەوە بەهێز بوو ئیتر فەرمانی بە کوشتنی هەموو ئەو کەسانە داوە کە مسوڵمان نین و وتی یان دەبێت سەرانە بدەن و یان ببنە مسوڵمان ! ئەمەش مانای کورتکردنەوەی برایەتیە تەنها لەناو چوارچێوەی ئیسلامدا و روخاندنی پایەکانی برایەتی گشتیە ومانای پچڕاندنی خۆشەویستی و چاك هەڵسوکەوتکردنی نێوان چینەکانی مرۆڤە،بەم شێوەیەش مسوڵمانەکان نیشتەجێ بوونی نامسوڵمانانیان لە هەموو دورگەی عەرەبیدا یاساخ کرد.

## لەوەڵامدا دەڵێین:

وتەکانی فادی پڕە لە هەڵەو درۆو ناتەواوی وەك:

١ـ گوایە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیەواله وسلم) لەشاری مەککەدا رێزی لە جولەکە و گاور و صابیئەکان گرتووە و پێی وتوون ئێوەش دەچنە بەهەشتەوە،ئەم وتەیە ناهەقە و دوورە لە راستیەوە چونکە لە شاری مەککەدا بوونی جولەکە و گاور و صابیئەکان نەبووە. چونکە خەڵکی مەککە پێکهاتبوون لە قوڕەیش و عەرەبەکان لەگەڵ سێ چوار کەسێکی گاوردا. هەروەها پێغەمبەری خوا (صلی الله علیەواله وسلم) لە شاری مەککەدا بانگەوازی خەڵکی کردووە بۆ یەکتاپەرستی و بەرنامەی خوای گەورە و ئاگاداری کردونەتەوە لە سزای خوای گەورە،خوای گەورەش فەرمانی بە پێغەمبەر و بڕوادارانی شوێنکەوتووی کردووە کە خۆ بپارێزن لە شەڕی موشریکەکان کە ئەمەش

حیکمەتی زۆری تێدا بووە،چونکە خوای گەورە دەزانێت قۆناغێکی نویێ دێتە ئاراوە کە شەڕ و ڕووبەڕووبونەوەی تێدا ڕوودەدات.

٢ـ هەروەها ڕاست ناکات گوایە پێغەمبەر (صلی الله علیەواله وسلم) لە شاری مەککەدا جولەکە و گاور و صابیئەکانی ئاگادار کردۆتەوە کە دەچنە بەهەشتەوە،بەپێیی ئایەتی ژمارە ٦٩ لە سورەتی المائدە.

ئەم ئایەتە لەشاری مەدینەدا دابەزیوە (چونکە سورەتی مائیدە سورەتێکی مەدەنیە)، هەروەها ئایەتی ناوبراو ناڵێت جولەکە و گاور و صابیئەکان لە بەهەشتدان بەڵکو ئاگادار دەکاتەوە کە باوەڕدارە مسوڵمانەکان ئەوانەی شوێنکەوتەی پێغەمبەری خوان و ئەوانە بڕواداری ڕاستەقینەن و لەبەهەشتدان، بەڵام جولەکەو گاور و صابیئەکان ئیمانی هیچ کەسێکیان وەرناگیرێت تا بڕوا بەخواو ڕۆژی دوایی و کردەوەی چاك نەکەن، ئەمەش نایەتە دی تا کاتێك ئیمان بەهەموو کتێبەکانی خوا نەهێنن لە نێویاندا قورئان وە ئیمان بە هەموو پێغەمبەران بهێنن لە نێوانیاندا محمد (صلی الله علیەواله وسلم).

جا ئەگەر جولەکە یان گاور یان صابیئە ئیمان بە قورئان و بەپێغەمبەرایەتی محمد (صلی الله علیەواله وسلم) نەهێنن ئەوا ئیماندار نین و لە بەهەشتدا نین،چونکە جیاوازیان لە نێوان پێغەمبەرانی خوادا کردووە و بڕوایان بەهەندێکیان هێناوە و بە هەندێکیان نەهێناوە و ئەمەش بێ باوەڕییەکی ئاشکرایە،هەروەك لە قورئاندا هاتووە (إِنَّ الَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ وَيُرِيدُونَ أَنْ يُفَرِّقُوا بَيْنَ اللَّهِ وَرُسُلِهِ وَيَقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَنْ يَتَّخِذُوا بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلاً(١٥٠)أُوْلَئِكَ هُمْ الْكَافِرُونَ حَقًّا وَأَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ عَذَابًا مُهِينًا(١٥١)وَالَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ وَلَمْ يُفَرِّقُوا بَيْنَ أَحَدٍ مِنْهُمْ أُوْلَئِكَ سَوْفَ يُؤْتِيهِمْ أُجُورَهُمْ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا) النساء ١٥٠ـ١٥٢.

بەواتای) بێگومان ئەوانەی باوەڕ بەخواو پێغەمبەران ناهێنن و دەیانەوێت جیاوازی بکەن لە نێوان خواو پێغەمبەرەکانیدا (گوایە باوەڕیان بە خوا هەیە بەڵام بە

پێغەمبەران نیە)(یاخود) دەڵێن باوەڕ دەهێنیین بە هەندێك لە پێغەمبەران و باوەڕ بە هەندێکیان ناهێنین و دەیانەوێت لەو نێوانەدا رێگەو بەرنامەیەك بۆ خۆیان بەدەست بێهێنن. ئا ئەو جۆرە کەسانە بە راستی هەر بێ باوەڕن و بۆ بێباوەڕان سزایەکی سەرشۆڕکەرمان ئامادە کردووە.ئەوانەی باوەڕیان بە خواو پێغەمبەرەکان هێناوە هیچ جۆرە جیاوازیەکیان نەکردووە لە نێوان هیچ کامیانداو باوەڕیان بە هەموویان هەیە،ئا ئەوانە لە ئاییندەدا خوای گەورە پاداشتی خۆیان دەداتێ خوای گەورەش هەمیشە و بەردەوام لێخۆشبوو میهرەبانە (بۆ باوەڕداران). تەفسیری ئاسان لا ١٠٢.

٣- بەپێی گومانی ناوبراو گوایە پێغەمبەر(صلى الله عليهواله وسلم) کاتێك کۆچی کرد بۆشاری مەدینەو بەهێز بوو شوێنکەوتوانی زیادی کرد بۆچوون و تێڕوانینەکانی گۆڕابەرامبەر بەخەڵکانی ترو وازی لەئاشتی هێنابەرامبەر بەخەڵکی و جەنگی راگەیاند دژ بەخەڵکی و فەرمانی کرد بەکوشتنی هەرکەسێك کە مسوڵمان نەبێت گەر جیزیە نەدات،خەڵکیش بەرامبەر سێ بژاردە بوون، مسوڵمان بوون، جیزیەدان، یان شەڕکردن.

وتەکانی ناوبراو ناهەق و درۆیەکی ئاشکرایە، ئەو دەیەوێ بڵێت محمد(صلى الله عليهواله وسلم) بیرو بۆچوونەکانی دەگۆڕێت و قورئان دانەری خۆیەتی حوکمە ئیسلامیەکانیش خۆی دای دەنێت.

خوای گەورەخۆی فەرمانی بەمسوڵمانان کردووە لەقۆناغی مەککەدا خۆیان بپارێزن لەشەڕی موشریکەکان و ئارام بگرن لەسەر ئەو ئازارو ناڕەحەتیەی توشیان دەبێت،هەر خوای گەورەش لەمەدینەدا دەرگای لێکردنەوەو رێگای پێدان بجەنگن لەگەڵ دوژمنە پەلاماردەرەکاندا سورەتە مەدەنیەکانیش ئەم راستیەمان بۆروون دەکەنەوە.

٤ـ ناوبراو دەڵێت قورئان بەبانگەشەکردنی بۆبرایەتی ئیسلامی پایەکانی برایەتی گشتی دەڕووخێنێت، وبۆندیخۆشەویستی و مامەڵەکردنی باش لەنێوان خەڵکیدا ناهێڵێت.

ئەمەش بوختان و درۆیەکی زەقە پێچەوانەیە بەبنەماکانی ئیسلام، بانگەشەکردنی قورئان بۆبەهێزکردن و قوڵکردنەوەی برایەتی لەنێوان مسوڵمانانداندا، مانای بچڕاندنی برایەتی نییە لەنێوان مرۆڤەکاندا، خوای گەورە داوا لەمسوڵمانان دەکات پەیوەنیان لەگەڵ خەڵکیدا چاك بێت وبەباشی مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن و هاوکاریان بکەن ئەمەش بەکاری خێرو چاکە بۆیان ئەژمار دەکرێت، بەڵگەی زۆرمان هەیە لەوانە(لا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُمْ مِنْ دِيَارِكُمْ أَنْ تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ) الممتحنه ٨.

بەواتای) دڵنیاش بن کە خوا قەدەغەی ئەوەتان لێ ناکات کە چاك رەفتاری و دادپەروەری بکەن لەگەڵ ئەو کەسانەدا جەنگیان دژ نەکردوون و دژایەتی ئایینیان نەکردوون و لە شوێنەوارتان دەریان نەکردوون، چونکە بەراستی خوا دادپەروەرانی خۆش دەوێت. تەفسیری ئاسان لا ٥٥٠.

(يَاأَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ)الحجرات ١٣

بەواتای) ئەی خەڵکینە بێگومان ئێمە هەمووتانمان لە نێر و مێیەك دروست کردوە،(کە باوکە ئادەم و دایکە حەوایە)و کردومانن بە چەندەها گەل و تیرە و هۆزی جۆربەجۆر تا یەکتر بناسن و پەیوەندیتان خۆش بێت بەیەکەوە. بەراستی بەرێزترینتان لای خوا ئەو کەسانەتانە کە زۆرتر لەخوا ترسەو فەرمانبەری خودایە، بێگومان خوا زانا و ئاگایە بە هەمووان. تەفسیری ئاسان لاپەڕە ٥١٧.

ئەمەو رێگری کردن لەمانەوەی لەنیشتە جێ بوونی نامسوڵمانەکان لەحیجازدا بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە،لەسەردەمی پێغەمبەردا خەڵکی حیجازوو دورگەی عەرەبی هەموو مسووڵمان بوون،ئەوانەشی مسوڵمان نەبوون دانیشتووی ناوچەکە نەبوون،

مسوڵمانان مافی خۆیانە (اقامە) نەدەن بەکەسانی تر لەبەر بەرژەوەندی و ئاسایشی وڵاتەکەیان.

ئەمەو یاساغکردنی نا مسوڵمان لە دوورگەی عەرەبیدا هیچ رەهەندێکی نەتەوەیی عەرەبی لەپشتەوە نەبووە چونکە بیری نەتەوایەتی و نەتەوە پەرستی کوێرانە لەئیسلامدا رەت کراوەتەوە، ئەوەی ئێستا پێی دەوترێت نیشتیمانی عەرەب و نەتەوەی عەرەب هیچ پەیوەندیەکی بەئیسلامەوە نیە بانگەشە کەرانی بیری نەتەوایەتی عەرەبی و دامەزرێنەرانی کەسانی مەسیحی بوونە وەك (میشیل عەفلەق، شبلی عەیسەمی و...بیرمەندە عەرەبە عەلمانیەکان) بوون. ئەوەی وڵاتە عەرەبیەکان لەم سەردەمەدا دەیکەن لەدوورو نزیکەوە پەیوەندی بەئیسلامەوە نیەو بەڵکو زۆر جار دژی بنەما سەرەکیەکانی ئیسلامە.

## ١٨ـ یاسای بتپەرستی

لە سورەتی المائدە لە ئایەتی ٩٧ دا هاتووە (جَعَلَ اللَّهُ الْكَعْبَةَ الْبَيْتَ الْحَرَامَ قِيَامًا لِلنَّاسِ وَالشَّهْرَ الْحَرَامَ وَالْهَدْيَ وَالْقَلَآئِدَ ذَٰلِكَ لِتَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْآرْضِ وَأَنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ)

بەواتای: خوا، کەعبە کە (بيت الحرام)ە کردوویەتی بەهۆی هەستانەوە و بوژاندنەوەی خەڵکی (لەهەردوو دنیادا) هەروەها مانگە حەرامەکانیش و دیاریی و قوربانیە دیاری کراوەکان، ئەوەش بۆ ئەوەیە چاك بزانن و دڵنیا بن کە خوا ئاگادارە بە هەرچی ئاسمانەکاندایە و هەرچی لە زەویدا هەیە، بەراستی خوا بە هەموو شتێك زانایە. تەفسیری ئاسان لا ١٢٤.

خواوەند کەعبەی کردۆتەماڵێك کە کاری ناشایستە تیایدا یاساغەو کردویەتیە روگە ونزرگەی خەڵکی و مانگی قەدەغە وئەو گیانەوارەرانەی کە دەبەخشیرێن) ئاشکرایە کە (الحج:مەبەست) کردن بۆ کەعبە و سروتەکانی مەبەست و بە ماچکردنی بەردە رەشەکەشەوە بۆ سەردەمی نەزانی دەگەڕێتەوە،عومەری کوڕی

خەتاب بە بەردە رەشەکەی وت (والله إني لأعلم أنك حجر لا تضر ولا تنفع، ولولا أني رأيت رسول الله يُقبلك ما قبلتك). رواه مسلم، (سوێند بەخوا دەزانم کە تۆ بەردێکیت و نەسودت هەیە و نەزیان،بەڵام گەر نەمدیبایە کە پێغەمبەر ماچت دەکات ماچم نەدەکردیت).

ئەمە لە کوێ و گوتەکانی سروشت لە کوێ ؟ وەکو گوتەی (سودی پەیکەری داتاشراو لە کوێدایە،کە دروستکارەکەی تاشیویەتی یان دارێژراوێکە،کە فێرکاری درۆیە بە رادەیەك دروستکارەکەی،کە دروستیکردوە پشتی پێ دەبەستێت،لەوەدا کە بۆ ئێوەی دروست کردووە؟وەیل بۆ ئەو بگۆیەی کە بەدار دەڵێت بە خەبەربەرەوە!وە بە بەردی کەڕ دەڵێت ئاگاداربە!ئایا ئەوانە خەڵکی فێر دەکەن؟ ئەوتا بە ئاڵتون و زیو توێژماڵکراوە بەڵام هەرگیز هیچ رۆحێکی لەناودا نییە.

وە هوشەع پێغەمبەر ووتی (ئەمێستا تاوانەکانیان زیاد دەکات چونکە بە کارامەیی خۆیان بتێك لە زیوی خۆیان وەکو پەیکەرێکی دارێژراو دروستدەکەن، هەمویشی کاری پیشەوەرانە،ئەوان واتە (پیشەوەران) لەبارەی ئەو بتانەو ئەو کەسانەش کە دەیانپەرستن دەڵێن(مرۆڤ سەربڕەکان گوێرەکە ماچ دەکەن،لەبەر ئەوە هەروەکو هەوری بەرەبەیان ئاونگ زوو دەڕۆن وەکو (کا) کە لە خەرمان لا دەبرێت وەکو دوکەڵ لە کونی دیوارەوە دەردەچن.

ئێمەش پرسیار دەکەین ئایا بەردە رەشەکە رۆحی تێدایە تاکو هەست بە گەرمی ئەو ماچە بکات،کە مسوڵمانان لەسەری مۆر دەکەن؟ ئایا ئەقڵی هەیە تاکو دەرك بەو رێز و تەقدیرەی مسوڵمانان بکات کە لێیدەگرن؟ئایا لەبەرچی مسوڵمانان بەو شێوەیە رێز لە بەردێك دەگرن،کە عەرەبەکانی سەردەمی نەزانی رێزیان پێ لە بتەکانیان دەگرت؟ئایا چۆن محمد بەرەو بەخشینی رێزلێنانێکی ئایینی لەبەرد هەنگاوی نا؟وە چۆن محمد ئەو بەردەی لە مەککە هێشتەوە هەروەکو بتەکانی تر لە کەعبە دووری نەخستنەوە؟

**لە وەڵامدا دەڵێین:**

١ـ حەج فەریزەیەکی ئیسلامەو، سەرەتا خوای گەورە فەرمانی بە ئیبراهیم پێغەمبەر کرد (درودو سڵاوی خوای لەسەر) حەج بکات، دواتر نەفامەکان ئەنجامیان دەداو داب ونەریتی خۆیان تێکەڵ دەکرد، خوای گەورەش جارێکی تر دروشمی حەجی گەڕانەوە بۆسەر سیماو بنەما ئیمانی و روحیەکان، کاتێك مسوڵمانان فەریزەی حەج ئەنجام دەدەن ئەوا فەرمانی خوای گەورە جێبەجێ دەکەن.خوای گەورەش لەم بارەیەوە فەرموویەتی (وَإِذْ بَوَّأْنَا لِإِبْرَاهِيمَ مَكَانَ الْبَيْتِ أَنْ لَّا تُشْرِكْ بِي شَيْئًا وَطَهِّرْ بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْقَائِمِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ(٢٦)وَأَذِّنْ فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالاً وَعَلَى كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِنْ كُلِّ فَجٍ عَمِيقٍ) الحج ٢٦ـ٢٧

بەواتای) (ئەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بەیاد بێنە)کاتێك شوێنی کەعبەمان دیاری کرد بۆ ئیبراهیم (دوای تەواو بوونی، فەرمانمان پێ دا)کە هیچ جۆرە هاوەڵێکم بۆ بڕیار نەدەیت و (بیکە بە بنکەی یەکخواناسی)و ماڵی من پاك بکەرەوە بۆ ئەوانەی بەدەوریدا دەسوڕێنەوە،یاخود بە پێوەن یان لە کڕنووش وسوژدە بردندان. جا بانگی خەڵك بکەو جاڕ بدە لە ناویاندا با بێن بۆ حەج،ئەوانیش بە پیادە دێن بەدەم بانگەوازەکەتەوەیان بە سواری (ئەو وشترانەی کە دووری ماوەکە) لاوازی کردوون و لەهەموو رێگەیەکی دوورەوە هەر دێن. تەفسیری ئاسان لا ٣٣٥.

٢ـ ماچ کردنی بەردە رەشەکە(الحجر الاسود) دەست لێدانی نەریتێکی نەفامی نیەو بەڵکو تەشریعێکی ئیسلامیە، ئەمە ئەوا ناگەیەنێت کەمسوڵمانان رێز لەو بەردە دەگرن لەبەر ئەوەی بەردە، بەڵکو فەرمانی خوای گەورە جێبەجێ دەکەن، ماچکردنیان بۆ بەردە رەشەکە وەك تەواف کردنە بەدەوری کەعبەدا ئەوان عیبادەتی خوای گەورە دەکەن لە هەردوو بارەکەدا.

وتەکانی ئیمامی عومەر (خوای لێ رازیبێت) جوان و شکۆدارو وەڵامێکی جوانە بۆ نوسەر بەڵگەیە لەسەر پوختی و درووستی عەقیدەی ئیسلامی.

بەڵام مەسیحیەکان پەیکەری(عیساو مریەم) (درودو سڵاوی خوایان لێبێت) درووست دەکەن و لەکڵێساکاندا هەڵی دەواسن.

## ١٩ـ ئەو یاسایانەی کەوا کۆمەڵگا دەپیێزێنێت و رەتی دەکاتەوە

لە سورەتی النساء ئایەتی ٨٩ دا هاتووە (وَدُّوا لَوْ تَكْفُرُونَ كَمَا كَفَرُوا فَتَكُونُونَ سَوَاءً فَلاَ تَتَّخِذُوا مِنْهُمْ أَوْلِيَاءَ حَتَّى يُهَاجِرُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَخُذُوهُمْ وَاقْتُلُوهُمْ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ وَلاَ تَتَّخِذُوا مِنْهُمْ وَلِيًّا وَلاَ نَصِيرًا)

بەواتای) (ئەو دوو ڕووانە) ئاواتە خوازن کە ئێوەش بێ باوەڕ بن وەك خۆیان بێ باوەڕ بوون، ئەو کاتە (هەردوو لاتان) یەکسان دەبن لە بێ باوەڕیدا، کەواتە لەوانە پشتیوان و یاوەر مەگرن هەتا کۆچ دەکەن لە پێناوی خوادا، خۆ ئەگەر یاخی بوون و پشتیان تێ کردن،ئێوە بیانگرن و بیانکوژن لە هەر کوێدا ئەوانەتان دەستکەوت،هەرگیز نەکەن ئەوانە بکەنە یاوەر و هاوکار..تەفسیری ئاسان لا ٩٢.

ئێمەش پرسیار دەکەین (ئایا ئەمە لەگەڵ مێژووی مسوڵماناندا دەگونجێت،کە لەکات و زەمانێکدا پشتیان بە مەسیحیەکان بەستووە؟هەروەها لەم سەردەمەدا پێداویستی کۆمەڵایەتی و سەربازی داوای یارمەتیکردنیان لە بیانی بەسەردا دەسەپێنێت چونکە خۆکەنارگیرکردنی رامیاری دژەوانەی سستەمەکانی مەدەنیەت و شارستانیەتیەو کۆمەڵگەش رەتی کردۆتەوە چونکە گونجاوو چاك نییە.

ئیسلام داوای لەمسوڵمانان کردووە ئاشنایەتی و دۆستایەتی بێباوەڕان نەکەن بەتایبەت ئەوانەی شەڕتان لەگەڵ دەکەن و شەڕتان پێدەفرۆشن.

### لە وەڵامدا دەڵێین:

ئەمە مانای ئەوە نییە مسوڵمانان دابڕاون و لەگەڵ غەیری خۆیاندا مامەڵە ناکەن و گۆشە گیرن پەیوەندی سیاسی و ئابوری و رۆشنبیری و هتد نابەستن. بەڵکو بەپێچەوانەوە مسوڵمانان بۆیان هەیە پەیوەندی سیاسی و ئابوری و زانستی و

فەرهەنگی لەگەڵ نەتەوەو ئایین زاكانی تردا ببەستن بۆ بەرژەوەندی هاوبەش و سودو قازانجی گشتی.

ئەمەو ئایەتەكە تایبەتە بەو بێباوەڕانەی دژایەتی ئیسلام دەكەن و پیلان دەگێڕن و سورِن لەسەر دوورخستنەوەی مسوڵمانان لەدینەكەیان، ئایەتەكە داوا دەكات مسوڵمانان هوشیارو بێداربن ئاشنایەتیان لەگەڵدا نەكەن چونكە لەبۆسەدان بۆ مسوڵمانان. بەڵام گەر مسوڵمانان لەهەر قۆناغێكی مێژووییدا بەهەر پاساوێك بێت، ئاشنایەتی و دۆستایەتی پشتگیری بێباوەڕانیان كردبێت شەڕیان دژ بە مسوڵمانانی هاودینی خۆیان كردبێت ئەوە و لایان داوە هەڵەو گوناهیان كردووە.

## ٢٠ـ پۆل پۆل دێنە ناو ئیسلامەوە

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ (إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ وَرَأَيْتَ النَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّهِ أَفْوَاجًا فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَاسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُ كَانَ تَوَّابًا) النصر ١ـ٣.

بەواتای) كاتێك یارمەتی و كۆمەكی خوا دێت،شاری مەككە رزگار دەكرێت و دەرگای ئازادی والا دەكرێت. خەڵكیشت بینی پۆل پۆل دەچنە ریزی ئایینی خواوە.ئەوسا ئیتر تۆ سوپاس و ستایشی پەروەردگارت بكەو داوای لێخۆشبوونی لیّ بكە، چونكە بەراستی خوا زۆر چاوپۆشی دەكات و تەوبە وەرگرە..(ئومێدە لە ئاییندەیەكی نزیكدا، خوای بالادەست سەركەوتنێك ببەخشێت، ئەو كاتە ئیمانداران هەست دەكەن ئەم سورەتە تازە دابەزیوە).تەفسیری ئاسان لا ٦٠٣.

ئێمەش پرسیار دەكەین (ئەگەر ئەوەی لە زانراوەكانە ئەوەیە كە خەڵكی بەسروشت وچاولێكەرو لاساییكەرەوەن و كۆمەلانی خەڵك و تیرەو هۆزەكان تەئسیریان لەسەر یەكتر هەبووەو وایكردووە،كە عەرەب و جگە لە عەرەبیشی بەرەو چوونە ناو ئیسلامەوە راكێشاوە كەچی مسوڵمانەكان ئەو حاڵەتەیان بە

ئاسانکاری لەلایەن خواوە داناوە، کەچی بە خەیاڵی کەسدا نەهاتووەو بەشاهێدی دان بۆ ئیسلام وەسفیان کردووە.

ئەی مسوڵمانان لە بارەی بت پەرستیەوە چی دەڵێن لەکاتێکدا ژمارەی شوێنکەوتوانی بت پەرستی چەندین جار لەوە زۆرترە،کە بەئایینی محمد ئایینمەندن، وە هێندەیان پەرستگا هەیە کە ئەژمار ناکرێن،وە زۆربەیان لە جوانی دیمەن و دەوڵەمەندیدا بێ وێنەن و هەر لە هندستانەوە تا سیبریا درێژ دەبنەوە،ئایا دەبێت بتپەرستی لە خواوەندەوە بێت؟!

**لە وەڵامدا دەڵێین:**

١ـ خەڵکی بەچاولێکەری و لاسایی کردنەوە مسوڵمان نەبوونە، گەروابوایە دەبوایە هەر لەسەرەتاوە عەرەبەکان مسوڵمان بوونایە، ئەوەتا قورەیش بۆماوەی بیست ساڵ بەهەموو هێزوو توانایەکی مادی و مانەوییەوە دژایەتی ئیسلام و مسوڵمانانیان دەکرد تا لەئازادکردنی شاری مەککەدا شکستیان هێنا.

٢ـ سەرکەوتن لەلایەن خوای گەورەوەیەو هەرئەویشە دڵ و دەروونی مرۆڤەکان دەکاتەوە بۆ پەیام و بەرنامەکەی و خەڵکی پۆل پۆل دێنە ناو ئیسلامەوەو، بەردەوام خەڵکی دێنە ناوئیسلامەوە لەرۆژهەلات و رۆژئاوادا خوای گەورە لەقورئاندا فەرموویەتی (وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الآرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لآ يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا وَمَنْ كَفَرَ بَعْدَ ذَلِكَ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الْفَاسِقُونَ) النور ٥٥

بەواتای) خوا بەڵێنی دڵنیا بەخش و تەواوی داوە بەوانەی باوەڕیان هێناوە لە ئێوەو کارو کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە بەڕاستی لە ئاییندەیەکی نزیکدا جێنشین و پایەداریان دەکات لە وڵاتدا هەروەك چۆن ئیماندارانی پێش ئەمانی جێنشین کردووە و ئەو دین و ئایینەیان بۆ دەچەسپێنێت خوا خۆی پێی رازیە، هەروەها ترس و بیمیان بۆ دەگۆڕێت بۆ ئارامی هێمنی، ئەو کاتە بە تەواوی هەر

من دەپەرستن و هەرگیز هیچ جۆرە هاوەڵ و شەریکێکم بۆ بڕیار نادەن،ئەوسا ئەوەی دوای ئەو پایەداریە بێباوەڕ بێت، ئا ئەو جۆرە کەسانە هەر تاوانبار و لە سنور دەرچوون.تەفسیری ئاسان لا ٣٥٧.

(هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَكَفَى بِاللَّهِ شَهِيدًا) الفتح ٢٨

بەواتای: خوا ئەو زاتەیە کە پێغەمبەری خۆی رەوانە کردووە، هاوڕێ لەگەڵ رێنموویی و پەیامی راست و دروستدا، بۆ ئەوەی زاڵی بکات بەسەر هەموو پەیام و بەرنامەیەکی تردا،خوا خۆیشی بەسە بۆ شایەتیدان و ئاشکراکردنی ئەو راستیە. **تەفسیری ئاسان لا ٥١٤.**

٣ـ بەردەوام ئیسلام بەهێزوو تونایە سەرەڕای شەڕو پەلاماری هەمەلایەنەی نەیارانی، هەر رۆژێك تێدەپەڕێت ژمارەیەکی تری خەڵك مسوڵمان دەبن،و دێنە ناو بازنەی ئەم ئایینە پیرۆزەوە، هەرچەندە هیچ وڵات و حکومەتێك بەراستی و درووستی ئیسلام پیادە ناکات، بەڵام لەئاستی خەڵك و جەماوەردا رۆژ بەرۆژ گەشە دەکات و پەرەدەسێنێت.

٤ـ لەکۆتایی سەدەی یەکەمی کۆچی، ئایینی پیرۆزی ئیسلام لەرۆژهەڵات و رۆژئاوادا بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر بڵاو بوەوەو گەل و نەتەوە جیاوازەکان پۆل پۆل هاتنە نێو ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە، لەسنووری چینەوە تا دەگاتە ئەندەلوس، چونکە دینێکی حەقەو لەگەڵ سروشتی پاك و فیترەتدایە.

## ٢١ـ شەڕی سەختی نێوان مسوڵمانان

خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت (وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا وَاذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنْتُمْ أَعْدَاءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُمْ بِنِعْمَتِهِ إِخْوَانًا

وَكُنْتُمْ عَلَى شَفَا حُفْرَةٍ مِنْ النَّارِ فَأَنْقَذَكُمْ مِنْهَا كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ) ال عمران ١٠٣.

بەواتای) (هەوڵ بدەن) هەر هەمووتان بە توندی دەست بگرن بە ئایینی خواوەو پەرت و بڵاو مەبن، یادی ناز و نیعمەتی خوا بکەنەوە لە سەرتان،(چونکە) کاتی خۆی دوژمنی یەکتر بوون، ئەوە بوو دڵەکانتانی بەهۆی نیعمەتی (ئیسلامەوە)پەیوەست کرد بەیەکەوە و هەموو بونە برای یەکتر (هەروەها ئەو کاتە)ئێوە لەسەر لێواری چاڵێکی ئاگر وەستابونو (خەریك بوو بکەونە ناوی)بەڵام خوا (بە ڕەحم و میهرەبانی خۆی)لەو ئاگرە رزگاری کردن،ئا بەو شێوەیە خوا ئایەتەکانی خۆیتان بۆ روندەکاتەوە، بۆ ئەوەی هیدایەت وەربگرن. تەفسیری ئاسان لا ٦٣.

ئێمەش وەڵامی رەتکردنەوەی دەدەینەوە بەوەی،کە ئەم قسەیە پوچ و بەتاڵە چونکە لەسەردەمی محمددا شەڕ و پەلاماری یەکتردانی عەرەب لەو پەڕیدا بووە محمد بۆ خۆی لە ٢٩ شەڕدا بەشداری کردووە ٤٧ شەڕ کە محمد بەشداری تێدا نەکردووە بەڵکو یەکێك لە هاوەڵەکانی لە بری خۆی ناردووە. واتە تاکو کاتی مردنی محمد ٧٦ شەڕ رویداوە،هەرچەندە هەندێ سەرچاوە تەنها ئەو شەڕانەی کەوا محمد بە ٧٠ شەڕ دادەنێن،واتە تەنها ژمارەی ئەو هەموو شەڕانەی تاکو کاتی مردنی محمد لەنێون خودی عەرەبەکاندا رویداوە لەگەڵ ئەو شەڕانەدا کە خۆی بەشداری تێدا کردووە ٩٩ شەڕ بووە،وە کاتێکیش کە محمد مرد ئەبوبەکر هەڵسا بەشەڕ کردن لە دژی هەڵگەڕاوەکان لە ئیسلام کە هەمویان عەرەب بوون و دانیشتوانی ناوچە جیاجیاکانی دورگەی عەرەب بوون.

وە لەدوای مردنی عومەری کوڕی خەتابییش شمشێریان لە ملی یەکتر دەسوی، هەروەها عومەر و عوسمان بە کوژراوی مردن وە شەڕی (حوشتر) لە نێوان عائیشەی ژنی پێغەمبەر و عەلی کوڕی ئەبی تالیبی ئامۆزا و زاوای محمد رویدا.

پاشان شەڕ لەنێوان معاویەو عەلی حسێنی کوڕی عەلی و لەگەڵ محمدی کوڕی ئەبوبەکر، کە عەمری کوڕی عاص کوشتی. لەساڵی ٧١ کۆچیدا ئاژاوەی عبداللە ی کوڕی زوبێر و جەنگ لە نێوان ئەوو حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفیدا رویدا،کە لە سەردەمی خەلافەتی عبدولمەلیکی کوڕی مەروانی ئومەویدا بوو،کە حەجاج لەو جەنگەدا کوڕی زوبێر و ژمارەیەکی زۆر لە هەڵکەوتوانی ناو مسوڵمانانی کوشت و لەکاتی ئابڵوقەدانی  مەککەدا بەهۆی مەنجەنیقەکانیەوە هەندێکیشی لە کەعبە روخاند.

ئیسلامگەرەکان دەڵێن لە سەردەمی عومەری کوڕی عبدالعزیدا کە بە (خامس الخلفاء) ناوی دەبەن گوایە هێندە ئاسایش بووە وەکو ئەوەی گورگ و مەڕ بەیەکەوە ئاویان خواردبێتەوە، بەڵام ئەوە درۆیەکی شاخدارە چونکە هەر ئەو خەلیفەیە قەدەغەی کردووە، کەمەسیحیەکان ئەسپ سواربن، وە پۆشاکێکی بەسەردا فەرز کردبوون کە نیشانەیەکی وەهای پێوە بێت تاکو بناسرێنەوە، وە ئەو رەمزەی ئیسلام جاریەکانی خۆی خنکاندیان.

وە هەروەها ئەو غەدرە سەرزەنشتکراوەش،کە لەسەردەمی خەلافەتی عبداللە دا روویدا کە عبداللە لە تیرەی بەنی کیلاب بوو.ئەو غەدرەی کە کیلابەکان لە قەبیلەکانی بەنی فەزارەیان کرد،کە بەشێوەی فێڵ و هەڵخەڵەتاندن و سوێندی درۆ،کە شمشێریان لێ خستنەکارو زۆریان لێ کوشتن.

پاشان بەنو قەبیس هاتن و زۆریان لە فەزاریەکان و بەنو کیلابیش کوشت.ئابەو شێوە زەمانە بەنی کیلابی دەستدرێژکار وەرچەرخاند. وەکاتێك ئەم هەواڵانە بە عبدومەلیکی کوڕی مەروان گەیشتەوە ئەویش نامەیەکی بۆ حەجاج نوسی،کەلەو رۆژگارەدا حەجاج والی حیجاز و تائیف و یەمامەو یەمەن بوو،کە سواربێت و بچێتە سەر بەنی فەزارە،حەجاجیش چووە سەریان و هیچ (خەوبین، باڵغ، منداڵ)ێکی تێدا نەهێشتن مەگەر هەمووی کوشتن.

حاڵی عەرەب ئابەم شێوە بوو لە سەردەمی ئیسلامدا، کە روبەڕوو یان بەفێل و غەدر لە پشتەوە یەکتریان دەکوشت.

ئایا ئەو ئاشتی و راهاتن لەگەڵ یەکتر و چاك بوون و تەبایی نێوان،کە ئیسلام هێنایە ناو عەرەبەوە کامەیە؟جگە لە ١٤ چەرخی خوێنین و ئەو پەڕی هەژاری،ئەم ئێستاشی لەسەر بێت هەتا عەرەب وابەستی(الجهل، والقتل، قورئان) بێت.واتە گیرۆدەی بلێندگەرایی ئایینی بێت و وەها بزانێت بەتەنها یەك هەقیقەت هەیە کە ئەویش لای ئەوە ئەوەو دەرەوەی(عەرەبایەتی و ئیسلام) ببوغزێنێت.،نەك خودی عەرەب و بەعەرەب کراوەکان ئارامی بەخۆیانەوە نابینن، بەڵکو پشێوی و ئاژاوە بۆ گشت گەلانی دنیاش دەخولقێنن،وە چیتر بۆ عەرەب ئیسلام ناچێتە سەر، کە پێناسیان شەڕەنگێزی و نەزانی و ئەنفالچێتی بێت.

### لە وەڵامی نوسەرو وەرگێڕدا دەڵێین:

عەرەبەکان لەپێش ئیسلام و سەردەمی نەفامیدا بەردەوام لەشەڕو ئاژاوەو دووبەرەکیدا بوون، ژیانیان لێوان لێو بوو لەرق و قین و ئاژاوەو زوڵم و ستەم کردن، لەسەر بچووکترین شت شەڕیان دەکرد.بەڵام دوای ئەوەی کە مسوڵمان بوون و پابەند بوون بەپەیام و بەرنامەی خواوە خۆشەویستی و برایەتی و یەکریزی و هاوکاری و هەماهەنگی جێگای شەڕو دووبەرەکی گرتەوە.بۆ نموونە شەڕی نێوان ئەوس و خەزرەج لەپێش ئیسلامدا، هەر بەگەیشتنی پێغەمبەر بۆشاری مەدینە یەکێك لەو کارە گرنگانەی کردی درووستکردنی برایەتی و تەبایی بوو لەنێوان ئەوس و خەزرەجدا و هەردوو هۆزییش بەشێوەیەکی جوان و ناوازە پێشوازیان لە موهاجیرەکان کرد.

ئەوشەڕانەی لەسەردەمی پێغەمبەرد(صلى الله علیەواله وسلم) روویانداوە شەڕی نێوان نەتەوایەتی و خێڵەکی نێوان عەرەبەکان نەبووە، بەڵکو شەڕی نێوان

موشریك و بێباوەڕان بووە لەگەڵ مسوڵمانانداو، مسوڵمانانیش شەڕی بەرگرییان کردووە لەئایین و بیرو باوەڕەکەیان.

بەڵێ ڕاستە دوای وەفاتی پێغەمبەر (صلی الله علیه‌واله وسلم) هەندێ کێشەو جیاوازی کەوتە نێوان مسوڵمانانەوە و چەند شەڕێکی نەخوازراو ڕوویانداو ژمارەیەکی بەرچاو لەمسوڵمانان کوژران.

لاپەڕەکانی مێژوو پڕە لەسەروەری و شانازی لەزۆر بواری جیاجیادا، بەڵام بێ کەلێن و کەموکورتی نەبووە، چونکە جیاوازی هەیە لەنێوا ئیسلام وەك ئایین و بەرنامەی خوای گەورە کەخۆی لە دوو سەرچاوەی سەرەکیدا دەبینێتەوە، لەگەڵ مێژووی ئیسلامی کەتایبەتە بە مسوڵمانانەوە بەدەسەڵاتدارو جەماوەرەوە، بۆیە مێژوو تۆماری ڕووداوەکانی پێشووە بە باش و خراپەوە.

ئەم قۆناغە کارەساتێك بوو تووشی مسوڵمانان بوو، بەڵام دواتر نەماو چارەسەر کرا، گیانی برایەتی و یەکریزی گەڕایەوە نێو مسوڵمانان.ئەمەو ئەو شەڕو جیاوازیانە نەبووە مایەی لادان و دەرچوونیان لە ئیسلام.ئەمەو بوونی کێشەو گرفت لەنێوان خەڵکیدا کارێکی حەتمیەو هەر ڕوو دەدات، مسوڵمانانیش فریشتە نین و پارێزراویش نین لەهەڵەو کەموو کورتی، هەروەك خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی(وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ النَّاسَ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلاَ يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ إِلاَّ مَنْ رَحِمَ رَبُّكَ وَلِذَلِكَ خَلَقَهُمْ وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ) هود ١١٨ـ ١١٩

به واتای) خۆ ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە ئەوە هەموو خەڵکی دەکرد بەیەك تاقم و کۆمەڵ،(بەڵام) بەردەوامیش ئەو خەڵکە جیاوازن لە نێوانی یەکتردا لە ئایین وبەرنامەو بۆچوندا.

مەگەر ئەوەی بەزەیی پەروەردگارت گرتبێتیەوە، هەر بۆ ئەو مەبەستەش خوای گەورە دروستی کردوون (واتە) بە شێوەیەك دروستی کردوون بتوانن ئازادی بیروباوەڕ و بۆچونیان هەبێت، ئینجا ڕاستیان پێ بلێت و بۆیان ڕونبکاتەوە و

بڕیاری پەروەردگاری تۆ دەرچووە و تەواو بووە، کە دۆزەخ پڕ دەکەم لە گرۆی پەری و خەڵکی (ئەوانەی خۆیان شیاوی ئاگر دەکەن). تەفسیری ئاسان لا ٢٣٥.

هەروەها مسوڵمانان توانیان شارستانیەکی پێشکەوتو و ناوازە دروست بکەن و لەهەموو لایەکی جیهانەوە خەڵکی رووی تێبکات بۆ فێربونی زانست و مەعریفە بەهەموو بەشەکانیەوە، بۆسەدان ساڵ رابەرایەتی جیهان بکەن،زۆرێك لە نوسەرو بیرمەندان و مێژوونوسانی رۆژئاوا دان بەم راستیانەدا دەنێن و دەڵێن رۆژئاوا قەرزاری جیهانی ئیسلامیە.

ئەمەو بەپێی سەرچاوەباوەڕپێکراوەکان ژمارەی غەزاکانی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه‌واله وسلم) (٢٨) غەزایەو لە (٩) غەزادا شەڕ رویداوەو ئەوانی تری بەبێ شەڕ ئامانجی خۆی پێکاوەو خۆیشی بەشداری(٩) یانی کردووە، سەبارەت بە عومەری کوڕی عەبدول عەزیز (رەحمەتی خوای لێبێت) رێزی زۆری نا مسوڵمانەکانی گرتووە بەتایبەت لەگاورەکان، زۆر مافی بۆ گەڕاندوونەتەوە مێژوو گەواهی ئەو راستیانەیە. سەبارەت بەوەی لەلایەن جاریەکانی خۆیەوە خنکێنرابێت، درۆیەکی شاخدارە، ناوبراو بەهۆی دادپەروەری و دڵسۆزیەوە کەهیچ مرۆڤێکی راستگۆ نکوڵی لێناکات، دەرمان خوارد کراوەو بەهۆیەوە کۆچی دوایی کردووە، تەنانەت لەو کەسەش خۆش بووە کە بە پارەو فیت و پیلانی هەندێك لە میرەکانی بەنی ئومەیە ئەنجام دراوە چونکە بەرژەوەندی مادی و دەسەڵاتەکانیان لەسایەی کەسێکی دادپەروەری وەکو ئەودا کەوتبووە مەترسیەوە.

بەردەوام قورئان فاکتەری برایەتی و یەکڕیزی نێوان مسوڵمانان بووە، هەرکاتێکیش مسوڵمانان دوور کەوتبێتنەوە لەقورئان و پەیامی ئیسلام بەئەندازەی دوورکەوتنەوەیان تووشی زیان و نوشستی بوونە مێژووی کۆن و نوێ شاهیدی وتەکانمانە.

ئیسلام ئایین و بەرنامەی خوایە بۆسەرجەم مرۆڤایەتی و نەك ئایینی عەرەب یان نەتەوە، یان هۆزێکی دیاری کراو، ئیسلام مایەی سۆزو بەزەییە بۆسەرجەم

مرۆڤایەتی (ومارسلناك الا رحمةللعالمين) دژی شەڕو ستەم و خراپەکارییە، وتەکانی نوسەر بێبنەماو لاوازەو پێچەوانەیە بەهەموو پێوەرە زانستی و بابەتیەکان، ئەمڕۆ زۆربەی مسوڵمانانی جیهان عەرە ب نین و لە مسوڵمانە عەرەبەکان زیاتر پابەندن بەئیسلام و سەنگ و کاریگەری خۆشیان هەیە، وڵاتانی وەك و ئەندونیسیا، مالیزیا، تورکیا، بەنمونە.

وەرگێڕیش بەبێ بەڵگەو ئاماژەدان بەسەرچاوەی راست و باوەڕپێکرا وبە تێکەڵی چەند خالێك دەوروژێنی کەتایبەتە بەشەڕی نێوان مسوڵمانان دەیەوێت بیکاتە بەڵگەو ئایینی پیرۆزی ئیسلامی پێ لەکەدار بکات، ناوبراو وەك وتمان نەیتوانیوە وتەکانی بسەلمێنێت گریمان گەر بەشێکی ئەو قسانەش راست بوون ئەوا ئەو شەڕو بارگرژی و لادانانە ماڵ نین یەسەر ئیسلامەوە بەڵکو ئەنجامدەرەکانی هەرکەسێکیش بن تاوان بارن و گەر لەسزای دونیایی دەرباز بوو بێتن ئەوا سزای دوارۆژ دەیانگرێتەوەو هەرگیز دەرباز نابن.

ناو براو مسوڵمانان بەشەڕەنگێزو ئەنفالچی لەقەڵەم دەدات، بەو بێ ویژدانە دەڵێین ئایا جەنگی جیهانی یەکەم و دووەم کەملیۆنەها مرۆڤ بوونە قوربانی و چەکی ئەتۆمی و کیمیاوی تێدا بەکارهات، کێ ئەنجامی دا، هەموو شەڕو کوشتارەکانی تر لەئاستی جیهانیدا تا ئەم ساتە وەختانە کێ کردوو یەتی و کێ لێی بەرپرسیارە، ملیۆنەها مسوڵمان لەسەردەمی ستالین و حوکمە کۆمۆنیستەکانی ئەوروپای رۆژهەڵات و رژێمە عەلمانییە دیکتاتۆرەکان کوژران و بریندار بوون، کێ کردی و لەپێناوی چیدا بوو، پێشترشەڕی خاچپەرستەکان کێ کردی و بۆچی کرا، ئەوەی رژێمە دیکتاتۆرو عەلمانیەکانی ناوچەکە کردوو یانەو دەیکەن و مسوڵمانانیش هەر قوربانین، با دوور نەڕۆین شەڕەکانی رژێمە عەلمانیەکانی عێراق بەگشتی و بەعسیەکان بەتایبەتی دژ بەگەلی کورد کەچەکی کیمیاوی درووستکراوی رۆژئاواو لەبەر چاوی رۆژئاوادا بەکار هاتووە، ئایا سەردەمی دەسەڵاتی ئیسلامی خوێناوی بوو یان سەردەمی دەسەڵاتی رۆژئاواو

عەلمانیە دەستکردەکانی کی ٚ ئاسایشی مرۆڤایەتی خستۆتە مەترسیەوە زلهێزو داگیرکەران یان مسوڵمانان، ئەوەی تۆزقاڵێك ویژدانی هەبێت و چاویلکەی رۆژئاوایی لەسەر چاوی لاببات ئەوا راستیەکانی بۆ روون دەبێتەوەو هاش و هوشی نەیارانی ئیسلام و ئەڵقە لەگوێکانی فریوی نادات.

## سەرچاوەکان:

- تفسير البيضاوي، المسمى انوار التنزيل واسرار التاويل، للامام القاضي ناصرالدين ابي سعيد عبدالله ابي عمربن محمد الشيرازي البيضاوي المتوفي سنة٧٩١، وبهامشه حاشية العلامةابي الفضل القرشي الصديقي الخطيب،حققه وبين الاحاديث الموضوعة والضعيفةوالاسرائيليات فيه.

الشيخ عبدالقادر عرفان العشا حسونة، دارالفكر، بيروت ١٩٩٦م.

- القران ونقض مطاعن الرهبان، الدكتور صلاح عبدالفتاح الخالدي، دار القلم - دمشق، الطبعة الاولى ١٤٢٨- ٢٠٠٧

- تنزيه القران الكريم عن دعاوى المبطلين، د. منقذ السقار (انترنيت).

- الاجوبة الجلية في الرد على الاسئلة المسيحية، شبهات نصارى حول القران الكريم، الحسيني الحسيني معدي، دارالكتاب العربي، دمشق - القاهرة،الطبعة الاولى ٢٠٠٧ (انترنيت)

- تەفسیری ئاسان، مامۆستا برهان محمد امين

- سایتی (معهد افاق التيسير للتعليم عن بعد)

- سایتی(رسول الله)

# پێشەکی

هەرچەند کتێبی ئایا قورئان پارێزراوە لە نوسینی (عبدالله عبدالفادي)، ئاستێکی تەواو نزمو نازانستی هەیەو کۆنیش بوە، پێویستی بەزۆر لەسەروەستانو مشتومڕ نییە.

وەلێ چونکە کتێبەکە تازەکراوە بە کوردیو ئەمڕۆش لەشێوەی ئەو گومانانە خەڵکێکی تریش دەیانوروژێنن، بۆیە کە پرۆژەی (تیشك) وەڵامدانەوەی بەشێکی کتێبەکەی پێ سپاردم، داواکەیانم قبوڵکردو هەوڵمدا بە کورتیو پوختی وەڵامی بدەمەوە.

وادەزانم ئەو گومانو پرسیارانەی کە ئەمڕۆ لە مەیدانەکەدا دەوروژێنرێت، بەپێی پێویست وەڵامدانەوەیان بەجێ دەبێت، خوێنەرێکی زۆریش چاوەڕوان دەکەن.

بەڵگەشم هەشت ساڵی ئەزموونە لە پرۆژەی (تیشك)، کە تائێستا نەوەد کتێبی بڵاو کردۆتەوەو بەشی هەرە زۆریان تەرخانن بۆ وەڵامدانەوە، جێگای دڵخۆشیە کە پێشوازییەکی بەرفراوانیان لێدەکرێتو بەشێکیان دووبارەو سێ بارە بە تیراژی زۆر چاپ دەکرێنەوە.

من نامەوێت درێژە بەم پێشەکیە بدەمو هەڵسەنگاندنی کتێبی (ئایا قورئان پارێزراوە؟)و وەرگێڕانە کوردیەکەی بکەم.

چونکە لە کتێبی یەکەمی وەڵامدانەوەکە برای بەڕێزم کاك ئیکرام کەریم بەتێرو تەسەلی لەو مەسەلەیە دواوە.

بۆیە ڕاستەو خۆ دێمە سەر وەڵامی بەشی (سێهەم، کە پرسیارە ڕەوشتیەکانە)و لە لاپەڕە (٨١) تا لاپەڕە (٩٨)ی کتێبەکەیە، شایەنی وتنە سەرباسەکانی ئەم کتێبە وەك لە کتێبەکەی (ئایا قورئان پارێزراوە) چۆن هاتوون وەك خۆیان دانراونەتەوە.

**خوا پشت و پەنامان بێت – نوسەر ٢٠١٢\١٢\٢٢**

## ١ـ حەڵاڵكردنی ئینكاریكردن لە خوا

ئەم ناونیشانەی سەرەوە دەستپێكی ڕەخنە، یان پرسیارە ڕەوشتییەكانی كتێبی (ئایا قورئان پارێزراوە؟)یە، بۆ ئەم مەبەستەش ئایەتی (١٠٦)ی سورەتی (النحل)ی بە بەڵگە هێناوەتەوە، گوایە مۆڵەتی بە كوفر كردن و نكوڵی كردنی لە بوونی خوا داوە.

ئایەتەكەش ئەمەیە (مَن كَفَرَ بِاللَّهِ مِن بَعْدِ إيمَانِهِ إِلاَّ مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالإِيمَانِ وَلَكِن مَّن شَرَحَ بِالْكُفْرِ صَدْرًا فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِّنَ اللَّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ) النحل/ ١٠٦).

واتە: هەركەس بڕوای بەخوا بووبێ‌و لەپاشان حاشای لێ بكات، (سزا دەدرێت) مەگین كەسێ ناچار بكرێ‌و لە باوەڕی دڵنیا بێت. بەڵام كەسێك بە حاشاكەی دڵخۆش بێت، بەرتوڕەیی خوا كەوتون‌و ئازاری زۆر دژوار دەدرێن.

لە بەرامبەریشدا وتەیەكی بە ناوی (مەسیح)ەوە (درودی خوای لەسەر بێت)، گواستووەتەوە، كە بە توندی بەگژ كوفر كردن و پاشگەزبوونەوەدا دەچێت، هەرچەندە بۆ تێگەیشتن لە حوكمی ئایەتێك یان فەرموودەیەك، پێویست دەكات، ئەو ئایەت و فەرموودانەی لەو بارەوە هاتوون، كۆبكرێنەوە و بە وردی لێیان ڕابمێنرێت تا حوكمەكە ڕووندەبێتەوە، بەڵام خۆشبەختانە ئەو ئایەتێكی بە بەڵگە هێناوەتەوە كە ماناكەی ئەوەندە ڕوونە، ئەگەر ئایەت و فەرموودەكانی دیكەش كە لەو بارەیەوە هاتوون، كۆنەكرێنەوە، هێشتا ماناكەی دژ بە بۆچوونی نووسەرە، كە گوایە ئینكاریكردنی پەروەردگاری حەڵاڵ كردبێت، بە پێچەوانەوە ئەو ئایەتە هەڕەشەی سەخت لەوانە دەكات كە مسوڵمانن و پاشان لە مسوڵمانێتییان پاشگەزدەبنەوە.

ئەم ئایەتە و كۆمەڵە ئایەت و فەرموودەیەكی تر، ئەوەندە هەڕەشەیان لەسەر پاشگەزبوونەوە كردووە، كە زۆربەی هەرە زۆری زانایانی ئیسلام فەتوای

کوشتنی ئەو جۆرە کەسانەیان داوە کە پاشگەزدەبنەوە لە ئیسلام و بێدین دەبنەوە.

ئەوەندە هەیە ئەم ئایەتە پیرۆزە، دادپەروانە مامەڵە دەکات و جیاوازی دەکات لە نێوان کەسانێك کە بە خۆشیی خۆیان دەستبەرداری ئیمانەکەیان دەبن و کەسانێکیش کە دەستبەردارنەبوون، بەڵام بە تۆپزی و لەژێر هەڕەشەی کوشتندا وشەیەکی کوفریان لە دەم دەردەچێت، بێ ئەوەی دڵیان لەخشەی تێبکەوێت.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکەش زانراوە، وەك (إبن كثير) دەگێڕێتەوە: بتپەرستەکان عەماری کوڕی یاسریان برد و ئەوەندەیان ئەشکەنجەدا، تا چەند قسەیەك لەوانەی دەیانویست پێیان کرد، دوایی هات و ئەمەی بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: دڵت چۆنە؟ وتی: بە ئیمان دامەزراوە. فەرمووی: ئەگەر ناچاریان کردیتەوە بیلێرەوە، پاشان ئەم ئایەتە دابەزی (إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالْإِيمَانِ)[٥٠٤]

نووسەری (ئایا قورئان پارێزراوە) هەر بۆ ئەوەی ڕەخنە بگرێت، دوای گێڕانەوەی سەربووردەکە لە تەفسیری (البيضاوي)یەوە، قسەیەکی ئەوی کردووەتە دەستپێچ، کە دەڵێت: (ئەمەش بەڵگەیە لەسەر مۆڵەتدان بە کوفرکردن لە کاتی زۆرلێکردندا).

هەرچەندە بە پێودانگی ئەم سەردەمە، ڕەخنەکە لە بەرژەوەندیی ئیسلامی پیرۆزە، چونکە دیارە ئایینی ئیسلام هێندە ڕێزی مرۆڤی لایە و ژیانی دەپارێزێت و گیانیی لابەنرخە، تەنانەت مۆڵەتی داوە بە مسوڵمانان کە بۆ پاراستنی ژیانی خۆیان، بە ناچاری قسە بە بیر و باوەڕەکەی خۆیان بلێن.

بەڵام ئەگەر وردتر لەو حوکمە بڕوانین بەم شێوەیە:

گەر ئیمانداریك بۆ دەستبەرداربوون لە ئیمانەکەی هەڕەشەی کوشتنی لێکرا و دڵنیاش بوو هەڕەشەکە جێبەجێ دەکرێت، ئەو کاتە بە ناچاری بۆی دروستە کە

---

[٥٠٤] تەفسیری (أبن كثير) ب١ ل٥٦٨.

بە سەرزارەکی کوفری لە دەم دەربچێت کە پێی دەوترێت (ڕوخسەت)، هەرچەندە باشتر وایە (عەزیمەت) هەڵبـژێرێت و خۆڕاگربێـت و تـا دەکوژرێـت هـیچ هەڵەیـەك نەڵێت، وەك: خۆڕاگرییەکـەی: یاسـر و سـومەیە و خوبـەیب و بـیلال کـە جگـە لـە بـیلال، سـیانەکەی تریـان لـەژێر ئەشـکەنجەدا گیانیـان دەرچـوو، بـێ ئـەوەی وشەیەکیان لەدەم دەربچێت بێباوەڕەکان ڕازیی بکەن.[٥٠٥]

سەیر ئەوەیە کە سەرنجی تەفسیری (البیضاوی) دەدەیـت، دەبینیـت نووسـەر تەفسیرەکەی بژاردە کردووە و قرتاندویەتی، هەر ئەوەندەی لێ گواسـووەتەوە کـە مەرامەکەی خۆی پێ بەدیبهێنێت و بیکات بە ڕەخنە لە قورئانی پـیرۆز، ئەگـەر نـا (البیضاوی) بە تێروتەسەلی مەسـەلەکەی هێنـاوە، کـە دەیخوێنیتـەوە گرفـت یـان ڕەخنە هەڵناگرێت، با سەرنجی تەفسیرەکە بدەین، (البیضاوی) دەڵێـت: (ئەمـەش بەڵگەیە لەسەر مۆڵەتدان بە کوفرکردن لە کاتی زۆرلێکردندا، هەرچەندە باشتر وایە خۆی لێبپارێزێت، لەبەر شکۆی ئایینەکە، وەك ئـەوەی بـاوکی عـەمار کـردی، وەك ئەوەش کە دەگێڕنەوە: موسەیلەمە دوو کەسی گرت و وتی بە یەکێکیان: چـی بـە (محمد) دەڵێیت؟ وتی: پێغەمبەری خوایە. وتی ئەی بـە مـن چـی دەڵێیـت؟ وتـی: هەروەها تۆش پێغەمبەری خوایت. ئەوی ئازاد کرد. وتی بە کەسەکەی تر: چی بـە (محمد) دەڵێیت؟ وتی: پێغەمبەری خوایە. وتی: ئەی بە مـن چـی دەڵێیـت؟ وتـی: کەڕم. سێ جار پرسیارەکەی لێ دووپات کردەوە، ئەویش هەمان وەڵامـی دایـەوە، بۆیـە کوشـتی. ئـەم هەواڵـە گەیشـتە پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئـەویش فـەرموی: یەکەمیان ڕوخسەتی خوایی هەڵبژاردووە، دووەمیشیان قسـەی حـەقی ڕاگەیانـدوە پیرۆزی بێت.[٥٠٦]

---

[٥٠٥] بەسەرهاتەکانیان لە زۆربەی سەرچاوە باوەڕپێکراوەکاندا باسکراوە.

[٥٠٦] تەفسیری البیضاوی ٣\٢٤١-٢٤٢.

دەبوو نووسەر دەستپاك بوایە و هەموو قسەكانی بەیزاوی لەو بارەوە بگواستایەتەوە، كە بەیزاوی خۆڕاگری و عەزیمەت بە پەسەندتر دادەنێت نەك ڕوخسەتەكە.

لەبەر ڕوونیی بابەتەكە، وانازانم لەم بارەیەوە پێویستمان بە زیادە لەسەر ڕۆشتن هەبێت، تەنیا ئەوەندە بەسە بڵێین:

ئیسلام واقعییانە لە مرۆڤ و تواناكانی دەڕوانێت و مامەڵەی لەگەڵ دەكات. لەكاتێكدا ئیمانداران تووشی ئەشكەنجەی تاقەتپڕووكێن دەبنەوە، پێی باشە خۆڕاگر و دامەزراو بن، با گیانیشیان لەو پێناوەدا بەخت بكەن، وەلێ ئەگەر كەسێك بەرگەی نەگرت و كوفرێكی لە دەم دەرچوو، ئیسلام ئەوەی لێناگرێت، چونكە بە زۆر كوفرەكەی پێكراوە. ئەم مۆڵەتدانەش ناچارییە و بە چەند مەرجێكەوەیە، كە پێش ئیسلامیش لە هەموو ئایینەكاندا ڕێگەی پێدراوە، چونكە سروشتی مرۆڤ ئەوە دەخوازێت.[٥٠٧]

جگە لەوەش ئەو بە زۆر كوفرپێكردنە هیچ حوكمێكی لەسەر دانامەزرێت و بە گۆڕانكاری حساب ناكرێت، بە تایبەت ئەمڕۆ لە بەندەكانی جاڕنامەی گەردوونیی مافەكانی مرۆڤدا، بە ئاشكرا ئەو زۆرلێكردنە لە گۆڕینی بیروباوەڕ، ڕەتدەكرێتەوە و بنیاتی لەسەر نانرێت. لە هەموو یاسا نێودەوڵەتییەكانیشدا دانپێدانانی زۆرەملێ هیچ دادوەرێك حوكمی لەسەر نادات و خاوەنەكەی پێ تاوانبار نابێت، با دانی بە تاوانی گەورەشدا نابێت.

دەی مادام هەرچی ئایین و یاسا هەیە لەسەر بێتاوانیی دانپێدانانی زۆرلێكراو كۆكن، كەواتە ئەم حوكمە شەرعییەی قورئان جێگەی شانازییە نەك ڕەخنە لێگرتن.

---

[٥٠٧] ئەوەی حەز دەكات زیاتر لەم باسە بخوێنێتەوە، با بگەڕێتەوە بۆ تەفسیری ئایەتەكە لە (تفسیر الكبیر)ی ئیمامی ڕازیی.

ئەم ڕاستییە هێندە زەقە، بابای وەرگێڕی کتێبی (ئایا قورئان پارێزراوە) کردووە بە گژی قەشەی نووسەری کتێبەکەدا و ناچاری بووە بەرپەرچی بداتەوە و پەراوێزێکی دوور و درێژتر لە وەرگێڕانەکەی لەسەر بنووسێت و لە بەشێکیدا بڵێت: (هەڵوێستی پێغەمبەر لەمەدا نەرمونیانییەکی پێوە دیارە، واتە ئەم ڕەخنەیە لەم باسەدا بە نموونە هێنراوەتەوە، لە بەرژەوەندیی هێڵە گشتییەکانی باسەکانی ئەم نووسینەدا نییە..)[٥٠٨].

ڕەخنەی وەرگێڕ لە نووسەر ئەوەیە، کە ئیسلام ئایینی توندوتیژی و قبوڵنەکردنی بیروڕای جیاوازە، ئەم باسەی نووسەر پێچەوانەکەی دەسەلمێنێت، واتە: دەریدەخات کە ئیسلام هێندە نەرمونیانە تەنانەت لادانیشی لە دینەکەی خۆی لا قبوڵە. سەیریش ئەوەیە وەرگێڕ مۆدێلێکی نوێی لە وەرگێڕاندا داهێناوە، کە پەراوێزەکانی خۆی بە جیا لەگەڵ نووسینەکەدا داناوە و نەیخستونەتە پەراوێزی کتێبەکەوە، بەمەش کتێبەکە دەبێتە تێکەڵەیەك لە نووسین و وەرگێڕان.

لە بەشێکی ئەو پەراوێزانەی وەرگێڕدا دەردەکەوێت، مەرامی (نووسەر) و (وەرگێڕ) لەو کتێبەدا پێچەوانەن و هەریەکەیان بەنیازێکەوە کتێبەکەی بڵاوکردووەتەوە. هەرچی نووسەرە وەك مەسیحییەکی بەرگریکار و دەمارگیر بۆ مەسیحیەت دەیەوێت بەراوردی دەقەکانی ئینجیل و قورئان بکات، ئەوانەی ئینجیل بە ڕاست لە قەڵەم بدات و ڕەخنە لە قورئان بگرێت. برادەرە وەرگێڕەکەش دەیەوێت هەموو ئایینەکان، تەنانەت باوەڕ بە خوای پەروەردگاریش ڕەتبکاتەوە، بۆیە لێرە و لە شوێنی دیکەشدا، قسەکانیان بەریەك دەکەون و وەرگێڕ کۆمێنتی خۆی هەیەو قسەکانی قەشە بەرپەرچ دەداتەوە، وەك لە نموونەی پێشوودا دەردەکەوێت.

---

[٥٠٨] ئایا قورئان پارێزراوە؟ ل٨٢.

## ٢ـ حەلاڵكردنی سەرپێچیكردن لە سوێندا.

ڕەخنەیەكی دیكەی نووسەر لە ئایەتی (٢٢٥)ی سورەتی (البقرة)یە، كە دەفەرموێت (لَا يُؤَاخِذُكُمْ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَكِنْ يُؤَاخِذُكُمْ بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ).

واتە: خوا بەسوێندی سەرزارەكی گوناهو لەسەر نانوسیێ، بەڵام ئەگەر لە تەهی دڵتانەوە بێت، خودا لێو دەپرسێتەوە. خودا لەهەڵە دەبوریێو لەسەر خۆیە.

پاش ئەوەی نووسەر ڕاڤەی ئایەتەكەی لە تەفسیری (البیضاوی) گواستووەتەوە، كە زۆر ڕۆشنە و جێگەی ڕەخنە لێگرتن نییە، كەچی ئەو سوێندە سەرزارەكییانە بە هاندان بۆ درۆكردن دادەنێت و دەپرسێت: (ئایا بنەماكانی زێدەچاكی و فەزڵ و بەرزییە، كە مرۆڤ درۆ بكات؟)

بێگومان نەخێر، درۆ لە خراپترین ئەو سیفەتانەیە كە ئیسلام بە توندی هەڕەشەی لەسەر كردووە. تەنانەت لە هەندێك شوێنی قورئاندا درۆزن بە هاوتای كافر هاتووە، لە دەیان شوێنیشدا، هەڕەشەی سەخت لە درۆكردن كراوە، صەدان فەرموودەش هەن دژ بە درۆكردن و لە هەندێك شوێنیشدا بۆ ئاستی پتپەرستی هاوشانكراوە، ئەوەتا پێغەمبەری ئیسلام ﷺ دەفەرموێت (الا أنبئكم بأكبر الكبائر قالوا بلى بارسول الله قال الأشراك بالله وعقوق الوالدين، وكان متكئًا فجلس وقال الاوقول الزور وشهادة الزورفمازال يكررهاحتى قلنا ليته سكت).[٥٠٩]

واتە: ئاگادارتان بكەم لە گەورەترین تاوان وتیان بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرموی: هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردانو بێ گوێی دایكو باوك، پێغەمبەری خوا پاڵی دابوەوە جا دانیشت و فەرمووی: ئاگاداربن هەروەها قسەی درۆو شایەتی درۆ، ئەوەندە ئەم وتەیەی دووبارە كردەوە تا وتمان خۆزگە بێ دەنگ بوایە.

---

[٥٠٩] متفق عليه.

تەنانەت کە لە پێغەمبەریان پرسی: دەگونجێت مسوڵمان زینا بکات، دزی بکات؟ فەرمووی: بەڵێ. بەڵام کە پرسییان: ئەی دەگونجێت درۆ بکات؟ فەرمووی: نەخێر.

بەڵکو لە ئیسلامدا درۆ بە سۆعبەتکردنیشەوە دروست نییە، وەك ئەو جارەی کە دایکەکە بە منداڵەکەی وت: وەرە بتدەمێ، (خورمایەکی پێبوو)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر هیچت پێ نەبوایە بە درۆ حسێب دەبوو بۆت.

هەر لەبەر ئەو هەڕەشە توندانەیە لە درۆ و درۆزنان، کە زانایانی فەرمودە ئەگەر درۆیەکیان لە فەرموودەناسێك بیستبێت، بەسبووە بۆ ئەوەی ئیتر فەرموودەی لێوەرنەگرن.

تەنانەت خراپترین جۆری درۆ بەوە دادەنێن کە کەسێك لە قازانجی ئیسلام فەرمودەیەك بە درۆ بگێڕێتەوە، با نیازیشی گەڕانەوە و پابەندبوونی خەڵکیش بێت بە ئیسلامەوە.

دەبوو نووسەر لەبری ئەو پرسیارە گوماناوییە بێ بنەمایە، ئایەتەکەی تەواو بخوێندبایەوە کەتیایدا دەفەرموێت (لاَ يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِى أَيْمَانِكُمْ وَلَاكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الأَيْمَانَ فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ ذالِكَ كَفَّارَةُ أَيْمَانِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ وَاحْفَظُواْ أَيْمَانَكُمْ كَذلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ ءايَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ) (المائدە٨٩).

واتە: خوا بەسوێندی سەرزارەکیو دوور لەمەبەست بە گوناهبارتان دانانێت بەڵام بەسوێندێ لەناخی دڵتانەوە بیّو نەیبەنە سەر، بەگوناهبارتان دادەنێو لە بارتەقای ئەوەدا خواردن بدەن بە دە هەژار. لەو خواردنەی بە ئاسایی دەیدەن بە خێزانی خۆتان. یان دەبێت جلکی دەهەژار باربو دەدەن. یان کۆیلەیەك ڕزگار بکەن، کەسێك ئەمانەی نەبوو با سێڕۆژان بەڕۆژوو بێت. ئەمە قەرەبووی

سوێنتتانە کە بەئەنقەست خواردبێتو، سوێندی خۆتان بپارێزنو بەجێی بێنن. ئاوا خوا نیشانەکانی خۆی بۆتان ڕووندەکاتەوە، کە ئێوە شوکرانەی بکەن.

هەروەها نووسەر دەبوو ئاگاشی لە جۆرەکانی سوێند بوایە لە ئیسلامدا، کە جۆرێکیان سوێندی درۆیە (الیمین الغموس)و گوناهەکەی هێندە گەورەیە کەفارەتیشی نییە، بەڵام ئەو سوێندانەی بۆ ئایندە دەخورێت، دوایی خاوەنەکەی وادەزانێت بیشکێنێت باشە، ئەمەیان کەفارەتی دەدرێت. جۆری سێهەمیش کە باسەکەی نووسەرە، ئەو جۆرە سوێندانەیە کە مرۆڤ بەبێ نیاز لە دەمی دەردەچێت (یمین اللغو)، ئەمجۆرە سوێندە لەبەرئەوەی کابرا بێ مەبەست دەیڵێت و زمانی لەسەری ڕاهاتووە، لە ئیسلامدا حسابی لەسەر ناکرێت و خاوەنەکەی پێی تاوانبار نابێت.

بۆ زیاتر تێگەشتن لە سوێندی سەرزارەکی (یمین اللغو) ڕەنگە کێرانەوەی ئەم ڕووداوە بەسبێت:

پێغەمبەری خوا ﷺ چەند هاوەڵێکی لەگەڵ دەبێت، بەلای خەڵکێکدا تێپەڕین کە نیشانەشکێنییان دەکرد، یەکێکیان کە تیرەکەی هاوێشت، وتی: بەخوا پێکام، بەڵام نەیپێکابوو، هاوڕێیەکی پێغەمبەر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا سوێندەکەی کەوت، ئەویش فەرمووی: سوێندی نیشانەشکێنان لەغوە و کەفارەتی نییە.

هەر لەوبارەشەوە عائیشە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (سوێندی ـ لەغو ـ) ئەوەیە کابرا لەماڵەکەی خۆی دەڵێت، بەرەوەڵا، نەوەڵا).[٥١٠]

دەبینین ئەمڕۆش لەو جۆرە سوێندانە زۆر دەخورێت و لە دەم دەردەچێت، بە بێ مەبەستی درۆکردن.

بەڵام لە ئیسلامدا نەك هەر ئەو سوێند خواردنە، بەڵکو بەبێ سوێندەکەشی، ئەگەر بابای قسەکەر، مەبەستی درۆکردنبوو، یان زانی قسەکە درۆیە، بێگومان حەرامی وتووە و قسەکەی نادروست و گوناهە، با سوێندیشی لەسەر نەخواردبێت.

---

[٥١٠] التفسير الكبير الامام فخر الدين الرازي ج٥-٦ ص٨٢.

وابزانم تا ئێرە وەڵامی پرسیارەکەی عەبدولفادی نووسەرمان دایەوە و ڕونمانکردەوە کە ئیسلام درۆکردنی حەڵاڵ نەکردووە.

سەبارەت بە وەرگێڕی کتێبەکەش، لەگەڵ ئەوەی زمانی عەرەبیی نووسینەکە زۆر ئاسانە، وەلێ وەها دیارە وەرگێڕ لە وەرگێڕانە حەرفییەکەشیدا بۆ زمانی کوردی، ساتمە دەکات، تەنانەت لە عەرەبییەکەدا هەڵەیەکی چاپ کراووە و لە بری وشەی (لایعدبە) کە لە تەفسیری (البيضـاوي) هێناویەتی بە (لانعتد بە)، کە بەم هەڵەیە سیاقی ڕستەکە تێکدەچێت، وەرگێڕی بەستەزمان هەر بەو هەڵەیەوە وەریگێڕاوە.

لەوەش ناقۆڵاتر، مانای کۆتایی ئایەتەکە (والله غفور رحيم)ی بە: (خوداوەند لە هەڵەکردن دڵئارام و خۆشنوودە) کردووە.

کە مەگەر وەك خەسەن و خوسەین کچی کام پێغەمبەربوون، هەموو وشەکان ڕاستکرێتەوە. خوداوەند بە مانای (اله) دێت، کە هەموو پەرستراوێك دەگرێتەوە. (الله) ناوی تەنها ئەو خودایەیە کە باوەڕداران باوەڕیان پێیەتی، ئەمەش لە (هەڵەکردن)ی زیادەی وەرگێڕەو لێرەدا سەر دەشکێنێت. (دڵئارام) بە مانای (غفور) نایەت، (خۆشنوود)یش (رحيم) ناگرێتەوە.

جا وەرگێڕێك لە چوار وشەدا پێنج هەڵەی کردبێت، دەبێت لەو کتێبە قەبەیەدا، چ کارەساتێکی قەوماندبێت.

من جارێك لە کتێبی (کچانی خوادا) کە ئەویش نەخوێندەوارێك تەرجەمەی کردبوو، خوێندمەوە، ئایەتی (فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا) (الاحزاب٢٨) وەها لێکدرابووەوە: وەرن با زینتان بکەم بە باشترین زین، تومەز وەرگێڕ پیتی (ح) لە (وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا) بە (ج) تێگەشتووە و لای ئەو بووە بە (أسرجكن سراجاً جميلا) بۆیە ئەو زینانەی دروستکردون، خوا لێمنەگرێت، وا تێدەگەم وەرگێڕی هەردوو کتێبەکە یەکن، چونکە لە نەخوێندەواریی وەرگێڕانەکاندا هەڵەکانیان تەواو لەیەکدەچن!

خۆزگە کەسێکی بە تاقەت عـەرەبی و کوردییەکـەی ئـەو دوو کتێبـەی بـەراورد کردبا، جا دەردەکەوت چ فەرتەنەیەکیان بەرپاکردووە و ئەو بۆچوونەی منیش کـە وادەزانم وەرگێڕی هەردوو کتێبەکە یەك کەسن ڕوون دەبێتەوە.

بەڵام کە بەو حاڵە شڕەوە لە وەرگێڕانەکـە دەبێتـەوە، ئیـدی بـاوی بـۆ خـۆش دەبێـت و دەکەوێتـە کۆمێنـت نووسـین، یـان ڕاسـتتر و وردتـر بڵـێین، دەکەوێتـە جنێودان و قسەی بێ بەڵگە هەڵڕشتن، ڕاستییەکەی مرۆ چـەندی بگـەڕێت شـتێکی بایەخدار و زانستییان تێدا نادۆزێتەوە، کە شایستەی وەڵامدانەوە بێت.

سەرنج بدەن لەم کۆمێنتەی لەسـەر ئـەم بەشـە نووسـیویەتی: (ئەگـەر سـەرنج بـدەین دەبیـنین نـەك مەسـیحییەکان، بـەڵکو صـابئە (صـوبی) و یـەزدانی واتـە ئایدیالییەکان و حەنفاییەکان و هتد... بە هێندەی مسوڵمانەکان سوێند ناخۆن..، کەچـی مسـوڵمانان لەبـەر بچـووکترین هـۆ گـەورەترین سـوێند دەخـۆن و..) یـان دەڵێـت: (پێدەچـێت ئـەو بـە ئاسـایی دانانـەی سـوێندخواردنی درۆ، کـارێکی وای کردبێت کە خەڵکی ڕەفتـاری درۆزنـی و فێڵبـازی بـە کـارێکی ئاسـایی و بگـرە بـە زیرەکی و وریایش ناودێر بکەن،...).

ئێمە پێشتر باسی قێزەونیی درۆمان کرد لە ئیسـلامدا، کـە بـە تـەنیا بەسـە تـا خاوەنەکـەی بخاتـە دۆزەخـەوە، لـە فـەرمودەدا هـاتووە: (وإنَّ الكـذبَ يهـدي إلى الفجور، وأن الفجورَ يهدي إلى النارِ، وأن الرجُل ليكذب حتى يكتب عند الله كذابا)[٥١١].

واتە: درۆکـردن خاوەنەکـەی بـەرەو خراپـەکاری دەبـات، خراپـەکاریش بـەرەو ئاگری دەبات، وە کەسێك ئەوەندە درۆ دەکات تا لای خوا بەدرۆزن دەنوسرێت.

بەڵام با پرسیارێك لە وەرگێڕ بکەین: تۆ چۆنت زانـی صـابیەکان درۆ ناکـەن؟ ئەمە دەبێت بـە تێکـەڵی و هاوڕێیـەتی کردنیـان بێـت، ئەگـەر وایـە و هاوڕێیـەتیت کردون؟ ئەدی چۆن فێری عەرەبی نەبوویت تا کتێبەکە بـە ڕێکـوپێکی بکـەیت بـە کوردی؟ چونکە ئەمڕۆ صابیئەکان لە عێراقدا زیاتر بە عەرەبی دەدوێن!

---

[٥١١] متفق عليه.

بەڵام سەبارەت بە درۆکردنی مسوڵمانان، هەرگیز ئیسلام تێیدا تاوانبار نییە، ئایا ئەگەر کەسێك پێچەوانەی یاسا جوڵایەوە، تاوانبار یاسایە یان کەسەکە؟

خۆ ئەگەر بوترێت لە کۆمەڵگەی ڕۆژهەڵاتدا لەبەر دواکەوتوویی درۆ دەکرێت، ڕاستە. بەڵام ئەمەش مسوڵمانە پابەندەکان ناگرێتەوە، بەڵکو ئەوانە دەگرێتەوە کە بە سەرپێیی لە ئایین دەڕوانن و پێوەی پابەند نین.

ئەو حوکمەش کە وەرگێڕ لە کۆتاییدا دەریکردووە (پێدەچێت ئەو بە ئاسایی دانانەی سوێند خواردنی درۆ کارێکی وای کردبێت کە خەڵکی ڕەفتاری درۆزنی و فێڵبازییبە کارێکی ئاساییوەربگرنبە زیرەکی و وشیاریش ناودێری بکەن..)

بڕیارەکە لەسەر بنەمایەکی هەڵە داڕێژراوە، چونکە سوێندی درۆ لە ئیسلامدا نەك بە ئاسایی دانەنراوە، بەڵکو بە یەکێك لە گەورەترین تاوان سەیر دەکرێت، کەواتە بڕیارەکەش تەواو هەڵەیە.

## ٣ـ حەڵاڵکردنی فریودان بە دارایی

سەبارەت بە دڵڕاگیراوان کە بەشێکن لەو هەشت جۆرە کە زەکاتیان پێدەشێت، لە ئایەتی (٦٠) سورەتی (التوبە)دا دەفەرموێت (إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاء وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِّنَ اللّهِ وَاللّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ).

واتە: زەکات هەردەبێ بدرێت هەژاران و کەم دەستان و ئەو کەسانەی پێ ڕادەگەن، بەختیش بکرێ بۆ هۆگری نەیاران و ڕزگارکردنی کۆیلان و قەرزداران لەڕای خوداو لەڕێگا بەجێماواندا. بڕیارێکە لە خوداوە، خودا زاناو کارزانە.

نووسەر ئەو زەکات پێدانەی دڵڕاگیراوان بە بەرتیل و فریودان دادەنێت بۆ مسوڵمانکردنی خەڵکی نامسوڵمان و دەپرسێت: (ئایا ئاین تەفرەدان بە پارە و پوول حەڵاڵ دەکات بۆ ئەوەی بچنە ناویەوە؟ ئایا خەڵکی بەکرێ دەگیرێت و بەرتیلی پێدەدرێت بۆ ئەوەی هەرەشە و ڕەشەکوژی ئەوانە بکەن کە ئەو

ئایینەیان ناوێت؟ ئایا ئەو پارە و پوولە بە ناوی زەکاتەوە کۆدەکرێتەوە، پاشان دەدرێت بە دڵگراگیرکراوەکان، بە زەکات دادەنرێت یان بەرتیل و ئیفساد (گەندەڵیی داراییە؟)

یاسای زەکات لە ئیسلامدا ڕۆشنە، لە دەوڵەمەندان وەردەگیرێت و بەسەر هەشت نوێژدا دابەشدەکرێت کە هەژار و کەمدەرامەت و قەرزار و ڕێبوار و مووچەخۆر و بەندە ئازادکراوەکان و نۆمسوڵمان و سوپان.

حەوت لەو توێژانە جێگەی موناقەشەی نووسەر نین، سەبارەت بە نۆمسوڵمانەکان، دیارە ئیسلام مەبەستیەتی ئەوانەی مسوڵمان دەبن زیاتر هانیان بدات و لەسەر مسوڵمانبوون دڵخۆشیان بکات، کە باوەڕهێنانەکەیان ئاسوودەیان دەکات نەك بەدبەخت.

لە لایەکی دیکەوە ئیسلام واقعیانە مامەڵە لەگەڵ تاك و کۆمەڵگە دەکات، کەسێك کە تازە مسوڵمان دەبێت، تا بە تەواوی باوەڕەکەی دادەمەزرێت و لە ئایین تێدەگات، دەبێت ڕێز و هاوکاریی مسوڵمانان ببینێت بەرامبەری، جگە لەوانەش حەزکردن بەدەستکەوت و پارە، سروشتی مرۆڤەکانە، بۆیە ئیسلام مامەڵەی واقیعییانەیان لەگەڵدا دەکات و لە بری خەفەکردنی حەزەکانیان بەشێکیان بۆ دابین دەکات.

وا دەزانم ڕەفتاری هەر خانەخوێیەك (دەوڵەت، حیزب، ئایین)ێك لەگەڵ نوێکاندا هەروایە.

ئەو مەسیحیەتەی نووسەر پێوەی پابەندە، ساڵانە ملیۆنان دۆلار تەخشانوپەخشان دەکات بۆ بەمەسیحیکردنی ڕۆڵەی مسوڵمانان و لەو پێناوەشدا بە چەندین شێوە هاوکارییان دەکات.

هەر لە کوردستانی ئێمەدا چەندین قوتابخانە و پەیمانگا بە ناوی جۆراوجۆرەوە کراونەتەوەو موژدەدەران تێیاندا پارە دەبەخشنەوە، تا ڕۆڵەی مسوڵمانان بکەن بە مەسیحی.

کەواتــە ئیســلام لــە دوای ئــەوەی نامســوڵمانێك (بــە بــێ زۆر لێکــردن و بــە ڕەزامەندیی خۆی) مسـوڵمان دەبێـت، مـافێکی ئاسـایی خۆیـەتی کـە بـە لوتفـەوە مامەڵەی لەگەڵ بکات و خەڵات و دڵنەوایی بکات.

ئەم زەکات پێدانەش مەرج نییە لە هەموو شوێن و سەردەمێکدا هەبێت، بـەڵکو دەسەڵات دەتوانێت بیوەستێنێت، وەك ئەوەی خەلیفە عومەر لە سەردەمی خۆیدا ڕایگرت.

واتە دەسەڵاتداری ئیسـلامی بـەپێی بەژەوەنـدیی گـەل و وڵاتەکـەی دەتوانێت هاوکاریی خەڵك و کەسایەتی نۆمسوڵمان بکات، یان نا. ئەم ڕەفتارەش لە ئێستادا زۆر وڵات بــە شــێوەی جۆراوجــۆر و بــە نیــازی جوانیشــاندانی ڕووی گەشــی وڵاتەکەیان پیادەی دەکەن، وەك لە زۆر وڵاتی ئەوروپیدا بەجۆرێك لە جۆرەکان لە ئێستادا هەیە.

وەك دەبینین وڵات هەیە هەر بـۆ سەرنجڕاکێشـانی هاووڵاتیـانی وڵاتـانی دیکـە، هاوکاری و پشـتیوانی دەکـات لەوانـەی تـازە دەچـنە وڵاتەکەیـەوە، یـان پێناسـی نیشتەجێبوون وەردەگرن، یان دەیانەوێت فێری زمانی خۆیانی بکات.

سەبارەت بە وەرگێڕیش، لەم بەشەدا دووبارە جگە لە وەرگێڕانە پڕ هەڵەکـەی، مەسەلەی سەیر و دوور لە بابەتەکەی ورووژاندووە.

جارێــك (والمؤلفــة قلــوبهم)ی بــە (دەســتەمۆکردنی نــەیارانی ئیســلام) وەرگێڕاوە(٥١٢) هێشـتا قەشـە کـە بەویـژدانترە لـە وەرگێـڕ، چـونکە ئـەو ڕاڤـەی ئایەتەکەی لە تەفسیری (البیضاوی)یەوە وەرگرتووە، کە تەفسیرێکی بەناوبانگـە، با کەم و زیادیشی لێکردبێت. نازانم ئەم برادەرە وەرگێڕە، بۆ ئەگەر لەبەر خـاتری فێربـوونی عەرەبییەکەشـی بێـت، لـە تەفسـیرێکی کوردییـەوە مانـای ئایەتـەکانی وەرنەگرتووە، تا لە مانای (والمؤللفة قلوبهم) بگات، کە هیچ خاوەن تەفسیرێك بەو شێوەی ئەو مانای ئایەتەکەی نەکردووە:مامۆستا هەژار بە (هۆگری نەیاران) مانای

[512] ئایا قورئان پارێزراوە ل٨٤.

ئایەتەکـەی لێکداوەتـەوە، مامۆسـتا محەممـەد بـامۆکیش بـە (ئەوانـەی دڵیـان دادەهێنـرێ بـۆ خۆشەویسـتیی ئیسـلام)و مامۆسـتا بورهـانی ئـەمینیش بـە (نۆمسوڵمانەکان) مانای کردووە[٥١٣].

ڕەنگـە وەرگێـڕ لـە تایبەتمەندییـەکانی زمـانی عـەرەبی و بـە تایبـەت زاراوە قورئانییەکان، نەگات، بۆیە لەخۆیەوە مانایان دەکات و مانای (والمؤلفة قلوبهم)ی بە (دەستەمۆکردن) لێکداوەتەوە.

لەخۆمـەوە نـاڵێم وەرگێـڕ عـەرەبی نازانێـت، سـەرنجی ئـەم دێـڕە بـدەن چـۆن کردوویەتی بە کوردی (هم أشراف قـديترقب بأعطـائهم ومراعـاتهم إسـلام نظـرائهم) (أشراف) پیـاوە بـەرزەکان وا چـاوەڕوان دەکـەن کـە ئیسـلام پێیـان بـدات وەکـو هاوتاکانیان موراعاتیان بکەن.

من باس لە ڕەکیکی و بزڕکاویی ڕستە وەرگێڕدراوکان ناکەم، باسەکەم ئەوەیـە دیارە وەگێڕ لە (مەعلوم) و (مەجهولی) فعلی عەرەبی سەر دەرناکات، ئەگەرنا ئەو دێڕەی بەم شێوەیە وەردەگێڕا:

ئەوانە پیاوماقوڵانێکن کە چاوەڕوان دەکرێت، بە پێبەخشینیان و دڵڕاگرتنیـان، هاوشێوەکانیان مسوڵمان ببن.

دە با خوێنەر وردبێتەوە لە زمانی وەرگێڕ و زانابیەکەی، لە بەرامبەر قورئانێك کـە زمـانزان و ڕەوانبێـژانی عـەرەب سـوژدەیان بـۆ پـاراوی و ناسـکیی وشـە و ڕستەکانی بردووە. ئەم برادەرەی لای ئێمەش بەو حاڵەوە ڕەخنەی لێدەگرێت!

وەرگێڕ کۆمێنتی لەسەر ئەم بەشەش نووسیوە.

کۆمێنتی یەکەم نووسیویەتی ((لە سەرەتادا زەکـات بـۆ فـەقیر و هـەژار بـووە، بەڵام لەوە پەشیمانبوونەوە کە بۆ هەژاران بێت، بـەڵکو بـۆ شـەڕە بەردەوامـەکانی ئیسـلام و سـەرانی دەسـەڵات بـەکاردەهات، وەکـو بـەرتیلیش دەدرا بـە دووڕوو و

---

[٥١٣] سەرنجی مانای ئایەتەکە بدە لە هەرسێ تەفسیری قورئانی پیرۆز و پوختەی تەفسیری قورئان و تەفسیری ئاسان.

باوەڕ لاوازەکان، تەنیا خێر و حەسەناتیان بۆ هەژاران هێشتەوە، بۆ ئەوەی خەڵکی هەژار بەردەوام چاوبەرەوژێری خوێنمژان بن...)).

هەر ئەوەندە دەڵێم: نووسەر کە دەڵێت (لە سەرەتادا زەکات بۆ فەقیر و هەژار بووە)، دەبوو بۆ هێشتنەوە و بەهای نووسینەکەی، ئاماژەی بە تەنیا سەرچاوەیەك کردبا، چونکە زەکات لە سەرەتادا هەر فەرز نەبووە، تا بە هەژار یان دەوڵەمەند بدرێت، بەڵکو زەکات لە ساڵی دووی کۆچیدا فەرز کراوە، واتە پازدە ساڵ پاش پێغەمبەرایەتی[٥١٤].

دواییش دەڵێت: (بەڵام لەوە پەشیمان بوونەوە) هەر ئەو ئایەتەی کە نووسەر ڕووبەڕووی بووەتەوە، دەیسەلمێنێت پەشیمان نەبوونەوە (أنما الصدقات للفقراء والمساكين) خۆ ئەگەر وەرگێڕ ئەمەشی لێتێکچووە، دەبوو سەیری ئێستای دەوڵەمەندانی کوردستانی کردبا کە زەکات بە هەژاران دەدرێت و پەشیمانبوونەوەشی تێدا نییە، پێغەمبەری خوا دەفەرموێت (أن الله افترض عليهم صدقة تؤخذ من أغنيا ئهم فترد على فقرائهم)[٥١٥].

واتە: پەروەردگار زەکاتی لەسەر فەرز کردوون، لە دەوڵەمەندەکانیان دەسەنرێت و دەدرێت بە هەژارەکانیان.

وەرگێڕ دەشڵێت (وەکو بەرتیلیش دەدرایە دووڕوو و باوەڕ لاوازان).

وەك دەزانین دووڕوویی مەسەلەیەکی دەروونییە، کەس نازانێت کێ دووڕوە (منافق)، کە ئەوەش نەزانرێت چۆن بەرتیلی دەدرێتێ؟

ئەوجا کە دەڵێت: (تەنها خێر و حەسەناتیان بۆ هەژاران هێشتەوە) ئەمەش هەڵەیە و بەوشێوە نییە، بۆیە ئەو حوکمەی کە لەسەر ئەو بنەما بێبەڵگەیە

---

[٥١٤] الفقه المنهجي على مذهب الأمام اشافعي تأليف د.مصطفى البغا. مصطفى الخن والشيخ على الشريجي دارالمصغضى_ دمشق الطبة الاولى ١٤٢٩-٢٠٠٨ ص١٥٩.

[٥١٥] منفق عليه الفقه المنهجي ص١٥٩.

هێناویەتیەوە (بۆ ئەوەی خەڵکی هەژار بەردەوام چاوبەرەوڕێری خوێنمژان بن)، بەڵگەیەکی بێ بنەمایە، چونکە لەسەر بنەمایەکی ناڕاستە و گریمانەیەکی ناحەقە.

وەك دەشزانین لە ئیسلامدا (زەکات) بڕیارێکی خواییە و مافی هەژارە لەو ماڵەی لای دەوڵەمەندە، کەواتە باسکردن لە چاوشۆڕی مانایەکی نییە.

کۆمێنتی دووەمی وەرگێڕ لەسەر نووسینەکە، تەواو جێگەی سەرسوڕمانە، چونکە لەسەر مەسەلەی ڕێزمان و وردەکاریی مانای وشەی عەرەبی قسە دەکات! وەك وتم وەرگێڕ لە عەرەبییە سادەکە ساتمە دەکات، نازانم چۆن وێراویەتی بچێتە ناو دەریای بێبنی زمانی عەرەبییەوە؟! لەوێشەوە کۆمەڵێك ئەنجامگیریی سۆشیالیستانە دەکات! من دڵنیام قسەکانی لە شوێنێکی دیکەوە هێناوە و هی خۆی نییە، نازانم بۆ بە هی خۆی حساب کردووە! لێرەدا وەرگێڕ ئەوەندە بڕیاری بێبنەما دەدات، زۆر دەخایەنێت تا وەڵام بدرێتەوە، ئەوەندەش سادەن من وەڵامدانەوەی بە پێویست نازانم.

بۆ نموونە دەڵێت: ((لەدوای سەرهەڵدانی ئیسلامەوە، بەشێوەیەکی چاك كار لە زمانی عەرەبیدا کراوە، کە لەگەڵ شرۆڤە و مەبەستەکانی ئەم ئایەتانەدا بێتەوە))[٥١٦] ئەم قسەیە دەبوو زمانزانێك بیکردایە بە وردەکارییەوە، تا وەڵامی بدرایەتەوە. یان دەڵێت (هەروەها بەڵگە مێژووییەکان ئەوە دەسەلمێنن کە (الانفال) تاڵانییەکان و زەکات هەمووی بۆ دەسەڵات و پەراوێزەکەی بووە و لە پاشان کراوەتە (بیت المال) (خانەی دارایی)و بۆ هەژاران سەرف نەکراوە)، وەرگێڕ دەبوو لەو بەڵگە مێژووییانە دوو سێ دانەی بە نموونە بهێنایەوە، تا شتێك بە خوێنەریش بسەلمێنێت.

جگە لەوە ئێمە پێشتر دەقی قورئان و فەرموودەمان هێنا کە زەکات بۆ هەژارانە، پێش هەموو توێژەکانی تر.

---

[٥١٦] ئایا قورئان پارێزراوە ل٨٦.

هـەر دەسـتەواژەی (دەسـەلآت و پەراوێزەکـەی) دەیسـەلمێنێت وەرگێـڕ ئـەو قسانەی لە شوێنی دیکە دزیوە و بە ناوی خۆیەوە تۆماری کـردوون، ئەگـەر نـا لـە زمـانی کوردیـدا دەسـتەواژەیەکی بەمشـێوەیە نییـە، هـیچ نـەبێت لـە بـری (پەراوێزەکـەی) کـە وەرگێڕانـی دەقـاو دەقـی (حواشـیە) عەرەبییـە، دەبـوو (دارودەستەکەی) بەکارهێنابا، کە لەناو کوردەواریدا باوە.

ئیدی وەرگێڕ لە جنێونامەکەی لەسەر زمـانی عـەرەبی و قورئـان، بەردەوامـە و بـە نـاوی خۆیـەوە دەڵێـت و هـیچ فـوو لـە دۆ ناکـات، تـا دەگاتـە ئـەوەی بڵـێ (پەروەردگارەکەی ئـەو کـە لـە ڕێگـەی مامەڵـە و قـازانج ( اضـعاف مضـاعفة) وە، قازانج و سوودی حەڵاڵ کردووە) وەك وتم، ئەم قسـانە وەرگێـڕ بـە نـاوی خۆیـەوە نووسـیویەتی، ئەگـەرنا هـی ئـەو نییـە، بۆیـە لـە باسـەکە لایـداوە و سـەبارەت بـە حوکمی سوو قسە دەکات، کە لە ڕاستیدا قورئـان زۆر بـە ڕاشـکاوانە، دەفـەرموێت (الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَا لا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَانُ مِنَ الْمَسِّ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا إِنَّمَا الْبَيْعُ مِثْلُ الرِّبَا وَأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا فَمَنْ جَاءَهُ مَوْعِظَةٌ مِنْ رَبِّهِ فَانتَهَى فَلَهُ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُ إِلَى اللَّهِ وَمَنْ عَادَ فَأُوْلَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ) (البقرة ٢٧٥).

واتـە: ئـەو کەسـانەی نـزول (سـوو) دەخـۆن ڕاسـتبونەوەیان لـەو دونیـا، وەك ڕاپەڕینی کەسێکی شەیتان دەسـتی لێ وەشـاندبێت وەهایـە. هـەر چـونکە ئەمانـە ئێژن: مامەڵـەش هـەروەك نزولـە (سـوو). خـودا سـەودای ڕەوا دیـوە و نـزولی پـێ ناڕەوایە. سا هەرکەسێك ئامۆژگاری دەبیەو دەست هەڵدەگریٚ، لەو شتانەی لەمەو بەر دەسـتی داوەتـێ دەبەخشـریٚو خـودا بـەکاری ڕادەگـا هەرکەسـێکیش دیسـان بچێتەوە سەری دەبن بە یاری ئاگر و تا هەتایە تیا دەبن.

یان دەفەرموێت، ئەگەر واز لە سوو خواردن نەهێنن دەبێت جەنگ لە گەڵ خـوادا بکەن (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ الرِّبَا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ{٢٧٨} فَإِن

لَّمْ تَفْعَلُواْ فَأْذَنُواْ بِحَرْبٍ مِّنَ اللّهِ وَرَسُولِهِ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُؤُوسُ أَمْوَالِكُمْ لاَ تَظْلِمُونَ وَلاَ تُظْلَمُونَ{٢٧٩}) (البقرة).

واتە: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان ئەبێ لەخودا بترسن ئەگەر بەڕاست باوەڕدارن، ئەو سودەی هێشتا ماوتانە نەتانەوێ. ئەگەر دەستی لێ هەڵنەگرن سا بزانن ئێوە دەگەڵ خوداو پێغەمبەرەکەی دا شەڕێ دەکەن. ئەگەر دەستی لێ هەڵگرن دەسمایەی خۆو بستێننەوە، ئیتر ئەوسا نەئێوە ناهەقی دەکەن نەناهەقیتان لێ دەکرێ.

بۆیە هەر مەسەلەیەکی دی بۆ جیاوازی دەستبدات، بەدڵنیاییەوە حوکمی سوو جێگەی مشتومڕ نییە و قورئان و فەرمووده و کۆڕای زانایان لەسەر حەرامبوونیەتی. دیارە وەرگێڕ باشیش نازانێت بابەتەکان (کە هی خۆی نین)، ڕێکیان بخات.

لە دوا پەرەگرافدا، وەرگێڕ پرسیارێك و ئامۆژگارییەکی بۆ ئیسلام هەیە، دەپرسێت: (ئایا لەبەر چییە کە ئیسلام لە ڕەهەندەکانی تری ژیانی ڕۆژانەدا لەسەر ئەو بنەمایە کار ناکات کە هەندێك ئایەت لابراون، هەروەکو چۆن کارکردن بە ئایەتی (المؤلفة قلوبهم) لابرا؟)

جا ئەگەر حوکمی کارکردن بەو ئایەتە لابرابێت، ئیتر بۆ ڕەخنەی لێدەگرێت؟ هەر ئەم قسەیەی وەرگێڕ دژی ڕەخنەکانیەتی لەسەر ئایەتە پیرۆزەکە[٥١٧]. جگە لەوەش وەرگێڕ دەبوو چەند ئایەتێك بهێنێتەوە کە لابراوە، گەر ئەوەی کردبا، بێگومان دەبوو بە داهێنان و کاری کەس نەکردە. دیارە ئەو پرسیارەکەی وەرگێڕاوە و لێی تێنەگەیشتووە کە مەبەست لە (الناسخ والمنسوخ) کە زانستێکی سەربەخۆیە و ئێرە جێگەی ئەو باسە نییە، بۆیە کەوتووەتە ئەو هەڵەیەشەوە.

کارکردنیش وەك ئەو دەڵێ بە (والمؤلفة قلوبهم) ڕانەگیراوە، بەڵکو بۆچوونی دەسەڵاتداری ئیسلام بەپێی بەرژەوەندیی گەل و وڵات، بڕیارەکە دیاری دەکات.

---

[٥١٧] بەڵام ئەگەر ئەو وادەزانێت کە کارکردن بە ئایەتی (والمؤلفة قلوبهم) ڕاگیراوە ئەدی بۆ ئەم باسەی تەرخانکردووە بۆ ڕەخنە لێگرتنی، خۆ دەبوو دەستخۆشی کردبا؟

ئامۆژگارییەکەشی ئەوەیە (چاك وایە ئایەتە حەربی و شەڕانگێزەکان و ئەو ئایەتانەش کە دەرەوەی ئیسلام دەبووغزێنن و ئەو ئایەتانەش کە بڵندگەرایی عەرەب و شۆفێنزمی و فاشییەتی ئیسلامی زەقدەکەنەوە و ئیسلام بەڕاستینەی ڕەها ناو دەبەن، هەر وەکو ئایەتە سڕدراوە و لابراوەکانی تر بسڕدرێنەوە).

ئەم ئامۆژگارییانە پرۆژەی کەسێکە کە زاتی ئەوەی نییە ناوی خۆی لە بەرگی کتێبەکەی بنووسێت، ئەی چۆن زاتی پرۆژەیەکی وەها بەرفراوان دەکات؟ بۆ گۆڕینی بەرنامەی نزیکەی دوو ملیارد مسوڵمان؟

پاشان ڕەخنە گرتن بە قسە هەڵڕشتن نابێت، ئەو ئایەتانەی ئەو باس لە سڕینەوەیان دەکات، دەبوو چەند نموونەیەکی لێهێنابایەوە، کامانەن ئایەتی بووغزاندن یان بڵندگەرایی عەرەب و شۆفێنزمی ئیسلامی؟ ڕاستییەکەی ئامۆژگارییەکانی وەرگێڕ لە ڕەخنە و جنێوەکانی سەقەتترن.

## ٤ـ حەڵاڵکردنی کوشتن

لەم بەشەدا نووسەر (١٦) ئایەتی لە قورئانی پیرۆزەوە هێناوە، کە بە بڕوای ئەو، هەموویان هاندانن لەسەر کوشتن و کوشتار و بەرامبەر سڕینەوەن، لە دوایشدا بە چەند پرسیارێك ڕەخنەکانی دەخاتەڕوو، لە یەکەم پرسیاریدا دەڵێت: (ئایا زۆر لە خەڵکی دەکەن تاوەکو ئایین بە شمشێر قبوڵ بکەن؟)

لەو شازدە ئایەتەی ئەو هێناونیەتەوە، وەك:

١- (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ حَرِّضِ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى الْقِتَالِ إِن يَكُن مِّنكُمْ عِشْرُونَ صَابِرُونَ يَغْلِبُواْ مِئَتَيْنِ وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّئَةٌ يَغْلِبُواْ أَلْفاً مِّنَ الَّذِينَ كَفَرُواْ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لاَّ يَفْقَهُونَ) (الأنفال ٦٥).

واتە: ئەی پێغەمبەر هانی باوەڕداران بدە بۆ غەزا ئەگەر ئێوە بیست کەس بنو خۆڕاگربن هێزتان بە دووسەد کەس دەشکێت ئەگەر سەد کەستان خۆ ڕاگربێت، بە ئیزنی خوا دوو هەزار کەس لە خوا نەناسان ڕا دەنێن، چونکە ئەوان کەسانێکی بێ ئاوەزن.

٢- (يَسْأَلُونَكَ عَنِ الشَّهْرِ الْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ اللّهِ وَكُفْرٌ بِهِ وَالْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ اللّهِ وَالْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ الْقَتْلِ وَلاَ يَزَالُونَ يُقَاتِلُونَكُمْ حَتَّى يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ اسْتَطَاعُواْ وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُوْلَـئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَأُوْلَـئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ) (البقرة ٢١٧).

واتە: لێت دەپرسن توشی شەڕ بوون لە مانگی شەڕ بەسا چۆنە؟ بێژە شەڕ لە هەیڤی وادا گوناهێکی زۆر گەورەیەو ڕێگەی بەخوا بەستن‌و حاشا لەخوا کردن‌و ماڵی خوا بەڕێز نەگرتن لێوە دەرنانی خەڵکەکەی لەلای خودا تاوانی هەرە مەزنە، ئاژاوەش بۆ شارنانەوە لە کوشتنێ خراپترە، ئەوان دەستو لێ بەرنادەن، هەردەگەڵ ئێوە بەشەڕدێن هەتا ئەگەر بۆیان بلوێ ئێوە لەدینەکەی خۆتان وەربگێڕن هەرکەسیش لە دین وەرگەڕێو بەخودا نەناسی بمرێ ڕەنج خەساری دونیاو قیامەت دەبن‌و دەکەونە ناو دۆزەقەوەو تا هەتا هەر تیا دەبن.

٣- (انْفِرُواْ خِفَافاً وَثِقَالاً وَجَاهِدُواْ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ) (التوبة ٤١).

واتە: سۆکباربن یان گرانباربن، بۆ غەزایە ڕێ دابگرن و لەگیان و ماڵ بەخت کردن درێغ مەکەن. گەر بزانن گەر بەقازانجی خۆتانە.

٤- (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ جَاهِدِ الْكُفَّارَ وَالْمُنَافِقِينَ وَاغْلُظْ عَلَيْهِمْ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ) ( التوبة ٧٣).

واتە: ئەی پێغەمبەر لەخودا نەناسان‌و ئەوانەی دووڕوویی دەکەن بەشەڕ وەرەو بەتوندو تیژی ڕەفتاریان لەگەڵ بکە، ئەنوای ئەوان جەهەندەمەو دوارۆژی دژواریان هەیە.

٥- (فَإِذا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ حَتَّى إِذَا أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنّاً بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاء حَتَّى تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ذَلِكَ وَلَوْ يَشَاءُ اللَّهُ لَانتَصَرَ مِنْهُمْ

وَلَكِن لِّيَبْلُوَ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ وَالَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعْمَالَهُمْ{٤} سَيَهْدِيهِمْ وَيُصْلِحُ بَالَهُمْ{٥} وَيُدْخِلُهُمُ الْجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمْ (محمد ٤-٦).

واتە: ئیتر هەر گا توشی ئەو بێ دینانە بوون لە ملیان دەن پاش‌و نجڕو نجڕ کردنیان شەتەکیاندەن. ئەوسا یان هەر بەچاکە ئازادیانکەن، یان بەرخوێنیان لێ بستێنن، هەتا شەڕ بەکۆتایی دێت ئەگەر خودا بی ویستبا بۆخۆی تۆڵەی لێ دەستاندن بەڵام ویستی بە یەکتریتان بە ئزموێ، ئەو کەسانەش لە پای خودا کوژراون کردەیان بەفیڕۆ نادا. بەم زوانە ڕێگەیان پێ نیشاندەداو کارو باری ژیانیان بۆ تەکوز دەکا. دەشیانباتە ئەو بەهەشتەی کە پێشەکی بۆی باس کردون.

٦- (فَلَا تَهِنُوا وَتَدْعُوا إِلَى السَّلْمِ وَأَنتُمُ الْأَعْلَوْنَ وَاللَّهُ مَعَكُمْ وَلَن يَتِرَكُمْ أَعْمَالَكُمْ) (محمد ٣٥).

واتە: سست مەبن و داوای شەڕوێستانێ مەکەن، هەر ئێوە بەسەر ئەواندان، ئێوە خوداتان دەگەڵەو هەرگیز پاداشتی خەباتەکەتان لێ کەمناکاتەوە.

ڕاستییەکەی ئەوەیە کۆی ئەم شەش ئایەتە کە نووسەر هێناونی و شازدە ئایەتەکەی دیکەش لە قورئاندا هاتوون، کە باس لە جیهاد و تێکۆشان دەکەن و بڕواداارانی لەسەر هاندەدەن. جگە لەدەیان فەرموودەی پێغەمبەری ئیسلام لەسەر هەمان مەبەست. بەڵام بۆ تێگەیشتن لە مانای جیهاد و حوکم و جۆرەکانی جیهاد، پێویست دەکات سەرجەم دەقەکان لەوبارەوە هاتوون وەربگرین، چونکە دەقەکان بەشێکیان ڕاڤەن بۆ بەشەکانی تر و هەموو پێکەوە وێنەی تەواوی بابەتەکەمان بۆ دەخەنەڕوو.

وەك چۆن ئەگەر بمانەوێت لە حوکمی یاسایی بابەتێك بگەین، دەبێت هەموو ئەو دەقە یاساییانەی لەسەر ئەو بابەتە هەن، بهێنین و لێیان بکۆڵینەوە، تا دەگەینە حوکمێکی دروست.

جا ئەگەر لە کۆی ئەو ئایەت و فەرمودانە بڕوانین کە لەبارەی جیهادەوە هاتوون، دەکرێت لەم خاڵانەدا کۆیان بکەینەوە:

١ـ جیهاد حوکمێکی شەرعیی چەسپاوە و فەرمانێکی خواییە و تاکو ڕۆژی قیامەت بەردەوام دەبێت، بە بەڵگەی دەیان ئایەت و فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێت: (الجهاد ماض الى يوم القيامة).

٢ـ جیهاد لە ئیسلامدا کە بە مانای تێکۆشان دێت، بازنەیەکی فراوانتری هەیە لە شەڕ و کوشتار، وەك نەزان و ناحەزان دەیانەوێت هەر بەو مانایە لێکبدرێتەوە. بەپێی دەقە شەرعییەکان جیهادی دوژمنان، جیهادی نەفس و شەیتان، جیهادی گەندەڵی و ستەم، جیهادی دووڕووەکان، جیهادی بانگەواز و بەیانکردنی دین، جیهادی ئارامگرتن هەیە.

هەریەکە لەو جۆرانەش زانایان قسەیان لەسەر کردوون و بەڵگەیان لەسەر هێناونەتەوە، با لە ناونانی زاراوەکانیشدا جودا بن.

با سەرنجی بەشێك لەو ئایەتانە بدەین لە سەردەمی مەکەدا هاتوونەتە خوارەوە کە جیهاد بەمانای (قتال) لەسەر مسوڵمانان فەرز نەبوو، کەچی باس لە جیهاد دەکەن، وەك: (ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُواْ مِن بَعْدِ مَا فُتِنُواْ ثُمَّ جَاهَدُواْ وَصَبَرُواْ إِنَّ رَبَّكَ مِن بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ...)[٥١٨].

واتە: جا ئەوسا کە پەروەرەندد، لەوانە وا پاش ئەو ئەزمونە سەختانە زێدی خۆیان بەجێ هێشتو چونە جیهاد خۆ ڕاگربوون پەروەرەندد پاش ئەمانە دیارە لەوانە دەبورێ‌و دلۆڤانە.

(وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا وَإِنَّ اللَّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ)[٥١٩] .

واتە: ئەوانەی لەڕای ئێمەدا چونە جیهاد، ئێمەش ئەوان بەڕێگەی خۆماندا دەبەین دیارە خودا لایەنگری کار چاکانە.

---

[٥١٨] النحل١١٠.

[٥١٩] العنكبوت ٦٩.

(وَمَن جَاهَدَ فَإِنَّمَا يُجَاهِدُ لِنَفْسِهِ إِنَّ اللَّهَ لَغَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ)[٥٢٠].

واتە: هەركەس دەچێتە غەزایە جیهاد بۆخۆی دەكا دیارە خودا لە هەموو كەس بێ نیازە.

(فَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ وَجَاهِدْهُم بِهِ جِهَاداً كَبِيراً )[٥٢١].

واتە: سا تۆ هەرگیز بە گوێی خوا نەناسان مەكەو بەهەموو هێزو تواناوە هەر بەگژیاندا وەرەوە.

دیارە هیچ لە مانای (جیهاد) لەم ئایەتە پیرۆزانەدا بە مانای جەنگ و كوشتار نەهاتوون، چونكە ئایەتی سەردەمی مەكەن، واتە لەو سەردەمەدا هاتوونەتە خوارەوە كە هێشتا مسوڵمانان لە مەكەدا بوون. یان ئەگەر سەرنجی ئەم ئایەتە بدەین كە لەمەدینەدا هاتووەتە خوارەوە (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ جَاهِدِ الْكُفَّارَ وَالْمُنَافِقِينَ وَاغْلُظْ عَلَيْهِمْ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ)[٥٢٢].

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا لەگەڵ خوا نەناسانو ئەوانەی دوو ڕوویی دەكەن جیهاد بكە بە توندو تیژی ڕەفتاریان لەگەڵ بكە ئەنوای ئەوان جەهەندەمەو دوا ڕۆژی دژواریان هەیە.

خۆ ئاشكرایە خەڵكی دووڕوو وەك كافر دیارنین و بە ڕواڵەت باوەڕدارن، بۆیە لە مسوڵمانان جوداناكرێنەوە، كەواتە ئەگەر جیهاد تەنیا بە مانای كوشتن بێت، شەڕ لەگەڵ دووڕوودا چۆن دەكرێت؟! كاتێك پێغەمبەری خوا لەڕێگەی وەحییەوە ناسیونی، ڕازیی نەبووە مونافیقەكان بكوژرێن، چونكە خەڵك بەو شێوە نەیناسیون.

مەبەست لە هێنانەوەی ئەو ئایەتانە، ئەوەیە كە (جیهاد) جۆری زۆرە و ناكرێت لە یەك بواردا كورتی هەڵێنین.

---

[٥٢٠] العنكبوت ٦.

[٥٢١] الفرقان ٥٢.

[٥٢٢] التوبە ٧٣.

٣ـ دیارە ئەوەی ئەمڕۆ قسەی زۆر لەسەر دەکرێت و نووسەری ڕەخنەگریش لە هێنانەوەی ئایەتە پیرۆزەکاندا مەبەستیبووە، جۆرێکی سەرەکیی جیهادە، ڕاستییەکەشی هەر زاراوەی جیهاد بەکارهات، بیری مرۆڤ بۆ لای ئەم جۆرەیان دەچێت، ئەویش مانای تێکۆشانە بە هێز و بازوو، یان بە مانای جەنگ و شەڕکردنە لەگەڵ بەرامبەردا.

کە ئەم جۆرەی جیهاد لە ئیسلامدا گرنگیی زۆری پێدراوە و بە چڵەپۆپە و لووتکەی ئیشە باشەکان دادەنرێت. ئەم جۆرە جیهادە و موجاهیدەکانیش هێندە گەورەیی و ڕێزیان لە دەقە شەرعییەکاندا باسکراون، بۆیە هەر کە ناوی جیهاد هات، یەکسەر سەرنج دەچێتە سەر ئەم جۆرەیان.

مێژووی هەزار و چوارسەد ساڵەی مسوڵمانانیش سەلماندویەتی سەروەری و سەربەرزیی ئیسلام و مسوڵمانان بەندە بەم جیهادەوە.

ڕەنگە ئەمە نهێنیی سەرەکیش بێت کە نەیارانی ئیسلام ئەوەندە ڕەخنە لەم جۆرە جیهادە دەگرن، تا مسوڵمانانی لێ دووربخەنەوە و لای ئەوانیش بە ناشیرین وێنا بکرێت، نەوێرن باسی بکەن و خۆیانی بۆ ئامادە بکەن.

ئیتر ئەوانیش بە ویستی خۆیان بکەونە داگیرکردنی خاك و ئاوی مسوڵمانان و لەسەر دینداری بیانچەوسێننەوە و ئایینەکەشیان سەرکز بکەن و بیکەن بە ئایینێك کە خۆیان لێی ڕازین.

خۆ ئەگەر ئەگەر مسوڵمان بە ناوی جیهادەوە هەڵەی کوشندەی کردبێت و زیادەڕەوی و لادانی بووبێت لە ئەحکامی جیهاد، دوژمنانیش هێندەی تر هەڵەکانیان لێ زەقکردبنەوە، وەك دەڵێن دۆ و دۆشاویان بە هەردوولاوە تێکەڵ کردبێت، هەرگیز هەموو ئەمانە پاساو نین بۆ ناڕەوایەتیی جیهاد و تێکۆشان و خۆدزینەوە لێی لە کات و شوێنی خۆیدا.

٤ـ بەڵام ئایا جیهادی جەنگی چۆنە؟ دژی کێ بەرپا دەکرێت؟ لە ئیسلامدا کامیان لەپێشە، ئاشتی یان جەنگ؟ جۆرەکانی جیهاد کامانەن؟ ئەمانەو زۆر

پرسیاری دیکە لەم بارەوە ڕەوایە وەڵام بدرێنەوە، چونکە لەبەر ئەو هۆیانەی لە پێشەوە وتمان، وشەی (جیهاد) ناڕوونی و بە هەڵە تێگەیشتنی زۆری بۆ دروست بووە و بەبێ ڕوونکردنەوە، بە هەڵە تەفسیرکردنەکەی نارەوێتەوە.

٥- ئەوەی لێرەدا جێگەی دەبێتەوە لەبارەی ئەو جۆرەی جیهادەوە لەسەری بدوێین، ئەوەیە ئیسلام کە ماناکەی خۆی لە ئاشتییەوە (سلم) هاتووە، ئاشتیخوازیی پێش جەنگ و شەڕ خستووە. خۆی بە ئایینی ئاشتی و ڕەحمەت دەزانێت بۆ هەموو مرۆڤایەتی، بەم بەڵگانەی خوارەوە:

(يَا أَهْلَ الْكِتَابِ قَدْ جَاءكُمْ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ كَثِيراً مِّمَّا كُنتُمْ تُخْفُونَ مِنَ الْكِتَابِ وَيَعْفُو عَن كَثِيرٍ قَدْ جَاءكُم مِّنَ اللّهِ نُورٌ وَكِتَابٌ مُّبِينٌ، يَهْدِي بِهِ اللّهُ مَنِ اتَّبَعَ رِضْوَانَهُ سُبُلَ السَّلاَمِ وَيُخْرِجُهُم مِّنِ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِهِ وَيَهْدِيهِمْ إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ) (المائدة ١٥-١٦).

واتە: ئەی ئەهلی کتێب بزانن ئەوەی کە هاتۆتە لاتان پێغەمبەرێکی ئێمەیە زۆر لەو مەبەستو باسو خواسەی کە ئێوە لە کتێبی خۆ حەشاروداو ئەو بۆتانی دەردەخاتو بۆتانی ئاشکرا دەکاو لە زۆرانیشی واز دێنێ لەلای خواوە ڕوناکیو کتێبێکی دیاری دەرتان بۆ هاتووە. بەو قورئانە، خوا ئەوانەی شوێنی ڕەزای دەکەون دەخاتە سەر ڕێی هێمنی و بە ئیزنی خۆی بە تاریکی دەریان دەخاو بەرەو ڕووناکیان دەبا ڕێگەی ڕاستیان نیشان دەدات.

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ ادْخُلُواْ فِي السِّلْمِ كَآفَّةً وَلاَ تَتَّبِعُواْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ) (البقرة ٢٠٨).

واتە: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان هەمووتان ئامادەی فرماندەری بن پێمەنێنە جێ پای شەیتان ئاشکرایە کە شەیتان پێتان دوژمنە.

(وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى اللّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ) (الآنفال ٦١).

واتە: ئەگەر داوای شەڕبەسیان کرت قبوڵی کەو هەر خۆت بەخودا بسپێرە، هەر خۆی گوێ دێرو زانایە.

(إِلاَّ الَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىَ قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَاقٌ أَوْ جَآؤُوكُمْ حَصِرَتْ صُدُورُهُمْ أَن يُقَاتِلُوكُمْ أَوْ يُقَاتِلُواْ قَوْمَهُمْ وَلَوْ شَاء اللّهُ لَسَلَّطَهُمْ عَلَيْكُمْ فَلَقَاتَلُوكُمْ فَإِنِ اعْتَزَلُوكُمْ فَلَمْ يُقَاتِلُوكُمْ وَأَلْقَوْاْ إِلَيْكُمُ السَّلَمَ فَمَا جَعَلَ اللّهُ لَكُمْ عَلَيْهِمْ سَبِيلاً) (النساء ٩٠).

واتە: مەگین ئەوانەی پەیمانیان لەگەڵ کەسانێکدا هەیە، کە ئەوانیش بوونە هاوپەیمانی ئێوە، یان ئەوانەی لەناچاری هاتوونە بەر دالّدەی ئێوەو لەناوناوەدا دوو دڵ ماون کە بەگژ ئێوەدا بچن یان توشی خزم کوشتن بن ئەگەر خودا مەیلی لێ با، هێندەی دەسەڵات پیی دەدان کە بەگژتاندا بچنەوەو سەریش کەون. ئەگەر خۆیان لەئێوە دوور خستەوەو بەگژتاندا نەهاتوون‌و دەیانەوێ شەڕتان لەناوتانا نەمێنێت خودا ڕێگەی پێ نەداون کە ئێوە دەستیان بۆ بەرن.

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا ضَرَبْتُمْ فِي سَبِيلِ اللّهِ فَتَبَيَّنُواْ وَلاَ تَقُولُواْ لِمَنْ أَلْقَى إِلَيْكُمُ السَّلاَمَ لَسْتَ مُؤْمِناً تَبْتَغُونَ عَرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا فَعِندَ اللّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٌ كَذَلِكَ كُنتُم مِّن قَبْلُ فَمَنَّ اللّهُ عَلَيْكُمْ فَتَبَيَّنُواْ إِنَّ اللّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيراً ) (النساء٩٤).

واتە: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان ئێوە وەختێ بۆ غەزا بەڕێ دا دەڕۆن هەموو شتێ لێك بدەنەوە نەکەن لەبەر ژیانی دونیا بەوەی کە فەرمانبەری خۆی دەربڕیوە بێژن: تۆ خاوەن باوەڕنیت ئێوە ئەگەر ماڵی دنیاتان گەرەکە دەسکەوتی زۆر وا لای خودا. ئێوەش بەرێ هەروابوون‌و باوەڕیتان بەخوا نەبوو خودا ئێوەی بەبەزەی خۆی خوێندەوە سا بەوردی بەکاری خۆ خورد ببنەوە خودا لە هەرکارێ دەیکەن ئاگادارە.

سەرنجی ئەو وشانە بدە کە خەتیان بە ژێردا هاتوون، هەموویان مانای ئاشتی دەگەیەنن، کەواتە ئاشتی بنەمای سەرەکییە لە پەیوەندیی مسوڵمان لەگەڵ ئەوانی تردا، لوبەر ڕۆشنایی (وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا) .

٦ـ (جیهاد)یش بە مانای شەڕکردن لەگەڵ دوژمندا، بە هەموو جۆرەکانیەوە، لەسەر ئەوە نییە بەرامبەر کافرە و دەبێت شەڕی لەگەڵ بکرێتو بکوژرێت، بەڵکو بێباوەڕان ئایینی ئیسلامیان بۆ ڕووندەکرێتەوە، جا ئەگەر مسوڵمان بوون باشە، ئەگەر نا، وازیان لێ دەهێنرێت و دەپارێزرێن و دەستدرێژی کردنە سەریان حەرامە[٥٢٣].

دروشمی (لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىَ لاَ انفِصَامَ لَهَا وَاللّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ)[٥٢٤].

واتە: لەم دینەدا بەزۆردا سەپاندن نیە. شارەزایی لە گومڕایی هاوێر دەکرا هەرکێ لەتاغوت نەبانەو بڕوای بەخودا بهێنێ، هەنگڵێکی هێندە توندی بەدەستەوەیە، هەرگیز پسانی بۆ نیە خوداش بیسەرو زانایە.

ئەم دروشمە دەبێتە بنەمایەکی ئیسلامی لە ئازادی و مافی مرۆڤدا لەسەر هەڵبژاردنی کام ئایینەی خۆی دەیەوێت.

کەواتە ئەدی جیهاد بەمانای جەنگ بەهێز و بازوو بەرانبەر دوژمن چۆن فەرزکراوە و بۆچی فەرزکراوە و چەند جۆرە.

**٧ـ جۆرەکانی جیهاد**

لە ئیسلامدا جیهاد بە مانای جەنگ و تێکۆشان، دوو جۆری سەرەکیی هەیە:

**جۆری یەکەم**

**جیهادی بەرگری:** وەك هەر بەرگریەك لە دەستدرێژی کردنی دوژمن بۆ سەر خەڵك و خاك و نیشتمان، قورئان دەفەرموێت (وَقَاتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُواْ إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبِّ الْمُعْتَدِينَ) (البقرة١٩٠).

واتە: ئێوە دەگەڵ ئەوانەدا کە شەڕ بە ئێوە دەفرۆشن، لەڕای خودا بجەنگن نابێ دەستدرێژی بکەن خودا لەدەست درێژی کەران خۆشی نایە.

---

[٥٢٣] موسوعة بيان الأسلام القسم الأول المجلد التاسع ج١٤.

[٥٢٤] البقرة ٢٥٦.

(الشَّهْرُ الْحَرَامُ بِالشَّهْرِ الْحَرَامِ وَالْحُرُمَاتُ قِصَاصٌ فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ وَاتَّقُواْ اللّهَ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ)[٥٢٥].

واتە: لە مانگی شەڕ بەس بەرامبەر بە مانگی شەڕ بەس، شکاندنێکی هەر ڕێزێکیش تۆڵەی هەیە، سا هەرکەسێك دەستدرێژی لە ئێوەکرد ئێوەش هەر بە ئەندازەی ئەو دەستدرێژی بکەنەوە لەخودا ترستان هەبێت خوا دەگەڵ خۆپارێزانە.

ب - یان بەرگری لە چەوساندنەوەی مسوڵمانان لەسەر ئایینەکەیان و ئازادیی بانگەوازی ئیسلامی، ئەمەشیان کاتێکە کۆمەڵێك مسوڵمان لەسەر دینەکەیان دەچەوسێنرێنەوە، یان ڕێگە نادرێت بانگەوازی ئیسلامی ئازاد بێت، ئەو کاتە قورئان دەفەرموێت (وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لاَ تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلّه فَإِنِ انتَهَوْاْ فَإِنَّ اللّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ بَصِيرٌ)[٥٢٦].

واتە: لەگەڵیان شەڕبکەن تا ئاژاوە نەمێنیّو دین گشتی دینی خودا دەبێت سا ئەگەر تەمیّ گرتوبون ئەوسا هەرکارێکی بیکەن خودا دەیبینیّ.

ج - یان بۆ ڕزگارکردنی خەڵکی چەوساوە لەژێر زەبر و زەنگی خوێنمژان (وَمَا لَكُمْ لاَ تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاء وَالْوِلْدَانِ الَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْ هَـذِهِ الْقَرْيَةِ الظَّالِمِ أَهْلُهَا وَاجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيّاً وَاجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيراً)[٥٢٧].

واتە: بۆچی ئێوە ناچنە غەزا لەڕای خوداو لە هێز لێگیراوەکان. لەبەر پیاوانو ژنانو منداڵانیّ کە دەڵێن: ئەی پەروەرێنمان لەم شارە وا خەڵکەکەی ناحەقی کارن ڕزگارنکەو لەلای خۆتەوە یارو یاوەرێکمان بۆ دیار بکە.

---

[٥٢٥] البقرة١٩٤.

[٥٢٦] الأنفال ٣٩.

[٥٢٧] النساْ ٧٤-٧٥.

د. هۆیەکی دیکەی ئەم شەڕی بەرگرییە پەیمانشکێنیی بەرامبەرە، مەبەست شەڕە دژی هاوپەیمانێك کە پێشتر پەیمانی ئاشتیی بەستووە، بەڵام دوایی ناپاکی دەکات و لەژێرەوە خەنجەری دوژمنکارانە دەوەشێنێت، قورئان دەفەرموێت (إِنَّ شَرَّ الدَّوَابِّ عِندَ اللّهِ الَّذِينَ كَفَرُواْ فَهُمْ لاَ يُؤْمِنُونَ، الَّذِينَ عَاهَدتَّ مِنْهُمْ ثُمَّ يَنقُضُونَ عَهْدَهُمْ فِي كُلِّ مَرَّةٍ وَهُمْ لاَ يَتَّقُونَ، فَإِمَّا تَثْقَفَنَّهُمْ فِي الْحَرْبِ فَشَرِّدْ بِهِم مَّنْ خَلْفَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ)[٥٢٨].

واتە: خراپترین زیندەوەران لای خودا ئەو کەسانەن کە خودایان نەناسیوەو ئیتریش بڕوا ناهێنن. ئەو کەسانەی پەیمانت دەگەڵ بەستن‌و لە پاشانا هەموو جاران پەیمانیان هەڵدەوەشێنن‌و هیچ ترسی خودایان نیە. جا ئەوانەت کە لەشەڕدا بەگیر هێنا وێڕای ئەوانەش کە هاتوون پشتیان بگرن بڕەتێنە، بەشکو تەمێ گرتوو بن.

هـ ـ هۆیەکی دیکەی جەنگی بەرگری، چەسپاندنی ئاشتی و ئاسایشی ناوخۆییە، کاتێك لایەنێك یان زیاتر پشێوی لە وڵاتدا نایەوە، ئەگەر ڕێگەی دیبلۆماسی سوودی نەبوو، دەبێت بە زۆر ئاژاوەکە دابمرکێتەوە و ئاسایش جێگیر بکرێت (وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِن بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِن فَاءتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ)[٥٢٩].

واتە: هەرگا لەناو باوەڕداران دوو گرۆ بەگژ یەك ڕاچوون، ئێوە ئاشتیان بکەنەوە ئەگەر یەکیان گەرەکی بوو ناهەقی لەوی تر بکا ئێوە بەگژ ئەوە ڕاچن کە هەر دەیەوێ شەڕ بکا. هەتا بۆ فەرمانی خودا مل کەچ دەکا ئەوسا بەبێ لایەنگیری پێکیان بێنن‌و بە یەکسانی بە کێشەکەیان ڕا بگەن لە ئەو کەسانەی بە یەکسانی پێ ڕادەگەن خوا خۆشی دێ.

---

[٥٢٨] الأنفال ٥٤–٥٦.

[٥٢٩] الحجرات ٩.

لەبەر ئەو هۆیانەی ڕوونمان کردەوە، لەئیسلامدا جەنگی بەرگری دەکرێت، لەو بەڵگانەی هێنامانەوە، دەیان بەڵگەی دیکە لە قورئان و سونەتدا هاتوون کە ڕەوایەتیی جیهادی بەرگری دەسەلمێنن و زانایانیش لەسەر ئەم جۆرە جیهادە یەکدەنگن.

بیرمان نەچێت ئێمە باس لە دەسەڵاتێکی ئیسلامی دەکەین، نەك تاکی مسوڵمان، دیارە هەلومەرج و توانای ئەو دەسەڵاتەش کاریگەریی زۆری دەبێت لەم بوارەدا.

ئەوەی ئەمڕۆ لە جیهاندا دەیبینین، هەموو دەسەڵاتە جیاوازەکانی دنیا (بە دینی و نادینییەوە) ڕەوایەتییان بەم جۆرە جەنگە داوە و زۆریشیان پیادەی دەکەن.

**جۆری دووهەم: جەنگی ڕزگاریخوازی (جیهاد الطلب).**

ئەم جۆرەیان زانایان قسەی زۆریان لەسەر کردووە و بۆچوونی جیاوازیان دەربڕیوە، ڕەنگە لێکۆڵینەوەکەی دکتۆر یوسف قەرزاوی، پوختەیەکی گونجاوی بەدەستەوە دابێت، کە پاش وردەکارییەکی زۆر، دەڵێت: کاتێك مسوڵمانان لە پەلاماردانی کوفر ترسان، ئەوە دروستە ئەمان دەستپێشخەریی پەلاماردانەکە بکەن.

واتە: شەڕکردن لەگەڵ کافردا تەنیا لەبەر بێباوەڕییەکەی نیە، بەڵکو لەگەڵ بێباوەڕبوونیشدا دوژمنکارییەتی بەرامبەر مسوڵمانان و ئایینەکەیان، ئەوکاتە بۆ نەهێشتنی ئازاردانی مسوڵمانان و دینەکەیان، جیهادی ڕزگاریخوازی ئەنجامدەدرێت.

ماوەتەوە بڵێین ئەم جۆری دووهەمەی جیهاد کە دەسەڵات ئەنجامی دەدات، کۆمەڵێك بنەما و مەرجی هەیە، کە تەواو تەبا و گونجاون لەگەڵ ئەو بنەمایانەی، ئەمڕۆ لە یاسا نێودەوڵەتییەکاندا داڕێژراون، وەك: نەکوشتنی دیل و دەستنەبردن بۆ منداڵ و ژن و پەککەوتووان و... دووركەوتنەوە لە کاولکاریی گشتی وەك: باخ

و مەزرا و کارگە و ئەوانەی ژێرخانی ئابوورییان لەسەر بەندە[٥٣٠]. ئەم دابونەریتە بەرزانەی ئیسلام لە جەنگدا سەرنجی زۆر لە زانا و ڕۆشنبیرە گەورەکانی ئەورووپای ڕاکێشاوە و شایەتیی جوانیان داوە، لە نموونەی گوستاف لۆبۆن، سیرتوماس أرنولد، ول پورانت، کە ڕۆژهەڵاتناس و زانای ناوداری ئەوروپین، کە لێرەدا جێگەی شایەتیدانەکەیان نابێتەوە[٥٣١].

جا ئەگەر سەرجەم ئایەتە پیرۆزەکان لەسەر جیهاد کردن بهێنین، دەبینین دابەش دەبن بەسەر یەکێك لەم جۆرە جیهادانەدا، هیچیشیان بە مانای شەڕەنگێزیی نایەن، تێیاندا نییە کەس بە شمشێر بکوژرێت، یان کوشتنی خەڵکی حەلاڵ بکات.

بەڵکو جیهاد یان بۆ بەرگرییە لە دین و ژینی مسوڵمانان، یان بۆ پاراستنی ئازادیی بانگەوازی ئیسلامی و خەڵکی چەوساوەیە.

لۆژیکی هەموو ژیرێکیش هەردوو جۆرەکەی لا ڕەوایە، ئەگەر زللەیەکیان لای ڕاستتدا، لای چەپیشیان بەرێ با لێی بدەن، دوورە لە واقیع. بەڵکو هەر وڵاتێك دەسەڵاتی هەبووبێت، با زۆر دادپەروەر بووبێت و حەزی بە ئاشتییش کردبێت، لۆژیکی (فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ وَاتَّقُواْ اللّهَ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ) (البقرة ١٩٤) جێبەجێکردووە، ئەمەش پوختەیەکی وەڵامی پرسیارە گوماناوییەکەی (فادی)یە، کە قورئان پێشتر زۆر جوانتر و بەرزتر وەڵامی داووەوە و فەرمویەتی (وَلَوْ شَاء رَبُّكَ لآمَنَ مَن فِي الأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعاً أَفَأَنتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ) (يونس ٩٩).

واتە: ئەگەر خودا کەیفی لێبا، دیارە هەرکێ لەم زەمینەن تێکڕا باوەڕیان دەهێنا، ئاخۆ تۆ دەتەوێ بەزۆر ئەم مەردمە بڕوا بێنن.

---

[٥٣٠] بەدەستکاریەوە لە کتێبی فقة الجیهاد د.یوسف القرضاوی بەرگی یەکەم لاپەڕە ٤٥٠–٤٦– وەرگیراوە.

[٥٣١] ئەوەی دەیەوێت ئەو شایەتیانە زیاتر بخوێنێتەوە با سەیری کتێبی (ساحة الأسلام) د. عبدالعزیز ال.

## ٥ـ حەڵاڵکردنی ڕاووڕووت و تاڵانی

نووسەر ئایەتی غەنیمەی هێناوە کە دەفەرموێت (وَاعْلَمُواْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ إِن كُنتُمْ آمَنتُمْ بِاللّهِ وَمَا أَنزَلْنَا عَلَى عَبْدِنَا يَوْمَ الْفُرْقَانِ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ وَاللّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ)[٥٣٢].

واتە: ئەگەر باوەڕتان بە خوداو باوەڕیتان بەوەش هەیە کە ڕۆژی لێك هەڵاواردن بۆ عەبدی خۆمان ناردە خوار ئەوێ ڕۆژێ کە دوو کۆمەڵ توشی یەکبوون، دەبێت ئەوەندەش تێ بگەن هەر تاڵانێكو دەستکەوت پێنج یەکێکی بەشی خوداو پێغەمبەرەو بۆ خزمان و هەتیوانو هەژاران و ڕێبوارانە، خودا توانای بەسەر هەموو شتکدا هەیە.

لەدواییشدا دەپرسێت: (ئایا خواوەند فەرمان بە کوشتنی خەڵکی و بردن و درزینی ماڵ و سامانێك دەدات و دەڵێت: ئەوە حەڵاڵ و چاکە؟ ئایا خوا ماڵی خەڵکی بە کەسێکی تر حەڵاڵ دەکات؟)

سەبارەت بە کوشتنی خەڵکی و چۆنیەتی جەنگ و جیهاد و جۆرەکانی، لە بابەتی پێشوودا وەڵامان دایەوە.

مەسەلەی بەتاڵانبردنی ماڵ و سامانیان و حەڵاڵیی خواردنیشیان، بەم شێوەیەیە:

غەنیمەت واتە (دەستکەوت): ئەو سەروەت و سامانەیە لە جەنگدا بەردەستی جەنگاوەران دەکەوێت و لە کاتی تێکشکانی دوژمندا دەیگرن، وەك: چەك، سەروەت و سامان، پارە و کەلوپەل...

وەڵامی پرسیارەکەی و نووسەریش لەسەر ئەو دەستکەوتانە ئەوەیە، باشە ئەگەر دوو سوپا شەڕیان کرد و لایەکیان سەرکەوت، چی بەو کەرەسە

---

[٥٣٢] سورة الأنفال ٤١.

جۆراوجۆرانە دەکرێت کە لە مەیدانی جەنگدا دەستیان بەسەردا گرتووە؟ تۆ بڵێی لایەنی سەرکەوتوو بچن ڕێگە بە لەشکرە شکاوەکە بگرن و بڵێن: مەڕۆن ئەو کەرەسانە هی ئێوەن بەڵکو بیانبەنەوە!

دیارە جەنگ و قسە داڕشتن لەیەك جیان، جەنگ یاسای خۆی هەیە، ئەوەی تێکشکا کارەساتەکەی لەوە قورسترە بیەوێت، یان بتوانێت بگەڕێتەوە بۆ کۆکۆدنەوەی شمەکی سوپای شکستخواردوو و بەزیوی.

بە پێچەوانەوە زۆر جار سوپای سەرکەوتوو خەرجیی خۆیشی دەخاتە ئەستۆی سوپای تێکشکاو. با دوور نەڕۆین، لە شەڕی نێوان (عێراق– ئێران)، (ئەمەریکا– ئەفغانستان)، (عێراق–کوەیت)، (ئەمەریکا–عێراق)، (ناتۆ–قەزافی)، کەرەسە و شمەکی سوپای تێکشکاو چییان لێ بەسەر هات؟ لە ئیسلامدا هەر بەشێك لەوە حەڵاڵکراوە، کە ئێستا لە جیهاندا پیادە دەکرێت، جیاوازیی هەر ئەوەندەیە لە ئیسلامدا دابەشکردنەکە پۆلێن کراوە و هەرلایە پشکێکی دیاریکراوی بۆ بڕاوەتەوە، بەڵام ئەمانی دیکە دەسەڵات هەمووی دەبات و هیچ بەشی جەنگاوەرەکان نادات.

بۆیە پرسیاری نووسەر ناواقعی و بێجێیە لەم بوارەدا.

بەڵام دیارە لەم پرسیارە و لە پرسیارەکانی دیکەشەوە (فادی) دەیەوێت بڵێت ئەم قورئانە کتێبی خوای گەورە نییە، چونکە خودا ئەو جۆرە فەرمانانە ناکات، بەڵکو کتێبەکە نووسراوی (محمد)ە، بۆیە هەڵە و کەموکورتیی تێدایە، ئەمەیان جێگەی باسی ئێمە نییە و خوێنەر دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ کتێبی یەکەم لەم زنجیرەی وەڵامدانەوەدا، کە بە تێروتەسەلی ئەو گومانانەی ڕەواندووەتەوە، کتێبەکەش بە ناوی (وەڵامە زانستییەکان) هەردوو مامۆستایان (ئیکرام کەریم و ئەندازیار عوسمان) نووسیویانە.

هەرچی وەرگێڕیشە هەندێك کۆمێنتی لەسەر ئەم بەشە نووسیوە، جگە لە بێسەروبەرەیی کۆمێنتەکان، هەرچیم کرد پەیوەندییەکم نەبینی لەنێوان

کۆمێنتەکان و باسەکەدا، کۆمێنتێکیان دەڵێت: ((ئەگەر مسوڵمان لە توانایدا بێت صەدان هەزار یان ملیۆنەها کەسی فەرەنسی و ژاپۆنی و چینی و هیندی و نەمساوی و سویسریی بێدین و بتپەرست و زیناکاری کافری ...ی...ی هتد، بکوژێت، ئەوا خوا لە گوناهەکانی دەبورێت)).

ئەوەی کەمێك ئاگای لە مێژوو بێت، دەزانێت چەندین سەدە مسوڵمانان دەسەڵاتداربوون و ئەو کوشتارانەشیان نەکردووە، گەر باسی ئەمڕۆش بکەین، نزیکەی هەموو وڵاتانی ئیسلامی کە مسوڵمانان زۆرینەن، کەمینە خاوەن ئایینەکانی دیکەیان تێدا نیشتەجێن، ئەو کوشتار و جینۆسایدەی وەرگێڕ بە خەیاڵپڵاوی باسیان دەکات، ڕووینەداوە. هەر لە کوردستانەکەی ئێمەوە بیگرە تا وڵاتانی عەرەبی و مالیزیا و ئەندەنوسیاو... پەیوەندی زۆرینەی مسوڵمان بە کەمینەکانی دیکەوە، سروشتی و بێ گرفتە.

بۆیە برادەری وەرگێڕ تەنها قسەی باخەڵی خۆی باس دەکات، کە پێچەوانەی دەقە شەرعییەکان و مێژووی هەزار و چوارسەد ساڵە و ئەمڕۆشمانە، موسڵمانان لەگەڵ زۆر لەو وڵاتانەی ئەو دەیانڵێت، تێکەڵبوون، لەسەر بێدینی و بتپەرستیش کەسیان نەکوشتوون.

باوەڕ ناکەم خوێنەر لەمە زیاتر چاوەڕوانی وەڵامی قسەی وا نابەرپرسیارانە و بێ بنەما بکات، بۆیە خۆمان بە وەڵامی کۆمێنتەکانی وەرگێڕەوە خەریك ناکەین.

## ٦ـ حەڵاڵکردنی سوێند خواردن

لەم بەشەدا نووسەر چەند ئایەتێکی لە قورئانی پیرۆز هێناوەتەوە، کە تێیاندا پەروەردگار سوێند دەخوات، وەك: (وَالْفَجْرِ{١} وَلَيَالٍ عَشْرٍ{٢} وَالشَّفْعِ وَالْوَتْرِ{٣} وَاللَّيْلِ إِذَا يَسْرِ) (سورة الفجر ١ – ٤).

واتە: سوێندەکە بەبەری بەیان، لەشەوانیشدا بە دەیان، بەجوت، بەتاك، بەو شەوگارە کە دادەبڕێت.

(وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا{١} وَالْقَمَرِ إِذَا تَلَاهَا{٢} وَالنَّهَارِ إِذَا جَلَّاهَا{٣} وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَاهَا{٤} وَالسَّمَاء وَمَا بَنَاهَا{٥} وَالْأَرْضِ وَمَا طَحَاهَا{٦} وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا{٧} فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا{٨} قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا{٩} وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّاهَا) (الشمس ١- ١٠).

واتە: سوێند بەخۆرو بە تیشکی، بەم هەیڤەش کە بەدوویدا دێت سوێند بەو ڕۆژەش کە تیف تیفەی هەتاو دەدات، بەوشەوەش کەدای دەپۆشیێ، بەو ئاسمانەو بەوەی ئەوی وەدی هێنا، بەو زەمینەو بەوەش کە واپانی ڕاخیست، بەگیانی مرۆ سوێندەکەو بەوەشی ڕێکی خستووە ئەوسا هەموو تاوانباریو پارێگاری، دەویژدانی گەیاندووە، دیارە هەرکێ گیانی خەوێن ڕاگرتووە ڕزگاربووە، هەرکەسێکیش دە گوناهیەوە پێچاوە دۆڕاندوویە.

(وَالضُّحَى{١} وَاللَّيْلِ إِذَا سَجَى{٢} مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى) (الضحى ١-٣).

واتە: سوێندێك دەخۆم بە چێشتەنگاو، بە جەنگی هەدادانی شەو، پەروەرندەت نەوازی لەتۆ هێناوە نە لێت قەڵسە.

لە دواییدا ڕەخنە لەو سوێند خواردنانە دەگرێت و دەڵێت: (لەبەرچی خاوەن قورئان سوێند بە هەموو شتێك دەخوات؟ ئایا خاوەنی وتەی ڕاست پێویستی بە سوێند خواردن هەیە بۆ ئەوەی جەخت لەسەر قسەکانی بکاتەوە؟)

نووسەر وەك بەشەکانی دیکە، بڕوای بەوە نییە کە قورئان فەرموودەی خوایە، بۆیە دەڵێت (خاوەن قورئان)، بەشێکی زۆر لە پرسیارە گومانا وییەکانی ئەو لەوێوە هەڵدەقوڵێت، خۆ ئەگەر باوەڕی هەبوایە کە قورئان فەرمایشتی خودایە، ئەو کات تەسلیمی پەروەردگار و فەرمایشتەکەشی دەبوو.

بە پێچەوانەی نووسەرەوە، وەرگێڕەکە باوەڕی بەخودا هەر نییە، بۆیە زۆرجار قسەکانی لەگەڵ نووسەردا لێکدەدەن.

سەبارەت بە سوێند خواردنی پەروەردگاریش لەو ئایەتانەدا، لای مسوڵمان کە باوەڕی بە خوا و فەرمایشتەکانی هەبێت، هیچ کێشەیەك لەو سوێندانەدا نابینێت.

بەڵام ئەگەر بەدوای حیکمەتی سوێند خواردنەکەدا بگەڕێت، لـەم چـەند خاڵـەدا وەڵامی دەستدەکەوێت:

١ـ قورئانی پیرۆز بە زمانی عـەرەبی دابـەزیوە، لـە زمـانی عەرەبیشـدا، سـوێند خواردن پێکهاتەیەکی زمانەکەیەو ڕەوانبێژان و شاعیرانی ئەو سەردەمە، هەمیشـە سوێند خواردن بەشێك بووە لە دەربڕین و داڕشتنەکانیان.

قورئانیش کە لایەنی ڕەوانبێژی بەشێك لە ئیعجازەکەیەتی، هەر دەبـوو هـەمان ڕێچکە بگرێتەبەر. ئەگەر قورئان سوێندی تێدا نەبایە، لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە لـەم سەردەمەدا بە کەموکورت حساب دەکرا.

٢ـ سوێند خواردن مەرج نییە تەنیا بۆ ڕەواندنەوەی گومـان بێـت لـە قسـەیەك، بەڵکو زۆرجار بۆ جەختکردنەوەیـە، یـان بـۆ سەرنجڕاکێشـانی بەرامبـەرە، یـان بـە گرنگ دانانی سوێند پێخوراوەکەیە. سەرجەم ئەو ئایەتـە قورئانییانـەی سـوێندیان تێدایە، یەکێك لەم حیکمەتانەیان تێدا بەدیدەکرێت، ئایا کاتێك دایك و باوك سوێند دەخۆن کە ڕۆڵەکەیان خۆشدەوێت، بۆ جەختکردنەوەیە یان گومان سڕینەوە؟

٣ـ سـوێند خـواردن تـا ئـەمڕۆش جێگـەی بایەخـە و لـە هـەموو دنیـادا بـاوە و حسابی گەورەی لەسەر دەکرێت، سەرنج بدە سەرجەم سـەرۆکەکان پـاش متمانـە پێدرانیان، یەکـەم کارێـك دەیکـەن سـوێند خواردنـە بـە بەرچـاوی گەلەکەیانـەوە. هەروەها سەرۆك وەزیر و هەموو وەزیر و پەرلەمانتاران و خاوەن پۆسـتە باڵاکـانی دیکە، سوێند دەخۆن. دوای ئەوەی خەڵك هەڵیان دەبژێرن و بە ڕاستگۆ و جێگەی متمانە دیارییان دەکەن، گومانیان لێیان نییە، کەچی ئەوان هەر سوێند دەخۆن!

٤ـ لە سەرجەم کتێبە ئاسمانییەکانی پێش قورئاندا، سوێند خـواردن هـاتووە، بە پێچەوانەی قسەکانی (فادی) کە دەڵێت مەسیح سوێندی نەخواردووە.

لە ئینجیلی مەتادا هاتووە (مـن حلـف بالهیکـل فلـیس بشـيء ولکـن مـن حلـف بذهب الهیکل یلتزم، ایها الجهال والعمیان، ایهما اعظم الذهب ام الهکیل الذی یقـدس الذهب، ومن حلف بالمذبح فلیس بشيء ولکن من حلف بالقربان الـذی علیـه یلتـزم،

ایها الجهال والعمیان ایها اعظم القربان ام المذبح الذی یقدس القربان؟ فإن من حلف بالمذبح فقد حلف به وبکل ما علیه، ومن حلف بالهیکل فقد حلف به وبالساکن فیه، ومن حلف بالسماء فقد حلف بعرش الله والجالس علیه)[٥٣٣].

له (تەکوین)یشدا هاتووه (بذاتي أقسمت)[٥٣٤].

بێگومان ئەم سوێند خواردنانە لە هەموو کتێبە ئاسمانییەکانی دیکەشدا، بەشێوەیەك لە شێوەکان هاتوون.

کەواتە سوێند خواردن لە قورئاندا زۆر ئاساییە و شتێك نییە کە لە پێش یان لە پاش قورئاندا نەبووبێت.

نووسەر دەیەوێت بڵێت لای مەسیح سوێند خواردن نەبووە، لەکاتێکدا ڕاستییەکەی بە پێچەوانەوەیە، وەك لەسەرەوە نموونەمان هێناوە. بۆ یە دەڵێت: (مەسیح وتی: هەرگیز سوێند مەخۆن، نە بە ئاسمان لەبەر ئەوەی کورسیی خودایە، نە بە زەوی لەبەر ئەوەی شوێن پێی خوایە، نە بە ئورشەلیم لەبەر ئەوەی شاری پاشای گەورەیە، هەروەها سوێند بە سەرت مەخۆ لەبەر ئەوەی تۆ ناتوانیت یەك تاڵ لە قژی سەرت سپی بکەیت یان ڕەشی بکەیت، بەڵکو دەبێت وەڵامتان بەڵێ بێت، یان نەخێر بێت).

ئەم قسەیە ئەگەر مەسیح وتبێتی، لە بەرژەوەندیی ئیسلامە، چونکە داوا لە شوێنکەوتووانی دەکات سوێند بە دروستکراوەکانی خوا نەخۆن، کە ئەمە تەواو لەگەڵ باوەڕی مسوڵمانان‌دا یەکدەگرێتەوە، کە لای دروست نییە سوێند بە غەیری خودا بخورێت.

جگە لەوەش لە ئیسلامدا تەنانەت سوێند بە خوای پەروەردگاریش تا دەکرێت نەخورێت و خۆی لێبپارێزێت باشترە، ڕاست وەك ئەو قسەیەی کە دراوەتە پاڵ مەسیح (علیەالسلام).

---

[٥٣٣] انجیل متی ١٦:٢٣-٢٢.

[٥٣٤] التکوین ٢٢.

ناشبێت بە تەنیا قسەیەکی مەسیح بکرێت بە بەڵگە و بوترێت، لە مەسیحیەتدا سوێند خواردن نییە، چونکە ئەو تەنیا قسەیە پێچەوانە ی چەندین دەقی دیکەی ئینجیلە، هەروەها تا ئەمڕۆش لای مەسیحییەکان سوێند خواردن هەیە و دەبینین هەموو سەرۆك و بەرپرسە باڵاکان سوێند بە ئینجیل دەخۆن.

## ٧ـ حەڵاڵکردنی درۆ

ڕاستییەکەی ناونیشان و ناوەڕۆکی ئەم بەشەیانم لا سەیر بوو، نووسەر باس لە حەڵاڵبوونی درۆ دەکات لە ئیسلامدا، لەکاتێکدا ئیسلام درۆ بە یەکێك لە گوناهە گەورەکان دەژمێرێت. پێغەمبەری ئیسلام هەر لەمنداڵییەوە تا پێغەمبەرایەتی، لەناو بتپەرستەکاندا ناونرابوو (ڕاستگۆی دەستپاك)، قورئان دەیان ئایەتی هەڕەشەکردنی لەسەر درۆکردن تێدایە، هەمیشە زانایانی فەرمودە بەشێکیان لە کتێبەکانیان تایبەت کردووە بەناوی (حەرامیی درۆکردن)، ئیتر نازانم نووسەر چۆن ئەو زاتە دەکات کە درۆ حەڵاڵکردن بخاتە پاڵ ئایینی ئیسلام؟ چونکە شەریعەتی ئیسلام هێندە درۆی قێزەون کردووە، تا گەیشتووەتە ئەوەی حوکمی درۆ لای هەموو خوێندەوار و نەخوێندەوار و گەورە و بچووکێك، ڕوونە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی (وأن الكذب يهدى الى الفجور، وأن الفجور يهدي الى النار)[٥٣٥].

بەڵام با بچینە سەر بەڵگەکانی نووسەر کە بۆ حەڵاڵبوونی درۆ لەئیسلامدا هێناونیەتییەوە:

یەکەم بەڵگەی ئایەتی (٢٢٥) لە سورەتی (البقرة)یە، کە دەفەرموێت (لاَّ يُؤَاخِذُكُمُ اللّهُ بِاللَّغْوِ فِيَ أَيْمَانِكُمْ وَلَكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْ وَاللّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ).

---

[٥٣٥] رياض الصالحين ص٢٧٩ تحريم الكذب الأمام النووى دارالفكر–بيروت–لبنان.

واتە: خوا بەسوێندی سەرزارەکی گوناهو لەسەر نانوسێ، بەڵام ئەگەر لەتەهی دڵتانەوە بێت، خودا لێ دەپرسێتەوە، خودا لەهەڵە دەبورێو لەسەر خۆیە.

پێشتر وەڵامی سوێندی سەرزارەکیمان لەم ئایەتە پیرۆزەدا دایەوە، بەڵام ئەم ئایەتە هیچی دەربارەی حەڵاڵبوونی درۆی تێدا نییە، دەفەرموێت: سوێندی سەرزارەکی کەبێ مەبەست لەدەمەوە دەرچێت، لێتان ناگیرێت، کە ئەم جۆرە سوێندانە ڕۆژانە لە دەمی هەموومان دەردەچێت، وەك: نەوەڵا ناچم، یان بەرەوەڵا دەیکەم.

ئینجا دووبارە ئایەتی١٠٦ی سورەتی (النحل)ی هێناوەتەوە (مَن كَفَرَ بِاللّهِ مِن بَعْدِ إيمَانِهِ إِلاَّ مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالإِيمَانِ وَلَـكِن مَّن شَرَحَ بِالْكُفْرِ صَدْراً فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِّنَ اللّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ).

واتە: هەرکەس بڕوای بەخوا بووبێو لەپاشان حاشای لێ بکا (سزا دەدرێ) مەگین کەسێ ناچارکرێ و لەباوەڕی دڵنیابێ، بەڵام کەسێ بە حاشاکەی دڵخۆشبێ و بەر تورەیی خوا کەوتونو ئازاری زۆر دژوار دەدرێن.

ئەم گومانەش لە بەشی پێشوودا وەڵاممان دایەوە، لە ڕاستیدا پەیوەندییەکیشی بە دروستی و نادروستیی درۆوە نییە، بەڵکو ئەم ئایەتە واقعییانە مامەڵە لەگەڵ مرۆڤەکاندا دەکات، دەڵێت: لەسەر بیر و باوەڕەکەت خۆڕاگر و بە ئارام بە، چەندە ئازار و ئەشکەنجە بدرێیت، دانبەخۆتا بگرە، بەڵام ئەگەر کەسێك بەرگەی نەگرت و بە ناچاری هەڵەیەکی لە دەم دەرچوو، ئەوا پەروەردگار لێی ناگرێت. نازانم لەکوێدا باسی درۆی تێدایە؟

بە پێچەوانەوە، من دەبینم ئەو دوو ئایەتە فەرمانی توندیان تێدایە لەسەر ڕاستگۆیی و هەڕەشەش دەکەن لە درۆ کردن.

ئەوجا فەرمودەیەك دەهێنێتەوە کە ڕەبیعی کوڕی سولێمان لە ئوموکەلسومی کچی عەقەربەوە دەڵێت (گوێم لێنەبووە پێغەمبەری خوا مۆڵەتی بەشێك لە درۆکردنی دابێت، مەگەر لە سێ شتدا نەبێت، پێغەمبەری خوا دەیوت: ئەو

کەسـەی ئاشـتەوایی (صـلح) لـە نێـوان خەڵکیـدا بکـات، بـە درۆزنـی دانـانێم، کـە قسەیەك دەکات و هیچ مەبەستێکی نییە و هیچی ناوێت، مەگـەر ڕێکـەوتن نـەبێت، هەروەها ئەو پیاوەی لە شەڕ و جەنگدا قسە دەکـات و ئـەو پیـاوەیش کـە لەگـەڵ ژنەکەیدا قسە دەکات و ئەو ژنەش کە مێردەکەی دەدوێنێت).

مانای ئەم فەرمودەیە ڕاستە و پێغەمبـەری خـوا فەرمویـەتی، بـەڵام بـا لەسـەر بڕگە بە بڕگـەی فەرموودەکـە وردببینـەوە: کـە سـەرەتای بڕگەکـە ئەوەیـە (گـوێم لێنەبووە پێغەمبەری خوا مۆڵەتی بەشێك لـە درۆکردنـی دابێـت) هـەر ئـەم بڕگەیـە بەڵگەیەکی ڕوونە لە سەر حەرامبوونی درۆ لە ئیسلامدا.

**بڕگەی دووهەم**: (ئاشـتکردنەوەی بەشـەڕهاتوان)، بێگومـان خـەڵکی لـە نێـوان خۆیاندا شـەڕ و نـاکۆکی دەکـەن، کاتێـك کەسـێك دەکەوێتـە نێوانیـان تـا پێکیـان بێنێتـەوە، ئـەو دوو لایەنـە لای ئـەو قسـەی بـەرز و نـزم و زبـر دەکـەن بەرامبـەر یەکتری، ئایا کابرای ناوبژیوان چی بکات، ئایا بە ناوی ڕاستگۆییەوە ئەو قسانە بۆ ئەوانی تر بگێڕێتەوە تا ئاژاوەکە ئاڵۆزتر بکات، یان قسەیەکی خێـر بکـات باشـە و ئـەو دوو لایەنـە سـاردبکاتەوە و ئارامیـان بکاتـەوە؟ دیـارە مـادام نیـازی کـابرا پێکهێنانەوەیانە، هەر دەبێت قسـەی خێـر بکـات، بـا زیادەڕۆییشـی تێـدا بێـت، وا دەزانم لۆژیك پێمان دەڵێت ئەمەیان باشە، هەرگیز ئاشـتەواییش بەمشـێوە نـەبێت ناکرێت.

**بڕگـەی سـێهەم**: لـە کـاتی جەنگـدا هـەموو لایـەك هـەوڵی فریـودانی یـەکتر و پاراستنی نهێنیی نەخشـەی جـەنگ و شـاردنەوەی بەرنامـەی خۆیـانن لـە جەنگدا بەرامبەر یەکتری، ئەمەیان لە ڕابوردوو و ئێستاشدا هەموو دنیـا لـە ئاسـتی تـاك و کۆمەڵ و دەوڵەتانیشدا، پیادەی دەکەن، ڕەخنە لێگرتنی هەڵەیـە. زانیـاریی هەڵـە ناردن بۆ دوژمن، تا ئێستاش پلانێکی هەموو سوپایەکە لە کاتی شەڕدا، فریـودانی دوژمـن بەشـێوەیەك ئـەو وابزانێـت هێـرش لـە قۆڵێکـەوە دەبێـت، بـەڵام تـۆ بـە پێچەوانەوە هێرش لە قۆڵێکی تـرەوە ببـەیت، یـان وابزانێـت پاشەکشـە دەکـەیت،

بەڵام تۆ پەلامار بدەیت. یان هەر لێتێکدانێکی دیکە. ئەمە یاسای شەڕە و کەس نکوڵیی لێ ناکات، بۆیە ڕەخنەکە زۆر بێجێیە لەو بارەوە.

**بڕگەی چوارەم:** گفتوگۆی نێوان ژن و مێرد و زیادەڕەوی لە دەربڕینی سۆز و خۆشەویستی، یان شاردنەوەی نیگەرانی لە یەکتر، عەقڵ وامان پێدەڵێت، دەروونناسان هەروا دەڵێن، کۆمەڵناسان هەمان قسە دەکەن، کۆمەڵگە هەر ئەوە پیادە دەکات، کە ژن و پیاو زیادە خۆشەویستی بۆ یەکتر دەردەبڕن، کە ئەگەر بە تەرازووی ڕاستگۆیی و درۆ کردن بپێورێت، بە درۆ دەردەچێت، بەڵام پێغەمبەری خوا ئەو زیادە ڕەوییانەی لە چوارچێوەی گوناهدا دەرهێناوە. تۆ سەرنجی دیوانی سەرجەم شاعیران و پەخشاننووسان و هەموو ئەدیبەکان بدە: لە دەربڕینی خۆشەویستیدا کامیان زیاتر تێپەڕێنێت، بەتواناتر ئەژمار دەکرێت، ئایا کە مەولەوی دەڵێت:

گوڵ چوون ڕووی ئازیز نەزاکەت پۆشان

وە فراوان چوون سەیل دیدەی من جۆشان

ئایا ئەمە بەرزیی ئاستی شیعر و شاعیر دەردەخات یان درۆ؟ نالی بەم شێوە عەیبی حەبیبە دەپۆشێت:

پێم دەڵێن مەحبوبە خێل و قیچە مەیلی شەڕ دەکا

خێل و قیچە یان تەرازوی نازی کەمێ سەر دەکا

ئەوەی نێوان ژن و مێرد، دەربڕینی هەست و سۆزە، نەك درۆ کردن، بەڵام بە تەرازووەکە وەها دەردەچێت، بۆیە پێغەمبەری خوا ڕێگەی پێداوە.

ئەوەی لە نێوان ژن و مێردا و دروستە، دەربڕینی زیادە خۆشەویستییە و ڕانەگەیاندنی بێزارییەکە کە ڕۆژانە لەنێوانیاندا ڕوودەدات.

پاشان بە ناوی فەرمودەوە هێناویەتی (ئەگەر قسەیەکتان بۆ هات دەلالەت لە ڕێنمایی کردن یان بەرپەرچی خراپەی دایەوە، ئەوا وەریگرن و قبوڵی بکەن،

وتبێتم یان نەموتبێت، ئەگەر لە منەوە وتراوێکتان بۆ هات دەلالەتی لە خراپە کردن بوو یان ڕێنمایی کردنی ڕەتکردەوە، ئەوە وەریمەگرن، چونکە من جگە لە هەق و ڕاستی شتێکی تر ناڵێم).

من دەقێکی وەهام وەك فەرمودە، نەبینیوە. دەبوو نووسەر ئاماژەی بە سەرچاوەکە بکردبایە، بە تایبەت کە بە ناوی فەرمودەوە هێناویەتیەوە، بەڵام ئەو بڕگەیەی کە دەڵێت (وتبێتم یان نەموتبێت) ناکۆکە لەگەڵ دوا بڕگەدا (من جگە لە هەق و ڕاستی هیچ شتێکی تر ناڵێم).

هەروەها ناکۆکیشە لەگەڵ چەندین ئایەت و فەرمودەدا، قورئان دەفەرموێت(یاایها الذين امنوا أذا جاءكم فاسق بنبأ فتبينوا).

واتە: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان هەرگا لەفەرمان لادەرێك دەنگوباسێکتان بۆ دێنیّ، بەوردی لێی ورد بنەوە.

واتە دڵنیا بن لە ڕاستی و دروستیی هەواڵەکە، ئەوجا باوەڕی پێ بکەن، ئەویش بە لێکۆڵینەوە و وردەکاری کردن دەبێت لە ناوەڕۆك و سەرچاوەی هەواڵەکە.

ئەم ئایەتە تەواو ناکۆکە لەگەڵ ئەوەی نووسەر بە ناوی فەرمودەوە هێناویەتیەوە.

فەرمودەیەکی صەحیحی پێغەمبەری خواش هەیە کە دەفەرموێت (من كذب علي متعمداً فليتنبوء مقعده من النار).

واتە: هەرکەسێك درۆی بەدەم منەوە کرد بە دەس ئەنقەست، با جێگەی خۆی لە ئاگر دیاری بکات.

ئەم فەرمودەیە جگە لە هەڕەشە لەو کەسانەی بە ناوی پێغەمبەری خواوە درۆ دەکەن، ئەوەشی لێوەردەگیرێت کە نابێت هەرکەس وتی پێغەمبەر وای فەرمووە، ئیتر ئێمە باوەڕی پیّ بکەین.

بۆیە زانایانی ئیسلام یەکدەنگن لەسەر دڵنیابوون لە سەرچاوەی فەرمودە، ئەوجا وەری بگرین، هەمووشیان یەکدەنگن لەسەر حەرامیی لەخۆوە قسەکردن بە ناوی پێغەمبەرەوە، با لە قازانجی ئیسلام و ئیمانیش بێت. لەم ڕووەوە فەرمودەناسان بێ ئەندازە وردەکارییان کردووە و ئەگەر بە ئەستەمیش لە ڕاستگۆیی کەسێك کەوتبنە گومانەوە، ئیتر قسەیان لێ وەرنەگرتووە، ئەو نموونە بەناوبانگەی نێوان ئیمامی بوخاری و کابرای دەشتەکی، بەسە بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییە، کاتێك بوخاری ڕێگایەکی دوور و درێژ دەبڕێت بۆ بینینی کابرایەکی دەشتەکی، کە گوایە ئەو فەرمودەیەکی لا هەیە، بەڵام کە دەبینێت دەیەوێت بە فێڵ حوشترە لە دەست بەربووەکەی بگرێتەوە، ئەوە دەکاتە نیشانەی ئەگەری درۆکردنی کابرا و فەرموودەکەی لێوەرناگرێت.

زانایانی فەرموودە دەڵێن خراپترین جۆری درۆ قسەکردنە بە ناوی پێغەمبەرەوە و فەرمودە هەڵبەستنە، با نیازیش هاندانی خەڵك بێت لەسەر خێر و ترساندنیشیان بێت لەسەر شەڕ، بۆیە قسەکەی (فادی) لەم بارەوە بێ بنەمایە.

لە بەشی پێشوودا ئەمانەمان ڕوونتر کردەوە، بەڵام وا باشە لەو ئایەت و فەرمودە زۆرەی کە هەن لەسەر حەرامیی درۆکردن، چەند دانەیەکیان بهێنینەوە، تا بێبنەمایی و ناڕاستیی قسەکانی (فادی) زیاتر بسەلمێنێت:

خوای گەورە دەفەرموێت:

(لَّعْنَةَ اللّهِ عَلَى الْكَاذِبِينَ) (آل عمران ٦١). واتە: نەفرینی خوا بۆ ئەوانەی وا درۆزنن.

(وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ صَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ) (العنكبوت٣).

واتە: ئێمە ئەوانەی بەر لەمانیشمان بەتاقی کردەوە، بێ گومانە خوا ئەوانەی ڕاستیان ووت ئەوانەش کە درۆزنن دیاری دەکات.

پێغەمبەری ئیسلامیش دەفەرموێت: (إياكم والكذب فإن الكذب يهدي إلى الفجور وإن الفجور يهدي إلى النار وإن الرجل ليكذب ويتحرى الكذب حتى يكتب عند الله كذابا وعليكم بالصدق فإن الصدق يهدي إلى البر وإن البر يهدي إلى الجنة وإن الرجل ليصدق ويتحرى الصدق حتى يكتب عند الله صديقا * ( صحيح ) _ وأخرج البخاري ومسلم نحوه ، مختصر صحيح مسلم ١٨٠٩ ، صحيح الجامع ٤٠٧١).

واتە: وریای درۆبن، چونکە درۆ بەرەو خراپەکاری دەبات، خراپەکاریش دەبات بەرەو ئاگر، بەڕاستی کەسێك هێندە درۆدەکاتو لەسەریشی دەڕوات تا لای خوا بەدرۆزن دەنوسرێت. وریای ڕاسگۆییش بن چونکە ڕاست گۆیی بەرەو چاکە دەبات، چاکەش بەرەو بەهەشت دەبا، بەڕاستی کەسێك هێندە ڕاستت گۆ دەبیّو بەردەوامیش دەبیّ لەسەری تا لای خوا بەڕاستگۆ دەناسرێت.

هەروەها پێغەمبەری خوا دەفەرموێت: (أنا زعيم ببيت في ربض الجنة لمن ترك المراء وإن كان محقا وببيت في وسط الجنة لمن ترك الكذب وإن كان مازحا وببيت في أعلى الجنة لمن حسن خلقه * (حسن) ـ الصحيحة ٢٧٣ . ( زعيم : الضامن والكفيل . ربض الجنة : المراد ما حول الجنة وفي أطرافها).

واتە: من زەمانەتی ماڵیك لەکەناری بەهەشتتدا دەدەم بۆ کەسێك واز لە دەمەقاڵیّ بینێت با لەسەر ڕاستیش بێت، زەمانەتی ماڵێکیش دەدەم لە ناوەڕاستی بەهەشتدا بۆ کەسیّ کە واز لەدرۆ کرد بێنیّ با بەسوعبەتیش بیّ و ماڵێکیش لەسەرەوەی بەهەشت بۆ کەسێکی ڕەوشت جوان.

## ٨ـ حەلاڵکردنی تۆڵە سەندنەوە

بەم ناونیشانەی سەرەوە نوسەر ڕەخنە لە سادەترین مافی بەرامبەر دەگرێت، کە بەرگری لە خۆکردنە.

ڕەخنەکەشی لەم ئایەتە پیرۆزەدا چڕ کردوەتەوە کە دەفەرموێت (الشَّهْرُ الْحَرَامُ بِالشَّهْرِ الْحَرَامِ وَالْحُرُمَاتُ قِصَاصٌ فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ وَاتَّقُواْ اللّهَ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ) (البقرة ١٩٤).

واتە: مانگی شەڕ بەس بەرانبەر بە مانگی شەڕ بەس، شکاندنی هەر ڕێزێکیش تۆڵەی هەیە، سا هەرکەسێ دەستدرێژی لە ئێوە کرد ئێوەش هەر بە ئەندازە ئەو دەست درێژی بکەنەوەو لە خودا ترستان هەبێ خوا دەگەڵ خۆپارێزانە.

(دەشڵێت: ئێمە شوێنەواری خراپی ئەو تۆڵەسەندنەوە بە بڵاوی دەبینین بەهۆی ئەو قسەیەوە!)

لەبەرامبەریشدا کۆمەڵێك قسەی بەناوی (مەسیح)و بۆلس و بوترۆس هێناوەتەوە کە داوا دەکەن هەرگیز تۆڵە نەسەنرێتەوە.

لەو قسانە کە ئەو هێناویەتیەوە بەناوی مەسیحەوە ئەوەیە: ((دوژمەکانتان خۆش بوێت،...) یان (بیستوتانە کەوتراوە: چاو بە چاوو دان بەدان،... بەڵام من پێتان دەڵێم: بەرەنگاری شەڕ مەبنەوە، بەڵکو ئەوەی زللەیەکی لە لای ڕاستت دا، لایەکی دیکەشی ڕوو تێبکە)).

**وەڵامیش بۆ ئەم ڕەخنەیە ئەوەیە:**

١- ئەم قسانەی مەسیحو پۆڵسو بوترۆس کە هەموو مەسیحیەکان باوەڕیان پێیانەو لە ئینجیلەکاندا هێناویانەو پێشتر ڕاستیانکردۆتەوە، ئایا مەسیحییەکان خۆیان چەندە پێوەی پابەند بوون، لە ماوەی دوو هەزار ساڵی مێژووی مەسیحیەتدا؟

ئایا شەڕە پیرۆزەکانو شەڕی خاچیەکان لە پێناوی چیدا هەڵگیرسان.

لە مێژووی نوێشدا لەماوەی سێ سەد ساڵی ڕابردوودا ئایا ئەوروپای مەسیحی بە هەزاران کیلۆ مەتریان نەبڕیو جیهانی ئیسلامیان داگیر نەکرد؟ بە هەزارانیان لێنەکوشتنو تا ئێستاش سەروەتو سامانی جیهانی ئیسلامی بە تاڵان نابەن؟

کەواتە ئەگەر مەسیحیەکان ئەوانە بەوتەی مەسیح دەزانن بۆ هەرگیز پێوەی پابەند نەبوون؟

یەکێك لەو تۆڵە سەندنەوانەی کە مێژوو بۆی تۆمار کردووین ئەوەیە کاتێك خاچیەکان هاتنە شامو سوریایان داگیر کرد لە چەرخی ڕابردوودا، قەشەیەکیان چووە سەر گۆڕەکەی سەلاحەدینی ئەیوبیو وتی: ها سەلاحەدین ئەوە گەڕاینەوە !

ئایا ئەمە تۆڵە سەندنەوەو هەڵگرتنی کینەیەکی چەند سەدەیی نیە بەرامبەر صەلاحەدین؟

لەوەش ڕووونتر کاتێك فەرەنساییەکان نوێنەریان نارد بۆ ڕێکەوتن لەگەڵ جەزائیرو قسەیان تێکگیرا نوێنەرە جەزائیریەکە لێی تورە بوو باوەشێنەکەی دەستی تێگرت، کابرای فەرەنسی ئەمەی کردە بیانوو کۆبونەوەکەی تێکداو لە تۆڵەی ئەوەدا هێرشیان کردە سەر جەزائیرو بۆ ماوەی یەك سەدە زیاتر جەزائیریان داگیر کرد.

بەڕاستی تۆڵە سەندنەوە ئاوها دەبێت!

کەواتە بە شایەتی مێژوو واقعی جیهانی مەسیحیەت ئەو وتانە تەنها بیردۆزەن و لە دنیای خەیاڵدان، هەرگیز پراکتیزەیان نەکردووە.

بەڵکو زۆر لەوە زیاتریشیان کردووە، واتە نەك هەر (فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ)یان جێبەجێ کردووە، بەڵکو زۆر لە سنوری (ولا تعتدوا)شیان تێپەڕاندوە.

٢- بۆیە ئەو قسە باوانەی کە دەدرێنە پاڵ مەسیح پێناچێت قسەی ئەو بێت، چونکە جێ بەجێ نەکراوەو ناشکرێت، هەروەها زۆر دوورە لە سروشتی هەموو مرۆڤێکی ئاساییەوە، پیچەوانەشە لەگەڵ هەموو پەیامی ئاسمانیو دنیاییەکان، لەڕاستیدا من زۆر بەگومانم لەوەی کە قسەی مەسیح بێت.

خۆ (العين بالعين والسن بالسن) لە دەستورەکەی حامورابیەوە (کە یەکەم دەستورە نوسراوەو بە مرۆڤایەتی گەشتبێت) چەسپێنراوەو بوە بە بنەمایەکی بەڵگە نەویست، هەرکەسێکیش وتویەتی باوەڕم پێی نیە، بە کردار ئیشی پێ کردوە.

تەنانەت لەم چەرخی بیستو یەکەمەدا سەرجەم یاسا نێودەوڵەتیەکان، وەڵامی دەستدرێژیکردنیان بەڕەوا داناوە بۆ هەر گەلو حکومەتێك کەواتە ڕەخنەکە لە جێگەی خۆیدا نیەو ناشکرێت (مەسیح)ی پێغەمبەری خواو کەسایەتی مەزنی مێژووی مرۆڤایەتی قسەی وەها بکات.

٣- بنەمای یاسا دارشتنی سزا بۆ ڕێگە گرتنە لە دەستدرێژی، واتە پێویستە خەڵك هەست بە بوونی سزادان بکات ئەگەر تاوانو دەستدرێژی کرد، چونکە بەشێك لە مرۆڤەکان ئەگەر هەست بەبوونی سزا نەکەنو لەتۆڵە نەترسن، دەبن بە درندە بەڵکو خراپتریش.

بۆیە تۆڵە سەندنەوەی سزادان جۆرێکە لەگەڕاندنەوەی ژیان بۆ خەڵکی تر (ولكم في القصاص حياة يا اولى الألباب) هەر لەسەر ئەم بنەمایەش یاسای سزادان بۆ سەرجەم دەستدرێژیەکان لەدنیادا دارێژراون وەك: سزای کوشتن، دزی، ناپاکی، لێدان،... کەواتە بنەمای (ئەگەر زلەیەکیان کێشا بەلای ڕاستتدا، لای چەپیشیان بۆ وەرگێڕە) پێچەوانەی هەمووو یاساکانەو پشێوی نانەوەیەو ڕێگە خۆشکردنە بۆ چەقۆکێشو چەتەو چەقاوە سورەکان تا بەکەیفی خۆیان تەراتێن بکەنو ستەمو خراپەکاری ئەنجام بدەن.

ئەوە سێ بەڵگەی زەق لەسەر ڕاستی بنەمای (فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ).

بۆیە ڕەخنە گرتنەکەی (فادی) ڕەخنەیەکی نالۆژیكو نا واقعیە.

٤- خاڵێکی گرنگ هەیە لەم بوارەدا دەبێت لەبەرچاوی بگرین، ئەم ڕێگرتنە لە دەستدرێژیو وەڵامدانەوەیە کە ئیسلام دیاری کردووە، دژ بەوانەن کە بەناحەق

خۆیانو ستەمەکەیان دەسەپێنن، زیاتریش ڕوو لەدەسەڵاتی دەوڵەتو کۆمەڵگەی مسوڵمانانە.

بەڵام لەبواری شەخسیدا واتە ئەگەر کەسێك خراپەی لەگەڵ مسوڵمانێکدا کرد، لەگەڵ ئەوەی ئەو مسوڵمانە مافی خۆیەتی داوای خۆی بکاتو هەقی خۆی وەرگرێت، بە پێچەوانەوە ئیسلام هانی دەدات کە لێخۆشبوو لێبووردە بێت، لەو ڕووەوە دەیان دەق لە قورئانو فەرموودەدا هاتووە پاداشتی گەورە بڕیار دەدەن بۆ ئەوانەی لە حەقی خۆیان خۆشدەبن، هەر بۆنمونە قورئان دەفەرموێت:

(وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا أَلا تُحِبُّونَ أَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ) (النور: ٢٢).

واتە: بلا چاویان لێ بپۆشنو لە هەڵەکانیان ببورن، مەگەر ئێوە حەزناکەن لە گوناهانو ببورێ، خودا لە گوناه دەبورێو دلۆڤانە.

(وَلَمَنْ صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَلِكَ لَمِنْ عَزْمِ الأُمُورِ) (الشورى:٤٣).

واتە: بۆ کەسێکی خۆ ڕاگر بێو لە تۆڵە چاوپۆشی بکا ئەمە یەکێ لەکارە پەسەندەکانە.

(وَإِنْ تَعْفُوا وَتَصْفَحُوا وَتَغْفِرُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ) (التغابن: ١٤).

واتە: ئەگەر چاویان لێ بپۆشنو واز بێننو بیان بەخشن، خوداش لە گوناه دەبورێو دلۆڤانە.

پێغەمبەری ئیسلامیش دەفەرموێت:

(الراحمون يرحمهم الرحمن ارحموا من في الأرض يرحمكم من في السماء). واتە: بەبەزەییەکان خوای بەبەزەی بەزەی پێاندا دێتەوە، ڕەحم بکەن بەوانەی لەسەر زەویدان ئەوی لە ئاسمانە ڕەحمتان پێ دەکات.

(إنما يرحم الله من عباده الرحماء). واتە: خوا ڕەحم بە بەندە بە ڕەحمەکانی دەکات.

بۆ بەرجەستەکردنی ئەم ئاکارە بەرزە سەدان نمونە لە ژیانی پێغەمبەرو هاوەڵانیو مێژووی ئیسلامدا هەیە کە لێرەدا تەنها دوو نمونەیان دەهێنینەوە:

**یەکەم**: لەگەڵ ئەو هەموو دوژمنایەتیو کوشتنو ئازارو ئەشکەنجانەدا کە بتپەرستان بەرامبەر بە پێغەمبەری خواو هاوەڵانی لە شاری مەکەدا کردیان، کەچی کاتێك مسوڵمانان فەتحی مەکەیان کردو دەسەڵاتیان بەسەرداگرت، پێغەمبەری ئیسلام لەبری تۆڵەو هەق سەندنەوە، پێی فەرمون: بڕۆن هەمووتان ئازادبن[٥٣٦].

**نمونەی دووەم**: کاتێك بوختانی داوێن پیسی بۆ دایکمان عائیشی کرا، یەکێك لەوانەی کە زۆر پڕو پاگەندەکەی بڵاو دەکردەوە (مسطَح)ی خزمی نزیکی ئەبوبەکری باوکی عائیشە بوو، کە جگە لە خزمایەتی ئەبوبەکر چاکەی زۆری لەگەڵ کردلوو، بۆیە کەپاش مانگێك تا ناڕەوایی بوختانەکە دەرکەوت ئەبوبەکر نەك تۆڵەی لێکاتەوە، بەڵکو تەنها نیازی کرد ئیتر چاکەی لەگەڵ نەکات، کەچی قورئانی پیرۆز ئەوەشی بۆ ئەبوبەکر بەڕەوا نەزانیو فەرمووی[٥٣٧]:

(وَلَا يَأْتَلِ أُوْلُوا الْفَضْلِ مِنكُمْ وَالسَّعَةِ أَن يُؤْتُوا أُوْلِي الْقُرْبَى وَالْمَسَاكِينَ وَالْمُهَاجِرِينَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ) (النور: ٢٢).

واتە: با ئەوانەی لەناوتاندا دەوڵەمەندن، سوێند نەخۆن کە خزمانو هەژارانو ئاوارەکانی ڕای خودا بێ بەش دەکەن، بلا چاویان لێ بپۆشنو لە هەڵەکانیان ببورن، مەگەر ئێوە حەزناکەن لە گوناهانو ببورێ، خودا لە گوناه دەبورێو دلۆڤانە.

جا بەهاتنە خوارەوەی ئایەتەکە ئەبوبەکر فەرموی بەڵێ خوای گەورە حەزدەکەم لێم خۆشبیت و بڕیاریدا لەوەوبەدوا هەروەك جارانی پێش بوختانەکە لەگەڵیدا مامەڵە بکات.

---

[٥٣٦] ئەم باسە بەدرێژی لە ژیاننامەکانی پێغەمبەری ئیسلامدا لە باسی فەتحی مەکەدا هاتووە.

[٥٣٧] ڕووداوەکە بە تێرو تەسەلی لە تەفسیری سورەتی ئەعزابدا هاتووە.

کەواتە ئیسلام ئاینی لێبووردەیی و دڵفراوانیە، نەك کینەو تۆڵە، داننانیشی بە نەهێشتنی قبوڵکردنی دەستدرێژی تەنها لەبەرژەوەندی کۆمەڵگەو یاسای کشتیە.

بەو هەموو سنوردانانو ڕێگە گرتنەش کە ئیسلام یاسای بۆ دارشتووە.

لە ڕاستیدا قورئان زۆر لە جێگەی خۆیدایە کە فەرموویەتی (فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُواْ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ).

## ٩ـ حەلاڵکردنی ئارەزووەکان

گومانێکی تر کە عەبدوڵلا فادی ورووژاندویەتی بە وتەی ئەو فرەژنییە. ئەم گومان دروستکردنە لە پێش ئەو و دوای ئەویش ورووژێنراوە. زانایانی ئیسلامیش بە تێروتەسەلی وەلامیان داوەتەوە، ئەوەی لە پێشەکیی ئەم وەلامەدا بیلێین، ئەوەیە: زاراوەی فرەژنی هەڵەیەکی مەبەستدارە، چونکە (تعدد دالزوجات) مانای (چەند ژنی) بۆی ڕاسترە تا فرەژنی، وەك دەزانین (فرە) یانی (زۆر)، کە بە بیستنی، ژمارەیەکی زۆر دێتە گوێ، لەکاتێکدا ژنهێنان تەنیا تا چوار حەلاڵە، دەلێین حەلاڵە نەك واجب و فەرز.

چەندژنی لە ئیسلامدا بە مەرجی دادپەروەری پیاو، بە دەقی قورئان و سونەت، ڕێگەی پێدراوە (وَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تُقْسِطُواْ فِي الْيَتَامَى فَانكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاء مَثْنَى وَثُلاَثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تَعْدِلُواْ فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ذَلِكَ أَدْنَى أَلاَّ تَعُولُواْ) (النساء٣).

واتە: ئەگەر لەمەڕ کیژە هەتیوەکانەوە، لەوە ترسان کە نەتوانن بەتەرزێکی هەق و ڕەوا دەگەڵییان بجولێنەوە، دەتوانن وازیان لێ بێننو ژنانی تر چەندی خۆتان پێتان باشەو پێتان دەشێن مارە بکەن، دوان بن یان سیان پێکەوە یا چواریش بن هەر ڕەوایە. ئەگەر ترسان نەتوانن ژنەکانتان وەکو یەك تەماشا بکەن با یەکێك بێ یان وەل ئەوانە ڕابوێرن کە بونەتە موڵکی خۆتان. بۆ خۆ لەغەدر پاراستن، ئەمە ئاکارێ پەسەندە.

نازانم بۆ نەیارانی ئیسلام بە ڕەخنەی دەبینن، لەکاتێکدا هەر ئەوان ڕێگە دەدەن پیاوێك چەندین کچەهاوڕێ (گێل فرێند)و دڵخوازی هەبێت، وەك ئەوەی ئەمڕۆ لە ئەوروپا دەیبینین، ئەی چی دەڵێن بەرامبەر بەو هەمووە ناپاکیی هاوسەرگیرییەی کە ژن و مێرد لە یەکدیی دەکەن؟ خۆ ئەگەر سەرنجی ژیانی بەرپرسان و دەوڵەمەندانی ڕۆژهەڵات بدەین، بە ڕۆژهەڵاتیش ڕازیی نابن ساڵانە چەند سەفەر بۆ وڵاتە گەشتوگوزارییەکان دەکەن، بێ ژماردن ئافرەتان دەگۆڕن، ئەدی ئەمە ناودەنێن چی؟ زۆربەی ئوتێلی شوێنە گەشتوگوزارییەکان چەندین ئافرەتیان ڕاگرتووە و هەموو سەیرانکەرێك بە ئارەزووی خۆی چەندی دەوێت دەیبات.

جا دەبێت ئەمانە کامیان ستەم بێت لە ئافرەت؟ پیاوێك بەئاشکرا ژنێکی تر بهێنێت یان لەگەڵ چەند ئافرەتی دیکەدا بە نائاشکرا دەست تێکەڵ بکات؟

ئەمە تەنیا لە لایەکەوە، لایەنەکەی دی حەڵاڵبوونی چەندژنی، جگە لە رووە شەرعییەکەی، چەندین نهێنی و حیکمەتی گەورەی لەخۆ گرتووە، لەوانە:

١ــ ڕاستییەکی سەلمێنراوی واقعیی و زانستیە کە لەڕووی جەستەیی و جنسییەوە، ئافرەت زووتر لە پیاو پێدەگات و زووتریش دەوەستێ و پەکی دەکەوێ.

هەر بۆ نموونە، زۆربەی ئافرەتان لەنێوان (٤٥ــ٥٠) ساڵیدا، ئیتر توانای منداڵبوونی نامێنێ، بەڵام پیاوان تا (٧٠)ساڵییش ئەو توانایەیان هەیە، واتە زیاتر لە بیست ساڵ نێوانیانە.

٢ــ لە زۆربەی چەرخ و کۆمەڵگەکاندا، ژمارەی ئافرەت لە پیاوان زیاترن، بەهۆی جەنگ و کارکردن و جوڵەوە، جا ئەو ئافرەتانەی لە پیاوان دەمێننەوە و زیاترن و یەك پیاوی سەڵتیان دەست ناکەوێت، یان دەبێت بە نیو پیاو ڕازیبن، یان تا دەمرن لە خۆکپکردنەوەدا بن، یان داوێنپیسی هەڵبژێرن، مەعلومیشە لەم سێ بژاردەیە، یەکەمیان لە دووەکەی دی دروست و ڕاسترە.

٢ـ ئافرەت جگە لە حاڵەتی منداڵبوون و زەیستانی، کە نزیکەی چل ڕۆژ دەخایەنێت، لە مانگەکانی دیکەشدا دەکەوێتە (بێنوێژی)حەیزەوە، کە زۆرینەیان هەفتەیەکە و هەندێك جار دەشگاتە پازدە ڕۆژ، لەو حاڵەتانەدا نابێت سەرجێی لەگەڵ بکرێت، جا لەو حاڵەتانەدا پیاو ناپاکی بکات باشە یان بە ئاشکرا خێزانێکی تری هەبێت؟

٤ـ بەشی زۆری کۆمەڵگاکان ڕێژەیەکی زۆر کچانی قەیرە و بێوەژنیان تێدایە، کەمتر وایە کوڕە گەنجەکان بیانخوازن، ئایا تا دەمرن وەها بمێننەوە یان باشە شوو بکەن بە پیاوێکی ژندار.

٥ـ نەزۆکیی ژن، ئەو پیاوەی کە حەزی لە منداڵە و کەچی خێزانی نەزۆکە، چارەی چییە؟ لەکاتێکدا لەگەڵ ژنەکەشی یەکیان خۆشدەوێت و نایانەوێت جیاببنەوە؟

ئەگەر کەسێك بڵێت ئەم حاڵەتانە بۆ ئافرەتانیشە، وەك: نەزۆکیی پیاو، یان لاوازیی جنسی، بێگومان لەم حاڵەتانەشدا ژنانیش دەتوانن تەڵاق لە مێردەکانیان وەربگرن، بەو مەرجانەی کە دانراون.

ئەم حیکمەتانەی چەندژنێتی، ساڵ لەدوای ساڵ لەناو کۆمەڵگەکاندا زیاتر[٥٣٨] دەسەلمێت، بۆیە گومان دروستکردن لە ڕەوایەتیی چەندژنی، مانایەکی نییە و کاریگەربوونە بەم شارستانیەتەی کە فیمینیزمی بەرهەمهێناوە.

پرسیارێکی دیکەش کە نووسەر دەیورووژێنێت، ئەوەیە: (ئایا ئاینێك کە لە خواوە هاتبێت، بە پێچەوانەی ئەو شەریعەت و یاسایانەی خوداوەندەوە ڕێگە بە فرەژنی دەدات، لەکاتێکدا لە سەرەتای خەلیقە و دروستکردندا مرۆڤی لە نێر و مێیەك دروستکرد و کردی بە یەك جەستە؟)

---

[٥٣٨] بەدەستکاریەوە لە کتێبی (ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەتدا) مامۆستا عەلی باپیر وەرمگرتووە. شایەنی باسە کە زاراوەی چەندژنی

بە دڵنیاییەوە چەندژن هێنان لە پێش ئیسلام و لە ئایینەکانی تریشدا هەر هەبووە، بەپێی بەڵگە مێژووییەکان، ئەو پێغەمبەرانەی کە (فادی) دان بە پێغەمبەرایەتییاندا دەنێت، چەند ژنیان هەبووە، وەکو لەمەو دوا باسیان دەکەین.

کەواتە یەکژنی لە خەلیقەوە نەبووە و ئیسلام داینەهێناوە، بەڵکو لە کۆمەڵگاکانی پێش ئیسلامیش چەندژنی هەبووە.

ئەو ڕەخنەیەش لە پێغەمبەری خوا دەگرێت، کە چۆن حەزی لە هەرژنێك بێت هێناویەتی، ئەمە وەڵامەکەیەتی:

پێغەمبەری ئیسلام ﷺ لە ٦٣ ساڵی تەمەنیدا، ٢٥ ساڵی تێپەڕاند ئینجا ژنی هێنا. لەگەڵ ئەوەی ژیانی ئەو زۆر بە وردی نووسراوەتەوە و پاش بە پێغەمبەربوونیشی دوژمنی زۆری بۆ دروست بوو، کەچی لە هەموو کتێبەکانی مێژوودا تاقە سەرچاوەیەك نییە کە ئاماژە بەوە بکات، لادانێکی ئەخلاقی لەو بیستوپێنج ساڵەی تەمەنیدا ڕوویدابێت. تەنانەت دوژمنەکانیشی کە چەندین ناو و ناتۆرەیان بۆ دەتاشی، وەك: جادووگەر، شێت، سەرلێشێواو،... بەڵام هەرگیز تۆمەتی شوێن ئارەزوو کەوتنیان بۆ دروست نەدەکرد، چونکە هیچ بەڵگەیەکیان نەدەبوو، کەسیش بڕوای پێنەدەکردن.

لە تەمەنی بیستوپێنج ساڵیشدا، بێوەژنێکی چل ساڵەی هێنا، کە پێش ئەو دوو مێردی دیکەی کردبوو. جا گەنجێك لە هەرەتی لاویدا کە یەکێك بوو لە جوانترین لاوانی هۆزەکەی، ئافرەتێك بخوازێت پازدە ساڵ لە خۆی بەتەمەنتر بێت، بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر شوێننەکەوتنی بە ئارەزووی جنسی.

تا خاتوو خەدیجەش لە تەمەنی ٦٥ ساڵیدا وەفاتی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ ژنی دیکەی نەهێنا. زۆر ڕوونیشە پیاوان لە خوار پەنجا ساڵییەوە لە دووی ئارەزوو دەگەڕێن، پاش ئەوە ئارەزوویان کەمدەبێتەوە.

ئەم سێ خاڵەی سەرەوە وەڵامی ئەو بێشەرمییەیە کە باس لە حەز و ئارەزووی پێغەمبەری خوا دەکەن لە مەسەلەی ژنهێنانیدا. ئەگەر بیشیانەوێت بۆ بەڵگەی دیکە بگەڕێین، دیارە زۆرمان بەدەستدەکەوێ، لەوانە:

یەکەم: لەناو پێغەمبەراندا تەنیا پێغەمبەری ئیسلام نەبوو کە چەند ژنی هێنا بێت، بەڵکو بەپێی ئەو بەڵگانەی لەبەردەستدان، پێغەمبەرانی دیکە و کەسایەتییە هەڵکەوتووەکانی مێژوو و ڕێبەران و سەرکردەکانی پێش و پاش پێغەمبەری ئیسلامیش، چەند ژنیان هێناوە.

جا لەبەر ئەوەی باسەکە لەسەر پێغەمبەری خوایە، ئێمە تەنیا بەڵگە بە هاوشێوەکانی دەهێنینەوە کە پێغەمبەرانن، لەوانە وەك پێشتر وتمان باوکی پێغەمبەران ئیبراهیم (درودی خوای لەسەر بێت)، کە دوو ژنی هەبوو (سارە) و (هاجەر)، لە سارە (ئیسحاق) و لە هاجەریش (ئیسماعیل)ی بووە. بەڵکو جگە لەو دوانەش، چەند کەنیزەکێکیشی هەبووە، وەك لە تەوراتدا هاتووە کە دەڵێت: (بەڵام منداڵی کەنیزەکەکان کە لە ئیبراهیم بوون، ئیبراهیم بەخششی پێدان و لە ئیسحاقی کوڕی دووری خستنەوە...) (التكوين٢٥:٦).

هەر لە تەوراتدا هاتووە کە یەعقوب چوار ژنی هەبووە، کە (ليئة، راحيل، بەلهە، زلفة)بوون.

ئیتر لە دوای یەعقوبیش کە ئاینی جولەکە بە هاتنی ئەو دەستپێدەکات، پێغەمبەرانی تەورات و پێش تەورات چەند ژنیان هێناوە، وەك تەورات دەیگێڕێتەوە، داوود نۆ ژنی لە یەك کاتدا هەبووە، سولەیمان نەوەدونۆ ژن و کەنیزەکی هەبووە.

هەمیشە (چەند ژنی) لە ئاینی جولەکەدا ڕێگەپێدراو بووە، تا لە سەدەی یازدەدا کۆبوونەوەی (دورمز)ی بەناوبانگ قەدەغەی کرد، هەرچەندە تا ئێستاش هەندێك لە تیرەکانیان وەك چاولێکردن لە پێغەمبەرانی جولەکە، هەر چەند ژن دەهێنن.

لە ئایینی مەسیحیەتیشدا چونکە وەك تـەواوکاری ئـایینی موسـا هـاتووە، وەك قورئانی پیرۆز دەفەرموێت (وَإِذْ قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَمُبَشِّراً بِرَسُولٍ يَأْتِي مِن بَعْدِي اسْمُهُ أَحْمَدُ فَلَمَّا جَاءهُم بِالْبَيِّنَاتِ قَالُوا هَذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ) (الصف٦).

واتە: کە عیسای کوڕی مریەمیش گوتی: ئەی بەری ئیسرائیل ئەمن پێغەمبەری خوام بۆ لای ئێوە، ئەو تەوراتە دەسەلمێنم کە لەپێش مندا هـاتووە، مـژدەو لـێبێ پێغەمبەرێك لـە پـاش مـن دێ وەنـاو ئەحمـەد، وەختـێ بەچـەند نیشـانەی دیـاری دەرەوە هاتە لایان وتیان ئەمە هەر بەئاشکرا جادووە.

بۆیە بێ دوو دڵـی دەڵـێین: عیسـا چـەند ژنیـی حـەرام نـەکردووە، بـەڵکو لـە ئینجیلی مەتا نموونەیەك هاتووەتەوە بەڵگەیە لەسەر ئـەوەی چـەند ژنـی دروسـتە لای ئەوان.[٥٣٩]

کەواتە چەند ژنـی، ئیسـلام یـان پێغەمبـەر داینەمەزرانـدووە، بـەڵکو ڕێبـازێکی کۆنەو لە هەموو شارستانیەت و ئایینەکاندا هەبووە، لـە لـە پێشیشـیانەوە ئـایینی جولەکە و مەسیحییەکانیش دانیان پێدا ناوە، تەنیا لە یەك حاڵەتدا نەبێت، ئەویش گۆشەگیر و ئەسقوفەکانە کـە نـەیانتوانیوە ڕاهیـبن و چـەند ژنێکیشـیان هـەبێت، بۆیە تەنیا یەك ژنیانهێناوە.

لە جیهانی مەسیحیەتیشدا یاسا داهێنراوەکان چەند ژنییان قەدەغە کـرد، نـەك خودی ئایینەکە.

مامۆستا محەمەد فوئـاد هـاشمی (ئـەو زانـا مەسـیحییەی کـە مسـوڵمان بـوو)، دەڵێت: (داننانی مەسیحیەت بە چەند ژنهێناندا تا سەدەی حەڤدە مابووەوە).

ئەم ڕەخنەی فرەژنییە پێشتر جولەکە لە پێغەمبـەیان گرتبـوو، کـە وتبوویـان ئەم پیـاوە تـەنیا حـەز و خـەمی ژنهێنانـە، خـۆ ئەگـەر پێغەمبـەر بوایـە کاروبـاری

[٥٣٩] سەیری ( بیان الاسلام)، بەشی دوو، ج١ ج٢، بکەن.

پێغەمبەرایەتی لە ژنهێنان سەرقاڵی دەکرد، جا خوای پەروەردگار ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە (وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلاً مِّن قَبْلِكَ وَجَعَلْنَا لَهُمْ أَزْوَاجاً وَذُرِّيَّةً وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ بِآيَةٍ إِلاَّ بِإِذْنِ اللّهِ لِكُلِّ أَجَلٍ كِتَابٌ) ( الرعد٣٨).

واتە: هەڵبەت پێش تۆش پێغەمبەرانمان ناردون، ڕێگەشماندان ژنو نەتەوەشیان هەبن، هیچ یەك لەو پێغەمبەرانەش نەیتوانیوە هیچ بەڵگەیەك نیشان بدات، مەگین خودا ئیزنی دابێ‌و وەختێکی تایبەتی هەیە کە نوسراوە.

دووەم: کاتێك پێغەمبەری ئیسلام هات، فرەژنی لەناو عەرەبدا باو بوو، ئایینەکانی دیکەش بە پێغەمبەرەکانیشیانەوە، پیادەیان کردبوو (جگە لە عیسا درودی خوای لەسەر بێت)، بەڵام پەروەردگاری ئەو فرەژنییەی بە ڕەهایی نەهێشتەوە و بە چوار ژن سنووورداری کرد، هەر مسوڵمانێکیش زیاد لە چواری هەبوو، زیادەکەی تەڵاقدا. لەو کاتەشدا پێغەمبەری ئیسلام نۆ ژنی هەبوو، جا ئەگەر ئەویش وەك هاوەڵانی کردبا، بۆ خێزانەکانی زیانێکی گەورە بوو، چونکە ئەوان بە دەقی ئایەتی قورئان (دایکی مسوڵمانانن) و کەس بۆی نییە مارەیان بکات، بۆیە بە بڕیارێکی خوایی هەر نۆیانی لای خۆی هێشتەوە :

(يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَحْلَلْنَا لَكَ أَزْوَاجَكَ اللَّاتِي آتَيْتَ أُجُورَهُنَّ وَمَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ مِمَّا أَفَاء اللَّهُ عَلَيْكَ وَبَنَاتِ عَمِّكَ وَبَنَاتِ عَمَّاتِكَ وَبَنَاتِ خَالِكَ وَبَنَاتِ خَالَاتِكَ اللَّاتِي هَاجَرْنَ مَعَكَ وَامْرَأَةً مُّؤْمِنَةً إِن وَهَبَتْ نَفْسَهَا لِلنَّبِيِّ إِنْ أَرَادَ النَّبِيُّ أَن يَسْتَنكِحَهَا خَالِصَةً لَّكَ مِن دُونِ الْمُؤْمِنِينَ قَدْ عَلِمْنَا مَا فَرَضْنَا عَلَيْهِمْ فِي أَزْوَاجِهِمْ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ لِكَيْلَا يَكُونَ عَلَيْكَ حَرَجٌ وَكَانَ اللَّهُ غَفُوراً رَّحِيماً) (الأحزاب٥٠).

واتە: ئەی پێغەمبەر ئێمە ئەو ژنانەتمان بۆ ڕەوا دیوی کە مارەیت پێ گەیاندوون ئەوانەش کە لە دەسکەوتەکاندا دەستکەوتوون و خودا کردونیە پشکی تۆ هەروەها دۆت مامەکان‌و دۆت پلکانت‌و دۆت خاڵانت‌و کیژەکانی خوشکی دایکت، کە دەگەڵ تۆ ئاوارە بوون بەتۆ دەشێن، هەر ژنێکی باوەڕداریش بەو مەرجە خۆی ببەخشێ بە پێغەمبەرو پێغەمبەریش گەرەکی بێ مارەی بکا،

ئەمـەش هەرتایبـەتی تۆیـە، نـەك بۆ بـاوەڕدارانی تـر ئێمـە خۆمـان زانیومانـە کـە دەربارەی ئەو ژنانەی بەوان ڕەوانو ئەوانەی دەبنە کەنیزەکیان چلۆن بڕیارێکمـان داوە، تا هیچ گیروگرفتێك ڕوونەدا خودا لەگوناه دەبووریو دلۆڤانە.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بڕیارێکی دیکەی بۆ دەرچوو، کە نابێت ئیدی ژنـی دیکـە بهێنێت، تەنانەت ئەگەر لێشیان مرد یان تەڵاق درا (**لَا يَحِلُّ لَكَ النِّسَاء مِن بَعْدُ وَلَا أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنْ أَزْوَاجٍ وَلَوْ أَعْجَبَكَ حُسْنُهُنَّ إِلَّا مَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ وَكَانَ اللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ رَّقِيباً**) (**الأحزاب ٥٢**).

واتە: دوای ئەمانە کە خودا پێتی ڕەوا دیبووی ژنانی ترت پـێ ناشـێ بۆشت نیـە ئەو ژنانەت بە ژنی تر بگۆڕیەوە، بـا دەلالی و جوانیەکەشـیان دڵـی تـۆی بـۆ خـۆی کێشـابێ، مـەگین ئەوانـەی لـە دەسـکەوتەکاندا بەرتۆکـەوتوون، خـودا بەسـەر هەمووشتدا چاودێرە.

سەرنجڕاکێش ئەوەیە مسوڵمانانی تر بۆیان هەیە چەند ژنـی دیکـە بهێـنن، بـەو مەرجەی پێکەوە لە چوار تێپەڕ نەبن ، بەڵام پێغەمبەری ئیسـلام بـۆی نـەبوو لـەو نۆیە زیادی بکات، با چەند خێزانێکیشی بمرێت یان تەڵاقیان بدات.

سێهەم: ژنهێنانەکانی پێغەمبەری خوا پڕن لە وردەکاریی شـەرعی و حیکمـەتی مرۆیی، ئەگەر سەرنجیان بدەین، ڕووندەبێتەوە کە هەریەکەیان مانایەکی تایبـەتی هەبووە، ژنهێنانێکی ئاسایی نەبوون. دەکرێت بیانکەین بە دوو بەشەوە:

أ- **مانایەکی گشتی**، کە ئیشێکی گەورەی ژنەکانی پێغەمبەری خوا گەیانـدنی هەڵسوکەوت و ڕەفتار و کرداری خێزانەکانی پێغەمبەری خوا بووە بە مسـوڵمانان، چونکە پێغەمبـەری ئیسـلام سـەرقافڵە و چـاولێکراوە، مسـوڵمانان دەیانـەوێت لـە کاروباری خێزانیشدا چاوی لێبکەین، ئەم ئەرکە بەرفراوان و پڕ وردەکارییەش بـە ئافرەت و دوان نەدەکرا.

لە لایەکی دیکەشەوە گەورەیی و لێهاتوییـەکی دیکـەی پێغەمبـەر دەردەخـات، کە بتوانێت بە دادگەرانە مافی (٩) خێزان بدات و بەسەریان بکاتـەوە، لەگـەڵ ئـەو

هەموو سەرقاڵی و عیبادەتانەشدا، کە هاوەڵانی تەواو سەرسامی ئەم توانایە بوون و لەناو خۆیاندا بووبووە باس و خواس.

هەر لەو مانا و حیکمەتە گشتییانە ئەوەیە کە بێباکیی پێغەمبەر دەردەخات لەو هەموو درۆ و بوختانانەی بۆی دەکرا، وەك جادوباز و فاڵچی و... خۆ ئەگەر پێغەمبەری ئیسلام کەمێك لە خۆی گومانی هەبوایە، ئەو ژنانەی کە هەریەکەیان لە شوێنێکەوە دەیهێنان، لە خۆی کۆنەدەکردنەوە، تا نهێنییەکانی دزە پێبکەن.

وەك چۆن ڕەوشت بەرزیی پێغەمبەر دەردەکەوێت لەوەدا کە ئەو ژنانەی هەموو هەڵسوکەوتێکی زۆر تایبەتی پێغەمبەریان گێڕاوەتەوە، یەك ژنیان بێزاری، یان کەموکورتییەکی پێغەمبەری خوای نەگێڕاوەتەوە.

مانایەکی تر لەو ژنهێنانانەی پێغەمبەر ﷺ دروستکردنی خزمایەتی و بەهێزکردنی و دوورخستنەوەی شەڕی نەیاران بووە لە خۆی و مسوڵمانان، وەك: هێنانی کچی ئەبو سوفیان و صەفیەی کچە جولەکە و جوەیرییەی بەنی موتلەق و... کە پاشان هەموویان بوون بە هۆی نزیکتربوونەوە و مسوڵمانبوونی زۆربەی بنەماڵە و هۆزەکانیان.

### ب ـ مانا تایبەتییەکان

ئەگەر سەرنجی یەکبەیەکی ژنەکانی پێغەمبەر ﷺ بدەین، دەبینین هەر ژنهێنانێکی مانایەکی تایبەتی ئایینی و مرۆیی گەورە لەخۆ دەگرێت، زۆر لەوە مەزنترن کە حەز و هەوەسیان تێدا بخوێنرێتەوە، وەرە سەرنجدەین:

لە یەکەم ژنیەوە کە خاتوو خەدیجە بووە، پازدە ساڵ لە خۆی گەورەتر بووە، پێش ئەویش دوو شووی تری کردبوو.

دەبێت بیربکەینەوە چ حەزێکی گەنجانە لە ژنهێنانێکی وەهادا دەدۆزرێتەوە؟!

بە مەرجێك لەو ماوەیەدا کە خەدیجە خێزانی بوو، تا گەیشتە پەنجا ساڵی، پێکەوە بەوپەڕی دڵسۆزی بۆ یەکتر دەژیان و ژنیشی بەسەردا نەهێنا.

کە خەدیجە گەیشتبووە تەمەنێکی ژوورتر لەوەی پیاو مەیلی پیاوانەی بۆی هەبێت، لەو ماوەی هاوسەرییاندا ئەگەر پێغەمبەر حەزی لە زۆریی ژن هەبوایە، هێنانی گونجاوتر و ئاسانتریش دەبوو، بەڵام خەدیجە لە لایەکی دیکەوە بووبوو بەپشتیوانێکی گەورە و ئارامبەخشێکی بێوێنە بۆ پێغەمبەری خوا لە گەیاندنی بانگەوازەکەیدا.

ژنی دووەمیش کە سەودەی کچی زەمعە بوو، ئەویش حاڵی لە ژنی یەکەمی باشتر نەبوو، ڕاستە بە گەنجێتی خاوەن جوانی و بنەماڵە بوو، بەڵام ڕۆژگار هاڕیبووی، چونکە مێردەکەی لە کاتی گەڕانەوەیان لە حەبەشەدا، کۆچی دوایی کردبوو. خۆیشی لەوپەڕی هەژاریدا بوو و بێکەس و بێ دەر بوو. پێغەمبەری خوا هێنای تا باری سەرشانی سووک بکات و بۆ ئەویش ببێتە دایکێك بۆ منداڵەکانی، جگە لە وەفا بۆ مێردەکەی و هۆزەکەی، کە دەبنە خاڵوانی پێغەمبەری خوا، واتە (بەنی نەجاڕ).

عائیشەی کچی ئەبووبەکریش دیارە چ ڕۆڵێکی گەورەی بینی بۆ بەهێزتر کردنی خزمایەتی و دروستبوونی یەك خێزان لە نێوان پێغەمبەری خوا و ئەبووبەکری باوکیدا. هەروەها لە گێڕانەوەی فەرمودەکانی پێغەمبەری خوادا، کە چەندین فەرمودەی گێڕاوەتەوە کە جگە لەئەولای کەس نەبووە، هەروەها (٢٢١٠) فەرمودەشی گێڕاوەتەوە.

ئەو جیاوازییە لە تەمەنیشیاندا لەو ڕۆژگارەدا زۆر باو و ئاسایی بووە و کەس ڕەخنەیەکی لێنەگرتوون، تا هاتنی ڕۆژ هەڵاتناسان کە بە دەستئەنقەست بە تەرازووی لاسەنگی ئەمڕۆیان کەوتنە ڕەخنەگرتن[٥٤٠].

---

[٥٤٠] ـ سەبارەت بە تەمەنی عائیشە لەکاتی شووکردنیدا دڵگیرترین بابەت کە بینیبێتم نووسینێکی ( ) کە مامۆستا سەلام ناوخۆش بە پوختی کردوویەتی بە کوردی لە ژمارە ( )ی گۆڤاری ستاندەردا بڵاویکردووەتەوە. زۆر زانستیانە دەیسەلمێنێت کە عائیشە لە کاتی شووکردنیدا تەمەنی لە (١٧) ساڵ کەمتر نەبووە.

ئیدی ژنەکانی دیکەی پێغەمبەری خوا جگە لە عائیشە، هەر هەموویان بێوەژن بوون، هەر ژنهێنانێکیش مانایەکی قووڵی مرۆیی تێدایە و دانایی پێغەمبەر ئاشکرا دەکات لە شێوەی مامەڵە کردن لەگەڵ هاوەڵانیدا.

هەشیان بووە وەك ڕوونکردنەوەی حوکمێکی شەرعی هێناونی، وەك: زەینەبی کچی جەحش، کە پێشتر خێزانی (زەید) بوو، ئەویش بەندەی ئازاد کراو و بە کوڕ کراوی (متبنی) پێغەمبەری خوا بوو، کە لە دابوونەریتی عەرەبدا ژنەکانیان بووك و خۆیان کوڕی خاوەنە پێشووەکانیان بوون، خوای گەورەش ویستی ئەو دابونەریتە ناڕاستە هەڵوەشێنێتەوە و بڕیاریدا کە پێغەمبەری خوا (زەینەب) بهێنێت. هەر بەو ژنهێنانەش ئەو باوە نەما و بنەبڕ کرا، هەرچەندە لەسەر پێغەمبەری خوا زۆر قورس بوو.

(وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِي أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَاتَّقِ اللَّهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَاهُ فَلَمَّا قَضَى زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَراً زَوَّجْنَاكَهَا لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِي أَزْوَاجِ أَدْعِيَائِهِمْ إِذَا قَضَوْا مِنْهُنَّ وَطَراً وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ مَفْعُولاً )(لأحزاب ٣٧).

واتە: ئەوسا ئەوی خودا چاکەی دەگەڵ کردو تۆچ چاکەت دەگەڵ کردوە، تۆ پێت ئەوت: دەس لەژنێ خۆ بەرمەدەو دەبێ لەخودا بترسی. شتێکیشت لەدڵی خۆدا دەشاردەوە، کە خوا هەر ئاشکرای دەکرد. هەر لەمەردمیش دەترسای، کەچی خوا شیاوتر بو لێی بترسی. جا کاتێ زەید لە هاووجوتەکەی خۆی بە ئارەزو گەییشت، ئەومان کردە هاوجوتی تۆ، هەتا خاوەن باوەڕەکان لە خواستنی ژنی زڕ کوڕانی خۆیان ـ لەدوای ئەوەی تەڵاقیان دان ـ لۆمە نەکرێن، هەر فەرمانێ خودا بدا دەبێ پێك بێ.

**لەم بەشەدا قسەکان پوخت دەکەینەوە و دەڵێین:**

- پێغەمبەری خوا تا تەمەنی بیستوپێنج ساڵی زگورد بووە، ژنهێنانەکانیشی بەو تەرتیبە، ڕێنماییەکی خوایی بووە و هەر ژنێکی بۆ ئەو قۆناغەی کە هێناویەتی، زۆر گونجاو بووە، کە بانگەوازی ئیسلامی پێدا تێپەڕیوە.

- هەموو خێزانەکانی بە بێوەژنی هێناون تەنیا عائیشەی بە کچی هێناوە، لە کاتێکدا هانی هاوەڵانی داوە کە کچ بهێنن.

- عائیشە لەناو ئافرەتاندا زۆرترین فەرمودەی گێڕاوەتەوە و زۆرترین زانستی بڵاوکردووەتەوە، ئەوەش حیکمەتێکی خواییە کە هەر بە منداڵی لای پێغەمبەری خوا بووە تا لەو تەمەنەیدا فەرمودەکان لەبەر بکات و بیانپارێزێت، ئەوەشی دەوترێت عائیشە تەمەنی ٧ساڵان یان ٩ساڵان بوە، قسەیەکی ورد نییە.

- دوو لە ژنەکانی پێغەمبەر لەخۆی گەورەتربوون، خەدیجە (١٥) ساڵ و سەودە (٥)ساڵ، کە ژنی یەکەم و دووەمی پێغەمبەری خوا بوون.

- تا پەنجا ساڵی جگە لە خەدیجە ژنی دیکەی نەهێناوە.

- گرنگە بزانین کە بەو ڕوونکردنەوانەدا دەردەکەوێت ژنهێنانەکانی پێغەمبەری خوا جیاوازە لە ژنهێنانی پاشا و دەسەڵاتدارەکان.

بۆیە ناکرێت بڵێین پێغەمبەری خوا بۆ حەز و هەوەس ژنەکانی هێناوە، لەگەڵ ئەوەی بەشێك لە پێکهاتەی مرۆڤ ئەو لایەنە بایۆلۆجییەیە و پێغەمبەری خواش ئەو لایەنەی فەرامۆش نەکردووە، ئەگەر بیکردبا کەموکورتی دەبوو بۆی. بەڵام پاشا و سەرۆکەکان بەشی زۆریان ژنهێنانیان تەنیا بۆ ڕابواردن و کەیف و سەفای خۆیان بووە، بۆیە گەنجترین و جوانترین ئافرەتیان هەڵبژاردووە، ڕازاوەترین کۆشك و جێگایان بۆ دابینکردوون، چەندین شێوەی خەڵات و زەویوزاریان بۆ تەرخان کردوون.کەواتە ناکرێت ژنهێنانەکانی پێغەمبەری خوا، کە پڕن لە حیکمەت و یاساڕێژی، بەراورد بکرێت بە ژنهێنانی پاشا و دەسەڵاتداران.

# سەرچاوەکان

١- التفسير الكبير للأمام الفخر الرازي، الطبعة الثالثة.

٢- تەفسيری قورئانی پيرۆز هەژار موكريانی،

٣- پوختەی تەفسيری قورئان محەمەد مەلا صالح، چاپی هەشتەم.

٤- تەفسيری ئاسان بۆ تێگەيشتنی قورئان، بورهان محەمەد ئەمين

٥- تفسير أبن كثير.

٦- الفقه المنهجي على مذهب الأمام الشافعي تأليف د.مصطفى البغا، د.مصطفى الخن، الشيخ علي الشريجى. دمشق الطبعه الأولى ١٤٢٩.

٧- موسوعة بيان الأسلام الرد على الأفتراءات والشبهات. تحت أشراف نخبة كبار العلماء، الطبعة الأولى.

٨- فقه الجهاد د.يوسف القرضاوى، الطبعة الثالثة.

٩- رياض الصالحين الأمام النووي در الفكر ـ بيروت ـ لبنان.

١٠- ئافرەت و خێزان لە سايەی شەريعەتدا، مامۆستا عەلی باپير.

١١- وەڵامی پرسيارەکان ڕەواندنەوەی کۆمەڵێك گومان سەبارەت بە ڕاستييەکانی ئيسلام د.كريم أحمد، چاپی يەکەم.

١٢- القرأن وَنَقضُ مطاعِنِ الرهبان، د.صلاح عبدالفتاح الخالدي، الطبعة الأولى.

١٣- أزواج الأنبياء محمد راجي حسن مناس، الطبعة الأولى.

# پێڕست

**بەشی یەکەم: وەڵامی پرسیارە زانستییەکان........................................١٩١**

پێشەکی ئیکرام کەریم......................................................١٩٣

وورد‌ەکاری پرۆسەی کۆکردنەوەو نووسینەوەی قورئان بەڵگەیە لەسەر پارێزراوی قورئان .....................................................................١٩٥

یەکەم: بەڵێنی خوا بۆ پاراستنی قورئان .....................................١٩٥

١ـ قۆناغی سەردەمی پێغەمبەر (صلى الله عليه واله وسلم): ......................٢٠٢

٢ـ قۆناغی سەردەمی حەزرەتی ئەبوبەکر (خوای لێ ڕازی بێت) ...............٢٠٧

٣ـ قۆناغی سەردەمی عوسمانی کوڕی عەففان (ڕەزای خوای لێ بێت) ........ ٢١٥

٤ـ قۆناغی سەردەمەکانی دوای عوسمان (خوای لێ ڕازی بێت)................٢٣١

پێشەکی ئەندازیار عوسمان ...............................................٢٥٣

١ـ پەیکەرێك دەبۆڕێنێت......................................................٢٦٢

٢ـ موستیلەی جادویی! ......................................................٢٦٥

٣ـ ئازاردانی ناو گۆڕ.........................................................٢٦٦

٤ـ وشتری مێ کچی بەردە؟ .................................................٢٦٨

٥ـ پشکۆ لەناو ئاگردا.........................................................٢٧٠

٦ـ ڕۆحی مرۆڤ لە ئاژەڵدا! ..................................................٢٧٣

٧ـ جنۆکە و عیفریتەکان.......................................................٢٧٦

٨ـ هەنگوین دەرمانی هەموو نەخۆشیەكە ! ........................ ٢٧٧

٩ـ شەورِەوی بۆ ئاسمان و گەڕانەوە بۆ زەوی........................ ٢٧٩

١٠ـ پەپو سلێمانەی فەیلەسوف ! ........................................ ٢٨٠

١١ـ ئاژەڵێك لە نێو پێغەمبەراندا ........................................ ٢٨٣

١٢ـ مردوویەك بۆ ماوەی ساڵێك خۆی دەدات بەسەر گاڵۆكێكدا............ ٢٨٣

١٣ـ كێوێك بە ئاسماندا دەفڕێت........................................ ٢٨٤

١٤ـ چیایەك قسە دەكات ................................................ ٢٨٥

١٥ـ ئاسن هەروەكو مێو نەرم دەبێتەوە ! ................................ ٢٨٦

١٦ـ نوستنێكی (٣٠٩) ساڵە ............................................. ٢٨٧

١٧ـ ڕەشەبا لە ژێر فەرمانی سولەیماندایە .............................. ٢٨٨

١٨ـ باڵندە بە بەرد شەڕ دەكات........................................ ٢٨٩

١٩ـ شەڕی بەچاوەوە بوون............................................. ٢٩٠

٢٠ـ نەوەی ئیسرائیل و مانگاكە ........................................ ٢٩١

٢١ـ ئایا بروسكە فریشتەیە ............................................ ٢٩٣

٢٢ـ ئازاری جادوو................................................... ٢٩٤

٢٣–تۆفانەكەی نوح .................................................. ٢٩٥

**بەشی دووەم: پێشبڕكێ بێبناغەكان** ................................ ٢٩٩

پێشەكی ............................................................ ٣٠١

بڕگەی یەکەم ........................................................ ٣٠٥

ئایا قەشە فادی راستئەکات کە ئەڵێ (١٠)جۆر هەڵە لە قورئاندا هەیە؟! .......٣٠٥

فەلسەفەی موتەشابیه چییەو بۆچی قورئان هەمووی موحکەم نیە؟........... ٣١٢

بڕگەی دووەم........................................................ ٣٢٧

نمونەیەك لە هەڵە جوگرافییەکان وەك قەشە فادی ئەیڵێت................. ٣٢٧

بڕگەی سێیەم........................................................ ٣٣١

نمونەیەك لە هەڵە مێژووییەکان وەك قەشە فادی ئەیڵێت. .................. ٣٣١

بڕگەی چوارەم........................................................ ٣٤٠

نمونەیەك لەو هەڵە رەوشتیانەی کە قەشە فادی بە حەرام و بە تاوانی دائەنێت

گوایە قورئان حەڵاڵیکردووە ! ........................................ ٣٤٠

بڕگەی پێنجەم........................................................ ٣٥٥

نمونەیەك لە هەڵە لاهووتییەکان وەك قەشە فادی ئەیڵێت.................. ٣٥٥

بڕگەی شەشەم ........................................................ ٣٧٠

نمونەیەك لە هەڵە زمانەوانیەکان وەك قەشە فادی ئەیڵێت .................. ٣٧٠

بڕگەی حەوتەم ........................................................ ٣٧٣

نمونەیەك لە هەڵە یاساییەکان وەك قەشە فادی ئەیڵێت.................... ٣٧٣

بڕگەی هەشتەم........................................................ ٣٨٣

نمونەیەك لە هەڵە کۆمەڵایەتیەکان وەك قەشە فادی ئەیڵێت .................. ٣٨٣

بڕگەی نۆیەم ........................................ ٣٩٤

نمونەیەك لە هەڵە زانستیەكان وەك قەشە فادی ئەیلێت.................... ٣٩٤

بڕگەی دەیەم ........................................٤١١

نمونەیەك لەو كارانەی قەشە فادی بە شوورەیی دائەنێ لە ژیانی پێغەمبەردا(صلی الله علیه و اله وسلم)...............................................٤١١

قسەیەك لە كۆتاییدا ........................................٤٤٠

سەرچاوەكانی بەشی دووەم ........................................٤٥١

**بەشی سێیەم: وەڵامی پرسیارە جوگرافی و مێژووییەكان.................... ٤٥٥**

پێشەكی ........................................ ٤٥٧

بە شـــی یــە كـــە م: پرسیارە جوگرافییەكان ........................................ ٤٦٤

١–ئاوابوونی خۆر لەناو بیر........................................ ٤٦٥

٢–زەوی جێگیرە ........................................ ٤٧٥

بە شـــی دووە م :پرسیارە مێژووییەكان ........................................ ٥١٢

میسر و فیرعەون و ئیسرائیلییەكان ........................................ ٥١٢

١–هامان وەزیری فیرعەون بوو ........................................ ٥١٢

٢–قاروون و هامان میسری بوون........................................ ٥١٦

٣– گوێرەكەی زێڕینی دروستكراوی سامیری بوو........................................ ٥١٧

هاڕوون گوێرەكەكەی دروستكردبوو؟ ........................................ ٥١٨

شاری سامیره لەکاتی مووسا ........................................ ٥١٩

سامیره یان شۆمەرۆن........................................................ ٥٢٠

شاری صومور.................................................................. ٥٢٣

٨–فیرعەون لە خنکان ڕزگاری دەبێت.................................... ٥٢٩

٣٠–کچی فیرعەون یان ژنەکەی؟......................................... ٥٣١

٣١–فڕێدانی منداڵان بۆ ناو ڕووبارەکە پێش لەدایکبوونی مووسا بوو نەك دوای
ناردنی بە پێغەمبەر.......................................................... ٥٣٣

٣٢–مارەیی ژنەکەی مووسا ................................................ ٥٣٤

٣٣–ئیسرائیل میراتیی میسری نەگرت..................................... ٥٣٦

دەربارەی گورزەکان لە میسر................................................. ٥٣٧

٣٤–گورزەکان کە لە میسر دران دە بوون نەك نۆ....................... ٥٣٧

٥١–لافاو بۆ میسرییەکان...................................................... ٥٤١

٣٥–بەردەکەی حۆرێب بیرەکانی ئێلیم نییە................................ ٥٤٢

٣٦–دوو لەوحەکەی شەریعەت ............................................... ٥٤٥

٣٧–ئایا داوایان کردبوو خودا ببینن؟ ....................................... ٥٤٧

٣٨–قۆرەح نەك قاروون....................................................... ٥٤٩

٣٩–سولەیمان یان ئەبشالۆم؟................................................. ٥٥٠

٥٢–شائوولی پادشا یان جدعونی قازی؟ .................................... ٥٥١

مەریەم و مەسیح............................................................ ٥٥٤

٥–مەریمی پاکیزە خوشکی هارٖوونە و کچی عیمرٖانە ....................... ٥٥٤

٩–زەکەرییا سەرپەرشتیی مەریەم دەکات ............................... ٥٥٦

١٠–دوورکەوتنەوەی مەریەم ............................................. ٥٥٩

١١–مەریەم لە دەشتایی منداڵەکەی دەبێت و ئەم لەژێرییەوە قسەی لەگەڵ دەکات ........................................................................ ٥٦٠

٤٠–هاجەر یان مەریەم؟.............................................. ٥٦٢

٤١–خوانێك لە ئاسمان دانەبەزیبوو........................................ ٥٦٣

٥٣–لە بێشکە قسە دەکات ............................................. ٥٦٥

٥٤–لە قورٖ باڵندە دروست دەکات ...................................... ٥٧٠

٥٥–باوەڕنەهێنان بە لەخاچدانی مەسیح .................................. ٥٧٢

لەخاچدانی مەسیح............................................................ ٥٧٤

فیدا و چوار ئینجیلەکە .................................................. ٥٨٢

دەربارەی پێغەمبەران ...................................................... ٥٩٥

ئیبراهیم....................................................................... ٥٩٥

٤–ئازەر باوکی ئیبراهیمە ................................................. ٥٩٥

٢٢–ئیبراهیم لەکوێ و نەمروود لەکوێ؟ ................................. ٥٩٩

یووسف ........................................................................ ٦٠١

